حەمەی حەمە سەعید



# دەنگی خاک

## بیرەوەری

## 1976 - 1991

بەرگی یەکەم

- ناوی کتێب: دەنگی خاک.
- بابەت: بیرەوەری.
- نووسەر: حەمەی حەمەسەعید.
- پێداچوونەوە و پێشەکی: پ. ي. د. کەیوان ئازاد ئەنوەر.
- دیزاینی  بەرگ: نزار نوری
- دیزاینی ناوەوە: هاوار تۆفیق
- پیتچنین: عیرفان بەڵخەیی.
- پرۆفایلی نوسەر نووسەر: کەمال نجم الدین
- چاپی یەکەم: سلێمانی ٢٠١٦
- چاپی دووەم ٢٠٢٠
- تیراژ:١٥٠٠ دانە.
- چاپخانە: کوردستان

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارەی سپاردن ١٠٥٩ی ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە.

# ناوەڕۆک

# پێشکەشە بە :

ئەم بەرهەمە پێشکەشە بەو خێزانەی منیان هێنایە دونیاو لە ئامێزیان پەروەردەو گەورە بووم، ئەوانیش:

باپیرم، حاجی عەلی محەمەد، سەرەتا لەلای ئەو بەقورئان خوێندن، فێری ئەلف و بێی کردم.

-بەو دایکو باوکەی کەزۆر ماندوبوون لەگەڵم، جگە لەبەخێو کردن و پێگەیاندنم، لەساڵی ١٩٧٧ یش بەدواوە تاساڵی ١٩٩١، شاخەو شاخ و دۆ لاوەدۆڵ بەدوامەوە بوون. بە خوشک و براکانم لەبەر ئەوە من بومە هۆی بێبەش بونیان لە خوێندن، ئەوە بوو دواجار لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٨دا بەیەکجاری هاتنە دەرەوە، بۆسەر چیا، لەبەر ئەوەی رژێمی بەعس نەیانگرێت و نەیانبات بۆ باشوری عێراق. چونکە ئەوکات هەرکەس ئەبووە پێشمەرگە رژێم دایک و باوک و خوشک و براکانی ئەبرد بۆ باشوورو ناوەڕاستی عێراق و زیندانی و دەست بەسەری دەکردن. ماڵی ئێمە خێزانێکی ١٠ کەسی بووین بەخۆم و خوشک و براکانم ٨ سەر منداڵ، ئەوانیش هادی برام سەروترین تەمەن ١٥ساڵ و خواروترین تەمەنیان چنوری خوشکم ٢ ساڵ بوو، لەگەڵ دایک و باوکم.

خۆم تەمەنم ١٦ ساڵ بوو. کاتێک چوومە سەر چیاو هاتمە دەرەوە ١٦ ساڵم تێپەڕ کردبوو. خوشک و براکانی ترمان لەنێوان هادی و چنووردا ئەمانە بوون شیروان چوار ساڵان، شەهید کۆسار پێنج ساڵان، کوێستان شەش ساڵان، ئیقباڵ هەشت ساڵان، ئەدیبە دە ساڵان، شەهید مەهدی دوانزە ساڵان بوو. زۆر بەسەختی و بەدژواری شەش مانگی یەکەم ساڵی سەرەتایان لەچیا گوزەراند. ڕۆژێک لەم دیوی هێڵی سەرسنوور ڕۆژێک لەودیوو، ئینجا بەردەوام لەم بێشەلان بۆ ئەو لێرەوار، لەم ئەشکەوت بۆ ئەو بنرەمەند، خۆرەتاو نزاری ئەم دۆڵ و ئەویاڵ، خۆ حەشاردانی ناو کونەبەردان، سەرکەوتن بۆ سەر چیاو داگەڕانەوە بۆسەر چۆم و گوێ ئاوان، لەگەڵ

پێشمەرگە سەرەوژوورو سەرەوخوار، لەگەڵ ئەوان ئاوارە بوون و دووبارە لەگەڵ ئەوان نیشتەجێ بونەوە.

تا ئەوکاتەی شۆڕشی گەلانی ئێران سەرکەوت و ڕژێمی شای ئێران سەرنگون بوو، ئەمجا لە ئاوایی شۆشمێ کوردستانی ڕۆژهەڵات، لەسەر سنوور لە ماڵی خزمان ڕۆژهەڵات پشوویەکیاندا، دووبارە دوای جەنگی عێراق و ئێران و شەڕی کوردانی لەگەڵ ڕژێمی کۆماری ئیسلامی ئێران، ئاوارەی هەمان شوێنەکانی پێشووتر بونەوە، سەرئەنجام پارتیزانی چکۆلە چکۆلەیان لێ دەرچوو، هەموو بڕوانامەی زانکۆی ناو ئەشکەوتیان وەرگرت لەنەخوێنەواریدا، بەم شێوەیە بوونە خاوەنی ئەم بڕوانامانە: ئەدیبە – نانکردن، مەهدی- قارەمانییەتی، هادی- شارەزایی، شیروان- لێدانی نیشانە، کوێستان- ئاگرکردنەوە، کۆسار-نەرمونیانی، چنور-خانۆچکەکردن، غەریبەی دایک-چایی لێنان، چونکە خۆراک و کەرەستەی چێشت کردن نەبوو. حەمەسەعیدی باوک- کوخو و کەوێڵ دروست کردن و ئەشکەوت پاکردنەوە و بنبەرد تەخت کردن.

ژیان و گوزەرانێکی دوورو بێبەش لەئاوەدانی، لە ڕۆشنایی، لە هەموو پێداویستیەکی سەرەتایی ژیانیان گوزەراند، نزیک لەمەترسی و مەرگ، نزیک لەهەموو نەخۆشی و ناخۆشیەکان، بەڵام گوزەرانێکی سەربەرزانە، بەوشێوە بەردەوام بوون تا پایزی ساڵی ١٩٨٨ لەناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستاندا، لەدوای ئەنفال و کیمیاباران کردنی کوردستان و ڕێکەوتنی ئێران و عێراق لە ١٩٨٨/٨/٨چوونە وڵاتی ئێران و بوونە پەنابەر، لەشاری پاوە نیشتەجێ بوون تاراپەڕینی بەهاری ساڵی١٩٩١ی خەڵکی کوردستان، ئینجا گەڕانەوە ناوچەی هەورامان، دۆڵبیان ئاواییەکەی خۆمانیان ئاوەدان کردەوە.

– هەروەها پێشکەشە بەگیانی شەهید کۆساری هەمیشە زیندو، بەئەسیر و فرمێسک، کوڕوکچەکەی ئەدیبە، بەڕۆحی پاکی باوکە شەهیدەکەیان کەیکاوسی نەمر. بەهاوارو سۆزدار بەڕۆحی باوکە شەهیدەکەیان مەهدی.

– پێشکەشە بەڕۆحی پاکی سەرجەم شەهیدانی ڕێگای ئازادی و کوردایەتی کوردو کوردستان بە شەنگال و کۆبانێ و عفرینیشەوە.

# پێشەکی:

ئەگەر مێژوو بەدیوێکدا تۆماری بەسەرهاتی ڕووداوەکانی ڕابردوو بێت، ئەوا بیرەوەرییەکانیش، کەزادەی شایەتحاڵەکانی سەردەمێکی دیاریکراو بوون، بەشێکن لەمێژوو. لەم سۆنگەوە نووسینەوەی بیرەوەرییەکان لەلایەن کەسایەتییە سیاسی وکۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانەوە، بەشێکی گرنگی تۆمارەکانی مێژوویان پێکهێناوەو بوونەتە سەرچاوەی زۆر باش و بایەخدار بۆ ئەوانەی سەرقاڵی نووسینەوەی تۆمارەکانی مێژوو و وەرگرتنی زانیاری بوون لەسەر ئەزموونە زۆرو زەبەندەکانی.

دیارە ئەوەش بەدەر لەوەی چەندە ئەو بیرەوەرییانە گرنگ بوون، کە بەشێکی تۆمارەکانی مێژوویان لە فەوتان ڕزگار کردووە، ئەوەندەش لەوەدا گرنگ بوون، کەئەزموون و ژیان و بەسەرهاتی ئەو تاکانەی بیرەوەرییەکانیان نووسیووەتەوە، بەنەوەکانی داهاتوو ئاشنا کردووە. سا ئەگەر تۆماری ئەو بیرەوەرییانە بەشێوەیەکی سادەو پاراو پاک و ڕاست نوسرابێتەوە، ئەوا سەرباری ئەوەی ئەرکێکی گەورەی لەکۆڵ مێژووسان و توێژەرانی ئەو بوارە کردۆتەوە، خزمەتێکی گەورەشیان بە چەندین لایەنی شاراوەی ژیان دەیان و سەدان تاکی کۆمەڵگاکان کردووە. دیارە ئەگەر ئەو تۆمارانەش نەبوونایە ئەستەم بوو مێژوونووسان و توێژەرانی ئەو بوارە بگەنە چەندین ڕاستی مێژوویی و زانیاری بەکەڵک لەسەر کەسایەتی ئەوان و شێوازی ژیانیان و بارو گوزەرانی خەڵکانی ئەو گوند و شارۆچکە و شار و ناوچانەی تۆمارە بیرەوەرییەکان گرتوویەتییەوە.

لێرەوە پێشمەرگەیەکی کاروانی خەباتی کوردایەتی و ئەندامێکی پارتێکی سیاسی کوردی و کوردستانی و بەرپرسێکی ئێستایی لەڕیزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەناوی کاک حەمەی حەمە سەعید دەستی دایە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی ژیانی. ئەو لەوڕێیەوەدا هەوڵێکی زۆریدا، تا بگاتە ئەو تۆمارانەی سەردەمی ژیانی و خەباتی پێشمەرگایەتی، کە هەر ڕۆژەی لە بن بەرد و ئەشکەوت و دۆڵ و لاپاڵ چیاییەک و پێدەشت و گوند

و شارۆچکە و شارێکدا بەسەربرد. ئەمەو وەک سەرجەم هاوڕێ و هەڤاڵ و هاوسەنگەرەکانی لەبەرامبەر یەکێک لە درندەترین ڕژێمەکانی سەدەی بیستەم لە جیهاندا، کە ڕژێمی بەعس بوو، لە سەنگەری خەبات و بەرەنگاریدا شەوی بە ڕۆژ و ڕۆژی بەشەو کردەوە. ئەو لەماوەی زیاتر لە چل ساڵ خەباتی پێشمەرگایەتیدا بەردەوامە،ئەمە بەرهەم و بەسەرهاتی  شانزە ساڵی ئەو خەباتەیە لە دژی ڕژێمی بەعس، جگە لە خودا و خاک هیچ هێز و دەوڵەت و لایەن و کەسێک ئازار و نەهامەتی و مەینەتییەکانی خەباتی پێشمەرگایەتی نەبیست و بەدەنگییەوە نەهات، بۆیە ناوی دەنگی خاکی لەم بەرهەمەی نا، کە تۆماری نزیکەی شانزە ساڵ سەربۆردەی ژیانی و خەباتی پێشمەرگایەتی و بەرپرسیارییەتی بووە لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردا. دیارە بەندە نە ئەو کات هاوڕێ و هاوسەنگەری بووم، تا ئاگاداری ڕاستی و دروستی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی بم، نە هاوتەمەن و هاوڕێی کار و خەباتی بووم، تا لە وێستگە و ڕووداوێکدا ئاگاداری ژیانی و شێوازی ژیانی و نەهامەتی و مەینەتییەکان قۆناغی خەباتی بم، بەڵام وەک لە ڕوونکردنەوەکەی خۆیدا لە سەرەتای ئەم بەرهەمە باسی لێوەکردووەو تۆمارەکانی لەسەر دارشتووە، پێناچێت کارێکی سادە و ساکاری ئەنجام دابێت و هەوڵی چەواشەکردنی ڕاستییەکانی دابێت، بەڵکو ئەوەندەی من وەک پسپۆڕێکی بواری مێژوو لێ حاڵی بووم، کارێکی جوان و باشی ئەنجامداوە و بیرەوەرییەکانی ژیانی خۆی و هەڤاڵەکانی بە ئەمانەتەوەو ڕاستگۆیانە تۆمار کردووە. خۆ ئەگەر هەڵەیەک لە تۆمارو ڕووداو و خەباتی کەسێک و تێڕوانینی بۆ کەسێکی هاوڕێ و هەڤاڵی یان نەیارێکی ڕوویدابێت، ئەوا لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە بیر و زهنی دڵسۆزی لەگەڵدا نەکردووە، تا لەگەیشتن بەو تۆمار و بیرەوەرییانەی نزیکەی شانزە ساڵی تەمەنی ووردبێت. ئەوەش دیاردەیەکی زۆر ئاسایی بووە، چونکە بۆ هەر تاک و مرۆڤێک ئاسایی بووە ڕووداو و بەسەرهاتەکانی تەمەنی وەک خۆی لە زهن و بیریدا مابێتەوەو لەیادی نەچووبێت، بۆیە لەم بوارەشدا نە هەڵەی کردووە و نەکەمتەرخەمی. هەربۆیە هیوادارم ئەو کارەی کاکە حەمە بەرهەمێکی باش و خۆشەویست و بە سوودبێت بۆ خەرمانی تۆماری بیرەوەرییەکانی مێژوو و مێژووی کورد. ئەمەو نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت، کە وەک چۆن خاکی کوردستان دوای زیاتر لە ملیۆنان ساڵ

بوون، هەنووکەش تامەزرۆیی سەربەخۆیی و ئازادییە، ئاوەهاش دەنگی خاکی ئەم هەڤاڵە پێشمەرگەیە، عەودالی بەدەنگەوە هاتنی خاک بوو بێت بۆ ئەو ڕووداوانەی لەبن بەرد و دۆڵ و ئەشکەوت و لاپاڵی چیا و پێدەشت و گوند و شارۆچکەیەک ڕوویداوەوە لە بیرەوەرییەکانیدا ماوەتەوە. دووبارە هیوای سەرکەوتن بۆ هەوڵە بەردەوامەکانی لەپێناو نووسینەوەی تۆمارەکانی مێژوو بە گشتی و مێژووی کورد بەتایبەتی، لەپاڵ هەوڵەکانی پێشتری لە چیانشیانی زاگرۆس و گەڕانەوە بۆ سەرەتاکانی ئیسلام و تەیمووری لەنگ و حەسەن سەباحدا.

پ. ی. د. کەیوان ئازاد ئەنوەر

٢٢ی نیسانی٢٠١٦زایینی

٢ی گوڵانی٢٧١٦کوردی

سولەیمانی

# ڕوونکردنەوە

نوسینەوەی یادەوەری هەر خەباتگێڕێکی کورد، یان نووسین سەبارەت بە کوردستان و کوردو نەتەوەکەیی، یان نوسینەوەی مێژووی کوردو کوردستان، تا ئەم کاتەش، جگەلە وەبیرهێنانەوەو وێناکردنی تراژیدیا، کارەسات، ڕوداوی تاڵ و ناخۆش و دڵتەزێن و خەم هێنەر شتێکی دی نییە. لەم بارەوە وەرگێڕو مێژوو نوسی ناسراوی کورد، ئیبراهیم یونسی لەتۆمارێکیدا نووسیویەتی ڕووداوەکانی کورد، وێنەی یان ڕوونوسی یان کۆپی ڕوداوەکانی سوور پێستەکانی ئەمریکان، دیارە هەموو ڕووداوەکان دووبارە بوونەوەن. لەوانە پەیمانبەستن، دوای کۆکردنەوەی هێز پەیمان شکێنی، دواتر کوشتنی ژن و منداڵ و پیرو لاو. ئەمە ستراتیژی دوژمنەکانمان بووە بەرامبەر بەئێمەی کوردیش .

لە خۆراسانییان پرسیوە مەغۆلەکان چیان کردو چیان بەسەرهات؟ لەوەلامدا وتوویەتی کوشتارو سووتاندن و تالانکردن، دواتر ڕۆیشتن! بەڵێ دوژمنانی کوردیش هەرئەوەیان کردووە لەگەڵ کوردا، لەوبارەوە بۆ خۆیشمان ئەگەر لەمن بپرسن : کورد چۆن بوون و چیتان کرد؟ سەرەتا ئەڵێم: گیانفیدایی...قارەمانییەتی...مەردایەتی و کوردایەتی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەتوانم بڵێم یەککرتوو نەبووین، خیانەتمان لەخۆمان و لەگەڵ یەکدا کردووە، هەڵەی زۆرمان کردووە، هەڵە لەدوای هەڵە، هەڵەو تاوان و چەوتیەکانمان خستوەو ئەخەینە ئەستۆی یەکتر، دەرس و پەندمان لەڕابردو وەرنەگرتووە، لەوە ئەچێ نەبۆ ئێستاو نەبۆ داهاتووش دەرسوپەند وەری نەگرین! سادەو ساکارو خۆش باوەڕبووین، خوێندنەوەمان بۆدۆست و دوژمن زۆر جار هەڵەو لەجێگەی خۆیدا نەبووە، لەگەڵ ئەمانەشدا دروشمان هەر (نەسرەوتن تا سەرکەوتن بووە) .

خوێنەرانی ئازیز: بێگومان لەم بەرهەمەدا هەندێ کەلێن و کادێن هەیە، لەزۆر شوێندا چاوەڕوانی ئەنجامی بەسەرهات یان ڕووداوێک دەکەی، بەدەستی

ناهێنێ. تۆمارەکە بەسەر یەکەوەو زنجیرەیی نییە، پچڕپچڕە. چونکە هەندێک هۆکارهەن، لەوانە یاداشتی نووسراوی ڕۆژانە، من لەو ڕۆژەوە بووم بەپێشمەرگە تاماوەی یەک مانگ ووردو درشتی یاداشتەکانم نووسییەوە، ڕۆژێکی سەرەتای بەهاری ساڵی ١٩٧٨ لەناو ئەشکەوتی بەرووداردا لەناوچەی هەورامان سنوری ئاوایی گریانە، خۆمان حەشاردابوو، لەتەنشت ئەشکەوتەکەوە لەبنزەردێکدا کەمێک دوورتر لەهەڤاڵەکانم، خەریکی نووسینەوەی بیرەوەری و یاداشتی ئەوڕۆژە بووم، بینیم بەرپرسی سەربازی و ڕابەر سیاسیەکەم هەڤاڵان ئەحمەد گریانەیی و عەلی شامار لەولامەوە بەچپە پێکەوە قسەئەکەن، تێگەشتم قسە کردنەکەیان سەبارەت بەمنە، ئەوەندەی پێنەچوو هاتن و بانگیان کردمەلاوە، قەڵەم و دەفتەرەکە بەدەستمەوە بوو، ووتم فەرموو کاک ئەحمەد؟ عەلی شامار وەڵامی دایەوەو ووتی: ئەو دەفتەرەم بدەرێ، ووتم فەرموو دەفتەرەکەیان لێوەرگرتم دەستیان بەخوێندنەوەی یاداشتەکانم کرد، دواتر عەلی شامار بەپێکەنینەوە پرسی ئەمە چییە؟ ووتم چییە یاداشتی ڕۆژانەن بیرەوەری، دووبارە بەکەنینەوە بیرەوەری چی؟ ئێ بەبیانوی ئەوەی نەوەک شەهید ببم و دوژمن سوود لەزانیارییەکانی ناو ئەودەفتەرەی بەرباخەڵم وەربگرێت، بەشە نووسراوەکەیان لێکردەوە، سووتاندیان. دەفتەرەکەشیان برد ووتیان بۆ حەرەسات.

نیگەرانی و ترس دایگرتم، نیگەرانی بۆ سووتاندنی یاداشتەکانم، ترس لەوەی کەڕەنگە خراپ بیرلەم نووسینانەم بکەنەوە. گرییانەی زانی نیگەران بووم بۆیە دڵی دامەوە، ووتی: حەمە تۆئەزانی ئێمە لەهەرجێگەیەک ئەمێنینەوە دوای کە ئەڕۆین و شوێنەکە بەجێ ئەهێڵین، من پاشماوەکانی وەک پاکەتی خاڵی و کاغەزو فلتەرەجگەرەو هەتا خۆڵەمێشی ئاگرەکەش، پاک ئەکەمەوەو لەشوێنی دورتر ئەیشارمەوە، نەوەک شوێن پێ و ئاسەوارومان دیاربێ، تۆلەم دەفتەرەدا وردو درشتی هەڵسوکەوت و جێگەوڕێگەو کاتوسات و کێمان بینی و کێمان بەسەر کردووەتەوە کێ هاتووە بۆلامان، هەمووت تۆمار کردووە؟ نابێ نا ئەوەهەڵەیە. منیش ووتم بەڵێ بەسەرچاو تەواو من ئەوەم نەزانیوە. ئەوەبوو تاساڵێک هیچم نەنووسی، دوای ئەوە خۆم بوومە بەرپرسی

مەفرەزەو جێگە متمانە، لەساڵی ١٩٧٨ بەدواوە، دووبارە دەستم کردەوە بەنوسینی بیرەوەری و یاداشتەکانم. ئەوانیش بەکەم وکورتی.

بەردەوام دەفتەری ساڵانەم هەبوو تاساڵی ١٩٨٨ دوای ڕێکەوتنی ئێران و عێراق و پاشەکشەی ئێمە بۆناو خاکی ئێران، هەموو دەفتەرەکانم و چەندین ئەلبوم وێنەی پێشمەرگەو پێشمەرگایەتی هەموو نووسراوەکان و نامە ئاڵوگۆڕ کراوەکانم شاردنەوە. ئەویش لەبەر خاتری نامەیەکی تایبەت[1]، نەمبردنە ئێران لەئاوایی هاوارەکۆنی کاکەیی نشینی هەورامان بەجێم هێشتن، بەهیوای ئەوەی ڕۆژێک بێمەوە سەریان و هەڵیان گرمەوە، بەڵام لەدوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ کاتێک چوومەوە بۆسەر شوێنەکەیان، نەمابوون و سووتاو فەوتابوون، بەهۆی تەقاندنەوەی ئاواییەکە و سووتاندنی ماڵەکانەوە. بۆیە ئێستا بەگەڕانەوە بۆ یادو یادەوەریەکانم، ئەم بیرەوەریانەم نووسیوە، بفەرموون لەو بارەوە چەند ڕوونکردنەوەیەک.

یەکەم: لەبیرکردنی هەندێک ڕوداوی گرنگ و هەندێک ناو و بەروار (ڕۆژ)، کە دەبوو لەبابەتەکانی ئەم کتێبەدابن، نین، هەرچەندە تۆمارەکە تەواو زنجیرەیی

---

[1]. من لە سنووری کاری سیاسی و حیزبایەتی و پێشمەرگانەی خۆمدا، کە زیاتر ناوچەکانی شارەزوورو هەڵەبجەو هەورامان بوو، لە ساڵەکانی ١٩٨٢-١٩٨٨ بەحوکمی ئەوەی هێزەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەم سنوورەدا بنکەو بارەگاو هێزیان هەبوو، زۆر هاوکاریان کردبووم، هاوکاری وەک گواستنەوەی مەفرەزەکانمان لەجێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکیتر بەئۆتۆمبێل لەکاتی پێویستدا، چارەسەر کردنی بریندارەکانمان و گواستنەوەیان بۆشوێنی تایبەت و نەخۆشخانەی شۆڕش لەدۆڵی جافایەتی، هێنان و ڕزگار کردنی ئەوکەسانەی لەشارەکانەوە ئەهاتن بۆ پێشمەرگایەتی، پەنادان و شاردنەوەی خێزان و کەسوکاری بەرپرس و فەرماندەکانمان لەدەستی بەعس و گەیاندنیان بۆسەر سنوورەکان و بنکەو بارەگاکانمان لەناوچە ڕزگارکراوەکان، بەتایبەت لەکاتی ئەنفالەکاندا. جگە لەم جۆرە هاوکاریانە لەکاتی شەڕیشدا چەند جارێک بەدژی هێزەکانی سوپای عێراق هاوکاریان ئەکردین. منیش لەبەرامبەر ئەم هاوکاریانەدا هاوکاری و یارمەتی ئەوانم دابوو، هاوکاری و یارمەتی وەک جێگەو ڕێگە کردنەوەیان لەو ئاواییانەدا، کە بەدەست ئێمەوە بوون لەناو خاکی عێراقدا. هەروەها لەو شوێنانەدا کە سوپاو هێزەکانی عێراقی نزیکی ئەوان و یان ڕێگەی هاتووچۆی ئەوانی لەسەر بوو. ئێمە هیچ جۆرە چالاکییەکمان ئەنجام نەئەدا. لەبەرامبەر ئەم هاوکارییەدا دکتۆر عەبدولڕەحمانی قاسملو نامەیەکی سوپاسنامەی بۆ ناردبووم، ئەوە نامە تایبەتەکە بوو.

هەموو یاداشت و بیرەوەریەکانم نییە بەسەر یەکەوە، پچڕ پچڕەو پاش و پێشی تێدایە، ڕووداو باس هەیە ساڵێک پێشتر ڕوویداوە، بەڵام لەگەڵ ڕووداو باسێکی ساڵێک دواتردا تۆمار کراوە، لەگەڵ ئەم پاش و پێشەدا مێژووی ڕووداوەکان دروستە، واتە پاش و پێشەکە نەبۆتە هۆکاری هەڵەی مێژوویی مێژووی ڕووداوەکان.

دووەم: دیاریکردنی ساڵ ومانگم بۆ ئاسان بووە، بەڵام بۆمێژوو واچاکتر بوو کە ڕۆژیشیان لەگەڵ بوایە، وەک لەهەندێ شوێندا بەرچاوتان دەکەوێ کردوومە، کەم و کورتییەکانیش گوناهەکەی بەئەستۆی بارودۆخ و ڕۆژگارە.

سێیەم: لەخستنە ڕووی هەندێک ڕاستی و ڕووداودا، بەکورتی لێی هاتوومەتە دەرەوە، چونکە درێژەدان بەڕووداو قەوماو ڕازو نیازو هاتووچۆو بگرەو بەردەی دەیان ساڵ خەبات و تێکۆشان، وەک ئەوەی من تێدا بەشدارو دیومەو بەسەرمادا هاتووە، بەچەندین بەرگ کتێب تەواو نابێت، خۆی دەبوو وابێت بەدوورو درێژی و بەوردەکاری ئەم بیرەوەریانەم بنووسمەوە، بەڵام لەبەر دووهۆکار یەکەم پەلەم بوو زووبێتە بەرهەم، دووەم لەڕووی مادییەوە تێچوی زیاتر ئەبوو، هەروەها لەگێڕانەوەو تۆمارکردنی هەندێک هەڵوێست و ڕاوبۆچوون و ڕووداو خۆم پاراستووە، چونکە هەندێکیان کاتیان نەهاتووەو هەندێکیان ئەبنەهۆی درووست بوونی کێشەو گرفت بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و عەشیرەییەکان.

چوارەم: ئەگەر بەشان و باڵی کەسێکدا هەڵم دابێت، ئەوە ڕاستی دڵی خۆمم وتووە، هیچ نیازێکی ئێستەو ئەوساشی لەپشتەوە نییە، واتە بەبۆچوونی خۆم، کالام بەقەد باڵا بڕیووە.

پێنجەم: لەزۆربەی ڕووداوەکاندا هەوڵمداوە هەرباس لەو گۆشەیە بکەم، کەخۆم تێدا بووم و قسەم لەسەر کردووە، نەک ئەوەی بەشێوەی پانۆراما ڕووداوەکان بەگشتی بەرجەستە بکەم، بەمەبەستی ئەوەی، کەخاوەنی قسەی خۆم بم و نەچمە قاڵبی هەموو کەسایەتییەکانی نێو ڕووداوەکانەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا وردودرشتی ڕووداو و بەسەرهات و کارو چالاکیەکانم نەنوسیوەتەوە، ئەوانەی نەم نوسیوون بەشێکیانم لەیاد نەماوە بەشێکیانم بەپێویست نەزانیووە، وەک: لێرەوە ڕۆیشتین و لەوێوە هاتین یان کەمینمان

داناو دووسەربازی تێکەوتن، فلان جاشمان چەککردو فلانمان ڕاونا.......
هەروەها دووبارە بوونەوەی گەشتەکان لەئاوایییەکان و ناوچەکان......تا دوایی.
مەبەست لە وشەی (جاش) بۆ ئەو کوردە چەکدارانە بەکاردێت، کەچەکو پارەیان لە حکومەت وەرگرتووە، یان چەکو پارەیان لەو حکومەت و وولاتانە وەرگرتووە، کەکوردیان بەسەردا دابەشکراوە، یان چەکیان وەرگرتووەو لەو سوپاو هێزانەی هەر وولاتێکی بێگانە بەشداریان کردووە، کە هاتوونە سەر کوردستان و شەڕیان دژی گەلی کوردو شۆڕشەکانی کردووە. بەکارهێنان یان مانای وشەکەش، بۆ بەچکەی گوێدرێژ بەکاردێت یان (بەچکە کەر)، جاشولکەشی پێدەوترێت.
شەشەم: گرنگە لەکۆی نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی گشت لایەکماندا، جگە لەوەی ڕابردوو زیندوو دەکەینەوە، ئەوەشی تێدایە، بۆداهاتوو کەمتر پەنا ئەبەین بۆ کلتورو مێژوو و گێڕانەوەی زارەکی، بەهەموومانەوە ئەرشیفێک لە قوناغی خەباتی شۆڕشگێڕی بۆ گەلەکەمان و نەوەی ئێستا دروست دەکەین، بۆ ئەوەی نەوە لەدوای نەوە بزانن، پێشمەرگایەتی و خەباتی شاخ، تەلاشی ناوشارو ناوزیندان و ئاوایییەکان چۆن بووەو چۆن کراوە؟ ئەم ئەزموونەی دوای ١٩٩١ چۆن و بەچی هاتوەتە دەست؟
حەوتەم: لەسنوری شارەزوورو هەورامان و هەڵەبجەدا، ئەوەندەی من ئاگادارم، هەڤالانی تێکۆشەر کاکە حەمەی فەرەج، کاکەحەمەی حاجی مەحمود، کاک شێخ عەلی، کاک حەمە هاواری، کاک خەلیل سەرکانی و مامۆستا پشکۆ بیرەوەرییەکانی خۆیان نووسیوەتەوە، دەست خۆشیان لێدەکەم، هەرچۆن هەن گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە چەند مەڵۆیەکیان خستۆتە سەر خەرمانی تێکۆشانی نەتەوەکەمان، گۆشەیەکیان ڕووناک کردوەتەوە، هیوادارم تێکۆشەرانی دیکەشمان بەهەمان کار هەستن، چونکە هەموو نووسینەکان قسەی خۆیان پێیەو لەکتێبخانەی کوردیدا دەمێننەوەو بەشێک لەبەسەرهات و ڕووداوەکان بۆ هەتاهەتایە بەزیندوویی دەمێننەوە، واتە ئەگەر ئەو نووسینانە نەبن ئەوا تێکۆشان و ڕووداو بەسەرهاتەکانی نەتەوەکەمان پاش سالانێک لە بیردەچنەوەو ڕاستییەکان دەبنە ڕازی گوێ ئاگردان، واتە لەڕاستییەوە دەبنە حیکایەت و داستان، چونکە هەرئەم بیرەوەریانەشن دەبن بەزادەی نووسینەوەی مێژووی ڕوداوەکان. بەتایبەتیش ناوەندە ئەکادیمیەکان

بۆ هەڵسەنگاندنی قۆناغ و راستبینی، ڕووداوکان کەرەستەیەکی باشی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەن. بەڵی هەرچەندە لەخوێندنەوەی بیرەوەرییەکانی ئەم هەڤالانمدا کەناوم هێناون، بەوەگەشتم هەندێک رەخنە هەڵدەگرن، ئەمەوێت وەک پاشکۆ لەم کتێبەدا ئاورێک لەبەشێکیان بدەمەوە زۆر بەکورتی بۆ هەریەکەو چەند نمونە.

هەشتەم: خوێنەری ئازیز لەزۆر شوێنی ئەم بیرەوەریانەدا، هەست دەکەی ڕیزبەندی کاتی، تەسەلسولی زەمەنی، وون بووە، ئەوە هۆکارەکەی نەبوونی تۆماری ڕۆژانە یان ڕۆژمێری تۆمارکراو بووە وەک لەخاڵێک پێشتر ئاماژەم بۆکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەست دەکەی کاری پێشمەرگانەو سەربازی، شەڕو قەوماو بگرەو بەردە زیاتر زاڵە، تالایەنە سیاسی و کۆمەلایەتیەکە، لەم بیرەوەریانەدا، ئەمیش هۆکارەکەی ئەوەیە، لەژیانی پێشمەرگایەتیمدا لەسەرەتاوە تا ساڵی ١٩٩٨ زیاتر کارم، کاری پێشمەرگانە (سەربازی) بووە.

نۆهەم: بابەتەکانی دەنگی خاک بەرگی یەک بیرەوەری ویاداشتەکانمە ساڵی ١٩٧٦-١٩٩١ بەپچڕ پچڕی لەشۆڕشی نوێ دا، لەگەڵ گوزەرێکی زۆر کورت و سەرپێی و خێرا سەبارەت بەبارودۆخی سیاسی و سەربازی و کۆمەلایەتی ناوچەی هەورامان لە شۆڕشی ئەیلولدا. ئەگەر تەمەن باقی بوو بەرگەکانی تری دەنگی خاک کەبابەتەکانی یاداشت و بیرەوەرییەکانمە لەساڵی ١٩٩١-٢٠٠٠ لەداهاتوودا پێشکەشتان ئەکرێت.

دەهەم؛ سەبارەت بەناوی کتێبەکەش دەنگی خاک، ئەوەیە دوژمنانی کوردو ناوچەکە، خاکی ئەم نیشتمانەیان ونجڕونجڕ کردوە، پارچەپارچە لەیەکیان دابڕاندوەو داگیریان کردووە، خاکەکەی و دارو بەردو پوشوپەلاشی بەڕەنگی سوری خوێن ڕەنگین کراوە، پڕکراوە لەگۆڕی بەکۆمەڵ و مین، تەخت و تاراجی زێدی باوباپیرانمانیان لەسەری دەرهێناوە، کانیاو سەرچاوەکانیان شوێن بزرو وشک و پڕکردەوە، مرۆڤەکانی سەری قڕکران بەئەنفال و کیمیاوی و کۆچ پێکردن. هێنانی کۆمەڵە مرۆڤی بێگانەو نامۆ بۆسەر ئەمخاکە، هەوڵی تێکدان و شێواندن و سڕینەوەی کلتوورو فەرهەنگی سەر ئەم خاکەیانداوە، دارو دەون و بێشەو لێرەوارەکانیان گرتێبەردا، هاواری ئەم خاکە لەتاو قرچەقرچ و بڵێسەی ئاگری داربەڕو و دارەبەنەکانی لێرەوارەکانی

سەرئەم خاکە، ئەگاتە کەشکەلانی فەلەک. نووسەری بەناوبانگ یەشار کەمال دەڵێت، خاک دەنگی هەیە بەلام گوێیەکم ئەوێت ئەودەنگە ببیستێت.
یازدەهەم: ئەم چاپە، چاپی دووەمی بەرگی یەکەم ، بەکەمێک دەستکاری و ڕاستکردنەوەی هەندێک هەڵەو زیاد پێکردنی پرۆفایلی خۆمەوە بووەتە ٨٦٢ لاپەڕە.

## پێشمەرگە و حیزب

لەماوەی ٣٧ ساڵی خەباتی پێشمەرگایەتیمدا بەبێ دابڕان، لەناو شۆڕش و حیزبایەتیدا، زۆر شتم بینیوەو بیستووەو هاتوونە ڕێگام و لەگەڵیاندا بەرەو ڕوو بووم، کە سەرەتا هەرگیز ئەمانەم بەبیردا نەهاتووە و بیریشم لێ نەکردونەتەوە، ڕەنگە ئەگەر پێشتر ئەو شتانەم بزانیایە نەمتوانیایە ببمە کەسێکی حیزبی. بەر لەوەی بچمە نێو بابەتەکە ئەمەوێت بڵێم:

ئاساییە لەناو شۆڕش و حیزبایەتیدا ڕەخنەو ڕەخنە لەخۆگرتن، ململانێ لەسەر ئەرکە حیزبییەکان و چالاکییەکانی شۆڕش بۆ پێشکەوتن و گەشەکردن، گلەیی و گازندەش لەیەکتر هەر ئاساییە لەسەرەوە بۆ خوارەوە یان بە پێچەوانەوە، یان لەنێوخۆی ڕێبەرایەتیدا بەرامبەر بە یەکتر، یان لەناو شانە و پۆل وکەرتە حیزبییەکان و لەناو یەکە سەربازی و پێشمەرگایەتیەکاندا، ڕیزبەندی زۆرینەو کەمینە لەسەر بیرو بۆچوون و ڕای جیاواز هەر تەندروستە.

بەڵێ زۆر دیاردە هەن لەسەرەتاوە نین، دواترو بەتێپەڕ بوونی وەخت و درێژە کێشانی شۆڕشەکان و گەشەکردن و فراوان بوونیان، ئەودیاردانە دروست ئەبن و دێنە ڕێگەت و ئەیانبینی و لەگەڵیان بەرەو ڕوو ئەبیتەوە، خراپترینی ئەوانە: براکوژی و شەڕی ناوخۆ، دەستەو دەستەگەری و دروستبوونی ڕیزبەندی، پاشقول گرتن لە یەکتر، زەم و زەم کاری و سوککردن و شکاندنی یەکتر، تۆمەت هەڵبەستنی بێبنەما، نوسینی ڕاپۆرتی درۆ بۆ سەروی خۆت لەسەر بەرپرسەکەت یان هاوڕێکەت، لەقبوونی بیروباوەڕو ورەبەردان، بێوەفایی و نادڵسۆزی، بێ هەڵوێستی، ئەمبەرو

ئەوبەرکردن بۆچەندین جار، دزی و گەندەڵی، تا ئەگاتە خیانەتکردن بەجۆرێک، زۆر جار رێک کەوتووە هاورێ و هاوسەنگەرێکمان لە پڕ دیار نەئەما، وەختێکمان ئەزانی چۆتە بەرەی دوژمن و بەوچەکەوە کەرۆژی پێشتر لەسەنگەردا دژی دوژمن بەکاری ئەهێنا، ئیمرۆ کەوتوەتە پێش هەمان دوژمن و لوولەکەی ڕوو کردوەتە سەر سنگی ئێمە، هەڤاڵەکانی دوێنێ.

شتێک کەزۆر نامۆو دورە لەیاساو رێسای شۆڕش و پێشمەرگایەتییەوە، کەمن بۆخۆم قەد ڕۆژێک لەرۆژان ئەمەم بەبیردا نەهاتووە، ئەویش ئەوەیە لەکاتی بەرگری و خەباتدا، پێشمەرگەیەک خۆفرۆشێکی بەسزای گەل گەیاندبێ لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشەکە، کەسوکاری خۆفرۆشەکە خوێنی خۆفرۆشەکەیان لە پێشمەرگەکە وەرگرنەوە، ئەویش لەرێگەی دادگای شۆڕشەکەوە، هەر بەڕاست ئەرێ ئەم پێشمەرگەیە ئەگەر هەر لەسەرەتاوە ئەمەی بەبیردا هاتبا یان بەخەویش بیزانیایە پێشمەرگایەتی ئەکرد؟ بێگومان نەخێر.

عەشیرەت و عەشیرەت بازی، بنەماڵەو بنەماڵەچێتی، ناوچەگەرێتی، ئەمانەش هەموو لەناوخۆی خۆیاندا لەگەڵ یەکتر ململانێیان هەیە لە وڵاتی ئێمەدا، من هەرزوو وەک گەنجێک لەناو شۆڕشی نوێدا دەرکم بەم شتانە کرد، زانیم پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردەواری وایە. هەرزوو بۆم دەرکەوت سیاسەت کردن لەناو کۆمەڵی وادا زۆر سەخت و دژوارە، سیاسیەکان دەبێ ووریابن زۆرجار نزیکبوونەوە و دۆستایەتی لەگەڵ لایەک ناڕاستەوخۆ لاکەی تر ئەکەیتە نەیاری ئەو حیزبەی کاری تێدا ئەکەی، ئێمە وەک یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەم بارەوە زۆر زەرەرمەند بووین. هەرچەندە من وەک خۆم هەمیشە هەوڵمداوە دووربم لەتێکەڵ بوون بەو ناکۆکیانەی نێوان لا ناکۆکەکانەوە، یان هەرلایەو حەقی خۆی بەمێ لەگەڵ لایەک نەبم بەگەرم و گوڕی و لەگەڵ لاکەیتر بەساردو سڕی. مەبەست لە لا، لایەنی کۆمەڵایەتیە، نەک سیاسی.

ئەو خۆشەویستی و دڵپاکییەی سەرەتا لە نێوان ئەندامانی حیزب و پێشمەرگەکان لە خەباتی پێشمەرگایەتیدا بووە، لەناو خودی خێزاندا نەبووە، جێگەی سەرسوڕمانە زۆرجار ئەمە گۆڕاوە بۆ دوژمنایەتی و ڕق و کینە، ئەو یەکسانی و دادپەروەرییە لەسەرەتاوە لەناو پارتیزانەکانی شۆڕشی نوێدا من

دیومە، بەجۆرێک بووە بۆنمونە: ڕێککەوتووە قومێک ئاو لە مەتارەکەمدا ماوە خۆم تینووم بووە دڵم نەهاتووە بیخۆمەوە وەرم گرتووە بۆ مەبادا، کەچی دوایی داومە بەهاوڕێکەم نەک ئەو لەمن تینووتر بێت. کاتێک لەڕادیۆوە هەواڵی شەهیدبوونی هاوسەنگەرێکی خۆمانمان گوێ لێ ئەبوو، ئەولە کەندیناوا یان لەباڵەکایەتی، ئێمە لەهەورامان پەژارە ئەیگرتین و لەدڵا ماتەمینیمان بۆ ئەگرت. سوێندمان بەسەری یەک ئەخوارد، شانازیمان ئەکرد بەوانەوە زیاتر ماندوو ئەبوون زیاتر لەخۆبردو گیانفیداییان ئەکرد.

دواتر کوشندەترین دەرد دێت و جێگەی ئەمە ئەگرێتەوە، دەستەو دەستەگەری، لەکوردستاندا هەموو شەقبوونەکان و جیابوونەوەکان ئەمە هۆکارە سەرەکیەکەی بووە، لەدەستەو دەستەگەریدا بێکەڵکترینی کەسی لاکەی لای خۆت بەباشتر دەزانی لەباشترین کەسی دەستەکەی بەرامبەرت، ئەمە ئەگەر لەسەر جیاوازی بیرو بۆچوون بێت ڕەنگە تاڕادەیەک ئاسایی بێت، بەڵام ئەوەی من بینیومەو هەیە لەڕابردو و ئێستاشدا زیاتر لەسەر پلەو پۆست و بەرژەوەندی هاوبەشی دەستەکان بووەو هەیە.

بێ هەڵوێستی وموزایەدەم بەجۆرێک دیوە، لەکۆبونەوەیەکدا لەسەر شەڕێک بیکەین یان نەیکەین و خۆمانی لێ لادەین، ئەوەی هەوڵیدا شەڕەکە نەکەین، چونکە ڕای وابوو بێسوودەو سەرکەوتنیش لەو جۆرە شەڕانەدا هەر دۆڕاندنە، لەشەڕەکەدا شەهید بوو، ئەوانەی لایەنگری شەڕکردنەکە بوون، لەسەرەتای شەڕەکەوە هەڵهاتن و بەجێیان هێشتین و لێشیان تەسلیم بەدوژمن بووەوە

باوەڕ ناکەم خوێنەرانی بەڕێز جێگەی بڕوابێت، کە پێتان بڵێم، بینیومە لەشەڕدا دەستەیەک پێشمەرگە چەند چەکدارێکی دوژمنیان دیل گرتووە، لەدوای شەڕەکە فەرماندەیەک هەر لەهێزەکەی خۆمان هاتوەو داوای کردووە ئەو دیلانەم بدەنێ ئەوە سەر بە عەشیرەتی منن نابێ لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکرێت! بەڵێ چونکە ئەو فەرماندە پەروەردە نەکراوە، بە ناموستەحەقی پلەی پێدراوە، حەقی تێکۆشەرێکی تری خواردووە

زۆر لە شۆڕشگێڕەکان کاتێک بەشداریان لەشۆڕشەکاندا کردووە خاوەنی سەروەت و سامان و پارەو ماڵ و موڵک بوون، لەپێناو بیروباوەڕو شۆڕشەکاندا سەرئەنجام هەموویان لەدەستداوە دواجار بەدەستی بەتاڵ لێی

دەرچوون، من بۆخۆم لەو توێژەم هێشتا بەدەستی بەتاڵیش لێی دەرناچم، ئەڵێم سا بەڵکو ئەم دۆخە بگۆڕێ و باشتر ببێت، بەپێچەوانەوە هەندێکی تر خاوەنی هیچ نەبوون، بەدەستی بەتاڵ هاتوونە ناو جووڵانەوەکە سەرئەنجام بوونەتە خاوەن سامان و دارایی زۆر!

لەناو پێشمەرگە و شۆڕشدا قسەیەک هەیە زۆر جار گوێت لێی ئەبێ (کێ کردی و کێ خواردی) ؟ هەرچەندە نیشتمانپەروەریێتی ئەرکی تاکەکانی هەر نەتەوەیەکە و منەتکردن بەسەر کەسدا ناکرێت، بەڵام لای ئێمە ئەو ڕستەی نێو کەوانەکە ڕاستە.

زۆر قارەمان و کەڵەپیاو و کوڕی تەنگانەم بینیووە، لە دروستکردن و گەشەپێدان و پێگەیاندنی شۆڕشەکاندا دەورو ڕۆڵیان هەبوو، لەبەرگریکردنی گەل و وڵاتدا دریغیان نەکردووە، ئێستا سەربازی وونن و کەسوکارو ماڵ ومناڵیان بێنازو لەبەرهەمی خەبات و خوێنی خۆشەویستەکانیان بێبەشن!

زۆرن ئەوانەی لەڕۆژە سەختەکاندا لەپێشەوە بوون و ئێستا کەس لەم بەرپرس و وەزیرو کزیرەی، کە دڵۆپێک عارەقەیان بۆ کورد نەڕشتووە دەرگایان لێناکەنەوە. زۆریشمان بینی خائین و کوێر بوون، تا سەدامیان نەبینی بەچاوی خۆیان لەسێدارەدرا هەر بەتەمای دوو چاوی ساخ بوون، کەچی ئێستا لەبەرهەمی خەبات و ماندوبوون و خوێنی شۆڕشگێڕە ڕاستەقینەکان، لەتەڕ ئەخۆن و لە ووشک ئەخەون!

بەهەرحاڵ لەوانەیە ئەمانە زۆر بریندارکەر نەبێت، بەڵکو ئەوە بریندارکەری هەست و شعوری کەسوکاری شەهیدەکان و پێشمەرگەو تێکۆشەرە دێرینەکانە کە: چەند کەس بەناو لە بەرپرسە باڵاکانی شۆڕشەکان لایەنگری لەو خائین گەلە ئەکەن، وەلەسەر مێزی پڕ لە شەرمەزاریان مەست ئەبن و ئەبن بەشەریکە توجاریان، شەرمیشیان نامێنێ...لەبەرامبەر ئەوخوێنەی ئەمانی پێگەیاند! زۆرجار بەشانازیشەوە ئەڵێن ئێمە تێکەڵی خانەوادەیمان هەیە، کام خانەوادە؟ خانەوادەیەکی ڕوو هەڵماڵراو خیانەتکار بە کورد، ئەمە بۆ گیرفان پڕکردن و خۆدەوڵەمەند کردن بەناشەرعی بەبێ شەرم کردن لە هیچ شتێک، ئەمانە بەئاگا یان بێئاگا گەورەترین سەرمایەی ژیانیان کە خەبات و هەڵوێستی کوردانەی دەورانی ڕابردویانە، ئەگۆڕنەوە بە

پووچترین شت ئەویش سەروەت و سامانە، دەوڵەمەندی و خۆشبەختی پارەو پوول و ماڵ و موڵک نییە!

ئاسوودەیی ویژدان و پاکی ناخ و خزمەتی گەل و وڵاتە، ڕێزو حورمەت بۆ خەڵک و خاکییەتی و خۆ بەزل نەزانینە، ئەمانە بۆ دنیاو بۆ پاشەڕۆژیش ئەبنە مایەی ناوی باش. جوان فەرموویەتی حاجی: مردن و ژین مسلی سێبەر و تاوە.........ئەوەی باقی بمێنێ هەرناوە.

بەداخەوە لەکوردستاندا لەدوای ڕاپەرینی بەهاری ١٩٩١وە بەهۆی شەڕی ناوخۆوە وەبەهۆی کێبرکێ و ململانێی حیزبایەتییەوە، بۆ ڕاکێشانی زۆرترین لایەنگرو بۆکۆکردنەوەی زۆرترین دەنگ، جیاوازی نەما لەنێوان باش و خراپ، لەنێوان نیشتمان پەروەرو نیشتمان فرۆش، لەنێوان جاش و پێشمەرگە، لەنێوان گەشمەردە[1]و کوژراودا.....تاد.

ئەو جۆرە خەباتگێرانەی سەردەمی خەباتی شاخ و گۆڕاو بەگەندەڵکاری فاسدی خەباتی شارو ئیدارە، بۆ ماوەیەک بوون بە هۆکاری سوک وسەلیم کردنی ناوی پیرۆزی پێشمەرگەو حیزب! هەرئەمەش بوو بەبیانوو تالەلایەن هەندێک بەناو گۆڕانخواز و ڕەهەندی و بەناو ڕۆشنبیر و جۆرە کەسانێکەوە، کەئێرەیان ئەبرد بە دەورانی مێژوویی زێڕینی حیزب و پێشمەرگە، چونکە خۆیان خاڵی و بێبەش بوون لەودەورانە پرسەروەری و کەرامەتبارە، لە ڕاگەیاندنەکانەوە وایان کردبوو بە ناوی پێشمەرگە، ئەوەبوو کەس لەڕووی نەئەهات بڵێت من پێشمەرگەم، یان کادری حیزبی شەرم بکات بڵێت من حیزبیم، بەڵێ ئەوانە وایان کردبوو لەم دوو ناوە پێشمەرگە و حیزب! خۆ ئەگەر شەڕی داعش و مەترسی لەسەر کوردستان و تاکەکانی گەل نەبوایە، ئێستا ئەو دوو ناوە ناشیرین ترین ناوبوون.

ڕق وقین و هاتووهاوارو چاوپێکەوتنەکانی دوژمنکارانەی هەندێک کەس و لایەن، کە دەردەبران و ڕادەگەیەنران، لەلایەن هەندێک ڕاگەیاندکاری نابەرپرس و چەواشەکارەوە وەک ئەوەی هەنگوینیان لە کلۆری داردا دۆزیبێتەوە، تاماوەیەکیش ئەو هاتووهاوارە لەناو دڵ و دەروون و مێشکی

---

[1]. بە شێوە زمانی هەورامی شەهید ئەبێتە گەشمەردە.

هاووڵاتیاندا بەچەواشەکاری، لەناو هزروهۆشی نەوەی تازەپێگەشتودا وەک پێدانی ڕاستی و ئاشکراکردنی نهێنیەک وەردەگیرا.

بێشەرمانە ئەیانووت پێشمەرگە میلیشیایە، ڕێگرو چەتەن، بەکرێگیراوی ئێران و تورکیان. ئەیانووت پێشمەرگە نەبوایە بەعس کوردستانی وێران نەئەکرد، یان ئەیانووت خەتای پێشمەرگە بووە ڕژێمی سەدام کوردستانی کیمیاوی باران کردووە......هەتا دوایی، بەڵام خۆشبەختانە نەک بۆ ئەو سەرلێشواوانە، بەڵکو بۆ دونیا دەرکەوت، وەک ئێرانییەکان دەڵێن: اگر سپاه نبود کشور هم نبود، ئەمەش ڕاستە ئێمە بڵێین: ئەگەر پێشمەرگە نەبوایە...کوردستانیش نەئەبوو.

شتێکی تری سەر سووڕهێنەر لەلای من ئەمەیە، نەزانی داوای چی دەکەی؟ تائێستاش ڕوون نیە کورد داوای چی لەداگیرکەرانی وڵاتەکەی ئەکات؟ لامەرکەزی، فدراڵی، کۆنفدراڵی، یان سەربەخۆیی؟ ئەوەی ئاشکرایە جارجار لێرەولەوێ لەسەردەم و کاتی جیاجیادا یەکێک لەم ووشانە بۆتە دروشمی لایەک لەلاکان، هەندێک جاریش بەیەکتریان فرۆشتۆتەوە، زۆرجاریش لەسەر ئەم داوا، گاڵتەو ڕەخنەی تەنز ئامێزیان لەیەکترگرتووە.

لەکۆتاییدا ئەتوانم بڵێم لەماوەی ٣٧ساڵی ژیانی سیاسی و پێشمەرگایەتیمدا شک نابەم تەنیا بۆ یەکجاریش دڵی کەسم لەسەر ناحەق ڕەنجاندبێ، زوڵمم لە کەس کردبێ، ڕاپۆرتم لەسەرهەڤاڵێکم یان بەرپرسێکم نوسیبێ بۆ هەڤاڵ مام جەلال، بۆ کاک نەوشیروان، بۆ مەکتەبی سیاسی یان هەرکەس و ئۆرگانێکیتر، دڵنیام هەموو ئەرشیفی ئۆرگانەکانی یەکێتیی ڕاپۆرت تەقریری منیان لەسەر کەسی ئەم حیزبە بەشەخسی تێدا نییە، ئەگەر ڕاوسەرنج و ڕەخنەو گلەییەکم لەسەر هەڤاڵەکانم یان بەرپرسەکانم هەبووبێ ڕاستەوخۆ و ڕووبەڕوو قسەی خۆمم کردووە.

هەڤاڵەکانم خۆشویستووە و خۆشم ئەوێن، خیانەتم نە لە نیشتمان و نەلە حیزبەکەم و نە لەخەڵک نەکردووە، ، هاورێ ودۆستی مەدەنی و جیا لەسیاسەت و حیزبیم هەیە جگە لەوەی نەیهێشتووە خۆم کەموکورتیم هەبێت، یارمەتی و هاوکاری ئەو هاوڵاتیە کەمدەرامەت و نەخۆش و هاوسەنگەر و پرۆژە خێرخوازیانەشی بۆکردوم، کە هاتون داوای هاوکاریان لە من کردوە تاوەک یەکێتي نیشتیمانی کوردستان هاوکاریان بکەم .

ژیان و گوزەرانی سادەو سەربەرزانەم کردووە، تائەم کاتەش ناوم لەم حکومەتی هەرێمەدا نییە، خانەنشینی پێشمەرگایەتیش، کەحەقی ژیانی ماڵومناڵمە نەمکردووە، من ئێستاش بەتەمای جێبەجێ کردنی سزاو پاداشم، بەتەمای لێپرسینەوەو راستکردنەوەی چەوتییەکانم بەتەمای ئەو رۆژەم دادپەروەری و یەکسانی پیادە بکرێت و خەباتیشی بۆ دەکەم، رەنگە هەبن من و ئەوکەسانەی کە وەک من بیر دەکەنەوە بەدەست وپێ سپی بێدەستەڵات بزانن، ئێمەش ئەوانە بەداماو هەڵەو نەزان یان خائین بەگەلی خۆیان ئەزانین.

قەلەق نەبوون و بێترسی، نەبوونی دڵەڕاوکێ، شەرمەزارنەبوون، ئاسوودەیی، سەری بەرزو ڕووی سوور، زۆر سەنگین ترو بەنرختر و بەلەزەترە لەماڵی دونیا، بەداخەوە بۆ ئەوانەی لەم تام و چێژە خۆیان بێبەش کرد!



# زێد و بنەماڵەکەم:

ناوم محەمەد سەعید عەلییە، ناســـراوم بــە حــەمەی حەمەسەعید ســـالی١٩٦٢ لەئـــاوایی دۆڵبیـــان لەدایکبووم. دۆڵبیان ئاواییـــەکی چوار ماڵەی ناوچەی هەورامانەو دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی پـارێزگـای هەڵەبجەو لە نێوان ئاواییەکانی سۆســەکان و پالانیا لەسەر سنوری ئێران-عێراق.

ئاواییەکە بەر لەڕاگواستنی لەسالی ١٩٧٩دا چوار ماڵ بوو. چوارماڵەکە هەریەک خێزان بووین، بەلام خێزانێکی گەورەو بەختەوەر، ماڵی باپیرم و سێ کوڕی. پێشتر ماڵی باپیرم لە تەوێڵە بووە، لەساڵەکانی نزیک بە ١٩٤٠ باپیرم لە تەوێڵەوە کۆچی کردووە بۆ ئەم شوێنە دۆڵبیان[1] و ئاوەدانی کردەوەتەوە، ئەودەم ئاواییەکە بڕکە ماڵێک بوون بە داوێنی خۆرەتاوێکەوە بەردەم ماڵەکان باخ وباخاتێکی سەر سەوزو خوڕەم بوو، خانوەکان چەند نهۆم و بە دار و بەرد و قوڕ دروست کرابوون. لەناو جەنگەڵی داربەڕو دار قەزوانەکاندا شاردرابوونەوە. خانوەکەی باپیرم لەخوارەوە پێکهاتبوو لەڕیزە گەلەخانێکی مەڕو بزن و چەندین گەوڕی قاترگەل و گاجووت، کارگەی هەلاجی و هەنگەلان، لەقاتی سەریشەوە ماڵی مام عەبدلقادر، لەپشتی ئەمانەوە دەستەچەپ ماڵی ئێمەو دەستی ڕاستیش ماڵی مامە حەمەڕەشید بوو. وولاخ و گەلە و ئاژەڵ دابەش نەکرابوو هەمووی پێکەوەبوو. پشتی ماڵەکان زەوی دێمەکار و ئەکرا بە گەنم و جۆ و نیسک و نۆک و گلێنە، کێلانی بەگاجووت بوو، دوای درەوکردن کێشە ئەکرا بۆسەر خەرمان و بە قاترگەل گێرە ئەکراو ئەکوترا. گاجووت و قاترەکانیش هەرهی خۆمان بوون،

---

[1] لەوە ئەچێت ناوی دۆڵبیان، لە دۆڵی بیانەوە هاتبێت، چونکە ئەودۆڵەی دەستەچەپی ئاواییەکە داربی زۆری لێبوو.

ئەو سەردەمە ئیشکردن لەناو خێزانەکەماندا دابەشبوبوو. باپیرم خەریکی هەلاجی و مام حاجی عەبدولقادر خەریکی باخداری و مامم حەمە ڕەشید خەریکی کاروانکردن بوو. واتە بردنی میوەی تەڕ و وشک و ئاڵوگۆڕ پێکردنی بە گەنم و جۆ لە هەورامانەوە بۆ گەرمیان. باوکیشم حەمەسەعید شوانی بۆ خێزانەکەمان دەکرد. ئەمەش وایکردبوو خێزانێکی تاڕادەیەک بەختەوەربین و جارجارەش کێشە و دەمەقاڵە هەبێ لەسەر باری کاری قورس و دابینکردنی بژێوی ژیان.

باپیرم پیاوێکی قورئان خوێن و خوداپەرەست و دۆستی زانایانی ئایینی و شێخانی تەریقەت بوو، لەشەڕ و ململانێ عەشایەرییەکانی ئەو سەردەمەشدا تفەنگچییەتی بۆ سان و سوڵتانەکانی خۆمانی کردوە. لەکاری خزمەتگوزاری و هاوکاری هەژاران و ئاوەدان کردنەوەشدا جێگە دەستی بەپێی توانای ئەو سەردەمە دیاربوو، بۆنمونە: بەر لە دروستکردنی بەنداوی دەربەندیخان و هاتنی ڕێگای ئوتومبێل، ڕێگای وڵاخەڕێی هەورامان- هەڵەبجە- شارەزوور بەرەو گەرمیان و خانەقین، لەدەربەندا بەڕۆخی ئاوی سیرواندا گوزەری کردوە و بەپلەی دەربەندیخان بەناوبانگ بووە. دیارە لەبەرسەختی و تەسکی ئەوشوێنە وولاخ نەیتوانیووە بەبارەوە پێیدا بڕوات، بۆیە کاروانچییەکان لەم دیو و ئەودیوی پلەکەوە بارەکانیان بەکۆڵ گواستوەتەوە و دووبارە باریان کردوەتەوە.

باپیرم بۆ چاک کردنی ئەو ڕێگە لە هەورامانەوە بۆ گەرمیان و خانەقین، پێنج کرێکاری بەکرێ گرتوە و لەگەڵ خۆی بە پیک و نوێڵ و قولنگەوە بردونی و بۆماوەی یەک هەفتە کاری پێکردون و کرێی پێداون، تا پلەکان فراوان بکەن. لە لەلاپەڕەکانی ٤٧٢-٤٧٤ی کتێبی هەڵەبجەو تیشکێک لەسەر بنەماڵەکانی لە نووسین و کۆکردنەوەی، سەیفەدین سید محەمەد و عەبدولقادری شایی، بابەتێک بەناونیشانی بنەماڵەی حاجی علی محەمەد[1] بەوردی لەسەر ئەم خێزان و بنەماڵەی ئێمە نووسراوە.

---

١ باپیرم حاجی عەلی محەمەد پیاوێکی باڵا مام ناوەندی ڕیش سپی گەنم ڕەنگ بوو، ڕیشێکی کورتی بەردابوەوە، نەنکم فاتیمە خان ژنێکی باڵا بەرزی لەشولار باریکی گەنم ڕەنگی گەرج وگۆڵ بوو، لەم دوایەی تەمەنیدا کوێر بووبوو.

کورتەی یادەوەرییەکانی خۆم لەوکاتەوە کە نەوجەوان بووم، دێنەوە یادم بەتێکەڵ و پێکەڵی بەم شێوەیە بووە: زۆرترین کات ماڵەکەمان قەرەباڵغ و جەنجاڵ بوو، جگە لەخزمانی خۆمان و دەرو دراوسێ زۆر خەڵکیش بۆ هێنان و بردنەوەی کەرەستەی هەلاجی هاتوو چۆیان دەکردین. لەبەرئەوەی لەسەرەڕێگەی کاروانچییەکانی نێوان ئێران و عێراق و ئاوایيەکانی ناوچەکەو شارەدێی تەوێڵەدا بووین، ئەمە وایکردبوو بەردەوام میوانمان هەبێت و قەرەباڵغییەکی تارادەیەک بێسەروبەر دروست ببێت. لەسەردەمی شۆڕشیشدا ناوەناوە پەل و دەستە و گروپ گروپ پێشمەرگە ئەهاتن و ئەچوون و لایان ئەدا، یان هەر بەتايبەت ئەهاتن بۆ نانخواردن. هەندێک جاریش لەسەر درەنگ ئامادەبوونی نان و چێشت و بردنی لێفە و بەتانی و بێگاری و بردنی دار بۆ سووتاندنی ناو بارەگاکان، کێشەو گرفت دروست ئەبوو، ئێمەش لەژێر پێیان و ئەو بگرە و بەردەو سمرسمرە دا ئەترساین و دەستمان ئەکرد بەگریان.

هەمیشە نەنکم و باپیرم رازیان (داستانیان) بۆ دەگێڕاینەوە، ئەوانەی لەدەورانی خۆیاندا بینیویانە، یان بەدەم باوباپیرانی خۆیانەوە سینە بە سینە وەریان گرتبوو، سەبارەت بەگرانی، وشکەساڵی، زستانانی سەخت و بێخوراکی، هاتنی پەتای تاعون و ئاوڵەو قڕکردنی بەکۆمەڵی خەڵکی و......تاد.

ئەیان ووت ئەم زەمانە زۆر خۆشە، جل و بەرگ، خواردن، دەواو دەرمان هەیە، ئەوساکە ئەم شتانە نەبوو، ئەیان ووت لەگرانی گەورەدا خەڵکی هەورامان ئەوەندە بەروویان خواردبوو، لەبەرتاڵیەکەی تاچەند ساڵ زاوزێ و منداڵ بوون نەبوو، ئەیان ووت لەساڵی هاتنی وەبای بەناو تاعونەکە گرانیش داکەوت، هەورامان توویان هەبوو بخۆن، خەڵک لەخوارەوە ئەهاتن بۆ هەورامان بۆ بەدەست هێنانی توو، ئەمردن لەکەناری ڕێگاکاندا تەرمەکانیان کەوتبوو کەس نەبوو بیان شارێتەوە جانەوەر ئەیخواردن.

# خوێندنگاو خوێندکاری

بەرلەوەی بچینە بەرخوێندن، لە ئاوییەکەمان دۆڵبیان باوە حاجی فێری قورئان خوێندنی ئەکردین، ساڵی١٩٦٨ لە ئاوایی سۆسەکان خوێندنگای شۆڕش کرایەوە، ئێمە هەموو ڕۆژێ لە دۆڵبیانەوە بۆ سۆسەکان، کە ٢کم دەبوو لەگەڵ قوتابییەکانی پالانیایی کە بۆ ئەوان ٤کم بوو هاتووچۆمان ئەکرد.

هاوڕێکانی پۆلی یەکەمی سەرەتایمان لە ئاوایی سۆسەکان ئەمانە بوون:

- ئادەم مەحمود لەساڵی ١٩٨٩ لە نوگرەسەلمان شەهیدکرا.
- قەیسەر حەمەرەشید لەساڵی ١٩٩٨ شەهیدکرا.
- هەریەک لە سەردار حەمەڕەشید، فەریح میرزا، حەمە حەمەیوسف، حەمەیوسف نەجمەدین، جەمال سەیدمحەمەد، بەرزان حەمەڕەشید، عەلی عوسمان، ڕەفعەت فەقێ محەمەد بوون.

لە دۆڵبیانیش من و عەباسی ئامۆزام بووین. عەباس لەساڵی١٩٨١ بوو بە پێشمەرگەو ساڵی ١٩٨٤ شەهیدکرا. لەئاوایی پالانیاش هەریەک لە مەحمود عەبدوڵلا- شەوکەت جەعفەر- جەبار قادر- ئیبراهیم ئەحمەد-حەمەکەریم مستەفا- کەمال حسێن، برای کاک دیاری حسێن ئەندامی ئێستای کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان، کە لە شەڕی عێراق-ئێراندا بێسەرو شوێن بوو، هاوپۆل بووین.

لەگەڕەکی کەلارای ئاوایی سۆسەکان، خانوویەکی حاجی عەبدوڵلا نەسروڵلا خوێندنگاکەمان بوو. لەخوارەوە دوو هۆدە و ڕاڕەوێک، لەسەرەوە دوو هۆدە و دالانێک بوو، لەدیوی دەرەوە دیواری نارێک و پێک، کە بە وشکەکەڵەک هەڵچنرابوو، دیوی ناوەوەش بە قوڕ سواخ درابوو، بنمیچەکەی داری لارو وێرو بەرزو نزم و دوکەڵ گرتوو بوو. تەختی یان کەفی خانووەکە خۆڵ بوو، لەبن مێزە ڕەق و تەقەکاندا لەژێرەوە لەڕێکی پێی هەر خوێندکارێک چاڵێک دروست بوو بوو بەهۆی جوڵەی پێکانەوە، بەزستان سارد و بەهاوین گەرم و ناخۆش بوو، یەکەم مامۆستاشمان ناوی شێرکۆ مەهدی عەزیز بوو.

دواتر خوێندنگایەکمان لەنێوان گەڕەکی ناوەڕاست و کەلارادا بۆ دروستکرا. لەپۆلی دووەم بەدواوە تا پۆلی پێنجەم مامۆستای ترمان هەبوون لەوانە لەیادم ماون مامۆستا مەلا کامیلی مەلا ئەمینی تەویڵەیی بوو، کە مامۆستایەکی زۆر بەرێز و خۆشەویست بوو. هەروەها مامۆستا هوشیار باباحاجی ئەویش هەر خەڵکی تەویڵە و هەمیشە دەم بەخەندە بوو. مامۆستا مەلا فەریدی مەلا ئەحمەدی سۆسەکانی، کەخۆی و بنەماڵەکەی جێگەی ڕێز و حورمەتی تایبەت بوون لەلای خەڵکی. هەرسێ مامۆستا حەمەمین ڕەئوف و موختار ئەول محەمەد و فازل هاواری سێ مامۆستای ترمان بوون. قەڵای سۆسەکان لەپشتی بینای خوێندنگەکەمانەوە بارەگای پێشمەرگەی لێ بوو، کەبەهۆیەوە ڕووداوێکی دڵتەزێن ڕوویدا. ئەویش ئەوە بوو، ئەوانەی ناو ئەم بارەگایە شتێکیان فڕێدابوو لەجۆری تەقینەوە، خوێندکارێکی هاوڕێی ئێمە بەناوی مەریوان ئەبوبەکر دەستکاری کردبوو وە پێدا تەقییەوەو کوشتی و شەهید بوو. ئەوە یەکەم جارم بوو ببینین خەڵک بکوژرێت، برایەکی تری مەریوان، کەئەویش هاوڕێمان بوو بەناوی شیروان لەشۆڕشی نوێدا بوو بە پێشمەرگەو ساڵی ١٩٩٦ لەشەڕی ناوخۆدا لەئاوایی سیساوای نزیک شارۆچکەی حەریر شەهید بوو.

لەدوای ئەوە لەخوێندنگا ئەهاتینەوە بۆ ماڵەوە ئیشیان پێ ئەکردین، بەزستانان ئیشی دەرکردنی ئاژەڵ و ئاودانی، ئالیک ڕۆکردن لەناو ئاخوڕی گەلەخانەکاندا. بەبەهاران ئیشی پاککردنەوەی ناوباخ و شوانی کاریلە و بەرخ گەل ئاڵف و گزرەو لۆ برین، لە بارگە (لاس) لۆکانی چیای کەمەرسپی. بەهاوینان ئاودانی باخەکان و کۆکردنەوەی توو و میوەی جۆراوجۆر. بەپایزانیشدا گوێز کۆکردنەوەو شکاندن و کردنی بەکاکڵە گوێز و بڕینی دار و کۆکردنەوەی بۆ وەرزی زستان، ئەمانە و ئیش و کاری تری جۆراو جۆری ماڵە جووتیار و ئاژەڵداری لادێ. بە زستانانیشدا شەوانە بۆ خۆمان و بۆ میوانیش لە باتی میوەو شەوچەرە، هەرشەوی یەکێک لەم شتانە دائەنراو ئەیاندایێ مێوژ، توو، قەزوان، هەنار، هەنجیری وشک، بەهێ، سنجەی، لەپۆرت و لەپارە[1]. بۆ بەرچایی بەیانیانیش هەربەیانییە و یەکێک لەم

[1] لەپۆرت لە هەنجیری زۆر گەیی و شلیقاو لە وەرزی پێگەیشتنی هەنجیر لە هاوینان دروست ئەکرێ. شێوەی دروستکردنەکەشی بەم جۆرەیە هەنجیرەکان لەسەر بەردی پان

بەرچاییەیان ئەداینێ ماست، کەرە، دۆشاوی توو، کەشکی خوساو، سۆڵەکە، کاکڵە گوێز، هەنگوین و ڕۆنی خۆمانە، هێلکە و شەوکە[1].

ئێمە ساڵی ١٩٧٤ ماڵمان چووە شارەدێی تەوێڵەو لەوێ لەخوێندنگەی هەورامان لەسەر پرۆسەی خوێندن بەردەوام بووین، بەڕێوەبەری خوێندنگاکەمان ئەحمەد حاجی عەلی پیاوێکی بالابەرزی خوێن گەرم و خۆشەویست بوو. مامۆستا عوسمان هەورامیش، کە وانەی ئینگلیزی پێ دەوتینەوە مامۆستایەکی شاعیر و ئەدیب بوو. لەپشووی هاویندا ئەهاتینەوە بۆ دۆڵبیان. لە هاوینی ساڵی ١٩٧٥ چادرگەی ئەو خوێندکارانەی لەناوچەکانی ترەوە هاتبوونە ناوچە ڕزگارکراوەکانی شۆڕش، لەبەردەم ئاوایی سۆسەکان لەناو باخەکاندا لەشوێنێک بەناوی گوێزە زەرد هەڵدرابوو. ئێمە بۆ هەنجیر فرۆشتن ئەچووینە ئەوێ. چادرگەکەش ناوی چادرگەی شەهید لەیلا قاسم بوو، شەهید ئازاد هەورامی لێپرسراوی بوو.

لە تەوێڵە ئەوکات بارەگای هێزی خەباتی لێ بوو، زۆربەی بەرپرس و پێشمەرگەکان ماڵیاز لەوێ بوو، شەوێک شین و شەپۆڕ لەناو مەیدانی تەوێڵە لەبەردەم مزگەوت دەستی پێکرد، ئێمە چووینە سەربان بۆ سەیرکردن،

---

و باریک دادەنرێن و هەر ڕۆژەو توێژێکی هەنجیرەکە بەدیوێکدا ئەدرێت بەسەر بەردەکەداو لەبەر خۆر دائەنرێت، کە توێژی یەکەم وشک بوو ڕۆژی دواتر توێژێکی تری تەڕ ئەدرێت بەسەر توێژە وشکەکەدا، بۆماوەی ٤تاه ڕۆژ لەپۆرتێک دروست ئەکرێت لەشێوەی کولێرە بەقیمەیەکی قایم دایە. لەپارەش لە کاکڵەو توو و قەزوانی شین دروست ئەکرێ. ئەوەش دوای ئەوەی هەریەک لەوان بەجیا لەناو دۆڵدا ئەکوترێت تا بەتەواوەتی وردبێت. دواتر هەرسێکیان تێکەڵ ئەکرێن و دووبارە ئەکوترێنەوە. دوای ئامادەکردنیشی بە پارچە پارچەی پچووک وەک پاقلاوە ئەبڕێت و دائەنرێ بۆ خواردن. ئەمە خواردنێکی زۆر بەلەزەت بوو بۆ ئەو کاتە.

[1] شەوکە ئەو مادە سپی و سروشتی و شیرینەیە کەوەک شەکری سپی وایە، بەهاویندا ئەبارێتە یان ئەنیشێتە سەر بەری داربەڕووەکان، واتە سەرجەوت و بەڕووەکە، خەڵک ئەو جەوت و بەڕوە ئەڕنێت و کۆی دەکەنەوە، مەنجەڵێکی گەورەی پڕلەئاو ئەخەنە سەر ئاگرو کاتێک هاتە کوڵ، بە بەرچینەیەک یان سوزکیەکی دەسک دار، جەوتەکە هەڵئەکێشن لەئاوەکە، ئیتر شیلەکە لەناو ئاوەکەدا ئەتوێتەوەو وردەوردە ئەکوڵێ و کاتێک خەست بووەوە وەک هەنگوینی لێدێت، هەڵئەگیرێت بۆ خواردن، زیادەکەشی ئەفرۆشرێت.

زانیمان پێشمەرگەیەکە بەناوی نافع سۆسەکانی پیاوێکی قارەمان بوو، لەشەڕی دەربەندیخاندا بەدەستی حزبی شیوعی شەهید کرابوو.

ئەوە دووەم پێشمەرگە بوو، کەتەرمەکەی بهێننەوەو ئێمە بچین بۆ سەیرکردنی، چونکە پێشتر کەسێکی تر، بەناوی مەلا قادر ناسراو بە مەلا قادر قرگەیی بەپلەی سەرپەل شەهید کرابوو. ئەوەش لەڕۆژێکدا بوو، کە هاتن بە شوێن ئاواتی کوڕیدا لە خوێندنگە بردیانەوە، ئێمە وانەکانمان تەواو نەکردبوو. ئیتر زانیمان کە باوکی شەهید بووە. چونکە ماڵیان لە سۆسەکان بوو، هەربۆیە لەوێ بەخاک سپێردرا. کاتێکیش لەساڵی ١٩٧٥دا شۆڕش شکستی هێنا و هێزی پێشمەرگە ب لاوەەی پێکرا، ئێمە تاقیکردنەوەی پۆلی شەشەممان ئەنجامدابوو، بەلام کە حکومەت هاتەوە ناوچەکە، تاقیکردنەوەکەیان قبوڵ نەکرد و دووبارە ئێمەیان بردەوە بۆ هەڵەبجە تاقیکردنەوەی ساڵیان پێکردینەوە. دوای دەرچوونیشمان لەساڵی خوێندنی ١٩٧٥-١٩٧٦ لەخوێندنگای ناوەندی تەوێڵە لەپۆلی یەکەم بەردەوام بووین تا پۆلی سێیەمی ناوەندی.

خوێندنگای ناوەندی تەوێڵە لەدوای ساڵی١٩٧٥ەوە، کە من تێدا خوێندکاری پۆلی یەکەم بووم، هاوکات بوو لەگەڵ هاتنەوەی بەعس و دروستکردن و بنیاتنانی دەزگای ئەمن و ئیستخبارات و مونەزەمە. ئەوەش بووە هۆکاری ئەوەی ، کە زوو زوو بێنە سەرمان و داوامان لێبکەن ببین بەعسی و بچینە ڕیزی خوێندکارانی بەعسەوە. زۆرێکیش لەخەڵک دەترسان، هەر لەشوان و سەپانەوە تا توێژی خوێنەوار و کاسبکار و کرێکار. هەندێک لە مامۆستایانی ئایینی ئەچوونە کۆبوونەوەکانەوە، بۆیە لای خەڵکی بە ترسنۆک و بێ وورە ناودەبران. لەگەڵ ئەم بارەشدا خەڵک هەبوون خاوەن هەڵوێست و مەرد لەژێر ئەو هەموو فشارەدا سەریان نەوی نەکرد.

لەخوێندنگاکەی ئێمەشدا چەند کەسێکیان لەخشتە بردبوو، یەک لەدوای یەک ئەبوونە بەرپرسی یەکێتیی خوێندکارانی بەعس، ئەمانەش هەندێکیان زوو پەشیمان ئەبوونەوە و دواتر پەیوەندییان دەکرد بە لایەنە سیاسیەکانەوە، تیایاندا هەبوو دواتر بوونە پێشمەرگە و شەهیدیش بوون وەک س. ئی. محەمەد. هەشبوو هەر زوو بووە پێشمەرگە وەک ج. م. حەمەسەعید، کە ئێستا بەرپرسیاریەتی هەیە، دواجار تا من لەوێ بووم تەنیا

خوێندکارێک بەناوی ئیقبال عەلی تۆفیق وەک بەرپرسی قوتابیان لەگەڵیان مایەوە. لەگەڵ ئەم بارودۆخەشدا منیش بەبێ ئەوەی پەیوەندیم بە ڕێکخستن یان بە هیچ کەسێکی سیاسییەوە هەبێت، دەستم دایە هەندێک کاری سەرەڕۆیی، لەناو خوێندکاران و مامۆستاکانداو واخۆم نیشاندا، کە شتم. مامۆستا و خزمەتگوزارەکانی خوێندنگاکەشمان کەسیان ئامادە نەبوون هاوکاری ڕژێم بکەن، لەوانە مامۆستا مەحمود عەبدولڕەحیم- بەڕێوەبەر، مامۆستا محیەدین سەلیم، یاسین حاجی عەبدولڕەحمان سێ مامۆستای خاوەن هەڵوێست بوون ماوەیەکیش مامۆستا یاسینیان گرت، کە ئازاد کرا من چووم نوقڵم کڕی ودابەشم کرد بەسەر پۆلەکەماندا. نابێت ئەوەش لەیاد بکەین، کە زۆربەی مامۆستاکانمان نزیک بوون لە حیزبی شیوعییەوە، چونکە ئەوکات شیوعییەکان فشاریان لەسەرنەبوو وە لەگەڵ بەعسییەکان لەبەرەیەکدا بوون.

چەند مامۆستاشمان هەبون لەوانە مەنسوور عەزیز، مامۆستا عادل مامۆستا عەزیزو..........تاد[1] خاوەن هەڵوێست بوون. لەخزمەت گوزارەکانیش هادی بابا، فەرەج محەمەد و مام مەحمود بوون. ئەوان زۆر لەلایەن بەعسییەکانەوە فشاریان لەسەربوو، دەیانهێنان و دەیانبردن و ئازار دەدران لەسەر ئەوەی دروشمی دژە ڕژێم لەسەر دیوارەکانی خوێندنگاکەمان

---

[1] – لە تەوێڵەو دوای ئەوە شۆڕش کۆتایی هات و حکومەت هاتەوەو ناوچە ڕزگارکراوەکانی گرتەوە، خوێندنگاکان کرانەوەو پرۆسەی خوێندن دەستی پێکردەوە. لەگەڵیشیدا پرۆسەی بەبەعسیکردنی مامۆستایان و خوێندکاران دەستی پێکرد، جگە لەو مامۆستایانەی ناوم هێناون لە خوێندنگا ناوەندییەکاندا. ئەمەو چەندین مامۆستای تریش لەخوێندنگا سەرەتاییەکاندا هەبوون نەچوونە ژێر باری داواکارییەکانی ڕێکخراوەکانی حیزبی بەعس و هەڵوێستی کوردانەیان هەبوو، هەرچەندە بارودۆخەکەش بارگاوی بوو بەترس وتۆقاندن. چەند مامۆستایەکیش ژێربەژێر لەبەر ترسنۆکیان بوون بە بەعسی. لەناو سەرجەم مامۆستایاندا لەخوێندنگاکانی ناوەندی و سەرەتاییشدا ئەوەی من بزانم و ئاگاداربم تەنیا یەک مامۆستا لەناو ڕێکخستنی یەکێتی لەساڵی ١٩٧٦دا ئیشی ئەکرد، ئەویش مامۆستای بەڕێز تالیب مستەفا بوو، کە ناسراوە بە مامۆستا تالیبی مستەفای حەق. مامۆستای تری خاوەن هەڵوێست هەبوون لەشارو شارۆچکەکانیتردا بەڵام ئەوکات من نەمدەناسین لەوانە مامۆستا عومەر حەمەحسێن لەسەر هەڵوێستی سیاسی لەهەورامانەوە نەفی کرابوو بۆ شاری بەسرە لەخواروی عێراق.

دەنوسران، درووشمەکانیش من دەمنووسین، لەگەڵ دوو خوێندکاری هاوڕێم بەناوەکانی عەلی حەمەموراد و عەباس حەمەڕەشید. دیارە ئەوان پاسەوانیان دەکردم ومینش دەمنووسین. ئەوەش لەبەر ئەوەبوو سەرەتا لەگەڵ دەست پێکردنی پرۆسەی خوێندندا ئەمانبینی ئەمنە عەرەبەکان فشاریان دەهێنا بۆ خەڵکی تا بیان ترسێنن و بچنە ریزی ڕێکخراوی قوتابیانی حیزبی بەعسەوە.

پێشمەرگەو شۆڕشیش نەمابوون. هەربۆیە چەندین کەسی خەڵکی ناوچەکە ئەکەوتنە بەردەستی ئەمنەکانی بەعس و ئازاریان ئەدان ئێمەش زۆرمان پێ ناخۆش بوو. ئەمانەش درووشمەکانمان بوون بژی سەرۆک مستەفا بارزانی، بژی پێشمەرگە، مردن بۆ ئەحمەد حەسەن بەکر، ڕووڕەشی بۆ خۆفرۆشان. لەسەر ئەمە دەست و خەتی هەموو قوتابیەکانی پۆلەکانی ئەو دەوامەیان وەرگرت، لەوێوە گومانیان لەمن کرد و کەوتنە چاودێریم. دوای تێپەر بوونی چەند مانگ بەسەر ئەمەدا من کۆمەڵەم ناسی سەرەتا لەڕێی کاک جەعفەری حاجی ئەولەوەو لەپۆلی دووی ناوەندی بووم. دوای ماوەیەک واتە لەهاوینی ١٩٧٦ گروپێکی خوێندکارانی کۆمەڵەم دروستکرد کەسەر بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەبێ ئەوەی پەیوەندیمان بەسەروی خۆمانەوە هەبێت. مەبەستم ڕێکخراوی خوێندکارانە لەناوچەکانی تردا. ئەوکۆمەڵەیە تەنیا ئەوەبوو کۆمەڵێک خوێندکار بەبێ ترس پێکەوە قسەمان لەگەڵ یەکتر ئەکرد لەوانە مستەفا ڕەشید ڕەزاوی، غەفار سەعید حەمەیوسف، عەلی حەمەموراد، عەباس حەمەڕەشید، جەوهەر ستار، نەزمی فارس و بێستون حەمەحسێن.....تاد. خوێندکارەکانی تریش هەندێکی کەمیان نەبێت ئەوانی دی بەسنگێکی فراوانەوە ڕێبازی کوردایەتیان هەڵبژاردو بوونە خوێندکاری شۆڕشگێڕ.

هاوینی ئەمساڵ مەفرەزەی پێشمەرگەش دەرکەوتن دەنگ و باسیان ب لاوە بوویەوە، ئەگەر پێنج پێشمەرگە شەو بچونایەتە ناو ئاواییەک بەیانی خەڵک ئەیانووت ئەمشەو پەنجا پێشمەرگە لە فلان ئاوایدا بوون. ئەوانەی بوبوونە بەرپرسی قوتابیانی بەعسی ترسان و وازیان هێنا، بەعسییەکان دوای ئەوترس و دڵەڕاوکە داوایان لە قوتابی کاک سابیر وەسیم کردبوو ببێتە بەرپرسی قوتابیان، ڕۆژێک کاک بارزانی حاجی عەبدوڵلا لەکاتی پشوودا لەگەڵ سابیر هاتن بۆلام. ئەوان لەپۆلی سێیەمدا بوون، بەرزان

دەستیکرد بەقسەکردن دەربارەی دروست بوونەوەی شۆڕش و پێشمەرگە من هیچم نەوت، دوایی بە کاک بەرزانم ووت بۆ لەلای ئەو کوڕەدا ئەو قسانەت ئەکرد؟ وتی هێنابووم بی ترسێنی ئەیانەوێت بیکەن بەرپرسی قوتابیان. ووتم: نەترسم لێی ووتی نا، منیش دواتر بینیم و پەشیمانم کردەوەو دواتر بووە چالاکترین ئەندامی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لەدوای ئەوە من بوومە پێشمەرگە چالاکترین هاوکارو یارمەتی دەرم بوو لەسەرەتای شۆڕشی نوێ دا، ئێستاش لەئەوروپا ئەژی پیاوێکی بەرێزو بەئەدەبی کەم وێنەیە.

لەم سەروبەندەدا ڕۆژێک بەرپرسی ڕێکخراوی بەعس و دارودەستەی ڕژێم هاتن بۆ خوێندنگاکەمان، بەرپرسی ڕێکخراو ناوی مامۆستا عەباس عەبدڕەزاق و عەرەب بوو، ئەو ڕۆژە هەموومانیان بەمامۆستاکانیشەوە بردە ناو هۆڵی خوێندنگاکە دەرگایان لێگرتین و دەستیانکرد بە قسەکردن بۆمان. ڕێبازی حیزبی بەعس و بەرنامەکەیان بۆ ڕوونکردینەوە. مامۆستا ئیبراهیم، کە خەڵکی تەوێڵە بوو وەرگێڕیان بوو، ئەگەرچی مامۆستای ئێمەش نەبوو. دواتر داوایان کرد قوتابیان بچنەناو یەکێتییەکەیانەوە. پاشان باسی موخەڕیبیان کرد زۆربەمان تێنەگەشتین، بەڵام ئەمانزانی باسی پێشمەرگە ئەکات، کە مامۆستا ئیبراهیم قسەکانی وەرگێڕا ئاوای ووت ( چەند چەکدارێک بەم شاخانەوەن ئەگەر شەوانە هاتنە ماڵەکانتان نانیان بدەنێ ئەوە هی خۆمانن، بەڵام دواتر خەبەر بدەن، چونکە ئەوە بۆ تاقیکردنەوەی ئەوانەمان ناردوون کە بیانەوێ دژی حکومەتبن و هاوکاریان بکەن و خەبەر نەدەن. ئەوان بچنە هەرماڵێک و هەرکەس هاوکاریان بکات خۆیان ئاگادارمان ئەکەنەوە). مامۆستا ئیبراهیم قسەکانی تەواو نەکرد بەجارێ هەموو قوتابیەکان دەستیان کرد بەپێکەنین و فیکوهوڕ عەباس خۆی توڕەکرد، مامۆستاکانمان زۆر ترسان، هۆڵەکە بوو بەدەنگەدەنگ و مامۆستای وەرگێڕ ووتی تەواو.

لەپۆلی دووەمی ناوەندی دەرچووم، باوکم گیرابوو وە بێ سەروشوێن بوو.[1] ئەو ساڵە لەگەڵ عەباسی ئامۆزام و عومەر پالانەییدا وەک سێ هاوڕێ

---

[1] پیاوێکی خەڵکی گوندی سۆسەکان، بەناوی حەمە عەلی مەولود، چووبووە دەرەوە بووبووە پێشمەرگە، لەمەفرەزە سەرەتاییەکان، لای کاک ستاری سەعید خەڵەف، ماوەی

هەمیشە پێکەوە بووین، بیرم لەوەکردەوە قسەیان لەگەڵ بکەم و بەچەکەوە شەوانە بچینە سەر ماڵان بەناوی پێشمەرگەوە، کەقسەم لەگەڵ کردن وتیان باشە ئامادەین، دەستمان پێکرد بەدزی ماڵەوە شەوانە دوای ئەوە خەڵک ئەخەوت، دەرئەچووین هەرشەوێ بۆ شوێنێ لەو شوێنەشدا ئەچووین بۆ سەر چەند ماڵێک و بەرلە مەلابانگدان ئەگەڕاینەوە، خۆم کلاشینکۆف وتاقمە مەخزەنی ڕێکوپێک و عومەر دەمانچەو عەباسیش لەدار برنەومان بۆ دروست کردبوو، ئەوەی من و عومەر ڕاستی بوو، هی باوکم بوو لەدوای شکستی شۆڕش لەماڵەوە شاردبوونییەوە، ئەمزانی باوکم لەکوێدا قایمی کردوون، کاتێک دەرم ئەهێنان دواتر ئەمبردنەوە جێگەی خۆیان نەم ئەهێشت ئەم دوو برادەرەشم بەشوێنەکە بزانن، هەرشەوێک دەرئەچووین بەیانییەکەی سوپای عەسکەرو جاش ئۆپەراسیۆنیان ئەکردو کێومالی ناوچەکەیان ئەکردو خەڵکیشیان ئەگرت، دەنگوباسێکی گەورەی لێکەوتەوە. ئەو کەسانەی خەڵکی ئاوایییەکانی بەڵخە و سۆسەکان و تەوێڵەو پالانیا بوون ئەگەر بەدزیشەوە بە بێئەوەی کەس زانیبێتی بوبوون بەبەعسی لەترساندا وازیان ئەهێنا، چەندین ماڵیش لەترسانا ئەم هاوینە لەخانەباخ و هەوارەکاندا کۆچیان بردەوە بۆ ناو ئاوایییەکان. ئەوماڵانەی ئەچووینە سەریان ئەمانناسین ئەوانیش زۆریان ئەگەر ئێمە سەروو چاومان دانەبەستایە ئەیانناسین و ئاشکرا ئەبووین، لەهەندێک ماڵدا عەباس و عومەر لە دەرەوە ئەوەستان و من ئەچوومە ژوورەوە دوای ئەوە ئەندامانی خێزانەکە بەخەبەر ئەهاتن ئەترسان، بەتایبەت کاتێک ئەمووت پێشمەرگەم، زۆر جار ڕێک ئەکەوت ژنەکە بەغیرەت تر ئەبوو تا پیاوەکە، چەندین جار کەئەچوومە ناوماڵەکان یان ناو کەپرەکان ژن و پیاوەکان کاتێک بەخەبەر ئەهاتن من بەپاسەریانەوە وەستاوم، پیاوەکان لەرزیان لێئەهات، زۆرجار کە داوای نان و خواردنم ئەکرد ژنەکان ئازایانە بۆیان ئامادە ئەکردم و ئەیان پێچایەوە، کەچی پیاوەکان لەگۆشەیەکەوە بێدەنگ کزکوڵەیان ئەکرد. لەهەندێ ماڵدا سەرەتا کە بەخەبەر ئەهاتن ئەشڵەژان هاوارو دادیان ئەکرد بۆ دەرو دراوسێ وایان ئەزانی دزین تا ئەمووت بێدەنگبن پێشمەرگەین.

---

چەند هەفتەیەک لایان بوو، چەکێکی فراندو هاتەوە، ئەو لەلای دەستگا ئەمنیەکانی حکومەت وتبووی حەمەسەعید هاوکاری پێشمەرگەکان دەکات، باوکم لەسەر ئەوە گیرابوو.

ئەومالانەی ئەچووینە سەریان، هەیانبوو ئەیانووت پیاوەکەیان بۆتە بەعسی بەڕاست یان درۆ، بەلام من هەر بڕێک دارکاریم ئەکردن، هەندێک خاوەن ماڵ کەقسەم بۆ ئەکردن ئەمووت پێشمەرگەم و شۆڕش دروست بۆتەوە هاوکاریمان بکەن و نەبن بەبەعسی، هاوکاری حکومەت نەکەن، ئەیانووت بەسەر چاو بەلام بڕۆنە ماڵی ئەم دراوسێیشمان ئەگینا بەیانی ئێمە بەگرت ئەدەن.

دواجار دایکم و مامە حاجیم پێیان زانیم، ئەوشەوە دایکم کە زانی بەچەکەوە بەشەودا چوومەتە دەرەوە ترساو دەستیکرد بە گریان، تازە خۆم ڕاستیەکەم بۆ باسکرد کەخەریکی چیم؟ ئەویش لەبەر ئەوە نەوەک بەشتی خراب تێبگات، ئاشکرا بوونەکەشم بەم جۆرە بوو: شەوێک دەمەوبەیان بوو خۆم کردەوە بەماڵدا، بینیم دایکم دانیشتووەو بەخەبەرە، ئەوشەوە لەئاوایی بەڵخە چووبوومە سەر چوار ماڵ بەناوی پێشمەرگەوە قسەم بۆکردبوون، پیاوەکانی هەرچوار ماڵەکەم هێنابوو بۆ لای مزگەوتەکە یەکێکیان ناوی ئەنوەری ئەحەلارە بوو لەشۆڕشی ئەیلوول پێشمەرگە بووبوو زۆرترسان، چەند ژنێک هاتبوون بەدوایاندا لەدوورەوە وەستابوون ئەنوەر قسەی زلزلی ئەکرد لێمدا پیاوەکانی تر زیرەیان کرد هەموویانم پێچابووە کوچەیەکی تەنگەبەر، ژنەکان وەیمن وەیمن ئەیانکێشا بەسەرو ڕوومەتی خۆیاندا، من بەباشی زمانی سۆرانیشم نەئەزانی لەهەندێک ماڵدا کە ئەهاتمە دەرەوە گوێم لێئەبوو ئەیانووت ئەو پێشمەرگە هەورامی بوو.

دایکم کە زانی چیم کردووە ووتی: تەواو تۆش ئەگرن و باوکیشت ئیعدام ئەکەن، قابیلە کەسێک نەیناسیبێ؟ منیش ووتم جاکێ ئەڵێت باوکم ئیعدام نەکراوە؟ یەکسەر دایکم دەستیکرد بەگریان و خۆیشم دەستم کرد بەگریان، بەیانی زوو بوو، دەرگاو پەنجەرەکەم بەست بۆ ئەوەی دراوسێکانمان نەزانن، خوشک وبراکانم هادی، مەهدی، ئەدیبە، ئیقباڵ، کوێستان، کوسار و شیروان وردبوون گەورەی هەموویان هادی بوو، کە ئەویش تەمەنی سیانزە ساڵان بوو، خەوتبوون، بەگریانی ئێمە یەک یەک بەخەبەر ئەهاتن و لێفەکەی سەر خۆیان لائەداو ئەوانیش بێئەوەی بزانن ئێمە بۆ ئەگرین لەجێی خۆیانەوە دەستیان ئەکرد بە گریان.

مامە حاجیم فەرەنجی کوڵەباڵی هەبوو، پێشتر من بەدزییەوە شەوانە دەمبرد و لەبەرم دەکرد، چونکە پێشمەرگە فەرەنجیان لەبەر ئەکرد، بەڵام دواجار ئەمخستەوە شوێنی خۆی، تا پێم نەزانێ. هاوینان فەرەنجی لەبەر نەدەکرا، نازانم چۆن زانیبووی نەماوە. ماوەیەک گەڕا بەدوایدا نەیدۆزییەوە، خستیە سەرماڵی دراوسێ باخێکمان ووتی ئەوان دزیویانە. ئەو ڕۆژە دوای نان و چا خواردن، دایکم چووە خوارەوە بۆماڵی مامە حاجی پێی وتبوو: فەرەنجیەکەت لای منە دیارە حکایەتەکەشی بۆ کردبوو، کە من ئەم ماوە خەریکی چی بووم، دایکم هاتەوەو مامەشم بەدوایدا هات، هاتە ژوورەوە دانەنیشت من و دایکیشم هەستاینە سەر پێ، مامەحاجی ووتی:

– ئەمە تۆ بووی ئەم هەراو فەرتەنەت دروستکردووە؟

– ووتم: ئەرێ وەڵا من بووم.

– ووتی: تەواو خەڵک ناسیویانی ئەتگرن.

– ووتم: دەی ئێستا ئەڕۆم بۆ ئەو شاخە بۆ لای خولە کەشکۆڵ[1] شەوانە دێمەوە هەرشەوی یەکێک ئەکوژم لە تۆڵەی باوکمدا، کە ئەمەم ووت، حاجی ک لاوە مشکیەکەی سەری داگرتوو کوتای بە بەردەمانداو ووتی: تەواو ماڵمان وێران بوو حکومەت هەموومان ئەسوتێنێ.

بابێمەوە بۆخوێندنگا، پاییز هاتوو چووینە پۆلی سێی ناوەندی هیچ باسێکیش نەبوو، ئەمساڵ مامۆستایەکی عەرەبمان بۆ هات و ناوی عەلی عەبدول حسێن بوو. لەسەرەتای ساڵەوە کاک دیاری حسێن هات و پێی ووتم: ئاگات لەخۆت بێت ووتم چی بووە؟ ووتی: مامۆستا عەلی لەگەڵ (ج-ق) ی هاوڕێم بانگی کردووین ووتویەتی: حەمە برادەرتانەو پێکەوە دێن بۆ مەکتەب بزانن باسی چی ئەکات بۆم بگێڕنەوە لەدەرسی عەرەبیدا دەرتان ئەچێنم. من ووتومە: جا باسی چی ئەکات تا ئێمە بیگێڕینەوە ئەو لەدۆڵبیانەوە دێت و ئێمەش لەپالانیاوە. تووڕە بوو بوو لە دیاری، بەڵام هاوڕێکەی ووتبوی باشە، ئەمان پۆلێک لەدوای ئێمەوە بوون منالتر بوون دیاری هەر لەو کاتەوە کوڕێکی عاقڵ بوو.

---

[1] – مەبەست لە خولە کەشکۆڵ لەم بەرهەمەدا شێخ عەلییە، کە رابەر سیاسی یەکەم مەفرەزەی سەرەتایی شۆڕشی نوێ بوو.

ئەو خوێندکارانەی خوێندنگای ناوەندی تەوێڵە دواتر زۆریان ڕێکخرابوون، هەندێکیش بێئەوەی ڕێکخستنبن، خاوەن هەڵوێستی کوردانە بوون زۆریان ڕۆڵی بەرچاویان دیت لەڕیزی لایەنە سیاسیەکانی کوردستاندا، هەندێکیان شەهید بوون، هەندێکیش تائێستە ماون بەرپرسن و سەربەرزانە خزمەت بەگەل و نیشتیمان دەکەن، لەوانە کاک سوبحی مەهدی ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی.

لێرەدا کۆتاییی بەباسی خوێندنگا دەهێنم، بەڵام لە بابەتەکانی، کەدواتر دێن دووبارە لە چەند لاوە باسی تازەتر سەبارەت بەخوێندنگا دێتەوە ناو.

# گەڕانەوەیەک بۆ دواوە – کوردستان

## لە سەردەمی منداڵیمدا




[redacted]

من کاتێک منداڵ بووم و قۆناغەکانی منداڵی و هەرزەکاریم تێپەڕاند، دەستم بەسەرەتاکانی ژیان کرد، زێدو خاکەکەم داگیرو دابەش کرابوو، هەروەک وەک سەرجەم هاونەتەوەو هاونیشتمانییەکانم، بەڵام لەباشوور کوردستان زایەڵەی شۆڕشێک کڵپەی سەندبوو، کۆمەڵانی خەڵک هیوایان لەسەر هەڵچنیبوو. شۆڕشەکەش لە چەندین ناوچەوە کڵپەی سەندبوو، بەڵام ئەو ناوچەیەی کاریگەری لەسەر زێدی من دروستکرد زایەڵەی ئازادی پێنجوێن بوو، ئەو شارۆچکەیە بووە یەکەمین شارۆچکەی ئازادکراوی شۆڕشەکە، لەدوای ڕزگارکردنی شارەدێی تەوێڵەو ناحییەی بیارە کە دواتر ناوی شۆڕشی ئەیلولی لێنرا. بەو ڕووداوەش هێزو وورەیەکی باش بەبەر شۆڕش و سەرکردایەتییەکەی و تەنانەت کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان کرایەوە. دیارە دەست بەسەراگرتنی مۆڵگەکانی ڕژێم لەم شارۆچکەیەدا و هەڵدانی بانگەوازی ئازادی مەزنترین چالاکی شۆڕشگێڕانە بوو لەدەڤەرەکەدا، چونکە پێشمەرگەکانی شۆڕش لەئازاد کردنی گوند و شارەدێکان هەنگاویان گواستەوە بۆشارۆچکە و دەست بەسەردا گرتنی تێکڕای دام و دەزگاکانی دوژمن، کەبۆ ئەوی ڕۆژێ دەستکەوتی گەورە بوون بۆ شۆڕش. بۆ ئەو ڕووداوە واتە شێوازی ئازادکردنی شارۆچکەی پێنجوێن و بەو پێیەی من لەو

ساڵەدا لەدایکبووم پەنام بردوە بۆ سەربۆردەی هەڤاڵی تێکۆشەر جەنابی مام جەلال و برای ئازیزمان کاک جەلال وەیسی ناسراو بە دکتۆر جەلال. لەم بارەوە جەنابی مام جەلال، کە ئەو کات ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی بوو، بڕیار و ڕووداوی ئازادکردنی شارۆچکەکە بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە[١]:

بەمەبەستی ئازادکردنی شارۆچکەی پێنجوێن، کە بڕیاری سەرکردایەتی شۆڕشی لەسەر درابوو لە ڕێگەی ناوچەی شارباژێڕەوە سەردانی گوندی دارۆخانم کرد، تا ڕاستەوخۆ چاوم بە حەمەڕەشیدخان بکەوێت و بەڵێنی هاوکاری و پشتیوانی بۆ ئازادکردنی شارۆچکەی پێنجوێنی لێوەربگرم. دیارە ئەوەش بە کەڵک وەرگرتن لە کەش و هەوای سەرکەوتووی پێشمەرگانە و مەعنەویاتی بەرزی خەڵک و وورەی پێشمەرگە، ڕوومان کردە ناوچەی پێنجوێن بۆ ڕزگارکردنی. لەوێ دەبوایە هێزی عەشایەرو پیاوماقولان ڕابکێشین بەلای خۆماندا. کلیلی سەرکەوتنیش لە گیرفانی خوالێخۆشبوو حەمەڕەشیدخاندا بوو، کە لە جمهوریەتی کوردستانی مەهابادیشدا ڕوتبەی ژەنەڕاڵی پێ بەخشرابوو، شان بەشانی شەهید سەیفی قازی و خوالێخۆشبوو ژەنەڕاڵ مستەفا بارزانی و عومەرخانی شکاک. بۆ ڕازیکردنی حەمەڕەشیدخانیش پێویستمان بە ڕازیکردنی خوالێخۆشبوو مەجیدخانی کوڕی هەبوو. دیارە من کە لێپرسراوی پارتی بووم لە سلێمانی لەساڵی ١٩٦٠-١٩٦١دا، چەند جارێک خوالێخۆشبوو مەجیدخانم دیبوو. مەجیدخان پیاوێکی ژیر و ماقوڵ و قسەزان و ڕووخۆش بوو. هەستی کوردایەتی لە دڵ و دەروونیدا دەیجولاند. من توانیم زوو بمە دۆستی و لەگەڵما نێوانمان زۆر خۆشبوو، بۆیە پەنام بردەبەر بۆ ڕازیکردنی خان و پیاوماڵاقونی تری ناوچەکەش. ئەویش لە وەڵامی ڕاسپاردەی مندا پلانێکی بۆ پێشنیار کردبووم لە گەشتەکەماندا بۆ ناوچەی پێنجوێن سەردانی پیاو ماقولان و خان بکەم. ئەرکی ڕازیکردنی خانیشی خستبووە ئەستۆی خۆی، بۆیە ئێمەش بە دڵنیاییەوە بەڕێکەوتین بەرەو ناوچەی پێنجوێن، شەهیدی نەمر مەلا رسوڵ و چەندین کادیری پێشمەرگانەی ترم لەگەڵدا بوون. ئەوسا بە پێ دەڕۆیشتین،

---

١. مام جەلال: لە یادی دۆستی دێرینمان خوالێخۆشبوو مەجیدخاندا، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٢٠٨٣، ڕۆژی شەممە، بەرواری ٢٠٠٠/٢/٢٦ز، ل١.

نە ڕێگەی ئۆتۆمبیل هەبوو، نە ئۆتۆمبێلمان هەبوو، وەزعیماڵیشمان زۆر خراپ بوو، جلمان شڕ بوو، زۆریش پێ لاوە دڕاو و پێ لاوە خراپ بووین، من خۆم پێ لاوەکەم دڕابوو، ژێرەکەی پچڕابوو بەپەت بەستبومەوە، لەوەش ئەو کەڵکەم وەرگرت کە پێشمەرگەی پێ هێور بکەمەوە هەر کاتێک پێشمەرگەیەکی پێ لاوە شڕ دەهات و پارەمان نەبوو پێ لاوەی بۆ بکڕین بەوە دڵم دەدایەوە کە دەمگووت وەرە پێ لاوەکانمان بگۆڕینەوە. ئەویش کە پێ لاوەە شڕەکەی دەدیت ڕازی دەبوو. بەڵام هەروا بێ جل و پێ لاوە نەماینەوە! کە نزیک بووینەوە لە دێیەکەی خواڵێخۆشبوو حەمەڕەشیدخان، خواڵێخۆشبوو مەجیدخان بە پیرمانەوە هاتبوو زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردین و ڕێنوێنی کردین هەتا ناو دێیەکە و لەوێش بۆ دیوەخانی حەمەڕەشیدخانی خوالێخشبوو، ڕۆژەکەی باران بوو، هەمووومان تەڕ بووبوین هەندێکمان منیش یەکێک لەوان بووم سەبارەت بە شڕی پێ لاوەمان هەموو پێ لاوەکانمان قوڕاووی بووبوون بۆیە کە خان لە دیوەخان هاتە دەرو پێشوازی گەرمی لێکردین و پاشان دەستی منی گرت و بەرامبەر ژووری دیوەخانەکەی کە مافوری فەرشی نایابی ئێرانی تێدا ڕاخرابوو، من ڕووم نەدەهات بەو تەڕی و پێ قوڕاویەوە بچمە ژووەرەوە، بۆیە داوای لیبوردنم لە خان کرد کە ڕێگەمان بدات بچینە مزگەوت قاچمان بشۆین و خۆمان ووشک بکەینەوە ئینجا بێنەوە، بەڵام خواڵێخۆشبوو حەمەڕەشیدخان ڕازی نەبوو ئەمری کرد مەسینە ئامادە کران و قاچمان لەبەر شوشت و ئێمەی ناچار کرد بچینە ژووری دیوەخانە گەرم و گووڕ و ڕازاوەکەیەوە! لەوێش هەر خۆمان وشککردەوە هەم خۆمان حەسانەوە. مەجیدخانی خواڵێخۆشبوو هەر لە دەرەوەی دێ کەیانەوە کە ئێمەی وا بەم وەزعە دیتبوو، سوارێکی نارد بوو بۆ پێنجوێن لەوێ پتر لە سەد و پەنجا جووت پێ لاوەی ڕاسپاردبوو بۆمان کرابوو شەو پێمان گەیشت و بەسەرماندا دابەشکران. خانیش منی خەڵات کرد شاڵێکی باشی کوردی و دەستکێشێک و قەمسەڵەیەک. لە دیوەخانەکەشیا خزمەتێکی باشیان کردین و خواردنێکی شاهانەیان بۆ هێنایین چەندین جۆری پلاو و گۆشت، شلەی کوردی و ئێرانی بۆمان سازرا بوو. منیش کوڕانم هاندا لە وەڵامی داوای خاندا کە وەک ماڵی خۆمان ڕفتار بکەین وشەرم نەکەین لە خواردندا. خان زۆر ڕێزی گرتین و پێ ڕاگەیاندین کە ئەنوەربەگی کوڕی بە

دەیان چەکدارەوە ئامادە کراوە بۆ هاوکاری کردنمان. راشی سپاردووە هەرچی سەرۆک و پیاوماقوڵێک هەیە و خۆی بە کورد بزانێت دەبێ هاوکارمان بێ. دوای نانخواردن خان بە جێی هێشتین تاکو بحەسێتەوە، بەلام خوالێخۆشبوو مەجیدخانی دۆستم مایەوە و مژدەی پێدام کە هەموو ئەرکەکانی خۆی بەدی هێناوە و چەند سەد چەکدارێکی عەشایەری ئامادە کردووە بۆ بەشداربوون لەگەڵمان بۆ ئازادکردنی پێنجوێن.

ئەوەبوو حەمەڕەشیدخان هێزێکی ۲۸۰ چەکداری ئامادەکرد، تا لە دۆڵی شێلرەوە بگەنە شاری پێنجوێن و بە هاوکاری هێزەکەی مام جەلال گەمارۆی شارەکە بدەن. دواتر پەیوەندی بە بەرپرسانی شارەکە و لە نێویشیاندا مەعاون کەمالی شێخ غەریبی بەڕێوبەری پۆلیسی قەزای پێنجوێن کرا، تا خۆیان بە دەست شۆڕشەوە بدەن. لە بەرامبەردا مەعاون کەمال ئەوەی ڕاگەیاند، کە ئەو خۆی بە دەست کەسەوە نادات، جگە لە حەمەڕەشیدخاننەبێت. ئەوە بوو داواکەی مەعاون کەمال نێردرا بۆ حەمەڕەشیدخان. ئەویش مەردانە بە خۆی هێزێکی ترەوە بەرەو دەروازەی ڕۆژهەلاتی شارەکە بەڕێکەوت و مەعاون کەمال ئاگادارکرا. دواجارلە ۲٤ی مایسی۱۹٦۲ز شارەکە بە خۆبەدەستەوەدانی بەڕێوبەری پۆلیسی قەزای پێنجوێن بەهۆی حەمەڕەشیدخان ئازادکرا. بەمەش هێزی پێشمەرگە چوونە ناو شارەکەوە و دەستیان بەسەر تەواوی شارەکەدا گرت و بڕی ۱۱هەزار دینار و ٦هەزار فیشەک و شەش ڕەشاش دەسکەوتی شۆڕش بوو. ئەمەو جگە لە بەدیلگیرانی ۱۷۲ پۆلیس. هەموو ئەو پارەو دەسکەوتانەش بەهۆی جەمالی میرزا سەعید و بە ئاگاداری و داوای حەمەڕەشیدخان نێردرایە گوندی بناوەسووتە، تا بدرێتە شۆڕش. هەر لەو پارەیەش مووچەی سێ مانگی پۆلیسەکانی پێنجوێنیش درا.

کاک جەلال وەیسیش سەبارەت بەم چالاکیە بەوردی و بەکورتی بەم چەشنە بۆی گێرامەوە و ووتی:

لەسوپای عێراقدا برین پێچ بووم، ڕێکەوتی ۱۹٦۲/٥/۱٥ خۆم و شەش لە هاوڕێکانم دەرچووین و لە ئاڵهاریزوە پەیوەندیمان کرد بەشۆڕشەوە. یەکەم کەس لەنزیک پردە بەردینی ئاوایی کانی مانگا کاک مەلا ڕەسوڵمان بینی. ئێمەیان بە جەلال کاوانیدا بەجلی سەربازییەوە نارد بۆ لای هەڤاڵ مام

جەلال تاڵەبانی، کە گەیشتینە جێ دیتمان مام جەلال چەکێکی سەمینۆفی پێیە و لەسەر گەلای داربەڕوو دانیشتووە و عارف قەرەچەتانی لەبەردەستدایە. دوای س لاوە و چاک و چۆنی پرسیاری لەیەک بەیەکمان کرد و ئێمەش وەک پێویست وەڵاممان دایەوە، ئەمانە بووین ناله جۆلای هەورامی، کە بەکاربەری ڕەشاش بوو، من برین پێچ بووم و عەزیزی حەمەخورشید و جەلال کۆیی و ئەوانی دی، بەفەرمانی مام جەلال قاتی کوردییان بۆ پەیدا کردین، هاوڕێکانم هەموو قاتیان بەرکەوت تەنیا من نەبێت، کە لەنێو بەرگە بێزەونەکەی سەربازیدا مابوومەوە، چومە نزیک مام جەلال و پێم ووت: قوربان من هەڵوێست و بیروڕام گۆڕیووە، کەچی قاتی کوردیم بەرنەکەوت ئەم جلە سەربازیەیان بۆ نەگۆڕیم؟ ووتی: بۆ؟ ووتم: دەڵێن نەماوە.

سدیق ئەفەندی بانگکرد و پێی ووت: قاتێک ڕانک و چۆخەم هەیە، بۆم کورتە بیدەن بەم کورە، بەم جلە سەربازییەوە بۆنی دوژمنی لێ دێت، با لەناوماندا نامۆ نەبێت. قاتەکەیان هێناو پۆشیم، تا گەیشتینە بەمۆش، هەرلەبەرمدا بوو، ئێوارەی ئەو ڕۆژە دوای نانخواردن مام بانگی کردمە لای خۆی و پێی ووتم: ئەتوانی ئەم شەو دەرمانخانەکەی پێنجوێن بگوازیتەوە بۆ بەریدەکە؟ ووتم: بەڕێزم بەتەنیا؟ ووتی: نەخێر پێشمەرگەت لەگەڵ دەنێرم، دەستەیەک لەپێشمەرگەو چەند خوێندکارێکی ڕۆشنبیر ودیار بوو خاوەن بروانامەن، لەگەڵی ناردم ووتی سدیق ئەفەندی لەبەریدەکە چاوەڕێتان دەبێت. چووینە ناو پێنجوێن و تەقە گەرم بوو، ئێمەیان بەڕێڕەوێکی ئاوەڕۆدا بردو تا لە جێیەکدا سەرمان دەرهێنا، کە دیم نەخۆشخانەکەیە، هەموو داو و دەرمانەکانم جیا کردەوە و مەڵۆمەڵۆ لەناو پەردەی پەنجەرەکانی بیناکەدا توندمان کردن و گواستمانەوە بۆ بەریدەکە. پێشمەرگە چواردەوری قەڵاکەی پێنجوێنیان دابوو، شەو لەگەڵ گەرمەی شەڕەکەدا مام جەلالم لەکۆلانێکی ئەو شارۆچکەیەدا بینییەوە. بەرپرسی قەڵاکە کەمال شێخ غەریب بووە، معاون کەمال خۆی نەئەداوە بەدەستەوە، پێشمەرگەش دەستگیران و خەسوەکەیان هێنابوو بۆ ئەوەی داوای لێ بکەن لەگەڵ پۆلیسەکاندا خۆیان بدەن بەدەستەوە.

دەستگیرانەکەی بەدەم هاوارەوە پێی ووتبوو: ئەگەر خۆت نەدەیت بەدەستەوە ئەوا بەتەمای من مەبە. پاش ئەوە بڕیاری خۆبەدەستەوەدانی دا.

مام جەلالیش ناردبووی بە دوای مەجیدخانی کوڕی حەمەڕەشیدخاندا تا بێت دەرگای سەرەکی قەڵاکە بکاتەوە. مەجیدخان هاتو ئەوانیش خۆیاندا بەدەستەوە. دەستکەوتی ئەو داستانە ۱۷۵ پارچەچەک بووە ۱۰ ڕەشاشی برێن ژمارەیەکی زۆر فیشەک و هەموو کەل و پەلەکان ۱۲[1] هەزار دینار و هەندێک دووربین و لاسلکی. ئەم ڕووداوە هەڵەی تێدایە بڕوانە مام جەلال: لە یادی دۆستی دێرینمان خوالێخۆشبوو مەجیدخان دا، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ۲۰۸۳، ڕۆژی شەممە، بەروارە ۲۰۰۰/۲/۲٦ز، لل۱-۲، منکوڕی: بەسەرهاتی سیاسی کورد، ۴۳/۲.

هەروەها کاک جەلال ووتی: من خۆم هەر ئەو شەوە چومە ناو قەڵاکە، لەسەر قەباغە فیشەک پێم خلیسکا و کەوتم، پۆلیسەکان بەبێ ئەوەی یەک کەس شەهید بکەن هەزاران فیشەکیان تەقاندبوو، پاش ئەو سەرکەوتنە گەورەمان سوپای عێراق هێرشی هێنا، مەلا ڕەسوڵ لەلای پردەبەردینە شەهیدبوو. ناچار پێنجوێنمان بەجێهێشت وگواستمانەوە بۆ ئاوایی بناوەسووتە، لەوێ شێومان خوارد و تۆپ باران دەستی پێکرد.

لەبنـــاوە سووتـــەوە شـــەو گواســـتمانەوە ئاواییەکی تـــر، لەچیا دابەزین بۆ نێو دۆڵەکەو مام جەلال کۆی کردینەوە، کاک حیلمی عەلی شەریفی وەک بەرپرسی هێزێک جیاکردەوە، کە بچن بەرەو بەمۆ. بە منیشی ووت: تۆش وەکو دکتۆر لەگەڵیاندا برۆ. ووتم: بابچم بۆ تەوێڵە، ووتی: ئاخر ڕۆڵە تەوێڵە پۆلیسی لێیە. ئیتر لەگەڵ هێزەکەدا بەرەو بناری بەمۆ کەوتینەڕێ. هەر ئەوکاتە مام جەلال تفەنگێکی لولە ڕووتی یانزە تیری لەگەڵ دەمانچەیەکی بچوکی حەوت تیر بە دیاری دامێ.

ئەوانەی بەرەو بەمۆ ئەکەونەڕێ، قەتارەی هێزەکە پێی لەسنوری پێنجوێن ئەبڕی و بەلاشانەکانی چیای سورێندا گەیشتونەتە نزیک خورماڵ.

---

[1] – لە پێشتردا باسی ۱۱ یانزە هەزار دینار کراوە، تێکۆشەری دێرینی گەلەکەمان کاک حەمید ڕەشاش، دەڵێت ئەو ۱۲ دوانزە هەزار دینارەی لە مەخفەری پێنجوێن دەست کەوت بوو، لەپێنجوێنەوە تا هاتینەوە چەمی ڕێزان، چەندین شەوڕۆژمان پێچوو، پارەکە هەرڕۆژەو بەکۆڵ یەکێکەوە بوو، دواجار کەگەیشتینە جێ ژماردیانەوە یەک دیناری کەم نەکردبوو. مام حەمید خەڵکی هەولێرەو لەسەرەتای شۆڕشەکەوە پێشمەرگەو بەشدار بووە، یەکێک بووە لەهاوڕێ نزیکەکانی مام جەلال.

دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک لە شەو حەمە کۆڵەدارە و عەلی شیعەیان بانگکرد و لەگەڵیان کەوتوون، تا گەیشتونەتە ئاوایی دەرەشیش، لەوێ ڕۆژیان کردەوەتەوەو چوونە ماڵی سەباح بەگی دەرەشیش. لەوێش حەمە کۆڵەدارە و عەلی شیعەیان لێ بزر بووە، دیارە چون بۆ جێگەیەکیتر ئەم (جەلال) نازانێ.

ڕۆژێک دوای ئەوە چوونەتە نێوان ئاوابییەکانی بەڵخە و بیارە لەجێگەیەک کەپێی دەووترێ سەید سەلام لەوێ بۆسەیان داناوە بۆ خاڵە بلەی بەرپرسی بنکەی پۆلیسی تەوێڵە، گوایە لە هەڵەبجەوە موچەی پۆلیسەکان ئەبات بۆ تەوێڵە. لەدرێژەی قسەکانیدا کاک جەلال ووتی منیان ناردە سەرچیاکە، دەستەملانی ئاوی سازگارو شنەی داربەڕوو بووم، بەیانی کە خۆر دەرکەوت تەقە دەستی پێکرد، پاش ماوەیەک برینداریکیان هێنا دیم تایەری حەبیبەیە تەوێڵەییە، ووتی جەلال تۆ لێرەیت، بەجێم نەهێڵی. ووتم: نەخێر هەر ئێستەش تەداویت دەکەم، دوای تەداوی ناردمان بۆ بەنەن، بەدوای ئەودا کاک حیلمیشیان بەبرینداری هێناو بەناچاری هەمومان پاشەکشەمان کرد بۆ بەنەنی بەڵخە، شێخ حەمە ئەمینی شێخ ئەو لاوە کاک حەمەی فەرەج و ژمارەیەک پێشمەرگە بوون. نازانم تایەر لەکوێوە هاتبوو لەگەڵ حەسەنە عەینای بەڵخەیی کەدواتر لەشەڕێکدا برینداربوو لای دەربەندیخان باڵیکی پەڕی. لەبەنەنەوە بەبێ دەستکەوت بە دوو بریندارەوە گەشتینە دەربەندی ئەشکەوڵ نازانم بۆ چالاکیەکە سەرکەوتوو نەبوو[1]، هەندێک لەهێزەکە چوونە

---

[1]- خاڵە بلە بەرلەوەی لە هەڵەبجە دەرچن تەلگراف ئەکات بۆمەخفەری سۆسەکان، تا مەفرەزە بنێرن بۆ سەید سەلام بۆ پاسەوانی ڕێگاکە. ئەوانیش بەیانی سێ کەسێک ئەنێرن بۆ ئەوشوێنەی کە پێشمەرگەکان لێی دامەزراون. لەبەرامبەردا کاکە حەمەی فەرەجو چەند هاوڕێی لە قەراخ جادەکەدا دائەمەزرێن. کاک حیلمی و حەسەنە عەینا لەپشتی جادەو لەسەر بەرزاییەکەوە لەسەنگەردا دائەنیشن و پاسەوانی ئەمان ئەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا بەدووربین چاودێری ئۆتۆمبێلەکەی خاڵەبلەی ئامرمەخفەری تەوێڵە ئەکەن، کەلەو کاتەدا لە بیارە دەرچووە بەرەو بەڵخە، ئاگاداری کاکە حەمە ئەکەن ئەڵێن واهات، ئیتر ئاگایان لەپشتەوەی خۆیان نابێت، لەوکاتەدا یەکێک لە سێ پۆلیسەکەی لەسۆسەکانەوە هاتوون ئەگەنە سەر کاک حیلمی و حەسەن عەینا، ئەڵێن ئەوە چی ئەکەن لێرەدا؟ ئەمانیش بێ وەڵامدانەوە یەکسەر پۆلیسەکە ئەکوژن، کە خەڵکی چەرمەگا بووە. بەوەش تەقە دەست پێ ئەکات. لەگەڵ دەنگی تەقەکەدا ئوتۆمبێلەکەی خاڵە بلە ئەگەڕێتەوە بۆ بیارەو وەرئەگەڕێت. دوو پۆلیسەکەی تری هاوڕێی پۆلیسە کوژراوەکە ڕائەکەنەوە بەرەو بەڵخە و سۆسەکان،

وەزگێل وهەندێکی دیکەش ئاوایی هاواریان کردە مەنزڵ و ئەویتر کەمایەوە بەرەو بناری بەمۆ قەتارەمان بەست.

دوای ئەوە ئەمان بەرەو بەمۆ ئەڕۆن، لێرە تایەری حەبیبە کە بریندارە، شێخ سەعیدی موفتی کە کادر بووە ئەبیات و لەشوێنێک پەنای ئەدا، کاک شێخ حەمەئەمین لەگەڵ هێزەکەدا ئەمێنێتەوە، لەسنووری هەڵەبجەو هەوراماندا گەشە ئەکەن.

کاک حیلمی و ئەوانیش کە ئەگەنە بناری بەمۆ بۆ لای ئەنوەر مائی، سەرەتا لەماڵی عەلی ئەحسەنی شەرەف بەیانی دا ئەمێننەوە، مەلاعەلی شمشێرکوڵ وکۆمەڵێک پیاوی کورد پەروەری سنووری بەمۆو گەرمیان لەوێ هاوکاریان ئەکەن و گەشە ئەکەن وئەمێننەوە تا لە رۆژی ١٩٦٢/١٢/٨ شێخ حەمە ئەمین نامەی ناردووە بەدوای کاک حیلمیدا و نوسیویەتی دەوری تەوێڵە گیراوە و بێن بەدەمامنەوە، نزیکەی سەد پێشمەرگە دێن و تا ئەگەنە ئاوایی سۆسەکان لە هەورامان، لەلایەن پێشمەرگەوە دەست بەسەر بنکەی پۆلیسەکەی سۆسەکاندا گیراوە، هەم تەوێڵەش کەوتووەتە ژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگەکان و پۆلیس خانەکەی گیراوە، جەلال نەخۆشخانەکەی تەوێڵە رێک ئەخاتەوەو ئەبێتە بنکەی تەندروستی شۆڕش، هێزەکە بەرەو بیارە بەڕێ ئەکەوێ و مەرکەزی پۆلیسی بیارە ئەگرن، دوایی روو لەخورماڵ کراوە بەڵام ئەو جارە بۆیان نەگیراوە.

سەبارەت بە دانانی بۆسەکە بۆ خاڵە بلە لە سەید سەلام لە هاوینەهەواری وەزەنێدا حاجی عەلی مستەفای بەڵخەیی بێ زیاد و کەم وەک ئەم گێڕانەوەی د. جەلال وەیسی، باسی کرد. ئەویش کە ئەو کات وەک رێکخستن چاوساخیان بووە، تەنیا جیاوازییەک لە قسەکانیاندا ئەوە بوو، کە حاجی ووتی: کەمینەکە بۆ پارەکە نەبووە، بەڵکو لەتۆڵەی تەقەکردنەکە بوو لەحەمەی فەرەج و هاوڕێکەی عەلی ئەورەحمان. بەڵام کاکەی فەرەج خۆی ووتی: حاجی حەمەرەحیمی بەڵخەیی نامەی نووسیبوو بۆمان لەو نامەدا نوسیبووی خاڵە بلە لەهەڵەبجەیە بەیانی مووچەی پولیسەکانی تەوێڵەو سۆسەکان ئەهێنێتەوە ئەگەر ئەتوانن بێن بۆی دانیشن.

---

ئەوانیش رەشە عەبابەیلەیی و حەمە کوڵبی ئەبن، لەبەرئەوە چالاکی پێشمەرگەکان سەرکەوتوو نابێت.

# زەعیم سدیق

منداڵانی کورد هەر لەتەمەنی منداڵییەوە گوێیان بەحیکایەت و داستانی کوشتن وبڕین و گرتن و لێدان و سووتان و ڕووخان ئەکرێتەوە، منیش هەر لەتەمەنی منداڵییەوە ناوی زەعیم سدیق و هێرشەکەی و دەبابەو تۆپخانەکانی وخەڵک کوشتنەکەیم بیستبوو. دواتر بۆم ڕوون بوویەوە کە لەساڵی١٩٦٣ دا عەبدولسەلام عارف هاتۆتە سەر حوکم، کاتێک داوای ووتوێژی لەگەڵ کوردەکان کردووە، کوردەکان بەهەلیان زانیوە بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی، دانووستانی لەگەڵدا بکەن، بەڵام هیچی لێ سەوز نەبووە، هەر هەمان ساڵ بەعسییەکان کودەتا ئەکەن، هێزی پێشمەرگەش لە تەوێڵە و بیارە و بناری هەورامان و هەڵەبجەوە بەهەڵی ئەزانن و زوو هێرش ئەکەنە سەر ڕەبیە و بارەگاکانی دوژمن لەنێوان خورماڵ و پردی زەڵمدا، هەندێک ئەگرن و هەندێک هەڵدێن، بەعسیش وەک عەبدولسەلام داوای ڕاگرتنی شەڕ ئەکەن و کوردیش ئەکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵیاندا.

لەوکاتەدا پێشمەرگە ئەچنە ناو شاری هەڵەبجە بۆ ئیشوکاری هاوبەش، لەگەڵ کاربەدەستانی ئەو کاتەی حکومەت. پێشتر جاش دروست بوون و هاوکاری حکومەتیان کردووە بەدژی پێشمەرگە. لەم کاتی ووتوو وێژەدا جاشەکان زۆریان چەک دائەنێن و پەشیمان ئەبنەوە لەهاوکاری کردنی ڕژێم. ئەم بارودۆخەش زۆر دەوام ناکات و حزبی بەعس بۆ دژایەتی کورد و دژی داوا ڕەواکانی، چی هێزی زەمینی و ئاسمانی هەبووە ئەیخاتەگەڕ و شەڕ دژی پێشمەرگە دەست پێ ئەکاتەوە.

ئەو جاش و خۆفرۆشانەی پێشتر چەکیان داناوە و داوای لێبووردنیان لەپێشمەرگە و گەلەکەیان کردووە، وردە وردە پەیوەندی ئەکەنەوە بەحکومەتەوە لە سەیدسادق کۆئەبنەوە. لیوای ٢٠ی سوپای عێراقیش کە یەکێک لەئەفسەرەکانی ناوی زەعیم سدیق بووە، بەرنامەی هێرش بۆسەر هەڵەبجە و هەورامان دائەنێن، لەمانگی ٦ و ٨ ی ساڵی١٩٦٣ دا زەعیم سدیق هێرش ئەکات، لەسەیدسادقەوە بۆ ناوچەی خورماڵ و پردی زەڵم بەهاوکاری

جاشە خائین و خۆفرۆشەکان. چەندین پێشمەرگە شەهید ئەبن، دوای چەندین جار تێک شکاندنی دوژمن و لێدانی زیانێکی زۆرلێی، دوا جار سوپای زەعیم سدیق تا نزیک ئاوایی زەردەهاڵ دێت.

ئەو کەسانەی فەرماندەیی پێشمەرگەو ئەو بەرگری و شەڕە پچڕ پچڕانەی ئەو سێ مانگەی چەمی زەڵم ئەکەن ئەمانە بوون: نەوشیروان فواد مەستی، فازل تاڵەبانی و حەمەی فەرەج، تەها بامەڕنیش لەدەوروبەری بیارە ئەبێت، بەڵام دەوری سەرەکی هی کاکە حەمەی فەرەج ئەبێت. لەو شەڕانەدا حەوت پێشمەرگە شەهید بوون، ئەوانیش ئەمین دەگا شێخانی، عینایەت ئێناخی، حەسەن عەبدولقادر نەورۆلی، عەلی حەمەئەمینی ئێناخی، نادر حەمەحەسەن، عەلی ئەحمەد، حەمە گوڵپی. هەر لەو شەڕەشدا کوڕێکی ئەمینە کەچەڵ بۆتە قوربانی.

هێزی پێشمەرگە پاشەکشە ئەکات بۆ تەوێڵە و بیارە و بەرزاییەکانی بناری هەورامان، زەعیم سدیق خۆی لەگەڵ سەرۆک جاشێکی ناوچەکە دێتە ناو ئاوایی خارگێلان، سوپا و دەبابەش دەگەنە زەردەهاڵ. لە خەرپانییەوە جەماوەری ئاواییەکە بەرەو خارگێلان ئەڕۆن، فەقیانەی سپی دەستیان ئەکەن بە ئاڵای سپی بۆ ناونیشانی خۆبەدەستەوەدان بە دروشمی بژی جەیش و جاش ئەچنە پێشەوە زەعیم سدیق ئەپرسێت چی ئەڵێن ئەوانیش بژی وەرئەگێڕن (تەرجومە).

لەئاوایی خارگێلان پیاوێکی ئاواییەکە بەناوی کەریم کەئێستا کوڕێکی بەناوی مینەوە ماوە قسە لەگەڵ زەعیمدا ئەکات و ئەیترسێنێ، ئەڵێت لەزەردەهاڵەوە هەتا تەوێڵە لەنزیکەی پەنجا جێگەوە جادە براوە و نزیکەی دوو هەزار کەس لەبۆسە و کەمیندان، ئەویش ئەگەڕێتەوەو سوپاش پاشەکشە پێئەکات.

لەو کاتانەشدا کەسوپا لەنزیک خارگێلان و ئاوایی زەردەهاڵە، تەقوتۆق بەپچڕ پچڕی هەیە، پێشمەرگە بەشلەژاوی و شکاوی لەناوچەکەن و لەناو باخەکانی بیارەدا لە بۆسەدان، کەمالی سەلیم بەگ ئەچێتە سەر سەنگەری دوو پێشمەرگە و بەزمانی عەرەبی قسەیەک ئەکات، ئەوانیش وا ئەزانن سەربازە و گوللەیەک ئەنێن بەسەر دڵیەوە و ئەیکوژن. کەمال پاسەوانی نەوشیروان فواد مەستی ئەبێت. دوژمن لەم سێ مانگەدا ژمارەیەکی زۆریان

لێ ئەكوژرێ، ئەم سوپایەش لەئاوایی سیارە ی لای دەربەندیخان نزیکەی ٢٠ کەسی مەدەنی و بێچەکیان گولە باران کردووە[١].

[١] ئەمە ناوی ئەوکەسانەیە کە سوپاکەی زەعیم کوشتوونی لە گوندی سیارەی لای دەربەنی خاندا: ١- مەلا مەحمود میران ئەحمەد، ٢- محەمەد میران ئیسماعیل، ٣- فەرەج حەمەئەمین، ٤- رەمەزان مەحمود رەحمان، ٥- رەسول مەحمود رەحمان، ٦- ئەمین خەسرەو، ٧- حسێن فەتاح رەحمان، ٨- عەزیز کەریم، ٩- غەفور فەرەج، ١٠- ئەحمەد مارف وەسمان، ١١- عەبدولقادر حەمەئەمین، ١٢- کەریم پیرۆەیس حەمە، ١٣- قادر حەمە ئەمین رەحمان، ١٤- مەولود رەحمان حەمە ئەلیاس، ١٥- سەباح ئەحمەد عەلی، ١٦- فەتاح رەحمان رەزا، ١٧- سالح میر وەیس، ١٨- سابیر تەوفیقە شەل.

# بارودۆخی هەورامان
# لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلولدا

پاش گرتنی بنکەکانی پۆلیس لە تەوێلە و سۆسەکان و بیارە، ئیتر ناوچەی هەورامان بووە سەنگەری گەورە و پەناگەیەکی باشی هێزی پێشمەرگەی کوردستان. لەسەرەتادا فەرماندە و بەرپرسەکانی هێزی پێشمەرگە خەڵکی هەڵەبجەو هەورامان و شارەزوور بوون، تاگەشتونەتە قەڵەمڕەوی ناڵپاریز و پێنجوێن و دەشتی شلێرو ناوخوان. ئەو بەرپرسانە بەشێوەیەکی جوان مامەڵەیان لەگەڵ پێشمەرگە و خەڵکی دەڤەرەکەدا کردووە و بەشێوەیەکی گشتی دڵی خەڵکیان ڕازیکردوە بۆ تێکڕای پێشمەرگە و جەماوەرەکەیش نامۆ و نەناسراو نەبوون، بەڵام دواتر کە شۆڕش پەرەی سەندو هێزی پێشمەرگە فراوان و فراوانتربوو، ژمارەیەک بەرپرس و فەرماندەی تر هاتن و جڵەوی گەلێک لە کارەکانیان گرتە دەست خۆیان و بەباشی لەگەڵ خەڵک و پێشمەرگەش هەڵسوکەوتیان نەکرد.

ئەوەش دواتر زیانی گەورەی لێکەوتەوە، چونکە ئەو بەرپرسانە هیچیان لە چۆنییەتی دابونەریتی خەڵکی ناوچەکە نەئەزانی و سەریان لەخوێندنەوەی باری دەروونی و کۆمەڵایەتی و سیاسی فەرهەنگی کلتوری دانیشتوانی ئەم سنوورە دەرنەچوو، بۆیە ئەمەش بوو بەمایەی ئەوەی گرژی و هەڵوەستەو ناڕەزایی دروست ببێت. ئەوان سووکایەتیان بەپیاو ماقوڵ و خەڵکانی دڵپڕ لەکوڵی کوردایەتی کرد، لێیان گرتن و نەفسی بڵندیان شکاندن، یان دووریان خستنەوە و تەنانەت ئەوەشی کە بەدڵی ئەوان هەڵسوکەوتی نەئەکرد ئازاریان ئەدا.

ئەم بەزۆر خۆسەپاندنەی ئەو بەرپرسانە، بڕێکی زۆر زیانی بە شۆڕش گەیاند و برایەتی و تەبایەتی بڕشتی لێبڕا. مەبەست ئەوەیە بڵێین لەکاردانەوەی هەڵسوکەوتی ناشۆڕشگێڕانەی ئەو بەرپرسە هاتوانەدا. چەندین کەسی دیارو تێکۆشەر ناچاربوون بەدڵ شکاویەوە ماڵئاوایی لە شۆڕش بکەن و پاڵ بدەن بەڕژێمەوە و ببنە جاش و هەڵگەڕێنەوە لە ڕێبازی کوردایەتی.

مەفرەزەی یەکەمی دەڤەری هەڵەبجە بەفەرماندەیی مامۆستا شێخ حەمە ئەمین شێخ ئەولا پێک هاتبوو، کە هەڤاڵەکانی بریتی بوون لە کاکە حەمەی فەرەج، عەلی ئەحمەد ناسراو بە عەلی شیعە، مستەفا کەریم ناسراو بە مچەکەچەل، جەمال بابان، حەمەی حەمە تایەر بەگ، شێخ سەعیدی موفتی، مەحمودی مایجان، نوری محەمەدی نانەوا، عومەر محەمەد ناسراو بە عومەر دوو لوولەو نوری غەفاربەگ و چەندین کەسی تر.



ئەم مەردانەی مەیدان لەسفرەوە دەستیان پێکرد و بوونە یەکەمین بەردی بنچینەی شۆڕشی ئەیلول. شایەنی باسە بۆ مێژووش بڵێین ژمارەیەکی باش لەشاری هەڵەبجەو دەورو بەریدا بوونە هاودەنگی پێشمەرگە و گیانێک بوون لەدوو جەستەدا، ئەو تێکۆشەرانەش بریتی بوون لەئەحمەدی شێخ ڕەووف، ڕەئوف حاجی حەمەعەلی، حەمەی کوێخا کەریم، حیکمەتی مەلاعەلی، عەلی مام ڕەزا، ئەحمەدی حەمە ساڵح، عومەری خەزان، خالیدی حاجی فەرەج، ڕەووفی ڕەحیم، عوسمانی عەلی حاجی ساڵح، ساڵح مەلا محەمەد، مەلا لەتیفی بامۆک، عەلی شاوەیس، جەمال خەفاف، کەمال خەفاف، توفیق ڕەحیم، لەتیف قادر، مەنسور براخاس هاواری، مەلا ڕەووفی دەروێش تۆفیق، مەلا عابید، ماجید حەمەی باول، عوسمان کەریم عارف، حەمەی ئەحمەد مایجان، باقی محەمەد عەزیز، عەلی حەمەگیانە، حاجی موشیری کۆکۆیی، شێخ کەمالی عەبابەیلی.

عەلی شاوەیس یەکێکە لە کادرەکانی سەرەتای شۆڕشی ئەیلول، دۆستێکی نزیکی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بووە لە تێکۆشەرە پاک و دڵسۆزەکانی ڕێگای کوردایەتییە، لە پێش ١٤ تەمموزی ١٩٥٨ لەگەڵ چەند کادرێکی تر لە سنوری هەڵەبجەدا کاری سیاسی کردووە، تا دروست بوونی شۆڕش و

لەپێکهاتەی هێزی پێشمەرگەشدا دەوری بەرچاوی هەبووە. سەبارەت بەکاری ئەو سەردەمەش کاک عەلی ووتی: من و حیکمەتی مەلا عەلی و شێخ سەعید و علی مام رەزاو چەند کەسێکی تر ئەگەڕاین لە هەورامان و هەڵەبجەو شارەزوور و پێنجوێندا بۆ دروستکردنی دۆست و لایەنگر بۆ حیزب، لەوکاتەدا کودەتای ١٤ی تەمموز ڕوویدا، ڕۆژێک لە هەڵەبجە لە نزیک مزگەوتی دار الاحسان کابرایەک هات لە خۆمی پرسی، ماڵی عەلی شاوەیس کامەیە؟ ووتم من عەلی شاوەیسم تۆ کێیت؟ ووتی من مەحمود کاوانیم، نوری ئەحمەدی تەها منی ناردووە بۆ ماڵی ئێوە، پێکەوە چووین و بردمەوە بۆ ماڵەوە جانتایەک پارەشی هێنابوو بۆ جوانڕۆییەکان، کە ئەوکات لە هەڵەبجەدا بوون و شەڕیان لەگەڵ ڕژێمی شای ئێراندا ئەکرد. بڕنەوێکم کڕی بوو. مەحمود ووتی: زۆر جوانە ووتم ئەبێ بیبەیت بۆ خۆت، ووتی چۆن ئەبێ؟ بە سوێن دامێ.

کاوانی ووتی: ئەیبەم سدیق میرانی پێ ئەکوژم، چونکە بارزانی بەمامۆسبرایمی ووتوە بیکوژن، من لێرەدا قسەکانم پێ بڕی و ووتم کاک عەلی سدیق میران کێیە؟ ووتی: پیاوێکی باش بوو شۆڕش لێی ئەترسا خەڵکی دەوروبەری شەق لاوەە بوو. درێژەی بە قسەکانی داو ووتی: پێکەوە چووینە سلێمانی بۆ لای حەسەن شێروانی، کە ئەو کات بەڕێوەبەری پۆلیسی سلێمانی بوو بڕنەوەکەی بۆ گۆڕینەوە بە بڕنەوێکی وەستەی تازە، مەحمود بردی و ڕۆیشت.

عەلی شاوەیس درێژەی دایە و ووتی: هەر لەو ماوەیەدا مامۆستا برایم لە بەغداد فەرمانی گرتنی دەرچوو بوو هاتبوە سلێمانی بە نهێنی، هێشتا شۆڕش دەستی پێ نەکردبوو، ڕۆژێک من (عەلی شاوەیس) و عەلی مام رەزا و حیکمەتی مەلا عەلی و نوری حەمەی نانەوا سەردانمان کرد، لەماڵێکدا بوو لە نزیک پارێزگای کۆنی سلێمانی، دوای ئەحواڵ پرسین و پشوودان کاک برایم ئەحمەد هەندێک قسەی بۆ کردین لەسەر بارودۆخی حیزب، دواتر عەلی مام ڕەزا ووتی: مامۆستا برایم هەروا بەپەلە و بێ هیچ شتێک بەدەستی خاڵی هاتووە و پارەی پێنییە، پارەتان پێنییە بیدەنێ؟ حیکمەت و نوری هەردووکیان ووتیان پێمان نییە، وابزانم پێیشیان بوو، من ١١٠ دینارم پێبوو، ووتم پێمەو دامە دەست عەلی مام ڕەزا و ووتم بیژمێرە ژماردی و ووتم ١٠ دینارەکەم

بەدەرەوە باپێمبێ، سەدەکەشی دایە دەستی مامۆستا برایم، مامۆستا ووتی عەلی خۆ ئەمەش نەبێ من و تۆ یەک ئەناسین دوایی پارەکەت بۆ ئەنێرمەوە، داوای نەکەیتەوە لە عەلی مام رەزا، کەچی دوایی هەر نەیناردەوە. لێرەدا قسەکانم پێ برییەوە و پرسیم کاک عەلی، مەحمود کاوانی دواتر چی لێ هات؟ ووتی: مەحمود کاوانی دوای ئەوە گەڕابووەوە سدیق میرانی کوشت ئینجا هاتوو شەڕەکەی ئەزمڕی کرد، لەو شەڕەدا حەمید کاوانی ئامۆزای شەهید بوو، لەگەڕانەوەیدا نامەیەکی بۆ نوسیبووم، باسی ئەوەی کردبوو ئەگەر حەمید شەهید نەبوایە ئەهاتم بۆ هەڵەبجە بۆ لات .

دیارە لە باسەکە لاماندا بابگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان. لەهەورامانیش دۆستانی حیزب ئەوکات ئەمانە بوون سەعدی بەگی قادر بەگی جافر سان، حاجی ئەولەی نەسە، یارئەحمەد بەگی ئەفراسیاو بەگ، نوری غەفار بەگ، عیزەتی حەسەن، مەهدی ئایزە، عیزەتی حەمە سەعید، مستەفا حاجی فەرەج و حاجی حەمەساڵحی[1] برای، مام عەبدولخالق عەبدولوەهاب، حاجی حەمەرەحیم بەڵخەیی، تایەری حەبیب، عەبدوڵلای حسلە، حەمە سەمینۆفی بیارەیی، کەمال ئەحەڕووش، سەعید حەمەیوسف-سەعە لەیلە، فەرەجی لەمە، ڕەشەی ساڵحە. کەدواتر لەسەر بەناڕەوا کوشتنی کەمالی ئەحەڕەش بوو بەدوژمنێکی هاروسەرسەختی دژی پێشمەرگە و شۆڕش.

لە شارەزوور و بناریشدا گەلێک کەس هەبوون وەک حەمە ساڵحی لاوەلا، حاجی موشیری باوکی شەهید شەوکەت، حاجی حەمە ئەمینی قاجری، حاجی خالیدی بەشارەتی باوکی کاک حامد، شەهید حەمە ساڵحی باوکی شەهید عومەر، سەباح بەگی حەمە سەعید بەگ، شەهید ئەحمەی حەمە ئەمین ، عەبدوڵلای تریفەیی شەهید حەمەئەمین تریفەیی، حەمەی هەواسی ئێناخی، قادری برزوم بەگ، قادرکوکویی، حسەینی عارف، مەلا سەعیدی زمناکۆ، شێخ حەمە ئەمینی کاردۆخی، شێخ محەمەدی نەقشبەندی.

---

[1] - لەتەوێڵەدا ئەو سەردەمە بنەماڵەکان و خەڵکەکە بەگشتی، یان شیوعی بوون یان پارتی، لەناو زۆربەی خێزانەکاندا لەهەردوو حیزبەکەی تیابوو، بۆنمونە لەماڵی حاجی فەرەج دا کورەکانی: کاک حەمەحسێن شیوعی و حاجی مستەفا و حاجی حەمەساڵح پارتی بوون.

جارێکیان مام جەلال لەدانیشتنێکدا بۆی گێڕاینەوە ووتی: لەماڵی حاجی موشیر لە تەپی سەفا، هەموو سەرۆک هۆز و تیرەکانی ناوچەکەمان کۆکردەوە، باسی ئەوە کرا سوێند بخۆن یان سوێند بدرێن، کە خیانەت لە کورد نەکەن، لەوانەی لەوێ بوون هەموو سوێندیان خوارد، جگە لە شێخ محەمەدی شێخ حسامەددین و حاجی مشیر، بەڵام دواتر هەر ئەو دوانەو چەند کەسێکی تر خیانەتیان نەکرد، چەندین کەس لەسوێند خۆرەکان خیانەتیان کرد!

دێینەوە سەر یەکەم مەفرەزەکەو دەڵێین یەکەمین چالاکی، کە تێدا سەرکەوتن کوشتنی دوو پۆلیسی گومرگ دەبێت بەناوەکانی حەموودی و سەید حەسەن لە شارەدێی تەوێڵە. هەموو جارێک دایکم باسی ئەکات ئەڵێت تۆ ئەوکاتە لەدایک بووی، کەحەموودی وسەید حەسەن[1] کوژران.

---

[1]- کوشتنی حەمودی و سەید حەسەن، کە دوو پۆلیسی گومرگ بوون لە تەوێڵە بەم شێوە بووە: کاتێک شێخ حەمە ئەمین بارەگای لە وەزگێڵ دانا، مام عەبدولخال لە تەوێڵەوە بەنهێنی چووە سەردانی و داوای لە شێخ کردووە بێنە ناوچەکە و جەولە بکەن. ئەوکات بەرپرسی گومرگی تەوێڵەش ئازاری خەڵکی داوە، پێی ووتون ئەتوانن کە هاتن ئەویش تەمێ بکەن و خەڵکیش بتانبینێت و بزانن پێشمەرگە دروستبووە، ئەوانیش ووتویانە باشە، چەند ڕۆژ دوای گەڕانەوەی مام عەبدولخالق، نامەیەک هاتووە بۆ ڕێکخراوی تەوێڵە تیایدا نوسراوە ئەوە پێشمەرگەکان هاتوون لە باخی لێژەی کەریم بەگن لە ئاوایی پالانیا. لەو بارەوە مام عەبدولخالق دەڵێ: چووم سەردانم کردن نزیکەی ١٥ کەس بوون، شێخ غەفوور برای شێخ حەمە ئەمین لەگەڵیان هاتبوو، لەوێ قسەمان کرد وتیان شێخ حەمە ئەمین ئێمە ناردوە، کە ڕێکخراوی تەوێڵە چی ئەڵێن وابکەین، ڕیکخراویش ئەوسا هەم بەژمارە کەم بووین و هەم چالاکیمان دیارو بەرچاو نەبوو، من گەڕامەوە بۆ تەوێڵە. تاهیری حەبیبە پێشمەرگە بوو لەگەڵیان بڕیاردرا شەو بیان هێنێ بۆ دەرەی بەڵخ کە باخێکی کەنارو چەپەکە و نزیکە لە تەوێڵە. بەڵێ شەو هاتوون و ڕۆژەکەی کەلوپەل و خواردەمەنیان بۆ ئامادەکراوە، خێزانی حاجی مستەفای حاجی فەرەج بەناوی نەزیرە خان لەگەڵ عیزەت مستەفا ناسراو بە عیزەتی مچە بۆیان بردوون بۆ دەرەی بەڵخ. حاجی ئەولەی نەسە دانراوە بەرنامە و نەخشەی عەسکەری دابنێ کە چۆن پێشمەرگە شەو هەم بەرپرسی گومرگەکە و هەم بەرپرسی بنکە تەندروستیەکە بگرن. حاجی ئەولەش نەخشەکەی بەم شێوەیە داناوە دەستەیەک پێشمەرگە لەگەڵ نوری خەفار بەگی جەعفەر سولتان، دەستەیەک لەگەڵ تاهیری حەبیبە هەورامی بچنە سەر ئەو دوو کەسە، حاجی ئەولە خۆیشی کەرێکخستن بووە و چەکی هەبوو، لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگە بچێتە

چالاکی دووەم: دانانی بۆسەیەک بووە بۆ خالە بلە هەر وەکو پێشتر لە جەلال وەیسیمان وەرگرتبوو یاداشتمان کردوە. لەچالاکی دووەمدا، پۆلیسێکی بنکەی سۆسەکان کوژراوە بەناوی قادر کە خەڵکی چەرمەگا بووە، ژێربەژێر ئەندامی پارتی بووە، هاوڕێکانی قادر حەمەکوڵپی و ڕەشەی عەبابەیلێی بوون، تفەنگەکەیان بردووە خۆیان بەبرینداری بەجێهێشتووە. حاجی عەلی بەڵخەیی لەو بارەوە پێی وتووم:

دانانی ئەو بۆسە وەکو باسکراوە بۆ بردنی مووچەی پۆلیسەکانی تەوێڵە نەبووە، بەڵکو بۆ کوشتنی بەکاربەری ڕەشاشەکەی سەر ئەو مسەلەحە بوو، کە پێشتر لە هەڵەبجەدا تەقەی لە حەمەی فەرەج و عەلی ئەوڕەحمان کردبوو عەلی شەهید کردبوو وە حەمەی فەرەجیش دەرچوو بوو. هەروەها وتی: من پێشتر لەگەڵ کەمینەکەدا بووم، کاک حیلمی ناردمیەوە بۆ بەڵخە وتی: تۆ بڕۆ بانەبینرێیت نامانەوێ قاچاخ ببیت، من گەیشتمەوە ئاوایی چایخانەکە تازە کرابوویەوە، سەرجادە قەرەباڵغ بوو، بینیمان ٣ سێ پۆلیس لەمەخفەری سۆسەکانەوە هاتن و ئەچن بەرەو سەید سەلام بۆ پاسەوانی ڕێگاکە، تا خالە بلەو پاسەوانەکانی لەهەڵەبجەوە ئەگەنە تەوێڵە، ئەو سێ کەسە حەمەکوڵپی و ڕەشەی عەبابەیلێ و قادر چەرمەگایی بوون. لەبەڵخە تێپەڕبوون، من گوێم

---

گەڕەکی بەرامبەر، ڕوبەڕووی مەرکەزی پۆلیسی تەوێڵەدا سەنگەر بگرێ، تا لەکاتی هاتنە دەرەوەی پۆلیسەکاندا ئەو بیانداتە بەر تەقە و نەهێڵێت بچن بەدەم ئەو دوو شوێنەوە. شارەزایی حاجی ئەولە لەکاری سەربازی و شەڕکردن بەهۆی ئەوەوە بووە پەیوەندی و دۆستایەتی هەبوە لەگەڵ بەگزادەکانی هەوراماندا بەتایبەت لەگەڵ حەمە ڕەزابەگی کوڕی جافرساندا، ئەوانیش خاوەنی لەشکری چەکدارو شەڕکەربوون. شەو حاجی ئەولەو دەستەکەی چوونەتە جێگای خۆیان، ئەو دوو دەستەی تر مام عەبدولخالق لەگەڵیاندا بووە لە خوار تەوێڵەوە چاوەڕێیان کردووە، حاجی ئەولە بگاتە شوێنی خۆی، لەوکاتەدا دوو پۆلیس لەسەر جادەکە لە خوارەوە باجیان سەندووە لە خەڵک و لە وڵاخدار، زانیویانە بەجەماعەت و ڕیزیک دەمانچەیان تەقاندوەو ویستویانە ڕابکەنەوە بۆ ناو تەوێڵە، بەڵام دوو پیشمەرگە فریا کەوتون و هەردووکیانیان کوشتوون، ئەو دوو پێشمەرگەش حەمەی حەمە تاهیر بەگ و نوری خەفار بەگ بوون، چوونەتە سەریان چەکەکان و دەمانچەکەو پارەکەی لە خەڵکیان سەندووە هێناویانە. ئەڵێن پارەکە لەگیرفانی سەید حەسەندا گوللەی بەرکەوتووە کون بووە، لەبەر ئەوە ئیشەکە سەری نەگرتووە و پێشمەرگەکان گەڕاونەتەوەوە بۆ وەزگێل .

ڕادێرابوو بۆ بیستنی تەقە، تەقە دەستی پێکرد، ئەم سێ کەسە کەوتبوون بەسەر کەمینەکەدا بەر لەوەی خاڵەبلە بگات، قادر کوژرا بوو، حەمەگوڵپیش چەکەکەی هێنابوەوە و لەگەڵ ڕەشە ڕایان کردەوە بۆ مەخفەرەکەی سۆسەکان. دواتر خەڵکی ئاوایی چوون قادریان بەبرینداری هێنا، کە گەیشتە ئاوایی بەڵخە گیانی سپارد.

با ئەمە بگێڕمەوە وەک نوکتەیەک خاڵە بلە پێش سەرهەڵدانی شۆڕش و پێشمەرگە هەربەرپرسی بنکەی پۆلیسی تەوێڵە بووە. ئەوسەردەم و وەختە هاوینان خەڵکی تەوێڵە لەسەربانەکان خەوتوون لەناو کەپردا، چەتە واتە ئەو کەسانەی قاچاخ و داواکراو بوون لەلایەن پۆلیسەوە، جاروبار چەتەکانی ئەودیو واتە شۆشمێ و نەوسوود شەوانە لەسەر شاخەکانەوە تەقە لە شارەدێی تەوێڵە ئەکەن، خەڵکیش لەناو کەپر و سەربانەکانەوە بۆ خۆپەنادان چوونەتە ناو ماڵەکانیانەوە، پیاوێک بەناوی مام عەولای حسلە لەتەوێڵە دۆستی خاڵە بلە دەبێت، لەژێریشەوە پەیوەندی بەچەتەکانەوە هەبووە، بەڵام خاڵە بلە بەمە ئەزانێت، بۆ ئەوەی مام عەولا بزانێت، خاڵە بلە ئاگای لەپەیوەندیەکەی هەیە لەگەڵ چەتەکاندا، عەسرانێک بازاڕی تەوێڵە قەرەباڵغ دەبێت مام عەولاش لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکدا وەستاوە، خاڵە بلە بەلایدا تێپەڕ دەبێت و بەدەنگی بەرز دەڵێت: ها... عەولا ئەم شەو لە دەرەوە بخەوین یان لەژوورەوە؟

ماوەیەکی کەم دوای چالاکییەکەی سەید سەلام هێزێکی ٢٥ کەسی پێشمەرگە لەئاوایی بەڵخە ڕێگای تەوێڵە-بیارە کۆنترۆڵ ئەکەن، هێزێکی دیکەش دەچنە ئاوێسەر، بەرنامە دائەنێن بۆ گرتنی پۆلیسخانەی تەوێڵە، بەهۆی ئەندامانی پارتی لەتەوێڵە، دەکەونە گفتوگۆ لەگەڵ خاڵە بلەدا بۆ ئەوەی بنکەکەیان تەسلیم بکات، دوای هێنان و بردنی چەندین قسە بەئەنجام ناگەن. ئەندامانی گفتوگۆکار مام عەبدولخالق هەورامی و چەند کەسێکی تر ئەبن، مام عەبدولخالق تێکۆشەرێکی دیاری ناوچەی هەورامانە لە هەردوو شۆڕشەکەدا. خاڵە بلە ڕۆژ بەرۆژ کات دەکوژێت تا هێزی ڕژێم بێت بەدەمیەوە، دواتر لە ڕۆژی ١٩٦٢/٩/١٢ دا پێشمەرگە بنکەکە دەگرن. دەستکەوتیان بریتی دەبێت لە ٢٤ پارچە چەک و یەک ڕەشاش و یەک بێتەل و یەک دووربین و یەک دەمانچەو ژمارەیەکی زۆر فیشەک. پێشمەرگەکان بۆگرتنی پۆلیسخانەکە

چەکی تەواویان پێنابێت، عەلی حەبیبوڵا عەلیە سانە ئەڵێت: من مسەسەلێکم پێبوو هی ماڵی سەعدی بەگی قادر بەگ بوو، شێخ حەمەمین ناردی لەدۆڵبیان لەماڵی باپیرت تفەنگێکی ژێرساف و لەپاڵانیاش سێ تفەنگی داداشیان لەلای سێ هاووڵاتی هێنا ئەوانیش غەفوری عەزیز بەگ، حسێن عوسمان بەگ، هەسەنی حەمەڕەزا بەگ بوون. دوای ئەم سەرکەوتنە ئیتر هێزی پێشمەرگە لەو شارەدێییەدا جێگیر دەبن و لەوێوە دەکەونە ئەنجام دانی چالاکی نواندنی تر، وەک گرتنی هەردوو بنکەی پۆلیسی سۆسەکان و بیارە کەدەستکەوتیان ٢٥بیست و پێنج پارچەچەکی دیکە بووە، لەگەڵ ژمارەیەک کەل وپەلی سەربازیدا. لەم چالاکیەدا چەندین پۆلیس دەبنە پێشمەرگە لەوانە حەمەگوڵپی، حەسەنی محموود بەگ، حەمە سەمینۆف، ئەوانەشیان کەبەدیل گیراون ئازاد دەکرێن، بەمەرجی ئەوەی کەهەرگیز زیانیان بۆ شۆڕش نەبێت و دەست بگرن بەک لاوەی خۆیانەوە.

لەکاتی گرتنی بنکەی پۆلیسی بیارەشدا وادیە کەچەڵ چاوشی بنکەکە بووە، ئەم کەسە پیاوێکی چاک بووە، ماوەیەک بەر لەگرتنی بنکەکە یار ئەحمەد بەگ ئەفراسیاوبەگ بانگی دەکاتە ماڵی خۆی و پێی دەڵێت تۆ بۆ خۆت بڕۆلێرە مەمێنە چۆڵی بکە بالەکاتی گرتنی بنکەکەدا لەوێ نەبێت، ئەویش بەگوێی مامەیارە دەکات و بەهەرجۆرێک بووە خۆی دەدزێتەوە. بەم جۆرە لەسەردەستی تێکۆشەرانی سنوورەکە ناوچەکە ئازاد دەکرێ و بارەگا دادەمەزرێت، پاشان وردە وردە گەشە دەکەن و بەرەو سنوورەکانی تر دەکشێن. وەک پێشتر ئاماژەمان پێکرد تا لەم سەرو بەندەدا لەهاوینی ساڵی ١٩٦٢دا کۆمەڵێک پێشمەرگە لە شاربازێڕەوە دێنە سنوری قەزای هەڵەبجە، ئەو هێزەش بەسەرپەرشتی عبدالوهاب ئەتروشی بووە کەخۆیشی پێشتر پۆلیس بووە لەیەکێک لەبنکەکانی سنوری چوارتا. لەم هاتنەیدا حەمەی سەید عەلی و شێخ محەمەدی کارێزە و عەریف جەباری لەگەڵدا بووە. هەر بەهاتنی ئەمان شەڕی نێوان پارتی و شیوعی لەئاوایی چاوگی کۆکۆیی نشین دەستپێ

دەکات. لەم شەڕەدا حەمەی ئیبراهیم و خێزانی شەهید مەجیدی مەلا حامد شەهید دەکرێن[1].

ورده ورده عەبدول وەهاب ئەتروشی دەست دەکات بەپاکسازی ئەوانەی کە ناچنە ژێر فەرمانی نارەوایەوە، لەگەڵ پۆرت شکاندنی ئەم و ئەودا جەلادێکی دڕندەشی هەبوو بەناوی فەیازە کوێر کە خوا بەو گەورەییە تۆزقاڵێک سۆزو بەزەیی پێ نەبەخشیبوو، بەزیادەوە بڕیارە چەوتەکانی بەرپرسەکەی جێبەجێ دەکردو بەرپرسەکەش چرکەیەک لەژیانی ئەوی نەدەگۆڕیەوە بە دەیان پێشمەرگە، ئەوەش لەبەر بەدبەختی شۆڕش بوو کە ئەو دوانەی کردبووە گورگ و کەڵبە.

عەبدول وەهاب کاری خۆی کردو بوو بەفەرماندەی هێزو باڵی بەسەر تێکڕای سنوورەکەدا کێشا، تا دروست بوونی دووبەرەکی لەنێوان باڵی مەکتەبی سیاسی و سەرۆک بارزانیدا. ئەم دووبەرەکیەش بەچەند شێوەیەک باس و خواسی لەسەر دەکرێت و بەهۆکاری جیاواز جیاواز لێک دەدرێتەوە[2]. من خۆم لەزاری کاک سەلاحی شێخ شەرەفم بیستووە کەووتی: سەرەتای دروست بوونی دووبەرەکی خەتای خوالێخۆشبوو نوری شاوەیس بووە، لە کۆبوونەوەیەکدا کردوویەتی بەدەنگە دەنگ لەگەڵ بەرزانیدا و خۆی تورە کردوو لێیدا چووە دەرەوە، هەروەها لەکوێخا سمایلی تەلانم بیستووە ناکۆکییەکە، یەکێک لەهۆکارەکانی، کێشەیەک بووە، بارزانی ویستویەتی محاسەبەی پیاوێک بکات بەناوی مەجید گورگە لەبێتواتە، مەلا ماتۆڕ بەرگری لێکردووە و لەدەست مەلامستەفا قوتاری کردوە، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدو هەڤاڵەکانی بەرگریان لێکردووە. هەرچەندە مام جەلال لای بارزانی بەڵێن وەردەگرێت کەمەلا ماتۆڕ ببەخشێت ئەویش بەخشیویەتی بەڵام بەومەرجەی بچێت بۆلای. داستانەکەی مام کوێخا بەم جۆرەیە: بارزانی مام جەلالی زۆر

---

[1]- کە تەقە دەست پێدەکات ئەو ژنە دڵسۆزە، بۆ ئەوەی برا دەستی نەچێتە خوێنی برای، دەچێتە ناوجەرگەی شەڕەکە و قورئان بەرزدەکاتەوە، بەڵام شەڕ نەوەستاوەو ئەمیش گوللەیەک ئەیکاتە میوانی گۆڕو شەهید ئەکرێت.

[2] – لەکتێبی دیداری تەمەندا، بەشی یەکەم لاپەرە ٢٨٧ تا ٢٩١ مام جلال بەدرێژی لەسەر ئەم بابەتە قسەی کردوە. بەتایبەت لەلاپەرە ٢٨٠دا بەسێ خاڵ هۆکارەکانی جیابوونەوەو تێک چوونی نێوان بەرزانی و مەکتەبی سیاسی ئەو سەردەمەی خستووەتە ڕوو،

خۆش ویستووه جێگەی متمانەو دڵنیای بووه لای، پێشتر بارزانی نووسراو نامە بۆ هەموو سەرۆک هۆزەکان و شێخ و مەلاو پیاوە ناودارەکان ئەنێرێت، لەونامەدا، ئەڵێت مام جەلال نوێنەری منە، داوایان لێ ئەکات پشتگیری بکەن و یارمەتی بدەن.

مام جەلال دێتە خوارەوە جەولەو گەشتێک ئەکات تا ئەگاتە هەڵەبجەو شارەزوورو پێنجوێن، لەوسەرو لەم سەرەوە ئەچێتە تەلان، لەگەڕانەوەدا مام کوێخا داوای لێ ئەکات لەگەڵ خۆی بیبات بۆ لای بارزانی، ئەویش ئەیبات، ئەگەنە پێشەوە لە کاتی نانخواردندا بارزانی بە مام جەلال ئەڵێت: حەز ئەکەیت کێیتر لەگەڵمان نان بخوات، ئەویش ئەڵێت مام کوێخا، بانگی ئەکەن، لەکاتی نانخواردنەکەدا مام جەلال ئەڵێت من نان ناخۆم تا کێشەیەک هەیە بۆم چارەسەر نەکەیت، ئەویش ئەڵێت بەسەر چاو چیت بوێت بۆت ئەکەم جگە لە کێشەکەی مەلا ماتوڕ، مام جەلالیش ئەڵێت وەڵا کێشەکەی مەلا ماتوڕە، بارزانیش ئەڵێت نانەکەت بخۆ ئەیبەخشم لەبەر خاتری تۆ، بەڵام هەر ئەبێ بێت بیبینم، مام جەلال زۆری پێخۆش بووه، بەڵام دوایی چەند کەسێک ناهێڵن بچێت بۆ لای. بەرزانیش هەرسووربووه لەسەر بڕیارەکەی خۆی، چونکە مەجید گورگە، پەلاماری ژنێکی داوەو بەرزانیش بەڵێنی داوە بەژنەکە توندترین سزای گورگە بدات.

ئەڵێن کەس نەبووه وەک بەڕێز مام جەلال بەڕاشکاوی لەگەڵ مەرحومی بارزانیدا گفتوگۆی کردبێت لەسەر کێشەوگرفت و کاری ڕۆژانەی شۆڕش و حیزبایەتی، بارزانیش لەگەڵ کەسی تر وەک مام جەلال نەبووه، بۆیە مام جەلال بە دڵ دژی دووبەرەکی و جیابوونەوە بووه، بارودۆخ و پەیوەنی کۆمەڵایەتی و کەسێتی، چارەسەر نەکردنی کێشەکان ناچاری کردووه لەگەڵ ئەو جیابوونەوە بڕوات.

شێخ محەمەد سۆڵەیی ووتی: بارزانی مام جەلالی زۆر خۆش ئەویست، مام سەرپەرشتی شەڕی چەمی ڕێزانی ئەکرد شەڕێکی سەخت بوو، بارزانی پەیامی بۆ ناردبوو پاشەکشە بکات و پێشمەرگە بەکوشت نەدا، مام جەلال وەڵامی داوەتەوە پاشەکشە ناکەم ئەگەر لەسەدا حەفتاو پێنجی پێشمەرگەکەم بەکوشت داوە، دووبارە بارزانی پەیامی بۆ ئەنێرێتەوە، ئەڵێت چەمی ڕێزان چەم و دۆڵێکە حکومەت هەر ئەیگرێت دوای گرتنیشی بەجێی ئەهێڵێتەوە،

بۆیە باشترە پاشەکشە بکەیت. (ئەم قسەی بەرزانی چەندە ژیرانەو لەجێگەی خۆیدابووە - نوسەر)، کێش توانیویەتی بەم جۆرە لەگەڵ بارزانیدا گفتوگۆ بکات.

لە شۆڕشی نوێ و لەساڵی ١٩٧٨ەوە من مام جەلالم ناسی، خۆشی ویستووم و منیش لەبەر خاتری ئەو لەناو یەکێتییدا کارم کردووە و تێکۆشاوم، نزیک بووم لێی وجێگەی متمانەی بووم، بەدرێژایی ٣٧ ساڵ خەباتو تێکۆشان لەگەڵیدا، تەنیا بۆ جارێکیش گوێم لێ نەبووە هانی کەس بدات بۆ شەڕی ناوخۆ و دووبەرەکی، بەڵکو هەمیشەو بەردەوام ڕێنوێنی و ئامۆژگاری بۆمان خۆپاراستن و دوورکەوتنەوە بووە لە درووست کردنی گرژی و شەڕی ناوخۆ.

لەوکاتەوە واتە لەدروست بوونی دووبەرەکیەوە تا ساڵی١٩٧٠ لەنێوان ئەو دوو لایەنەدا، پارتی و باڵی مەکتەبی سیاسی گەلێک شەڕ و پێکدادانی خوێناوی ڕوویدا لەسنوری ئێمەدا، شەڕەکانی عەنەب، بەردە ڕەشان، گردی درۆزنە، عەبابەیلێ، خوڕماڵ، دەرەشیش، کەلی ئەشکەهۆڵ، ناوچەی نەورۆلی، شەڕی چریکەکانی ئێران....تاد شەڕی گەورە و خوێناوی بوون. چەندین فەرماندە و بەدەیان ڕۆڵەی قارەمان و لێ بوردەی هەردوولای تێدا بوونە قوربانی.

من بۆخۆم هاتنی چریکەکانی ئێرانم لەبیرە لەساڵی ١٩٦٨ دا لەسنوری شۆشمێ - تەوێڵەوە هاتنە سنورەکە، چریکەکان زۆربەیان سەربە دینی یاریی و ئەهلی حەق بوون، خەڵکی ناوچەکانی گاوارە، کوزەران، کرند، توشامی و سەرپێڵ بوون سەر بە هەرسێ تیرەکانی قەڵخانی و قەلازەنجیر و تفەنگچی بوون، ڕژێمی شای ئێران بۆ یارمەتیدانی پارتی ناردبوونی بۆ لێدانی زەبرێک لەجەستەی هێزەکەی باڵی مەکتەبی سیاسی و دەرپەڕاندنیان لەدەورو بەری هەڵەبجەدا، بەلام خۆیان تێداشکان.

پاش نیوەڕۆییەکی ساڵی١٩٦٨ بوو ئێمە منداڵ بووین قەتارەیەکی هێزی ئەو چریکانە و هێزی پێشمەرگەمان بینی لە تەوێڵە هاتن و بەلای ماڵی ئێمەدا لەدۆڵبیان تێپەڕ بوون دەچوون بۆ هاوار لەوێشەوە بۆ نەورۆلی. هەندێکیان هۆرەیان دەچڕی، هەندێکیشیان لەبەرخۆیانەوە باسی دەست بەسەردا گرتنی هەڵەبجەیان دەکرد، ئەوەشمان لەبیرە و دێتەوە پێش چاومان کەگوریس و

حەبلیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو بۆ تالآنی کردن. کاکە حەمەی فەرەج لەبیرەوەریەکانی بەناوی لەشنرۆیەوە بۆ ستۆکهۆلم بەوردی باسی ئەم شەڕەی کردووە.[1]

لەم شەڕەشەدا پارتی چی هێزی هەبوو بەکاری هێناو چریکی ئێرانیش هاوکاریان بوون، ئەو بەرپرسانەش لەگەڵ عەبدولوەهابدا بوون عەزیز ئەترۆشی، حەمەمینە سوری چوارتایی، قادری حەمەسالحی رەشید و حەمە شەمێرانەیی، دوای شکانیان پاشەکشەیان کرد و هاتنەوە بۆ چیای ئەشکەوڵ و بەردەڕەشانی پشتی عەنەب لەوێوە بەهاوان هەڵەبجەیان بۆردومان کرد، چەندین کەسی بێتاوان لەژن و منال و گەنج و پیر کوژران. بەرپرسی هاوێشتنی گولە هاوانەکان ئەفسەرێکی ئێرانی بوو بەناوی سەرهەنگ عەزیزی کەخەلکی مەهاباد بوو، لەگەڵ چریکەکاندا هاتبوو.

لەتۆڵەی ئەم تۆپبارانە و کوشتنی خەلکدا بەرە بەیانییەکی زوو لەلایەن هێزی باڵی مەکتەبی سیاسیەوە پەلاماری ئەشکەوڵ، شنرۆێ، بەردەڕەشان درا، بەیانی ئەو رۆژە مام جەلال خۆی لەئاوایی عەبابەیلێ بوبوو، هێزەکەی پارتی زۆر خراپ تێک شکان و تەرمی دوو شەهیدیشیان بەجێهێشت، ئەوانیش عەزیز ئەترۆشی و مەنوچەر بەگی ئێناخی بوون، عەزیز ئەترۆشی فەرماندەیەکی خۆشەویست بوو لەناو خەلکدا، هێزە شکاوەکەی پارتی ڕوویان کردە دێهاتەکانی هاوار و بەلخە. لەوێشەوە بۆ سەر سنوور زۆربەشیان تەوێڵەیان چۆلکرد و بەرەو ئێران ڕۆیشتن، بەلام کەس لەدوایان نەهات و وردە وردە گەڕانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان.

فەرماندەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی کە لەو شەڕەدا بەشداربوون بریتی بوون لە قادر کۆکۆیی، حەمەی فەرەج، ئەحمەد مەولود، ئەحمەد عەبدوڵڵا کوردە، محەمەد کوێخا کەریم و مەلا بایز.

---

[1]- بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو لاپەڕە ٢٦١-٢٦٤.

# کوشتنی قالە سوری بەڵخەیی

هەورامان بەر لە هەڵایسانی شۆڕش ناوچەیەکی ئاوەدان و ئارام بوو وە هەر ئاواییەک بۆ خۆی خاوەنی دەیان دۆنم باخ و موڵکی دێم و بەراوی خۆی بوو. بەراوەکان باخی دارگوێز، توو، هەنار، هەنجیر، هەڵوژە، قۆخ، هەرمێ، هەنگوری (ترێ) سپی جۆراو جۆر، سێو و قەیسی بووە، دێمەکان زیاتر ترێ ڕەشە بوو، کە کراوەتە مێووژ و سرکە و دۆشاو. هەرئاواییەک خاوەنی ئاژەڵی ڕانەمەڕ و بزن و ڕەشەوڵاخ و هەر ماڵێکیش خاوەنی برێک مریشک و کەڵەشێر و جوجەڵە و مێشەهەنگی خۆیان بوون لەئاواییدا. لەهەر ئاواییەکیش برێک دانەوێڵەی دێمەکاری دەکرد بەگاجووت یان بەپاچ وەک: گەنم، جۆ، نیسک، نۆک. هەرئاواییەکیش خاوەنی چەندین ووڵاخی بەرز بوون بۆ تەواوکردنی پێویستی خۆیان لەباری دانەوێڵەوە کاروانیان دەکرد لە هەورامانەوە بەرەو خۆرئاوا بۆ شارەزورو گەرمیان. بەرەو ڕۆژهەڵاتیش بۆ ماهیدەشت، ئەمەو میوەی تەڕو وشکیان بەدانەوێڵە ئاڵوگۆڕ دەکرد.

سەرباری ئەوەی پیشەکارو پیشە دەستییەکان پێداویستی ناوچەکەیان دروست دەکرد و زیادەشیان بۆ ئەملاوئەولا دەنارد، لەوانە بەرهەمەکانی ڕستن و چنین، جۆلایی، شاڵ و کەمەربەند، جاجم و مەوج، بەرماڵ و کڵێم، گورەوی و دەستکێش، پوزەوانە و کڵێتە، شەل[1]و کەژو[2] گوریس،

---

[1] – شەل ئەو پارچە بوو، کە لە مووی بزن دروست ئەکرا، مووەکە دوای ڕستن ئەکرا بە بەن، بەنەکە بە تەون ئەچنراو ئەکرا بە پارچە، پارچەیەکی زبرو قایم، لەو پارچە خەرار و ڕەشکە دروست ئەکرا بۆ گواستنەوەی کەماو لۆکاو گزرە لەچیاکان و دەرو دەشتەوە بۆ ناوکادانی ماڵان لەئاواییەکاندا بۆ زستانی ئاژەڵ. هەر لەو پارچە جل و سەرجلی قاترو گوێ درێژ دروست ئەکرا، کۆچەرەکانیش لەمووی بزن و بەن پارچەی ڕەش دەواریان دروست ئەکرد

[2] – کەژوو پارچەیەکە بەهەمان شێوەی شەل، بەڵام شەل بەری نزیکەی ٢٥سم پانە، کەژوو بەری تەسک و نزیکەی ٧سم پانە بۆ دروست کردنی قەیاسەو بەرەکو پاڵوی کورتانی ولاخ بەکارئەهێنرێت.

دروستکردنی پێ لاوە و کلاش، پەستەک و فەرەنجی و کەپەک، لەباد یان نمەد، لەی یان کومبار، لەگەڵ بەرهەمەکانی ئاسنگەری لەوانە درووست کردنی، پیک و نوێل، پاچ و بێل، تەورو تەوەرزین، تەشوێ و شەکرشکێن، داس و تەورداس، گاسن و....تاد، بەرهەمەکانی چێوین و تووڵینی وەک: کەوچ و قاپ، کەوچک و کەشکۆل، ئەشیاکانی جۆلایی و جووت کردن، لەگەڵ سەبەتە، تەرپانە، تەکەللە، بەرچینە نانەشان و .....تاد.

لەڕابوردودا هەورامییەکان سادە و ساکار و خۆشگوزەران بوون، پاک وخاوێن و دڵپڕ لەمیهرەبانی و خۆشەویستی بوون. دوور لە هەرکینە و بوغزێک ژیانیان دەگوزەراند. دیارە لەگەڵ ئەوەی هەندێک ڕووداو دیاردەی نەشیاوی کۆمەڵایەتی لەناوکۆمەڵگای کوردستاندا هەبوون. لە ڕابوردوو بەر لە ڕاگواستنی گوندەکانی کوردستان، ئەو دیاردانە لەناو هەورامان و هەورامیەکاندا نەبوون یان ئەگەر هەبووبن زۆر کەم ڕوویان داوە، لەوانە کوشتن و تۆڵەکردنەوە، دزیکردن، فرەژنی، ژنبەژن، گەوەرە بە بچووک، توندوتیژی دژی ژنان، سواڵ کردن، دەست درێژی بۆ سەرناموسی خەڵک، خۆفرۆشی، جاسووسی و خیانەت...... تاد.

بەڵام لەدوای دەهەی هەفتاکانەوە بەتایبەت لەدەورانی ڕژێمی بەعسو ڕاگواستنی ئاوایییەکانی کوردستان، ڕاگواستنی هەورامان و پرش و بڵاوەپێکردنی خەڵکەکەی، سەرەڕای پێشکەوتن و گەشەکردنی کۆمەڵی کوردەواری، لەباتی ئەوەی ئەو دیاردانە ئەگەر بەڕێژەیەکی کەمیش هەبووبن نەمێنن، بەپێچەوانەوە ئەو ڕووداو دیاردە نەشیاوانە لەناو هەورامییەکانیشدا زیاتر بوون. بەرلە دروست بوون وهەڵگیرسانەوەی شۆڕشیش هەورامییەکان سەرقاڵی پەیداکردنی بژێوی ژیان بوون، هەریەکە و بەشێوەیەک. ئەمەو لەناوچەکەدا پێشتریش چەک هەبوو بەتایبەت لەدەورانی عەشائیریدا و زۆرتریش بۆ بەرگریکردن بووە، زۆر بەکەمی ڕێک کەوتوە خەڵک بکوژرێت.

بەڵام لەم دوایییەداو لەسەردەمی شۆڕشدا چەک لەناوچەکەدا زۆر بوو، چەک وسیاسەت بوونە هۆکاری کوشتن و دوژمنایەتی و تۆڵەکردنەوە. دیارە پێشترو لەدەورانی عەشائیریدا چەندین حاڵەتی کوشتن هەبووە، کە منداڵ بووین ئەیانگێڕایەوە، لەتەوێڵەدا قادر بەگ سان ئەحمەدی کوشتووە یان

لەنەوسوودەوە دەستەیەک ھاتوون، لەبانی وات واتا لەنێوان ئاواییەکانی بەڵخەو بیارەدا چەند پیاوێکی تەوێڵەیان کوشتوە. ئەوسا کوشتن تاوان و شتێکی دەگمەن و نەبڕاوە بوو، بۆ چەندین ساڵ لەبیری خەڵکیدا ئەمایەوەو باس ئەکرا، بەڵام لەم دواییە و لەسەردەمی شۆڕشدا چەندین کەس کوژران و کوشتن بوو بەشتێکی ئاسایی، بۆیە لیرەدا بە پێویستی ئەزانم ئاماژە بەکوشتنی چەندین کەسێک بکەم، کە بە بەئەنقەست کوژران، لەم بوارەشدا لە خوا لێخۆش بوو قادربەڵخەییەوە دەست پێ ئەکەم:

قادر بەڵخەیی بە قالەسوور ناسراوە، لەلقەکەی کەمالی ئەحەڕووش فەرماندەی پەلبووە عەبدولوەھاب ئەتروشی بانگی کردوە و پێی ووتوە تۆ کراوی بەسەرلق لە بەمۆ، بۆیە ناردی بۆ ئەوێ. دوای ئەوەی لە بیارە رویشت پەلەکەی دابەشکرا. زۆری نەخایاند دوای ڕۆیشتنی بەبروسکە ئاگاداریان کردەوە، کە بگەڕێتەوە بۆ جێگەی خۆی. ئەویش گەڕایەوەو بینی پەلەکەی نەماوە، بۆیە زۆری پێی ناخۆش بووە، چەند گلەیی و قسەیەکی کردوە. عەبدولوەھاب لێی تووڕە بووە ئاگاداری کردوە، کە تۆ پلەت سەر لقە بڕۆرەماڵەوە و بێدەنگ دانیشە تا ئاگادارت دەکەینەوە. ئەویش چووەتەوە بۆ ئاوایی بەڵخەو دوای ماوەیەک کوژرا. لەبارەی کوشتنەکەییەوە حاجی عەلی مستەفای بەڵخەیی ووتی:

"حەمەیوسف ئەمین سلێمان لەگەڵ محەمەد ڕەحمان لە گوندی بەڵخە دەمەقاڵەو عاجزیان بوو لەسەر نانی نانەواخانە. من خۆم لەوێ بووم حەمە ھات یەخەی کراسەکەی دڕا بوو، داوای لە قادر (قالە سوور) کرد نامەی بداتێ بچێ لەبیارە شکات لە حەمەیوسف بکات. قادر پێی ووت: ئێوە ئاموزان جوان نییە لەسەر نانی نانەوا شکاتی یەکتر بکەن. حەمەش بەگوێی نەکرد ڕۆشت بۆ بیارە. غەفاری برای حەمەیوسفیش ھات و ووتی: عەلی حەمە چووە بۆ شکایەت، ئێستا پێشمەرگە دێن حەمەیوسف ئەشکێنن، وەرە باخۆمان بیبەین بۆ بیارە. پێکەوە چووینە ماڵی حەمەیوسف دەمەو ئێوارە بوو، حەمەیوسف نەھات لەگەڵمان، غەفار گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بەمنی ووت: ئێستا پێشمەرگە دێن بە دوای حەمە یوسفدا، کە ھاتن دێنە لای تۆ، تۆش بیانھێنە بۆماڵی ئێمە ئەو ڕۆیشت، منیش لەماڵەوە سەیری ڕێگەی بیارە و بەڵخەم ئەکرد لەپەنجەرەکەمانەوە.

دوای ماوەیەک دەستەیەک پێشمەرگە دەرکەوتن، من هاتمە دەرەوە و بەرەو پیریان ڕۆیشتم، لەوکاتەدا تەقەی تفەنگ هات، هاوار بەرزبووەوە ووتیان حەمەیوسف قادری کوشت، لەگەڵ کوشتنەکەی حەمەیوسف هەڵهاتوو دواتر چوو بۆ ئێران. ئەو دەستە پێشمەرگەی کە هاتبوون بەدوای حەمەیوسفدا لەسەر شکاتەکەی حەمەی ڕەحمان، غەفوریان برد بۆبیارە، ماڵەکانی حەمە یوسف و غەفاریان لە بەڵخە سووتاندن، باخەکانیشیان بڕین. لە بیارە خزمێکی قادر بەناوی جەبار کەپێشمەرگە بوو لەزینداندا غەفوری کوشت. عەلی مستەفا محەمەد، حاجی عەلی ئێستا لەژیاندا ماوە، پیاوێکی ماندوو تێکۆشەرە، لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولدا وەک کەسێکی حیزبی دەوری بەرچاوی هەبووە.

من خۆم (نووسەر) لە کاک حەمەیوسفم پرسی بۆچی مام قادرت کوشت، ووتی لەسەرکانە بەردبوو، ئەو لەبەر ئەوەی سەرلق بوو زوڵمی لە من ئەکرد، پێشتر شکاتی کردبوو لیژنەی یاسایی هاتبوون بۆسەیری کانە بەردەکە حەقی هاتنی لیژنەکە ٣دینار بوو لە منیان سەند. دوای ئەوەش هەرقسەی بەرزو زبری ئەکرد لەسەر ئەوە کوشتم.

ساڵی١٩٨٧ جارێکی تر حەمەیوسف بەڵخەیی حەمەزەمانی برای ڕەشەی ساڵحەی کوشت، حەمەزەمان بەرپەسی کەرتی جەیشی شەعبی بوو لە هەڵەبجە، حەمەیوسف لەگەڵ ئەرشەدی کوڕی دوای کوشتنەکەی زەمان چوونە ناو خانویەکی دووقات، جەیش و جاش گەمارۆیاندان شەش کاتژمێر شەڕیان کرد، دوای ئەوە بەبەڵێن تەسلیمی فەرماندەی لیوایەک بوون، لەسەر ئەوە مام حەمەیوسف بیست ساڵ حوکم درا. ساڵی ١٩٩٩ لە زیندانی ئەبوغرێب ئازاد کراو هاتەوە بۆ هەڵەبجە، من سەردانم کرد و دەمانچەیەکم بەدیاری بۆ دانا، خەڵکی زۆری لابوو، بۆ پێکەنین حەمەخان بەگی عوسمان بەگ ووتی: دەمانچەی چی ئەدەیتێ ئیسلامیەکیش ئەکوژێ؟ ووتی: ئەی نایکوژم؟ حەمەیوسف پیاوێکی کورد پەروەرە، سەرەتای شۆڕشی ئەیلول لەدەستەی پاسەوانی بەڕێز مام جەلال بووە .

# کوشتنی خەڵکی بەبێ مەحکەمە

کاتێک هەورامان بەدەست پێشمەرگەو شۆڕشەوە بوو، جاروبار لەناوچەی تەوێڵە و بیارەدا خەڵک ئەکوژران و تەرمەکانیان فڕێ ئەدران، دواتر دێنشینەکان تەرمەکانیان ئەشاردەوە، لەوانە مەحیەدین کەیکاویس ناسراو بە مەحە دزە خەڵکی تەوێڵە بوو، لەخوار ئاوایی بەڵخە لەچەمی سۆڵە کوشتیان و تەرمەکەیان فڕێ دابوو.

مەلا ڕەحیمی ویردی خەڵکی ناوچەی بانەی کوردستانی ڕۆژهەڵات بوو، ئەندام و بەرپرس لەحزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، هاوڕێی شەهید سلێمانی موعینی وخەلیل شەوباش بوو، لەکۆنگرەی دووی حیزب لەسونێ جیا بووبوونەوە لەئەحمەد تەوفیق هەڤاڵەکانی، زیندان بوو لە تەوێڵە بڕیار بوو تەسلیم بەساواک بکرێتەوە، شەوێک دەستەیەک لەپێشمەرگە بەرەو مەرزی شۆشمێ ئەیبەن تاساواک بێت وەریگرێت. لەوکاتەدا کە پێشمەرگەکان چاوەڕێ دەبن لەسەر مەرزەکە تاکو ساواک بێت و ڕادەستی بکەن، مەلا ڕەحیم بەفەرماندەی پێشمەرگەکان دەڵێت: من ئەزانم تەسلیمم ئەکەنەوەو ساواکیش ئەمکوژن، بۆیە شتێکی نهێنی هەیە وەرە با بۆتی باس بکەم. مەلارەحیم ئەمە وەک تاکتیک بەکاردێنێ بۆ ڕزگار کردنی خۆی، بەڵام سەرکەوتوو نابێت. چەند مەترێک فەرماندەکە و مەلا رەحیم لە پێشمەرگەکان دوور ئەکەونەوە و دەست بە قسەکردن ئەکەن لەناکاو مەلا رەحیم پەلاماری چەکی دەستی فەرماندەکە ئەدات و لێی ئەسەنێ و هەڵدێت، بەڵام لەدواوە کەسێکی تر گوللەیەکی پێوە ئەنێ و مەلا رەحیم ئەکوژێت، ساواک دێن و تەرمی مەلارەحیم دەبینن زۆر دڵگران دەبن، دەڵێن ئێمە بەزیندوویی ئەمان ویست، فەرموون مەیتمان ناوێت بیبەنەوە بۆ خۆتان. بەیانییەکەی هێنایان و لەگۆڕستانی ئاوایی سۆسەکان بەخاکیان سپارد. ئێمەش منداڵ بووین چووین بۆسەرقەبران.

حەمەنەزیف نادر قادر قەیتولی ئامۆزای ئەکبەر ئێناخی یەکێکی تر لەو پێشمەرگانەی سەرەتای شۆڕشەکە بوو کەلەگرتنی مەرکەزی تەوێڵە و سۆسەکان و چالاکیەکانی تری ناوچەکە بەشداربوبوو، کەچی لە شەوی ١٩٦٦/٩/١ بەفەرمانی عەبدولوەهاب ئەتروشی و جەمال نامیق لە نزیک ئاوایی بەڵخە پێشمەرگە کوشتیان، خەڵکی بەڵخەش لەگۆڕستانی دێکەدا بەخاکیان سپارد.

مستەفا خانە ئەحمەد یەکێکی تر لەپێشمەرگە ناسراو و دیارەکان بوو، کەبە مستەفا ئێناخی ناسرابوو، لەساڵی١٩٦٨ خرایە زیندان و بەقسەی پێشمەرگە و کادیرەکانی ئەوکاتە دوای ئەشکەنجە دانێکی دڕندانە، ئاوی کوڵ بەکوڵ ئەکەن بەقورگیدا، دوای ئەوە گیان لە دەست ئەدات.

قوربانیەکی تری بێ دادگایی کردن مەجیدە سووری ئێناخی پێشمەرگەی باڵی مەکتەبی سیاسی بوو، پەیوەندی کرد بە شۆڕشەوە، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم، شەوێک لە سەر کانی و ئاوی حاجیئاوا لەنێوان بەڵخە و سۆسەکاندا کوشتیان، بەبیانوی ئەوەی گوایە هاتووە بۆ کوشتنی عەبدولوەهاب ئەتروشی. بەڵگەش بۆ کوشتنەکەی ئەوە بوو، کە لەکاتی تەشکیلات و دابەشکردنی پێشمەرگە بەسەرلق و پەلەکاندا ئەم داوای کردووە کەئەیەوێت ببێتە پاسەوانی عەبدولوەهاب، گوایا بۆیە داوای کردووە، کە پاسەوانی ئەو بێت بۆ ئەوەی بیکوژێت.

هادی عەبدوڵلا حەمە میرزا پیاوێکی ئازاو ناسرابوو، لەئاوایی چناری ناوچەی کۆکۆیی گیراو هێنایان بۆ هەورامان، دواتر لەبەنەنی بەڵخە ئەشکەنجەیاندا، هەربەو ئەشکەنجەدانە گیانی لەدەستدا. لە سەرەتای شۆڕشی نوێدا دیسان ئەم بنەماڵە زوڵمێکی گەورەیان لێکرا ئەویش کوشتنی مستەفا و نوری برای هادی و مامە عەبدوڵای باوکیان بوو، بەبێ تاوان دواتر باسی چۆنیەتی کوشتنەکەیان ئەکەم.

هەر لەوێداو لەبەنەنی بەڵخە کەسێکی تریان بەناویی حەمە باخەنارەیشیان کوشت. ئەحمەدی مەلا یەکێکی تر بوو لەو کەسانە، هەر ئەو

ماوە لەناوچەی بیارەو لەگوندی هانە گەرمڵەی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا کوژرا، ئەحمەد پیاوێکی ئازا و سەرەڕۆ بووە.

شێخ نوری تالەبانیش وەک باس دەکرێت یەکێکی تر بوو لەپێشمەرگە ئازاکان و لەتەوێڵەدا گرتیان پاش چەند ڕۆژێک لە حاجی ئاوا لەنێوان بەڵخە و سۆسەکان شەوێک کوشتیان بکوژەکەشی جەباری ژن برای عەبدولوەهاب ئەتروشی بوو.

محەمەد فەتاح ڕەشید ناسراو بەحەمەتەکش لە خزمانی نەوڕۆڵی، یەکێکی تربوو لە پێشمەرگەکانی پارتی و زیندان بوو لە تەوێڵە. نوری حەمەعەلی[1]، کە جێگری عەبدولوەهاب ئەتروشی بوو، بەپێشمەرگەیەکی پاسەوان ئەڵێت کاتێک ئەچێت بۆ سەر ئاو لەدواوە بیکوژە و هاوارکەو بڵێ ڕایکرد. سەرەڕای ئەوە خوشکەزایەکی حەمە بەناوی ئازاد نەوڕۆڵی ئێستا لەهەولێرە لە سەربازی ڕایکردووو بۆناو پێشمەرگە چەکێکیشی هێنابوو نزیک بە چوار مانگ زیندان کرا لەترسی ئەوەی نەوەک تۆڵەی خاڵی بکاتەوە.

حەمە کاناڵ کابرایەکی باڵابەرزی موو زەرد خەڵکی شارۆچکەی نۆدشە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، هاتبووە تەوێڵە لەلای خزمێکی تری بەناوی وەستا مەولودی سەعات سازی ئیشی ئەکرد. مەولود و کاناڵ سەر بە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوون، کاناڵ پاش ماوەیەک لەلایەن فەتاح ئاغا[2]

---

[1] - نوری حەمەعەلی خەڵکی سلێمانی بوو، پیاوێکی باش و خوێندەوارو ڕۆشنبیرو بوو، ئەیانووت پارتی نیەو پاسۆکە، پێشمەرگەو فەرماندەیەکی باش بوو لەچاو بەرپرسەکانی تری لەناوچەکەدا بوون، لەکاتی کۆتای هاتنی شۆڕشدا نەچووە ئێران، خۆی تەسلیمی عێراق کردەوە. لەسلێمانی و لەگەڕەکی قەزازەکان دا ساڵی ١٩٧٩ بەبێ تاوان شەهید کرا بەشێوەیەکی تەمومژاوی.

[2] - عەبدول وەهاب ئەتروشی تابوو بەپارێزگار ئامرهێزی خەبات بوو، لەماوەی ئەو بەرپرسایەتیەیدا زولمی زۆری کردو خەڵکی زۆریش لەناوچەکەدا کوژران، جاشایەتی خەڵک و چوونە پاڵ حکومەت، لەناوچەکەدا ئەو هۆکاری سەرەکی بوو.

دوای ئەو خوالێخۆش بوو فەتاح ئاغا حەمەمین ئاغا لەپێنجوێنەوە هات بۆتەوێڵەو بوو بەئامرهێزی هێزی خەبات. فەتاح ئاغا پیاوێکی باش و بەڕێزو خۆشەویست بوو لەناو خەڵک و پێشمەرگەدا.

ئامیر هێزی خەباتەوە نێردرایە لای حسێن بەگی وەکیل بۆ سەرگەت لەوێ بووە پێشمەرگە، ساڵی ١٩٧١ بەشێوەیەکی تەموومژاوی لە گوندی سەرگەت کوژرا.

ئەم بێ سەروبەری و ستەمکردن و کوشتن و برینە، لەگەڵ شکاندنی کەرامەتی خەڵک، لەناوچە رزگارکراوەکاندا، بەبێ لێکۆڵینەوە و دادگا، ئەشکەنجەدان و ئازاردانی ئەو کەسانەش کە ئەیانکوشتن هەندێک جار بەرگەی ئەو ئەشکەنجە دڕندانەیان نەئەگرت بەر لەوەی بەگوللە بیانکوژن ئەمردن. وەک دووکەسی خەڵکی بیارە بە ناوەکانی حەمەی لەمە برای فەرەجی لەمە و مورادی مام عەلی. ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی خەڵک ناوی پێشمەرگەو شۆڕشی لاناشیرین بێ و لێی بترسن.

ئەم کارانە لەوە ئەچوو زۆرتر لەلایەن بەرپرسەکانی سنوورەکەوە ئەنجام بدرێن وە ڕێبەرایەتی شۆرش لێی ئاگادار نەبووبێت.

بەڵێ خوێنەری ئازیز جگە لەمانە چەندین کەسیتر کوژران و بێسەر و شوێن کراون، دواتر وردەکاری کوشتنەکەیان دەخوێنیتەوە. سەرەرای ئەوە شۆرش شۆڕشی خەڵکی کوردستان بوو، زۆربەی خەڵکی کورد وەفادار بەم شۆڕشە و بەشدار بوون تێدا قوربانی وخوێنی زۆریان بەخشی، بەڵام لەکەدار کردن و سوک کردنی ناوی پێشمەرگە بەدەست هەندێ فەرماندە و بەرپرسی ئەو سەردەمەوە، سەرجەمی شۆڕشەکەی خستە ژێر پرسیارەوە.

دووبەرەکیش بووە هۆکاری تر بۆ قوربانیدانی زۆرتر و زیاتر، دروست بوونی دوژمنایەتی لەنێوان هۆز و تیرە و دێنشینەکانی کوردستاندا درێژی کێشا. ئەمەش بوو بەهۆی قوربانی زیاترو گەورەتر. لەوانەیە ئەو لەشکرە کادیر و فەرماندە و پێشمەرگانەی کوردستان لەهەردوو شۆڕشەکەدا، لەنێوان لایەنە سیاسیەکاندا و لەشەڕی ناوخۆدا بوونەتە قوربانی، ژمارەیان زیاتربێت، لەوانەی کەدوژمنی سەرەکی گەلەکەمان حزبی بەعس و ڕژێمەکەی و سوپاکەی لەماوەی دەسەڵاتیدا شەهیدی کردوون، ئەگەر شەهیدانی کیمیاباران و ئەنفال و بەرزانییەکانی لێ جیابکەینەوە.

خوێنەری بەڕێز دیارە نووسینەوەی ڕووداوەکانی ڕابردوو، بەتایبەت ڕەخنەو ئاماژەکردن بە کەم وکورتییەکانی شۆڕش بۆ مەبەستی تایبەت نییە لەلایەن منەوە، یان بۆ تاوانبارکردنی ئەم و ئەونیە، مەبەستەکە وەرگرتنی پەندو دەرسە لە ئەزموونی تاڵ و هەڵەی کوشندە لەڕابردوودا، بەڵێ بەکردەوە دەرکەوت برایەتی، ئاشتی، تەبایی بەرهەمی هەیە و دووبەرەکی و کێشە و شەڕ و ئاژاوە، ماڵ وێرانی و قوربانی بەدواوەیە. شۆڕشی کوردستان دەیان ساڵ دواکەوت و زیان و قوربانییەکان زیاتر بوون بەهۆی ئەو دووبەرەکی و یەکتر قبوڵ نەکردن و خۆبەزلزانی و هەڵە و کەم و کورتیانەوە.

لەسنوری هەڵەبجە، شارەزور و هەورامان لە شۆڕشی ئەیلول و لەکاتی جیابونەوە و دروستبونی شەڕی ناوخۆدا، گەلێک فەرماندە و کادر و پیاوی دڵسۆز و نیشتمانپەروەر لەهەردوولا بەناحەق و بێتاوان کوژراون، بێ سەروشوێن کران، گەلێک ئاوایی و مەزراو خەلەوخەرمان سووتان، دوژمنایەتی لەناو خەڵکدا دروست بوو، چەندین ساڵ درێژەی کێشا و ڕۆژانە قوربانی زیاتری لێ کەوتەوە لەناو هۆز و تیرە و بنەماڵەکان، بۆنمونە هۆزو تیرەکانی نەوڕۆڵی، شەمێرانی، ئێناخی، کۆکۆیی هەروەها لەناو هەورامان و هەورامییەکاندا.

زیندانی کردن و شکاندنی حورمەتی زۆر لەپیاوە ناودار و ئـــاییني و ناسراوەکانی سنوورەکە، زوڵم و ستەم و غەدری بەناحەق بەرامبەر بە خەڵک بەناوی کوردایەتی و شۆڕشەوە، ئەمانە هەموو بوونە کینەو بوغز لەناو دڵ و دەروونی خەڵکی ناوچەکەدا تائێستاش شوێنەوار و کاریگەری لەناوچـــەکەدا ماوە، دیارە ئەم ڕووداو و قەوماوە تاڵ و ناخۆشانە لەناوچە ڕزگار کراوەکانی کوردستان لەوسەردەمەدا، لەزۆر شوێندا هاوشێوەی هەڵەبجـــەو هەورامان دووبارە بوونەتەوە.

# کەمالی ئەحەڕووش
# لەسەرچی شەهیدکرا ؟



کەمال خەڵکی بیارە بوو، نـــاوی کەمال ئەحمـــەد بابـــایە بەکەمالی ئەحـــەڕووش ناسراوە، گەنجێکی باڵا بەرزو جوان و خوێن گەرم، پیاوێکی بەشـــەخسیەت و بەهەیبـــەت بـــووە، ئێمـــە هـــەر لەمنداڵیەوە نـــاومان بەئازایەتی و مەردایەتی بیستبوو، دواتریش واتە دوای ساڵی١٩٦٨ بەدواوە ناومان جارو بار ئەبیست کەکەسایەتیەکی وا لـــەلایـــەن عـــەبدولـوهـــاب ئەتروشیەوە، یان بەفـــەرمانی ئەو کوژراوە. کەزوڵمێکی گەورە بووە لەکەمال و لەبنەماڵەکەی و لەهەورامیەکان و لەشۆڕش کراوە، بەوەشەوە نەوەستان دوای کەمال مامە ئەحمەدی باوکیشیان کوشتووە، نەوەکا تۆڵەی کەمالیان لێ بکاتەوە، چونکە مام ئەحمەد پیاوێکی بەغیرەت و چاونەترس بووە.

بەڵێ خۆسەپاندن و زوڵم و زۆر، سووکایەتی کردن و چەوسانەوەی خەڵک لە لایەن ئەو تاقمەوە وائەکات کەمال هەڵوێست وەر بگرێ لابسەنێ، خەریکی کۆکردنەوەی پێشمەرگە ئەبێت وداوای لایەنگری لە پێشمەرگە و جەماوەر ئەکات، بۆئەوەی پشتگیری بکەن بۆ دەرکردنی ئەو تاقمە، واتە عەبـــدولوەهاب و دارو دەســـتەکەی، هەرچەنـــدە زۆربەی پێشـــمەرگەو فەرمانـــدەکانی ئەو ســـەردەمە بەڵێنـــی ئەدەنـــێ، بەڵام کـــار ئەگـــاتە قـــایمی پاشەکشـــەی لێی ئەکەن و دوور ئەکەونەوە و ئەمێنێتەوە خـــۆی و ڕەشـــەی ساڵحە و چەند کەسێکتر، ڕەشەی ساڵحە ئەزانێت هیچیان پێ ناکرێت، تەسلیم

ئەبێتەوە و کەمـالیش بەبەڵـێن و پەیمـان دەمێنێتەوە، بەڵام پـاش مـاوەیەک لەسەر ئەو جوڵانەوەیە کوژرا.

عەلی میرزا عارف کەپیاوێکی تێکۆشەر و ڕۆشنبیر و خزمی کەمال و خۆشی لەناو شۆڕشەکەدا بووە، داوام لێکرد لەو بارەوە چی ئەزانێت. بۆی گێڕامەوە و ووتی: (ساڵی١٩٦٤ دوای ئەوەی کە عبدلوەهاب بوو بەئامرهێزی هێزی خەبات و جەمال نامیق ئامر بەتالیۆنی هەورامان، کەوتنە ئازار و ئەشکەنجەدانی خەڵکی هەورامان و دەڤەرەکەی و هەڵەبجە و شارەزوور، لەژێر پەردەی شۆڕشدا چەندین خراپە و پیاو کوژی و فەسادو کاری ئەخلاقیان ئەنجام ئەدا. بێ ئەوەی سەرکردایەتی شۆڕشەکە هیچ موحاسەبەیەکیان بکات، هەرچەندە چەندین جار سکاڵا گەشتبووە ئاستی باڵای شۆڕشەکە. لەڕاستیدا عبدلوەهاب و تاقمەکەی دژ بەپیاوە ناودار و مەزنەکان و فەرماندە و پێشمەرگە قارەمانەکانی وەک کەمالی ئەحەڕوش و شێخ کەمالی عەبابەیلێ و مەلاساڵحی هەڵەبجە و حەمە ئەمین عەباس بەگ و ئەحمەد حەمەئەمین لەپریس و چەندین کەسی تر بوون.

لەهەر هەلێکی لەباردا دەستی تاوانیان سور ئەبوو بەخوێنی چەندان کەس لەبیارەو تەوێڵە و هەڵەبجە و خورماڵ و ناوچەکەدا، زۆرکەسی بێتاوانیان بەبیانوو ناوی جۆراو جۆرەوە کوشت. هەربۆیە کەمال لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی تر ڕووبەڕووی ئەو هەموو ستەمە وەستانەوە و دەنگی ناڕەزایەتیان بەرزکردەوە) .

لەرۆژی ١٩٦٥/٨/١٤ کێشەکە ئەگاتەپەلاماردانی عەبدلوەهاب و هەندێ فەرماندە و پێشمەرگە لەوکاتەدا ئیتر ئەبینن بارودۆخ ئەبێت یەکلایی بێتەوە ڕوو لەکەمال وەرئەگێڕن بەتایبەت هەورامیەکانی خزمی خۆی، بۆیە کەمال پەنا ئەباتە بەر ئاواییەکانی سەرگەت و چیاکانی ڕەنگین و هانەنەوە، ڕەشەی ساڵحەش ئەڕوات بەرەو تەوێڵەو لەنێوان ئاوایی سۆسەکان و بەڵخەدا توشی دوو پێشمەرگە ئەبێت کەخەڵکی تەوێڵەن بەناوەکانی حافز فەتاح و حەمەیوسف عارف عومەر عەلی ناسراو بەگوڵتەڕەشیان پێ ئەبێت و ئەیانەوێت بەبەندی بیبەن بۆ بیارە، ڕەشە لێیان ئەسەنێ و ئەڵێت بگەڕێنەوە بۆ تەوێڵە. خۆشی کەدوو پێشمەرگەی لەگەڵدا ئەبێت یەکێکیان حەمەی برای و ئەوی تریان ئەنوەری ئەحەلارەی بەڵخە ئەبێت، ئەچێتە تەوێڵە، لەڕێوە سەلیم کوێی چەک ئەکات و ئەچێتە سەر حەمەی سەید عەلی، بەڵام ژنان

قورئان دەبەنەڕێی و ئەویش وازی لێ ئەهێنێ و لای عەسر ئەچێتە ئاوێسەر، ئێوارەکەی دێتەوە ناو تەوێڵە، پەیوەندی ئەکات بەوانەی کەبەڵێنیان دابوو لەگەڵیان بن، بەڵام زۆربەی زۆری ئەوانە پەشیمان ئەبنەوە تەنیا دووکەس لەگەڵیان ئەبن یەکێکیان نیزام ڕەحمان و ئەوی تریان ڕەحمان ئە لاوەەیس ناسراو بەچەمەلە، ئەوانەی پەشیمان ئەبنەوە حامدی حەمەتاهر بەگ و حەمەی قالە و سەعدی بەگی قادر بەگ و حاجی ئەولەو سەفای حاجی فەرەج و.....تاد لەبیارە و بەڵخە و پالانیا و دەگا شێخانیش هەموو ئەوانەی کە کەمال و ڕەشە پشتیان پێ بەستبوون کەسیان لەگەڵی ناکەوێت. وەک حەسەن مەحمود بەگ و کۆمەڵێک پێشمەرگەی تر .

بەڵام کاکەییەکانی هاوار لەگەڵی ئەمێننەوە، تائەوکاتەی چەند کەسێک ڕەوشەکە ئاسایی ئەکەنەوە، کەمال دڵنیا ئەکەنەوە کە بگەڕێتەوە، تا بەهەموو لایەک کێشەکان چارەسەر بکەن و درێژە بەخەبات بدەن، کەمال بەمە ڕازی ئەبێت و ئەگەڕێتەوە. بەڵام ڕەشەی سالحە باوەڕی بەوبەڵێن و گفتوگۆ و چارەسەر کردنە نابێت وخۆی و یەک کەسی دیکە ئەچن و تەسلیم ئەبنەوە بەحکومەت.

عەزیز ئەقراویش کە ئەندامی فەرماندەی هێزی پێشمەرگە ئەبێت هاتوەتە بیارە و بەفرو فێڵ کەمال ڕازی ئەکات و بەچەکی شانییەوە ئەچنە خورماڵ و لەوێ ئەیگرن ئەیبەنە گەلاڵەی لای حاجی ئۆمەران، دوای مانەوەی بۆ دوومانگ لە ڕایات بە دەست بەسەری. خوالێخۆشبوو بارزانی بانگی ئەکات و ئەیکات بەجێگر هێزی دەشتی هەولێر لەلای ملازم تاریق ئەحمەد.

لەو بارەوە مام عەبدولخاق هەورامی ووتی لە هەمەدانەوە کە گەڕاینەوە، یەکەم وەجبە بە فەرماندەیی شەهید کاک عەلی عەسکەری ١٥٠سەدو پەنجا کەس گەیشتینەوە سنوری بارەگای بارزانی، دۆستێکی خۆمان هات بۆ بەخێرهێنانەوە بەمنی ووت، بابیرم نەچێت کەمال لەڕایات دەست بەسەرە، پێی ووتووم بیستوومە جەماعەت ئەگەڕێنەوە، ئەگەر وابوو بەڵکو بە عەبدولخالق بڵێت سەردانم بکات، منیش دوای ماوەیەک بە کاک عەلیم ووت، مۆڵەتی دام وسێ پێشمەرگەشی لەگەڵ ناردم، چووینە لای کەمال، پێی ووتم ئەوە دوو مانگە لێرەم کەس بۆم ناپرسێ، بارزانی کاک عەلی خۆش ئەوێت بەڵکو بیری بخاتەوە و شتێکم بۆ بکات. منیش قسەکانیم

بۆ کاک عەلی گێڕایەوە، ووتی بەسەر چاو لەم ڕۆژانەدا بۆنانخواردن لای بارزانی ئەبین بزانم شتێکی بۆ ئەکەین.

دوای ئەوە کە ماوەیەک جێگر هێز ئەبێت لەدەشتی هەولێر، کاک کەمال داوای مۆڵەت ئەکات و دێتەوە بۆ بیارە. عەبدولوەهاب پێی ناخۆش ئەبێت متمانەی نابێ و دووبارە ئەیگرێ و لەملەی چنار لەبیارە ئەیخاتە بەندیخانەوە، دواتر ئەینێرنە پێنجوێن، عبدلوەهاب و حەمەی سەید عەلی و جەمال نامیق بەتەلەگراف لای بارزانی خەتاباری ئەکەن بە دووبارە هەڵگەڕانەوە، ئەیگرنەوە و بەناوی ناردنەوەی بۆ سەرکردایەتی لەلای گەرمک ئەیکوژن، بەبیانوی ئەوەی ویستویەتی ڕابکات، ئەمە ڕاست نەبووە خەڵکی گەرمک دیویانە کە فیشەکی دەمانچە بەناوچەوانییەوە نراوە، دواتر فڕێ دراوەتە کەنار ڕێگای گەرمک، خەڵکی ئەو ناوچە لەوێ دفنی ئەکەن و ئێستاش گۆڕی بێ ناوو نیشانی لەوێیە.

دیارە کەمالیش پێش کوشتنی زانیویەتی ئەیکوژن بۆیە پارچە شیعرێکی بۆپرشنگ خانی خێزانی نووسیوە، بەداخەوە من پارچە شیعرەکەم دەست نەکەوت. مامە ئەحمەدی باوکی کەمالیش پیاوێکی چەتوون و بەقابیلیەت بووە، دوای کوشتنی کەمال ئەویش لەبیارە ئەگیرێ و ئەبرێتە نزیک ئاوایی ڕیشێن لەوێ گوللە بارانی ئەکەن، یادگاری محەمەد بەگ یادگار جاف ئەڵێت: منداڵ بووم لەگوندی قاینەیجە لەگەڵ حەمەی حاجی سابیرو عومەری مەحمودا چووین بۆ دەشت بۆ ڕاوە شەلاقە، لەنێوان ڕیشێن وقاینەیجەدا کەوتین بەسەر تەرمی پیاوێک دا کوژرا بوو، گوللەیان نابوو بەسەرییەوە، کەللەسەری تەقیبوو مشکییەکەی سەری لەلایدا کەوتبوو، ترساین وڕامان کردەوە بۆ ئاوایی و خەبەرمان دا، دواتر ووتیان ئەوە ئەحەڕووشی باوکی کەمالە فەیازە کوێر کوشتویەتی. عبدالوەهاب ئەتروشی تاکوتایی شۆڕش دژایەتی ئەوانەشی ئەکرد کەدژی ئەو هەڵسوکەوتەی بوون، لەوانە: شێخ کەمالی عەبابەیلێ، حەمە ئەمین عەباس بەگ، حاجی مشیری تەپی سەفا، حاجی خالیدی بەشارەت، ئەحمەد حەمە ئەمین پریسی، سەعدی بەگی قادر بەگ لەتەوێڵەو مامۆستا مەلا کەریمی مۆردینی و ...... تاد.

ناردنی حەمە شەمێرانی بۆ سەر ئەحمەدی حەمە ئەمین و دروست کردنی ئەو کێشە گەورە، لەنێوان ئەو دوو تیرەدا شەمێرانی و نەوڕۆلی، جگە

بیانوە سەرەکیەکەی بۆ کوشتنی ئەحمەد حەمە ئەمین، ڕقی کۆنی لایەنگری کردنەکەی لەکەمالی ئەحە ڕووشیشی لەدڵدا بووە.

بەڵێ کوشتنی دەیان کەس لەناوچەکەدا و دروست بوونی شەڕی عەشایەری و درێژەکێشانی تا ئەم ساڵانەی دواییش، لەنێوان شەمێرانی و نەوڕۆڵی وە لەنێوان کۆکۆیی و نەوڕۆڵیدا ئەو هەموو زەرەرو زیانە کەبەر ئەم عەشیرەتانە کەوت ئەو هەموو پیاوە تێکۆشەرو ئازاو دڵسۆز و کورد پەروەرانە کەلەو نێوانەدا بونە قوربانی، هەمووی لەسەرەتاوە عەبدولوەهاب و دارو دەستەکەی هۆکاری بوون، فیتنەیەکی لەسنوورەکەدا دروست کرد، کە تائێستاش ئاسەواری ماوە و بەتەواوەتی نە سڕاوەتەوە.

عەلی سنجاری لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی (القضیةالکردیة الجزء الثالث) دا، لەم بارەیەوە لە بابەتێکدا بەناونیشانی (التمرد في منطقة هورمان) لە لاپەڕە ٣٥٠دا نوسیویەتی

(فی نیسان ١٩٦٤ أخبرني المرحوم عبدالوەهاب أتروشی آمر هیز لواء خبات للبشمرکة فی السلیمانیة أن الجلالیین والاستخبارات العسکریة ضمن خطة عزیز یحاولون کسب بعض البشمرکة والکوادر الحزبیة ووتشکیل تکتل بإسم الهورمانیین وهذا التکتل یقوده کمال احمد رش وکان معاون امر بتالیون بیارة بقیادة الملازم جمال نامق وفیصل سوراني وکان نائب ضابط سابق في الجیش وفي بدایة شهر مایس ١٩٦٥ وصلت برقیة من مقر هیز خبات بأن رە شا صالح هورماني وکان سەڕ لق ب.م امر سریة قد تمرد ومعه عدد من البشمرکة وکان عبدالوەهاب اتروشی في ایران انذاک وکان الشهید معاون الشرط شیخ محمد سید علي وکیلا له وموجود في مقر الهیز في طویلة فذهبت فورا الی مقر هیز خەبات وقمنا مع معاون شیخ محمد بملاحقة رە شا صالح وجماعتة في جبل هاني دن مابین طویلة و بیارة الا الهم کانوا قد اختفوا وذهبوا لیلا الی حلبجة والتحقوا بالجلالیین هناک وقد تم القضاء علی هذا التکتل وقتل کمال احمد رە ش فیما بعد کما قتل والدة وکان هذا خطا وظلما لان والدة کان کبیر السن ولا یستحق القتل)

ئەمە بەقسەی تێکۆشەرە دێرینەکانی سەرەتای شۆڕشی ئەیلول زۆر دورە لە ڕاستیەوە هەموو خەڵکی هەورامان و هەڵەبجە و تێکۆشەرەکانی ئەو سەردەمە کە زۆربەیان ئێستا ماون ئەزانن و ئەڵێن، جولانەوەی کەمالی

ئەحەروش پەیوەندی نەبوە نە بە هەواڵگری عێراق و نەبە جەلالیەکانەوە، کەمال ئەیویست عەبدولوەهاب دەربکات لە سەر زوڵم زۆرداری بەرامبەر بەخەڵک و لەسەر بەلاڕێدا بردنی شۆڕشەکە، وەرەشەی ساڵحەش کە باوەڕی بە ووتوێژو ڕێکەوتنەکە نەبووە لە نێوان عەبدولوەهاب و کەمال دا تەسلیم بە ڕژێم بۆتەوەو بووە بەجاش .

یەکێک لە تێکۆشەرەکانی ئەو سەردەمە کە ئێستا ماوە خۆی لە کێشەکەدا بووە بەڕێز عەلی شاوەیسە کە ناسراوترین تێکۆشەرەکانی سەرەتای شۆرشی ئەیلولە لە ناوچەکەدا تا ئێستا ماوە، لەم باریەوە دەڵێت: (کێشەی کەمال پەیوەندی نەبە حکومەت و نەبەباڵی مەکتەبی سیاسیەوە نەبووە . ئەوەی عەلی سنجاری باسی دەکات دوورە لە ڕاستیەوە. کەمال فەرماندە و بەرپرسێکی ناسراوو خۆشەویست بوو، هەتا عەبدولوەهاب هۆکاری سەرەکی دروست کردنی کێشەکە و کوشتنی کەمال نەبوو، بگرە چەند کەسێک خۆیان ڕقیان لە کەمال بوو بەلام پێی نە ئەوێران عەبدولوەهابیان هاندا بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەکەو کوشتنی کەمال و مام ئەحمەدی باوکی، لەوانە جەمال نامیق، حەمەی سەید عەلی، فازل سۆرانی.....تاد، هەروەها شێخ خالیدی لامەرکەزی و دیاری حامدبەگ دەستیان لەو کێشەیەدا هەبوو لە دژی کەمال.

ئەوانەش بەڵێنیان دابوو بە کەمال لە مەسئول و پێشمەرگە کە پشتگیری بکەن پەشیمان بوونەوە، من و حیکمەتی مەلا عەلی لەسەر ئەم کێشە قاچاغ بووین و دوایی عەبدولوەهاب بانگی کردینەوە، چونکە ئێمە کاتێک کەمال لە زیندانیدا بوو پێمان ووت شەو پەیژەت بۆ ئەهێنین و بۆت دا ئەنێین ڕاکە، لە وەلامدا ووتی: من ڕاناکەم چونکە، ئەگەر ڕام کرد ئەبێت ببم بە جاش، بەلام من جاشایەتی ناکەم. ئەوکاتە عەبدولوەهاب لەسەرتەکی بەمۆ بوو، حەمەصالح بەگی بیارە بە کەمالی ووت بڕۆ بۆلای عەبدولوەهاب چەند کەسێک کەووتنە سەرو خواری نەیان هێشت، لەوانە ئەمینی حەمە وەیس و چەند کەسێکی تر. بەقسەی عەلی شاوەیس ئەگەر کاک کەمال بڕۆشتایە بۆ لای عەبدولوەهاب بۆ سەرتەکی بەمۆ نەئەکوژرا) .

## شەهیدکردنی
## مەلا حەبیب و ئەحمەدی برای

لەدوای کوشتنی حسێنی عارف لەشەرێکدا، کێشە لەنێوان کۆکۆیەکان و نەورۆلیەکاندا کەدوو عەشیرەتی سنوری هەڵەبجەن پەرە ئەسەنێت، حسێنی عارف لە عەشیرەتی نەورۆلیە و بەرپرسی عەسکەریش بووە لەناو پێشمەرگەدا، بۆیە نزیکەی ١٠-١٢ ماڵی نەورۆلیەکان و خزمە نزیکەکانی حسێن عارف هەڵەبجەیان جێهێشتوە و هاتونەتە بیارە، لەوانە کەریمی عارف برای حسێن، ئەحمەدی موراد خان و چەند کەسێکی تر. لەبیارە پەیوەندی ئەکەن بە شۆڕشەوە، لەوێ نیشتەجێ ئەبن، لەسەر حسێنی عارف عبدلوەهاب ئاوایی چاوگی سووتاندوەو زوڵمێکی گەورەی لەکۆکۆییەکان کردووە، کۆکۆیەکانیش چاوگ بەجێ ئەهێڵن و دێنە ناو هەڵەبجە چەک وەرئەگرن، کێشەکە گەورەتر ئەبێت. هەرلەم سەروو بەندەدا شەوێک لەبیارە لەکاتی نانخواردنی ئێوارە هەموو ئەو خزمانەی نەورۆلی لەماڵی کەریمی عارف میوان ئەبن لەسەر سفرەی نانخواردن کۆئەبنەوە، لەوکاتەدا نارنجۆکێک ئەخەنە ناویان و زۆریان بریندار و دوو کەسیشیان ئەکوژرێت بەناوەکانی جەمال غەریب عارف و کەمال محەمەد عارف.

هۆشمەن کوڕی یارئەحمەد بەگ ووتی:( گەورە بووم لە ماڵی نەنکم بووم، نەنکم دراوسێی ماڵە نەورۆلیەکان بوو، کاتێک نارنجۆکەکە تەقییەوە هات و هاوار بەرز بووەوە، خەڵک چوو بە دەمیانەوە، منیش چووم بۆ سەیرکردن. بینم ١٢ کەس کەوتوون و خوێن سەری کردووە، هاوار و ناڵە و قیژو قاو ئەوسەری نییە، هەر شەو بریندارەکانیان برد بۆ ئێران، شەهیدەکانیش بەیانی لەگۆڕستانی ملەی چنار نێژران. کەس نەیئەزانی کێ بووەو چۆن بووە، کوڕێکی مەلا حبیب بەناوی کەریمە سور خزمەتی ئەو ماڵانەی ئەکرد و لەگەڵیان دا بوو، تا کوژراوەکانیش نێژران هەر لەوێ لەدەورو بەریاندا مابووەوە، بەڵام لەپڕ دیار نەما) .

کاتێک کوڕەکە دیار نامێنێت پێشمەرگە بەدوایدا ئەگەڕێن بەڵام نایدۆزنەوە، هەر ئەو ڕۆژە ڕێگاو بانەکانی ئەو ناوچەیە بۆ هەڵەبجە کۆنترۆل

ئەکەن، بەڵام ناگیرێ، دەست بەجێ مەلا حەبیبی[1] باوکی کەریم و ئەحمەدی برای مەلا حەبیب کە سێ ساڵ بووە قسەیان بەیەکەوە نەبووە ئەگرن، دوای چەند ڕۆژێک کەریمە سور لەهەڵەبجە دەرئەکەوێ و ئەبینرێ و دەنگ و باسی ئەوە پەیدا ئەبێت کەگوایە کۆکۆیەکان پێشتر بەڵێنی ٥٠٠ دینار و ژنێکیان پێ داوە، لەبەرامبەر ئەم تەقینەوەی کە ئەنجامیداوە.

لەسەر ئەمە مەلاحبیب و ئەحمەدی برای لەملەی چنار لەزیندان ئەهێننە دەرەوەو بەفەرمانی عەبدولوەهاب ئەتروشی بەستراون بەدارتویەکەوە و دراونەتە بەر دەستڕێژی گولە و کوژران، ئەوە نمونەی حوکمڕانی وبەڕێوە بردنی ئیداری ئەو تاقمە بووە، باخ بڕین وماڵ سووتاندن و ئەوپەڕی زلم وستەمی بێویژدانانە، شکاندنی کەرامەت وشکۆی مرۆڤ، پیادەکردنی یاسای جەنگەڵ، ئەم شتانەش بوونە هۆی ناشیرین کردن و لەکەدارکردنی ناو ناوبانگی پێشمەرگەو شۆڕش لەناوچەکەدا.

---

[1] - مەلاحەبیب پیاوێکی بەڕێز بووە، باوکی مامۆستا مەلا مووسایە لەیەکگرتوی ئیسلامی کوردستان.

# بارودۆخی جەماوەری ناوچەکە
## لە ساڵانی ۱۹٦۳-۱۹۷٥

سەرەڕای دڵسۆزی خەڵک بۆ پێشمەرگە و شۆڕش، سەرەڕایی لەخۆبوردوویی و بەشداری کردنیان لەشۆڕشدا، بەشێوەی جۆراوجۆر، خەڵک بەگشتی بەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ڕژێمیشەوە وەفادار بوون بۆ جوڵانەوەی سیاسی کوردستان.

کەچی بەداخەوە هەندێک کەس و فەرماندە بەناوی پیرۆزی پێشمەرگایەتیەوە وایان کردبوو، ترس و دڵە ڕاوکێ و نائارامی پەرەی سەندبوو، گرتن و کوشتن، هەرچەندە لەوانە پیاوخراپ و دژی شۆڕشیان تێدا بوون، سەرانە لێ سەندن و ئابوونە وەرگرتنی بەزۆر، کۆکردنەوەی دەغڵو دان و بێگاری کردن بەخەڵک، ناردنی وولاخ دار و قاتر چییەکان لەهەورامانەوە بۆ ناوچە دورەکان وەک گەلاڵەو حاجی ئومەران، دابەشکردنی پێشمەرگە ڕۆژانە بەسەر ماڵان بۆ نانخواردن، بردنی داری سووتاندن بۆ بارەگاکان، هەتا جل و بەرگ و پێداویستی بارەگاکانیش هەموو ئەمانە لەئەستۆی گوند نشینەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشدا بوو.

نەفی کردنی هەندێک پیاوی پیاوانە و خاوەن نفوس و ناودار و شکاندنیان و سووکایەتی پێکردنیان باو بوو، ئەوانەی سنوری ئێمە بۆ نمونە سەعدی بەگی قادر بەگ، یارئەحمەد بەگی ئەفراسیاو بەگ و ئەسکەندەر بەگی برای، کوێخا عەلی کۆکۆیی، مستەفای حاجی فەرەج و سابیری کاکەلەی تەوێڵەیی....تاد. ئەمە جگە لەوەی زۆر کەسی تری سنوورەکەیان لەزیندانەکانی ڕایات و خەلان خزاندبوو تاکۆتایی هاتنی شۆڕشەکە.

زۆرجار ئەم زوڵم و زۆرە ئەوانەشی ئەگرتەوە کەکوڕ یان کەسی نزیکیان پێشمەرگەبوو، هەرکەسەش ئەگەر بەدەنگی نزمیش بیویستایە ناڕەزایەتی دەرببڕێ مەرگ چاوەڕێی ئەکرد، کارگەشتە جێگەیەک کام کچێک جوان بوایە بەزۆر ئەیان سەند لەخێزانەکەی بۆ ئەو بەرپرسانەی هاتبونە ناوچەکە، لەو بارەیەوە چەندین نمونە هەیە لەتەوێڵە و بیارە و ناوچەکەدا کەپێم خۆش نییە ناویان بهێنم.

تەنیا کەسێک نەیان توانی بەزۆر کچی لێبسەنن و نەیدا پیاوێکی خەڵکی گوڵپ بوو، ئێستا نەماوە ، خەڵک چاوەڕێ بوون بکوژرێ، ئەویش ناوی خاڵە سەلیمی مینەی عەدەیە لەئاوایی گوڵپ، دوای ئەوەی چەندین جار ئەچنە داواکاری کچەکەی و نایدا. ڕۆژێک جەمال نامیق بەزۆر بانگی ئەکاتە بارەگای بەتالیۆنی حەوت لە بیارە، پێی ئەڵێت ئەبێ کچەکەت بدەیت بەفلان بەرپرس، بەرپرسەکە ناوی عەباس تۆفیق بووە. ئەویش ئەڵێت نایدەم لێی ئەپرسێت بۆنایدەی؟ ئەڵێت کچی خۆمە و نایدەم، جەمال نامیق ئەیەوێت خۆی تورە بکات، مام سەلیم سەیری سەردیواری بارەگاکە ئەکات وێنەی پێوە ئەبێت، ئەپرسێ لەجەمال نامیق ئەو وێنانە کێن؟ ئەویش وەڵام ئەداتەوە، خاڵەسەلیم ئەڵێت دەی تۆ نەک بۆعەباس بۆ ئەوانەی داوا بکە بزانە ئەیدەم. ناچار وازیان لێهێناوە.

بیرم دێت پیاوێک مەسئولی بنکە بوو لەسۆسەکان ناوی حەمە عەلی مەولە بوو، ئابوونەوەی کۆ ئەکردەوە، پاش نیوەڕۆیەکی هاوینی ساڵی١٩٧٤ هاتە ماڵمان لەناوباخدا بووین داوای ئابوونەوەی کرد، لەوکاتەدا حازر نەبوو، ئەویش پێی داگرت کە ناڕوات تا لەگەڵ خۆی نەیبات، ئەوە بوو باوکم بەرچینەیەک هەنجیری چنی و من بردم بۆ وەزە زەرد لەکۆمەڵگای شەهید لەیلا قاسم فرۆشتم، هەنجیر فرۆشتن بەدانە بوو٣ سێ دانە بە ١٠فلس ئەو ئێوارە کاک ئازاد هەورامی هەنجیرەکانی فرۆشتوو پارەکەی کۆکردەوە و من هێنامەوە، حەمە عەلی چاوەڕێی ئەکرد باوکم پارەکەی دایە و ڕۆشت.

پیاوێکی خەڵکی سۆسەکان ناوی حەمە شەریف بوو پێیان ئەووت شەفەکە، دابووی بەلای قەبرستانی ئاواییەکەدا، ووتبوی کێتان ناڕازیە هەڵسێتەوە بامن بێمە جێگەکەی، خۆزگەم بەخۆتان حوکمی حەمە عەلی مەولەتان نەدیووە. ئەم حەمە عەلیە ساڵی١٩٧٦ یەکەم مەفرەزەی سەرەتای شۆڕشی نوێ دروست بوو ڕژێم ناردیە لایان بۆجاسوسی، یەکەم تفەنگی شۆڕش تەسلیم کرایەوە ئەو کردیەوە، باوکمی دا بەگرتن، شایەتی لەسەردا بەدرۆ گوایا شەو مەفرەزەکەی سەرەتا هاتوون بۆ ماڵی ئێمە و باوکم سندوقێک فیشەکی داوە بە شێخ عەلی خولە کەشکۆل، بۆیە ساڵی١٩٧٦-١٩٧٧ چەندین مانگ باوکم بێسەر و شوێن کرا، هەواڵمان نەئەزانی تا کاک

جەعفەری حاجی ئەولە لەزیندان ئازاد کرا پێی ووتین گیراوە لەزیندان بینویەتی.

ئەو دەمەی شەڕی چریکەکان ڕویدا، هێزەکانی پێشمەرگە شکان و بەرەو سنوور هەڵدەهاتن جەماعەتەکەی مام جەلالیش لەئەشکەهۆڵ زیاتر نەهاتن و گەڕانەوە، ئێمە منداڵ بووین، ناوی جیاجیامان لە زمانی خەڵکەوە ئەبیست لەسەر باڵی مەکتەبی سیاسی، کاتێک لەناو کۆڕو کۆمەڵدا باس ئەکرا، هەبوون ئەیانووت جەلالی یان جەماعەتی حزب، یان جەماعەتی مەکتەبی سیاسی، ئێمە لەگەڵ بەشێک لەمانە زۆر دۆست بووین، کەلە ناوچەکە هاولاتی بوون سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسی بوون، ئەوانە زۆرتر تەوێڵەیی بوون. بە هاوینان لێیان ئەهاتنە دۆڵبیان بۆ ناو باخ، دواتر من زانیم ئەوانە یەکیەک و دوو دوو ئەهاتن لەوێ کۆئەبونەوە، ئەوە بۆ کۆبونەوەی حیزبی بووە لەوانەش:

عێزەتی حەسەن، حاجی ئەولەی نەسە، حەمەسەعید حەمەیوسف ناسراو بە سەعە لەیلە، حاجی مستەفا، ماڵی سەعدی بەگی قادر بەگ، عەلیە سانە، زۆراب عەزیز بارام، سابیری کاکەلە، ماڵی حاجی ئەوڕەحمانی مولکی و هادی ئایزە و حەمەی حەبیب ناسراو بە حەمە کەلا...تاد. من لەو دەمەدا لەسەر جەلالیەکان یان جەماعەتی حزب هیچم نەئەزانی هەرئەوەندە نەبێ لەکاتی شەڕەکاندا یان شتێک ڕووی بدایە یان کەسێکیان ئەهێنایە ناوچەکەو ئەیان کوشت یان خەڵکی دەسبەسەر کراو ئەهێنرایە ئەو ناوچانە ئەیان ووت ئەوە جەلالین .

جارێکیان عەلیە سانە کەناوی ئەسڵی عەلی حەبیبولایە ڕای کردبوو بۆ هەڵەبجە چووبووە ناو جەلالیەکان، مەهدی سانە برای پێشمەرگە بوو، لەدوای ڕاکردنەکەی عەلی لەناو قاوەخانەی سەید جەعفەردا لەناو شارەدێی تەوێڵە فیشەکی تفەنگی برنەوی دابوو لەژێر چەناگەی لە سەریەوە دەر چوو بوو نەمرد، ئێستاش ماوە و لەهەڵەبجەدا ئەژی کارمەندی ئیدارەی ئاوە، ئیتر نازانم لەترسی عبدالوەهاب وایکرد بوو، یان پێی ناخۆش بوو بوو ئەم پێشمەرگەیە و عەلیش ڕایکردووە، هەر ئەو ماوە کە عەلی لەهەڵەبجە بوو، دوای شکاندنی هێزی پێشمەرگە لەشەڕێکدا، ڕۆژێک ماڵەکەی عەلیان سووتاند، ماڵەکە لەسەرووی گەڕەکی چلانەوە بوو، ماڵیشیان واتە ناوماڵ هیچی وانەبوو هەندێک شڕەو شیتاڵ، ئەو ڕۆژە من لەگەڵ باوکم چوو بووم

بۆ سەرتاشین بۆ تەویڵە، هەموو خەڵک سەیری لای ماڵی عەلییان ئەکرد، ئێمەش چووینە لای خەڵکەکەو تەماشای ماڵەئاگر تێبەردراوەکامان ئەکرد، ئاگر لەدەرگاو پەنجەرەی ماڵەکەوە ئەهاتە دەرەوە، چرە دوکەڵ ئاسمانی سەر تەویڵەی پۆشی.

کەس نەیئەوێرا بچێت بە دەوری منداڵەکانیشیدا، ئەوانە نەوتیان کردبوو بەسەر ماڵەکەدا، منداڵەکانیان هێنابووە دەرەوە لەدوورەوە ئەگریان و قیژو هووڕیان بەرز بوبووەوە. لەوەبەدواوە ئێمە ئیتر ئەترساین بەبێ ئەوەی هیچیش بین.

هەر لەو ماوەدا پێشمەرگەیەکی پیری خرەڵانە کەناوی ناڵە بێوەنی بوو، هەموو جارێک ئەهاتەچەمی پالانیاو دۆڵبیان، ئەچووە سەرماڵان داوای سەوزە و میوە و ئەوشتانەی ئەکرد، پاشنیوەڕۆیەکی درەنگی هاوینی ساڵی۱۹۷۳بوو، نازانم چی داوا کردبوو لەماڵی حاجی نادر کە ئێمە بەبابا ناڵە ناومان دەبرد نەبان بووبوو یان نەیاندابویە، مەفرەزەیەکی هێنایە سەریان و هەموو ئەندامانی خێزانەکەیان دارکاری کرد، تەنانەت لەبیرمە ماما سوەیل خێزانی حاجی نادر جل و بەرگەکەیان لەبەریا دڕاندبوو .

ئەم جۆرە کار و کردەوە نابەجێیانە ئەکران بەرامبەر بەخەڵک، کەس نەبوو بپرسێتەوە، یان خەڵک ئەوەندە فەقیر بوون نەئەچوون بەدوای مافی خۆیاندا، ئەگەر جاروبار کەسێکیش بیویستایە سکاڵا بکات، کەس نەبوو بۆی بپرسێت، ئەوەش وای کردبوو هەرکەس چەکی لەشاندا بووایە و سەر بەو باندە بوایە ئیتر بۆخۆی حاکم و کەس باڵادەستی نەبوو.

# ساڵی ١٩٧٥ شکستی شۆڕش

شۆڕشی ئەیلول چواردە ساڵ بەردەوام بوو، لەساڵی ١٩٦١ لەبەرامبەر زوڵم و ستەمی نەتەوایەتی و داگیرکاریدا بەرپابوو، هەرچەندە لەم بارەیەوە چەندین ڕاوبۆچوونی جیاواز هەیە، هەندێک کەس بە جوڵانەوەی ئاغاکان و خاوەن زەویەکانی ئەزانن بە دژی یاسایی ئیسلاحی زەراعی. گوایا خودی خوالێخۆشبوو بەرزانیش ڕازی نەبووە بە هەڵگیرسانی ئەو شەڕە. لە ماوەی ئەو چواردە ساڵەدا لەسەر چیاکانی کوردستان و لەناو دەشت و دۆڵ و بناردا ئاڵای پیرۆزی کوردایەتیان شەکاندەوە، ئەم شۆڕش و خەباتە لەماوەی ئەم چواردە ساڵەدا سەرەڕای هەموو کەموکورییەکان ئەوەندە کاریگەربوو زۆر لەگەلانی دنیاو حیزب و ڕێکخراوی مرۆڤ دۆست ناسییان و زۆرێک نووسەر و ڕۆژنامە نووس و رووناکبیران ڕاپۆرت و کتێبیان لەسەر ب لاوە کردەوە.

لەزۆر کۆڕو سیمیناردا حزب و ڕێکخراوی جیهانی ئاماژەیان بەم شۆڕشە کردووە، پارچەکانی تری کوردستان پشتگیریان کرد و شۆڕشگێرانیان بەشداریان تێدا کرد. هەزاران پێشمەرگە سەنگەریان تێداگرت و بەرگریان کرد و شاخەو شاخ و دۆ لاوە دۆڵ جەنگان، کەم شوێن هەیە لەکوردستاندا نەکرابێتە گۆڕی دوژمن، یان پێشمەرگە خوێنی خۆیانیان تێدا نەڕژاندبێ و شەهید نەبووبن، سەدان کەس گیانی خۆیان بەخت کرد لەپێناو کەشەپێدان و بەئومێدی دوارۆژێکی گەش و بەهیوای ئازادی گەل و خاکی کوردستان.

بۆماوەی ٤ چوارساڵیش لەو چواردە ساڵە، دوای بەیانی ١١ئازاری ١٩٧٠ لەوتوو وێژو نەشەڕو نەئاشتیەدا، دەرکەوت ڕژێم گوێ بە داواو مافەکانی گەلەکەمان نادات بۆیە لەساڵی١٩٧٤ بەتوندی شەڕ دژی ڕژێم دەستی پێکردەوە. ئەمجارە زۆربەی زۆری کورد، لەژێر ئاڵای یەک حزب و سەرکردایەتیدا کۆبوونەوە، تەنیا حزبێکی چەپ و لینینی نەبێت، لەعێراقدا کەشۆڕش و خەباتەکەیان بەپیاوی بێگانە و نۆکەری ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی ئەزانی لەودەمەدا، ئەوحزبەش بەشە کوردەکەشی وەکو بەشە

عەرەبەکەی بیریان ئەکردەوە، بگرە بەدژی شۆڕشیش هاوکاری ڕژێمیان کرد لەشەڕەکاندا. ئەم جارە چونکە شەڕەکە لەجاران قورس تر و توندتر بوو هاوکاری کۆمەڵانی خەڵکیش فراوانتر و کاریگەر تربوو.

زیانی زۆرگەورە لە دوژمن و سوپاو هێزە چەکدارەکان کەوت، ئەوە بوو سەدام حسێن دواتر لەساڵی١٩٨٠ دا لە چاو پێکەوتنێکی تەلەفیزیۆنیدا خۆی دانی بەوەدانا نزیکەی ١٦٠٠٠ شانزە هەزار کوژراو برینداری هەبووە، وە ئاماژەی بەوە کردو ووتی پێداویستییە سەرەکیەکانمان تەواو بوو بوون، چەکی یەکلاکەرەوەمان کۆتای هاتبوو وە ئەیووت، گولە تۆپەکانمان بەرەو تەواو بوون ئەچوون، سێ ناپاڵی گەورەشمان مابوو.

دوای ڕێکەوتنەکەی عێراق و ئێران کە بە ڕێکەوتنی جەزایر ناسراوە، بارزانی نەمرو و چەند سەرکردەیەکی تری شۆڕشەکە بانگهێشتی تارانی پایەختی ئێرانی حەمەڕەزا شا کران بەرلەوەی ڕێککەوتنەکە ڕابگەیێنرێ. دوای گەڕانەوەیان، داوای ووتوو وێژیان لە عێراق کرد، بەلام عێراق وەلامیان دانەوە کە ئەبێت بە بێ شەرت و مەرج خۆتان ڕادەست بکەنەوە. دوای چەندین کۆبونەوە بڕیاردرا ب لاوەەی لێبکرێت، گوێی بۆ ڕاوبۆچوونی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی و ئەو کەسانەی نزیک بوون وڕای جیاوازیان هەبوو نەگیرا.

لەوانە: عەلی عەسکەری و ئەسعەد خۆشەوی و ساڵح یوسفی د.مەحمود عوسمان...تاد. دەووترێت ئەمانە ڕایان وابووە ئەگەر بارزانی ڕازی ببێت چەک و جبەخانە و خۆراک و توانایی چەند ساڵێکی تری درێژەدان بە شۆڕشیان هەیە، ئەگەر کەسیش پشتیوانی و هاوکاریان نەکات لەدەرەوە. ڕاشیان وابوو لەوانەیە دوای ماوەیەک درێژەدان بەشەڕو بەرخۆدان سەدام ئەو ڕایەی بگۆڕێت سەبارەت بەو وەلامەی، کەدوای گەڕانەوەی بارزانی لەلای شای ئێران، سەرکردایەتی کورد داوای وتوو وێژی کردبوو لەعێراق، بەلام سەدام لەوەلامدا داوای خۆبەدەستەوەدانی بێ قەید و شەرتی کردبوو.

لەدوا کۆبوونەوەکانی ١٨و ١٩٧٥/٣/١٩ و لەگەرمەی ووتوێژو پێشنیار و بۆچوونی جیاوازدا کۆتا بڕیار هەر ئەوەبوو کەبارزانی وتبووی هیچ ڕێگایەک نییە جگەلەوەی کێ دێتە ئێران بێت و لەوێ دانیشێت، کێش

دەرواتەوە بۆ عێراق بەخشراوە، با ئەم درێژەدان بە شۆڕشە وەربگرین بۆ کاتێکی تر.

بەکورتی زۆر هەوڵ دراوە لەلایەن یەکە سەربازیەکان و ڕێکخراوە پیشەیەکانی سەر بەشۆڕش و هەندێک لەئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتییەوە بڕێکیش لەلایەن دەرەوە، بەڵام ئەم پێشنیار و داواکاری و هەوڵانە هیچی ئەنجامی نەبوو، بریماکۆف لەبەیرووت بەمام جەلالی ووتوە لەگەڵ بارزانی پەیوەندی بکە باثەو بڕیارە نەدات، ئێمە هاوکاریتان ئەکەین، وە لەو پەیوەندیەدا ووتبووی دووجۆر هاوکاریتان ئەکەین وەک هاوکاری مادی و کەرەستەی جەنگی لەگەڵ فشار خستنە سەر دەوڵەتی عێراق.

هەرچەندە مام جەلال ئەم پەیامەی گەیاندبوو بەڵام گوێی بۆ نەگیراو لەکۆبوونەوەی ١٩٧٥/٣/١٩بارزانی[١] فەرمانی وەستانی تەقە ئەدات و بەرە و ئێران ئەکەونەڕێ، بەبروسکە و نامە و شەفاهیش ئەم بڕیارە سەرتاسەری کوردستانی لێ ئاگادار کرایەوە و ئەمەش بووە کۆتایی پێهێنان و ب لاوەه پێکردنی شۆڕشەکەو بەئاش بەتاڵی ساڵی١٩٧٥ ناو زەد کرا.

---

[١] – ئەم بڕیارەی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانی بووە جێگەی گلەیی و ڕەخنەیەکی زۆر لەلایەن حیزب و ڕێکخراو کەسایەتییە سیاسی و ڕۆشنبیرییەکانی ناوچەکەو پارچەکانی تری کوردستانەوە. دەوترا نەدەبوو بارزانی ئەوبڕیارە بدات، ئەیتوانی درێژە بەشۆڕش بدات. ئەمە دواتریش بوو بە خاڵیکی گەورەی لاواز وە ڕووبەڕووی قیادەی موەقەت بوویەوە. بەڕای من ئەگەر بەراوردی هەلومەرج و بارودۆخی سیاسی نێودەوڵەتی و هەرێمایەتی و ناوچەکە ئەو کات لەگەڵ ئێستادا بکەین، کە ئێستاو ئەوکات تەواو دوو دنیای لێک جیاوازن، ئەو ڕەخنەو گلەییانەی لە بەرزانی گیراوەو کراوە، بەشیکی دروست و لەجێی خۆیدا نەبووە. ئەوەش هەیە ئەی بۆچی بەماوەیەکی زۆر کەم لەدوای ئەو بارودۆخ و سەردەمە، یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان توانی بڕیاری دروستکردن و درێژەدان بە شۆرش بدات. ئەوەش ڕاستە، بڕیارێکی قورس و بوێرانە بووە، بەڵام جیاوازیش هەبوو لەنێوان گەورەیی و بەرفراوانی هەیکەلی هێزی پێشمەرگەو شەڕی بەرەیی و ناوچە ڕزگارکراوەکان، لەگەڵ مەفرەزەی بچوک بچوک و شەڕی پارتیزانیدا. لەو باوەڕەداو بێگومانیشم ڕوخانی ڕژێمی شاهەنشاهی ئێران بوو بەهۆی زیندووی و بەردەوامی بڕیارەکەی یەکێتی، دواتریش هەڵەکانی سەدام حسێن و ئاڵوگۆری بارودۆخە سیاسییە نێودەوڵەتییەکە تا ئێرەی هێناوین.

دکتۆر مەحمود عوسمان لەدیدارەکانی خۆیدا، باسی ئەوەدەکات کەچۆن لەگەڵ بارزانی شای ئێران بانگی کردوون و ئاگاداری کردوون کەئەوان لەگەڵ عێراق ڕێک کەوتوون و ئیتر پشتیوانی شۆڕش ناکەن. بەڕای من هەرچەندە هەڵەو کەموکوڕی لە ستراتیژ و سیاسەت و پەیوەندیەکانی سەرکردایەتی شۆڕشەکەدا هەبووبێ، دواجار ئەو پلانە گ لاوە و شومەی نێوان ئەمریکاو ئێران و عێراق و چەند وڵاتێکی تر، کەماوەیەک پێشتر ئامادەکاری بۆکراوو، وەک کۆبونەوەو دیدارەکانی نیوان عێراق و ئێران لەتورکیاو وەزیرانی دەرەوەی هەردوو ووڵات لەنیۆیۆرک و گرێبەستی چەند سەد ملیۆن دۆلاری کەیسنجەر لەبەغداو....تاد، ئەو کەم وکورتیو هەڵانەی شۆڕشەکە دائەپۆشن، ئەوە زوڵمێکی گەورە بوو ئەوان لەگەلێکی ژێر دەستەو ستەم لێکراویان کرد، کەزۆر دوورە لەئەخلاقی ئەو یاساو ڕێساو بانگەشە سیاسیەوە کەئەوان ئەیانکرد، ئەوەتا کەیسنجەر لەیاداشتەکانی خۆیدا دان بەو زوڵم و خیانەتەدا ئەنێ کەبەرامبەر بەشۆڕشی ئەیلول و گەلی کوردیان کردووە، بەڵام کەیسنجەر خۆی لێ بەری کردووە، گوایە کاتێک شای ئێران ڕایگەیاندووە لەگەڵ عێراق ڕێککەوتون، ئەم،کەیسنجەر سەرسوڕمان گرتویەتی و ئاگاداری ئەو ڕێککەوتنە نەبووە.

بائێمە بچینەوە سەر باسەکانی خۆمان و ئەمە بەجێ بهێڵین بۆ مێژوو نووسانی کورد و ئەو سەرکردەو لێپرسراوانەی ئەو سەردەمە، کەبەشێکیان ئێستاش سەرکردە و لێپرسراویەتی باڵایان لەکوردستان و عێراقدا هەیە. بەتایبەت بەڕێز کاک مەسعود بارزانی کە ئەوکات ئاگای لەورد و درشتی ڕووداو و پێشهات و هەڵوێست و پەیوەندیەکانی شۆڕشەکە بووە، ئەگەر وەک کەسێکی چاودێرو بێلایەن دوور لەبیری تەسکی حیزبی بینووسێتەوە.

لەو باوەڕەدام بەرێزیان خۆی بواردبێ لەهەندێک بابەت، لەکتێبی (بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد)دا.

# ئەوەی بەچاوی خۆم بینیم
# لەساڵی ١٩٧٥ دا

من خوێندکاری پۆلی شەشەمی سەرەتایی بووم لەتەوێڵە، لە ١٩٧٥/٣/٢٠ لەناکاو سەرەتا پێشمەرگە کەوتنە فرکان فرکان و پەلاماردانی فرۆشگا و ئەمبارەکانی ئازوقە و تەقەمەنی، ووتیان ئاش بەتاڵە، دواتر هەندێک کەس و پێشمەرگە دەستیان کرد بەتالان کردن و تەقەیشیان ئەکرد بەسەر یەکتردا، هەندێک سەر لێشێواو پەژارە دایگرتبون، بگرە و بەردە و پێکەڵ ڕژانێک بوو ئەوسەری دیار نەبوو، خەڵک کارتۆنە جگەرەو تایت و سابوونیان لەگەڵ ئارد، ڕۆن و برنج........تاد ئەبرد. نەخۆشخانەی گەورەی شۆڕش لەناو باخی حەمەی حاجیدا بوو، لەچەمی تەوێڵە بەرەو ئاوێسەر، د. باقر فەیلی لەوێ دکتۆر بوو، تەوێڵە فرۆشگای شۆڕش و نەخۆشخانەی شۆڕش و ئەمباری جۆراو جۆری شمەک و کا لاوە کەل و پەلی ئێرانی تێدا بوو، بارەگای هێزی خەبات و چەندین ئەمباری چەک و چۆڵە و فیشەک و گوللەی لێ بوو.

هەموو لایەک سەری تێ کردبوو، بڕێک خەڵک چەکو فیشەکیان ئەبردو ئەیانشاردەوە، پێشمەرگە و فەرماندەییەکان کۆمەڵ کۆمەڵ لە خوارەوە بەرە و تەوێڵە و بیارە ئەهاتن، کۆمەڵێک بەرەو خوارو کۆمەڵێک بەرەو ژوور، چەندین کۆڕ و کۆبوونەوە ئەکرا تابزانن بۆ کام لا بچن ئێران یان عێراق؟ ئەوانەی بۆعێراق ئەچون پۆل پۆل بەرەو خوار بۆ سەیدسادق لەوێ تەسلیم ئەبونەوە، دیارە لەوێ لیژنەی لێ بوو بۆ ئەوانەی تەسلیم ئەبنەوە، قەتارەی پێشمەرگە و ژن و منداڵیش بەرەو شۆشمێ و سەرمەرز، ئەوانەی بۆ ئێران ئەچوون ڕێگە بەرنەئەکەوت. لەناو تەوێڵەدا ئەمبینی هەندێک چەکیان فڕێ ئەدایە ئاوەکەوە و جنێویان بەسەرکردایەتی شۆڕش ئەدا، هەندێک چەکەکانیان ئەفرۆشت بەچەند دینارو تمەنێکی کەم یان بەپاکەتە جگەرەیەک.

چەند ڕۆژ دواتر من لەگەڵ ماڵی دوو پورمدا گوڵچین وشیرین کە هاوسەرەکانیان پێشمەرگە بوون بڕیاریان دابوو بچنە ئێران تانزیک سنوری

شۆڕشمێ ڕۆیشتم، سەر مەرزەکە کەس بە کەس نەبوو، خەڵک بەناو یەکدا ئەهاتن و ئەچون، لەکاتی گەڕانەوەمدا پورەکانم دەستیان کرد بە شین و زاری ئەنوەر عەلی هاوسەری پورە شیرینم کلاشینکۆفێکی سینی قۆنداخ داری نوێی پێ بوو زۆر جوان بوو، پێی دام ووتی بیبە بۆ باوکت، پورەکانم ئەیانووت لە ڕێگە لێی ئەسێنن مەیدەرێ، ووتم نا نایدەم بە کەس زۆر دڵخۆش بووم بەوەرگرتنی کلاشینکۆف و تاقمەکەی زوو گەڕامەوە، هێنامەوە بۆ ماڵی خۆمان و باوکم شاردیەوە، تا شۆڕشی نوێ دەستی پێکردەوە، دوای دووساڵ دواتر من لەتەمەنی پانزە ساڵیدا بووم بە پێشمەرگە و ئەو چەکەم لەگەڵ خۆم بردە دەرەوە.

چی بەردەم دووکان و ڕێگاوبان و ناو بازاڕ و بەردەم ئەمبار و بارەگا هەبوو پڕ بوو بوو لەکارتۆنی خاڵی گوللە و حەشۆ و فیشەک و شتی جۆراو جۆر، وردە وردە ولاتەکە چۆڵ بوو پێشمەرگەی لێ نەماو حکومەتیش نەهاتەوە، ڕێنمایی دەرکرا بۆ ئەوکەسانەی چەک تەسلیم ئەکەنەوە، پارە وەرئەگرن ئەوانەی بیشارنەوە و قایمی بکەن، دوایی کاشیفە لەژێر زەویدا ئەیدۆزێتەوە و سزای هەیە.

هەندێک کەس دەستیان بەکۆکردنەوەی چەک کردو بەوەجبە ئەیان برد بۆ سەیدسادق ولەوێ حکومەت لێی وەرئەگرتن و پارەی ئەدانێ، خەڵکی زۆریش ئەیان شاردەوە، باوکم دەستیکرد بەکڕینی چەکی برنۆو کلاشینکۆف و فیشەک بەپارەیەکی کەم، دوای ماوەیەک قاچاخچی چەکوفیشەک دەرکەوتن ئەیانکڕی و ئەیانبرد بۆشاردنەوەو وەرگرتن نەک بۆتەسلیم کردنەوەی.

## هاتنەوەی دەزگا
## ئەمنی و سەربازییەکان بۆ هەورامان

ئێمە تاقیکردنەوەی پۆلی شەشمان لەخوێندنگای شۆڕشدا لە تەوێڵە کردبوو، لەدوای هاتنەوە و دامەزراندن و جێگیر بوونی ئیدارەکانی حکومەت و سوپای عێراق لە ناوچەکەو بەتایبەت لەسەر بەرزاییەکان لە سەرەتای مانگی٤/١٩٧٥ دا، دەستگای ئەمن و ئاسایش هاتەوە ناوچەکە، چەند کەسێکی نەفس نزم و بەکرێ گیراویش هاوکاریان ئەکردن و ڕێنوێنی کەریان بوون، خەڵکیان بۆ دەستنیشان ئەکردن، هەرچەندە لێبوردنی گشتی هەبوو بۆ ئەو کەسانەی کەپێشمەرگە بوون یان کاری حیزبیان کردووە.

پارتە کارتۆنییەکانی کوردی هەبوون کە هاوکاری ڕژێم بوون لەو کاتەدا چەند کەسێکیان هاتوو چۆیان هەبوو لەنێوان هەڵەبجە و تەوێڵە و بیارە دا، بەخەڵکیان ئەووت ئەگەر نابنە بەعسی وەرنە لای ئێمە، هەرچەندە هیچیان بە دەست نەبوو، ئەمنەکان داوایان لەخەڵک ئەکرد کە ئەبێ هەموو کەس ببێتە بەعسی. دوای ماوەیەکی کەم کە ناوچەکە ئاسایی بوویەوە و دەستگاکانی حکومەت و ئەمن و ئاسایش دامەزران.

ئینجا جەژنی حەوتی نیسان لەناو بازاڕی تەوێڵە دەستی پێکرد، چەندین شەو ڕۆژ زڕناو دەهۆڵ و سەرچۆپی کێشان بوو، دروشمی جۆراو جۆر. (كل هورامان بعسيه، بعسيەونبقا، ضدك ياموﻻ، كل أشجار بعسيه). ئینجا دابەشکردنی وێنەی ئەحمەد حەسەن بەکر و سەدام حسێن. چەند کەسێکی ناوچەکەش کەئەهاتن و ئەڕۆشتن بە دەور و بەری ئەمنە عەرەبەکاندا لای خەڵک وا خۆیان پیشان ئەدا کەشتیان بەدەستە لەتەوێڵە و دەور و بەریدا، لەوانە قادر بەڵخەیی، مەناف فەتحوﻻ، کامیل کەریم.... تاد، کامیل کوڕێکی زیرەک بوو، دواتر بوو بەپێشمەرگەی پارتی و لەوشکەناو بەتۆپی عێراق شەهید بوو.

لەم جەژنی حەوتی نیسانەدا ڕۆژێک بۆ تەماشا کردن من و خوێندکارێکی تری هاوڕێم بەناوی دڵشاد نەجیب چووینە سەر دوکانی لاﻻوناجی هاوڕێمان

بوو ، لەدوکانەکەدا وێنەی سەدام و ئەحمەد حەسەن بەکر هەڵواسرابوو، من بەنەعمانی کوڕی لالۆناجیم ووت ئەو وێنەت بۆ هەڵواسیون؟ ووتی ئەمنەکان خۆیان هێناویانە، بەیانی دوو ئەمن هاتن بۆ مەکتەب منیان بانگ کردو بردمیان بۆ ئەمن ووتیان بۆ وات وتووە من حاشام کرد ووتم شتی وام نەوتووە، ووتیان شاهید هەیە، حەمید حەمە ئەمین ودڵشاد نەجیب ئەهێنین، ووتم بیان هێنن باش بوو پەشیمان بونەوەو نەیانهێنان ئەمجارەش ڕزگار بوم.

ئەبێ کەسێکی تر بەم قسەی زانیبێت، دڵشاد و حەمید نەبووبن بۆیە نەیان هێنان، دڵشاد خزممان بوو جێگەی متمانەش بوو ئەیزانی من دەمانچەم هەیە، کاتێک لە دۆڵبیان دەمانجەکەم هێنابوومەوە بۆ تەوێڵە لەپایزی ١٩٧٦ دا دڵشادم لەگەڵ خۆم بردبوو. ئێمە پێشتر ماڵمان لە دۆڵبیان بوو کەبارمان کردبوو بۆ تەوێڵە کلاشینکوف و دەمانچەکەمان لە دۆڵبیان شاردبووەوە نەمانبردبوون بۆ تەوێڵە، من بەبێ ئاگاداری باوکم و بەخود سەری دەمانچەکەشم بردەوە. جا ئەوڕۆژە لەگەڵ دڵشاد لە تەوێڵەوە چووین بۆ دۆڵبیان دەمانچەکەمان دەر هێنا لەناو کونی پشکۆلا بوو[1]، کاتێک گەڕاینەوە بۆ تەوێڵە بە ناو چەما ڕۆشتین لە جێکەیەک بەناوی ئاساوگە هاتینەوە سەرجادە دەمانچە لەژێر پستوێنەکەی مندا بوو بەگەشتنی ئێمە جێبێکی سەربازی لەلای سۆکانەوە هات بڕوا بۆ تەوێڵە لەلای ئێمەدا وەستا هەردووکمان سەیری یەکمان کرد ترساین، بەڵام ئەوان دابەزین و خەریکی ئاوکردنە ناو ئۆتۆمبێلەکەیان بوون، ئێمەش ڕۆشتین.

پیاوێکی هەژارو خزمەتکاری بارەگای هێزی خەبات و بەردەستی عبدلوەهاب هەبوو ناوی حەمەئەمین بوو، پێیان ئەووت جوجولە، هەرکەس گاڵتەی پێبکردایە شکاتی ئەکرد لای فەرماندەی هێز ئەیووت ئەمە جنێو ئەدات

---

[1]- پشکۆڵ ئەو دارەیە کە کۆن لە گوندەکاندا دەرگای پێ قایم ئەکرا. لەدیوی ناوەوە کاتێک ماڵەکە دروست ئەکرا، دیوارەکانی ئەملاو ئەولای دەرگاکە کونێکی ئاسۆیی بۆئەکرا لەبەرامبەر یەک. لەلای چەپەوە کونەکە کورت بوو، لەلای ڕاستەوە درێژ بوو لەگەڵ دروستکردنەکەدا ئەو دارە، کە پێی ئەوترا پشکۆڵ لەکونە درێژەکەدا دائەنرا. هەرکات دەرگاکەت دابخستایە سەری پشکۆڵەکەت ڕائەکێشاو ئەتخستە کونەکەی بەرامبەری. بەوجۆرە دەرگاکە قایم ئەکرا.

بەپێشمەرگە، یان یەکێک بیویستایە کەسێک عەزیەت بکەن، بەحەمەئەمینیان ئەووت برۆرە لای عبدلوەهاب بڵێ فلانەکەس جنێوی داوە بەبارزانی، دواتر لە جەژنی هاتنەوەی بەعس و لە زەماوەندی حەوتی نیساندا چەند کەسێک سواری سەرجێبێکیان کردبوو بەگوڵ و گیای جۆراو جۆر تاجەگوڵینەیان کردبووە ملی ئەویش لەسەر سەقفی جێبێکەوە سەمای ئەکرد، دواتر هەرکەس قسەی بکردایە بەدڵی ئەو نەبوایە ئەیووت ئەوە جنێو ئەدەیت بەئەحمەد حەسەن بەکر.

ئەو رۆژەی عەسکەر هاتنەوە و گەشتنە لای مەخفەری سۆسەکان، پاش نیوەڕۆ بوو، ئێمە چووینە نزیک مەخفەرەکە بۆ سەیری عەسکەر، فەسیلێک هاتن و لایان دایە مەخفەرەکە، پیاوێکی خەڵکی تەوێڵە وەک شارەزا لەپێشیانەوە هاوکاری ئەکردن شانازیشی ئەکرد بەو کارەیەوە.

دواتر سریەی عەسکەر هاتە تەوێڵە و ناوی ئامر سریەکە مالیک بوو بە پلەی ملازم، بارەگای فەوجەکەیان بەر لەوەی بێتە تافانی بیارە هاتبووە ئاوایی رۆستەم بەگ. ماوەیەک ملازم شاکر ناوێک لەوێ مەسئول بوو، هاوینی ساڵی١٩٧٦ ملازم شاکیر هات بۆ دۆڵبیان و باوکمی گرت،ماڵمان لەناو خانەباخدا بوو کاتێکمان زانی مەفرەزەیەک سەرباز لەگەڵ ئەفسەرێکدا دەوری خانەباخەکەیان گرت، ئینجا ئەفسەرەکەو سەربازێک هاتنەناو فایلێکی کردەوەو پرسیان حەمەسەعید کوا؟ لەو کاتەدا باوکم چوبوو بۆ لای ماڵی حاجی ئەولە دراوسێ باخمان بوون، ووتمان لێرە نییە، داوای ئاویان کرد دایکم بەمنی ووت ئەو سەتڵە ببە لەکانی ئاو بێنە، کانییەکە لەبەردەم کەپرەکەدا بوو کەڕۆیشتم دووعەسکەر گێرامیانەوە، دایکم ووتی بائەم کوڕە بچێت باوکی بانگ بکاتەوە، ووتیان نادانیشن کردینیانە ناو خانەباخەکە، خوشکو باکانم مناڵ دەستیان کرد بەگریان، ئەفسەرەکە ووتی مەگرین هیچ نییە بۆ ئەگرین؟ ئەوەندەی نەبرد کاتێکمان زانی واباوکم دوو عەسکەر هێنایان سەیرێکی ئێمەی کرد و ئێمەش ئەومان بینی بەجارێ دەستمان کرد بەگریان، باوکم توڕە بوو ووتی بۆ ئەگرین، ئەفسەرەکە ووتی بەباوکم هەستە برۆین لەگەڵ کۆمەڵێک سەرباز دایانە پێش و رۆیشتن، شینوزاری ئێمە گەرم بوو، دوو سەرباز بەدیارمانەوە وەستان تا ئەوان دورکەتنەوە، ئەمانیش بەپەلە بەدوای ئەواندا رۆیشتن .

پاش چەند ڕۆژێک لەگەڵ دایکم ومام حاجیمدا چووین بۆ لای شێخ ئەحمەدی شێخ محەمەد ووتیان ڕەنگە حورمەتی ئەو بگرن و بتوانن باوکتان بەربدات، بەڵام کوا بەعس حورمەتی پیاو چاک ئەگرێ؟ دواتر من و کەمالی سەید محەمەدی پورزای هوشمەن مستەفا چووین بۆ لای کاک هوشمەن بۆ عەربەت، لەوێ بەڕێوەبەری ناحیە بوو، کاتێک دەرگاکەی کردەوە ئێمەی بینی ووتی ها چیتان ئەوێت کەمال دەستی بەقسەکردن کردن کرد، ئەویش کە تێگەشت بۆ چی چووین لەوەڵامی کەمالدا سەیرێکی ئەملاو ئەولای کردو کردی بە دارێکدا بۆمان، من لە پشتی کەمالەوە وەستابوم بوخچەیەک جلیشم پێبوو بەدڵشکاوی ڕامان کردو گەڕاینە دواوە. دواتر لەگەڵ چەند پیاوێک و حەمەڕەشیدی مامدا، جارێکیتر چووین بۆ سۆراخی لە ئاوایی ڕۆستەم بەگ سەربازگەی لێبو حامد البیاتی مەسئول بوو کە ئێستا نوێنەری عێراقی تازەیە لە یو، ئێن دا، دوای ئەوە مامم قسەی لەگەڵ کرد، دڵی داینەوە و ووتی خوا گەورەیە، ئینشا ئەڵا باوکتان بەر ئەبێت، پیاوێکی بەڕێز بوو.

دوای چەند مانگێک جەعفەری حاجی ئەولە لەزیندان ئازاد کرابوو، چووین بۆ لای لێمان پرسی لەزیندان باوکمی نەدیوە ووتی نا، کەچی دوای چەند ڕۆژێک ناردیان مام حاجیم بچێت بۆلای جەعفەر، چوبوو کەهاتەوە ئێمە چووین بەدەمیەوە هیچی پێنەوتین، شەو من و دایکمیان بانگکرد بۆماڵی مامم، لەوێ ووتی نابێت کەسبزانێت چونکە بۆ جەعفەر خرابە باوکتی لە زینداندا بینیوە. بەوقسە دڵخۆش بووین، دوای شەش مانگ کاتێک باوکم ئازاد کرا زۆر کەس نەی ئەناسییەوە لاواز بوبوو چەرمی پشتیان گرتبوەوە، ژێر پێیان بەئوتووی گەرم سووتاندبوو، لەگەڵ چەندین کەسدا بوبوو لەسێدارە درابون یان لەژێر ئەشکەنجەدا شەهید بوبوون، لەگەڵ چەند کەسێکی تردا لەوانە عەلی دەرەدۆینی[1]، مام قادر شارستێنی و حەمە پێنجوێنی.

---

[1] – باوکم ئەیووت عەلی لەسەر ئەوە گیراوە برایەکی پێشمەرگە بووە بەناوی نەجیم سالح، عەسکەر چوون ماڵیان گەڕاون دوو دەمانچەیان دۆزیوەتەوە، خۆیشی پەیوەندی بەپێشمەرگەکانەوە بووە. لەدوای ڕاپەڕین باوکم ووتی بزانە عەلی ماوە یان لەسێدارە دراوە، لەجوامێری برای شەهید شاهۆ حەمەی تەڵەم پرسی، ووتی ئەوە خاڵۆزامانە ساڵی ١٩٧٦ دوای حەوت مانگ ئازاد کرا، لەڕۆژی ١٩٩١/٣/١٢دا لەڕاپەڕین و لەخانەقین شەهید کرا. لەگەڵ براکانی کاک سەلامی کوێخا عەزیزدا.

## خوێندکارێکی سەرمڕۆ بووم

لەپۆلی سێی ناوەندی بووم، شەهید ستاری سەعید خەڵەف لە دەڤەری هەورامان بوو. ئەوکات ستار کۆمەڵە بوو، شێخ عەلی وکاک حامیدی حاجی خالید و ئەحمەد گریانەیی و پێشمەرگەکانیان لەدەوروبەری ئاوایی بۆینو بناری چیای شنرویدا بوون. ڕۆژی ١٩٧٧/٤/٢٩ دۆستێکی باوکم، کە ناوی مستەفای سەید موراد بوو لە ئاوایی هاوارەوە هات بۆ دۆڵبیان، دوای پشوودان و چای خواردنێک بەدزی ماڵەوە پێی ووتم: کاک ستاری سەعید خەلەف ناردومی، پێی وتووم برۆ بۆ دۆڵبیان بە حەمە کوڕەکەی حەمەسەعید بڵێ سبەی ئێوارە بەنهێنی کەس پێی نەزانێ بێت بۆ ئاوایی هاوار بۆ لام، پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٧٧/٤/٣٠ لە دۆڵبیانەوە بەبیانوی سەردانی هاوڕێکانم چوومە ئاوایی پالانیا، بەدایکم ووت: ئەمشەو لەماڵی جیهانبەخشی هاوڕێم ئەبم بەیانی دێمەوە، لەوێوە لەگەڵ کەسێک بەناوی عومەر ئەحمەد ناوخاس ڕۆیشتین بۆ هاوار بۆماڵی کاک مستەفای سەید موراد، ناردی عومەری برازای کوڕی خاڵۆ غەفار هات پێی ووت: قاترەکەت بهێنەو حەمە سوارکە ببەرە تاوێرە، لەوێشەوە چووین بۆ تاوێرە، کاتێک هەوا تاریکی کرد گەیشتینە کەوانەی ئاوایی.

لەسەر ڕێگای هاوار-تاوێرە یەکێک لەپێشمەرگەکان پاسەوانی دەکرد چاک و چۆنیمان لەگەڵ کرد. پرسی کێن و بۆکوێ ئەچن؟ سەرەتا وتمان هاتوین بۆ ماڵی خزمان ترساین نەوەک جاشبێت، کە بۆمان دەرکەوت پێشمەرگەیە هەواڵی کاک ستارمان پرسی، ئیتر تەواو تاریکی کرد، خۆمان کرد بە ئاواییدا. ئەو پێشمەرگە بردمیە ماڵی ڕەفعەت تاوێرەیی[1]، کاک ستار لەوێ بوو هات بەدەممەوە لە بەردەرگا ئەملاوئەولای ماچکردم و چووینە ژوورەوە، لەوێ ناساندمی بەپێشمەرگەیەکی تر ووتی: ئەمە خزمی خۆمە.

[1] – کاک ڕەفعەت خەڵکی گوندی تاوێرو لەبنەماڵەیەکی دیاری ناوچەکە و ئەو سەردەمە ولاخدار بوو، تاوێرەییەکان زۆربیان بەبۆنەی هاتووچۆی سنوورەوە ئەهاتن بۆ ماڵی ئێمە ئەمناسین لەوانە سەید جەعفەر، کاک ڕەفعەت و براکانی، ڕەفعەت ئێستا ماوە لە شاری هەڵەبجە کەبابچییە.

پرسی لەمن ئەم پیاوە دەناسی؟ ووتم: نەخێر. ووتی: ئەوە کاک نادر هەورامییە لەئێران گەڕاوەتەوە. کاک نادر لەماڵەکەدا قسەی ئەکرد بۆ چەند کەسێک ئەیووت خۆم لەدەست ساواک رزگار کردووەو بە دزی هاتومەتەوە بۆ خزمەتکردنی وولاتەکەم.

من ئەبوو هەر ئەو شەوە پێش ئەوەی رۆژ بێتەوە بگەڕێمەوە دۆڵبیان و سبەینێ لە تەوێڵە لەمەکتەب ئامادەبم. کە ئەمەم بە کاک ستار راگەیاند، ئەویش هەستا و بردمیە پەنایەکەوە هەواڵو دەنگ وباسی تەوێڵەو ناوچەکەی لێ پرسیم. منیش وەڵامم دایەوە، ئینجا ووتی: سبەی شەو دێمە پاڵانیا، کە تاریکی کرد وەرە بۆ ئەوێ. ووتم : بەسەرچاو لەوکاتەدا کاک نادریش هاتە لامان کاک ستار پێی ووت: سبەینێ ئێوارە لەپاڵانیا چاوەڕێمان ئەکات، قسەتەواو بوو، لەوکاتەدا شەهید ستار بەخانە خوێکەی ووت قاترێک ئامادەکەن ئەم کوڕە تا ئاوایی جاور ببات. ووتم کاک ستار لەهاوارەوە قاتریان داومەتێ لەدەرەوەی ئاوای قاترەوانەکە چاوەڕێم ئەکات، لەکاتی هاتنەدەرەوەدا کاک نادر دەیویست شتێک بڵێت و بواری نەبوو، کەمێک هات بەدوامداو بەئەسپایی پێی ووتم: سبەی شەو کە هاتی زووتر وەرەوە بڕۆرە ماڵی حەسەن بەگی مەحمود بەگ، من دێمە ئەوێ و ئیشم پێتە، من هیچم نەوت هەر بەجوڵەی سەر رەزامەندیم پیشاندا، نەمهێشت عومەر بزانی کاک ستار بۆ بانگی کردوم و چیمان باس کردووە، کە لەئاوایی دوور کەوتینەوە عومەر پرسی سبەینێ دێنە پاڵانیا؟ خۆم هەڵە کرد ووتم کێ؟ ووتی ئەم جەماعەتە؟ ووتم: نازانم. ووتی ئێ ئەوە کاک نادر وایووت ووتم: من تێنەگەشتم نازانم.

هاتینەوە بۆ هاوار ماڵئاوایمان لە کاک عومەری قاترەوان کردو دەمەو بەیان گەشتینەوە ئاوایی پاڵانیا. عومەرم لەماڵی خۆیان جێهێشت و بەرەو دۆڵبیان هاتمەوە خەوم لەخۆم تۆراند، کاتێک گەشتمە بەردەرگای ماڵەوە جیرەی کردنەوەی دەرگاکە هات. دیم دایکم بە سەتڵی خاڵی ئاوهێنانەوە هاتەدەوە ئەچێت بۆ سەر کانی، منیش نەچوومە ژوورەوە لەگەڵ دایکما چووم دەم و چاوم شۆردو هاتمەوە، نان وچاییم خوارد و کتێب و دەفتەرم خستە جانتاکەمەوەو خۆم ئامادەکرد بۆ رۆیشتن بۆ خوێندنگا. ئەو رۆژە لەخوێندنگا لە وانەکاندا چەند جارێک باوێشکمدا. مامۆستا محێدین سەلیم پێی

ووتم چییە ئەڵێی گورگی ترسیت شەو نەخەوتوویت؟ ووتم مامۆستا دایکم نەخۆش بووە بەدیارییەوە دانیشتووین تا بەیانی. نیوەڕۆ لەخوێندنگا گەڕامەوە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٧٧/٥/١ وردە وردە هاتمە پالانیا، نەچوومە ماڵی حەسەن بەگ و خۆم کرد بەمیوانی ناوەختی حەمەسەعیدی قادر مەجنوون، پیاوێکی باشبوو لەتەوێڵەوە ماڵی گواستبوویەوە بۆ پالانیا. دوای پشوویەکی کورتیش ووتیان: پێشمەرگە هاتنە ناو ئاوایی. خاوەن ماڵ هەستا بچێت بۆ لای مزگەوت، پێم ووت ئەگەر کاک ستار سەعید خەڵەف بوو پێی بڵێ: حەمە لەماڵی ئێمەیە. سەیری کردم ووتی: چۆن؟ ووتم: بەنهێنی هەربەخۆی بڵێ، تابزانێت من لێرەم. کاک حەمە سەعید ڕۆیشت و زوو هاتەوەو ووتی: جەماعەتی ستار بوون قسەم لەگەڵ کرد، پێی ووتم بابێتە دەرەوەی ئاوایی چاوەڕێی دەکەم، ستار و هەندێ لە پێشمەرگەکان بۆ نانخواردن دابەش نەبوون و بەرەو تەوێڵە لەئاوایی دەرچوون، منیش دەرچووم و لەناو گۆڕستانەکەی ئاواییدا کاک ستار چاوەڕێی ئەکردم، تاریکی داهاتبوو چوومە لای و پاش چاک و چۆنی ووتی: هاتی؟ ووتم: بەڵێ، پرسی دەتوانی لەڕێیەکی چەپەکەوە بمبەیتە ناو تەوێڵە؟ ووتم بەڵێ ووتی: دەی باشە بابڕۆین. بەناو چەم و باخەکانی پالانیا و سۆسەکانو پاشان بەرەو تەوێڵە ڕێگامان بڕی، لەڕێگەدا بۆم دەرکەوت، کە تەنیا خۆی و حەوت پێشمەرگەن و نادر هەورامییان لەگەڵدا نییە. شەوێکی ئەنگوستەچاو بوو، لەنێوان دۆڵبیان و سۆسەکاندا چەکی یەکێک لە مەفرەزەکەی دا بەمن و خاوەن چەکەکە پیاوێکی بەتەمەن بوو، لەخانە باخێکدا دایناوە، ووتی: لێرەبە پاش دوو کاتژمێری تر دێینەوە لات، ئیتر لەوێوە پێی ووتم: تۆ لەپێشەوە برۆ، لەهەر شوێنێک دەنگیان دای تۆ قسە مەکە و خۆت بدە بەزەویدا.

تاقم مەخزەنەکان بۆ من گەورە بوو، توند نەئەکرا و زوو زوو شل دەبوویەوە، چەند جارێک بۆی چاک کردم. بەڕێگەیەکی بەرەو ژوور و پێچاوپێچ و کۆڵانە و کۆلانی تەنگەبەری ناوباخەکاندا گەیاندنمە ناو ماڵەکانی تەوێڵە. بەر لەوەی بگەینە ئەو شارەدێیە یەکێک لەپێشمەرگەکان کەئێستە لەژیاندایە و ناوی عومەری قالە گوڵباخە، گوێم لێبوو ووتی: بۆ ئەم کوڕە چەکەکەی دانەنێ و بێچەک لەپێشمانەوە بڕوات، لەهەرشوێنێک دەنگیاندا بڵێت منم هاولاتیم بەدوای ولاخدا دەگەڕێم؟

کاک ستار بەمە رازی نەبوو ووتی: نەخێر، بەمنی ووت: هەرتۆ لەپێشمانەوە برۆ، ئەگەر توشی عەشایەر بوویت خۆتیان لێ نزیک مەکەرەوە با نەتناسن، ئەگەر کەمینیش هەبوو دەنگیان دایت وەڵام بدەرەوە و بڵێ خەڵکی تەویڵەم، لەگەڵ وەڵامدانەوەکەدا خۆت بدە بەزەویدا، ئێمە لەدواوە تەقەیان لێ دەکەین، کە چووینە ئاوایی یەکەمجار چووینە گەڕەکی بەرامبەر لەبەر دەمماڵی حاجی ئەولەدا ووتم: ئەمە ماڵی خاڵتە لائەدەیت؟ ووتی نا برۆین، من و کەسێکی دیکەی ناردەپشتی گەرماوەکە و پاسەوانی بکەین تا ئەوان دێنەوە بۆ لامان، بەناو کۆلانێکی گەڕەکی بەرامبەردا سەرەو ژوور بوونەوە، لەوکاتەدا کەسێک بەناوی نەسرەدین عەزیز، کە لە شەونشینی بوو لەماڵی حاجی ئەولە، هات بړواتەوە بۆ ماڵی خۆی گەیشتە لامان و دەیویست لێمان نزیک بێتەوە بزانێ کێین؟ ئەو پێشمەرگەی کەپێکەوە بوین زللەیەکی تێ سرەواندو ئەویش بەڕاکردن گەڕایەوە.

پاش کەمێک ئەوانیش کە چووبوون بەرەو ژوور گەشتنەوە لامان و کەسێکیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، ویستمان بەرەو گەڕەکی چلانە بچین، بەڵام نەمانتووانی لەجادەکە بپەڕینەوە، پەیژەیەکمان هێناو دابەزینە ناو گەراجەکەی تەوێڵە، پاسەوانێک لەوێ خەووتبوو، ناوی دارا بوو بەخەبەرمان هێنا و دەرگای گەراجەکەی بۆ کردینەوە، لەوکاتەدا کە دەمانویست لەجادەکە بپەڕینەوە بۆگەڕەکی چلانە، سێ کەس دەرکەوتن، چەند پێشمەرگەیەک ویستیان تەقەیان لێ بکەن، بەڵام من ناسیمنەوە کە عەشایرن و نەمهێشت تەقەیان لێ بکەن، گەشتنە لامان و من خۆم لادا، کاک ستار چاک و چۆنی لەگەڵدا کردن و یەکیان لەئامێز گرت، ئەو چەند کەسەش دکتۆر حەمە رەشید عوسمان و خزمەکانی بوون، لەجادەکە دەرچووین گەیشتینە کۆلانی دەمەرە سورا لەوێ وەستاین و بۆم دەرکەوت ئەو کەسەی کە هێناویانە جەمیلی ئاغا جەعفەرە، دوو پێشمەرگەش چوون کەسێکی تر بێنن بەناوی مام حەسەن حەمەسەلیم، لەم شوێنەدا چەند کەسێکی عەشایەر ژن و پیاو هاتنە رێمان، لەوانە دڵشادی حاجی عەبولە، ماڵی پورە ئامەی جەلالی و کورەکانی سەردار و سالار، دڵشاد هەر دەریان دەکردو دەهاتەوە لامان بۆیە ئەویش لێدانی خوارد، مام حەسەنیشیان هێنایە خوارەوە، چوون بۆ کەسێکی تر بەناوی عەلی تۆفیق بەڵام ئەو هەڵهات لەدەستیان. عەریف مەحمود ناسراو بە خولە

سەر چەور بەعەرەبی ووتی: عەلی تۆفیق هەڵهات تەقەی لێ بکەین، کاک ستار ووتی: نا وازی لێبهێنن.

هەموو یەکمان گرتەوە و هاتین بەرەو خوار بۆ لای خانەقای تەوێڵە، لەوێ بینیمان دادە قەتەی خێزانی جەمیل ئاغا جەعفەر هاتووەتە خوارەوە لەگەڵ پێشمەرگەکاندا دەستی بەقسەکردن کرد، من کەمێک دوورکەووتمەوە بۆئەوەی نەمناسێ،کەسێک بەدوامدا هات و ووتی نەڕۆیت، ئێمە شارەزا نین لەکوێوە ئەگەڕێینەوە؟ ووتم نا ناڕۆم منیش وەستام و چاوەڕێم کردن، کە هاتن لەبابە سەرهەنگ و جۆگەی سۆفیەوە پێشیان کەوتم تاهاتمە ڕاستی ئاساوگە و لەوێوە بۆسەر جادەی سەرەکی بەجادەدا تا هاتینە باجگیران نزیک ئاوایی سۆسەکان، لەوێ بەمنیان ووت تۆ بڕۆ، ئیتر بەرێگەدا ڕاستە و ڕاست هاتمە سۆسەکان و لەوێوە بۆ دۆڵبیان.

من گەشتمەوە لای ئەو پێشمەرگەی جێمان هێشتبوو، لەگەڵ گەیشتنی من بۆ لای ئەو دوو دەست ڕێژی گولە کران، کابرا ووتی ئەها کەووتنە کەمینەوە ووتم نەء، من زانیم ئەوە جەمیل و حەسەنیان کوشت، ئەو پێشمەرگەیە داوای چەکەکەی کردەوەو ووتی بمدەرەوە ووتم: نا بابرادەران بێن ئەتدەمەوە، نەمدایەوە زۆر حەزم ئەکرد کەچەکم پێیە، دوای نیو کاتژمێر جەماعەت هاتن و پێکەوە ڕۆیشتین بۆ ماڵی خۆمان بۆ دۆڵبیان و دایکم لەخەو هەستاند هێلکە و ڕۆنی بۆ کردن و نانیان خوارد، ئەوان گەڕانەوە بەرەو خوار بۆپالانیا. منیش کەمێک خەووتم ئەوە شەوی پێشتریش هیچ نەخەووتووم، باسی هیچم لە ماڵەوە نەکرد بۆ دایک و باوکم و نەیان زانی چی ڕویداوە تا دواتر.

بەیانی چوومەوە بۆ خوێندنگا هێشتا حکومەت نەهاتبویە سەر مەیتەکان، خەڵک ئەچوون بۆ تەوێڵە ئەگەیشتنە لای کوژراوەکان ئەگەڕانەوە من لەگەڵ چەند خوێندکارێکی تر نەگەڕاینەوە،چووین و دامان بەلایاندا، کەگەشتینە تەوێڵە بینیمان هەموو خەڵک لەناو بازارو لەم بەرو لەوبەری جادەوە وەستاون لەئێمەیان ئەپرسی چیتان بینیوە لە ڕێگەدا ڕاستە ئەوپیاوانە کوژراون؟ ئێمەش بەناو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا ئەڕۆیشتین و بە پچڕپچڕی وەڵامی خەڵکمان ئەدایەوە. بۆ من لەلایەکەوە خۆش و هەستم بەسەربەرزی ئەکردو لەدڵا پێم خۆش بوو هاوڕێکانی خوێندنگام یان ئەوکەسانەی کەدژی

بەعس وحکومەتن هەموو بزانن ئەمشەو لەگەڵ ئەو مەفرەزە بووم، لەلایەکی ترەوە ترسم هەبوو چاوو و گوێم لە هەرجوڵەو بۆهەر سەدایەک غافڵ نەبوون.

دوای کوشتنی ئەم دوو پیاوە خەڵکەکە چاو ترسێن بوون، هەموو ئەوانەی بەعسی و سەر بەدەزگا جاسوسیەکان بوون کشانەوە. دوای ئەوەی من بووم بە پێشمەرگە و لەناو یەکێتیی و پێشمەرگەدا هەڵسوڕاو و لەناوچەکەدا چالاک بووم، کاک نادر هەورامی کە بەرپرسی قیادە موەقەتە بوو، هاتە ئاوێسەر و لەکۆبوونەوەیەکی جەماوەریدا وا باسی ئەم بەسەرهاتە ئەکات، ئێمە هاتینە پالانیا مەفرەزەیەکمان دا بەحەمەی حەمە سەعید بڕوا دوو سەربازی حکومەت بکوژێت چوو دوو هاوڵاتی کوشت



یەکێک لەبەشداربوانی کۆبوونەوەکە بەناوی حەسەن ئەڵلا بەخش ووتبووی: کاک نادر حەمەی حەمە سەعید خوێندکار و منداڵ بوو، ئێوە بۆ ئەوەندە سادە و ساویلکە بوون مەفرەزەیەکتان دایە دەست ئەو، ئەی خۆتان چ کارە بوون؟ کاکە حەمەی حاجی مەحمودیش لەرۆژمێری پێشمەرگەیەکدا، بەرگی دووەم لاپەڕە ١٩٢ لەم بارەوە شتێکی نووسیوە. دیارە قسەکانی نادر هەورامی ڕاست نەبووە، ئەم رقەی لە سێ لاوە سەرچاوەی گرتبوو، یەکەم: هەڵسوڕاوی وچالاکی من لەناوچەکەدا، دووەم: داخی شەوەکەی تاوێرە و نەچوونەکەی من بوو بۆ ماڵی حەسەن بەگ بۆ لای لەئاوایی پالانیا. سێیەم: ویستویەتی بەو قسەیە بەرپرسیاریەتی کوشتنی حەسەن و جەمیل لەسەر خۆی لابدات.

ئەمە یەکەم جاربوو مەفرەزەی پێشمەرگە لەدوای کارەساتی ساڵی١٩٧٥و هاتنەوەی ڕژێم بێنە ناو شارۆچکەی تەوێڵە، کەڕێکەوتی شەوی ١لەسەر٢ی/١٩٧٧/٥ بوو. مەفرەزەکە هەموو پێشمەرگەی ئازاو چاونەترس بوون، لەوانە: کاک ستار، سەرداری برای، عومەری قالە گوڵباخ، عەریف

مەحمود-خولەسەر چەور، فایق شەفیق و فازڵ شەفیق چەند کەسی دی کە من نەم ئەناسین. پێشتر ئەحمەد گریانەیی و مەفرەزەیەک هاتبوون بۆ تەوێڵە، بەڵام نەهاتبوونە ناو هەر لە دەرەوە بە ئاڕ بی جی دایان لە ڕەبیەی سەر پردو بازگەزگەکەی دەرەوەی شارۆچکەکە.

من لەخوێندنگاشدا کەوتبوومە بەرچاوی بەعسییەکان و چەند جار بانگیان کردبووم، یەکەم جار لەپۆلی دووەمی ناوەندیدا بوو کاتێک ڕۆژێک لەدەرسدا بووین خزمەتگوزارەکە مام فەرەج محەمەد هات بۆ پۆلەکەمان و بەمامۆستاکەی ووت بەڕێوەبەر داوای خوێندکار محەمەد سەعید دەکات. مامۆستا مۆڵەتی دام و چوومە خوارەوە، بینیم دوو ئەمن واتە ئەندامی ڕێکخراوی بەعس بەناوەکانی قاسم و محەمەد لای بەڕێوەبەر مامۆستا مەحمود عەبدولڕەحیم دانیشتوون. مامۆستا هەوڵیدا بزانێت منیان بۆچییە؟ ووتیان ئێستا دێتەوە ئەیبەین بۆ دائیرە، چووم لەگەڵیان بینیم قەیسەر حمەڕشید نجیبو پیاوێکی تری خەڵکی تەوێڵە بەناوی جەلال ئەحمەد وەهاب ئەشکەنجە ئەدەن، من ئەوانم بینی ترسام چونکە جەلال خوێن لەگوێچکەو لووتییەوە هاتبوو.

عەباس عەبدولڕەزاق مامۆستایەکی عەرەب و بەرپرسی دائیرەی ئەمن بوو، لێی پرسیم دوێنێ شەو لەکوێ بوویت؟ ووتم: لەماڵی عەلی حەمە موراد بووم. ئەو هاوپۆلم بوو. دواتر ووتی: کێی تر لەوێ بوو؟ ووتم: مستەفا ڕەشید و غەفار سەعید. پرسی باسی چیتان کرد؟ ووتم: باسی خوێندنگا و دەرس خوێندن. ئەو چووە دواوە و قاسم چەپۆکێکی پێدا کێشام، ئیتر هەندێک لێدان و هەڕەشە و گوڕەشەیان لێکردم و دوو کەسی خەڵکی تەوێڵە بەناوەکانی مەناف فەتحوڵا و کامیل کەریم لەوێ هاوکاریان بوون و وەک وەرگێڕ لەنێوان من و عەباسدا قسەیان ئەکرد، کامیل شتێکی بەعەباس ووت و منی لەژێر دەستیان دەرهێنا و ناردمیانەوە بۆ خوێندنگا، بەڵام نەمزانی ئەو قسەیەی منی پێ ڕزگارکرا چی بوو؟

# لە قوتابخانەوە بۆ شەڕی پارتیزانی

مەفرەزە سەرەتاییەکانی ی.ن.ک لەزۆربەی ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا لەحاڵەتی خۆدەرخستن و ڕاگەیاندندا بوون. ڕژێم زۆربەتوندی هێرشی ئەکردە سەریان و لەهەر جێگەیەک سوسەی بکردایە، کە پێشمەرگەی تێدایە یان پێشتر پێشمەرگەی لێ بینراوە، لەئاسمان و زەمینەوە هێرشی دەکردە سەرئەو ناوچەیە. لەو ڕۆژگارە خەڵک دووجۆر بۆچوونیان هەبوو بۆچوونی یەکەم: شۆڕشی ئەیلول بەو فراوانییەوە بەو هەموو هێز و چەک و ناوچە رزگارکراوانەوە کۆتایی هات، تازە بەچی و چۆن لەسفری سفرەوە دەست پێ دەکرێتەوە، ئەم بۆچوونەش زۆرتر نیشانەی بێ بڕوایی و بێورەیی بوو. بۆچونی دووەم: لەسەر ئەوە چەقی بەستبوو، کە کورد کۆتایی نایەت و شۆڕش بەردەوام دەبێت بەبیرو ئایدیای تازەوە و بەپشت بەستن بەخەڵکانی شۆڕشگێڕ، دوژمن خەیاڵی خاوە بتوانێت شۆڕشی گەلەکەمان چۆڕبڕ بکات.

لەم سەرو بەندەدا چەند کەرتێک لەسنوری هەورامان- هەڵەبجە- شارەزوور پێک هێنرابوون، مەفرەزەکان دابەش کرابوون، سنوری هەڵەبجە و هەورامان کەرتێک بوو کە حامدی حاجی خالید فەرماندەی بوو، شێخ عەلی ڕابەرسیاسی و مامۆستا تایەر عوسمان و عەلی شاماریشیان لەگەڵ بوو. سێ مەفرەزەکەش، کە سەر بەم کەرتە بوون بریتی بوون لە مەفرەزەی هەورامان، کە شەهید ئەحمەد گریانەیی فەرماندەی بوو، مەفرەزەی باڵامبۆ، کە شەهید فەرەج تریفەیی فەرماندەی بوو. مەفرەزەی شنرۆێ، کە شەهید غەفوور دەرەشیشی فەرماندەی بوو. هەڤاڵ تایەر عوسمان (مامۆستا سەرکەوت) وەک ڕێکخەرو شەهید دکتۆر ڕەزاش وەک پزیشک لەگەڵیان بوون، جگە لەبەرپرسەکان پێشمەرگەکانیش بریتی بوون لە شەهید حسەین مەجید مەلاحامید، بەکر مام ئەولقادر، محەمەد ئەبوبەکر-حەمە هاواری، هادی حەمەیوسف -مام هادی، وشیار ئەحمەد مولوود -مام هەڵمەت، سدیق تۆفیق گریانەیی، فەتاح جەعفەر ئێناخی، شەهید عەلی خرە ئێناخی، حەبیب دەوانی، ئیبراهیم شەمێرانی، ئەنوەر نوری قەساب، قادر سووری شەمێرانی، وەهاب

مۆردینی، شەهید فەرەج دەرەشیشی، مەلا سۆران کوڕی مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعزیز، ئازاد چاوڕەش، ڕێبوار مینە قارەمان، مستەفای مینە قارەمان، قادر مەلا ئەحمەد، شەوکەتی ئایشێ، فاروق کوێرەکی، حەمیدی حەمەی کاکە ئەولا- ناسراو بە شاسوار [1].

ئێمەش من و حەمە کەرەم عەبدوللا و حیکمەت حاجی حەمە صالح بووین بەبەشێک لەپێشمەرگەکانی ئەو ڕۆژە. بەندە لە پۆلی سێیەمی ناوەندی و پاییزی ساڵی ١٩٧٧ بوو، پاش نیوەڕۆی ڕۆژێک لەسەر داوای شەهید ئەحمەد گریانەیی چووم بۆ ئاوایی پاڵانیاو سەردانم کردن، شوێنی دیتنمان ماڵی حەمە سەعیدی قالەی مەجنون بوو. پاڵانیا ئاواییەکی ئاودار و سەرسەوزی دەڤەری هەورامانە ئەو دەمە نزیکەی ٤٠ ماڵێک دەبوو، لەڕووی جوگرافییەوە ئەکەوێتە نێوان هاوار و تەوێڵە، لەبەری لای باشوورەوە ئەڕوانی بەسەر باخات و چەمێکی بەلرفەدا. دانیشتوانی ئەم ئاواییە بەهەردوو زاری سۆرانی و هەورامی ئەدوێن. لەسەروبەندی پێکرتنی شۆڕشدا بۆ ئێمە زۆر باش بوون و هاوکاری باشیان دەکردین، ئەوانەیان لەڕیزەکانی ڕێکخستندا کاریان دەکرد، من بۆ خۆم چەند کەسم دەناسین، کە ئێجگار چالاک بوون، ئەوانیش محەمەد فەتالی وحەمەتەقی کەریم بەگ و فەتاحی حەمەئەمین بەگ بوون، لەگەڵ ئەماندا خەڵکی دیکەشیان تێدا بوو، کە جێگەی متمانە بوون، وەکو کەریم بەگ ومەحمود بەگ، پێشتر مەحمود بەگی حەمە ئەمین بەگ و حەسەن بەگی کوڕی و بنەماڵەکەیان بەگشتی بەشداربووی شۆڕشی ئەیلول بوون، ئەمانیش لەگەڵ خەڵکی ئاواییدا هاوکار و دڵسۆزی کودایەتی و پێشمەرگە بوون.

هەر ئەو ڕۆژەی شەهید ئەحمەد گریانەیم دیت، داوایان کرد لەبەر ئەوە مەترسیم لەسەرە بگیرێم و ئەوانیش پێویستیان بەکەسێکی شارەزا هەیە

---

[1]- شاسوار خەڵکی باخەنارەی بناری بەمۆ بوو، وەک پێشمەرگەیەکی ڕۆشنبیرو ڕاستەقینەی ئەم کوردستانە، خاوەن داستان و بەسەرهاتێکە، کە پڕیەتی لە گیانفیدایی و قارەمانیەتی، دڵسۆزی، چیرۆکەکەی خەمهێنەرو دڵ ئازاردەرە. شاسوار یەکێک بوو لەوانە، پێشمەرگەیەکی خوێندەوار و ڕووناکبیرو بە ئەدەب و لەسەرەخۆ بوو، لێرەدا جێگەی باس کردنی خەباتەکەی و پاک و بێگەردییەکەی، چیرۆک و بەسەرهاتە تاڵ و دڵ خەمبار کەرەکانی ئەو نییە. ئەوە بەجێ دەهێڵم بۆ هاوڕێکانی.

لەناوچەکەدا باشتر وایە ببمە پێشمەرگە، ووتم ئەی مەکتەبەکەم گریانەیی ووتی: شۆڕش ئێستا تۆی پێویستە، کەمێک قەلەق بوم بەلام ئامادەیی خۆم دەربڕی، پێم ووتن کەسیتر وەرئەگرن؟ وتیان ئەگەرجێگەی بڕواو دڵنیاییبن بەڵێ، ووتم دەی دەبێت بگەڕێمەوە، چونکە دوو کەسیتر هەن تا قسەیان لەگەڵدا بکەم و لەگەڵ خۆم بیانهێنمە دەرەوە، ئەوانیش ڕازی بوون و ووتیان سبەینێ لە ئاوایی هاوار چاوەڕێتان دەبین. هەر ئەوشەوە گەڕامەوە، پێشتریش کاک ستاری سەعید خەلەف پێی ووتبووم ئەگەر خوێندکار نەبویتایە بهاتیتایە دەرەوە باش بوو، منیش پێم ووتبوو با مەکتەبەکەم تەواو بکەم.

هەر ئەو شەوە لای کاک ئەحمەد گەڕامەوە قسەم لەگەڵ هەردوو کەسەکەدا کرد، یەکێکیان حیکمەت حەمە سالح بوو، کە بەمۆڵەت لە سەربازی هاتبوویەوە، ئەوی دیکەشیان حەمەکەرەم عەبدوڵلا بوو، ئەوانیش ئامادەیی خۆیان نیشاندا، دەمەو بەیانی زوو لە تەوێڵەوە بەڕێکەوتین، ڕێگەمان بڕی تاگەیشتینە هاوار، بۆخۆم هێندە پەلەم بوو لەوەی کە زووتر بگەمە مەنزڵ و ناوبنرێم پێشمەرگە. کەوی دڵم لەقەفەزی سینەمدا باڵە تەپێی پێ کەوتبوو، ڕێگاکە وەک ئەوەی شەڕ لەگەڵ بازی ڕۆحمدا بکات خۆی لێ درێژ دەکردمەوە، هەر درێژ و درێژتر دەبوویەوەو کۆتاییی نەدەهات...ئەی خودا خۆ من چەند جاری تر ئەم ڕێگایەم پێواوە، ئەی ئێستا بۆ واخۆی لێگۆڕیووم؟ لەگەڵ هەنگاوە بەپەلەکانمدا هەناسەکانیشم بەلەز بەدوای یەکدا دەهاتن، کەچی هەر نەدەگەشتمە سەوزەلانی کەعبەی مراز، سەنگەری شەرەف کوردایەتی ئاخری هەرگەیشتین، پێشمەرگەکان لەوێبوون لە هاوار مابوونەوە، ئێمە چووینە ماڵی مستەفای سەید موراد هاواری و ئەحمەد گریانەیی هات بۆلامان، باسی ئەوەی بۆ کردین دایک و باوکی ئەوانەی ئەبنە پێشمەرگە دەبرێن بۆخوارووی عێراق، بۆیە بەناوی ئەوەی کە گیراون بەبەرچاوی خەڵکەوە دەتانبەین لەگەڵ خۆمان، با دەنگوباس ب لاوەبێتەوە کە گیراون، ئەم پلانەش سوودێکی ئەوتۆی نەبوو، دوای دوو ڕۆژ ئاشکرا بوو کە بووینەتە پێشمەرگە.

بەڵێ پێشمەرگە هاتن و ئێمەیان بەناوی گرتنەوە لەماڵەکە بردە دەرەوە بەرەو هاوارە کۆن بردینیان، تەنیا شێخ عەلی وکاک ئەحمەدو پێشمەرگەیەکی

تر لەگەڵمانن هێزەکەیان لە پێشەوە ڕۆیشت بەرەو ئاوایی هاوارە کۆن. هاوار شارەدێ بوو نزیکەی ١٦٠٠ماڵێکی لەخۆگرتبوو، ئەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری هەڵەبجە بەدووری ١٦ کیلۆمەتر، ئەم شارە دێیە دەکەوێتە نێوان چیا بەرزەکانی رووتاوا و دۆڵە هەنجیر لای ڕۆژهەڵاتەوە خۆرەتاوە سەختەش لای باکور و لەرووی خۆرئاواشی چیای شنروێ و هاوارەکۆنیش دەکەوێتە باشوری.

ئەم ئاواییە کاکەیین و لەسەر ڕێوڕەچەی یارسانن. لەسەردەمی تازە دەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێدا هاوکار و پشتیوانی بێ وێنەی ی.ن.ک و پێشمەرگەکانی بوون، چەندین کەسی دیار و ڕۆشنبیر و سەربەرێکخستنی ئەو سەردەمەیان هەبوو، ئەوانەی ئەوکات من ئەمناسین، سەیوان عەلی رەزا، سیروان عەلی رەزا، سەیفەدینی ئەلی کەرەم، کە دواتر بوو بەپێشمەرگە و شەهید بوو، پێشمەرگە و کادیرێکی سیاسی بەتوانا بوو.

ئێمە کە لە هاوار دەرچووین بۆ هاوارە کۆن، بەرلەوەی بگەینە ئاوایی هاوارەکۆن، شێخ عەلی و ئەحمەد گریانەیی کۆبونەوەیەکیان کرد بەدوو کەسی، دوای کۆبوونەوەکە منیان بانگ کرد شێخ عەلی هەندێک قسەی بۆ کردم ئەبینم هەوڵ ئەدات من پەشیمان ببمەوەو بگەڕێمەوە، ڕازی نەبووم[1]، ئینجا کۆبونەوەیان پێکردین، ناوی نهێنیان بۆ دانایین، من بەناوی ئاسۆ، حەمەکەرەم ئاراس، حیکمەت ئاکۆ. کەچووینە ناوئاوایی خەڵکەکە هاتن بەپیرمانەوە، چەند کەس بەمنیان ووت ئەرێ تۆ کوڕەکەی خاڵۆ حەمە سەعید نیت؟ ووتم نەخێر لەو کاتەدا حەمەی خاڵۆ لفتە لەسەر بانێکەوە، ووتی ئەوە حەمەیە کوڕەکەی حەمەسەعید، عەدنان بڕۆ بیهێنە با بێت بۆ ماڵی خۆمان، عەدنان هاتوو من چووم لەگەڵیا، کوڕی خاڵۆ حەمەی لفتەیە، ئیتر من ئاشکرا بووم و پێشمەرگەکانی تریش زانیان ناوی ڕاستەقینەی من حەمەی حەمەسەعیدە[2]، نیوەڕۆش لەهاوار دەرچووین زۆرکەس هاتن بۆ لای شێخ

---

[1] دوای ماوەیەک زانیم کاک شێخ عەلی بەکاک ئەحمەدی وتووە حەمە منداڵەو بۆ ناو پێشمەرگە ناشێ کاک ئەحمەدیش پێی وتووە کوڕێکی وریایەو خۆشم داوام کردووە بۆشارەزای مەفرەزەکەمان بێتە دەرەوە

[2] – لە تەوێڵە کەسێکی تر کە خزمی خۆمانە، هەر بەناوی حەمەی حەمەسەعید هەیە خوشکی ئەو ئامۆژنی منە، بەڵام زۆرتر بەناوی حەمەی پورە هەمینە ناسراوە، ئەم کاکە

عەلی وکاک ئەحمەد و داوایان دەکرد بەرمان بدەن و دەیانگووت ئێمە دەبینە کەفیلیان، بەتایبەت لەبەرمن بوو کەدەیانناسیم، وایان ئەزانی هەر بە ڕاستی گیراوین. پێشمەرگەکان لە هاوارە کۆن ئەوشەوە مانەوە، ئێمە هەرسێکمان لەگەڵ شێخ عەلی و شەهید فەرەج دەرەشیشی شەوچووینە ئاوایی گریانە و لە هاوارە کۆن نەماینەوە.

هاوارە کۆن دێیەکی سروشت جوانی دە ماڵە بوو، ماڵەکانیان لەسێ شوێنی جیاجیادا بوون خاڵۆ مەحو لەگەڵ قادر و جەمالی کوڕیدا لەشوێنێکدا بوون دەکەوتنە سەر چەمی گەورە. خانوەکانیان کۆن و گەورە و دوونهۆم

---

حەمە لەشۆڕشی ئەیلولدا پێشمەرگە بووە، ئەوکات بەرپرسی هەندەسە بوو. لە تەوێڵە نیشتەجێ بوو، حکومەت و دەزگا ئەمنیەکان کەوتنە چاودێریکردنی، بڕیار بوو بچێتە دەرەوە، کێشەیەکی هەبوو هی قەرز و کەسابەت، بۆیە لە چوونە دەرەوە دواکەوت. لەوکاتەدا کاک جەمالی ئەلی محەمەد و کاک جەعفەری حاجی ئەولە گیرابوون و لەزینداندا بوون. کاکە حەمە پێشمەرگەیەکی ئازاو ناسراوە، لەدوای هەرەس دوورخرایەوە بۆ ناوەڕاستی عێراق و لەشاری ڕومادی گیرسایەوە. ساڵی ١٩٧٧ لە ڕێگەی هادی حەمەیوسف ناسراو بە مام هادی پەیوەندی پێوە کراو گەڕایەوە بۆ کوردستان و کاکە حەمەش گیراو منیش چوومە دەرەوە. پاش چەند مانگێک کاکە حەمە ئازاد کراو جەمال و جەعفەریش بەلێبوردن ئازاد کران، هۆکاری ئازادکردنی کاکە حەمەش ئەوەبوو، کە لەکاتی لێکۆڵینەوەدا وتبووی: من کەس بەناوی حەمەی حەمەسەعیدەوە نامناسێ، من لەناوخەڵکدا بەناوی حەمەی هەمینە ناسراوم، ئەو حەمەی حەمە سەعیدە ئەوەیە چۆتە دەرەوە ئێستا لە شاخە، جەمالی ئەلی محەمەدیش شایەتی بۆدابوو وەتبوی: بەڵێ ئەو حەمە لەگەڵ ئێمەدا بووە کە ئێستا لەدەرەوەیە ئێمە گیراوین ئەو ڕایکردوە. دوای ئازادکردنی کاکە حەمە هەر لەتەوێڵەدا مایەوە تا ساڵی ١٩٧٩، لە هاوینی هەمان ساڵدا کاک مەلا بەختیار هاتە هەورامان، داوای کرد بنێرین بەدوای کاکە حەمەدا با بێت ببینیم. شەوێک هاتە ئاوایی شۆشمێ سەروو بەنهێنی کاک بەختیار بینی و داوای لێکرد بێتە دەرەوە، ئەویش ئامادەی خۆی نیشاندا، بەڵام هەندێک داواکاری هەبوو، کە ئەو کات لەبەرنامەو ڕێبازی یەکێتیدا ئەوجۆرە داواکاریانە شتێکی نەگونجاو قبوڵ نەکراو بوون. داواکەش ئەوە بوو ئەیوت: ئەبێ بکرێم بە مەفرەزەی سەبەخۆ و پێنج کلاشینکۆف و ئار بی جییەکم بدەنێ، کاک مەلا بەختیاریش پێی ووت: ئێستا ئەوەمان بۆ جێبەجێ ناکرێ بڕۆرەوە تاهەرکات چەکمان هەبێ، کە گەڕایەوە تاساڵی ١٩٨١ کاکە حەمە هاتووچۆو پەیوەندی هەر هەبوو، بەڵام لەدوای ئەم بەروارەوە لەلایەن قیادەی موەقەتەوە پەیوەندی پێوەکراو ساڵی ١٩٨٢ چووە دەرەوە بۆلای ئەوان.

لەژێرەوە گەلەخان و نهۆمی دووەمیش شووێنی ژیانی خۆیان بوو. لەسەر زەوییەکی داکەوتە بنیات نرابوون، لەسەرووی ئەمانەوە بەنزیکەی ٥٠٠مەتر خانووەکانی خالۆ عەبدولکەریم و غەفووری برای بوون، لەو لاترەوە کە قەلای هاوارە کۆنی پێ دەووترێت ماڵەکان لەسەر گردێک دروست کرابوون، کەلایەکی دەڕوانی بەسەر چۆمی هاواردا و لاکەی تری ڕووە و گریانە و دارستانەکانی دیوی ئێرانیشی لێوە دیارە، بەڕووکاری هاواردا بەدووری ٢٠٠ مەتر کانی هاوارە کۆن هەیە کەسەرچاوەیەکی سازگارە، هەم ئاواییەکە ئاوی لێ دەخۆنەوە و هەم باخەکانشیان دێراو دەکات.

لەسەر قەلا ماڵەکانی خالۆلفتە، کوڕەکانی فەتاح و حەمە، خالۆ باسام کوڕەکانی حەمەڕەحیم وعەلیە شەلی لێ بوون. دانیشتوانی ئەم ئاواییەش کاکەیی بوون و خەڵکێکی دڵسۆز و نیشتمان پەروەرو خزمەت گوزار بوون، ئەمانە هەر بەدڵسۆزی مانەوە لەهیچ کاتێکدا پشتیان نەکردە ی.ن.ک و شۆڕش. شێخ عەلی شەو لە گریانە هەندێ قسەی لەبارەی ئاشبەتاڵ و دروست بوونەوەی شۆڕشەوە بۆ کردین، شەو لەماڵێکی ئاوایی گریانەدا خەوتین، بەیانییەکەی شێخ عەلی ئێمەی بردەخوار ئاوایی، لەوێ مەشقی ئەوەی پێکردین کەچۆن تفەنگ بەکاربێنین و نیشانەبپێکین، سەرەتا، بەردێکی گەورەی دیاری کرد، لەمبەر بۆ ئەوبەری چەم لەجێگەیەک بەناوی‌کانی کوێخا عەلی، یەکەم جار ئاکۆ، دواتر حەمەکەرەم هەر یەکەو چەند فیشەکێکیان تەقاند و نەیگرت، کە هاتە سەرەی من ووتم: کاک شێخ عەلی ئەوبەردە گەورەیە، من ئەیگرمە ئەو بەردە بچووکە، کاتێک نیشانەکەم شکاند، کاک شێخ عەلی هەستی ئەکرد تفەنگەکەی قووتیلە، تفەنگی قووتیل لای ئێمەی خەڵکی هەورامان چیرۆکی تایبەتی هەبوو. بۆ دووەم دیسان نیشانەکەم شکاند، ئیتر دڵنیابوو تفەنگەکەی قووتیل نییە. لێی پرسیم دیارە لەتفەنگ ئەزانی؟ ووتم بەڵێ باوکم ڕاوچییە لە تاپر و ساچمەزەن و وەرەندڵ و کلاشینکۆف و برنەودا شارەزام شێخ عەلی زۆر پێی خۆش بوو، زوو زوو بەجەماعەتی ئەووت سەیری حەمە مەکەن منداڵە تفەنگچییەکی زۆر باشە.

گریانە دوورترین ئاوایی ئەو سەر چۆمەیە لەو سەرسنوور، ئەو دەمە نزیکەی ٤٠ ماڵێک دەبوو لەسەر چۆمی تەوێڵە، هاوار، هاوارە کۆن لەنزیک ئەو شوێنەدا هەڵکەوتووە کەچۆمەکە دەڕژێتە ناو ڕووباری سیروانەوەو پێی

دەگووترێت دەراوی گریانە، سیروان لە دەوروبەری شاری سنە و ناوچەی کەلاتەرزان و لای مەریوانەوە سەرچاوە ئەگرێت، درێژ دەبێتەوە بۆلای ئاوایی لاوران و ئاوایی کەوتەی ناوچەی نەوڕۆلی لەوێ دەڕژێتە بەنداوی دەربەندیخانەوە، ئەم شوێنە دەبێتە سنوور و کەوشەنی ئێران –عێراق. ئاوایی گریانە هەرلەسەرەتای شۆڕشەوە تا ساڵی۱۹۷۹ کە ڕاگوازران یەکێک بوو لەوئاواییانەی بەردەوام جێگەی حەوانەوەی پێشمەرگەبوو دانیشتوانەکەی زەحمەتکێشترین خەڵک بوون، کەژیانیان لەسەر ئاژەڵداری، باخداری، قەزوان، بنێشت و دارفرۆشی بووە.

ئەو پێشمەرگانەی کە لە هاوارە کۆن لێیان جیابووینەوە ئەوانیش ئێوارەی ڕۆژی دوایی گەیشتنەوە گریانە، لەناکاو حەمە کەرەم ووتی: ها ئەوە باوکتە لەگەڵ پێشمەرگەکاندا، من ترسام چونکە پرسم پێ نەکردبوو کە دەچمە دەرەوە، لەوێ دوای بەخێرهاتن و یەکتر بینین، ئێمە لەگەڵ باوکم چووینە ماڵی تۆفیق شاکەرەم باوکی سدیق گریانەیی.

باوکم پێی ووتین: ئێوە ناتوانن پێشمەرگایەتی بکەن، تاکەس نەیزانیوە هاتونەتە دەرەوە هەڵسن بابڕۆینەوە. ئێمەش بێدەنگ بووین تادوای نان خواردن، باوکم کە دڵنیابوو لەوەی ناچینەوە، بە شێخ عەلی ووت: دوایی من بەرپرس نیم لەوەی ئەمانە هەرچییەکیان لەدەست قەوما، پرسی شتی وەک چۆن؟ باوکم ووتی : وەک بردنی چەکو خۆبەدەستەوەدانەوە. ئەویش ووتی: کە کردومانن بە پێشمەرگە پرسمان بە کەس نەکردووە، هەرچییەکیش لەدەستیان وەشایەوە خۆمان لێی بەرپرسین. باوکم دواجار ووتی: دەیباشە حاجی حەمە سالح و عەبدەکە بانگ کراون بۆ سلێمانی واتە باوکی حیکمەت و حەمەکەرەم، من دەچمەوە دۆڵبیان و ناچمەوە تەوێڵە، تابزانم چارەنووسی ئەوان چی لێدێت. ئەگەر گیران منیش دێمەوە بۆ لاتان خۆشم ئەبمە پێشمەرگە، هەر بەو شەوە گەڕایەوە دۆڵبیان. عەلی شامار یەکێک بوو لەوانەی وردە وردە ئێمە و ئەوکەسانەی کە ئەهاتن بۆ پێشمەرگایەتی لەڕووی فیکرییەوە پەروەردەی ئەکردین، کاک ئەحمەد گریانەیش لەڕووی پێشمەرگایەتی و پارتیزانییەوە قسەو باسی بۆ دەکردین. شێخ عەلی کەشکۆل لەکتێبەکەی خۆیدا بەناوی کەشکۆلی کۆلم، سەبارەت بە من و بوونم بەپێشمەرگە، لە لاپەڕە١٣٤دا ئاوای نوسیوە ((لەو برادەرانەی کە لە ناوچەی

هەورامان لە سەرەتاوە هاتنە ڕیزی شۆڕش و هێزی پێشمەرگەی کوردستان، ئەحمەد گریانەیی، فەرەج تریفەیی، حسێنی مەجیدی مەلا حامد، حەمە هاواری، شێرکۆ حسێن ڕەسوڵ، فاتیح سازانی، مستەفا کۆکۆی....تاد زۆر کەسی تر ئەهاتن، بە تایبەت لاوی پێگەیشت و نەوجەوان، دڵم نەئەهات بیان کەین بە پێشمەرگە، لەبەر ئەوەی زۆر منداڵ بوون، نەوەک توشی کێشە و گیروگرفتی کۆمەڵایەتی ببن، بۆ نمونە لەوانە حەمەی حەمە سەعید، کە ئێستا لێپرسراوی مەڵبەندی شارەزوورە، لەساڵی ١٩٧٧ هات بوو بە پێشمەرگە، ناو براو لاوێکی تازە پێگەیشتووی جوان و پاک و تەمیز بوو، حەزمان نەئەکرد بەو منداڵییە بکەوێتە دنیایێکی جەنجاڵەوە، نەوەک تووشی خراپە و شتی تر ببێت!!! چونکە زۆربەی پێشمەرگەکان خەڵکی شار بوون! من نەمئەزانی، ئەم پیاوە لێزانە وەک گەلی فارس ئەڵێت: مەردێکی تەواو عەیاری ناو مەیدانەکەی لێ دەر ئەچێت.))

بەڵێ دوای ئەوە کەوتینە گەڕان و جەولەکردن بەناو دێهاتەکانی سنوورەکەدا، ئێمە هەرسێکمان من، حەمەکەرەم، حیکمەت لە مەفرەزەکەی ئەحمەد گریانەیی دانراین، لەهەر دێێکدا خەڵکەکەیان کۆدەکردەوە لەمزگەوت و یەکێک لەبەرپرسەکان قسەی بۆ دەکردن، ئەوکات زۆرتر قسە لەسەر درندەیی و نیەتی گ لاوەی ڕژێمی بەعس و شکستی شۆڕشی ئەیلول و دروست بوونەوەی شۆڕشی نوێ دەکرا. هەروەها داوای هاوکاری و پشتگیریی شۆڕشیان لێدەکرا. هەڕەشەش دەکرا لەوانەی کەهاوکاری ڕژێم دەکەن، بەوجۆرە بەردەوام بووین تا جیاکردنەوەی ئەو پێشمەرگانەی دەچن بۆ بەشداریکردن لەو کاروانانەی دەچن بۆ هێنانی چەک لەناوچەی هەکاری. هەر لەم سەروبەندەشدا چەندین چالاکی کرا وەک تەمبێ کردنی جاسوس و پیاو خراپان، یان بە سزای گەل و شۆڕش گەیاندنیان، یان تەقە کردن و لێدانی سەرباز و جاشان لە ناو شار و لە ناو ڕێگە و بانەکاندا بە شێوەی کەمین دانان و شەڕی پارتیزانی.

# مەفرەزەکانی سەرەتا و هاوکاریی خەڵکی

لەدوای شکستی شۆڕشی ئەیلول ساڵی ١٩٧٥ لە کوردستانی باشوور، ڕژێمی عێراق بەڕابەرایەتی حیزبی بەعس دەستی گرتەوە بەسەر ئەو شوێنانەدا کە لەژێر دەستی هێزی پێشمەرگەدا بوبوون. لەو بارودۆخ و هەلومەرجەدا کۆمەڵەی مارکسی لینینی وەک ڕێکخراوێکی سیاسی لەکوردستان وعێراقدا سازو ئامادە بوو. کۆمەڵە پێشتر، واتە لەپێش ساڵی ١٩٧٠ دا وەک چەند گروپێکی چەپ لەناو شۆڕش و بەتایبەت لەناو باڵی مەکتەبی سیاسیدا هەبوون، ڕیشەی یان سەرچاوەی بیری چەپی ئەم گروپانەش ئەو کەسانە بوون کەسەر بەڕێکخراوی (سازمان انقلابی در کشور) بوون کە لەسەردەمی شادا ئێرانیان جێهشتبوو چووبونە ئەوروپاو، دواتر هاتبوونە کوردستانی باشوور و لای جەنابی تاڵەبانی ومەکتەبی سیاسی مابوونەوە، بەرپرسی ئەم ڕێکخراوە بەناوی کورشی لاشایی[1] کاریگەری زۆری هەبوە لەسەر کادرو بەرپرسانی حیزب لە وەرگرتنی بیرو ئەندێشەی ماوتستۆنگ لەوانە مام جەلال، نەوشیروان مستەفا، شیهابی شێخ نووری...تاد.

---

[1] - کورشی لاشایی پیاوێکی ئازاو هەڵسوڕاو بەجەرگ بووە مەیلی ماویی هەبووە لەگەڵ هەڤاڵەکانی لە ئێرانەوە چووەتە ئەوروپا بۆ خوێندن و لەوێ ڕێکخراوێکی دروستکرد و بەناوی خوێندکارانی شۆڕشگێڕ خەباتیان لە دژی ڕژێمی شای ئێران درێژە پێداوە، مام جەلال لەوێوە لەگەڵیان ئاشنا بووە. دواتر هاتونەتە عێراق و بە هاوکاری دەوڵەتی عێراق بارەگایان لە سلێمانی کردەوەو حەزیان کردوە شۆڕشگێڕانی کوردستانی خۆرهەڵات بناسن و پەیوەندیان لەگەڵ بگرن، مام جەلال لەگەڵ سولەیمانی موعینی و سمایلی شەریفزادە ئاشنای کردن. ئەسەدوڵا عەلەم وەزیری دەرباری شای ئێران، لەکتێبی(یاداشتهای علم)دا بەرگی شەشم لەلاپەڕە ٢٤٩ ساڵی١٣٥٥-١٣٥٦ لەسەر کورشی لاشایی هەندێک زانیاری نوسیووە، چوونکە فریشتەی لاشاهی خوشکی کورش مەنشی عەلەم بووە.

خاڵە شیهاب و گروپەکەی بڕیاری دروست کردنی ڕێکخراوێک سیاسی ئەدەن، لە ١٩٧٠/٦/١٠ دا کۆمەڵە دروست ئەکەن و پاش ماوەیەکی کەم لەگەڵ مام جەلال گفتوگۆ ئەکەن، ئەویش ڕازی ئەبێت و لەگەڵ چەند تێکۆشەرێک ئەچنە ناو کۆمەڵە، دواتر لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا قسە ئەکەن ئەوڕازی نابێت بچێتە ناو کۆمەڵە تاساڵی ١٩٧٢ خۆی و گروپەکەی بە جیا ئەمێننەوە، لەهەمان ساڵدا خۆی ئەچێتە دەرەوەی وولات بۆ خوێندن و گروپەکەی ئەنێرێتە ناو کۆمەڵە، بەم جۆرە کۆمەڵە ڕۆژ بە ڕۆژ تێکۆشەرانی کوردستان پەروەردە ئەکەن بەبیری چەپ و ڕێکیان ئەخەن و زیاترو زیاتر گەشە ئەکەن تا ئەوکاتەی یەکێتیی نیشتمانی دروست ئەبێت، کۆمەڵە بوە باڵێکی سەرەکی یەکێتیی لەگەڵ ڕێکخراوێکی تری سیاسی بەناوی بزووتنەوەی سۆشیالیست.

بزووتنەوەش سەرەتای بیری دامەزراندنی لەوکاتەوە سەرچاوەی گرت کە شۆڕشی کوردستان بە ڕابەرایەتی خوا لێخۆش بوو مەلامستەفای بارزانی بەپیلانی شوومی جەزایری لە٢٦/٣/ ١٩٧٥ کۆتایی هات، لەدوای یەک مانگ کۆمەڵێک فەرماندەو کادری لێهاتووی شۆڕشەکە لەمانگی ١٩٧٥/٥ لەوانەی چووبونە وولاتی ئێران لەشاری ورمێ لەماڵی شەمزینی کۆدەبنەوەو دوای ڕاوێژو و گفتوگۆ کەچی بکەن چی نەکەن ناگەنە ئەنجام، دواتر بەشێک لەبەشداربوانی ئەم کۆبونەوەو چەندین کەسیتر لەشاری نەغەدە کۆئەبنەوەو بڕیار ئەدەن بگەڕێنەوە بۆ عێراق و لەناوخۆی وڵاتدا حیزبێکی نوێ بەنهێنی دروست بکەن. بەڵام دوای گەڕانەوەیان ڕژێم دوریان ئەخاتەوە بۆ ناوەڕاست و باشووری عێراق، لەو بارودۆخە نالەبارو ناهەموارەدا لە دوای چەندین کۆبونەوەو یەکتر بینین لە ١٩٧٦/٨/٨ کۆمەڵێک لەو کۆڵنەدەرە کورد پەروەرانە لەشاری بەغدا زۆر بەنهێنی کۆدەبنەوەو بزووتنەوە دروست ئەکەن، ئەوانەش ئەم تێکۆشەرانە بوون عەلی عەسکەری، ڕەسوڵ مەمەند، ساڵح یوسفی، عەلی هەژار، کاردۆ گەلالی، عومەر مستەفا، خالید سەعیدو سەعدی عەزیز لەدروست کردنەوەی شۆڕشی نوێ و مەفرەزە سەرەتاکاندا بزووتنەوە و فەرماندەکانیان دەوری بەرچاو کاریگەریان بینی.

هەر لەدوای شکست لەدەرەوەی وڵات، مام جەلال تاڵەبانی وکۆمەڵێک کادری سیاسی لەوانە نەوشیروان مستەفا، د.کەمال فوئاد، د.فوئاد مەعسوم،

عومەر شێخ موس، عادل موراد، عەبدولڕەزاق فەیلی، لەدوای چەند دانیشتن و کۆبونەوە لەڕۆژی ١٩٧٥/٥/٢٢[1] لە شام بڕیاری دروست کردنی یەکێتیی ئەدەن و کلێشەی بەیانی ڕاگەیێندراوەکەش ئەنووسنەوە، دواتر د.کەمال فوئاد هەڵەبڕی و پاکنووسی ئەکات و لە ڕۆژی ١٩٧٥/٦/١ دا ب لاوە ئەکرێتەوە. یەکێتیی پێک هات لە هەردوو ڕێکخراوی کۆمەڵەو بزووتنەوەو لە خەڵکی تری کورد پەروەری بێلایەن و جیا لەو دوو ڕێکخراوە، بۆ کۆکردنەوەی ئەوانیش ریخراویک ناو نرا خەتی پان یان گشتی ئەمەیان مام جەلال خۆی جگە لەوە ئەمینداری گشتی یەکێتیی بوو سەرپەرشتی ئەم خەتەشی ئەکرد، وەک تاکتیک خۆی بەئەندامی ئەم خەتە ئەناساند، لەڕۆژی١٩٧٦/٦/١ دا بڕیاری هەڵگیرسانەوەی شۆڕشیش درا.

یەکەم مەفرەزەی چەکداری ئەم شۆڕشە لەنێوان مەفرەزەکەی شارەزوورو باڵەکابەتیدا قسەوباسی جیاواز هەیە، کامیان یەکەم مەفرەزەیە؟ بۆ من واساخ بوەوە کەلە باڵەک قادر خەبات و مەحمود سەیدە یەکەم مەفرەزەن، بەو دەلیلەی خەبات لە شکستەکەی ١٩٧٥ دا نە چۆتە ئێران و نەتەسلیم بە عێراق بۆتەوە. ئەوەش هەیە لەهەوراماندا ئەحمەد گریانەی نەچووە ئێران و تەسلیمش بەڕژێم نەبوەوە، مەفرەزەکەی شارەزوور هاتنە ناوچەکە پەیوەندی پێوە کردن، مەفرەزەکانی سەرەتا لەبارودۆخێکی سەخت و دژواردا دەرچوونە دەرەوەو چوونە چیاو گوندەکانی کوردستان، بەچەکی کلاشینکۆف و برنەوی ژەنگاوی و فیشەکی ژێر گڵو پووچەوە، ڕووبەڕووی حیزبی بەعس وڕژێم و سوپا زلو زەبەلاح وسەرکووت کەرەکەی بوونەوە، مەفرەزەکەیی شارەزوورو هەڵەبجەو هەورامان بونە پێشڕەو سەرمەشق، سەرەتاو یەکەم جار حەوت کەس بوون ئەونیش شێخ عەلی کەشکۆڵ، عەلی

---

[1] - ئەگەر کۆڕو کۆبونەوەکان و بڕیارەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول دوای ڕێکەوتننامەی جەزائیر لە ١٩٧٥/٣/٦دا تا ١٩٧٥/٣/٢٦و لە ماوەی ٢٠ڕۆژدا بڕیاري کۆتایی هاتنی شۆڕشیان دابێت، ئەوا دەستەی دامەزرێنەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە سەرۆکایەتی مام جەلال یەکەم کۆبوونەوەی لەڕۆژی ١٩٧٥/٥/٢٢ بۆ دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ئەنجامدا. ئەوەش دوای ٥٧ ڕۆژ لەچۆلکردن و بەجێهێشتنی مەیدانەکە لەلایەن سەرکردایەتی شۆڕشەکەوە لەسنووری باکوری کوردستانی باشوورەوە بەرەو ئێران، لەلایەکی ترەوە بڕیاری هاتنەوەی ناو مەیدانەکە درا.

شیعە، شەوکەتی حاجی موشیر، حامدی حاجی خالید، حەمەی حاجی مەحمود، حەمەسەعیدە سوورد. ڕەزا و تەوفیق ڕەحیم بوون، یەکەم چالاکی و تەقە ئەم مەفرەزە کردی و دوای ئەم حەوت پێشمەرگە هەشتەم کەس فاتیحی شێخ حەیدەر پەیوەندی پێوە کردن، ئەویش بووە یەکەم شەهیدی شۆڕشی نوێ.

لەگەڵ دروست بوون و دامەزراندنی یەکێتیی و هەڵگیرسانەوەی شۆڕش و هاتنە دەرەوەی مەفرەزە سەرەتاییەکاندا، زۆربەی خەڵکی کوردستان و بەتایبەت ئەو سەردەمە دێنشینەکان، بەشێوەیەکی دڵسۆزانە و نەترسانە بوونەیارمەتی دەرو هاوکاری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و هێزی پێشمەرگەی کوردستان. بەڕێگەی جۆراو جۆر و جیاواز جیاواز، بەشداری خەبات و تێکۆشانیان کرد. ئەمە بۆ ئێمە زۆر گرنگ بوو لەبارودۆخ و سەردەمێکی ئاوا نالەبار و ناهەمواردا، کەهەم هەرەس روویدا بوو شۆڕشی کوردستان کۆتایی پێهات بوو، هەم دوژمنان و ڕژێمی بەعس لەوپەڕی بەهێزیدابوون و جەژنی سەرکەوتنیان ئەگێڕا، وا زوو خۆمان بکەینە جێگەی متمانە. ئەوکەسانەی لەوسەردەمەدا ئەبوونە پێشمەرگە یان ئەوانەی ئەچوونە ناو ڕێکخستن، لەوخەڵکە دڵسۆزو ورەبەرزو بەجەرگانە بوون کە ئامادەبوون لەپێناوی کورد و بیرو باوەڕەکەیاندا خۆیان و ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانیان بکەنە قوربانی، وەزۆریشمان کردمان، هەرئەوکاتە لەبارەی هوشیاری و ئاگای سیاسیشەوە هەوڵمان ئەدا خۆمان پەروەردە بکەین، بەڵام سەرچاوەی دەوڵەمەنی خۆپەروەردە کردنمان نەبوو.

لەچەند ساڵێکی سەرەتای شۆڕشی نوێدا، سەرچاوەی خۆپەروەردە کردن و پرچەک کردنی پێشمەرگە بەچەکی بیروباوەڕ، تەنیا ئەو کادرو ڕابەر سیاسیانە بوون لەشارەکانەوە لەناو ڕێکخستنەکانەوە هاتبوون، سەرچاوەی زانیاری و خۆپەروەردە کردنی ئەوانیش خوێندنەوەی ئەدەبیاتی چەپ وچەپ گەرایی بوو بەکرچ و کاڵی هەندێکیش لەوکادرو ڕابەرسیاسیانەی بەشدار لەشۆڕشی ئەیلول بوون، ئەوانیش زۆرتر لەباری ناسیۆنالیستیەوە زانیاری کەموکورتیان هەبوو. بەگشتی لەو دەمەدا لەباری فیکری و زانیاری یان ڕۆشنبیریەوە لاواز بووین.

لەسەرەتاوە ئەوچەند ساڵە ئێمە دابڕاو بووین لەرێکخستنی شارەکان، لەسەرکردایەتی کۆمەڵەو یەکێتیی، لەهەڤاڵانی ترمان لەمەفرەزەو کەرت و هەرێمەکان. مەفرەزەکانی سەرەتا هەرکەس بۆخۆی لەناوچە جیا جیاکاندا سەربەخۆ کارمان ئەکرد، پەیوەندیمان بەیەکەوە نەبوو، هاتووچۆو یەکتر بینین زۆرکەم بوو، لەساڵی ١٩٧٦ تاسەرەتای ساڵی ١٩٧٩ دووجار لەناوچەی شارەزوور هەورامان و هەڵەبجەدا بەرپرس و ئەندامی سەرکردایەتی ڕێی کەوتوەتە لامان و کۆبوونەوەمان کردووە، یەکەم جار شەهید ئازاد هەورامی و دووەم جاریش هەڤاڵ مەلابەختیار. لەسەردان و بەسەرکردنەوە و کۆبوونەوەکانی ئەو دوو هەڤاڵەدا ئێمە زیاتر کەڵکمان وەرگرتوو چاوکوێمان کردەوە.

کادرو ڕابەر سیاسیەکانی ناوچەکەو خۆمان ئەو سەردەمە لەکۆبوونەوەکانی ناو خۆماندا دا بۆ پەروەردە کردنی پێشمەرگە یان بۆ پەروەردەکردنی ئەندامی ڕێکخستن لەئاواییەکاندا، زیاتر ئەم بابەت ومەتڵەبانە قسەیان لەسەر ئەکرا: بەرنامەی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، بەرنامەی کۆمەڵە لەناویەکێتییدا، ئەرکی شۆڕشی نوێ و پێشمەرگە، کەم وکورتی و هۆکارەکانی کۆتایی هاتنی شۆڕشی ئەیلول، دڕندەیی ڕژێمی بەعس و بەرنامەی ڕاگواستن و بەعەرەبکردن و سڕینەوەی ناسنامەی کورد، خەباتی نەتەوایەتی و چینایەتی، شۆڕشی چەواشە، دەرس وەرگرتن لەهەڵەو کەموکورتیەکانی شۆڕشەکانی پێش ئێمە لەوانە شۆڕشی شێخ مەحموود- کۆماری کوردستان- شۆڕشی ئەیلول، پشت نەبەستن بەبێگانە، پشت بەستن بەجەماوەری کوردستان، هەروەها گفتوگۆ ئەکرا لەسەر: مارکسیزم لینینیزم، پرۆلیتاریا، شۆڕشی ئۆکتۆبەر، شۆڕشی کوباو کاسترۆ، جیڤارا، شۆڕشی فەرەنسا، فەلەستین و ڕێکخراوی ئازادی بەخش، فەتح و جۆج حەبەش، ئیمپریالیزم بەسەرۆکایەتی ئەمریکا، دیموکراسی، هاوکاری یارمەتی دانی شۆڕشگێڕانی پارچەکانیتری کوردستان، بەعێراقی کردنی شۆڕشی کوردستان – ئەمەیان بەباس کردنەکەشی من تەنگەنەفەس ئەبووم......تاد. ئەو زانیاریانەی سەبارەت بەم بابەتانەش بەکەم وکورتی و بڕێک بەهەڵەش وەرمان ئەگرت یان پێمان ئەدرا.

ئەم مەتڵەب وبابەتانەمان لەناوخۆماندا بەکۆبونەوە بەگروپ گروپ یان بە دووکەسی و سێ کەسی لەمزگەوتەکان، یان شەوانە لە ئاواییەکاندا کاتێک کۆئەبوینەوە لەماڵێکدا بۆخەوتن، یان لەناو باخ و بێشەڵانەکان کاتێک خۆمان حەشار ئەدا، یان لەدەرەوەی ئاواییەکان کاتێک چاوڕێمان ئەکرد کات بڕوات و بچینە ناوئاوایی بۆنان خواردن باس ئەکرد، یان کادرێک قسەی لەسەر ئەکردن و ئەوانیتر گوێمان بۆ ئەگرت.

لەوچەند ساڵەی سەرەتادا، سەرچاوەی تری وەک کتێب و نوسراوە نەبوو تازانیاری سیاسی و ڕۆشنبیری لێوەرگرین، هەبوو نەبوو کتێبێکی بەرباخەڵ بەناوی چەپکێک لەووتەکانی ماو هەبوو ئەویش بەنۆرە ئەمان خوێندەوە، جارجار ئەو هۆنراوەو سرودانەمان ئەخوێندەوە کە وورە ئەدەن بەشۆڕشگێڕو پارتیزانەکان وەک ئەوانەی شاعیری پایەبەرز قانعی هەرگیز نەمر.

سەرچاوەی تری وەک رادیۆ جیهانییەکان هەبوو، وەک بی بی سی ومۆنتی کارلۆ......تاد، بەڵام زۆربەمان زمانی عەرەبی و فارسیمان نەئەزانی تاکەڵکیان لێوەرگرین. بەم جۆرە لەباری خۆپەروەردە کردنەوە گوزەراندمان تا سەرەتای ساڵی ١٩٧٩.

لەو بەرواره بەدواوە لەباری پەیدا بوونی سەرچاوەی پەروەردە کردن و خۆ ڕۆشنبیر کردن و وەرگرتنی زانیارییەوە، پێمان نایە قۆناغێکی نوێوە، سەرەتای ئەم قۆناغە نوێیەش ئەوکرانەوەو هاتووچۆیە بوو لەنێوان خۆماندا لەگەڵ سەرکردایەتی و ڕێکخستنی شارەکان و مەفرەزە و کەرت و هەرێمەکانی تردا، بەشی سێیەمی ئەم قۆناغە کرانەوەی دەرگایەکی گەورەو ئێجگار گرنگ و دەست گەیشتن بوو بەسەرچاوەی پڕزانیاری بۆ ئێمەی پارتیزانەکان، ئەویش ڕووخانی ڕژێمی حەمەڕەزاشای ئێران و سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران بوو. ئیتر دەستمان گەیشتە کتێب و ڕۆژنامەو مەتبوعات، بەتایبەت هی چەپەکان، لێرەش کێشەی زمانی فارسیمان هەبوو، بۆیە پەنامان ئەبردە بەر کوردەکانی ئێران بۆ وەرگێرانی بابەتەکانی بەتایبەت هەواڵ و زانیاری.

ئەم سنوورەی کەمن لێی پێشمەرگە بووم زۆرتر سنوری قەزای هەڵەبجە و قەزای پێنجوێن و دەشتی شارەزوور بوو، هاوکاری جەماوەری

ئەم سنوورانە و ئازایەتی پێشمەرگە و هاوکارەکانمان کەم وێنە بووە، ئەم تەشکیلاتی پێشمەرگایتیە لەم سنوورەدا هەبوو، لەسەرەتاوە چەند مەفرەزە و دواتر بووە چەند کەرتێک و دواتر هەرێمی یەکی یەکێتیی نیشتمانیی لێ پێک هات، گیان بازی وگیان فیدایی زۆریان کرد.

هەرێمی یەک چەند کەرتێکی هەبوو، دابەش بوو بوون بەسەر ناوچەکەدا: لەبەری هەڵەبجەو هەوراماندا سێ کەرت هەبوون، کەفەرماندەکانیان شەهیدان ئەحمەد گریانەیی و فەرەج تریفەیی و غەفوور دەرەشیشی بوون، دواتر مەحمودی حاجی فەرەج و حسێنی مەجیدی مەلا حامد و مەلابرایمیش بوونە بەرپرس لەکەرتەکەی فەرەج تریفەیی و یەک لەدوای یەک، حسەینی مەجید و مەلابرایم شەهید بوون و شەهید مەحمودی حاجی فەرەج دواتر بووبە بەرپرسی تیپی ٢٥ خاڵخاڵان و پاشان لە ناوچەی ئاکۆیان شەهید بوو.

ئەم سێ کەرتە زۆربەی کات پێکەوە لەسنوورەکەدا جەولەمان ئەکرد، یان لەیەک شوێندا یان نزیک لەیەک بارەگامان دائەنا، سنوری جەولە کردنمان ئاوایییەکانی هەورامان و ناوچەی بناری هەڵەبجەو دەشتی شارەزوری بەری هەڵەبجە بوو، بەتایبەت ناوچەکانی تیرەکانی نەورۆڵی، زەردۆیی، کۆکۆیی، ئێناخی، شەمێرانی، تاوگۆزی، سەدانی، هارونی وشاتری نشینی ئەگرتەوە، جار جاریش ڕێگامان ئەکەوتە سنووری ناوچەکانی تیرەکانی گەلالی، تەرخانی، روغزایی، شێخ ئیسمائیلی و غەوارە نشین. زیاتر مانەوەمان لە سەرەتادا لەئاوایییەکانی هاوار و هاوارە کۆن و گریانە و بۆین و لاوران و لەچەند دێێکی تردا خۆمان پیشان ئەدا.

ساڵی١٩٧٧ لەچالاکیەکی هاوبەشی مەفرەزەی هەورامان و مەفرەزەی شنرۆیدا، لەقەمانی وەزگێڵ دوو سەربازی سوپای عێراق کوژران لەدوای کوشتنی سەربازەکانی سەر چیای شنرۆێ ڕژێم هێرشی بەرب لاوەی کردە سەر ئەم ئاواییانە و ئاواییەکانی بۆ ماوەیەک چۆڵ کرد و خەڵکەکەی دەرکرد، پاش ماوەیەکی کەم خەڵکەکە گەڕانەوە جێگەی خۆیان، دواتر ساڵی١٩٧٩ بەیەکجاری ئاواییەکانی ڕاگواست بۆ کۆمەڵگا زۆرەملێکان، بەناوی جێبەجێکردنی بەندێکی بڕیاری ساڵی١٩٧٥ی جەزائیر، کەلەنێوان ئەمریکاو عێراق و ئێراندا درابوو. عێراق ئەم هەنگاوەی نا، دوای ڕاگواستنی ئاواییەکانی سەر سنوورەکان ژیان و گوزەرانی پێشمەرگە کەوتە قۆناغێکی

زۆر سەخت و دژوارەوە. هەرچەندە لەهەندێک شوێنی قایم و چەپەکدا بارەگاو جێگەی حەوانەوەمان هەبوو وەک: دەوەرە لەپشتی چیای بالانبۆ، گوندی بۆین، ئەشکەوتەکانی کولێن دەشت و هەزارپەز لەسەر رۆخی ئاوی سیروان، کانی چنار و ئاوایی لاوران لەتاوگۆزی کانی کێخا عەلی لە نزیک گریانە.

بەڵام خواردن و پێداویستی ژیان زۆر بەزەحمەت دەست ئەکەوت، ماوەیەک مەفرەزەمان ئەکرد بۆ شارەکان و ئەو ئاواییانەی کەمابوونەوە بۆ بەدەست هێنانی ئاردو رۆن و شەکرو چایی، ماوەیەکیش لەئاواییەکانی کوردستانی رۆژهەڵاتەوە بەر لەروخانی رژێمی شا بەزەحمەتێکی زۆر و روبەروو بونەوەی گرفت و کێشە خۆراکمان پەیدا ئەکرد، چونکە ساواک و چریکی سەردەمی شا رێگرییان لێ ئەکردین. بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند سەرکەوتنی شۆرشی ئێران و روخاندنی رژێمی شا دەرگایەکی تری ئومێدی بەرووماندا کردەوە، لەباری ژیانەوە کەوتینە قۆناغێکی ترەوە.

لەگەڵ دەست پێکردن و سەرەتای خۆپیشاندانەکانی وولاتی ئێران لەساڵی ١٩٧٩دا ئێمە بنکە و بارەگاکانمان بردە سەر سنوورەکان و کانی و ئاو و هەوارەکانی باخەکانی کوردستانی رۆژهەڵاتمان کردە بارەگاو جێی حەوانەوە، بۆکارو چالاکی ئەهاتینە قووڵایی خاکی عێراق و بۆ حەوانەوە و پشوودان ئەچووینە ناو ئاواییەکانی کوردستانی رۆژهەڵات. لەم سەردەمەشدا ئەرکی زۆرمان لەسەر هەردوو ئاوایی شۆشمێی خوارو و سەروو لەگەڵ ئاواییەکانی شێخان و شبنێ و خەنانە کەرو ئاواییەکانی تری دەورووبەری شاری نەوسوود هەبوو.

لەدوای راگواستنی ئاواییەکانی سەر سنوور رێگەی هاتنە خوارەوە مان بۆ گەیشتن بەئاوەدانی و سەرکەوتنەوە بۆ بنکە و بارەگاکانمان لەسەر سنوور لە دوو لاوە بوو.

یەکەم/ لەپەرونی وکەچێنەوە بۆ ئاوایی وێران کراوی هاوارو لەوێوە بۆ عەبابەیلێ و گەیشتن بە هەڵەبجە و شارەزوور. دووەم / لە هاکڵێ[1] و ئاوایی شۆشمێوە بۆ ئاواییە وێران کراوەکانی پالانیاو خەرپانی لەوێوە گەیشتن بە ئاواییەکانی دەشتی شارەزوور.

لەبرینی ئەم رێگا دوورەدا زۆرجار هەڵکشان بە هەورازدا قەڵس و جارستی دەکردین بەڵام کە دەگەیشتینە لووتکە عەبیری سەر بەرزی کەیلی دەکردین، هەستمان دەکرد سەر بڵندین و سەرمەست بە شەرابی لەعەلی خەبات و بەرخۆدان، سەرمەست وەکو ئەو سۆفییەی حەق پەرستانە بەرەکەتی خودایان هێناوە نێو محرابی دڵیانەوە، یان بە پێچەوانەوە پەرەسێلکەی دڵیان هەواریان گواستوەتەوە بۆ سەفاخانەی عیشقی لاهووتی، لەو بەرزاییانەوە هەستمان دەکرد ئەم دنیایە پۆلێک هەڵۆی بزر کردووەو سۆراخیان ناکات هەڵۆکانیش ئێمەین، ئێمەیەک کەتروسکەی ئومێدێ هەناوی کردوینەتە مەشخەلان، ئێمە کەلەبانی دوندەکانەوە نزیک بوو بووینەوە لە ئاسمان، دەمانتوانی ئاسان ئاسان بە خودای خۆمان بڵێین: ئیلاهی گوناهمان چی بوو لەنێو لیستی گەلانی جیهاندا ئێمەی کوردت فەرامۆش کردووە؟ بینای چاوان عەرشت نەلەرزێ ئەگەر بڵێین: بۆ چی بۆ چارەنووسی ئێمە گەزەکەت کورتی هێناو پۆشاکی کۆیلەیت بەبالا برین؟ ئاخرتاکەی کەی ئێمە واکۆیلە بین، خاوەن ماف و سەر بەخۆ نەبین بۆبۆبۆ؟؟؟.

بەر لەچۆڵ کردن و بارکردنی، ئاوایی پالانیا برکە ماڵێک بوون ئەکەووتنە سەر چەم لەخوار تەوێڵەوە بەدووری ٥کم. پێشتر باسمان کرد. لێرە هەموو خێزانەکان هەژار و کەم دەرامەت بوون، بەڵام لەکوردایەتیدا دەوڵەمەند بوون، مامە حەمەی فەتالی ئیشی رێکخستنی بەباشی و ژیرانە ئەکرد، لەسلێمانییەوە ب لاوەکراوە و نووسراوەکانی بۆ رێکخستنی تەوێڵە لەئەستۆدا بوو، ئەو سەردەمە چەند بنەگونییەک فیشەکی ژەنگاوی و شانەی کلاشینکۆف و گولە ئارپ بی جی مان هەبوو، کەئەمە هەموو ئەمبارێکی

---

[1] – هاکڵێ چەند خانە باخێکی هاوینەی ئاوایی شۆشمێن لە کوردستانی خۆرهەڵات ، لەناو باخەکاندا چیکراون هاوینان خاوەن باخەکان کۆچیان ئەکردە ئەوێ، زستانان ئێمە ئەمانکردنە بارەگاو جێگەی حەوانەوە.

تەقەمەنی ئێمە بوو، لای مامە حەمە بوو لەجێگەیەکدا بەناوی لێژەی موراد بۆی شاردبووینەوە. بەداخەوە مامە حەمە دوای راگوێزانی ئاواییەکان ئاوارەی ئێران بوو، تائێستاش نەگەڕاوەتەوە و هەر لەئاوارەییدا ئەژی،

جگە لەمامە حەمەی فەتالی بەگ لە ئاوایی پالانیای کوردستانی باشور، پورە عوزرای خوشکیشی لەئاوایی شۆشمێی کوردستانی ڕۆژهەلات دائەنیشت. ئەو ژنەی کە پێشمەرگە و کادیرەکانی سنوری هەڵەبجە بەدایکی کوردستان ناویان ئەبرد، ژنێکی تێکۆشەرەو خاوەن دوو کچ و پێنج کوڕی هەتیو بوو، بەلام ماڵەکەی نەک بنکەو بارەگا بگرە ماڵی هەموو پێشمەرگەیەک بوو وەک ماڵی خۆی، من ئێستا سەرم سوڕئەمێنێ ئەم دایکی کوردستانە بەهەتیوباری و بەبێ هیچ سەرچاوەیەکی بژێوی ژیان، ئەم هەموو برسیەی چۆن تێر ئەکرد..

لەرۆژهەلات گوندەکانی شۆشمێ سەرو خواروو، ماڵەکانیان زۆریان بۆ پێشمەرگەکانی یەکێتیی هەروەک ماڵی خۆمان بوو، بەتایبەتی لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران. دواتریش هەر لەسەر سنوور و لەباشوری شارۆچکەی نەوسوود بەدووری دوو کیلۆمەتر ئاوایی سەرکەشی شێنێ هەبوو ئێستا چۆڵ کراوە، لەم گوندە چوار ماڵیەدا خالۆ مستەفای شێنێ، یەکێک بوو لەو کەسانەی کەزەحمەت و ئەرکی یەکێتیی نیشتمانیی لەساڵانی ١٩٧٩-١٩٨٠ پشتی چەماندبوو، خالۆ مستەفا زاوای دەروێش عەلی یۆسوتال بوو، دەروێش لە بەهارو هاوین تا کۆتایی پایزیش ماڵی لەهەوار لەسەر کانی و ئاوی گەچێنە ئەبوو و خۆی و کوڕەکانی، ماڵی عەلی یوسوتاڵ بۆ ئێمە هەمیشە دەرگای لەسەر پشت بووە، خزمەتێکی بێوێنەی مەفرەزەکانی ئەم سنوورەی ئەکرد. یوسۆتاڵ، لەدەورانی عەشایەریدا چەتە بووە و هاوڕێی ئاغا شرەی ئێناخی بووە، پورە کاڵێ هاوسەری دەروێش عەلی یوسوتاڵ ژنێکی سەلارەو بەهەیبەت بوو، ژنێکی خزمەتگوزارو دڵسۆز بوو، ئەویش هاوشانی ئەو کەسانە بوو کەحەقی رێز لێنانی هەیە لەپای ئەو خزمەتەی بێبەرامبەر تەنیا لەبەر ناوی پێشمەرگە، لەخزمەت شۆڕشی کوردستاندا بوون. سەبری میرزا حەمەساڵحی نەوسوودی هاوکاری و یارمەتی ئێمەش و قیادە موەقەتەشی ئەکرد، سەبری و نوری شۆشمەیی و حەمەی گۆرانی بێژی نەوسوودی، ئەمانە ئەحمەد گریانەییان زۆر خۆش ئەویست بەو

بۆنەشەوە لەو دەمەی شای ئێران نەڕوخابوو بەدزی ھاتوچۆیان ئەکردین، دوای ڕووخانی ڕژێمی شاش ھەرچەندە ئەحمەد گریانەیی شەھید بوو بوو، بەلاّم ئەمان زیاتر نزیک بوونەوە و یارمەتیان داین.

میرزا حەمەساڵحی باوکی سەبری لەدەورانی عەشایەریدا بەرپرسی دەستەیەک چەتە بووە کە ئەو چەتانە عێراق و ئێرانیان بۆ نەبووە. ساڵی١٩٨٨ میرزا حەمەساڵح مابوو، لەگەڵ ھاوڕێم حەکیمی مەلاساڵح سەردانمان کرد لەشاری پاوە لەکوردستانی ڕۆژھەلات، پرسیاری زۆرمان لێکرد و زۆر شتی بۆ باس کردین ئەیووت شەڕی ھەورامان لەگەڵ مەنمی و گەڵباخی، شەڕی ھەورامان لەگەڵ جوانڕۆ، شەڕی ھەورامان لەگەڵ سەردار رەشید عەباس خان، شەڕی ھەورامان لەگەڵ قاجاریەکان و شەڕی ھەورامان لەگەڵ ڕەزا شای پەھلەوی لەزۆریاندا بەشدار و فەرماندە بووم.

ئەیووت: قاجاریەکان شکان و سالار دەولە ڕای کرد بۆ شام و لەوێوە چوەتە بەغداد، بەغداد ئامادە نەبوون ھاوکاری بکەن لەوێوە گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان و چووەتە ماڵی ئەحمەد بەگی جاف لەئاوایی ریشێنی سەربەناحیەیی خورماڵ، داوای لەئەحمەد بەگ کردووە پەیوەندی لەگەڵ شێخ حسامەدین نەقشبەندی لەئاوایی باخەکۆن بۆ دروست بکات. ووتی: دواتر سالار دەولە ھاتە باخە کۆن و لەوێ داوای لەشێخ کرد بوو کەئەیەوێت بگەڕێتەوە تاران بگرێتەوە، پێویستی بەشێخە لەگەڵ جەعفەر سوڵتان قسە بکات بۆ ھاوکاری کردنی.

جەعفەر سوڵتان کە دێت و دوای ووتوێژ، سالار دەولە ئەڵێت: محەمەد عەلی شا لەشیمال و لەقەزوێنەوە دێتە تاران، ئێمەش لەسنەو کرماشان و ھەمەدانەوە ئەڕۆین و تاران ئەگرینەوە، جەعفەر سوڵتان پێی ئەڵێت ئەگەر موکریان و سەردارە رەشید و کەلھوڕ و گۆران بەشدار نەبن منیش ناتوانم ھاوکاریت بکەم. لەوەلامدا پێی ئەڵێت ئەوانەو بەختیاری و لوڕیش بەڵێنیان داوە ھاوکارم بن. جەعفەر سوڵتانش بەڵێنی ئەداتێ و ئەگەڕێتەوە دەست ئەکات بەگەڕان بەئاواییەکانی ھەورامی نشیندا بۆ کۆکردنەوەی لەشکر، لەئاوایی نۆدشەو لەناو مزگەوتدا کاتێک سان قسەیان بۆ ئەکاو پیاوێک ئەڵێت: جەعفەر سان بەپێی پەتی و بەسکی برسی شەڕی مەنمی و گەڵباغی و کوێ و کوێت پێکردین، بۆ کوێمان ئەبەی تاران چۆن بۆ

ئێمە ئەگیرێت، نەزمان ئەزانین و نە نەخشە شارەزاین ئەگەر شکاین هەموو لەناو ئەچین وازمان لێ بهێنە، سانیش ئەڵێت ناناشکێین ئەیگرین، ئەو پیاوە ناوی حەمە شیلانی خەڵکی شارۆچکەی تۆدشە بووە. ئینجا لەشکرکێشی ئەکەن لەهەورامانەوە بۆ سنە لەوێ خوالێخۆشبوو ئایەتوڵا مەحمەدی مەردۆخ هاوکاریان ئەکات. سنە و کرماشان تەسلیم ئەبن و هەمەدان جێ ئەهێڵن و ئەگەنە باخی شا لەوێ ئەشکێن.

میرزا حەمەسالح ئەیووت: لەباخی شا تەنیا جەعفەر سولتان بەرگری کردووە، هەموو هۆزو تیرەکانیتر هەڵهاتن، کوڕێکی جەعفەر سولتان لەوشەڕەدا گیراوە بەناوی محەمەد عەلی بەگ (حەمیتە). ئەگێڕنەوە یوسوتاڵ باوکی دەروێش عەلی لەگەڵ دەستەیەکدا تەرەئەبن و لەباغی شاوە ئەگەڕێنەوە بۆ هەورامان، لەڕێگە هەر توشی نارەحەتی ئەبێت و بەرخێک ئەکاتە مەولود تا ئەگاتە کرماشان، حساب ئەکات ئەزانێ شەش بەرخ قەرزارە، دێت و ئەگاتە کوێزی کاروان سەرا کە ئەکەوێتە نێوان شاری پاوە و روانسەر، نیوەڕۆ ئەبێت لەسێبەری دارگوێزەکاندا پشوو ئەدەن، ڕانە مەڕی عێلی ئێناخی لەسەرڕا دێنە خوارەوە بۆکەلە بێرە. بەچەکدارەکانی هاوڕێی ئەڵێت: ئادەی شەش بەرخ بگرن و سەریان ببڕن، یەکێکیان ئەڵێت حەرامە نابێت بۆ مەولود، یوسوتالیش ئەڵێت: سەریان ببڕن ئەی خوا خۆی نازانێت من کوا بەرخە مێم هەیە.

لە خاڵۆ میرزا حەمەسالحم پرسی بۆ لەگەڵ یوسوتاڵ چوونەتە سەر دۆڵبیان و ماڵی باپیرمتان تالان کردووە لەدەورانی عەشائیریدا؟ ووتی: ماڵی باپیرت و حاجی ئەولەی نەسە دراوسێ بوون لە دۆڵبیان، ئێمە لەتالانێکدا رادیۆیەکی ئەو سەردەمەمان دەست کەوتبوو، ناردبوومانە ماڵی حاجی ئەولە، زاوایەکی حاجی، کەناوی میرزا بوو کلاش کەر بوو، خاڵێکی دایکی تۆ ناوی مەحمود بوو شاگردی میرزا بوو، باوکی دایکت حاجی عەزیز لە ئاوێسەر لەدۆڵی دەرەتاریک بوو.

میرزا رادیۆکەی بردبوو لەگەڵ مەحمود بردبویان بۆ دەرەتاریک، لەماڵی حاجی عەزیز باپیرت دایئەنێن، ئەڵێن بائەم ئامانەتە لێرەبێت، ئەوان ئەڕۆن و نەنکت بەرماڵێک ئەدا بەسەریا، ئێوارە حاجی لە تەوێڵەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵ، نەنە خەجێ پێی ئەڵێت: میرزا و مەحمود سندوقێکیان

هێناوە لێرە دایان ناوە، ئەویش ئەڵێ: ئایبهێنە، کاتێ سەیری ئەکات، ئەڵێ: ئەو چەکوشەم بۆ بێنە ئەمە سندوقی لیرەیە، ئەیشکێنێ هەندێک سیم و تەل دەرئەکەون، وازی لێ ئەهێنێت، ئەچێت ڕەئوف حەموئەمین لەتەوێڵە ئەهێنێ بۆ سەیری ئەویش لێی نازانێت، ئەڵێت با بچین کوێخا حەمەسەلیم بهێنین، ئەویش کە دێت ئەڵێت من نازانم تەنیا شێخ عەلادین ئەزانێت ئەم شتەچییە، ئەچن شێخ ئەهێنن بۆ سەیرکردنی ئەڵێ ئەمە رادیۆیە بۆ واتان لێ کردووە.

لێیان ئەکرێت بەتفەنگێکی ئەو سەردەمەو چاکی ئەکاتەوەو لەبیارە دایئەنێ، حاجی ئەولە خەبەر ئەزانێ رادیۆیەک لەماڵی شێخە ئەچێت بۆ ئەوێ، ئەبینێت ڕادیۆکەی خۆیانە ئەپرسێت لە شێخ: ئەم ڕادیۆیەت لەکوێ بووە؟ شێخ ئەڵێ: لای ئەو جەماعەتە کڕیومە... دواتر حاجی ئەولە وا ئەزانێت ماڵی باوە حاجی عەلی محەمەد ڕادیۆکەیان بردوەو ناردویانەتە ئاوێسەر بۆماڵی حاجی عەزیزی باوکی دایکت، ئەوە لەسەر ئەوەبوو ماڵەکەمان تالان کردووە، دواتر کەزانیمان چۆن بووەو چیرۆکەکە ئاشکرا بوو، پەشیمان بووین و چووین بۆ لای باوات تاگەردنمان ئازاد بکات.

بابێینەوە سەر باسەکەی خۆمان و هاوکاری و یارمەتی کوردەکانی ڕۆژهەڵات لەسەرەتای شۆڕشی نوێدا، مستەفا بەلەبزانی لەئاوایی بەلەبزان، حەمەی وەسمان بەگ لە ناوچەی ئیمامی نشینداا، ماڵی عێل بەگی لە هێرتای ناوچەی ئێناخی نشیندا، حەمە کۆکۆ و حەکیمی شەوکەتی لەنۆدشە، ماڵی خەلیفە نەرویی، حاجی برایمی شۆشمێی سەروو، بنەماڵەی شێخ نەجمەدینی نیعمەتی[1] نەرویەی و بەتایبەت حەمەی کوڕی، بەگشتی جەماوەرەی دراوسێی

---

[1] - کاتێک فەتاح ئێناخی بریندار بوو، بردبومانە ئەشکەوتی هەزارپەز، دەرمان و پێویستی برین پێچیمان نەبوو، حەمە ئاوات پێشمەرگەو برینپێچ و دوکتۆرمان بوو، تاخۆی بریندار نەبوو خزمەتی زۆری پێشمەرگەکانی سەرەتایی کرد، کوڕێکی بەقابیلیەت بوو، بەڵام بریندار بوونەکەی خۆی لەناوچەی تاوەگوزی سەخت و چارەسەرنەکراو بوو. بەڵێ لیستێکی کرد بۆ دەرمان و دەرزی بۆ فەتاح. لیستەکەمان بەنهێنی برد بۆ لای محییەدینی وسێن ناسراو بەمەحل لەئاوایی شێخانی خۆرهەڵاتی کوردستان. گریانەییش پێش چوونی ئەمەی پێ ووتبوو، کە ئەوە ببات بۆ شێخ نەجمەدین لەئاوایی نەرویو پێی بڵێ بریندارمان هەیە. مەحل چوو بووە ئاوایی نەروی شێخیش مەحلی ناردبوو بۆ شارۆچکەی نەوسوودو پێی ووتبوو: برۆ بۆلای ڕۆستەمی قادر بەگو پێ بڵێ ئەو دەرمانانەت بداتێ

سنوری هەرێمی یەک لەدیوی کوردستانی ڕۆژهەڵات، لەکاتی مەفرەزە سەرەتاییەکان و ڕژێمی شا لەسەر حوکم بوو، وەدواتریش لەسەردەمی سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامیدا، پشت و پەناو جێگەی حەوانەوە و هاوکاریکردنی ئێمە بوون، بەتایبەت لەساڵی ١٩٧٨-١٩٨٢ .

لەوانە جەماوەری شارو شارۆچکەو شارە دێ و دێهاتەکانی مەریوان، ساوجی، جەژنیاوا، ئاسناوا، بایاوا، خانمە شێخان، مرانە، سیاناو، ئاسکۆڵ، پیران، وەلە لێوارەکانی گۆلی زرێباریشدا ئاواییەکانی: نێ، لەژێر، کانی سانان، بەردەڕەشە، دەرەتفێ، ئاواییەکانی تری سەرسنوور کەلەباکوری سنوری هەرێمەکەدا بوون.

لە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەلاتیشدا پاوە، نەوسوود، نۆدشە، نەرویی، شەڕەکان، وەزلێ، تەشار، شێخان، شۆشمێی سەروو خواروو، لەسنوری هەورامی نشیندا هیروێ، بەلەبزان، زێ، هێرتا، ژاڵە، مەڕەخێڵ، وارامچە و هەنجیرک، دەگاگا، سیمان، بەوڕۆڵ و دڕۆڵە، لەسنوری ئێناخی و ئیمامی نشیندا، خزمەتێکی بەرچاویان کردووەبە مەفرەزەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە سەرەتایی شۆڕشدا، هاوشان و هەماهەنگ لەگەڵ خەڵکی هەورامانی دیوی کوردستانی باشورو شارەزوررو هەڵەبجە و پێنجوێن وسەرجەم ناوچەکانی تردا، یارمەتی وهاوکاری وپشتیوانی ئەم جەماوەرە لەسەرەتا و لەکاتی تەنگانەو ڕۆژە سەختەکاندا بۆ پێشمەرگەو شۆڕشی نوێی کوردستان، لەبیرنەکراوە لە مێژووی گەلەکەماندا.

---

ومن پارەکەیان ئەدەمێ، مەحل چوو بووە نەوسوود دەرمان و کەلوپەلی برین پێچیەکەی لای ڕۆستەم وەرگرتبوو، لەگەڕانەوەدا لەنزیک شێخان ژاندارم مەحلیان بەدەرمانەکەوە گرتبوو بردبوویان، کاتێک ئێمە چاوەڕێی مەحلمان ئەکرد لە هەزار پەز بە دیار فەتاحەوە، ئەوە بوو ساواک و هێزێکی ئێران هاتن و ئێمەیان دەرکرد، ئەمەم لەشوێنی خۆیدا باس کردوە. بەڵێ دووبارە ئەحمەد گریانەیی مام تەوفیقی شاکەرەمی بەنهێنی ناردەوە بۆ لای شێخ نەجمەدینی نیعمەتی، شێخیش خۆی چوو بووە لای مەرزەبان بۆ شارۆچکەی نەوسوودو مەحل و دەرمانەکانیشی بەردابوو. شێخ وتبووی: ئەوانە کۆمەڵێک خزمی منن قاچاخن لەعیراق و نەخۆشیان هەیە، دواتر بیستمان ڕۆستەم خۆی خەبەری داوە بە دەوڵەت مەحلیان گرتووە.

# جیاکردنەوەی مەفرەزەکان

# بۆ سەفەری هەکاری

لەسنوری قەزای هەڵەبجەدا، لە ناوچەی هەورامان سەرەتا کاک حامدی حاجی خالید لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک پەڕینەوە بۆ بەری سووریێ، ئێمە لەگەڵ ئەوانە بووین کەماینەوە لەسنوورەکەدا، پاش هەفتەیەک دوای ئەوان شێخ عەلیش پاش نیوەڕۆیەکی زستانی ١٩٧٨ لە سێڕیانی سۆڵە- جاور-هاواردا، لەو شوێنەدا کە لەهاوارەوە بەرەو پاڵانیا دەڕوات، ئێمەی جیاکردەوەو بووین بەدوو بەشەوە، داوایان کرد ئەوانەی لای ئێمە بەڕیز بوەستین و دوای ئەملاو ئەولا ماچ کردنی یەکتر خواحافیزی لەیەک بکەین، ئەوانەی لەگەڵ کاک ئەحمەد گریانەیی ماینەوە لەوان جیابووینەوە کەلەگەڵ شێخ عەلیدا ڕۆشتن، حەمە کەرەمی برادەرمان کەناوە نهێنییەکەی ئاراس بوو کەوتبووە لای ئەو جەماعەتە لەگەڵ شێخ عەلیدا بوون.

من داوام کرد ووتم: با یان ئێمەش واتە من و حیکمەت، بێینەلای ئێوە یاخود با حەمەکەرەم بێتەوە لای ئێمە، مام هادی لای لاکەیتر بوو، ووتی: ئێمە دەچینە ئاوایی خەرپانی و سبەینێ دێینەوە. من بۆخۆم بڕوام نەکرد کەچۆن سبەینێ دێنەوە؟ ئەی بۆچی ئەملاو ئەولای یەکتر ماچ ئەکەین، حەمەکەرەم بڕوای بەقسەکەی مام هادی کرد، بۆیە بەحیکمەتی ووت: ئەو نیودینارەم لێوەربگرە تا دێمەوە، چونکە گیرفانەکەم دڕاوە باوڕی نەکەم، خوا حافیز.. خوا حافیز. ئەوان بەرەو ئاوایی خەرپانی و ئێمەش بەرەو ئاوایی پاڵانیا.

ئەو شەوە ئێمە چووینە ئاوایی پاڵانیا. بەیانی برادەرەکانمان دیار نەبوون بێنەوە، ماوەیەک بۆخۆمان جەولەمان کرد بە ناوچەکەدا، برادەرەکانمان دوای ماوەی چەند هەفتەیەک مەفرەزەیەکی تێکەڵ لەو دوو مەفرەزە کە لەگەڵ کاک حامد و شێخ عەلی ڕۆشتبوون، بەفەرماندەیی شەهید فەرەج تریفەیی گەڕانەوە، هەندێ چەکی زیادەشیان پێ بوو، بۆیان گێڕاینەوە

کەچوونەتە سورێن و لەئاوایی کۆڵیتان حسەین فەیلی جەماعەتی قیادەی موەقەت بوو، خۆی و جەماعەتەکەیان چەک کردووە، ئیتر ئەمان گەڕاونەتەوە بۆلای ئێمە و ئەوانیش بەرەو بناری قەندیل ڕۆیشتوون.

ئەوکاتانە لەبەرئەوەی نەڕادیۆ و نەجیهاز هەبوو هێندە ئاگامان لەیەکتر نەبوو، ئێمە تەنیا هەواڵی سنوورەکەی خۆمانمان دەزانی، ئاگادار نەبووین لەناوچەکانی تری کوردستان چی ئەگوزەرێت و چی ڕوو دەدات، هەموو ئیش و کارەکان بە بڕیاری ناوچەیی بوو تابڕیاری مەرکەزی، چی بەچاک ئەزانرا جێ بەجێ دەکرا، زۆرجار ڕووداوێک یان شەهیدبوونی بەرپرسێک یان تیاچوونی مەفرەزەیەک یان ڕوودانی شەڕێک دوای چەند مانگ لێی ئاگادار دەبووین، یان هەر نەمان ئەزانی، بۆ هەواڵێکی سەرکردایەتی یان بانگ کردنی مەفرەزەیەک یاخود هەرکارێکی پێویست بەهۆی نامەوە ئاگادار دەکراین، نامەبەرەکەش یان لەڕێی شارەوە یان شەهید حاجی چاو شین بوو، کەجاروبار سەردانی دەکردین، حاجی چاوشین پیاوێکی باڵا بەرزی ناوقەد باریکی تیژڕەو بوو، کەبەداخەوە شەهید بوو.

حاجی هاتوچۆی هەموو ناوچەکانی کوردستانی ئەکرد نامەبەرو هاوکارو شارەزایی مەفرەزەکانی ئەکرد لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکیتر، شەوی۲۹لەسەر۳۰ ۱۹۷۹/٤لەگەڵ شەهید سیروان تاڵەبانی فەرماندەی هەرێمی (٥) پێنج و شەهید حەسەن خاوێ فەرماندەی کەرت و شەهیدان عەلی چەلەبی و نەجات ڕەحیم لەشارباژێڕەوە بڕێک چەکیان ئەبردەوە بۆ قەرەداغ، بەسواری تراکتۆری هاووڵاتیەک بەناوی محەمەد ئەمین کەوتنە بۆسەی جاشەکانەوە لە شارەزور لەنزیک یاسین تەپە ڕۆحیان فڕی بۆ بەهەشتی سەروەران، شۆفێرەکەش شەهید بوو. شەهید سیروان من لە نزیکەوە نەم دیبوو بەڵام بە بیستنی ناوی و دەورو کاریگەریەکەی لەو سەردەمەدا لە ناوچەی قەرەداغ و گەرمیان، من شێوەو ڕوخساریم لەپێش چاوی خۆم وێنا کردبوو، بەبیستنی هەواڵی شەهیدبونەکەیان زۆر غەمبار بووم، دواتر وێنەکەیم بینی بۆم دەرکەوت بەهەڵە ڕووخساریم وێناکردووە.

ماوەیەکی کەم بەرلەشەهید بوونیان حاجی چاوشین هەواڵی کارەساتی هەکاری بۆ هێناین، دواتر بەهۆی هاتنەوەی عەلیە خرەی ئێناخیەوە کەپێشمەرگەی مەفرەزەکەی ئێمە بوو لەکاروانی هەکاریدا بەشدار بووبوو،

ئاگاداری وردەکاریەکان و چۆنییەتی کارەساتەکەمان زانی. شەهید عەلی خرە بەشداربووی کارەساتەکە بوو، لەوێ بەدیل کراوی رادەستی رژێمی عێراق کرابوویەوە و پاشان لەکەرکوک ئازاد کرابوو، هاتبووە هەڵەبجەو لای کەس و کاری لای نەدابوو، یەکسەر خۆی گەیاندەوە لامان لە ئاوایی گریانە، درێژەی بەخەباتی پێشمەرگایەتی دایەوە تا لەساڵی ١٩٧٩ لەم ساڵەدا لەشەڕ لەگەڵ سوپای پاسداران لەمەریوان لە پشتی پادگانەکە شەهید کرا، من هەواڵی حەمەکەرەمی هاوڕێمم لێپرسی کە چیلێهاتوە؟ ووتی ئەویش گیراو لە زیندانی کەرکوک پێکەوە بووین پێکەوەش ئازاد کراین، لەوکاتەدا نیو دینارەکەیم هاتەوە یاد کەئەو رۆژەی لەیەک جیابووینەوە بەحیکمەتی ووت: ئەم نیودینارەم بۆ هەڵبگرە خۆم گیرفانەکەم دڕاوە.

لەوکارەساتەی هەکاریدا هەموو هێزەکان تیاچون تەنیا کاکە حەمەی حاجی مەحمود و چەند کەسێک گەڕانەوە، سێ پێشمەرگەی ترمان بەناچاری خۆیان گەیاندبووە شاری کوردنشینی قامیشلۆ لە کوردستانی خۆرئاوا، کەئەو دەم نووسینگەی پەیوەندیەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانی لێبوو، سێ پێشمەرگەکەش بریتی بوون لە حەمە هاواری، شەهید حسەینی مەجیدی مەلاحامد و بەکر عەبدولقادر ئەمانە سەربەکەرتەکەی هەورامان بوون، کاک حامدی حاجی خالید فەرماندەی بوو خۆی لەهەکاری گیرابوو لای قیادەموەقەت زیندان بوو، ئەمان لەسوریاوە گەڕابوونەوە قەندیل، دووتر گەڕانەوە بۆ لای ئێمە بۆ هەورامان، حەمە هاواری لەبیرەوەریەکانی خۆیدا بەناونیشانی لە هەورامانەوە بۆ قامیشلی باسی ئەو کارەساتە و هەندێکی زۆر لەڕووداوەکانی کردووە و بەچاپی گەیاندووە. هەروەها کاک نەوشیروانیش بەناوی کارەساتی هەکاریەوە لەدووتوێی نامیلکەیەکدا باس و خواسی لەسەر کردووە.

کاک حسەینی مەجیدی مەلاحامد کەگەڕایەوە کرا بەفەرماندەی کەرت و پاش ماوەیەک لەنزیک ئاوایی هاوار کەووتنە بۆسەی جاشەکانەوە، خۆی شەهید کرا و هاوڕێکەشی عەلی دەڵێنی بەبریندار گیراو پاشان لەقەسابخانەکەی موسڵ لەسێدارە درا.

# سەرەڕۆیی و سەرپێچی

لە سەرەتای بەهاری ١٩٧٨ دا ڕۆژێک لەسەر چیای ئاوەزنێ بووین لەناو چەند بنگەڵە هەژگ و داربەڕوویەکدا خۆمان شاردبووەوە لەسەر دەنگەدەنگی دوو پێشمەرگە، گریانەی خۆی لەمن تووڕە کرد، ئەشی زانی من نەبووم پەیوەندی بەمنیشەوە نییە، دیارە بەئەنقەست لە من تووڕە بووە بۆئەوەی ئەوانیتر ساکت بن، چونکە من بەتەمەن لەهەموویان بچوکترو گریانەیش خۆشی ئەویستم، من دەرک بەمە ناکەم، ئەوماوە زیاتر نیوەڕوان لەشوێنی خۆحەشاردان ئەهاتینە دەر، لەکاتی هاتنە دەرەوەدا یەک یەک و دوودوو ئەچووین بۆ سەر ئەو کانییەی ئاوەزنێ کەپێی دەوترێ هانەشروان، ئەم شوێنە سنوور و کانیەکە لەناو خاکی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا بوو، من لەدڵا عاجزبووم و فرسەتم گرت بەبێپرس، خۆم دزیەوە لێیان و بەدیوی عێراق دا هاتمە خوارەوە بۆ نزیک ئاوایی هاوارەکۆن لەجەنگەڵێکا تائێوارە خۆم حەشاردا، دواتر چووم بەرەو چۆمی پاڵانیا و دۆڵبیان، هەرئەو ڕۆژە نیوەڕۆ دواکەی کەلەنزیک ئاوایی هاوارە کۆن خۆم شاردبوەوە، کاتێکم زانی وابرادەرەکانم بەلامدا هاتنە خوارەوە بۆ هاوارەکۆن ئەچن، ئەوان ڕۆیشتن و من خۆم ئاشکرا نەکرد، مامەوە تاتاریکی کرد، ئینجا هاتمەدەرەوە پەڕیمەوە بۆ ئەمبەری چۆم، بۆ ماڵی قالەی مەحو لەوێ لام دا، بانگم کرد خاوەن ماڵ دادە حەیاتی خێزانی و مامە قالە بەجووتە لەدەرگاکەوە هاتنەدەر، فەرموو ئەوە لەکوێ بووی؟ ئەحمەدو هاوڕێکانت ئێستا چوون بەرەو گریانە بەدواتا ئەگەڕان، ئەحمەد ئەیووت لەمن عاجز بووە ئەگەر هاتە ئێرە خاڵۆ قادر بەناوی منەوە پێی بڵێ بێتەوە قەیناکا، ئەترسم بڕواتووشی کێشە بێت، کوڕەکەی حاجی حەمەساڵحیش حیکمەت زۆر خەمی بوو ئەیووت ئەترسم لەناو جەنگەڵەکەدا مار گەزتبێتی باش نەگەڕاین بە دوایدا.

لەوکاتەداو بەبیستنی قسەکانی مامە قالەو دادە حەیات دڵم تەنگ بوو، بەدڵتەنگیەوە وتم ئەزانم، دوونانم بەنێ ئەڕۆم، ووتیان نان حازرە دانیشە هەرچەندیان کرد دانەنیشتم، دادە حەیات چووە ژوورەوە لەوسەرەوە گەڕایەوە تۆشەبەرەیەکی (دەستماڵ) هێناو ووتی هابگرە، لێم وەرگرتوو نانی تێدابوو بەستمە پشتم و بەلاڕێدا بەرەو هاوار هاتم لەئاوایی هاوار لامنەدا، گەشتمە نزیک چەمی سۆڵە کەئەکەوێتە نێوان ئاوایەکانی هاوارو جاور، کاتژمێرم نەبوو بەڵام ئەمزانی بەشێکی زۆر لەشەو تێپەڕیوە، لەوچۆمەوە لە بەڵخەوە سەرچاوە ئەگرێ و لەم شوێنەدا دێتەوە سەر چۆمی سەرەکی تەوێڵە، لەوێوە بەرەو هاوار، هاوارەکۆن و لەخوار گریانەوە ئەڕژێتە ناو ڕووباری سیروان لامدایەوە.

شوێنیکی چەپەکە باخو بێشەلانێکی چڕە، لەسەرئاوەکە کەمێک حەوامەوە ئینجا مەتارە ئاوەکەم پڕ لەئاو کردو چوومە ناو توودڕکێکی چڕو شوێنم چاک کردوو لێی خەووتم، بەیانی ڕۆژ بوەوە بەخەبەرهاتم کەمێک سەرمام بوو دوای کەمێک جووڵە باش بووم، مەتارەکەم لەبەرگەکەیدا دەرهێناو تۆشەبەرەکەی دادە حەیاتم کردەوە نان و ئاو بخۆم، ئەبینیم نزیکەی نیوکیلۆ ڕۆنی خۆمانە (حەیوانی) ئامێتە بەدۆشاوی توو لەناو دوو مووچە نان دایە، چەند خۆش بوو. نان و ڕۆنی باشم خوارد، لێی کەوتمەوە گوێم شل کردووە بۆ چرکەو سەدایەک، دنیا کشوماتە تەنیا باڵندە و بولبولەکان سەرمەستانە ئەمبەرو ئەوبەرو ع لاوەچل دەکەن، بەئاوازی خۆشو دلگیر هەریەک بە ئاوازێک، وام هەست ئەکرد ئەیانەوێت من بلاوێنن بۆئەوەی بێتاقەت نەبم.

خۆر هەڵ هاتبوو لەشەخەڵەکەدا هاتمەدەرەوە بەوریاییەوە دەوروبەرم نیگائاژن کرد، وولات چۆل و هۆڵە، پاش ماوەیەک دەنگی ئاهەنگی زرمو زرنگەی زەنگو زەنگۆڵەی جۆراوجۆر دێتە گوێم، کاتێک ئاوڕ ئەدەمەوە بەلای ڕاستدا دیمەنێکی هەرگیز لەبەر چاو وون نەبوو دێتە بەر چاوم، گەلەڕانی

ئاوایی هاوار سەرێکی گەیشتوەتە نۆمندەرە[1]و بەبەرب لاوەی و بەلەوەڕ وردەوردە ب لاوەوتر ئەبێتەوە، سەری دواوەشی لەپلەسورە، کۆساری شاعیر شوانەو لەگەڵ هاوشوانەکەیدا هاتوو هاواریانە، دوای ماوەیەک لەدیدی مندا نەمان، تالای ئێوارەیەکی درەنگ هەرلەو جێگەدا گوزەراندم، دەمەوتاریک بوون و لێڵەی هەوا هاتمە خوارەوە، کەوتمەڕێ بەرەو ئاوایی جاور.

کاتیک گەیشتمە نزیک ئاوایی جاور لەڕێگەی سەرەکی لام دا بەسەر جۆگەکەدا و بەبەرماڵەکاندا بەهێواشی و بەپسکەپسک تالە ئاست ماڵەکان تێپەڕ بووم، باحاجی حەسەنی کاکەبرا نەمبینێ پیاوێکی دڵسۆزە، بەڵام کەمێک نهێنی پارێز نییە، خەڵک نەخەوتبوون گەیشتمە ئاوای پالانیا، ئەمەوێت ئەمشەو بچمە ماڵی عومەر ئەحمەدی هاورێم، سبەینێ تائێوارەش لەوێبم، لەجێگەیەکدا لەبەردەم ماڵی فەتاح بەگدا باخچەیەک هەبوو لەو باخچەی بەردەم ماڵاندا دانیشتم تاخەڵکی خەوتن چراکان کوژانەوەو کزکران ئاوایی خامۆش بوو، ئەوجا خۆم کرد بەناو ئاواییدا، سەگەلی بەرەڵا لێم ئالان، ماڵی عومەر لەناو دۆڵەکەی مەلا عەبدوللایە ناوەڕاستی ئاواییە، لەمبەرو ئەو بەرەوە چەند چرایەکی کز لەپەنجەرەکانەوە شەوقیان دیارە، لەو پەنجەرانەوە تارمایی سەری چەن کەسێک دیارە سەیری خوارەوە ئەکەن، تابزانن ئاخۆ ئەو سەگەلە پەلاماری چی ئەدەن، هەر تارماییەک دەر ئەکەوێ من کورکە ئەکەم و جوڵە لەخۆم ئەبڕم، تائەگەمە بەردەرگای ماڵی عومەر.

ئەم ماڵە هەژارترین ماڵی ئاواییە، عومەر هەتیوە باوکی نەماوە، کوڕە گەورەی ماڵە لەگەڵ دایکی مەلیعەخان و دووبراکەی عەلی و وەلی و خوشکە چکۆلەکەیان نگین پێکەوە ئەژین[2]. دەرگاکەیان نەگرتووە، من لەدەربازەکەوە

---

[1] - نۆمندەرە چەم ودۆڵێکە ئەکەوێتە نێوان ئاوی هاواری کاکەی نشین و ئاوای بەڵخەی هەورامی نشین. ئەم دۆڵە چەند کانی و ئاوێکی لێیە و پەڵە باخێکی دارگوێز ئاودێری دەکات.

[2] لەساڵی ١٩٨٨دا مەلیعە خانی هەتیوبارو داماو نیشتمانپەروەر ئەنفالکراو برایە نوگرە سەلمانو لەوێ شەهیدیان کرد. دروودو سڵاو ئەنێرم بۆ ڕۆحی شادی. دوای ڕاپەڕینیش وەلی کوڕی بەمەبەستی پەیداکردنی چەند پارچە لەوحێک لە مۆڵگا چۆڵکراوەکانی سەربازە

چوومە ژوورەوە قاتی خوارەوە دوو گەوڕی وڵاخ و دالانێکە بەپلیکانەدا ئەچیتە سەرەوە لەوێش دووهۆدەو هەیوانێکە، دەرگای هۆدەکەی لای ڕاستم کردەوە تاریکو دیارە کەسی لێنییە بەلای چەپدا سوڕامەوە دەرگای هۆدەکەی ترم کردەوە ئەبینم لەلای دەرگاکەوە چرا فانۆسەکەیان بەکزکراوی داناوە مەلعەخان و منالەکان خەوتوون و عومەر دیار نییە لەناویاندا، کەمێک بەڕاسەریانەوە وەستام، بەخەبەر نەبوون چراکەم هەڵگرتوو هێنام و هاتمەوە دیوەکەی تر دڵنیا بووم کەسی لێنییە.

چراکەم بردەوە بۆیان و خۆم هاتمەوە لەدیوە چۆڵەکەدا دانیشتم، ئەمووت ڕەنگە عومەر لەمالان بێت ئێستە دێتەوە، هەربۆیە دەرگاکەشیان نەگرتوە، زۆر دانیشتم کەس دیار نەبوو ڕۆژ بوەوە دایکی عومەر هەستاو نەهاتە ئەم دیوو، چووە خوارەوە، لەپەنجەرەکەوە سەریم کرد بینیم وا چوو بۆ سەرکانی بۆ ئاو.

بەڵێ ئەگەر دزبوومایە سەدان ماڵم ئەبڕی بێئەوەی کەس پێم بزانێت، چوونکە لەژیانی پارتی زانیدا ئاوا سەدان جار لەشارو شارۆچکەو گوندەکاندا شەوانە چوومەتە ناوماڵان، بێئەوەی خاوەن ماڵ پێم بزانن یان بەخەبەریان بهێنم زۆر جار تەشتی نانەکەم خاڵی کردوەو شەکرو چاییم پێچاوەتەوەو کردوەتەکۆڵ و ڕۆیشتووم و بەجێم هێشتوون.

مەلیعەخان کەلەکانی گەڕایەوە هاتمە هەیوانەکە لەپلەکانەکاندا ئەهاتە سەرەوە بۆئەوەی نەترسێ بانگم کرد دادە مەلیعە، ووتی بەڵێ ئەوە کێی؟ ووتم منم حەمە، هاتە سەرەوە چاکوچۆنی لەگەڵ کردم و وای ئەزانی ئێستا هاتووم ووتی ئەوە کەس نەیبینیوی؟ ووتم نا. هەواڵی عومەرم پرسی ووتی دوێنێ چووە بۆ سۆسەکان بۆماڵی ئەختەری پووری ئەمشەو نەهاتوەتەوە، بەدەست وبرد نان و چایی ئامادە کردو لەسینییەکا هێنای بۆم ئەوکات لەلادێکاندا کەم ماڵ سفرەی هەبوو هەر لەسینی وتەپکەدا نان دائەنرا، پریاسکەکەی(تۆشەبەرەکە) خۆیشم کردەوە بەشێک لەنان و ڕۆنەکەی تیا مابوو لەسەر سینییەکە دامنا، من نان و چایەکەی ئەوانم خوارد، ڕۆنەکەم

---

عێراقییەکاندا بهێنێت تا لە ئاوایی پالانیا سەرپەنایەک دروست بکات، بەلام ئەڵغام ئەویشی شەهید کرد

دەست لێنەدا ووتم بامناڵەکانی ئەوان بیخۆن. لەوێ مامەوە لای نیوەڕۆ عومەر هاتەوە زۆری پێخۆش بوو من چووبوومە ماڵیان، لەدایکی پرسی چیت لێناوە؟ ووتی: ساوەر ئەیویست بچێت لەناو ئاوای مریشک بکرێت نەمهێشت.

ئەو ڕۆژەو شەوەکەشی تادرەنگ مامەوە، نیوەشەو لەماڵەکەدا هاتمە دەرو دەرچووم بەرەو دۆڵبیان، ئەوماوە جاش گەل زوو زوو بەشەودا ئەهاتن لەدەوری دۆڵبیاندا بۆسەیان دائەنا، بەناوباخەکاندا بەلەسەرە خۆیی بەسەر چۆگەکەدا چوومە بەردەم ماڵەکان، ئەمشەو مانگەشەوە لەدورەوە زەلام بەدی ئەکرێت، بەڵام جارجار پەڵە هەورێک بەری مانگی ئەگرت و دنیا تاریک ئەبوو، لەپەنایەکەوە دانیشتبووم سەیری دەوری ئاواییم ئەکرد کاتێکم زانی کەسێک کەوتە بەرچاووم لەنزیک ماڵی خۆماندا لە پەنایەکەوە وەستاوە، ئاسایی نییە خۆی مەلاس داوە چاودێری ئەورێگا ئەکات کەلەئاوایی سۆسەکانەوە دێت بۆ دۆڵبیان، منیش بەتاقەت بەدیاریەوە دانیشتووم، دوای ماوەیەک چەند کەسی تر دەرکەوتن و هاتن بۆلای ئەم، یەک یەک بەبەر دەم ماڵەکاندا بەرەو خوار ڕۆیشتن دڵنیا بووم چەکدارن منیش گەڕامەوە بەرەوخوار بۆسەر چەم، کردمە ئەوبەرەوە چوومە بەرامبەر ماڵەکانی ئاوایی لەناو دەوەنێکدا لەناو ڕەزە دێمەکەی مەلاعەبدلحامددا جێگەم چاککردو مامەوە، لێی خەووتم، بەیانی ڕۆژ بوەوە سەیری ماڵەکانم ئەکرد هەرکەسەو بەلایەکدا سەرقاڵی کارێک بوون، دۆڵبیان ئێستا سێ ماڵە، ماڵی خۆمان ومامە حاجی و مامە ڕەشە، باپیرم ئەلی محەمەد کۆچی دوایی کردووەو نەنکم لای ماڵی مامە ڕەشەمە. ماڵی خۆشمان لەتەوێڵە بووەو دوای چوونە دەرەوەی من هاتوونەتەوە بۆ دۆڵبیان.

بێتاقەت بووم لەدەوەنەکەدا برسیشم بوو، لەدەوروبەری نیوەڕۆدا، هەستام هاتمە دەرەوە خۆم کرد بەناو باخەکانداو لە چەم پەڕیمەوە سەرکەوتم دووبارە بۆ ئەو شوێنەی شەو لێی دانیشتبووم لەوێ مامەوە، کانی ماڵەکان سەدمەتر لەماڵەکانەوە دوورە، وەختێکم زانی دایکم سەتڵێکی بەدەستەوەیەو ئەچێت بۆئاو، لەنیوەی ڕێگەکەدا بوو، بانگم کرد ئاوڕی دایەوە کەس نییە دووبارە بانگم کردەوە سەیری خوارەوەی کرد کەمنی بینی لەباخەکەدا، گەڕایەوەو سەتڵەکەی داناو هاتەخوارەوە بۆلام، بێدەنگ دەستیکردە ملم و

ووتی ئەوە لەکوێ بووی؟ ووتم هاتووم بۆ ئەمناوە ئەڕۆمە ناو باخە بەهێکان نانم بۆ بێنەو وەرە بۆ ئەوێ، جارێ باکەس نەزانێ، دەستی گرتوم و بەرم نادا ئەبینم دایکم ڕەنگی گۆڕاوەو ئەلەرزێ، دوای کەمێک دەستی بەردام و سەرکەوتەوە بەرەو ماڵ و منیش خۆم کرد بەناو باخەبەهێ چڕەکەدا و لەوێ دانیشتم.

ئەوەندەی نەبرد دایکم هاتەوە نانوچایی بۆ هێنابووم، ووتی بۆ بەتەنیای؟ خۆ ئەحمەد گریانەی و سدیق و حەبیب وئەحمەد پەتلە ئەمشەو لێرە بوون لەماڵی خۆمان نانیان خواردو ڕۆیشتن، هەواڵی تۆمان پرسیوە کاک ئەحمەد ووتی ناردوومە بۆ شوێنێکی تر، لە سۆسەکان بووی؟ ڕۆڵە بەتەنیا مەڕۆ بەملاو بەولادا، ووتم نامەترسە.

بۆم دەرکەوت ئەوانەی شەو من بەجاشم زانیون لەلای ماڵەکاندا، ئەوان بوون هاوڕێکانی خۆم، بەدوای مندا هاتوون، کەزانیویانە ئەمان بێئاگان و من نەهاتووم بۆ ئەم ناوە ئیتر قسەیان نەکردووە نەوەک دایکم بترسێ، ئەو ڕۆژە لەوێ مامەوە، چەند خەیاڵ هاتن بەسەرمداو کەوتمە بیر کردنەوە، بڕۆم لەجێگەیەکدا کەمین دابنێم و سەربازێک بکوژم بەڵکو چەکەکەیم دەست کەوێت بەدەست کەوتەوە بڕۆمەوە بۆلای کاک ئەحمەد، نا واباشە بەیانییەک زوو بچم لەسەرجادەی نێوان تەوێڵەو بیارەدا سەیتەرە دابنێم بەڵکو یەکێک لە ئەمنە عەرەبەکان بگرم یان بکوژم چونکە هەموویان ئەناسم و ئەزانم بەسەیارەی مەدەنی هاتووچۆ ئەکەن، نەخێر واباشترە ئەم ماوە بچمە دەورو بەری ئاوێسەرو چیاکانی پشتەوە هەم کاک ئەحمەدو ئەوان ناتوانن بێن بۆ ئەوناوە، هەم ئەتوانم لەئاواییەکانی تەوێڵەو سۆسەکان و بەڵخەدا پەیوەندی بکەم بەهاوڕێکانیی خوێندنگاکەمەوە چەند کەسیان بینە پێشمەرگەو خۆم مەفرەزەی سەربەخۆ دروست بکەم و دەست بکەم بەچالاکی کردن......... تاد.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە بەرلەوەی هەوا تاریک بکات خواحافیزیم لەدایکم کردو بەرەو ئاوایی پالانیا گەڕامەوە، بەنییەتی ئەوە عومەرئەحمەدی هاوڕێم ڕازی بکەم ببێتە پێشمەرگە چونکە سەربازی لەسەر بوو پەیوەندی نەکردبوو، ساڵێک پێشتر واتە بەهاری ١٩٧٧ هێرشێک کرا بۆ ناوچەکانی هەورامان، لەگەڵ ئەو هێرشەدا شەوێک فەوجێک سەرباز هاتبوون گەمارۆی ئاوایی پالانیایان دابوو بەیانی عومەریان گرتبوو بردبوویان بۆ بەڵخە، لەوکاتەدا

حاجی ئەولەی نەسە لەتەویلەوە دیت بچیت بۆ سلیمانی ئەویش ئەگرنو لەگەل عومەردا سواری کوپتەریان ئەکەن، ئەو چەن رۆژە لەگەل خۆیان گێرایانن، بردنیاننە شاخی هەوارە بەرزە دواتر بۆچیای رەنگین بەسواری کوپتەر، بەحاجیان وتبوو ستاری سەعید خەلەف خوشکەزاتە بیدۆزەرەوە تۆ شوێنی ئەزانی پێمان بلێ .

با بێمەوە سەر باسەکەی خۆم، بەرلەوەی بچمە مالی عومەر چوومە مالی حەمەسەعیدی قالە دۆستی یەکێتیی و کۆنە جەلالی بوو، کاک حەمەسەعید پرسی ئەوە بۆ بەتەنیای ئەمویست بلێم ئیشم هەبوە بەکارێکی تایبەت لەم ناوەم، ووتی ناعاجز بوویت ئەحمەد بەدواتا ئەگەرێ هاتووە بۆلام زۆر دلگران بوو بۆت تۆ چۆن شتی وائەکەیت؟ زۆر قسەی بۆکردم و ووتی ئەحمەد ووتویەتی لەم سنوورەدا دلم بەو خۆش بووە، بەلکو بیدۆزیتەوە بینێریتەوە بۆلام، لەدلا بەلێنم دابگەرێمەوە بۆ لای کاک ئەحمەد، بەلێنم دا بەکاک حەمەسەعیدی قالەی مەجنون، ووتی دلنیابم ئەرۆیتەوە؟ ووتم بەلێ، ووتی دەی لێرەبە ئەحمەد هاتبوو بەدواتا ئەیزانی لەم ناوەیت گەراوەتەوە بەلام سدیق گریانەیی و ئەحمەد پەتلەی بەجێهێشتوە لە شوێنێکن ئێستا ئەچم بەدوایانا بابێن لێرە نان بخۆن و پێکەوە بگەرێنەوە، منیش رازی بووم، ووتم تۆ مەرۆ لەکوێن من ئەچم بۆلای ئەوان؟ ووتی نا خۆی رۆیشت لەخانە باخەکەی مالی فەتاح بەگدا بوون هێنانی و هاتەوە دەستمان کردە ملی یەکتر سدیق منی زۆر خۆش ئەویست ووتی بۆ واتپێکردین؟ ووتم چیم کردووە؟ ووتی وەلا هیچ. دوای نان خواردن کەوتینە رێوگەراینەوە، ئەوشەوە تابەیانی بەرێوەوە بووین گەیشتینە ئاوایی گریانەو رۆژ بوەوە ووتیان ئەحمەدو جەماعەت لەئەشکەوتەکانی خوار ئاواییەوەن، سدیق ووتی بابچین بۆمالی خۆمان نانوچایی بخۆین و برۆین بۆ لای جەماعەت، ووتم من نایەم ئێوە برۆن، ئەیچی ئەکەی بۆ کوێ ئەرۆی قیادە واحیدە؟ ووتم ئەچم بۆ مالی خالۆ کەریم، باوکی کاک ئەحمەد، پیاوێکی ریش سپی و بەرێز بوو، سدیق ووتی بروانە چەزۆر زانە بەخوا بچیتە مالی مام جەلالیش عەلی شامار هەر تێت هەل ئەدا، ووتم وەلا ناتوانێ، شامار رابەر سیاسیمان بوو.

لەپردەکەی ناو ئاوای کردمە ئەوبەرەوە، خالۆ کەریم لەسەر بانەکەی مالی خۆیان وەستابوو گاچۆنێکی بەدەستەوە بوو چەناگەی خستبوە سەر

چەماوی گاچۆنەکە، منی بینی بانگی کردم وەرە بۆ ئێرە ووتم بۆئەوێ دێم، گەشتمە لای و دەستی هێنا تەوقەم لەگەڵدا بکا دەستیم ماچ کرد، بردمیە ژوورەوە نانوچا ئامادە بوو نانم خوارد، ووتی ئەحمەد عاجزبووە لێت؟ ووتم نا، هیچ نەبووە، غەریبی کوڕی نارد ووتی بڕۆ بەکاکەت بڵێ حەمە هاتووەتەوە بائەو بێت بۆ ئێرە.

پاش نیو کاتژمێر کاک ئەحمەد هات ئێمە هاتبووینە دەرەوە لەسەربانەکەدا وەستابووین، کاک ئەحمەد منیبینی لەدوورەوە دەستیکرد بەپێکەنین، نزیک بوەوە چووم بەپیریەوە ئەملاوئەولام ماچ کرد. ووتی لەمن عاجزبووی ووتم پێم ناخۆش بوو کەسێکی تر خەتای کردبوو تۆ لەمن تووڕە بووی، ووتی تووەک عەزیز تەماشا ئەکەم.......تاد،


ئەشکەوتی لای باخی حاجی حەمەڕیشە ئەشکەوتی چەتان

عەزیز برای کاک ئەحمەدە، دەروێش کەریم ووتی هیچ نییە قەیناکا ئەحمەد حەمەمناڵە بەسنییە تووشی شتێک نەبووە، بەڵام بەخوا ڕۆڵە خەفەتی زۆرت داینێ، هەستاین و کەوتینە ڕێ خاڵۆ کەریم بانگی کرد بەدوای کاک ئەحمەدا ووتی ئەحمەد هیچ بەوکورە نەڵێێ، ئەویش ووتی ناتازە چیبڵێین.

گەیشتینە ئەشکەوتی چەتان لای باخی حاجی حەمەڕیشە، جەماعەت چاییان لێنابوو گیای بەهار تازەژنێ هاتووە هەموو دڵخۆش بوون و بەخێر هاتنەوەیان کردم، عەلی شامارو مامۆستا پشکۆ لەولاو بەجیا لەئەشکەوتێکی تردا دانیشتبوون سدیق و ئەحمەد پەتڵەیان داناوە و قسەیان لەگەڵ ئەکەن، دیارە ئەپرسن چۆن دۆزیتانەوە؟ لەکوێ بووە؟ چۆن هاتەوە؟ کاک ئەحمەدیش چوو بۆ لایان، من تاقم و تفەنگەکەم کردووەتەوە کلاشینکۆفەکەم پاڵ داوە بەبن زەردەکەوە، دوای ماوەیەک بانگیان کردم بەبێچەک چووم بۆ لایان لەگەڵ ئەوانیش چاکی چۆنیمان کردو عەلی شامار دەستیکرد بە ئامۆژگاری من و ووتی: چۆن شتی وا ئەکەیت بەبێ پرس ئەڕۆیت ئەوە چوار ڕۆژە ئێمە هەموو شەوڕۆژ ئامادە باشین...... تاد.

کاک ئەحمەدیش ووتی ئەبێ ڕەخنە لەخۆت بگریت لەکۆبوونەوەدا، ئێستا کۆبوونەوە ئەکەین، وە دوو حەفتەش چەک بکرێیت، منیش ووتم بادوو حەفتەکە چەک بکرێم بەڵام ڕەخنە لەخۆم ناگرم، دووبارە دەستیان بەقسەکردن وئامۆژگاری کردەوە ووتیان ئەگەر لەتۆ نەپرسینەوە ئەوە ئەبێتە سەرمەشق بۆئەوانیتر، دواتر هەرکەس مخالەفەی کرد ناتوانین ئیجرائاتی لەگەڵدا بکەین، من هەرئینکاریم کرد ووتم یەک ئیجرائاتیان قبووڵ ئەکەم، ئەوان تووڕە بوون منیش سەیری دەموچاوی کاک ئەحمەدم کرد تێگەشتم دڵی ئەوان ناشکێنێ بۆمن، ئەوان مەسئولن و من پێشمەرگەیەکی سادەو منالیش و مخالەفەشم کردووە، کاک ئەحمەد ووتی هەستن بابچین بۆ کۆبوونەوەکە دەی حەمە قەیناکا چەککردنەکە یەک حەفتەو ڕەخنەکەش لەخۆت بگرە، وەڵامم نەدایەوە و هەستاین هاتینەلای جەماعەت ووتیان کۆبوونەوەیە شامارو گریانەی قسەیان کرد بەگشتی لەسەر ئیلتزام و ئیجرائاتوو مخالەفەو یاساو ڕێسای پێشمەرگایەتی و پارتیزانی، دواجار ئەحمەد گریانەی ووتی بڕیارمان داوە حەمە لەسەر ئەوە بێپرس ڕۆیشتووە ڕەخنە لەخۆی بگرێ وچەند ڕۆژێکیش بێچەک بێت، ئادەی حەمە هەستە سەر پێ، هەستام ووتم بەمەرجێ ڕەخنە لەخۆم ئەگرم مۆڵەتم بدەن هەندێک قسە بکەم، ووتیان بەسەر چاو فەرموو ووتم من هەڵەم نەکردووە عاجز بووم و ڕۆیشتووم ونەمزانیوە هەڵەیە خۆم هاتوومەتەوە ئەمجارە بمبەخشن جارێکیتر کاری واناکەم، کاک ئەحمەد ووتی ئێ تەواو ئافەرم ئەوە باشترین شێوەی ڕەخنە لەخۆگرتنە. ووتیان ماوە چەکەکەت دابنێیت ووتم ئەوەتا لەویا دانراوە، شامارو پشکۆ ووتیان نا، هەستە تاقمەکە ببەستەو ئینجا بیکەرەوە، کاک ئەحمەد ووتی نا تەواو زانی بیانوی زیادە ئەگرن تووڕە بوو، ووتی مامۆستا پشکۆ ئەو تفەگەی لای تۆ ئەبێت تاماوەکەی تەواو ئەبێت، م- پشکۆ برنەوی درێژی پێبوو دایان بەکەسێکیترو کلاشینکۆفەکەی منی کردە شان، چەند ڕۆژێک زۆرم پێناخۆش بوو هەستم بەنوقسانی ئەکرد ئیتر ڕاهاتم لەگەڵ بارودۆخەکەدا.

# تەمەنی پێشمەرگایەتییەکەی
# تەنها دوو ڕۆژ بوو

لەبەهاری ساڵی ۱۹۷۸دا مەفرەزەکەی ئێمە (هەورامان) لەدەوروبەری گریانە بوو، جاروبار مەفرەزەکانی شنروێ و باڵامبۆش دەهاتنە لامان و پێکەوە جەولەمان دەکرد. کارەساتی هەکاری قەومابوو، ئێمە لێی ئاگادار نەبووین بۆیە قیادەی موەقەتە ئەوانەی کەلەئاواییەکانی دزلی، کێمنە، بێرواس بوون لە دیوی ئێران لەهەلێک دەگەڕان بۆ لێدانی ئێمە، لەم سەروبەندەدا شەهید شەوکەتی حاجی موشیرو مەفرەزەیەک بەڕێکەوت هاتنە هەورامان و لە ئاوایی گریانە یەکمان گرتەوە، ئەوڕۆژە ئەوان گەشتنە لامان ولاخدارەکانی گریانە لە تەوێڵەوە گەڕانەوە ئاگاداریان کردین ووتیان جەماعەتی قیادە موەقەتە لە سەر چیای ئاوەزنێن[1]، هەواڵی ئێوەیان پرسیووە، ئێمەش پێکەوە لەگەڵ مەفرەزەکەی کاک شەوکەت چووین بۆ ئاوایی بۆین، ئەم ئاواییە دەکەوێتە ۲۷ کیلۆمەتری ڕۆژهەڵاتی هەڵەبجەوە، لەنێوان چەند لووتکە و شاخێکی سەختدا هەڵکەوتووە، لە لای خۆرهەلاتییەوە شاخی سەختی داڵاڕی و لای باکووری چیای شنرویێە و لای باشور و خۆرئاواشی ئاوایی سازان و ڕوباری سیروانە. لەسەرەتای شۆڕشەوە تا ڕاگواستنی ئاواییەکان، دوژمن مەبەستم سوپاو جاشی عێراقە، نەهاتبویە ئەم ئاواییە، بۆیە زۆجار لەوێ دەماینەوە، لەم ئاواییەدا حەمەی حاجی ئەحمەدی تازەدێ لەگەڵ کاک شەوکەتدا بوو خۆی لەمن نزیک کردمەوە، تاقمی چەرمی گلاسی کلاشینکۆف ئەوکاتە دەگمەن بوو، لێی سەندم و بە فەرویەک ئاڵوگۆڕمان کرد.

ئەو مەفرەزەی کە لەگەڵ کاک شەوکەت هاتبوون بریتی بوون لە یونس شەکرالی- شەهید هاوار، حەمەی حاجی ئەحمەد، عەبدولکەریم تەپی

---

[1] - ئاوەزنێ ئەو شاخە بەرزەیە، کە ئەکەوێتە نێوان ئاوایی شێخانی سەر بە خۆرهەلاتی کوردستان و ئاوایی دەرەتفێی سەر بە باشوور و خاڵێکی سنووری بوو کەوتبووە خۆرهەلاتی هەڵەبجە. ڕێگەی وولاخە ڕێیەکە لە تەوێڵەوە بۆ گریانە هاتووچۆکەران بەسەر ئەم چیایەدا گوزەر دەکەن.

سەفایی، ئەنوەر تەپی سەفایی، مامەڕەشەی ئەحمەد ئاوایی و چەند پێشمەرگەیەکی تر. بەداخەوە ئێستا ناوەکانیانم لەیاد نەماوە.

هەردوو مەفرەزەکەی شنروێ و باڵامبۆش هاتن و لێرە لە بۆین لە ڕۆژی ١٩٧٨/٤/٨یەکمان گرتەوە، چووین بەرەو شەمێران و تاوگۆزێ، هەر لەئاوایی بۆین دەرچووین، لە ئاوایی ڕێشاو کەسێک بەناوی بورهان هاتە لامان بۆ ئەوەی ببێتە پێشمەرگە، پێیان ووت: چەکمان نییە، ووتی: خۆم چەکم هەیە، ناردیان بچێت چەکەکەی بێنێت و شەو خۆی بگەیەنێتە ئاوایی کۆساوا، ئێمەش لەڕێگای ملەپانکەوە تاریکی کرد چووینە کۆساوا، دابەش بووین بۆ نان خواردن. من و حیکمەت لە کەوانەی ئاوایی کەوتینە ماڵی سەیدجافر باوکی شەهید رەفعەت ئێناخی. ئەمشەو شتێکی سەرنجراکێش روویدا، کاک ئەحمەد گریانەیی ووتی: تۆو حیکمەت لەپەڕی ئاوایین، یەکێکتان حەرەس بێت تائەوتان نان بخوات و دواتر ئەویشتان حەرەس بێت، حیکمەت حەرەس بوو، من لەژورەوە بووم.

ئەو بورهانەی ناومان برد، شەو لەڕێشاوەوە هات و حیکمەت تێی خوڕی و فیشەکی بردبووە پێشەوە تفەنگەکەی سەمینۆف بوو، بورهان هات و چووە ناو ئاوایی، حیکمەت لەبیری چوو بوو فیشەکی لێخوڕیوە، کچی خاوەن ماڵەکە ناوی شەرافەت بوو چوو بوو پاکەتە جگەرە بکڕێ لەماڵێکی تر بۆ حیکمەت، کاتێک گەڕایەوە لە نزیک ماڵەکەی خۆیاندا بوو حیکمەت فیشەکێکی لەدەست دەرچوو، بەرامبەر ئاواییەکەش ڕەبایەی سەربازی لێبوو، من پرسیم لەکچەکە نەترسای ووتی نەخێر، چونکە زانیم فیشەک لەدەست ئەو پێشمەرگە دەرچووە، ئێمە هەردووکمان بێخەم دانیشتین نانی خۆمان خوارد بێ ئەوەی کەسمان لەدەرەوە بێت، دوای ماوەیەک هەستاین، ئاگامان لێ نییە هەموو پێشمەرگەکان لەئاوایی دەرچوون، حەمەی حاجی ئەحمەدیش پێش هەندێکیان کەوتووەو بەرەو بۆین گەڕاونەتەوە.

من و حیکمەت کاتێک زانیمان چیمان قەوماندوە، بەفیکەو بانگکردن چەند پێشمەرگەیەکمان لەپشتی ئاوایی دۆزییەوە، پرسیمان چییە؟ ووتیان کەمینی دوژمن لەکەوانەی ئاوایدایە و جەماعەت هەموویان ڕۆیشتوون ئێوە لەکوێ بوون؟ ئێمەش کەمێکی تر ڕۆشتین کاک ئەحمەد و کاک شەوکەتمان دۆزییەوە، ووتیان: دەبێ بگەڕێینەوە چونکە کەمینمان بۆ دانراوە و ناتوانین لە

سازان بپەڕینەوە، ئەی ئێوە گوێتان لەتەقەی فیشەکە نەبوو لەکوێ بوون؟ حیکمەت دەیویست ڕووداوەکە بشارێتەوە، بەڵام من کاک ئەحمەدم بردە لاوە و پێم ووت: ئەو فیشەکەی تەقی لەدەستی ئێمە دەرچوو. کاک ئەحمەد کاک شەوکەتی بانگ کردە لاوە پێی ووت، ئیتر پێشمەرگە هەموو کۆکرانەوەو ناردیان لەولاتر حەمەو چەند کەسیتریان دۆزییەوە، سەرژمێریان کردین، دووبارە گەڕاینەوە و بەپەنا ئاوییدا کردمانە ئەو بەرەوەو، بەدەشتی سازاندا ڕۆیشتین، لەنزیک ئاوایی سازانەوە سەرکەوتینە سەرشاخەکەی نێوان سازان وچنار داگەڕاینە خوارەوە، کات نزیکەی کاتژمێر (٣)ی شەو بوو، لەجێگەیەکدا پشومادا من جامەدانیەکەم لەملما بوو ک لاوەکەم بەسەرمەوە بوو، لەبندار قەزوانێکی گەورەدا پاڵم دابووەوە، کاتێک وتیان هەستن ک لاوەکەم کەوتبوو نەم زانی بوو، چووینە ناو ئاوایی چناری کۆکۆیی، بەناو ئاواییەکەدا بەرەو مۆردین بەڕێکەوتین، ووتیان با ئەم ئاواییە پێمان نەزانن چونکە دوژمن دارن، دیارە من ئاگاداری وردەکاری شەهید کردنەکەی مستەفا کۆکۆیی و براو باوکی نەبووم، دواتر زانیم کەئەوانە چۆن کوژراون و کوشتنەکەشیان خراوەتە ئەستۆی مۆردینییەکان[1].

---

[1] – بەر لەوەی من بچمە دەرەوە مستەفا کۆکۆییو براو باوکی قاچاخ بوون و ماڵ و منداڵەکانیشیان لەگەڵدا بوون، ئەمانە خەڵکی گوندی چنار بوون، لەپشت چیای بالانبۆ، بەڵام لەبەر ئەوە دەستی بەعسیان نەگاتێ چووبوونە سەر سیروان لەبەر دەم ئاوایی چناردا لەشوێنێکی عاسی و چەپەکدا بەناوی چەمی کەوچێز ئەیان گوزەراند. لە پێکهاتەی ئەو پێنج مەفرەزەیەی هەڵەبجەو دەوروبەری و شارەزوورو هەوراماندا، مستەفاش یەکێک بوو لە ئامر مەفرەزەکان، واتە ئەحمەد گریانەیی، غەفوور دەرەشیشی، فەرەج تریفەیی، مستەفا کۆکۆیی وعومەری حەمەساڵح، بەڵام لەکاتی پشکنینی گشتی و فشاری زۆری سوپای عێراقدا لەساڵی ١٩٧٧دا مستەفا وازی لە ئامر مەفرەزەیی هێناو چوو بەدەم ماڵ ومنداڵ و کەسوکارەکەیەوە، لەمەفرەزەکەشی ئەمینی محێ دین، عنایەت کۆساوای، ڕەحیمی حەمەتەقی تەسلیم ئەبنەوە، دوای ماوەیەک بەشێوەیەکی تەمومژاوی مستەفا و مامە عەبدڵڵای باوکی و نوری برایشی لەڕۆخی ئاوی سیرواندا لەبەر دەم باخەکانی دەوەرەدا لە کەورگی ئەشکەوتی بلۆکێ دا لەمانگی ١٩٧٧/٦دا شەهید کران. عومەریش بەخۆی و مەفرەزەکەیەوە هەموویان شەهید کران. شەهید کردنی عومەری حەمەساڵحو مەفرەزەکەی ئاشکراو لەشوێنی خۆیدا باسم کردوە، بەڵام تامەزرۆ بووم بزانم مستەفاو باوک و براکەی چۆن چۆنی ولەسەر چی بەوشێوە نامەردانە شەهید کراون؟ تاماوەیەکی

بەیانی زوو لەبەردەم ئاوایی مۆردیندا لە ناو داربەڕووەکاندا ماینەوە، چەند پیاوێک نانوچاو ماستیان بۆ هێناین، دواتر بەرەو تەوەنەوەل بەڕێکەوتین، لەوێ دەرچوین و لەئاوی دەریاچەی دەربەندی خان پەڕینەوەو گەشتینە ئاوایی لاورانی ئەوبەری سیروان، لەو ناوچەیەدا مەفرەزەیەکی ترمان هەبوو کە مەلاعەلی زمناکۆ فەرماندەیان بوو، پێشمەرگەکانیش ئەمانەبوون مام عەبدولڕەحمان، سۆفی، مەلا بارام، ئاغەی حاجی مەحمود و چەند پێشمەرگەی تر، ئەم ناوچەیە چەپەک و دوورە لەدەستی ڕژێم، بۆیە بەئاسانی بەناو ئاواییەکاندا دەگەڕاین، من بۆخۆم زۆر پێم خۆش بوو کەلەم جەولەیەدا لەئاوایی سەرشاتە بەدیداری سەید عەبدولڕەحمان شاد بووم، کە پیاوێکی بە ویقار و سیمادار و پیاوماقوڵێکی نەوەی شاعیری گەورەی گەلەکەمان مەولەوییە. من خۆم پێناساندو پێم ووت: خاڵە سەید من هەورامیم، پێم وابوو مادام مەولەوی هۆنراوەکانی بەشێوەزاری هەورامی هۆنیوەتەوە هەورامی بووە، ئەو ڕێزی خۆی لێگرتم، لەوکاتەوە بوو بەناسیاوم، هەرکات ئەچووینە ناوچەی تاوگۆزی سەردانم ئەکرد، ئاواییەکان داگیران تاوگۆزییەکان لە کۆمەڵگەی زەڕایەن نیشتەجێکران، دوای ڕاپەڕین بەدیداری خاڵە سەید شاد بوومەوە، تەمەنێکی پڕبەرەکەتی کرد، تا مام

---

زۆر بەدوای ئەم وەلامەدا گەڕام، لەگەڵ ئەمەشدا شێخ عەلی کەشکۆڵ و عەلی شامار چووبوونە سەر مۆردینیەکان و کۆیان کردبوونەوە وهەڕەشەیان لێکردبوون، شێخ وتبووی: ئێوە کوشتووتانن تا دوو ساڵی تریش دەرکەوێ ئێوە بوون و ٣ پیاوتان لێ ئەکوژین، پیاوەکانیشی دیاری کردبوون حاجی مەجید، مەلا کەریم، خاڵۆ حسێن.

ئاوایی مۆردین دراوسێێ ئاوایی چنارە. دواتر بۆم دەرکەوت کۆکۆییەکانی خزمی مستەفاو ئەوان، خۆیان و ئەوانەی لەشار بوون و ڕێکخستن بوون ڕاپۆرتیان داوە بە دەرەوە، گوایا مستەفا پەیوەندی بەڕژێمەوە کردوەو کەسێکی بینیووە بەناوی نوری تەنیا. حسێنی مەجیدی مەلا حامیدیش یەکێک بوو لەو پێشمەرگانەی لەگەڵ شێخ عەلیدا چووبوونە سەر مۆردینیەکان خۆیشی کۆکۆیی بوو. دواتر بەهۆی هاوڕێیەکییەوە زانیبووی خزمەکانی خۆیان هۆکاری شەهید کردنەکەیان بوون و برادەرەکانی خۆمان شەهیدیان کردوون، نەک مۆردینیەکان، بۆیە ئەوەندە لەخزمەکانیان دلگران بوو لەمەڤاڵەکانی دلگران نەبوو. دوای شەهید کردنی مستەفاو ئەوان، حکومەت هەرلێی ئەگرتن و ئازاری کەسوکارەکەیانی ئەدا. بۆ نموونە ئیسماعیلی مەلا حەمە کەریمی گرتوو لە سێدارەیاندا.

جەلالیش بوو بەسەرۆک کۆمار هەرمابوو، ئەیووت: زۆر حەزم کرد بینیم و بیستم مام جەلال چووە شوێنەکەی سەدام حسێن، ئەوزاڵمە ئەیوت هەموو کورد ئەبەخشم حگە لە جەلال تاڵەبانی.

دواجار سەردانم کرد نەخۆش بوو لەماڵەوە کەوتبوو دەوروبەرەکەی هەڵیان ساندەوە، ووتی ئەوە کێیە؟ ووتیان حەمەی حەمەسەعیدە. دوای چاکوچۆنی و مەعریفەتێکی زۆر کەمێک بێدەنگ بوو، ئینجا ئەم کۆپلە هۆنراوەی باپیری ووتەوە،

پوس کوس گوش نم کێشان کەم کەم    ئیسەرو ئۆسەرەن دووربینەکەی چەم .

واتە: هەم گوێم گران بووەو هەم چاویشم کز، ئەوەیە کە پێستی تەپڵ شێ بکێشی چەند لێیدەی دەنگی نایەت. مەولەوی ئەمەی شوبهاندووە بەپەردەی گوێ، دووربینیش کاتێک ئەمسەرو ئەوسەر تەماشای شوێنی پێبکەی شوێنەکە دوور ئەخاتەوە، ئەمیشی شوبهاندووە بەچاوی.

هەر ئاواییەکی ئەم کوردستانە چیرۆکێکی تایبەت بەخۆی هەیە، باسی ئاوایی کۆساوام کرد، ئەم ئاواییە ئەدمۆنز لەکتێبەکەیدا (کورد و تورک و عەرەب) نووسیویەتی: بەشێک لە خەڵکی ئاوایی کۆساوا بەبنەچە هەورامی و لەناوچەی هەورامان و لە ئاوایی تەشارەوە هاتون، ۷۰ساڵ بەر لە ئێستە لەسەر دوژمنابەتی هەڵهاتوون و لەم ئاواییەدا گیرساونەتەوە. ئەدمۆنز ئەمگێڕانەوەی لەساڵی۱۹۲۲دا نووسیوە، لەهەڵەبجەوە بەگەشتێک بەسازان و کۆساوا و بۆیندا تێپەڕ بووەو لەوێشەوە بۆ هاوارەکۆن و هاوار و دەرەتفێ، ویستویەتی لەوێوە بچێت بۆبینینی پردیوەر و مەزاری سلتانی ساق، بەلام لەملەی گاکوژەوە تەماشای کردوەو مەرزی عێراق و ئێرانی نەبەزاندووە و لەوێوە گەڕاوەتەوە بۆ تەوێڵە.

چیرۆکێکی تری ئەم ئاواییە لەساڵی ۱۹۷۷ دەبێت، کە مەفرەزەکەی هەورامان دوو سەرباز لە کانی قەمان دەکوژن لە چیای شنروێ، خەڵکی ئەم ئاواییە و بۆینیش بۆ هاوینە خۆری هەرتەو رۆژە کۆچ ئەکەن بۆ هەوارەکانی چیای شنروێ. دوژمن لەتۆڵەی ئەو دوو سەربازەدا، سوپا دەنێرێتە سەریان و لە ئاسمانیشەوە بە کۆپتەر تێیان بەردەبن و لەگەڵ ئازار و ئەشکەنجە داندا، چەندین خەڵکیشیان لێ شەهید وبریندار دەکەن و دەگرن، لەوانە

پیاوێکی ناودارو نانبدەی خاوەن سفرە و خوان بەناوی حاجی عوسمانی کۆساوایی پلەی شەهیدی پێ دەبرێت.

بەڵێ لەم سەفەرەدا چووینە ئاوایی پشت قەڵای شەمێران، ئاواییەکە بەناوی وێرانەی قەڵایەکی سەردەمی خۆیەوە ناونراوە ئێستاش وێرانەی ئەو قەڵا ماوەو یەکێکە لەشوێنەوارە دێرینەکان، لەم سنوورەدا مەفرەزەیەکی چەکدار هەبوون، یاروەیس ناوێک فەرماندەیان بوو، دواتر دەرکەوت بەناوی قیادە موەقەتەوە قسە ئەکەن، چواریان پەیوەندیان کرد پێمانەوە کەبریتی بوون لە عەلی حسەین- برای شەهید ئەحمەدی حسەینی شەمێرانی، والی ئەبوشوارب کەدواتر بوو بەچەکداری رژێمو هەردوو چاوی لەدەستدا، لەگەڵ مەلوود شەمێرانی کوڕێکی بەڕێز و خۆشەویست بوو خەڵکی ئاوایی دڵفی شەمێران بوو، حسەین شەمێرانیش کە هەر خەڵکی ئەو ناوچە بوو. هەمان رۆژ پێشمەرگەیەک پەیوەندی پێوەکردین بەناوی عەزیز عەلی مەجید خەڵکی ئاوایی زەمەقی نزیک شاری هەڵەبجە بوو. ئەمانە لەسەر بەرزاییەکەی پشتی ئاوایی سەرشاتە کۆبوونەوەیەکیان پێکراو سەبارەت بە یەکێتیی و بەرنامەی شۆڕش قسەو باسیان بۆ کرا، دوای کۆبوونەوەکە بڕیار درا ئێمە بگەڕێینەوە سنوری هەورامان و کاک شەوکەتیش بەرەو شارەزوور، پاشان ئەو چوار پێشمەرگەی کە پەیوەندیان پێوە کردین بەم شێوەیە دابەش کران، مەولوود بۆ مەفرەزەی هەورامان، والی بۆ مەفرەزەی بالامبۆ، عەلی حسەین بۆ مەفرەزەی شنروێ. حسەین لەگەڵ دەستەکەی کاک شەوکەت دانرا لەگەڵ عەزیز زەمەقیدا، کەهەر ئەو رۆژە پەیوەندی پێوە کردبووین، ئێوارە درەنگ وەخت خوا حافیزیمان لەیەک کردو ئێمە بەهەمان رێگادا کە چوبووین گەڕاینەوە بەرەو سنوری چالاکی خۆمان، کاک شەوکەت و برادەرەکانیشی بەبەلەم لەدەریاچەکەوە گەشتبوونە شارەزوور. دوای دوو رۆژ چوبوونە ئاوایی میری سوور لە رێکەوتی ١٩٧٨/٤/١٤ دا کەووتبوونە بۆسەی جاشەکانەوە ئەم هاوڕێیانەمان شەهید بوون یونس محەمەد عەلی ناسراو بە هاوار فەرماندەی دەستە، عەلی محەمەد قادر خێڵی حەمەیی، حسەین شەمێرانی بەدیل گیراو پاشان لەسێدارەدرا، عەزیز عەلی مەجید عەزیزی جوانە مەرگ شەهادەی هیواکانی لەگۆڕناو تەمەنی پێشمەرگایەتییەکەی تەنیا

دوو رۆژ بوو. ئەم مێژووە لە ئینساکلۆپیدیای یەکێتییدا چاپی دووەم لە لاپەڕە ٧٥٣ دا ٢٠ نیسان و لە لاپەڕە ٧٨٨ دا ١٩ نیسان نوسراوە.

پێشمەرگەکانی هەڵەبجەو هەورامان لەساڵی ١٩٧٧-١٩٧٨دا گورزی کوشندەمان بەرکەوت، پێشتر لە ١٩٧٧/٦/٩ دا مەفرەزەکەی شەهید عومەری حەمە ساڵح لە چەمو قامیشەڵانی نێوان گوندەکانی تووە قووت و بێسەڵمێن دا لە شەڕێکی قارەمانانە و نابەرامبەردا، شەهید بوون، ئەوانیش هەڤاڵان عومەر حەمەساڵح فەرماندەی مەفرەزە، عەلی ئەوڕەحمان خەڵکی میراولی، ساڵح مەحمود، کامیل ئیبراهیم حسێین، ئیبراهیم عەبدوڵلا زێرانی، هیدایەت عەبدوڵلا، ئیبراهیم خەلیل کەرکووکی. ئەم حەوت قارەمانە داستانی بێ وێنەیان لەو دەمەدا تۆمار کرد، دوژمن بەهێزی گەورەی سوپاو جاش بە پشتیوانی هێزی هەوای و تانک و تۆپ هاتە سەریان، تا دوا شەهید و دوا فیشەک جەنگان و جاشێک و سێ ئەفسەر و نزیکەی ٣٠سەربازیان کوشت.

لەسەر ئەم مەفرەزە کەسێک لەلایەن شۆڕشەوە کوژرا بەناحەق، چۆن؟

ئەمە داستانەکەیەتی: ساڵی ١٩٧٧ ڕژێم پشکنینی گشتی (تەمشیتی عام) دەست پێکردبوو بۆ دۆزینەوەو لە داوخستنی مەفرەزەکانی پێشمەرگە. بڕیاردرا دەستە دەستە و بەژمارەی کەم کەم ب لاوەە بکرێت بۆ خۆ پاراستن و خۆحەشاردان. لەم دەمەدا پێشمەرگەیەک بەناوی ئەل لاوەەیس خۆی نەگرت و تەسلیم بوویەوە. هاوکات لەگەڵ خۆبەدەست دانەوەی ئەمدا، مەفرەزەکەی شەهید عومەر دۆزرانەوەو هەموو شەهید کران، ووتیان: ئەل لاوەەیس خەبەری داوە بە دوژمن، ئەل لاوەەیس خۆی ئەمەی بیستەوە رایکرد بۆ باشووری عێراق و لە هەڵەبجەدا نەما لەجیاتی ئەوەدا بێت پاکانە بکات، لەساڵی ١٩٧٨دا ڕۆژێک ئەل لاوەەیس گەڕابوەوە بۆ هەڵەبجە، ئێمە لە ئاوایی لاوەران بووین، لە شارەوە ڕێکخستن ئاگاداری مەفرەزەکەی شەهید فەرەج تریفەیی کردبوو، هەر ئەوشەوە مەفرەزە هاتن و ئەل لاوەەیسیان گرتوو هێنایان، بۆ بەیانی گەشتنەوە لاوەران، ئە لاوەەیس لەلایەن کادرەکانی کۆمەڵەوە دوای ئەشکەنجەدانێکی بێبەزەییانەوە کوژرا. بەڵام دواتر دەرکەوت و ئاشکرا بوو کەسێکی تر خەبەری داوە بەڕژێم کە ئەومەفرەزە لەو شوێنەدان، ئەوکەسە دواتر بووە سەرۆک جاش و بەدەستی پێشمەرگەیەک کە خزمی شەهید فەرەج بوو ئەویش کوژرا.

# سزادانی سەرپێچی کردن
# بە مەرگ

لە کۆتاییی بەهاری ١٩٧٨ماوەیەک بوو لەئەشکەووتی هەزارپەز دا قەتیس بوو بووین، دوور لەئاوەدانی و خۆراکی پێویست، نزیک لەبێتاقەت بوون. رۆژێک مام هەڵمەت داوای کرد بوو مۆڵەتی بدەن بچێتەوە ئاوایی بەڵخە بۆهێنانی جلوبەرگ و پارە، حیکمەت و ئەحمەد پەتڵە و عومەر پالانیایی هاورێیبن و لەگەڵ خۆی بیانبات، وەک مەفرەزەیەکش جەولەیەک بکەن، مۆڵەتیان نەدرا، دوایی بەسەرەڕۆیی و بێپرس رۆشتن، کاتێک کە زانیمان دیار نەماون، وامان زانی چوون تەسلیم ببنەوە، ئەو ئەشکەوتەمان چۆڵ کردو چووینە ئەشکەوتێکی دوورتر، لەوێوە چاودێری ئەشکەوتەکەی ترمان ئەکرد، لەدوای دوو رۆژ بینیمان واهاتنەوە بۆ ئەشکەوتی هەزارپەز، هەرخۆیانن ئێمەش چووینەوە بۆ هەزارپەز، دوای قسەوباس و پرسیارو وەلام، یەکسەر چەک کران، ئەحمەد پەتڵە و عومەر وتیان: بۆچی چەکمان ئەکەن؟ ووتیان: بۆچی بێپرس رۆشتوون؟ ووتیان: مام هەڵمەت و حیکمەت پێیان ووتووین مۆڵەتمان بۆ وەرگرتوون وەرن لەگەڵمان، ئینجا کۆبونەوە کراو پێیان ووترا رەخنە لە خۆتان بگرن، هەڵمەت و حیکمت ووتیان، رەخنە لە خۆمان ناگرین، عومەر و ئەحمەد رەخنەیان گرت لەخۆیان، بۆیە دوای چەند رۆژێک هەردووکیان چەکەکانیان وەرگرتەوە.

مام هەڵمەت و حیکمەت بەدەست بەسەر مانەوە، هەرئامادە نەبون رەخنە لە خۆیان بگرن. پاش چەند رۆژێک لەشوێنی خۆمانەوە چووین بۆ شاخی ئاوەزنێ و لەسەرکانی هانە شیروان نیوەڕۆ ئاگر کرایەوە بۆچا لێنان، حیکمەت ووتی: عەلی شامار شتێکی کردووە من ئاگادارم، لەسەر ئەم قسە، عەلی شامار دای لەحیکمەت و سەری شکاند، مام هەڵمەت بێدەنگ کری کردبوو. هەڵمەت ناوی تەواوی هوشیار ئەحمەد مەولودە خەڵکی گوندی بەڵخەی هەورامانە باوکی لەشۆڕشی ئەیلولدا شەهید بووە. لەهەورامان سێ پێشمەرگەی ساڵی ١٩٧٦مان هەیە ئەوانیش مام هەڵمەت، مام هادی،

حەمەهاوارین. لەکۆنگرەی دوودا ناوی پێشمەرگەکانی سالی ١٩٧٦ دیاری ئەکرا، بۆ ئەوەی ببنە ئەندامی هەمیشەیی کۆنگرە، هەڤاڵێک ئەیووت نابێت هەڵمەت لەو ناوانە بێت چونکە تەسلیم بووتەوە، حەمەهاواریش لەسەرەتای ١٩٧٧ دا هاتووەتە دەرەوە، من بەرگریم لێکردن و ووتم: حەمە سالی ١٩٧٦ هاتوەتە دەرو مام هەڵمەتیش ڕاستە تەسلیم بووتەوە، بەلام مۆڵەت درا بۆکارێک کە کارەکەی تەواو بوو یەکسەر نەوەستاو هاتەوە.

سالی١٩٧٨-١٩٧٩ کەگوندەکان ڕاگوێزران ڕژێمی بەعس قەرەبووی باخ ومولک و مالی ئەکردنەوە بەپارە، ئەوانەی کوڕ یان باوکیان پێشمەرگە بوایە معامەلاتیان لاسەرف ئەبوو، ئەوکاتە ئەوەی مالی مام هەڵمەت و ئێمەش ڕاگیرا بوو. ئێمە ئەوەی بۆمان نوسرابوو، دەیان دۆنم باخ و ڕەزو خانو بوو، قەرەبووەکەی نزیکەی ٧٠ هەفتا هەزار دیناری عێراقی بوو، مام هادی بێ پرسی ئێمە لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش قسەی کردبوو، مۆڵەتی لەکاک مەلابەختیار وەرگرتبوو، تەسلیم ببینەوە تاپارەکە وەرئەگرین دوایی بگەڕێینەوەو بەشی شۆڕشی لێبدەین، من ئەوەم نەکرد بەلام مام هەڵمەت وای کرد، ئەوە بوو خۆبەدەستەوە دانەوەکەی مام هەڵمەت. ئێمە نەک ئەوەی خۆمان فەووتاو لاسەرف بوو، ئەوەی مامەکانیشم نەدراو بەهۆی ئێمەوە توشی زیانی گەورە بوون.

بەڵی لای ئێوارە کەوتینەڕێ بەرەو ئاوایی دەرەتفێ، ئەم ئاواییە دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی هاوارەوە و دانیشتوانەکەی کاکەیی مەزهەبن، نزیکەی چل مالێک دەبێت، خەڵکەکەی سادە و دڵسافن و ژیانیشیان لەخوارووی پلەی مامناوەندیەوە بوو، کەمێک باخیان هەبوو لەگەڵ ئەمەشدا سوودیان لە دارەبەن ئەبینی بۆ بنێشت و قەزوانەکەی، ئەمەش هەموو پێداویستیەکانی ژیانی ڕۆژانەی بۆ دابین نەدەکردن، هەندێ ئاژەڵداریشیان هەبوو، بۆئەوەی کەمێک ئاستی هەژارییان بەرز بکەنەوە، ڕۆژانە بەقاترو گوێ درێژ بارەداریان دەبرد بۆ تەوێڵە دەیان فرۆشت، مام حاتەم و سوڵتان موراد دوو پیاوی دیارو ناسراوی ئەم ئاواییە عاسیە بوون [1].

---

[1]- مام حاتەم پیاوێکی بالابەرزی چوار شانە بوو سمێڵێکی سپی و سەرنج ڕاکێشی هەبوو بەر لەوەی من بچمە دەرەوە ئەمناسی، چونکە دۆست و ناسیاوی هەم مالی باپیرە

بەرلەوەی بگەینە ئاوایی لەجێگەیەک کەناوی کەلی گاکوژەیە کۆبوونەوەیەک سازکرا لەسەر ئەم کێشەی مام هەڵمەت و حیکمەت و دواتریش حیکمەت و عەلی شامار، پێشتر کۆبونەوەیەکی تایبەت کرا لە لایەن ئەم هەڤاڵانەوە عەلی شامار، ئەحمەد گرییانەیی ومامۆستا پشکۆ لەکۆبونەوەدا بڕیاریان داوە هەڵمەت وحیکمەت بکوژن، بەڵام کاک ئەحمەد ڕازی نەبووە لەسەرئەمە. لەبەر ئەوە یەکەم : سەرپێچییەکە سزای کوشتن نییە، دوەم: ئەم دوو کەسە کەسوکاریان هەیەو ناسراوە و شۆڕشەکە زەرەری لێ ئەکات، بەڵام تەنیا ڕاکەی خۆیەتی. بۆیە ئەحمەد دەڵێت مادام ئێوە هەرسوورن لە سەر کوشتنیان با بیانێرن بۆ هەرێم، بۆلای چیای سوورێن بالەوێ بیان کوژن، نامەکە ئەنوسن، ئینجا هاتن و بەئێمەیان ووت کۆبونەوەیە، لەکۆبونەوەکەدا عەلی شامار نامەیەکی خوێندەوە، دەقی نامەکە ئەوە بوو کە حیکمەت و هەڵمەت هەڵەیان کردووە و دان بەهەڵەی خۆیاندا نانێن، وا بەچەک کراوی ناردمانتە لاتان تا هەرێم سزایان بدات، چونکە مەفرەزە لەمە زیاتر دەسەلاتی سزادانی نییە، ئەوە ماوەی یەک مانگە چەککراون.

حیکمەت و هەڵمەت رازی بوون کەبنێردرێن بۆ سوورێن بۆلای هەڤاڵانی هەرێم، ئەودەمە هەڤاڵان شەوکەتی حاجی موشیرو ڕەئوفی خەلیفە

---

گەورەم حاجی عەلی محەمەد بوو هەم مالی باپیرە گەورەی ترم حاجی عەزیز دۆست و ناسیاوی هەردوولایان بوو هاتووچۆی ئەکردن. سولتان مورادیش پیاوێکی ڕەشتالەی بالا مامناوەندی وسمێلێکی درێژی هەبوو بەهەمان شێوەی مام حاتەم دۆستمان بوو، بۆیە کاتێک بووم بەپێشمەرگەو هەرکات ڕێم بکەوتایەتە ئاوایی دەرەتفێ نەیان ئەهشت بچمە مالی کەسی تر، باوا حاجی عەزیزم جۆلا بوو، مام حاتەم هەرگیز ناوی منی نەئەدا هەر ئەیووت کچەزاکەی شالشاش. سالی ١٩٧٨ دوژمن زوو زوو بەشەودا ئەهاتن و گەمارۆی ئاواییەکانیان ئەدا بەنهێنی نەیان ئەهێشت کەس بزانێ تابەیانی ڕۆژ ئەبووەوە، کە ڕۆژ ئەبووەوە ئەگەر پێشمەرگەی لێبوایە ئەوە لێیان ئەداو شەڕ دروست ئەبوو، زۆرجاریش مالەکانی ئەو ئاوایانەیان ئەپشکنی، بۆیە ئەوسەردەمە کەمتر لەئاواییەکاندا ئەماینەوە. دەرەتفێ ئاواییەکی دوور و چەپەک بوو لەسەر سنووری عێراق- ئێرانە من زوو زوو ئەچوومە ئەوێ ئەشچوومە مالی مام حاتەمو ئەترسا ئەیووت: ڕەعە دوو هێلکە بکەرە ناو ڕۆن با کوڕی شالشاش بیخواو بڕوات شەڕمان لێ لادات.

سەعید لەسورێن بوون، هەڤالان حەمەی حاجی مەحمود و حامدی حاجی خالید و شێخ عەلی چوبوون بۆ هەکاری.

شەو لەئاوایی دەرەتفێ خەوتین، لەکاتی سەرە حەرەسیاتی مندا کاک ئەحمەد گریانەیی پێی ووتم: ئەمانە هەڵسێنە باڕابکەن و بڕۆن، من ئەو کارەم بۆ نەکرا، سبەینێ کاک ئەحمەد بەنهێنی بەمنی ووت: ئەونامەیەی کەعەلی خوێندیەوە وانییە، نامەیەکی ترمان نووسیوە و چەند کەسێک ئیمزایان کردووە، لەوانە عەلی شامار و مامۆستا پشکۆ. بۆئەوەی بیانێرنە ئەوێ بکوژرێن. ئەحمەد ووتی خۆم ئەیانبەم، ئەوەبوو ڕۆژی دواتر گریانەیی، لەگەڵ کۆمەڵێک پێشمەرگەدا هەردووکیانی برد و بەرەو سوورێن بەرێکەووتن، ئێمەش لەچەمی پالانیا و سۆسەکان ماینەوە.

نیوەڕۆکەی لەجێگەیەکدا بووین کە لە دوژمن زۆر نزیک بووین لەناکاو فیشەکێک تەقی، لەدەست حەرەسەکەی ئێمە مامۆستا پشکۆ دەرچوو بوو، ئیتر شوێنەکەمان بەجێ هێشت و بەرەو شوێنێکی تر ڕۆشتین، کاک ئەحمەد شەو لەنزیک ئاوایی خارکیلان بەهەڵمەت و حیکمەت دەڵێ: ڕاکەن بڕۆن خۆتان بشارنەوە، بەدرۆ تەقەیان دروست کردبوو بەحساب کەوتوونەتە بۆسەی جاشەکانەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو گریانەیی حەزی نەدەکرد ئەو دووانە لەسەر ئەو سەرپێچییە ئاساییە بکوژرێن، ئەوان ڕایان کردبوو مەفرەزەکەش گەڕابوونەوە بۆ پالانیا هەواڵی ئێمە ئەپرسن، دوای چەند ڕۆژێک لەودەورو بەرەدا یەکمان گرتەوە، گریانەیی داستانەکەی ئەگێڕایەوە بۆ جەماعەت کە چۆن لەنزیک ئاوایی خارگێلان کەوتوون بەسەر کەمیندا لەوکاتەدا هەڵمەت و حیکمەت ڕایان کردووە. ئەو پێشمەرگانەی ئەم مەفرەزە ئێستا سێ کەسیان ماون، ئەوانیش سدیق گریانەیی،حەبیب دەوانی و وەهاب مۆردینی.

من ئەمزانی ئەمە دروست کراوەو گریانەی پاڵی پێوە ناون تاڕابکەن، ئەم دوو هەڤالە ماوەیەک تەسلیم نەبوونەوە بە نهێنی لەناوچەکەدا مانەوە دوای ٢٠ ڕۆژ لەجێگەیەکدا ئەبن لەنزیک تەوێڵە بەناوی دەرەی بەلخ حیکمەت خۆی ناگرێ و تەسلیم ئەبێتەوە مام هەڵمەت بەتەنیا خۆی پەنادا لەناوچەکەدا ، تا مەلا بەختیار هاتە سنوورەکە، ئینجا هەڵمەت پەیوەندیی بەمنەوە کرد داوای کردبوو لەگەڵ کاک مەلا بەختیار قسە بکەم ، منیش کاک بەختیارم

تێگەیاند، مەلا لەكاك ئەحمەدی پرسی ئەو كێشەیە چییە و چۆنە؟ ئەویش بەهەڵەیەكی بچوك و سەرپێچی ئاسایی باسكرد و پشتگیری كرد كەبگەڕێتەوە باشترە، چونكە زانیاریمان هەیە هەر بە نهێنی لە ناوچەكەدا ئەژێت و پەیوەندی بە كەسەوە نەكردووە و چاوەڕێی وەڵامی ئێمەیە، بۆیە مەلا بەختیار ووتی بنێرن بە دوایدا با بێتەوە و خۆشی نامەی ناردبوو بۆ ڕێكخستن تازانیاری زیاتر لەو بارەوە وەرگرێت، لەوماوەدا گریانەیی لەگەڵ سدیق چووە ئاوایی جاور بۆماڵی حەسەنی كاكەبرا ئەوان ئەیانزانی هەڵمەت لە كوێیە بۆیە دوای چەند ڕۆژ مام هەڵمەت هاتەوە، هاتنەوەكەی هاوكات بوو لەگەڵ كۆبونەوەیەك لەئەشكەوتی هەزار پەز، هەڵمەت بەشداری پێنەكرا لەدورەوە دانیشتبوو كاك بەختیار پرسی ئەوە كێیە بۆ بەشداری ناكات لەكۆبوونەوەكە؟ گرییانەیی ووتی ئەوە مام هەڵمەتە، ئەویش ووتی بابێت بەشداری بكات. بەشداری كردوو چەكەكەی درایەوە، كاتێك مەلابەختیار لەناوچەكەدا گەڕایەوە مام هەڵمەت لەگەڵیدا ڕۆیشت، لای ئێمە نەمایەوە[1].

لەم شۆڕشەدا دوو شت لای من جێگەی سەرنج بوون یەكەم سزای چەككردن، بەومانایە ئەهات كەسی چەككراو شەرەفی پێشمەرگایەتی لێ وەرگیراوەتەوە، دوەم ڕەخنە لەخۆگرتن زۆر قورس بوو بەو مانابیەی كەسی ڕەخنە لە خۆگر كارێكی نەگونجاو وهەڵەی كردووە. بۆیە زۆر كەس بەئاسانی ئەم دوو جۆرە سزایەی قبوڵ نەئەكرد.

---

[1] - مام هەڵمەت ئەڵێت لەگەڕانەوەدا كە گەشتینە دۆڵی جافەتی لەوێ هێزەكەی یەكێتیی كێشەیان هەبوو، بەرپرسەكان شەهید جەمالی عەلی باپیر، خاڵە نەبەز، سەلاح چاوشین توانای چارەسەریان نەبوو، بۆیە مەلابەختیار لەوێ مایەوە دوای لێكۆڵینەوە ٣٧ كەسیان لێ چەككرا لەوانە باوكی شەهید غەریب هەڵەدنی و كەسوكارەكەی هەندێكیان بە زیندانكراوی بردنمانە خڕی ناوزەنگ (مەڵبەندی سەركردایەتی).

# گوند نشینێکی دڵسۆز

لەبەهارو هاوینی ساڵی ١٩٧٨ دا مەفرەزەکەمان لەهەورامان پتر لەناو باخ و لێرەوارو دۆڵ و گوێ چەم و ئاوەکانی ئاواییەکانی دزاوەر، تەوێڵە، سۆسەکان، پاڵانیا، بەڵخە، هاوار، دەرەتوێ، هاوارەکۆن، گریانەو بۆییندداو لە هاوینە هەوارەکانی ئاوێسەر، تەوەنێ، وەزلی، وەزەنێ وەزگێڵ دا، ڕۆژمان بەشەو دەگەیاند و شەوانەش ڕوومان لەئاواییەکان دەکرد. بۆ نانخواردن و قسەکردن لەگەڵ خەڵکیشداو زیاتر داوامان لێ ئەکردن پشتگیرو پشتیوانمان بن، لەگەڵ ئەمەشدا داوامان لەگەنجەکان ئەکرد ببنە ڕێکخستن. هەروەها بەئاسانی ئەمانتوانی لەگەڵ کوڕەکاندا پەیوەندی بکرین بەڵام لەگەڵ کچەکاندا پەیوەندی گرتن ئاسان نەبوو ئەویش لەبەر ئەو کلتورە کۆمەڵایەتییەی ئەوسەردەمە.

ئەمساڵ ئەوەندە بەرکە و هەڵەمووت و قەدپاڵەکاندا هەڵزنابوین و لاڕێکانمان تەی کردبوو، ئەوەندە بەناو چەم و چوخڕوو و دەربەند و گوێ ئاوەکاندا وەرەو بڕۆمان کردبووە پیشە، ئەوەندە بەنزارو خۆرەتاودا سەرەو ژوور و سەرەوخوارمان کردبوو، ئەوەندە کەلوملو ئەمیالو ئەویالمان بڕی بوو، ئەوەندە بووبووینە میوانی هەمیشەیی ئەشکەوت و کەورگ و بنڕەمەند و بنزەرد و بنکاچەکان، ئەوەندە لێومان نابوو بەپلوسکی کانیاو و دەممان نابوە چاڵەئاو و گۆلاوەکان، ئەوەندە لەناو بنەوان و جۆگەو جۆبارەکاندا خۆمان شۆردبوو، یەکپارچە بوبووینە بەبەشێک لەسروشت، بۆیە لەبن هەردارێکدا پشوومان بدایە بە باوەشێنی سرووە عارەقەیان دەسڕین و ماندوو بونیان لە بیر ئەبردینەوە. باڵندەکانیش بەسەماو چریکەی دڵگیر، بەئاوازی خۆش و ڕەنگاو ڕەنگیان ناخیان دەکردینە هێلانەی شادی، دیمەنی جوان و دڵگیرو ڕەنگاو ڕەنگو جۆراو جۆری گوڵە کێویلەکان بە عەتر باران، قەڵبەزەو تافەکانیش بە سەدای خوڕەییان مەستیان ئەکردین، شەوانەش سەدای گەلاکان بەشنەشنو، شیرەشیری شیرشرەکەرە و ڤیزە ڤیزیی سیسرگ و ئاوازی مێروو گەل، لەبن سێبەری درەختەکانی بەرمانگە شەوی سەر ئەستێل و کانیاوەکان، فەرموو ئازیزیان لێ ئەکردین. ئەمە توانەوەی

ئێمەبوو لەسروشتدا یان سروشت کەیفی دەهاتێ ئێمەی وەتەن دۆست لەناویا بژین.

ئەمساڵ سوپای عێراق و جاشەکانی[1] ڕژێم، دەیان جار بە ئاشکراو بە نهێنی دەهاتنە ناوچەکەو چەندین جار بۆسەیان بۆ دادەنایین، جێگای بۆسەکانیشیان لە نێوان ئاواییەکان و سەر ڕێگا گشتی و لاپێکاندا بوو، زۆرجاریش هێرش و پشکنینی ئاشکرایان دەکرد و کۆپتەرەکانیش بەئاسمانەوە دەگەڕان، لەهەرشوێنێک سوسەی شتێکیان بکردایە دەیاندایە بەر ڕێژنەی شەستیر، لەم سەروبەندەدا هەندێک جار ئێمە خۆمان حەشار دەداو هەندێک جاریش شەڕو پێکدادان ڕوویدەدا. هەر لەمساڵ و لەم دوو وەرزەدا مەفرەزەکەمان جارجار بەهاتنە دەرەوەی پێشمەرگەی تازە ژمارەمان زیادی دەکرد و جارجارەش بەخۆبەدەستەوەدانەوەیان کەم دەبووینەوە، چونکە بەرگەی ئەو بارودۆخە نالەبار و دژوارەیان نەدەگرت. ئەوانەی کە لەم دوو وەرزەدا تاسەر خۆمان لەبەر هاشاوڵی ئەو ڕۆژە سەختانە ڕاگرت، بریتی بووین لە ئەحمەدگریانەیی فەرماندەی مەفرەزە، عەلی شامار خانەقینی ڕابەر سیاسی، تایەر عوسمان ناسراو بە مامۆستا سەرکەوت بەرپرسی ڕێکخستن، لەگەڵ ئەم پێشمەرگانەدا سدیق گریانەیی، عومەر پالانیایی، حەبیب دەوانی، وەهاب مۆردینی، مام هادی، دڵسۆز حەمەسان ئەحمەد، عەزیز عەبدوڵلا، فەتاح ئێناخی، هەڵمەت بەڵخەیی و مامۆستا پشکۆ و عەبەکەی وەهاب. ئەمانەش هەندێکیان دواتر بەرگەیان نەگرتوو خۆیان بەدەستەوەدا یان جێیان هێشتین. ئەوانەی تاسەر لەم هەڤاڵانە مانەوە یان بەردەوام بوون لەسەر

[1] - لەم سەردەمەدا لەسنووری هەڵەبجە ڕژێمی بەعس ٣ مفەرزەی خائین و خۆفرۆشی پێکهێنابوو، کە نزیکەی ١٥٠ کەس دەبوون. زۆربەی کات پێکەوە دەرئەچوون تەنگیان پێ هەڵچنیبووین بەشەو ڕۆژ بەدواماندا ئەگەڕان، چەندین کوڕی ئازاو قارەمانیان لەخوێنی خۆیاندا گەوزاند، پێکهاتەی ئەم خۆفرۆشانە جۆراوجۆر بوو، هەندێکیان لەشۆڕشی ئەیلولدا پێشمەرگە بوو بوون، هەندێکی تریان بۆ پارە ڕاوە پێشمەرگەیان ئەکرد، بڕێکیشیان هەر بەسرووشت خائین بوون و لەهەردوو شۆڕشەکەدا نۆکەرایەتیان کردبووە پیشە. فەرماندەی ئەم سێ دەستە لەوکاتەدا ئەمانە بوون ڕەشید سالح نادر ناسراو بە ڕەشەی سالحەو سالح عەبدوڵلا خەیاتو حەمەئەمین قادر شەمێرانی. دوای ئەمان و لەگەڵ دروست بوونی شەڕی عێراق-ئێراندا بە دەیان مەفرەزەی تر دروستکران و بەهەزاران چەکداریان بەردایە گیانی خەڵکی تێکۆشەری کوردستان و هێزی پێشمەرگە.

ڕێگای خەبات و لەکاروانەکە دانەبڕان، ئەمانە بوون شەهید ئەحمەد گریانەی، عەلی شامار، مامۆستا تایەر، مام هادی، مام هەڵمەت و خۆیشم، داوای لێبووردن دەکەم ڕەنگە پێشمەرگەی دیکەش لەگەڵمان بووبن لەم دوو وەرزەدا و ئێستە بەیادم نەیەنەوە.

هەر لەم دوو وەرزەدا هەردوو مەفرەزەکەی دیکەش بەڕابەرایەتی غەفوور دەرەشیشی و فەرەج تریفەیی لەسنوری نەوڕۆلی، شنروێ، سازان و تاوگۆزیدا دەمانەوە وکاروباری خۆیان ئەنجام دەدا، وارێک دەکەوت هەرسێ مەفرەزەکە بۆماوەیەک یەکمان دەگرتەوە و پاشان لێک جیا دەبووینەوە.

لەکۆتایی دوا مانگی بەهاردا شەوێک لەئاوایی دەرەتفێ بووین و بۆ ڕۆژەکەی چووینە سەر کانیاوی لێژە، خاوەنی ئەو کانی و باخە کەریم بەگی پالانیا بوو، کانیاوەکە ئەکەوێتە بەرامبەر ئاوایی، کات نزیک بەیازدەی نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە گریانەیی منی نارد بۆ ناو ئاوایی، تابڕێک نان لەیەک دووماڵە دۆستدا کۆبکەمەوەو بهێنم، لەگەڵ کڕینی جگەرە وهەندێک پێداویستیتر، پێی ووتم: بێچەک بڕۆ، ئەوکاتە من بەتەمەن لەهەموویان گچکەتر بووم، لێژە باخێکی سەفادارە، دارگوێزەکان لەگەڵ درەختەکانی مێو، هەنار، هەنجیر، قەیسی سەوزەلانێکی سیحراویان دروستکرد بوو، لەگەڵ ئەم هەموو درەختەدا، لەدەرەوەی باخەکەش دارەکانی بەڕوو، کێکف، گوێژ و بلاڵوک جەنگەڵێکیان دروست کردبوو. لەباخەکەوە سەرەوخوار شۆڕبوومەوە بۆ سەرچەم، جەنگەڵەکە ڕێگەنادا کەس لەوبەرەوە لەئاواییەوە بمبینێ، لەچەم پەڕیمەوە ئەوبەرو بەژێر سایەو شنەی دارگوێزە بەرزەکاندا گەشتمە بەردەم مزگەوتەکە[1].

لەوێ دوای پشوویەکی کورت سەیرێکی دەورووبەرم کرد، کەس دیار نەبوو، بەپسکەپسک سەرکەوتم و خۆم کرد بەناو ئاواییدا. بەتەنیشت

[1]- ئەم مزگەوتە لەگەڵ مزگەوتەکانی خورماڵ و پاوە و نگل دا زۆر کۆنن مێژووی بنیات نانیان دەگەڕێتەوە بۆسەروبەندی هاتنی لەشکری ئیسلام بۆ وولاتی جیبال. دیارە بەو پێیەی گەیشتنی ئیسلام بۆ سەردەمی خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتاب دەگەڕێتەوە، کاتێک لەسەر فرمانی خەلیفە عەبدوللای کوڕی عمران کوڕی حصن نێردرا بۆ گرتنی ئەو بەرەیەو سەرکردەی قۆڵی شارەزووریش ئەبوعوبەیدەی ئەنساری بوو، بۆیە ئاسایی دروستکردنی مزگەوتەکە بۆ دوای ئەو ڕووداوە دەگەڕێتەوە. بۆ زانیاریش مەزاری ئەو سەرکردەیە لەگوندی عەبابەیلێیە و هەر بەناوی ئەویشەوە گوندەکە ناونراوە، چونکە لەوێ کوژراوە و هەرلەوێش نێژراوە.

مزگەوتەکەوە تاکە دووکانێکی لێبوو، پێش ئەوەی بچمە دووکانەکەوە، ڕۆشتم لەماڵی حەمەسەعیدی قالەی مەجنون و محەمەد بەگی باوکی جیهانبەخش کەهاوڕێی خوێندکاریم بوو، تۆشەبەرەیەک نانم هێناو بەرەو دووکانەکە گەڕامەوە، دوای چاک و چۆنی لەگەڵ مام ڕەئوفی دوکانداردا، لام کردەوە دیتم پیاوێکی بەڵخەیی لە دووکانەکەدا دانیشتووە، ئەم پیاوە کاسبکارێکی دەست پاک و نمونەی گوندنشینێکی دڵسۆز، دۆست و ناسراوی ماڵی خۆمان بوو هەستا لەئامێزی گرتم و دەستیکردە ملم بەتاسەوە چەندبارە ماچی کردم، داوام لە مام ڕەئوف کرد پارچەیەک جگەرەی بەغدادی موقەبام بداتێ، لەگەڵ هەندێ وردە کەل و پەلدا بۆ پێشمەرگەکان لیستێکی بچوکیان بۆ کردبووم، دوای ئامادەکردنی پێداویستییەکان، ویستم پارەی بدەمێ خاڵۆ حەسەن نەیهێشت، جگەلەوەش سێ پارچە جگەرەی ڕۆزمەنی جیاکردەوە و خستیە ناو تۆشەبەرەی کەلوپەلەکەمەوە، ووتی: ئەوە لەسەر منە، لەگەڵ قسەکەیدا دەستیشی کرد بەگیرفانیدا ١٠ دیناری دایە دەست خاوەن دوکانەکە، حەوت دیناریشی بەجیا دابە من، ووتی ئەوەش بدە بە کاک ئەحمەد و بڵێ بیدات بەبزنێک و سەری ببڕن بۆ پێشمەرگەکان. منیش دوای کەمێک قسە و باس چۆن ئەبێ و نابێ و نایبەم. کاک ئەحمەد لێم تورە ئەبێ، ووتی : نا تۆ برۆ حەقت نەبێ، منیش بەو ڕێگەدا کەپێیدا هاتبووم گەڕامەوە.

پێش ئەوەی بگەمە لای برادەران یەکێک لەپێشمەرگەکان هات بەپیرمەوە ووتی: کاک ئەحمەد بەدووربین ئاگای لەهاتنەوەت بوو، ووتی حەمە کۆڵەکەی قورسە بچۆ بەدەمیەوە هاوکاری بکە، کە گەشتینە جێ کاک ئەحمەد ووتی: نانی زۆرت هێناوە ئەی ئەو هەموو جگەرە ڕۆزمەنە چییە؟ ووتم هەرئەوە نییە شتی تریشم پێیە، ووتی شتی وەکو چی؟ ووتم: پارە، کەئەمەی بیست لەبرادەران دووری خستمەوە، دەستم کرد بەگیرفانمدا حەوت دینارەکەم دایە دەستی گریانەیی، ووتی: ئادەی قسەم بۆ بکە ئەم پارەو ئەجگەرە چییە؟ ووتم دوای نان کۆکردنەوەکە چوومە دووکانەکەی مام ڕەوف بۆ کڕینی شتەکان، خاڵۆ حەسەنی سەعید بەگی بەڵخەیی لەوێ بوو پارەی هەموو شتەکانی داو ئەو سێ گلۆزە جگەرە ڕۆسمەنە و حەوت دینارەشی دامێ و ووتی بیدرە گریانەیی با بزنێکی پێبکڕن و بیخۆن.

گرییانەیی دڵخۆش بوو بەخەنینەوە ووتی: ئەی دەستی ئەو خۆش بێت و تۆش بەخێربێیتەوە. بەڵام ئەگەر پێشمەرگەکان پرسییان کێ ئەو پارە و جگەرانەی ناردووە ناوی خالۆ حەسەن نەبەیت ئەبێ ئەمە نهێنی بێت، ووتم: باشە. نیوەڕۆ دوای نان و چا خواردن کاک ئەحمەد ووتی هەڤالان وەرنە پێشەوە، جگەرەی دابەشکرد بەسەر جگەرەکێشاندا وپێیشی ووتن: ئەوە دۆستێک ئەو جگەرەو حەوت دیناریشی بۆ ناردوین، پارەی وردە ئەشیاکانیشی داوە. منیش هەرکەسەو پارەکەی خۆیم دایەوە، حەبیب دەوانی بێ ئەوەی جگەرە خۆربێت، ووتی: دەبێ بەشی خۆمم بدەنێ و لەگەڵ جگەرەکێشەکاندا حیسابم بکەن، چونکە دەمەوێت جگەرەکان بگۆڕمەوە بەفیشەک یان شانەی کلاشینکۆف.

منیش هەستم ئەکرد سەرکەوتنێکی گەورەم بەدەستهێناوە زۆر دڵخۆش بووم، هەستم کرد بوومەتە جێی متمانەی گریانەیی، ئەوەتا نهێنی شۆڕشم لایە، دواتر چەند هەڤالێک لێم نزیکبوونەوە تابزانن ئەو پیاوە کێ بووە یارمەتی داوین؟، بێمەبەست هەر حەزیان ئەکرد بزانن منیش هەر پێم نەوتن.

ئەو ماوەیە هەر لەو سنوورە بەرتەنگەدا دەهاتین و دەچووین، تاشەوێک ئاراستەمان گۆڕی وچووینە ئاوایی بەڵخە دیتمان خەڵکەکە دەرگامان لێ ناکەنەوە و تەنانەت ئەوانەش کە دۆستمان بوون وەک جاران نەمابوون و ترسیان پێوە دیار بوو، پرسیارمان کرد چی قەوماوە؟ ووتیان جاش زوو زوو دێنە ئێرە. من یەکسەر چووم لەسەرجادەکە بووم بە حەرەس، پاش کەمێک پێشمەرگەیەک هات بەدوامدا و ووتی: وەرە ئەڕۆین، هاتینە خوار ئاوایی لەوێ برادەران چاوەڕێی ئێمەیان دەکرد، پرسیم چییە بۆ وازوو؟ کەس وەڵامی نەدایەوە، دڵسۆزی مام ڕەئیس هاتە پەنامەوە و ووتی: ئەڵێن زوو زوو جاشەکان دێنە ئێرە، دوو سێ شەو لەمەوپێش جاشەکان هاتوون و حەسەنی سەعید بەگیان گرتووە و داویانە لەمناڵەکانیشی، ئێستە بێسەروشوێنە و پێیان وتووە: پارەت داوە بە پێشمەرگە و حەیوانت بۆ کڕیوون، من یەکسەر بێدەنگ بووم کەوتمە بیرکردنەوە خەیاڵ بردمیەوە بۆ ئاوایی پالانیاو دوکانەکەی مام ڕەئوف. من نازانم لەوکاتەدا دڵسۆز و هەڤاڵەکانی تر داخۆ دەزانن و بەبیریان دێتەوە، کە ئەو پیاوە بووە ڕۆژەکەی

لێژە پارەی داوینەتێ و جگەرەی بۆ کڕیووین؟ من بۆخۆم هەم سەرسام بووم و هەم ترسم لێ نیشت، زۆریشم پێ ناخۆش بوو. چونکە ماوە نەبوو ئەو شەوە سەردانی فاروق سان ئەحمەدی هاوڕێم بکەم، چونکە بەرلەوەی بچینە ئاوایی وام دانابوو ئەم شەو سەردانی ئەو هاوڕێیەی ماوەی خوێندکاریم بکەم و لەوێ لەلای پورە ئەمنەی دایکی نان بخۆم.

کاک ئەحمەد بەپێوە وەستا بوو ووتی: ئادەی دوو سێ کەستان لەم دوو سێماڵەدا نان و شەکر و چایی کۆبکەنەوە، ئیتر پاش ئەوە بەرەو خوار بووینەوە و بێدەنگی چەتری خۆی هەڵدا بەسەرماندا‌و کەس چووتەی لێوە نەئەهات، تا لەئامێزی خانە باخەکەی حەمەلاو بەگدا، کە بە سۆڵە ناسرابوو خۆمان گرتەوە. منیش شەلالی بیرکردنەوە بووم و لەدڵا بەخۆم ئەووت: خۆ جگە دووکاندارەکە کەسی دی لەوێ نەبوو، هیچ یەکێک لەپێشمەرگەکانیش بەوەی نەدەزانی جگە لە کاک ئەحمەد، ئەی چۆن دوژمن بەوکارەی زانیووە؟ وەلامی ئەم پرسیارەم لەلابوو بە مەتەڵێک، بەڵام کە گەیشتینە شوێنی پشوودان و مانەوە حەرەسات دانرا، من لە ٨بۆ٩ ی سەر لەبەیانی حەرەسی رۆژ بووم و دوور لەهەڤالان لەبن دار قەزوانێکدا کورکەم کردووە، دیتم کاک ئەحمەد بەقووڵی نەفەس لەجگەرەکەی ئەدات و بەرەو لای من دێت، دیارە ئەویش بیرکردنەوە لەم ڕووداوە سەرقاڵی کرد بوو. هات بۆ لام و پرسی: ئەو رۆژە چووی بۆپالانیا کێ لە دووکانەکەی رەئوف دا بوو؟ ووتم: کەس. ووتی هەرکەس کەس، ووتم بەڵێ، هەردووکمان بێدەنگ سەیری یەکترمان کرد و ووتم جگە لە خاڵۆ حەسەن کەسی ترم نەدی. ووتی: ئەی کەس لەدەورو بەری دووکانەکەدا نەبوو؟ ووتم: نەخێر. تا دەمەو عەسر لەوێ ڕۆژمان بەسەر برد و پاشان بەرەو ئاوایی جاور کەوتینەڕێ، شەو لەوێ ماینەوە، سبەینێ دەمەو عەسر بەرەو پالانیا سەرە و ژوور بوینەوە و چووینە ناو باخەکەی فەتاح بەگی حەمە ئەمین بەگ لەنزیک ئاوایی.

کاک ئەحمەد دوو پێشمەرگەی نارد و ووتی: بچن ڕەئوفی دووکاندار بهێنن، من زۆر پەرێشان بووم و دڵەڕاوکە جارستی کردبووم، داخۆچی دەبێت و چی ڕوو دەدات؟ ڕەئوفیان هێناو زۆرێک لەخەڵکی ئاواییش بەدوایدا هاتن. کەریم بەگ و مەحمود بەگیش هاتن، ئەم دوو پیاوە هەرچییەکیان گووتایە کاک ئەحمەد قسەی نەدەشکاندن، گرییانەی بە بەخەڵکەکەی ووت:

ئێوە لەولاوە ڕاوەستن ئێمە دوو قسە لەگەڵ کاک ڕەئووف دەکەین، کاک ئەحمەد لێی پرسی: ئەو ڕۆژە ئەو پیاوە لەدوکانەکەت ئەو شتانەی بۆ ئێمە کڕی و پارەشی بۆ ناردووین.......... یەکسەر مام ڕەئوف قسەکەی پێ بڕی و ووتی من خەبەرم لێدا، ئەویش لەترسی خۆمدا، ووتم: حەمە منداڵە نەک ڕۆژێک تەسلیم بێتەوە یان پێشمەرگەیەک زانیبێتی و گیانی من بکەوێتە مەترسیەوە.

کاک ئەحمەد ووتی: تۆ بۆ؟ تۆ دووکانداریت.....؟ لەم کاتەدا عەزیزی حاجی عەبدوڵلا دوو فیشەکی بەپەنای گوێی ڕەئوفدا تەقاندو ووتی: لەدەستم دەرچوو، مام ڕەئوف زۆر ترساو خەڵکەکەش لەدورەوە وەستابوون بەپەلە هاتن بەرەو لامان، وایانزانی ڕەئوفمان کوشتووە. من ئەمزانی عەزیز مام ڕەئوفی خۆش دەوێت، بۆ ئەوە وایکردووە، تا خەڵکەکە لەدورەوە وەستاون بێن بەدەم ڕەئوفەوە. ڕەئوفیش هاواری ئەکرد ماوم ماوم، زوو زووش لە مەتارەکەی عەزیز ئاوی دەخواردەوە زۆر ترسابوو، بەڵێ خەڵکەکە لەدەورمان پورەیان بەست کاک ئەحمەد بەجیا ناوەڕۆکی مەسەلەکەی بۆ کەریم بەگ و مەحمود بەگ باسکرد، ئەوانیش ووتیان: هەقی کوشتنی هەیە، کاک ئەحمەد ووتی ئێمە دەیبەخشین، بەڵام ئەگەر حەسەنی سەعید بەگ لەسێدارەدرا ئێوە ئاگاداربن ڕەئوف بکوژیەتی، ئیتر ڕەئوفی ڕادەستی کەریم بەگ و مەحمودبەگ کرد. دوایی ئەوان ڕۆشتن و ئێمەش ئەو گوزەرەمان بەجێهێشت. منیش خەم و پەژارەی دوو ڕۆژ بوو دایگرتبووم بەری دام.

بەڵام زۆر دڵگران و نیگەرانی خاڵۆ حەسەن بووم، چونکە پیاوێکی بەڕێز و کوردپەروەر بوو، دوای ماوەیەک لە زیندان ئازاد کرا، لەگەڵ ئەحمەد گریانەیی شەوێک چووینەوە بۆ بەڵخە و سەردانمان کرد، کاک ئەحمەد دڵی دایەوەو بۆی باسکرد کە ڕەئوف خەبەری لێداوە، من تا خاڵۆ حەسەن خۆی دەستی نەکرد بە قسە کردن، نیگەرانییەکم هەر هەبوو، بەڵام کە گوێم لە قسەکانی خاڵۆ حەسەن بوو ئەو دڵی ئێمەی ئەدایەوە و ئەیووت: ڕەئوف نامەرد بوو، من خەتای خۆم بوو، ئەبوایە بە دیار ئەوەوە ئەو کارەم نەکردایە، بەڵام خوا بکات ئێوە سەرکەوتوبن و ئاگاداری خۆتان بن ئەم جۆرە مەترسیانەش لە بەردەمان دایە، من لە دوای قسەکانی ئەو دڵخۆش و ئاسوودە بووم. لەوێ هەستاین بەرەو هاوار گەڕاینەوە.

# شەوێکی ساردی زستان

ساڵی ١٩٧٩بۆ ئێمە ساڵێکی سەخت و کۆتاییی پاییز و زستانەکەشی سەخت و بەدژواری تێمان پەڕاند، لەبەر ئەوە ئاواییەکان خەڵکەکەیان ڕاگوێزرابوو، ماڵەکان تەخت و تەقێنرابوونەوە پەناگایەک نەمابوو لەسنوورەکەدا بۆ حەوانەوەی ئێمە لەم زستانە سەختەدا، بۆیە ماوەیەک پەنامان بردەوە بۆ گەرمەسێر بۆ ئەشکەوتەکانی کەنار ڕووباری سیروان، لەوێ نەپێخەف و نەخواردن وەک پێویست هەبوو، نە دەستیش ئەکەوت. هەرکەس و بۆخۆی جێگەی خۆی بۆ نووستن و بۆدانیشتن دروست ئەکرد، ئەویش بە بەردو داروو پووش و پەلاش، ئەوانەی بەتانییە دڕاوە ڕەشەیەک یان پارچە جلێیان هەبوو. ئەوە بۆخۆیان حکومەت بوون. لەسنوورەکەدا ئاوەدانی تەنیا لە بیارە و تەوێڵە و هەڵەبجە دا هەبوو، تەوێڵە نزیکترین شوێن بوو بۆ ئێمە. لەبەر ئەوە هەوارمان گواستەوە بۆ ناو خانەباخەکانی پەرونیلەسەر سنوور. جارجار مەفرەزەمان ئەچوو بۆ هێنانی خۆراک و پێویستی زیاتریش ئارد و شەکر و چا خۆراکی سەرەکی ئێمە بوو. گواستنەوەشی بەکۆڵ و ئەمسەرو ئەوسەر ٦ شەش کاتژمێرمان پێ ئەچوو. زۆرتر من و چەند هەڤاڵێک هاتوو چۆمان ئەکرد. لەناوەڕاستی ڕێبەنداندا پاش نیوەڕۆیەک کەوتینە ڕێ بۆ تەوێڵە، سەر لەئێوارە کزەیەکی ساردو زوقمی وشک هەڵی کرد، لە نیوەی ڕێگادا بەفربارین دەستی پێکرد، کاتژمێر ٨ هەشتی شەو گەشتینە کەناری ئاوایی، لەبەری لای ڕۆژهەڵاتەوە، لەسەرەتای گەڕەکی بەرامبەرەوە بەبێدەنگی لەپەنا بەردو کەڵەکێکدا لەسەر بەفرەکە کورکەمان کردووە. لەو بەرزاییەوە تەماشای ئەو دیمەنەی ناو تەوێڵەمان ئەکرد. ڕووناکی لامپەکان هەرسێ لای ئاوایی و ناو بازار ومەیدانەکەی ڕووناک کردبووەوە. کڵۆ بەفرەکانیش لە ئاسمانەوە بۆسەر زەوی لەپەڵە هەوری شێواوی سپی بریسکاوی دەچوون، کشوماتی باڵی کێشا بوو بەسەر هەموولایەکدا، جاروبارو لەناکاو لوورەی سەگێ خوێڕی و شراقەی فیشەکی سەربازەکان گۆمی مەنی ئەودیمەنەیان ئەشکاند و ئەشڵەقاند. دوای

پشوویبیەک خۆمان گەیاندە ناو کووچەو کۆلانەکان. لێرە هەموو خێزان و بنەماڵەکان دۆست و ترسمان لە کەس نەبوو. دوای نانخواردن و پشوودان کۆلیشیان بۆ پێچاینەوە، کەوتینەوە ڕێ بەفر تا ئەژنۆ هاتبوو، لەمەترسی دەرچووین ئەوانەی کۆلیان پێ نەبوو تفەنگی ئەوانەیان وەرگرتبوو، کە کۆلکانیان پێ بوو. دەمەوبەیان خۆمان گەیاندە ناو خانە باخێکی هاوولاتیەکی خەلکی ئاوایی شۆشمێ لەسەر سنوور، دەرگاکەمان شکاندو چووینە ژوورەوە ترسیشمان لەچریک و ژاندارم هەبوو. جلوبەرگەکەمان لەدەرەوە بەفر و لەناوەوە عارەق خوساندبووی. هەڤالان خەریکی ئاگرکردنەوە بوون. دوکەڵ گێجی ئەخوارد خەریک بوو کوێر ئەبووین، بینیم بەستەیەک قامیشی تەیمان لە گۆشەیەکی خانەباخەکەدا دانراون، کۆلەکەم لەسەرێکیانەوە داناو لەسەریان ڕاکشام ئەوەندە هیلاک بووم خەو بردبوومییەوە، دوای ماوەیەک دلسۆزی مام ڕەئیس ووتی: هەستە ساردە و سایەقەی کردۆتەوە نەخۆش ئەکەوی. ویستم هەستم نەمتوانی شتێک نووساندبومی بە قامیشەکانەوە، دلسۆز دەستی گرتم و هەستام، قامیشەکان لەگەڵمدا ڕاست ئەبوونەوە، بۆیە دووبارە کەوتمەوە کاک دلسۆز قۆپچەکانی پالتۆکەی کردمەوە، خۆم هاتمە دەر لەناویا و پالتۆکەم جێما بە قامیشەکانەوە، ئەمە شەوێک بوو لە سەدان شەوی وا، کە لەناو کرێووەو زوقم و سەهۆلبەنداندا هەڵ لەرزوین هەر سەر لە ئێوارە تا دەمەو بەیان.

بەرلەوەی هەوا ڕووناک بکا هەستاین و لەخانەباخەکەدا هاتینە دەروو دەرچووین بەرەو بارەگا خنجیلانەو ئازیزەکەمان، بەر لەهەڤالەکانم خۆمکرد بەژووردا، عەبدولای حاجی دێوانە بەخێربێتەوە ئەوە ئێستا هاتمە ژوورەوە من پاسەوان بووم، لەولاوە چەند کەسێک لەژێر چەند پەتوەڕەشدا گرمۆلیان کردوە. کوانوویئاگردان ساردووسڕ، یەک یەک هەڤالان بەجلووبەرگی تەڕوو خوساوەوە دێنە ژوورەوە. بێگوێدانە ماندوو بوون و منوو تۆ و بۆلەبۆڵ دەستم کرد بەپاک کردنەوەو ئاگر کردنەوە، عەبدولا زوو کتریەڕەشی هێناو خرایەسەر، ساردوسڕی بارەگا گۆڕا بەگەرمووگوڕی، چایی دەم کراو پەندە مەشهورەکەی پێشمەرگە جێبەجێکرا بەیانیان نان و چا، نیوەڕۆ چایی و نان، ئێوارە هەردووکیان دوای نان وچا خواردن، جا نۆرەی ئێمە هات بۆ ژێرپەتوە ڕەشەکان وپشوودان.

## هاتنە دەرەوەی
## سێ ئەندامی ڕێکخستن

ئێمەی ئەو چەم و دۆڵ نشینە لە زۆر لایەنەوە حاڵمان شپرزە بوو، بەتایبەتی لەڕووی چەک و تەقەمەنی و پۆشاکەوە کزۆڵ بووین، بۆپڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەش پێویستمان بەپارە هەبوو، بەڵام لەکوێی بێنین؟ ڕێبازەکەمان وا ڕایهێنابووین دەوڵەمەندانە بیر لەچارەنووسی گەلەکەمان بکەینەوە و هەزارانە ژیان بەسەر بەرین، هەرئەو ڕێبازە پیرۆزەش بوو، پارە سەندن لەم و لەوی لەلا کردبووینە شتێکی بێزەون، جگەلەوەش ئیرادەی گەلەکەی خۆمان نەبێت هیچ لایەکی دەرەکیمان نەبوو دەستی بەباڵمانەوە بێت.

لەم ڕۆژگارە بەرتەنگانەدا کاک مەلا بەختیار ڕاسپێردرابوو بۆ دووبارە تەشکیل کردنەوە وباشتر ڕێکخستنەوەی هێزی پێشمەرگە، لەسنوری هەرێمی یەکی شارەزووردا، لەدوای کارەساتی هەکاری و پچڕانی شیرازە و تێکچونی مەفرەزە و کەرتەکان و پاش ماوەی هەرێمەکان لە کوردستاندا، مەلا بەختیار دەوری بەرچاو و سەرەکی هەبوو لەو ڕۆژگارەدا بۆ ڕێکخستنەوەی هێزی پێشمەرگە و دروستکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ ڕێکخستنەکانی ناوشاردا.

بەڵێ حاڵی شپرزە بوومان گەشتبوو بەوەی ئاگاداری ڕێکخستنی ناوشار بکرێت کەهەوڵ بدەن بۆ بەدەستهێنانی هەندێک پارە، ڕێکخستنی هەڵەبجە تەقەلای خۆیاندا، پاش ماوەیەک محەمەد سەعید ئەحمەد (شاهۆ) ئەندامی ڕێکخستن و چاودێری کشتوکاڵ بوو، پارەی تەعاونی فرۆشتنی بڕێک مریشک دەکەوێتە لا کە ٣٥٠٠ سێ هەزارو پێنج سەد دیناری ئەوسەردەمەبوو، بۆ ئێمەی دەست لەزۆر شت بڕاو سەرو زیاد بوو. لەگەڵ بەختیار عەلی حەمەگیانە و حەمە ئاواتدا کە یەکەمیان پۆلیس بوو لەسیروان و دووەمیشیان لەنەخۆشخانەی هەڵەبجە لەسەر تیشک کاری ئەکرد،

بەبریاری کۆمیتەی هەرێمەکان هاتنە دەرەوە، ئەوکات بەختیار عەلی یەکێک بوو لە بەرپرسەکانی رێکخستنی هەڵەبجە[1]

ئێمە زۆرمان پێ خۆش بوو کەهاتنە دەرەوە لەبەر: یەکەم سێ پێشمەرگەی دیکەمان زیادی کرد کەخەڵکی خوێندەوار بوون و بەبریاری رێکخستن رێگای سەنگەریان گرتۆتەبەر، دووەم ئەو برەپارەش کاریگەری خۆی هەبوو بۆپرکردنەوەی ئەو هەموو کەلێنانەی هەمان بوو. ئەوماوە ئێمە لە دەوروبەری گرییانە بووین، رۆژێک سەر لەبەیانی بوو لەخوار ئاوایی گرییانە لەحاڵتی پشودان دا بوین، پاسەوانەکە ئاگاداری کردین ئەوە مام مەجیدە شەلی بۆینی هات بۆ لامان، دوای بەخێر هێنانی نامەیەکی ئەو هەڤاڵانەی پێبوو بەختییار نوسیبوی کە هاتوین و لە گوندی بۆینن، ئێمەش مەفرەزەمان چوو بەدواییاندا، ئەوان لەهەڵەبجەوە هاتبونە گوندی عەبابەیلێ لەوێوە شێخ عەبدوڵلای شێخ رەئوف و شێخ فەتاحی شێخ کەمالی رەحمەتی رەوانەیان کردبون تائاوایی رێشاو لەوێشەوە هاتبونە گوندی بۆیین، ئەو ماوە شێخ عەبدوڵلا پەیوەندی نێوان رێخستنی شارو پێشمەرگە بوو، خەڵکی ئاوایی بۆیین بەختییاریان بینیبو ترسابون ووتبویان ئەوە پۆلیسەکەی مەرکەزی سیروانە.

دوای ماوەیەک لەهاتنە دەرەوەی ئەم سێ هەڤاڵە، سەر لەئێوارەیەک لە ئاوایی بۆین بووین هێزێکی قیادە موەقەتەش بەسەر پەرشتی نادر هەورامی هاتنە سنوورەکەو پێیان نایە ئاوایی بۆینەوە، ئێمە سەرەتا سەنگەرمان لێگرتن وامانزانی جاشن تالەیەک ئاشکرا بووین.

بەرێکەوت ئێمە ئەبوو سبەینێ سەرلەبەیانی چاوەرێی شەهید فاتیح ئێناخی بین چونکە بریار بوو سێ کلاشینکۆف و چەند سندوق فیشەکمان بۆ

---

[1]- ئەم سێ هەڤاڵە بەرێنوێنی و شارەزایی فەتاح کوری شێخ کەمالی عەبابەیلێ و عەبدوڵلای شێخ رەئوف گەیەنرابوونە گوندی رێشاو لەوێشەوە خۆیان هاتبوون بۆ گوندی بۆین. لەم گوندە چونکە کەسیان نەناسیبووە چوونە مزگەوتەکەوە، لەوێ خەڵکەکە بەختیار دەبینن و ئەیناسنەوە پۆلیسی مەرکەزی سیروانە سڵی لێ دەکەنەوە، دواتر لەگەڵ خەڵکەکەدا قسەیان کردبوو، ئەوانیش لێیان دڵنیابوو بوون، مام ماجیدە شەل بردبوونیەماڵی خۆی و دوای حەوانەوەی ئەوان خۆی هات بۆگریانە و نامەیەکی بەختیاری هێنابوو، ئێمەش چووین بەدەمیانەوە بەدیتنیان شاد بووین.

بکرێت و بێنێته نزیک ئاوایی ناوبراو، فاتیح خەڵکی ئاوایی سازان بوو پێشتر پێشمەرگە بوبوو ئەوماوە تەسلیم بوبوەوە، دواتر هاتەوە بوو بە فەرماندەی مەفرەزە پیاوێکی ئازاو چاو نەترس بوو لەپایزی ١٩٨٢ دا لەشەڕی هێزی پشتیواندا لەپشتی ئاوایی ئاڵوەتان شەهید کرا، دوای یەکتر بینین کاک نادر هەورامیش داوای کرد سبەینێ میوانی ئەو بین و حەیوانێکمان بۆ بکرێت، ئاگادار نەبوون لەوەی ئێمە لەوان دەوڵەمەندترین. ئێمە ئاگاداری خۆمان بووین نەکەوینە داوەوە، بۆیە حسابی رێک و پێکمان کرد بۆ خۆمان و هەرتەپکەیەک ئەوان بیانەوێ بینێنەوە لێی دەرباز بین. نانی ئێوارە خوراو شەو بەسەردا هات.

ئەوان هەندێکیان لەمزگەوت و هەندێکیان لەچەندماڵێکی لای ژووری ئاواییەوە خەوتن، ئێمەش لەچەند ماڵێکی لای خوارویئاواییەوە جێگەمان گرت و شەو کۆبوونەوەی خۆمان کرد، وا دانرا کاک ئەحمەد گریانەیی و عەلی شامار و من و چەند پێشمەرگەیەک بچین بۆ هێنانی چەکەکان لای فاتیح و پارەکەش بەشێکی لای کاک ئەحمەدو بەشێکی تریشی لای بەختیار بوو.

کاک غەفوور دەرەشیشی لەدەوری ئاواییەکە بمێننەوە تائێمە دەگەڕێینەوە. بەختیار و حەمە ئاوات و عومەر پاڵانیایی و چەند پێشمەرگەیەکیش بچن بۆ میوان داریەکەی کاک نادر هەورامی لەکانی هەناری نزیک بۆین کەدەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئاواییەکەوە.

دەمەو عەسری ئەو ڕۆژە ئێمە چەکەکانمان هێنا و موزەلیەکیان دانرا بۆ مامۆستا شاهۆ و دوانیشیان بۆ دوو پێشمەرگەی بێچەک، گەشتینەوە ئاوایی، حەمە ئاوات و بەختیار و پێشمەرگە میوانەکانی نادر هەورامی وتبوویان با ئێمە زووتر بچینەوە ئاوایی، کاک نادر پرسیبووی ئەوانی ترتان بۆچی نەهاتوون؟ ئەوانیش لەوەڵامدا وتبوویان ڕۆشتن بەدەم کارەوە ئێوارە دێنەوە، بەمەش هەر بەرنامە و خەیاڵێک لەنیازیاندا بوو نەزۆک دەرچوو.

ئەوان ئەیانزانی کەئێمە بێئاگاین چی لەهەکاری روویداوە، بۆیە بەناوی برایەتی و میوانداریەوە ویستبوویان داومان بۆ بنێنەوە، کاتێک لەئاوایی دەرچووین بەرەو گریانە، ئەوان لەکانی هەنارەوە ئەهاتنەوە بۆ ئاوایی، پێیان زانین ئێمە لە ئاوایی دەرچووین چەند دەست ڕێژێکیان تەقاند

بەسەرماندا، بەلام تازە ئێمە دوور کەوتبووینەوە، پاشان کەگەڕابوونەوە ئاوایی خەڵک لێی پرسیبوون بۆچی تەقەتان کردووە بەسەر منداڵەکانی ئێمەدا؟ کاک نادر وتبووی ئەبوبەکر بووە بێ عەقڵی کردووە، ئەبوبەکر برای مەلا عومەری بانیبنۆک، بەمەش دەیانویست کارێک بکەن کەخەڵکەکە نەزانێ نیازیان چییە بەرامبەر بە ئێمە.

پاش ئەوە نادر هەورامی لەناو مزگەوتەکەدا خەڵکی ئاوایی کۆ کردبوونەوە و هەندێک بۆیان دوابوو، پیاوێک پێی وتبوو خاڵۆ نادر عاجز مەبە قسەکانی ئێوە بێسەروبەرن، ئەم منالانەی ئێمە قسەیان بۆ ئەوە باشە لەناو قەباڵەدا سەنەد بنووسرێتەوە. بۆینییەکان پێشمەرگەکانی یەکێتیی واتە ئێمەیان ئەوکات بەمنداڵەکانی خۆیان ناو بردبوو. لەسەرەتای شۆڕشدا لەهەموو ئاوایییەکانی ناوچەکەدا باوا حاجیم ئەلە هەلاج ناسراو دۆست و خزمی هەبوو، بۆ من ئەوانە بوونە پشتیوان ویارمەتی دەر، لەوانە: هاواریەکان، هاوارەکۆنییەکان،دەرەتفەیەکان، بۆیینییەکان و گرییانەیەکان بەگشتی و چەند بنەماڵەیەک لەئاوایییەکانی ڕیشاو، کۆساوا، سازان، تلێوەری، لمە، پێگە، نەیجەڵە. من خۆم هەورامیم، جەماوەری ئەم ئاوایییانە ناوم هێنان بەسۆرانی ئەدوێن، لەسنووری ئاوایییەکانی هەورامی نشینیشدا سەرەتاو لەپارتی زانیدا بۆ خۆم و مەفرەزەکەمان هاوکارو یارمەتی دەرمان بوون وئەیانشاردینەوە، هیچ کات تووشی زەرەر نەبووین لەدەستیان، جەماوەری ناوچەکە زۆر دڵخۆش بوون بەشۆڕشی نوێ.

بابچینەوە سەر باسەکەی خۆمان، هەر ئەو شەوە هێزەکەی قیادە موەقەتە هاتن بەدواماندا شەو لەگریانە بووین و ویستمان لەمزگەوتەکەدا بخەوین، دوای ماوەیەک ئاگاداریان کردین کە جەماعەتی قیادە وابەدواتاندا هاتن، ئێمەش دێمان چۆڵ کردو بەرەو هەزار پەز و کۆلێن دەشت ڕۆیشتین، کە دوو ئەشکەوتی پەناگای ڕۆژانی تەنگانەمان بوون لەسەر ئاوی سیروان، کەچی لەوێش کەووتنە دوامان، لەخوارەوە گەڕاینەوە بەرەو بۆین، چەمی گریانە چەپۆکانی دەکرد، هەر چۆن بوو لێماندا و پەڕینەوە بەرەو ئەشکەووتی مەڕەمانگان و بەڕوو دار، کاک نادر و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون زانیبوویان سوودی نییەو ناتوانن لەدامان بخەن، گەڕانەوەو خۆیان کرد بەدیوی ئێراندا و چوونە ئاوایی شێخان، هێشتا شۆڕشی گەلانی ئێران

نەکراوە، ئێمە بۆیە خۆمان لەشەڕ لادەدا چونکە ژمارەمان کەم بوو، دوو رۆژ لەئەشکەوتی بەڕوودار بووین، بڕێک وردە نان لەبنی گونییەکدا مابوویەوە بەکوڵی منەوە بوو، گریانەیی هەر ئەیووت ئاگات لێی بێت نەیخۆن، دوا جار بەدۆلکەی نایلۆن دابەشی کرد بەسەرماندا بەچاوە نۆشمان کرد. بەختیاری عەلی حەمەگیانە قسە خۆش بوو، بەحەمە ئاواتی ووت ئاجگەرەیەکی رۆزمەنم بەرێ، چونکە دوای چەوری خواردن جگەرە تامی خۆی هەیە.

هێزەکەی قیادە دوای ئەوە خۆیان کرد بەئێرانا گەڕانەوە بۆ کێمنە و بێرواس دوو ئاوایی کوردستانی رۆژهەلاتن، ئێمەش وەک جاران کەوتینەوە گەڕان بەناو ئاواییەکاندا، ئەو ئاواییانەی کەئێمە بوو بووینە منداڵیان و بەلایانەوە نامۆ نەبووین.

# کەلی وەزمرا و شەهیدبونی تۆفیق حاجی مەمەندی

لە کۆتاییی بەهاری ١٩٧٨دا مەلا بەختیار لەناوزەنگەوە هات بۆ سنووری هەرێمی یەک و گەشتە چیای سورێن، لەوێ مابوویەوە و داوای کۆکردنەوەی مەفرەزەکانی کردبوو لەهەموو سنوری هەرێمەکەدا، ئەمەش بۆ ئەوەبوو کۆبوونەوەیەکی گشتی بەهەموان بکات و لەئەنجامدا تەشکیلاتی تازە و بەرنامەی نوێی کارکردن دابڕێژێ بۆ هێزی پێشمەرگە، چونکە سەفەرو کارەساتی هەکاری بۆشایی گەورەی بۆ دروست کردبووین، هێندەی نەبرد دوای گەیشتنی بۆ سورێن نامەیەکی بە حاجی چاوشیندا نارد بۆ هاوار و گریانە، وشیار حاجی مامانی و حەمەی حاجی ئەحمەد هاورێی حاجی چاوشین بوون لەم گەشتەدا، مەبەستی نامەکە ئەوە بوو هەرسێ مەفرەزەکەی قۆلی هەڵەبجە-هەورامان بگەنە ئەو شوێنەی دیاری کرابوو کە چیای سوورێن بوو، پاش چەند ڕۆژێک دوای گەیشتنیان بۆلای ئێمە، ئاگاداری شەهیدان فەرەج تریفەیی و غەفوور دەرەشیش کرایەوە کەبێن بۆلای ئێمەو لەدەوروبەری هاوار یەک بگرینەوە، پاش نیوەڕۆیەک لەئاوایی هاوار هەمووومان بەیەک گەیشتین، ئەوکاتە ژمارەی پێشمەرگەی سنوورەکە نزیکەی ٤٠ چل کەس دەبووین و هێزێکی باش بووین.

لە ڕۆژی ١٩٧٨/٦/٤دا لە ئاوایی هاوار نانی نیوەڕۆمان خواردو چاوەڕێی خۆرمان دەکرد ئاوا بێ و بکەوینەڕێ بەرەو شارەزوور، ئەوەی لەیادم بێ و هەرگیز لەیادم ناچێت لەساتە وەختی چاوەڕوانیدا وشیار (تەوفیق) حاجی مامەندی شیعرێکی خوێندەوە کەناوەڕۆکەکەی وەسیەت نامەیەک بوو بۆ ئاری کوڕی، وشیار پیاوێکی ژیر و بەئەدەب، پێشمەرگەیەکی قارەمان و چاونەترس، خەڵکی ئاوایی حاجی مامەند بوو لەشارباژێر.

دوانیوەڕۆیەکی درەنگ بەڕێکەوتین، بەڵێ چوون هەردە جاران کەوتینەوە شیلانی پشتی توولە ڕێکانی ئاشنامان، ماوەیەک لابەلاو مدەتێک سەرەو ژوورو سەرەوخوار بێدەنگ بێدەنگ دەڕۆیشتین و قسەشمان دەکرد ئەز بە خۆمم دەووت: تۆبڵێیت ڕۆژێ بێت باڵندەی خەونەکەی ئەحمەد

موختار جاف بدات لە شەقەی باڵو بەسۆزی زوڵاڵی ئەم دوندو لاپاڵ و نزار و خۆرەتاوانە دارماڵ بکات لە ژیانی سەربەستی؟ بڵێی ئەو ڕۆژە بێت ئەم وڵاتە بەهەشتۆکەمان لەم جوغزی تەنگەبەرە تاساوە دەرچێ و دەستی ئاوەدانی وەکو شابووک زیاتر ئارایشی بکات و بگەین وببینین بەوەی فەرموویەتی:

پاش قرانی مودەعی دەست پێئەکا تەعمیری ملک
جادەی ئاسن ئـەچێتە شاخی هـەورامــانــەوە
کـێوکەژ گشتی ئەبێتە باخ و قەسری گەوهەریـن
بـۆتەماشای دەستە دەستە دێـن لەئینگلستانەوە

بەڵێ دوای بڕینی چەندێن کاتژمێر ڕێگا بەبێ وەستان گەیشتینە ئاوایی خەرپانی و نانی ئێوارەمان لەوێ خوارد، شەو داهات و لەوێشەوە کەوتینە ڕێ و دوای خستنە پشت سەری ئاواییەکانی دەرە قەیسەرو زەردەهاڵ، چووینە ئاوایی بنجۆی درە، کە ئاوایی ماڵی یارئەحمەد بەگی ئەفراسیاو بەگە، هەرسێ فەرماندەی مەفرەزەکان و مامۆستا سەرکەوت چوونە سەرەوە بۆلای مامەیارە و دانیشتن، ئێمەش لەسە ڕێگاکەو لەبەردەم کەپرو ماڵەکەیاندا چاوەڕێمان ئەکرد چراتۆڕیان هەڵ کردبوو، کوڕەکانی مامەیارە بەنانەشان قەیسییان هێناو دابەشیان کرد بەسەر هێزەکەدا، پیاوێک لەماڵیاندابوو بەناوی کاک حەمەسەعید لەگەڵ هۆشمەنی کوڕی مامەیارە ئێمەیان تا نارنجلە بەڕێ کرد، سەرکەوتین بۆ سەر شاخ و بەودیودا داگەڕاینە خوارەوە، درەنگانی شەو گەیشتینە ئاوایی گەچێنە لەوێ پیاوێک بەناوی فەیرۆز هاتە لام و ووتی، ئێستە مەفرەزەیەکی قیادە موەقەتە لێرەبوون، پرسیم کێ بوو؟ ووتی: شێخ جەلالی شێخ محەمەد و خالۆ زۆرابت بوون. منیش ئاگاداری ئەحمەد گریانەییم کردو ئەویش عەزیزی حاجی ئەولەی نارد بە دوای فەیروزدا، کە هات پرسیاری کرد و زانیاری زیاتری لێ وەرگرت، فەیروز دۆستی ئێمە بوو. ئاوایی گەچێنە ئەکەوێتە بناری چیای شرام کەبەشێکی سەختە لەزنجیرە چیای هەورامان و شرام دەکەوێتە پشت شارۆچکەی بیارە.

هونەرمەند عوسمان هەورامی دەنگ خۆش لەم ئاواییەدا دەژیا، پاش کۆکردنەوەی نان و شەکر و چایی دەمەو بەیانی چووینە سەرەوە بۆسەر

کانی هەمزەی بۆ داوێنی چیای شرام، ڕۆژەکەی لەوێ ماینەوە و چەند سەر حەیوانێکمان کڕی بوو بۆ نیوەڕۆ، نیوەڕۆ دوا پیاوێک گیرابوو زۆریان لێدا، گوایە پیاوی بەعسە، بەڵام وابزانم درۆچن گوزارشی دابوو شتی شەخسی بوو، پاش لێدان ئازاد کرا. مەفرەزەکەی شێخ جەلالی شێخ محەمەدی نەقشبەندی کەشەو لەئاوایی بوون و بەئێمەیان زانیبوو، ڕۆژەکەی لە پشتی ئێمەوە مابوونەوەو چاودێریان کردبوین تا بزانن ئێمە کێین و بۆ کوێ دەچین؟ سەرلەبەیانییەکەی زوو ئاگاداری نادر هەورامیشیان کردبوو لەو بارەگایەی لەپشتی ئاوایی کەیمنە و بێرواس هەیان بوو لەناو خاکی ئێراندا.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە ئێمە بەناوقەدی چیای شرامدا لابەلا چووین تا چووینە ئاست ئاوایی هانەدن، لەوێ لەدورەوە چاومان کەوت بەمەفرەزەکانی قیادەی موەقەت. لەوێوە داگەڕاین و شۆڕبووینەوە بۆ ناو ئاوایی هانەدن، نانی ئێوارەمان لەوێ خوارد. دواتر ڕێچکەمان ڕوەو هەوراز بۆ سەری سییە بۆ بنار چیای هەسون بەست، نیوە شەو سەرکەوتین بۆ چا لاوەا و وەنەناو، بەنیەتی گەیشتن بۆسەرکەلی وەزەرا تا لەڕێی دالانییەوە بچینە مڵە خورد، لەوێشەوە بۆ وشکەناو پاشان بەرەو چیای سورێن و بگەین بەئەشکەوتەکانی سوڵتان و هەورامی. ئەم ڕێگەی ئێمە هەڵەبوو، ئێمە دەبوو لەخەرپانییەوە بچووینایەتە شیرەمەڕ و لەوێوە بۆ عاموورە و میری سوور تا گەشتن بەجێی ژوان.

ئەم ڕێگە هەڵەو دژوارو هەڵەمووتەی دیاری کرابوو، لەبەر ئەوە بوو کەهەر بنارەو بنار بڕۆین و نەکەوینە دەشتەوە، قیادە موەقەتەش حەقی خۆی بوو ڕێگەمان پێ بگرێت، چونکە ئەوان بارەگاکەیان لەمڵە خورد بوو، بەڵام ئێمە نەمان زانی بوو، ئەمانەی لای بێرواس وایانزانی بوو ئێمە دەچینە سەر بارەگاکەی ئەوان واتە بارەگای مڵەخورد، بۆیە بەرلەوەی ئێمە لە وەنەناو سەر لە بەیانی ڕۆژی ١٩٧٨/٦/٦ بگەینە سەر کەلی وەزەرا ئەوان لەبارەگاکانی خۆیانەوە لەئاواییەکانی کێمنەو بێرواسەوە هاتن و ڕێگەیان لێگرتین، سەر لەبەیانی ئەوڕۆژە کاتێک لیشکی تیشکی خۆر دەرکەوت من و پێشمەرگەیەکی تر بەناوی ئەحمەد پەتڵە وەک پێشقەرەوڵ لەدەم کەلدا سەرمان کێشایە ئەودیو سنوور، چیم لێوە دەرکەوت، دۆڵێکی سەوزی داکەوتەی ڕەنگاو ڕەنگ، لەناوقەدی دا ریزێک پیاوی کۆکەن بەئاسۆی

لەتەنیشت یەکەوە کەماولۆ دەبڕن، یەک دوو کەس خەریکی بنە چاککردنن و بار داگرتن بوون لەقاترەکان.

بێئەوەی پێمان بزانن ئەحمەد بەدیاریانەوە دانیشت، من گەڕامەوە بۆ دیوی خۆمان و لەوئاسمانەوە سەیری خوارەوە ئەکەم و قەتارەی ماڕپێچی هەڤاڵەکانم نیگائاژن دەکەم لەحاڵەتی جوڵەو سەرکەوتندان ورد ورد، ڕێگاکە لەدێراوی تووتن دەچێت، ئەوەندەی نەبرد چەن هەڤاڵ لەقەتارەی ماڕپێچەکە گەیشتنە لام و ئەپرسن ها ئەودیو چییە؟ ووتم بڕۆن بەهەشت چاوکەن. هەرکەس سەر ئەباتە دیار بەهێواشی لەبەر خۆیەوە ئەڵا ئەڵا، لەدەم کەلدا بەرابی هێز دوو دوو سێ سێ جەم بووین و بێدەنگ بێدەنگ گوێمان ڕادێراوە بۆ قاسپەقاسپی کەو و ئاوازی جۆراو جۆرو ڕەنگاوڕەنگی بولبول و گونجشک گەل، ویزەویزو شیرەشیری مێروگەل. دیمەنی ڕەنگاوڕەنگی گوڵە سۆسەن و مێلاقەو هەلاڵە برەمە، بۆن وبەرامەی سورە هەلاڵەو بۆژانەو چنورو کەماولۆ بەو دەمەو بەیانە ئەبینم من پێی مەستم، لەم غەرق بوونەی قولایی خەیاڵدا شراقەی تەقینەوەی گوللەیەکی برنۆ لەسەر ڕووی ڕۆژهەلاتی ئەو گابەردەی پاڵم پێوەداوە شوێنی خۆی نەخشاند و گۆمی مەنی خەیاڵی هەمووومانی شڵەقاند.

بەرلەوەی نیگای چاوبخەمە سەر ئەوشوێنەی گوللەکەی لێوە هاوێژراوە جێگەی خۆمم قایم کرد، ئینجا دیمەنی شڵەژاو شێواوی ریزی کۆکەنەکانم کەوتەبەر چاو سەرەوخوار هەڵنیشتن و لەچاو وون بوون، بەرەو ئاواییەکانی خۆیان دەرەکیەو دەمەیۆ لەکوردستانی ڕۆژهەلات. ئەوانەی گەیشتبووینە کەل هەریەک بەجۆرێک سەنگەری خۆی گرت، تابزانین ئەوتەقە چیبوو.



لەگەڵ پەیدابوونی چەند سەداو دەنگەدەنگ لەڕووی ڕۆژهەلاتی ئەم زنجیرە چیایەی هەسوونەوە درابنەوە بەر گوللەی تفەنگ، شەڕدەستی پێکردو ئەو ڕۆژە تائێوارە درێژەی کێشا، ئێمە بەتەمابووین خۆمان بدزینەوە لەم شەڕە بەلام کاتێک خەریکی

دانانی بەرنامە بووین بۆ ئەوەی بەشێکمان بەرگری بکەین و بەشەکەی ترمان بەرەو مڵەخورد بڕۆن تائێمەش بەدوایاندا بڕۆین، کاتێکمان زانی لەلای مڵەخوردیشەوە دراینە بەرتەقە ئەوەبوو ناچار لەدوولاوە بەرگریمان لەخۆمان کرد تائێوارە، لەم شەڕەدا توفیق محەمەد ناسراو بە وشیار حاجی مامەندی کەدوو رۆژ پێشتر وەسیەت نامەکەی بۆ خوێندینەوە لەکاروانەکەی ئێمە نەماو چووەڕیزی کاروانی نەمرانەوە.

لەگەڵ تاریک بوونی هەوا ئێمەگەڕاینەوە، لەو ئاسمانەوە سەرەوخوار داگەڕاینەوە بەرەو ئاوایی دەرەی مەڕ و سەری سیپە، تەرمی پیرۆزی شەهیدەکەشمان بەکەماو لۆ داپۆشی و بەجێمان هێشت، لەتاریکایی شەو و لەنیوقەدی ئەم سەرەوخوارە هەزار بەهەزارەدا گریانەی یەک بەیەک بەسەری کردینەوە. غەفور دەرەشیشی و پێنج تاشەش کەس دیارنین، ئێمە شارەزای ئەم شاخ و هەڵەتە نەبووین بەهەڵەش ڕێگەمان گرتبوویە بەر بەسەر شاخی دلانی وسووریێندا، ئەگەر بنارەو بنار ڕۆیشتباین ئەو شەڕە نەدەقەوما، بەرپرسیاریەتی ئەم ڕێگا گۆڕین و هەڵەیە لەئەستۆی مامۆستا سەرکەوت و گریانەیی و مامۆستا پشکۆدا بوو، کەڕەنگە ئەوانەیان ئێستە لەژیاندان و ئەو دەم بەرپرس بوون قسەی خۆیان هەبێت لەسەر ئەم بابەتە، بەتایبەت مامۆستا سەرکەوت چونکە بەرپرسی ناوچەو بڕیار لای ئەوە.

دەمەو بەیان بەر لەوەی ڕۆشن بکات بەشپرزەیی و دڵگرانی چووینە سەر کانی و ئاوی شەڵوان دڕ دڵگرانی بۆ شەهید وشیارو ئەو مەفرەزەی دیار نییە، لەوێ لەسەرکانی ووتیان ئاو بخۆن و مەتارەی ئاوەکانتان پڕ لەئاو بکەن و لەناو ئەم دار و دەوەنەدا خۆتان حەشار بدەن تا سبەینێ نیوەڕۆ، وامان کرد و چووینە ناو هەژگەلان و جەنگەڵەکەی پشتی کانی لەبناری چیایی شرامدا، بەبەرب لاوەی و پچڕ پچڕ لەناو هەژگەلانو دەوەنە پڕەکاندا لێی خەووتین تا خۆر و بان گەرم بوو، نیوەڕۆ یەک یەک و دوو دوو هاتینەوە بۆ سەر کانییەکە بۆ بن دارگوێزەکان، ئەوچەند کەسەی کە لێمان ون بوبوون ئەوانیش شەوەکەی لەسەر چیا هاتبوونە خوارەوو لە قووتەی لنگە لەرز مابوونەوە هاتنەوە لامان، لنگەلەرز قوللەیەکی بەرزە بەرامبەر شەڵواندرِ لە پشت ئاوایی هانەی دن یەکێک لەپێشمەرگەکان بەناوی ئەحمەد پەتڵە شەو گوێی لێ نەبووە کاتێک پێمان ووتراوە خۆر و بان گەرم

بوو وەرنەوە بۆ سەرکانی، بەتەنیا لەدەوەنێکدا خەوتووە، سبەینێ هەستاوە کەس لەدەوری دا نەبووە بەرەو ئاوایی گوڵپ ئەکەوێتەڕێ ڕاست بەڕۆژی نیوەڕۆ جادەی گشتی بیارە –خوڕماڵی بڕیوە و بەرەو هاوار ڕۆشتووە، ئێمە زۆر گەڕاین بەدوایدا وامان ئەزانی مار پێوەی داوە.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە هاتینە ئاوایی هانەی دن دوای پشوودان و نانخواردن. کەوتینە ڕێ بەرەو ئاوایی گوڵپ، لەئاوایی گوڵپ د. نەجمەدین فەتحوڵا تەداوی بریندارەکانی بۆ کردین و کەل و پەلی برین پێچیشی داینێ، چونکە لەوێ بنکەی تەندروستی لێ بوو. لەبەردەم ئاوایی گوڵپ دا حاجی چاوشین و حەمەی حاجی ئەحمەد لەگەڵ عەلی شامار و مامۆستا پشکۆدا بەنامەیەکەوە ڕۆشتن بەرەو لای مەلا بەختیار بۆ سورێن چەک و کۆڵەپشتەکەی شەهید وشیار حاجی مەمەنیشیان لەگەڵ خۆیان برد، ئێمەش نەمانتوانی درێژە بەسەفەرەکەمان بدەین و گەڕاینەوە بۆ بەری هاوار و بناری شنروێ.

دوای درەنگانێکی ئەوشەوە خۆمان گەیاندە دۆڵەکەی پشتی ئاوایی خەرپانی لەبن دارتووەکاندا خۆمان بە زەویدادا، بەیانی کەڕۆژ بووەوە جل و بەرگەکەمان شیلاوی بوو بوو، چونکە لە سەر تووی وەریوو خەوتبووین، ئێوارەی هەمان ڕۆژ گەشتینەوە ئاوایی هاوار، بینیمان ئەحمەد پەتڵە کە ئێمە بە تەمابووین مار پێوەی، دابێت، لەوێ لەهاوار چاوەڕێمان ئەکات. ئەوشەوە لەهاوار پشوومان داو ڕۆژی دوای مەفرەزەکان هەریەکەو چونەوە بۆ سنووری خۆیان.

# ڕێکخستنەوەی هەرێمی یەک ۱۹۷۸/۷



لە دوای گەڕانەوەی ئێمە لە شەڕی کەلی وەزەرا بۆ بەری چیای شنروێ و سەر ئاوی سیروان، هەردوو مەفرەزەکەی بالانبۆ و شنرویش گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی سنووری چالاکی خۆیان. ئێمەش لە دەوروبەری گریانە و کولێن دەشت بووین. مەلا بەختیار دوای ئەوەی مەفرەزەکەی ئێمە گەشتبونەلای، کەزانی بووی وا پێویست ئەکات خۆی بێت بۆ ناوچەکە بڕیاری دابوو بێت بۆ بەری هەورامان. بۆیە لەدوای تەواو بوونی ئیش و کارەکانی لە ناوچەکانی شارباژێڕ و بەرکێو و بناری سورێندا، لەگەڵ مامۆستا پشکۆ و عەلی شامارد، لە سەرەتایی هاوینی ۱۹۷۸دا پەڕینەوە بۆ بەری هەورامان، ئەو کاتە ئێمە لەکولێن دەشت و هەزار پەزدا دوو ئەشکەوتەکەی ماڵە باوانمان جەم بوو بووینەوە، ڕۆژێ ئاگادار کراین کە هێزێک هاتوەتە ئەمبەرو لە ئاوایی هاوارە، مەفرەزەیەکمان بەرەو پیریان چوون. بەرلەوەی بگەنەلامان مامۆستا سەرکەوت داوای لێکردین هەموومان لەسەر رووی بەرگی مەتارەی ئاوەکان بنووسن م.ل واتە کۆمەڵەی مارکسی لینینی. ئێمەش هەموو نووسیمان جگە لەپێشمەرگەیەک ئەویش فەتاح ئێناخی بوو. ئێمە گەشتینە ئاوایی گریانە و مەلا و مەفرەزەکەی پێمان گەشتن، لەئاوایی گریانەماینەوە ئەوانی ترمان لەکولێن دەشت مابونەوە ئەوانیش هاتن و شەکر و چای و نانمان لەئاوایی جەم کرد و چووینە کانی کوێخا عەلی، ئەوکات ئێمە لەسنوری هەڵەبجە و هەورامان ڕێگەمان نەدەدا خەتی گشتی و بزووتنەوەی سۆشیالست کار بکەن، بەتایبەتی دروستکردنی ڕێکخستنیان لەناو پێشمەرگە دا.

کادرەکان لە ناوچەکەدا لە هەورامان شێخ عەلی-کاک حامد -عەلی شامار-م.سەرکەوت کۆمەڵە بوون و بەتوندی ئەو بیرو رایەیان گرتبوو، بەڵام لەشارەزوور و ناوچەی سوورێندا خەتی گشتی و بزووتنەوە، سەرەڕای ئەوە کاک حەمەی حاجی مەحمود دۆستی کۆمەڵەو شەهید ڕەئوفی خەلیفە سەعید کۆمەڵە بوو، چەند کەسێکیان هەبوون لەوانە  شەهید شەوکەتی حاجی موشیر بزووتنەوە بوو.

دوای چەند ڕۆژ ئەوان حەسانەوە، لەپڕ حاجی چاوشین جارێکی تر هاتەوە، نامەیەکی دایە دەست مەلا بەختیار، مەلا دەستی بەخوێندنەوەی نامەکە کرد بە سیماو ڕوخساری مەلادا زانیمان شتێک قەوماوە، هەر وەک مامۆستا پشکۆ لە ئەزموون یاد دا ئاماژەی پێکردوە. بەڵام نازانین چییە؟ مەلا بەختیار ووتی بابچینە ئەو ئەشکەوتەی بارەگامان لەوێیە مەبەستی هەزار پەزبوو لە سەر ڕۆخی سیروان، چووینە خوارەوە بۆ ئەشکەوتی هەزار پەز، کانی کوێخا عەلیمان بەجێهێشت، هەمووکەس عاجزە بێتەوەی بزانێت چی ڕوویداوە، بەڵام لەوە ئەچێت ئەم هەواڵەی دابێت بەگریانەی و فەرماندە مەفرەزەکان شەهیدان فەرەج تریفەی و غەفور درەشیشی.


ئەشکەوتی هەزار پەز

گەیشتینە هەزارپەز لەئەشکەوتەکەدا ماینەوە مەلا لەکۆبوونەوەیەکی هەموو پێشمەرگەکاندا باسی ڕووداوی هەکاری و تیاچوونی هێزەکەی بۆ کردین، ووتیشی کاک ئازاد هەورامی و کاک شێخ عەلی و کاک حامدی حاجی خالید و کاک عەلی شیعە ماون، بەڵام کاک عەلی عەسکەری و د. خالید و شێخ حسەین بابەشێخ شەهید کراون. دیارە قیادەموەقەت لە شەهید کردنی فەرماندەو کادیرەکانی بەکێتییدا، لە هەکاریش بەرنامەی هەبووە، ئەوانەی کۆمەڵە زیندان ئەکاو ئەوانەی بزووتنەوەی سۆشیالیست شەهید ئەکەن، پێیان وایە مام جەلال بزووتنەوەو لەدواڕۆژدا کۆمەڵە بەدژی ئەبن بەڵام بەڕای من

پێچەوانەکەی لە دوا ڕۆژدا لەبەرژەوەندی ئەواندا ئەبوو هەڵەیان کرد. سەرکردەکانی کۆمەڵە زیاتر نزیک و پشتیوانی مام جەلال بوون.

لەم کۆبوونەوەیەدا قسەکانی کاک مەلا بەختیار بۆ ئێمە سەرنج ڕاکێش بوون، چونکە بەوردی باسی لەسەر دامەزراندنی یەکێتیی و لەسەر بیرو بۆچوونی کۆمەڵەو ئەرکی پێشمەرگە و بەرنامەی کاری یەکێتیی نیشتیمانیی بۆ شیکردینەوە، زانیاری زیاتری داینێ، کەئەوانە بۆئێمە باس و خواسی نوێ بوون دوای ئەمە هەندێک مەسەلەی ناوخۆیشمان هەبوو، وەک چەک کردنەکەی مام هەڵمەت و حیکمەت، شەهید کردنی مستەفا کۆکۆیی و باوک و براکەی و ماف خواردنی هەندێ پێشمەرگە ئەمانەش باسیان لەسەر کرا.

دوای ئەم کۆبوونەوەیە بەرنامە داڕێژرا بۆ جەولەیەکی هێزەکەمان لەهەورامانەوە بۆ ناوچەی تاوگۆزی و شەمێران، ئێمە هەر سێ مەفرەزەکەو لەگەڵ یازدە پێشمەرگەی کاک مەلا بەختیار دا ژمارەمان دای لە نزیکەی ٥٠ پەنجا پێشمەرگە ئەوکاتە خۆ حەشاردان و شاردنەوەی هێزێکی وەها نەک هەر ئاسان نەبوو، بەڵکو دژواریش بوو، چونکە قۆناخەکە قۆناخی پارتیزانی بوو، واتە مەفرەزەی بچووک بچووک نەک یەک خستنی هێزێکی وەها، ئەمەش لەکاتێکدا بوو دوژمن کەوتبووە جێبەجێکردنی پلانی ڕاگواستنی ئاواییە سنوورییەکان.

پاش چەند ڕۆژ ئاواییەکانی بۆین[١]، ڕێشاو، کۆساوا، سازان، چنار، مۆردین مان خستە پشت سەرو دوای پەڕینەوەمان لەدەریاچەی دەربەندیخان گەشتینە ئاوایی لاوران، لەنزیک ئاوایی لاوران چووینە کانی چناری پشتی

---

١ - ئەو ڕۆژە گەشتینە ئاوای بۆین بۆ نیوەڕۆ کاتی دابەش بوون، شەهید مەحمودی حاجی فەرەج بە مەلا بەختیاری وتبوو: تۆ میوانی ئێمەیت، ئەویش ئەپرسێ لەکوێ؟ مەحموود: ئەڵێت لەگەڵ ڕۆستەمی زێبا دوو مریشکیمان کڕیووە لەو ماڵە چاکیان کردوە بۆمان تۆش وەرە. مەلا نەک نەڕۆیشت نەیهێشت خۆشیان بیخۆن، ڕەخنەی لێگرتن و کۆبوونەوەیەکیش کرا لەسەر ئەو مریشکانەو مەحموودو برادەرەکانیشی چوونە ماڵێکی تر بۆ نان خواردن، مریشکەکان بەجێمان بۆخاوەن ماڵەکە. عەبدوڵلای سلێمان بەگ ویستبووی بەدزی مریشکێکیان بخاتە ناو کوڵەکەی خەبەریان لێدا، مەلا ئەویشی لێ سەندنەوەو ناردییەوە بۆماڵەکە. ئەیووت نابێت پێشمەرگە یان مەسئول بەجیا خواردنی جیاواز بخوات.

کانی سالار لەداوێنی چیای بێزەلدا، بۆ دۆزینەوەی مەلاعەلی،[1] مەلابەختیار نامەیەکی بەچەند کەسێکدا بۆ نارد تابێتە ئەوێ بۆچاوساخی و ڕێنوێنی هێزەکەمان.

سەرلەبەیانییەک نزیک کاتژمێر ١٠ بوو، دوو چەکدار لەناو ئاوایی لاورانەوە هاتنە لامان، یەکێکیان ئاخەی حاجی مەحمودی ئیمامی و ئەوی تریان کوڕێکی گەنج بوو، کوڕە گەنجەکە بە مەلابەختیاری ووت ئێوە میوانن بۆتان نییە بنێرن بەدوای خەڵکدا، هەردووکیان چەک کران و لەپەنایەکەوە دانران، لەڕاستیدا ئێمە بۆ هەلێک دەگەڕاین قادری حەمە ساڵح ڕەشید یا عەزیزی برای یا هەربەرپرسێکی قیادە موەقەتە بەدیل بگرین بۆ ئاڵوگۆڕ پێکردنیان لەگەڵ ئازاد هەورامی یان هەریەکێکی تر لەهەڤالانمان کە لەزیندانی ئەواندا بوون.

بۆ ڕۆژی دوایی کەرتەکەی ئێمە کە هەژدە کەس بووین، لەگەڵ شەهید گریانەیی چووینە ئاوایی کانی ژنان مەلا بەختیار و هێزەکەی تریش دابەزینە ئاواییەکانی لاوران و گەڕاو ئەم سێ ئاواییە لەناوچەی تاوگۆزیدان، چۆمی زمکان لەناو ئێراندا سەرچاوە ئەگرێ بەبەردەمی ئاواییەکانی کانی ژنان، گەڕاو، لاوەران دا دێو لەگەڵ لێڵەو سیراون لە بەر دەم لاوەران دا یەک ئەگرنەوە هێڵێکی دابڕینی ئەم سێ ئاواییەی لەگەڵ ئاواییەکانی تری ناوچەکەدا دروست کردووە ئەم سێ ئاواییە کەوتوونەتە بەری بناری چیایی بێزەل، عەسری ئەو ڕۆژە کە ئێمە لەکانی ژنان بووین، مەفرەزەیەکی (١٧) کەسی بەسەرپەرشتی عەزیزی حەمە ساڵح هاتنە کانی ژنان کە لەئاوایی شێخ سێڵەی دیوی ئێرانەوە هاتن و بارەگای سەرەکییان لەئاوایی ناوبراودا بوو لەناوخاکی ئێران دا.

ئەوان بەئێمەیان نەزانی تاهاتنە لامان، تێکەڵ بووین، بەشێکمان لە هەردوولا یەکترمان دەناسی، ئەوان یەکێکیان بێچەک بوو.

---

[1]- مەلاعەلی خەڵکی ئاوایی زمناکویی ناوچەی شەمێران بوو، پێشمەرگەی سەرەتایی و فەرماندەی مەفرەزەی یەکێتی بوو لەو سنوورەدا، خۆی کۆمەڵە بوو، بەڵام دواتر چووە ناو ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانو ئێستا پلەی ئامر لیوای لە هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا هەیەو لە هەولێرە.

پێشمەرگەیەکیشیان ناوی ئیبرایم شەمێرانەیی بوو، پێشتر لەگەڵ ئێمە بوو بوو، لە مەفرەزەکەی هەورامان، لووتی توشی نەخۆشی شێرپەنجە بوو بوو برینەکەی چاک نەئەبووەوە، لەبەر ئەو نەخۆشیە پێشتر بەجێی هێشتین و چوو بووە ناو ئەوان قیادە موەقەت بۆ ئەوەی لەئێران چارەسەری خۆی بکات، هەر ئەو ئێوارەیە پێی ووتم بە کاک ئەحمەد بڵێ من دێمەوە ناو یەکێتیی، بەڵام بەداخەوە لەوشەڕەی ئەو شەوە ڕوویدا ئیبرایم یەکێک لەقوربانیەکان بوو، کەبەشەڕی کانی ژنان ناسراوە.

# تاوگۆزی و ڕووداوەکەی کانی ژنان

ئێوارە عەزیز پێی وتین سبەینێ میوانی ئێمەبن و بچین بۆ دارو شەخسەکەی بەڕوێن لەوێ حەیوان دەکرین و دەیخۆین. ئەمە لەژێرەوە نامەیەکی بۆ قادری برای نووسیوە کە ئەمە بەشێک لە دەقی ناوەرۆکەکەیەتی (ئێوارە گەیشتینە کانی ژنان جەلالیەکان هەژدە کەسن و لەگەڵ ئەحمەد گریانەیی لێرەن، میوانم کردوون بۆ سبەینێ نیوەڕۆ ئەیانهێنم بۆ دارو شەخسەکەی بەڕوێن ئێوەش وەرەن، ئەگەر خۆشت نەهاتی جەماعەت لەگەڵ حەسە کوڕپەدا بنێرە بۆ لامان)، ئێمە لەکاتی گەڕانەوەی بێچەکەکەی ئەواندا ئەم نامەیەمان پێگرت، ئیتر لەناوەڕۆکی نامەکەدا نیازو مەرامی میوانەکەی سبەینێ ئاشکرایە.



عەلی شامار و کاک ئەحمەد بانگیان کردم پێیان وتم تۆ بڕۆ بۆ گەڕاو و لاوران ئاگاداری مەلا بەختیار بکەو پێی بڵێ جەماعەتی قیادە موەقەت هاتوون لەکانی ژنانن، عەزیزو حەڤدە کەسن، وتم باشە، تاریکی کرد بەشێوەیەکی زیرەکانە خۆم دزیەوەو ڕۆشتم بێئەوەی برادەرەکانی خۆشمان بزانن، لەنێوان گەڕاو و کانی ژنان دا گەیشتم بەکاک مەلا بەختیارو هێزەکە، خۆیان بەرەو کانی ژنان ئەهاتن، کاتێک من و پێشڕەوی هێزەکە بەیەک گەیشتین ئەوهاواری کرد کێی زەلام نەجوڵێیت؟ وڵامم دایەوە خۆمانین، ئێوە کێین؟ پێشمەرگەین تۆکێیت؟ منیش پێشمەرگەم، بەیەک ئاشنا بووین، کوا کاک بەختیار؟ هاتە پێشەوە، ها حەمە ئەوە بۆ کوێ؟ وتم بۆ لای ئێوە هاتووم، بانگی کرد هەرکەس لە جێگەی خۆیدا دانیشێ، چووینە کەناری ڕێگاکەو

لەجەماعەت دوور کەوتینەوە، مەسەلەکەم تێگەیاند، ووتی لەپێشەوە بڕۆ، گەیشتینە نزیکی ئاوای بوەستە، هاتین تانزیک ئاوایی لەوێ وەستاین، بڕیار درا شەهید دکتۆر رەزا لەگەڵ شەهید ڕۆستەمی زێبا و چەند پێشمەرگەێک و دوو دیلەکە کەڕۆژی پێشتر چەک کرابوون ئاغەی حاجی مەحمود و هاوڕێکەی لەخوار کانی ژنان بمێننەوە و ئێمەش بچینە ناو دێ.

مانەوەی ئەمانەو نەهاتنیان بۆ ئاوایی لەگەڵ ئێمەدا لەبەر ئەوە بوو، یەکەم: تا عەزیز و جەماعەتەکەی نەزانن ئەم دوو کەسەچەک کراون، دووەم: شەهید ڕۆستەمی زێباش کاتی خۆی حەمەی برای لەشۆڕشی ئەیلولدا شەهید کراوە بەدەستی چەند کەسێک، ئەوانە لەم کاتەدا لەگەڵ عەزیزدا بوون. ئەوانیش ئەحمەد و براکانی و عەزیزی تۆفە کوللە سەر و براکانی بوون.

کەئێمە چووینە ناودێ هەموو پێشمەرگەکان، ئەوانەی ئێمە و ئەوانەی ئەوانیش پێکەوە دابەش بوو بوون بۆ نانخواردن و هەندێکیان لەماڵان هاتبوونەوە لەسەربانێک بەتێکەڵی ڕاکشابوون بۆ خەووتن و هەندێکیش لەماڵان نەهاتبوونەوە، مەلا، گریانەیی و شاماری بانگ کردە لای خۆی، دوای قسەکردن وەرگرتنی زانیاری زیاتر، چەند کەسێکی تری خۆمانی بانگ کردە لاوە و قسە کرا لەسەر ئەوەی کەچی بکەین، لەوانە غەفوور دەرەشیشی، فەرەج تریفەیی،مەحمودی حاجی فەرەج، مامۆستا شاهۆ، فەتاح ئێناخی، خۆم و...تاد.

بڕیار درا هەر ئەمشەو ئەم جەماعەتەی عەزیز حەمە سالح چەک کەین، من نازانم چی ڕوویدا دواتر مەلا بەختیار پەشیمان بوویەوەو ووتی ئەیخەینە سبەینێ، ئێمەش ب لاوەمان لێکرد، جارێکیتر مەلا بانگی کردینەوەو ووتی: سبەینێ ناکرێ هەر ئەبێ ئەمشەو چەکیان بکەین، بۆ چەک کردنیان بەرنامەکەشی بەم شێوەیە دانا: ووتی بە مامۆستا شاهۆ تۆخۆت و چوارکەس دووکەسی ئەوان بەرە بڵێ بابچین بۆ ئاوایی زارێن نان بهێنین بۆ سبەینێ لێرە هێزەکە زۆرەو نان کەمە، هەرئێستا بڕۆن لێرە دوور کەوتنەوە ئەوانەی ئەوان چەک بکەن، بەمنی ووت تۆو عەزیز عەبدوڵڵا بچنە بەردەم ئەوماڵەی عەزیزی حەمەساڵحی لێیە، ووتمان بەسەر چاوو، بەرلەوەی کەسی تر دیاری بکات، هەڤاڵان غەفور و فەرەج ووتیان ئێمە ناسیاوین و تێکە لاوەیمان هەیە... مەلا نەیهێشت قسەکە تەواو کەن ووتی باشە ئێوە دوور

کەونەوە. ڕووی کردە مەحمودی حاجی فەرەج ووتی تۆو فەتاح و دڵسۆزو خۆت دوو سێ کەسی تر دیاری بکە ئامادە بن، ئەوە بوو هەر ئەمانەی ناوم هێنان و چەند کەسێ تر ئاگادار بوون، عەزیزیش گومانی کردبوو لەوەی کەئەم هێزە زۆرە لەکوێوە هاتن؟ و ناشزانن مەلا بەختیار لێرەیە، بۆیە بەعەزیز ووترا ئەگەر سبەینێ بچین بۆ بەڕوێن ئەوا هێزەکە زۆرین و نان بەشمان ناکات، بامەفرەزەیەکی هاوبەش لەپێشمەرگەکان بنێرین بۆئاوایی زارێن بۆ هێنانی نان، عەزیز دووکەسی دیاری کرد مامۆستا شاهۆ و چەند کەسی ئێمەش لەگەڵ ئەوانەی ئەوان بەڕێکەوتن، مەلا بەختیار بە مامۆستا شاهۆی ووت دوور کەوتنەوە یەکسەر چەکیان بکەن، ئەوان ڕۆشتن و ئێمەش ئەو حەوت هەشت کەسە بەو جۆرە ڕاسپێردرابووین ئامادە بوین بۆچەک کردنی ئەوانەی لەدێدا ماونەتەوە.

بڕیار بوو هەرکات مەلا بەختیار بەدەنگی بەرز بانگ بکات کاوە، ئێمە گوێمان لەدەنگەکە دەبێت هەرکەسەو چەکدارەکەی تەنیشتی چەک بکات، سەرەتا کەبەدەنگی بەرز بانگی کرد کاوە، کوڕێک بەناوی کاوە مەخمووری کە بەرپرسی دەستەکەی خۆی بوو ووتی: بەڵێ، مەلا دووبارەی کردەوە کاوە، ئێمە عەزیزمان چەک کرد لەگەڵ کوڕێکی تر بەناوی عەبدولکەریم پاسەوانی عەزیز و خەڵکی سەرشاتە بوو، لەولاوە لەوشوێنەدا کەپێشمەرگەی هەردوولامان تێکەڵ بوون، بڕیارە مەحمود چەکیان بکا بوو بەتەقە، عەزیزە لە لای مندا بوو بووم بەدەنگی بەرز هاواری ئەکرد، کەس تەقە نەکات من گیراوم باکەس نەکوژرێت، بەڵام تەقە نەوەستاو ماوەی پێنج دەقیقەی خایاند، دوای تەواوبوونی تەقە عەزیزمان برد بۆ لای مەلا بەختیار، مەلا لەسەر سەنێرگەیەک وەستابوو، عەزیز کلاشینکۆفێکی یەکلاق و دەمانچەیەکی حەوت تیری پێبوو، ووتمان: ئەوە عەزیزە و ئەوەش چەک و دەمانچەکەی، لەو ساتەدا یەکێک لەلاوە هاتوو لەبەر دەستی مەلادا بەقۆنداخی چەکەکەی کێشای بەبناگوێی عەزیزدا، مەلا زۆری پێناخۆش بوو، بۆیە توڕە بوو لەو هەڤاڵەو پێی ووت بۆ کاری ترسنۆکانە ئەکەیت پاڵێکی پێوەنا لەسەر سەنیرگەکە کەوتەخوارەوە .

دواتر دەرکەوت ئەوبرادەرانەی ئێمە داوایان لەپێشمەرگەکانی خۆمان کردووە بێنە ئەملاوە لەوان دور کەونەوە، ئەوانیش بەگوێیان نەکردبوون،

لەوکاتەدا ئەو چەند کەسەی دانرابوون داوای چەک دانان لەوان بکەن، یەکێکیان کوڕێکی پەلەپەل کەر بوو بەناوی حەمەعەلی فەتاح، یەکسەر تەقەی کردبوو، تەقەکە لەوەوە دروست بوو، ئەگینا لەڕاستیدا بەرنامەی تەقەکردن و کوشتنی کەسمان نەبوو، حەمەئاواتیش یەکێک بوو لەو پێشمەرگانەی خۆمان لەناو پێشمەرگەکانی ئەواندا، ئەوانەی خۆمان برینداریان کردو هەردوو لاقیان شکاند.

لەئەنجامدا ئەوان چواریان بونە قوربانی و سیانیشیان لێ بەدیل گیرا، ئەوانی تر هەڵهاتن و لەسەر گردێکی ئەوبەرەوە دەستیان کرد بەتەقەکردن لەئاوایی. پاش کەمێک ئەوانیش ڕۆشتن، ئەوانەی بڕیار بوو م.شاهۆ چەکیان بکات چەکی نەکرد بوون ووتی دور نەکەوتبووینەوە تەقەکە کرا تاریک بوو ڕایان کرد، عەزیز و دوانەکەی ترمان هێنا و ئاوایی کانی ژنانمان بە جێهێشت و هەر ئەو شەوە گەشتینە کانی چنار خۆمان ئامادەکرد سبەینێ ڕژێم هێرش بکاتە سەرمان.

حەمە ئاوات هەردوو لاقی شکا و خراپ بریندار بوو، بەدارەمەیت گەیاندمانە جێ، شەو چووینە بناری بێژەل بۆ پشتی ئاوایی لاوران تا بەیانی خۆروبان گەرم بوو، وردە وردە هاتینە سەر کانییەکەی کانی چنار، لەوێ چەند ڕۆژێک مابنەوە، مەلا خەریکی نامەنووسین و ئیش و کاری ناردنەوەی حەمە ئاوات بۆ شارو بەردانی دیلەکان بە کەفالەت بوو جگە لە عەزیز، یەکێک لە دیلەکان حەمە پشتەیی بوو، باوکی پیاوێکی ڕیش سپی خڕەلانەی هەژار بوو، هاتەلامان لە کانی چناری بنار چیای بێژەل، دوای ئازاد کردنی کوڕەکەی داوای کرد لە لای خۆمان بیکەین بە پێشمەرگە، ئەویش وەرگیراو حەمەپشتەیی بوو بەباشترین پێشمەرگەی یەکێتی، کەبەڕاستی لای ئێمە هەڵسوکەوت و قارەمانێتی و ئەخلاقی شۆڕشگێڕانەی جێگەی سەرنج بوو، بەداخەوە دواتر لەشەڕی ناوخۆو لەشارباژێر بەدەستی پارتی شەهید کرا.

کاک حەمەی حاجی مەحمود و خاڵە سەیید کاکەیش هەریەک لەنووسینەوەی بیرەوەریەکانی خۆیاندا باسی ئەو شەڕەیان کردووە، کەلەگەڵ چەکدارەکانی قیادە موەقەتە لەئاوایی کانی ژنان ڕوویدا، بەلام ئەم دوو بەڕێزە هیچکامیان بەشداربووی ئەو ڕووداوە نەبوون لەوناوچەشەوە نزیک نەبوون، بۆیە لە گێڕانەوەیدا کەوتوونەتە هەڵەوە، مامۆستا پشکۆش

لەئەزموون و یاددا باسی لێوە کردووە، کەئەو خۆی تێدا بەشدار بووە، ئێمەش بەم شێوەیە دەیگێڕینەوە کەلەتۆمارگەی بیرماندا جێگەی گرتووە.

با ئەوەشمان لە بیر نەچێت مەلاعەلی زمناکۆیی کە فەرماندەی مەفرەزەی ئەو سنوورە بوو، ئێمە چووینە سنوورەکەی، مەلا نامەی ناردبوو بەدوایدا بێت بۆ چاووساخی هێزەکەی ئێمە، بەڵام بەرلەوەی بگاتەلامان کەزانی ئاغەو ئەوان چەک کراون، شەڕی کانی ژنانیش ڕوویدا، ئیتر خۆی ونکرد و نەمان بینییەوە، دواتر ئێمە ناوچەکەمان جێهێشت ئەویش چوو بووە ناو قیادە موەقەت بۆ ئاوایی شێخ سێڵە، ئەم ئاواییە بارەگای قیادەی موەقەتی لێبوو لەکوردستانی ڕۆژهەلات، لەناوچەی جوانڕۆ.

# تەقاندنەوە و سووتاندنی ئاواییەکانی سەر سنوور

بەبۆنەی سەرهەڵدانی شۆڕشی گەلانی ئێرانەوە، وولاتی ئێران بەرنامەی چۆلکردنی دێهاتەکانی سنوری خۆی لەگەڵ عێراق لە کوردستانی رۆژهەلات بۆ جێبەجێ نەکرا، کەلە رێککەوتننامەی جەزائیردا بڕیاری لێدرابوو، بەڵام رژێمە فاشیستەکەی لەمەڕ خۆمان مانگی ٧-٨ / ١٩٧٨ هەر رۆژەی چەند ئاواییەکی دەکردە کەلاوەیەکی گەورە و خەڵکەکەش بەزۆر راپێچ دەکران بۆناو کۆمەڵگا زۆرە ملێیەکانی نزیک شارەکانی ناوچەکە، ئیتر ئێمە لەحاڵێکی ناهەموارەوە کەوتینە داوی حاڵێکی دژوار ترەوە. لەناوچەی تاوگۆزیەوە لە کانی چنار مەفرەزەیەک جیا کرایەوە بۆ ئەوەی عەزیز حەمە سالح بەرنەوە بۆ سنوری هەورامان، عبدالکریم سەرشاتەیی ئازاد کرا حەمە پشتەییش لەلامان بووبە پێشمەرگە.

حەمە ئاوات بەو برینە سەختەوە نێردرا خۆی رادەستی رژێم بکات، چونکە هیچ چارەسەرێکی لای ئێمە نەبوو مەگەر بمانکوشتایە، چاکە چارەنووسی هەر تیاچوون بێت بابەدەستی رژێم بێت باشترە [1]. غەفوور دەرەشیشی و مەفرەزەکەی عەزیزیان بردو رووە و هەورامان بەرێکەوتن. ئەوی ترمان کەماینەوە جەولەیەکی ئاواییەکانی تاوگۆزی و شەمێران مان کرد، لەم جەولەیەدا سەردانی ماڵی سەیید عەبدولرەحمان تاوگۆزی کرا لە ئاوایی سەرشاتە و لەشەمێرانیش سەردانی ماڵی کاک حەمەسەعیدی مەحمودی حەمەی سان ئەحمەد کرا.

---

[1]- وەک ئاماژەمان پێدا پێشتر ئەگەر پێشمەرگەیەکمان بریندار بوایە حەمەئاوات برین پێچمان بوو، ئەو چارەسەر و تەداوی ئەکردن، ئێستا خۆی بریندارە برینداریکی قورس هەردوو لاقی شکاوە، نامەیان بۆ ناوشار نووسی پێم وابێ بۆ تۆفیقی رەعنا بوو، بۆئەوەی تەسلیمی بکاتەوە، چەند رۆژ دوای نامەکە شەوێک بە دارە مەیت حەمەمان بردە سەر دەریاچەی دەربەندیخان لەبەردەم ئاوایی لاوەرانو خرایە ناو بەلەمە شکاوێک و فەرەج تریفەیی و چەند پێشمەرگەیەک بردیان بۆ ئەوبەر بۆ ئاوایی کەوتەی ناوچەی نەورۆلی لەوێ لەجێگەیەی دایان ناو هاتنەوە، لەهەڵەبجەوە هاتن بردیان تەسلیمان کردەوە.

لەوکۆبوونەوانەی لەو دووناوچەیە کران باس و خواس لەسەر کارەساتی هەکاری تەفرو توناکردنی هێزێکی یەکێتیی کە لەچوارسەد چەکدار و ٣٠٠ بێچەک پێک هاتبوو کرا، ئەوەش روون ئەکرایەوە کەئەم هێزە بۆ هێنانی چەک رۆشتوون و بڕیار بووە لەناوچەی سێ سنوورەوە تاقەندیل بارەگا دابنێن و چەک بێنن بۆ بەرگری کردن لەو ئاواییانەی سنوور کەڕژێم مرِی چۆلکردنیانی لێ خۆش کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک قسە کرا لەسەر ئەم شەڕەی لەکانی ژنان ڕوویدا، ئێمە هەوڵمان ئەدا خەتاکە هەمووی بخەینە سەر ئەوان، بەلام خەلکەکە بەگشتی شەڕەکەیان پێناخۆش بوو، کاریان بەوە نەبوو خەتای کام لایە.



پاش هەفتەیەک ئێمەش ناوچەکانی شەمێران وتاوگۆزیمان بەجێهێشت و گەڕاینەوە هاتینە کانی سالار، خۆمان ئامادە کرد بۆ گەڕانەوە بەرەو هەورامان دوای ئەوەی نان و ناوساجی بەدەست هات ئێوارەیەک کەوتینەڕێ بەرەو لای تەوەنەوەل و چنار و مۆردین. چەند پێشمەرگەیەک نانمان بەکۆڵەوە بوو، هەندێک دەیان ووت دێهات لەپێشمانە بۆ نان هەلگرین؟

حەمە عەلی فەتاح کەدواتر لەبناری کۆسرەت شەهید بوو، قازێکی کرِیبوو کولاندبووی لەگەڵ نان و ناوساجیدا کردبوویە کۆڵێک بەشانییەوە، ڕێگەی گەڕانەوەمان بەدامێنی چیای بالانبۆ و گوێ ئاوی سیرواندا بوو، ئەوەندە شوێنێکی هەلەت و هەلدێر بوو بە دژواری بە ڕێگەیێکی لێژوو سەخت دا تێپەڕ بووین چیاکەیش ئاگری گرتبوو پەنگاویی ئاویی سیروانی ڕۆشن کردبووەوە، سایەو سێبەری قەتارەی پێشمەرگە لەسەر مەنی ئاوەکە ئەتوت ئەوە جەماعەتێکی ترن، کۆلەکەی حەمە عەلی خلۆر بوویەوە بۆناو ئاوەکە،

بەحەسرەتەوە تەماشای دەکرد، چونکە دایبابوو رۆژێک بەخواردنی گۆشتی ئەو قازە برسێتی بشکێ.

دەمەوبەیانی نزیک بووینەوە لە چنار و مۆردین ، دیتمان چڕە دووکەڵ ملە و بەندەنەکانی پۆشیوە هەردوو ئاواییەکە بە تی ئێن تی تەخت کراون و سەفاکەی جارانیان ماتەمینییەکی قورسی دەنواند، سەربازەکانی ڕژێمیش لەبەرزاییەکانی دەورو بەری ئاوایکاندا بوون، بەرلەوەی پێمان بزانن ئێمە داگەڕاینەوە بۆ دەوەرەی هەوارگەی گوێ ئاو، لەوێ بەنارنجۆک ژمارەیەک ماسییان کوشت، من و شەهید گریانەیی و چەند پێشمەرگەیەکی تر چەند ماسیەکمان دەرهێناو پاشان بەبێ خوێ برژێندران، گریانەیی پارچە پارچە دابەشی کرد بەسەر هێزەکەدا.

لای ئێوارە سوپای دوژمن پاشەکشەیان کرد، ئێمەش هاتینە ناو ئاوایی چناری کۆکۆیی نشینی[1] وێرانە خاک، بۆ خۆم قورئانەکەی

---

[1]- کۆکۆییەکان لە بنچینەدا لەوبەر ئاوی سیروان نیشتەجێ بوون، لە سنوری باینگانی ناوچەی پاوە و لهۆن. نشینگەشیان سێ ئاوایی گوێی ڕووباری سیروان بووە بە ناوەکانی سیمان، بەورۆڵ، کوڕی گەور ئێستا ئەو ئاواییانە لە بەشی خۆرهەڵاتی کوردستاندان. لەمبەری ئاوی سیروان تەنیا لە دوو ئاوایی بە ناوەکانی نەیجەڵە و بۆیندا ژیاون ئەم دوو ئاواییەش ئەکەونە باشووری کوردستان. ئەوان لە دەورانی عەشایریدا هاتوونەتە ئاواییەکانی چنار لەودیو چیای بالانبۆ و چاوگ و باوەکۆچەک نیشتەجێ بوون. دانیشتوانی ئاوایی چنار خزمایەتی و ژن وژنخوازیان لەگەڵ بنەماڵەی سانەکانی هەوراماندا هەبووە هەڵکەوتەی جوگرافیایی ئاواییەکانی کۆکۆینشینیش سەخت و قایم و چەپەکە، بۆیە لەکاتی لێقەومانی بنەماڵەی سانەکانی لهۆن لەگەڵ دەوڵەتەکانی ئەوکاتی ئێران لەسەردەمی قاجاریی و هەم لەسەردەمی پەهلەویش دا پەنایان بردووە بۆ ئاواییەکانی کۆکۆینشین لە بۆین و چنار. سنوورەکەشیان لە دەورانی دابەشبوونی عەشایریدا کەوتبووە چوارچێوەی حکومڕانی و دەسەڵاتی لهۆنییەکانەوە. باوا ڕۆبیتەن باپیری شەهید مستەفا کۆکۆیی هاوسەرەکەی هەورامی بووە لەگەڵ جافرساندا ئاوەڵزاوا بوون، بۆیە لە لێقەومانی ئەم دواییەو لەدەورانی ڕەزا شای پەهلەوییدا ئەو پیاوانەی لهۆن کە هەڵوێستیان دژی ڕژێمی پەهلەویی وەرگرت پەنایان برد بۆ لای کۆکۆییەکان و لە ئاوایی چناردا مانەوە. هەردوو دەوڵەتی ئێراق و ئێرانیش لیژنەیێکی هاوبەشیان دروستکرد بۆ گرتنیان و تەسلیم

مزگەوتەکەم دی لایەکی سووتابوو، لاسووتاوەکەی تری کەوتبووە ناو ئاودەستەکانەوە دەرم هێناو لەلاوە دامنا، ئەم ئاوایییەش هەنجیر و ترێی باشی هەبوو، جگەلەوەی تێرمان لێ خواردن، هەریەکەو بەشی ڕێگەشمان لێ هەڵگرتن، چونکە ئەمانزانی تازە ئاوایییەکانی دەوروبەری سازان کە لە پێشەوەمانن نەماون و ئەوانیش یەختەسار کردن بۆتە چارەنووسیان.

ئەو ئێوارە هەندێک پێشمەرگە ترس دایگرتن لەئاوایی چنار خۆیان نەخۆش خست و وتیان ناتوانین ڕێ بکەین، خۆیان کەنار گرت و دواتر تەسلیم بەڕژێم بوونەوە، لەوانە شێرزاد نەورۆڵی و لەتیف پریسی و چەند کەسێکی تر. سەر لەئێوارە ئێمە کەوتینە ڕێ، درنگانی ئەو شەوە گەشتینە ئاوایی سازان و چرایەک لەئاوایی تروسکەی ئەهات، من و فەتاح ئێناخییان نارد تابزانین ئاوەدانی هەیە یانا ئەگەر هەبێت هەندێ نان بێنین و بزانین دنیا چباسە، کەڕۆشتین بینیمان تەنیا پیرەژنێک بەدیار چرا فانۆسێکەوە دانیشتووە، فەتاحی دەناسی پێی ووتین: بڕۆن سەربازو هێز لەدەوری ئاوایین ئێوە لەکوێوە هاتوون، هەموو خەڵکیان ڕاگواستووە بۆ هەڵەبجەو من بەدیار شڕوشیتاڵەوە ماومەتەوە، سبەینێ زیل دێن منیش بار دەکەن، زیلی عەسکەری بەشی هەموو خەڵکی ئاوایی نەکردووە بەیانی دێنەوە، چەندماڵێکیش لەترسا خۆیان بەرەو شار ڕۆشتوون وکەلو پەلیان جێ ماوە.

---

کردنەوەیان بە ئێران، کاتێک ئەو لیژنەیەش چوونە ئاوایی چنار و پیاوەکانیان کۆکردەوەو لەناو مزگەوت و سوێندیاندان بە قورئان کە بەگزادەی لهۆنیان پەنا نەداوە، هەریەکە سوێندی خوارد بەجۆرێک سوێندەکەی نەکەوێت، کەسێکیش، کە لەگەڵ لیژنەکەدا بووە وتبووی سوێندیان بە تەلاق بدەن. بۆ ئەو مەبەستەش خەڵکەکە ئەنێرنە دەرەوە تا بچن بە دوای هاوسەرەکانیاندا تا لەو سوێندخواردنەدا ئامادەبن، کۆکوییەکانیش پلانێک دائەنێن، تا هەریەکەو هاوسەری یەکێکی تر لەگەڵ خۆیدا بباتە ژوورەوە بۆ سوێند خواردن و بڵێ: تەلاقی ئەم ژنە کەوتبێت بەگزادەی هەورامی لەماڵماندا نییە. بەو جۆرە هەموو سوێند دەخۆن کەسیش سوێندەکەی ناکەوێت. لەکاتی گەڕان بە شوێن ئەم زانیارییەدا یەکێک لە نەوەکانی مام عەبدوڵڵای باوکی شەهید موستەفا کۆکویی پێی ووتم : نەنە خورشەی هاوسەری باوا عەبدوڵڵا چەندین جار ئەوەی بۆی گێڕاوینەتەوەو وتوویەتی: ئەو ڕۆژە من لەگەڵ حاجی فەرەجی مام نادردا چوومە ژوورەوە.

پیرەژنی داماو نانی نەبوو، ئێمەش بەدەست بەتاڵی هاتینەوە، دوای گەیاندنی هەواڵەکە بەبرادەران بەڕێکەوتین بەرەو کۆساوا و بەیانی لەگەڵ گزنگی خۆردا ئاوایی بۆین دیسان لەئامێزی گرتین، بەڵام ئەمجارە نەداری بەسەر بەردەوە ماوە و نەسرتەیەک پێمان دەڵێ: منداڵەکانمان دیمانەتان بەخێر. من ئەم بەیانیە پێشڕەوی هەڤاڵان بووم لەپلەکانی خوار ئاواییەوە سەرکەوتم بۆ ناو ئاوایی سێبەری چیای داڵەڕی باڵی کێشابوو بەسەر کەلاوە داتەپیوەکاندا، وابزانم خۆر


[illegible] ١٩٧٨ [illegible]

لەپشتی چیاکەوە وەستابوو دڵی نەدەهات چاوی بەو وێرانەیە بکەوێ، پاڵم دا بەبەردێکەوەو نیگام خستە سەر زنجیرە چیاکانی پشتی ئاوایی ولاتێکی سامناک و کشوومات، دیمەنی وێرانەی گوندی خۆشم دۆڵبیان[1] هاتە بەر چاوم، وردە وردەو بەبێدەنگی یەک یەک هەڤاڵانی دواوە دێن و ورد ئەبنەوە لەوێرانەی کەلاوە گەل . دوای گەیشتنی هەموان کەوتینە گەڕان بۆ دۆزینەوەی ئارد یان هەر خۆراکێکی تر، بەڵام چاومان بەزەوای خوا نەکەوت. شەش پێشمەرگە ووتیان لەولای ئاوایی ئەشکەوت هەن، بەبێچەک ئەچین بزانین چی لێیە، ئەو شەش کەسە دروویان کرد، رۆشتن ئیتر هەر نەمان

---

[1] دۆڵبیان بەر لەئاواییەکانی دراوسێمان تەقێنرابووەوە، ناوچەکەش بەقەدەغەکراوا ڕاگەێنرا بوو سەرەتا بەناوی ڕاگواستنی شریتی سنووری عێراق و ئێران هەرئاواییەک خەڵکەکەی دەر ئەکرا ، هەر جووتیارێک لەباتی خانوو باخەکەی بەبڕێک پارە قەرەبوو ئەکران، ئەو بڕە پارە لیژنەیەک دیاری ئەکرد، ئەو ماڵەی کەسێکیان پێشمەرگەبوایە قەرەبووەکەیان ئەکردە لاسەرف. بۆباخ وماڵو مولکی ئێمە لیژنە نزیکەی حەفتا هەزار دیناری دیاری کردبوو بەڵام نەک ئەوەی ئێمە هی سنووری دۆڵبیان هەموو بوو بە لاسەرف.
بۆیە ئەگەر ئاواییەکانی کوردستان ئەوانەی ساڵی ١٩٧٩ بەزۆرە ملە کۆچ پێکران و جێبەجێ کردنی بەندێکی ڕێکەوتن نامەی جەزایریش بوو، بەناوی قەرەبووەوە ماڵومولکیان فرۆشتبێ و بەعس کڕیبێتی، ئەوە دۆڵبیان ئەو ئاواییەیە بستێک خاکی نەفرۆشراوە.

دیتنەوە تا هەواڵمان زانی س لاوەیان لەڕژێم کردووەو ماڵ ئاوایی لەمەردایەتی و کوردایەتی.

بەڵام مەردانە چەکەکانیان نەبرد لەوێش بە هیلاکیەکی زۆرەوە کەوتینە ڕێ و لەرێگای مەڕمانگانەوە گەڕاینەوە گریانە. ڕژێم ئەم پەناگەو ماڵەباوانەشی تێک دابوو بەسەر یەکدا، بەڵام ئەو مەفرەزەی پێشتر عەزیزیان هێنابوویەوە، ئارد و برنج و ڕۆن و هەندێ پێداویستی تریان شاردبوویەوە و لەباخێکدا بارەگایان چێ کردبوو، یەکێک لەپاشەکەوتەکان هەنگوین بوو ڕژێم هەنگەلانەکانیان تەقاندبوویەوە، ئەمانیش هەنگوینە ڕژاو، پژاوەکەیان بەهێڵەک پا لاوەتبوو کەسوودێکی تەواوی هەبوو بۆمان. هەر ئەو ڕۆژە من بەهاوکاری چەند کەسی تر دەستمان کرد بە نان کردن، نانی هەورامیمان دروست کرد لە وێرانەی ئاوایی گریانەدا. پاش دوو ڕۆژ پشوو دان، مەلا بەختیار تەشکیلاتێکی نوێی کردو سێ مەفرەزەکەی سنوری هەڵەبجە-هەورامانی کردە سێ کەرت و هەرکەرتەش سێ مەفرەزە.

دوای تەشکیلات و پشوودان، لە ڕۆژی١٥ ئابی ١٩٧٨ دا هەموو لەناو باخەکانی بەردەم ئاوایی گرییانەدا بووین، پێشمەرگەیەک بەناوی عومەر باسام حەرەس بوو، دیتمان کۆپتەر لەچەند لاوە هاتن و لەبەرزاییەکانەوە سەرباز دائەگرن، دابەزینە ناو ئاوایی چونکە چەند ماڵێک مابوون تەختی زەوییان بکەن، ئێمەش بەچەمەکەدا بەرەو دەراوی گریانە ڕۆشتین بۆ ئەوەی توشی شەڕ نەبین. لەناکاو تەقە کرا لەکۆپتەرەکان و ئەوانیش دەستیان کرد بەئاگر باران، پووش و پاوەنی زۆر گڕی گرتوو دیمەنێکیان لەدۆزەخ دروست کرد.

گریانەیی چەند پێشمەرگەیەکی لەخواروی ئاوایی گل دایەوە و سەرکەوتین بۆسەر نیوقەدی شاخەکە، هەم بۆ بەرگریکردن لەپێشمەرگەکان و هەم زانیمان پێشمەرگە بەجێ ماون و تەقە لەئاوایی دروست بووە. ئەم جارەش پۆستاڵی سەربازەکان ڕەنگێکی نامۆ و دزێوی لەسەر روخساری ئاواییەکە دارشت.

بەپەلە چەند ماڵێکیان لەسەروی ئاواییەوە تەقاندەوەو کۆپتەرەکانیش بەردەوام بەئاگر ئاوڕشێنی ئەو ناوەیان دەکرد. ڕەحیمە کوێری گریانەیی و چەند کەسێکیتر بەقاچاغ گەڕابوونەوە لامان بۆ ئاودێرانی باخەکانیان، خۆیان

لەگەڵ ئێمە بەڕێ کەوتن و دوایی کە گەڕاینەوە بینیمان قاترەکان بە گوللەی شەست تیری کۆپتەرەکان لە کەلاوەکانی ئاواییدا بە ڕاست و چەپدا کەوتوون و کوژراون. ئەو پێشمەرگەی تەقەی کردبوو عومەر باسام بوو، عابید حەسەن نازداری بۆینیش هەردوو پێی سووتابوو، بۆیە ئەویش تەسلیم بوویەوە، کار بەم شێوە تێپەڕی، مەلا بەختیار دوا کۆبوونەوەی پێکردین و گەڕایەوە بۆ سوورێن و عەزیزی لای ئێمە بەجێ هێشت، دایە دەست کەرتەکەی شەهید ئەحمەدگریانەیی، ووتی پارێزگاری بکەن یەکەم سەلامەت بێت و دووەم ڕانەکات، تاگەڕامەوە ئەوکات هەوڵ دەدەین لەگەڵیەکێک لەهەڤاڵە گیراوەکانماندا دیل بەدیلی پێ بکەین، لە نیوەی مانگی ٨/ ١٩٧٨ دا ئەوان خوا حافیزیان کرد و کەوتەڕێ بەرەو بناری چیای سوورێن. عەزیزیش لامان بەدیلی مایەوە تا بەرەبەیانی ڕۆژی ١٩٧٨/١١/١٤ ئەوە بوو لەم بەروارەدا لە ئەشکەوتێکی پشتی ئاوایی دەڵەمەڕ لە بناری هەڵەبجە هەڵهات و گەشتەوە لای قیادەی موەقەتە.

# پێشمەرگە و کاری بنێشت کردن



مانگەکانی ٥-١٢ ساڵی ١٩٧٨چەند گرفتێک دەستەو یەخەمان وەستان و هیلاکیان کردین، هەرچەند ئێمە بەدل دەستمان پێکردبوو، کە رۆژ لەدوای رۆژ برینی کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان سارێژ بکەین، خەومان بەوەوە دەدی بەم نیازە خاوێنەمانەوە گەل و نیشتمان لەدەست خاڵە رەشەکان قووتار بکەین و بیانخەینە گۆشەی خاڵی گەشەوە، بەلام بەپێچەوانەی خواست و بەرنامە و هەڵوێستی ئێمەوە هەر رۆژەی کوسپێک لەبەر دەم رێبازەکەماندا قووت دەبوویەوە. گرفتەکان زاوزێیان دەکرد و زورێتی وایان دەخستەوە دەبووە تەوق ودەچووە گەردنمان، ئەو گرفتانەش وەکو:

١-رووداني کارەساتەکەی هەکاری، رووداوێکی هەست هەژێن و بارێکی گران، خەنجەرێکی ژەهراوی بوو درا لەپشت جەستەی یەکێتیی، هەریەکێتیی و ئێمەی چیاو رێکخستنی شار بوو توانیمان شان لەبەریدا رابگرین و درێژە بەخەبات بدەین، چونکە بەنەسرەوتن تا سەرکەوتن گوش کرا بووین.

٢- راگواستنی ئاواییەکانی سنوور، کەزیانێکی گەورەی بەجەستە و هەناومان گەیاند، بەلام وورەو بیروباوەڕ بەدەنە مانـــدووەکـــەی ئێمـــەی لەبەرامبەردا کردبووە پاڵەوانێکی ئەفسانەیی رۆستەم ئاسای حەوت خوان بەزێن.

٣-گێچەڵ و سەر ئێشەی قیادە موەقەتەش بۆخۆی کەم نەبوو، ئەوانیش وەکو کنێ کەوتبوونە کەوڵمانەوە و هەرجارەی تەپکەیەکیان لەسەر رێماندا قووت دەکردەوە، جارجار برینی جەستەیان ئەکولاندینەوە.



پەڕاندنەوەی کاڵوپەل بە کەڵەس لەوبەر سیروان بۆ ئەم بەر بە گوریس

٤- دابڕان لەئاوایی و بێ ئاگابوون لەجم و جووڵەکانی ڕژێم و پچڕانی پەیوەندیمان لەگەڵ شانەکانی ڕێکخستنی شاردا، وایکردبوو هەر ئێمە بووین بەرپێی خۆمان دەبینی.
٥-ڕوو لەوپەڕی کزی بوونی خۆراک و پێداویستیەکانی پێشمەرگایەتی و ژیان تەنگیان پێ هەڵچنی بووین و بەناچاری شەڕی دەستەو یەخەمان لەگەڵدا دەکردن.

بۆسرەوتنی هەندێ لەئازارەکانمان گریانەیی فریامان دەکەوت، ئەم کەڵەپیاوە زۆر بەتوانا و ورە بەرز بوو، هەوڵیدا لەئاواییەکانی کوردستانی ڕۆژهەلات لەوبەری سیروانەوە لەبەلەبزان و زی و هێرتا کەسەر بەشارۆچکەی نەوسوودی سەر بەقەزای پاوە بوون ئازووقەمان بۆبێت، ئەمەش لەڕێگەی تایەری ئەمینی وەنەوشەوە کەسەر بەعەشیرەتی ئێناخی بوو، بەگوریس لەو بەرەوە بۆ ئەم بەر بەهۆکارێک کەپێی دەووترێت کەڵەس[1] دەیگواستەوە، ئیتر بۆماوەیەک ئەوەمان کردبوو بەپیشە، هەرجارێک خۆراکمان کەمبوایەتەوە دەچووینەوە بۆگوێ ئاو، لەم بەرەوە بەچەپک س لاوەمان دەگەیاند بەتایەر و ئەویش لەدوای عەلەیکێ ئازوقەکەی دەخستەوە دەستمان.

ئەو دەمانە لەهەردوو ئەشکەوتی هەزارپەز و کولێن دەشت ئارامماں گرتبوو کە نزیک بەسنوور بوو، جارجاریش چریکی ئێران بەرامبەریان لێ دەگرتین و پێیان دەوتین، کەنابێت لەوێدا بمێنین چونکە سەر سنوورە، ئێمەش کەهیچ

---

[1]- کەڵەس لەسەر ئاوێک دەبەسترێت، کە ولاخ نەتوانێ پێدا بپەڕێتەوە. گوریس لەمسەرو لەوسەرەوە دەبەسترێت، کوڵی لێ توند دەکەن، ئەمبەرییەکان گوریسەکە رادەکێشن و ئەوبەرییەکان گوریسەکە شل دەکەن تاکو بارەکە دێتە دەست.

دەسەلاتێکمان نەبوو بەناچاری جێمان ئەهێشت و لەئەشکەووتێکی دیکەدا خۆمان دەگرتەوە یەکێک لەو ئەشکەوتانە کونە فەتاح بوو [1].

لەمانگی ١٩٧٨/٨ بارەگاکەمان گواستەوە بۆ سەر کانی و ئاوی گەچێنە کە، و ماڵی عەلی یوسوتاڵی لێبوو ، لەم شوێنەدا بنەمان داکووتاو عەزیزی حەمەساڵحیش زیندان و لەلامان مابویەوە.

لەم کاتەدا بێ پارەیی و ناچاری بۆبژێوی ژیانی پێشمەرگەکان، گریانەیی و چەند پێشمەرگەیەکی شارەزا لەکاری بنێشتکردندا چوون بۆ کۆکردنەوەی بنێشت، ئێمەش نزیکەی ١٥ پانزە پێشمەرگە لەبارەگادا ماینەوە. ئەو بنێشتەی کە هیی ئاواییە راگوێزراوەکان بوو، خەڵکی ئەو ئاواییانە لەمانگی شەشدا کۆچەڵەیان لەداربەنەکان بەستبوو، بەڵام لەمانگی ٧و٨ /١٩٧٨ دا بارکران و بنێشتەکەیان بۆ ئێمە مایەوە، لەماوەی ١٠ دە ڕۆژدا کاک ئەحمەدو مەفرەزەکە لەو شوێنانەدا کە مەترسی لەسەر نەبوو هەموویان کۆکردەوە، دوای کۆکردنەوەی بنێشتەکە لە قەلاگا [2] کولاندیان و سێ باری لێ بەرهەم هات، پاشان چەند کەسێکی دۆستی خۆمان هاتن و هەرسێ بارەکەیان گەیاندە ئاوایی سۆسەکان و لەوێشەوە بۆ هەڵەبجە و فرۆشران، بەتەمابووین ئەمە بۆ ئێمە کەڵکی زۆر بێت، چونکە کاروبارمانی ئاسان دەکرد، ئەو پایزە لەگەچێنە ماینەوە، هێدی هێدی باری ئێران ئاڵۆز دەبوو،

---

[1] - جارێکیان دوو مەفرەزەی خۆمان لەیەک گۆڕان و تەقە کەوتە نێوانیانەوە فەتاح ئێناخی بەسەختی بریندار بوو، سێ گوللە بەر حەوزی کەوت، ئەوکات لەو حاڵە ناخۆشەدا بردبومانە ئەشکەوتی هەزار بەن لەوێ حەمە ئاوات، کە برین پێچ بوو، بەحەبی موسەککین ئازاری ئەسرەوان و بەدیتۆل ، دەرمانە سوریش برینەکەی ئەهوەن ئەکردەوە. دوای دوو ڕۆژ ساواک لەگەڵ چریک و ژاندارمی ئێران هاتن ووتیان ئەمەسەر سنوورە بڕۆنە خوارتر، ئێمەش بردمانە کونەبەردێکی تر، ئەگەر جارجار بەجێمان هێشتایە ئەوە بەشی پێویست خۆراکمان لا دائەنا، ئەوەندە لە کونەدا مایەوە ئەشکەوتەکە ناونرا کونە فەتاح.

[2] - قەلاگا هاوینەهەوارو باخوباخاتی ئاواییەکانی شێخانی تازە و شێخانی مەزارگای سوڵتان ئیسحاقن، ئەم دوو ئاواییە ئەکەونە سەر ڕۆخی ڕووباری سیروان لەباشووری شارۆچکەی نەوسوود، قەلاگاش ئەکەوێتە خۆرئاوای نەوسوود لە خۆرهەڵاتی کوردستان. قەلاگا هاوسنوورە لەگەڵ ئاواییەکانی دەرەتفێ و گریانەیی دۆڵی هاوار لە خۆرهەڵاتی هەڵەبجە.

جاروبار خۆپیشاندان و سووتانی سینەماو کوژرانی خەڵکمان بەر گوێ دەکەوت.

پێشتر کەلەهەزار پەز بووین دوو کەس سەردانیان دەکردین کەخەڵکی شارۆچکەی نۆدشە بوون لە کوردستانی ڕۆژهەڵات. بەجیا لەگەڵ ئەحمەدگریانەیی کۆ دەبوونەوە، وەکو هاوکاری پارەیان هێنابوو. ئەو دووکەسەش حەمە کۆکۆ و حەکیمی شەوکەتی بوون، وام دێ بەبیردا کەسێکی دیکەشیان لەگەڵ بوو بەناوی عەبدوڵلای مەلا کەخەڵکی ئاوایی هەجیج بوو. لەلایەن چەند کادرێکی ئەوکاتەوە گومانی ئەوەیان دروست کرد کەئەوانە ساواک ناردوونی بۆلای ئەحمەدگریانەیی. بەڵام هیچی وانەبوو، بەڵکو خەڵکانی کورد پەروەر بوون و هاتبوون هاوکاریمان بکەن و ئامادەش بوون هەرچیمان پێویست بێت بەپێی توانا درێخی نەکەن، پاشان وردە وردە خۆپشاندانەکان تەشەنەیان کرد و سەران سەری ئێرانیان گرتەوە.

جارێکی دی حەمەکۆکۆو حەکیم لەگەڵچێنە سەردانیان کردینەوە، ئێمەش بارەگاکەمان گواستەوە بۆ سەر ئەستێڵەکەی پەروونی[1] کەنزیکتر بوو لە هەردوو ئاوایی شۆشمێ سەروو خواروی سەربەنەسوود. لەمەشدا نیازمان ئەوە بوو هەم ئاگامان لەبارودۆخی ئێران بێت و هەم لەتەوێڵەو بیارەشەوە نزیک بین.

---

[1] - پەروونی ناوی ئەو چاوگە ئاو و کانیاوەییە، کە ئەکەوێتە داوێنی چیایەک ئێمە پێی ئەڵێن بەندەن. ئێرانیەکانیش بەناوی چیای تاک (تک) درەخت ئەیناسن. ئەم کێوە یان ئەم چیایە ئەکەوێتە خۆرهەڵاتی شاری هەڵەبجە، جیاکەرەوەی سنووری عێراق و ئێرانە، کانیاوەکەی پەروونی لەداوێنی چیاکەدا لەوبەشەی کە خاکی ئێرانە هەڵکەوتوە باخێکی سەفادارو پڕ لە میوەی لەبەردەم دایەو ئاودێری ئەکات، لەدەستی ڕاستی پەروونیدا کانی و ئاوی گەچێنەو لە دەستی چەپیشیدا کانی و ئاوی دەرەماموور هەن، کە ئەوانیش دوو باخوو هەوارگەی جوان و دڵڕفێنن.

# شەهید کردنی دوو لاو لە تەوێڵە

بەر لەمانگی ٨ ی ١٩٧٨ کە لەئەشکەووتی هەزار پەز[١] بووین، دووکەس هاتن بنە پێشمەرگە، خەڵکی شارۆچکەی تەوێڵە بوون، یەکێکیان بەناوی دارا زوبە کە کوڕێکی هەژار و بێ کەس بوو، ئەویتریشیان سلێمان محیەدین بوو کە باوکی ناسراو بوو بە محەدزە، ئەو پیاوەی کەکاتی خۆی عەبدولوەهاب ئەترووشی کوشتی.

ئەو دەمانە هەرکەسێک پشتگیری و نوسراوی رێکخستنی ناوشاری پێ نەبوایە نەدەکرا بەپێشمەرگە. ئەم دوو گەنجە زۆر سوور بوون لەسەر ئەوەی کەوەربگیرێن و نەگەڕێنەوە، چونکە خەڵک پێی زانی بوون، ئەوکاتانە کەسانی وەها مەرجیان بۆ دادەنرا مەرجەکەش ئەوە بوو کەنارنجۆکێکیان دەدرایە و کەسێکیان بۆ دیاری دەکرا کە بیکوژن یان نارنجۆکەکە بخەنە ناو بنکە و بارەگای دەزگا سیخوڕیەکانی ڕژێمەوە. ئەم دووکەسەش کاتێک لەلایەن مام هادی یەوە قسەیان لەگەڵ کرا نارنجۆکێکیان درایە و دەمەو ئێوارەیەک گەڕانەوە، مام هادی پێی ووتین ناردومن بۆ کوشتنی یەکێک لەسەرەک جاشەکانی هەڵەبجە کەئەو سەرو بەندەش ڕەشەی ساڵحە[٢] خراپ ترین سەرەک جاش بوو.

نەیانتوانی بوو چالاکیەکە ئەنجام بدەن، بۆ ئەوەی بێ ئەنجام نەبن بڕیار دەدەن کارێکی تر ئەنجام بدەن، ئەویش کوشتنی چەند سەربازێکی سریەی تەوێڵە بوو، کەشەوانە لەناو بازاڕ دەگەڕان. مانگی ڕەمەزان بوو لەتەوێڵە شەوانە چایخانە و هەندێ دوکان بازاڕیان دەگەڕا، چایخانەکەی سەیید جەعفەر کە لەژێر خانوکەی ماڵی سەعدی بەگی قادر بەگدا بوو، دارا و

---

١ - ئەم ئەشکەوتە ئەوەندە گەورەیە هەزار بزن تێدا جێگەی بۆتەوە ناوەکەی لەوەوە هاتووە، ناوچەکە بە زستانانداا جێگەی لەوەڕاندنی ئاژەڵە.

٢- ڕەشەی ساڵحە هەموو فەرمانێکی دوژمنی جێبەجێ دەکرد، لەگەڵ ئەو هەموو خیانەتەدا، کە کردی دواجار لەشەڕی عێراق – ئێرانو لە شاخی شەمێران بەترسنۆک و خائین درایە قەڵەم و بەدەستی ڕژێم لە تانجەرۆ کوللەباران کرا.

سلێمان هەردووکیان شەوی ۱۹۷۸/۹/۱دەچنە سەربان و دەبینن چەند سەربازێک لەبەردەم چایخانەکەدا راوەستاون، دارا بەسنگە خشە دەچێتە پێشەوەو نارنجۆکەکە هەڵدەدات بۆیان.

پێشتر ئێمە لەناو شارۆچکەی تەوێڵە و دەوروبەریدا چەندین چالاکی پێشمەرگانەمان ئەنجام دابوو، لەوانە دووجار لێدانی رەبایەکەی بازگەی تەوێڵە لەسێرپانی تەوێڵە-بیارە- ملەی شۆشمێ، هەرجارێک کەچالاکیەکمان ئەنجام دەدا دوژمن لەهەموو بەرزاییەکانەوە کوێرانە گولە بارانی ناو شارۆچکەکەی دەکرد و زۆریش دەستیان لەماڵان نەدەپاراست، شەوێک دوو پێشمەرگە بە ناوەکانی فەیسەڵ کاکەو رزگار عەزەقوڵ بەنارنجۆک ئەنداز ئەدەن لە بارەگای سرییەی تەوێڵە، لەسەر ئەمە ژنێکی بەساڵاچوو بەناوی دەوڵەت کە خێزانی حاجی ئیسماعیل بەکر بووشەهید کرا، ژنێکیتر بەناو ملکی بریندار کرا.

ئەو شەوەش دوای تەقینەوەی نارنجۆکەکە لەلایەن داراوە، گوللە باران دەست پێدەکاتەوە، ئەم شەو بەجیاواز لەجاران جگە لەدەست رێژی کوێرانە، دوو ئەندامی رێکخستنی ی.ن.ک کوێرانە دەگرن و شەهیدیان دەکەن. دوو شەهیدەکەش یەکەمیان موختار عەزیز کەریم خاوەنی خێزان و دوو کوڕبوو بەناوەکانی هەورامان و کۆسالان، دووەمیان یاسین محەمەد یان فەقێ یاسین کە کرێکارێکی کورە هەژار بوو، ئەو شەوە لەچایخانەکەدا شاگردی کردبووە.[1]

لەوکەسانەی ئەو شەوە لەوێ دەبن دەگێڕنەوەو دەڵێن: چونکە مانگی رەمەزان بوو، دوای بانگی شێوان ناوبازاڕ خەڵکێکی زۆری تێدا بوو، لەدوای تەقینەوەی نارنجۆکەکە ئەو شەوە بوو بەرۆژی حەشر، سەربازەکان بەهەموو لایەکدا تەقەیان دەکرد. خەڵکەکەش هەندێکیان دەخەنە چەمەکەوە

---

[1]- تەرمی ئەو دوو شەهیدەش تا بەیانی هەر لەبەر چایخانەکەدا ماونەتەوە، بەدەستی سەربازێک شەهید کراون ناسراوە بە فلس. ئەم سەربازە قەباخە فیشەکێکی بردۆتە سەر حەوزی مزگەوت، بەیانی بەخەڵکیان وتووە: کە لە مزگەوتەکەوە تەقەمان لێ کراوە کوڕەکانی ئێوەش ئەوان کوشتیانن، لەگەڵ ئەم دوو شەهیدەدا کەسێکی تر بەناوی بەختیار عەبدول عەزیز ئەچنە سەری و خۆی ئەکات بە مردوو، وا ئەزانن ئەویش کوژراوە، بەڵام دواتر کە ئەو ناوە چۆڵ ئەبێت خۆی رزگار ئەکات.

بەناو ئاوەڕۆکاندا خۆیان قووتارکردبوو. هەندێکیان پەنایان بۆ مزگەوتەکە بردوە و نەیان توانیوە بێنە دەرەوە.

رۆژی دوای ۱۹۷۸/۹/۱داراو سلێمان هاتنەوە لامان، قسەو باسەکەیان گێرایەوە. ئێمەش دوای چەند رۆژێک زانیاریەکانمان پێگەشت کەرووداوە کەچۆن بووە، چی قەوماوە و تاکەسەربازێکیشیان نەکوشتوە، شەهید کردنی ئەو دوو لاوەشی بەدوادا هاتووە گەلێک نیگەران بووین، لەبەر ئەو کارە ترسنۆکانە وەرمان نەگرتن و ئیتر دارا ڕۆشتە ریزی قیادە موەقەتە و هەواڵمان زانی گەشتوەتە ئاوایی کەمینەی دیوی ئێران، پاش ماوەیەک لەناو ئەوانیشدا نەیکرا و بەرەشاشێکی دیکتارۆفەوە خۆی رادەستی ڕژێم کردەوە. سلێمان مایەوە و ئەویش لەوشەڕەدا کەئەحمەد گریانەیی شەهید کرا بەدیل گیرا.

سێ رۆژ دوای ئەو رووداوە فەرماندەی فەوجی بیارە دێتە تەوێڵە. خەلکەکە کۆ دەکاتەوە و لەناوقسەکانیدا دەڵێ: ئێوە موخەریب دێنن دەیان شارنەوە، نانیان دەدەنێ ئەوانیش کورەکانتان دەکوژن، عوسمانی سۆفی حەمەکەریم کە ئەندامێکی چالاک و نەترسی رێکخستن بوو ڕەدی قسەکانی دەداتەوە حەسەنناوێک کەعەرەبی زان بووە قسەکانی عوسمانی وەک خۆی وەرنەگێڕاوە بۆ فەرماندەکە، ئەمەش لەبەر نەهێشتنی مەترسی لەسەر ژیانی عوسمان.

# چنینی داویٚ بۆ لەداو خستنی هەڵۆیەک

مانگی ١٩٧٨/١٠ ئەوکاتەی کەبارەگاکەمان هێنابووە پەرروونی کارو چالاکی پێشمەرگەکانمان زیاتر بووبوو، قیادەی موەقەتەش بارەگایان لەئاواییەکانی دزلی و کێمنە و بێرواس بوو، لەبەشی کوردستانی ڕۆژهەڵات، ئەوانە هەمیشە چاوەڕێی هەلێک بوون بۆ لێدان و لەناوبردنی ئێمە. هاتنی ئەوان بۆسەر ئێمە ئاسان بوو، چونکە بەناو ئێراندا ئەهاتن و ڕژێمی ئەو وولاتەش هەموو هاوکاریەکی دەکردن، سەرلەبەیانی ڕۆژێک دکتۆر نەجمەدین فەتحوڵا کەپێشتر لەبنکەی تەندروستی گوڵپ بوو، وەک هاوکاریکردنمان حەب و دەرمانی بۆ دەناردین، بەتایبەت کاتێ لەشەڕی کەلی وەزەرا [1] گەڕابینەوە، چەند برینداریێکی سووکمان هەبوو تەداوی کردبوون، لەم ڕووەوە گومانی توندی کەوتبووە سەرو لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە فەرمانی گرتنی دەرچوو بوو، هاتە پەرونی و ئامێزمان بۆگرتەوە، ئەم دکتۆرە ئەندامی حشع بوو، لەڕێی هەڤاڵانی ڕێکخستنی شارەزوورەوە نێردرابوو بۆلای ئێمە کەئەمەش لەسەر داوای حزبەکەی بووە، ئەو دەمە حشع هاوبەرەی حزبی بەعس بوو، داوایان کرد بوو کەئێمە پەنای بدەین تابزانن ڕۆژ بەرەو کوێ دەچێ.

محەمەد شەفیع بەرپرسی قوتابیانی بەعس گیرابوو، لای ئێمە زیندان بوو، لەگەڵ عەزیزی حەمە ساڵحی ڕەشیددا. سەردار حەمەڕەشیدیش لەسەر ڕاپۆرتی درۆ گیرا بوو، بابچینەوە سەر ئەو داوەی کەقیادە موەقەتە چنیبویان، بنەڕەتی پلانەکە یان بڵێین چنینی داوەکە چۆن سەرچاوەی گرت؟ شێخ جەلالی نەقشبەندی کەقیادە موەقەتە بوو لەگەڵ نزیکەی ٢٥ چەکداریدا لەوەدابوون کەخۆیان ڕادەستی ڕژێم بکەنەوە، بەڵام کەپێیان زانرا بەتەقە

---

[1] - کەلی وەزەرا ئەو ملە بەرزەیە، کە ولاخەڕێی نێوان ئاواییەکانی دەرەی مەڕ و سەرگەت لەبنار چیای هەوراماندا بۆ ئاواییەکانی دەرەکییەو دەیۆ پێدا گوزەر ئەکات. کەئەکەونە ناو خاکی ئێران، ئەم کەلە خاڵی سنووری هەردوو وولات دیاری ئەکات.

بۆی دەرچوون، تەقەو هەراکە لەدەوروبەری چیای شرامدا ڕوویدا، لەو تەقەکردنەدا پێشمەرگەیەک بوو بەقوربانی بەناوی عەریف حسێن، شێخ جەلال و گرووپەکەی بوون بە جاش و چوار کەس لەچەکدارەکانی خەڵکی بیارە بوون، بەناوەکانی فازل محیەدین، فەیرۆز محیەدین، حامد ئەحمەد حەمەکە، مستەفا ئەحمەد حەمەکە، ئەمانە ژێر بەژێر پەیوەندی ئەکەنەوە بەنادر هەورامیەوە، داوا ئەکەن بگەڕێنەوە بۆ ناوقیادە موەقەت، سەرەتای چنینی داوەکە لێرەوە دەست پێئەکا، نادر هەورامیش هەلەکە ئەقۆزێتەوە و ئەم ڕێگەیان بۆ دیاری دەکەن: ئەڵێن قبوڵمانە بێنەوە، بەڵام بەمەرجی ئەوەی بچنە ناو جەلالیەکان و بڵێن شێخ جەلال دەبێت بە جاش و ئێمەش جاشایەتی ناکەین، هەروەها ناتوانین بڕۆینەوە بۆ ناو قیادە، چونکە عەریف حسەین لەتەقەکەدا کوژراوە خراوەتە سەر ئێمە، ئامادەین بێین لەناو یەکێتیدا ببینە پێشمەرگە نادر هەورامی ئەوەشیان پێدەڵێت: بچنە لای حاجی ئەولەی نەسە ئەم قسەیەی پێ ڕابگەیەنن، ئەویش قسە لەگەڵ ئەحمەد گریانەیی دەکات و وەرتان دەگرن، کەوەریان گرتن لەهەر هەلێکدا کەبۆتان ڕەخسا گریانەی بکوژن و بێنەوە ئینجا وەرتان ئەگرینەوە.

شێخ جەلال هۆکاری تەسلیم بونەوەکەیان بۆ دروست بونی کێشەیەک ئەگێڕێتەوە لە نێوان خۆی ونادر هەورامیدا دروست بووە، گوایا چەند بەرپرسێکیان پەیوەندیان بەڕژێمەوە هەبووە لەڕێی هوشمەند مستەفاوە، ئەڵێت لەوبارەوە بەڵگەی تەواوم خستە بەر دەم ناوبراو بەڵام لەباتی پاداش و دەست خۆشی پشتگیری لەوان کردو بەهەمویانەوە بوونە دژی من.

ڕۆژێکی مانگی ۱۰/ ۱۹۷۸ حاجی ئەولە ناردبووی، ئەحمەد بێت ببینم ئیشم پێیەتی، کاک ئەحمەد من و سدیق گریانەیی لەگەڵ خۆی بردو چووین بۆ نزیک ئاوایی سۆسەکان، حاجی ئەولە باخێکی هەبوو بەناوی ملەگا لەوێ چاوەڕێی دەکردین، حاجی ئەولە چی بووتایە کاک ئەحمەد لەقسەی دەرنەئەچوو، چونکە ئەو پیاوە جێگەی متمانەی هەموان و دڵسۆزی ی.ن.ک بوو، تێکۆشەری دێرین و وەک کەسێکی ڕێکخستنی ناوشاری ئەو سەردەمە حسابی بۆ دەکرا.

حاجی ئەولە بەکاک ئەحمەدی ووت: ئێوە لەسنوری بیارەدا لاوازن و پێویستتان بەخەڵکی ئەوێ هەیە کەلەگەڵتانبن، چوار کوڕی چەکداری قیادە

موەقەتە تەسلیم بوونەتەوە و نایانەوێ جاشایەتی بکەن، هەروەها لەبەر کوشتنی عەریف حسەینیش ناوێرن بچنەوە لای قیادە، ئەمە باشترین هەلە کەئێوە وەریان بگرن، ئێمەش زۆرمان پێ خۆش بوو، گەراینەوە پەروونی و چاوەڕێی حاجی ئەولەمان ئەکرد بیانگەیەنێتە لامان. سەر لەبەیانییەک هاتن و پۆشتە و پەرداخ بوون و سێ دەمانچەیان پێ بوو، کەسێکی ڕێکخستنی خۆمانیان بەناوی سابیر فەتاح لەبیارەوە لەگەڵ خۆیان هێنابوو، ئەویشیان بۆدڵنیابوون لەگەڵ خۆیان خستبوو، کەدواتر هەر سابیر بووە هۆی ئەوەی کاک ئەحمەد لەپلانەکەدا شەهید نەکرێت.

بەڵێ زۆر ڕێزیان لێگیراو چەکمان لەسێ پێشمەرگە وەرگرتەوە و پێمان سپاردن، بەردەوام داوایان دەکرد کەبە مەفرەزە دەرچین و چالاکی بنوێنین، ئەمانە بەرپرس و دەم راستیان حامد بوو، حامد کەسێکی دامەزراو نەبوو، هەمیشە ئەمبەرو ئەوبەری دەکرد، لای قیادەوە بۆ لای ڕژێم، لەوێوە بۆلای ئێمە، کەلای ئێمە رایکردەوە بۆلای قیادە موەقەتە لەوێش ئەوەندە بەند نەبوو خۆی کردە پاسداری ئێران، دواتر چووە ناوپارتی و دواتر هاتەوە لای حکومەت و جارێکیتر بۆلای ئێمە و دیسان چوە وە ناو پارتی. فەیرۆز و براکانی لەسەرە خۆو بەئەدەب بوون ئەم توشی ئەو هەڵەی کردن.

شەوێک من و مام هادی چووینە تەوێڵە و ئەوانیشمان لەگەڵ خۆمان برد، ئەمەش وەکو بانگەشەکردنێک بۆ خۆمان، کەئەمانە بوونەتە یەکێتیی و شانازیمان پێوە ئەکردن، شەو کەلە تەوێڵە گەراینەوە لەباخەکەی هادی حاجی حەمە ئەمین کاتژمێر سێی شەو بوو خۆمان شاردەوە، بەتەمابووین ڕۆژەکەی لەوێ بمێنینەوە، هەرچەندە شوێنەکە جگە لەوەی لە تەوێڵە وە نزیک بوو دوریش نەبوو لەڕەبیەیەکی ڕژێمەوە، یەکەم حەرەس من بووم حامد خەوی لەخۆی تۆراند هات بەمنی ووت: بخەوە من دەبمە حەرەس، وا خۆی نیشان دەدا و دەیگووت بەشەو من لەباتی هەمووتان حەرەسیات دەگرم، لەمەولا ئێوە بەشەودا بحەوێنەوە و دڵنیا بن لەهەموو شتێ، مام هادی گوێی لەم قسانە بوو، لەتەلانێکی سەرووی شوێنەکەمانەوە دانیشتبوو، منیشی بانگ کردە لای خۆی و ووتی: وریابە ئاگات لێی بێت، هەردووکمان تابەیانی نابێت بخەوین، نەخەوتین.

سبەینێ گەڕاینەوە پەروونی لەگەڵ مام هادی باسەکەمان بۆ گریبانەی گێرایەوە، گووتمان ئەمانە نیازیان خراپە، کاک ئەحمەد بڕوای پێ نەکردین. ماوەیەک بەسەر چوو، ڕۆژێک حامد ووتی بابچین بەئارپیجی لە مەرکەزەکەی بیارە بدەین، واباسی دەکرد کەدەمانباتە بن دیواری مەرکەزەکە و ژووری ئامر مەرکەزەکە دیاری دەکات بۆ ئەوەی بە ئاربیجی لێی بدەین، سەرلە ئێوارەیەک کاک ئەحمەد مەفرەزەیەکی ئامادە کردو کەوتەڕێ بۆبیارە مەفرەزەکە پێک هاتبوولە ١٠دە پێشمەرگە، ئەوچەند کەسە جگە لەیەکێکیان بەناوی مستەفا کە لەپەروونی مایەوە ئەوانیتر لەگەڵ مەفرەزەکەدا بوون.

ئێمە بەڕێکەوتین لەگەڵ بەتاریک داهاتنی هەوادا، گەیشتینە نزیک کەلی هەیوەت بەرامبەر ئاوایی پالانیا، لەوێ بەمنیان ووت تۆ بگەڕێرەوە بۆ بارەگا، زۆرم پێ ناخۆش بوو، هەرچیم کردو کۆشا کاک ئەحمەد لێی وەرنەگرتم و ووتی: دەبێ بگەڕێیتەوە، پاشان بانگی کردمە لاوەو ووتی ئەو پێشمەرگانەی بەجێماون ژمارەیان کەمە سێ گیراویشمان لایە بۆیە دەبێ بگەڕێیتەوە.

من لەلایەکەوە دەمزانی حامد و برادەرەکانی لەهەلێک دەگەڕێن هەڵبێن، لەلایەکی تریشەوە حەزم دەکرد لەهەموو چالاکیەکاندا بەشداربم بۆیە ناڕەحەت بووم لەوەی کە بگەڕێمەوە، لەوشوێنەوە تادەگەمەوە بارەگاکەمان نزیکەی ٣٠خولەک دەبوو، ئەوان ڕۆیشتن و من گەڕامەوە، کەگەیشتمە لای هەڤالان لێیان پرسیم بۆ گەڕاویتەوە؟ ووتم لەبەر ئەوەی ئێوە کەمن. پرسیم کوا مستەفا؟ ووتیان لێرەیە: ووتم کوا لەکوێیە؟ ووتیان ڕەنگە لەدەرەوە لای حەرەسەکە بێت، حەرەسەکە لەپشتی خانە باخەکەوە بوو، چووین سەیرمان کرد نییە، بانگمان کرد وەلامی نەبوو، ئیتر زانیمان ڕایکردووە.

دیارە حامد پێی گوتووە کەئێمە ڕۆشتین تۆش ڕاکە، ئێمە هیچ هۆکارێکی پەوەندی کردنمان نەبوو بۆ ئاگابوونمان لەیەکتری، تا کاک ئەحمەد ئاگادارکەین بڵێین مستەفا ڕای کردوە ئاگاتان لە خۆتان بێت، شەو تابەیانی نەخەوتین، لەگەڵ ڕۆژ بوونەوەدا بەهاوڕێیەتی چەند پێشمەرگەیەک هاتینە بەرامبەر پالانیا، چەند ولاخدارێکی قاچاخ چیمان بینین، ووتیان کاک ئەحمەد و مەفرەزەکەتان لەدواوەن، لێیان قەوماوە بەلام سەلامەتن.

کەگەیشتنە جێ بۆیان گێڕاینەوە: شەو چوونەتە نزیک مەرکەزەکەی بیارە چوونەتە ماڵی خاوەن باخێک کەلەخانە باخەکەدا ماوەتەوەو

نەگەڕاوەتەوە ناو ئاوایی، لەوێ لایانداوە بۆپشودانێک، حامد لەگەڵ فەیرۆزو فازلدا، ناچنە ژوورەوە، سابیر لەگەڵ کاک ئەحمەدو چوار برادەرەکەی تر لەژوورەوە ئەبن، حامد کاک ئەحمەد بانگ ئەکاتە دەرەوە بەڵام کاک ئەحمەد دەستی لەسەر دەمانچە چواردە خۆرەکەی بەرپشتوێنیدا ئەبێت و بەدەستەکەی دیکەشی ئاڕ بی جیە کەی هەڵگرتووە، یەکسەر حامد دەڵێت کاک ئەحمەد کورێکی ئەم ماڵە قیادە موەقەتە بووە و تەسلیم بەڕژێم بۆتەوە، ئەوکاتە منیان ناردووە ٤٠٠ چوارسەد دینارم لێ سەندون، بۆیە لەڕووم نایە بێمە ژوورەوە، ئێوە بێخەم پشوو بدەن ئێمە لەدەرەوە دەبین، کاک ئەحمەد بڕوای پێ دەکات و دەچێتەوە جێگای خۆی، لەوکاتەدا پێ لاوەکانیان فڕێ دەدەن و بەئاماژە بەسابیر دەڵێن: هەستە وەرە دەرەوە، سابیر نایەت و ئەشلەژێ، یەکسەر تەقە دەکەن بەناو ژوورەکەداو ڕادەکەن، بەڵام کەس لە پێشمەرگەکان بەرناکەون و دێنە دەرەوە و سەیر دەکەن پێ لاوەکانیان نەماوە، ناچار بەپێی پەتی دەگەڕێنەوە بەرەو بەنەنی بەڵخە، ئەوانیش ڕایان کردبوو، چوبوون بۆئاوایی هانەگەرمڵە بۆلای نادر هەورامی، لەبرادەرانی ئێمە کەسیان شەهید نەبوو، ئیتر لەبەر ترس و شڵەژاوی بووە یان نەیان ویستوە کەسیان لێ بکوژن، قیادە موەقەتەش لێیان بوران و باسی کوشتنی عەریف حسەین یشیان لەگەڵ نەکرا.

لەم کاتە تەنگانەو بێچەکیەی ئێمەدا لەبەرامبەر ئەو هەموو ڕێزەدا لێیان گیرا، ئەم خیانەتەیان لێکردین و سێ کلاشینکۆفیشیان بردین کەبۆ ئێمە لەوسەردەمەدا زۆر بوو [1].

---

[1]- لەم شۆڕشەدا ئەوکەسانەی چەکیان ئەبرد و تەسلیم بەدوژمنیان ئەکردەوە یان ئەیان برد بۆلای لایەنێکی تر، لێپرسینەوەیان لەگەڵ ئەکرا، کەسوکاریان ئەگیراو پارەی چەکەکەیان لێ ئەسەنرا. مەگەر یەکێک لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکرابێت دەستی پێ نەگەیشتبێ، ئەمانە ئەوسی کلاشینکۆفەیان برد لێپرسینەوەیەیان لەگەڵ نەکرا، چونکە دەستمان پێنەگەیشتن، تا لە ١٩٧٩/٤/١٥دا نیازی عیزەت هاتە دەرەوە ماوەیەک کارمەندی کشتوکاڵی بیارە بوو پرسیارم لێکرد بیارە شارەزای ووتی: بەڵێ، ووتم کەسوکاری ئەمانە ئەناسی ئەو خیانەتەیان لێکردین و چەکەکانیشیان بردین ووتی بەڵێ، شەوێ ٢٧لەسەر١٩٧٩/٩/٢٨ مەفرەزەیکم برد و ڕۆیشتم بۆ بیارە، هەڤاڵ حەمەسەلیم فەتحوللا یەکێک بوو لە ئەندامانی ئەو مەفرەزەیە. کاتێک گەیشتینە بەنەنی بەڵخە ئیتر شارۆچکەی بیارەمان لێوە دەرکەوت، نیازی ووتی: لێرە تا ناوشار من شارەزا نیم، پرسیارم لە

جەماعەت کرد کێتان شارەزایە پێشمان کەوێت تا ناو بیارە، کاک حەمەسەلیم ووتی: من شارەزام پێشمان کەوت رێگەی نێو کاتژمێرە، ئەوەندە کەوتینە ناو شەخەڵ و توودرک و چوینە ناو چەمو هاتینەوە دەر بە سێ کاتژمێر گەیشتین، سەرەتا چووینە ماڵی کوێخا موستەفا، دوای پشووودان و نان خواردن سەرکەوتین و چوین بۆ گەڕەکی بەرامبەر خانەقا ماڵی خوشکی یەکێک لەوانە بەناوی ئایشێ لەوێ بوو، چەند ماڵێک گەڕاین کەسمان دەست نەکەوت گەڕاینەوە بۆ بەر جادە دووماڵ لەبەردەم جادەکەدا بوون دراوسێی مام کوێخا بوون، چووینە ئەوێ نیازی ووتی: ئەمانە دووره خزمیانن پورزای حامد و ئامۆزای فەیرۆزن، ووتی: من با نەیەمە ژوورەوە ئەمناسن. من خۆم چوومە ژوورەوە دوای چاکوچۆنی ووتم: هەندێک نان و شەکر و چامان بدەنێ. ووتیان: بەسەر چاو جارێ دانیشن نان بخۆن، ووتمان نانمان خواردوە دانیشتین. پیاوێک و دوو کوڕی مێرمنداڵی لێبوو وردە وردە دەستمان کرد بە قسە کردن، تاکوڵمان بۆ ئەپێچنەوە، پرسیم لە کابرا چی ئەم ماڵەیت چی ئەکەی لێرە؟ ووتی خەڵکی هانەگەرمەڵەم هاتووم کرێکارم گوێز ئەتەکێنم، زۆر کزۆڵ بوو بەزەیم پێداهاتەوە، لەدوو کوڕەکەم پرسی ئێوە کوری ئەم ماڵەن باوکتان لەکوێیە؟ یەکێکیان ووتی بەڵێ کوڕیانین باوکمان لێرە نییە، کەیبانووی ماڵ ناوی ئامە فاتم بوو نان وشەکرو چاکەی ئامادە کرد، هەستاین بڕۆینە دەرەوە پرسیم لەیەکێک لەکوڕەکان ناوتان چییە؟ یەکێکیان ووتی ناوی من حسێنە ئەویش محسن، ووتم دەباشە لەگەڵمان وەرن بمان خەنەسەر رێگا، هاتن و ئەم هێشت بگەرێنەوە، دەمەو بەیانی گەیشتینەوە نزیک بەنەنی بەڵخە، لە باواندەرە ماڵێکی لێبوو ئاژەڵدار بوو دوو گیسکمان لا کرین، خۆر هەڵنەهاتبوو گەیشتینە باخەکانی مامە یارەی بەڵخەیی لەوێ ماینەوە گیسکەکانمان سەربرین گۆشتمان دابەشکرد، خوێمان لەبیر چووبوو گۆشتەکەمان بەبێ خوێ خوارد. لەو کاتەدا ئاگرمان کردەوە دوو فڕۆکەی کۆپتەر بەسەرمانەوە دەرکەوتن زوو ئاگرەکەمان کوژاندەوە نەوەک بە دووکەڵەکەیا پێمان بزانن، لەئێمە دەرچوون و بەنگی دەست رێژی شەست تیر هات لەنێوان بەڵخەو سۆسەکاندا، دواتر زانیمان دابوویان لەسەیارەیەکی جێب کوڕێکی حاجی عەلیەسوری تەوێڵەیان شەهید کرد بەناوی نائب.
ئێمەش ئێوارەی ئەو رۆژە گەڕاینەوە بۆ دەوروبەری چیای پەروونی چەند رۆژ کوڕەکانمان لابوو کەس نەهات بەدوایاندا ئێمەش ناچار بەرمان دان. کاتێک رەوانەمان ئەکردن حسێن ووتی کاک حەمە ئیشم پێتە بردمیە لاوە ووتم: فەرموو. ووتی: ئەو کابرا ئەوشەوە لەماڵی خۆمان بوو بەتۆی ووت خەڵکی هانە گەرمەڵەم ئەوە ئەمینەکوێری برای حامدی حەمەکە بوو،ووتم: تازە گوزەشت ئەو شەوە بۆ پێت نەووتم؟ ووتی: ئەم ماوە لەلای ئێوە تێگەشتم و هەندێک شت فێر بووم لەوکاتەدا نەم ئەزانی ئەوانە چیان کردووە بەڵێن بێت من ئیشتان بۆبکەم، وەڵڵا باوکیشم لە هۆدەکەی تردا بوو خۆی ئاشکرا نەکرد بە ئێوە. بەداخەوە دوای راپەرین زانیم حسێن بووە بە جاش لەگەڵ حامدو لەساڵی ١٩٨٧دا لەگرتنی قەرەداغدا کوژراوە، موحسینیش لەکیمیابارانەکەی هەڵەبجەدا لەساڵی ١٩٨٨ شەهید بووە.

# شەهید کردنی گریانەییی و
# بردنی پارەی بنێشتەکە

مانگی ١٩٧٨/١١ عومەر باسام کەلای ئێمە پێشمەرگە بوو، رایکرد بۆ ناو قیادەی موەقەت ئەو مەفرەزەش کەبەپیلان هاتبوونە لامان حامد حەمەکەو هاوڕێکانی لەبیارە تەقەیەکی ترسنۆکانەیان لە گریانەیی و هاوڕێکانی کردو رایان کردبوو، گەڕابوونەوە بۆلای ئەوان قیادەی موەقەت. زانیاری تەواویان لەسەر ئێمە دابوو، شوێن و جێگەی کەمین و حەرەسیاتمان، ژمارەی چەکدار و بێچەک و دیلەکان، عەزیزی حەمەسالح و زیندانییەکانیتر، وردەکاریان بەوان گەیاندبوو. لەسەر بنەمای ئەم زانیاریانە بەرنامەیەکیان دارشتبوو کەشەوێک هێرشێکی لەناکاو غافلگیرانە بکەنە سەرمان، ئەو شەوە رێکەوتی ١٢لەسەر١٣ی ١١-١٩٧٨بوو، لەکاتێکدا کە مەفرەزەیەکی کەرتەکەمان چوو بوون بۆ هەڵەبجە و دەوروبەری، ئەو مەفرەزەش بریتیبوون لە م. شاهۆ، فەتاحی جافر، نەجیم مۆردینی، حەبیب دەوانی، وەهاب مۆردینی، ئەمینی عینایەت، ئێمە مابووینەوە نزیکەی ١٥پێشمەرگەیەک کە ٤چوار کەسیان بێچەک بوون و سێ دیلیشمان لابوو.

چەند رۆژێک پێشتر سێ بار بنێشتەکەمان لە هەڵەبجە فرۆشرابوو بەبڕی ١٥٠٠ دینارو پارەکەیان هێنابووەوە بۆمان، ئێوارەی ئەو رۆژە ئەحمەد گریانەیی کۆبوونەوەیەکی پێکردین ووتی: سبەینێ هەر پێشمەرگەیەک ٥ دیناری ئەدەینێ و مەڕێکیش ئەکڕین بۆ خواردن، ئەوەیشی کەلێی دەمێنێتەوە چەند تفەنگێک و هەندێ فیشەکی لێ دەکڕین ، هەمووومان خۆشییەک دایگرتین، لەهەمووومان زیاتر عەزیزی حەمەسالح دڵخۆش بوو کەئێمە حسابی دیلمان بۆ نەدەکرد ئەویش هیچ هەوڵێکی ڕاکردنی نەئەدا و دڵشاد بوو بەو مژدەیە.

ئێمە کاتێک حەیوانێکمان سەردەبڕی، گۆشتەکەیمان بە پێی ئەوەی چەند کەسین پشک پشکمان دەکرد، لە سەر پێستی ئاژەڵەکە یەک یەک دامان



وەستاوەکان لای ڕاستەوە حەبیب دەوانی شەهید
گریانەیی،حەمەی محەمەدحەمید . دانیشتووەکان لای ڕاستەوە
شەهید هێمن شەهید عەباس - عەلی تەرسمان

ئەنا، پێشمەرگەیێک پشتی لە پشکەکان ئەکردو بەپێوە ئەوەستا لیستی ناویی پێشمەرگەکانی لەدەستدا بوو، یەکێکیش دەستی ئەخستە سەر هەر پشکێک و دەی ووت ئەمە بۆ کێ؟. ئەو کەسەی لیستەکەی بەدەستەوە بوو ئەیووت ئەوە بۆ فلانە کەس، تا پشکەکان تەواو ئەبوون دابەش دەکرا، هیچ جیاوازیێک لە نیوان کەسماندا نەبوو، واتە لە نێوان بەر پرس و نابەرپرسدا وەکو یەک دابەش دەکرا، یەکترمان زۆرخۆش ئەویست بۆ نمونە ئەگەر کەسێکمان سێ نانی پێبوایا یەکێکی تر دوو نان، ئەوەی سێ نانەکەی پێ بوو لەتێکی دەدا بە هاورێکەی کە دوو نانی پێ بوو، عەزیزی حەمە سالح بەم یەکسانی و خۆشەویستیەی نێوان ئێمە زۆر دڵشاد بوو، ئەیووت لە دوو شۆڕشدا بەشداریم کردووە ئەم نیزام و یەکسانی و خۆشەویستنەی لە ناو ئێوەدا هەیە نەم دیووە. ئەو شەوەی قیادەی موەقەت بەسەر پەرشتی نادر هەورامی هاتە سەرمان ئەم ناوانەی خوارەوە پێشمەرگەکانی کەرتەکەمان بوون، حەوت پێشمەرگەیان ئەوشەوە لامان نەبوون و چووبون بۆ دەورووبەری هەڵەبجە بەمەفرەزە، ئەمانەی خوارەوە ناوی پێشمەرگەکانی کەرتی دووی هەورامانە:

ئەحمەد کەریم ڕەزا (گریيانەیی) ف-کەرت
پشکۆ نەجمەدین ڕابەر سیاسی
دڵسۆز محمد سان ئەحمەد
عەبدوڵا حاجی دێوانە
عەزیز عەبدوڵا نەسروڵا
نەجمەدین عەزیز
حەبیب دەوانی
عەبدوڵا وەهاب

هادی حەمەیوسف (مام هادی)
سدیق تۆفیق شاکەرەم
بەرزان غەیدان هاواری
سلێمان مەحیەدین - بێچەک
کەمال حسێن خەرپانی- بێچەک
نەجیم خەرپانی - بێچەک
عەلی عوسمان سۆسەکانی
موحەمەد سەعید ئەحمەد م.شاهۆ
وەهاب مۆردینی
نەجیم مۆردینی
فەتاح جەعفەر ئێناخی
ئەمینی عینایەت ئێناخی
ئەمیر غەفور بۆینی
نەجمەدین فەتحولاحیزبی شیوعی- بێچەک
حەمەی حەمە سەعید

ئەوشەوە کات مابووی بگات بە ١١شەو عەبدوللای حاجی دیوانەی عەنەبی حەرەس بوو، هات بۆ لای من نەخەوتبوم ووتی: لەولایەوە لەناوباخەکەدا دووکەس بانگ ئەکەن، چووم نزیکیان بومەوە وتیان کاک ئەحمەدمان دەوێ. هەستام لەگەڵ عەبدوللا چووین بەدەمیانەوە ئەبینم فەتاحی حاجی ئەولەو ئەنوەری عەبدلخالقە، وتیان کاک ئەحمەدمان ئەوێت باهەر خۆت بزانی ئێمەین، من گەڕامەوە بۆ خانەباخەکە، ئەحمەد گریانەیی بەشەو دەخەوت بەناڕەحەت خەبەرمان دەکردەوە واتە خەوی قورس بوو، م. پشکۆ بەپێچەوانەی ئەمەوە نوسیویەتی زۆر وریا وەک کێچ وا بوو، هەڵمان ساند تا ئەو هەڵسا پێشمەرگەکان هەنێکیان بەخەبەر هاتن. م.پشکۆ لەئەزموون و یاددا دەڵێ: م.شاهۆ و کاک ئەحمەد ڕۆیشتن بۆ لایان. بەڵام مامۆستا شاهۆ بە مەفرەزەچوو بوو بۆ هەڵەبجە. ئەحمەد گریانەیی هات و من چووم لەگەڵیاو ڕۆشتین بۆ لایان من لەدورەوە وەستام، بەڵام گوێم لەهەموو وتووێژەکەیان بوو، ئەنوەر عەبدولخالق و فەتاح عەبدوللا ئاگاداری

کاک ئەحمەد گریانەیان کرد کەقیادە موەقەتە نزیکەی ٨٠ چەکدارێکن و بەسەر پەرشتی نادر هەورامی هاتوونەتە ئاوایی شۆشمێی خواروو لەپەلاماردان بێنە سەرتان.

ئەمانە چۆن ئەو هەواڵەیان زانیبوو؟ لەوەلامدا دەبێت بڵێین: زۆراب عەزیز بارام خاڵۆی منە لای قیادەی موەقەت بوو، ئەم کارەی پێ باش نابێت کەبدەن بەسەر ئێمەداو غافڵگیرمان بکەن دۆستیشمان بوو، هێزەکەیان لەڕۆژی ١٩٧٨/١١/١١دا لەئاوایی کێمنەوە هاتبوونە ئاوایی دزئاوەر دووئاوایی کوردستانی ڕۆژهەڵاتن لەوێوەشەوە بەشەو هاتبونە سەرکانی و ئاوباخێک بەناوی وەزڵی، کەدەکەوێتە سەر سنوور لەنێوان شارۆچکەی نەوسوودی کوردستانی ڕۆژ هەلات و شارەدێی تەوێڵە لەکوردستانی باشوور.

ڕۆژی ١٩٧٨/١١/١٢ کەلەسەر کانی و ئاوی وەزڵی دەبن چاوەڕێی ئەوە دەکەن دنیا تاریک دابێت و بەرنامەکەیان جێبەجێ بکەن، کەغافڵگیر کردنی ئێمە بوو. لە وەزڵی نەسرەدین حەمەیوسف کەڕاو چییەکی خەڵکی تەوێڵە بوو لەوێ دەبێت دەیگرن و تا داهاتنی تاریکی لای خۆیان گلی دەدەنەوە. کاتێک دەکەونە ڕێ بەرەو شۆشمێ ئازادی دەکەن، لەو کاتەدا خاڵۆ زۆراب پێی دەڵێت: خێرا بگەڕێوە و کەگەشتیتە تەوێڵە برۆ بۆ لای حاجی ئەولە و ئاگاداری بکە بڵێ زۆراب وتی ئێمە دەچینە سەر ئەحمەد گریانەی لەپەروونی. بەر لەوەی ئەوان بگەنە شۆشمێ نەسردین زوو دەگەڕێتەوە بۆتەوێڵە، دەچێتە ماڵی حاجی ئەولەو هەواڵەکەی پێ دەگەیەنێت.

حاجی ئەولە کوڕەکانی بانگ دەکات و دەڵێ: بچن بۆ پەرونی ئاگاداری ئەحمەد گریانەیی بکەن، پێی بڵێن کەئەمشەو دێنە سەریان. دیارە لەم بارەیەوە لەنێوانیاندا قسە درێژە دەکێشێ کێ بڕواو کێ نەڕوا، بۆیە حاجی ئەولە توورە دەبێ و خۆی کۆدەکاتەوە دەڵێ: خۆم دەچم، ئەوانیش ڕێگەی پێ نادەن، فەتاح ئەڵێ من ئەچم ئەنوەریش بانگ ئەکاو پێکەوە هاتبوون، حاجی ئەولە بەرنامەشی بۆ دانابووین چیبکەین وتبووی بەئەحمەد بڵێن شەڕنەکەن ئەوان کەمن و ئەمان قیادە زۆرن، بابچن بۆ هەنەشروان، ئەوکات ئەمان ئەچنە سەر خانە باخەکە لە پەروونی کەسی لێنەبێ ئەگەڕێنەوە، ئەگەر ڕۆیشتن بۆئەوێش بەدوایاندا ئەوا ئەوکات ڕۆژەو ئەتوانن لێیان بدەن.

حاجی ئەوله لەدلا ئەلێت نەک ئەنوەرو فەتحلا بترسن و نەڕۆن ، حەمەیوسف حەمە سۆسەکانی کەئەو شەوە لەماڵی حاجی ئەوله دەبێت، حاجی دەمانچەی هەیەو حەمەیوسف دەنێرێت بۆ شوێنێکی نزیکی ئێمە، کەدەنگی دەمانچە بگاتە گوێمان، حاجی پێی دەڵێت: ڕیزێک فیشەکی دەمانچە بتەقێنە بەرەو پەروونی تا بەئاگابێینەوەو خافلگیر نەکرێن.

حەمەیوسف دێت و هەموو فیشەکەکانی ناو شانەکان تاقی دەکاتەوە چروک دەبن ناتەقن، بۆیە دوای گەڕانەوە دەچێتە لای حاجی ئەولەو پێی دەڵێت: دەمانچەکە تەقەی نەکرد. حاجی دەڵێت ترساوی چۆن تەقەی نەکرد، ئەڵێت ئەوە فیشەکەکان هەموویانم چرکاندوە.

لەملاوە فەتاحی کوڕی و ئەنوەر عەبدولخالق کەزاوای شەهید ئەحمەدە دێنە شۆشمێ سەرو بۆ ماڵی نوری شۆشمەیی، تا لەوێوە نوری لەگەڵ خۆیان بێنن بۆ پەروونی. نوری دەهێنن و دەگەنە شۆشمێی خواروو، (دوو ئاوای کوردستانی ڕۆژ هەڵاتن) فەتاح و ئەنوەر لەدەرەوەی ئاوایی دەوەستن و نوری دەچێت بۆناو ئاوایی تابزانێ ئاخۆ کەسی لێیە یان نا؟ هەر ئەگاتە بەردەم مزگەوتەکەی ئاوایی نوری دەنگ دەدەن و دەیگرن و دەیبەن بۆ ماڵی حەبیب پالانەیی، نادر هەورامی لەوێ بووە، لەماڵی حەبیب بەنوری دەڵێ: بۆچی بەم شەوە هاتویەتە ئێرە؟ دیارەگومانیان لەهاتنەکەی دەبێت.

فەتاح و ئەنوەریش کە لەدوورەوە گوێیان لەدەنگدانی نوری بووە خۆیان بەرەو پەروونی دێن. هەردووکیان زۆر بوێرانە و مەردانە بەو جۆرە بەناو ڕەبایەو کەمینی بەعسدا و لەملاشیانەوە پاسگاو کەمینی چریکەکانی ئێرانی شادا خۆیان گەیاندبووە پەرونی. ئەوان ئێمەیان ئاگادار کرد، بەڵام ئێمە نەزان بووین و نەمان ئەزانی ئەو شەوەچی بکەین؟ دوای ئاگادار کردن و گەڕانەوەی ئەو دوو کەسە کاک ئەحمەد گریانەیی کۆی کردینەوە کەچی بکەین؟ م. پشکۆ پێشنیارێکی ژیرانەی کرد، ووتی ئێمە کەمین بادوور بکەوینەوە بچین بۆچیای ئاوەزلی و هانە شیروان، ئەوان کەدێن و ئێمە لێرە نەماوین دەگەڕێنەوە، ڕێک بەرنامەکەی حاجی ئەولە بۆی دانابوین. بارەگاکەمان هەندێ قاپ و قاچاخ و کتری و قوری و چەند بەتانییەکی ڕەش بەولاوە هیچی دیکەی تێدا نەبوو.

زۆربەمان ئەمەمان پێ باشتر بوو، م.پشکۆ راستی دەکرد (٧) حەوت پێشمەرگەی شەڕکەرمان لەوێ نەبوون، لەگەڵ ئەمەشدا پێشمەرگەی بێچەک و سێ دیلیشمان لەلا بوو. مابووینەوە ١٣سێزدە کەسێک، پێویستی نەدەکرد بەرگری لەو قاپ و قاچاخ و بەتانییە ڕەشانە بکەین. کەچی بەرلەوەی کاک ئەحمەد گریانەیی ڕای خۆی دەربارەی پێشنیارەکەی م. پشکۆ دەرببڕێت، پێشمەرگەیەک لەولاوە ووتی بۆ کوێ بڕۆین؟ قیادە موەقەتە چییە لێیان بترسین و راکەین؟ دواتر تەقە دەستی پێکرد ئەو پێشمەرگە بۆی هەڵهات و پشتی ئێمەی بەردا. کاک ئەحمەد دوای قسەی ئەو هەڤاڵە توورە بوو، ووتی ئادەی باسەرکەوینە سەر شاخ، بۆ پشتی بارەگاکەمان، هەرچەند کاک ئەحمەد توورە بوو ، بەڵام من پێم ووت با من لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا بچین لەکەوانەی ئاوایی شۆشمێ خواروودا کەمین بگرین ئەوان کەدێنو لەئاوایی دەرئەچن ئەکەونە کەمینەکەمانەوە دەستڕێژیان لێدەکەین بەمجۆرە بەرنامەکەیان تێک ئەچێت، دوای ئەوە دێینەوە بۆ ئەو شوێنەی کە مامۆستا پشکۆ باسی دەکات، ئێوە دیلەکان و بێچەکەکان لەگەڵ خۆتان بەرن و بڕۆن.

گریانەیی بەمە رازی نەبوو سەری خستین بۆبن قەزوانی بەنەن (تک درخت) لەوێ چوار کەسی نارده جێگەیەک بەناوی قەڵاتەی شوانان، بەحساب کەمینی یەکەمەو دوژمن لەوێوە دێت، ئەوانیش دڵسۆز محەمەد، عەبدوڵا وەهاب[1]، عەزیز عەبدوڵا، نەنجمەدین عەزیز بوون، خۆی و دیل و بێچەکەکانیش لەگەڵ مامۆستا پشکۆو د. نەجمەدین و مام هادی لەجێگەیەکدا بەناوی چا لاوەی خوگان لایاندا، من و سدیق گریانەییش نارد بۆ سەر بەرزاییەک لەو سەر بەدووری ٧٠٠ مەتر لەخۆیەوە ، ووتی: بەیانی ڕۆژ بووەوە تۆ وەرە دووربینەکەت بێنە تابچین بەڕووی ئەودیودا و سەیری لای

---

[1] مام عەبەکەی وەهاب بەتەمەنترین پێشمەرگەی کەرتەکامان بوو، پیاوێکی سادەو ساکاری نەخوێنەوار بوو، مامە عەبە هونەرمەندیش بوو، دەیزانی شمشاڵ بژەنێ، ئەوکاتانەی لەئەشکەوتەکانی کەناری سیروان ئەماینەوە، من داوام لێئەکرد شمشالمان بۆ بژەنێ، ئەویش ئەیناردم بۆ گوێ ئاو بۆهێنانی قامیش تا شمشاڵ درووست بکات.
تا تاوێک شمشاڵی بۆ ئەژەنین چەندین بیانووی ئەگرت، ئەیوت ئەمەیان تەنگەو هەوا ناکێشێ، گەورەترم بۆ ئەهێنا ئەیووت گەورەیەو فوو بەشی ناکات، میانەم بۆ ئەهێنا ئەیوت ددانم نین باش ناژەنێ، منیش وازم ئەهێناو ئەچوومە جێگاکەی خۆم .

بارگەکەمان بکەین. دیارە وای دەزانی سبەینێ لەگەڵ ڕۆژ بوونەوەدا دێنە سەر بارەگاکەمان، دووری نێوان خۆی و ئەو کەمینە چوارکەسیە دوو کیلۆمەتر دەبێت، خۆیشی دوو پێشمەرگەی نەکردە دەکاتە حەرەس و لەگەڵ دیل و پێشمەرگە بێ چەکەکان لەدۆڵێکدا دائەنیشن.

کاتژمێر دووی شەو بوو، جارجار هەور بەری مانگی لێدەگرتین، ئیتر تریفە نەدەبووە شەو چرای ڕێمان، شەوەکە ئاودامان قوماشێکی ڕەشی دەپۆشی، کورد واتەنی چاو چاوی نەدەدی، جار جاریش پەڵە هەورێک پەچەی خۆی لەڕووی بوکی مانگەکە لادەدا ئەو شیعرەی مەولەوی خۆی دەخزاندە هەناومانەوە کەدەڵێ: (گۆشەی سیاماڵ هۆردا و دیاوە - چون مانگ نەگۆشەی هەوری سیاوە).

گڤە و هاژەی کزەبایەکی ساردیش بەناو قەتارەی هەژگ و بنگەڵاندا تەراتێنی دەکرد و مۆسیقایەکی ناسازی دەئاخنییە گوێمانەوە، لەم لاشەوە کار مامزی خەیاڵمان لەدەشتێکی قاقڕدا دۆش دامابوو بەدوای تروسکەی چارەنووسی خۆیدا دەگەڕا، چونکە وێنەی بێگوناهمان لەچوار چێوەی پیلانێکدا قەتیس بوو کەدوژمنە خۆماڵیەکان قەرەوڵیان لێگرتبوو، نەک دوژمنی سەربەرزاییەکان کەسووتانی ئاواییەکان و لەناوبردنی ئێمەیان بەحەجی گەورە دەزانی.

لەگەڵ سدیق گریبانەییدا لەناو سەنگەرەکەماندا کورکەمان کردبوو، لەناویدا بۆسرتەی دەنگێک گوێمان سوک کردبوو، لەناکاو بووە دەنگە دەنگ و هات و هاوار، بەدوایدا چەخماخەی چەند دەستڕێژێ هێڵێکی سووریان لەتاریکیدا دروست کرد.

نەیارەکانمان هەر لەئاوایی شۆشمێ دەرچوون، بەپێی ئەو زانیاریانەی کە عومەر باسام و حامد بیارەیی پێیان دابوون بەم شێوەیە دابەش بوون بەگوزەرەکەدا، بیست و پێنج کەسیان ناردووە بۆلای دارو شەخسەکەی بازی بێگوناح، بۆ دەستە ڕاستی ئەو خانە باخەی پەروونی کەبارەگا خۆشەویستەکەو لانەی ئێمەی لێ بوو، بیست کەسیش بۆ سەر بارەگاکە و بەحیساب گرتنی پاسەوانەکە، نزیکەی چل کەسیش بۆسەر شاخەکەی پشتی بارەگاکە، ئەمانەش لەو ڕێگەیەوە هاتوون کەکەمینە چوارکەسیەکەی لێ بووە، بەڵام توشی کەس نەبوو بوون، دیارە لەڕاستە ڕێوە نەهاتبوون، ئەوانە کەدانرابوون بۆگرتنی بارەگاکە، کە دێنە سەر خانەباخەکە تەماشا ئەکەن

کەسی لێنییە، کەدەزانن چۆڵە و ئێمە ئاگادار کراوین و لەوێ نەماوین، یەکتر ئاگادار دەکەن، هەندێکیان یەک دەگرنەوە و راستە و راست دێنە سەرەوە، یەکەم جارئەچنە سەر ئەودوو پاسەوانەی پاسەوانی شوێنەکەی مامۆستا پشکۆ، مام هادی، گریانەیی، دکتۆر نەجمەدین و دیلەکان دەکەن، ئەم هەڤالانە لەچالاییەکدا بەو سەرمایە دەخەون.

خالۆ زۆراب لەپێشەوە دەبێت ئەچێتە سەر ئەو دوو پێشمەرگە نەکردەی پاسەوانی کاک ئەحمەد و برادەرەکانی، یەکێکیان بەتانی داوە بەسەر خۆیدا و دەیگرن، ناوی سلیمان محیەدین بوو، ئەوی تریان بەرزان هاواری هەڵدێت بۆلای کاک ئەحمەدو دەڵێ: هەستن هاتنە سەرمان، کاک ئەحمەد دیارە ویستویەتی بەرەو لای پاسەوانەکەی تر بڕوات، نازانێ گیراوە ناگات گوللەیەک سەر سنگی دەبڕێت، لەوکاتەدا بە م.پشکۆ و مام هادی دەڵێت عەزیز بەرن و بچنە خوارەوە بۆ هاوار و دەرەتفێ، خۆی لەگەڵ د.نەجمەدین و بەرزان هاواری بەرەو لای ئێمە دێن، بۆلای من و سدیق، بەڵام ناگات، دکتۆر نەجمەدین نزیک بوەوە دەنگمان دا ووتی: خۆمم بۆ لای ئێوە دێم، هاتە لامان و پرسیمان چییە؟ ووتی کاک ئەحمەد وتوویەتی بڕۆین بۆلای حەمەو سدیق کەچی خۆی تائەم لاوە هات لەوێ بەمنی ووت تۆبڕۆ لەگەڵ سدیق و حەمە وەرنە خوارەوە بۆ هاوار و خۆی ڕۆشتووە، ئێمە باوەرمان پێ نەکرد، چونکە کاک ئەحمەد بۆ بۆخۆی ئەهات ئەگەر بیەوێت چۆلی بکەین و بەرەو هاوار و دەرەتفێ بڕۆین؟ بارزانیش تەئکیدی لەسەر ئەو قسەیە کردەوە، دیارە کاک ئەحمەد لەگەڵیان هاتوە بەڵام زانیویەتی ناتوانێت سەرکەوێت بۆ لای ئێمە بەمانی ووتوە بڕۆن بە حەمەو سدیق بڵێن بێن بەرەو دەرەتفێ، دیارە برینداریەکەی شاردبوویەوە لە دکتۆر نەجمەدین و بەرزان هاواری، لەدوای ئەوان ئیتر کەمێک دوور کەوتوەتەوەو رووەو ئاوایی دەرەتفێ داگەڕابوو ئیتر لەوێ کەوتوە، بەیانی کە ڕۆژ بۆتەوە لەوسەر ملەوە بە دوری دووسەد مەتر بەرەو دەرەتفێ قیادە موەقەت بە فەروە ڕەشەکەی بەریدا لاشەی بێڕۆحی ئەوهەڵۆ بەرزەفڕە ئەدۆزنەوە.

دوای ماوەیەک لەهاتنی بەرزان و د. نەجمەدین، ڕوویان کردە سەنگەرەکەی ئێمە تەقەدەستی پێکرد، تاشەبەقی دا تەقەمان کرد لەچەند لایەکەوە وردە وردە نزیک بوونەوە، بەڵام نەمان هێشت بێنە پێشەوە،

لەودەمی شەبەقەدا ئێمە پشتمان چۆڵ بوو، لەوێوە دەرچووین، چووین بۆسەر کانییەکەی گەچێنە و بەدووربین تەماشمان دەکرد، بۆمان دەرکەوت کەبەرزاییەکانی دەوروبەریان گرتووە، چووینە خوارەوە بۆ قەڵاگا د. نەجمەدین قاچی لەجێ چوو بوو، لەوێ لەلای خاوەن باخێک بەجێمان هێشت. سدیقیش خۆی دزیەوە و لەوێ مایەوە، من و بەرزان گەڕاینەوەو سەرکەوتینە سەر چیای ئاوەزنێ وچووین بەرەو هاوار، لەچۆمی هاوار ئەشکەوتی گۆمە بێبن هەیە لەێ جەماعەتمان دۆزیەوە ئەمانە بوون م.پشکۆ. مام هادی، ئەمیر بۆینی، عەلی عەسمان و عەزیزی حەمەسالحیشیان لەگەڵ بوو.

هەواڵی کاک ئەحمەدیان نەدەزانی، لەوێ م. پشکۆ ووتی چیبکەین؟ من ووتم ئێوە لێرە بن من ئەمشەو ئەچمە تەوێڵە نان ئەهێنم و هەواڵیش ئەزانم سبەینێ دیمەوە. م- پشکۆ ووتی باشە جگەرەش بێنە با بەرزان لای ئێمە بێت، من بەرزانم لای ئەوان بەجێهێشت عەلی عوسمانم لەگەڵ خۆمدا برد. مام هادی ووتی: منیش دێم. ووتم وەرە، بەمامۆستا پشکۆم ووت جێگە نەگۆڕن دوایی ناتان دۆزینەوە، ڕۆشتین و لەنزیک سۆسەکان لەجێگەیەکدا خۆمان شاردەوە بەناوی زووزی حاجی نادر، بەیانی ڕۆژ بووەوە چووینە دۆڵبیان، ڕێکخستن دووژنی ناردبوو بەکۆڵێک نانەوە، ئەم دووژنە ئێستاش ماون پاش ۳٥ سی و پێنج ساڵ هەر بەردەوامن لە تێکۆشاندا، یەکێکیان ناوی گەوەری حەمەیوسف و ئەویتریان ناوی پەرنیسای مام ڕەزا بوو دایکیشم لەگەڵیان بوو، لەوێ ووتیان عەزیزی حاجی ئەولە لە تەوێڵە بەچەکەوە تەسلیم بۆتەوە بەجاشەکانی ڕەشەی ساڵحە ئەم بەیانییە هاتن بردیان بۆ هەڵەبجە، لەوکاتە دا ئەوهەواڵە بۆمن زۆرناخۆش بوو، عەزیز یەکێک بوو لەو چوار پێشمەرگەی کەمینەکە، هەروەها ووتیان سیانەکەی تر لە تەوێڵە خۆیان شاردوەتەوە و ئەگەڕێنەوە بۆ لاتان، ئەوانیش مامە عەبەی وەهاب و نەجمەدین عەزیز و دلسۆزی ڕەئیس بوون، ئەو پێشمەرگەش کەناوی عەلی عوسمان بوو، لەوێ کەگوێی لەقسەی ژنەکان بوو، ووتی بامن بڕۆمەوە ووتم بڕۆ بەڵام باسی هیچ نەکەی ئەویش بەجێی هێشتین و خۆی تەسلیم کردەوە چەکەکەی ئەویش بووە ملمان.

نانەکەمان هەڵگرت و لەگەڵ مام هادی ملی ڕێگامان گرتەبەر بەرەو هاوار، عەسر لەنزیک ئاوایی جاور تووشی م. شاهۆ و مەفرەزەکە بوین کەلەجەولەکەیان گەڕابوونەوە، لەوێ لەدوای قسەکردن و ئاڵوگۆڕی هەواڵ و زانیاری ووتیان ئێمە لەهاوارەوە هاتووین م. پشکۆمان نەدیوە بابچینەوە بۆپەرۆونی. ڕەنگە مامۆستا پشکۆ لەو بارودۆخەدا لەقسەکەی من ترسابێ و جێگەکەی گۆڕیوەو ڕۆیشتوە بەرەو عەبابەیلێ، ئێمە گەڕاینەوە بۆ پەرۆونی ئەوێ دیتمان قەرەباڵقیەکە و خەڵکی ئاواییەکانی شێخان و شۆشمێ و شێنێ هاتوون و لەگۆڕستانەکەی بازی بێگوناح خەریکی ئەسپەردە کردنی تەرمی شەهید ئەحمەد گریانەیین.

خەڵکەکە بۆیان گێڕاینەوە ووتیان پێرێ شەو قیادە موەقەتە هاتوونەتە شۆشمێی خواروو دەوری ئاواییان داوە و دوای نانخواردن هاتن بۆ سەر ئێوە، دوای ئەوە دوێنێ شەو کەس نەخەوتوەو سەیری ناوچەکە و گوێمان ڕادێرا بوو بۆ تەقەکان. دوێنێش نزیک عەسر گەڕانەوە بەرەو دزاوەر بەئاشکرا بەلاماندا تێپەڕین و ڕۆشتنەوە، بریندارێکیان پێبوو بەناوی زۆراب عەزیز لاقی شکابوو. بەئاشکرا ئۆتۆمبێل هات و ساواک و چریکی ئێران لەم ناوە بوون و بریندارەکەیان بۆچارەسەر بەرەو کرماشان برد.

هەر ئەو خەڵکە بۆیان گێڕاینەوە و ووتیان: بەئێمەیان وتووە ئەحمەد گریانەیمان کوشتووە ئەوەش چەک و دەمانچەکەیەتی هێناومانە، بۆ ئاگاداریش بابزانن ئەم جەلالیانە پیاوی بەعسن، ئەوە ئەحمەد گریانەیی هەزارو پێنج سەد دیناری پێبووە، چۆن پێشمەرگە لەم شاخەدا ئەوەندە پارەی پێ دەبێت ئەگەر بەعس هاوکاریان نەکات؟.

ووتیان: ئێمەش پێمان وتوون: ڕاست ناکەن ئەوەپارەی بنێشتەکەیە کە ئەحمەد گریانەیی و پێشمەرگەکانی ماوەیەک خەریکی بنێشت کۆکردنەوە بوون و لەم ڕۆژانەدا فرۆشتبوویان، وا ئێوەش پارەکەتان برد.

بەلام کاک نادر توورە ئەبێ و بەدەنگی بەرز ئەڵێت ئاها .... بەستەی ١٥٠٠ دینارەکە ڕائەوەشێنێت ئەڵێت: ئەگەر ئەحمەد بەعسی نییە پێشمەرگە پارەی کوا؟ حاجی ئەوڵ کەریم خەڵکی ئاوایی شوشمێ و ڕیش سپی بوو، کاک ئەحمەدی زۆرخۆش ئەویست ئەڵێت ئەحمەد گریانەیی جاسوس پیاوی بەعس نییە، ئەوەپارەی بنێشتەکەیە ئێمە ئەزانین ئەحمەد گریانەیی بە بنێشت کردن پێشمەرگەکانی ئەژیێنێت، بەلام ئێوە جاش و پیاوی ساواکن.

## خۆرەتاو پرسە دادەنێت

خۆرەتاو چیایەکی بەرزە، لەڕووی ڕۆژهەڵاتەوە دیوارێکی سەختی بۆئاوایی گریانە دروست کردووە. ژمارەیەکی زۆر دارە بەنی پێوەیە کەساڵانە گریانەییەکان قەزوان و بنێشتیان تیا بەرهەم دەهێنا، جگەلەوەش دارەکانی بەڕوو، کێکف، بلاڵوکی لەخۆگرتووە، ئەوکاتەی ئەحمەد گریانەیی هەواری تەمەنی گواستەوە بۆمەنزڵی شەهیدان، ئەم چیایە کۆتەڵێکی بۆگێڕا کەتائێستەش پرسەکەی نەشکاندووە، چونکە ئەو کاکەیە لەخۆشەویستی ئەم چیایەوە سەوداسەری هەموو چیاکانی کوردستان بوو، هەموو بەیانییەک لەترۆپکی ئەم چیایەوە خۆری دەدی زێڕەوشانی ئاواییەکەیانی دەکرد، بۆیە لەزێڕی خۆر و بەرزایی ئەو چیایەوە بوو بە فەرهادێکی هەمیشەیی شیرینی ئاوایی ئازادی.

ئێمەش بەلەدەست دانی ئەو کەڵە مێردە نەبەز و نەبەردە، ئەو ڕێنوێنەی کاروبارەکانمان و ئەو چرا بەسۆزەی شەوانی تاریکی پێشمەرگایەتیمان خەمێکی قورس بەرۆکی دڵی گرتین و تائێستەش ئاهی بۆ هەڵدەکێشین یادی بەخێر..... هەزار جار، بەڵێ بابێینەوە سەرباسەکە: بەگریانی وشک..... بەناڵەی بێدەنگ، لەناو ئاپۆرەی کوردانی ڕۆژهەڵاتدا هەموو لەدەور جەنازەکەی گریانەیدا وەستاوین، خاک هەڵدرایەوە بە سەر گۆڕیچەکەیدا. فلچەو بۆیاخمان پێنەبوو شتێک بۆ یادگاری لەسەر کێلی گۆرەکەی بنوسین. بەڵام مەزاری کەڵەمێردی وا چۆن لەبیر دەکرێت؟ بە تایبەتی کە ژەرەژی ڕۆحی بە داوی لارەبرا قاسبەی چنراوە، ئیتر ماڵئاوا ئەی هەڵۆ چاووتیژەکەی تاریکەلانی سەردەمی بەرخۆدان. خوات لەگەڵ ئەی جوانمێرەکەی گیان و ژیان و مان و هەست و هەڵوێست و خوست و مەبەست و نەست و نازو نیازو ڕازو ئاوازی خورپەی دڵت ڕادەستی ڕێبازی کوردایەتی کرد بوو. ت گەل و نیشتیمانە خێر نەدیوەکەت لە سینە باخی سەرفرازیدا ئۆخژن بگرن.

کاتێک هەڤاڵێکمان شەهید ئەبوو نیگەران دەبوین خەم و پەژارە دای ئەگرتین. بەشێوەیەکی کاتی و بۆماوەیەکی کەم، چونکە ئەمانزانی دواتر یەکێکی ترمان.

هەمان چارەنوس چاوەڕێی ئەکات. زۆر قارەمان و کوڕی نەبەرد و مەردی مەیدانمان گیانیان بەخت کرد، بەبێ ڕێوڕەسم و بەبێ کوڕی ماتەم، زۆریشیان کەلێمان ون ئەبون تەرمە پیرۆزە کانیشیان نەئەبینرانەوە، لەوە ناخۆشتر ئەوە بوو کەسوکارو بنەماڵەکانیشیان نەیان ئەتوانی بە دزیشەوە کوڕی پرسەیان بۆ بگرن، ئەوساتانەی بەیەکگەیشتن زۆر ناخۆشبون دوای ماوەیەک کەسوکارو خێزان و منالی شەهیدێ بەدزیەوە ئەهاتن بۆ بینینی هاوسەنگەرەکانی باوک و برا شەهیدەکەیان.

دۆستەکانمان لەمەراسیمی بەخاک سپاردنی کاکە ئەحمەد گریانەیی دا بڕێکی پێویست نان و شەکر و چایان بۆ هێنابووین، قەرەبووی ئەو ئازوقەیەی بۆکردینەوە کە ق.م لەبارەگاکەماندا نەوتیان پێدا ڕژاندبوو. بێ ئەوەی شەهید گریانەی سەرقەتارمان بێت جارێکی تر ڕێگەی کولێن دەشت و هەزار پەزمان گرتەبەر، کولێن دەشت خانوویەکی تێدا بوو کەدەبووە زستانەواری میرزا حەمە سالحی نەوسوودی، ئەم ماوە سەرماو باران بەزەییان لێبڕین و هاشاولیان کردە سەرمان.

شەوێک فەتاح ئێناخی داربەڕووی زۆری هێنا و لەدەمی دەرەکەدا ئاگرێکی کردەوە، بۆئەوەی ڕێگای هاتنە ژوورەوەی شەپۆلی سەرما بگرێت، کەئاگرەکە هەڵ چوو داری لاشیپانی دەرەکەی سووتاند، کاتێک لەتاو بۆنی چرە دووکەڵ بەئاگا هاتینەوە دیتمان بنمیچ و داری خانووەکەش دەبنە خۆراکی ئاگر، خانووەکە لەباتی پەنجەرە کەلێنێکی تیابوو فریامان کەووت و لەوێوە بۆی دەرچووینە دەرەوە، خۆ ئاوی ڕووباری سیروان ئەوەندە دوور نەبوو لێمان، بەلام کەرەستەیەکمان پێ نەبوو ئاوی پێ بێنین بۆ کوژانەوەی ئەو ئاگرە نەگریسە، بۆیە ناچار بەدیار نیوە خانووەکەوە چیچکانمان داکووتا، تا تەواو سووتا و ڕوخا بەسەریەکدا، بەیانی کەڕۆژ بوەوە چەند پێشمەرگەیەک نێردران بۆلای هەردوو کەرتی شەهید فەرەج تریفەی و شەهید غەفوور دەرەشیشی تا ئاگاداریان بکەن ئەحمەد شەهید بووە و بێن تا بزانین ئێمەچی بکەین؟

دوای یەک دوو ڕۆژ کاک غەفوور گەشتە لامان، کۆبوونەوەیەکمان کردو لەئەشکەوتێکی ئەو ناوەدا ماینەوە، زۆری نەبرد مەفرەزەیەکی شارەزوور کە حەمە شیرەمەڕی و جەلال کولکنی و هەندێ پێشمەرگەی تربوون گەشتنە

لامان و نامەی کاکە حەمەی حاجی مەحمودیان هێنابوو کەلەگەڵیان بچین بەرەو سوورێن، بەیانییەک من و چەند پێشمەرگەیەک لە ئەشکەوتەکە دەرچووین بەرەو هاوار تابزانین کەسێک نابینین لەرێیەوە ئاگاداری عەلی باسام بکەین، لەئوردوگای عەنەب برێک ئاردمان دەست بخات، لەنێوان گرییانەو هاوارەکۆن لەخانە باخێکدا بینیمان دوکەڵ بەرز بۆتەوە، حەیتەی خانەباخەکەمان داو ئێوە کێن؟ وتیان ئێمە پێشمەرگەین، وتمان ئێمەش پێشمەرگەین، باشە ئێمە لای حەمەی حاجی مەحمودەوە هاتوین بۆلای ئێوە، باشە کێ ئەناسن مام هادی، ئێوە ناوی خۆتان بڵێن، حەمە شیرەمەڕی جەلال کولکنی، جەلیل هەڵەبجەیی (نەریمان) .

باشە نەجولێن تا ئاگادارتان ئەکەینەوە، ئادەی مام هادی بانگ بکەن، مام هادی گەشت، ئێوەش یەکێکتان بێچەک بێتە سەرەوە نەریمان هات، دوای چاکو چۆنی مام هادی ئەمە ئەناسی؟ بەڵێ پێشمەرگەیە باشە هەڤاڵەکانت بانگ بکەو وەرز ئێمەش لەگەڵیان پێکەوە گەراینەوە بۆ ئەشکەوتەکە بۆ لای هەڤالان، نامەکەی کاکە حەمە خوێندرایەوە داوا ئەکات ئێمە بچین بۆ سورێن، دوای یەک رۆژ کەوتینەرێ بۆ سورێن، کاتێک کەوتینە رێ مام هادی هات پێی وتم: من نایێم تۆش مەڕۆ وتم بۆ؟ وتی راسە ئەمە(نەریمان) ئەناسم پێشمەرگە بووە بەلام کێ ئەڵێت تەسلیم نەبۆتەوە، ئەمانەش جاشنین لەگەڵیا کەزانیبێتیان ئەحمەد شەهید بووە، ئەم نامەی حەمەش دروست کراو نییە، بیانەوێت بمانبەن بمانخەنە داو، منیش پێکەنیم و مام هادیم بەجێهیشت، لەگەڵ دکتۆر نەجمەدین نەهاتن و رۆشتن بۆ دیوی ئەودیو بۆ هەوارەکانی قەلاگا.

ئێمە بەرێکەوتین هەر ئەو ئێوارەیە شەهید حەیدەری عوسمانی سۆفی عەلی، ئازادی حاجی عومەر هاتن بۆپێشمەرگایەتی و لەگەڵ خۆمان بردمانن، لەگەڵ دادانەوەی پەچەی تاریکیدا گەشتینە نزیک ئاوایی دەرەشیش، ئاوایی وێران کراو تەپیو بەسەر یەکدا، دەنگە ناسازەکەی کونەپەپو نەبێت سرتەی دیکەی لێ نەدەبیسترا، رەبایەیەکی سەربازی بەسەر گردەکەی ئەمبەریەوە چێ کرابوو، بۆراوە پێشمەرگە، لەناو چەمەکەدا بێدەنگ دانیشتین تا هەوا بەتەواوی جبەی ئاودامان رەشی پۆشی.

مەرە لاتێکی گەڕ لەرانەکەی عەنەب دابڕابوو، بە شاتە تووردرکەوە لەبێهێزییەوە گیری کردبوو، مەرەکە نەخۆش بوو دەڵەکی کردبوو، منیش




سەرم بڕی و دەستم دایە کەولی کەم، سکیم هەڵدڕی جگەرەکەیم دەرهێنا کاک غەفورو دوسێ پێشمەرگە بەکاڵی بێخوێ خواردیان، ئەمە سەیرانی شەوێکی تووشی زستانمان بوو سکمانێ پێکەرم کەینەوە، شەو خواربووینەوە تا گەشتینە ئاوایی خێڵی حەمە، ئازاد پەکی کەوت، لەماڵێک بەجێمان هێشت و وتمان بائەمشەو لاتان بێت و سبەینێ ڕەوانەی هەڵەبجەی کەنەوە، ئازاد ئەو شەوە دەستبەرداری خێرو بێری پێشمەرگایەتی بوو، بەڵام بۆ منی چەکمەشڕ خێرێکی گەورە بوو، چونکە پێ لاوەە شڕو ناقۆلاکەی خۆمم دایە و جووتێ پۆتینی چاکی لەپێدا بوو لێ سەند.

دیسان ملی ڕێگەمان گرت ئاوایی خێڵی حەمەمان خستە پشت سەرو تاوێرانە ماڵەکانی عامووره نەوستاین، لەوێ دەستەملانی حەوانەوە بووین، نەوشەوە کزە با گاڵەی پێکردین، تەنیا دڵسۆزی رەئیس بەخت یاری بوو، لەپەنایەکدا هێلانە قەڵێکی دۆزیبوویەوە و چوبووە ناوی، بەکوڵەباڵەکەی بەری دەرگای کولانەکەی گرتبوو، هەموومان بەخیلیمان پێ دەبرد، کوردایەتی رەئیس زادەی لەخەوی دیوەخانەوە هێنابوویە ناو کولانە قەل. ئێمە تا دنیا ڕووناک بوویەوە چۆقەی دانمان هات و تەنیا ئەوەی خۆش بوو دەمانزانی لەژوان نزیک بووینەتەوە.

کەوتینەڕێ لەمیری سوور سەرکەوتین و لەئەشکەووتی سوڵتان بەدیداری برادەران شادبوین، کاک بەکری حاجی سەفەر فەرماندەی هەرێمی سێ و کاکە حەمەی حاجی مەحمود و هێزێک لەوێ بوون، دوای بەخێر هاتن و هەندێ یەکتر ناسین دەقیقەیەک ماتەمینیمان گرت بۆگیانی کاک ئەحمەدی هەمیشە زیندوو، دوای ئەوەی سەرە خۆشی ئەو کۆستە گەورەیان لێکردین کاکە بەکر هەندێ قسەی بۆکردین و دڵی داینەوە.

دوای تەواو بوونی وتەکەی کاک بەکر نانی نیوەڕۆ خوراو لای ئێوارە بەرێکەوتین بەرەو سنوری شارباژێر. لەوێ جەولەیەکمان دەست پێکرد و

تانزیک ئاوایی دۆلپەمو رۆشتین، لەگەڕانەوەماندا کاک شەوکەت لەگەڵمان هات و بەیاوەری هێزەکە بەڕێگا وڕێگا هاتین تا گەشتینە هاوینە هەواری سەرکەن لەنزیک ئاوایی تاوێرە، پاش نیوەڕۆی ئەو رۆژە چووینە ناو ئاوایی عەبابەیلێ، ئەوە یەکەم جار بوو بەهێزێکی زۆرەوە بەڕۆژدا بچینە ناو ئەو ئاواییە.

عەبابەیلێ کەناوی دێرینی سازگارە[1] دێیکی زۆر کۆنە و هاووتای ئاوایی سازانە. دەکەوێتە دوو کیلۆمەتری رۆژهەڵاتی هەڵەبجەوە لەداوێنی چیا سەرکەشکەی شنرۆیدا ئارامی گرتووە، جوانترین ئاوایی ناوچەکەیە و بەردەمی پڕە لەباخی میوەی جۆراو جۆر، شنرۆیی شەنگ بەڕاسەریەوە شنەو سروەی خەڵات دەکا و ئەو هەوا سازگارە بەسەر کانی بەهارە و کانی مزگەوت دا دەکەوێتە پیاسەیەکی نەرم و پاشان دەچێت بۆ راموسانی زەلەکێ و قەتارە تووان، بۆ هێنانە لەنجەی گوڵ و گیا کەلە زەماوەندی بووکی سروشت دەچێت.

لەپەنجەرە و بەرهەیوانیماڵەکانیشەوە کاکەمەمی دەشتی شارەزوور جوان جوان دەبینی، کە گۆرانی کنالەیل بۆ خاتوو زینی دەریاچە شین پۆشەکە دەچرێ، ئەم سیحرە دڵبەرە وایکردووە کەلەدەورانی سوڵتان ئیسحاقی کاکەییدا بەشێک لەشێخانی بەرزنجە بێن و زیاتر ئاوەدانی بکەنەوە و لەوێوە بانگەوازی یاحەق هەڵدەدەن بەگوێی گەردووندا، جگە لەبەرەی شێخەکان خەڵکانی تری تێدایە کەبەزاراوەی کوردی بۆریان پێ دەگوترێ.

بەرەبابی شێخەکان لەکۆنەوە پیاوی بەرزی دینی، کۆمەڵایەتی و نیشتمان پەروەریان تێدا هەڵکەوتووە، ئەگەر لەم بارەوە بەزنجیرە ناویان

---

[1]- سازگار ناوە کوردییەکەیەتی، عەبابەیلێ لە اباعبیدەوە هاتووە، کە مەبەست لێی ئەبا عوبەیدەی ئەنسارییە، کە لەسەردەمی هاتنی ئیسلامدا بۆ کوردستان، ئەو یەکێک بووە لەسەرکردەکانی عەرەبەکان و لەوێدا کوژرا، ئیتر لەبەر پیرۆزی ئەم ناوە ناونراوە عەبابەیلێ. بەوەشدا دەردەکەوێت، کە ئەم گوندە بەر لەئیسلام ئاوەدان بووە، لەپاڵ ئەمەشدا ئەوەش جێگەی باسە کەبڵێین لەهەڵەبجەوە بەر لەگەشتن بە عەبابەیلێ گۆڕێکی تێدایە بەناوی گۆرە جوو. دیارە ئەمیش لەو جەنگەدا تیا چووە و چونکە دژی لەشکری ئیسلام جەنگاوە ئەو ناوەی بەسەردا براوە.

تۆمار بکەین ئەوە لەڕاستیدا خەرمان بەرەکەت، زۆرن و لە ئۆدەی ئەم کتێبەدا نییە یەک یەک بەسەریان بکەمەوە، ئەوە ئەرکێکی مێژووییە بەسەر نەوەکانیانەوە هیوادارم بەجێی بێنن، چونکە بۆ مێژووی سەروەری و کۆمەلایەتیمان پێویستە. بەتایبەتی لەڕووی شۆڕشگێڕیەوە ناوی شێخ ڕەشید لە شۆڕشی کورددا بەڕابەرایەتی شێخ مەحمود ئەدرەوشێتەوە و ناوی شێخ کەمالی[1] کوڕیشی لە شۆڕشی ئەیلول و نوێدا جێگەی خۆی هەیە.

دوای بەجێهێشتنی ئاوایی عەبابەیلێ بە بەرپرسێتی شەهید شەوکەتی حاجی مشیر هەرسێ کەرتەکەی هەورامان، بالامبۆ، شنروێ ڕۆیشتن بەرەو چنار و مۆردین، من و مەفرەزەیەکیش بەرەو هاوار و گریانە چووین هەندێ گولله ئاڕ بی جی و فیشەک هەبوون لەگەڵ خۆمان بیان بەین و بگەینەوە لایان، بردمانن وگەشتینە چنار و مۆردین. لەبەر نەبوونی خواردەمەنی و باری ئالۆزی ئێرانیش، هێزەکە لەئاوی سیروان پەڕیبوویەوە بۆ بەری ئێران، بۆ جەولە کردن لەئاواییەکانی سەر سنووردا، پەیامیان بۆمن بەجێ هێشتبوو بگەینە ئەوبەرەوە، بەلام لەڕاستیدا ئەگەرچی بگاری پەڕینەوەش هەبوو، ئێمە نەمانتوانی بپەڕینەوە بۆ ئەو بەر، بۆیە لەئاوایی دەگاگا کە لەسەر ڕۆخی ئاوەکەیە کوڕانی حەمەی وەسمان بەگی ئیمامی ماینیان هێناو ئێمەیان کردە ئەو بەرەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پێیان ووتین ئەم شەو لای ئێمە میوان بن و سبەینێ دەگەنەوە بەهێزەکەی خۆتان.

زێی سیروان ئەسپەشێ ئاسا چەپۆکانی دەکرد، وەکوو دەروێشکی حال لێهاتوو سەری دەدا بە کەنارەکانی ئەم بەرو ئەوبەردا، بە چەشنێ

---

[1]- شێخ کەمالی شێخ ڕەشید پیاوێکی دیوەخانداری نان بدەو کەسایەتییەکی سەنگین و بەویقاربوو، بەلام بە داخەوە خزمەکانی خۆی کەسەر بەکۆمەڵەی ناو یەکێتی بوون نژایەتییان دەکرد، تەنانەت جارێکیش گرتیان و بردیانە گوندی بەشارەت، شێخ کەزانیبووی دەیبەن و توانای ڕێگرتنی نیە، داوای ماینەکەی کردبوو، بەلام ڕێگەیان پێ نەدابوو، وتبوویان دەبێ هەر بەپێ بێی لەگەڵمان و هەندێ قسەی ناشرینیان لەڕوو کردبوو، تەنانەت ڕێزی ئەوەشی لێنەگیرا، کە جەنابی مام جەلال نامەیەکی جوانی بە کاکە حەمەی حاجی مەحموددا ناردبوو بۆ ئەو شێخە کورد پەروەرە، لەدوای کارەساتی هەکاری.

هاواری دەکرد و لفەی لێ هەڵدەسا و دەینالاَن، وەک ئەوەی بەئێمە بڵێ: ڕۆڵەکانم ئێوەیش ڕێگای دژوارتان لەبەرە، گوورِ بدەنە خۆتان وبەهەڵمەت بن تالە تەنگەلاَن دەرچن و بەگورجی بگەن بە ئامێزی دەریاچەی ئاوات. وەک چۆن من بەخێرایی دەڕۆم تا بگەمە باوەشی پرسۆزی دەریاچەی دەربەندیخان.

حەمەی وەسمان بەگ سێ کوڕی هەبوو بەناوەکانی حامد، فەیرۆز، جەمشێر ئەمانە دۆستی ئێمە بوون و هاوڕێی شەهید مەحمودی حاجی فەرەج بوون، شەو لەهۆدەیەکی پاک و خاوێندا سۆپای دار تابەیانی دەسووتا دانیشتبوین، خالۆ محەمەد زۆر باس و خواسی کۆن و دەورانی عەشایەری بۆ کردین، قسەی لەسەر ئیمامی و ئێناخی و نزیکایەتیان لەگەڵ هەورامیاندا بۆ کردین، حامدی کوڕی ماڵی لەئاوایی دڕۆڵە بوو کەدەکەوتە بەرامبەر چیای بالاَمبۆ، دڕۆڵە لەو شوێنەدا بوو کەئاوی لێڵە و زمکان دەگەشتن بەرووباری سیروان، لەوێ باسگایەکی لێ بوو فەرماندەکەی ناوی ئاوەیسی بوو، خالۆ حەمە بە حامدی کوڕیدا ئاگاداری کردبوو پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانین و لێیان قەوماوە و هاتوونەتە ئەم بەر تاماوەیەک بۆ نانخواردن لەم ئاواییەدا دەبن و کاریان بەسەر کاری کەسەوە نییە، لەبەر ئەوە لەشوێنی خۆی دەرنەچێت و چاودێرییان نەکات، ئەمە لەمانگی ١٢/١٩٧٩دا بوو.

بۆ ڕۆژی دواتر ئاوایی دەگاگا و سیمان مان بەجێ هێشت، لەئاوایی بەوڕۆڵ گەشتینەوە بەهێزەکەی خۆمان، بۆڕۆژی دواتر چووینە ئاوایی هەنجیرکی زەردۆییان، پاشان رووومان لەیەکەمین ئاوایی ئێناخی نشین کرد بەناوی وارامچە ژنانی ئەم ئاواییە دەچوون بۆگوێ ئاوی سیروان و بە کونە ئاویان دەهێنا، ئەمەش لەبەرئەوەی ئاواییەکەیان بێ ئاو بوو، ئەم شەو لەوارامچە میوانی ماڵی کاکە عەبدوللا ئێناخی بووم، کە خۆی چریک بوو لەپاسگای ئاوایی دزاوەر بەلاَم بە مۆڵەت هاتبووەوە، پیاوێکی بەڕێز لەوکاتەوە تا ئێستا پەیوەندی و دۆستایەتیمان نەپچڕاندوە. ئیتر لەوێوە دێ بە دێ بەسەرسنووردا ئاواییەکانی لانەوان، ژاڵە، ژاڵەی ڕەحمان بەگ، ماسان، هێرتا و زی ئێناخی نشینمان خستە پشت سەرو گەیشتینە ئاوایی بەلەبزان، لەئاوایی ژاڵەدا سێ چریکی ئێران هاتنەلامان، یەکێکیان عەلی ئێناخی بوو تفەنگی ژ-٣ پێبوو ئەوەیەکەم جار بوو ئەو جۆرە چەکە ببینین، لەهێرتاش

کاتێک بەپێچەکانی جادەکەدا چووین خوارەوە، ئەمنیەو چریکەکان لەناو مەخفەرەکەدا مانەوەو دەرگاکەیان لەسەر خۆیان داخست.

لێرە لەبەلەبزان شەو و ڕۆژێک ماینەوە، لە شارەکانی پاوە نەوسوود و نۆدشەوە خەڵک هاتن بۆ لامان، لەوانە حەمەی ئەلەماجە و چەند کەسێکی تر. سەبارەت بە خۆپیشاندانەکانی ئێران و هاوکاری ئێمە بۆ ئەوان قسە و باس کرا. لە گەڕانەوەیاندا لە ڕێگا لای دووئاو حەمە و هاوڕێیێکی گیران لەلایەن ساواکەوە چونکە فیشەک و نارنجۆکیان پێبوو ئێمە پێمان دابوون بیبەن بۆ پاوە بۆ ئینقلابیبەکان. لێرە ماڵی داود بەگم ناسی، بەیانی ڕۆژی دواتر بەلەبزانمان جێهێشت و داگەڕاین بۆ سەر ئاوی سیروان، بەلەبزانییەکان شەوەکەی هاتبوون و لە جێگەیەک بە ناوی چێوان کە تەنگەیەکی زۆر تەسکە لە سەر ئاوەکە پردیان بۆ چاک کردبووین.

هاتینەوە ئەمبەر بۆ ناو خاکی کوردستانی باشوور، قەتارەی پێشمەرگە کۆتایی هات و لەو بەرەوە چریک دەستڕێژی گوللەیان بەسەردا کردین، چەند پێشمەرگەیەک میلیان ڕاکێشا تەقەیان لێبکەنەوە بەڵام شەوکەتی حاجی مشیر نەیهێشت، ئەمە دواتر کاک شەوکەت بۆ منی باسکرد بۆیە تەقەی هەواییان کردووە بەسەرماندا مەسئولییەتیان لەسەر خۆیان لابردووە، واتە پێشتر کەسێکیان ناردووە بۆ لامان ووتوویانە کاتێک چوونە ئەوبەرەوە چەند دەستڕێژێکی هەوایی دەکەین. کاتێک هاتینە ئەمبەرەوە ئەو نیوەڕۆیەو شەوەکەشی چووینەوە بۆ ئاوایی شێخان و ماینەوە، ئێرەش ئاوایی کوردستانی ڕۆژهەڵات و سەر سنوورە، دوای ئەم سەفەرو گەشتە ئێمە هاتینەوە بۆ ئەشکەوتەکانی کۆنەهەواران لەدەوروبەری ئاوایی گرییانەو کاک شەوکەت و هەڤاڵانی تریش هەرکەس و بۆ سنووری خۆی ب لاوەیان کرد، کەرتەکەی شەهید گرییانەیی و کاک غەفور لێک دران و کاک غەفور بوو فەرماندەی هەردوو کەرتەکە لەچوارچێوەی یەک کەرتدا.

# پارە وەرگرتن
# لەگوند نشینانی ڕاگوێزراو ١٩٧٩

دوای ڕاگواستنی ئاواییەکانی سنوری چالاکیمان و کۆکردنەوەیان لەکۆمەڵگا زۆرە ملێکانی خورماڵ، سیروان، زەمەقی و عەنەبدا لیژنەی ناوچەی ئێمە بڕیاریدا هەر خێزانێک کەپارەی قەرەبوو وەردەگرێت بڕێک پارەی لێ وەربگیرێت بۆ شۆڕش. کەس نەیدەوێرا پارە بدات، یاخۆی بینێرێتە دەرەوە، بۆیە دەست کرا بە مەفرەزە ناردن بۆ ناو کۆمەڵگاکان و ئەوەی بەر دەست کەوتایە پارەیان لێوەر دەگیرا. ئێمە حەقمان بوو ئەو بڕەپارەیە بەدەست بهێنین، چونکە بارمان کەوتبووە لێژی و لەڕووی مادییەوە حاڵمان تەواو شڕ بوو، ئەوانیش حەقیان بوو دەست پێوەبگرن و پارە نەدەن، چونکە دوژمن هێندە سەرسەخت بوو خراپتری بەسەر دەهێنان. بڕیارەکە لەلایەن م. سەرکەوت بەرپرسی ناوچەو م پشکۆ بەرپرسی ڕێکخستنی پێشمەرگەوە دەرچوو. برادەرانی هەرێمیش لەوبەرەوە هەمان کاریان ئەکرد، کەچی ئەمە بۆ حەمەی حاجی مەحمود کرابوو بەرەخنەو عەیبە.

ئێمە نەماندەتوانی بچینە نێو کۆمەڵگای خورماڵەوە، بەڵکو زیاتر ڕوومان لە سیروان و زەمەقی و عەنەب دەکرد، دواتریش پێشمەرگەکانی سەر بەناوچە خۆیان دەچوون بۆ وەرگرتنی پارە، بەداخەوە بەرنامەیەکی چاک و ڕێک و پێک بۆ ئەم مەسەلەیە دانەڕێژرا بوو، یەکەم: دیاری نەکرابوو هەر سەرۆک خێزانێک چەند پارە بدات دووەم: هەبوو زیادی لێ دەسەنرا و هەبوو کەمتر، ئەمەش بەئارەزوی بەرپرسی مەفرەزەکە بوو، جار جاریش بەنووسراو ئاگاداری لیستێک ناو دەکرا کەدەبێ پشکی شۆڕش بدەن، ئەگینا دواتر بەرپرسیار دەبن و سزا دەدرێن کەپارەکەش کۆ دەکرایەوە، چەند بوو؟ چی لێدەکرا؟ چۆن سەرف دەکرا؟ ئەوە ئێمە نەماندەزانی.

من بۆخۆم تاقە جارێک چووم بۆ کۆمەڵگای عەنەب بۆئەو ئەرکە یان ئەو چالاکیە بێ بەرنامەیە، بەڵام کەوتمە ناو تەنورەوە بە موعجیزە رزگار بووم، واتە زۆری نەمابوو لەرێی ئەو کارە بێ بنەمایەدا شەهید ببم. ئێوارەیەکی پایزی ١٩٧٩ مەفرەزەیەکی هەشت کەسی لەلایەن ناوچەو رێخستنەوە نێردراین، کەوتینەرێ بەناو ئاواییە وێرانکراوەکاندا گەشتینە کانی حەمە و غان نزیک لەشاری هەڵەبجە شەهید حەمەی حاجی تۆفیق، مەلا یاسین، پشتیوان، ئەفراسیاو هاواری، شەهید حەیدەر عەنەبی، حەمە سەلیم فەتحوڵلا، نەجمەدین عەزیز تەوێڵەیی و بەندە بەناو گوڵە تووتنەکانی بەردەم کۆمەڵگای زۆرەملەی عەنەبدا لەپەنا نەخۆشخانەی هەڵەبجەوە لەشەوێکی ئەنگوستە چاودا گەیشتینە نزیک ریزی یەکەمی خانووە تەواو یان نیوە تەواو کراوەکان، لەوێ دوو پێشمەرگە حەمە سەلیم و نەجمەدین دانران بەکەمین، ئەوانیتر بووینە دوو دەستەی سێ کەسی، مەلایاسین و حەیدەر و ئەفراسیاو بەکۆلانێکدا، من و حەمەی حاجی تۆفیق و پشتیوان عومەر مەجید کە دوو پێشمەرگەی بەدەست و برد بوون بەکۆلانێکی تردا.

گروپی ئێمە بەناو کۆلانێکدا بەرەو ژوور بووینەوە، لەچەندلاوە جۆگای قووڵ بۆ ئاوەرۆ هەڵکەنرابوون و کۆمەڵە بەرد و بلۆک و تەپۆلکەی خۆڵ یا لم و چیمەنتۆ رێی لێ تێک دەداین، تاناوەراستی کۆلانەکە کەسمان بەردەست نەکەوت، لەتاقمێک خانووی تەواو کراو نزیک بووینەوە، چرایەکی نەوتی کزکراو شۆڵەکەی کەووتبووە سەر چەند جووت پێ لاوە، کەلەماڵی تازیە دار دەچوو، چوومە نزیک شۆڵەکە و نزیک بوومەوە لەهەیوان و ژوورەکە دیتم ژمارەیەک کەس بەتەنیشت یەکەوە خەوتوون، گەرامە دواوە و ووتم ئەمە کۆمەڵێک پیاو لەم ماڵەدان دەیان بەینە دەرەوە بۆلای دوو قەرەوڵەکە، لەوێ حیسابیان لەگەڵ دەکەین ئیتر پێویست ناکات ماڵەو ماڵ بگەرێین.

پشتیوان لەسەر کۆلانەکە بوو کەلێوەی سەرکەوتبووین، ئەم ماڵەش لەسەر سیلەی کۆلانەکە بوو کەدەرۆشتەوە سەر کۆلانی هاوشانی، حەمەی حاجی تۆفیق لەبەردەم هەیوانەکەدا وەستاو منیش چوومە ناو خەوتووەکان،

بەتانیم لادا لەسەر یەکێکیان ووتی:ها، ووتم: هەستە ووتی: باشە، کەچاوی کردەوە چەکم بەدەستەوەیە و ریشم درێژە بەهەردوو دەست توند بەتانییەکەی دا بەهەردوو چاویدا و گرتی، منیش هەر بەدەنگێکی هێواش پێی دەڵێم هەستە ئیشم پێتە، نووستوەکانی تەنیشتی دیارە هەندێکیان بەخەبەر هاتوون، بەڵام راست نابنەوە لەپڕ حەمەی حاجی تۆفیق لولەی کلاشینکۆفەکەی ئاراستەی سەربانی ماڵەکە کردو ووتی: کێی زەلام؟ لەگەڵ دەنگدانیدا دەستڕێژێکی لێکرا، ئەویش دەستڕێژی لێ کردەوە و دیتم بزیسکەی گوللەکانی کابرای سەر بان دەدات لەدیواری بەرامبەر هەیوانەکە کەمنی تێدا بووم.

ویستم دەرچمە دەرەوە بۆلای حەمە، دووژن لەهۆدەیەکی تەنیشتەوە دەرپەڕین و ویستیان باوەش بەلاقی مندا بکەن، بەڵام بەقۆناخە کلاشینکۆف لەخۆمم دوورخستنەوە، یەکەم جار بوو ژنانی وا شێتۆکەو شڵەژاو ببینم، پیاوەکان هەر نەحوولانەوە، ڕام کردە دەرەوە بەدوای حەمە و پشتیواندا بەکۆڵانەکەدا سەرەو خوار بووینەوە، بەڵام وەک تەرزە لەهەموو لایەکەوە ،کوێرانە گوللە دەباری، بەحاڵێکی خراپەوە گەشتینە لای دوو پێشمەرگەی کەمینەکە، لەکۆڵانەکەی ئەولاشەوە گروپەکەی مەلایاسین بەڕاکردن گەشتنەوە لامان بەرەو ئاوایی عەنەب بۆی کشاین، دیتمان ئۆتۆمبێلی جاش بەجادەدا بەرە و عەنەب و بیاوێلە دەڕۆشتن، ئێمەش لەنێوان کۆمەڵگای عەنەب و گوندی عەنەبەوە بەرەو گوندی جەلیلە ڕۆشتین وبەدەستی خاڵی گەڕاینەوە.

دواتر وجارێکیتر بە هەمان شێوەی ئەم تێکەوتنە ڕوبەڕو بومەوە، بەڵام ئەم سەفەرە بۆ پارە سەندن نییە، شەوێک لە گوندی بەشارەتی خواروەوە بۆ لێدانی ماڵەجاشەکانی ناو شارۆچکەی سیروان کەتینە رێ، دەستەیەک پێشمەرگە لەوانە حەیدەر عەنەبی، فەیسەڵ کاکە وەهاب، ڕزگارمەحیەدین، سەباح حەمەسادق،....تاد شارەزاو پێشڕەومان شەهید تاهیرە بچکۆلی نەمر بوو، کەگەشتینە ناو شارۆچکەکە بەوریای و پسکە پسک بە پەناو پەسویدا خۆمان گەیاندە جێگەیەک بەحیساب نزیکە لەماڵە جاشەکان، چووینە بەردمم

ماڵێک تا لێیان بپرسین ماڵە جاشەکان کامەن سوک لە دەرگاماندا، مەگیر هەڵەمان کردووە ئەمە ماڵە جاشە، ژنێک هاتەدەرەوە من دوای چاکوچۆنی ووتم پورێ ماڵە جاشەکان کامەن لەباتی وەڵام ساتێک راماو یەکسە پەلاماری چەکەکەی دەستی منیدا، نارنجۆک هاوێژ بوو لولەکەی گرتبو ژنێکی پۆشین بەسەری زەلامی رەشتاڵە بوو، زۆری ئەکرد لەدەستمی دەرکا منیش دەستم راتەکاندو بە لولەی نارنجۆک هاوێژەکە پاڵێکم پێوەنا ئەو بەپشتا کەوتو دەنگە دەنگ دروست بوو بەپێشمەرگەکانم ووت ب لاوەەی لێکەن و وریابن، لە ماڵەکانی ئەودەورو بەرەوە درابنە بەردەستڕێژ. هەر چۆن بوو بەدەم تەقەکردنەوە خۆمان دەرباز کرد، بەلام کۆڵمان نەدا هەڵگەڕاینەوەو لەجێگەیەکی ترەوە خۆمان گەیاندە نزیک مەعمەلی پەتاتەکەو چەند گولە نارنجۆکمان بۆ هاویشت و بۆی دەرچوون دوبارە لەهەموو لایەکەوە تەقەی کوێرانەو هەوایی دەستی پێکردەوە ئێمەش بە سەلامەت روناکی و شەوق و چراخانی شارمان خستە پشت سەر، خۆمان گەیاندە وەردەکان و بە بە ناووتاریکیدا خۆمان لەچاو دوژمن وون کرد.

من لەوێدا واتە لەماڵەکە و لەناوخەڵکەکەدا لەئوردوگای عەنەبدا دواجار زانیم ئەوانە چەکدارن و نارنجۆکیش بەقەدمەوە بوو، بەلام لەبەر شڵەژان و پەلاماردانم لەلایەن ژنەکانەوە نارنجۆکەکەم بیر چوو بوو، دواتر داخم ئەوە بوو کەئەو نارنجۆکەم بۆ پیا نەتەقاندن کەبەئاسانیش ئەمتوانی ئەم کارە بکەم، بەوەش دەبووە چالاکیەکی کەم وێنە و هەم نەیاندەتوانی بێنە دەست و تەقەمان بەدوادا بکەن.

دواتر بۆمان دەرکەوت مەفرەزەی جاشەکانی رەشەی ساڵحە بوون، هەر خۆیان لەو گەڕەکەو لەوشوێنەدا خانوەکانیان دروست کردووە و شەوانە لەوێدا کۆبوونەتەوەو بێخەم پاسەوانیان داناوە، ئەوشەوەش ئێمە چووینەتە ئەوێ پاسەوانی سەربان خەوبردوێتیەوە کاتێک من لەژوورەوە بانگی کابرام کردووە هەستێت، لەدەرەوە حەمە بە پشتیوانی ووتوە وریابە،

بەو دەنگە پاسەوانەکە خەبەری بۆتەوە و هاتوەتە ڕاسەری حەمەی حاجی تۆفیق، کەووتنە تەقە لەیەکتر، بەوشێوەی کەباسمان کرد.

پشتیوان ئەو شەوە کاتژمێرە دەستیەکەی لێکەوت و جێما، پاشماوەیەک کەنازانم کێبووە زانیویەتی کاتژمێری پێشمەرگە بووە ناردویەتیەوە بۆ پشتیوان، ئەوکەسەش کەمن چووبوومە سەری خەڵکی خەرپانی بووبوو بەناوی قووتبەدین و چەکداری مەفرەزەی تایبەت بوو لای مەفرەزەکەی ڕەشەی ساڵحە.

# ململانێ یان گوڵە یان دڕک

## ١٩٧٧-١٩٧٨

پێش برکێی کادیران چ سیاسی چ سەربازی کارێکی بەجێ و شایستەیە، بەڵام بە مەرجی ئەوەی هەوڵدان بۆ خزمەتی زیاتر و گەشەپێدانی ڕەوتی شۆڕشگێڕی و تێکۆشان بێت، بۆ بەرەو پێشەوە چوونی شۆڕش و گەشتن بە ئاقاری سەرکەوتن. خۆ ئەگەر بەم شێوە نەبوو ئەوا بمانەوێ و نەمانەوێ زیانی گەورە بەپەیکەری شۆڕش دەگەیەنێت.

بە داخەوە لە سنوری ئێمەدا گەزی ململانێکان کورتی دەهێنا، چونکە بە دژایەتی کردنی یەکتر و شکاندن و بوختان و درۆ پێوانە دەکرا. وەک شکڵێکی هەرەمی لە سەرەوە بۆ خوارەوە ئەم کارە دزێوە ڕەنگی دابوویەوە. کێشە و ململانێی نێوان کۆمەڵە، بزووتنەوەی سۆشیالیست، خەتی گشتی لە لایەن هەندێ بەرپرسەوە خراپ دەشکایەوە لەسەر شۆڕشەکەمان. تەنانەت لە ناو بازنەی کۆمەڵەدا کە بڕبڕەی پشتی (ی. ن. ک) بوو کرداری چەوتی لێکەوتەوە و زۆر جار دەبووە مایەی لێک ترازان و دڵساردبوونەوە و لەیەکتر خوێندن و هەندێ جاریش دەبوو بە هۆی داڕمانی وورەی خەڵکی خۆنەگرو تەسلیم دەبوونەوە بە دوژمن

ئاکارو ئایدیای هەندێ لە کادیرانی کۆمەڵە و دەربڕینی هەندێ قسەی نا مەوزوعی لە ناو پێشمەرگە و گوندنشینەکاندا لەقکردنی بڕوای خەڵک بە شۆڕشەکەیان نەبێت هیچی تری لێ نەدەکەوتەوە، ئەوانەش وەکو ناو ناتۆرە خستنە شوێن کەسانی دەوڵەمەند[1]، دەرەبەگ، شێخ ومەلاو لایەنگرانی دین،

---

- لە شارەزوور حاجی مەحمودی هارونی لە گوندی گوڵەخانە ناودارو خاوەن مالات و دەوڵەمەند بوە، کاکە حەمەی کوڕی لایەنگرو دۆستی کۆمەڵە بوو، حاجی خالید لە گوندی بەشارەت خاوەن زەوی وزار بوو، کاک حامدی کوڕی کۆمەڵە بوو. ئاغای دیارو بەرچاو لەناوچەکەدا مارف ئاغای حسێن ئاغای گلالی بوو، خۆی وبراکانی کۆمەڵە بوون، بەگزادە و سانەکانی هەورامان کورەکانیان کۆمەڵە بوون لەوانە شەهیدی سەرکردە ئازاد هەورامی. شێخەکانی نەقشبەندیش کوڕەزاکانی شێخ محەمەدی شێخ حسامەدین،

هەتا ئەوڕادەی کەنابێت ئەو پێشمەرگانەی کۆمەڵەن لەئاواییەکاندا بۆ نانخواردنیش بچنە ئەو ماڵانەی کەدەوڵەمەندن یان ئاغاو دەرەبەگن، لەکاتێکدا زۆر لەبەرپرسەکانی کۆمەڵەو پێشمەرگەکان کوڕە ئاغاو کوڕە دەوڵەمەندو کوڕە شێخ بوون.

لەو لاشەوە سووکایەتی کردن بەهەرشتێک کە لەگەڵ تەرزی بیرکردنەوەیاندا نەبوایە و خۆبەزل زانین و کەشخەکردن بەپلە و پایەوە لە خێرایی شەمەندەفەرەکەی شۆڕشیان کەم دەکردەوە.

ئەو دەمە کۆمەڵگای کورد بڕێک لەژێر چەتری دین و پاشماوەی دەرەبەگایەتی و کوێخا و رەعیەتدا قەراری گرتبوو، بۆیە نەدەکرا بەو سەبرو دوو فووەی هەندێ لە کادیرەکانی کۆمەڵە جێگا بە ودیاردانە لێژبکرێت. بێجێ

---

عەبدولڕەحمان و شازاد کۆمەڵە بوون، مەلاو زانایانی ئاینی ناودارو دیاری هەڵەبجە کوڕەکانیان کۆمەڵە بوون، حەکیم کوڕی مامۆستا مەلاساڵحی گەورە کۆمەڵەو بەرپرسی ڕێکخستنی شار بوو. شەهید مەلاعەبدلقادر کوری مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز پێشمەرگەی کۆمەڵە بوو لەمەفرەزەکانی سەرەتادا.

[1]- هاوینی ساڵی ١٩٨٢ ئێوارەیەک لە ئاوایی حاسڵ بووین، بەر لە دابەشبوونی پێشمەرگە شەهید شەوکەتی حاجی موشیر وتی: من ئەچمە ماڵی مارف ئاغا بۆ نان خواردن تۆو نیازیش وەرن، دوای دابەشکردنی پێشمەرگە کاتێک چووین بەرەو ماڵی کاک مارف ئەترساین لەوەی پێشمەرگە پێمان بزانن، چونکە دواتر لەکۆبوونەوەدا رەخنەیان لێئەگرتین. کاتێکمان زانی پێشمەرگەیەک بەناوی رزگاری عەزەقوڵ کەوتۆتە دوامان، بۆ کوێ ئەچن؟ برۆ ئیشمان هەیە، نا بەخوا ئەزانم، چی ئەزانی؟ هەر چۆن بوو ڕازیمان کرد رۆشتەوە بۆ ئەوماڵەی کەلێی بوو.

کاتێک گەشتینە حەوشەی ماڵی ناوبراو پیاوێکی باڵا مامناوەندی لەش و لار باریکی ئێسک سوکی خوێن گەرم هاتە پێشوازیمان، ڕۆیشتینە ناو دیواخان کاک شەوکەت سەرگەرمی جفرە حەل کردن بوو، پیاوەکە گەڕاوە نەهاتە ژوورەوە، سفرەیەک ڕاخراوە بڕێک خواردن و خواردنەوەی لەسەرە، پیاوەکە هاتەوە دوو قاپ زەیتونی داناو دووبارە بەخێر بێن، دووبارە دیار نەما، نیازی پرسی لە کاک شەوکەت ئەی مارف ئاغا لە کوێیە؟ کاک شەوکەت ئەڵی ئەی ئەوە مارف ئاغا نییە؟ نیازی نا ئەوە خزمەتکاریانە، بڕوا ناکات لەم قسەوباسەدا کاک مارف هاتەوە، کاک شەوکەت ئەپرسێ ئەم هەورامیانە ئەناسی کاک مارف؟ مارف ئاغا، هەر بەناو، بە ئاماژە ئەمە حەمەیەو ئەویش کاک نیازی. دوای نان خواردن هاتینەوە بۆ مزگەوت، نیازی ئەڵی ئیتر لەڕەخنەگرتن ناترسم ئەگەر ئاغاو دەرەبەگ وەک مارف ئاغابن، منی کۆمەڵە خزمەتکاریانم.

بوو بە هەڵویستی چەپکەرایی و دروشمی مارکسی-لینینیانە لە قۆناخێکی ناسکدا کۆمەڵگا بگۆڕدرێ، چونکە لە سەرووی هەموو ئەمانەوە دوژمنی سەرەکی بە هێزێکی ئیجگار زەبەلاحەوە لە دارشتنی پلانی سەرکوت کردنی گەلەکەماندابوو بە هەموو چین و توێژ و ئایدیا جیاوازەکانەوە، لەگەڵ ئەو هەموو کەموو کورتیانەشدا، گیانفیدای، لەخۆبردوی، قارەمانییەتی، ڕێکوپێکی، کوێرایەڵی، دەستپاکی و خوو ڕەوشتی بەرزی بەرپرس و کادر و پێشمەرگەکانی کۆمەڵە لە دەرەوە لەناو جەماوەرو گوندنشینەکاندا ناوبانگی پێشمەرگەو شۆڕشی نوێی کردە دیاردەیەکی نوێ وجێگەی سەرسوڕمان، هەرواش لەناو گرتووخانەکانی ڕژێمی بەعسدا خۆڕاگری و لەخۆبردویی کۆمەڵەکان ڕەنگدانەوەی لێکەوتەوە، ئەویش ترس و بێ هیوایی لە دڵی دوژمناندا، ترس لەبەرامبەر خۆڕاگری وقایمی وبێباکی و ورە بەرزیدا، بێهیوایی لەبێ ئەنجامی ئەو ئازارو ئەشکەنجە دڕندانەیان، بەجۆرێک ئەو شەهیدانە تاگیان لەجەستەو سەدا ئەهاتە سەر زمانیان وەلامیان کەم بژی وکەڵ بژی بوو.

لەساڵی ١٩٧٧ شەهید ئازاد هەورامی عادل کەرکوکی سەفەرێکی سنوری هەڵەبجە - هەورامانی کردبوو لەو سەفەرەیدا گەلێ قسەی شیاوی ئەو ڕۆژگارەی چرپاند بوو بەگوێی کادیرو پێشمەرگەکاندا کە ئەبێت وەک یەکێتیی کار بکەن. ئازاد هەورامی هاتبوو خولی هۆشیار کردنەوەی پێشمەرگەی لە بۆین و کانی کوێخا عەلی کردبوویەوە، قسەی زیاتر لە سەر ئەوە کرابوو، کە کادیر و پێشمەرگە لە هەوڵی ئەوەدابن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکانی کۆمەڵگاکەیاندا بە شێوەی تەندروست بکەن، چونکە هەڤاڵ مام جەلال وای ناردبوو، کە کێشەی کادیرەکان چارەسەر بکات و وەک یەکێتیی ڕەفتار و هەڵس و کەوت بکەن نەک تەنیا وەک کۆمەڵەو بەسووک سەیرکردنی دوو هێڵەکەی تری ناو یەکیەتی. بەلام لەباتی ئەوەی پەیڕەوی لە بۆچوونەکانی بکرێت هەندێک کادیر لە قسەکانی دڵگران بووبوون، بۆیە کاک ئازادیش بە دڵگرانی گەڕابوویەوە.

لەو لاشەوە گەڕانەوەو ناردنەوەی هەندێ کەس لە لایەن قیادە موەقەتەوە بۆ ناو مەفرەزە سەرەتاییەکان کەساواک دەستی تێدا هەبوو، کێشەو گرفتێکی تر بوو، کە ئەمەیان زیاتر ڕووبەڕووی شێخ عەلی دەبویەوە

لەسنووری هەوراماں، چونکە ماوەی پێدان و نەیزانی چەکێشەیەکی بەدوادا دێت. دەست لە ناو دەست ئەمانە هەموو کۆسپ و تەگەرەبوون بەزیانی شۆڕشەکەمان تەواو بوون، تەنیا و تەنیا گیان بەوە بوو خەڵکانی دڵسۆز و لێزان و کارامە هەبوون، ئەگینا هەر ئەو دەمە شۆڕش دەبوویە کای بەربا، ئەمانە و کێشەی نێوان خەتی شەهید ئارام و کاک نەوشیروان، بە دوایدا کێشەی نێوان گروپی زیندان و کۆمیتەی چیاو پاشان زەق بوونەوەی کێشەی کۆمەڵەو بزووتنەوەی سۆشیالیست، ئەمانە بەردەوام بوون، تاجەنابی مام جەلال بە سنگە فراوانەکەیەوە دەستەڵاتی شکایەوە بە سەرکەش و هەواکەدا.

گرێ کوێرەی ئەم گرفتانە هێدی هێدی بە حیکمەتی مام جەلال دەکرانەوە، تەنانەت کێشەی کوردستانیی عێراقچی، داش عێراقی بوونی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانیش لە سەرەتای هەشتاکاندا ڕووی لە نشێو کرد. مەبەستم ئەوەیە بڵێم ئەگەر جەنابی مام جەلال کۆنترۆڵەکەی نەگرتایەتە دەست ئەوا یەکێتیی نیشتمانی حاڵی لە حاڵی چریک فیدایی ئێران باشتر نەدەبوو، هەر ئەو بوو توانی ئەو جەمسەرە دژانە ڕێک بخاتەوە و برینە زۆرەکانی جەستەی شۆڕش سارێژ بکات، تاڕادەیەکی باشیش کاریگەریەکانی شەق بوونەکانی بزووتنەوەو لەم دوایەشدا ئاڵای شۆڕش لەسەر یەکێتی کەم بکاتەوە.

## ئێران و بانگی ئازادی ۱۹۷۹

ڕاگواستنی گوندەکان بۆ ئێمە کوستێکی گەورە بوو، هێندەی نەبرد لەوماتەمینەدا جار جار ئاوازێک دەیدا لەپەردەی گوێمان و مزگێنی پێ دەداین، کەشەبەقێک بەرێوەیە ڕووناکی بەدوادا دێت، ئەویش نرکەو زایەڵەی گەلانی ئێران بوو دژی دیکتاتۆریەتی شاهەنشاهی پەهلەوی. ئەمە بۆ ئێمە موژدەیەکی دڵگیر بوو، چونکە ئەوێ ڕۆژێ لەپاڵ جەنگماندا دژی ڕژێمی عێراق، دژی ڕژێمی ئێرانیش هەڵوێستمان هەبوو، ئەوەش بوو بووە مایەی ئەوەی ئەو دەوڵەتەش دژایەتیمان بکات، وەهابوو ئەگەر لەسەر سنوورەکان مەفرەزە یان پێشمەرگەیەکیان بکەوتایەتە بەردەست ساواک یان خود چریک و سوپا و ژاندارم، ئیتر تۆماری مەرگی بەخەتی سوور پڕ دەکرایەوە و ماڵئاوایی لەژیان دەکرد، نمونەی ئەوەش پێشمەرگەیەکمان خەڵکی سلێمانیی بەناوی عومەر عەبدوڵلا عوبەید ناسراو بە سیروان لەمەفرەزەی هەوراماندا بوو، لەساڵی ۱۹۷۷دا مەفرەزەکەیان لەچیای ئاوەزنێ لەسەر هانەشروان بووبوون لەسەر سنوور، ڕۆشتبووە بۆ هەوارەکانی قەڵاگای لای شێخان نان بهێنێت، ئەو شوێنە کوردستانی ڕۆژهەڵاتە. لەوێ دەیگرن و پاش ماوەیەک لە نەوسوودەوە بۆ تەوێڵە ڕادەستی عێراقی دەکەن و پەتی سێدارەکەی موسڵ گیانی لەگەردنەوە دەچنێ.

ئەو سەروەختەی کەڕژێمی ئێران گلۆڵەی کەوتە سەرەتای لێژی، ئێمە بەحوکمی ئەوەی لە سنوورەوە نزیک بووین ژمارەیەک خەڵکی تێکۆشەری ئەودیوی بستۆکە سنوورەکەمان دەناسی و دۆستایەتی و هاوکاریان دەکردین، ئەوکات ئەولایەنە سیاسیانە ڕێکخراو نەبوون. بەو دۆستایەتیەمان لە ئایدیاو تەرزی بیرکردنەوەی ئێمە تێگەشتبوون و مایەی ئیلهام بوو بۆیان، خەڵکیشیان تێدا هەڵکەوت لەریزی یەکێتیدا درێژەیان بەخەبات و تێکۆشان دا.

ئەم دۆستایەتی و تەباییەی نێوان ئێمە و ئەوان بۆ ئەوان دوو مەبەستی شۆڕشگێرانەی تێدابوو .

یەکەم: بیروباوەڕی سیاسی ئێمەیان لا پەسەند بوو، تا لایەکیتر.

دووەم: بۆئەوەی لە ئێمەوە کەڵک لەهونەری شەڕی پارتیزانی چریکی وەربگرن.

لەلایەکی تر لایەن هەبوون دەست لەناو دەستی ڕژێمی شاهەنشاهی ئێران دژی ئەو خەباتکارانە دەجووڵانەوە، پاشانیش کەڕژێمەکە گۆڕا بە جمهووری ئیسلامی ئێران یەکسەر بەرەو پیری چوون، هەرچی ڕژێمی تازە پێی خۆش بوایە بۆ دژایەتی کردنی ئێمەی ئەم دیو و ئەوانی ئەودیو جێبە جێیان دەکرد ئەو دۆستایەتی و هاوکاریەی نێوان ئێمە و برا تێکۆشەرەکانی ئەو دیومان وای کردبوو، ئێمە لەلای خەڵکی کوردستانی ئێران خۆشەویست و ئەوانیش پەراوێز کەوتبوون .

ئەو تێکۆشەرانەی ئەودیو دوای گەرم بوونی تەنوری خەبات و فراوان بوونی بازنەی تێکۆشان جارجارێ لەناو رۆژنامە و راگەیاندنەکانیاندا ئەدەبیاتی یەکێتیی نیشتمانییان وەردەگێرایە سەر زمانی فارسی و ب لاوەیان دەکردەوە.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم کەوانەیەک بکەمەوە بۆ دەربڕینی قسەیەک، کەلە ٢٢ی ڕێبەندانی ساڵی ١٣٥٧دا بەڕابەرایەتی ئیمام خومەینی خەڵکی ئێران ڕژێمی دووهەزار و پێنج سەد ساڵەی رووخاند و لەژێر دروشمی نەشەرقی. نەغەربی – جمهووری ئیسلامی ئازادییان بەدەست هێنا. بۆ ئێمە وەک پێشمەرگەکانی سنوورەکە دەرگایەکمان لەڕوو ئاوەلا کرا، کەڕۆژە تەنگەکانی گواستینەوە بۆ رۆژانێکی خۆش و لەبار. چونکە ئاهێکمان پێدا هاتەوەو بەکردەوە بووینە هاودەنگی برا کوردەکانمان.

هەروەها بۆیەکێتیی نیشتمانیش بوو بە دەروازەیەک کەلەوێوە پەیوەندیە دبلۆماسیەکانی لەگەڵ وڵاتانی دەرەوە ڕێکبخات، واتە گۆڕانی ڕژێمی پادشایەتی ئێران و هاتنە کایەی ڕژێمێکی دیکە بۆ ئێمەش دەسکەوتێکی گەورە بوو، لەولاشەوە بەڕێزان د. قاسملۆ، شێخ عیزەدینی حوسەینی، فوئادی مستەفا سوڵتانی لەگفتوگۆدا بوون لەگەڵ ڕژێمی تازەدا بۆ بەدەست هێنانی هەندێ ماف، بەڵام دروست بوونی جەنگی ئێران و عێراق

زۆر شتی کرد بەژێرەوە کەیەکێکیان ئەو داخوازیەی سەرانی کورد بوو لەمیوی ڕۆژهەلاتی کوردستان، بەهەرحاڵ باهەواری قسەمان نەگوازینەوە بۆ شەڕی ئێران و عێراق چونکە ئەوە بابەتێکی ترە.

ئەو ڕۆژانەی لەوقوڵەی ئێمەوە سنوری نێوان ئێران و عێراق ناوێکی نەماو بەمەیلی خۆمان بازمان دەدا بەسەریدا، بۆمن شارۆچکەی نەوسوود و گوندەکانی شۆشمێی سەرو و شۆشمێی خواروو، شێخان و هەوارەکان نامۆ نەبوون، چونکە خزمایەتی و ناسراوی کۆنمان لەگەڵیان هەبوو، هاتوو چۆی مالی ئێمەیان کردبوو، کەچووینە ناویان بۆمن تام و چێژی زیاتری هەبوو. ئەوکاتەش کەئەوان چ هاوکاریەکیان لەئێمە بویستایە نەک دەستمان نەدەنا بەڕوویانەوە، بەڵکو بە سنگێکی فراوانەوە بۆمان جێبەجێ دەکردن، یەکێک لەهاوکاریەکان کەئەوان زۆر خوازیاری بوون پەیداکردنی چەک بوو، ئێمە بۆخۆمان نەمان بوو، بەلام ڕێگەمان بۆ خۆش دەکردن کەبەپارە بیکڕن، ئەکرەمی رەسولی – ئەبوبەکری بەهاری – محەمەدی ئەلە ماچە لەو کەسە دیارانە بوون کە هەولی بەدەست هێنانی چەکیان ئەدا بەپارە بۆ خەڵکی بکڕن لە کاتی خۆپیشاندانەکانی دژی ڕژێمی شادا.

ئێمەش بەپێی توانا چەکو فیشەک و نارنجۆکمان بۆپەیدا دەکردن. لەم ماوەدا بەنهێنی وهەندێک جار بەئاشکراش خەڵکی ڕۆژهەلات ئەهاتنە لامان کۆبوونەوەمان ئەکرد ڕێنوێنیمان ئەکردن، بەرنامەو ڕێبازی یەکێتیی نیشتمانیمان بۆ ڕوون ئەکردنەوە، ڕۆژێک لە نزیک گوندی شۆشمێ لەناو خانە باخێکدا کەسێکی خەڵکی شاری پاوە سەردانی کردین، هاتبوو بۆ ئەوەی چەکێکی دەست بکەوێت، ئەوکاتە نەک ئەوەی چەک نەبوو تەنانەت بەپارەش بۆی پەیدا نەکرا، کاتێک ئەم پیاوە هاتە لامان هێشتا شۆڕشی گەلانی ئێران سەرنەکەوتبوو، هێزەکانی وەک چریک و ژاندارم لەسنوورەکان مابوونەوە، ئەو پیاوە خۆی لێ نزیک کردمەوە و ووتی کاکە تۆ خەڵکی کوێیت؟ ووتم: تەوێڵە. ووتی: تۆ مندالیت چی ئەکەی لەم شاخ و داخە بۆ ناڕۆیتەوە؟ ناترسی لەناو ئەم دار و بەردەدا مارێک پێتەوە بدات؟ منیش هەندێک قسەم بۆ کرد و گووتم هاتووم خەبات ئەکەم بۆ ڕزگاریی کوردستان، کاتێک گەڕایەوە کاتژمێرەکەی دەستی پێشکەش کردم و ووتی: ئەمەیادگاری منە بۆ تۆ منیش لێم وەرگرت.

دواتر کە شۆڕشی گەلانی ئێران سەرکەوت ئەو پیاوەم دیتەوە کارمەندی دەوڵەت بوو، بوویە ناسراو دواتریش بوویە خزم، ئەو پیاوە لوتفولای باسام بەگ ناسراوبە نەجەفی بوو، تائێستاش ئەو دۆستایەتیەمان بەردەوامە.

من بۆخۆم و کوردانی ئەودیویش هەندێکیان، بە هەڵە وامان دەزانی دوای رووخانی ڕژێمی حمەڕەزا شا تازە قیادە موەقەتە کاریان تەواو بووە، چونکە دژی شۆڕشی ئێران بوون بەڵام سیاسەت و بەرژەوەندی شتێکی تربوو، ئەوە بوو کەدیتمان. واتە خۆیان گرێدا بەدەسەڵاتی تازەوە و کەوتنە هاوکاریکردن و ئەوانیش پشتیان گرتن، لەئێمە زیاتر کەوامان دەزانی مادام دژی ڕژێمی شابووین و هاوکاری سەرکەوتنی شۆڕشەکەمان کردووە ئێرانی تازە هاوکاری ئێمە ئەکات.

لەوانە بوو واش بێت، بەڵام ئێمە ماوەمان نەداو زوو خۆمان یەکلای کردەوە، ئەوە بوو سەرەتا لەکاتی وتووێژو داواکاری کوردەکان لەتاران یەکسەر پشتگیریمان کردن، کاتێکیش شەڕی نێوان هێزە کوردیەکان و ڕژێمی ئیسلامی دەستی پێکرد شەڕی ئێرانمان کرد و بووینە پاڵپشت و پشتیوانی هێزە کوردیەکان، پەیوەندی و دۆستایەتیمان لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا نەما تا تێکچوونی مفاوەزاتی یەکێتیی و حکومەتی عێراق لەساڵی ١٩٨٤-١٩٨٥دا.

## لەناوچەیەکی بەرتەنگەوە

## بۆ کەوشەنێکی فراوان مانگی ٢/١٩٧٩ -٢٢ بەهمەنی ١٣٥٧

ئێمەی لانەواز لەم دونیا فراوانەدا چەپەکک کەوتبووین، نەڕادیۆیەک بەئاوی پەیڤ نەمامی ناخی دێراو دەکردین و نەبەیاننامەیەک بەمزگێنی ڕستە و ناوەڕۆک کورپەی هەناومانی دەلاواند و نەکتێبێک مێژووی شارستانیەت و ڕوداوو و بەسەرهاتەکانی ڕابوردووی بۆ دەگێڕاینەوە. ئێمە هەر ئەوەبووین کەناومان پێشمەرگەو خاوەنی بیروباوەڕێ بووین، ئەگینا زۆر دووربوین لەشەوقی شارستانییەت و فەرهەنگ مێژووی ڕابووردومان، ئەوکاتەش ڕوومان لە ئاوەدانی ئەکرد، دوژمن هەزارو یەک داوی بۆ ئەتەنین، تەنیا باوەڕی پیرۆز بوو لەسەرپێ ڕایگرتبوین، نەسرەووتن تاسەرکەوتن ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کوێستانی هەناومانی بەخونچەی ورەو وزە دەنەخشاند، باوەڕەکەمان وای ڕاهێنابووین ئەو ژینە تاڵەمان نەدەگۆڕییەوە بەهەموو خۆشیەکانی ژیان لەدنیادا.

لەزوقمی ئەشکەوت و ڕچەی نواکانەوە لەهەڕەتی خۆنواندنی سروشت و جمەی گەلانی ئێرانەوە، بەرامەی بەهارێکی ئێجگار خۆش خزایە گیانی کەنەفتمانەوە و گو لاوەی گۆڕانکاری دەپژان بەسەرماندا، دەمانزانی ئێمە لەو قاوخە تەسکە دەردەچین و دەروازەی چوونە ناو دنیایەکی دیکە بەڕووماندا ئاوەلا دەبێت، سروشت لەتەدارەکی گژوگیا و شکوفەکاندا سەرمەستانە بانگی نوێ بوونەوەی سالی دەدا بەپەردەی گوێماندا، زەوق و شەوقێکی بلاوێن چۆم و چیاو ڕەزو ڕەوەز و باخ و شاخ و ناخی ئێمەشی هێنابویە سەما، شای ئێران لە تاو ڕاپەڕینی گەلانی ئێران، لە ٢٦ دی ١٣٥٧ هجری شمسی دا کە بەرامبەرە بە ١٩٧٩/١/١٦ تەخت وبەختی زێرکاری خۆی بەجێهێشت و گەیشتە ولاتی میسر، شاپوری بەختیاری لەجێگەی خۆیدا دانابوو، کوورە تاوگرتووەکەی ئەو ولاتەی سپاردبوو بەشاپوور، بەخەیالی ئەوەی ئەم بتوانێت ئەو خەلکە ڕاپەڕیوە ڕازی بکات و دەست لەزنجیرەی خۆپیشاندانەکان بەربدەن. بەلام تازە ئەو شەتاوە شەپۆلیاوە لەوەدا نەمابوو

هیچ هێزێک بتوانێ ئارامی کاتەوە. دەوڵەتی شاپور کە شا ڕایسپارد کابینەی تەشکیل کرد، تەنیا ٣٧ ڕۆژ توانی دەوام بکات. گەورەترین کێشە کەڕووبەڕووی ئەم کابینە بووەوە خۆپیشاندانی ملیونی ڕۆژی ١٩٧٩/١/١٩ بوو.




ئیمام خومەینی ڕۆژی ١٩٧٩/١/٢٠ ڕایگەیاند دێتەوە بۆ ئێران، شاپور لەبەرامبەر ئەم ڕاگەیاندنەدا فڕۆکەخانەی مهرئابادی داخست. بەڵام ئەم بڕیارە وڵاتی زیاتر شڵەژاند،[1] بۆیە شاپور پەشیمان بووەوە، دواتر ووتی هەرکات ئیمام مەیلی هەبوو ئەتوانێ بێتەوە، ئەوە بوو لە ڕۆژی ١٩٧٩/٢/١ دا ئایەتوڵا خومەینی بە فڕۆکە لە تاران لە پێشوازیەکی بێوێنەدا نیشتەوە. لە چاو پێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیدا ڕایگەیاند ئەبێ حکومەتی بەختیار هەڵوەشێتەوە و حکومەتی کاتی دامەزرێت، هەر لەوێدا لێیان پرسی هەست بەچی ئەکەیت؟ لە وەڵامدا ووتی: هیچ.

ڕۆژی١٩٧٩/٢/٩ بەڕەووتی شنە لەسەر سنوورەوە هەنگاومان گواستەوە، بستۆکە سنوورەکەمان بڕی تا لە ئامێزی گوندی تەشار دا کەسەر بەشارۆچکەی نەووسوودە گیرساینەوە. ئەم شەو نەک ئەوەی ترس

---

١- لەو سەردەمەدا قسەیێک هەبوو، گوایا ئەگەر ئیمام خومەینی نەیتوانی یا نەکرا لە ڕێگەی هەواییەوە بگەڕێتەوە تاران، ئەوکات بە پێی بەرنامەو پلانێک لە فەرەنساوە دێتە وڵاتی سووریاو لەوێشەوە بە قاچاخ و بە پیادە لە ڕێگەی یەکیەتی نیشتیمانی کوردستانەوە دێتە چیاکانی کوردستان. دواتر لە قەندیلەوە بە یاوەری سەرۆک تاڵەبانی و لەگەڵ دووهەزار پێشمەرگەی یەکیەتی نیشتیمانی کوردستاندا، لە سنووری شاری سەردەشتەوە خۆی دەکات بە وڵاتی ئێراندا. هەڤاڵ مەلا بەختیار ئەڵێت، نا، بەر لەوەی لە عێراق دەربکرێ، مام نامەی بۆ ئیمام خومەینی ناردووە کە بێتە دەرەوە بۆ ناو شۆڕش و لەلای سەرکردایەتیەوە، سەرکردایەتی ڕاپەڕینی گەلانی ئێران بکات

وخەممان نەبوو، بەڵکو پەنجەی هیوا ختووکەی ڕۆحی دەداین و گیانی تژی دەکردین لەبەرامەی عەبیری ئومێد، ئێمە بەپێویستمان زانی ڕۆژیش لەئاوای تەشار بمێنینەوە، ماینەوە بۆئەوەی زیاتر لەنزیکەوە ئاگامان لەهەڵچوونی دەریای ڕاپەڕین بێت، پاسگای ملە سەروا و بنکەیەکی ئەرتەش لەو ئاواییە نزیک بوون، بەڵام گوێی خۆیان لەئێمەش و خەڵکی گوندەکەش خەواند و بەزاریاندا نەهات بڵێن ئەمانە کێن و بۆ لێرەن؟ شەوی دووهەم لە جادەی پاوە- نەوسوود پەڕینەوە هەورازتر بووینە میوانی گوندی وەزڵی کەلەسەر ڕێگای نەووسوود-نۆدشە بوو، هەرئەو شەوە شەوی ٢٢/ بەهمەنی ساڵی١٣٥٧شاپووری بەختیاریش بەپەلە پرۆزێ حکومەتەکەی تەسلیم کردو خۆی لەناو تاران دا شاردەوە. بۆ بەیانییەکەی خەڵکی نەووسوود بەئۆتۆمبێل شوێن پێیان هەڵگرتین و لە ڕۆژی ١٩٧٩/٢/١١دا کردینیانە میوانی شارۆچکە خنجیلانەکەیان، لەوێ چوار سەربازی عێراقی و جێبێکی سوپایی لەبنکەی کونسولگەریدا



[illegible]

بوون، خەڵکەکە بەرلەوەی بمانگەیەننە شارۆچکەکەیان ووتیان: نابێت دەست بۆ ئەو سەربازە عێراقیانە بەرن، ئێمەش بەدەم و بەسەر وەڵامان باشە بوو، هەرچەندە ماوەیەک لەوەوپێشتر ئەوانە عومەر (سیروان)یان هەربەم جێبە سەربازیە بردبووە تەوێڵە و دابویانە دەست هاوکارەکانیان دواتر لە سێدارە درا، سیروان پێشمەرگەو پێشتر لەسەر سنوور بۆ نان چووبوە هەوارەکانی قەلاگا ساواک گرتبوی..

هەرکەپێمان گەشتە سەر ڕاستە جادەکەی نەوسوود خەڵکی زۆر لێمان کۆبوونەوە و ڕێو ڕەسمیان پێک هێنا، ئێمە بۆخۆمان لەسەر گرتنی

سەربازەکانی عێراق بووین بە دوو بەش، بەشێکمان ئەمان ووت ئەبێ سەربازەکانی عێراق بدەنە دەستمان، بەشەکەی تر ئاپۆرا جەماوەریەکەیان بینی ووتیان کراونەتە خاتری ئەمان و دوور کەوتنەوە لە ئێمە، هەروەک لەوێنەکەدا دیارە، خەڵکەکە ووتیان ئەو پێشمەرگەی ئێوە، ساواک تەسلیمی کونسولگەریان کردووە، ئەمانیش بردویانەتەوە بۆ عێراق، ئەمان چی بکەن و لەدەستەڵاتی ئەماندا نەبوە؟ دوای بگرەو بەردەیەکی کەم ئێمەش ڕازی بووین، ڕێورەسمەکە دەستی پێکردەوە گەنجەکان تفەنگەکانی ئێمەیان وەردەگرت و بەرزیان دەکردەوە، هەموو یەک دەنگ دروشمیان دەدا و کەیفیان لێ دەباری، ئێمەش بەجل و بەرگی چلکن و کەوشی دڕاو و بەڵمە ریشەوە لەگەڵ تاقمە مەخزەنەکانی قەدمان نامۆییمان پێوە دیار بوو، ڕێ پێوانەکە لە ملە سەروا وە لەگەڵ زایەڵەی دروشم و هووتافدا ڕێچکەی بەست تا ناو شاریان پێواو بە حەوزەلارە گەشتن. ئەوەندە نەرم ڕێگەیان دەبڕی کاتیان بە نیوەڕۆ گەیاند، هەریەکە و میوانداری چەند کەسێکیان کرد، وامان هەست دەکرد لەسەیرانین، چونکە نەوسوود بۆ خۆی بەچاوی گەشی حەوزەلارە و کەف چرینی زیوینەوە، لەگەڵ لاپاڵی ئاودامانی قەیفە پۆش و لەنجەی دارو درەختەکان، بە بزووتنی سروە و ئاوازی چریکەی باڵندەو بولبولە کەیلەکانی هەوای تازە، پارچەیەک لەبەهەشتیان پێک هێنا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ماوەیەکی زۆر بوو ئێمەش بەنی تاسەمان براببوو لە نان و چێشتی پوختە و گەرم و چەور، ئەم نیوەڕۆ بەرلە دابەشبون مێرمنداڵێکی جوان و بالابەرز خۆی لەمن نزیک کردەوە ووتی تۆ بۆ نیوەڕۆ لەماڵی خۆمانی، منیش لەگەڵ دوو پێشمەرگەی تردا چووین بۆماڵیان دایکی بەگەرموگوڕی پێشوازی کردین، لەکورەکەی پرسی ووتی: فەیسەڵ گیان ئەوە بۆ نەتپرسی بزانی حەمە کچەزاکەی حاجی ئایزە بارام کامەیە لەگەڵ ئەم میوانانە ئەویشت بهێنایە؟ نەجمەدین عەزیز یەکێک لەپێشمەرگەکان بوو بەهەورامیانە ووتی: مەتی ئانە حەمەن، واتە پورێ ئەوە حەمەیە، پورێ دەستی کردە ملم و ووتی حەمەگیان من زێبام خێزانی شەهید حاجی نیازی لهۆنی[1]. من ناوبانگی لهۆنیم بیستبوو کەلەسەر پەیوەندی لەگەڵ تەیموری بەختیاری گیراوە.

---

[1]- حاجی نیازی لهۆنی سالی ١٩٦٤-١٩٦٥ مالی لە تەوێڵە بووە دراوسێ و دۆست

وناسیاوی ماڵی باپیرم بووە، دواتر ماڵیان گەڕاوەتەوە بۆ ئێران و لەنەوسوود نیشتەجێ بوون، لەوکاتەدا قادری نامداری ئێناخی مەفرەزەی چەکداری هەیەو بەدژی ڕژێمی حەمەڕەزاشا چالاکی ئەکەن، شەوێک لەئاوایی خانەگای لای پاوە ئەکەونە بۆسەوە کەسێکی نیزامی ئەکوژن، دوای ئەوە دورئەکەونەوە، بۆ بەیانیەکەی دەوڵەت کێومال ئەکات لەپشتی ئاوای دشە لەسەر کانی هێلاو چەکدارێکی قادری نامدار بەناوی حسێنی محەمەدی ئەگرن، ئەیبەن وپێی ئەڵێن ئەگەر بەڕاستی هاوکاریمان بکەی لەسێدارە نادرێیت، ئەویش ئەوکەسەی چوونەتە ماڵی ئەوەی نانێکی پێداون ئەوەی لەسەرە ڕێگایەک بینیونی ناویان ئەدات، بۆیە حکومەتی ئێرانی شۆڕەتی لەمحەمەدیەوە گۆڕیوە بۆ ڕاستگۆ، واتە حسێنی ڕاستگۆ، دوای ئەوەش ٢٠ساڵ حوکم دراوە. ئەوانەی ناوی داون لەشەو ڕۆژێکدا ئەگیرێن و لەشارەدێی بانیگان کۆیان ئەکەنەوەو ڕاست لەوێوە ئەیانبەن بۆ جەڵدیان لە پارێزگای ورمێ لەوێ زیندان ئەکرێن، دوای دادگایی کردنیان ئەمانە لەسێدارە ئەدەن حاجی نیازی لهۆنی باوکی فەیسەڵ وعەلی هاوسەری خاتوو زێبا، بەهمەن بەگی لهۆنی، داریوش نیکۆ کرماشانی، مامۆستا جەعفەری کەریمیان دزاوەری، مەجیدی مەجیدیان نۆریاوی، عەتای مەجیدیان نۆریاوی. ئەمانەش حوکمدروان:

١. عیزەت بەگ کوڕی کەریم سان ئەفسەر بووە ٤ساڵ.

٢- حاجی حسێنی دوریسانی ٤ساڵ.

٣-کوێخا عوسمانی دوریسانی ٤ساڵ.

٤- داود ئەوڕەحمان ٤ساڵ.

٥-سەید تاجەدینی خانەگایی ٤ساڵ.

٦- تاهیری نامدار ئێناخی ٤ساڵ.

کاک سەلاحەدینی موهتەدی لەبارەی ئەمانەوە ئەڵێت: ساڵی ١٩٦٨ ئێمە لەزیندان بووین لهۆنیەکانیان هێنا بۆلامان، ئەوانەی لەبیرم بێت و پێشتر پێکەوە بووین لەسەر حیزبی دیمۆکرات گیرابووین، خۆم واتە سەلاحەدینی موهتەدی- محەمەدی ئێلخانی زادە، سالح لاجانی، سلێمانی موعینی، مەلا ئاوارە، یوسفەکۆل. موهتەدی ئەڵێت: بۆ ڕۆژی کۆتایی دادگایی کردن دەوڵەت مۆڵەتیان ئەدا هەرکەس هەستێ وبەرگری لەخۆی بکات یان پارێزەر بگرێ، بەحوکمی ئەوە من لەزینداندا بووم وقانونیش بوم، لهۆنیەکان داوایان کرد لەڕەئیسی مەحکەمە من ببمە پارێزەریان، ئەویش قبوڵی کردو بۆئەو مەبەستە نزیکەی ٤تاە جار بینیمن و پێکەوە دانیشتین، تۆمەت و جورمیان سیاسی بوو، پێیان ئەوتن مخالفی دەوڵەت بوون و پەیوەندیتان بە تەیموری بەختیارەوە هەیە، ئەو شۆڕش و شەڕەی پێشترو سەردەمی جەعفەرسانیان بۆ کردبوونەوە بەتۆمەت و تاوان، داریوش نیکۆو بەهمەن بەگ زۆر بەجەرگ بوون، زۆرتر حاجی نیازی قسەی ئەکردو نەقڵەکانی ئەگێڕایەوە، ئەمین بەگیش پیاوێکی نەترس بوو. ئەسەدوڵا عەلەم لەکتێبی یاداشتەکانیدا

لەم کاتەدا چەند کەسێک بەناوی کۆمیتەی ئینقلابەوە جێبەکەو سەربازەکانیان بردە کەلی شۆشمێ و ئاودیوی عێراقیان کردنەوە. لەم لاشەوە پاسگاو ساواک چەک کراون، بەڵام کەسیان نەچوون بەلای سەربازگەکەدا، چونکە سەربازەکان بەچاوی بێلایەن سەیریان دەکرد، واتە وەک ئەرتەش خەڵک سەرکوت ناکەن.

شەو لەنەوسوود بووین کاتێکمان زانی قەتارەیەک ئۆتۆمبێل لەپاوەوە هاتن بۆ نەوسوود بەدوای ئێمەدا تابڕۆین بۆشارەکەی ئەوان، لەولاشەوە خەڵکی شارەدێ نۆدشە بەهەمان شێوە و خواستەوە هاتبوون، ئێمەش نەماندەزانی چیبکەین و چۆن دڵی هەردوو لایان ڕابگرین، لەبەر ئەوەپێمان ووتن ئێوە لەناو خۆتاندا ڕێک بکەون، هەرچییەکتان پێ باش بوو ئێمەش پەیڕەوی دەکەین.

حەمەلەڕوش کەسێکی خەڵکی نۆریاوی لای پاوە بوو، بڕنەوێکی وەسەتی لەساواکی ئەوشارە دەست کەوتبوو، شۆفێری دەبڵ کابینەیەک بوو بە تۆپزی ئێمەی سواری چەند ئۆتۆمبێلێک کرد و بەرە و شاری پاوە بەڕێکەوتین. لەڕێگەدا گەشتینە گوندێک بەناوی کۆمە دەرە حەملە وەستا و دابەزی، بەدەستێک تفەنگە بڕنەوەکەی ڕوو لەئاسمان کردو گولەی ئەتەقاند، هێندەی نەبرد خەڵکی گوندەکەی لەدەور کۆکردینەوە. شەو گەشتینە پاوە و نۆریاو. بەیانی ڕۆژی١٢/٢/١٩٧٩ ڕێپێوان ساز کرا، لەوبەری شارەوە بۆ ئەمبەر خەڵک قەتارەیان بەست و شارەکەیان دارماڵ کرد لەدروشمی شۆڕشگێڕانە و سۆزی دەروون. لەگۆڕەپانی فەرمانداری ئۆتۆمبێلێکی لۆرییان هێنا و بڵندگۆیان لێ بەستبوو، گووتیان دەبێت قسە بکەن بۆ خەڵک، مامۆستا سەرکەوت بەپچڕ پچڕی هەندێکیان بۆ دوا و پیرۆزبایی و پشتگیری کردنی یەکێتیی بۆ سەرکەوتنی شۆڕشەکەیانی ڕاگەیاند.

نیوەڕۆ لەخانەیەکی سەفاداردا بەناوی مهمان سرا بانگێشتیان کردین و بۆ شەویش دابەشیان کردین بەسەر ماڵاندا. ئەو دوو سێ ڕۆژە گوندەکانی شمشێر، نۆسمە، نۆریاو هەندێ پێشمەرگەیان کردە میوانی خۆیان، لەوانە کە

---

بەناوی ،(یاداشتهای علم) لەبەرگی دوودا لەلاپەڕە٩٣دا بەووردی باسی تەیموری بەختیاری کردوە.

هەرگیز بیرم ناچێتەوە پیاوی سەخاوەت دار میرزا فەرەجی شمشێری بوو. هەندێ تێکۆشەری خوێن گەرمیش لەشاری پاوەوە دەهاتن و داوای ڕێنونیان دەکرد لەگەڵ زانیاری لەسەر یەکێتیی. تەنانەت پرسیاریان دەکرد ئایا لەناو دیموکراتدا خۆیان ڕێک بخەن یاخود لایەنی دی؟ بۆنمونە لەبیرم دێ لەماڵی حەمەی وەڵەدبەگی کاک فەرەیدونی میتران لە ئێمەیان پرسی کەچ لایەنێکتان پێ باشە خەباتی تێدا بکەین؟

هەر لەو سەفەرەدا مام هادی ئەوان بەپیاوێکی سیاسیان دەزانی بردبوویانە لاوەو لێیان پرسیبوو: ئەرێ ئێوە شورەوی (سۆڤیەت) بە سۆشیال دەزانن یان بەسۆشیال ئیمپریال؟ مام هادی سەری لەو قسەیە دەرنەچوو بوو، دوای کەمێک وەستان وتبووی هەردووکیانە. هاتنە لای من و وتیان مام هادی وادەڵێت ئەوەی یەعنی چی بۆمان شیبکەرەوە چۆن شورەوی سۆشیالیستە و سۆشیال ئیمپریالیستیش؟ منیش لە رووم نەبوو بڵێم مام هادی تێنەگەشتووە یان نازانێ سۆشیال ئیمپریال چییە؟ خۆیشم زۆر سەرم لێ دەرنەئەچوو، بۆیە ووتم بچنە لای ئەو پێشمەرگەیەی کەناوی د.کەمال شاکرە[1]، بائەو وەڵامتان بداتەوە، لەم سەفەرەدا هەڤالانی بەرپرس بریتیبوون لە شەهید غەفوور دەرەشیشی، م. سەرکەوت و مام هادی...

وردە وردە پەیوەندیمان دروست کرد لەگەڵ ئەو گەنج و لاوە ڕۆشنبیرانەی ناوچەکەدا کەخوازیاری ئەوە بوون سەر لەباروDۆخی سیاسی ئەوسەردەمە دەربکەن و خۆشیان لەناو ڕێکخراو یان حزبە سیاسیەکان ڕێک بخەن.

هەر ئەم کارەش بووە مایەی ئەوەی کەلەبەشی هەورامانی ئەودیو ژمارەیەکی ئێجگار زۆر دۆست و لایەنگرمان بۆ دروست بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوکاتەو دواتریش هەندێ لەگەڵمان بوونە پێشمەرگە لەوانە جەمشید مام ئەمین و فەیسەڵ حەمەتەقی، محەمە کێمنەیی، ئیقباڵی حاجی کەریم. کەلەڕیزەکانی ئێمەدا پەپوولەی ڕۆحیان هەڵفڕی بۆ بەهەشتی نەمریی.

---

[1] – کەمال شاکر برین پێچ بوو خەڵکی هەڵەبجەیە، لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا چەپ و لەگەڵ حیزبی شیوعی قیادەمەرکەزیدا بوو. دواتر پەیوەندی بە ڕێکخستنی کۆمەڵەوە ئەکات لەساڵی ١٩٧٨دا هاتەدەرەوە، کادرێکی ژیرو لەسەرخۆو بەئەدەب بوو، هاوسەرو منداڵەکانیشی لەچیا لەگەڵیدا بوون.

شاری پاوە یەکەم شار بوو کە لەودیو بەتایبەت لەسنوری پارێزگای کرماشاندا راپەڕینیان دەستپێکرد بەدژی ڕژێمی شا، ئەم تێکۆشەرانە هەر زوو ساواک و چریک و ژاندارمیان چەک کرد و گیراوەکانی ناو زیندانی ساواکی شارەکەیان ئازاد کرد. لەناوچەکانی دەور و بەریانەوە لە ڕۆژی٨ ی ئابانی ساڵی١٣٥٧ هجری شەمسی دا کە بەرامبەرە بە ٩٧٨/١٠/٢٩ پالیزبان و سالار جاف بەژمارەیەکی زۆر تفەنگچییەوە بەسەرپەرشتی محەمەد ئاغای ئولفەتی کەخەڵکی گاوارەی لای کرماشان بوو، هاتنە سەر پاوە. بەتفەنگی شکاری چەندین کەسیان شەهید کرد و دروشمی جاوید (بژی) شایان هەڵدا و خەڵکەکەش دروشمی مرگ برشا. خەڵکی پاوە دەستیان لێکردنەوە، ژنانیش لەسەر بانی ماڵان و دووکانەکانی بازاڕەوە بانگردێنیان خستبوە خوار بەسەر چەندین خەڵک و ئۆتۆمبێلدا کەوتبون، لەهێزەکانی پالیزبان نزیکەی ٢٠ کەسیان لێکوژرا.

شاری پاوە بووە گۆڕەپانی شەڕێکی گەورە، هێزە نەیارەکە بەسەرپەرشتی محەمەدی ئاغای ئولفەتی بێ بەزەییانە دەستیان لەخەڵکی ئەو شارە کردەوە و کۆمەڵێک شۆڕشگێڕی بەئەمەکیان تێدا شەهید کرد، لەوانە مەعروفی فەتاحی، عەلی خورشیدی و سالح هۆشدار......... تاد. ئەمە جگە لەبەدیل گرتن و بریندارکردنی ژمارەیەکی دی، لە کاتی خۆپیشاندانەکانی شارەکانی ئێران دا جەماوەری شاری پاوە سەر مەشق بوون، لەوکاتەدا تیرەو هۆزەکانی دەرەوەی شار بۆپشتگیری کردنی شا هاتنە سەر پاوە و خەڵکیان کوشت، دوای سەرکەوتنی ئینقیلاب هەر ئەوانە گەمارۆی شاری پاوەیان دا بە ناوی کوردایەتیەوە خەریک بوو فیتنەیەکی گەورە بەرپابکەن. ئێمەش بەنەزانی و بەهەڵە لەگەڵیان بووین و هاوکاریمان ئەکردن.

پاوە لەچاو شارەکانی پارێزگای کرماشاندا خەڵکی کورد پەروەرو ڕووناک بیرو پێشکەوتوو خوازیان زۆرتر بوو، چونکە ئەم کەلتوورەیان بەمیرات بۆ ماوەتەوە، هەروەها پێشتر بزاووتی ئەدەبی تێدا بووە، لەگەڵ مزگەوتە بەناوبانگەکەی کەهەمیشە مەکۆی خوێندەواری بەرز بووە، بۆیە لەم شارەدا کەسانی وەکو سەیدی دووەم، خەستەی خانەگایی، جیهان ئارا خانم، میرزا عبدالقادری پاوەیی، شەمسی قورەیشی و مەحزون میرزا مەحمود و ئەفوایی کوڕی تێدا هەڵکەوتووە کەخەڵکی ڕۆشنبیری دەورانەکانی ئەم شارە

سەربەرزە بوون. شعری شاعیرانی سەردەمی خۆی لە پاوەدا دیارو بەرچاون، لەئاسۆی ئەدەبیاتی کوردەواریدا.

ئەگێڕنەوە کەوکەوخانی کچی میرزا عەبدوڵلا جوانییەکەی لەڕادە بەدەر بووە، بۆیە لەچەندین کۆپلەداو لەلایەن چەندین شاعیرەوە ناوی هاتوە، وەک ئەفوایی کە ئەڵێت:

(تەعامی کۆکۆ کەوکەو ئاوەردەن وەشتەرەن جەکۆ کەو کەباب کەردەن)

کەوکەوخان باخی لەسەر ڕێگاکای پاوە خانەگا بووە، ئەفوایی لە پاوەوە ئەچێت بۆ خانەگا، بەهار بوە کەوکەو خواردنی هێلکەوڕۆن (کۆکۆ)ی کردووە فەرموی لێ ئەکات، ئەویش پارویەکی لێ ئەخواو ئەو شعرەی سەرەوەی بۆئەڵێت .

لەسەرەتای بەهاری ۱۹۷۹ دا ئێمە ماوەیەک وازمان لە جەولەو چالاکی نواندنی دیوی خۆمان لەباشوور هێنابوو، دیارە ئەمەش دوو مەبەستی تێدا بوو، یەکەم: بۆ هاوکاری کردن و ڕێنوێنی تێکۆشەرانی ئەودیو ڕۆژهەلات، دووەم: بۆپشوودان وحەوانەوەی هێزەکانمان، بۆیە کاتێ شۆڕشی گەلانی ئێران سەرکەوت، ئێمە گەڕاینەوە سنوری چالاکی خۆمان و بنکەو بارەگامان دانایەوە، دوای ئەوە مایەوە جار جار دەچووین بۆ کڕینی پێداویستیەکانمان یاخود بۆ سەردانی خزمان و دۆستان لەگوندەکان و شارەکانی وەک نەووسوود، نۆدشە، پاوە، مەریوان دواتریش کەشەڕو کێشە لەنێوان ڕژێمی ئێران و لایەنە سیاسیەکان دروست بوو، بەبێ بەرنامە جارجار بۆ هاوکاریکردنی براکانمان دەچووینەوە ئەودیو.

# شەڕی دزلی

**١٩٧٩/٣/٢١**

دوای بەرفراوان بوونی ڕاپەڕینی گەلانی ئێران و پتر بڵند بوونەوەی بانگەوازی ئازادی و سەرفرازی، زۆر لەشار و شارۆچکە و دەڤەرەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات کەوتبوونە ژێر دەسەلاتی خەڵک و پێشمەرگەوە، لەهەندێ شوێن کۆمیتەی ئینقلابیان جێگیر کردبوو بۆ بەدەمەوە چوون و ڕاپی کردنی کاروباری هاوڵاتیان، لەهیچ یەکێک لەو شوێنانەدا کەلەژێر دەستی خەڵک وپێشمەرگەدا بوون نەئەچوون بەگژ سوپادا (ئەرتەش) تا سوپاش بێلایەن و تەماشاچی بوو.



لەم کات و ساتەدا شاری مەریوان و هەموو ناوچەکە جگە لە ئاوایی دزلی بەدەست خەڵک و هێزە سیاسیەکانی ڕۆژ هەلاتەوە بوون. هێزەکانی قیادە موەقەتە بەرلە ئینقلاب و لەدەورانی شاشدا، خۆیان لەشارە دێی دزلیدا جێگیر کردبوو، پاسگاکەی ئەمنییەو ژاندارمی شـــا بەهـــەموو چـــەکو چۆڵەکـــانیـــانەوە هـــەرلەوێن، لەســـەرەتای مانگی١٩٧٩/٣دا بەشـــێک لەهێزەکانی یەکێتی، چووینە سنوری مەریوان و تا دەهات وردە وردە ژمارەمان زیادی دەکرد، هێزەکانی یەکێتیی ئەوکات لەسنوەی مەریوندا کۆبووبونەوە لەلایەن ئەم هەڤاڵانەوە سەرپەرشتی دەکران، لەوانە: سالار عەزیز، جەلالی حاجی حسەین کەلوش، ئەنوەر مەجید سوڵتان، بەکر حاجی

سەفەر، جەمالی عەلی باپیر، شەوکەت حاجی موشیر و حەمەی حاجی مەحمود، مستەفا چاورەش و عوسمانی قالەمنەوەر.......تاد هێزەکان هەندێکی لەمەریوان و ئەوی تریش لەگوندی ساوجبییەوە تا کانی دینار دابەش بوون. لەم کاتەدا ئێمە نزیکەی ٢٠ بیست پێشمەرگەیەک لەگەڵ کاکە حەمەی حاجی مەحمودا، چووبوین بۆ ناوزەنگ بۆلای جەنابی مام جەلال و برادەرانی سەرکردایەتی، چەند ڕۆژێک لەوێ ماینەوە تا لەڕێکەوتی ١٩٧٩/٣/٢٠ گەڕاینەوە، لەڕێی سەردەشتەوە، شەوی ٢٠لەسەر٢١ی ٣/ ١٩٧٩ گەشتینە شاری بانە بڕێک چەک و فیشەک و گوللە (ئاڕ بی جی )مان لەگەڵ خۆماندا هێنا بوو، شەو کەلە بانە بووین ئێوارەکەی ئاگری نەورۆز دری بەتاریکە شەودا، چراخانێکی گەورە دروست بوو بوو، بۆن و بەرامەی ئازادی پاش نەمانی ڕژێمی شاهەنشاهی لەسەربان و کۆڵانەکانەوە دەگەشتە ترۆپکی چیای ئاربابا و بابۆس و کەلیخان، ئەو خەڵکە ستەم دیدە لە زەماوەنێکدا دەژیان نەمان دەزانی گوێ لەئاوازی پێکەنین بگرین یا لە چریکەی پیرۆزبایی و گریان بۆ ئەو جەژنە کە هەرگیز کۆن نابێ.



ڕۆژی ٢٠ /١٩٧٩/٣ شاری بانە لەڕاستەوە مەحمودی حاجی فەرەج، حەمەی حەمەسەعید، سەیوان هاوارێ

لە هێزەکەی هەورامان من،(حەمە) و د.کەمـــال شـــاکیر، مەحمـــودی حاجـــی فەرەج، سەیوان عەلی ڕەزا و حەمە مستەفا لەگەڵ کاکە حەمە لەوسەفەرە دا بەشدار بووین، بەشی زۆری هێزەکـــەی هەورامان بەسەرپەرشتی شەهید غەفوور دەرەشیشی، لەسنوری مەریواندا مابوونەوە، هەر ئەو شەوەی کەئێمە لەبانە لاماندابوو، هێزەکانی یەکێتیی هێرشیان کردبووە سەر بارەگاو پێگەکانی قیادە موەقەتەو پاسگاکەی دزلی، ناوچەکەیان پێ چۆڵ کردبوون و ئەوانیش بەرەو ئاوابییەکانی کەیمنە و بێرواس دەرچووبون، بەڵێ ڕۆژی ٢١/ ٣ / ١٩٧٩ بەیانی زووی ئەو ڕۆژە

لەبانەوە کەوتینە رێ بەرەو مەریوان، ئەو چەک و تەقەمەنییەی هێنابوومان لەسندوقی پاسێکدا کەبەکرێ گرتبوومان، داماننابوو، لەرێگایەکی خۆڵەوە کەبەسنووردا راکێشراوە دەمەو نیوەرۆ پاسگای چۆڵ کراوی بەساممان خستە پشت سەرو لەرێگای سەرشیوی سەقزەوە گەشتینە دەڤەری مەریوان، دەبوو بەلای پادگانەکەی ئەم شارەدا تێپەڕین و بەناو بازگەکەیدا بڕۆین. کاکە حەمە و شەهید مەحمود و کەمال شاکیر لەپێشەوە بوون، لەریزی دواوەی پاسەکەدا، شەهید حەمە مستەفا و حاجی عومەر قاینەجی و برایەکی سوار بوو بوون، ساڵح پارەزانیش بەپێوە لەتەنشت دەرگای پاسەکەدا راوەستابوو. گەشتینە بازگەی پادگان و سەربازێک رایگرتین، دووسەربازیش لەتەنیشت جێگەی حەرەسیاتەکەوە وەستابوون.

کاتێک سەربازەکە دەرگای پاسەکەی کردەوە و بەفارسی پرسی: چەکت پێیە بیدە؟، لوولەی کلاشینکۆفەکەی گرت، ساڵح دەستی پێدا نا تەقاندی بە سەربازەکەدا، کاکە حەمە بەشۆفێرەکەی ووت: لێخوڕە بڕۆ، کاکەی شۆفێر حەپەسابوو سەری نەوی کردبوو، بەهێواشی ئەڕۆیشت تا هاوارمان کرد بڕۆ بڕۆ. کەمێک، دور کەوتینەوە لەهەموو لایەکی سەربازگەکەوە گوللەیان بەسەردا ئەباراندین، ئێمە خەمی گوللەکانمان نەبوو. بەڵکو لەتەقەمەنییەکان دەترساین بەگوللەیەک بتەقنەوە لەناو سندوقی پاسەکەدا.

ئۆتۆمبێلەکە نەوەستا تاناوشار بەپەنچەری و لەسەر ویل ڕۆیشت، لەگەڵ گەیشتنمان حاجی ئەمین بەگ و عەتای کوڕی و چەند کەسێکی تر هاتن بەدەممانەوە، نازانم چۆنیان زانیبوو تەقەمان لێکراوە، کاتێک هاتینە خوارەوە ئەوانەی ریزی دواوە هەرچواریان بریندار بوو بوون و بران بۆ نەخۆشخانە. هەرچەندە داوایان لێکردین کەپشوو بدەین، ئێمە لێمان وەرنەگرتن و ووتمان دەچین بۆ دزلی. ڕۆشتین و کەگەشتینە بەرەوە، شەڕ تەواو بوو بوو، لـە قـیـادة مـوقـتـة مەلا عارف بەرپرسی ناوچەو و چەند کەسێکی تریان لێگیرابوو، کوڕێکی تەوێڵەیی بەناوی عومەر عەزیز کەپێشمەرگەی قیادەبوو بووبوە قوربانی، عومەر کوڕێکی هەژارو لەبنەماڵەیەکی بەڕێزی خەڵکی تەوێڵە بوو، من ئەمناسی و زۆر دلگران بووم بۆی. ئۆتۆمبێلێکی جۆری پەیکان هی سەربازی کوڕی کاک نادر هەورامی جێمابوو سووتاندیان.

لەهێزەکەی ئێمەش مامە عەبەی وەهاب و عومەر مەجید (پشتیوان) بریندار بوون [1]. هێزەکەمان ئەوەندە زۆر بوو لەدزلیدا جێگەمان نەدەبوویەوە، بۆیە بەشێکمان بۆ ئێوارە چووین بۆگوندەکانی دەرەکێ و دەمەیەو ئەمانویست دوایان بکەوین بۆ لای ئاواییەکانی کێمنەو بێرواس.

ڕۆژێ دوای شەڕەکە هەیئەتێک لەلایەن ماڵی شێخ عوسمانەوە هاتنە دزلی، ئەوانیش شێخ ناسح و براکانی و چەند کەسی تر بوون، گووتیان جەنابی شێخ عوسمان داوای کردووە، دوای هێزەکەی قیادە مەکەون بەرەو هەورامانی لهۆن، چونکە نادر هەورامی پەیوەندی کردوەو بڕیارە، لەڕێی ئێمەوەوە خۆییتان تەسلیم بکات، من بۆخۆم دەمزانی ئەوەڕاست نییە، بۆ ئەوەیەکە ئێمە دوایان نەکەوین تا دوای ئەو تێک شکانەی دزلی خۆیان ڕێک بخەنەوە، بۆ ئەو مەبەستە کاک شەوکەت و سالار عەزیز و کاکە حەمەی حاجی مەحمود و چەند کەسی تریان برد بۆ دوو ڕۆ [2]. بۆ ماڵی حەزرەتی شێخ عوسمان. ئێمە کەرتی هەورامان زۆرمان پێناخۆش بوو، چونکە ئەمانزانی ئەوان لە کەیمنە و بێرواس دواتر خۆیان ڕێک ئەخەنەوە. هێزەکانی دیکەی ئێمەش دەچنەوە سنوری چالاکی خۆیان و سەریەشەکە هەر بۆ ئێمە جێ دەمێنێ.

ئەو ڕۆژە جەماعەت چوون بۆ ئاوای دووڕۆ لەماڵی جەنابی شێخ عوسمان دا خەڵکی بیانی لێ بوو بوو، کامێرای ڤیدیۆیان پێ بووە و وتوویژیان لەگەڵ بەرپرسەکان کردبوو، لەکاتی ووتوێژدا بەکاک سالار

---

[1] - دوای شەڕەکە کۆبوونەوەیێک کرا کە ئەم هەڤالانە تێدا بەشدار بوون شەهید جەمالی عەلی باپیر، بەکری حاجی سەفەر، شەهید ئەنوەری مەجید سوڵتان، شەهید ڕەئووف خەلیفە سەعید، شەهید شەوکەت حاجی موشیر، سالار عەزیز و جەلالی حاجی حسەین-حسە کەلۆش. سالار عەزیز بەتوندی دژی قیادە موەقەتە قسە دەکات، کاک شەوکەتیش دەڵێت: بروسکەی مام جەلالم بۆ هاتووە کەشەڕەکە ڕابگیرێت و شوێنیان نەکەوین. کاک سالار عەزیز لەوەڵامدا دەڵێت: کاتێک من شەڕی قیادە موەقەتەم کردووە مام جەلال لەئەورووپا بووە، ئێستەچۆن بەقسەی ئەو شەڕ ڕادەگرم؟ ئەمەیان وانەبووە-حەمە. چونکە پێشتر شەڕمان نەبووە لەگەڵ قیادەدا بەرلەوەی مام بێتەوە لەدەرەوە.

[2] دووڕۆ ناوی ئەو ئاواییەیە کامالی شێخی لێبوو، دووڕۆ لەدوو ڕوودەوە هاتوو، واتە ئاو، لەوشوێنەدا دوو چۆمی ئاو یەکدەگرنەوە.

عەزیزیان ووتبوو، ئێوە سەر بەجەلال تاڵەبانین، کاک سالار عەزیز خۆی لەوقسەیە تورە کردووە و گوتبووی: نەخێر جەلال تاڵەبانیش بەرپرسێکە وەکو من، من سەرکردەم، ئێمە کۆمیتەی سەرکردایەتیمان هەیە و کەس بەرپرسی یەکەم نییە، شریتی ناو کامێراکەی شکاندبوو، حەمەی حاجی مەحمود و شەوکەتی حاجی موشیر زۆر نیگەران بوون لەم هەڵوێستەی کاک سالار عەزیز.

بەم شێوەیە هێزەکەمان ساردبوویەوە و بەدوای پاشماوەکانی هێزەکانی قیادەدا نەچووین، گەڕاینەوە بۆ دەورو بەری مەریوان هەرلەم ماوەدا بوو کەبزووتنەوەی سۆشیالیست لەیەکێتیی جیابوونەوە و چووبونە گۆرە شێر و بێ دەلان، ئاگاداری کاک شەوکەتیان کردبوو بچێت سەردانیان بکات، لەپڕێکدا کاک شەوکەت و بڕێک پێشمەرگە لێمان دوور کەوتنەوە و ماوەیەک دیار نەمان، ئێمە لەخۆ ئامادەکردندا بووین بۆگەڕانەوە بۆ دیوی عێراق، ڕۆژێک کاکە حەمە لە مرانە و ئاسناوا بوو، ئێمەش بەدوایانەوە لەبایاوا بووین، لەوکاتەدا ووتیان ئەوە کاک شەوکەت هاتەوە، چەند پێشمەرگەی ئێمەی بانگ کردە لاوەو قسەی بۆ کردن، پاشان چوو بۆماڵێک لەوێ داوای منی کردبوو بمبینێت، ئەو پێشمەرگەیەی هات بەدوامدا ناوی عەبدول ڕحمان بەچە بوو، کە چوومە ماڵەکە دیتم کاک شەوکەت ڕەنگی گۆڕاوە و شڵەژاوە، دوای چاکی و چۆنی، ووتی: ئەوە مام جەلال هەموو چەکەکانی دابەش کردووە و هەمووی داوە بەکۆمەڵەو پارەکەشی هەر بلوە بەوان، هەندێ قسە، کە لەو چاوەڕوان نەدەکرا هات بەدەمیدا بەرامبەر بە هێرۆ خان، پێم ووت کاک شەوکەت حەزناکەم ئەو قسانە بکەیت، ئەوە باش نییە، ووتی: لەهەورامان کاک غەفوور و دڵسۆزو پێشمەرگەکان لەگەڵ ئێمە دێن و هەر تۆ ماوی، وەکو دۆست پێت دەڵێم حەز ناکەم کوڕێکی ئازای وەکو تۆ پەراوێز بخرێ ئێستا بێیت باشترە، نەک دواتر، ووتم کاک شەوکەت من یەکەم کۆمەڵەم دووەم لەبەر مام جەلال یەکێتییم سێیەم هیچ زانیاری وئاگاداریەکم نییە لەبارەی ئەم جیابوونەوەوە، دوای هەندێک ووتوێژ ووتی دوای پەشیمان ئەبیتەوە...... منیش حەزم لەگوێگرتنی ئەو قسانە نەبوو، بۆیە خواحافیزیم لێکردو هاتمە دەرەوە، چوومەوە بۆ مزگەوتەکەی بایاوە بەپێشمەرگەکانم ووت ڕێکەون بابڕۆین بەرەو مرانە.

دوو پێشمەرگە لەو چەند پێشمەرگەی کاک شەوکەت قسەی لەگەڵ کردبوون ووتیان ئێمە لێرە ئەبین، یەکێکیان ناوی مەحمود خەڵکی عەبابەیلێ بوو، کەدواتر تەسلیم بوەوە، لەکیمیابارانی هەڵەبجەدا تیاچوو. خۆیان گرتە دواوە، پێم ووتن هەستن دەڕۆین، ووتیان ئێمە نایەین لێرە دەبین تاکاک غەفوور دێت، منیش تفەنگەکانم لێ سەندن و بێچەک بەجێمان هێشتن، ئێمە ڕۆشتین و گەیشتینە نیوەی هەورازەکە، گوێمان لێبوو عەبدڕەحمانە بەچەو نەجیم گردی شەریفی بانگمان دەکەن کە بوەستین، ئێمەش خۆمان لێ کەڕ کردن، کەچی چەند دەست ڕێژێکیان کرد بەسەرماندا، ئێمەش پێمان ووتن بگەڕێنەوە بانەتان کوژین، کاکە حەمە لەمڕانە کەگوێی لەتەقەکان دەبێت مەفرەزەیەکی ناردبوو بەدەممانەوە، گەیشتنە کۆتایی هەورازەکەو مەفرەزەکە هاتنە لامان و پێکەوە ڕۆیشتین و گەشتینە جێ.

چووین بەرەو لای ئەوماڵە کاکە حەمە لەوێ بوو، قسەکانی کاک شەوکەتم بۆ کاکە حەمە گێڕایەوە، پرسی ئەوتەقانە چیبوو؟ ووتم تەقەکانیش ئەوان کردیان لەسەر ئەو پێشمەرگانەی کەچەکمان کردوون، هێزەکەی لەگەڵ کاکە حەمە بوو کەوتبوونە ڕێ بۆ ئاسناواو زۆریان مڕانەیان بەجێ هێشتبوو، پێی ووتین ئێوەش بکەونەڕێ بۆ ئاسناوا، خۆی نامەیەکی بۆ کاک شەوکەت نووسی، لەنامەکەدا ئەم جوملەم هەر لەیادە، (کاک شەوکەت ئەم هەڵوێستەت باش نیە، ئەگەر دەتەوێت شەڕیش ببێت، ئەوە من و تۆ شەڕ دەکەین، ئیتر بۆپێشمەرگە بدەین بەکوشت)، لەکۆتایی نامەکەیشیدا گلەیی لەو هەڵوێستەی کاک شەوکەت کردبوو بەرامبەر بە مام جەلال و هێرۆخان، سەبارەت بەقسە نابەجێکان. ئاسناوا گوندێکی گەورەی سەر سنوورە، زۆر ئاوەدان و خۆش بوو دەکەوێتە بناری چیای ئاسنەوای نزیک پێنجوێن، بەرووی دۆڵی بوزان دا.

ماوەیەک بەر لەشەڕی دزڵی قیادە موەقەتە لەو گوندەدا هاتبوونە سەر کاک تایەری حاجی عەزیز و چەند پێشمەرگەیەکیان لێ شەهید کردبوون، لەوانە دلێرە بچکۆل، کاک تایەر و کاک مستەفای سەعەی زۆرابییشیان گرتبوو، وادەزانم هاشم ناوێکیشی تێدا شەهید بوو. ئێمە لەوێ خواحافیزیمان لەکاکە حەمەو هێزەکە کرد، لەگەڵ کەرتەکەی هەورامان گەڕاینەوە بۆ چیای پەرونی و دەوروبەری شۆشمێ، شەهید غەفووریش لەگەڵ پێشمەرگەکاندا بەجێ مابوو دواتر هاتنەوە بۆلامان، لەسنووری

هەڵەبجەو هەوراماندا کەس لەگەڵ بزووتنەوە نەچوو لەو جیابوونەوەیان دا لە یەکێتیی .

لەدوای ئەم بگرەو بەردەی نێوان ئێمەو قیادە موەقەت، هێزەکانی قیادە لە دزڵی خۆیان کۆکردەوە و بەدوای هەلکدا دەگەڕان تالە خاڵێکی لاوازەوە زەربەیەک لەپێشمەرگە و کادیرەکانی ئێمە بدەن، ئەوەبوو لەمانگی ١٩٧٨/٩ دا دکتۆر رەزا و فایەق گلاڵی و ئازاد مۆریاسیان گرت و بەدیلی شەهیدیان کردن، پێشمەرگەیەکی کەرتەکەی ئێمەشیان بەناوی محەمەد تۆفیق عەبابەیلێی کەلاوێکی خوێن گەرم بوو بەنازناوی سمکۆ، لەڕێگای نێوان نەوسوودو دزڵیدا لەناو ئۆتۆمبێلدا گرت بەبێ چەک، بردیان لەچیای دالانی بەزیندوی هەڵیان دێرا لەشاخێکەوە خستیانە خوارەوەو شەهیدیان کرد.

دوای گەڕانەوەمان لەسنووری مەریوان بۆ شارەزوورو دەوروبەری هەڵەبجە لەسەر سنوورو ناوچەی هەورامان جارێکیتر گیرساینەوە، لەوێوە دەستمان کردەوە بەکارو چالاکی خۆمان و بنکەو بارەگامان دانایەوە. تێکە لاوەیشمان لەگەڵ کوردەکانی ڕۆژهەلات پەرەپێدا.

# شێخ سێڵە و قالیجە

لەهاوینی ١٩٧٩داو لەم وەرزە پارتیزانییەدا، لەناوچەی هەورامان و لەسەر سنوورە بستۆکەکەدا ئەم دیو ئەو دیومان ئەکرد، هەندێ ژیانمان لەبارو ئاسوودە بوو بوو، چونکە وەرزی هاوین بۆ پارتیزانەکان لەباری ژیان و گوزەرانەوە باشترە، لەهەر بنداری لە هەر بنبەردێ ئارەزوومان بوایە پشوومان ئەدا، نیوەڕوان لەسێبەری دارو دەوەنەکاندا دەحەواینەوە، سازو سەنتوری باڵندەو بولبولەکان دەیان لاواندینەوە، هەوای نەسیمی دەمەو بەیانیان و شنەشنی سروەی ئێوارانیش لەسەر کانیاو ئەستێلان فێنک وەشێنیان دەکردین، بە




نزاو ئارەزووی ئێمە بوایە سێ وەرزەکەی تری ساڵیش لەم مەدارە قەتیس دەبوون. لەم وەختەدا کاتێکمان زانی مامە عەلەڕەش و مەفرەزەیەک دەرکەوتن و سەردانیان کردین، دوای چەند ڕۆژێ حەوانەوە، مامە عەلە نامەیەکی کاک مەلابەختیاری دایە دەستم کە تێدا نووسیبوی (مامە عەلی دێتەلاتان و لەوێوە دەچێت بۆ سنوری بەمۆ، لەگەڵ مەفرەزەیەکدا ڕەوانەی بکەن، ئەگەر خۆت لەگەڵیدا بڕۆی باشترە). ئێمەش لەگەڵ مەفرەزەیەک سەر لە بەیانییەک لە دەور و بەری شۆشمێوە کەوتینە ڕێ و ئێوارەکەی گەیشتینە گوندی زیی ئێناخی نشین و شەو لەوێ ماینەوە.

مامە عەلەپیاوێکی دنیا دیدەی زۆر بەڕێز بوو. لە شۆڕشی ئەیلول شیوعی بوو بوو کە ئەوێ ڕۆژێ ناوبانگ و دەوری خۆی هەبووە لە سنوری قەرەداغ و دەرەبەندیخان و گوندەکانی عەشیرەتی شەرەف بەیانیدا. مەفرەزەیەکی

حەوت کەسی لەگەڵدا بوو، ئەمانیش وەکو فەرماندەکەیان ڕۆح سووک و دڵسۆزبوون، منیش لەگەڵ مەفرەزەیەکدا کەپێکهاتوو بوو چەندین پێشمەرگەی ئازاو قارمان لەوانە شەهید عەلی مجید ناسراو بە هێمن، شەهید ئەفراسیاو هاواری، نەجمەدین عەزیز، هێرش حەمەسالح، ڕزگار و فەیسەڵ.... تاد، لەگەڵیان ڕۆشتین، لەڕێگە شەهید حسێنی مەجیدی مەلاحامدی کۆکۆیمان پێگەشت، مامەعەلە داوای لێکرد ئەویش لەگەڵمان بێت پێکەوە جەولەیەک بکەین و ئەوان گەیشتنە جێ ئێمە بگەڕێینەوە، بووینە قوەتێکی بیست کەسی.

دوو ساڵ دواتر شەهید عەلی مەجید هێمن لەگەڵ مەفرەزەیەکدا کە شەهید فاتیح ئێناخی، ئەنوەر بامۆکی، شەهید سالحی مەجیلان و نەجیم بامۆکی بوون، لەشەوی ١-١٩٨١/٦/٢ بۆ چالاکییەک ئەچوونە ناو شاری هەڵەبجە، لە کانی شێخی گوندی بامۆک کەوتنە کەمین و هێمنیان بەبریندادی بەجێهێشت، هێمن ئازایانە شەڕی کردبوو دوای ئەوەی فیشەکی پێ نامێنێت بە برینداری دیل دەکرێت، ڕۆژی ١٩٨١/٦/٢ ڕژێم بە سەیارەیەکی ئیسعاف و بە پاسەوانی مەفرەزەیەکی جاش و دەستگا ئەمنییەکان هێمنیان لە هەڵەبجەوە بۆ سلێمانی دەگواستەوە، لە ڕێکخستنەوە هەواڵ درا بە پێشمەرگە، بۆیە لە دەشتی شارازوور و لە نزیک ئاوایی گردەنازێ نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ مەفرەزەیەکی پێشمەرگە کەمینیان دانایەوە بە هیوای ئەوەی هێمن ڕزگار بکەن، بەڵام ڕزگار نەکرا و دووبارە هێمن بریندار بوەوە و چەند جاشێکیش کوژران، دواتر هێمن لە زیندان دوای ١٤ ڕۆژ مانگرتن لە خواردن گیانی لەدەست دا و چووە کاروانی شەهیدانەوە.

لە دوای ئاوایی زیی، پێکرا ئاواییەکانی هێرتا و مەڕەخێڵمان خستەپشت سەر تا دڕۆڵە، جادەیەکی پێچەڵ پێچ و دوور و درێژمان بڕی و لەپردی لێڵە پەڕینەوە و بناری چیای بێزەڵ لە باوەشی گرتین. بێزەڵ چیایەکی بەرز و جەنگەڵدارە، وشک و بێ ئاوە، هێڵی سنوری عەشیرەتی ئیمامی و تاوگۆزییە. ئەو ڕێگا سنووریەی دەمان پێوا لە سەردەمی شای ئێراندا قەسری شیرینی گرێ دەدا بە سنوری مەریوانەوە. ئەم ڕێگایە بە ناوەڕاستی سنووری هەرسێ عەشیرەتی ئێناخی، ئیمامی و تاوگۆزیدا تێدەپەڕێ، کە ئەم سێ عەشیرەتە لە هەردوو دیوی کوردستانی باشوور و ڕۆژهەڵاتدا نیشتەجێن. دوای ئەو سنوورە بە ناوەڕاستی سەرزەمینی هەورامی نشیندا قەسر و مەریوان بەیەکەوە دەبەستێت.

گەشتینە داوێنی چیای بێزەل، ماندوبوون تینی بۆ هێنابین، باش بوو لۆرییەک کە ئێرانییەکان پێی دەڵێن (خاوەر) هاتوو ڕامانگرت، بێپرسی شۆفێرەکە هەمووومان سواربووین، دوای دوو ڕۆژ برینی ڕێگا بەپێیان چی لەوە خۆشترە بە ئۆتۆمبیل بچیت بەرەو مەنزڵ؟

دوای نیو کاتژمێر ڕێگەبڕین، چەند چەکدارێک بەگردێکی بەرامبەرمانەوە دەرکەوتن، لێمان دانیشتن و دەستیان کرد بە تەقەکردن. مامەعەلە بانگی ئازادی کوڕی و حەمە سەعیدە قەڵەوی ئەوبەری کرد و پێی ووتن: خۆتان بگەیەننە ئەو تەپەی بەردەمتان و بە بڕنەو تەقەیان لێبکەن. شەڕ دروست بوو، ئەوان شانبە شانی ئێمە دەچنەپێش و ئێمەیش بە دەستی چەپدا هەڵدەکشێین. جار جار بە تفەنگی ژ / ٣ و بڕنەو تەقەیان لێدەکەین، چونکە ماوەکەمان لە حوکمی کلاشینکۆفدا نەبوو.

دوای عەسر لێک دوور کەوتینەوە، ئێمە گەشتینە گوندی قاڵیچەی باوەجانی نشین و چەکداری ئەو عەشیرەتە هاتن بەدەممانەوە، ئێمەیان دابەشکرد بۆ حەوانەوە و خۆشیان لەدەوروبەری ئاواییدا دامەزران، خەڵکیان نارد بە دوای کوێخا بارامدا ئەویش بە سواری ماینە زەردەوە هاتە لامان. لەم سەر و بەندەدا هۆز و تیرەکان لە کوردستانی ڕۆژهەڵات زۆربەیان چەکدار بوون، بەچەکی هێزە چەکراوەکانی ڕژێمی شا.

شەو لە سەربانێک جێگەیان بۆ چاککردین، چەکدارەکانی ئەوان لەگەڵ پێشمەرگەکانی خۆمان پێکەوە پاسەوانی و کەمینی دەوری ئاواییمان دانا. هەندێ لە خەڵکەکە بەناو دێدا دەهاتن و دەچوون و جارجاریش قسەی بەرز و نزم ئەکرا، هەڕەشەی ئەوەیان دەکرد تاوگۆزییەکان چۆن تەقەیان لە میوانی ئێمە کردووە؟ یا چۆن دەتوانن تەقە بەڕووکاری باوەجانیدا بکەن؟

سبەینێ هەستاین و بە کوێخا باراممان ووت ئەچین بۆ بناری بەمۆ، حیکایەتی نامە نووسینەکە و ڕێگرتنەکەی ئەوانمان بۆ باس کرد، چەند چاو ساغێکی لە خزمانی باوەجانی لەگەڵماندا نارد و هەندێکی تر بەرەو ناو قووڵایی خاکی ئێران ڕۆیشتین تا لە لایەکەوە کە دوور بین لە شێخ سێڵە تێپەڕ ببین، گەیشتینە سەر ئاو و چۆمێک کە ئەوە دواخاڵی قەڵەمڕەوی خۆیان باوەجانی بوو، ئیتر ئەوان گەڕانەوە. کات گەیشە نزیک نیوەڕۆ، دیسان تووشی تەقە و لێکدانی دوور بە دوور بووینەوە. ئەمجارە کوێخا بارام بە خۆی و چەند چەکدارێکەوە هاتنە لامان و بڕیاردرا لەگەڵ ئەوان بگەڕێینەوە بۆئاوییەکانی باوەجانی وبەیانی مەسیری ڕێگەمان بگۆڕین.

بە ناو عەشیرەتی باوەجانیدا بڕۆین تا بگەینە سنوری قەڵخانی نشین، لەوێوە بڕۆین بەرەو دەربەند دەقۆڵ. ئەو شەوەش گەڕاینەوە لەگوندی کیسەڵە ماینەوە چەند ڕۆژێک دواکەوتین. پاش ئەوە درێژەمان بەڕێگەدا تا گەشتینە قولقوڵەو دەشتی ور.

لەم گوندانەدا هەندێ جار پێیان دەگووتین: ئەرێ ئەوە شوانییەک، گاوانییەکتان دەست ناکەوێ بیکەن؟ ئەمە ئێوە خەریکی چین؟ یەکەم جارم بوو ئەم ناوچەیە ببینم و خەڵکانێکی هەژارو سادە و دواکەتووی بەو چەشنە لە ناوچەکانی کوردستاندا کەمە، خەڵکانێک دەستی شارستانییەتیان پێ نەگەشتبوو، دوور بوون لە هەموو ژیارێکی نوێ نزیک بوون لە هەموو دەردە کۆمەڵایەتیەکان. هەندێ لە گوند نشینەکانمان ئەدی کاتی خەوتن مەڕو بزنیان دەکردە لای سەرووی خۆیانەوە، واتە لە هەیوانەکەدا دادەنیشتن و مالاتەکەیان لای ژوورەوە. کە دەمان پرسی بۆ وایە؟ دەیانگوت ئەگەر وانەکەین ئەوا قەڵخانییەکان بە شەو ئاژەڵەکانمان دەبەن. نیوەڕۆیەک لە گوندێکدا خواردنی خورما و ڕۆنیان بۆ ئامادە کردین، ئەوە یەکەم جار بوو ببینم خورما و ڕۆن دۆشاوی تەماتەی بە خامی بەسەردا بکرێت، یان خورماکە ناوکەکەی هەر لەناودا بێت، کاتێک کە سنوری عەشیرەتی باوەجانیمان بە جێ هێشت، ویستمان بە ناو قەڵخانییەکاندا بڕۆین، ئاگادارکراین کە قەڵخانییەکان خۆیان ئامادە کردووە شەڕمان بکەن و شڕمان بکەن. بۆیە دواجار گەڕاینەوەو ناچار بەنهێنی چووینە قەڵای جوانڕۆ و لەوێوە گەڕاینەوە بۆ ناوچەی هەورامان و سەفەرەکەمان سەرکەوتوو نەبوو. هۆی سەرەکی ئەمەش نامەکەی مامەعەلە بوو.

کاتێک کەجەماعەت نامەکەی مامە عەلەیان خوێندوەتەوە زانیان ئەمانەوێت بڕۆین بەرەو ئەمۆ خۆیان ئامادە کرد و ڕێگەیان لێ گرتین، سەرەڕای ئەوەش ئاگاداری تاوگۆزیەکانی دیوی ئێرانیان کردبوو وتبویان، ئەمە ئەوانەن کە شەڕی کانی ژنانیان کردووە و دێنە سەرتان، ئەوانە جاشی عێراقن، بەقەڵخانییەکانیشیان وتبوو ئەمە ئەوانەن کە ساڵی ١٩٦٩ کوڕەکانی ئێوەیان کوشت لە نزیکی هەڵەبجە مەبەستیان شەڕی جەلالی و مەلایی ساڵی ١٩٦٩ بووە، ڕێگەیان مەدەن و شەڕیان بکەن و خاکی تاوگۆزی و قەڵغانییان لێ حەرام کەن، ئەمە نامە هەنگوینییەکەی مامە عەلە بوو، ئەگەر مامە عەلە ئەو نامەیەی بۆ ئەوان نەناردایە، ئەوان

زةنطة وا بة ئاسانى رِي ئَطةيان لة ئي ئَمة ئَطرتبا..

## پاداشی کاڵکاڵ درایەوە

دوای رووخانی رژێمی پاشایەتی ئێران ئەو دەرو دەرگایەیی لێمان کرایەوە، ئێمە چاوەڕێی زۆرترمان ئەکرد، ئەوە جگە لەوەی لەڕوی سیاسیەوە بووینە دەستە برای راستەقینەی کوردەکانی رۆژهەلات. بەهیوای ئەوەی ئەوان لەگەڵ رژێمی نوێدا مافێک بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن کەبۆ تێکڕای کوردستان جێگای ئومێد دەبێت، ئێمەی هاوکار و هاوسەنگەرو هاوهەستیشیان خێرو بەرەکەتی باشی لێ بینین. بەڵام بە داخەوە بەپێچەوانەی هەستی هەموو کوردێکی پاکەوە کەش و هەوا سیاسیەکە بەو ئاقارەو رێگەدا نەگۆڕا و نەڕۆیشت کە هەموومان خوازیاری بووین. خەڵکانێ هەبوون لە ناو رژێمی نوێدا، کۆسپ و تەگەرەیان دەهێنایە سەر رێگای کاروانە شۆڕشگێڕیەکەو نەیان دەهێشت دانووستانەکانی کورد – دەوڵەت بەرێگای راستی خۆیدا بڕوات.

لە سەردەمی رژێمی پەهلەوی ئێراندا، هێزەکانی قیادەی موەقەتە بنکە و بارەگاکانیان لە ناو ئێراندا بوو، لەسنووری ئێمەدا لە هەورامان، دزلێ، کانی خەیاران، کەیمنە و بێرواس لە سەرسنوور، لەناو هەورامانی سەر بە کوردستانی بەشی رۆژهەلاتدا بوون، کە لەلایەن هەژار و مەلامحەمەد و نادر هەورامییەوە سەرپەرشتی دەکران. لە سنوری بەمۆش لەشێخ سێڵە کە ئاواییەکی تاوگوزی نشینی کوردستانی رۆژهەلات دا بوون، ئازاد قەرەداغی و قادر حەمەسالح رەشید، لەوێ بەرپرسیان بوون.

هێزەکەی لای هەورامانیان هەندێ جار هەلیان بەدەست دەهێنا و خۆیان دەکرد بەدیوی عێراقدا بۆ لێدانی پێشمەرگەی ئێمە، وەک شەهیدکردنی دکتۆر رەزا و فایەق کەلالی لەچیای سوورێن و دواتر سمکۆ عەبابیلێی لەچیای هەورامان وئەحمەد گریانەیی لە چیای پەروونی...... تاد.

له دوای شەڕی دزڵی و گەڕانەوەی ئێمە بۆ دیوی عێراق قیادە موەقەتە بە شێکیان گەڕانەوە بۆ دزڵی و بەشێکیان لە سنوری ھانەگەرمڵە مابوونەوە. سوپایی ڕزگاریش خەریکی خۆڕێکخستن و تەشکیلات و کۆکردنەوەی ھێز بوون. ھێزەکانی پارتی ئەوانەی لە دزڵی و دەورو بەریبوون، کەوتبونە بارودۆخێکی خراپەوە، چونکە مەترسی ئەوەیان ھەبوو سوپای ڕزگاری بەھاوکاری جاشەکانی عێراق لێیان دەن چەند جاریش پێکدا ھەڵپژان و چەند پێشمەرگەیەکیان شەھید کردن، ئەو ماوە بەشێک لەھێزەکەی ھەورامان لەگەڵ ئێمە لەھەولێر و لەناوچەی خۆشناوەتی بووین.

لەڕێکەوتی ٥/ ٦/ ١٩٨٠ دا لەلایەن حزبی دیموکراتەوە بە ھەژدە ئۆتومبێلی دەبڵ کابینە ھێزکەی پارتی لە ھەورامانەوە، گوازرانەوە بۆ ناوچەی شێخ سێڵە و ئەزگڵە. ئەمەیش بە مەبەستی ڕزگارکردنیان بوو لەدەست سوپای ڕزگاری و لەو بارووردۆخە ناھەموارەی تێیکەوتبوون و دابڕابوون. ھاوکاریکردن و گواستنەوەکەش ئارەزوێکی کەسیەتی بوو، لەلایەن حەمە سەعید کاڵکاڵەوە، چونکە کاڵکاڵ خزمی نەسرەدین ھەورامی و دۆستی نادر ھەورامی بوو، لەولاشەوە سوپای پاسداران خۆیان لە سنوری شێخ سێڵەو ئەزگڵە دا پتەو کردبوو، ئەوھێزەی ئەوێشیان مەترسی لەسەر نەبوو، بۆیە ئەمانیش ڕۆیشتن و گەیشتنەوە لای ئەوان.

لەم سەرو بەندەدا کەزۆربەی ھێزەکەی ھەرێمی (یەک)ی شارەزوور، بەگەشتێکی سیاسی و سەربازی چووبوینە سنوری ھەولێر، بەڕۆشتنی پارتی بۆلای ناوچەی تاوگۆزی و بەجێھێشتنی ھەورامان، پاشماوەی ھێزەکەشمان لە بناری سوورێن و ھەورامان مەترسی پارتییان لەسەر نەما .

پاش ماوەیەک ھێزەکەی پارتی لەئەزگڵە و شێخ سێڵە لەڕێی سوپای پاسدارانەوە ڕەوانەی کرماشان کران و لەوێشەوە بەفڕۆکە گوازرانەوە بۆ شاری سنە بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە ناوچەی مەریوان. بەڵام ئەوە نەدەکرا، چونکە جادەی سنە – مەریوان بە دەست ھێزەکانی دیموکرات و کۆمەڵەو سوپای ڕزگاریەوە بوو، لەبەر ئەوە گواستبونیانەوە بۆ ھەمەدان و تاکستان و لەوێوە بۆ تەبرێزو ورمێ و چوونە ناوچەی ڕاژان کە بنکەی سەرەکی سەرکردایەتییان لەوێبوو.

پارتی لەم ماوەیەدا تەواو شپرزە بوو بوون و لەلێواری هەلوەشاندنەوە دا خۆیان ڕاگرتبوو. دەیانویست هەر چۆن بووە بنکەو بارەگا بێننەوە نزیکی سنوورەکانی پارێزگای سلێمانی. واتە ناوچەکانی سیوەیل، سوورێن، هەورامان، شەمێران و تاوگۆزی.

کاتی خۆیشی واتە مانگی شەشی ١٩٨٠ حەمەسەعید کالکال کەپێشتر بەرپرسی ناوچەی هەورامان-جوانڕۆ بوو، کاک نادر هەورامی و هێزەکەی گواستنەوە بۆ ئەزگلەو شێخ سێڵە، لەسەرکەردانی ڕزگاری کردن، کالکال کرایە ئەندامی کۆمیتەی شارستانی مەریوان و بنکەی سەرەکی لەدزلێدا بوو. بەلام هەرکە کاک نادرو هێزەکەی لەمانگی یازدەی ١٩٨٠دا لەڕاژانەوە گەڕانەوە بۆ سنەو پاشان بۆ مەریوان، لەوێشەوە بەهاوکاری سوپای پاسداران گەڕانەوە بۆ دزلی، لەشەوی ٨ لەسەر ٩/ ١٢/ ١٩٨٠ هێرشیان کردە سەر دزلی و حزبی دیموکراتیان تێدا دەرکرد. لەم شەڕەدا چاکەی پیاوەتیەکەی کالکالیان دایەوە، چۆن...؟؟ بەگرتنی کالکال و ڕادەسەتکردنی بە برادەرانی سوپای پاسداران، ئەحمەدی و قوچەلی.

ئەم شەڕە بەهاوبەشی پارتی و پاسداران کرا بۆسەر ئاوایی دزلی. سوپای پاسداران لەبیەکەڕەوە بەجادەو بەدەربەندەکەدا کەوتبوونە ڕێ و پارتیش بەکێوەکاندا گەشتنە سەر دزلی و لەشەڕێکی نابەرامبەردا حزبی دیموکراتیان دەرپەڕاند. پاداشتیشیان بۆ حەمەسەعید کالکال ئەوە بوو، بەبرینداری دەیگرێ و ڕادەستی پاسداران دەکرێ و مەرگ دەبێتە چارەنووسی. لەم شەڕەدا شەش پێشمەرگەی کۆمەلە لەناکاو لە دەربەندەکەدا بەماشێنێکی سواریەوە دەکەونە بۆسەوە، چارەنووسی ئەمانیش گولە باران کردن بوو، ناسری مستەفا سولتانیش نەخۆش بوو لەمالی خزمەکانی لەدزلێدا دەریان هێناو ئەویشیان گولله باران کرد.

ڕێنوێنی هێزەکەی پارتی کە لەکێوەکانەوە دابەزیبوونە ناو دزلی چەند چەکدارێکی سنوری مەریوان بوون، پێشمەرگەی موسولمان، لەژێر فەرماندەی دوو پاسداردا بەناوەکانی ئەحمەدی و قوچەلی. لەگەل ئەم شەڕەدا لە دەوربەری گوندی دەمەیۆو دەرەکێ دیموکرات و سوپای ڕزگاریش لەیەکتر کوشتن و بریندا بوون. لە ناو دزلێدا جگە لە حەمەسەعید کالکال چواردە پێشمەرگەی دیکەی دیموکرات بوونە قوربانی، ئەوانیش لەناو

سەیارەیەکی گەلابەدا ئەبن و بێئاگا خۆیان ئەکەن بە ئاواییدا. نزیکەی دوازدە کەسێکیشیان بەدیل دەگیرێن. لەهێزەکەی پارتیش عەلی سۆفی دەبێتە قوربانی .

حەمە سەعید کالکال[1]، بەبریینداری لەناو کادانێک دەگیرێ، ئەویش دەڵێ بمگەیێننە لای نادرو نەسرەدین هەورامی تابەهانامەوە بێن، چونکە پیاوەتی زۆرم کردووە لەگەڵیان. مەنسور حەمەشەریف کەئەوکات پێشمەرگەی پارتی بووە، دەڵێت: کالکالمان لە کادانێکدا بە برینداری هێنایە دەر، ویستمان بیبەین بۆ لای کاک نادر، بەڵام چەکدارە کوردەکانی مەریوان ناسییانەوەو گوتیان ئەوە کالکالە چۆن درۆمان لەگەڵ دەکەن؟ بەڕاکردن چوون ئەحمەدی و قوچەلییان بۆهێنایەن و لەدەستیان سەندینەوە. ئێمەش زەبوونانە هیچمان پێنەکرا، پێشمەرگەیەکی تری پارتی کەلەو شەڕەدا بەشدار بووە ئەڵێت: کالکال قۆڵی بریندار بوو کاتێک ویستیان بیکوژن، ووتی مەمکوژن من ئیمام خومەینی ئەمناسێت، بەڵام لەبەر ئەوە پاسدارەکان لێیان کوژرابوو هەرلەوێ کوشتیان. پاش شەڕی دیموکرات هەر ئەم هێزەی پارتی و پاسدار شەڕی سوپای ڕزگاریشیان[2] کردو لەناوچەکەدا دەریان کردن و سنووری دزلی و هەورامانی تەختیان خستنە ژێر دەستی سوپاوە.

[1] – کاتێک ئیمام خومەینی لەعێراق دا پەنابەر بووە، حەمەسەعید کالکالیش لەعێراق بووەو هاتوچۆی کردوەو پەیوەندی هەبووە، بۆیە ئەودەم برادەرانی پارتی ئەیانووت کالکال ووتویەتی مەمکوژن من پەیوەندیم بەئیمامەوە هەیە. گوایا جاسوس بووە لەناو دیموکراتدا، پارتی ئەمەیان بۆیە بلاو کردەوە بۆ پۆشینی ئەو هەنگاوەیان(تەسلیم کردنی کالکال) ئەوکات. ئەگینا کالکال کوردێکی پاک بوو.

[2] – سوپای ڕزگاری ئەو تەشکیلاتە چەکدارییە بوو کەلە ناوچەکانی هەورامانی بەشی ڕۆژهەلاتدا لەدوای دروستبوونی شەڕی عێراق و ئێرانەوە لەلایەن کوڕەکانی جەنابی شێخ عوسمانەوە دروستکرا، لەڕووی ژمارەشەوە لەماوەیەکی کەمدا بوون بەهەزاران کەس. چەکوچۆڵەیان لەلایەن عێراقەوە پێدرا، لەجێگەی خۆیدا وردتر ئەمەمان باسکردوە، لێرەدا مەبەستمە بڵێم ئێمە وەک یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەرچەندە لەسەرەتاوە هاوکاریمان کردن، وەیەکێک لەفەرماندەکانی ئەوسەردەمە شەهید شەوکەتی حاجی موشیر بوو نێردرابوو بۆ هاوکاری و ڕێنوێنیان وەک فەرماندەی یەکەمی سەربازیان کاری لەگەڵدا دەکردن.

بەلام کە کۆمەڵە چەکی کردن، ئێمە پێشتر ئاگاداربووین، لەهاوکاری کردنیان کشاینەوە چوونکە بەمەترسیمان ئەبینین بۆسەر خەباتی کوردایەتی لەڕۆژهەلاتدا، ئەم هێزە زوو پوکانەوە، لەدوای ئاگربەست و ڕێککەوتنی ئێران و عێراق لەساڵی ١٩٨٨دا، ئیتر بەیەکجاری هەڵوەشانەوە. بەلام دواترو دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١، ئێمە دۆستیان بووین و هاوکاریشمان کردن وەک ڕێبازی تەسەوف، مام جەلال بۆخۆی ڕێزی تایبەتی هەبوو بۆجەنابی شێخ، دوای فەوتیشی چەندین جار مام منی ڕاسپاردوە کە ئاگام لێیان بێت وهاوکاریان بکەم لەسنوورەکەدا، تائەو ڕادە مام جەلال خۆی پەیامێکی نوسراوی ئاراستەی مەلبەندو کۆمیتەکانی یەکێتی کردوە، لەوێدا دەڵێت: مەڵبەندو کۆمیتەکانتان بارەگاو تەکیەی موریدو مەنسوبانی حەزرەتی شێخن.

لەبەرامبەریشدا هەڵوێستی برادرانی پارتی لەسەر بنەماڵەی شێخ دژایەتی کردن و بەئاشکراش لەسەر شاشەی تی ڤی بەجاش و خۆفرۆش و جاسوسی عێراق ناویان ئەبردن، ئەم ڕاو بۆچوون و هەڵوێستەی پارتیش لەسەریان لەلایەن مەلا محەمەد بەرپرسێکی بالای ئەو لایەنەوە لەساڵی ٢٠١٥دا دووبارە لەشاشەی (تی ڤی) تەئکیدی لەسەر کرایەوە.

هاوکاری و دۆستایەتی ئێمە لەڕووی سیاسیەوە بۆ ڕێبازی تەسەوف بووە، بەرامبەر بەئیسلامی سیاسی، ئەگینا ڕۆژێ لەڕۆژان ئێمە هیچ داواکاریەکمان لەهیچ کەسی سەربەم ڕێبازەش نەبووە، هەتا لەبەرامبەر ئەو هەموو هاوکاری و یارمەتیدانەیان داوای دەنگێکمان لەهیچ هەڵبژاردنێکدا لێنەکردوون، لەم نێوانەداو لەبەرامبەر ئەم دوو هەڵوێستە جیاوازەدا، سەرپەرشتیاری نوێی ئەم ڕێبازە، یان ڕوونتر بڵێم جەنابی دکتۆر مادح، کوڕی جەنابی شێخ عوسمان، موریدو مەنسوبانی سنووری هەورامان و شارەزور لەدوای مانگی ٩ساڵی ٢٠١٥وە بەجێ ئەهێڵی و ئەگوازێتەوە بۆ هەولێر، چکات؟ ڕاست لەدوای ڕاگەیاندنی هەڵوێستەکەی پارتی بەرامبەریان.

لەڕۆژی ٢٠١٥/١٢/٧شدا نامەیەک بۆ کاک مەسعود دەنێرێت و لەو نامەدا دەڵێت: هاوکاریمان بکە بۆکردنەوەی خانەقاو بەڕێوەبردنی ئوموراتمان لە هەولێر، ئێمە لەسەر هەڵوێستمان سلێمانیمان بەجێهێشت و بەیەکجاری هاتینە هەولێر، چونکە بێئەدەبیمان بەرامبەر کراوە. گوایا دکتۆر لایەنگری مانەوەی سەرۆکی هەرێمی کردووە، لەسەر ئەوە دژایەتی کراوەەو بەقەولی خۆی، بێئەدەبیش، دەقی نامەکە لەلای من پارێزراوە حەزم نەکرد لەبەڵگەنامەکاندا دایبنێم لەبەر حورمەتی بنەماڵەی شێخ، چوونکە هەندێک شتیتری تێدایە.

دیارە ئەمە هەڵوێستی هەڵەی ئێمە دەسەلمێنێ بەرامبەر بەدکتۆر، نەک بەرامبەر بەتەسەوف، ڕاست و دروستی بۆچونی پارتی و قسەکانی مەلامحەمەد لەسەر خۆیان ئەسەلمێنن، دەی کەوابوو تاوانبارو هەڵەکەر یان لەگەڵ ڕێزمدا بەقەولی ئەولایەنە

# بە حەق یان بە ناحەق

لەدوای دروست بوونەوەی شۆڕشی نوێ و هێزی پێشمەرگە لە ١٩٧٦/٦/١دا، مەفرەزەکان سەرەتا بۆ خۆناساندن تاماوەیەک دەستیان کرد بەگەڕان بەئاواییەکاندا، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ترساندنی ئەوانەی بوبوون و ئەبوون بەدار دەست و پیاوی ڕژێم، بەتایبەت بۆپەشیمان کردنەوەی ئەوانەی هاوکارو یارمەتی دەری دام و دەزگا ئەمنی و جاسووسیەکان بوون، یەک جار ئاگاداریان ئەکردنەوەو ئامۆژگاری ئەکران دەست لەوکارەیان هەڵگرن، دوای ئەوە، لەلایەن ئەو مەفرزانەوە بڕیاری بەسزا گەیاندن و ئیعدامی شۆڕش گێڕانە ئەدرا بۆ ئەوانەی بەردەوام ئەبوون لەسەر ئەوکارەیان، چونکە ئەم بەبەعسی بوون و هاوکاری کردنەی بەعسیەکان لە دوای کۆتایی هاتنی شۆڕشی ئەیلولەوە بووبو بە (دیاردە) باو.

لەو شوێنانەدا کەسەرەتا دەستی پێشمەرگەی ئەگەیشتێ، چەندین کەس بەسزای مەرگ سزا دران، جگە لەوەش ڕژێم هەوڵی ئەدا خەڵک بکات بەجاش و جاسووس جاروبار لێرەو لەوێش خەڵکی ئەنارده ناو مەفرەزەکان بەجاسووسی بۆ وەرگرتنی زانیاری یان شەهیدکردنی پێشمەرگە و بەرپرسەکانیان.

---

خۆفرۆشان، دەبێ بۆ داوای لێبوردن چووبن، لەوکاتەدا ئیتر گلەییان لەسەر نامێنێ لەلایەن ئێمەوە.

من بۆخۆم ڕێبازی تەسەوف هەروەک ئەودەمە دەبینم وەتەماشا ئەکەم کەڕێبەرانی ڕاستەقینەی ڕێبەرایەتیان کردوە بۆ خزمەتی دین و خاک و خەڵک، ئەوان کۆچیان کردو گەڕانەوە بۆبارەگای باری تەعالا، هیوادارم لەدوای ئەوان ڕێبەرێکی شایستەو شیاو بتوانێ ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ.

تا لەداهاتوودا بتوانن وەک ڕابووردو خزمەتی زیاتر بەکۆمەڵگەی کوردەواری بکەن، خزمەتی عیلم و زانست، تەریقەت و شەریعەت و دین و خاک و ئاو هەموو جوانیەکانیتر.

لەساڵی١٩٧٦وە تاساڵی ١٩٨٣ لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا سەدان کەس بەتۆمەتی جیاجیای هاوکاری و جاسووسی بۆ ئەم ڕژێمەی بەعس کوژراون، بەحەق یان بەناحەق، لەوانەیە لەناو ئەمانەدا بەدەیان خەڵکی بێتاوانی تێدا بووبێت، چونکە نەدادگا هەبوو نەلێکۆڵینەوەی ڕێک و پێک، هەموو بە بڕیاری تاکەکەسی و حکومەتە چکۆلەکان بەقەولی م.پشکۆ نەجمەدین..

قیادەی موەقەت و حیزبی شیوعی و سۆشیالیستیش لەو بەحەق یان بەناحەقەدا بەشدارن، بەڵام بەڕێژەی کەمتر لە یەکێتی، قسەیەک هەیە سەرەتا شۆڕش کوێرانە هەرکەس کوێخای ئاواییەکان یان شارەکان بووبێ کوشتویانە، ئەوە ڕاست نییە، بەڵام ئەوەڕاستە حکومەت سەرەتا ئەوانی ناچار ئەکرد کەئەبێ هەرکەسی نەناسراو یان بەقەولی ئەوان موخەڕیب هاتنە ئاواییەکان یان شارۆشارۆچکەکان ئەبێ خەبەریان لێبدەن، بەڵێ ئەوانەی ئەو بڕیارەی بەعسیان جێبەجێ کردبێ و بەردەست کەوتبێ کوژراون.

ڕاستە خەڵک بە هەڵە کوژراوە، بەڵام ئەوە ڕاست نییە مەفرەزە نێردراوە بۆ کوشتنی عومەر ناوێک چوار عومەرناویان کوشتبێ ئینجا گەیشتبنە عومەری تاوانبار. لێرەدا ئەوەندەی لەبیرم بێت لیستی ناوی ئەوجۆرە کەسانە لەسنووری هەڵەبجەدا لەسەر ئەم مەسئەلە کوژراون ب لاوەئەکەمەوە. چەند ناوێکی ناو ئەم لیستە لەبابەتە جیاجیاکانی تری ناو کتێبەکەدا ناویان هاتووە، چەند ناوێکیش هەن لێرەدا ناویان نەهاتووە، بەڵام لەناو بابەتەکاندا یان لەپەراویزەکاندا ناویان هاتوەو هەیە. ئەمەش لیستی ناوی بەشێک لەو قوربانیانەیە لەسنووری هەڵەبجەدا لەساڵەکانی١٩٧٧تا١٩٨٣ کوژراون.

١-تەوفیقی موختاری هەڵەبجە، لەهەلەبجەدا کوژراوە بەتۆمەتی بەعسی بوون هاوکاری کردنی ئیدارەی ئەمنی شارەکە.

٢-جەمیلی ئاغا جەعفەر، لەبابەتی لە(چالاکیەکەدا بەشدار بووم) بەووردی باس لەچۆنییەتی کوشتنەکەی کراوە، ئەم پیاوە خەڵکی تەوێڵە بوو پاسەوانی دارستان بوو، مام جەمیل و حەسەنی حەمەسەلیم ئەویش خەڵکی تەوێڵەو پاسەوانی دارستان بوو پێکەوە کوژران، پێشمەرگە ئەچنە هاوار لەوێ خەڵک شکاتیان ئەکات، ئەڵێن خەڵووزو دار فرۆشی ئەکەین عەزیەتمان ئەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا تۆمەتی بەعسی بوونیان لەسەر بوو.

٣-حەسەن حەمەسەلیم، تەمەنی نزیک بەحەفتاساڵ بوو، لەشەوی ١٩٧٧/٥/٢ لە تەوێڵە لەگەڵ مام جەمیل گیران و لەنێوان تەوێڵەو سۆسەکاندا کوژران.

٤-حامد عەبدلخالق سەعید خەڵکی ئاوای بەڵخەی ناوچەی هەورامان بوو، پیشەی کوتاڵ فرۆشی بوو بەکۆڵ ئەگەڕا بەئاواییەکاندا، ساڵی ١٩٧٧ کوژرا بەتۆمەتی جاسووسی.

٥-حەمەڕەشید دەرویش عەبدوڵلا خەڵکی ئاوایی پریس لەناوچەی نەورۆلی ئەم پیاوە ڕێکخستنی یەکێتیی بوو راپۆرتی لەسەر درابوو گوایا لەژێرەوە پەیوەندی بە حکومەتەوە هەیە، کوشتنی ئەم پیاوە کێشەی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا، مەلاڕەسولی کوڕی مام سالح پێشمەرگە بوو دوای ئەوە تەسلیم ئەبێتەوە ئەچێتە لای خزمانی حەمەڕەشید پاکانە ئەکات کەدەستی لەکوشتنیدا نییە، دوای ماوەیەک مەلاڕەسووڵ لەناو مەزرادا شەو چەند کەس شەهیدی دەکەن برایەکی بچووکی لەگەڵیدا ئەبێت بە بکوژەکان ئەڵێت ئەتان ناسم ئەویش شەهید ئەکەن، خزمەکانی مەلاڕەسوڵ ئەمە بەدەستی ماڵی حەمەڕەشیدی ئەزانن، ئەوانیش چوون ساڵحی برای حەمەڕەشیدیان کوشتەوە، خزمەکانی حەمەڕەشیدو ساڵح لەباتی ساڵح ڕۆستەمی برای شەهید عومەر چاو جوانیان کوشتەوە لەگەڵ محەمەد قادردا، دوای ئەوانە هەرئەم جەماعەتە واتەخزمەکانی حەمەڕەشید کە چەکداری حکومەت بوون لەمەفرەزەی تایبەتدا، عەبدوڵلای حەمەی سەلیم و دووکوڕیان بەناوەکانی سەلاح وسەلام کوشت، عەبدوڵلا ئامۆزای مەلا ڕەسولە.

٦-تاهیرە شەل تاهیر تەوفیق ئەم کوڕە هات بۆ پێشمەرگایەتی گومانی لەسەر بوو، نارنجۆکی (ڕومانە) دەستیان دایە بیبات لەناوشاری هەڵەبجە بیخاتە نلو ئیدارەی هەوالگری، بردی و ڕۆیشت تەقاندیەوە، کەهاتەوە وەرگیرا لەشارەوە دووبارە هەواڵ هات وتیان: تاهیر هاتوەتە ناوشارو پەیوەندی کردووە بەوشوێنەوە کەناردوویەتی پێی وتوون پێشمەرگە وەریان نەگرتووە و نارنجۆکیان داومەتێ بیتەقێنمەوە، ئەوانیش لەهەوالگری ژوورێکی چۆلیان بۆدیاری کردووە نارنجۆکەکەی فرێداوەتە ناوی، تاهیرگیرا لەژێر ئەشکەنجەدا وتبووی بەڵێ حکومەت ناردوومی، داوای لێکرا ئەبێ ناوی ئەوکەسانەمان بدەیتێ کەلەناو ئێمەدان واتە لەناو پێشمەرگەدا وئیش بۆ حکومەت ئەکەن. ئەویش ناوی شەهید ساڵحی مەجیلانی دابوو، ساڵحیش ئەشکەنجە درا زۆر

خراب، بەلام ووتی تاهیر درۆ ئەکات، نازانم چیبوو چۆن بوو، ڕۆژی تەواو نەبوو بوو سالح نەکوژرا، چونکە ئەوسەردەمە وابوو هەر بەحال یەکێک بیوتایە فلان پیاوی بەعسە تەواو نەشکوژرایە دەرکرابوو. وەک نوکتە پێشمەرگەیەکی هاوڕێی سالح بەناوی ستار ئەمین ئەشکەنجەی سالحی نابوو، لەگەڵ هەرپیاکێشانی کابلێکدا وتبووی سالح گیان وائەزانم لەغەفاری برامی ئەدەم. بەلام سالح مایەوەو فەرماندەی کەرتێکی قارەمانی لێدەرچوو لەگرتنی ڕەبیەیەکی جاشدا لەنزیک ئاوایی تاسلوجەی شارەزوور شەهید بوو.

٧-حەمەی ڕەشە (حەمەی مینا) کوڕێکی گەنج بوو کارمەندی پۆستەو گەیاندن بوو لەبیارە، باس دەکرا کە بەعسیە، هاتوچۆی ئیدارەی ئەمنی ئەکرد بەلام زیاتر بۆ وەرگێران بۆ ئەوکەسانەی ئیشیان ئەکەوتە ئیدارەکانی نەولەت، چونکە ئەم زمانی عەرەبی دەزانی، ڕۆژێک مەفرەزەیەکمان ناردە سەر جادەی نێوان تەوێلەو بیارە بۆسووتاندنی ئۆتۆمبێلێکی گەلابەی ڕێگاوبان، ئەوڕۆژە گەلابەکە نەهات مەفرەزەکە لەکاتی گەڕانەوەدا لەسەر جادە ئۆتۆمبێلێکی مەدەنی ڕائەگرن حەمەی تێدا بوبوو گرتبوویان و هێنایان بۆ لای ئێمە، پاش لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەدان، ووتی من بەعسی نیم، من زمانی عەرەبی دەزانم و ئەچم بەدەم ئەوکەسانەوە کەئیشیان ئەکەوێتە ئیدارەکانی حکومەت، شیعرێکی لەسەر پێشمەرگە هەبوو، لەگیرفانیدا بوو، خوێندیەوە بۆمان، ئەو ڕۆژە تائێوارە لامان بوو، بەفەرمانی رابەرسیاسی ئەوکاتی مەفرەزەکە نێردرایەوە سەر جادە لەو شوێنەدا کەگیرابوو کوژرا.

٨-کەریمی کەبابچی ئەم پیاوە لەبنەچەدا خەڵکی کوردستانی ڕۆژهەلات بوو لە هەڵەبجەدا کوژرا بەتۆمەتی بەعسی بوون.

٩-حەمەڕەشید فەرەج میران خەڵکی ئاوایی عەنەب بوو، لەشۆڕشی ئەیلولدا مەسئولی بنکە بووە بۆ دابەش کردنی پیشمەرگە، پیاوێکی کەم دەرامەت و هەژار بووە، دوای هاتنی سەربازگەی سوپای عێراق بۆ پشتی ئاوایی عەنەب هاتووچۆی ئەو سەربازگەی کردووە ئەوکات ئەوترا جاسوسە، بەلام دوای ئەوەی کە کوژرا من لەچەندین کەسم بیستوە وتوویانە بۆبەدەست هێنانی خوارەدەمەنی و سەموون هاتووچۆی ئەو سەربازگەی کردووە.

١٠-حەسەنە زەوجە خەڵکی لای پێواز بوو، چاودێری شارەوانی هەڵەبجە بوو بۆ نەهێشتنی زیادەڕۆیی، ئەم پیاوە تۆمەتی بەعسیەتی لەسەر بوو لەگەڵ

ئەوەشدا جەیشی شەعبی بووە، خەڵک زۆرلێی ناڕازیبوون، بەبەرتیل خواردن هاوکاری خەڵکیشی ئەکرد، شەوێک مەفرەزە ئەچێتە ناوشار لەناوشاردا حەسەنیان گرتبوو هەر لەناو شاردا ئیعدامیان کردبوو.

١١-کەرەیمە دۆم خۆی و خوشکێکی بەناوی کیشوەر کوژران لەناوشاردا لەسەر هاتووچۆیان بۆ ئیدارەی ئەمنی هەڵەبجە. پێشتر خوشکەکەی کوژرا، ئەومەفرەزەیەی، ئەم کارەیان ئەنجام دا کادرێکی تێکۆشەری کەم وێنەی خۆمانیان شەهید کرد لەکاتی ئەنجام دانی ئەو کارەدا و لەکاتی هێنانەدەرەوی کیشوەر لەماڵەکەدا ئەو پێشمەرگە دیاری کراوە تەقەی لێبکات و بیکوژێت لەو کاتەدا تەقەی لێ ئەکات کیشوەر خۆی ئەئاڵێنێ بەوکادرەوە، ئەویش بەرکەوتبوو شەهید بوو، کادرەکەش محەمەد مستەفا باوەکۆچەکی ناسراو بە سیروان بوو.

١٢- عابد حەمەسالح ناسراو بەعابد کولارە خەڵکی عەبابەیلێ بەتۆمەتی ئەوە گیرابوو کاتێک عوسمانی عەلی چەتوون ساڵی ١٩٧٨ لەئێران گەڕابووە بوو بوو بەجاش، ئەم عابد ناوەش چەکی لەگەڵدا هەڵگرتوە، عوسمان لەشۆڕسی ئەیلولدا فەرماندەی لق بووە، بەڵام لەدوای گەڕانەوە لەئێران بوو بە جاشێکی هار، لەشەڕی سۆیلەمیش لەدەشتی شارەزوور بەدەستی پێشمەرگە کوژرا عابد لەناوشار گیراو هێنایان بۆ بارەگای تیراوێ لەنزیک ئاوایی شۆشمێ، لە شۆشمێ خزمی هەبوون داوایان کرد بکرێت بەخاتری ئەوان، رابەرسیاسی و مەسئولی رێکخستنی پێشمەرگە قبولیان نەکرد، هەر چەندە خزمەکانی زۆر خزمەتی پێسمەرگەیان کرد بوو بەتایبەت مام هۆمەری خەجێ و حەمەی برای، من و هاوڕێیەکم بەناوی کەریمی شێخ عەلی عەبابەیلێی هەوڵی زۆرماندا لەبەرخاتری ئەوان نەکوژرێ، سەرەتا ووتیان باشە بەڵام ئەبێ چەکێکی کلاشینکۆف بکڕن بۆ شۆڕش، باوکم ئاگاداری مام هۆمەری کرد کەلەبەرامبەر چەکێکدا ئازادی ئەکەین ئەوانیش ووتیان باشە، بریاربوو بەیانی ئازاد بکرێت، بەرپرسی ناوچەو بەرپرسی رێکخستن ئێوارەکەی کۆبوونەوەو پەشیمان بوونەوە، هەر ئەو ئێوارەیە ناردیان بۆ سەر جادەی تەوێڵە بیارە ولەوێ کوشتیان لەگەڵ سابیر ناوێکدا کە ئەویش جەیشی شەعبی بوو گیرابوو.

١٢- حەمەئەمین حاجی حەمەسالحی گلەجالی، بەرپرسی ڕێکخستنی قوتابیانی بەعس بوو لەخوێندنگای سانەوی هەڵەبجە، بڕیار درا حەمەئەمین و خالید بەلەمەڕی پێکەوە بکوژرێن، خالیدیش بەرپرسی یەکێتیی قوتابیانی بەعس ، لە خوێندنگای ناوەندی شارەزوور، ئەمانە زۆریان هێنابوو بۆ خوێندکاران، هەر بۆنەیەکی حیزبی بەعس بووایە خوێندکارەکانیان بەزۆر ڕاپێچی ناو بازار یان شوێنی ئاهەنگەکان ئەکرد، لەبیرم دێت جارێکیان بەبۆنەی حەوتی ٧ نیسانەوە کاتێک خوێندکارەکان ڕاپێچ ئەکەن و ئەکەونەڕێ بۆ شوێن ئاهەنگەکە هەموو بەیەک دەنگ ئەم دروشمەیان وتبوەوە ئەم ڕۆ ڕۆژی شاییە شایی دایکی خالیە، حەمەمین شەوێک کەوتە بۆسەی پێشمەرگەوە لەنزیک ماڵی خۆیاندا ئەو کوژرا، خالیدیشی لەگەڵ بوو بەڵام ئەو دەرچوو بوو نەکوژرا نازانم ئێستا ماوە یانا.

١٤- عوسمان ماواتی ئەم کابرایە پۆلیس بووبوو لەشاری سلێمانی هاتبووە دەرەوە بۆ سنووری هەرێمی سێ ٣ لەشارباژێڕ، ئەیانووت هاتوە بۆ کوشتنی کاک بەکری حاجی سەفەر ، هێزێکیان هاتن بۆ هەورامان بۆ لای ئێمە ئەو عوسمانەشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، برا بۆ کوشتن بۆ نزیک ئاوایی پالانیا، ئەبوو دوو پێشمەرگەی ئەو هێزە بیکوژن کەهێنابوویان، ئەوکات هەر پێشمەرگەیەک تازە ئەهاتەدەرەوە ئەگەر کەسێک هەبوایە بۆ کوشتن دەبوو ئەوکەسە، پێشمەرگە تازە هاتوەکان بیکوژن بەئاشکراش، ئەمە بۆ ئەوەبوو ئەوپێشمەرگە ڕۆژێ لەڕۆژان بیر لەخۆبەدەستەوە دانەوە (تەسلیم) نەکاتەوە، من بۆخۆم زۆرێک لەوانەی کوژراون بەدیارەوە بووم، بۆیە زۆر قسەو دیمەنی ناخۆش و جەرگ بڕم بیستوەو بینیوە لێیان، عادەت وابوو ئەوانەی دەکوژران بەر لەکوشتنیان دەبوو چاویان ببەستن، ئەو ڕۆژە چاوی عوسمانیان دەبەست ووتی چاوم مەبەستن چونکە بێتاوانم، من قەد ئەوەم لەیاد ناچێ بۆی نیگەران بووم، هەرچەندە نابێ لەسەردەم و بارودۆخی وادا شۆڕشگێری ڕاستەقینە بەوجۆرە قسەو دیمەنانە دڵگران بێ.

١٥- حەمەسەعید سەقلە کەسێکی بەڕواڵەت داماو هەژار بوو، دەلال بوو لەکاراجی هەڵەبجە بۆ تەوێڵە و بیارە، لەناوشاری هەڵەبجەدا کوژرا، من نەمزانی ئەوانی کوشتیان کێبوون وەبۆ چی کوشتیان.

١٦- جەزای عەلەتورکە ئەمە لەشاری سلێمانییەوە لەگەڵ برایەکی بەناوی جەمال هاتبوون بۆ پێشمەرگایەتی، گەیشتبوون بەمەلا جەبار هەولێری دەمانچەیەکی جۆری مخابەراتیان پێبوو ئەویش ناردبوونی بۆ پارازان بۆ لای هەرێمی یەک، لەوێ گرتنیان وتیان ئێوە حکومەت ناردوونی بۆ کوشتنی حەمەی حاجی مەحمود هەر لەبەر ئەوە دەمانچەکە مخابەراتە، نەچووبونە ژێر بار، ئەشکەنجە کرابوون جەزا وتبوی بەڵێ حکومەت ناردووینی، هەردوکیان کوشتن، جەمال هەر بەئەشکەنجە دانەکە گیانی دەرچوو بوو.

١٧- جەمالی عەلە تورکە، هەمان جەمالە لە خاڵی ١٦ شانزەدا باس کراوە.

١٨- حەسیبە حەمەفەرەج تەمەن ٢٢ ساڵان لەگەڵ خوشکیکی بەناوی نەجیبە تەمەن ١٨ساڵان لە هەڵەبجەدا بەتۆمەتی هاتووچۆکردنی پیاوانی دائیرەی ئەمن بۆ ماڵیان کوژران.

١٩- نەجیبە حەمەفەرەج، هەمان نەجیبەی خوشکی حەسیبەیە لەخاڵی هەژدەدا باس کرا کاتێک تەقەیان لەحەسیبە کرد بوو نەجیبە خۆی دابوو بەسەریا ئەویش بەرکەوتبوو.

٢٠- ئەحمەد قادر حەمەسەلیم، گەنجێکی تەمەن نزیکەی بیست ٢٠ ساڵان خەڵکی ئاوایی پریس بوو، لەناو شاری هەڵەبجەدا کوژرا، من نەم زانی بەتۆمەتی چی کوژراوەو کێ کوشتوویەتی.

٢١- ئە لاوەیس کۆکۆیی، لەبابەتێکی ناو ئەم کتێبەدا بەوردی باس لەگرتن و کوشتنەکەی کراوە.

٢٢- خێزانی عەریف سەعید، عەریف سەعید ماڵی لەناو شاری هەڵەبجە بوو، ئەیان ووت جەیشی شەعبی بووە ڕاستی و دروستی بۆمن ڕوون نەبووەوە، مەفرەزە چووە سەری و نارنجۆکیان فڕێدایە ناو ماڵەکەی ژنەکەی بەرکەوتوو گیانی لەدەست دا.

٢٣- مەحمودی ئەحمەد ڕەش، مەحمود خەڵکی ئاوایی کشەدەری شارەزوور بوو پیاوی حکومەت بوو باوکی واتە ئەحمەدە ڕەش پیاوێکی باش بوو خزمەتی زۆری پێشمەرگەی کردووە، مەحمود پەیوەندی ئەکات بەفەرماندەی کەرتێکی حیزبی سۆشیالیستەوە بەناوی عەبدرەحمانە بەچە، بەچە ئەک بەپیاوی حکومەت و ئەیبەستێ بە ملازم خالدەوە کەبەرپرسی ئەمنی هەڵەبجە بوو، سۆشیالیت لەبناری چیای سورێن پێیان زانی و بەچەیان گرتوو کردیانە

زیندان، دوای ماوەیەکی کەم مەحمودیشیان گرتو کردیانە لای بەچە، شەوێک مەرسوکیان هەڵدێن لەزیندان، دەرچون و گەیشتنەوە هەڵەبجە، دواتر بەچە ـلوا ئەکات بیبەخشن تا بێتەوە بەپێشمەرگە، سۆشیالیستیش ئەیبەخشن بەومەرجە خولە بکوژێ، ئەوێش کوشتی و هاتەوە، دواتر بەچەش ئەلغام کوشتی.

٢٤- سابیرناوێک، لەناوشاری هەڵەبجەدا گیرابوو لەسەر ئەوە بووبوە جەیشی شەعبی، لەگەڵ عابید حەمەساڵحدا پێکەوە زیندان بوون و پێکەوەش کوژران، باسی چۆنییەتی کوژرانی عابد لەخاڵی ١٢ دا کراوە.

٢٥- سەلام فەتاح جەلیلەیی کوڕێکی گەنجی پێکەوتوبوو هاتبوو بۆ پێشمەرگایەتی وتیان لەسەر ڕووباری سیروان کاتێک مەتارەی ئاوەکەی پڕکردووە، ئاو بردوویەتی، من دواتر لە هەڤاڵەکانی ئەو مەفرەزەم بیست، گوایا دراوە بەئاودا.

٢٦- حەمە کوڵەدارە خەڵکی خورماڵە، لای قیادەی موەقەت پێشمەرگە بوو، گرتیان و لەسەرچیای داڵانی کوشتیان وتیان پەیوەندی بەحکومەتەوە هەبووە لەگەڵ عەلی کوڕیداو لەگەڵ خالیدی حەمەی ساڵح دا.

٢٧- خالید حەمەی ساڵح، خالید دێکونی ئەویش لەگەڵ حەمە کوڵەدارەدا کوژرا.

٢٨- هیدایەت جەلال هۆمەر[1] خەڵکی تەوێڵە بوو لەناوشاری هەڵەبجەدا کوژرا، لەسەر چەکداریەتی بۆڕژێم.

---

[1] - جەلال هۆمەر خەڵکی تەوێڵە بوو ساڵی ١٩٧٧ لەسەر چیای وەزڵی کوژرا، شێوەی کوشتنەکەشی بەنهێنی و کەس نەیزانی چۆن و بۆچی کێ کوشتی، بەتەوەرزین کوشتبویان؟ هەر لەودەمەدا ئەوکوژرا، کەسێکی تربەناوی عەبدوڵلا عەبەکەی وەهاب لەوسنوورەدا بوبوو خرایە سەر ئەو مام عەبە شوان و خەریکی لەوەڕاندنی مەڕبوە، ماوەیەک خۆی شاردەوە. دواتر چوە لای مەفرەزەکەی سنووری هەورامان و بوو بە پێشمەرگە، ئەوەندەی نەبرد تەسلیم بوەوە پەنای بردە لای ڕەشەی ساڵحەی سەرۆک جاش، نەیتوانی داڵدەی بدات، دووبارە ڕایکردەوە بۆناو پێشمەرگە خۆی و ماڵ ومنداڵی تاساڵی ١٩٨٨. وەک دەڵێن هیدایەت کوڕی جەلال هۆمەر لەسەر کوشتنی بابی چوەبوە بەپیاوی بەعس، هەرچەندە مامە عەبە تا کۆچی دوایشی کرد هەر حاشای لە کوشتنی جەلال ئەکرد.

٢٩- کەریم تەوفیق حەمەئەمین، ناسراو بەکەریمی مالیە خەڵکی ئاوایی بەڵخەی ناوچەی هەورامانە، لەلایەن حیزبی شیوعیەوە کوژرا لەسەر بەعسی بوون. لەکاتی لێدانی دا مەنیجە خانی خێزانیشی بەرکەوتبوو کوژرا، کەریمی مالیە ئیشیشی بۆ ڕێکخستن ئەنجام داوە.

٣٠- مەنیجە حەسەن خێزانی کەریم

٣١- ئیسماعیل فەتحولا، خەڵکی تەوێڵە بوو، جێگری بەڕێوەبەری کشتووکاڵی شارەزوور بوو، بەعسی بوو بەپلەی نەسمیر موتەقەدم، لەدوای بانگەشەی هەڵبژاردنە ساختەو کارتۆنییەکانی حیزبی بەعسدا لەشارۆچکەی سیروانندا کوژرا، ئەوترا ئیشی بۆ هۆشمەند فەتاح کردووە، لایەنگرانی کاندیدێکی تر کە نەبەرد جاف بووە کوشتویانە. بەڵام ئەوە ڕاست نەبوو چونکە ئیسماعیل خۆی کاندید بوو، بەعسیەکانی خەڵکی سنوورەکە لەناو خۆیاندا منافەسەو ململانێیان هەبوو خۆیان کوشتیان.

٣٢- حسێن، خەڵکی تەوێڵە بوو تەمەنی نزیکەی ٧٠ حەفتا ساڵ بوو، تۆمەتی ئەوەی لەسەر بوو، شەهید حەکیم فەتاح ڕەحمان ئەندامی ڕێکخستنی کۆمەڵە لەتەوێڵە ساڵی١٩٧٨ ئەو ئاشکرای کردووەو لەسێدارە دراوە، حاجی حسێن لەناو شاری هەڵەبجەدا کوژرا ساڵی ١٩٨٣ چۆنییەتی ئەو کێشەو کوشتنەکەی لە بابەتی گفتوو گۆی یەکێتیی و حکومەتدا بەوردی باس کراوە.

٣٣ - عەلی حەمە کوڵەدارە لەگەڵ باوکیدا لەچیای دالانی کوژران لەلایەن قیادەی موەقەتەوە بەتۆمەتی پەیوەندیان بە بەعسەوە.

٣٤ - خالیدی حەمەی سالح دێکۆنی پێشمەرگە بوو لەگەڵ قیادەی موەقەت ئەویش لەچیای دالانی لەگەڵ حەمە کوڵەدارەو عەلی کوڕیدا کوژر لەبەرواری١١/ ١٠/١٩٧٧.

٣٥ – بەهادین حەمەسەعید ناسراو بە بەهادینە ڕێوی خەڵکی هەڵەبجە بوو. لەلایەن مەفرەزەیەکەوە شەوێک لەناو شاردا کوژرا، کوشتنەکەی پەیوەندی بەبەعسی بوون و پیاوی حکومەتەوە نەبوو، پەیوەندی بەهەڵسوکەوتی لایەنی کۆمەڵایەتی بەهادینەوە بوو.

٣٦ – حەلیم ڕانییەیی خێزانی د. مستەفای نجاری، مستەفا پێشمەرگەی حیزبی دیموکرات بوو، خەڵکی ئاوایی نجاری کوردستانی ڕۆژهەلات بوو ماڵی لەناو شاری هەڵەبجەدا بوو ساڵی ١٩٨٤. شەوێک خەڵک لەکۆلانی

بەریدەکەدا کۆدەبنەوەو بەبۆنەی ئەو وتوویژەوە کەلەنێوان یەکێتیی و حکومەتدا هەبوو شایی وهەڵپەرکێ دەکەن لەبەر دەم ماڵی حەلیم خاندا، لەوکاتەدا مەفرەزەیەکی پارتی دێنە ناو خەڵکەکە، قسەوجنێودان لەنێوانیاندا دروست ئەبێ، حەلیم ئەڵێت پاسدارموەقەتە لێرەش وازمان لێناهێنن بۆ لەخەڵک تێک ئەدەن، لەبەرامبەر ئەم قسەدا یەکێک لە پێشمەرگەکان ئەیداتە بەرفیشەک و کوشتیان.

٣٧ - مەحمود فەتحلا نەسرلا کویخای ئەحمەد ئاوا لەئەحمەد ئاوا گیراو هێنرا بۆ سەرجادەی تەوێڵە بیارەو لەنزیک ئاوای دەگاشێخان کوژرا لەسەر ئەوە گوایا هەواڵی پێشمەرگە ئەدات بە حکومەت.

٣٨ – نەوزاد ڕەشید ڕەسووڵ خەڵکی هەڵەبجە لەلایەن مەفرەزەیەکەوە هەر لەناوشاردا شەوێک کوژرا لەسەر چەکداری کردن بۆ ڕژێم.

٣٩ _ شێخ ئەحمەدی ئەحمەد ئاوا لەکۆمەڵگەی سیروان کوژرا لەلایەن مەفرەزەیەکی پارتیەوە لەسەر ئەوە گوایا پیاوی ڕژێمە، دوای دەرکەوت شێخ ئەحمەدو خێزانەکەی پەیوەندیان بەڕژێمەوە نەبوە بەپێی بەڵگەنامەی ئەمنی هەڵەبجە بۆ ئەمنی سلێمانی.

٤٠ – خێزانی شێخ ئەحمەدی ئەحمەد ئاوا، لەوکاتەدا شێخ ئەحمەد ئەکوژن خێزانەکەی هاوار ئەکات بەپێشمەرگەکان ئەڵێت ئەتانناسم ئەویش ئەدەنە بەر فیشەک و ئەیکوژن [١].

٤١ – کوبراعەلی قادر خوشکی شێخ ئەحمەدی ئەحمەد ئاوا ئەم ژنە ماڵی لەئەحمەدئاوا بوو، هاوسەرەکەی دیل بوو لەئێران، لەشەڕی ئێراق ئێران دا گیرابوو دایکی دوو منداڵ بوو، بەرلەشێخ ئەحمەدی برای کوژرا لە١٩٨٣/١١/١٦دا، لەسەر ئەوە گوایا هەواڵی پێشمەرگە ئەبات بۆ خورماڵ بۆ حکومەت، لەدوای کوشتنەکەی پێشمەرگەیەک تەسلیم بوەوە، قسەیە هەبوو لەسەر ئەو کوژرابێت، دەرکەوت هاتووچۆکەی بۆ وەرگرتنی موچەی هاوسەرە دیلەکەی بووە

---

[١]- لەڕاستیدا گومان هەبوو شێخ ئەحمەد لەسەر ئەوە کوژرابێت نهێنیەکی لابێت، ئەویش پەیوەندی نێوان حکومەت و دوو بەرپرسی ئەوکاتەی پارتی بوو.

٤٢ – مەحمود مستەفا خەڵکی ئاوایی گەچینە ماڵی لەناو کۆمەڵگەی خورماڵ دا بوو. شەوێک لەلایەن مەفرەزەیەکەوە گیراو هەر هەمان شەو لەکۆمەڵگەکەدا کوشتیان لەتۆڵەی کوشتنەکەی ڕەئیس عورەفا حسێن دا، کەهیچ پەیوەندیەکیشی بەکوشتنی حسێنی حاجی حامدەوە نەبوو.

ئەمانەو خەڵکیش بە هەڵە کوژراوە لەوانە بۆ نمونە:

١ – عەبدوڵلا شێخ نوری، پۆلیس بوو لە تەوێڵە ساڵی١٩٧٧ لەکاتی گەڕانەوەدا بۆ هەڵەبجە لەلای ئاوای زەردەهاڵ کەوتە بۆسەی پێشمەرگە، ناوبراو لەناو ڕێکخستنی یەکێتیی خۆیدا بوو، بەڵام کاتێک ئوتومبێلەکەیان ڕائەگرن پێشمەرگەیەک دەرگاکەی ئەکاتەوە ئەبینێ چەکێکی کلاشینکۆف لەبەردەم عەبدوڵلادایە بێ پرسیارو وەڵام، تەقە ئەکات لەعەبدول لاوە ئەیکوژێت، لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا کەسێکیتر بەناوی زۆراب مستەفا بریندار بوو دوای ماوەیەک بەهۆی ئەو برینەوە مرد، ئەویش ئەندامی ڕێکخستنی تەوێڵە بوو.

٢ – حەمەی حاجی محەمەدی ئامین، وەرزشەوان بوو خەڵکی هەڵەبجە بوو، لەنزیک ئاوایی بیرکێ پێشمەرگە بازگە دائەنێن، چەندین ئۆتۆمبێل ڕائەگرن ناوبراو ئەندامی ڕێکخستنی هەڵەبجە بوو، لەسەر دواکەوتنیان لەگەڵ پێشمەرگەکان دەمەقاڵەیان ئەبێت لەسەر ئەوە کوژرا. ئێمەش بەفەرمی ئەوکات داوای لێبوردنمان کرد لەکەس وکارەکەی، بەڕاستی ئەوانیش هەڵوێستێک جوانیان هەبوو.

# کۆبوونەوەیەک لە ئاوێسەر

کۆتایی هاوینی ساڵی١٩٨٠بوو، لەناوچەی هەوراماندا لەدیوی ڕۆژهەڵات جگە لەناوەندی شاری پاوە، ناوچەکانیتری سنوورەکە لەژێر دەستی هێزەکانی حیزبی دیموکراتدا بوون. هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی لەبەری هەڵەبجەو هەورامان پێک هاتبوو لە سێ کەرت و ئۆرگانی لیژنەی ناوچە، بنکەو بارەگاکانمان لەناو خاکی ئێران و لەناو باخ و چەم و دۆڵەکانی سەر سنووردا جێنشین ببووین، بەبۆنەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە، خەڵک بەئاسانی لەسلێمانی و هەڵەبجەو شارەزوورەوە بۆتەوێڵەو لەوێشەوە بۆ مەرزی شۆشمێ و بۆ نەوسوود هاتوو چۆیان ئەکردین.

من و سامان زۆراب (فەرەح) لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک چووینە ئاوێسەر دوو ڕۆژ بەپەنامەکی کە لە فەرهەنگی شاخ و پێشمەرگەدا پێی دەگووترا (ئیختیفا)ماینەوە، ئەو دوو ڕۆژە خەلکێکی زۆری ڕێکخستنمان بینی، بەتایبەت گەنجان و خوێندکاران، لەوانەش چەند خوێندکارێک کەلەسلێمانیەوە هاتبوون[1]. ڕۆژی سێیەم دیاری کرا بۆ جەماوەری تەوێڵە کە بەڕێنوێنی ڕێکخستن بێنە ئاوێسەر تا کۆبوونەوەیەکی جەماوەرییان لەگەڵدا ساز بکرێ، کاکە حەمەی حاجی مەحمود فەرماندەی هەرێم هاتبوو بۆ هەورامان لە دەوروبەری نەوسوود بوو، ئێمڕۆ چووبوو بۆمەلەن دوو بۆ دیتن و کۆبوونەوە لەگەڵ کەریم خاڵدار کەفەرماندەی هێزی شاهۆی حزبی

---

[1] بەر لەکۆبونەوەکە ڕێکخستن هاتنە لامان ووتیان کۆمەڵیک خوێندکار لەسلێمانیەوە هاتوون بۆسەیران حەزدەکەن پێشمەرگە ببینن، ووتمان باشە بابێن، هاتنەلامان، کاک سامان قسەی بۆئەکردن، لەوکاتەدا خوێندکارێکی ژیرو جوان و نەرمونیان دوای قسەکردن و گفتووگۆ لەگەڵمان، بووە جێگەی سەرنج، ئێمەی خۆشحاڵ کرد بەقسەکردنەکەی و زانیاریەکانی لەبارەی کۆمەڵەو یەکێتی نیشتیمانیەوە، بۆمان دەرکەوت ئەندامی ڕێکخستنە.
بووە هۆی خۆشحاڵی و ورەبەرزی زیاتری ئێمە کەلەشاردا خەلکی وامان هەیە. دوای ٣٩ ساڵ بۆم ئاشکرابوو ئەو خوێندکارە هونەرمەند ( ئاسۆ عومەر سوارە) بووە .

دیموکرات بوو. کاتژمێر ٣سێی پاش نیوەڕۆ دیاری کرابوو بۆ کۆبوونەوە جەماوەریەکە، لەکاتی خۆیدا جەماوەرێکی زۆر ئامادە بوون لەسەر چاوگی ئاوەکەی ئاوێسەرو لەبندارگوێزە بەرزو بەتەمەنەکاندا، هەندێکی ئاگادارەو هەندێکی بێئاگا. ئێمەش کەلەو نزیکانەدا خۆمان حەشاردابوو لەکاتی دیاری کراودا هاتینە ناو ئاپۆرای خەڵکەکە و پاسەوانمان لەخوار خەڵکەکەوە دانا بۆ رێگری کردن لەوانەی ئەترسن و ئەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ ناو تەوێڵە لەگەڵ دەستگیر کردنی ئەوکەسانەی پیاوی حکومەتن. لەو کاتەدا کاکە حەمە و مام عەبدولخالق هەورامی هێزێکی ٣٠تا ٤٠ کەسی لەدیوی رۆژهەڵاتەوە هاتن و لەپشتی ئاوێسەرەوە دابەزینە لامان ئێمەش چووین بەپیریەوە.

جەماوەرەکە پێشوازییان لە کاکە حەمە کرد، دووبارە هەندێک لە خەڵکەکە ویستیان بڵاوەی لێبکەن و بڕۆنەوە بۆناو تەوێڵە، بەڵام رێگەمان نەدان. کاکە حەمە ووتی ئەمەوێت قسەیان بۆ بکەم. سامانیش بە منی ووت: بە کاکە حەمە بڵێ ئێمەش دوو رۆژە لێرەین و ئەم بەرنامە ئێمە دامانناوە، با سامان بەخێرهاتنی خەڵکەکە بکات و جەنابت پێشکەش بکا بەجەماوەرەکە لەوەڵامدا ووتم بەسامان من لەڕووم نایە، خۆت بەمام عەبدولخالق بڵێ، کەپێی ووت ئەویش قسەی لەگەڵ کاکە حەمە کرد، کاکە حەمە ووتی باشە ئێمە دەڕۆین، ئێمە زانیمان کاکەحەمە دڵگران بووە بۆیە لەگەڵ مام عەبدولخالقدا بەسامانمان ووت کاکە حەمە قسە ئەکات.

کاکە حەمە دەستی بە قسەکردن کرد، باسی کارەساتی هەکاری کرد کەچۆن قیادە موەقەتە و ئێران و عێراق و تورکیا دەستیان کردووە بەیەک بۆ لێدانی ئێمە. لەناو قسەکانیدا کە باسی شەهید کردنی عەلی عەسکەری کرد من چاوم لێبوو پیاوێک دەستی کرد بەگریان. دوای کۆبوونەوەکە خەڵکەکە بڵاوەیان کردوو بەترسەوە گەڕانەوە بۆ ناو تەوێڵە، ئێمەش ماینەوە تاهەوا تاریکی کردوو ئەو سنوورەمان بەجێهێشت، کاکە حەمەو برادەرەکانیشی گەڕانەو بۆ دیوی رۆژهەڵات.

لە کتێبی رۆژمێری پێشمەرگەیەکدا کاکەحەمە بەم شێوە باسی لەو کۆبوونەوە کردووە، (مام عەبدولخالق خەڵکی کۆکردبوویەوە من قسەیان بۆ بکەم، کادرەکانی کۆمەڵە پێیان ناخۆش بوو، پێشمەرگە ویستیان چەکیان بکەن خۆم نەم هێشت).

پایزی ١٩٧٩ هەڤاڵانی ناوچەو کادرەکان زۆر ناڕەواییان کردو خراپ لەسەر شۆڕشەکەمان شکایەوە، دەستیان دابوە هەندێک کارو کردەوەی نابەجێ، بەلام چیمان بکردایە بڕیار بەدەست ئەوان بوون م. پشکۆ، م. سەرکەوت، مەلایاسین، سامان و مام هادی.

غەفور دەرەشیشی وەک فەرماندەی کەرت لەم کارانە دڵگران بوو، بۆیە ئەو کادرانە لە بەرامبەریدا کەمینی ڕقیان گرت و هەوڵیان دەدا بەپێشمەرگەی بسەلمێنن کە ناوبراو جاسوس و پیاوی ڕژێمە[1]. مام عەبدولخالق هەورامی دژی ئەم جۆرە ڕەفتارانە بوو هەروەک غەفور دەرەشیشی، بۆیە دواجار دەریان پەڕاند، مام هادی کە بە حیساب کادرێکی سیاسی بوو ڕۆڵی خراپی لەو بەزمەدا دەبینی، وا دەزانم خۆیشی لێیان دەترسا بۆیە ببووە داروەلەکی دەستیان.

لەم سەرو بەندەشدا بنکەو بارەگاکانمان لەسەر سنوورو لەناو گوندەکان و هەوارو باخەکانی هاولاتیانی ڕۆژهەلات دابوو، بۆیە خەریک بوو خەڵکی ئەو ناوچەو گوندەکانی سەر بەناحیەی نەوسوود بەدژمان بوەستنەوە، بەلام ناسراوی و خزمایەتی ئێمە لەناو هەورامییەکان و غەفوور دەرەشیشی لەگەڵ نۆریاویەکان و خزمەتی دوکتۆر کەمال شاکریش دەوری باشی بوو بۆسارد کردنەوەی خەڵکەکە، بەهۆی ئینقیلابەوە لەناوچەکەدا دکتۆر و دەرمان دەست نەئەکەوت، کەمال شاکر چارەسەری نەخۆشەکانی ئەکرد، کادێرێکی تێگەیشتوو و پیاوێکی کامڵیش بوو.

---

[1] - غەفور دەرەشیشی پیاوێکی تەمەن ٤٥ ساڵ، ڕەشتاڵەیەکی باڵا مامناوەندی بوو، باوکی چایچی بوو لەئاوای دەرەشیشی خووارو. لەبنەڕەتدا خەڵکی ئاوایی نۆریاو بوو لەخۆرهەلاتی کوردستان. غەفوور لە شۆڕشی ئەیلولیشدا پێشمەرگە بوو، لەم شۆڕشدا سەرەتا فەرماندەی مەفرەزەو دواتر فەرماندە کەرت بوو. عەشایرو قسەخۆش و ڕۆح سووک بوو. بنەماڵەیەکی دەست کورت و هەژار و ئەندامی کۆمەڵە بوو، بەلام عەقڵی خۆی نەئەدایە دەست کادرە بێ ئەزموونەکانی کۆمەڵە. جارێک هاولاتیەک گیرابوو لەسەر بەعسیبون بەناوی محەمەد حەمەڕەشید، لەکاتی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەداندا کادرەکانی کۆمەڵە ئەیانپرسی ئەرێ غەفوور لەگەڵ ڕژێمدا پەیوەندی نییە؟ ئەیانویست بخەنە دەمی کابراو بڵێت بەڵێ غەفوور پەیوەنی بەڕژێمەوە هەیە.

کارە ناڕەواکانیش بریتی بوو لە: گرتن و کوشتن، ئەشکەنجەدان، سووکایەتی کردن و شکاندنی خەڵک بەبێ ئەوەی دادگایەک هەبێ، بێئەوەی پرس و ڕایەکیان بەکەس کردبێ. جەماوەری گوندکانیش ئەمەیان پێناخۆش بوو لەناو ئەواندا، کەسوکاری گیراوەکان ئەهاتن ڕوویان لەخەڵکی ناوچەکە ئەکرد، ئەیان ووت ئەمانە ئێوە بەخێویان ئەکەن خاترتان ئەگرن بەڵکو ڕجامان بۆبکەن. بەڵام بەڕاستی ئەوسەردەمە ئەوەندە کتێبی و ووشک بووین خاتری کەسمان نەئەگرت.

بەهەرحاڵ ئێمە نامانەوێ برینی کۆن بکوڵێنینەوە، بەڵام بۆمێژوو نابێ لێی بێدەنگ بین و لەبیر بکرێت. ئێمەش بۆ خۆمان لەو هەڵانەدا بەشدار بووین، گرتن و کوشتن و ئەشکەنجەدانی خەڵک، لەسەر گومان و ڕاپۆرتی درۆ، لەگەڵ قسەکردنی بێجێ و بێمانا بەرامبەر بە: دین، ئاغا، شێخ، بنەماڵە دەوڵەمەند...تاد. ئەوەندە بەهەڵە لەکۆمەڵەو چەپ گەرای تێگەشتبوین وامان ئەزانی کفرکردن و سوکایەتی کردن بەپیرۆزیەکان، نیشانەی ڕۆشنبیریەتی و وەرگرتنی بڕوانامەیە لەمەکتەبی مارکسیزم دا.

## حەمە ئەم کاکایە دەناسی؟



لەساڵی ١٩٧٨و٧٩ دا ئەبوو هەرجارەو هەرێمێک بۆ ماوەی یەک مانگ بچێتە ناوزەنگ بۆ پاسەوانی سەرکردایەتی و هاوکاری هەرێمی پارێزگاری.

پایزی ساڵی ١٩٧٩ سەرەی هەرێمی یەک بوو، هێزێک کۆکرایەوە لەهەموو کەرتەکانی سەربە هەرێمەکە، کاکە حەمەی حاجی مەحمود خۆی لەگەڵ هێزەکەدا بوو، لەکەرتی ٢ دووی شەهید ئەحمەد گریانەیی (هەورامان) من لەگەڵ مەفرەزەیەکدا بەشداری ئەو هێزەمان ئەکرد، بەشێکی کەرتەکەمان لەسنوورەکەدا مانەوە، ئەوانیش ئەم هەڤاڵانە بوون: غەفور دەرەشیشی، حەمەهاواری، فەیسەڵ مەلا عەلی، د. کتۆر کەماڵ شاکر، مام هادی، نیازی و چەند پێشمەرگەیتر، لەسەرکانی و ئاوی دۆڵە هەنجیر لەسنوری گوندی هاوار مانەوە، ئێمە لەوێ لێیان جیابووینەوە و بەڕێکەوتین، ئەوان خەریکی چاک کردنی بارەگابوون بۆ زستانی داهاتوو، بارەگاکەش ئەستێلێ ئاوی باخەکەی دۆڵە هەنجیر هی دوو برایی کاکایی بوو، بەناوەکانی مام قارەمان و فەتاحی کەیکاوس.

ئاوەکە لەسەرەوە مەسافەیەک ئەهات و ئەڕژایە ناو حەوزەکەوە، حەوزەکە لە شێوەی خانویەکی ٤X٣ مەتری چوار گۆشەدا بوو. ئاوەکەیان لە سەرچاوەکەوە لادابوو لە لای دەرەوەی دیواری حەوزەکەوە ئەڕۆیشت و نەئەڕژایە ناو حەوزەکە. لەلای خوارەوە دەرگایەک کرابووە ناو دیوارەکەی و

بەدار سەری گیرابوو، ئیتر ناوحەوزی ئاوەکە لەباتی ئاو پێشمەرگەی تێدا ئەژیان و ئەنووستن.

مەفرەزەکەی ئێمەش کەبەشدار بووین لەگەڵ هێزەکەی هەرێمی یەک لەم پێشمەرگانە پێک هاتبوو: حەمەسەعید عەلی باوکم، خۆم حەمە، عومەر مەجید پشتیوان، ڕزگار عەزەقوڵ، فەیسەڵ کاکل، سلێمان حەمە کەریم، بەهمەن هاواری و چەند کەسێکی تر کە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە.

ئێمە پاش نیوەڕۆیەکی ڕۆژێکی مانگی ١٠/ ١٩٧٩ لەهاوارەوە بەچەمی سۆڵەدا بۆ خەرپانی و لەجادەی گشتی خورماڵ- پردی زەڵم نیوەشەو پەڕینەوە بۆبنار چیای سوورێن و بەگوندە چۆڵەکانی ڕیشێن، کانی ئاسکان، نەوێ و بەردەبەل دا دەمەو بەیانی ڕۆژی دوایی گەیشتینە گوندی سیامێوە. ئەم گوندە سەر بەناحیەی ناڵپارێزەو ئەکەوێتە نێوان گوندی چەوتان و نەوێ لەسەر ڕێگایەکی پیادەڕێی ئەم بنارەو لە شارەزوورەوە دیارنییە لە بەر ئەوە بەرزایی پشتی ئاوایی وەڵەسمت[1]بەردەمی گرتووە.

ئەم گوندە بەردەوام مەرکەزی هاتوچۆی قاچاخ چی و کاروان چییەکانی نێوان سەیدسادق و شاری مەریوانە، سیامێوە بەردەوام پێشمەرگەی لێبوو چونکە لەدەشتی شارەزوورەوە ئەو هێزانەی بەرەو شارباژێڕ ئەڕۆن ئەبێ لەوێ ڕۆژێک بمێننەوە، ئەوانەی لە شارباژێڕ و سنوورەکانی ترەوە دادەبەزنە شارەزوور- هەڵەبجە و هەورامان دووبارە ئەبێ لە سیاومێوە ڕۆژێک پشوو بدەن، گوندی سیاومێوە بە هۆی هەڵکەوتە جوگرافیایەکەی چەندین جار شەڕ تیایدا لە نێوان پێشمەرگە و حکومەتدا ڕوویداوە.

هەنگاوی دوای دەرچوون لە سیامێوە بەئاواییەکانی خڕنوک، زمنگی سەر و چەوتاندا گوزەر ئەکەین و شەو لەجادەی گشتی پێنجوێن - سەیدسادق ئەپەڕینەوە بەپەنا گوندی دۆڵە سوور دا ئەڕۆیت و دەمەو بەیانی

---

[1] وڵەسمت ناوی ئاواییەکی بناری سورێنە لەپێدەشتی دەشتی شارەزووردا، ئەم ناوە لەوەوە هاتووە، کەئاوی چەمی چەقان لەئاوایی بۆڕیدەرەوە بنەوانی جۆگەیەکی لێهەڵکرلوە دوای مەسافەیەک ئاوی ئەوجۆگە لەباکورەوە بەکونێکی دەست کرددا، لەبەرامبەر ئاوایی سیامێوەوە بەناوشاخەکەدا دێتو لەباشورەوە لەلای ئاوایی وەڵەسمتەوە دێتە دەرەوە بەهەورامیانە، وڵ= کون، سم= سمین= کونتێکردن.

ئەگەیتە دۆڵەچەوتەو لەوێوە بۆ نزیکەی کاتژمێر ١٠ی سەر لەبەیانی، گوندەکانی دۆڵە چەووتەو بەردە بەل ئەدەیتە دواوەو ئەگەیتە گوندی ڕەزڵە.

گوندی ڕەزڵە، ناوەکەی چەندە جوانە هەڵکەوتەی جوگرافیایی ئاوایش ئەوەندە جوانەو خەڵکە کەشی زۆر بەڕێزو کورد پەروەرن. حەوزو سەرئاوی ڕەوان، لە ناو کووچە و ماڵەکاندا تاکە تاکە دارگوێزی گەورە و بەتەمەن هەن، دەوروپشتی بە دارستانی داربەڕوو دارمازوو داپۆشراوە.

هەندێک گوند لەم سەردەمەو لەم شۆڕشە نوێیەدا بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافیانەوە ئەرکێکی ئێجگار زۆری پێشمەرگەیان لەسەرە، یەکێک لەو گوندانە گوندی ڕەزڵەیە سەر بەناحیەی نالپارێزە، هەنگاوی سێیەم لەم سەفەرەدا دوای ئەوەی لەڕەزڵە لەگەڵ هێزەکەی هەرێم و کاکە حەمە خۆیدا یەکمان گرتووەتەوە گوندەکانی دۆسەدەرە، قولیگیسکان و گوێزە کوێرە، پاڕازان، قەلاتێ و مکل کەمەکۆی مانەوەو پشوودانی پێشمەرگەن، ئەدەینە دواوەو ئەگەینە چاڵە خەزێنە و چنارەی شێخ لەتیف.

دوای پشوویەکی کورت ئینجا هەورازی سورەبانمان بڕی و دەمەو بەیانی ڕۆژێکی نوێ گەیشتینە گوندەکانی چەمپاراو و بلەکێ، ئەم گوندانە سەر بە فەرمانداری شاری بانەی کوردستانی ڕۆژهەلاتن، لەنێوان گوندی سوورەبان سەربە فەرمانداری چوارتا لە کوردستانی باشوورو گوندەکانی بلەکێ و چەم پاراو، بە شەو هەندێک جاریش بەڕۆژدا کاروانی قاتر و بارگیر وەک قەتارەی مێروو بەڕێوەن، تۆکە ئەو ڕێگایە ئەبڕێت هەمووی لە دیوی عێراقەوە سەرەو ژوورکەیەو لەدیوی چەم پاراوەوە شۆڕئەبیتەوە، ئەبێ دەیان جار لە شاڕێگا کە لابدەین لەبەر کاروانی قاترەکان، ئیتر بە تەواوی بە هیلاک ئەچیت، گوندی بلەکێ و چەم پاراو مەرکەزی مانەوە و پشوودانی ئەو هێزانەیە کە لەسەرکردایەتیەوە بەرەو خوارەوە بۆسنوری هەرێمەکانی یەکی شارەزوور و سێی شارباژێر و پێنجی قەرەداغ و گەرمیان، بەپێچەوانەشەوە هاتوو چۆ ئەکەن.

لە بلەکێوە بەرەو سەرچۆمی چۆمان و گەیشتن بەسنوری ئالانی سەردەشت سنووری ئاوایی گەلیک ئەبڕیت و هەمووی بەسەر سنووردایە و نزیکەی ١٠-١٢ ئاوایی چکۆلەو کوخ لەسەر ڕێگاکەتدان. کاتێک گەیشتینە بێژوێی ناوچەی ئالان لەو شارەدێیەدا ماینەوە، خەڵکێکی دڵسۆزو میوان

دۆست کە قەد بێزار نابن لەو هەموو ئەرکەی پێشمەرگە، مزگەوت و حەوزو ئاوی ئەبێتە هۆی حەوانەوەو پشوودان. پێم باشە لێرە یادێک لەپیاوێکی کورد پەروەرو زۆر دڵسۆزو دۆستی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بکەمەوە کە ناوی کاکە حەمەی مەلا عەلیە، یەکێکە لە تێکۆشەرو پیاوە دیارو بەهەیبەتەکان کە من لەژیانی سیاسی خۆمدا بینیوومەو ناسیومە.

سەر لە بەیانی ڕۆژی دوای ئەو شەوەی کەلە بێژوێ پشوومان دا پێشمەرگە کەووتنەڕێ و قەتارەیان سەرێکی لە ئاوایی و بەرەتایان گەیشتوونەتە نزیک ملەی هۆمل. کاتێک لە هۆمل ئەگەینە سەرەتای دابەزینی سەرەو خوارگەیەکی زۆر توند بۆ قووڵیی سەر ئەو چۆمەی کەگوندەکانی ئەسپە مێزەو دەرماناوێ و قەڵەڕەشەی لەخۆگرتووە، شاری سەردەشتت لێوە دەرئەکەوێت.

لە دوای دەرچوون لەگوندی قەڵەڕەشە ئیتر دەبێ بە وریایی و دوور لە سێڕای سەردەشت بێوران قەڵەڕەشە، بە هەورازێکی کەمدا با ئەدەیتەوە و ئەو مەسافە ئەبڕیت و ئەگەیتە بێورانی خوارو و سەرو، کونە مشکەی، کە جوانترین گوندەکانی ناوچەکەن، قەتارەی چناری باڵابەرزو پارچە زەویەکانی کەجیا جیا کراونەتە کشتوکاڵ و زۆریشان بەوێنجەی سەوز داپۆشراون و پەرژینیشیان درەختی(عناب) سنجەی بولینەیە، دیمەنێکی جوان و دڵفرێنیی هەیە.

بەڵێ هەرهەمان ڕۆژ عەسرێکی درەنگ بەو دۆڵەدا کە ئەم بەرو ئەوبەری باخ و مەزراو دارگوێزی بەتەمەن و گەورەگەورەی لێیە، هەرسێ گوندی وردەو بنوخەڵەف و کانی زەردمان بەجێهێشت و بەلای دەستی چەپی چۆمی قاسمەڕەش و نۆکاندا بەڕێگایەکی لاپێ و ولاخەڕێدا گەیشتینە ناوزەنگ، ئێرە بارەگای جەنابی مام جەلالە و نەوشیروان مستەفا و مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی و چەندین بارەگای تری ئۆرگانەکان و حزبی لێیە بڕین و تەیکردنی ئەم ڕێگایە لەهەورامانەوە بۆ ناوزەنگ و شێنێ بەپێ و پیادەڕەو بۆ ئێمە دەیان بارە بۆتەوە.

لەناوزەنگ لەسەر ڕێگای گوندی شێنێ- قاسمەڕەش بازاڕی قاچاخچی لێیە، بەردەم بازاڕەکە بارەگای زیندان و عەلی شامار لەوێ بەڕێوەبەری زیندان بوو. شەو هێزەکە دابەش بوو بەسەر بارەگاکاندا، ئێمە مەفرەزەکەی کەرتی دووی هەورامان چووینە لای عەلی شامار، جگە

باوکم، ئەو چوو بوو بۆ بارەگای مەلا بەختیار. بۆ ئەوەی لەوێ پشوو بدات، چونکە دوو بەیانی دابەش ئەبین بەسەر ئەو بەرزاییانەدا کە ئیتر پاسەوانیی لێ ئەکەین، شەوی یەکەم، پشووماندا، بەیانی هەر لەوێ بووین، بڕیاربوو بۆ ڕۆژی دووەم بچین و دەورو تەسلیم لەگەڵ ئەو هێزەدا بکەین کە لە واجبدان.

شەوی دووەم پێشمەرگەیەکی هەرێمی یەک هات و ووتی کاکە حەمە، کاک حەمەی حاجی مەحمود لەماڵی مام جەلالە داوات ئەکەن، من یان ناردووە بە دواتدا. خۆم کۆکردەوەو چوومە سەرەوە، بارەگای مام جەلال خانوچکەیەکی لاروکۆم و نزم و هەیوانێک بەرهەڵا لەژوورەوە هۆدەیەک کەچرایەکی دەستی لێ هەڵکراوە. سەلامم کردو مام جەلال ووتی وەرە لێرەدا دانیشە، کاکەحەمەو هێرۆخان و پیاوێکی تری لەش و لار باریک و دەموچاو شیرین و خوێنگەرم لەوێ دانیشتبوون.

دوای چاکی و چۆنی مام ووتی: حەمە ئەم پیاوە ئەناسی؟ ووتم نەوەڵا مامە، بەڵام لە دڵدا ڕەحمم بۆی جوڵیووە، مام ووتی: ئەمە کاکە عادلە، ئازاد هەورامی خزمی خۆتانە، من پێشتر ساڵی ١٩٧٤ کاک ئازادم بینی بوو کاتێک خوێندکاری پێنجەمی سەرەتایی بووم، ئەوکات ئەو بەرپرسی ئوردگای شەهید لەیلا قاسم بوو لەگوێزە زەردی گوندی سۆسەکان، بەڵام جارێکی تریش لەسەرەتای ئەم شۆڕشەدا هاتووبوە ناوچەی هەڵەبجەو هەورامان ساڵی ١٩٧٧ ئەوکاتە من نەمبینی بوو. بۆیە قەد نەم ئەناسیەوە، ئەگەر جەنابی مام جەلال نەیناساندایە.

چایەکیان دامێ و مام بۆی باسکردم، بە ئیشێک ئازاد هەورامی ئەبێ بچێتە ناوچەی هەورامان، سبەینێ ئەبێ تۆ بیبەیتەوە، پرسی چەند پێشمەرگەت لەگەڵە؟ ووتم: دە کەس ،ووتی زۆرباشە، کاک ئازادیش خۆی دوانزە کەسی لەگەڵدا بوو.

ئازاد هەورامی کوڕی مەجید بەگی غەفار بەگی جەعفەر سوڵتانی هەورامانە. کە خەڵکی شارۆچکەی نەوسوودە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، لە دەورانی عەشایری دا بە تایبەت لە دوای کێشەی ڕژێمی شاهەنشای پەهلەوی و لەشکر کێشی بۆ سەر هەورامان باوباپیری کاک ئازاد ئاوارە ئەبن و دێنە عێراق، سەرەتا لە ناوەڕاستی عێراق و دواتر ئەگەڕێنەوە بۆ کەرکوک. کاک ئازاد جگە لە هەورامیەکان لەگەڵ جوانڕۆیەکانیش خزمایەتی هەیە.

لە دوای ئینقلاب و ئەو بارودۆخە سیاسیە لە ناوچەکانی کوردستانی ڕۆژهەلات دا هاتبووە ئاراوە، ئەبوو کاک ئازاد بێتە ناوچەکەو لەگەل کەسوکارو بنەماڵەکانی خۆیان و هەندێک سەرۆک هۆزو تیرەکان قسەو گفتوگۆ بکات، برێک چەک و تەقەمەنیشیان بەدیاری بۆ بهێنێ. زۆرێک لەم سەرۆک هۆزو تیرانەی ناوچەی جوانڕۆ کەجافەکانن و بەشێک لەهەورامیەکان چەکی مخابەراتی عێراقیان وەرگرتبوو دابەشیان کردبوو بە سەر خەڵکدا، ئێمەش بەڕێنوێنی مام جەلال هەوڵمان ئەدا ئەمانە بە ناوی دەفتەری مامۆستا شێخ عیزەدینی حسێنییەوە ئیش و کار بکەن و دوور بکەونەوە لەوەی ڕژێمی بەعس پێیان ئەسپێرێت، زۆرێک لەوانە دەوری باشیان بینی و ئەو چەکو چۆلەی لەعێراقیان وەرئەگرت بۆ شەڕی دژی ئێران بەشی ئێمەشیان لێئەدا، ئەوی تریشی دواتر بووبە مولکی حیزبە کوردستانییەکانی ڕۆژهەلات، لەوانە حامدی حەمە تاهیر بەگ و چەند کەسێکی تری ئێناخی، ئیمامی، جوانڕۆیی، هەورامی و باوەجانی.


لەراستەوە: مولازم عومەر، مام جەلال، کاک ئازاد و [illegible]

بەلێ مام ووتی: ئەبێ سبەینێ تۆ بگەڕێیتەوەو کاک ئازاد بەرێتە هەورامان، بەڵام ئەبێ زۆر وریاو ئاگادار بیت بەسەلامەتی بیگەیێنیتەجێ. منیش ووتم بەسەرچاو، زۆریشم پێ خۆش بوو ماوەی ئەو مانگە لەوێ نەمێنینەوە.

دواتر لەگەل کاکە حەمەو کاک ئازاد ڕێک کەوتین کەلەکوێوە بڕۆین و چۆن لەڕێگا کاک بەکری حاجی سەفەر لەسنوری هەرێمی ٣و کاک ڕەئوفی خەلیفە سەعید جێگری هەرێمی ١یەک لەسنوورەکانی خۆیاندا هاوکاریمان ئەکەن. سەر لەبەیانییەک لە ناوزەنگەوە کەوتینەڕێ هەر بەهەمان ڕێگای خۆماندا تا گەیشتینەوە گوندی بێژوێی ئالان.

لێرە لەبێژوێ کاکە حەمەی مەلا عەلی کەپێشتر باسم کردووە، لەگەل کاکە عەلی شیعەدا هاتن و پێشوازیان لە کاک ئازاد کردو ١٠٠ سەد تفەنگی

برنەوی جۆری سەلیبیان تەسلیم کردین. ئەو چەکانەمان مەسافەیەک بە قاترو هەندێک جار بە ماشێن گواستنەوە تا گەیشتینە گوندێکی تەنیشت بلەکێ، لەوێ لای مامۆستا شێخ جەلالی برای شێخ عیزەدین لاماندا و دوای پشودان، لەوێش+ ٢٠ بیست سندوق فیشەکی برنەومان وەرگرت، لەبلەکێ و چەمپاراو ١٥ قاترمان بەکرێ گرتن و بارمان لێ بارکردن و بەرەو شارباژێڕ کەوتینە ڕێ تا گەیشتینە چاڵە خەزێنە.

من بۆ خۆم ڕێزی تایبەتم بۆ کاکە ئازاد هەبوو، خۆیشی پیاوێکی بەڕێز و بەئەدەب بوو، حورمەتی هەموو کەسی ئەگرت، لەڕێگا برین و ئەرکی پێشمەرگانەشدا گورج و گۆڵ و چوست و چالاک بوو. گواستنەوەی نزیکەی ٢٠ بیست بار چەک و چۆڵە بەباری قاترو بەپێ، لەئالانی سەردەشتەوە بۆ ناوچەی نەوسوودی هەورامانی ڕۆژهەڵات، ڕێگایەکی دوورو درێژو پڕ لە هەورازو نشێو برینی سەدان کیلۆمەتر دەشتودەر، پەڕینەوە بەسەر دەیان چۆم و ڕێگای گشتی نێوان شارو شارۆچکەکانی ناوچەکە و بەنێوان و بەپەنا دەیان سەربازگەو ڕەبیەی دوژمنەوە، لەچەندین جێگەدا شوێنی بۆسەدانانی دوژمنە، ئەبێ بیبڕی و بیخەیتە پشت سەر ئەمە بۆ هەموو کەس کارێکی ئاسان نەبوو.

پێشمەرگەکانیش زۆریان شارەزای بارکردن و لێخوڕینی وڵاغ نین بەبارەوە، بۆیە ئەرکی ئەم ڕێگا پڕ زەحمەت و نارەحەت و مەترسیدارە لەئەستۆی خۆم و باوکم و فەیسەڵی مام کاکلدا بوو. بەڵام کاکە ئازاد لەیەکەم هەنگاوەوە تا گەیشتنمان بە جێگەی مەبەست لە ئێمە زیاتر هیلاک و ماندوو ئەبوو. چەند ڕۆژێک لەگوندەکانی بەرکێو و لەناوچەی شارباژێڕ بەیاوەری کاک بەکری حاجی سەفەرو هێزێک، گوند بەگوند هاتین و تا گوندی سیامێوە پێکەوە بووین.

ئەو قاترەوانانەی لەسنوری شارباژێڕەوە هاتبوون لەگەڵمان لە نزیک گوندی سیامێوە دامان نان و نەمان هێشت بزانن چەک و چۆڵەکە لەکوێ دائەنێین، خۆمان بە دزی خەڵکی سیامێوەو خاوەن قاترەکانەوە، کاروانەکەمان لێخوڕی بۆچەمی چەقان، لەخوار ئاوایی بۆڕیەرەوە لە ناو بێشەو چەم و چوخوڕدا بارەکانمان شاردەوەو قاترەکانمان بردەوە بۆ قاترەوانەکان و ئەوان گەڕانەوە بۆ شارباژێڕ و خۆشمان چووینە ناو ئاوایی سیاومێوە.

سبەینێ پاش نیوەڕۆ ١٥ قاترمان لەگوندی سیامێوە وەرگرت و پێمان ووتن قاترەوان نابێ بێت لەگەڵمان ئێشمان بەم قاترانەیە و دوای دوو ڕۆژی تر بۆتان ئەهێنینەوە.

هەرچەندە ئەمە بۆ ئێمە نارەحەت و ئەرکێکی قورس بوو کە ١٥ پانزدە قاتر بگەێنینە هەورامان، چونکە ئیتر لە شارەزووردا قاتر نەبوو. نەئەشمان توانی لە هیچ جێگەیەکدا لابدەین و باربخەین، ئەبوو لە سیامێوەوە ڕاست بۆ هەورامان بێ پشوودان ئەو مەسافە ببڕین. لێرە کاکە بەکر و هێزەکەی هەرێمی سێ گەڕانەوە و کاک ڕەووفی خەلیفە سەعید و ئەحمەد قەدەفەری هاتن بۆ ئەوەی تا نزیک خورماڵ لەگەڵماندابن.

عەسرێک لەچەمی چەقان لەخوار گوندەکانی بۆڕپیەر و جۆمەرەسیەوە بارەکانمان بارکردوەوە و تاریکی کرد، بەبەردەم گوندە وێران کراوەکانی بەردەبەل، نەوێدا و بەتەنشت ڕیشێن و بەبەردەم میری سوورو عامورەدا هاتین و لەگوندی کێڵەک لامان دا تا پشوویەکی کورت بدەین، بەڵام بارەکان هەر لە سەر پشتی قاترەکان بوو، لەناو حەوشەیەکی گەورەدا، کەهی ئەو ماڵەی لامان دابوو، پێم وابێ ماڵەکەش ماڵی حاجی ساڵح بوو، باوکی مەحمود کارگێڕی مەڵبەندی شارەزوور. لێرە لەکێڵەک نان و چایمان خوارد نزیکەی کاتژمێر یەکی شەوبوو.

دوای پشوویەکی کورت کەوتینەڕێ و کاک ڕەوۆف و برادەرەکانیشی خواحافیزیان لێکردین و ئێمەش لەکوڵکنییەوە جادەی گشتی خورماڵ زەڵممان بڕی و بەرەو گۆمەلار کەدوا گوندی ئاوەدانی دەشتی شارەزورە کەوتینەڕێ. لە هەر جێگەیەکدا بەسەر جادەی ئیسفادالت (قیر) گوزەرمان ئەکرد، قاترەکان زۆر زەحمەتیان ئەداین، بەزۆر بەسەر قیرەکەدا ئەپەڕینەوە، لەدەشتی شارەزوریشدا پەڕینەوە لەچەند جۆگەیەک بەهیلاکی ڕۆیشتین، زۆر بەپەلەبێن بۆ ئەوەی ڕۆژمان لێ نەبێتەوەو دەستمان بگاتە بنار، قاترەکان هەندێکیان بڕیان نەئەدا، کەدنیا ڕووناکی کرد وێرانەی گوندی چۆڵکراوی خەرپانیمان بەجێهێشت، چەند پێشمەرگەیەک خۆیاندا بەئەرزدا، ووتیان چیتر ناتوانین ڕێگە بکەین. کاک ئازاد پرسی بۆ شوێنی ئەمین و قایم؟ پێم ووت یەک کاتژمێری تر، بۆیە بەقسەی خۆش وردە وردە پێشمەرگە ماندوو یەک کەوتووەکانی هێناو کاتژمێر٨ هەشتی سەر لەبەیانی گەیشتینە باخەکانی

بەردەم گوندی بەلخە، لەجێگەیەک کەپێی ئەووترێت سۆلە، لەناوباخ و چەم و بێشەلانەکاندا بارەکانمان لە قاترەکان کردەوە و خۆمان لە جێگەیەک مانەوەو ولاخەکانمان لە جێگەیەکی دورتردا شاردەوە لەناو جەنگەڵدا.

هەنارو ترێیکی زۆر بەم پایزە درەنگە بەدارەکانەوە مابوو، سەیرمان نەکردو تواناى لێکردنەوەیمان نەبوو. لێرە دوای یەک کاتژمێر پشوودان باوکم و بەهمەن هاواری ڕۆیشتن بۆ دۆڵە هەنجیر بۆلای کاک غەفور دمرەشیشی تابێن بە دەممانەوە.

دوای نیوەڕۆ بەهمەن هاتەوە ووتی بارەگاکە لەوێ نەماوە و چۆڵە، لەهاوار خەڵکی لێیە پێیان ووتوین جەماعەت لە شوشمێن، باوکت چوو بۆ شوشمێ و ووتی ئەوانیش بابەرەو ئەوێ بێن، ئێمەش بارەکانمان بارکردەوە و بەرەو گوندی پالانیا ڕۆیشتین. بۆ لای عەسری ئەو ڕۆژە گەیشتینە چۆمی پالانیا بینیمان کاک غەفورو د.کەمال شاکرو هەڤاڵەکانیان واهاتن بەپیرمانەوە، باوکم گەیشتووە شوشمێ و ناردبوونی بەدەمانەوە.

لێرەوە ئێمە مەفرەزەکەی خۆمان و چەند پێشمەرگەیەکی تری کەرت و چەند پێشمەرگەیەکی ناوچەش بە دەستی ڕاستدا، قاترو بارەکانمان بردو ڕۆیشتین بۆ سەر کانی و ئاوی پەرونی، کەدوای نیوکاتژمێر پێی ئەگەین، کاک ئازاد و دەستەکەی خۆی و کاک غەفورو چەند کەسێکی تر بەدەستی چەپ دا بەرەو گوندی شۆشمێ و نەوسوود ڕۆشتن، ئەوانیش هەر نیو کاتژمێر ڕێگەیان ماوە، ئیتر ئێمە خەیاڵ ئاسوودە بووین، چونکە لەسەر سنوور و ناوخاکی ئێران داین، باوکیشم تاقەتی نەبردبوو لە شۆشمێ پشووبدات، شەو هاتەوە بۆ لامان بۆ پەرونی. خانە باخ و کەوێلەکانی هەوارەکانی پەرونی چۆڵ و هەواش ساردی کردبوو، بارەکانمان داگرت و قاترەکانمان مەرەخەس کردەپاونێک بۆ ئەوەی بحەوێنەوەو بلەوەڕێن. خۆشمان چەند خانە باخێکمان پاک کردەوە و چایمان لێنا ئەو شەوە تا بەیانی حەواینەوە و وەک ڕێگەمان نەبری بێ وابوو.

سەر لە بەیانی کە زوو هەستاین باوکم هەریەکە ئیشێکی بۆ دیاری کردین. چەند کەس خۆڵ هەڵکەنین و قوڕبگرینەوە، چەند کەس نان و چایی ئامادە بکەن، خۆی و چەند کەسیش سواقی دیواری وشکەکەڵەکی خانە باخەکان بدەن. دوو پێشمەرگەش پشتیوان مەجید و بەهمەن هاواری بچنە

دۆلە هەنجیر، هەندێک کتری و قۆری و قاپ و قاچاخ لەوێ جێماوە بیهێننەوە. کاتێک ئەم دوو پێشمەرگە کەوتنەڕێ و کەمێک سەرکەوتن و لەئێمە دورکەوتنەوە، بەراکردن داگەڕانە خوارەوە، بانگمان کرد هاچییە؟ ووتیان سەیرکەن پشتمان گیراوە.

دیارە هەر ئەم شەو کەئێمە گەیشتوینەتەجێ هێزێکی تایبەتی سوپای عێراق کەزۆر جار بەپارتیزانی دەرئەچوون و ئۆپەراسیۆنیان ئەنجام ئەدا بەدوامانەوە بوون، دواتر ئەوترا بەڕێنوێنی پێشمەرگەیەک کەپێشتر لامان بووە و دوایی تەسلیم بۆتەوە، ئەو هێزە تایبەتەی ڕژێم هاتووەو پشتی لێگرتوین، ئەفسەرێک فەرماندەی ئەم هێزە بوو بە ناوی فەریق ناسراو بە فەریقی لەیلا، ئێمە هیچ نەشڵەژاین و زوو بەپەلە خۆمان کۆکردەوەو لە دوو قۆڵەوە بەرەو دوژمن چووین.

ئەم دوو دەستە بەچەکی کلاشێنکۆف و چەند کەسیش بە تفەنگی برنەو وەک پشتیوانی دوو دەستە هێرش بەرەکە دانران. کاتژمێر هەشتی سەر لە بەیانی تەقەو لێکدان دەستی پێکرد، لە کاتژمێر ١٠ی بەیانییەوە چوار٤ کۆپتەر بەسەرمانەوە دەرکەوتن. لەپەلاماری یەکەم و سەرەتادا ئەو هێزانەی شۆڕ بووبونەوە هەڵبڕان و دوخرانەوە بۆسەر بەرزاییەکان. ئەو چەکانەی کەوەک پشتیوان دانرابوون نەیان ئەهێشت دوژمن سەر دەربهێنێ. کۆپتەرەکان بە شەستیرو جۆرێک لە ساروخ دەورو بەرمان و خانە باخەکانیان دابێژا.

هەر لەسەرەتای دروست بوونی شەڕەکەوە، کاک ئازاد هەورامی و ئەوهەڤاڵانەی ئێمە لەگەڵیدا ئێوارە ڕۆیشتبون بۆ شۆشمێ و نەوسوود کەوتبونەرێ بەرەولای ئێمە، لەگەڵ چەندین کەس لەخەڵکی نەوسوود و شۆشمێ هاتوون بەدەممانەوە، ئەو ڕۆژە ئەوخەڵکە دەوری بەرچاویان هەبوو بۆهێنانی نان و ئاو خواردەمەنی و گواستنەوەی کەلوپەلو دەرکرنی ئەوچەک و تەقەمەنییەی هێنابوومان، جێگەی خۆیەتی ناوی کەمال ئەحمەد ناسراو (کەمالی ئەحەی) شۆشمەیی بهێنم، جگەلەوەی پێشڕەوی خەڵکەکە بوو وەک گەنجێکی گورجوگۆڵ چاونەترس خۆی گەیاندە سەنگەری پێشەوە بۆلای ئێمە، کاک ئازادو ئەوخەڵکە لەڕێگا کۆپتەرەکان شپرزەیان کردبوون و

چەند پێشمەرگەش بریندار بووبون، بۆیە دواکەوتن و تا گەیشتنە لای ئێمە چەندین گردو تەپۆلکەمان لەچیای بەندەنی پەروونی لە دوژمن سەندەوە.

ئیمڕۆ شتێکی خۆش لەنەوسوود ڕوویدا بوو، سەربازگەیەکی سەربازی ئەرتەشی ئێران لەملەسەروای نەوسوود هەبوو، لەکاتی سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێراندا، هیچ سەربازگەیەک لە ناوچەکە دەستی نەدرابوو، کەسێکی خەڵکی نۆدشە بە ناوی حەمە کوکو چوبووە لای ئەفسەری سەربازگەکە و وتبوی ئەوە عێراق هات و ئێوە بۆ بێدەنگن، ئەویش وتبوی ئەوە سەر سنوورە و لەگەڵ پێشمەرگە شەڕە ئێمە هیچ دەستورێکمان پێنییە، حەمە کوکو ووتبوی خومپارەیان بۆ بهاوێژن، ئەویش ووتبوی ناتوانین و دەستورمان پێ نییە، حەمەکوکو میلی تفەنگی لێراکێشابوو ووتبوی من دەستورت ئەدەمێ.

ئەفسەرەکەش چەند گوللە هاوانێکی لە نەوسوودەوە هاوێشت و لە نێوان ئێمە و سەربازە عێراقیەکاندا کەووتن، ئەمە زۆر باش بوو بۆ ئێمە، دوای ئەوە ئیتر کوپتەرەکان لە قوڵیی ئاسمان توند بوون و کوێرانە قەسفیان ئەکرد.

لای عەسر پێشمەرگەیەک هات ووتی کاک ئازاد هاتووە لەپشتی کانی بلێسەنە[1] داوات ئەکات، هاتمە خوارەوە، بینیم کاک ئازاد زۆر ماندووە، دەست خۆشی لێ کردین و ووتی ئێمە زوو هاتین بە دەمتانەوە بەڵام کوپتەرەکان شپرزەیان کردین بۆیە دواکەوتین، من دەست خۆشیم لەوکردو پێم ووت نەئەبوو وەپێویستی نەئەکرد تۆخۆت بخەیتە بەردەم ئەو مەترسیە[2]، ووتی باوکیشت هەروای پێوتووم، بەڵام ناچۆن ئەبێ ئێوە هێرشتان لەسەر بێت و

---

[1] - کانی بلێسەن کانییەکی بەهارەیە ئەویش ئەکەوێتە دامێنی چیای بەندەن لەسەروی دەستەچەپی کانی پەروونەوە، کانیە بەهارەکان ئەوکانی و ئاوانەن کە بەبەهاراندا ئەتەقن و ئاویان زۆرە بەڵام زۆرجار لەنیوەی وەرزی هاوین دا وشک ئەکەن، مەگەر ساڵ تەڕەساڵ بێت کانیە بەهارەکان تاوەرزی پایز ئاوەکانیان بمێنێ و وشک نەکەن.

[2] - بیرم لەوە ئەکردەوە، کە لەناوزەنگ دەرچووین مام جەلال پێی وتبووم: ئەبێ ئاگات لەکاک ئازاد بێت، بۆیە تا ئەوکاتەی گەڕایەوەو ناوچەکەی بەجێهێشت من هەرلە دڵەڕاوکەدا بووم دوای گەڕانەوەی ئەو گەیشتنەوەی بۆلای مام بەسەلامەتی هەستم بەسەرکەوتن ئەکرد.

ئێمە لەدورەوە تەماشاچی بین، ئەوە چەک و تەقەمەنییەکانم ناردووەتە خوارەوە بۆ ئەودۆڵەی خوارتر هیچی لێرە نەماوە، تاریکی کرد ئەبێ ئێرە چۆڵ بکەین.

بەکاک ئازادم ووت تۆ بڕۆرە خوارەوە، چەند پێشمەرگەیەکم لەگەڵیا گەڕاندەوە، ووتم ئێمەش دوای تاریک بوونی هەوا دێینە خوارەوە بۆلاتان، لەمکاتەدا بەدوربین تەماشای خوارەوەم ئەکرد، بینیم کەسێک بەکۆڵی باوکمەوەیە، پێشمەرگەیەکم نارد ووتم برۆ بزانە ئەوە کێیەو یارمەتی باوکم بدە، ئەوەندەی نەبرد پێشمەرگەکە هاتەوە ووتی حەمەهاواری بوو پێی لەجێ چووە، خالۆ حەمەسەعید بردیە خوارەوە ووتی تۆبگەڕێرەوە بۆلای حەمە.

ئەو پێشمەرگانەی ئەو ڕۆژە دەوری بەرچاویان هەبوو ئەوەندەی لە بیرم بێت ئەمانەبوون. فەیسەڵ مامە کاکلی وەهاب، ڕزگارمحی الدین، لەتیفی حەمەی مەلاسابیر، شەهیدکەریمی برای، شەهید حەمە تۆفیق شخ حەمەئەمین، حەمە سەعید عەلی (باوکم)، کەریم شێخ عەلی و پشتیوان مەجیدو وەستائرایمی مام مەجید......... تاد. داوای لێبوردن لەوانە ئەکەم کە ناوەکانیانم لەیاد نەماوە. خاوەن قاترەکانی گوندی سیامێوەش چاوەڕێی ئەوەن ئەم ئێوارە قاترەکانیان بگاتەوە دەستیان، بەڵام چەند قاترێکیان ئەم ڕۆ بەگوللەی کۆپتەرەکان کوژران.

ئەوانەی مابوون دوای هەفتەیەک شەهید حەمەی حاجی توفیقی تەپەکورەی بردنییەوە. ئەم شەو ئێمە پەروونی و خانە باخەکانمان چۆڵ کرد و چووینە خوارتر بۆ جێگەیەک بە ناوی هاکلێ و لەوێ بارەگامان داناو خەریکی ئیش و کاری ئاسایی خۆمان بووین، کاک ئازادیش دەستی کرد بە جەولە کردن لەسنوری پاوە و نەوسوودو نۆدشەدا و دوای تەواوبوونی ئیش و کارەکانی گەڕایەوە بۆ ناوزەنگ.

# پەرونی دووبارە باوەشی بۆ گرتینەوە

کۆتایی بەهاری ساڵی ١٩٧٩ هێشتا وەرزی بەهار مابووی خشڵ و پۆپلانەکانی خۆی بداتە دەست گەرمای هاوین. بەهار بەو دڵگیری و شەنگیەی بە تایبەتی لە مەرزو بوومی هەورامانیدا شانە خڕێی لەگەڵ بەهەشتدا دەکرد، هەرچی ئێمەیشین لە خوامان دەویست ڕۆژێ زووتر هاوین س لاوە لەو لالەزارە بکات و ئەو دنیا کەسکە بداتە بەر لێزگی هەتاوی خۆی، چونکە ئەم وەرزە بۆ ئێمە سوودی هەبوو.


چیای بەمۆ و کالی پەرونی لە دیوی ڕۆژهەڵاتەوە

ئیتر نیازمان بە نوێـــن و پێخـــەف نەدەمـــا و لەهــــەر کوێیـــەک بمانویستایە نەخەوتین و ئەماینەوە گەرمـــامـــان دەکردە پێخەف، وردە وردە میوەی کێوی و باخەکان بە هانای برسیەتیمانەوە دەهاتن، گۆماوەکان بۆمان دەبوونە گەرماو و جەستەی شەکەتیان لەچڵک و پڵک سووک دەکردین. لەم وەرزەدا ئێمەی تەنیا باڵ دیتمان والەشارەوە پۆلێک روویان لە چیاکرد و بوونە هاوڕێ و هاودەممان، ئەوانیش کەسانێک بوون کە بیر و ڕایان لە حیزبەکەیان ترازا بوو، بە تایبەتی لە سەر ئەو بەرەیەی کە ساڵانێک بوو لەگەڵ حیزبی بەعسدا دایان مەزراندبوو، دەبوو زووتر دەرک بەوە بکەن کە بەعس سۆشیالیست نییە، بەڵکو فاشیستە. ئەم پۆلە هاوڕێیەی حیزبی شیوعی سەرەتا بریتی بوون لەتۆفیقی حاجی و ئیسماعیلی برای، عەبەی مامە، نەسرەدین هەورامی، مستەفای دەروێش قادر، نەجیمی سۆفی، عەبدوڵڵای مەلافەرەج، هاوڕێ ئەسکەندەر، پاشان محەمەد ڕەشید قەرەداغی،

مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی، ئیبراهیم سۆفی مەحمود (ئەبو تارا) و دکتۆر نەجمەدینیش کەپێشتر لای ئێمە بوو، پەیوەندی پێوە کردن،

دوای ئەوەی لەقەڵاگا و شێخان یەکترمان دیت، نامەیەکی مامیان پێبوو، ئەوەندەی کە لە دەستمان هات هاوکاریمان کردن و نزیکەی پانزدە پارچە چەکی شانی پێشمەرگەکانی خۆمان پێشکەش کردن، بارەگایان بردە کۆنە هەوارەکەی ئێمە هەزار پەز. پاشان ئەم برادەرانە گەشەیان کردوو، چوونە ئەو بەری سیروان و لەگوندی بەلەبزان بارەگایان چێ کرد. ئیتر وردە وردە زیادیان دەکرد و بۆ ئێمە گۆشەیەکی تەنیاییان ئاوەدان کردینەوە. دوای ئەوەی هێزەکەیان پەرەی سەند ئەبوتارا بەنازناوی مەلامحەمەدی جوانڕۆیی بەسیاسەت خۆی خزاندە ناو حیزبی دیموکراتەوە، لەملاشەوە لەڕووی چەکو تەقەمەنییەوە دەستی بەباڵی حیزبەکەیەوە بوو. واتە ئەبو تارا بە تیرێ دوو نیشانەی دەئەنگاوت.

یەکەم: هۆشیاری و زانیاری دەبەخشییە زۆرێک لە ئەندامانی حیزبی دیموکرات و گەرمتری دەکردن لە سەر شۆڕش. دووەم: بڕێکی باش چەک و تەقەمەنیشی بۆ حیزبەکەی خۆی دەستەبەر کردو لەو ڕووەوە بوژاندنییەوە. کاتێک کە لەبەلەبزان بوون، کاکە حەمەی حاجی مەحمود و پاشان کاک شەوکەتیش سەردانیان کردن، ئیتر جاروبار پێکەوە کۆئەبووینەوە لەناوچەی هەڵەبجە و هەورامان هاوکاری یەکترمان دەکرد و زانیاریمان ئەگۆڕییەوە.

ڕۆژێک پێکەوە کۆبوونەوەمان هەبوو لەچەمی پاڵانیا لەباخێکا بەناوی ڕێزە کەباخی بارام بەگی خاوەن نوکتە خۆشەکانە. پێش ئەوەی کۆبوونەوەکە دەست پێ بکات، غەفوور دەرەشیشی مام هادی ناردبوو کورتان بکڕێت بۆ قاترەکەمان، لەو هاوینە هەوارەی دیوی ئێران کەمەشهورە بە پیرپزاز خاوەنی ئەم باخ و هەوارە پیاوێکی بەڕێزو خزمەتکارو کورد پەروەر بوو بەناوی ئەحەکوێر کەخەڵکی گوندی شۆشمێی خوارووە، مام هادی گەڕایەوە و فریای کۆبوونەوەکە کەوت، دوای س لاوە کردن یەکسەر دانیشت و ووتی: کاک غەفوور کورتانەکە بەحەوت دینارە. هەڤاڵەکانی حیزبی شیوعی سەیرێکی یەکتریان کردو شڵەژان و لە کۆبوونەوەکە هەستان. ئێمەش ووتمان چی ڕوویداوە؟ ووتیان ئێوە پیلانێک دەگێڕن، ووتمان پلانی چی؟ ئەوە نییە مام هادی بەنهێنی قسە ئەکات؟ ئێمەش دەستمان بەپێکەنین

کردو ووتمان هەر بەڕاست چوە کورتان بکرێت. د. کەمال شاکیر دایناوەوە و کۆبوونەوەکەمان تەواو کرد.

لەم سەرو بەندەدا ئێمەیش دووبارە بارەگامان گواستەوە بۆ سایە-چیای بەندەن و هاوینەکەی لەدەستە چەپی کانی پەرووونیدا لەسەر کانی گەومگی بارەگامان دانا، لێرەوە بۆ بەدەست هێنانی پێویستیەکانمان هات و چۆی دیوی ڕۆژهەلاتمان ئەکرد بەتایبەت بۆ شارۆچکەی نەوسوودو گوندەکانی دەوربەری. هەرلێرەشەوە دادەبەزین بۆ شارەزوور و هەڵەبجە و حورمال و تەوێڵەو بیارە بۆ چالاکی کردن و مەفرەزەکانمان بەردەوام لە جوولە و بزاووتدا بوون. کەرتی یەکیش کە هەڤاڵ مەحمودی حاجی فەرەج ـەرسراوی بوو لەگەڵ پێشمەرگەکانی لیژنەی ناوچەدا کەمامۆستا سەرکەوت ـەرپرسیان بوو بارەگایان لەدەرە وەزلێی خوار گوندی شۆشمێ وە ـامەزراند.

کەرتەکەی ئێمەش زستانەکەی ماوەیەک لەتیراوێ و دەمێکیش ـەاکێ کە موڵکی شۆشمێییەکان بوون بارگەمان خست. هاکێ گوند نییە، ـەلکو خانەباخ و هەواریکە بەچەشنی گوڵێ درابوو لە سنگ و بەرۆکی ئەو ـەربەندەی کە هەموو جوانییەکانی سروشت ڕەنگی خۆیان بەسەردا پژاند بوو. ئەم تاقە ماڵە لە درزی درەختەکانەوە چاو باشقەڵێی لەگەڵ پەرووونیدا ـەکرد و ئەویش بۆ دڵدانەوە مەمکی کانیاوەکەی نیشان دەدا. بەیانیانیش ـەگەڵ پەخش بوونی ئەگریجەی هەتاودا باڵندەکان کۆنسێرتێکیان دەگێڕا ئەو ـەوروبەرەیان مەست دەکرد بە ئاوازی جریوە و قاسپە، ئێمەش حەیران حەیران چەندێ ئاوازی دڵگیر شەقەی ماچی لەپەردەی گوێمان هەڵدەستان، ـەومەندەش چاومان دەبوونە پیشانگای دەیان تابلۆی جادووباز، بە تایبەتی ـرەختەکان کەگزنگ باڵی زێڕەوشان دەکردن و هەر گەڵایەکیان بە وێنەی ـیرەیەک جیلوەیان دەبەخشی بە هەوارگەی دەروون.

لەولاوە سیاچەمانەی چۆمەکەو وردە بەزمی چۆگەلەکان هاوڕێ ـەگەڵ لاروولەنجەی گوڵباخەکان و کەرویشکەی گژوگیادا، سیحرێکی دیکەیان لێدەکردین و وەهامان دەهات بە خەیاڵدا کە باوە ئادەم لە بەهەشت دەرکرا ئەم شیوە شیاوەی کردۆتە پایتەخت.

خانە خوێی یەکێ لەهەوارە تاقانەکەی ئێمە کردبوومانە لانکە، ژنێکی دڵپاکی ڕوو خۆشی دەست ب لاوەی کورد پەروەری چوست بوو بە ناوی مەتی عوزرا کە ئێمە لە دڵەوە ناومان نابو دایکی پێشمەرگە. تیراوێیش بە هەمان شێوە بازاڕی جوانی گەرم بووە هەردووکیان بۆ ئێمە لانەیەکی نیان و پڕ بەرامەبوون.

لە مانگی ٦ و ٧ ی ئەم ساڵ ساڵی١٩٧٩ کادرەکانی کۆمەڵە بەرنامەیەکیان داڕشت بۆ ئەوەی ئەم هێزەی هەورامان لەهەرێمی یەک داببڕن. ئەم بەرنامەیە لە سەرئەوە چەقی بەستبوو کەحەمەی حاجی مەحمود پشتیوانی زۆرینەی پێشمەرگەکانی شارەزوور سەر بە باڵی بزووتنەوەی سۆشیالیستی ناو یەکێتیی بوون دەکا، گوایا خەڵکی گەندەڵ و بێڕەوشت و سەرەڕۆیان تێدایە، جگە لەوەش پارە لەخەڵک و قاچاخچییەکانی سنوورەکە وەردەگرن. ئەیانووت لە ناو گوندەکانیشدا کاری نەشیاوو نا بەجێیان ئەنجام داوە. کادرەکانی کۆمەڵە ئەوانیان بە وررده بۆرژواو هێزێکی بێ سەروبەر دەزانی و ئەیانووت حەمەی حاجی مەحمودیش هیچ لێپرسینەوەیەک لەگەڵ کەسیاندا ناکات، لە ڕاستیدا حەمەی حاجی مەحمود بزووتنەوە نەبوو زیاتر پشتگیری کۆمەڵەی ئەکرد. بزوێنەری یەکەمی ئەم بەرنامەیە مامۆستا پشکۆ و کادیرەکانی کۆمەڵە بوون لەبەری هەڵەبجە و هەورامان کە لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا دەستەملانی لیژنەی ناوچە بوو بوون و ناوچەش بۆخۆی ژمارەی کەرتێک پێشمەرگەیان هەبوو.

کاک حامدی حاجی خالید کە تازە لە زیندانی پارتی ئازادبوو بوو چونکە لە کارەساتی هەکاری دیل کرابوو، بە بڕیاری کردیان بە بەرپرسی هەموو هێزەکەی هەورامان، دوای ئەوەی کە هات و پاش ماوەیەک وەزعەکەی بۆ دەرکەوت دڵی نەیگرت و گەڕایەوە بۆ شارباژێڕ لە هەرێمی سێ لای بەکری حاجی سەفەربوو بە جێگری هەرێمی ٣سێ، حامد پیاوێکی سادە و ساکار و دڵ سافە، حەوسەڵەی ژێر بە ژێر و ئیش و کارێکی نییە کەمل شکاندنی هاوڕێکانی خۆی تێدا بێت.

لەوبەریش کاک ئەبوشەهاب کە بەرپرسی لق بوو لەگەڵ کاک ئاسۆی شێخ نووری لەبەری سووڕێن و شارەزوور کەوتنە دژایەتی کردنی حەمەی حاجی مەحمود و نیازیان خراپ بوو بەرامبەری، ئاگری ئەم کێشەیە :

ـحەات تاوی دەسەند و دەستێکیش نەبوو ئاوێکی بە سەردا بپڕژێنێ، دواجار کاربەوەگەشت بە تایبەتی لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠ دا کاکەحەمە و جێگرەکەی ڕەئوفی خەلیفە سەعید لەگەڵ ژمارەیەک پێشمەرگەدا جیابوونەوە و لایان چۆڵ کردین، دواتر دەرکەوت ئەو ئاژاوەو ودووبەرەکیە زیانێکی گەورەی بە یەکێتیی گەیاند لەسنوورەکەماندا وبرینێکی قوڵی لەجەستەی یەکێتیی دا دروست کرد.

لە٢٥/ ٦/ ١٩٧٩ دا بە مەفرەزە دابەزیبوومە شارەزوور و دەوروبەری هەڵەبجە و خورماڵ. دواتر کەگەڕامەوە شۆشمێ، زانیم کەمەلا بەختیار هاتووە بۆ ناوچەکە و ڕۆشتم لەگوندی شۆشمێی سەروو بینیمن. پاش تاوێ لەگەڵ هەڤاڵ مەلابەختیار لە سەربانێک کەوتینە پیاسەکردن. ئەو هەواڵی خوارەوەی لێدەپرسیم، منیش بۆم باسکرد کە بۆ کوێ چووین و چیمان کردووە. پیاوێکی کورتە باڵای تێکسمڕاوی ڕەشتاڵەی خوێن گەرم هەنگاو هەنگاو لەگەڵمان دەجوولا و گوێشی بۆ قسەکانمان شل کردبوو. دوای تەواو بوونی باس و خواسەکەمان مەلا بەختیار پرسی: حەمە ئەم پیاوە دەناسی؟ووتم: نەخێر، ڕووی لەپیاوەکەش کردو ووتی: ئەی تۆ ئەم دەناسی؟ ووتی: بەناو ناسیومە بەڵام ئێستا ئەزانم حەمەیە، ووتی شکڵ و شێوەیم بەجۆرێک تر وێنا کرد بوو . مەلا ڕووی کردەوە بەلای منداو ووتی: حەمە ئەمە خزمتانە و ناوی مام عەبدول خالقی هەورامیە. بە ویشی گووت: بەڵێ حەمەی حەمە سەعید ئەمەیە. ئەو ڕۆژە بۆیەکەمجار بوو لەگەڵ پیاوێکی تێکۆشەری دێرین و نەرم و نیان ئاشنا بووم و تا ئێستایش ڕێزی تایبەتی لە لامە.

لەم کاتەدا هەواڵ هات کە مەفرەزەیەکی قیادە موەقەتە کەیەکێکیان خەڵکی گوندی هەجیجە بەناوی ڕەؤوف، لە نزیک دوو ئاوی نێوان نەوسوود - پاوە لە ئۆتۆمبێل ئاغای حاجی مەحمودی ئیمامیان دابەزاندووە و بردوویانە. ئاغا لە شەڕی کانی ژنان دا لەسەر قیادەی موەقەتە چەک کرابوو، کەچی ئیمڕۆ ئەوان دەیگرن لە سەر ئەوەی بۆتە یەکێتیی. بۆ سۆراغ کردن و لە داوخستنی مەفرەزەکەی قیادە و گێڕانەوەی ئاغای حاجی مەحمود هێزەکە تا گوندی هەجیج ڕۆشتن و لەگوندی داریان و وراوە هاتنەوە دووئاو.

لە٢/ ٧/ ١٩٧٩ مەلا بەختیار چوو بۆ سەردانی حزبی شیوعی لەگوندی بەلەبزان، لەوێشەوە لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگە بەرەو سەر پێلی زەهاو و قەسری شیرین ڕۆشتبوون بەنیازی ئەوەی لەڕۆژانی هەرەسی شۆڕشی ئەیلولدا مەلابەختیار هەندێ چەک و فیشەکی لەمەحمود قەجەر شاردۆتەوە بیان هێننەوە. یەکێک لەپێشمەرگەکانی لەگێڕانەوەیدا ووتی: لە دیوی ئێرانەوە پاچ و خاکەنازمان بردو دوای ئەوە سنوورمان بڕی وئاودیوی مەحمود قەجەر بووین، بەبێ هەڵەو گەڕان بەدوای شوێنەکەدا مەلابەختیار ڕاست بردینیە سەر شوێنەکە، دوای ئەوەی خاکەکەمان هەڵدایە وەچەکەکانمان دەرهێنان، ژمارەیەک کلاشینکۆف و بڕنەو دەمانچە، زۆریان ڕزی بوون، ژەنگ خواردبونی. دوای ئەوەی لە ناوچەی قەیتول و سوورمارەوە گەڕانەوە بۆلای جوانڕۆ و هەورامان ئەو چەکانەیان دابووە هەندێک دۆست و ناسراو لە ڕۆژهەلات.

# ڕۆژهەلاٌت لەدوای ئینقلاب

ڕژێمی پالەوی و دەستگا ئەمنییەکەی ساواک لەسەردەمی شادا دژایەتی یەکێتیی نیشتمانی کوردستانیان بەتوندی ئەکرد، بۆیە ئێمە مەفرەزەکانی سەرەتا لەسەرەتای سەر هەڵدانی خۆپیشاندانەکانی ئەوولاتە لە دژی شاو لەگەڵ بەرز بوونەوەی دەنگی یەکەم شعاری مرگ برشادا تا ئەو ڕۆژەی شۆڕشی گەلانی ئێران سەرکەوت، ئەوەی پێمان کرا هاوکاری خۆپیشاندەرانمان کرد بەتایبەت لە شارو شارۆچکە سنووریەکاندا.

لەدوای سەرکەوتنی شۆڕش لەئێران دا کۆمیتەی ئینقیلابی دروستکران، چەندین حیزبی چەپ و دیموکرات و کۆمۆنیست خەریکی کارکردن و بنکە و بارەگادانان بوون لە سەرانسەری ئێراندا، کوردستانی ڕۆژهەلاٌت جگە لەحیزبی دیموکرات، یەکێتیی جووتیاران کۆمەڵە، دەفتەری مامۆستا شێخ عیزەدین حسەینی و چەندین حیزب و گروپی تری ئێرانی وەک فیدائی ئەکسەریەت و ئەقەلیەت و کارگەرو پەیکارو.. تاد. لە بارودۆخێکی بێ سەروبەرو هەرکەس بۆ خۆیدا ئیشیان ئەکرد. هێزەکانی یەکێتیی بۆ هاوکاری شۆڕشەکە ماوەیەک بوو بەشێکمان لەوێ لەڕۆژهەلاٌت بووین، ئەو ناوچەش ئێمەی لێبوو زۆرتر لەناوچەی هەورامانی لهۆن و جوانڕۆدا بووین، لەوێ زورتر حیزبی دیموکرات خاوەن جەماوەر بوو، چەندین کادری بەتوانایان هەبوو لەوانە عەبدوللای بارامی، حەکیمی ڕەزای[1]ی.... تاد.

---

[1] - حەکیم پیاوێکی ئازاو بەجەرگ، کادرێکی حیزبی خاوەن بیروهۆش لەگەڵ ئەوەشدا فەرماندەرێکی بەدیسپلین بوو. خەلک خۆشیان ئەویست، لەکاتی کۆبونەوە جەماوەریەکاندا بەزیرانە سەرنجی خەلکی ڕائەکێشا. ڕۆژێک خەلکێکی زۆری ناوچەکەیان کۆکردبوەوە لە مزگەوتەکەی ئاوایی تەشاردا حەکیم قسەی بۆئەکردن وئێمەش لەوێبووین، پیاوێکی بەتەمەنی خەلکی ئاواییەکە بەناوی دەروێش حسەینی دەلاک لەناو خەلکەکەدا هەستاوقسەکانی پێبڕی وکەمێکی (هێلەک) خاک بێژانی بەدەستەوە بوو، ووتی ئەولحەکیم خۆت ماندوو مەکە، حەکیم پرسی بۆ مام دەروێش؟ دەروێشەکە ووتی ئەتوانی لەو حەوزەدا پڕی ئەم کەمە ئاوم بۆ بهێنی؟ حەکیم ووتی مام دەروێش لەکەما ئاو چۆن دێت؟

ڕژێمی عێراقیش ماوەیەک بوو، هەموو گوندەکانی سەرسنوری ڕاگوێزابوو بۆ کۆمەڵگا زۆرە ملێکان، فشارێکی زۆرمان لەسەر بوو، بۆ پشوودان و حەوانەوە هەڤاڵەکانی ترمان ڕوویان لە شارو شارۆچکە و گوندەکانی سەرسنوور کرد بوو، لە خانەو میراوایی سەردەشتەوە تا بانە، مەهاباد، بۆکان، سەقز، مەریوان، سنە، جوانرۆ، پاوەو نەوسوود، لەگوندەکانی سەر بەم شارانە لە سەر سنوور بەردەوام پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان هەبوون. حیزبی دیموکرات دوای دامەزران و جێگیر بوونیان جارو باریش ڕێگای لێ ئەگرتین و داوایان ئەکرد نەچینە ناو گوند و شارەکان، هەڤالانی ئێمەش زیاتر دۆستایەتیان لەگەڵ یەکێتیی جووتیاران هەبوو یان سەردانی بنکە و بارەگاکانی ئەوانیان ئەکرد، ئەو سەردەم کۆمیتەکانی ئینقلابی وردە وردە لاواز بوون لەکوردستاندا و حیزبەکان جەماوەریان لە دەور کۆبوەوە، هەیئەت وەفد لە کوردستان دروست بوون بۆ وتوێژ لەگەڵ حکومەتدا، هەیئەتی کوردستان داواکاری و مافەکانی لەگەڵ خۆی بردە تاران، ئێران ئەو سەردەمە باسی یەکپارچەیی خاکی ئێرانی ئەکرد و باسی ئەوەیان ئەکرد ئێران هی هەموان و ئەبێ پێکەوە وڵات ئاوەدان بکەینەوەو لە ئیسلامدا سنوور نییە و.... تاد.

کۆمۆنیستەکان و کەمینەکانی تر چ سیاسی و چ مەزهەبی و چ نەتەوەی بەتایبەت کوردەکان ئەیان ووت ئێمەش خەباتمان کردوەو زیندان کراوین و ئەشکەنجە دراوین و دەربەدەر بووین، ئەیان ووت بەشداری ڕاپەڕین و خۆپیشان دانەکانمان بەهەموو نەتەوەو پێکهاتەکانەوە کردوە، بۆیە ئەبێت بەشداری دەستەڵات و ئازاد بین. بەداخەوە ئەنجامی ئەم بارودۆخە شەڕو توندوتیژی لێکەوتەوە، ڕابەری شۆڕشی ئیسلامیش خوالێخۆش بوو ئیمام خومەینی لەسەر ڕووداو پێشهات و بارووددۆخەکە بۆچوونی خۆی هەبوو. ئەیووت لەدوای سەرکەوتنی شۆڕش بۆماوەی پێنج مانگ ئازادی ڕەهامان داوە بەهەموو لایەک بەڵام دەرکەوت ئەوانە ئازادیان ئەوێت بۆ پیلان گێڕی، زمانیان زمانی چەکوگوللە بووە. بۆ زیاتر زانیاری لەسەر

---

دەروێش پرسی بۆ نایەت؟ حەکیم ووتی: لەبەر ئەوە کەمەکە کون کونە شرە، مە دەروێش ووتی: دەی کوردیش وەک ئەوکەمەیە شرە شڕ.

ـوچوونەکانی ئیمام خومەینی لەوبارەوە، بڕوانە لاپەڕە١١٢ی کتێبی (گفتوگۆ ـەگەڵ مێژوودا) لەنووسینی ئۆریانا فالاچی.

دوای بەرپابوونی شەڕی عێراق و ئێران، سوپای ڕزگارییش وەک هێزێکی لۆکاڵ لەناوچەکانی هەوراماندا دروست بوون و کەوتنە گەڕ، زیاتر لە ناوچەی مەریوان و هەوراماندا نفوسی هەبوو لەشارە گەورەکانیشدا لەسنە ئەندام و لایەنگریان زۆر بوو هێزێکی چەکدار بوون و سەرگەرمی کارکردن بوون. لەم وەزعە بێ سەروبەرەی کوردستان و ئێران دا، ئێران داوای ئەکرد ئەمن شارو شارۆچکەکان تەسلیمی حکومەت بکرێنەوە، کوردیش داوای خود مختاری ئەکرد واتە ئۆتۆنۆمی، وردە وردە شەڕو تەقە و لێکدان دەستی پێکرد، یەکێتیی نیشتیمانیی لەپشتیوانی ئینقیلابەوە بووینە پشتیوان و هاوکاری کوردستانی ڕۆژهەلات، چەندین فەرماندەی ئێمەش لەو ماوەدا گیانیان کردە قوربانی لەوانە ئەنوەری مەجید سولتان، عەلی شیعە، حەمە ئەگرەیی،..... تاد. لەگەڵ دەیان فەرماندەی مەفرەزە و پێشمەرگەش بونەقوربانی لەوانە کەریمی حەمەی مەلا سابیر لەشاری پاوەو عەلی حەمەتەقی لەمەریوان.. تاد، ئەمانە سەربە کەرتەکەی ئێمە بوون.

منیش بۆ خۆم لەگەڵ هەشت پێشمەرگەی تر بە فەرمانێک ماوەیەک لەگەڵ هێزەکانی کۆمەڵە لەژاوەرۆ، هەورامان، کامیاران و سنەدا بووین، تا حکومەت هێرشی کردە سەر شاری سنەو لەحیزبە کوردستانییەکانی سەندەوە، دوای ئەوە ئێمەش بە جێمان هێشتن و گەڕاینەوە بۆ بنکە و بارەگاکانی خۆمان لە سەرسنوور. دواتر بابەتێک بەناوی (ئەودیو چیاکان و ئەرکی ئێمە) لەو بارەوە ئەخوێنیتەوە.

لە سەرەتای شۆڕشی ئیسلامیەوە تا کۆتایی سالی ١٩٨٠ من بە بۆنەی هاتوچۆی زیاتر و جەولەی زۆرتر لە کوردستانی ئێران، چەندین پیاوی سیاسی و تێکۆشەرو کورد پەروەرم ناسی، کەبەشێکیان لەزیندانەکانی حەمەڕەزاشادا بوون و لە ئینقیلابدا ئازاد کرابوون لە دروست بوونی شەڕ لە نێوان کوردستان و حکومەتی ئیسلامی ئێراندا سەر ئەنجام دوای چەندین سال کۆتایی بەدەستەلاتی حیزبە سیاسیەکان هات لە شارو شارۆچکە و گوندەکاندا، ئەوانیش بەرەو عێراق هاتن و کەوتنە شەڕی پارتیزانی، وە لەو سەردەمەی لە ناوخۆی ئێراندا بوون چەندین جار لێرەو لەوێ یەکدی چەک

کردن و چەندین جاریش تەقەو لێکدان لە نێوانیاندا ڕوویدا و خەڵکیان لەیەکتر کوشت، شەڕی ناوخۆ ئەوانیشی گرتەوە. چەندین جیابونەوەو ئینشقاقیان کرد. بۆچوونی جۆراو جۆرو جیاوازجیاواز هەبوو لە سەر خود موختاری، لەسەر وتووێژ، لە سەر دەست پێکردنی شەڕ لەگەڵ دەوڵەت. ئەو سەردەمە بۆچوون و ڕاکانی د. عەبدولڕەحمان قاسملو بەڕای من گونجاو تربوون، بەڵام نەیارەکانی ناو حیزبەکەی خۆی و لایەنەکانی تریش بەسازشکار ناویان ئەبرد.

شەڕی کۆمەڵەو ڕزگاری، کۆمەڵە و دیموکرات زیانێکی گەورەی لە جولانەوەی کوردستانی ڕۆژهەلات داو و هەلێکی مێژوویيان لە دەست چوو. لە سەرەتای هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئیسلامیەوە بە تایبەت مام جەلال هەوڵی زۆریدا بۆ ئەوەی دەوڵەتی ئیسلامی ئێران و کوردەکان بگەنە ڕێکەوتن و شەڕ و کوشتار ڕوونەدات، بەڵام بێ ئاکام بوو. شەڕی یەکێتیی و پارتیش کاریگەری خراپی لە سەر وەزعی کوردەکانی ڕۆژهەلات دانابوو، یەکێتیی دوای ئەوەی کە هەوڵەکانی گفتوگۆی نێوان کورد و دەوڵەتی ئێران بێئەنجام بوون و شەڕ دەستی پێکرد، لە کاتی شەڕەکانیشدا جاروبار مام جەلال هەوڵی ئەدا بۆ ناو بژیوانی.



پارتی هێزەکانی لەهەندێک شوێن بۆ ئەوەی بگەنە سەر سنوورەکان ئەبوونە پێشڕەوی سوپای پاسداران چونکە کۆمەڵەو دیموکرات جارجار ڕێگریان ئەکردن، یەکێتیش خۆی یەک لاکردەوە بوو بە لایەنگری لایەنە سیاسیەکان و بەشدار بوو لە شەڕی ناوچەی مەریوان و سەردەشت و خانەو گوندەکانی ئالوەتان و کونە مشکێ.

لەمانگی ٧/ ١٩٧٩ هێزەکەی هەرێمی یەک کە نزیکەی ٣٠٠ سێ سەد پێشمەرگە بوو، هەمووی ئاودیوی ئێران بووین و لە دەوروبەری شاری

مەریوان خەریکی گەشت بووین، لەئاسناواو مرانەوە بۆ بایەواو باشماخ و بەبناری چیاو جەنگەڵەکانی بەرامبەر شاری مەریوان و لێوار گۆلی زرێباردا تا نزیک کاڵ و ڕیخەڵن و پەرینەوە بۆ لای کانی دینار و بەرقە لاوە ئەوێشەوە بۆ ناوشار کە بەدەستی حیزبەکانی ڕۆژهەلاتەوە بوو، بۆ لای گوندی سێف و گاگل و ساوجی، ئالەم کاتانەدا لەلای پادگانەوە کە ئەکەوێتە سەر ڕێگای مەریوان سەقز هێرش ئەکرا بۆ ناوشاری مەریوان.

ئێمەش بە نۆرە لە کەمین و حەرەسات و پاسەوانی چیاکەی پشتی پادگان کە لەپشتی دارسێرانەوە سەرئەکەوتین ئەچووینە ئەو شوێنەی کەپاسەوانیمان ئەکرد. ڕۆژی ٢٥/ ٧/ ١٩٧٩ لە کاتێک دا مەلا بەختیار و حەمەی حاجی مەحمود لەگەڵ بەرپرسەکانی کۆمەڵە لە ناوچەکەدا بوون لە ناو گوندەکانی دەوروبەری گۆلی زرێباردا پشوویان ئەدا، سەر لەبەیانی ٢٧/ ١٩٧٩/٧ ئێران هێرشی کرد بۆ سەر لووتکەی نێوان پادگان و ناوشار، هەر لە کاتژمێر شەشی بەیانییەوە تەقە دەستی پێکرد، تەنیا مەفرەزەیەکی بچوکی ئێمە لەوانە: حەمەی فەتاح و ڕۆستەمی زێباو عەلیە خرەی ئێناخی تا نزیک عەسر بەرگریمان کرد، لە دەوروبەری پانزەی نیوەڕۆ لە کاتێکدا من و عەلی لە سەنگەرێکی بەردیندا بووین کە حەشاری ڕاوە کەو بوو، نارنجۆکێکی دەستییان بۆ هەڵداین، کەوتە پشت کەڵەکە بەردی حەشارەکەوە، ساتێک نەتەقییەوە عەلی سەری بەرزکردەوە لەو کاتەدا تەقی و ساچمەیەک بەرملی کەووت و شەهید بوو. لە دوای نیوەڕۆ ناردمانە خوارەوە بە حەمەی فەتاح تریفەییدا، هەر ئەو ڕۆژە فوئادی مستەفا سوڵتانی بە تەنیا و لە ناکاو لەلاماندا سەری هەڵداو سەیری دەوربەری سەنگەرەکەی ئێمەی کرد و گەڕایە دواوە، ئیترمن نەم زانی چیلێهات.

دواتر حەمەی فەتاح تەرمی عەلی خرەی بردبووە خوارەوە، ووتی ئەو پیاوەی کە هات بۆ ئێرە چووە خوارەوە پێم ووت هاوکاریمان بکە نەیکرد، جنێوم پێداوە هەر گوێشی بۆ نەگرتم، ووتم: کاکە ئەوە فوئادی مستەفا سوڵتانی بوو، ووتی هەرکەس هەیە کەیفی خۆیەتی. دواتر جەنازەکەی عەلی نێردرایەوە بۆ لای سەریاسی نزیک پاوە و لەوێ دفن کرا.

هەر لەم ماوەدا واتە لە ڕۆژی ٣٠ / ٧ / ١٩٧٩ ئێمە لە خوارەوە بووین لە دەوری شاری مەریوان دا جەماوەرێکی زۆر لە سنەوە بەپێ هاتن بۆ

کۆمەڵگای نزیک بەردەڕەشە کە خەڵکی شاری مەریوان کۆچیان کردبووە ئەوێ لە بەر تۆپ باران، لە ناوخەڵکەکەدا ناسری ڕەزازی و مەرزیە خانی خێزانی دیاربوون بە جل و بەرگی پێشمەرگانەوە.

ماوەیەکی زۆر لەم ناوچەدابووین، مەلابەختیار و کاک حەمەش ساردییەک لە نێوانیاندا هەبوو لە سەر چەند پێشمەرگەیەکی پۆخڵەوات و بێشیلتزام، ڕەئوفی خەلیفە سەعیدی جێگری هەرێم لە نێوانیاندا هەر خەریکی سوڵح کردن بوو.

لە شەوی ٦ – ٧ / ٨ / ١٩٧٩ هێزێکی هاوبەشی هەرێمی سێ و هەرێمی یەک لەلای سنوورەوە لە سێ لاوە چووینە ناو شاری پێنجوێن و بە ئاڕ بی جی درا لەچەند ڕەبیە و بارەگایەکی دوژمن و بۆ بەیانییەکەی بە لای بناوەسووتە دا خۆمان کردەوە بە بایاوا دا. بناوەسووتە گوندی کوردستانی عێراق و مەرکەزی عەسکەری عەرەبی لێ بوو، بایاواش گوندی کوردستانی ئێرانە پێشمەرگەی لێ بوو چۆمێکی بچکۆلە لە یەکتریان جیا ئەکاتەوە دووری نێوانیان لە ٥٠٠ مەترکەمترە.

ئەم سەفەرە کانی سانانی گوندی مەحمود خانی کانی سانان کە هاوکاری شێخ مەحمودی کردووە لەگەڵ مەحمود خانی دزڵی داو گوندی دۆلاشی زادگای قانعی شاعیری شۆڕش گێڕم بە سەرکردەوە کەپێشتر لە ناو کتێبدا ئەم دووناوەم بیستبوو. موسای شێخ الاسلام ئەو بەرپرسەی کۆمەڵەشم ناسی، ئەوەندە گورج و گۆڵ و بەردەوام ئەهات و ئەچوو، غەفور دەرەشیشی پێی ئەووت موسا ڕۆژێک دێت وەک بەردەچەرخ تەواو ئەبێت.

حاجی ئەمین بەگ و عەتای کوڕی و عەبەی دارابی و مەحمود بەگی سەردۆش و چەندین کەسایەتی ترم لەم سەفەرەدا ناسی، لە دەوروبەری ١٠ / ٨ / ١٩٧٩ گەڕاینەوە بۆ دیوی باشوور و لە دەشتی شارەزوورەوە سەرکەوتینەوە بەرەو لای ئاواییەکانی شۆشمێ و ناوچەی نەوسوود.

لەشەڕی هێزی پشتیواندا، یەکێتیی نیشتیمانی خاوەنی هێزێکی چەکداری بەدیسپلین و بەژمارە زۆر و لەڕوویی چۆنایەتییشەوە زۆر باشبوو، یەکە تەشکیلاتیەکانی تیپ و کەرت و مەفرەزە بوون، بەشێکی کەمی لە کوردستانی عێراق دا هێشتەوە ئەوی تری وردە وردە ئاودیوی

کوردستانی ڕۆژهەلات کرد بوو کە نزیکەی ۳۰۰۰ سێ هەزار پێشمەرگە بوون.

بەرلەوەی شەڕەکە دەست پێ بکات، لەناوخۆی یەکێتیی دا چەندین کادر و فەرماندە گلەو بۆڵەیان هەبوو، دژی ئەو بڕیارە بوون، یەکێتیی چۆن بەشداری ئەو شەڕە گەورە لەگەڵ دەوڵەتێکی گەورەی دراوسێی وەک ئێران بکات؟ ئەوانە زیاتر ئەوانە بوون، دواتر بوون بە ئاڵای شۆڕش، بڕێک کاریگەریشیان لەسەر سارکردنەوەی هێزەکە هەبوو، بەڵام مادام شەڕەکە بۆپشتگیری کوردەکان و بۆ هاوکاری ئەوان بوو، ئەو پرتەو بۆڵە لێرەو لەوێ زوو کۆتایی هات، مەلا بەختیار لە کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسدا بە فەرمی باسی کردووە، ئەم بڕیارە بە هەڵە ئەزانێت، بەڵام چونکە هەڤاڵ مام جەلال و مەکتەبی سیاسی بڕیاری لێداوە بە بێ دوودڵی بەشداری کرد. کە ئەوەش هەنگاوێکی تەواو حیزبیانە بوو.

هێزەکان بەشدارییەکی زۆر کارایان کرد، بەڵام ئەنجامەکەی بە تێکشکاندنی هێزەکانی دیموکرات و کۆمەڵە و ئێمە و دەرکردنی سەرکردایەتی حیزبی دیموکرات لە دۆڵەتو بوو، لەچەند گوندێکی سەرسنوور مابووین خەریکی خۆسازدان و بەرگری بووین لەو زنجیرە گوندە، لەونە کونەمشکێ، ساوێن، مەمکاوێ، داوداوێ کانی زەرد بنەوخەڵەف و مەزراو ....تاد . بەفرێکی زۆر باری و بوو بە بەربەست لە بەردەم هێزەکانی ئێراندا، ئێمەش لەسەر خۆ پاشەکشەمان لەو گوندانەش دا کرد، یەکێتیی ناچار بوو سەرکردایەتی لە خری ناوزەنگ، شێنێ و توژەڵەو زەڵێ، وردە وردە بگوازێتەوە بۆ ناوچەی ئاسۆس و دۆڵی جافایەتی. چونکە توانای مانەوەی لەوێ نەما، یەکەم کەوتبووە ژێر لوولەی تۆپەکانی سوپای ئێران و دووەمیش لەگەڵ توانەوەی بەفر ئێران هێرشی ئەکردە سەری. دواتر لە بابەتێکی جیادا بە ناوی هێزی پشتیوان یادەوەریەکان لەم بارەوە ئەخوێنیتەوە.

عێراقیش ئەم شەڕی ئێمەی پێ خۆش بوو لەگەڵ ئێران، چونکە خۆیان لەگەرمەی شەڕدابوون لەگەڵ ئێران، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی یەکێتیی و عێراق گفتوگۆی ساڵی ۱۹۸۳ دەست پێ بکەن.

# کارو چالاکی بێ بەرنامە

سەوز، سوری کاڵ، زەرد، نارنجی و خەنەیی و سوهێل ڕەشتوویی ئەو ڕەنگانەبوون کە لە مانگی ١١ ی ساڵی١٩٧٩دا قڵچەی سروشت سیمای گەڵای دار و دەوەنەکانی پێ دەنەخشان و هەڕەشەی توندی سەرمای ئەو ساڵەشی لە ئێمە دەکرد. دوای بانگەوازی باخ بەرەڵا یەک یەک و دوو دوو تەڵانە و تەڵان بە ناو باخە گەورە و بچووکەکاندا دەگەڕاین و سۆراخی هەنجیرو هەناری دەم کراوە و هەندێ بۆڵە تریمان دەکرد، کە لە ناو گەڵاکاندا خۆیان شاردبوویەوە، بۆ ئەوەی تاسەی خۆمانی پێ بشکێنین و ناوسکمانی پێ گەرم بکەینەوە. لەم وەرزەدا ئێمەی لانەواز دەبوینە مولکداری میوە بیرکراوەکان و شاردراوەی ناو گۆژمە گەڵاکان، نازمان دەبەخشیە خانە باخ و کەوێڵەکان، بنبەرد و ئەشکەت و پەناو پەسوێکان، تا دەگەشتین بەو ڕۆژانەی هەوای بانەمەڕ پشتی زوقم و کرێوەی دەشکان.



ماوەیەک بوو شەش لاوچاکی بە بیروبڕوا دلگەرم بۆ کوردایەتی و سەر بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی هاتبوونە دەرەوە، لە کەرتی دووی هەرێمی یەک بوون بەپێشمەرگە، کە بریتی بوون لە سامان حاجی قادر، ئاوات مستەفافەنی، بەرزان سەید مەحمود، ئازاد شێخ مونزیر، تاریق گولپی، تاهیر دێ کۆنی. ئێمە زۆر شاد و دڵخۆش بووین بەم پۆلە پێشمەرگە، چونکە لە کەرتەکەماندا پێشمەرگەمان نەبوو خەڵکی خورماڵ بێت و ئەمانیش ئەو شارۆچکەیە زێدیان بوو.

سامان کوڕێکی وریا و ئازاو لێ وەشاوە بوو، زوو بە زوو دەیویست بە شریخەی تفەنگەکەی چزەیەک لە جەستەی دوژمن هەستێنێ. هەر ئەو دڵسۆزی و لە خۆبوردەییە پاش ماوەیەک وای لێکرد، پێشنیاری چەند چالاکییەکی کرد و ئێمەش بە ئەرکێکی مەزنمان دەزانی. یەکێک لەو چالاکیانە

کوشتنی سەرەک جاشێکی بزێو نا بەکاربوو بە ناوی ڕەشەی ساڵحە، کە لەو ماوانەدا زوو زوو هاتوچۆی بەغدادی دەکرد و لە قومارخانەیەکدا خوێنی خەڵکی دەدۆڕان. بۆ ئەنجامدانی ئەم چالاکییە سامان بەنهێنی گەڕایەوە ناوشار و بە هاوڕێیەتی عوسمانی سۆفی حەمەکەریم، کە خەڵکی تەوێڵەو ئەندامی ڕێکخستن بوو. سامانی گەیاندە بەغداو دەمانچەیەکی ستاری بۆ پەیدا کردبوو. بەرنامە وا دارێژرا بوو سامان بچێتە ئەو قومارخانەیە و هەل بە دەست بێنێ ڕەشە هەناسە ساردبکات و بگەڕێتەوە لامان. بەڵام کارەکە سەری نەگرت، ئەوەش بە هۆی ئەوەوە بووکە ئەو ڕۆژانە ئەجەل سمی ڕەشەی لە بەغداد بڕیبوو.

وەرزی پایز تێپەری و کەوتینە زستان لەڕێکەوتی ١٩٨٠/١/١٢ هێزێکی کەرتەکانی هەورامان بۆ جەولەکردن لە هاکێ قەتارەمان بەست، تا لە کەلاوەکانی گوندی خەرپانیدا گیرساینەوە. کات دەمە و ئێوارەیە و چاومان لەخۆر بوو تا لە ناو دەریا سوورەکەی ئاسۆدا نوقم ببێت. هێدی هێدی تاریکی خێمەی هەڵدا بە سەرماندا، کاک حامدی حاجی خالید بەرپرسی هێزەکە بوو هاوڕێ لەگەڵ غەفوور دەرەشیشی، حەمەی حاجی تۆفیق، کەمال شاکر، فەیسەڵی مەلا عەلی و چەند فەرماندەی مەفرەزە و جێگری کەرت و کادر و ژمارەیەکی بەرچاو پێشمەرگە بووین. دەستە دەستە و گروپ گروپ، پێکەوە لەچاوەڕێی تاریک بوون داین، کاک حامد و کاک غەفور لەگۆشەیەکەوە وەستاون و سامان و فەیسەڵی مەلا عەلیشیان بانگ کردووە، دوای هەندێک چووتەچووت من چاوم لێبوو فەیسەڵ بەتووڕەیەوە جێیهێشتن.

پێشتر سامان پێشنیاری ئەوەی کردبوو بە مەفرەزە  بچنە خورماڵ یەکێک لەم چالاکیانە ئەنجام بدەن.

١ – چەککردنی چوار پۆلیسی پاسەوانی بەدالەکەی شار.

٢ – کوشتنی کەسێک بە ناوی عوسمان فەتاح کە دەستی لەگەڵ ڕژێمدا تێکەڵ کردبوو، وابزانم کارمەندی بەدالەکەبوو.

٣ – لیستی ناوی ١٥ کەس هەبوو بۆ کوشتنی هەریەکێکیان کەبۆیان بلوێ.

٤ – کوشتنی عەلی مەجید کە فەرماندەی مەفرەزەی جاش بوو .

ئەو کەنار گرتن و چپەچپەی برادەران بۆ ئەوە بوو، وایان دیاری کردبوو کە نابێ سامان بە تەنیا ئەو کارە ئەنجام بدات، بەڵکو دەبێ فەرماندە کەرتێک یا

فەرماندە مەفرەزەیەکی لەگەڵدا بێت. بۆ ئەو مەبەستە بەچەند هەڤاڵێکیان وتبوو کەسیان ئامادە نەبوون لەوانەش فەیسەڵ، ئەمەش بە بیانووی ئەوەی کە ئەم پێنج پێشمەرگە بێ ئەزموونن و ڕەنگە هەشیان بێ نەزانێ بە باشی چەکەکەی بەکاربێنێ. دواین جار بەمنیان ووت، منیش ئامادەیی خۆم نیشاندا، بەڵام بەومەرجەی دوو پێشمەرگەی کردە و سامان و خۆم بین. دوای گفتوگۆ، سامان هەر پێداگری کرد، کە ئەبێ ئەو پێشمەرگانە ببەین تازە هاتوون و خەڵکی خورماڵن، ئەگەر پێشمەرگەی تریش ببەین ئەوە بۆ مانەوە لەناوشاردا کێشەمان بۆ دروست ئەبێت. بەڵێ من گفتوگۆم واز لێهێناو تەسلیم بووم و پێکەوە ڕۆیشتین. لەگەڵ هێزەکە پێکەوە کەوتینەڕێ بەرەو گوندەکانی گۆمەلار، خێڵی حەمە، هەردوو تەپی سەفا.

بڕیاربوو ئێمە لە نزیک گوندی خارگێلان لە هێزەکە بەدزییەوە خۆبگرینە دواو جیاببینەوە، وامان کردو بەرەو خورماڵ ملی ڕێگەمان گرت، جگە لە کاک حامد، کاک غەفور، د.کەمال شاکر کەسیتر نەیئەزانی ئێمە بۆ کوێ ئەچین؟ نەدەبوو کەس بزانێ بۆ کوێ دەچین؟ بەڵام فەیسەڵی مەلا عەلی ئەیزانی، چونکە پێشتر بڕیار بوو ئەو بچێت. بەناو زەوییە کێڵراوەکان و قوڕێکی گیردا، وردە وردە و لەسەرەخۆ، ماوەیەک پشوومان ئەداو ماوەیەکی ترئەکەوتینەوە قوڕ شێلان. لەڕۆیشتندا هیلاک و عارەقە جلەکانی بەرمانی خووساندبوو، کە پشوومان ئەدا هەواکەی ئەوەندە سارد بوو، دوای چەن خولەک هەڵئەلەرزین بەناچار ملی ڕێگاو قوڕ شێلانەکەمان دەست پێئەکردەوە.

لە تەمەنی پێشمەرگایەتیمدا یەکەمجار بوو بچمە ناو شارۆچکەی خورماڵەوە. دوژمن گوندەکانی ڕاگواستبوو، لەم بەری ڕاستە جادەکەی شارەوە کۆمەڵگایەکی گەورەی لاکێشەیی بۆچێ کردبوون، کە گەشتینە کەوانەی کۆمەڵگاکە شەوقی گڵۆپەکان دەرودەشتی کردبووە ڕۆژی نیوەڕۆ، لەتاریکیەکدا گرمۆڵە بووبووین، چرپاندم بەگوێی ساماندا و ووتم: دەچینە کام لاو ومالی کێ؟ واتە لەچ ماڵێک بۆ ڕۆژەکەی دەمێنینەوە، وەلامی دامەوە هەر شوێن زۆرە، پێم ووت: ئەمشەو هەمووومان لەیەک شوێن دەبین تا سبەی شەو، پاشان کام یەک لەچالاکییەکان گونجاوە ئەنجامی دەدەین. بە ئەسپایی ناو کۆمەڵگاکەمان بڕی و چووینە گەڕەکی قە لاوەە. دنیا زۆر ئارام و کوچە و کۆلانەکان ڕووناک و بێدەنگی و ماتەمی باڵی بەسەر شارۆچکەکەدا

کێشابوو تەنیا ئێمە و جارجار و لەناکاو ئەمانبینی چەند سەگە بەرەڵایەک بەرنەکەوتن و برێک لێمان ئەوڕن، ئێمەش خۆمان لەگۆشەیەکدا پەنا ئەداو، ئەوانیش ئەڕۆیشتن و لەچاو وون ئەبوون. بەتاریکای و گۆشەو کەنارەکاندا گەشتینە لای مزگەوتی گەورەو لەوێ گۆشەیەکی نووتەکمان دۆزییەوە و دانیشتین. بینیم سامان و برادەران لە ناو خۆیاندا لە سەر ئەوەرێک ناکەون لەچ ماڵێکدا بین، کار بەوە



گەشت ماڵێک گیرنەهات هەر شەشمان لەخۆبگرێ، چونکە لەو سەر دەمەدا کەس ئامادە نەبوو پەنای مەفرەزەیەکی وا بدات ئەگەر پێشتر ئامادەکاریی بۆ نەکرابێت و خاوەن ماڵ ئاگادار نەکرابێ. بۆیە هەر ئەو ساتە زانیم کارەکەمان مەیسەر نابێت، من پێداگریم لەسەر ئەوە ئەکرد ئەبێ هەمومان لەیەک ماڵدا بین، شەویش درەنگی کردووە و ماوەی دەرچوون لە شار نەماوە ئەگینا لە شار دەمهێنانە دەرەوە.

لەکۆتاییدا بە ناچاری گەشتینە ئەوەی کە من و سامان و ئازاد و ئاوات بچینە ماڵی مستەفا فەنی باوکی ئاوات، بەرزان بۆ ماڵی باوکی و تاریقیش بۆ ماڵی غەفار ناوێک کە زاوایان بووکەهەر سێ ماڵەکە نزیکی یەک بوون. بەر لەوەی لێمان جیاببنەوە پێم ووتن جگە لەو ماڵەی کەلێی ئەبن، کەسی تر نابێ بتانبینێ، نابێ بنێرن بە دوای هاوڕێ و کەس و کاردا، تا سبەی شەو خۆمان دێین بە دواتاندا. ئەو دوو ماڵە ئەوان بۆی دەچوون نزیکی ماڵەکەی لای ئێمە بوون. کات لەچواری شەو تێپەڕی، بە سەر دیوارێکی لاروچەوتدا، کە بەکەڵەکە بەرد هەڵچنرابوو خۆمان هەڵدایە حەوشەیەکەوە. بەچپە خاوەن ماڵ تێگەیەنرا کە کێین و ئەوانیش دەرگایان لەرووکردینەوە. بە پسکەپسک خۆمان خزاندە ژوورێکەوە و لێی ڕاکشاین. من بەر لەوەی خەو بزێتە چاومەوە بیرم لەوە دەکردەوە ئەو دوو

پێشمەرگەیەی تر بە هۆی نەزانکاری و نەشارەزایی لە شێوازی ئیختیفا کردن ئاشکرا دەبن یان کەسوکاریان رازیان دەکەن خۆبەدەستەوە بدەن.

ئەو بیرکردنەوەیە دووچاری دڵەڕاوکەی کردم و خەوی لێتۆراندم تا شەوم گەیاندە بەیانی. لەپەنجەرەی ژوورەکەوە رووناکی بەرچاوی رۆشن کردینەوە. هەستام و لەگۆشەیەکی پەنجەرەکەوە کەوتمە نیگای شارو کۆمەڵگاکە و مۆڵگە سەربازییەکەی تەنیشت ئاوایی رۆستەم بەگ. دەم دیت خەڵک بەڕاست و چەپدا دەهاتن و دەچوون و هەر کەسە و لە خەمی کاری رۆژانەی خۆیدا بوو. لەم چاوگێڕانەدا مەبەستی ئەوەم هەبوو سەر لەیەک دووگۆشە دەربکەم، دوای ئەوەی چاوانم ماندوو بوون بوومە میوانی خەوو، تا یازدەی نیوەڕۆ پشووی خۆمم دا. کە بە ئاگاهاتمەوە دیتم سامانو کچێک بە تەنیشتمەوە دانیشتوون و ئازاد و ئاواتیش لەژوورەکەی تردا قسە لەگەڵ خەڵکدا دەکەن. دوای ئەوەی کچەکە چاک و چۆنی لەگەڵدا کردم، سامان ناساندی، خوشکمە و ناوی شوعلەیە، چووم دەم و چاوم شت و گەڕامەوە، کچەکە چووبووە ژوورەکەی تر، پرسیم: ئەو کچە شەو لەم ماڵەدا بوو؟

- نا مامۆستایە لە ئاڵپارێز. - ئەی چۆن هاتۆتە ئێرە؟

- فەرهادی ئامۆزام نارد بە دوایدا و حەزم کرد بێت و بیبینم. فەرهاد کێیە؟ سامان هەندێک تێم راما و پاشان ووتی: بۆهیچ هەیە؟ بەپرسیارەکەیدا دیاربوو زانی پێم ناخۆشە. ووتم نەئەبوو نەفەرهادو نەشوعلە ئاگادار بکەی. نا کاکە حەمە هیچ نییە.

رۆژی ١٩٨٠/١/١٣ کات قاچی سست بوو بوو، زۆر بە خاوی تێ دەپەڕی. پێم خۆش بوو کات پەلە بکات و خۆی بگەیەنێتە سێ و چواری ئێوارە چونکە لە شەو نزیک دەبووینەوە، ئەوکات قەڵای مێردانە. بە هەر سستیەک بوو کات خۆی بە نیوەڕۆ گەیاند و سفرەمان بۆ رازێنرایەوە. من بۆ خۆم دەمێکی زۆر بوو خوانی وا رێکوپێک و خاوێنم نەدیتبوو، بامێ و گۆشت و برنج هەڵمی لێ هەڵئەسا، بەڵام من هیچم پێ نەئەخورا، وردە وردە خۆم خەریک کرد شتێکم خوارد، لە ئیختیفادا وایە کە مێشکت جەنجاڵ و ترست هەبوو توانای خواردنیشت نامێنێت. دوای نانخواردن ژنێک هاتە ژوورەکەمانەوە سڵاوەی لێکردم، منیش لە بەری هەستام، ژنەکە باوەشی پێدا کردم، ئەم لاو ئەو لای راموسیم، وام زانی کەیبانووی ماڵەکەیە، دوای

کەمێک قسەکرن تێگەشتم بەدری خانی خوشکی شەهید دکتۆر ڕەزایە. ئەمیش ئاگادار کرابوو هاتبووە لامان؟ بەڵام چ خانمێک؟ شای خانمان. ورە بەرز دڵسۆز و کوردپەروەر.

کاتژمێرێکی مابوو دنیا تاریک بێت، منداڵێک بە دەم گریانەوە خۆی کرد بەژووردا، نازانم ئەوە منداڵی ماڵەکە بوویانا؟ دوایی دەرکەوت سامان ناردبووی بۆ ئەوەی بزانێ جاشەکان بەرەو کام لای شاردەچن بۆ کەمینی شەو؟ دیارە عوسمانی عەلی چەتون لە خورماڵ بارەگای دانابوو، چونکە تازە ببووە جاش[1]. منداڵێکی نەزان بە ئاوەزی منداڵانەی خۆی چووبووە بەردەم مۆڵگەی جاشەکان و وەستاوە. ئەوانیش بانگیان کردبوو چیت دەوێ بۆ لێرە وەستاویت؟ منداڵەکە لە ترسا هەڵاتبوو، ئەوانیش بە دوایدا هاتبوون و یەکێکیان شەپازلەیەکی دابووە بناگوێی. دواتر لە حەژمەتی ئەوەی منداڵەکە زارە ترەک نەبێ بەریان دابوو، بەڵام بە دزییەوە شوێنی کەوتبوون تا خۆی گەیاندبووە ماڵەوە. ئیتر جاشەکان گەڕابوونەوە. منیش بۆ خۆم لەم مەسەلەیە بێئاگام بووم و نەدەبوو سامان ئەم کارەی بکات.

لەپەنجەرەکەوە کەوتینە چاودێری کردنی شارو دەوربەری، لە بەر ئەوەی گەڕەکی قەڵا دەیڕوانێ بە سەر خورماڵدا هەموو شتێک دەبینرا، جگە لەگردەکەو ڕەبایەی پشتی ماڵەکە. هێندەی نەبرد بەچاو دیتمان لە سەربازگەی دەڵێنەوە ئۆتۆمبێل و ناقیلە کەوتنە ڕێ بۆ ناو شار، لە هەڵەبجە

---

[1] - لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا عوسمانی عەلی چەتوون بەرپرسیاریەتی هەبوو، دەوریشی دیارو بەرچاو بوو، بەداخەوە دواجار خۆی فرۆشتوو بوو بەجاش وبەجاشایەتیش کوژرا. عومەری ڕەشە جووتەش هەر لەو شۆڕشەدا واتە لەشۆڕشی ئەیلولدا بەرپرسایەتی هەبوو ئەوکاتە من منداڵ بووم، ناوبانگی کاک عومەرم بیستبوو، کەفەرماندەیەکی بەڕێزو قارەمانە، دواتر لەشۆرشی نوێدا هاتەدەرەوە منیش لەنزیکەوە ناسیم زانیم ڕاستە پیاوێکی بەرێزو خۆشەویستە، بەڵام بەداخەوە ئەوەندەی نەبرد شەهید بوو. لەشۆڕشی پێشوودا ئەم دوو فەرماندە لەناوچەی هەورامان و سەر بەهێزی خەبات بوون، هەردووکیان بەنامەیەک ئەگوازنەوە بۆلای خوالێخۆش بوو حسێن بەگی وەکیل ئەو ئامر بەتالیۆن بوو، کە ئەگەنە جێ نامەکە ئەدەنە دەست حسێن بەگو پێیان ئەڵێت: فەرموو دانیشن، دوای خوێندنەوەی نامەکە، خاڵە حسێن بەگ سەیریان ئەکات بەبێ دەنگی وەک بیەوێت پرسیارێک بکات، کاک عومەر پێی ئەڵێت بڵێ، وەک بزانێ قسەیەکی پێیە، ئەویش ئەڵێت زووير مەبن، من ئەم جووتەو چەتوونەم تەنیا لەقاتردا بیستوە ئێوە خەڵکی کوێن؟

و سەیدسادقیشەوە بەپیکاب و زیل جاش و سەرباز بەرەو خورماڵ دێن، دوژمن کەوتە گەمارۆدانی شار و دەرکەوت هۆکاری ئاشکرابوونی ئێمە ئەو منداڵە نەبووە، دیارە پێشتر ڕژێم ئاگادار کرابوو لەوەی کە پێشمەرگە لەناو ئەم شارۆچکەیەدا هەن. بەهۆی مناڵەکەشەوە گومانیان لەو ماڵە کردبوو، کە ئێمەی لێین، وردە وردە نزیکی خۆرئاوا بووینەوە، بەر لەوەی تاریکی ڕەشماڵی خۆی هەڵبدات بەسەرماندا دوژمن بە تەواوەتی گەمارۆی شارۆچکەکەی دابوو، خۆمان پێچابوەوە، تا شەڕ لەگەڵ مەرگدا بکەین.

ژنانی ناو ماڵەکەش دەستیان کرد بە سنگ کووتان و قژڕنینەوە، بەردی خان هەردوو دەستی بەرزکردەوە بەرەو ئاسمان و لە خوا دەپاڕایەوە. ئەوانی تر بەدەم گریان و پاڕانەوەوە لە خوای گەورەی خۆیان دەپاڕانەوە، لەو بەلا ناگاهانە سەر فرازو دەربازبین، سامانیش لە سەرخۆ دڵنەوایی دەکردن، دەویست بە قسەکانی کە بەرامەی ورەی بەرزو شۆڕشگێڕی دەگەیاند ئارامیان بکاتەوە، بۆیە هەر پێی دەگووتن: بڕۆن هیچ نییە و بۆ خۆتان بێدەنگ دانیشن. بە سامانم ووت: بەجێیان بێڵە وەختی ئەوەنییە.

خەریک بوو تاریک دادەهات هاتینە ناوکۆڵان، ئیتر گوێمان لەوە نەبوو خەڵک ئەمان ببینێت، دەوربەری ماڵەکە چۆڵ بوو. لە دوورەوە دەماندی هەندێ کەس بەپەلە خۆیان دەکردەوە بە ماڵەکانیاندا، دەیانزانی نەگبەتیەک بەڕێوەیەو پریشکبشی بەرئەوان دەکەوێ. هەوا تاریکی کرد لەم کاتەدا سامان هەریەک لە تاریق و بارزانی بانگ کردەوە لای خۆمان، دیاربوو هەردوکیان لەماڵێک بوون نزیک لەئێمە، لەکوچەیەکی تەنگدا خڕبووین بەچپە پێم ووتن: کامتان شارەزایە پێش بکەوێت با لەگۆشەیەکەوە خۆمان قووتار بکەین. سامان ئەی چالاکییەکەمان ئەنجام نەدەین؟ چالاکی چی؟ کاکە حەمە ئەوانەی بۆیان هاتوین یەکێکیان ئەمە ماڵەکەیەتی.
تازە ئەمشەو ناکرێت، چونکە پێمان زانراوە با وانەکەین زیان بە خۆمان بگەیەنین.
ئەو چەنێ گوێی لای قسەکەی من بوو هێندەش خەیاڵی لای چالاکییەکە بوو، بۆیە ووتی: ئەمە ماڵی عوسمانی تاوانبارە با لەگەڵ خۆمان ببەین. منیش ووتم: باشە بڕۆن بیهێنن.

خۆی کرد بە ماڵەکەیاندا و تاوانبار لە ماڵەوە نەبوو. ئەوەندەی نەبرد لە هەموو لایەکەوە دەنگیان داین و بوو بە گوللەباران سامان و تاریق و ئاوات بە لایەکداو من و بەرزان و ئازادیش بە لایەکی دیدا. لە هەر شوێنێکەوە دەمانویست لە شار دەرچین دەدراینە بەر ڕێژنەی گوللە، بۆیە بە ناچاری دەگەڕاینەوە شوێنی خۆمان. بۆ ماوەیەک هەر خۆفرۆشەو بۆ خۆی لەپەنایەکەوە دەستڕێژی گوللە دەکات، ئێمە بۆ ئەوەی خۆمان لەو فیشەکە کوێرانە ڕزگاربکەین ڕۆشتینە ناو کۆلانێکی بەرتەنگەوە کە ئەم لاو ئەو لای بە وشکە کەڵەک هەڵچنرابوو، سەنگەری خۆمان گرت ئێمەش بەچەند دەست ڕێژێک دەوری خۆمان دابێژا، دوای ئەوە لەهەموو کوچەو کۆلانێکی ناوشارو دەوروبەرییەوە کوێرانە تەقە گەرم بوو، لە ناکاو هات و هاواری لای سامانەوە دەستی پێکرد. دیارە سامان شەهید بووە و تاریقیش بە برینداری خۆی کردووە بە ماڵێکدا و ئاواتیش بریندارە، چەکەکەی لێ بۆتە بارێکی گران و لە شوێنێکەوە خۆی بە دەرەوەی شار گەیاندووە. عەلی کۆزە رەقەییش کەسێکی تر بوو لە نێوان ئێمە و دوژمندا کوژرا بوو.

ویستمان بەرەو لای ئەوان سامان بڕۆین نەمانتوانی، زرمەی تەقینەوەی نارنجۆکێک ماڵەکانی ئەو گوزەرەی هەژاند. تاریق لە حەوشەی ماڵی عوسمان ناوێکدا بریندار بوو، گەمارۆی ماڵەکەیان دابوو ئێمە گوێمان لێبوو داوای خۆبەدەستەوە دانیان لێ ئەکرد، ئەویش وتبووی وەرن تەسلیم ئەبم، کۆمەڵێک سەرباز خۆیان کردبوو بەژووردا، بەڵام بە ڕومانە (نارنجۆک) چوار سەرباز و ئەفسەرێکی بە سزای گەل گەیاندبوو دوای ئەوە شەهید بووبوو، ئیتر تەواو لێک دابڕاین. ئێمە بەرەو سەرپردی تەنیشت مزگەوتی بەری قەڵا، ڕێگەی خۆمان کردەوە دواجار پەنامان برد بۆ چەمەکەی زەڵم، کە لە ئەحمەد ئاوا وە دێت وخورماڵ ئەکات بە دوو بەرەوە. ئەگەرچی ئاوەکە تیژ ملی ڕێگەی گرتبوو، بەڵام ناچار بووین لێی بدەین بۆ ئەوەی بپەڕینەوە و خۆمان لەو داوە گەورەیە ڕزگار بکەین. بەناو ئاوەکەدا و لژێر پردەکەوە هەرچۆن بوو گەشتینە کەنارو بە ناو پەڵە چنارو تووەڕکدا هەندێک لەگۆڵمەزەکە دوور کەوتینەوە. بەڵام تەقەی کوێرانە و بەرب لاوە و پچڕپچڕ لێرەو لەوێ هەرمابوو. جاروباریش هەندێ لە گوللەکان بە

سەرمانداو بەم لاوئەولاماندا ویزو هوڕیان بوو. پێ لاوەمان لەپێدا نەمابوو، ئاوەکە لێی سەندبووین.

لە پێشدا بەرەو شیرەمەڕو دواتر داگەڕاینەوە بەرەو کوڵکنی کات بەرەو دووی شەو دەچوو، نزیک بووینەوە لە جادەکەی پردی زەڵم – خورماڵ، کاتێکمان زانی کاروانێکی سەربازی لە خورماڵەوە بەرەو پردی زەڵم دەڕوات، لە پەنا جادەکەدا خۆمان حەشاردا تا دوژمن تێپەڕی. ئێمەش لە جادە پەڕینەوە و لەگوندی کوڵکنی سێ جووت پێ لاوەمان پەیدا کرد، پاشان بێوچان بەرەو گوندی تەپی سەفا ڕۆیشتین. لەوێ عەبدولکەریم تەپی سەفاییم بینی و پێشتر دەمناسی پێشمەرگە بووە. زانی لێمان قەوماوە خوڵکی کردین کە حەشارمان بدات و ماوەیەک بحەوێینەوە. سوپاسمان کرد و گووتمان دەڕۆین، ئەویش ڕێنوێنی کردین تا لە ئاوایی دەرچووین و خۆمان گەیاندە گوندی شەشکی بچووک، کە تاقەماڵێک بوو.

ئەمشەو نەرمە بارانێکی تێکەڵ بە بەفر وردە وردە دەباری، ئەو شەوە ئاسمانیش شەڕی لەگەڵ دەکردین، خۆمان خزاندە تاقە ماڵەکەی خاڵە حەمە نەجیب، کە پیاوێکی چاونەترسی کوردپەروەر و خاوەن سفرەو خوان بوو. دوای نانخواردن سۆپای عەلادینیان لەژوورێکی شێداردا بۆ داگیرساندین، غازی سۆپا و بۆنی شێ تێکەڵ بووبوو، ڕووی دەمم کردە خاڵە حەمە نەجیب و گووتم: سبەینێ لێرە دەمێنینەوە. دادە مینای خێزانی هەڵیدایەو ووتی: ئەبێ بەیانی زوو بچنە ناو چەم، ووتم: ناو چەم قوڕ و سەرمایە. ووتی: نابێ.. ئێرە مەترسی زۆری لە سەرە، هەموو جارێک جاش دێن گەوڕەکان و هەردوو ژوورەکەش دەپشکنن، ئەوەش بزانن کە ئەمشەو لە خۆرماڵ تەقەیەکی گەرم بووە، بەیانی حکومەت دێت.

نەیئەزانی تەقەکە خۆمان بووین. بڕیارماندا بڕۆین، من هەرچەندە پێم لە جێ چوو بوو، بەلام سەرما و خەمی سامان و هەڤاڵەکانی. ئازاری لە بیر برد بوومەوە. نزیکەی یەک کاتژمێر شەوی مابوو، قوتوویەک ماسی کەپس و چەند نانێکمان لە دادە مینا وەرگرت و بەتەنیشت خێڵی حەمەدا ڕێگای دەشتی سەبانمان پێوا، تا گەشتینە کەلاوەکانی گوندی خەرپانی، کە گەشتینە جێ شوێنێکمان لەو گوندە وێرانکراوە بۆ مابوویەوە، کە هەندێ ئارامی تێدا بگرین، ئەویش بان (سەقف)ی مزگەوتەکە بوو، کە لەکاتی تەقاندنەوەدا بە

گەورمیی کەوتبووە خوارەوە، بەڵام نە بەتەختی، بەڵکو بەلاربوونەوە شێوەی ئەشکەوتێکی پێکهێنابوو.

ئەو ڕۆژە، واتە ١٩٨٠/١/١٤ ئاگرمان لە ئەشکەوتە ناسروشتیەکەدا کردەوە، سەیرم لێدەهات بەعس چۆن بەم شێوەیە بە جێی هێشتووە و تەختی زەوی نەکردووە[١]؟ دەمە و عەسر چەند ولاخ دارێکی قاچاخچی ناسراو هاتن. هەرچیمان لێ دەپرسین، بێ وەڵام بوو، دیاربوو کەبێ ئاگابوون لە هەموو هەواڵێک، ئازاد لە بەر ئەوەی لەشی بەخۆوە بوو شەکەتی زۆری بۆ هێنابوو، بەولاخدارەکاندا ناردمانەوە بۆ سەر سنوور، کە شەو داهات لەگەڵ بەرزاندا گەڕاینەوە تا بەڵکو لە دەوروبەری خورماڵ هەواڵێکی برادەرانمان دەست کەوێ، هاتینە گوندی گومەلار هیچ هەواڵێکمان دەست نەکەوت. منیش پێم هێندە ئاوسابوو خەریک بوو لەپێ لاوەکەمدا جێگەی نەدەبوویەوە، چی بکەین؟ وەڵامی ئەم پرسیارە گەلێ زەحمەت بوو، بیرم کردەوە ئەگەر برادەران شەهید نەبووبن ئەوا وەک ئێمە چۆن خۆمان دەرباز کرد، ئەوانیش خۆیان دەرباز کردووە. بەڵام دڵنیا بووم شەهید بوون، لەم هێنان و بردنەی خەیاڵدا هەر ئەوەم بەچاک زانی بگەڕێینەوە.

دیسان سەرکەوتینەوە بۆ خەرپانی. بەرزان کوڕێکی بە غیرەت بوو، نەمیزانی قاچم لە جێ چووە، کە گەیشتینە ئەو شوێنەی جێگەی مەترسی نەماوە، جارجار چەکەکەی لێ وەردەگرتم و دەیکردە شانی، لە خەرپانی نەرچووین لە چەمی سۆڵە لە جێگەیەکدا پێی دەگووترا سەفەر هاواری ئیتر هێزمان لێ بڕاو شەکەتی زۆری بۆ هێناین، کونێکمان دۆزییەوە وەک کونە گورگێ وابوو، بەڵام کەمێک فراوان. کاتی خۆی بنێشت کەرەکان گڵی سپییان بۆ سواخدان و کۆچەڵەی بنێشت لێ هەڵکەندبوو، شوێنی وا پێی دەووترا گڵەجانە، ئێستا بۆ ئێمە بووە کاروانسەرا. چووینە ناوکونەوەو بەکوڵەباڵەکەی بەرزان دەمەکەیمان گرت. نان و ئاومان خوارد و تا بەیانی کزکۆڵەمان تێدا کرد. بەیانی زوو هاتینە دەروو کەوتینەوە ڕێکردن، هەورازەکەی شوانکێلمان

---

[١] - ڕژێمی سەدام دوای ئەوەی ئاوایییەکانی کوردستانی وێران ئەکرد، ئەگەر بەهۆی کەمتەرخەمی سەربازەکانەوە خانوویەک یان گەوڕێک یان سەرسایەک بمایە، دووبارە ئەهاتنەوە بۆتەقاندنەوەی نەوەک پێشمەرگە کەڵکی لێوەرگرن.

بڕی و دابەزینەوە بۆ سەر چۆمی پالانیا، وێرانەی ئاوایی کاولکراوی دەستی بەعسمان خستە پشت سەروو هەورازبووینەوە بۆ سەرسنوور، نزیک بە نیوەڕۆ گەشتینەوە هاکلێی بۆ بارەگاکەمان، هەندێ پێشمەرگە هاتن بەدەممانەوە و هەواڵی دڵتەزێنی شەهیدبوونی سامان و تاریقیان پێگەیاندین، دیارە هەر ئەو شەوە شەهید بوون، قافڵە سەربازییەکە، کە لەلای کوڵکنی بەلای ئێمەدا ڕەت بووە تەرمی ئەوانی پێ بووە بەرەو سەیدسادق بردوونیان، بەڵێ لەو کاتەدا دوو کاتژمێر پێشتر ئێمە هەمومان پێکەوە بووین وا ئێستا تەرمی بێگیانی ئەوان بەدەست دوژمنەوەیە و ئێمەش بێ ئاگا لەم کارەساتە دڵتەزێنە خەریکی قوڕ شێلانی دەشتی شارەزوور بووین.

زانیمان لە تەوێڵەوە ڕێکخستن هەواڵیان ناردبوو بۆ هاکلێو ئاگاداری برادەرانیان کردبووکە سامان و تارق شەهید بوون. لەو لاشەوە ئاوات بە برینداری هەر هەمان شەو خۆی گەیاندبووە ئاوایی تازەدێی پەنا خورماڵ و ماڵی حاجی ئەحمەد شاردبوویانەوە. دوای چەند ڕۆژێ ئاگاداری دکتۆر کەمال شاکریان کردبوو، کە لەو ناوەدا بووە بە هانایەوە چووەو بە سواری ولاخێک هێنابوویەوە بۆ شۆشمێی و سەرسنوور.

لە شۆڕشەکەماندا هەندێ کاری بێ بەرنامە و پلان دەکران، کە زیانی زۆری لێدەکەوتەوە، ئەو کارەش کە بە ئێمەیان سپارد زۆر بێ پلان بوو. بێ ئەزموونی پێنج پێشمەرگەکەش با لەولاوە بوەستێ، کە ئەو ڕووداوە ناخۆشەی خوڵقاند، بەلام ئەو ئێوارەیە فەیسەڵی مەلاعەلی لە خەرپانی قسەی نەخشەکێشەرانی ئەم بەرنامەی شکاند بوو بەوەی بەرپرسیاریەتی وەرنەگرتبوو، بەڕای من کارێکی عاقلانەی کرد. من ئەو ڕۆژە ئەمزانی فەیسەڵ بۆ بەرپرسیاریەتی ئەو ئەرکەی ڕەتکردەوە، بۆ خۆشم کاتێک وتیان تۆ بڕۆ بێ لێکدانەوە ڕۆیشتم، وام ئەزانی ئەگەر بڵێم ناڕۆم ئەوە ترسنۆکییە، هیچ نەبێ دەبوو لەباتی دوو پێشمەرگەی نەکردە دووپێشمەرگەی کردە لەگەڵ خۆم ببەم.

سامانی حاجی قادر کورد واتەنی کون لە جەرگیدا نەبوو، بەلام بێیەزمونی خۆی و ئەو ناکۆکییەی لەناو هەرێمی یەکدا هەبوو کردیە

قوربانی[1]. ئەم بنەماڵە لە ڕێگای کوردایەتیدا قوربانی گەورەیاندا، دوای سامان براکەی سالار هات و سەنگەرەکەی سامانی پڕ کردەوە و درێژەی بە ڕێگاکەیدا، بوو بەیەکێک لە کادیر و فەرماندە زیر و هوشیارەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان. بەداخەوە ئەویش لە ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١دا لە کفری لەجێگەیەک بەناوی تا لاوەاو لەشەڕێکی نابەرامبەردا گیانی فیدای ڕێگاکەی سامان کرد.

---

- ئەو کاتە سەرەتای ناکۆکییەکانی ناو هەرێمەکە سەری هەڵدابوو، ئەوەبوو کۆمەڵە بەرنامەی هەبوو سێ کەرتەکەی بەری هەڵەبجەو هەورامان لەهەرێمی یەک و کاکە حەمە داببڕن، کاک حامد بکەنە بەرپرسیان، نەلەبەر خۆشەویستی کاک حامد بەڵکو لە دژی کاکە حەمە، جائەو خەون و خەیاڵە بەرپرسانی ئەو نەخشەیان سەرلێ شێواندبوو، بێبەرنامەو پەلەپەل ئەیانویست زنجیرەیەک چالاکی بکەن بەلام نەیانتوانی و سەرکەوتوو نەبوون، لەشوێنێکی تردا باسمان کردوە کاک حامد زوو لەمە تێگەیشتوو ناوچەکی بەجێهێشت.

# گەشتەکانی ئەودیو چیا

سەرەتای لەمنگی ١٩٨٠/٢دا کۆمەڵەی ئێران هێزێکی لە ناوچەکانی هەورامان کۆکردەوە، لە شاری نەسوودەوە گەشتێکی بۆ ناوچەکانی ژاوەرۆ، کامیاران، سنە و دەوروبەری دەست پێکرد ، دواجار هێزەکە بۆ پشتیوانی کردن لە شاری سنە ڕۆیشت، کە ئەوکات شار بەدەست هێزەکانی کۆمەڵەو دیموکرات و لایەنەکانی تری وەک چریک فیدایی، پەیکارو.....تاد وە بوو، بەر لەوەی هێزەکە بگاتە ناوشاری ناوبراو لەدەوروبەری کامیاران و گەردەنەی مرواریدا بووین.

ئەو دەمە هێزەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، کە سەر بە هەرێمی یەک بوون لەسنوورەکانی نەوسوود، مەریوان و پاوەدا بەپچڕ پچڕی و بێ بەرنامە ئامادەییان هەبوو، بارەگای کەرتی دووی هەورامانی سەربە هەرێمی یەکیش لە هاکێی و کەرتی بالانبۆ لەتیراوێ و لیژنەی ناوچەی هەڵەبجەش لە دەرە وەزێی بوون، ئەم شوێنانە کەوتبوونە نێوان شاری نەوسوود و سەر مەرزی تەوێڵە لەبەردەم ئاوایی شۆشمێدا. ئێمە مەفرەزەیەک نزیکەی[١] کەس سەر بەم کەرتانە لەگەڵ ئەوهێزەدا بووین.

لەناوچەکانی ترو هەرێمەکانی تریش کادرو بەرپرسەکانی یەکێتیی لەگەڵ هێزەکانی ڕۆژهەلات بوون، بۆ نمونە عەلی شیعە، حەمە نەگرمی ئەنوەری مەجید سوڵتان، جەمالی حەمەی خواکەرەم و شێخ عەلی، کە هەموویان فەرماندە و کادیری دیاری سەرەتای شۆڕش بوون لە ناوچەکانی سنە، سەقز، بانە، مەهابادو ناوچەکانی تردا ئیشیان دەکرد.

---

[١] – ئەمە لیستی ناوی پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە، لەگەڵ ئەو هێزەی ڕۆژهەلاتدا بووین حەمەی حەمەسەعید، سامان زۆراب، حەمەسەلیم فەتحلا، حەمەغەریب ڕزگار مەحیەدین، فەیسەڵ کاکڵ، فەیسەڵ مەلاعەلی، سەروەت ڕەمەزان هاواری، عوسمان مامە عەبە دەڵەمەری، عەبدوڵای سلێمان بەگ، ستار ئەمین، ئازاد عەبدوڵا وەهاب و ئازادی شێخ مەنزر.

لە نەوسوودەوە ئەم هێزە بەڕێکەوتین بەرەو شارۆچکەی نۆدشە. نۆدشە شارۆچکەیەکی خجیلانەیە لە دامێنی چیای هەورامان ڕووبەڕووی یەکەم لووتکەی زنجیرە چیای شاهۆ بەناوی گامۆڵ هەڵکەوتووە، کە بەشێوەزاری هەورامی ئەدوێن، زنجیرە چیاکانی شاهۆ و هەورامان بەشێکن لە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس. ئەم شارۆچکە مێژووییەکی دێرینی هەیە و ژیان و گوزەران تێدا سەخت و نالەباربووە، سەرچاوەی ژیانیان باخداری و کۆڵداری و پیشە دەستیەکان بووە. شەوێک لە نۆدشەدا ماینەوە، هێزەکانی دیموکرات کەوتنە هاتوچۆو کۆڕ و کۆبوونەوە. ئێمەیان ناسییەوە کە پێشمەرگەی (ی. ن. ک) و لەگەڵ ئەم هێزەداین، ڕۆژی دوایی بەرەو دەرە هەجیج و مێویە نۆدشەمان بەجێهێشت، ئەوانەی ئەندام ولایەنگری کۆمەڵە و دیموکرات بوون لە نۆدشەدا بەردەوام بگرەوبەردە لە نێوانیاندا هەبوو، بۆیە من لە دوای دەرچوون لەو شارە، چاوەڕێی ئەوەم ئەکرد دیموکرات هەڵوێستێک بنوێنێ و بیانویەک بگرن بەم هێزەی کۆمەڵە.

دەرە هەجیج ئەکەوێتە دوو کیلۆمەتری باشووری ڕۆژهەڵاتی نۆدشە، دانیشتوانی ئەم گوندە هەجیجین، هەڵکەوتەی جوگرافیای گوند لە ناوسەخت و بەردی ڕەق و تەقدا دایە، ئاوی سیروان لەخواترو بەبەردەمیدا بە شێوەیەکی خوڕو سەرنج ڕاکێش لەو کاتەوە دنیا دروست بووە تا ئێستا بۆ ساتێکیش نەوەستاوە، مرۆڤ سەری سوڕئەمێنێ، کە چۆن لەوێدا ژیاون. عەبەی مەلا کادیری سیاسی و پێشمەرگەی باوەڕپێکراوی ئەم هێزەیە و خەڵکی هەجیجە، هیچ میللەتێک هێندەی هەجیجیەکان ڕاستگۆ و زەحمەتکێش و دەست ڕەنگینین. زۆربەی پێداویستییەکانی ژیانیان خۆیان دابینی دەکەن. عەبەی مەلا لە هەر گوندێک کۆبوونەوەی جەماوەری بکرایە، بەشێوەیەکی زیرەکانە سەرنجی خەڵک بۆلای خۆی ڕادەکێشاو بۆ ئەوەی ببنە کۆمەڵە و هاوکاری ئەم هێزە بکەن.

لەڕۆژی سێیەمی گەشتەکەیدا ئەم هێزە لە گوندی هەجیجی گەورە[1]، کە ئارامگای کۆسەی هەجیجە بە سەرئەبرد. هەجیجی گەورە کەوتووەتە سەر

---

[1] پیاوانی هەجیجی لەئێرانی کۆتایی سەردەمی قاجاریەو لە دەورانی ئەحمەدشادا، وە لەسەردەمی پەهەلەویدا لەهەردوو دەورانی ڕەزاشای باوک و محەمەد ڕەزاشای کوڕدا،

ڕووباری سیروان بە دووری ٥٠٠ مەترەوە. لە سەرووی هەجیجەوە، نزیک بە٧٠٠ سەد مەتر کانی بەناوبانگی بڵ هەیە، بڵ بە زمانی یونانی واتە خوای ئاوەکان، لە ناو هەجیجدا سەیری هەرلایەک بکەیت جگە لە ماهی بەرزو شاخی سەختی ڕەق و تەق و گابەردی گەورەگەورە چیتر بەدی ناکەیت، هەجیج و هەجیجیەکان مێژووی بە سەرهات و تایبەت بە خۆیان هەیە[1]. کات

---

نەگیراون بە سەربار، تا ساڵی ١٣٥٧ی شەمسی و ڕووخانی ڕژێمی شاهەنشاهی، لەساڵی ١٣٥٠دا بۆ یەکەم جار گەنجێکی هەجیجی ئەبێتە سەربازی خۆبەخش بەناوی حەمەعەزیزی ئەحمەدی، بۆ بەشداری لەشەڕی مهراندا. لە درووست بوونی دەوڵەتی عێراقیشدا لەسەردەمی مەلیکیەوە تاساڵی ١٩٧٥ پیاوانی هەجیجی ئازاد بوون و هاتوو چۆیان بۆ عێراق ڕێگری نەدەکران، نیشانەو پاسپۆرتیان ئەو شاڵەی سەریان بوو.

٢- داستانی ئەم سەربازی نەکردنەیان لەئێران و ئازاد بوونەیان لەعێراق، دەگێڕنەوە بەم شێوەیە بووە: کاتێک ڕەزاشا ئەفسەر ئەبێت لەسوپای ئەحمەد شای قاجارد بەمەئموریەتێک لەسنەوە دێتە ناوچەی هەورامان و لەکراویە دۆڵ شێخی حسامەدین ئەبینێ، شێخ پێی ئەڵێت تۆئەبیتە شای ئێران، ئەویش پێی ئەڵێت ئەگەر بووم بەشای ئێران تۆ داواکاریت چی ئەبێت لەمن؟ شێخ ئەڵێت دووئاوایی هەن پیاوانیان ببەخشە لەسەربازی کردن، ئەو دووئاواییەش هەجیج و کەلجینن. ڕەزاشاش کە بووە بە شای ئێران بە نوسراوی فەرمی ئەم داواکاریەی شێخی حسامەدینی جێبەجێ کردووە. ئەم دوو ئاواییە لە هەوراماندا بێدەرامەترین ئاواین، هەجیجیەکان بەکۆڵ شارەوشارو ناوچە بەناوچە وردەواڵە فرۆشیان کردووە، کەلجیەیەکانیش سەید و بەسروشت فەقیرحاڵن. هەرلە دوای ئەو بڕیارەی ڕەزاشا، شێخ لەعێراقیش لای حکومەتی وەخت ئەو ئازاد بوونەیان بۆ دەستەبەر ئەکات.

[1] - کاتێک جەعفەرسان حکومەتی لهۆنی دروستکرد هەرئاواییەک بەپێی دەرامەت و ژمارەی دانیشتوانی تفەنگ و تفەنگ چیان لەسەردا ئەنێ، ئەوکات بۆ هەجیج حەوت تفەنگچی و حەوت سەد تمەن بۆکڕینی حەوت تفەنگی برنۆ دیاری ئەکەن، هەجیجیەکان حەوت سەد تمەنەکەیان پێ هەڵناسوڕێ و ناشیانەوێ تفەنگچیەتی بۆ سان بکەن کۆئەبنەوە، بڕیارئەدەن سەد تمەن بۆ سلامانە بنێرن و پیاوێکی ژیرو قسەزان بیبات و تکا بکات وازیان لێ بهێنێ. بۆ ئەو مەبەستەش سۆفی شەفیعی فاتەخان دیاری ئەکەن، ئەویش ئەڵێت: من ئامادەم بەلام جلوبەرگم دڕاوەو لەڕووم نایەت بەم جلوبەرگەوە بڕۆمە خزمەت سان. ئاوایی شەرواڵی هەلاوەو چۆغەی بەئامانەت بۆپەیدا ئەکەن، ئەیکاتە بەروو سەد تمەنەکە ئەبات و ئەچێت بۆ نەوسوود. ئەو ڕۆژە بەڕێکەوت بەگزادەی جاف وچەندی سەرۆک عێل بۆ پیرۆزبایی میوانی سان ئەبن، پاسەوان ڕێگە نادەن سۆفی شەفیع بچێتە پێشەوە، بۆیە دەنگ بەرز ئەکاتەوە ئەڵێت: من بۆ پیرۆزبایی هاتووم، سان گوێی لێ ئەبێت

ئێوارە بوو وردە وردە باران ئەباری، ئێمە لە مزگەوت چاوەڕێی دابەش بوون بووین، بە سەرمالاندا بۆ نانخواردن، دوای دابەشبوون، هەر خاوەن ماڵێک میوانەکانی خۆی ئەبردەوە بۆ مزگەوتەکە و پێیان ئەوترا لە مزگەوت نان بخۆن.

کاتێک هەموان بەیەک گەیشتینەوە لە مزگەوت، یەکێک بە دەنگی بەرز ووتی: کاکەگیان ناکرێ ئەم میوانانە هەریەکەو لە ماڵێکدابن، ماڵەکان نانەکە ئەهێننە مزگەوت لێرە هەموان پێکەوە نان ئەخۆین. ئەمەیەکەم جاربوو من شتی وابببینم، ئەمەش بۆ ئەوە بوو نەوەک ماڵێک نانی ئامادە نەبێت یان خواردنەکەی باش نەبێت، یان ئەو میوانە حەزی لەو جۆرە خواردنە نەبێت، کە لەو ماڵەدا هەبێت. هەر چۆن بێت لە مزگەوت خواردنی جۆراوجۆر تێکەڵ و پێکەڵ لە سەر سفرە دانراو ئەوانەی هاتبونەوە بۆ مزگەوت هەرکەس ئارەزووی لە هەر خواردنێکی هەبوایە ئەوەی ئەخوارد، هەندێکیش لە ماڵان مابوونەوە بەگوێی خاوەن ماڵەکانیان نەکردبوو. ڕۆژی دواتریش بۆ نیوەڕۆ هەر لە هەجیج بووین. پێش نیوەڕۆ لەناو مزگەوت دانشتبووین کەسێک خۆی کرد بەژووردا و چووە لای عەبدوڵڵا بابان، کە بەرپرسی یەکەمی ئەم هێزە بوو، پێی ووت: نوێنەری حیزبی دیموکرات هاتوون ئەیانەوێت لەگەڵتان دانیشن. من زانیم بابەتەکە چییە و دیموکرات باسی چی ئەکەن؟

دوای ئەوەی کە هاتنە مزگەوت کەسێک بە ناوی سەرۆکی وەفدەکەوە خۆی ناساند ووتی: من ئەسکەندەری ئەلەی لەیلێم، هاتووین بزانین ئێوە ئەم هێزەتان بۆ کۆکردوەتەوەو بۆ کوێ ئەچن؟ عەبدوڵڵا بابان وەڵامی دایەوەو ووتی: ئێمە ئیشی خۆمان هەیە و لەم ناوچەیە گەشت ئەکەین و پەیوەندی بە

---

ئەڵێت ڕێگەی بدەن بابێت، ئەچێتە ژوورەوە سان لەلای خۆیدا دایئەنێت. ئەویش بەدیار میوانەکانەوە بەدەنگی بەرز بەناوی هەجیجیەکانەوە پیرۆزبایی لەسان ئەکات و ئەڵێت: ناتوانین حەوت سەد تمەن جەم بکەین و هەر سەد تمەنمان بۆ کۆکراوەتەوە ئەوە هێناومە بۆ سلامانە، تفەنگچیەتیش ناکەین، ئەگەر تفەنگچیەتیمان کرد بۆ تۆ، ئەو کات نە لە عێراق ئازاد ئەبین و نە لەلای دەوڵەتی ئێران. سانیش دوای بەخێرهێنان و ڕێزی تایبەت بۆی بەدیار میوانەکانیەوە هەجیجیەکان ئەبەخشێ لەکڕینی حەوت تفەنگ و تفەنگچیەتی کردن، سەد تمەنەکەشی ئەداتەوەو ئەڵێت ئەوە ببەرەوە بۆ کوێرەکانی (حافزەکان) بەردەم مەرقەدی کۆسەی هەجیج.

ئێوەوە نییە. ئەوانیش ووتویان: چۆن پەیوەندی بە ئێمەوە نییە؟ ئێوە ئەتانەوێت بچنە سەر سوپای ڕزگاری ئێمە ڕازی نین، لەم ناوچەیە ئێمە باڵا دەستین ئەبێت بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆتان. بابان بەپێکەنینەوە ووتی: تۆ بڕیاردەری ئێمە نیت و درێژە بە گەشتی خۆمان ئەدەین. ئەسکەندەر بە توڕەییەوە ووتی: ئەی ئەمە چییە هێزی بێگانەتان لەگەڵە؟
بابان لە وەڵامدا ووتی: ئەوە بێگانە نین، پێشمەرگەی کوردستانن، موی چاوی ئێمەن، مەبەستی لەمووی چاو (برژانگی) پاراستنی چاوە. پێی ووت ئەوە ئێوەن ڕێگە ئەدەن جاشی بەعس وەک عوسمانی عەلی چەتون دێهننە ناوچەکە و پشتیگری لە ڕزگاری دەکەن بە دژی ئێمە. منیش لە سوچێکی مزگەوتەکەدا لەگەڵ (کاکە شێخ) فەیسەلی مەلا عەلی دانیشتووین و گوێمان لەم گفتوگۆیە گرتووە، سەرئەنجام پێک نەهاتن و وەفدەی حیزب گەڕانەوە، ئێمەش کەوتینە ڕێ و بەسەر پردی هەجیجدا بەرەو ئاوایی ئەسپەرێز، پردەکە لەسەر سیروان، بەدار بەستراوە زۆر بەرزو سامناکە کردمانە ئەوبەر، بەلای چەند ماڵێکدا بەناوی گەڵوان سەر کەوتین، لەوێ پیاوێک وەستابوو باوەشێک نانی لەسەر هەردوو دەستی دانابوو، هەرپێشمەرگەیەک بەلایدا ڕەد ئەبوو نانێکی هەڵئەگرت و ئەیخستە گیرفانی، ئەوپیاوە ناوی مەحمودی باوە عیسا بوو، بەهەڵگەڕان بە هەورازێکی توند ڕێگەیەکی لاپێدا[1].
سەرکەوتین بەرەو گوندی ئەسپەرێز بەڕێنوێنی پیاوێکی هەجیجی بەناوی نازاری حاجی حەمە عەزیز، خۆمان لەڕێگەی بڵ و سەرپردی مەلا دزییەوە. گوندی ئەسپەرێز کەوتوەتە داوێنی زنجیرە چیاکانی شاهۆ لە ناو جەنگەڵێکی پڕ و ڕوو بە ڕووی چیای هەورامان و چیای کوسالاندا جێگەی گرتوە. عەسر گەیشتین لێرەدا مابینەوە چەند کەسێک هاتن و ووتیان، هێزێکی سوپای ڕزگاری لەوبەر دامەزراون لە گوندەکانی ڕوار و دەل، ئەیانەوێت دوای تێپەڕبوون لێرە کەگەیشتنە ئاواییەکانی زۆم و دەشتە قەڵبێ، لێتان بدەن. ئەو شەوە چەند شارەزایەک ئامادەکران، تا لە ڕێگەیەکەوە بەرەو دەڵەمەرزو دێوەزناو بڕۆین و خۆمان بە دوور بگرین لە شەڕی سوپای ڕزگاری.

[1] - ئەو ڕێگە سەخت و هەورازو لاپێ ،پێی ئەوترێ ڕێزنە گونی.

کاتێک لەئەسپەریزەوە ئەچیتە دەڵەمەرز ئەبێ بەڕێگایەکدا بڕۆیت بەناو گوندەکانی دەشتە قەڵبی و زۆم دا بە لێواری لقێکی ئاوی سیرواندا گوزەر بکەیت، کە لە ناوچەی سنەوە سەرچاوە ئەگرێت و لە بەردەم گوندەکانی ئەسپەریز و نوێندا، لەگەڵ ئەو لقەی سیروان کە لە ناوچەی مەریوان و سەرشیوی سەقزو ناوچەی کەلاتەرزانەوە سەرچاوە ئەگرێ یەک ئەگرنەوە، گوندەکانی ڕوارو دەل ئەکەونە بناری پای کۆسالان. دیوەزناو، دەڵەمەرز، دەشتە قەڵبێ، زۆم و ئەسپەریزیش ئەکەونە دامێنی زنجیرە چیاکانی شاهۆ، ئاوی لقەکەی سیروان کەلەسنەوە سەرچاوە ئەگرێ ئەیانکاتە دووربەری، ئەمبەرو ئەوبەر.

ئەگەر بتەوێ بە ناو ئەم گوندانەی زۆم و دەشتە قەڵبێدا نەڕۆیت بەرەو دەلەمەرز ئەبێ ڕێگایەکی سەختی لاپێ و ڕێوازی بزنە کێوی بگریتەبەرو بەبناری شاهۆدا تا لەئاستی ڕوارو دەل تێپەڕی و ئینجا لە ئاست دەڵەمەرزدا شۆڕبیتەوە بۆ سەر سیروان و ڕێگای سەرەکی. ماوەیەک بە بنارو لە بەردەم هەوارەکانی چەپی دۆڵەوە گوزەرمان کرد چەپی دۆڵ ناوی ئەو هەوارگانەن کە بۆ ماوەیەکی زۆر گوندی ئەسپەریزو گوندی زۆم کێشەیان هەبووە لەسەری، بەکەس چارەسەر نەکراوە، تا دواجار ئەڵێن فلانە پیرەژنی بەتەمەن لەو بارەوە زانیاری لایە، حاکمی دەوران پیرە ژنەکە بانگ ئەکات بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکات ئاخۆ لەم بارەوە چی ئەزانێ، ئەم هەوارانە هی کام لایە؟

ئەویش بە خوێندنەوەی شیعرێکی میرزا شەفیع ی هەورامانی کە دەڵێت:

کەردەڵە چــــڕۆ ئۆ گەردە میـــــان
چەپی دۆڵ وەشا هوبەو زۆمیان

بە خوێندنەوەی ئەم شیعرە کۆتایی بە کێشەکە دێت و هەوارەکان ئەبنە هی گوندی زۆم.

هەندێک پێشمەرگە لە نیوەی ڕێگەدا توانای درێژە دانیان بەم ڕێگا سەختەدا نەبوو، بۆیە لە ئاست گوندی دەل دا لەم بەرەوە، حەمە کۆکۆ پێشیان کەوت و سەرەو خوار هەڵنیشتن و بەراییان گەیشتنە ڕۆخی سیروان، لە نزیک کانییەکەی کلوور کە دووبنەدار گوێزی گەورەی لەسەرە. لەوبەرەوە لە بەردەم گوندی دەلدا، هێزەکانی سوپای ڕزگاری دامەزرابوون و تەقەیان لێ کردن. تەقە و لێکدانی دووربە دوور دروست بوو، بۆ ماوەیەکی کورت و

کەس تووشی زیان نەبوو، ئێوارەی ئەو ڕۆژە، هەموو لەئاوایی دەڵەمەرز یەکمان گرتەوە لە سەر کانی و ئاوێکی تەنیشت گوندەکە، خەڵکی ئاوایی نان و ئاویان بۆ هێنایین دوای نان خواردن، شەو بەسەردا هات.

بەڕێگایەکی تەسکی لێوار ڕووبارەکەدا بە شوێنێکی تاریکی نووتەکەدا ڕێگای گوندی دێوەزناومان گرتەبەر. نزیکی گوند بووینەوە ومەفرەزەیەکمان بۆ تاقی کردنەوەی ئاوایی نارد. هێزەکەش لە خوار گوندەکەوە، چاوەڕێی هاتنەوەی مەفرەزەکە ئەکەین. چەند کەسی مەفرەزەکە هاتنەوە، ووتیان شێرە پاڵنگانی بەرپرس لە حیزبی دیموکرات لەگەڵ مەفرەزەیەکی حیزبی شیوعی عێراقیدا لەناو ئاواین، پێشمەرگەکانی حیزبی شیوعی لە مەهابادەوە هاتونەتەوە بۆ لای بەلەبزان ڕەوانەیان ئەکەنەوە. دیارە ئیمرۆ ویستویانە لێرەوە تێپەڕبن ئەم تەقە و لێکدانەی ئێمە و سوپای ڕزگاری بووە، ئەوانیش گەڕاونەتەوە بۆگوندی دێوەزناو.

زۆرماندو هیلاک بووین خۆمان کرد بە ئاوایی دێوە زناودا، دێوەزناو لە شوێنێکی پەناو چەپەک دایە، ئەکەوێتە نێوان گوندی پاڵنگان و دەڵەمەرز دوای ئەوەی پێشمەرگە ب لاوەبوونەوە بۆچایی خواردن و هەندێک بۆنان خواردن. شەو هەموو لە مزگەوت کۆبووینەوە جەماوەری گوندەکەش هەموو بانگ کرانە مزگەوت و عەبەی مەلا دەستی بە ووتار خوێندنی خۆی کرد، پاش تەواوبوونی قسەکانی، چەند کەسێک ووتیان ئەگەر ئەتانەوێ بچن بۆ پاڵنگان ئەبێ کاتژمێرێک شەوی بمێنێ لێرە دەرچن. چونکە سبەینێ ڕۆژ بومەوە ڕزگاری لە ئاواییەکانی زەوەنێی خوارو سەرو دان ئەو قولە بەرزانەی ئەوبەر زاڵن بەسەر ئێرەدا و کەس ناتوانێ لەو پلەوە سەرکەوێ بۆ لای پاڵنگان.

دوای ڕۆیشتنی خەڵک بڕیاردرا کاتژمێرێک شەوی بمێنێ لەئاوایی دەرچین. حەرەسەکان ئاگادارکران کاتژمێر چواری شەو هەموو هێزەکە بە خەبەرکەنەوە، بەلام کاتێک حەرەسەکان دەستیان بە خەبەرداركردنەوە کرد لەناو مزگەوت، فەرماندەی عەسکەری هێزەکە پیاوێکی نەشارەز لەڕێوڕەسمی پارتیزانی وسەربازی، عەشائیر ئینگارو بێ ئیلتیزام بوو بە ناوی حەمە کوکو. لە جێگای خۆیەوە ووتی کەس هەڵنەسێ و ئەوەی ئەڵێت بابڕۆین ترسنۆکە، ناڕۆین با ڕۆژبێتەوە. پێشمەرگەش ماندوون و خەوەکەیان

پێ خۆش و بۆ بیانویەک ئەگەڕێن کە نەڕۆین. کە زانیمان وایلێهات ویستمان پێشمەرگە ڕازی کەین هەستین و بڕۆین، بەڵام نەمانتوانی و ماینەوە. منیش مەفرەزەیەکی پێنج کەسیم لەپێشمەرگەکانی خۆمان بەشارەزایی کەسێک نارده پشتی ئاوایی، بۆبناری چیای شاهۆ، شارەزاکە کە خەڵکی گوندەکە بوو ڕێنوێنی کردن و بردبوونیە جێگایەکی باش.

کە ڕۆژ بوەوە، بینیمان وەک ئەوەیە لەچاڵێکی زۆر قوڵ دابین، بەرامبەرمان لووتکەی سەخت و بەرز لەو بەر سیروان سوارن بەسەر ئاوایدا، وادەرئەکەوێت کەلەو قولانەوە بەبەرد نەهێڵن کەس لە ئاوایی دەرچێت، گوندەکە لە سەر پارچە زەویەکی تەخت سواری لێواری ڕۆخانەیە، لەپشتیشەوە دوای برینی ٥٠٠ پێنخ سەد مەتر زەوی تەختایی ئەگەیتە سەرەتای سەختێکی هەزار بە هەزار، مەفرەزەکەی ئێمە لە قەد ئەم سەختەوە سەیری ئاوایی بەردەمیان و سەیری هێزەکانی سوپای ڕزگاری ئەکەن لەو بەر بەسەر لووتکەکانەوە دامەزراون و زاڵن بەسەر دێوەزناودا، بڕیاردرا بە دەستەی پێنج تاحەوت کەسی وردە وردە بە مەسافێکی دوور لەیەکەوە لە ئاوایی بەرەو لای کەمینەکەی خۆمان دەست بدەینە ئەو سەختەی چیای شاهۆ.

ئێمە پێش کەوتین و گەیشتینە لای کەمینەکە و دەستمان گیربوو لە شوێنی ئەمین و دوور لە مەترسی، وردە وردە دەستەکان هاتن و ئێمەش هەورازتر هەڵکشاین و خەبەرێک نەبوو.

ئینجا حەمە کۆکۆ و بابان لەگەڵ کۆمەڵێک دەستیان لەماڵەکانی ئاوایی بڕاو مابوویان بگەنە سەختەکە درانە بەردەست ڕێژی گوللەی تیرباری ژـ٣ گەڕانەوە بۆ ناو ئاوای، ئێمەش بەچەکی بڕنەو و ژ-٣ وەڵاممان دانەوە و لەم بەری ئاوی سیروان بۆ ئەوبەر دوورە تەقە دەستی پێکردەوە، جەماعەتی حیزبی شیوعی و شێرە پاڵنگانی لەئاوایی خزانە ناوماڵان و نەهاتنە دەر، تا شەو بە سەرداهاتبوو مابونەوە. حەمە کۆکوو بابان و پاشماوەی هێزەکەی ئێمەش بەحاڵێکی خراپ تا گەیشتنە لای ئێمە. ڕێگای یەک کاتژمێر ئەبوو بەشەو بیبڕین، ڕۆژەکەی بە نزیکەی ١٠ دە کاتژمێر ئەم دۆڵ و ئەو شان و یاڵ ئینجا گەیشتینە گوندی پاڵنگان.

لە دوورەتەقەی ئەم ڕۆژدا، پێشمەرگەیەکی کۆمەڵەکە ناوی عەلی ڕەزابوو، بانگی سامانی کردبوو کە بچێت بۆ لای، سامان نزیکەی ٥٠٠ پێنج سەد مەترێک لەو هەورازە بەتینوویەتی داگەڕابوە خوارەوە، بۆلای عەلی ڕەزا، پێی وابووە برینداربووە، بۆیە داوای سامان ئەکات، سامان ئەگاتە لای و پێی ئەڵێت ها عەلی ڕەزا چییە؟ ئەڵێت وەڵا حەزم کرد بێیت ببینی من چەپارتیزانێکم، ئاوا بەم شێوە ماوەیەکە لەم سەنگەرەدا شەڕئەکەم. سامانیش تازە دەست ئەکات بەپێکەنین و ئەڵێت پارتیزانێکی زۆر باشی.

نیوکاتژمێر ڕۆژی مابوو گەیشتینە ئاوایی بەناوبانگی پاڵنگان گوندێکی کۆن و مێژوویییەکی دێرینی هەیە، لە مێژووی کۆندا بە دەرەتەنگە ناوی هاتووە پایتەختی هەڵۆخان بووە.

پاڵنگان دووگەڕەکە بەرامبەر بەیەک لەم بەرو لەوبەری ئەولقە ئاوەی لە نزیکی کامیارانەوە دێت و لەنزیک پاڵنگاندا لەگەڵ ئەو لقەی لای سنەو ژاوەرۆوە دێت یەک دەگرنەوە، ماڵەکانی لەسەر یەک بەقەد بەردە سەختەکانەوە بەوشکە کەڵەک هەڵچنراون، کەسێک ڕێی بکەوێتە ئێرە بەسەیرکردنی خانوەکان لە سەرو تەنیشتی گابەردەکانەوە ترس دایئەگرێ، ئەمە دوا گوندی هەورامی نشینن بەرەو کامیاران و کرماشان. بەڵام لە بێڵەوار گوندەکانی کەنۆلە هەن کەدابڕاون لە هەورامان و بەشێوەزاری هەورامیش ئەدوێن، ئەو شەوەشمان لەپاڵنگان بەسەربردو هەرکەس لەو ماڵەی کە ئێوارە لێی بووە بۆ نانخواردن شەویش لەوێ خەوتووە.

بەیانی دوای نان و چایی خواردن ئێمە لەوگەڕەکەی بەری چیای شاهۆوە مابووینەوە، دابەزینە سەرچەم، بەسەر پردێکی دارینی مەترسیداردا چووینە ئەوبەر، بۆ گەڕەکەکەی بەری لای زەمان گیروە، سەرکەوتین بۆ پشتی ئاوایی، پاڵنگان مزگەوتەکەی زۆرکۆن و پەرپووت بوو، لە سەرویی ئاواییەوە ئاسەواری قەڵای پاڵنگان ماوە. جادەی ئۆتۆمبێل لە کامیارانەوە تا زەمان گریوە هاتووە ئیتر ئینقیلاب بووە پاشماوەی بیلدۆزەرو گرێدەرو گەڵابەکانی ڕێگاوبان لەوێ لە کۆتایی جادەدا کەوتبوون و فەرهوود کرابوون.

دوای بڕینی ڕێگایەکی دورو درێژ گەیشتینە گوندی ماویان و لەوێ پشوومان دا، ئەوڕۆژە چەندین گوندی خنجیلانەی جوانمان خستە پشت سەر، لەولنە یوزیەر، کاشتەر و بزوەش گازرخانی و... تاد بزوەش، ماوەیەک نشینگەی

عەباس خان (سەردارەڕەشید) بووە. ماوەیەک لەم ئاواییانەدا گەشتمان ئەکردو ئەماینەوە.

لە دوای ئاوایی گەشکی بە لای چەپ دا لامان دایە ئافریانی سەر، خواروو. لە ئافریان بەرپرسانی کۆمەڵە سەردانیان کردین و لەگەڵ بەرپرسەکانی ئەم هێزە کەووتنە کۆبوونەوە و چەپەچپ، ئێمە پێمان ناخۆش بوو، پێمان وابوو مادام ئێمە بۆ هاوکاری و فێرکردنی یاسا و ڕێساکانی پارتیزانی لەگەڵ ئەم هێزەداین، ئەبێ ئاگامان لە هەموو شتێکیان بێت. لەم گوندەدا سدیقی کەمانگەکەر بەرپرسی کۆمەڵە لە کامیاران و حەمەسوری بەرپرسی سەربازی کۆمەڵەم ناسی، لەگەڵ چەند کادرێکی تریان وەک بەدلاڕەش و... تاد. لێرە لە مزگەوتی ئافریان چەند پێشمەرگەیەک شکاتیان کردبوو لە حەمە کۆکۆو وتبوویان پیاوێکی نەخوێندەوارەو عەشایرە بۆ لێپرسراوی کۆمەڵە ناگونجێ، کۆمەڵەش تەنیا لەناوچەی هەورامان بۆ دژایەتی کردنی حیزبی دیموکرات حەمەکۆکۆیان کردبووە مەسئول.




دوای چەندین ڕۆژ مانەوە لە ئافریان ڕۆژێک کە بارانێکی زۆر ئەباری ئاودیوی دۆڵی ملە مرواری بووین، چووینە گوندی نەجەفاوا، گوندێکی گەورە و لە نزیک ڕێگای کامیاران سنە دایە، پاشماوەیەک بڕیار درا بچینە ناو شاری سنە، دەنگوباسی هێرشی دەوڵەت هەبوو بۆ سەر شار، ڕۆژێک چەند ئۆتۆمبێلێکی پاس هاتن و چووینە ناو شار، لە جێگەیەکدا کە داخڵی شار ئەبووین شەوقی کارەبا هەموو جێگەیەکی ڕووناک کردبوەوە بۆ ئێمە دنیایەکی تر بوو، ئێمەش لەپەنجەرەی پاسەکا گوندی پانگان ، دەرەوەمان ئەکرد. ترافیک بوو، بینیمان چەند کەس لە ئۆتۆمبێلەکانیان دابەزیون و بگرەو بەردەو پەلاماری یەکتر ئەدەن و چەند ژن و منالێش بە دیاریانەوە ئەگرین، حەمەکۆکۆ خۆی تانیوقەدی لەپەنجەرەی پاسەکەی

ئێمەوە دەرکردو پێی ووتن هاتمە خوارەوە هەلا هەلاتان ئەکەم، ئێمەش هەموو دامانە قاقای پێکەنین.

ماوەیەک لە ناو شاردا بووین، بنکەو بارەگامان دانا، ئێمە لەماڵەکانی ئەحمەدی مفتی زادەدا[1] بووین، ئێوارەیەک بابان لەماڵێک میوانداری کرابوو، منیشی لەگەڵ خۆی برد، ناسری ڕەزازی لەوێ بوو، منی ناساند بەڕەزازی، من پێشتر لە هاتنی جەماوەری سنە بۆ مەریوان بەرپێیوان لە مانگی ٥ ١٩٧٩ ناسر و مەرزیە خانی خێزانیم بینی بوو، بەڵام ئەوان منیان نەئەناسی. بۆ ئێوارەی دواتر ناسر من و هەڤاڵەکانی ترمی میوان کرد و چووینە ماڵیان. شەویش لەوێ ماینەوە و بەیانی ئێمەی بردەوە بۆ ئەو شوێنەی کردبوومانە بارەگا، ناسر هونەرمەندێکی گەورەو کورد پەروەرە و ناسراوە لەسەر ئاستی کوردستان، بەووتنی سروودو گۆرانیەکانی گەنجان و لاوانی ئەخروشان و ورەی ئەدا بە شۆڕشگێڕەکان .

شار بە دەستی هێزە سیاسیەکانەوە بوو، (ئەرتەش) سەربازیش لەپادگانی شاردا بوون، لەسەر ڕێگەی سنە_مەریوان لەجێگەیەکدا بەناوی بیست و پێنج، بیست و پێنج ناوی گەڕەکێکە لە شار، من نەم زانی ئەو ژمارە لەچییەوە هاتووە، دواتر بۆم دەرکەوت بەناوی ٢٥ی شەهریوەری ساڵی ١٣٢٠ شەمسییەوە کە رووس هێرشی کردووەتە سەر ئێران، ناو نراوە، ئەو سوپایەی لەوێ بوو لەشکەری ٢٨ ی کوردستان بوو.

بڕیاربوو هێزەکانی حکومەت هێرش بکەنەوە سەرشارو لەژێردەستی حیزبەکاندا دەریهێنن. ئەوانیش بە ڕێگای جۆراو جۆر خۆیان ئامادە ئەکرد ڕێگای لێ بگرن. لەوانە دانانی ژن و منداڵ لەسەر جادەکانی دەرەوەی شار ئەیانووت با ژن و منداڵ لەسەر جادەکان ڕاکشێن وڕێگا لە تانک و زرێپۆش بگرن.

---

[1] ماڵەکانی مفتیزادە داگیر کرابوون، لەلایەم کۆمەڵەوە، ئەوماوە ئێمەیان ناردە ئەوێ. کۆمەڵەوە چەپەکان دژایەتی مفتی زادەیان دەکرد بەڕای من ئەودژایەتی کردنەیان کارێکی هەڵەبوو، چونکە هەرچەندە مامۆستا ئەحمەدی مفتی زادە پیاوێکی دیاری ئایینی بوو لەگەڵ ئەوەشدا بیری نەتەوایەتی و کوردایەتیش زاڵ بوو بەسەریدا. لەباری مەزهەبیشەوە لەگەڵ حکومەتدا یەکی نەدەگرتەوە.

ئێمە داوامان کرد لە کۆمەڵە ئەمانەوێت بگەڕێینەوە، چونکە ئەرکی ئێمە تەواوبووە، ئێمە لەچیاو دۆڵ و گوندەکاندا فێری شێوەی ژیانی پارتیزانی و عەمەلی و کەووتی مەفرەزە پارتیزانەکانمان ئەکردن. ئێستا لە ناوشار دان و پێویستیان بە ئێمە نییە. بۆیە پێش دروست بوونی شەڕەکە و هێرش کردنی دەوڵەت بۆ ناو شار، ئێمە خۆمان کۆکردەوە بۆ گەڕانەوە، بەڵام ماوە نەبوو بگەڕێینەوە شەڕ دروست بوو، چونکە هێرشی دەوڵەت بۆ سەر شاری سنە زۆر کوتوپڕ بوو، شەڕەکە دەستی پێکرد و حیزبەکان هەموو دەرچوون بەرەو ئاریژو دەورو بەری شار، ئێمەش بەتەنیا جێماین و خۆمان بەناڕەحەت دەرکرد، تەنیا یەک پێشمەرگەی ئێمە بە ناوی فەرەح زۆراب سامان دیار نەمابوو ماوەیەکیش گەڕاین بە دوایدا نەماندۆزییەوە، بۆیە ڕواکەوتین، دواتر خۆی هاتەوە بۆ نەوسوود، باسی ئەوەی کرد لە کاتی دروستبوونی شەڕەکەدا چەکەکەی فەووتاندوەو سواری سەیارە بووە و بەرەو کرماشان بۆ لای خزمەکانی ڕۆیشتووە.

بەڵی لەناوشارەوە دەمەو ئێوارەیەک هاتینە گوندی حەسەن ئاوا، کەسێکی خەڵکی گوندی هەجیج لەگەڵمان کەوت بەناوی مامۆستا ئەلیاس، کە سەر بە کۆمەڵە بوو، مامۆستای یەکێک لە گوندەکانی ژاوەڕۆ بوو. ئەویش ئەیووت شارەزا نیم لەحەسەناوا بۆدەرچوون دوور کەوتنەوە لەئاست فرکەخانەی ئەو شارەدا، ئێمەی گەیاندە دەرەوەی شار و لە نزیک تونێلەکان هاتینەوە سەرجادە. ماوەیەک بەپێ و مەسافەیەک بە تراکتۆر هاتینەوە گوندی نەجەفاوا و بێوەستان بەرەو ئافریان بەڕێکەوتین، لای عەسر لە نێوان ئافریان و نەجەفاوا گەیشتین بە مەفرەزەیەکی کۆمەڵە لە نەوسوودەوە هاتبوون، مامۆستا حەمەرەشید سییامەند و مامۆستا فایەقیان لەگەڵدا بوون، پێیان وتین لە دەشتە قەڵبێ سوپای ڕزگاری لێیە و ئێمە کەوتوونەتە کەمینیانەوە، دوای گفتوگۆیەکی کورت ئێمە بەپەلە هاتین و کەمێک ڕۆژی مابوو گەشتینە نزیک ماویان، لەوێ ئەتۆمۆبێلێکی گەلابەمان بینی پێم ووت تا نزیک زەمان گریوە بمانبە، پیاوێکی باشبوو بە سواری گەلابەکە هاتین تا زەمان گریوە.

کاتێک گەیشتینەوە پاڵنگان تاریکی کردبوو، بەڕێکەوتین بۆ دێوەزناو، ئەمجار بەگوێی ڕووبارەکەدا نەک بەچیای شاهۆدا. لەگوندی دێوەزناو مامۆستا ئەلیاس کە شارەزاکەمانە خۆی لێ شاردینەوە، ئێمەش بۆ ئەوەی

دوانەکەوین خۆمان بەڕێگەیەکدا کەپێشتر هاتبووین هاتینە دەڵەمەرز، نیوەشەوێکی زۆر تاریک بوو، بە وریایی و پسکەپسک هاتینە ناو ئاوایی، چوومە بەر پەنجەرەی ماڵێک، چرای نەوتی فانۆسیان هەڵکردبوو، دام لەپەنجەرەی ژوورەکە و بەهێواشی بانگم کرد خاوەن ماڵ، بینیم چراکەیان کزکرد، هەرچەندەم کرد دەرگاکەیان نەکردەوە، زانیم ئەترسن پێشمەرگەیەک خەریک بوو بەزۆر دەرەکە بکاتەوەو بانگییان بکاتە دەر نەمهێشت، ووتم وەرە وازیان لێ بهێنە،

چووینە بەردەم ماڵێکی تر دەرگای لێکردینەوە، خۆم چوومە ژوورەوە ژوورەکە تاریک بوو، لەدەرگای هەیوانەکەدا وەستام و ووتم لالۆ ئەوچرا هەڵکە، ژن و پیاوەکە بەشڵەژاوی چراکەیان هەڵکرد، چەند منالێک لەژێر لێفەکانیانەوە جارجار سەریان ئەهێنایە دەرو سەیریان ئەکردم خەریک بوو زارە ترەکبن، ماڵەکەیان بۆنی شتی لێ ئەهات داوام کرد لەپیاوەکە ئەتوانی تا نزیک زۆم ڕەوانەمان بکەیت؟ پیاوەکە هەستا خۆی کۆکاتەوە منداڵەکانی هەموو بەجارێ زیرەیان لێ هەستاو ئەگریان، منیش وازم لێ هێنان و هاتمە دەرەوە. ملی ڕێگەمان گرت و لەئاوایی دەرچووین، ماوەیەک دوورکەوتینەوە لەجێگەیەکدا ئەوەی لەپێشەوە ئەڕۆیشت میلی کلاشنیۆفی ڕاکێشاو هاوری کرد کێی زەلام؟ نەجوڵێیت ئەکوژرێیت. بە ترس و شڵەژاوی یەکێک وەلامی دایەوە بۆ خاتری خوا ڕاوچیم. من لێی چوومە پێش و بینیم پیاوێکی قەڵەوە منداڵێکی لەگەڵدایە و تفەنگێکی ساچمە زەن و جووتێک نێرەکەوی پێیە. پێم ووت پێشم کەوە بۆ ئەسپەرێز، بەلام لەڕێگەیەکەوە نەچینە زۆم و دەشتە قەڵبێ. زۆر پاڕایەوە وازم لێ نەهێنا. کەوەکانی و ساچمەزەنەکەیم لەپەن ڕێگەوە داناو، بە زۆر پێشی خۆم دا، کەوەکان لەناو قەفەزەکاندا بە بەردی ئان دامئۆشین نەوەک تـ دي ئەتەوە ري ئویی بیانخوات. کاتێک گەیشتینە هەوارەکانی زۆم تیشکی خۆر لە سەر قولەی شاهۆ دای لە قولەی پشتی گوندی کەلجی و هەوارەکانی سیراجگا. ڕاوچییەکە و منداڵەکەیشم مۆلەت داو گەڕانەوە.

ئێمەش نان و چایمان لەگوندی ئەسپەرێز خواردو پێشمەرگەکان زۆریان هەوڵدا بخەون ڕازی نەبووم و بەڕێکەوتین و لەڕێی پردی مە لاوە(مەلا سەرکانی بڵەوە هاتینە بەردەم گوندی هەجیجی گەورە. لەئەسپەرێزد

ەرقەدی سەید ئیسماعیلی لێیە کەبەناوبانگە بە پیرئیسماعیل، ئەیان ووت ئەمە برای سید عوبەیدیلایە (کۆسەی) هەجیج.

سەرچاوەی ئاوی بڵ لەئەشکەوتێکی زار ب لاوەدا لەبەرزایی ئەشکەوتەکەوە هەژمەکات بۆ ناو ئاوی سیروان هەر ۱۰ دە مەتر لە ئاوەکەی سیروانەوە بەرزترە. ناو ئەشکەوتەکە وێرانەی ئاشێکی ئاوی لێیە. ماوەیەک سەیری ئەویمەنە سەرنج ڕاکێشەمان کردو بەجێمان هێشت کەوتینە ڕێ بەرەو گوندی هەجیج، ئەو ڕۆژە بینیمان خۆڵ و بەردی سەرپەردەکەی هەجیج لابراوە و تەنیا دارەکان بەڕووتی لەسەرئاوەکە ماون، لە لای بەری هەجیجەوە بەگوریس و تەل سەری دارەکان بەستراوە بە بەردەکانەوە. ئەمە بۆ ئەوەیە ئەگەر پایەی پردەکە ئاوبردی دارەکان بکەنە ئەو بەرەوە کە بەستراونەتەوە ئاونەیان بات، چونکە جارێکی تر داری وا درێژ و گەورەیان دەست ناکەوێتەوە بۆ بەستنەوەی پردەکە.

چەند پێشمەرگەیەک ترسان و نەیانتوانی بەسەر دارە ڕووتەکاندا بپەڕنەوە، ڕێگەی دوورو درێژی هەجیج نۆدشەیان گرتەبەرو ئێمەش پەڕینەوە و شەو گەیشتینە گوندی داریان و لەوێ ماینەوە. ڕۆژی دواتر هاتینەگوندی وڕاو لەوێوە بۆ کۆمەدەرە و بە ئۆتۆمبێل هاتینەوە بۆ شارۆچکەی نەوسوود، بۆ ئێوارەکەی گەیشتینەوە بارەگای خۆمان بۆ خانە باخەکانی هاکڵێ. واتە بەسێ ڕۆژ و دووشەو لە سنەوە هاتینەوە بۆچیای پەروونی لە نزیک گوندی شۆشمێ، کە جگە لەیەک شەوی لە داریان پشوومان دا ئیتر بە درێژیی ئەو دوو شەو و سێ ڕۆژە بەردەوام بەڕێوە بووین.

لەم سەفەرەدا و ئەو شەوەی لەشارۆچکەی نۆدشەدا مابووینەوە ئەفراسیاو هەورامیم ناسی، ئەوکات گەنجێکی دۆستی چریکە فیداییەکان بوو، دوای تەواوکردنی خوێندن لە ئێراندا چووە مۆسکۆ و لەوێ بڕوانامەی دکتۆرای لەمێژوودا وەرگرت، دواتر سەرقاڵی کارکردن بوو لەسەر ئارشیفی کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤیەت و خزمەتێکی گەورەی بەکورد و کوردستان کرد.

نۆدشە زادگای چەندین عالم و زاناو ئەدیب و پیاوی کورد پەروەرە، چەندین ڕۆڵەی قارەمانیان لەسەردەمی شای ئێران لەساڵەکانی ۱۹۷٦ -۱۹۷۷

دا لەڕیزی پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانی لەناوزەنگ لەلای مام جەلال پێشمەرگە بوون و خەباتیان ئەکرد، لەوانە هەڤالان عوسمانی ڕۆشن تودە و فەتحوڵای یەکسانی....تاد.

موئمین محەمەد برومەند، شاعیری نەخوێندەوار، هۆنراوەکانی لەسەر شریت و سیدی تۆمار کراون، جێگەی سەرنج و تام و چێژی گوێگرن، یەکێک لەشعرەکانی بەناونیشانی وەزو گومالی، پرسیار و وەڵامی شاعیر و بە تەمەنترین دارگوێزی سەرکانی گوماڵە، برومان ئەچێتە سایەی دارگوێزەکەو پرسیاری ڕۆژگاری لێدەکات، لەوسەرە ڕێگە چی چاوپێکەوتوە. چەند کۆپلەیە لە هۆنراوەکەی:

ڕوی جەڕوان بـــی ســـەوزەی وەهـــار بـــی
وەنــــــەوشەو نێرگــز سۆســـەن دیـــار بـــی
ـــریقەی شــــــەونم ئـــی ســـەرپەلی گـــوڵان
شـــنەی شـــــــەماڵ بـــی پەی فنکـــی دڵان
بـــــــــەزم و ئـــاواز بـــی وەنەی بـــل بـــلان
یـــا جە ســـــــــەرچل بـــی یـــا ســـەر گـــوڵان
هەوای گەشـــــــــتم بـــــی دەمە و بەیـــــانی
ڕوم نیـــــا مـــــاوای ئاســــــــاو و ســـــانی
پەرســـــام پیــــرە دار پیـــــری کونەســــــــــاڵ
مەعلـــــوم جەلاتەن ئەحـــــوالانی حـــــــــاڵ
تـــۆ چـــن دەوڕانـــت وســـتەن پشـــتی ســـەر
جە چـــن زەمانـــا تـــۆ هەنـــت خەبـــــــەر؟
وەڵامی دار گوێزەکە:
عـــــومری تەمـــــامم نیـــــا جە یـــــادم
لەق و پـــۆم مەڕیـــان تەمـــــام بەربـــادم
چـــــن دەوری نابـــــاو چـــــن زەمـــــانم دی
چـــــن ئـــــاوەدان و چـــــن وێرانـــــــم دی
چـــــن عالــــــــــم و چـــــن عولەمـــــام دی
چـــــن ســـــاحیب دیـــــن وچـــــن خولەفـــام دی
چـــــن ســـــــەروەت مەن ســـــاحب نانـــــم دی

چنە بێ ژەمەن مەن پەریشانم دی
چەن نازارە دی چێ سەرەڕاوە
چەن جوانم دی ئاماو لاواوە
چەن خان و سەردار چەن ئەمیرم دی
چەن یانە وێران مەن چەن فەقیرم دی
چەن سوود وەر چەن کرولم دی
مەن چەن قەتاری کول بەکولم دی
چەن زولمی ناحەق جە ئێرانم دی
نادرو نەسرەدین مەن کەریم خانم دی
چەن لەشکرم دی چێ سەرە ڕاوە
دەس و پا مەرپیا ئاماو گێ لاوەە

.............................................................

هەروەها من لەم سەفەرە و سەفەرێکی ترم دا بۆ ناوچەکانی هەورامانی دیوی ڕۆژهەڵات بۆم دەرکەوت ئاوەدانی هەورامان هەمووی، لە نزیکەی ١٢٠ گوند و شارۆچکە پێک هاتووە، جگە لەوەی ئێستا ئەم ١٢٠گوند و شارۆچکە ئاوەدانن وژیانیش تیایاندا بەردەوامە، بە دەیان هەزار خێزانی هەورامی لە شارەکانی تاران، کرماشان، سنە، کامیاران، مەریوان، سلێمانی، هەولێر، هەڵەبجە، قەزای شارەزوور و لە وڵاتانی بێگانە دا بەتایبەت لە ئەوروپا و ئەمریکا دا ئەژین و سەرقاڵی کارو فرمانی ژیانی ڕۆژانەی خۆیانن و لەو شوێنانەدا نیشتەجێن. شتێکی ئاشکراشە لەسەردەمانی کۆندا هەورامان زۆر گەورەتربوە لەوەی کەئێستا هەیە، لەڕووی جوگرافی و هەم لەڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە، لەڕووی جوگرافیاوە، جوگرفیای کلتووری لەڕۆژهەڵاتەوە تانزیک هەمەدان و ئەوەی پێی وتراوە سنووری ئیماراتی ئەردەڵان، لەخۆرئاواوە تا کەرکوک و ئەوەی ئەبێتە سنووری ئیماراتی بابان، لەباکورەوە تا موکریان وتیلەکۆ لەباشوورەوە تا ئیلام و بانمیل بووە،

جوگرافیایی حوکمڕانی کردنەکەیان لەسنووری کلتوریەکەیان کەمتر بووە. شوێنی نیشتەجێ بوونیشیان زیاتر بووە لەوەی کەئێستا هەیە.[1]

سەرە ڕای ئەو هەموو داگیر کردن و کۆچ پێکردن و دژایەتی کردنەی زمانی هەورامی یا شێوە زاری هەورامی لەلایەن دوژمنەکانییەوە، تا ئێستایش تایبەت مەندی خۆی لەدەست نەداوە، دیارە یەکێک لە هۆکارەکانی ڕەنگە سەختی شوێنەکەو هەڵکەوتەی جوگرافیاییەکەی بێت. هەروەها دابڕانی ناوچەکە بوو بێت لەگەڵ دەوروبەریدا، زۆرتر تێکەڵ نەبووبن لەگەڵ فارس و تورک و عەرەب دا.

بەداخەوە ئێستا خەریکە وردە وردە ئەمشێوە زارە کۆنە ڕەسەنە کوردیە لاواز ئەبێ. یەکێک لە هۆکارەکانیش بە تایبەت سیاسی و زڵمی دەسەڵاتدارانی ناوچەکە بووە سەبارەت بە کورد، بە تایبەت لە باشوردا بە هۆی لێدان و کۆچپێکردن و قڕ کردنەوە لە دەورانی ڕژێمی سەدامدا بووە. هۆکارەکانی تری وەک: جیهانگیری عەولەمە کاریگەری خۆی هەیە بۆ لە ناوچوونی تایبەتمەندی و ڕەسەنایەتی زمانەکان، سەبارەت بە زمانی هەورامی لەبەر ئەوەی لە خوێندنگاکاندا ناخوێنرێت زیاتر هەڕەشەو مەترسی لە نیوچوونی لەسەرە، بەداخەوە کەسیش لە خەمی لە نێو چوونی ئەم زمانەدا نییە، حەق وایە ڕۆشنبیرانی هەورامی و پسپۆڕانی بواری زمانەوانی لە کوردستان لە بەشی باشوور و ڕۆژهەڵاتدا هەنگاو بنێن لەم بارەوە، فشار دروست بکەن لە سەر دەسەڵاتداران، تابەلانی کەمەوە بەفەرمی لە خوێندنگاکانی سەرەتاییدا ئەم زمانە لە سیستەمی پەروەردەدا بخوێنرێت.

---

[1] – هەورامییەکان لەدێر زەمانەوە بەچەندین بەش ولەچەندین کاتی جیاجیادا بۆ چەندین شوێنی جیاوازو دور لەیەک کۆچ پێکراون، بەڵام لەو شوێنانەشدا دوای سەدان ساڵ ئەو زمانەیان پاراستووە، وەک هەورامییەکانی کۆچ پێکراوی لای شیرازو دواتر هەورامییەکانی باکوری ئێران لەچوار قەڵای عەبدول مەلەکی و زاغمەرز لەسەر کەنارەکانی دەریای خەزەر. ئەمانە ئەوەندە زۆر بوون لە ڕووی ژمارەو دەوریشیان لەڕووی سیاسی و هێزەوە کاریگەر بووە، لەدەورانی قاجارییەدا قاسم خان هوژەبرە دەولەی هەورامی پارێزگار یان والی مازندەران بووە، دواتریش لەدەورانی پەهلەویدا ڕەزا شا شای ئێران کاتێک مامی دەنێرێت بۆ حوکمڕانی ئەوسنورە بەنامە داوای لەهەورامییەکانی باکوری ئێران کردوە هاوکاری و پشتیوانی بکەن،دەقی ئەونامە پارێزراوەو ماوە لەتاران.

بـة رِای مـن (نـووسةر) فـراوانـی شي ێوەزارةكـان، بەلکەی دةول ێةمـةنـدی زمـانـی کـوردە، زمـانـیش یـةكـي ێكـة لـة ثـایـةكـانـی نـةتـةوة. سەرەکیترین بنەمای نەتەوەیی هەرنەتەوەیەک زمانەکەیانە. ئێمەی کوردیش بەهەمان شێوە، بنەمای تریش هەن وەک جوگرافیا، بەلام ئەم بنەما تەمومژی لەسەرە، وەک ئەوەی ئێمەی کورد، تائێستاش مشتومڕ لەسەر سنووری جوگرافیای کوردستان هەیە. ئاشکرایە داگیرکەران لەسەر شێواندنی کـلـتـووری ئێمە ئیشیان کـردووە، ئەوە هیچ ریشەو ڕەچەڵەکیشمان گومانی لەسەرەو لەڕووی زانستیەوە جگە چەند ئاماژەیەکی کورتی پرفیسۆر مار زیاتر شتێکی ترنیە. باس لەزمـانـی یـةكطرتـووی کـورد دةكـری ێ، بـةلآم لـة بـاشور تـا نـي ێستـاش بـادیـنـان هـةر بـة بـادیـنـی نـةنـوسن و نـةخوي ێنـنـةوة، سۆرانیش هەروەها، بـاوةرِنـاكـةم دوای ٢٦ سـال ێ حوكـمرِانـی كـوردی لـة دهـۆك هـۆنـراوةی شـاعیـري ێكـی سلـي ێمـانـی بـخوي ێنـنـةوة، یـا لـة سلـي ێمـانـی و طـةرمـةسي ێر، رِۆمـانـي ێكـی رِۆمـانـوسي ێكـی دهـۆك بـخوي ێنـنـةوة.

## لیستی ناوی ئەو شارۆچکە و گوندانەیە کە نشینگەی سەرەتاو لەمێژینەی هەورامانەکانە

پاوە، ناوەندی قەزا
سەو لاوەا، ناوەندی قەزا
نۆدشە، ناوەندی ناحیە
نەوسوود، ناوەندی ناحیە
بێساران، ناوەندی ناحیە
ئەوێهەنگ، ناوەندی ناحیە
پایگەلان، ناوەندی ناحیە
هەورامانی تەخت، ناوەندی ناحیە
بیارە، ناوەندی ناحیە
خورماڵ ، ناوەندی ناحیە
دزلی، شارەدێ
نییەر، دێ
مێراو، دێ
ژنێن، شارەدێ
هویە، شارەدێ
سەرهویە، شارەدێ
نجێ، شارەدێ
سالیان، شارەدێ
شیان، شارەدێ
فارساوا، شارەدێ
چەشمەیەر، شارەدێ
هەرسین، دێ
ئاریان، دێ
دەگاگا، شارەدێ
ڕەزاو، شارەدێ
کەڕاوا، دێ
خانەگای لای ڕەزاو، دێ
دووڕۆی سەرو خوارو، شارەدێ
بندۆل، دێ

دەرەکێ، شارەدی
باراماوە، دێ
دەمەیۆ، دێ
کەمالا، دێ
وەیسیا، دێ
ڕوە وەرێ، دێ
سەرپیر، دێ
بلبەر، شارەدێ
سلێن، شارەدێ
ژیوار، شارەدێ
هەباساوا، دێ
وەرگەوێر، دێ
کەلجی، دێ
دۆ لاوە ، دێ
تاو، دێ
نوێن، دێ
ناو، دێ
ئەسپەرێز، دێ
دەشتەقەڵبێ، دێ
ڕوار، دێ
زوم، دێ
دەل، شارەدێ
دەڵەمەرز، شارەدێ
جوڵندی، دێ
پاڵنگان، شارەدێ
دێوەزناو، دێ
سورە تفێ، شارەدێ
هەجیج، شارەدێ
دەرەهەجیج، دێ
مێویە، دێ

کەلەوان، دێ
ـریان، شارەدێ
حلەنەگا، شارەدێ
ـشە، دێ
کەڵ گرال، دێ
ـمیسانە، دێ
شەرمکان، دێ
ئەروی، دێ
تەشار، دێ
شێخانی تازە، دێ
شێخانی سوڵتان ئیسحاق، دێ
قەرمنی، دێ
خەنانەکەر، دێ
شینێ، دێ
شوشمێ ی سەرو، دێ
شوشمێ ی خوارو، دێ
وەزلی، دێ
بزاوەر، دێ
کێمنە، دێ
بێرواس، دێ
هانە گەرمڵە، شارەدێ
بێکانان، دێ
گەلێن، شارەدێ
تفێن، دێ
وەسێنەی وارینە، دێ
نەسەنار، دێ
دەێرمۆلی، دێ
دەژن، دێ
سەرڕێز، دێ
گواز، دێ
سەروماڵ، دێ
یالانپێ، دێ

زەلم، دێ
ئەحمەد ئاوا، شارە دێ
هانەی دن، دێ
دەرەی مەڕ، دێ
سەرگەت، دێ
باخە کۆن، دێ
گەچێنە، دێ
دەرەکێ، دێ
نارنجلە، دێ
دەرەقەیسەر، دێ
بنجۆی دڕە، دێ
زەردەهاڵ، دێ
هانەی قوڵ، دێ
دەگاشێخان، دێ
بەڵخە، دێ
تەوێڵە، شارەدێ
پالانیا، دێ
سۆسەکان، دێ
گولپ، شارە دێ
دۆلبیان، دێ
بزلانە، دێ
وەسێنەی سەرینە، دێ
هەشەمێز، دێ
هەڵوان، دێ
تەختە، دێ
ژان، شارەدێ
دێبەر، دێ
هەنگەراو، دێ
خەرپانی، دێ
خارگێلان، دێ
بانی شار، دێ
دەرمور ، دێ

ناوی ئەو ئاواییانەی کە بەدیالێکتی کرمانجی نێوەڕاست ئەدوێن و لەناو سەرزەمینی هەوراماندان:

هاوار، شارەدێی کاکەیی

هاوارە کۆن، ئاوایی کاکەیی

دەرەتفێ، ئاوایی کاکەیی

گریانە، دێ

هیروێ، دێ

کۆمەدەرە، دێ

نجار، دێ

نۆریاو، شارەدێ

دوریسان، شارەدێ

نۆسمە، دێ

بندەرە، دێ

شمشێر، شارەدێ

دەرەبەیان، دێ

یۆژنان، دێ

وڕا ، دێ

تەوریبەر، دێ

زەوەنێ سەرو، دێ

زەوەنێ خواروو، دێ

کەکڵ یاوا، دێ

نیاوا، دێ

ژریژە، دێ

بۆرپیدەر، شارەدێ

مازیین، دێ

کولێژ، دێ

لەنگە ریز، دێ

دووئاو، دێ

کانی حسێن بەگ، دێ

دەرەناخێ،

بەلەبزان،دێ

# گەشت بۆ سنوری هەولێر۱۹۸۰

تازە لە چالاکیەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان گەڕابوومەوە بۆ هاکلێ[1] لەسەر سنوور، دوای چەند ڕۆژێک پشوودان، ڕۆژێک غەفوور دەرەشیشی و نیازی عیزەت و حەمە هاواری لەبارەگا دوور کەووتبوونەوە و منیشیان بانگ کرد. کاک غەفوور باسی جەولەیەکی کرد بۆ دەشتی هەولێر کە بڕیارە هێزێکی هەرێمی یەک بیکات، گووتی بۆ ئەم سەفەرەش پێویستە پێشمەرگەیەکی لەخۆبوردوی وەک تۆ خۆتی بۆ ئامادە بکەیت، کێ و چەند پێشمەرگەت ئەوێت لەکەرتی هەورامان لەگەڵ خۆت بیبانبە. نیازی برۆی هەلتەکاند واتە نەچیت. منیش بێ لێکدانەوە یەکسەر ووتم: ناڕۆم و ئامادەنیم ووتی: بۆ؟ ووتم: چونکە پێشتر بەمەفرەزە بۆ شارەزوور و شارباژێر چووم پاشان ڕۆشتووم بۆڕۆژهەلاتی کوردستان وئەرکی خۆم بەجێ هێناوە؟ ئەوە هەموو پێشمەرگە و بەرپرسیتر هەن، یەکێک لەوان بڕوات.
کارگەشتە دەنگە و قسەی بەرزو نزم، ووتم: من ئێوە بەرپرسم نین ئەی کێ بەرپرستە؟ م.پشکۆ و م. سەرکەوت، ئەوە من دەچم بۆ ئەوێ لێرەنابم. بێئەوەی یەک پێشمەرگە لەگەڵ خۆم بەرم چوومە ئەو بەرەوە بۆ ناوچە. کەگەشتمە ئەوێ باس و خواسەکەم بۆ برادەرانی ناوبراو کرد ئەوانیش ووتیان: کێشە نییە دلگران بوونی ناوێ.

شەو لەوێ بووم کاتێکمان زانی حەرەس هاواری کرد کێی زەلام؟ وەڵام درایەوە فەیسەڵی مامە کاکلم، لەگەڵ ئاواتی مستەفا فەنی و ئازادی شێخ مونزیر. ئێمە هاتینە دەرەوە دیتمان چەند لایتێک داگیرساون. لە دەوربەری حەرەس جەم بووین و حەرەسیش تیشکی لایتی خۆی دەگرێتە ناوچاوی فەیسەڵ. دیتمان جگە لەچەکەکەی خۆی سێ چەکی زیادەشی پێیە

[1]- هاکلێ ناوی ئەو چەند پەڵەباخەن، کەچەند خانە باخێکیان تیایە، خانووەکان بەهاوینـ خاوەن باخەکانی لێیەو بەزستانان چۆڵە. ئەو زستانە ئێمە کردبوومان بەبارەگا، باخەکـ هی شۆشمییەکانن، سەرچاوەی ئاوەکەیان ئەکەوێتە داوێنی چیای پەرۆونی شوێنێکی خۆش و دلگیرە بەناوی سەرچەمە.

چەکەکەی کاک غەفور و نیازی و پێشمەرگەیەکی تریشی هێناوە، م پشکۆ و چەند کادیرێک هاتن و قسەمان لەگەڵ ئەکردن چی قەوماوە؟ لەو بەرەوە لە لای هاکڵێوە چەند دەستڕێژێک کران. ئەوە بەدوای ئێمە دا دەیتەقێنن. فەیسەڵ وای ووت. چەند پێشمەرگە و کادرێکی ناوچەش وەک حەمە تۆفیق و کەریمی شێخ عەلی هەڵئەدەنێ و دەڵێن: ئێمە شتی وا قبوڵ ناکەین، مامۆستا سەرکەوت قسەی پێبڕین و منیش بە فەیسەڵ دەڵێم: کارێکی خرابت کردووە. بە مامۆستا سەرکەوتیشم ووت: کەسێکی لای خۆتان بنێرە با بچێتە لای کاک غەفوور ئێستە چەکەکانی بۆ ئەبەمەوە. هەموو دەچینە ژوورەوە. پاش تاوێ حەرەس ئاگاداری م. سەرکەوت و م.پشکۆ دەکات، ئەوە لەوبەرەوە لەکەرتی نووەوە چەند کەسێک چوون بۆ کەرتی ٣ بۆ لای کاک مەحمودی حاجی فەرەج.

دواتر کەسێک هات و بە مامۆستا سەرکەوتی ووت: کاک مەحمود و کاک غەفوور داوات دەکەن. کادیرێکی ناوچە ووتی: با ئەوان بێن بۆ ئێرە. تانزیکەی کات سێی دەمەو بەیانی هەربگرە بەردەو هاتووچۆ بوو تا برادەران هاتنە بارەگای ناوچەو پێکەوە دانیشتین. مەحمودی حاجی فەرەج هەڕەشە دەکات و دەڵێ: ڕێگە نادەین کەس لێمان یاخی ببێ. م.پشکۆ دەڵێ: ئێرە بارەگای ناوچەو کەرتی کۆمەڵەیە بۆ لای ق. م نەچوون. من قسە تێ هەڵکێش دەکەم و دەڵێم: کاک غەفوور ئەوە کێشە نییە، ئەم برادەرانە کارێکی خراپیان کردووە، سبەینێ من خۆم لەگەڵ پێشمەرگەکاندا دەگەڕێینەوە بۆکەرت. کاک غەفوور لەوەڵامدا دەڵێ: نابێت ئەوە تەعەدا لەمن کراوە، تۆ ئەبێ هەر ئێستە بڕیار بدەیت بچیت بۆ دەشتی هەولێر. بەڵێ بەسەرچاو قسەی لەسەر ئەکەین. نەخێر دەبێ فەیسەڵ سزا بدرێ. م سەرکەوت و م.پشکۆش دەڵێن: با کێشەکە گەورە نەبێت، شتێکی وانییە چارەسەری ئەکەین.

بەڵێ بڕیاردرا فەیسەڵ مانگێک خەفەر بێت و سامانی حاجی قادرو و ئازادی سێخ مونزرو ئاواتی مستەفا فەنیش نقل بکرێن.

باشە، چەکە زیادەکان هەر شەو درانەوە بەخاوەنەکانیان، ئەوان گەڕانەوە ئێمەش لەناوچە ماینەوە، پاش چەند ڕۆژێ پێک هاتینەوە، سزاکەی فەیسەڵ جێبەجێ نەبوو. پاش ماوەیەک هەردوو کەرتەکە بەڕێکەوتین بۆ هەرێمی یەک، کاکە حەمەی حاجی مەحمود لە سنوری مەریوانە. لەوێ لەئاواییەکانی

کەناری دەریاچەی زرێباردا لە٢٠/ ٤/ ١٩٨٠دا یەکمان گرتەوە. دوای چەند ڕۆژێک پشوودان هاتینەوە بەدیوی عێراق داو لەسەرەتای مانگی (٥) پێنج دا واتە ڕۆژی ٢و١٩٨٠/٥/٣ لەئاوایی کوڵێتان بووین، لێرە لە کوڵێتان مەفرەزەیەک جیاکرایەوە بۆ مەلائیبراهیمی فەرماندەی کەرتی یەک، بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە سنوری هەورامان. ئێمەش بەڕێکەوتین تا گەشتینە ئاوایی ڕەزڵە. لەوێ ئەو مەفرەزە و بەرپرسانەی کە بڕیاربوو پێکەوە هێزێکی ٨٠-٩٠ کەسی پێک بێنین و لەگەڵ کاکە حەمە دا بەرەو ناوچەی هەولێر بچین دیاری کران. بەحساب کە دەگەینە سنوری کۆیە لەسەرکردایەتیەوە هێزێکی تر دێت و یەک دەگرینەوە.

بۆکۆبوونەوەی هێزەکە چەند ڕۆژێک لەڕەزڵە ماینەوە. بڕیاردرا کاک غەفور دەرشیشیش لەگەڵ ئێمەدا بێت، مەحمودی حاجی فەرەج بگەڕێتەوە بۆهەورامان و مەفرەزەیەک لەکەرتەکەی ئەویشمان برد لەگەڵ خۆمان، لەم سەفەرەدا بورهان قانع هاتبووە دەرەوە بڕیار بوو بچێت بۆ سەرکردایەتی، ئەویش لەگەڵ هێزەکەمان هات. من بۆ خۆم کە زۆر شەیدا و هۆگری شیعر و سروودەکانی باوکی بووم، خۆم لێ نزیک کردەوە و بووینە برادەر. دوو دیلیش لەگەڵمان بوون کە زۆر نەجیب و نەرم ونیان بوون. کاتێ وتیان ئەمانە جاشن لەسەرجادەی قیر لەدۆڵە سوور کەوتوونەتە کەمینی پێشمەرگەوە، هەرگیز بڕوام نەدەکرد دووکەسی وا خوێن گەرم و ئێسک سووک و خانزادە جاشبن. دواتر وردە وردە بۆم دەرکەوت ئەمانە، پێشتر لەلایەن شۆڕشەوە بەختیاری برایان کوژراوە. بەختیاریش پێشمەرگەی سەرتای شۆڕشی نوێ بووە، بەڵام لەناو تەنگ و چەڵەمەکان و منافەسەو ململانێی شۆڕشدا ڕووخاوە و تەسلیم بەڕژێم بۆتەوە. ئەم دوو براییەی بەختیاری مەجید خان کەگیراون، بڕیاربوو وەک سزا بڕێ پارە بدەنە شۆڕش و ئازاد بکرێن. ئەو چەند ڕۆژە کەلامان بوون هەرلەگەڵ مندابوون، منیش ڕێزم ئەگرتن.

لەگەڵ بورهان قانع پێکەوە بووین و قسەمان لەگەڵ ئەکرد، باسیان کرد بۆمان و تێگەشتین زۆر دەترسن لەوەی کاک بەکری حاجی سەفەر و جەمالی حەمەی خواکەرەم دەست بخەنە ناو کێشەکەیانەوە.. دیارە ساردیەک

هەبوو لەنێوان ئەوهەڤالانەو ماڵی خاندا، بۆیە بەزوویی پارەی سزاکە کەپێم وایە ١٣ هەزار دیناربوو، هێنایان و کاکە حەمە ئازادی کردن.

کەلەچەووتان بووین نامەی جەنابی مام جەلال هاتووە بۆ حامدی حەمە تایەربەگ کەلە بەگزادەکانی باوەجانیە، لەناوچەی جوانرۆو لەئاوایی قشلاخ. حامدبەگ چەکی لەڕژێمی عێراق وەرگرتووە، چۆتە نەسوود و خەڵک چەکداردەکات. لــە ر ۆ ذ هـە لآت یەکێتیی کادیرێکی خۆی بەناوی نەریمان لایلناوەو بەناوی دەفتەری مامۆستا شێخ عێزەدینەوە قسەدەکات و لەئاوایيەکاندا چەکدار پێکدێنێ تەشکیلات دەکات. ئــە و چەکانەی بەبێ حساب لەعێراقی وەردەگرت بەشی کەرتەکان و مەفرەزەکانی یەکێتیی لێ دەدا.

من نازانم ناوەڕۆکی نامەکەی مام جەلال بۆ حامد بــە ط چی بووە، بەلام مەلائیبراهیم لەگەڵ مەفرەزەیەکدا دیاری کرا کە نامەکە بگەیەنێتە حامد بەگ لەنەوسوود. ئەوان بەرەو شارەزور بەڕێ کەوتن، وا ڕێک دەکەوێ لە تەپی سەفا دوژمن گەمارۆی مەفرەزەکە ئەدات و مەلائیبراهیم و تایەر پریسی شەهید دەبن، فەلاحی حەمە بۆریش چەکەکەی لەدەستی دەپەڕێ و بێچەک رزگاری دەبێت. مەلایاسینی حەسەن موانی و حەسەنی مەجیدیش بەدەم تەقەکردنەوە خۆیان قووتار دەکەن. نامەکە کەتۆتە دەست ڕژێم، هەرێمیش نــە شـا ربــا ذ ي ێ ر ة و ة لەڕێگەی بێسیمی حیزبی شیوعیەوە کە لەئاوایی شۆشمێن حامد بەگ ئاگادار دەکات و پێی دەڵێن نامەی مام جەلالت بۆ هاتووە و گیراوە نەگەڕێتەوە بۆ عێراق. حامد بەگ دەمێنێتەوە و ئەیەوێت بچێت بۆ ناوزەنگ بۆلای مام جەلال لە مەهاباد دەگیرێ و پاش ماوەیەک دەکوژرێت لەلایەن چریک فیدای[1].

---

[1] -حامید بەگ، کە ئەزانێت نامەکەی مام جەلال کەبۆی ناردوە گیراوە، لە نەوسوود ئەمێنێتەوەو ناگەڕێتەوە بۆعێراق. دوای ماوەیەک بێتاقەت ئەبێ و داوا لە مام هادی ئەکات، پێکەوە بچن بۆ ناوزەنگ، بۆ لای مام جەلال. حامید بەگ و مەحموودی برای و مام برایمی بانیگانی باوکی کاک حەمەنەزیفی قادری و مام هادی پێکەوە لە هەورامانەوە ئەکەونە ڕێ بەناو ئێراندا بۆ ناوزەنگ، ئەگەنە مەریوان و لە نزیک گاران لەڕێگای مەریوان –سەقزدا، لە پەنا ئاوایی چنارەدا حامید بە مام هادی ئەڵێت: ماندووین، بەڵکو سەیارەیەک پەیدا بکەین تا سەقز بمانبات.

لەدوای وەرگرتنی پارەکە و ئازاد کردنی دوو دیلەکە، وردە وردە هێزەکەمان بەرێکەوت بۆئاوایی حاجی مامەند. لەوێ کاکە حەمە کۆبوونەوەیەکی بەخەڵکەکە کرد، بۆ سبەینێ بەهەورازەکەی سیەردا سەرکەوتین وبەرەو سەر شاخ و بەودیودا بۆ شارباژێڕی تەخت شۆڕ بووینەوە. نیوەڕۆ لەئاوایی شووکێ بووین، من کەووتمەماڵی مامۆستای ئاواییەکە کە خەڵکی تەویلە بوو بەناوی مامۆستا سەعدی حەمە عەزیز. لەشوکێوە بەرەوگورگەیەر و گەڕمدێ وسیتەک کەوتینە ڕێ. لەئاوایی گورکەیەر چەند حەیوانێک، کڕراو دابەش کرا بەسەرماندا، ئێوارەیەکی درەنگ لە سیتەک چاوەڕێ دەکەین تا هەوا تاریک بکاو بپەڕینەوە بۆئاوایی خەمزە، مەفرەزە و کەرتەکان خۆمان سەرژمێر دەکەینەوە و ڕێنوێنی و ناوی نهێنی شەو دابەش دەکەین. تا ئێرە نزیکەی ١٢ پێشمەرگە لەهێزەکەمان هەڵدێن. دیارە لەترسدا بوو، چونکە یەکێتیی پێشتر

---

مام هادی ئەڵێت: (سەیارەمان دەست نەکەوت، حامید پرسی چنارە لێمانەوە نزیکە ووتم: ئەمە چنارەیە بۆ؟ ووتی بارەگای چریک فیدای لێرەیە و عەبوی کەریمی برادەرمە بابچین سەردانی بکەین و بەڵکو سەیارەشیان لابێت، چووینە بارەگاکەیان وتیان عەبو خەوتووە. لەوکاتەدا سەیارەیەکی گەلابە هات، حامید بەگ بە پاسەوانەکەی ووت: خەبەری مەکەنەوە، بەڵام کاتێک هەستا پێی بڵێن حامید بەگ هاتوو ڕۆیشت بۆ مەهاباد، ئێمە چوار کەس بووین مام برایمی باینگانی باوکی حەمەنەزیفیشمان لەگەڵ بوو سوار بووین و ڕۆیشتین). بەڵێ ئەچنە مەهاباد ئۆتێل ئەگرن شەو ئەمێننەوە. بەیانی نزیک بە نیوەڕۆ مەم هادی ئەچێتە دەرەوە، دوایی ئەگەڕێتەوە بۆلایان ئەبینێ تەنیا مام برایم لەوێیە، ئەپرسێ کوان جەماعەت؟ ئەڵێت مەلا محەمەدی جوانڕۆیی-ئەبو تارا ناردبووی بـە دو ی حـا مـد بـە طـد ا چون بۆ لای ئەو. چاوەڕێ ئەبن هەر ناگەڕێنەوە، مام هادی ئەچێت بۆ لای ئەبو تارا ئەڵێت: تۆ ناردوتە بەدوای حامید بەگدا؟ ئەویش ئەڵێت: حامید بەگی چی؟ مام هادی پیاوی خاوەن ئەزموونە، ئەچێت لەناو شار دڵێری سەید مەجید ئەدۆزێتەوە حیکایەتەکەی بۆ ئەکات ئەویش ئەچێتە لای حیزبی دیموکرات، ئەوان ئەڵێن با لێکۆڵینەوە بکەین ئاگامان لێ نییە. ڕۆژی دووەم چریک ڕاگەیاندراوێکی بڵاو کردەوە و ڕایانگەیاند مەزدورێکی عیراقیمان گرتووە. ئاشکرا بوو لای ئەوانە، کە مام هادی چۆتە ناوزەنگ و ڕاگەیاندراوەکەی بردوە بۆ کاک نەوشیروان، مام جەلال ئەوکات لەوێ نەبوو، کاک نەوشیروان تەقەلای خۆیدا بەڵام هیچی پێنەکرا، چریک دوا جار کە شەڕ دەستی پێکردبوو کوردستانیان لەدەستدا. لە ناوچەی بانە ئەیانەوێت تەسلیمی دەستی جەمالی حەمەی خواکەرەمی کەن وەری نەگرتبوو، وتبووی بەرپرسیاریەتی هەڵناگرم دیارە ئەیناسیووە ئەوانیش حامید بەگیان کوشتووە.

هێزی ناردۆتە ناوچەی هەولێرو لەلایەن ق.م و سۆشیالیست و قیادە وحیدەکانی وەک سلێمان بیریژییەوە خراپ تێک شکێنراون. پێشمەرگە مەلهاتووەکان هیچیان لەپێشمەرگەکانی کۆمەڵەو بەری هەورامان نەبوون، بەڵکو پێشمەرگەکانی شارەزوور و ئەوانەی دەروبەری کاکە حەمە بوون.

کاکە حەمەیش بۆ خۆی بۆچوونی وابوو کەگوایە یەکێتیی دەینێرێ بۆ ئەو سەفەرە بۆ ئەوەیە بکوژرێت و لە کۆڵ بێتەوە. بەڵام بەراستی ئەوە بۆچوونێکی بێ بنەمابوو. کاکە حەمە لە دیدو بۆچوونی چەند کادرێکی کۆمەڵەوە کە لە هەرێمەکەی خۆیدا بوون ئەم بۆچوونەی بۆ دروست بووبوو. شەو داهات و لەجادەی قیر لە خوار پێچەکانی ئەزمڕەوە بۆ ئەوبەری جادە و بەتوولە ڕێیەکی باریک و لاپێدا گەشتینە خەمزە.



بەهاری ١٩٨١ بناری چیای ... گوندی ... - لەراستەوە
ئاسۆیۆسفی، تەیمور سەلاح ، فەیسەڵ، حەمەی حەمەسەعید

پێشمەرگە لەمزگەوتەکەدا لێی ڕاکشان و چەند کەسێکیش بوونەپاسەوان ڕەبایەکانی سەر بەرزاییەکانیش لێمانەوە دیاربوون.

دوای ئەوەی خۆروبان گەرم بوو چەند کۆپتەرێک دەرکەوتن و بەسەر ناوچەکەدا دەگەڕان، هەندێجار لەبەر چاو بزر دەبوون و هێندەی نەدەبرد دەردەکەوتنەوە. ئەو ڕۆژەمان بەزەحمەت و دڵەڕاوکە بەسەر برد. بەئاواییەکانی سنگرو مێولاکەو چۆخماخدا مەنزڵی حەوانەوەمان بردە ئاوایی مالوومە، لەوێ هەرێمی (٣ و ٤) ی لێ بوو لەگەڵ چەند کادر و فەرماندەی دیکەی وەک شەهیدبابە تایەر و سەلاح چاوشین وشەهید عەلی چوارتایی وشەهید سەلاحی موهەندیس و هەندێکی دیکە ئاشنا بووین. شەهید جەمال عەلی باپیر بۆ پێکەنین ووتی: شارەزووریەکان ئەوە بەکری حاجی سەفەر هاتووە دەڵێ: با هەرێمی ٣ و ٤ بۆڵ بۆڵێن بکەین، واتە یاری گۆڵ گۆڵێن. ئەوەیەکەم جارم نەبوو کاک بەکرو کاک جەمال بناسم. کاک جەمالم لە

شەڕەکەی دزڵی و کاک بەکریشم لە٧٩ لەسووریێن دیبوو دوای شەهید کردنی ئەحمەد گریانەیی.

بەشێک لە هێزەکەمان چووین بۆئاوایی چا لاوەا، شەومان لەوێ ڕۆژ کردەوە تا نیوەڕۆی ڕۆژی دوایش هەرلەوێ بووین، لەچا لاوەا لەماڵێک بووم کوڕەکەیان ناوی حاتەم بوو، ئەم ناوە بۆ من سەرنج ڕاکێش بوو، مام حاتەمی کاکەیی وەبیر هێنامەوە لەئاوایی دەرەتوێی ناوچەی هەورامان. ئەو تەمەنی خۆی دەدا لە هەشتا، پیاوێکی کەڵەگەت و سمێڵێکی درێژو سپی جوان و سەرنج ڕاکێشی لە مێشکمدا وێنەکێشابوو، بەڵام ئەم حەوت هەشت ساڵان بوو. بەلامەوە سەیربوو ناوی حاتەمە. ئێوارەیەک هەردوو هێزی مالوومە و چا لاوەا لەبەردەم بەرگەڵوودا یەکمان گرتەوە کەبریتی بووین لەهەرێمی یەک و سێ و چوار، لەشەوی٨ لەسەر ١٩٨٠/٥/٩چووینە ناو شارەدێی سەرگەڵو.سەرگەڵو شارە دێیەکی جوان بوو لە داوێنی چیای داباندا، بە دارو دەوەن و ڕەز و باخ و ئاوی سازگار خۆی نوقمی جوانی کردبوو، هێندە دڵگیر بوو بەرامەی گو لاوەی هەورامانی پژاند بەرووماندا، لووتکەکانی دابان و هەلاج و دوند و قووچکەکانی دەوری ئاوایی وەک قوللەکانی شنروێ، وەزڵی، تەتە، هەوارەبەرزە، شرام، هەسوون و سونێ سەریان لە ئاسمان دەسوو. مزگەوتێکی گەورە و خوێندنگاو چەند دووکانێکی تێدابوو، خەڵکی ئێرە بەشێکیان سەر بەڕێ و ڕەوشتی حەقە بوون، بۆیە دەست و دڵ بە لاوە میوان پەزێر بوون. ئەو شەوە لەوێ حەواینەوە و سبەینێ زوو هێشتا باڵندەکان لەپرخەی خەودابوون بەرەو خولر بەدەربەندەکەدا ڕێچکەمان بەست.

هەرێمی٣ سێ و٤چوار لەبەر بەردەم گەلیەکەدا بەرەو ڕۆژهەلات و بەدەسی ڕاستدا گەڕانەوە بۆ دۆڵی جافەتی، ئێمەش بەرەو باکوری خۆر ئاولو بەرەو ئاواییەکانی سێدەر و شارستێنە، جەمالی عەلی پاپیرو مەفرەزمیەک وەک شارەزا بەدرێژایی ئەو ڕۆژە ڕێنوێن بوون و شەو لە جادەیەکی دی کردینیانە ئەو بەرەوە تا لە شەوێکی ئەنگوستەچاودا ئاوایی خۆشاو ئامێزی پڕ میهری بۆگرتینەوە. لەوێ لەگەڵ کاک جەمالدا خواحافیزیمان لەیەکتر کرد و بەچەند بەلەمێک پەڕینەوە بۆ ئاواییەکانی بنار چیای کوسرەت. دوای ئەوەی لە ئاو پەڕینەوە بە هەورازێکدا سەرکەوتین و ڕێگەی ئاوایی چنارەمان

گرتمەبەر. هەرهەمووومان ماندوویێتی زۆری بۆ هێنابووین، بۆیە بڕیاردرا لە شوێنێکدا دەخولەکێک پشوو بدەین. لەدوای پشوودان لەڕێزەکەدا کاکە حەمە حەسین پێشمەرگەیەک لەپێشییەوەیە چەکی پێ نییە. دەست ئەدا لە شانی و نەویش لادەکاتەوە، پێی دەڵێ: بۆچەکت پێ نییە؟ ڕادەچڵەکێ و دەڵێ: لەو شوێنەی کەپشوومان دا جێم هێشتووە. بەناچاری هێزەکە وەستا ئەبینم پێشمەرگەی ئێمەیە، من و پێشمەرگەکە گەڕاینەوە شوێنەکە، بەهۆی ئەوەی گیامان شێلابوو بەچنگە ماشێ چەکەکەمان دۆزییەوە کەنارنجۆک ئەندازێ بوو، ئەوە چەکێکی ئەمەریکی بوو دوای شۆڕشی گەلانی ئێران لەوجۆرە چەکەمان دەست کەووتبوو.

لە بناری چیای کۆسرەتی سەربڵند و ڕووبەڕووی دەشتی بیتوێنی عەیاردا ماوەی چەند ڕۆژێک ماینەوە تای چە پشوویەکمان دا، لەئاوایی شیوەشان چەند وێنەیەکمان گرت بۆیادگاری. لەم هەرێمە دڵگیرەدا ئاوایییەکانی چنارە، مێوژە، شیوەشان، خدران و کەلکان[1]، کە دەکەونە بناری چیای کۆسرەت و زاڵ بەسەر دەشت و دەریاچەدا. ئەم هەرێمە بەزنجیرە لووتکە و دۆڵ و شیوە سەختەکانییەوە، بە دەشتاییەکەی بەردەمیان و پەنگاوی دەریاچەی دووکانەوە، لە وەرزی بەهاردا گرەویان لەگەڵ بە هەشتدا

[1] کەلکان ئەو ئاوایییە لەبناری چیای کۆسرەت لەپێدەشت و سەرەتای بتوێندا، عەسرێک لەئاوایی شیوەشان بووین لەگەڵ شەهید دلێر جاف و چەند هەڤاڵێکی تردا چووینە خوارەوە بۆ کەلکان بۆسەردانی شەهید شێخ حەمەساڵحی برای جەنابی مام جەلال. من تائەو ڕۆژە نەمزانی بوو براو کەسوکاری مام جەلال لەو ئاوایییەدا ئەژین، یەکەم جار بینیمن ماڵێکی نەجیب خوش خولک و خۆش ڕوو خزمەتکاری پێشمەرگە، بەتایبەت نووکچە دلێر لەکوردایەتیەکەیان نازدارو هێرۆ. نەیان هێشت بگەڕێینەوە تا نانی ئێوارەمان لاخواردن. بەداخەوە دوای چەند ساڵ لە ڕۆژی ٦/٣٠ / ١٩٨٤دا هەواڵم زانی جاشە خۆفرۆشەکانی ناوچەکە چوونەتە سەریان و بەبێ هیچ تاوانێک شێخ حەمەساڵحیان بەوتەمەنەوە لەگەڵ دوو کچەکەیدا شەهید کردون. ئەمە کارەێکی ترسنۆکانەو تاوانێکی گەورە بوو، لەبێدەستەلاتیا، بەرامبەر بەهێزی پێشمەرگەی ئەو سنوورە. شەهیدی قارەمان ئازادی حەمەگەنحان لەچالاکیەکدا چەند خۆفرۆشی بەسزای گەل گەیاندبوو، سوارەکانی سەلاحەدینیش لەتۆڵەی ئەمەدا هێرشیان کردبوە سەر ماڵی شێخ و نازدارو هێرۆیان لەگەڵ باوکیان شەهید کردبوون .

دەکرد و نەش دەدۆڕان، جاران وام دەزانی سیحری سرووشت هەر لەهەوراماندایە، کەچی لێرەش بوکێکی ڕازاوە هەیەو خەڵکی بەهەشتە.
لە نزیک خدران مەفرەزەیەکی پێشمەرگە چەک دەکەین، بێ ئەوەی بزانین کێن و بێ ئەوەش بزانین بۆ چەکیان دەکەین، بەرپرسەکەیان ناوی عەلی بایز بوو. دەیانگووت ئاغاو سەربەموخابەراتن، هەر لەوێ ڕەسوڵ ئاغای مێوژەشمان بینی ئەترسا چەک بکرێت کاک حەمە نەیهێشت نازانم بۆچی؟ لەوێ دووفەرماندە کەرتی سنوورەکە بە ناوەکانی مەندە و فەرەج لە قارەمانییەتیدا ناوبانگیان هەبوو، ئێمە نەمانبینین چونکە شەهید بووبوون، لێرە موشیرو ئامۆزایەکی دیکەی بەناوی فەتاح هاتنە لامان و بوونەڕێ نیشاندەرو ڕێنوێنمان، فەرماندەی کەرت و جێگری کەرت بوون، بەلام کە زانییان بەرەو لای سماقووڵی دەپەڕینەوە خۆیان لێمان دزییەوە. لە دوای خدران و مێوژە لە جادەی هیزۆپ پەڕینەوە ئەو بەرو چەند شارەزایەک کە خەڵکی ناوچەکە بوون ئێمەیان گەیاندە ئاوایی جەلی.
ئیمڕۆش کوپتەر بە ئاسمانی ناوچەکەدا دەسووڕێنەوە، ڕۆژی دوایی بەلای چەپدا چووینە سماقووڵی گەلی و ڕۆژێک لەسەر چۆمەکەی نزیک جەلی ماینەوە، پێشمەرگە خۆیان شۆردو سەریان بە مووس تاشی پێشمەرگەیەک ناوی عەبدولڕەحمان چنگیانی بوو نازانین هۆی چی بوو بوورایەوە. ئێوارە گەڕاینەوە بۆ جەلی. شەوی پێشتر لە دەشتی قاقلە پێشمەرگەیەکیتر کە چووچانی بوو لەکاتی پشوودانیدا کلاشینکۆفەکەی جێمابوو. ئەوەی لەنزیک دەریاچەی دووکان نارنجۆک ئەندازەکەی بەجێ هێشتبوو گاڵتەی بەم دەکرد. ئەویش پێی ووت: تۆچەند شەو پێشتر تۆپێکت لە بیرچوو. لە سەر ئەمە بووبە دەنگە دەنگ و لێمان جوداکردنەوە.
ئەو چەند ڕۆژەی چاوەڕێی هێزەکەی سەرکردایەتی و هاتنی ئەندامی م. س بووین، کەچی هیچ هەواڵێک سووسەی نەبوو، بۆڵەبۆڵ لە ناو هێزەکە ب لاوەبوەوە کە بگەڕێینەوە، ئەمەوا دیاری دەدات کە ئێمەیان ناردووە تیابچین. کاکە حەمەش ئەم قسانەی پێ خۆش بوو. چونکە خۆیشی ئەیووت منیان ناردووە بو ئەوەی بکوژرێم. کاک حەمە زۆر بەلاییەوە گرنگ نەبوو کادرەکانی کۆمەڵە جاروبار دژایەتیان ئەکرد، بەلام ئەمجارە بەرپرسی کۆمەڵە لە شارەزوور لەدوای ئەوە ئێمە دەرچووبوین بۆناوچەکانی هەولێر بەکاک

ڕەئوفی خەلیفە سەعیدی ووتبوو، ئەوە حەمە لەم سەفەرەدا ئەکوژرێ و
ناگەڕێتەوە، تۆ لەجێگەکەیدا دائەنێین و ئەتکەین بە ئامر هەرێم، ڕەئوف
جێگری حەمە بوو، ئەویش بەنامە کاکە حەمەی ئاگادار کردبوو لەم قسەیە،
پرتەوبۆڵەو گلەییەکانی حەمە لەمەوە سەرچاوەی گرتبوو.
بەرەو ئاوایی نازەنین کەوتینەڕێ. نازەنین هەرخۆی نازەنینە، هەر خۆی
نازفرۆش بەچیای سەرکەش و دارستانی چڕو باخاتی چنارو هەموو چەشنە
دارێکی بەردارو بێبەرە، ئەمە چییە هەر دەگەڕێین و کوردستانی شیرین لە
هەر گۆشەو کەنارێکیدا سیحری خۆیمان لێدەکات؟ لێرەش لە نازەنین
ئافرەتانی گوران واتەنی:

تــابلێی تەڕپــۆش ئــاڵــو والا جـل
بەژن ڕێک و پێک بەدەن نەرم وشل

بەڵێ لێرەش وەک لای خۆمان هەورامان:

عەشقی ئێوارەی ســەرەڕێی کــانی
بەرئــەداتە چــەم کڵپــەی گــۆرانی
خۆرئــاوا ئەبێ، چــەم تــاریک دائێت
دەنگی لاوکو حەیران هەردوایی نائێت

ئای کوردستانە شیرینەکەم چەندە شەیداو ئەڵوەدای تابلۆ دڵگیرەکانی
سروشتی تۆم، چەند دڵبەندم بەڕەونەقی سەفا بەخشت، ئیتر چۆن لە خۆم
نەبوورم و سەروماڵم قەزاو گێڕی بەهەشتەکەمان نەکەم؟
نەیارەکانمان لەو ئاواییە نازەنینەدا، پێشتر هێزەکانی ئێمەیان چاوشکێن
کردبوو. لە دوای مانەوە و پشوودان و میوانداری کردن و دڵخۆش بوونی
خەڵکەکە، ئێمە بەسەر هەورازەکەی پشتی ئاواییدا سەرکەوتین و لەسەر
چیای هەورێ پشوومانداڵ ووتیان لێرەدا چەند فەرماندەیەک بە دەستی
دوژمن شەهید بوون سەید سەلیم و شینە بۆلی. کە لەسەرشاخ بەرەو داوێن
نزیک بووینەوە، گەشتینە ئاوایی سماقوولی سەروچاوە، من بۆ خۆم دوای ١٧
ساڵ لە شەڕی نەگریسی ناوخۆدا دووبارە گەشتمەوە سەروچاوە.
دوای گەڕانەوە بە شوێنی خۆماندا، لە نازەنینەوە بەدەشتێکی بەرفراواندا و
دوای بڕینی شان و بەردێکی نزم، ڕۆژێک لەئاوایی کودەڵە ماینەوە
تاقەماڵێکی مەڕداری لێمابوو، کۆپتەر لەم ئاواییە خەڵکی شەهید کردبوون

پێشتر، ئێوارەکەی دەرچووین و شەو چووینە هەردوو ئاوایی پۆکەی سەروو پوکەی خواروو، ئەم دوو ئاواییە ئاوەدان بوون و کارەبایان هەبوو، دوای دابەشبوون بەسەر ماڵاندا، ماوەیەکی زۆربوو خواردنی سەرەکیمان ساوەر بوو. لەم پوکەدا ڕزگاری عەزەقوڵ و فەیسەڵی مامەکاکل هەریەکەو لە ماڵێک بوو بوون، فەیسەڵ خواردنی دۆڵمەیان دابوویە گووتبوی هەندێک دەبەم لەگەڵ خۆمدا بۆ هاوڕێیەکم، ماڵەکەی ڕزگاریشی لێبوو بوو کفتەیان بووە ئەمیش وتبووی دوو دانە کفتەم بدەنێ لەگەڵ خۆم دەیبەم.

شەو کە کۆبووینەوە بۆڕۆشتن هەردووکیان پێشمەرگەی دەستەکەی من بوون، هاتن بۆ لام وتیان: ئەم ئێوارە خواردنی باشمان بووە، بۆتۆیشمان هێناوە. وتم هەڵیگرن بەیانی دەیخۆین.

سبەینێ گەشتینە دۆڵی سەرکەپکان، لەوێ خواردنەکەیان کردەوە دۆڵمەکە لەباتی برنج ساوەری تێدا بوو، کفتەکەش هەربەساوەر دروستکر بوو. لەئاواییەک لەنزیک سەرکەپکان ڕۆژی ١٩٨٠/٥/٢٢ عەبدوڵلا سوورمان بینی. لەم دۆڵەدا سەرەتا لەئاوایی سەرکەپکان بووین، شەو کەدامەزراین و بەیانی بەرەو پلنگان ڕۆشتین، چەند چەکدارێکیش لەوماڵەدا بوون کە ئێمەی لێ بووین، ئەوان بەیانی ڕۆشتن بۆ شاری ڕانییە. ئێمەش سەرمان لەم نهێنییە دەرنەئەکرد.

دۆڵی پلنگان ماڵی سوار ئاغای هەباس ئاغای لێبوو کە فەرماندەی هەرێمی چواردەبوو، ئەمانە لە عەشیرەتی ئاکۆیان بوون، ناوچەکەش بەگشتی بە ئاکۆیان بە ناوبانگە. کاک سوارە برایەکی تری هەبوو بەناوی کاک ئاکۆ ئێمە نەمان بینی، دکتۆر موشیر ڕابەر سیاسی هەرێمەکە بوو، بەڵام هیچی بەدەست نەبوو، هەر بەناو ڕابەر سیاسی بوو. عەبدوڵلای حاجی شێخە جێگری هەرێم بوو، عەلی نەبی، حەمەی مام هەمزە، ئیبراهیم ڕەبەند، حاجی ئەحمەدی بۆلێ، فەقێ حەسەن، کوێخا بایز و حاجی مستەفا، فەرماندە کەرتەکانی ئەو هەرێمە بوون.. داربەڕوویەکی گەورەی شۆخ و شەنگ نزیک ماڵی سوارەدا هەبوو، ئێمە و پێشمەرگەکانی ناوچەکە لەمێ داربەڕووەکەدا کۆبوونەوەیەکمان سازکرد. لێرە زیاتر باسی ئەوەکر سەرکردایەتی بەڵێنەکەی ڕاست نەبووە و ئەبێ بگەڕێینەوە. من و لەتیف حەمەی مەلا سابیر بەدڵ حەزدەکەین بگەڕێینەوە، بەڵام بۆ ئەوەی بڵێین ئێمە

کۆمەڵەین و لە ئێوە زیاتر گوێڕایەڵی سەرکردایەتین بەرپەرچی پرتەو بۆڵەو ئەو دەنگانە دەدەینەوە کە دەڵێن با لەسەر ڕای هەموومان بگەڕێینەوە. هەرچەندە کاکە حەمە زۆر ڕێزی من و لەتیفی دەگرت و بۆ هەموو شتێک پرس و ڕای پێدەکردین.

لەم چەند ڕۆژەدا لەئاوابییەکانی دارەبەن و پلنگان و چەند ئاواییەکی ترماینەوە. لەسەروی پلنگانەوە کە دەچیت بەرەو وەرتێ لە دۆڵێکدا سەرچاوەی ئاوێک کەهەندێ پەلگی لەسەرەو جادەکەش دێتە تەنیشتی، لەژێر سێبەری دارەکاندا ماوینەتەوە. حەرەسەکە هات و ووتی: ئەوە ئۆتۆمبێلێکی تەکسی لەوێدا وەستاوە وچەند کەسێکی لێ دابەزیون کەبەهەورامی قسەدەکەن. ڕۆشتم بۆ لایان. کاک عوسمانی سۆفی حەمەکەریم کەلەهەموو جێگەیەکدا هاتووە بەهانامانەوە خۆی گەیاندبووە ئەوێش. دوای هەواڵپرسین بیتمان عوسمان عەبدوللا و شاهۆی حەمەی سان ئەحمەدی لەگەڵ بوو، زۆر دڵخۆش بووین بە دیداریان و ماوەیەک بوو هەواڵی سنوورەکەی خۆمان و کەس و کارمان نەدەزانی، هەموویان بە وردی بۆ باسکردین. دوای چەند کاتژمێرێ پێکەوە بوون، کاک عوسمان دە دیناری دایێ بۆ خەرجیمان، خواحافیزیمان لەیەکتر کردو منی بردەلاوە ووتی: بالەتیف نەزانێ کەریمی برای لەشەڕی پاوەدا لەکوردستانی ڕۆژهەلات شەهیدبووە. ئەوان ڕۆشتن و لەتیف ووتی: عوسمان چی گووت؟ ووتم: هیچ، لەتیف شەو خەوی دیبوو بۆ بەیانییەکەی بۆمن و برادەرانی گێڕابوەوە.

ئەو پارەی سزاکەی کوڕەکانی مەجیدخان کەپێمان بوو لێی خەرج نەئەکرا چونکە دەبوو بینێرین بۆ سەرکردایەتی. کاکە حەمە جلەکانی دڕابوو سوارئاغا قاتێکی شاڵی خۆی دایەو کردیە بەری، دوواتر بەکاک غەفووردا پارەکەی ناردەوە بۆ سەرکردایەتی.

سەرکردایەتی داوای کاک غەفووری کردبوو، کۆبوونەوەیەک کرا لەو کۆبوونەوەدا بڕیار درا غەفوور بگەڕێتەوە بۆ ناوزەنگ، دیارە ئێران گلەیی لەیەکێتیی کردووە، لەسەر ئەوەی لە شەڕی دیموکرات و ئێراندا یەکێتیی بەشداری کردووە، غەفوور دەرەشیشی لەپاوە شەهید کراوە. کەریمی حەمەی مەلا سابیریان لێ بۆتە غەفوور دەرەشیشی، ئەمە لەڕۆژنامەکانی ئێراندا وەک هەواڵ ب لاوەکرا بوویەوە، کاک غەفوور داوا کرا بچێتە ئێران چاو پێکەووتنی

لەگەڵ بکرێت بۆ بەدرۆخستنەوەی هەواڵەکە.. لەگەڵ مەفرەزەیەکی شارەزا و چەند پێشمەرگەیەکی خۆمان کە بوبوون بەبار بەسەرمانەوە لەڕێی کێوە ڕەشەوە بۆ مەمکان و دووگۆمان کەووتنەڕێ و لە ئاوی قەندیل پەڕینەوە و گەڕانەوە بۆ خڕی ناوزەنگ.

ڕژێم ڕێگای سەر کەپکان و پڵنگانی بۆ ڕانییە داخست و حەساری خستە سەر ئاوایییەکانی سنوورەکە، بۆیە بە ئێمەیان ووت: ئێوە سنوورمکە بەجێ بێڵن و بڕۆن حکومەت لەبەر ئێوە ڕێگاکەی داخستووە. ئێمەش ووتمان ئەی ئێوە چین؟ مەگەر ئێوە پێشمەرگە نین؟ کاکە حەمە پێی ناخۆش بوو وامان ووت، ئێمەیش لە١٩٨٠/٥/٢٨ بەهەورازێکدا سەرکەوتین و لەزینی وەرتێ ئاودیو بووین، چووین بۆ ئاوایی وەرتێ و کوێستانەکانی چیای کاروخ. وەرتێ یەکێکە لەئاواییە جوانەکانی کوردستان، کوێستان و بەندەن و هەوارو دار گوێزی تێدایە، کوێستانەکانیشی داپۆشراون بەچنوور و شەوبۆ و کەما و لۆ، نزارە بەفر گرتووەکانیشی بە هەشتۆکەیەک بوون دڵی خەمگینیان پردەکرد لە ساز و ئاوازی بلاوێن. هێندە سیحراوی بوون، ناخی نەشە دەکرد لەساز و مۆسیقای دڵبەند. شەوی ١٩٨٠/٥/٣١گەڕاینەوە بۆ دۆڵی شاوری و ئاوایی پڵنگان. لە دوای گەڕانەوەمان لەئاوایی وەرتێ بۆ دۆڵی پڵنگان، هێزێکی تر لە ناوزەنگەوە بە فەرماندەیی کاک مەلا بەختیار هات و گەیشتنە لامان. دوای یەک ڕۆژ پشوودان هەردوو هێزەکە بەیەکەوە لەڕۆژی ١٩٨٠/٦/٩ کەوتینەڕێ بۆ ناوچەی خۆشناوەتی.

سەرلەبەیانی دوو هێز کەوتەڕێ، سەرێکی لەئاوایی پڵنگان و سەرێکی دوای سەرکەوتن بە لای ئاوایی گوڵان و هەورازێکدا گەیشتوەتە سەرشاخ، بۆ نیوەڕۆ لە سەرشاخ لە دۆڵێکدا پێم وابێ ئارسنی ناوە پشوومان داو ماینەوە لێرە مەفرەزەیەکمان پێگەیشت فەرماندەکەیان ناوی وەسمان بەگ بوو، لەگەڵ برازایەکی، چەک کران پێم وابێت هەر لەسەر ئەوەبوو ئەمانە پابەند و گوێ ڕایەڵی دیسپلینی حیزبی نەبوون. ئەگینا ئەیانووت یەکێتین و بەحسەب وەسمان بەگ فەرماندەی هەرێمی ١٢ یە، دوای نیوەڕۆ بە دۆڵێک دا شۆڕبووینەوە لەسەروی مەلەکانەوە، بە ڕێگایەکی لاپێ و سەختدا لاملەد بۆپشتی ئاوایی شیری، ئێمە لەم ڕێگەیەوە ڕۆشتین و لێرەوە بووینە

ـووبەش، هێزێک بەقیادەی مەلابەختیار بەرەو دەرەشێریێ شۆڕبونەوەو هێزێک بە فەرماندەیی حەمەی حاجی مەحمود بۆئاوایی زێویێ.

ئێمە لەم هێزە داین هەوا تاریکی کرد و شەو گەمارۆیی ئاوایماندا، شەوی ٩-١٠ / ٦ / ١٩٨٠ بەیانی سەحەر لەپشتی ئاوایی ناوچەکەمان خستووەتە ژێر چاودێری، بینیمان چەند چەکدارێک لەماڵێکدا هاتوو چۆیانەو خەریکی خۆ کۆکردنەوەن لە لای راست و چەپەوە هێز شۆڕبوونەوە بەرەو ئاوایی زێویێ. مام ئەحمەد پیاوێکی بەساڵاچوو شارەزاو رێنیشاندەری هێزەکەی ئێمەیەو تفەنگی برنەوی پێیە، لە سەروی ئاوایی لە نزیک ئەو تاقگە جوانەدا کە لەبەرزاییەکی بەرزەوە ئەڕژێتە ناو باخە چڕەکانی دارگوێزەکان، مایەوە و نەهاتە خوارەوە. پێشمەرگە نزیکی ئەو ماڵانە بونەتەوە کەچەکدارەکانی لێیە دنیا بێدەنگە، مام ئەحمەد بە تەقاندنی گوللەیەکی برنەوەکەی و کوشتنی چەکدارێک گۆمی بێدەنگی شڵەقاند. کوژراوەکە ناوی حسێنی حاجی مینە بوو، پاشماوەی چەکدارەکان و ئەوانی تر لەچەند لایەکی ترەوە بوون خۆیان کرد بەناو باخە چڕەکاندا و خۆیان ونکرد. بۆ نیوەڕۆ لە ئاوایی نانی نیوە ڕۆمان خوارد، هەندێک لە خەڵکی ئاوایی پێشوازی گەرم ئەکەن و دڵخۆشن، هەندیکیشیان شین و زاری ئەکەن.

پاش نیوەڕۆ لە ئاوایی دەرچووین و بەرەو خوار بووینەوە، لای عەسر گەیشتینە سەر جادەی خۆشناوەتی خەلیفان_سەروچاوە لە لای ئاوایی مێرگە سەر، لەم کاتەدا هێزەکەی مەلابەختیار گەیشتووەتە ئاوایی چیوەی سەروو، سلێمان بیریێژی و هێزەکەشی لەئاوایی چیوەی خواروون. هێزەکەی چیوەی سەروو داوائەکات ئێمە بچینە لایان، ئێمە لەمێرگەسەر چەند جێب و تراکتۆرمان گرتووە و سوار بووین و بەرەو چیوەی خواروو کەوتینەڕێگا. شۆفێرەکان بە کاکە حەمەی ئەڵێن ناتوانین بێن چونکە سلێمان لە دارو قەبرسانەکەی چێوەی خوواروو کەمینی داناوە. ئێمەش وا ئەزانین بۆ ئەوە وا ئەڵێن نەیان بەوێن و ترسبان هەیە. بەبێ گوێدانە هات و هاواریان ڕۆیشتین، گەیشتینە بەردەم ئاوایی بە قەراغ ریزی دارچنارەکاندا جێب و تراکتۆرەکان کەپڕن لەپێشمەرگە و بە تەماین بگەینە لای هێزەکەی کاک مەلا بەختیار. لەبەر دەم ئاواییدا لەناو قەبرسانەکەدا لەناکاو درانیە بەردەست ڕێژی گوللە و هات هاوارو بگرە و بەردە تێکرژان دەستی پێکرد. کاکە حەمە خۆی لە دواوە

بوو زووهات بە دەممانەوە، چەندین پێشمەرگە برینداربوون لەوانە: دلێر جاف، شاخەوان فەتحولا، مەحمود زەردۆیی، عوسمان مكلی، حمەڕەش گرێزەیی حەمەڕەش یەكێك بوو لەفەرماندە قارەمانەكانی سەرەتای شۆڕشی نوێ. دووانیان برینەكەیان سەخت بوو، لەوانە شەهید دلێر جاف فەرماندەی كەرت، شاخەوان فەتحولا. كوڕێكی گەنجیش بە ناوی عومەری حاجی مەحمود خەڵكی ئاوایی گامێش تەپەی لای سەیدسادق شەهید بوو.

ئەوهێزەی لە چێوەی سەروو لەگەڵ مەلابەخیتاردا بوون مەردانە هاتن بەدەممانەوە چەند فەرماندەیەكی لێوەشاوەی وەك شەهید عەلی نەبی و سامان گەرمیانیان لەگەڵدا بوون، سلێمان بیرێژی و هێزەكەی هەڵهاتن و سێ جەنازەیان لێ بەجێما، یەكێكیان ناوی عەبدوللا خۆرانی بوو. شەو داهات و بەدیار بریندارەكانەوە لەچێوەی سەروو تا بەیانی ماینەوە، مەفرەزە ئامادەكرا بۆگواستنەوەی بریندارەكان لەچێوەوە بۆ ناوزەنگ بە ولاغ، ئەمەش هەروا ئاسان نییە و ڕێگا دور و مەترسی دارە. هەندێك مەفرەزە و شارەزا كە خەڵكی ناوچەكە بوون لێمان ونبوبوون و ڕۆژی دواتر هاتنەوە بۆ لامان. بریندارەكان ڕۆژی ٦/١١ / ١٩٨٠گوازرانەوە بۆ كودەڵەو لەوێوە بۆ دۆڵەڕەقە و بەكێوە رەشدا بۆ سەرئاوی قەندیل و لەوێوە بۆ ناوزەنگ، ئەمەش بەهیمەتی چەند فەرماندەو پێشمەرگەیەك.

رادیۆی پارتی لە هات و هاوارێكدا ب لاوەی كردەوە گوایە ئێمە بریندارەكانمان بەكۆپتەر ناردوە بۆ بەغداد لەكاتێكدا بەنارەحەت هێسترمان دەست كەوتبوو بۆ گواستنەوەی بریندارەكان، ماوەی هەفتەیەك لەم دۆڵەدا بووین ڕژێم هێرشی كرد بۆ سەر ناوچەكە لەڕێگای سەروچاوەوە بۆ مێرگە سەرو دابەزاندنی هێزی مزەلیش بە كۆپتەر لەسەر بەرزاییەكانی هەورێ و ك لاوە قاسمەوە. ئەم ڕۆ ئێمە لەناو لێرەوارو پووش و پاوەنی ناو قەدی چیاكەدا دامەزرا بووین و خۆمان ئامادە كردبوو بۆ ڕوو بە ڕوو بونەوە كەچی تووشی تەقەو لێكدان نەبووین و ڕژێم لەناوچەكە پاشەكشەی كرد.

ڕۆژی دواتر عەسرەكەی لەئاوایی نواوەوە دووبارە لەگەڵ هێزمكەی سلێمان پێك هەڵپژاینەوەو تەقەو لێكدان دەستی پێ كردەوە، لەوێش هەڵهاتن و ئێمە بەرەو ئاواییەكانی بالیسان و تووتمێ و خەتێ و بلێ جەولەكەمان درێژە پێدا. ڕۆژێك لەبالیسانەوە بۆئاوایی تووتمێ ئەچووین ئەوانمان بینی

لەئاوایی زینوێ پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٤ / ٦ بۆ جاری سێیەم لەگەڵ هێزەکەی بیرێژی ڕوو بە ڕوو بووینەوە ئەوان هەڵهاتن و لەچیاو بەدەستە چەپی زینەتیردا ئاودیو بوون بۆ لای شەق لاوەە و سپیندارە.

ڕۆژی دوایی ئێمە لەئاوایی دەراش بووین، لەم ئاواییەدا ماڵی حاجی کاکۆڵ بوونە دۆست و ناسراوم ئەنوەری کوڕیان هەر چەندە منداڵ بوو، بەڵام وولاخ دارێکی ئازاو نەترس بوو هاتوو چۆی سنوری سەردەشتی ئەکرد، دایکی ئەنوەر ژنێکی سەلارە بوو خزمەتی منیان ئەکرد وەک دایکم دڵم پێی ئەکرایەوە. دواتر گەڕاینەوە بۆ خەتێ ئاگاداریان کردین کە ئەم شەو لەئاوایی سپین دارە عەبدوڵلا تورک سلێمانی کوشتووە و خۆی تەسلیمی ڕژێم کردوەتەوە، هەر ئەو ڕۆژە هادی برای سلێمان و چەند کەسێتر هاتن و خۆیان بەدەستەوەدا. ئیتر وردە وردە ئەو مەفرەزە و چەکدارانە لە فەرهەنگی پێشمەرگایەتیدا پێیان ئەووترێت قیادە واحدە، یان تەسلیم ئەبوون یان ناوچەکەیان بەجێ ئەهێشت. ئێمەش جارجار هەموو هێزەکە پێکەوە یان بەچەندین بەش جەولەی ناوچەکەمان دەست پێکرد و لەئاواییەکاندا بە تایبەت ئاواییەگەورە و قەرەباڵقەکان کۆبوونەوە بەخەڵک ئەکراو مەلا بەختیار قسەی بۆ ئەکردن، جارجاریش لەسەر قسەکردن لە نێوان مەلا و عەلی حەوێز و کاکە حەمە کە کامیان قسەبکەن؟ ساردی دروست ئەبوو، بەڵام زۆرتر مەلا بەختیار قسەی ئەکرد، چەند کادرێکیش خەریکی ڕێکخستن و درووست کردنی شانەی حیزبی بوون، لەوانە کاک ئەرسەلان باییزو، جەمیل ڕەنجبەرو سلێمان بالیسانی برین پێچیش بوو دواتر شەهید بوو.

لەم سەفەرەدا چەندین کادر و پێشمەرگە و فەرماندە بوونە دۆست و ناسیاوم لەوانە هەڤاڵان ئەرسەلان بایز، جەمیل ڕەنجبەر، سلێمان بالیسانی، عوسمان بەگ، عەلی نەبی، عەزیز بەگ و کاک هەندرێن.. تاد. پێم وابێت لەو هەڤاڵانە ئێستا تەنیا کاک ئەرسەلان ماوە ئەوانی تر گیانیان بەخت کرد لە ڕێگەی کورد و کوردستاندا، ئەرسەلان بایز لە پیاوە بەوەفا و دۆستە باش و سەمیمیەکانی منە لەم شۆڕشەدا، پیاوێکی بەوەفاشە بەرامبەر بە برادەرەکانی، جەمیل ڕەنجبەر شاعیرو پیاوێکی ڕۆشنبیرو کادرێکی متمانە پێکراو بوو.

ورده ورده ناوچەکە ئاسایی بووەوه و چەندین جار سەردانی دۆڵی خۆشناوەتی و بناری هیران و نازەنین و دۆڵی سماقوڵیمان کرد، زەمینە سازبوو بۆ دامەزراندنی یان دامەزراندنەوەی هەرێمی ٨ی دەشتی هەولێر و گەراندنەوەی هێزەکەی هەرێمی یەک بۆسنوری شارەزوور. کاتێک ئێمە گەراینەوه، مەلا بەختیار ئەندامی سەرکردایەتی و عەلی حەوێز ئەندامی م. س و سامان گەرمیانی جێگری هەرێمی ٥ له ناوچەکەدا مانەوه تا شێخ عەلی بگات و بکرێتە فەرماندەی هەرێمەکە، بەڵام بەر لەوەی بگاتە لای هێزەکە له بناری کۆسرەت تووشی شەڕێکی قورس بوون چەندین شەهید و برینداریان دا، یەکێک له شەهیدەکان حەمەعەلی فەتاح، پێشتر پێشمەرگە بوو له کەرتی دووی هەرێمی یەک لای ئێمە کوڕێکی قارەمان بوو.

ئەو هێزەی قیادەو قیادە واحدەکان کەلە ناوچەکەدا بوون بەر لەچوونی ئێمە بۆ ئەوێ، نزیکەی ٢٠٠ دوو سەد کەس ئەبوون، بیرێژی یاری لەگەڵ هەموولایەکدا ئەکرد، خەڵکی ناوچەکە بەشێکی لێی بێزار بوون وبەشێکیشی لێی ئەترسان، بۆیەکەم جاریش بوو یەکێتیی هێزی گەورەو شەڕکەری بەوشێوە بچێتە ئەوێ، لەگەڵ خەڵک باشبوین و هاوکاری جووتیارەکانیشمان ئەکرد، وەک بەهەرەوەرزی دروێنەکردن. له دوای کوژرانی بیرێژی و تەسلیم بونەوەی عەبدولڵا تورکە ورده ورده کۆتاییان هات، زۆربیان هاتنەوه لای یەکێتیی و چەندین کەس خۆیان تەسلیم بەڕژیم کردەوه، بەشێکیشیان لەگەڵ گوڵەباخ ناوێک و هاشم باپیردا کە نزیکەی ٤٠ چل کەس ئەبوون گەرانەوه بەرەو ئێران و هێزەکەیان لەبەریەک هەڵوەشایەوه. هەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر دەستی بەکارو چالاکی کرد لەناوچەکەدا.

لەگەرانەوەدا هێزەکەی هەرێمی ١یەک، لەدۆڵی شاورێوە بەرێکەوتین بۆ کێوەرەش، نزیکەی ٧٠ کەس ئەبووین، رۆژێک بەبێ نان و ئاو لەنزیک ماخ و بزنان لەپشدەرە رەقە ماینەوه. پاش نیوەڕۆکەی ورده ورده کەوتینەڕێ بۆلای دووگۆمان ئەوبنارە دێکانی چۆڵیان کردبوو چووبونە قەندیل بۆ لەوەرخۆری، لەبەردەم ماخ و بزناندا دامان بە لای گومێکی ئاودا کە باراناوی بەهاری تێدا کۆدەکەنەوه بۆ مەڕو ماڵات، ئەوەندە بۆگەنی کردبوو پێشمەرگە ئەیاندا بە لایدا لووتیان ئەگرت. سەگی تێدا تۆپی بوو گەنیبوو، کیسەڵ چوو

بوو بۆ ئاوخواردن لە قورِولیتەی ڕەشدا چەقی بوو لەشی وەریبوە ناو ئاوەکە.

هەر بەڕۆژ و دةمـةو ئـي ئوارة هاتینە سەر ئاوی قەندیل لەوێ کەلاوەی ئاواییێکی لێیە، ثـي ئم واب ێ مـةمـکـان و دوو کـۆمـانـة سوارة بـةسةر ضنمةکـةدا، خەڵکی لە ئوردوگایی سەنگە سەرەوە سەیریان ئەکردین، دوو مەفرەزە بە فەرماندەیی لەتیفی حەمەی مەلا سابیر و فیسەڵی مام کاکل و مامە ڕەشەی گلاڵی چونە خووارەوە بۆ سەرچەم و لەوێوە سەرکەونە سەرجۆگە و جادەی نێوان سەنگەسەر و کورتەک کەمینبن تا هێزەکە بپەڕێتەوە کە گەیشتنە سەر چۆم، لێرەوە ئێرەییمان پێ ئەبردن کە تێر ئاویان خواردوەتەوە.

کاتێک سەرکەوتنە سەرەوە لە ناوکاو لەبەر چاوی ئێمەوە کەمینی جاش هەستان بۆیان و دەنگیان دان، نەجوڵێن و تەسلیم بن، ئەو دوو مەفرەزە شێر ئاسا لێیان هاتنە دەست و ئێمەش لەم بەرەوە بەچەکی برنە و کلاشنیکۆف پشتیوانیمان کردن تا داگەڕانە خوارەوە و سەرکەوتنەوە بۆ لامان، لەم تەقەولێکدانەدا حەوت جاش کوژراون.

بەڵێ گەڕاینەوە بۆ لای گۆمی ئاوە گەنیوەکە، پێشمەرگە جامەدانییان لەسەر دائەنا و چلکاویان ئەمژی حاڵێکی زۆرخراپ بوو، نیوەی هێزەکە لە بەر تینویەتی پەکی کەوت، هەر لەنزیک ئەم گۆمەدا سێ کەس تازە هاتبوون بۆپێشمەرگایەتی جێمان. وردە وردە بە دۆڵێکدا سەرکەوتین بۆ هەوارەکانی ماخ و بزنان و گۆڕبەنان لێرەو دووبارە فەیسەڵ و لەتیف و مامەڕەشەی گلاڵی پێش کەووتن بەڵکو لەو هەوارانە ئاو بهێنن بە دەم هێزەکەوە. ئەوان ڕۆیشتن و ئێمەش هێواش هێواش بە قورِبان و سەدەقەو بەپاڕانەوە پەک کەوتووەکان گام گام ئەبەین لەگەڵ خۆمان، دەمەو بەیانی شەش کونە ئاویان بە باری سێ گوێدرێژ هێنا و هاتن.

دوای ئاوخواردنەوە هەر لەوناوەدا پشووماندا، خۆروبان گەرم بوو گەیشتینە هەوارەکان، لەکاتی نانخواردنی نیوەڕۆدا لە بەرزاییەکانی بەری ڕۆژهەڵاتی هەوارەکانەوە دراینە بەر دەست ڕێژی گوللە، وردە وردە بە بەری لای خۆرئاوادا بەرزبووینەوەو دووره تەقە کۆتایی هات، گەشتینە سەرەوە هەوارەکانی گۆڕبەنان، بینیمان عەبدولڕەحیم مەرگەیی شەهید و

مەفرەزەیەک پەیدابوون و هاتن ئێمە گەشاینەوەو خۆشحاڵ بووین شارەزامان بۆپەیدا بوون لە کۆمتانەوە ئەمانبەنە بناری قەندیل بۆ لای قەلاتوکان. هەر بەڕووناکی نزیک بووینەوە لەو سەربازگە کە لەو دۆڵەدایە، هەوا تاریکی کرد و لەجادە پەڕینەوە بە بناری قەندیل دا تا ڕۆژبوەوە ڕێگامان بڕی، بۆ نیوەڕۆ هاتینە بنکە و بارەگاکانی قەلاتوکان، کاک کەمال خۆشناو لەوێ بوو میوانداری باشی کردین و دوای حەوانەوە بەڕێکەوتین بۆڕەزگەو مارەدوو، کەم کەم هاتین گەیشتینەوە ناوزەنگ و تووژەڵە. لەوێ چەندین ڕۆژ ماینەوە، ئێرە بارەگاکانی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی و مام جەلالی لێیە.

لێرە من هەوڵمدا کاک لەتیفی حەمەی مەلا سابیر هەڤالان پێی نەڵێن و نەزانێ کەریمی برای شەهید بووە، ئەو ماوە پشوومانداا، هێزەکە پچڕ پچڕو کەرتەکان بەرو دوا کەووتنەڕێ بەرەو ئالانی سەردەشت و بلەکێ و دەوروبەری بانە، بۆ دابەزین بەرەو شارباژێڕ و شارەزوور. ئەو چەند مەفرەزەیەی هەورامان پێکەوە بووین و غەفوور دەرەشیشی هاتەوە لامان و کەوتینەڕێ، لەنزیک ئاوایی بێوران لەگەڵ لەتیف پێکەوە ئەڕۆشتین پێشمەرگەیەکی ناسراو برادەری لەتیف کەبەمۆڵەت لەخوارەوە بووبوو لەشارباژێڕ ئەگەڕایەوە بۆ سەرکردایەتی پێمان گەشت، دوای چاک و چۆنی و یەکتر ماچ کردن ڕووی کردە لەتیف و پێی ووت: خۆت خۆش بۆ کەریمی برات، لەتیف حەپەساو هیچی نەوت، ئازاری درکێکی بەسۆ چزا بەدڵیدا و پەردەی خەم ڕووی سیمای پۆشی، ڕویکردە من و بەهەناسەیەکی ساردو حەسرەتناک و بەدەنگێکی کزۆڵەوە، ووتی تۆ زانیووتە بۆپێت نەوتووم؟ هەر سێکمان بێدەنگ لاماندایە کەناری ڕێگاکە، ئەو ڕۆژە لەدۆڵی پڵنگان عوسمانی سۆفی حەمە کەریم بانگی کردیتە لاوە ئەوەی پێ ووتی؟ ووتم بەڵێ، ئەوە بوو خۆیشی هەر ئەو بەیانییە خەوی بینی بوو بۆ منی گێڕابووەوە، ووتم حەزم نەکرد بزانی ویستومە بگەینەوە شۆشمێ و لەوێ بزانیت. دەی بڕۆن باجێنەمێنن خواتان لەگەڵ،کوڕەکە ڕۆیشت و من و لەتیفیش ملی ڕێگامان گرتەوە، لەژێر چاوەوە نیگایەکی دزانەم گرتە سیمای، بینیم فرمێسک لەچاوە کزۆڵەکانییەوە بەسەر ڕیشە شاشو شەوێڵەکەیدا ئەڕژێن، تاسام وتەزوویەک تەزاندمی.

ئیتر درێژەمان بەڕێگابرینی خۆماندا بەخاکی کوردستانی ڕۆژهەلاتدا لەناوچەی سەردەشتەوە بەرەو بانەو مەریوان تا گەیشتینە بارەگای حیزبی دیموکرات لەئاوایی دزلی، لەوێ لەلای کاک سەعیدی ئەفشار ماینەوە پشوومانداو سەعیدی ئەفشار کادرو فەرماندەیەکی بە قابیلیەت بوو، ئەو ماوە بریندارو قۆلی شکابوو، ڕۆژی دواتر سەیارەی بۆگرتین وکەوتینە ڕێ بۆ نەوسوود، لەپاسگای ژالانە سوپای ڕزگاری ڕێگەیان لێگرتین، لەوێ پاش بگرە و بەردە و دەنگە دەنگ رازیمان کردن ڕێگایان داین هاتینەوە نەوسوود و ئێوارەکەی هاتینە ئاوایی شۆشمێی خواروو، لەماڵی باوکم پشووماندا و ڕۆژانی دواتر کەس و کاری لەتیف هاتن بۆلای، هەڤالان و خەلکی ئاوایی هەموو هاتن بۆ بەخێر هاتنەوەمان و بۆ سەرە خۆشیکردنی لەتیف، شەهید کەریمی حەمەی مەلا سابیر کوڕێکی بە ئەدەب و کەم وێنەبوو لە قارەمانییەتیدا، بە بنەماڵە کورد پەروەرو یەکێتیی بوون.

دیارە چەند پێشمەرگەیەکی ئەم گەشتە لە سەرەتای مانگی٢/١٩٨٠ وە لە چیای پەروونییەوە لەگەڵ کۆمەڵە چوو بووینە ناوچەکانی هەورامانی لهۆن، ژاوەرۆ، کامیاران و سنە، لەوێوە گەڕابووینەوە و کەووتبووینە ڕێ بەرەو دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی، لەکۆتایی مانگی٧/١٩٨٠دا لەوێش دووبارە بەقەندیل و ناوچەکانی سەردەشت و بانەو مەریواندا گەڕاینەوە بەرەو هەورامان و بۆ مانگی ١٩٨٠/٨گەشتینەوە مەنزڵ دوای چەند ڕۆژ پشودان چووینەوە بۆکۆنە هەواران بۆداوێنی چیای پەروونی، ئەمە هەموو بەپیادە ڕەوی، ئێوە بەخێرو ئێمە بەسەلامەت. ئەمجا بەرەو وەرزی پایز ئەچین و دەستمان کرد بەپوش کێشان بۆ سازکردن و دروست کردنی خانەو لانەی ئەم پایزو زستانەمان لە کەوێڵ و خانەباخەکانی ئەو چەم و دۆڵەدا.

# کەرت بوونی هەرێمی یەک

هەرێمی یەک یەکێک بوو لە هەرێمە گەورەکانی یەکێتیی کەسنوورەکەی پێک هاتبوو لە بەشێکی پێنجوێن، دەشتی شارەزوور، هەورامان و ناوچەی هەڵەبجە، ئەو سەردەمەی کاکە حەمەی حاجی مەحمودی گوڵەخانە بەرپرسی ئەم هەرێمە بوو، لە ناو هەرێمەکەدا هەرسێ باڵەکەی یەکێتیی، کۆمەڵە، بزووتنەوە وخەتی گشی ڕێکخستنیان هەبوو. ئاسۆی شێخ نوری بوو بە ڕابەر سیاسی هەرێمەکە، ئەبوشەهاب بەرپرسی لق بوو لە سنوری هەردوو هەرێمی ١ یەک و هەرێمی ٣سێ[1] دا.

هەرچەندە کاکەحەمە دۆستی کۆمەڵە و پشتگیری ئەکردین، بەڵام کۆمەڵە کێشە و گرفتی بۆئەو دروست ئەکرد، بە بیانوی ئەوەی پشتگیری چەند فەرماندە کەرت و فەرماندە مەفرەزە ئەکات و بە پشتیوانی ئەم، ئەو فەرماندانە ڕاوڕووت ئەکەن، بەشێوەیەکی دوور لە کردەوەی پێشمەرگانە لەگەڵ هاولاتیان و دێنشینەکان ئەجولێنەوە، هەندێک جار تۆمەتی دزی و ئەخلاقیان ئەخستە پاڵیان. کاکە حەمەش حسابی بۆ ڕابەر سیاسی و بەرپرسی لق و هەندێک لە کادرانی کۆمەڵە نەئەکرد، ئەمە بووە هۆی ئەوەی وردە وردە لەناو هەرێمەکەدا بەرەیەکی دژ بە کاکەحەمە دروست بکەن.

لەمەشدا ئەو برادەرانەی ڕابەرایەتی بەری معارەزەیان ئەکرد زۆرتر پشتیان بەستبوو بەو سێ کەرتەی بەری هەورامان، فەرماندەی ئەو کەرتانەش، مەحمودی حاجی فەرەج و شەهید غفور دەرشیشی بوون. کەرتی دوو فەرماندەکەی ئەحمەد گریانەیی شەهیدبوو بوو حەمەیان خۆش ئەویست و بە ڕووکەشی ناچاریش بوون بە گوێی کۆمەڵە بکەن، لە هەورامان و هەڵەبجە جگە لە کەرتە عەسکەریەکانیش هەڤاڵانی ناوچەو کادرەکانی کۆمەڵەش هەبوون، م-پشکۆ جولێنەرو سەرپەرشتیاری بەرەی معارەزە بوو بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە ئەزمون و یاددا نووسیویەتی.

---

[1] هەرێمی (٣)ی شارباژێر کاك بەکری حاجی سەفەر ئامر هەرێمی بوو.

ئێمەش هەندێک جێگر کەرت و فەرماندە مەفرەزە و دوو فەرماندە کەرتەکە کە پێشتر ناومان هێنان باوەڕمان بەو بڕوبیانوانە نەبوو کە بەحەمە نەگیرا و پڕوپاگەندەی لەسەر ئەکرا، بەڵام لە بەر ئەوە کۆمەڵە بووین ئەبوو بە گوێی برادەرەکانی خۆمان بکەین.

وردە وردە کێشەکان گەیشتنە لێواری تەقینەوە، کەرتەکانی تری هەرێمەکە، کە زۆرتر پێکەوە بوون لەبناری سورێن و دەشتی شارەزووردا، چووبونە ئاواییەکانی سنوری شاری مەریوان و کاکە حەمەش لەوێبوو، ئێمەش بانگ کراین بۆ ئەوێ، لەلایەن کاک ئاسۆ و ئەبوو شەهابەوە، واتە کەرتەکانی بەری هەورامان و هەڵەبجە، چەند کۆبوونەوەیەکیان لەگەڵ هێزەکەی لای ئێمە کرد لەسنوری سەر دۆش و مڕانە و دەوربەری بایاوادا. هەرێمەکە بوو بەدوو بەش، زۆرینە لاکەی لای ئێمە بوون کە ئەبوشهاب و ئاسۆی شێخ نوری سەرکردایەتیان ئەکرد، لاکەی تریش کاکە حەمە و کاک ڕەئوف و چەند فەرماندەی کەرت و فەرماندە مەفرەزە لەگەڵ هێزێک بوون، ئەم دوو هێزە بە جیا جیا ڕێگای ناوزەنگمان گرتەبەر.

ئەمە لە کاتێکدایە کە ماوەیەک پێشتر بزووتنەوە لە یەکێتیی نیشتیمانی جیابۆتەوە و لە سنوری هەرێمی یەکدا کاک شەوکەتی حاجی مشیرو چەندین پێشمەرگە لەگەڵ بزووتنەوەدا چوون، کێشەو گرفت بەهۆی ئەو جیابوونەوەوە لە هەیکەلی ڕێکخستن و هێزە سەربازیەکەی یەکێتیی دروست بووە، زیاتر لە ناوچەی هەولێردا بزووتنەوە باڵادەست و گرفتی زیاتری دروست ئەکرد، کاک شەوکەت گەشتێکی کردو لەدەورووبەری دۆسەدەرەو ڕەزڵەدا تووشی تەقە و لێک دان بوو لەگەڵ هێزەکانی یەکێتیی و ناوچەکەی بەجێ هێشت و گەڕایەوە بۆ گۆڕە شێر.

لەناوچەی شارباژێر و لەدیوی کوردستانی ڕۆژ هەڵات لەدەورو بەری بلەکێ عوسمانی قالە منەوەر حسک و جەماعەتی پاسۆک بنکەو بارەگایان دانابوو، حەمەی حاجی مەحمود هێزێکی هەرێمی یەکی بردبوو و بەسەر هەرێمی٣ سێ و لەپەنا بەکری حاجی سەفەردا چەکی کردن. لەجیابوونەوەی بزووتنەوەدا، کاکەحەمە داکۆکیکارێکی سەرسەخت بوو لەیەکێتیی و ڕێگەی نەئەدا لەسنوورەکەدا بزووتنەوە کاروچالاکی ئەنجام بدەن یان هەر بێتە ناوچەکە. لەسەرو بەندی ئەم کێشەو گرفتانەی لەنێوان یەکێتیی و

بزووتنەوەدا ڕویان ئەدا، حەمەی حاجی مەحمود ئاڵای پاکسازی بزووتنەوەی هەڵگرتبوو. کۆمەڵەش خەریکی دژایەتی کردنی حەمەو بەشێکی هەرێمەکە بوون. ئەمە یەکێک لەو هەڵە گەورانەبوو یەکێتی کردی.

من یەکێک بووم لەوکادرانەی کەدژی کاکەحەمەو لە بەرەی معارەزەدا بووم، ئەوکاتەو ئێستاشی لەگەڵ بێت، ئێمە کارێکی خراپمان کرد، ئەوهەڵەیەی ئێمە کردمان گورزێکی کوشندە بوو لە یەکێتیی دراو یەکێتیی پێ لاواز بوو. لە دوای کۆبوونەوەکانمان دژ بەحەمە، لەسنوری مەریوان، ئێوارەیەک لە گوندی ساوجیبیەوە کەوتینەڕێ بۆناو زەنگ، شەو لەچەمی شلێرو لەسەرو ئاوایی گۆخلانەوە لەگەڵ چەکدارەکانی عەلی مەریوانی توشی تەقە و شەڕبووین، چونکە کەوتینە بۆسەیانەوە سێ کەسیان لێ کوژراو ئێمە بەسەلامەت دەرچووین، بۆ بەیانی گەیشتینە سەیران بەند. پاش ماوەیەک هەردوولا گەیشتنە سەرکردایەتی یەکێتیی. لیژنەیەک دروست کرا بۆ لێکۆڵینەوە لەکێشەکان و بەشێوەی دادگایی کردن. هەندێک کەس دادگایی کران.

لەو کاتانەدا کە پایزی ساڵی ۱۹۸۰ یە گەیشتینە سەرکردایەتی، پارتییش خەریکی کۆکردنەوەی هێزو نزیک بوونەوەیە لەسەرکردایەتی یەکێتیی. هاتوەتە بەرزاییەکانی دەوروبەری ناوچەی دۆڵەتوو، کونەمشکێ، ئاڵوەتان. کاکە حەمەی حاجی مەحمودو ئەو هێزەی لەگەڵیدا بوون لەئاوایی شێنێ بوون. ئێمەش بوو بووینە دووبەش، بەشێکمان لەبەرزاییەکانی لای مەمکاوێ و داوداوێ وپشتی نۆکان، بەشەکەی تریشمان لەکانی کەنێرو بەرزاییەکانی پشتی توژەڵە بووین.

لەم کاتانەدا بوو، ڕۆژێک نزیکەی هەشت فرۆکەی جەنگی عێراق بەسەر ئێمەدا ئاسمانی ئێرانیان بەزاندو سەرەتای شەڕی عێراق ئێران بوو. ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە ڕۆژانە هێزی هەوایی عێراق پۆل پۆل فرۆکە جەنگییەکانی ئەچوون لەئێران ئەیاندا لەشارەکان و ئەگەڕانەوە. ڕۆژێک کەمال شاکر و مەحمودی حاجی فەرەج گرەویان کرد لەسەر ئەوە، مەحمود ئەیووت ئەگەر وابڕوات ئەتوانین پاش هەفتەیەکی تر بارەگا لە ئاوایی عەبابەیلێ دانێین، د.کەمال ئەیوت یەک مانگ بەردەوام بێت ئینجا ئەتوانین ئەو بارەگایە دابنێین. مام هادی ووتی ئەگەر شەڕەکە درێژەی کێشا ئەوە لەکولێن دەشت

و ئەشکەوتەکانی سەرەتای شۆڕشیشدا جێگەمان نابێتەوە. کەچی شەڕەکە هەشت ساڵی خایاند و نەک ئەمان توانی لەعەبابەیلێ بارەگا دابنێین، دوای ماوەیەک ئەشمان توانی لەوبنکەو بارەگایانەی ساڵانی پێشتر لەسەر سنوور هەمان بوون تیایاندا بمێنینەوە. پێشبینیەکەی مام هادی راست دەرچوو.

هێزەکەیی پارتی بەسەر پەرشتی کاک مەسعود بارزانی ناوچەکانی لەمزڵە توو و تا قەلاتوکانی گرتووە و چاوەڕێ ئەکات بە هاوکای سۆشیالیست پاسۆک بێنە سەربنکەو بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتیی، چەکوچۆڵەی تەواویان ئامادە کردبوو لەوانە شەش٦ هاوەنی ١٢٠ ملیم، هەرێمی یەک بەدووبەش هاتوینەتە سەرکردایەتی. لێرە لەسەنگەر داین بەرامبەر بەپارتی، لەم لاوە عێراق هێرشی گەورەو بەرب لاوەی بۆ پشتی شێنێ و سەر چیای مەمەندە هێنا، هێزەکانی یەکێتیی بەقیادەی مولازم عومەرو مەلابەختیار بەرەنگاریان بوونەوە و لەشەڕێکی قارەمانانەو خوێناویدا، سوپای عێراقیان شکاند، ئەم سەرکەوتنە بەخوێنی شەهیدان مستەفای سەعەی زۆراب پێنجوێنی و فایق گەلالی و(٥) پێنج پێشمەرگەی تر تۆمار کرا. هەر لەم کاتەدا هێزێکی دووسەد ٢٠٠ کەسی کۆمەڵە بەفەرماندەی مینەی حوسامی لەلای مەمکاوێ و داوداوێوە پشتی ئەو هێزەی پارتیان گرتبوو کەئەیانویست بێنە سەر یەکێتیی، هەڕەشەشیان لێ کردن، پارتی دوای ئەمەو شەڕەکەی یەکێتیی و عێراق، هێزەکانی خۆی پاشەکشە پێکردەوە بۆ دیوی ئێران و ناوچەکەی بێ شەڕ چۆڵ کرد.

بارودۆخەکە ئارام بوەوە، لێکۆڵینەوە لەگەڵ هەڤالانی هەردوو لای هەرێمی یەک دەست پێکرا، ئەنجامی وابوو چەند فەرماندە و بەرپرسکی لاکەی لای ئێمە ماوەیەک وەک سزکراو لەسەرکردایەتی بمێننەوە، لەوانە مەحمودی حاجی فەرج و غەفور دەرەشیشی، لەلاکەی تریش فەرماندەی هەرێم نابێت بێتەوە بۆسنوری هەرێم، تا مامجەلال لە دەرەوە دەگەڕێتەوە، ئەگەر داش بەزێتە خوارەوە نابیت لە ١٠ دە کەس زیاتری لەگەڵ بێت و فەرماندەی هەرێمیش نابێت. کاک ڕەئوفی خەلیفە سەعیدش جێگری هەرێم لەسەرکردایەتی بمێنێتەوە. کاکە عەمە ئەمەی قبوڵ نەکرد.

هێزەکەی بەری هەورامان بەقیادەی مەلایاسین کە کادیری کۆمەڵەیە گەڕاینەوە بۆ هەورامان. دوای ئێمە، زانیمان کاکە حەمەش بەهێزەکەی

خۆیەوە گەڕاوەتەوە، کاک ڕەئوف خەلیفە سەعید چۆتە ئەوبەر بۆ گۆڕە شێر بووە بە بزووتنەوە، یـەکـێ ێـتـی بەیانێکی ب لاوەکرادەوە کە چیتر حەمەی حاجی مەحمود فەرماندەی هەرێم نییە و بۆی نییە بەو ناوەوە کاربکات لە ڕادیۆش ب لاوە کرایەوە، کە کێشەکە لەقەبارەی خۆی دەرکرا، کاکە حەمە و چەندین فەرماندەو دەیان پێشمەرگە پەیوەندییان بە سۆشیالیستەوە کرد و چوونە چیای سوورێن.

ئێمە یەک ڕۆژبوو گەیشتبووینەوە ئاوایی شۆشمێ لەسەر سنوور لەناوچەی هەورامان، بانگ کراینەوە بۆ ناو زەنگ بۆجاری دووەم. لە ئامادە نەبوونی مام جەلال و لە کرچ و کاڵی و هەرزەیی ئێمە، لە بێمنەتی چەند ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی و هەڵەشەیی ناوەندی کۆمەڵە. لە خۆ بەزلزانی و حساب نەکردنی کاکە حەمە بۆ سەرووی خۆی، وە بەرگریکردنی لە چەند کەسێکی بێنەزم، هەرێمی یەک تووشی ئینشقاق و دواتر شەڕی کاکە حەمەو بزووتنەوە لەگەڵ یەکێتیی بەشێوەیەکی خوێناوی ڕوویدا. ئێمە هەندێک کادر ئەمان زانی کاکەحەمە ئەو سزادانە قبوڵ ناکات، کاتێک لەناوزەنگ بووین، بەجیا چووینە لای کاک نەوشیروان مستەفا، هەندێک پێشنیارمان بۆ کرد و بەڕاشکاوی پێمان ووت کاکەحەمە ئەمە قبووڵ ناکا و سزاکەش قورسە، لەوەڵامدا پێی ووتین ئێمە لە بادیناندا ماوەیەکی زۆر کەسمان نییە، چی ڕووی داوە، هەورامانیشمان ناوێت هەمووتان بڕۆن دوایی خۆمان پێشمەرگە ئەنێرین بۆ هەورامان و هێز دروست ئەکەینەوە. ئێمەش بێ ئەنجام هەستاین و هاتینە دەرەوە.

من و نیازی و مام هادی لەگەڵ هێزەکەدا مەلایاسینی حەسەن موانی کرابووە بەر پرسی، بۆجاری دووەم لە شارەزوور و شاربازێڕەوە نەگەڕاینەوە بۆ ناو زەنگ، ڕێگەی ترمان دۆزیەوە، ئاخر لەهەرامانەوە ڕۆیشتن بۆ ناوزەنگ، لەناوزەنگەوە گەڕانەوە بۆ هەورامان و پشتی هەڵەبجە بەگەیشتنە پێشەوە، دووبارە داوای گەڕانەوەت بکەن بۆ ناوزەنگ، ئەگەر هێزێکی گوێڕایەڵ و پەروەردەی ڕێک و پێکی وەک کۆمەڵە نەبوایە، کێ گوێی بۆ ئەو بڕیارە ئەگرت. ئێمە بەمەلایاسینمان ووت خۆت لەگەڵ هێزەکەدا بگەڕێرەوە، چونکە کراویت بە مەسئولی یەکەم و ناکرێ دوابکەوی، ئێمە بۆ خۆمان دێینەوە. ئێستا ماندوو و هیلاکین و چەند ڕۆژێک دوا ئەکەوین. ئێمە

ڕێگای دیکەمان هەبوو بۆ گەڕانەوە و نەئەکرا لەو ڕێگەوە بەهێزەوە بگەڕێینەوە. مەلایاسین هەندێک هەوڵیدا نەگەڕێتەوە بەلام سەری نەگرت، بۆیە لەگەڵ گەیشتنەوەی بۆ ناوزەنگ بەرپرسیاریەتەکەی لێ سەندرایەوە. حەمە هاواریش جارجار بە تەعەلیقەوە ئەیووت سەردەمی مەسئولەیەتەکەی مەلایاسین کورت بوو.

دوای دوو ڕۆژ پشوودان ئێمە چووینە نەوسوود، لەگەڵ فەرماندەی هێزی شاهۆی حیزبی دیموکرات قسەمان کرد، ووتمان: ئەمانەوێت لەڕێی ئێرانەوە بگەڕێینەوە بۆ سەردەشت، نووسراومان پێ بێت و کەس ڕێگریمان نەکات. ووتیان ئەوە کاک کەمالی دەباغی ئەگەڕێتەوە بۆ میراوێ لەگەڵ ئەودا بڕۆن.

لە نەوسوودەوە کەوتینەڕێ لەگەڵ کەمالی دەباغی، کاک کەمال ئەندامی سەرکردایەتی دیموکرات بوو، لە نەوسوودەوە بەماشین چووینە ئاوایی دزلی لە ناوچەی مەریوان. لەوێوە بەتراکتۆر و بە پێ گەیشتینە ئاوایی ساوجی. لە ساوجی چەند چەکدارێکی جاشی عێراق لە جەماعەتی عەلی مەریوانی بوونە شارەزا بۆ پەڕاندنەوەمان لە ناوچەی شلێرەوە بۆ دەوروبەری شاری بانە. بە ڕۆژ چووینە مەخفەری گوخلان، سەربازەکانی عێراق ئاو چاییان بۆ هێناین بەسەر پێوە خواردمان. تاریکی کرد بەناو دارستان و بێشەیەکدا کەوتینەڕێ. لەوێ شارەزاکە جەماعەتی عەلی مەریوانی بوو، ووتی ماوەیەک لەمەوبەر لێرەوە جەماعەتی یەکێتیی تێپەڕبوون لێیان داوین سێ کەسمان شەهید بووە، بەقەولی سلێمانی بڕێک فشەی کرد، ئەیووت ئێمەش زۆرمان لەوان کوشتوون. ئێمە خۆمان لەو شەڕەدا بوو بووین لەگەڵ نیازی، ئەو کابرا باسی ئەو کاتەی ئەکرد لە ناوچەی مەریوانەوە ئەو هێزەی لە کاکە حەمە جیابووینەوە ڕاست لەو ڕێگەوە چووبوین بۆ ناوچەی سەیران بەند، لەو شوێنەدا تووشی تەقە و لێکدان بوو بووین لەگەڵ ئەم جەماعەتەدا ڕاستی ئەکرد بەلام ئێمە کەسمان شەهید نەبووبوو، پێشتر باسم کردووە.

بۆ بەیانی ڕۆژی سێیەم کە لە نەوسوودەوە دەرچوو بووین ماوەیەک بەپێو ماوەماوە بەتراکتۆرو سواری ماشێن، بەلارێ و جاجاریش بەپەناو کەوانەی ئاوایەکان و ناوەناوەش بەڕێگای خۆ لاوەی ناو دارستانەکانی داربەڕو دارمازووەکاندا، هەندێک جارلابەلاو پەڕینەوە لەم دۆڵ

بۆ ئەویال، جارجاریش سەرەوژوور و سەرەوخوار، بەسەرو چاوی تۆزاوی و جلوبەرگی خۆ لاوەیەوە گەیشتینە ئاوایی بۆینی لای بانە خەڵک زوو هاتن و لەلای مزگەوتدا جەم بوون بۆ نیوەڕۆ هەرکەس و چەند پێشمەرگەیەکی بردەوە بۆماڵ بۆ پشوودان و نانخواردن، ئای لەدڵسۆزی و میوان نەوازی خەڵکو جووتیارەکانی ئاوایی نشین بەدڵوبەگیان هەرچیان هەیە لەخزمەت پێشمەرگەدایە، ئەوان ئامادەن سەروماڵ فیدای کوردو کوردستان بکەن، لەبەرامبەردا داوایان لەئێمەی پێشمەرگە تەنیا ئەوەیە، برابین، تەبابین، یەکتر نەکوژین. لەوێوە چووینە شارۆچکەی ئارمردە بەرامبەر بەکێوی ئاربەبا، لەوێ دەرچووین شەو لە ئاواییێکی ئەوسنوورەدا ماینەوە پێم وابێ تاژەبان بوو. لەوێ عوسمانی ئیسراری و هاشمی کەریمیمان بینی و شەو پێکەوە بووین کاک کەمالی دەباغی ئێمەی پێناساندن، ئەمشەو گفتوگۆو قسەوباس گەرمو خۆش بوو، سەبارەت بەخەبات و کوردایەتی راو بۆچوونی لێک نزیکمان هەیە، ڕەخنەو گلەیی برایانەش لەسەر دۆستایەتی و پەیوەندیە کوردستانییەکان هەیە لەیەکتر.

ڕۆژی دواتر بە ئاواییەکانی ساڵۆک و جادەی نێوان بانە - سەردەشت دا گەیشتینە ئاوایی میراوێی لای سەردەشت، لەوێ خواحافیزیمان لە کاک کەمالی دەباغی کرد و بە دۆڵێکی قووڵ و لێرەواری چڕدا شۆڕبووینەوە، سەرلەئێوارە گەیشتینە ئاوایی مەزراو لەوێوە چووینەوە بۆ تووژەڵە، چەند ڕۆژ پشووماندا ئینجا هێزەکەی خۆمان لەگەڵ مەلاپاسیندا هاتوو یەکمان گرتەوە.

پاش ماوەیەک دووبارە لەگەڵ مەلا بەختیار و هێزەکەی هەرێمی یەک و هێزێکی تردا بەرەو شارباژێڕ کەوتینەوە ڕێ، لە ٢٥/ ١١/ ١٩٨٠ دا گەیشتینە دەوروبەری پارەزان و ڕەزڵە. مەلابەختیار دەستی کرد بە نامە نووسین و هەواڵ ناردن بۆ ئەو مەفرەزەو پێشمەرگە متەفەڕیقەو دابڕاوانەی لەناوچەکەدا مابوونەوە، لەگەڵ ئەوانەی هێزەکەی لای کاکە حەمە، ئەیویست هەرێمەکە ڕێک بخاتەوە هەوڵی ئەدا کەمترین کادرو فەرماندە و پێشمەرگە بە گوێی کاکەحەمە بکەن و بڕۆن لەتەکیا، چەندین کۆبوونەوەشی کرد بەهێزەکەی لای ئێمە. بەڵام بارودۆخەکە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ئاڵۆز دەبوو ئەنجامەکەی شەڕو کوشتاری لێکەوتەوە و کاک نەوشیروان مستەفاش بەدیلی کەوتە دەست کاکەحەمە و سۆشیالیست.

# ئەیکەین بەو ڕۆژە قەرەمەی تیا کوژرا

دوای ئەوەی لە مانگی ١١/ ١٩٨٠ کاکە حەمەی حاجی مەحمود لە سەرکردایەتی گوێی نەدا بەبڕیاری ئەو لیژنەی لەسەر کێشەی هەرێمەکە گیرابوو، ناوزەنگی بەجێهێشت و هاتەخوارەوە، لەوێوە هەندێک پێشمەرگەی لەگەڵ هات و لە خواریشەوە نزیک٧٠ حەفتا پێشمەرگەی لەگەڵ ڕۆیشت و بوونە هێزێکی نزیکەی ٩٠ نەوەد پێشمەرگە و چوونە شارەزوورو بناری سورێن، دەستی کرد بە جەولە کردن هەرلەم کاتەشدا کاک ڕەئوفی خەلیفە سەعید جێگری هەرێم لە سەرکردایەتی مابوویەوە، ئەویش پەڕییەوە بۆ گورەشێرو چووە لای سۆشیالیست، سۆشیالیست ئەمەیان بە هەل زانی، مادام کێشە هەیە لەناو هێزەکەی یەکێتدا لەم سنوورەدا، ئەوان ئەیانەوێت کەلکی لێ وەرگرن، چونکە تا ئەوکات، ئەوان لەشارەزوور وەک سۆشیالیست بە ئاشکرا کەسیان نییەو نەیان توانیوە مەفرەزەیەکیش دروست بکەن.

سۆشیالست هێزێکیان نزیکەی ٨٠-٩٠ کەس ئەبوو لە سەرکردایەتیانەوە هاتە خوارەوە بۆ شارباژێرو شارەزوور،

لێپرسراوەکانیان شەهید ملازم تاهری عەلی والی و کاک قادر جەباری بوون، هێزەکەیان پێک هاتبوو لەدوو هەرێمی سۆشیالیست، هەرێمی٣ شێخ مەنسور سەرپەرشتی ئەکرد و هەرێمی ٤ قادرچاوشین فەرماندەی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بێ گوێدانە ئەوەی کە ئەم وەزعە پێوستی بەوە هەیە موراعاتی یەکتر بکەین کاک ڕەوئوفی خەلیفە سەعیدیشیان لەگەڵ خۆیان هێنابووە خوارەوە.

برادەرەکانی ئێمەش داوای ئەو چەک و پێشمەرگانەیان ئەکرد کەڕیشتوون بگەڕێنەوە بۆ لای ئەم هێزەی لەگەڵ ئێمەیە، کاک مەلا بەختیار بۆتە ئامر هەرێمی، لە ڕادیۆشەوە بەیانیک لەسەر کاکە حەمە دەرکراوە، زوو زوو ئەخوێندرایەوە، واتە بارودۆخ زۆر سازبوو بۆ دروست بونی شەڕێکی گەورە، تەنیا شقارتەکە مابوو یەکێک دایگرسێنێ.

هێزەکەی ئێمە لە شارباژێڕو سنوری دۆڵی گلاڵ و بناری بەرکێودا کۆ ئەکرایەوە و ئەسووڕایەوە. ئەو مەفرەزەو کەرتانەی ب لاوەیان کردبوو لەدەشتی شارەزووردا ئاگادار کرابوون وردە وردە بێنە سەرەوە بۆ شارباژێڕ.

ئەوهێزەی سۆشیالیست لەگەڵ ملازم تاهر هاتبوونە خوارەوە، شارباژێڕیان بەجێ هێشتوو لە دەوروبەری نیوەی مانگی ١٩٨٠/١٢ دا چوونە بناری سوورێن، بۆ بینینی کاکە حەمە تا داوای لێبکەن ببێتە سۆشیالیست چونکە تا ئەوکاتە کاکەحەمە بە فەرمی نەبوو بووە سۆشیالیست. لەڕاستیدا لەشارەزوور سۆشیالست چوونە لای کاک حەمە، نەک حەمە بچێتە ناو سۆشیالیست. مەلابەختیار ئەڵێت حەمە بەرلەوەی لەناوزەنگ بگەڕێتەوە بۆ شارەزوور چووبوە ئەوبەر بۆ بێدەلان و گوڕەشێر بووبوە سۆشیالیست .

دیارە کاکەحەمە لەلایەک یەکێتیی بڕیاری لێپرسینەوەی داوە ئەویش قبووڵی ناکات، زوو زووش لەڕادیۆی گەلی کوردستانەوە بەیانەکەی لەسەری دەرچووە ئەخوێنرێتەوە، لەبەیانەکەدا هاتووە چیتر حەمەی حاجی مەحمود فەرماندەی هەرێمی یەک نییە. کاک ڕەئوفیش بووە بەسۆشیالیست و کاریگەری هەیە لەسەرکاکە حەمە، ئەم هێزەش کۆ ئەکرێتەوە و مەلا بەختیار هاتووە بۆ سەرپەرشتی کردنی، ئەمەش لای کاکە حەمە هۆکارێکی تری زیاتر ئاڵۆز بوونی ڕەوشەکەیە، بۆیە ئەویش بڕیاری داو بووە سۆشیالیست، بەڵام لە دڵەوە کەس لەسۆشیالیستدا بە مەسئوولی خۆی نازانێ. لەدوای چەند ڕۆژێک هێزەکەی ملازم تاهیرو کاکەحەمە پێکەوە گەڕانەوە بۆ شارباژێڕ، کە بەهەردوو لا نزیکەی ١٨٠ سەدو هەشتا پێشمەرگە ئەبوون، ئیتر ئەمەیان بەئاشکرا بۆ عەرزی عەزەلات بوو، بەرەتایان گەیشتە ڕەزڵە، مەفرەزەیەکیان هاتە ئاوایی پەرخ و شەوی ٣-٤/ ١/ ١٩٨١ ئەو مەفرەزە لەلایەن یەکیەتیەوە چەک کرا، بارودۆخ بەرەوگوژی وچەک کردن و تەقوو تۆق ڕۆیشت. بۆ ڕۆژی ٤/ ١/ ١٩٨١مەفرەزەیەکی یەکێتیی لەدۆڵی گەلاڵ کەووتنە ناو هێزەکەی سۆشیالیست و چەند کەسێکیان چەک کران و پێشمەرگەیەک بە بریندارى گیرا ئەویش هاوڕێ کامەران بوو، ئێمەش بەرەو ڕەزڵەو پەرخ و بیوەک و بەرزایەکانی ناوچەکە هاتین.

لەڕۆژی ٥/ ١٩٨١/١ ئاگادار کراین کە کاک نەوشیروان مستەفا سکرتێری کۆمەڵە لەقەویلە لەلایەن هێزەکەی سۆشیالیستەوە گیراوە، سەرەتا

ئێمە باوەڕمان نەکرد، چونکە نە کاک نەوشیروانمان بینی بوو نەئەمان زانی هاتوەتە ناوچەکە، ئیتر نازانم مەلا بەختیار ئاگادار بووە لەهاتنی یاننا. تائێستاش بۆ من ساغ نەبوەوە کاک نەوشیروان بۆ لەگەڵ حەمەی حاجی سابیرو دوو پێشمەرگە، لەم بارودۆخە گرژەدا چەندین کیلۆمەتر ئەچێتە پێشەوەی ئەو ناوچەی کەهێزی یەکێتیی تێدا باڵادەستە؟ یان ئەچێتە ئەو شوێنەی هێزەکەی سۆشیالیست جەولەی تێدا ئەکات؟ بۆیە لە ٢٠٠١ دا بۆ ئەو بابەتانەی کە لە ڕۆژمێری پێشمەرگەیەک دا هاتوون من ئاگادار بووم لێیان یان پەیوەندییان بەمنەوە هەبوو لەڕۆژنامەی هەواڵ ژمارە ٢ ساڵی یەکەم – ١٦ ی تەمووز و لە ژمارە ٣ ساڵی یەکەم ١ی ئابی ٢٠٠١ دا ڕوون کردنەوەم دابوو، لەو بابەتەدا ئەگەر زۆر شتی کاکە حەمەش وایە کە نووسیویەتی، بەڵام چەند شتێک ڕاستییەکانیشی کردۆتە جێی گومان، لەوانە لە سەر چۆنییەتی گرتنی کاک نەوشیروان لە لاپەڕەی ٤٠٠ ی بەرگی یەکەمدا دەنووسێت.

(ڕۆژی ٤/ ١/ ١٩٨١ کاک نەوشیروان لە ئاوایی قەویلەی لای قەڵی سرۆچک لە دیوی شارباژێڕەوە لە کایانێک دا دوای دابڕینی لە هێزەکەی لەشەڕی ٣/ ١/ ١٩٨١ لە ماڵی حاجی علی قەویلەیی گیرا لە لایەن پێشمەرگەی سۆشیالیست و لەگەڵ حەمەی حاجی سابیر و دووپێشمەرگە)، یان دەنووسێ: (هەموو پێشمەرگەی کەرکوک و سلێمانی بەری مەرگە و دۆڵی جافایەتی هاتبوون بۆ ئەو شەڕە لەگەڵ هەموو سەرکرایەتیشیان).مەبەست سەرکردایەتی یەکێتیە.

ئەوەندەی من بزانم کاک نەوشیروان بە نهێنی هاتبووە خوارەوە، ئێمەو هێزەکانی تری سنوورەکەش بێئاگابووین لە هاتنەکەی، مەلا بەختیاریش دوای چوونی بۆ قەویلە زانی بووی، ئەو وای بە ئێمە ووت. گوایا ڕۆشتنەکەش بۆ ئەوە بووە دایکی بێت و لەوێ چاوی پێی بکەوێت بۆ مەسئەلەیەکی تایبەت وشەخسی خۆی، ئەگینا جێگەی بڕوا نییە جێگری سکرتێری گشتی و سکرتێری کۆمەڵە، مەسئولی هێزەکانی یەکێتیی بێت هاتبێ بۆ سەرپەرشتی شەڕ، بەڵام هێزەکانی یەکێتیی لە حاجی مامەند و پاڕەزەن و ڕەزڵەدابن، ئەو بێت وبچێت بۆ قەویلە زۆر لە پێشەوەی هێزەکانی خۆیەوە

لەگەڵ سێ پێشمەرگەدا ئیختیفا بکات، هێزەکانی سۆشیالیستیش لەو دەورو بەرەدابن؟

ئەگەر وابێت، واتە بۆ سەرپەرشتی کردنی هێزە و شەڕکردن بهاتایە؟ نەشی ویستایە ئاشکرا بێت، خۆ دەبوو لە پشتی هێزەکانی خۆیەوە لە دەور و بەری دۆڵ پەموو خۆی بشاریتەوە، یان حیکمەتی خۆشاردنەوەکەی لە چی دایە ئەگەر بۆ سەرپەرشتی هێزەکان و شەڕکردن هاتبێت؟ ئەگەر هێزێک بیەوێت شەڕ بکات، بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی بترسێنێ و هێزەکانی بێورە بکات، ئەوە دەبێت بە ئاشکرا گەورەترین و باشترین مەسئول سەرپەرشتی ئەو هێزە بکات.

بەڵێ کاک نەوشیروان لەڕۆژی ١/٤ گیراو شەو لەگەڵ هێزێک بردیانە ئاوایی هۆزخواجە، خۆیشی لە قەویلە بەرلەوەی بگیرێت نامەیەکی بۆ ملازم تاهر نووسی بوو، پێم وابێ زیاتر ئەو نامە ئاشکرای کرد. من بیستم ژنێک لای جەماعەتی سۆشیالیست وتبێتی مەسئولێکی گەورەی یەکێتیی لەم ناوەیە، پرسیویانە چۆن ئەزانی مەسئولی گەورەیە؟ وتبووی حەمەی حاجی سابیر خۆی مەسئولە، بەڵام پێشی ئەو کەسەیتر ناکەوێ لەکاتی بەڕێگا ڕۆیشتندا.

دوای ئەوە لە ڕۆژی ١٩٨١/١/٥ دا ئەحمەد شاتوانی و مەحمود گەرمیانی دوو فەرماندەی کەرتی هەرێمی یەک بوون، لەدەشتەوە سەرکەوتبونەوە لە دارو گۆڕسانەکەی قەویلەدا کەوتنە کەمینی سۆشیالیست، چەن کەسیان چەک کراو پێشمەرگەیەک بووە قوربانی. هێزەکەی سۆشیالیست لەدوای ئەمە ئیتر شێرە بوون، کاک نەوشیروانیش دیلە لایان، ئەمە زیاتر زاڵی کردن، ئێمەش برێک کەوتینە پاشەکشەو وتوویژ.

مەلا بەختیار کەهاتوەتە خوارەوە کێشەی زۆری ڕوبەڕوو بۆتەوە لە تەقەلای چارەسەر کردنیاندایە، کاک نەوشیروانیش گیرا و کێشەکان زیاترو ئاڵۆزتر بوون، تازە ئەبێ زیرانە هەنگاو بنێین و جوڵە بکەین، بۆیە ئێمەش هەوڵماندا هێز زیاتر کۆبکەینەوە. لە قەرەداغەوە مام ڕۆستەم و ئەوان گەیشتن، کاک مەلا بەختیار لە کۆبونەوەیەکدا لە ڕەزڵە ئامۆژگاری و ڕێنوێنی هێزەکان و پێشمەرگەو فەرماندەکانیان ئەکات، هۆکاری سەر هەڵدانی کێشەکان روون ئەکاتەوە، مەبەستەکەشی ئەوەیە هەتابتوانین هەوڵ بدەین

بەئاشتی کێشەکان چارەسەر بکەین و شەڕ نەقەومێ، حەمە هاواری پرسی ئەی ئەگەر قەوما؟ مەلاش ووتی ئەیکەین بەو ڕۆژە قەرەی تیا کوژرا. حەمە هاواریش[1] ووتی: بۆ نالێیت ئەیکەین بەو ڕۆژە نەوشیروانی تیا کوژرا؟

ئەو ڕۆژە ئێمە لەڕەزڵە بووین، هێزەکەی ئەوانیش هاتبووە دۆڵە چەوتەی کانی برایمە، سامان نامەیەکی برد بۆکاک نەوشیروان و ئەویشیان گرت و نەگەڕایەوە، دوای چەند ڕۆژێک هێزەکەی سۆشیالیست هەمووی پەڕییەوە بۆ سوورێن وناوچەکەیان جێهێشت، هەشت دیل و کاک نەوشیروانیشیان لەگەڵ خۆیان برد، دواتر چەندین کەس ولایەن کەوتنە هاتوچۆی سوورێن و گفتوگۆیان بوو لەگەڵ سۆشیالیست و حەمەی حاجی مەحمود بۆ بەردانی کاک نەوشیروان، بەڵام دواجار جەمال ئاغای حەکیم ئاغا و قادری ڕەشە ناسکە و عەلی کلاشینکۆف لەگەڵ سۆشیالیست ڕێک کەوتبوون یەکێتیی ٣٥سی وپێنج کلاشینکۆف بدات بەحسک و کاک نەوشیروان بەیانی ئازاد بکرێت

حیزبی شیوعی بەمیوانی ئەوشەوە کاک نەوشیروان مستەفا ئەبەنە لای خۆیان و لەوێوە شەو لەگەڵ دوو پێشمەرگەی شێخ کاوە ڕایکردبوو، ئەو بەرپرسەی حیزبی شیوعی لەوبارەگادا تۆفیقی حاجی و عەبدوڵلای مامە بوون، ئێوارەکەی تەوفیق دائەبەزێ بۆ شارەزوورو عەبدوڵلا لەبارەگاکەدا ئەمێنێتەوە، دواتر ئەو دووفەرماندەی حیزبی شیوعی هاتنە ناو یەکێتیی وکاک تەوفیق شەهیدبوو.

یەکێتیی کە لەشارەزوورو هەڵەبجەو هەورامان تاکە هێزو تاکە لایەن بوو، تا سالی ١٩٨٠، بەهۆی بێتەجروبەیی و هەرزەی چەند کادرێک لە هەرێمەکەدا و ئەو بریارە هەڵانەی بەناوی کۆمەڵەوە دران، بەشێکیش لە سەرکردایتی نەیانزانی چۆن ڕووبەڕوو ببنەوە لەگەڵ کێشەکانداو چارەسەریان بکەن، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی فەرماندە و جێگری هەرێم و نزیکەی ٨٠ تا ٩٠ پێشمەرگە، لە ناویاندا دەیان فەرماندەو جێگر کەرت و

---

[1] -حەمە هاواری سالی ١٩٧٦ بۆتە پێشمەرگە، باوکی خەڵکی شارەدێی نەوسوود بووە لە خۆرهەڵاتی کوردستان، دایکی خەڵکی هاوار و کاکەییە. پێشمەرگەیەکی قسە خۆش و ماندووی شۆڕشی نوێیە

فەرماندە مەفرەزەی ئازاو لەخۆ بوردوو، یەکێتیی بەجێ بهێڵن و ببنە سۆشیالیست. سۆشیالیستیش بهێننە ناوچەکەو ڕێگەش بۆ پارتی خۆش بکەن ساڵانی دواتر بە هێزی هاوبەشەوە بۆماوەیەک ڕێگە بەیەکێتیی نەدەن بگەڕێتەوە شارەزوورو چالاکی خۆی بکات، ناوە ناوەش پەلاماری شارباژێڕ بدەن بۆ دەرکردنی هێزەکانی یەکێتیی لەوێش. ئاشکرایە باس کردنی شەڕی ناوخۆو کوشت و کوشتار لەیەکتر، گێڕانەوەی باش نییەو کەسیش نییە خۆی بەسەرکەتوو بزانێت لەشەڕی ناوخۆدا. بۆیە من خۆم بەدوور گرتووە لە گێڕانەوەی ئەودیمەنە ترسناک و شانۆ مەترسیدارو بێزەوبانەی شەڕی ناوخۆ و وێناکردنیان بۆ بەرچاوی چاوی خوێنەر.

لەناوچەکەدا ئەم ماوە جارجار ئاشتی و جارجاریش شەڕ ڕووی ئەدا، تا دواترین شەڕی گەورەو مەترسیدار لە نێوان یەکێتی و بەرەی جوددا روویدا ئەویش هێرشی جود بوو بە بەشداری ٨٠٠ هەشت سەد پێشمەرگە و ١٥٠سەدو پەنجا پاسدار، لەشەوی ١٣و١٤/ ٩/ ١٩٨١ کردیان، لەئێرانەوە بەرەو سوورێن و لەوێشەوە بۆ شارباژێڕ هاتن، لەگوندەکانی دۆڵە چەوتەو ڕەزڵەو قوڵچی و دۆسەیەرەدا بەریان لێگیراو هەڵگەڕێنرانەوە بەرەو دوا، بەجۆرێک ئەم هێزە گەورەو زەبەلاح و پۆشتەو پەرداخ و خاوەن چەکە زۆرە شکاو ب لاوەەی کردو هەڵهات بەرەو سوورێن و لەوێوە بۆ ئێران کەلەباوەڕدا نەبوو، سەرکردایەتی کردنی هێزەکانی یەکێتیی لەم شەڕەدا کاکە بەکری حاجی سەفەرو چەندین فەرماندەی تری قارەمان بوون. ئیتر لەدوای ئەمەوە هەموو لایەک هەوڵی دەدا بۆ ئاشتی. ئەگەرچی دواتر تا دروست بوونی بەرەی کوردستانی چەندین جاری تر لە ناوچە جیا جیاکانی کوردستاندا لەنێوان لایەنەکاندا شەڕ و ڕووداوی ناخۆش چەند بارە بوونەوە.

هەرکەس ئەیەوێت وردەکاری ئەم شەڕانە بەتایبەت شەڕی ڕۆژی ١٥ و ١٤ / ٩ / ١٩٨١ بخوێنێتەوە با کتێبی ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەک بەرگی یەکەم لاپەڕە ٤٧٨ تا ٤٨٣ سەیربکات هەرچەندە نووسەرەکەی کاکە حەمە خۆی لاداوە لە وردەکاری تێک شکانێکی ئابڕووبەرانە، چونکە خۆی قیادەی هێرشەکەی بەرەی جوودی ئەکرد، کاکە حەمەخۆی پیاوێکی بەهیمەت و هێزەکەشی شەڕکەربوو، بەڵام لایەنەکانی تری جود ئەمانیشی وەک خۆی لێ کرد.

ئەم ماوە ئێمە ناوچەی هەورامانمان چۆڵ کردبوو، هەمووومان لە شارباژێر بووین و مەلا بەختیار سەرپەرشتی هەرێمی یەکی ئەکرد، هەر ئەوەندەبوو ئێمە سەرگەرمی شەڕی ناوخۆمان بین و دوژمنی سەرەکی پشتوێنی لێ بکاتەوە، بەردەوام ڕژێم پەلاماری ئەداین و بەرەنگاری ئەبووینەوە، یان ئێمە پەلامارمان ئەدان و لەکوێ ڕێک بکەووتایە دەستمان لە دوژمن ئەوەشاند.

لە مانگی ١٩٨١/٣ دا کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆی ڕۆژێکی باراناوی، هێزێکی پێک هاتوو لە کەرتەکانی ١-٢-٣-٤ ی بەری هەورامان، لەگەڵ کەرتەکانی بەری شارەزوور و دووەمەفرەزەی هەرێمی ٩ی بەمۆ وهەرێمی پارێزگاری بەقیادەی مەلابەختیار، لە دوولاوە بەربووینەوە بۆ سەر جادەی گشتی سلێمانی- سەیدسادق، هێزێکی کەرتەکانی شارەزوور لە قەویلەوە بەرەو ئاوایی کانی سپیکەو برینی ڕێگای سەرەکی لە نزیک ئاوایی مایندۆڵ کەوتنەڕێ، هێزێکی تری کەرتەکانی بەری هەورامان لە شێرەبەرەوە بۆ سەرجادەی گشتی لە نزیک ئاوایی گرێزە کەوتینە ڕێ، هەرچەندە سەربازگە و هێزی، زۆری ڕژێم لە نزیک ئاوایی گرێزە هەبوو، لەلای ئاوایی سەراوی سوبحان ئاغاو دەورو بەریدا بە هەمان شێوە چەندین سەربازگەو مۆلگەی سوپای لێبوو، ئێمەش بەدوای مەرگدا ئەگەڕێین و بەو ڕۆژی نیوەڕۆیە هاتوین و لەتەختای دەشتی شارەزوورو سەرجادەی قیردا خۆمان خستوەتە نێوان ئەو هێزە گەررەو زەبەلاحەی دوژمن.

دوای ئەوە هەردوو هێزەکە لەهەردوولای کەنار جادە سەرەکیەکەدا دامەزران، ئێمەش من و لەتیفی حەمەی مەلا سابیر لەگەڵ دوو مەفرەزە ئەرکی ڕاگرتنی ئەو ئۆتۆمبێلانەمان پێ سپێردرا کە لە هەرلایەکەوە بێن لایان دەینەوە بۆ ئەو دۆڵەی کەنار جادە بەلای دەستی ڕاستدا.

لە کاتژمێر چواری ئێوارە تا چوارونیو نزیکەی ١٠٠ سەد سەریارەمان ڕاگرت و ناردە ناو دۆڵەکەوە، ئینجا ئاگاداری کاک مەلابەختیار کرا کە لەو نزیکانەدا چاوەڕێ بوو بێت کۆبوونەوە بکات بەخەڵکە و قسەیان بۆ بکات. لە کاتی کۆبوونەوەکەدا لە لای سەراوی سوبحان ئاغاوە هێزێکی ڕژێم هات و لەگەڵ ئەو هێزەی کەرتەکانی شارەزوو کە هەڤاڵان ئەحمەد شاتوانی و

مەحمود گەرمیانی و جەلال کولکنی و چەند فەرماندەیەکی تر بوون شەڕ دەستی پێکرد، کاک بەختیار کۆبوونەوەکەی لەنیوەدا کۆتاییی پێ هێنا.

بۆ ئەوەی خەڵکە مەدەنییە ڕاگیراوەکە تووشی زیان نەبن، مۆڵەت دران هەموو بەرەو لای سلێمانی ڕۆیشتن، دوای ئەوە هێزێکی تری دوژمن لە لای کانی پانکە و گرێزەوە هات و لەوێش تەقەدەستی پێکرد، شەڕێکی سەخت و گەورە، لەپاڵ ئەو هەموو سەربازەکەو مۆلگانەی دوژمندا، لەتەختایی دەشتی شارەزووردا، لە نێوان هێزی پێشمەرگە و دووژمندا، بووە هۆی خۆشحاڵی خەڵک و بەرزبوونەوەی ورەی هێزی پێشمەرگە و ورەبەردانی هێزەکانی دوژمن بە تایبەت جاشە کوردەکان.

شەڕ بەردەوام بوو تا هەوا تاریکی کرد و ئینجا فەرمانی چۆڵ کردنی سەرجادە دەرکرا و هەموو بەرەو کانی سپیلکە و بەردەڕەشە گەڕاینەوە، زیانی ئێمە ئەو ئێوارە شەهیدبوونی فەرماندەی مەفرەزە هەڤاڵ سدیق حەسەن ئاوایی بوو، سدیق قارەمانێکی کەم وێنە بوو، تەرمەکەشی کەوتە دەست دوژمن. زیانی دوژمنیش کوژرانی چەندین سەربازبوو، چەند کەسێکیش لە ناو خەڵکەکەدا گل درابوونەوە و شەو لەگەڵ خۆمان بردمانن بۆ ڕۆژی دوایی ئامۆژکاری کران و بەکەفالەت ئازاد کران ئەوانیش چەند سەرۆک هۆز و پیاوی دیاری سنوری هەڵەبجە بوون تۆمەتبار کرابوون بەوەی ئەوان کارئاسانی ئەکەن بۆعەشایرەکانی ناوچەکانی جوانڕۆ، تاچەک بۆ مخابەراتی عێراق وەرگرن بۆ بەکارهێنانی دژی سوپای پاسدارانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە سنوری پاوە و باینگانی سەر بە ئوستانی کرماشان.

## پەلامار بۆ سەر بارەگای چۆڵ

پایزی ساڵی ۱۹۸۱ ئێمە لەپانتایی دەشتی شارەزووردا خەریکی جەولەو و کارو چالاکی بووین بەدژی هێزەکانی دوژمن و جاشە کوردەکان. ماوەیەک بوو بنکە و بارەگاکانمان لەسنوری هەورامان لەدێکانی گریانە، هاوارە کۆن، هاوار چۆڵ کردبوو، لە هاوار چەند سەربازێکی هەڵهاتوو (فیرار) پاسەوانی بارەگای کەرتی ۱ ی شەهید فەرەج تریفەییان لە ئەستۆ گرتبوو، فەیسەڵی مەلا عەلی کاکەشێخ یش لەلایان مابووەوە، بنکەی کەرتی۲ی شەهید ئەحمەد لە گریانە و ماڵی باوکیشم لە هاوارە کۆن بوو، حەمەسەعید عەلی باوکم و مام هادی لەگەڵ چەند سەربازێکی تری هەڵهاتوو وەک پێشمەرگەی بەرگری پاسەوانی هەردوو شوێنەکەیان ئەکرد.

بنکە و بارەگای هێزی شاهۆی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش لەئاوایی دەرتفێ بوو لەسەرسنوور، خەڵکی ئاواییەکانی هاوار، هاوارە کۆن، دەرەتفێی کاکەیی نشین، زۆربەیان دۆستی ئێمە بوون، هەم وەک بنەماڵە و هەم لەرووی کۆمەڵایەتیەوە پەیوەندی پتەوو دێرینمان هەیە، وەک بیرو بۆچوونی سیاسیش دۆست و هاوکاری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانن، لەم دەمەدا بەشێکی زۆر لە گەنجەکانیان لەناو سوپای عێراق دا هەڵهاتوون و گەڕاونەتەوە ناوچەکەو بوونەتە پێشمەرگەی بەرگری.

لەم سەرو بەندەدا کاک نادر هەورامی کە بەرپرسی هێزەکانی پارتی بوو، لە سەر سنوری دزلی-خورماڵ بنکە و بارەگایان هەبوو بە هێزێکی نزیک بە ۷۰ هەفتا پێشمەرگە و هێزێکی۸۰ هەشتا کەسی پاسدارەوە دێنە سنوری هاوار [1]، لە جێگەیەک بە ناوی چەمی سۆڵە لە نێوان ئاواییەکانی

---

[1] - سەبارەت بەم پەلامارە بۆ سەر بارەگای چۆڵ، شەوکەت لهۆنی کە ئەوکات پێشمەرگەی پارتی و بەشداربووی ئەو هاتنە بووە ئەڵێت: ئێران ئاگاداری کردین هێرش ئەکاتە سەر تەوێڵە و بەڵخە و دەوروبەری، بۆیە بڕیاردرا هێزێکی ئێمە (پارتی) لەگەڵ هێزێکی سوپای پاسداران ڕۆژێک پێش هێرشەکە بچینە چەمی سۆڵە، بۆئەوەی ئەگەر هێزەکانی عێراق شکان لەوقۆڵەوە ئێمەش لە پشتەوە هێزە شکاوەکان بخەینە داوەوە، بۆیە ۷۰ پێشمەرگەی پارتی بە فەرماندەیی کاک نادر هەورامی و قادر قادرو ۸۰ پاسدار بە

بەڵخە، تاوێرە، هاواردا خۆ حەشار ئەدەن و بەڕۆژ ناوچەکە ئەخەنە ژێر چاودێری، دیارە ئەزانن ناوچەکە چۆڵە و بنکە و بارەگاکان چەند سەربازی هەڵهاتوی (فیرار) ی لێیە.

پاش نیوەڕی هەمان ڕۆژ بەرنامە بۆ سووتاندنی بارەگاکان دائەنێن، شەو دێنە سەر هاوار، بەرلەوە سەربازە هەڵهاتووەکان پێیان ئەزانن، هەڵدێن و ئەوانیش لە دواوە ئەیاندەنە بەر دەستڕێژی گوللە. سەربازەکان دێنە هاوارە کۆن و باوکم ئاگادار ئەکەن. هێزەکەی پارتیش لە هاوار بارەگای کەرتەکە ئەسوتێنن، کەهەندێک جل و بەرگی پێشمەرگە و سەربازە هەڵهاتووەکان و قاپ و مەنجەڵ و کەل و پەلی شرەی ناو بارەگا بووە، خواردنەکەشیان نەوتاوی ئەکەن.

باوکم لەگەڵ ئاگادار بوونی سەر ئەکەوێ بۆ ئاوایی دەرەتفێ و ئاگاداری فەرماندەی هێزی شاهۆ حیزبی دیموکرات ئەکات، ئەوکات فەرماندەی هێز سەروان سابیر مهر پەروەر بوو، سەروان سابیر ئەفسەری ڕژێمی شای ئێران بوو، ساڵی ١٩٧٩ هاتبووە ریزی هێزی پێشمەرگەی حیزب، دۆستێکی نزیکی من و هاوکاریی یەکێتیی ئەکرد، زۆر کاری گرنگی ئەو سەردەمەی بۆ ئەنجام ئەداین بە دژی ڕژێمی بەعس. پیاوێکی ڕۆح سووک و خۆشەویست و ئازاو گورج و گۆڵ بوو. لە بەرامبەر ئەو کارو هەڵوێستانەی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی بە ئیمزای نەوشیروان مستەفا سوپاس نامەیەکی بۆ ناردبوو، شەهید شەوکەتی حاجی مشیریش کلاشینکۆفێکی بە دیاری بۆ ناردبوو.

---

فەرماندەیی ئاغای گورگی و ئاغای ئاگری لە خۆرنەوازانەوە کەوتینەڕێ و هاتینە چەمی سۆڵە ڕۆژەکەی لەوێ ماینەوە. ئەوەبوو لەلایەن ئێرانەوە ئاگادار کراین هێرشەکە ناکرێت، بۆیە ئێوارەی هەمان ڕۆژ کە تاریکی کرد، سەرداری حاجی حسەین و قادر بەلخەیی بەشێکی زۆری پاسدارەکانیان بردەوە بۆ سەر سنوور بۆ ملەخورد. ئێمەش کاک نادر پێی وتین: هەر هاتووین جەلالییەکان لەخوارەوەن بەشێکی کەمیان لە هاوار ماون با بچینە سەریان. ئەوە بوو شەو هاتینە سەر بنکەو بارەگای ئەو کەرتەی، کە لە هاواردا بوو بەلام چۆڵ بوو، چەند سەربازێکی هەڵهاتووی لێبوون ئەوانیش ڕایان کرد. ئەم پەراوێزە قسەی شەوکەت لهۆنین، ئەوکات لەگەڵ ئەوهێزەدا بووە

سەروان سابیر خۆئامادە ئەکات و بە دوولکی پێشمەرگەوە لە
ـمرەتقێ وە بەرەو هاوار پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ ئەکەوێتە ڕێ و دوره
ـەقەیەک دروست ئەبێ و پارتی پاشە کشێ ئەکەنەوە بۆ ئەو شوێنەی کە
ـێیەوە هاتبوون. بەم جۆرە بەرنامەکەی کاک نادر هەڵ ئەوەشێتەوە..

هەر هەمان ڕۆژ ئێمەیان لەشارەزور لەم ڕووداوە ئاگادار کرد و شەوەکەی دوو مەفرەزەمان ناردەوە، سەرکەوتنەوە بۆ دۆڵی هاوار بۆ پاسەوانی بارەگاکان ومالی باوکم، ماوەیەک لەمەوبەرتر کەئەهاتینە خوارەوە نەئەکرا بەچەند پێشمەرگەیەکی کەم پاسەوان بۆ بارەگاکان دابین بکەین، بۆیە ئەو کەلوپەلەی هەمان بوو ئەمان شاردەوە، ئەوکات ئەشیاو کەلوپەلی بارەگاو مەقەڕ چەند پەتوە شرە و کتریە ڕەش و مەنجەڵە قوپاو دۆلکە نایلۆن بوون. لەم کاتانەشدا منالەکان لەگەڵ باوکم بەتەنیا ئەمانەوە، تا ئێمە ئەگەڕاینەوە ئەوانیش لەئەشکەوتە چەپەکەکاندا خۆیان پەنا ئەدا.

دوژمن بە ئاسانی ئەیتوانی لەم کاتانەدا بێت وبیان گرێت بەڵام بۆ ئەمە ڕووینەدا؟ یەکەم/ لەبەر وریایی باوکم وجارجارەش مەهدی کە لەلایان ئەمانەوەو ئەیانپاراستن و ناوچەکەش سەخت و قایم بوو. دووەم/ خەڵک و ئەوکەسانەی هاتوچۆی ناوچەکەیان ئەکرد دۆست ونیشتمان پەروەر بوون، بەگشتی خەڵکەکە باش و کەس جاسوسی نەئەکرد بۆ ڕژێم یەکێتییان خۆش ئەویست.

لەگەڵ ئەمەشدا دووجار هەوڵ درا نارنجۆک بخەنە ناو ماڵەکە، هەردوو جارەکە سەری نەگرت، بەم شێوە: یەکەم جار ساڵی ١٩٧٩ بوو، ماڵەکەمان لەئاوایی شۆشمێی خواروو بوو لەکوردستانی ڕۆژهەڵات، کەسێک کوژرا بوو بەدەستی پێشمەرگە، ناوی محەمەد ڕەشید بوو، ماڵە خزمی هەبوون لەئاوایی کێمنە، لەکوردستانی ڕۆژهەڵات، بنکەی قیادەی موەقەتیش لەو ئاواییەدا بوو، بەرپرسێکی ئەوکاتەی قیادە نارنجۆکێکی دابوو بە کوڕێکی پورزای کوژراوەکە بێت بۆ شۆشمێی سەروو بەهۆی خزمەکانی تریان لەئاوایی ناوبراودا ئەگەر توانی مام هادی حەمەیوسف کە ئەوکات کادر بوو بکوژێت، ئەگەر نەیتوانی بیخاتە ناو ماڵومناڵەکەی ماڵی ئێمە، ئەمەش زۆر ئاسان بوو بۆ ئەو کەسە کە ئەم کارە ئەنجام بدات، بەڵام نەیکرد لەبەر ئەوە

خزمەکانی لە شۆشمێ دۆستی ئێمە بوون، نارنجۆکەکەیان لێ سەندبوو خۆیشیان دەرکردبوو، مام هادیشیان لێ ئاگادار کردبوو.

دووەم جار ساڵی١٩٨٢ بوو، من لەبارەگای گریانە بووم،ماڵی باوکم لە هاوارە کۆن بوون، پاش نیوەڕۆیەک کەسێکی ئێرانی سەر بەحیزبی دیموکرات هات بۆ لام ووتی باوکت ناردوومی بەدواتدا، پرسیم بۆ؟ ووتی نازانم، ووتم برۆ من خۆم دێم بۆلایان، لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگە کەوتینە ڕێ بۆ ئاوایی هاوارە کۆن، لەخوار ئاوایی عەلی مام باسامان بینی دوای چاکوچۆنی ووتی لەماڵی باوکت بووم، ووتم نازانی بۆچی باوکم ناردوویەتی بەدوامدا؟ عەلی پیاوێکی کاکەیی قسە خۆشە، ووتی با، ووتم بۆچی؟ بەپێکەنینەوە بە هەورامیانە ووتی زارولی ئامان تەقنوشاوە واتە منالێک هاتوە بیان تەقێنێتەوە. پێمان هەڵگرتوو گەیشتینە ماڵەوە، کەپرێکیان هەیە لەسەرەوە، بندارگوێزەکانیش لەخوارەوە مەنزڵ و جێگەی دانیشتنی ڕۆژە، ئەدیبەی خوشکم لەناو کەپرەکەدا نانی ئەکرد سەرەتا چووینە لای ئەو، پرسیم چییە چی ڕوویداوە؟ ووتی هیچ نییە، ووتم باوکم بۆ ناردوویەتی بە دوامدا؟ ووتی ئەوان لەخوارەوەن، منالێک لێرەیە دوو ڕۆژە هاتووە ئەڵێت هاتووم بۆ پێشمەرگایەتی، یەکەم ڕۆژ هات پرسی ئەمە ماڵی کاکە حەمەسەعیدە وتمان بەڵێ، هەواڵی تۆی پرسیوە ووتومانە لێرە نییە، دوو ڕۆژە ئیش ئەکات لەگەڵ باوکم و دێت و دەڕوات، لەو کاتەدا هاتە سەرەوە لەگەڵ باوکمدا، بینیم مێرمنداڵە چووینە لاوە هەندێک قسەی لەگەڵ کردوم، ووتی من چوم بۆ لای پارتی، وەریان نەگرتم نادر هەورامی ناردومی لێرە ببم بەپێشمەرگەو فرسەتم بۆ رێککەوت رومانەیەک بخەمە ناو ماڵتان و برۆمەوە.

ئێمەش لەبەر ئەوە راستی وتووە سزایی نادەین، لەبەر ئەوە جێگەی متمانە نییەو منداڵیشە ناشکرێ بیکەینە پێشمەرگە، باشترە کەس نەزانێ بینێرینەوە. پیمان ووت برۆرەوە، ووتی برۆمەوە ئەمگرن، ووتم مەڕۆرەوە بۆ لای پارتی بۆرەوە بۆ شار بۆ لای دایک و باوکت تۆ ناتوانی پێشمەرگاتەتی بکەیت، ئەی رومانەکەت کوا، واڵەو سەرەوە لەبن دارگوێزێکدا شاردومەتەوە، باشە ناردم لەگەڵ پێشمەرگەیەدا هێنایان. دوای ئەوە قسەمان بۆکرد، ووتمان

برۆرمەوە، لەناوشاردا ئیشمان بۆبکە. هەر ئەو ڕۆژە دامانە دەست ڕەوف ئیناخی ولاخ دار بوو ڕەوانەی کردەوە.

چەندین جار لەلایەن ڕژێم و هەتا لەناو بەرەی جودیشدا پارتی هەولی ئەوەیان ئـەد ا لەناوچەکەدا ئەم ماڵە هەرچەندە ماڵەو ژن ومنداڵیشی تێدایە لێبدەن و نەیهێڵن، چونکە بووبووە مەکۆیەک بۆ زۆر شت، جگە لەوەی ئێمە خۆمان چوار کەس لەم ماڵەدا پێشمەرگە بووین ژن و کچ و کوڕە منداڵەکانیش هەر خزمەتیان ئەکرد. زۆربەی کات کەپێشمەرگەکانی کەرتەکانی سنووری هەڵەبجە، سنوورەکەیان چۆڵ ئەکردو ناوچەکەمان بەجێ ئەهێشت، بەنییەتی جەولە کردن، ئەچووین بۆ دەشتی شارەزوور و قەرەداغ وشارباژێر، یان بۆسەرکردایەتی وناوچەکانی تری کوردستان، ماڵەکەمان ئەو کاتانەی کە بەنیمچە نهێنی یان ئاشکرا لەناوچەکەدا ئەبوە بنکەی سەرەکی بۆ ئیش و کارەکانی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان. ئـةو بـنـكـةش كـة ضةنـد كـةسي تـي ىَكـى ىَدا نـةبـوو لـةنـزيـك مـال ىَةكـةشة ئەوانەی ئەهاتن بۆ پێشمەرگایەتی لەوێ ئەمانەوە تا پێشمەرگە ئەگەڕانەوە، نەخۆش وبریندارەکان یان لەماڵەکەدا یان لەشوێنێکی نزیک لە ماڵەکەدا ئەشاردرانەوەو خزمەتیان ئەکرا، ئەوەی عاجز ئەبوو تا ئاشت ئەکرایەوە لەوێ ئەبوو، ئەوەی کەس وکاری لەشارەوە ئەهات بۆلای چەند ڕۆژ ئەمانەوە هەر لەماڵەکەدا ئەبوون، ئەوانەی لەسەر پیاو خراپی یان لەشەڕەکاندا ئەگیران کەسوکاریان ئەهات بۆلایان لەناوچەکانی ژێر دەستەلاتی ڕژێمەوە، بەرلەوەی بچنە بارەگاکان ئەهاتنە ماڵەوە، ئەو بەرپرس و بریندارو نەخۆشانەی لەگەڵ خێزانەکانیان لەناوچەکانی تری کوردستانەوە سەفەری دەرەوەیان ئەکرد بۆ ئێران، یان لەڕێی ئێرانەوە بۆ ئەورووپا بەتایبەت لەدوای ساڵی ١٩٨٥ تا ١٩٨٨ چەند ڕۆژ لەم کاروان سەرادا ئەمانەوە، دەیان کێشەی کۆمەلایەتی لەم ماڵەدا چارەسەر کراوە، بەتایبەت ئەوانەی کێشەکانیان لەشارەکانەوە لای دادگاو پۆلیس حەلیان نەئەکرد ئەهاتنە لای پێشمەرگە.

لێرەدا با داستانێک بگێڕمەوە لەوبارەوە، بۆ چارەسەر کردنی ئەوکێشانە زۆرجار خەڵک سوێند ئەدران بەقورئان، لەباتی قورئان کتێبی

حەمەدۆکمان دائەنا نەلەبەر ئەوەی قورئان نەبوو بەحساب لەبەر ئەوەی گوناح بار نەبین.

ساڵی١٩٨٢ کێشەیەک هەبوو، هاووڵاتیەکی گریانەی لە کۆمەڵگەی عەنەب لەهەڵەبجە، بەناوی ئەورەحمان برایەکی کەم ئەندامی هەبوو بەناوی رەحیم، مام ئەورەحمان کچێکی هەبووە، لەتەمەنی منالیدا بووە ووتوویەتی ئەم کچە گەورە بوو ئەیدەم بەژن بۆ رەحیم، کچەکە گەورە بووبوو، دابوویان بە کەسێک بەناوی نەسرەدین لفتولا، رەحیمیش رێگری ئەکرد، نەسرەدین لەئاوایی گریانە لەگەڵ چەند کەسیتر سەربازی هەڵهاتوو بوون، چەکیان لابوو، مامۆستا جەمال خەرپانەیش کادری شۆرشگێران بوو، ئەمانە پێیان وتبوو چالاکیەک هەیە بابچین بیکەین، شەو چوو بوون کابرای کەمئەندام و داماویان هێنابوو، لەرێگادا زۆریان لێدابوو، بردبوویانە گریانە خستبویانە ناوئاو، کاتێک ئەمەم زانی ناردم هەم چالاکوان و هەم دیلەکەیان هێنان بۆ هاوارەکۆن، رەحیم خۆی زۆر شپرزە، شپرزە تریان کردبوو.

عەزیز کەریم رەزا، برای شەهید ئەحمەدم راسپارد مامم رەحمان و کچەکە لەشارەوە بانگ بکات بۆ هاوارە کۆن، لەکاتی دیاری کراودا هەموو هاتن، بەرێکەوت ئەو رۆژە شەهید شەوکەتی حاجی مشیر هاتبووە سەرەوە گەیشتە ماڵی ئێمە، کاک شەوکەت شۆرش گێران بوو کە گوێی لەقسەکان بوو تێگەشت ئەمانە بەناوی مەفرەزەی شۆرش گێران چیان کردووە، زۆر توورە بوو ئەیویست سزای توندیان بدات، بەڵام تازە من بوومەوە بەدیفاع کەریان، ووتم کێشەکەم چارەسەر کردووە لێم تێک مەدە، کچەکە عاقڵ بوو ووتی مادەم مامم ئەشکەنجە دراوە من تازە ئەم شووە بەم پیاوە ناکەم، بیشیکەم ئەمە سەرەتای بێت ئاخری خێر نابێت، باوک و براکانی ئەیانووت تازە تۆ مارە بڕاوی هەرەشەیان ئەکرد، نەسرەدین ئەیووت تەلاقی نادەمەوە. ئەنجامی چارەسەر ئەوە بوو، نەسرەدین تەلاقی کچەکەی داو چی بۆ کردووە بۆی بگێرنەوە، بەمەرجێ کچەکە سوێند بخوا کەس زۆری لێنەکردووە کە پەشیمان بۆتەوە، مام رەحمان و کورەکانیش سوێند دران کچەکەیان نەکوژن و پارێزراو بێت و رێزی بگرن.

لەشاخ، لەتاقچەی ژورێکی خانوچەکە پەرپووت و لارو کۆمەکەی ماڵی باوکمدا، چەند کتێبێکم دانابوو، ئەوەندە دەستاو دەست پێکرابوون شپرزو

بیبەرگ، ناونیشانیان نەمابوو، تارپیزبەندی بابەتەکانت نەخوێندایەتەوە نەتەزانی ڕۆمانی دایک و حەمەدۆگیان تێدایە. لەکاتی سوێند دانەکەدەدا هەستام و چوومە ئەو ژووری کتێبەکانی لێبوو، کتێبی گەورە نووسەر یەشار کەمال حەمە دۆکم وەرگرتوو ئەدیبەی خوشکم پارچە قوماشێکی سەوزی دابوو بەسەریدا، لێم سەندو پێچام بە کتێبەکەوەو هاتمەوە ئەمدیو، هەموو هەستانە سەر پێ وایان زانی قورئانە بەدەستمەوە، سوێندەکانیان دراو کۆتایی بە کێشەکە هات هەرکەس بۆ ماڵی خۆی کچەکەش لەگەڵ باوکو براکانیدا ڕۆیشتەوە.

خوێنەری بەڕێز لە خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا، ڕەنگە ئەو پرسیارەت لا دروست ببێت خۆراک و خەرج و مەسرەفی ئەم خێزانە لەو سەچیاوشاخە کێ لێی بەرپرسیار بووە؟ بەڵی سەرەتا بۆ ماوەیەک گوزەراندیان بەو پارە کاش و پاشەکەوتەی هەیان بوو، لەگەڵ خۆیان هێنابوویان، دوای تەواو بوونی ئەو پارە، بنێشت کردن لەلایەن باوکم و چەند پێشمەرگەیەکەوە لەوەرزی هاویناندا بەزەحمەتێکی باوەڕ پێنەکراو، ماوەیەکیش بەئاژەڵداری و شوانی، خزم و کەسوکاریش کۆمەک و پیتاکیان ئەکرد.

لەکاتی نووسینەوەی ئەم بابەتەدا پرسیارم لەباوکم کرد، ئەوسەردەمە کەس هاوکاری کردوین؟ ووتی: خەڵک ئاردو برنج و ڕۆن وشەکرو چایان بۆ ناردووین ئەویش زۆر بەکەمی و بەنهێنی چونکە دوژمن زاڵم بوو بیزانیبیا یەکێک کیلۆیەک چامان بۆ ئەنێریت ئەیانگرت. وەک پارەی نەقدیش ساڵی ١٩٨١ کاک مەلابەختیار٥٠ پەنجا دیناری بە مام هادی دا لەناوزەنگەوە بۆ ناردبوین بەناو کوردستانی ڕۆژ هەڵاتدا هاتبوویەوە بۆ هەورامان، پارچە قوماشێکی چوار مەتری و ٢٠ بیست دیناری هێنابوو، ووتی قوماشەکە بایی چوار دینارە بۆ کۆسارو شیروان، ئەمەش ٢٠ بیست دینارەی ماوە، ٥٠ پەنجا دینارەکە تمەن و دینارم پێکردووە زەرەری کردووە.

# من ڕەحیم نیم

هاوینی ساڵی١٩٨٢ئێمە، هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان ناوچەکانی هەڵەبجە، شارەزور، هەورامانمان چۆڵ کردبوو، بەهۆی کەرتبوونی هەرێمەکە و ئەو کێشانەی دوای کەرتبوون، چووبووینە شارباژێرو قەرەداغ. هێزەکانی بەرەی جود[1] لەوشوێنانەی شارەزوردا کەباسمان کرد جەولەیان ئەکردو ئەسوڕانەوە، هێزەکەی هەورامان لەشارباژێڕەوە پەڕیبووینەوە بۆ قەرەداغ لە دەورو بەری گوندەکانی شەمەو وێلەکە بووین، کۆبوونەوەیەک کرا لەو کۆبوونەوەدا قسە لەسەر ئەوە کرا چۆن یەکێتیی بگەڕێنینەوە بۆ ناوچەکە، نەگەیشتینە هیچ ئەنجامێک لەو کۆبوونەوەدا.

چەند ڕۆژێک دوای ئەوە هەڤاڵ شەوکەتی حاجی موشیر داوای کرد پێکەوە دانیشین، دانیشتین بەڵام بەنهێنی، هەڤاڵانی ترمان وەک فەرماندە کەرتەکان ئاگادار نەکران، لەو دانیشتنەدا پرسیاری کرد، پێت چۆنە تۆ لەگەڵ مەفرەزەیەکی ١٠_١٥ کەسیدا بگەڕێیتەوە بۆ هەورامان؟ پرسم چۆن چۆنی بۆ چ مەبەستێک؟ ووتی بۆ ئەوەی لەدۆڵی هاوار بنکەوبارەگا دابنێینەوەو

---

[1]- بەرەی جود کورتکراوەی، جەبهەی وەتەنی دیموکراتی بوو، ئەم بەرە ڕۆژی ١٩٨٠/١١/٢٨ لە چوار هێزی سیاسی باشووری کوردستان دروستکرا، کە ئەمانە بوون پارتی دیموکراتی کوردستان، حیزبی سۆشیالیستی کوردستان، حیزبی شیوعی عێراق، پارتی سۆشیالیستی کوردستان-پاسۆک. لەبەرامبەر بەرەی جودیشدا، بەرەی جەوقەمد هەبوو، کە کورتکراوەی جەبهەی وەتەنی قەومی دیموکراتی بوو، ئەم بەرەیەش لە ڕۆژی ١٩٨٠/١١/١٢دا دروستکرا بوو، کە لە هەریەک لە هێزەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست، بزووتنەوەی عەرەبی سۆشیالیشت، ڕێکخراوی سوپای ڕزگاری گەلی عێراق، حیزبی سۆشیالیستی کوردستان، حیزبی شیوعی عێراق پێکهاتبوو. دیارە هەریەک لە حیزبی شیوعی عێراق و حیزبی سۆشیالیستی کوردستان لەهەردوو بەرەکەدا ئەندام بوون، بەڵام لە چەند جەولەیەکی شەڕی ناوخۆدا، لەگەڵ بەرەی جودا شەڕیان لەگەڵ یەکێتیی هاوپەیمانیان لەبەرەی جەوقەددا کرد.

ـمویوه دەست بکەنەوه بەکارو چالاکی بەمەفرەزەی بچووک بچووک هاتوو چۆی هەڵەبجەو شارەزوری بەری هەورامان بکەن.

ڕێک کەوتین سەرەتا بڕیار بوو لە زەڵەڕەشەوە بێینە میرەدێ و ـمویوه بپەڕینەوه بۆ ئاوایی ئەحمەدبرنە[1] و لەوێوە بۆسەر دەریاچەی ـدربەند و بەبەلەم بپەڕینەوە بۆ ئاوای نێرگزەجاڕ بۆبەری ناوچەی نەورۆلی و هەڵەبجە. پاش نیوەڕۆیەک لەگەڵ نزیکەی ٢٠ پێشمەرگە لەدەربەند فەقەرەوە بەسواری تراکتۆرێک چووین تا ئاوایی بەردەکەڕ، شارەزامان شێخ حەمەئەمین لەتیپی ٥٥ی قەرەداغ بوو، لەوێ لەدڵی خۆمدا بڕیارم دا ڕێگاکە بگۆرم، لەمیرەدێ وئەحمەد برنەوە نەڕۆین، بۆیە شێخ حەمەئەمینم بردە لاوەو پێم ووت ئەتوانیت لەناوتاق و بیرکێوە ئەمشەو بمبەیتە لێوار دەریاچەی دەربەنیخان و لەوێوە بەبەلەم و ماتۆڕ بڕۆم، ووتی لەوێوە ئاسانترە، چونکە بەم تراکتۆرە ئەتوانین تا ئاوایی ناوتاق بڕۆین. ووتم دە بەرەو ناوتاق بڕۆ.

شێخ حەمەئەمین عازەبانی لەتیپی ٥٥ی قەرەداغ، پێشمەرگەو فەرماندەی کەرتبوو هاتبوو بۆ ئەوە تاسەر دەریاچەکەی دەربەندیخان ڕەوانەمان بکات، شێخ حەمەئەمینی شێخ مەحمود پێشمەرگەیەکی لەسەرخۆ و ئازاو پیاوێکی خوێن گەرمە، عەسرێکی درەنگ لەناو تاقەوە کەوتینەڕێ بۆ نزیک ئاوایی بیرکێ. کەمێک بەرلەوەی تاریک بکات گەشتینە نزیک چەموو

---

[1] - ئەحمەد برنە ئاواییەکی خۆش و هەڵکەوتەی جوگرافی زۆر جوانە، ئەکەوێتە دەستە چەپی ڕێگای سلێمانی –دەربەندیخان. بەسەر دەریاچەی دەربەندیخاندا دەڕوانێ، بەناوی ئیمامزادەیەکەوە ناونراوە، کە ناوی ئەحمەد برندە. دانیشتوانەکەی خەڵکێکی باش و کوردپەروەرن، بۆیە زوو زوو پێشمەرگە ئەچووە ئەوێ هەرچەندە هێزەکانی حکومەت نزیک بوون لێی. ڕۆژی ١٩٨١/٢/٢٩ ئێمە شەوەکەی لە ئاوایی ئەحمەد برنە بووین و بۆ ڕۆژی دواتر چوینە ئاوایی دەق، ڕۆژی ٣/٢ بارانباری. سەرلەبەیانی ئاگاداریان کردین لە ئەحمەد برنە تەقەیە، سەرکەوتین بۆ سەر چیای سێبڕ ئەم چیا ئەکەوێتە نێوان ئەحمەدبرنە- دەق، لەوێ زانیمان پێشمەرگەکانی کەرتی شەهید مەحموودی حاجی فەرەج لەوێ بوون، هێزی حکومەت هاتووەو دەمەو بەیان شەڕ دروست بووە، ئەفسەرێک و چوار سەرباز کوژراون و پێشمەرگەیەک بەناوی شێخ عەلی خەڵکی هەڵەبجە شەهید بووە. دوای دەرچوونی پێشمەرگەکان جاش و سەربازەکان دوو سەربازی هەڵهاتوویی ناو ئاواییەکەیان شەهیدکرد بە ناوەکانی کەریم دێوانە ئەحمەد و ناجی حسێن فەتاح.

ژاڵەکەی پشت ڕێگای دەربەندیخان- سلێمانی،لەوێ وەستاین وشێخ حەمەمین و هاشم بۆینی و فەیسەڵ و ڕزگار چوون بۆ ئاوای، بۆ ئەوەی فریای بەلەمەوانەکان بکەون نەوەکا شەو بچنە خوارەوە بۆ قەراغ دەریاچەکە و ئێمە نەیان دۆزینەوە، هەرچەندە چەند ڕەبیەیەک لەسەر بەرزاییەکانی ئەمبەرو ئەوبەری ئاواییدا هەبوون، پێشمەرگەکان بەناو چەم و ژاڵەو ژێر پردەکەدا خۆیان گەیاندبوە ناو ئاوایی، کەهەوا تاریکی کرد ئێمەش لەگەڵ ئەوشارەزاییەی شێخ بۆی بەجێ هێشتبووین پێشمەرگەیەک بوو بەناوی سەید لەتیف سەید کەریم عازەبانی، چووینە ناو ئاوایی لەوێ یەکمان گرتەوە، بەلەمەوانەکان لە ئاوایی دەرچوو بوون، شێخ یەکێک لە پێشمەرگەکان و خزمێکی خۆی ناردبووە خوارەوە بۆلایان، نەوەک بچنە ناو ئاو و دواتر درەنگ بکاو نەیاندۆزینەوە، خۆی لەئاوای وەستابوو بەدیار ئێمەوە. ئێمە گەشتین و دوای نانخواردن لەگەڵ چەند شارەزایەکی تر سەرەوخوار بووینەوە بۆ کوێ ئاو تا گەشتینە لای بەلەمەکان، بەلەمەوانەکان بڕو بیانویان ئەگرت، منیش بەقسەی خۆش ڕازیم کردن تا بەدوو بەلەم و ماتۆڕ بمان پەڕێننەوە، پرسیان بۆ کوێو تاکوێ؟ وەڵامم نەدانەوە، کەسیتریش بۆی نییە وەڵام بداتەوە[1] ووتیان ئەبێت بزانین تاکوێ ئەمانبەن بۆئەوە حسابی بەنزین بکەین، ووتم ئەچین بۆدلف. دلف گوندێکی وێران کراوی ناوچەی شەمێرانە، بارەگای پارتی لێبوو، بەرلەوەی سواری بەلەمەکان بین بەجەماعەتم ووت کەستان ناوی ڕاستی یەکتر مەدەن با نەماننناسن، فەیسەڵی

---

[1] ــلەپارتیزانیدا، تەنیا فەرماندەی مەفرەزەکە لەکاتی جەولەکردندا ئەزانێ بۆکوێ ئەچن وچی ئەکەن، نەخشەی ڕیگاو شوێنی مەقسەد لەدڵی خۆیدایە، بڕیاری مانەوەو پشودان خۆی ئەیدات، ئەوانیتر نازانن، جارجار ڕاوێژ ئەکات بەجێگرەکەی ئەگەر هەیبوو، یان زۆرجار ئەو پێشمەرگەی کە کونترو زیاتر جێگەی متمانەیە، یان ئەوەی لەوناوچەدا شارەزایە بەنهێنی و بێ ئاگاداری ئەندامانی تری مەفرەزەکە، بەشەوبێت یان ڕۆژ ئاگاداری ئەکات لە بەرنامەی ڕۆشتن و گەڕانەوە، یان مانەوەو خۆشاردنەوە، هەرواش بۆئەنجامدانی چالاکی و هەر ئەرکێکی تری پێشمەرگانەو حیزبیانە. زۆرجار کە ئەگەنە ناو ئاواییەک لەوێ پێیان ئەڵێت: لێرە ئەمێنینەوەو نان ئەخۆین، یان کاتێک بیانەوێ چالاکییەک بکەن، ئەڕۆن تاله نزیک ئەو خاڵەی دوژمن، کە مەبەستیانە، لەوێ کۆبونەوە ئەکات بەمەفرەزەکەو پێیان ئەڵێت: چالاکی ئەکەین و هەرکەس ئەرکی خۆی بۆ دیاری ئەکرێت.....هتد.

مام کاکل و جه‌ماعه‌تێک له‌به‌له‌مێکدا بوون، من و به‌شه‌که‌یتر له به‌له‌مێکیتردا سوار بووین، شێخ عه‌بدولڕه‌حمانی شێخ ئه‌حمه‌دی نه‌قشبه‌ندی وحه‌کیمی مه‌لاسالح و بارزانی شێخ مه‌حمود له‌به‌له‌مه‌که‌ی ئێمه‌دا سوار بووبوون، به‌له‌مه‌که لاسه‌نگ بوو کاکی به‌له‌مه‌وان ووتی یه‌کێکتان له‌وڕیزه‌دا هه‌ستن بێنه ڕیزی ئه‌مبه‌ر، منیش به‌شێخ عه‌بدولڕه‌حمانم ووت ڕه‌حیم تۆهه‌سته وه‌ره



ئه‌مبه‌ر، دیاره عه‌بدولڕه‌حمان گوێی گرانه و گوێی لێنه‌بوه کاتێک ووتوومانه که‌س ناوی ڕاستی هـــاوڕێکه‌ی نه‌هێنێ، کاتێک من پێم ووت ڕه‌حیم توڕه‌بوو ووتی من ڕه‌حیم نیم. چونکه لـــه‌سلێمانی ئه‌گـــه‌ر به‌یه‌کێک بڵێت ڕه‌حیم به‌مانای فشه‌که‌ر دێت. بۆیـــه شێخ به‌تووڕه‌ییه‌وه ڕووی کرده من و ووتی من ڕه‌حیمنیم. منیش ووتم باشه ده‌ی له‌ویا دانیشه

مه‌سافه‌که زۆر بوو به‌ناو ئاوه‌که‌دا، بڕێک جێگه‌ی مه‌ترسیش بوو، هه‌رچۆن بوو گه‌شتینه ئاستی بانه‌بانان، به‌له‌مه‌که‌ی ئێمه له‌پێشه‌وه بوو به به‌له‌مه‌وانه‌که‌م ووت بڕۆ بۆ لای ده‌ستی چه‌پ، دیاره ئێمه‌ی ناسیوه هیچ گفتوگۆی نه‌کرد بڵێت بۆ؟ یان بڵێت ئه‌ی ئێوه نه‌تانووت ئه‌چین بۆ دڵف؟. له‌به‌ر ده‌م بانه‌باناندا له‌نگه‌ریان گرتوو ئێمه دابه‌زین و سه‌ره‌و ژووربووینه‌وه بۆ مله‌ی داری، ئه‌وانیش گه‌ڕانه‌وه تاماوه‌یه‌ک هه‌رده‌نگی ماتۆڕه‌کانیان له‌تاریکایی ئاوه‌که‌دا به‌رگوێ ئه‌که‌وت.

ده‌مه‌وبه‌یان ئاودیوی ناوچه‌ی نه‌ورۆلی بووین، لاماندایه به‌رده‌م ڕێگای مله‌ی داری له‌ناو په‌ڵه‌هه‌ژگ و لێره‌وارێکی چڕدا بۆی که‌وتین، زۆر هیلاکوماندو بووین. ئه‌وه‌نده‌ی نه‌برد مه‌فره‌زه‌یه‌کی به‌ره‌ی جود له‌ناوچه‌ی نه‌ورۆلییه‌وه هاتن و به‌پشتی ئێمه‌دا ڕۆیشتن به‌ره‌و ئاوایی نێرگزه‌جاڕ، خۆمان لێنه‌گه‌یاندن چونکه زۆر ماندو بووین. لای نیوه‌ڕۆوه هه‌ستاین و که‌وتینه ڕێ بۆئاوایی چوره‌سانه‌ی وێرانه‌و چۆڵکراو، بۆعه‌سری هه‌مان ڕۆژ گه‌شتینه

ئاوایی پریس لەویّ خاڵە زەینەدین بە ڕێکەوت هاتوو بینیمان ناردمان بۆلای ماڵی شێخ مەحمودی کاکەشێخ نانیان هێنا بۆمان و خۆشیان هاتن بۆلامان شێخ مەحمود خۆی و هەورامانی کوڕی هاتبون بارزانی کوڕیشیان بینی، خاڵەزەینە سەیارەی جێبی هەبوو لەڕێکخستن ئیشی ئەکرد زۆر چالاک ودڵسۆز بوو.

دوای ئەوە نانمان خوارد، نامەیەکم نووسی بۆ کاکە حەمەی حاجی حەمەشەریف، و کاک ئەحمەد کولکنی ناوەرۆکی نامەکە سەبارەت بەگەڕانەوەمان بوو بۆناوچەکە، تەنها کاک حەکیمی مەلاساڵح ئاگادار بوو لەنامەکە، کەبۆ کاکە حەمەو کاک ئەحمەدم نارد، ئەوان بەرپرسی ڕێکخستنی شاربوون، نامەکەم دایە دەست کاک هەورامان ئەوان گەڕانەوە بۆشارو ئێمەش بەرەو ئاوای تریفە چووین و بەڕۆشنایی سەرمان بردە دیار کەلاوە رووخاوەکانی ئاوایی چاوگی باوەکۆچەک، لەویّ ماینەوە تا تاریکی کردو ئینجا شەو قەلای مێردانە، بەپەنا ئاوایی باوە کۆچەکدا کەوتینە ڕیّ بەرەو ئاوایی بامۆک تائاوایی عەبابەیلیّ نەوەستاین، نیوەشەو دوای پشودان و کۆکردنەوەی شەکرو چایی و وەرگرتنی نان، کەوتینە سەرەتایی هەورازی تاقەت پروکێنی عەبابەیلیّ بەرەو چیایی ئەشکەدۆڵ. دوای گەیشتن بەلوتکەو داگەڕانەوە بەرەوخوار لەگەڵ ڕووناکی بەری ئاسۆدا گەیشتینەوە ماواو مەسکەنی خێڵی یارسان، هاواری دڵگیر.

دوای ئەوە کەگەشتینە دۆڵی هاوار و لەگرییانە بنکەو بارەگامان چێ کرد کەوتینە هاتوچۆو مەفرەزە کردن بۆ هەڵەبجە و خورماڵ وسیروان وشارەزوور، هەروەها هەڤاڵانی ڕێکخستن لەم شوێنانەدا پەیوەندیان پێوەکردین وچالاکانە هاوکاریان کردین، جەماوەری یەکێتیی ودۆست ولایەنگرانی ئەوماوە لەلایەن بەرەی جودەوە فشاریان خرابووە سەر، بەلام کە ئێمە هاتینەوە سنوورەکەو چەندین مەفرەزەمان ناردە خوارەوە، بۆ هەڵەبجەو شارەزووری بەری خورماڵ و سیروان بەتایبەت بەهاوکاری ئەحمەد کولکنی و هەندێک ئجرائات کرا، ئیتر ئەوزەخت و زۆرە لەسەر دۆست و ئەندامانی یەکێتی نەماو دوای ماوەیەک هێزەکانی سنوورەکە لەشارباژێر وقەرەداغ گەڕانەوە بۆشوێنی کارو چالاکی خۆیان لەشارەزوور و هەورامان و یەکمان گرتەوە.

# شـــەڕی ناوخۆ

دیـا رة ـنـي ێمـةش و هەر پێشمەرگەو کادرو فەرماندەیەک، کاتێک بیر لەو شەڕانە ـنـةکـةیـنـةوة کە شەڕی ناوخۆ بوون و ڕوویانداو تیایاندا بەشدار بوون، وەک چەکدارێکی شەڕکەر یا وەک فەرماندەیەک و سەرپەرشتیکەری شەڕگەیەک، ئێستا لە ناخی خۆماندا هەست بەجۆرێک لەناڕەحەتی ئەکەین، بەڵام ئەوکات ئەم هەستەمان وەک ئێستا نەبوو. لەزۆربەی هەرەزۆری ئەو ڕوودا و قەوما و کارەسات و ماڵ وێرانیانەدا ئەوەندەی من ئاگاداربم و بزانم، یەکێتیی نیشتمانی نەبەرنامە داڕێژەر بووە، نەدەست پێشخەر، بەڵکو زیاتر بەرگری لە خۆی کردووە. بـةلآم لـة مـةنـدي ێك شـةڕدا لـي ێرةو لـةوی ێ، ڕةنـطة هۆکـا ربـو و بـیـن.

من نازانم بۆچی؟ کاتێک دوژمن بەو دوژمنایەتی کردن و قین لە دڵیەی، بەو هەموو هێزو توانا لەڕادەبەرەی خۆیەوە بە دڕندانەترین شێوە خەریکی جێبەجێ کردنی بەرنامەی لەناوبردنی کورد بوو، ئێمەی براکان لە هیچ جێگەیێک ڕێمان نەئەبووەوە، لە هەر جێگەیێک دەرکەوتینایە، سوپاو داموو دەزگا ئەمنی و جاسووسیەکانی سەدام حسێن و حیزبی بەعس لەگەڵ چەتە بەکرێ گیراوەکانی کورد (جاش) پەلاماریان ئەداین و هەوڵی لە ناو بردنیان ئەداین. کەچی ئێمەیش بەزەییمان بە خۆماندا نەئەهاتەوە و لەو مەیدانە بەرتەسک و دژوارو گەمارۆ دراوەدا بەیەکدا هەڵ ئەگژاین.

خوێنەرانی ئازیز من لەم کتێبەی بەردەستاندا هەوڵم داوە کەمترین برین بکولێنمەوە، خۆم بە دوور بگرم لە گێڕانەوەی ڕووداو و شەڕەکانی ناوخۆ. بەڵێ وەک پێشمەرگەیێکی ئەم کوردستانەو فەرماندەیێکی سەربازی و سیاسی ئەو سەردەمەی بەڕێم کردووە، لەو شەڕانەدا کەشەڕی ناوخۆ بوون شکان یان سەرکەوتن هەر شکان بووە بۆ هەموومان، هەرچەندە من لەو بڕوایەدا بووم ئەوکات ئەوە بۆ بەرگری کردن بووە لە خەبات و تێکۆشان و ڕێبازو بیرو باوەڕەکەم.

لەگەڵ ئەوەشدا بازم داوە بەسەر هینانەوە یادی زۆریک لە ڕووداوەکان و وێنا نەکردنی شانۆی شەڕکەکان و شەڕەکاندا، هەر چەندە جارجار لێرەولەوێ چەند شەڕو ڕووداوێک خۆی خزاندوەتە نێو باس و بابەتەکانەوە ئەوانەش بەناچاری کورتە باسێکیان لێوە کراوە. ئـةويـش بـة نـيـةتـی دةرس و ثـةنـد وةرطرتـن.

شەڕی ناوخۆ لە کوردستان پێشینەی هەیە، تەمەنێک و مێژوویێکی بەرێ کردووە، هەرچەندە لاکانی شەڕەکە بۆ خۆیان بیانوو و هۆکاری جۆراو جۆرو جیاواز جیاواز بۆ ڕەوایەتی پێدانی ئەو شەڕە قێزەون و هەڵە کوشندانە ئەهێننەوە بەڵام هیچ دادێک نادا، برینەکان سارێژ ناکا برینی براکوژی قوڵە و هەمیشە سۆی هەیە، تەنیا یەکرێزی و برایەتی و دەرس و پەند وەرگرتن لەهەڵەو هۆکارەکانی ئەوشەڕانەو دووبارە نەکردنەوەیان برینەکان سارێژ ئەکات.

هۆکارەکانی ئەم شەڕانە هەم دەرەکی و هەم ناوخۆیی بوون، بۆ هۆکارە دەرەکیەکان نەئەبوو هیچ لایێک گوێ بگرێت بۆهیچ کەسێک، چونکە دۆستایەتی و هاوکاری ئەو لایەنە دەرەکیانە، بۆچ بۆ من، دۆست و دڵسۆزو هاوکارە، بەڵام بۆ براکەم دوژمنی دڵ پڕ لەقینە؟ ئایا ئەو خەبات و تێکۆشانەی بۆ ئازادی و سەرفرازی کوردستان و ڕزگار کردنی، بۆچی بۆ دۆستانی دەرەکی ئەگەر براکەم بیکات و خاوەنی بێت، لای ئەو ڕەوایەتی هەیە و مافی ڕەوای خۆیە ئەبێت بەدەستی بهێنێ، ئەو پشتگیری ئەکا؟ بەڵام ئەگەر من ئەو خەبات و تێکۆشانە بکەم و من خاوەنی بەدەست هێنانی ئەومافەبم، ئەوە ئەو دوژمن و نەیارمەو دژایەتیم ئەکات؟.

بۆ هۆکارە ناوخۆییەکانی شەڕی ناوخۆ هیچ پاساوێک نییە، هەموو هۆکارەکان نارەوان، خۆ بەزلزانی، بیری تەسکی حیزبایەتی، تاکرەویی، خۆ بەخاوەنداریەتی زانین....تاد. تەماشا بکەن لایەنێک لەسەر سنوور خۆی کۆئەکاتەوە وهێز ئامادە ئەکا، بەسەر دەیان سەربازگەو مۆڵگەی سوپای دوژمندا تێپەڕ ئەبێت و دێت بۆ پانتایی دەشتی شارەزوور، هێزێکی تریش لەهەمان دەشتدا سەرقاڵی کاری خۆیەتی لەناوەڕاستی هێزەکانی دوژمندا، براکان ئەو هەموو مۆڵگەو یەکە سەربازی و دامودەزگا ئەمنی و جاسووسیانەی دوژمن کە بە ترس و لەرزەوە ئەیانخاتە پشت سەرو بەجێ

دەهێڵێ، دێت و لەبیریان ئەکات، دێت تا فرسەت بهێنێت لەبراکانی خۆی، تاسا بەلکو گورزێکیان لێ بوەشێنێت، بەڵێ لاکەی لای دەشتیش خۆی کۆ ئەکاتەوە



و خۆ ئامادە ئەکات بۆ ڕێگری لە هاتنیان تا لە بۆسەیان بخات ودەرسێکی وایان دابدات تا جارێکی تر نەوێرن بێنە ناو جەماوەر، باهەرلەو سەر سنوورەوە بە دووربین سەیری ئەم دەشتە پان و بەرینە بکەن.

ڕاست لەکاتێکی واداو لە بەروار ١٩٨١/٨/٢٥دا لەشکری براکان لە گوندەکانی بیەڕەشکە و ناوگرداندا لە ناوەراست و ناوجەرگەی هێزەکانی دوژمنی داگیرکەردا پەلاماری یەکتر ئەدەن و بەیەکدا هەڵئەگژێن، هێزی دوژمن و جاشانی بەکرێگیراوی نیشتمان فرۆش، لە جێگای خۆیانەوە ئەبنە تەماشاچی، بە ئاسوودەیی چاوەڕێی ئەنجامی مژدە بەخشی شەڕی براکان ئەکەن.

شەڕ بەردەوام ئەبێت تا شەو بەسەردا دێت، لەشکری هاتوو چەندین کەس ئەکاتە قوربانی سیاسەتی هەڵەو بە چەندین بریندارەوە ئەبێت ڕێگای پڕ مەترسی و پڕ لە دوژمن و مەیدانی مین ببڕێ و خۆی دەرباز بکات و بگاتەوە سەر سنوور. لایەنی ناودەشت و بە قەولی فارس، بوومیش، باشترین کادر و فەرماندەی لەوشەڕە قێزەونەدا ئەکاتە قوربانی و بریندارەکانی بەبێ دکتۆر و دەرمان ئەباتە نەخۆشخانەی ناو گۆلە تووتن و جەنگەڵە گوڵە بەڕۆژەکان، لە لێوار پەنگاوی بەنداوی دەربەندیخان لە نزیک پردی کۆنی زەڵم.

ئەنجامی دلخۆشکەرو مژدە بەخشی ئەم پێکادانەی براکانیش لە ۱۹۸۱/۸/۲۵ دا لە ناوگردان، بۆ دوژمنی داگیرکەرو پیاوانی ڕژێم، لەلایەک، شەهید بوونی جەمالی مەلا عەلی و جەباری حاجی شەریف و سالحی خالە و ئەحمەد ئەسکەندەر و چەندین بریندارە. بریندارەکان بەزەحمەتێکی زۆر تاگەینرانەوە دزلی و مەریوان.

لەلای لاکەی تریش شەهید بوونی فەرماندەیێکی ناودارو کەموێنە بەناوی غەفوور دەرەشیشی و شەهید بوونی پێشمەرگەیێکی زەحمەتکێش و بەوەفا بۆ کوردستانەکەی بە ناوی حەیدەر عوسمان سۆفی عەلی و بریندار بوونی چەند کەسێکی ترە، لەوانە فەرماندەی قارەمان نیازی عیزەت تەوێڵەیی و ئازاد عەبدوللا وەهاب، بۆ چارەسەری ئەمانیش، لەشارەزورەوە بۆ ناوچەی سەردەشت، بەتراکتۆرو قاترو دەردی سەریەکی زۆر تاگەێنرانە نەخۆشخانەی شۆڕش.

## ڕەشەباو شەوێکی سارد

لەدوای شەهید بوونی شەهید غەفوور هەوڵمان ئەدا مەیدانەکە چۆڵ نەکەین و بەردەوام بین و کارو چالاکیەکانمان زیاد بکەین و زۆرتریش لەنا جەماوەردا بین. چالاکیەکانیشمان لەلایک گورز وەشاندن بێت لە دوژمنی داگیرکەرو دوژمنی سەرەکی، لە لایکی تریشەوە بەدوای هەل و فرسەتدا دەگەڕاین تۆڵەی فەرماندە شەهیدەکەمان لە براکان بسەنینەوە، وەکو ئەوەی قوربانییەکانی ئەوان هیچ نرخێکیان نەبێت!!. ئیتر بەوجۆرە بەردەوام بووین.

سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٨٢ لەدەشتی شارەزوور و شارباژێرو دەوروبەری هەڵەبجە دا بۆ ماوەێک سەر قاڵی کەشتی سیاسی و سەربازیی بووین، ویستمان سەرکەوینەوە بۆ بنکەو بارەگاکانی دوڵی هاوار و گریانە و بەری شنروێ بۆ پشوودان. لەم سەفەرەدا کاک حەمە هاواری لە دڵی خۆیدا ئەبێ جێگرەوەی شەهید غەفوور بێت، هەرواش بوو ئەو لە من لەپێشترو جێگر کەرتیش بوو، منیش بە حوکمی چوست و چالاکی وگوێڕایەڵی پێشمەرگەکان بۆمن، کاکە حەمەی خستبووە گومانەوە، لە ڕاستیدا منیش تموحی ئەوەم هەبوو ببمە فەرماندەی کەرتەکە. لە دوای شەهید غەفوور، ئیتر ئەمە وایکرد بوو جاروبار ساردی بکەوێتە ناومان. هەرچەندە هیچ لایکمان مافمان بە خۆمان نەئەدا ئەمە ببێتە کێشەو گرفت لە بەردەمماندا.

لە شارباژێرەوە بەرەو هەڵەبجە دەشت و دەرمان خستە پشت سەرو دوای نیوە شەوێکی درەنگ گەیشتینە عەبابیلێ کە دوا ئاوەدانییە بەرەو بنکەو بارەگاکانمان لەسەر چۆمی هاوار و گریانە. خەڵکی عەبابەیلێ خەڵکێکی زەحمەتکێش و دۆست و هەمیشە ئەرکمان لەسەریان بوو، ئەمشەویش لە خەومان کردن و دوای نان و چای خواردن کوڵیشیان بۆ پێچاینەوە.

لەم شەوە سارد و کزەدار و ڕەشەباویەدا لە عەبابەیلێوە سەرکەوتینە سەر ملەی ئەشکەهۆڵ. بەهۆی ڕەشەبا بەهێزەکەو سەرماوە پچڕ پچڕ لە یەک دابڕا بووین لەم کاتەدا کاروانی ولاخ داری ئێرانی دایان بەلای ئێمەداو سەرکەوتنە سەر شاخ و پێشکەوتن و ڕۆیشتن. دواتر لەسەر یاڵ و لەدەمی کەلدا پێشمەرگەکان هەموو یەکمان گرتەوە، چەند ڕەبیەیەکی دوژمن لەدەستە ڕاستی دۆڵەکەدا زاڵ بوون بەسەر ئەو ملەو دەربەندەدا، من بینیم کاکە حەمە هاواری جگەرەی داگیرساندووە یەکسەر پێم ووت کاکە حەمە بۆ جگەرەت

داگیرساندووە؟ ووتی بۆ؟ ووتم ناترسی لەسەرەوە دەسرێژێکمان لێبکرێت؟ ئەوە ڕەبیەکان دیارن لێمانەوە، حەمە بە لەسەرخۆی و مژی قووڵ دان لەجگەرەکەی ووتی: بۆ کاکە حەمە پێت وایە لەم کاتەدا جگە لە ئێمە و سەگ کەسی تر بەدەرەوەبە؟ منیش بزەیەکم کردو هیچم نەوت.

دواتر کاتێک هەستاین برۆین، ئەوسێ پێشمەرگە بووبوونە دەستەی پێشڕەو لە ملە سەرەو خوار بوونەوە، دوای بڕینی چەند سەد هەنگاوێک بەرەو هاوار بە ڕاکردن گەڕانە دواوە، پرسیمان ها چییە؟ ووتیان لەناو ئەم دۆڵەدا لەسەر ڕێگا ئاگرێک هەیە، ئێمە لاماندایەوە بە لای چەپدا و ڕێگاکەمان گۆڕی لەوێوە لەوشان و بەرزاییەوە ئاگرەکانمان لێوە دەرکەوت، دۆڵەکە بەدرێژی و پانی سەدان مەتر ئاگری گرتوە ئاگرەکە تازە کەوتوەتەوە، ڕووناکی و شەوقی هەمووولایەکی گرتوەتەوە، دەنگی قرچەقرچی سوتانی دارو دەوەن و بلاسە بلاسی کڵپەی ئاگرەکان و جاجار هەڵفڕینی باڵندەکان لەڕووناکیەکەداو ونبوونیان لەتاریکیدا، لەگەڵ بەرزبوونەوەی گێژەلوکەی سووتاوی و خۆڵەمێش و ڕەشایی بەرەو ئاسمان و دووبارە بارانەوەی بەسەر ئێمەدا، جارجاریش یەکێک ئەڵێت بۆنی گۆشت سوتاو دێت، دەرکەوتنی قەتارەی پێشمەرگەکان لەڕووناکی ئەوئاگرە بێئامانەدا لەمبەرەوە، دەرکەوتنی ڕەبیەو مۆڵگەی سەربازەکان لەوبەرەوە، ئەو دیمەنەن من نازانم چۆن چۆنی وێنای بکەم و بیخەمە بەرچاوی خوێنەر.

لەئاگرەکە تێپەڕمان کرد، ئێمە نازانین و بێئاگاین لەناو ئەوکورە تاوگرتوەدا چەندین کەلاکی قاترەو جەستەی قاترەوانەکان دەبرژێت. دواتر دەرکەوت دوژمن لەسەر ڕێگەی ئێمە مینی چاندووە، ئەو ئێوارە بەر لە ئێمە قافڵەیەکی وڵاخداری حیزبی دیموکراتی ئێران کەوتبوون بەسەر مەیدانی مینەکاندا، دوو وڵاخداری خەڵکی گوندی شێخان کوژرابون و وڵاخەکانیشیان هەموو لە ناوچوو بوون، لەئەنجامی تەقینەوەی مینەکاندا ئاگرەکەش کەوتبوەوە.

زۆر جار لەکاتی جەولەکانی شەڕی ناوخۆشدا ڕێککەوتووە مەفرەزەکانی لایەنە سیاسیەکانی بەشەڕ هاتوو بەیەک گەیشتوون و چاو پۆشیان لە یەک کردووە و بەیەکدا هەڵنەگژاون، لە بەهاری ساڵی ١٩٨٣دا پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ لە هاورەکۆنەوە کەوتمە ڕێ بەرەو قەرەداغ لەگەڵ

دەستەیەک پێشمەرگە، دوای بڕینی هەورازی تاقەت پڕوکێنی هاوارەکۆن بۆ سەر چیای شنروێ و داگەڕانی سەرەوخوارەی شنروێ بۆ ئاوایی عەبابەیلێ بەشێکی کەم لە شەو تێپەڕی، بەوریای و بەپسکەپسک بەپەناو پەسوێدا خۆمان لائەدا تا نەکەوینە بەر شەوقی لامپەکان نەوەک کەمینی جاشانی خۆفرۆش هەبێ و وەداو کەوین. لەماڵە جووتیارێکی هەژاری دەست وپەنجە قلیشاوی دۆستی شۆڕشدا گیرساینەوە، نان و دۆیەکی زۆر بەلەزەت و چایەکی گەرم بەدوایدا، ئینجا خاوەن ماڵ کەناوی ئاسۆیە تابەری باخان پێشمان ئەکەوێ و ئەمانخاتە سەر ڕێگای ئاوایی بامۆک.

دوای تەیکردنی ڕێگا بەتەنشت شاری هەڵەبجەدا هەرسێ ئاوای بامۆک و باوە کۆچەک و حەسەن ئاوامان خستە پشت سەر لە چەند جێگەدا سەگەلی بەرەڵا پەلاماریان ئەداین و ئێمەش ناچار کورکەمان ئەکرد، لە چەن شوێنێشدا تەلبەنی باخ و بۆیسان گیری ئەداین و ئێمەش پەلەمانە ڕۆژمان لێنەبێتەوە تا بگەینە ئەوبەری دەریاچەی دەربەندیخان. لەحەسەناوا بنەماڵەی حاجی کەریم دۆستی باپیرەمن، حاجی کەریم لەساڵی ١٩٦٣شەهید کراوەو حاجی ئامینی خێزانی شاژنێکی خانەدانە، کوڕەکانی عەلی، شەوکەت، ڕەزا و جەبار، هەرکات ڕێم ئەکەوێتە ئەم ئاواییە هاوکاریم ئەکەن، ئەمشەو هەوڵم دا بەتراکتۆر کەمێک دەشتی نەبڕاوەی نێوان حەسەناواو ئیمامی زامن ببڕم بەڵام ڕێک نەکەوت ووتیان تاریکە بەبێ لایت نابێ و لایتیش داگرسا تەقەمان لێ ئەکەن. دەرچووین کەمتر ترسی لەکەمین کەوتنمان هەیە، پێمان هەڵگرت کاتژمێر سێی نیوەشەو گەیشتینە لێوار ئاوی دەریاچە لەئاست ئاوایی تووە قووت، پێشمەرگەکان بەهیلاک چووبوون، بۆی کەوتن خۆم کەمێک سەرەوخواروو سەرەوو ژوورم کرد بەلەمێکی بێماتۆرم دۆزییەوە، هەستن سواربن بابچینە ئەوبەرەوە تائێوارە لەوێ بخەون.

بەسەوڵ لێدان چووینە ئەو بەر بەلەمەکەمان بەستەوە، لەڕۆخی ئاوەکەدا تا ماڵەکانی ئاوایی تووەقووت ٣٠٠ سێسەد مەترە، سەرکەوتین، سەگەل لێمان ئاڵزکان، گەیشتمە بەر دەرگای ماڵی کەریمی حاجی ئەحمەد، ئەبینم خۆیو فاتمەخانی خێزانی لەهەیوانەکەدا بەپێوە وەستاون چرایەکی دەستیان لەپەناوە داناوە، س لاوە، بەهێواشی ئەوە تۆی کاکە حەمە، بەڵێ وەرن وەرنە ژوورەوە، لەهەیوانەکەدا جەماعەت دانیشتن. پرسیم ئاسایی نین

چییە؟ ووتیان هیچ نییە دانیشە، مام کەریم چوو بۆ پشتەوەی خانوەکە، فاتمە چراکەی کزتر کرد، زانیم شتێک هەیە، هەستام و بەئاماژە پێشمەرگەکانم حاڵی کرد، فاتمە شڵەژاوە ئەلەرزێ دەستی گرتم کە نەچمە دەرەوە من هەر هاتمە دەرەوە، لەوسەرموە مام کەریم هاتوو ئاوقەی یەکتر بووین، چییە؟ مام کەریم، وەرە ئەم بندیوارەوە قسەت بۆ بکەم، فەرموو، کاک فەرەیدون جوانڕۆیی و چل کەس لێرەن لەسەر بان خەوتوون ئەوەتا هەستاون بەئێوەیان زانیوە، لێیان پرسیوم ئەوە کێن؟ ووتوومە حەمەیە، ئەڵێن مادام ئەوە ئێمە ئەڕۆین، منیش ووتم نا بڕۆ پێیان بڵێ ئێمە ئەڕۆین. جەماعەت کەلەپێ کەوتبوون کورجوکۆڵ بوونەوە دایان لەمیل تفەنگ و سەنگەریان گرت منیش ووتم مەکەن ئەوان بییانویستایە ئێمەیان ئەکوشت، مام کەریم هاتەوە ووتی ئەوان وابەڕێکەوتن بۆ ئاوایی جەرداسنە، کاک فەرەیدون ئەڵێت حەزئەکەین مەرحەبایی حەمە بکەین، منیش قەلەق بووم و بەپێشمەرگەکانم ووت ب لاوەەی لێبکەن و وریابن، کاک فەرەیدون و کاک حەمەئەمین شەمێرانی هاتن و کەسێکیتریان لەگەڵە دەست ئەدەین و چاکوچۆنیمان لەگەڵ یەکتر کردو ووتم ئێوە مەڕۆن ئێمە ئەڕۆین، ووتیان نا ئێوە ماندوون و ئێمە پشوومان داوەو وارۆژیش ئەبێتەوە، هەر خۆمان ئامادە کردبوو بۆ ڕۆیشتن، ئەوان ڕۆیشتن ماڵیان ئاوا کە نەیان کوشتین و زیاتر لەوەش شوێنەکەیان بۆ چۆڵ کردین. دواتر زانیم لەو کاتەدا ئێمە چووینەتە ناو ئاوایی ئەوان پاسەوانەکەیان خەوی پێدا کەوتووە، کاتێک گەیشتووینەتە بەردەم ئەو ماڵەی ئەوان لەسەربانی خانوەکەیاندا خەوتوون کاک فەرەیدون خۆی خەبەری بۆتەوە، چەند کەسێکیش ویستوویانە تەقەمان لێبکەن نەیهێشتووە، هەرچۆن بووبێ منیان قەرزار کرد ماڵیان ئاوا.

ساڵی ١٩٨٤ یەکێتی نیشتمانی لەوتوو وێژدا بوو لەگەڵ ڕژێم، ئێمە لەدەشتی شارەزووردا ئازاد ئەسوڕاینەوە، پارتی دیموکراتی کوردستان بنکەو بارەگایان لەسەر سنوورەکان بوو، یەکێک لەبنکەکانیان لەوێرانەی ئاوایی دڵفی ناوچەی شەمێران دا بوو، بەرپرسانی ئەم بنکە لەوکاتەدا هەڤاڵان فەرەیدون جوانڕۆیی، خورشید شێرە، حەمەئەمین شەمێرانی بوون، هەرچەندە لەو دەمەدا ڕاگەیاندنەکانی بەرەی جوود بەتایبەت پارتی زۆر چەواشەکارانە کاریان ئەکرد، گاڵتە ئامێزانە لەسەر ئەو دانووستانەی یەکێتی

وحکومەت قسەیان ئەکرد، لەکوێش بۆیان ڕێککەوتبا دەستیان لە لێدانی پێشمەرگەی یەکێتیی نەدەپاراست.

ڕاست لەودەمەدا ئێمە هەواڵمان بۆ کاک فەرەیدون نارد سەردانیان ئەکەین، بەرلەوەی وەڵام وەرگرینەوە سەر لەبەیانییەک من و هەڤاڵان شەهید مەحمودی حاجی فەرەج و مامۆستا شاهۆ لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک چووینە ئاوایی ئیمامی زامن دوو گیسکمان کڕی و هەندێک برنگ و ڕۆنمان بردو هاوولاتی عیزەت عەبدوللا شەمیرانی خاوەن بەلەم و ماتۆڕ بوو دۆستی پارتیش بوو لەگەڵ خۆماندا بردمان و گەیشتینە بنکەکەی دلف، ئەوان پێشوازی گەرمیان کردین، ئەو ڕۆژە تائێوارە دۆستانە پێکەوە بووین وپێشمان وتن چیان پێویست بێت بەئێمە بکرێت ئامادەین هاوکاریان بکەین.

لەدلف شوێنی بارەگاکەیان سەرکانی و ئاوێک بوو لەسێبەری چەند دار پەلگ و سوورە چناردا، لەداوێن و بن قەلاکەی شەمیراندا، ئەو ڕۆژە چەند وێنەمان گرتن بۆیادگاری، کاک فەرەیدون، ئەورۆژە کاک خورشید شێرەی پێناساندم و ووتی شەوەکەی تووە قوت یەکترمان بینی کاک خورشید بوو لەگەڵمان، ئێوارە ئێمە گەڕاینەوە بۆ دەشتی شارەزوور.

# لەیەک گۆڕان و ڕێ هەڵەکردن

زۆر جار ڕێککەوتوە پێشمەرگە لەیەک گۆڕاون یان ڕێیان هەڵەکردووە لەئەنجامی ئەمەدا کارەساتی دڵتەزێن رویداوە، پێشتر باسی لەیەکگۆرانی شەهید غەفورو فەتاح ئێناخیم کردووە، بەهاری ١٩٧٨غەفور دەرەشیشی بەمەفرەزە چووبوە هەڵەبجەو دەورو بەری ماوەیەک بوو هەواڵمان نەئەزانین، شەوێک لەئاوایی گریانە لەمزگەوتەکەدا خەوتبوین، مامۆستا تاهیر عوسمان بەرپرسی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە بوو داوای لەگریانەیی کرد مەفرەزەیەک بنێرێت بۆ دەورو بەری سازان بۆ ئەوەی هەواڵێکیان بزانن، بڕیار درا فەتاح ئێناخی و سەلاحی حاجی عەلی (سەلاحە سوور) بچن بۆسۆراخیان، ئەوسەردەمە ئەبوو دەمەو بەیانیان بەرلەوەی ڕووناک بکات لەئاواییەکان بچینە دەرەوە، بەرلەبانگی بەیانی هەستاین ئێمە بەرەو ئەشکەوتەکانی بەڕوودار و ئەوان بەرەو سازان، ڕووناکی کردبوو ئێمە خەریکی چایی دەم کردن بووین، کاتێکمان زانی سەلاح بەشڵەژاوی واهاتەوە، پرسیاریان لێکرد ها چییە چی ڕوویداوە؟ ووتی سەرکەوتین بۆچاڵان لەسەر کانییەکەی قەمان[1] ، کەوتین بەسەر کەمینی جاشداو فەتاح شەهید بوو منیش دەرچووم.

---

[1]- قەمان ناوی ئەو کانییە ئەکەوێتە نێوان ئاواییەکانی بۆین، هاوارە کۆن، گریانە. ناوەکەی لەوەوە هاتووە قەمیان لەبەردا داناوە بۆ ئاو کۆکردنەوە، ئەوسا چیمەنتۆ نەبووە شوێن بۆ ئاو خواردنەوەی مەڕوومالات دروست بکەن، لەداری کلۆر قەمیان دروستکردوە، لە شنروێ و هاوینە هەواری تاریکەڵێنیشدا کانی قەمان هەیە. چاڵان ڕووبەرێکی فراوانە لە دارستان، درێژی لە هەواری وەزگێڵ و هاوارەوە دەست پێئەکات تاسەر ئاوی سیروان، پانتایی لەخورەوە چۆمی هاوار، هاوارەکۆن تا گریانەیە، لەسەرەوە چیای شنروێ تا چیایی داڵەڕییە، ئەم ھەڵکەوتەیە جگە لەوەی لەوەڕگەو پاوەنی چوار ئاواییە، سەرچاوەیەکی گرنگی داهاتی بنێشتیشە.

ئاواییەکانیش ئەمانەن بۆین، هاوار، هاوارەکۆن و گریانە. دارە بنێشتەکان یان دارە وەنەکان لەم دارستانەدا کەرت کەرتە هەرکەسەو هی خۆی هەیە کڕین و فرۆشتنی وەک

ئێمەش خۆمان ئامادە کرد بۆ شەڕ، خەریکی دابەش بوون بووین، وتیان وا کەسێک لەئاوایییەوە بەرەو ئێرە دێت، گەیشتە پێشەوە بۆمان دەرکەوت ڕەحیمی حەمەتەقیە یەکێک بوو لەپێشمەرگەکانی مەفرەزەکەی کاک غەفوور، ئەوە لەکوێوە چیتان لێهاتوە ئەم ماوە.......تاد، هەستن ئەم بەیانییە لەئاوایی بۆینەوە هاتینەوە بەرەو ئێرە لەکانی قەمان لەگەڵ فەتاح لەیەک گۆڕاوین تەقەمان لەیەک کردووە، فەتاح بریندارە هێناومانەتە خوار وا لەئاوای، هەندێکمان چووین بەدەمیانەوە، ئەزانین فەتاح برینەکەی سەختەو دوو فیشەک بەر حەوزی کەوتوون، بڕیار درا بیبەینە ئەشکەوتی هەزار پەن، گواستمانەوە بۆ ئەوێ ماوەیەکی زۆر لەو ئەشکەوتانە بوو تا چاک بووەوە. لەشوێنی خۆیدا چۆنییەتی چاکبوونەوەکەی باس کراوە.

لەبەهاری ساڵی ١٩٧٨دا، هەرلەم بارەوە شەوی ٢٦-٩- ١٩٨٥لە دەشتی شارەزوور لە نزیک گوندی تەپی سەفا مەفرەزەیەکی ناوچەی شۆڕشگێڕان و مەفرەزەیەکی ترمان لەیەک گۆڕان و کارەساتێکی ناخۆش ودڵتەزێنی لێکەوتەوە ئەویش شەهید بوونی دوو کادرو فەرماندەی قارەمان هەڤالان وریا غەفوور بیارەی و موختار شێخ ئەنوەر عەبابەیلێیی بوون، بەدەستی هەڤاڵەکانی خۆیان.

لەمانگی ١٩٨٧/١٢دا، مەفرەزەیەکی تیپی باڵانبۆ لەئاوایی باوە کۆچەک فەرماندەی تیپەکەی خۆیان شەهید کرد، ئەم تیپە بارەگایان لەدەوەرە بوولەپشت چیای باڵانبۆ، فەرماندەکەیان عەبدڕەحمانی میرزا حەسەن بوو، لەشوێنی خۆیدا بەوردی باسکراوە.

شەوێک لە دەشتی شارەزورەوە هێزێکی تیپی ١١ هەورامان کە نزیکەی ٧٠-٨٠ کەس ئەبووین، دوای بانگی شێوان لە جادەی سەرەکی سەیدسادق - هەڵەبجە لە ئاستی ئاوایی گردەنازێ پەڕینەوە بۆ گەیشتن بەشارباژێر، ڕەحمەتی کاک شەوکەت فەرماندەی هێزەکە بوو، پێشڕەوی قەتارەی بەڕێکەوتوو کەوتبوونە سەرڕێگایەکی تەختی چەوڕێژ، بەرەو بناری

---

باخی بەراوە بگرە گرانتریشە، بەداخەوە لەوکاتەوە ئاوایییەکان ڕاگوێزراون وە لە ناوچەکەدا گەلەو ئاژەڵ نەماوە، ساڵانە بەهۆی ئاگر کەوتنەوەوە هەرساڵەو برێکی زۆر لەودارە بەنانە ئەسووتێن و لەبن دێن.

چیای سوورێن ئەچوو، دوای نیوو کاتژمێر، ئێمە کەلەپشت سەری دەستەی پێشڕەوەوە بووین گەیشتینە دەرگایەک، خانوویەک لەپاڵ دەرگاکەدا بوو شوڵەی چرایەکی کز دیارە من کەوتمە گوومان، دەستەی پێشڕەو لە خانوەکە دەرچبوون و چوونەتە ناوەوە، بەکاک شەوکەتم ووت ئەمە ئاوەدانییە بەدەنگی بەرز ووتی: ئابزانن ئەم خاوەن بیرە ئاویان لایە، لەگەڵ ئەمەدا بوو بەتەقە، ئەمە سەربازگەیە و ئێمە ڕێگەمان هەڵەکردووە.

لەچاوو تروکانێکدا ئەوهێزە کەسی لەسەر جادەکەدا نەما، بەملاو بەولای جادەکەدا بەرەو دواوە گەڕاینەوە، شەهید فەیسەڵی مەلاعەلی دەستەی پێشڕەوە مەجالی گەڕانەوەی نەبووە، لە گۆشەیەکی سەربازگەکەوە بەرەو شانەدری قووتار بووە، ئێمە گەشتینەوە ئاوایی گردەنازێ و لەوێ سەرژمێری کەرت ومەفرەزەکانمان کردەوە، هەموو تەواوە جگەلە فەیسەڵ. ئەبێ دوور کەوینەوە چونکە سبەینێ دوژمن چاودێریمان ئەکات، کەوتینە ڕێ بۆ ناو گوڵە بەرۆژەکانی ئاوایی بیەڕەشکە، ڕۆژ بووەوە و لەخەمی فەیسەڵ داین، لای نیوەڕۆوە دۆست لەشانەدەریەوە هاتن و مژدەیان داینێ فەیسەڵ لەلای خزمەکانیماڵی حاجی کاکەلیە. بنەماڵەی ماڵی حاجی کاکەلی خزمەتی زۆری یەکێتیی و شۆڕشیان کردووە لەشارەزووردا.

# دروست کردنی کەرتێکی نوێ

لە دوای کەرت بوونی هەرێمی یەک و ڕۆیشتنی بەشێکی لەگەڵ کاک حەمە، پاش ئاسایی بوونەوەی سنوورەکە، هەرێمەکە دروست کرایەوەو لیژنەی هەرێم دروست کرا بۆ سەرپەرشتی وبەڕێوە بردنی. هێزەکانی سەر بەهەرێمەکە لە دەشتی شارەزوور هەموو پێکەوە بووین، ڕۆژێک لەناوچەی کەلالی نشین لە ئاوایی قەڵبەزەی ئاگاداریان کردم، ئەو کەرتەی شەهید ئەحمەد گریانەیی کە دوای گرییانەی غەفوور دەرەشیشی فەرماندەیی بووە دوای شەهید بوونی غەفوور دەرەشیشی تۆ جێگری کەرتەکە بوویت و سەرپەرشتیت کردووە. ئێستا ئەبێت برادەرێکی تر بێت و ببێتە فەرماندەی کەرت و تۆ هەروەک جێگیر بمێنیتەوە.

منیش لاریم کردو ووتم ئەم کەرتە باشترین کەرتی هەرێمی یەکە و بێ فەرماندەیی پێوە دیار نەبووە و ئەبێ خۆم فەرماندەی بم، چەند هەوڵ درا ئێمە ڕازی نەبووین. لیژنەی هەرێم بڕیاریاندا کەرتەکە ببێتە دوو کەرت من و برادەرەکەی تر هەریەکەو فەرماندەی کەرتێکیان بین، ژمارەی کەرتەکە ئەو ڕۆژە ٢٢ بیست و دوو پێشمەرگە بوون. ئەم بڕیارە بە ناچاری هەرێم دەری کرد. بۆیە سەپاندیان بەسەر مندا کە ئەبێ تۆ شەش پارچە چەک لە ٢٢ بیست و دوو چەک ببەیت، منیش ڕازی بووم. ئەمزانی لە ماوەیەکی کەمدا بەو شەش چەکەوە گەورەترین وبەهێزترین کەرت دروست ئەکەمەوە، بۆ جیاکردنەوەی پێشمەرگە بڕیار درا ئارەزوو مەندانە بێت.

شەوکەتی حاجی مشیر، حاکم عومەر عەزیز، حامد حاجی خالد لیژنەی هەرێم بوون. لە تەنیشت ئاوایی قەڵبەزە لەوێوە کە ڕێگە بەرەو کانی بەردینە ئەڕوات. پێشمەرگەیان کۆ کردەوە. واتە پێشمەرگەکانی کەرتی دووی هەرێمی یەک، و زۆربەی فەرماندەی کەرتەکانی تر و هەندێک پێشمەرگەشیان لەو کۆبوونەوەدا ئامادە بوون. لەوانە فەرماندەکانی وەک مەحمودی حاجی

فەرەج، ئەحمەد شاتوانی، مەحمود گەرمیانی، جەلال کولکنی، ئیبراهیم کۆیی، دلێر جاف... تاد.

من و برادەرەکەی تریان هەریەکە و لە لایەکەوە داناو ووتیان ئەوانەی ئەچنە لای حەمە با بێنە تەنیشتی ئەو، ئەوانەشی لە کەرتە ئەسلیەکەدا ئەمێننەوە با بێنە لای م.ش. ژمارەی پێشمەرگەی کەرتەکە٢٢ بیست و دوو پێشمەرگەن، ١٨ هەژدەیان هاتن و لەم لاوە لەلای مندا وەستان، چوارکەسیش مانەوە لە کەرتەکە، کەئەم هەڤاڵانە بوون نیازی عیزەت، سوهاد خانەقینی، ئەمیر سەعید تایەر، حەمەهاواری . هەڤاڵ شەوکەت هەڵی دایەو ووتی، حەمە شەش چەکی هەیە ئێوە ئەبێ ١٢ کەستان بێ چەک بێت. ڕزگاری عەزەقوڵ بە تەعەلیقەوە ووتی بە تێلاشەوەبێ لەم کەرتە پێشمەرگایەتی ئەکەین. برادەران زۆر هەوڵیاندا کەس پەشیمان نەبووەوە. بۆیە ووتیان باشە با چەکەکان لای ئێوەبن. هەر کاتێک پێشمەرگەیەک هات بۆ ئەم کەرتەی م.ش ئێوە چەکێکی بدەنەوە. ووتمان باشە شەش چەکەکەی لای ئێمە دیاری کراو ١٢ دوانزە چەکەکەی تریش دیاری کران. کەچی لەناکاو م.ش ووتی مەخزەن و فیشەکی ناو مەخزەنی ئەو ١٢ دوانزە چەکە بژمێرن. لەسەر ئەم قسە پێشمەرگە ئەوانەی دوانزە چەکەکەیان پێ بوو دایان نان و ووتیان فەرموون ولاخێک بگرن باریکەن، ئێمە چەکی ئامانەت وەرناگرین و لەگەڵ خۆتان ببەن. بارودۆخی کۆبوونەوەکە ناخۆش بوو. بۆیە لەسەر داوا و تەکلیفی حاکم عومەر عەزیز ئێمە ڕازی بووین چەکەکان نەدەین بەسەر هەڤاڵانی ترداو لای خۆمان بن، تائەو کاتەی چەک دەست ئەخەین وئەوانیش پێشمەرگەی نوێیان بۆ دێت.

ماوەیەک پێکەوە لە شارەزووردا جەولەمان کرد. ئێمە کەرتی تازە تەشکیل کراو سەرکەوتینەوە بۆ هەورامان، چەکێکی (ئاڕ بی جی) هەبوو لای کەرتە ئەسلیەکە مایەوە، ئێمە بێ (ئاڕ بی جی) بووین. ئەو سەردەمە هەر کەرتێک ئاڕ بی جی نەبوایە نوقسانییەکی گەورە بوو. ڕۆژێک کە لەناو گردان بووین بەرپرسیارانی هەرێمکە زانیان کارێکی هەڵەیان کردووە، کاک شەوکەت ووتی: حەمە ئێمە ئەمانزانی ئاوای لێدێت، ئەوە ڕەئی لیژنەی هەرێم نەبوو، ئەوە پێشنیاری کۆمەڵە بووە بۆ جەنابی مام جەلال.

لەناو گردان داوایان لە کەرتەکانی تر کرد هەر کەرتە و چەکێک بە دیاری بدات بەم کەرتەی ئێمە. شەهید مەحمودی حاجی فەرەج کەرتەکەی ١٤ کەس بوو واتە لەو چواردە چەکەکە چەکێکی دروست کرد کلاشینکۆفێکی خۆرکە لێدراو سەرداری شکاو سەر قەپاخی قوپاو بێ زمە و قۆنداخێکی قلیشاو. ئێمەش ووتمان ئەسپی هەدیە سەیری ناودەمی ناکرێت و وەرمان گرت.

ئەو ڕۆژەو لەوێ لەهێزەکە جیا بووینەوە و سەرکەوتینەوە بۆ گریانە و بۆین. کلاشینکۆفەکەی مەحمود و دانەیەکی ترم گۆڕیەوە بە (ئار بی جی) یەک لەگەڵ کاک کاوەی بارامی، لەلای هێزی شاهۆی حیزبی دیموکرات. پاش ماوەیێک چووینە ئاوایی بۆین، تووشی مەفرەزەیەکی حیزبی دیموکرات بووین کە هەڤاڵ محەمەد نەزیف قادری لەگەڵیاندا بوو. چەند ولاخێک بارکرابوو لە چەک و چۆلە و فیشەک و هاوەن، لە لای سازانەوە بەرەو هاوارە کۆن و دەرەتفێ ئەچوون، یەکێک لە پێشمەرگەکان پێی ووتم ئەوە ئەکبەری ڕەواییە لەگەڵیان.

ئەکبەری ڕەوایی فەرماندەی مەفرەزەی مخابەرات بوو لەو هێزە عەشایرانەی ئێران کە لەو کاتەدا عێراق چەکداری کردبوون و دژی ئێران ئەجەنگان. ماوەیەک پێشتر هەڤالان مەحمودی مامە عەزە و حاجی عەبدوڵلا و ئەو پێشمەرگانەی ناوچەی بەمۆی یەکێتی ٤٠٠ چوارسەد سەر مەڕی عەرەبی هاواردەیان لەناوچەی قورەتو و چوار ک لاوەوە هێنابوو تووشی شەڕ بوون و عێراق بە کۆپتەر لێی دابوون، بەلام مەڕەکانیان گەیاندە درۆڵە و لەوێوە بەسەر سنووردا ئەیانهێنا بۆ ناوچەی هاوار بۆ لای ئێمە، لە ئاوایی هێرتای ئێناخی نشین ئەکبەر و چەند کەسێکی تر هێزێکی نزیکەی ٥٠٠پێنج سەد چەکداریان لەگەڵدابوو مەحمود و هەڤاڵەکانی میوانداری ئەکەن و شەو تەکبیر ئەکەن چەکیان کەن و ڕانە مەڕەکە تەسلیم بە عێراق بکەنەوە. بۆیە هەڤاڵێکی چەکدار لەو هێزەدا بەناوی ئەمینی عینایەت کە پێشتر پێشمەرگەی یەکێتی بووبوو، ئاگاداری مەحمود ئەکا و شەو دەربازیان ئەکات. بۆ بەیانییەکەی گەیشتنەوە لای ئێمە لە ئاوایی گریانە و ئەوانیش ٤٠٠ چوارسەد سەر مەڕەکەیان تەسلیم بە مخابەراتی عێراق لەهەڵەبجە کردەوە لە دەشتی سازان. لەسەر ئەمە لە ئاوایی بۆین ئەکبەر کە لەگەڵ برادەرەکانی حیزبی

دیموکرات بوو لێمان سەندن. هەرچەند ووتیان ئەکبەر بۆتە دیموکرات و بۆ لای ئێمە دێت، بەڵام من ڕازی نەبووم. بەزیندانی کراوی ئەکبەرم برد بۆ گریانە. کاک حەمەنەزیفی باینگانی بەرپرسی برادەرانی حیزب بوو ووتی باشە بیبەن بەڵام داواکارین ئەم پیاوە بپارێزن سەلامەت بێت تا ئێمە لەگەڵ سەرووی خۆماندا قسە بکەین منیش بەڵێنم دایە کەسەلامەت ئەبێت. چونکە لەگەڵ حیزب دۆست بووین و لەو سنوورەدا بنکەو بارەگاکانمان نزیک بوون لەیەکەوە.

هەرئەو شەوە حیزب ئاگاداری دۆکتۆر عەبدوڕەحمان قاسملو ی کردبوو. ئەویش جەنابی مام جەلال ئاگادار کردبوو، لە گرتنی ئەکبەر، مام بەبروسکە ئاگاداری کردم بیدەمەوە دەس حیزب. منیش دووبارە بەبروسکە ڕوونم کردبوەوە ئەکبەر ئەو کەسەیە کە ویستی مەحمودی مامە عەزە و هەڤاڵەکانی چەک بکات، بەڵام دەربازبوون و ڕانە مەڕەکەی بردەوە بۆ حکومەتی عێراقی. دیارە حیزب داوایان لە مام جەلال کردبوو کە ئەکبەریان بدرێتەوە. من ئێستا نازانم ئەوان ئەوکات چیان بە مام ووتبوو. مامیش دووبارە بە بروسکەیەک بۆ ئێمە ئەڵێت:

( لە/ مام جەلالەوە،

بۆ /هەڤاڵ حەمەی حەمەسەعید،

بە گەیشتنی ئەم بروسکەیە ئەکبەری ڕەوایی تەسلیم بە برادەرانی حیزبی دیموکرات بکەنەوە). ئێمەش دەست بەجێ ئەکبەرمان تەسلیمی برادەرانی حیزب لە هێزی شاهۆ کردەوە. ئەو چەند شەو و ڕۆژەش لامان بوو ڕێزمان گرت و هیچ جۆرە سووکایەتیەکمان پێ نەکردبوو.

دوای چەند ڕۆژێک ئەکبەری ڕەوایی یەک چەکی ئار بی جی و کلاشینکۆفێکی بە دیاری بۆ ناردبوم، ئەوەندەی نەبرد ئەکبەر لە لایەن ڕژێمەوە گیرا. کەس و کاری هاتن بۆ لای من و داوای ئار بی جیەکە و کلاشینکۆفەکەیان کردەوە. گوایا ڕژێم زانیویەتی و ئەمەش ژمارەکانیان، لەسەر پارچە کاغەزێک دوو ژمارەیان نووسیبوو، زۆر سادە بوون داوایان ئەکرد، من ئەو چەکانە بگێڕمەوە تا ڕژێم ئەکبەر ئازاد بکات. ئێمەش لەبەر

ئەوەی لەسەری نەسەلمێنرێت حاشامان کرد ووتمان شتی وا نییە و ئەکبەر چەکی بە ئێمە نەداوە، بەنائومێدی گەڕانەوە. دواتر ڕژێم ئەکبەری ڕەوایی بێسەر و شوێن کرد.

یەکێتی لە وتوێژی ساڵی ١٩٨٤ دا لەڕێی لیژنەی تەنسقەوە داوای ئازاد کردنی ئەکبەریان کرد لە ڕژێم، لەوەلامدا ووتبوویان نەماوە. بەپێی زانیاریەک ئێمە هەمان بوو ئەکبەر لەلایەن حەمەی حەمە تاهیر بەگەوە ڕاپۆرتی لەسەر درابوو، ژمارەی دوو چەکەکەی دابووە موخابەرات چونکە حەمە لەگەڵ ئەکبەر پێکەوە بوون، هاوسەری ئەکبەر خوشکی حەمە بوو، زاواکەی خۆی دا بە ئیعدام کردن، ئیتر نازانین ئەم هەواڵە ڕاست بوو یانا.

هەر لەم سەر و بەندەدا هەڤالانی کەرتەکەمان ژمارەیان لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە زیادی کرد، ئەکبەر ئێناخی، فاتح مستەفا ئێناخی، هاشم بۆینی، کەیکاوس کۆکۆیی و چەندین پێشمەرگەی تر پەیوەندی پێوە کردین و کاک ئەکبەر و فاتح مەفرەزەیان بۆ کرایەوە و ئەوانیش هەر لەو ماوەدا لە چالاکیەکدا لە ملە خەڵوزە سێ سەربازیان کوشت و سێ پارچە چەکیان دەست کەووت بوو. لە چەمی پالانیاش سەربازێکی تر گیراو کلاشینکۆفێکی تر دەست کەووت بوو، کەرتی دووی هەرێمی یەک کە تازە بووبوو بەدووکەرت و ئەو کەرتەش کە خاوەنی شەش پارچە چەک بوو، بوو بەخاوەنی دوو ئاڕ بی جی و نزیکەی ١٥ چەکی کلاشینکۆف.

هەر لەم ماوەدا سەردانی جەنابی مام جەلالم کرد و ئەویش نزیکەی دوانزە پارچە چەکی ژ-٣و بڕنەو و کلاشینکۆفی بۆ کڕیم. پارەی بۆ سەرف کردین بردمانە ئاوایی میراوێی نزیک شنۆ کە بازاڕی چەک فرۆشتنی لێبوو چەکەکانمان کڕی و هێنامانەوە بۆ هەورامان. وەرزی هاوینی ئەم ساڵ کەرتەکانی تری سنووری هەڵەبجەش هاتنە هاوارە کۆن و ئێمەش لە گریانەیین. ئێمە منافەسەی چالاکی کردن و زیاد کردنی پێشمەرگە و چەک ئەکەین.

ئەو ڕۆژەی لە ملەخەڵوزە سێ سەربازەکە کوژران و چەکەکانیان گیران، ڕژێم تۆپ بارانی ناوچەکەی کرد و بارودۆخ تێک چوو. فەرماندە و هەڤالانی کەرتەکانی تر هاتن بۆ لامان بۆ دەست خۆشی و پیرۆزبایی. هەڤاڵێکی فەرماندەی کەرت کە پێشتر داوامان کرد ئاڕ بی جی کەرتەکەیمان

بداتێ بە ئامانەت بۆ ئەوەی چالاکیەکی پێ بکەین نەیدایێ. ئێمەش ئێستا بووینەتە خاوەن دوو ئارپ بی جی و چەندین چەکی زیادەو ئەم ڕۆش زۆر شانازی بە خۆمانەوە ئەکەین کە سێ سەرباز کوژراوە و چەکەکانیان گیراوە. کەچی ئەو فەرماندە ووتی:دەستان خۆش، بەلام سێ عەسکەری خوێڕی چییە. تەقەتان لێ کردن بۆ بەدەست نەتان گرتن. ئەم تۆپ بارانە و هۆسە و هەرایە ڕوی نەئەدا، مەحمودی حاجی فەرەج نەیهێشت ئێمە وەلام بدەینەوە، ووتی: فەرموو جەنابت برۆ بەدەست بیگرە، ئەوە هەموو ڕەبیە و عەسکەرن لەم سەر یالانە.

## شەڕی قاجرو ئەزموونێکی نوێ

پایزی ساڵی١٩٨٢ لە ناوچەی شارباژێڕ ئەو هێزەی هەرێمی یەک کە پێک هاتبوو لە کەرتەکانی بناری هەڵەبجە و هەورامان و کەرتەکانی دەشتی شارەزوور کۆبوو بووینەوەو بڕیار درا بێینە دەشتی شارەزوور لەجێگەیەکدا کە ئێمە هەڵیبژێرین دەستێکی باش لە دوژمن بوەشێنین. بۆزیاتر بەهێزبوونی دەست وەشاندنەکە کەرتێکی هەرێمی سێی شارباژێڕ و کەرتێکی هەرێمی پێنجی قەرەداغ ئامادەکران لەگەڵ هێزەکەی ئێمەدابن. ئەو دوو کەرتەش کەرتی دووی بازیان شێخ جەعفەری شێخ مستەفا بەرپرسی بوو ، ئەوەی هەرێمی٣ ش وەهاب بەرپرسی بوو.

دوای ئەوەی گەیشتینە قولیی دەشت هێزەکە بەرەو سنووری هەڵەبجە و خوڕماڵ، ئاواییەکانی تاسلوجە، هەردوو سۆیلەمێش، کەڵتەکە، کەڵوڕان، بیەڕەشکە و ناوگردانی خستە دواوە، ئەم ئاواییانە ئەکەونە تەختایی دەشت لەبەردەم شارۆچکەی سەیدسادق دان، لە هەشتاکاندا بەردەوام پێشمەرگە لە هاتوچۆو مانەوەدا بووە لەم ئاواییانەدا.

ئێمە بە ئاشکرا و بە ڕۆژیش لەم ئاواییانەدا ئەماینەوە و بە تایبەت لەم سەفەرەدا بێمنەت بووین لە ڕژێم و حەزمان ئەکرد هێرش بکاتە سەرمان. ئێوارەیەک هەموو هێزەکە لەناوگردان کە نزیکە بە چەقی شارەزوورە یەکمان گرتەوە. ڕژێمیش زانیاری وردی لەسەر هێزەکە و مەسیرەکەی کۆ ئەکردەوە.

وردە وردە هێزی ئامادە ئەکرد لە ناوچەکەدا، جگە لە چەند فەوجێکی سەرباز بەسەدان جاشی لە دەرەوەی ناوچەکە، لە ناوچەکانی کۆیە و چەمچەماڵ و گەرمیانەوە هێنایە سنوورەکە. ئێمە کە زانیمان ڕژێم پەلامار ئەدات. دوای ئەوە ئاوایی ناو گردانمان جێهێشت بووینە دووبەش، واتە دوو ڕەتل ڕەتلی یەکەم چووینە ئاوایی قاجر، ڕەتلی دووەم لە گردی شەریف مانەوە، نێوان ئەم دوو ئاواییە نزیکەی ٢ کیلۆمەترە. ئەو هێزەی لە گردی شەریف بوون حامدی حاجی خالید فەرماندەی بوو، کەرتەکەی قەرەداغیش لەوێ مانەوە. ئەم ئاواییە نزیکە لە ئاوایی گردە نازێ و گردەکەشی دەست کردە و لە

مێژوودا ناوی قەرە تەپەیە. ئەم دوو ئاوایییە لای باکوریان جادەی گشتی سەیدسادق- هەڵەبجە و پردی زەڵمە، لای ڕۆژهەلاتیان جادەی سەرەکی پردی زەڵم- هەڵەبجەیە. لای باشوورو باشووری خۆرئاوایشیان ئاوی دەریاچەی دەربەندیخان و چەمی تانجەرۆیە.

ڕێکخستنی شاریش لە سەیدسادق و هەڵەبجەوە بەردەوام زانیاری ئەنێرن بۆ هێزەکە. لەم سەرو بەندەدا لایەنەکانی تری بەرەی جود کەووتبوونە ب لاوەکردنەوەی پروپاگەندە بەدژی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بە تایبەت یەکێک لەو شتانەی یەکێتی یان بێ تۆمەت بار ئەکرد ئەیانووت یەکێتی و ڕژێم پەیوەندییان هەیە، ئەگەر وانییە چۆن بە ئاشکراو بەو هێزە گەورەوە ئەوە چەند ڕۆژە لە ناوەڕاستی هێزەکانی دوژمندا لەناو ئاوایییەکاندا ماونەتەوە جەولە دەکەن.

ئێوارەکەی لە هەڵەبجەوە هەواڵمان بۆهات ڕژێم ئەو هێزانەی کە لەدەرەوەی ناوچەکە هێناویەتی لەشارۆچکەکانی سەیدسادق و خورماڵ مۆڵی داون، هێزەکانی ناوچەکەشی لە هەڵەبجە و سیروان و پردی زەڵم ئامادە کردووە، فڕۆکەخانەی تایبەت بە هێلیکۆپتەری جەنگی لە تانجەرۆیە، زیاتر لەجاران هێلیکۆپتەری بۆ هاتووە. خۆمان ئامادە کرد بۆ دەمەوبەیانی پێمان وابوو لە تاریک و لێڵی بەیانیدا هێرش دەکەنە سەرمان، ئەوانەی لە ئاوایی قاجر بووین کەرت کەرت لە دەوری ئاوایی خانووی خەووتنمان گرت و بڕیاریش درا ئەو شەوە هەر کەرتێک لە باتی یەک پاسەوان دوو دوو پاسەوانی هەبێت، کاتژمێر سێی شەویش هەموو هەستین و لە دەوری ئاوایی سەنگەر بگرین.

لە ئاوایییەکانی دەشت و تەختاییدا ڕێوڕەوشی شەڕ جیاوازە لەگەڵ ئاوایەکانی ناوچە شاخاویەکان، لە ناوچە شاخاویەکاندا لەسەر بەرزایی و شوێنە سەختەکاندا خۆت ئامادە دەکەیت بۆ بەر پەرچدانەوەی هێرشی دوژمن، بەڵام لەدەشتدا نابێ دەست لەناو ئاوایی کەندەڵان و ئاودڕو گوێ جۆگەو ئاوەکان بەردەیت. ئیمڕۆ لەقاجر دەمەو بەیانی کش و بێدەنگ دونیا ڕووناک بووەوە، ئەو شوێنانەی لەبەر دیدی ئێمەدا بوون چ جووڵەیەک نەبوو. چونکە لە دەشتدا بەتایبەت ئەو ئاوایییانەی ئاودار و چەم و بێشەن، پارتیزانەکان بوردی بینینیان بە هۆی بێشەلانی زەل و پیزڵ و تووترک و

دارییەکانەوە کەمترە. کاتژمێر بووە ٨ بەیانی ﻉ جموجوڵێکی نائاسایی نییە، بۆیە ئاگاداری پێشمەرگەکانمان کردەوە هەرکەس لێفە و بەتانی شەو بۆ خەوتن لە ماڵان هێناوە بیانبەنەوە. پێشمەرگە ب لاوەبوونەوە هەندێک بۆلای مزگەوت و سەرچەم بۆ دەموچاو شتن و هەندێکیش بۆ لای خانە خوێی ئێوارەو بردنەوەی پێخەفەکان بۆیان.

لەم کاتەدا ئێمەچەند کەسێک لەشوێنی خۆماندا وەستاوین و چاودێری دەورو پشتی ئاوایی ئەکەین، لەپڕپێشمەرگەیەک بەناوی مالیکی حەمە عەلی کە ئێستا ماوە و لای پارتی پێشمەرگەیە، دوور کەتبووەوە لەماڵەکان، بە ڕاکردن گەڕایەوە ووتی هاتن، دیارە مەفرەزەیەکی لە جاشەکانی هەڵەبجە کە نزیکەی ٢٥ کەس ئەبوون دەنگیان دابوو، ئەویش بەڕاکردن هاتەوە بۆ لای ئێمە، بەشێکی کەمی پێشمەرگە ئاگادار بوون لەمە، جاشەکان لە دوولاوە لە ڕووی باکووری ئاواییەوە گەیشتنە پەنای ماڵەکانی ئاوایی. یەکەم دەستڕێژ چەند پێشمەرگەیەکی قارەمان کردیان و هەموو پێشمەرگە بەهۆی تەقەکانەوە ئاگاداربوون و هەرکەس بە ڕاکردن بۆ جێگەی خۆی لە هەرچوار دەوری ئاوایی ماڵەکان کرانە سەنگەر.

لەم دەست ڕێژەی سەرەتای بەیانییەدا نزیکەی ١٦شانزە جاش کوژران. چەکەکانیان دەست پێشمەرگە کەووتوو جیهازی ئەو ڕەتڵەی دوژمنیش کەپەیوەندی بەکۆپتەرەکانەوە پێئەکرا گیراو کەوتە دەست ئێمە، لێمان نەئەزانی، ئەمە ڕێکەوتێکی زۆر باش بوو، دوژمن لەناکاو لەدەستپێکدا گورزی کوشندەی بەرکەوت. لەدوای ئەمە ماوەیەک تەقە نەماو مەیدانی شەڕەکە ماتەمی باڵی بەسەردا کێشا، وەک بڵێیت هەر ئەم ١٦ شانزە کەسە بوون و تەواو. دوای یەک کاتژمێر لەچەند لای ترەوە هێرش دەستی پێ کردەوە، بەڵام لە هیچ قوڵێکەوە نەیانتوانی نزیکی ئاوایش ببنەوەو ١٦ شانزە جەنازەش لەدەست ئێمەدایە.

لەلای باشووری قاجرەوە جێگەیەک هەیە پێی دەووترێت توی سەیدەکان ئەشکەوتە نێوان قاجر و گردی شەریف چەند دەبابەو ناقلە جێگیر بووبوون، لەڕووی دەریاچەکەوە. ئەمە زۆر بۆ ئێمە باش بوو، چونکە ئەگەر کەسێک یان مەفرەزەیەک بیری خۆدزینەوە و پاشەکشەیان هەبێت تازە تەواو و ناتوانن، ئەبێ لە ئاوایدا تادوا فیشەک شەڕ بکەن.

ئەم هێزە فەرماندە کەرتەکانی و مەفرەزەکان هەموو پێشمەرگەکان قارەمان بوون، باش بەرگرییان کرد لەناو ئاواییدا، کاک شەوکەت لەسەر ئەو گردەی ئەکەوێتە سەر لێواری چۆمی ڕیشێن کە بەقەراخ ماڵەکاندا ئەڕوات، فەرماندەی شەڕەکەی ئەکرد. من لەگەڵ کەرتەکەی لای خۆم ، سەرگەرمی پاراستنی ئەو شوێنە بووین کە بۆمان دیاری کراوە، بەر لەنیوەڕۆ پێشمەرگەیەک هات بۆلام ووتی کاک وەهاب ئیشی پێتە. چووم بۆ لای ووتم: فەرموو: ووتی پێشمەرگەی ئێمە زۆریان ڕانەهاتون لەسەر شەڕی ناو دەشت و تەختایی، ئەگەر زۆرمان بۆهات بچینە ئاواییەکەی خوارەوە بۆ لای ڕەتڵەکەی کاک حامد چۆنە؟ ووتم: نازانم برۆ لەگەڵ کاک شەوکەت قسە بکە. چونکە ئەم پرسیارە پەیوەندی بە منەوە نەبوو بتوانم وەڵامی بدەمەوە، منیش فەرماندەی کەرتێک بووم وەک ئەو، کاک وەهاب ڕۆیشت ومنیش گەڕامەوە شوێنەکەی خۆم.

دوای نیو کاتژمێر دووبارە کاک وەهاب خۆی هاتەوە هاتەوە و پێی ووتم ئا وەرە، خۆی کەوتە پێشم بەرەو لای باشووری ماڵەکانی ئاوایی و کەرتەکەی خۆیشی لەوێ دا بوون. دووبارە بانگم کرد کاک وەهاب چییە؟ هەر ووتی تۆ وەرە، چووینە دەرەوەی ماڵەکان لەوشوێنەدا پەیژەیەک پاڵدرا بوو بە دیوارێکەوە. خۆی لەپەنا پەیژەکەدا وەستاو ووتی: ئا سەرکەوە چوومە سەر پەیژەکە و ووتی سەیری ئەو گردەی خوارەوە بکە، ئەوە ئەو ئاواییە نییە حامد و هێزەکەی تری لێ مانەوە؟ من بەرلەوەی وەڵامی بدەمەوە سەیرم کرد، گردەکەی گردی شەریف کەپێی ئەووترێت قەرەتەپە نزیکەی ٢٠٠ دوو سەد چەکدار بەقەرەباڵخی لەسەر گردەکەن و ئالای عێراقی لەسەر هەڵکراوە و کۆپتەر بەنزمی بەسەریاندا ئەسووڕێتەوە، ئاوڕم دایەوە گووتم: با ئەوە گردی شەریفە و جەیش و جاشی لێیە.

من هاتمە خوارەوە کاک وەهابم بەجێ هێشت، وەهاب فەرماندەیەکی قارەمان و بەهیمەت بوو، بەرەو لای گردی ناو ئاوایی ڕۆیشتم، بینیم کاک شەوکەت خۆی بەزەویدا داوە بەتفەنگێکی برنەوی وەست تەقە ئەکات، سالە پوقەیی لەپەنایدایە، چەکە برنەوەکە هی دەستی ئەو بوو. کاک شەوکەت ڕوخساری سوورسوور هەڵگەڕاوە، پێچی جامەدانی سەری درزی تێ کەوتووە، پێچێکی جامەدانییەکەی هاتووەتە سەر برۆی و پێچەکەی تری

چووە سەر تەوقە سەری، تاسی سەری و سەروو نێوچەوانی دەرکەوتوە، نیوی باری گرتوەو دەنگی نووساون. ها حەمە چییە؟ منیش پێم ووت ئەوە تکات لەگردی شەریف هەیە؟ ئا، باسی مەکە برۆ مەفرەزەیەک بنێرە لەگەڵ حەمە هاواری بۆ سەر ڕێگای قاجر – کشەدەری، ئەی کاک حامد و ئەوان چیان لێهاتوە؟ واز لەوە بێنە. زوو برۆ حەمە هاواریم بۆ بنێرە خۆت لەشوێنی خۆت بە و ئاگاشت لەلای کاک وەهاب بێت، ووتم زۆرباشەو من گەڕامەوە.

بە دەمی بیرکردنەوەوە ئەو هەموو هێزە لە گردی شەریف چیان لێهاتوە؟ ئای کاک شەوکەت لە چەند کەمین و شەڕو پیلاندا ڕزگارت بوو وا ئیمڕۆ ئاخر جارە تەواو ڕزگاربوونت نییە، خۆشمان هەروەها، ماوەیەکی ترهیمەت بکەین ڕۆژ بەرەو تەواو بوون نزیک بکەینەوە رزگارمان ئەبێت.

حەمە هاواری و مەفرەزەکەم ناردە لای کاک شەوکەوت و کاتێک حەمە لە ئاوەکە ئەچێتە ئەوبەرەوە، لەسەر ڕێگای کشەدەری– قاجر سەنگەر بگرن، مەفرەزەیەک بەرەو قاجر دێن ،دەنگیان ئەدەن ئەوە ئێوە کێن؟ من شەریفە سوورم بۆلای ئێوە دێم. شەریفە سوور کوڕێکی قارەمان بوو، لەگەڵ هێزەکەی لای حامد بووە. بەهۆی ئەمانەوە، زانیمان حامد و هێزەکەی چیان بەسەر هاتووە ئاسوودەبووین.

ڕۆژ گەیشتە نزیکەی کاتژمێر دوو، چەندین پۆلە کۆپتەر دێن و خۆیان خالی ئەکەنەوە و ئەگەڕێنەوە، بەردەوام ئاسمانی ناوچەکە مەیدانی پۆلە کۆپتەرە، جار جار بە تەقەی برنەو هاوێشتنی موشەکی ئاربیجی حەوت لە قولیی ئاسمان توند ئەبن، جارجار لە چاو ئەم پۆلە ون ئەبن و کەچی لە لایەکی ترەوە دێنەوە، تۆپخانە لە قەدەفەرییەوە بە ٨١ملیم، لە دەلێنەوە بە ١٢٠ ملم لە شاندەری و وشقوبەوە هەروەها پچڕانی نییە، چەند بۆمب ئەدات بە زەویدا ئەوەندەی تر بە هەواوە دێن، ناو ئاوایی وەک ڕۆژی حەشرە یەکپارچە بووە بە چرە دووکەڵ، قەل و مریشک و مەڕ کوژراون دووکەڵ و بۆنی باروووت هەموو لایەکی گرتوەتەوە، کاتمان گەیاندە سێی پاش نیوەڕۆ، چوومە لای کاک شەوکەت، ووتی: ها حەمە بارووودۆخەکە چۆن ئەبینی؟ ووتم: دوژمن بۆیە ئەم زەختە ئەکات مەیتەکان بەرێتەوە، ئی ئەڵێیت چی؟ ووتم تائێستا باشمان هێناوە بۆ وردەوردە لەم گوێجۆگەوە مەجالێک هەیە پاشەکشە نەکەین بۆ ناو بێشەلانی گوێی زەڵم، ووتی بابزانم،

لەم کاتەدا کاک شەوکەت یەک یەک فەرماندە کەرتەکانی بانگ کردوەو پێی ووتون ئەوە حامد و رەتڵەکەی تر لەچەمی زەڵم و لەناو چەم وبیەکەی سەر بگاری تەپە تۆڵەکەن. چی بکەین؟ لەوانە: م.شاهۆ، کاک وەهاب...تاد، من نازانم هەرکەس رای چی بووە. بەڵام کاتێک خۆمی بانگ کردەوە و هەواڵی شوێنی هێزەکەی تری دامێ و ووتی: چی بکەین؟پێم ووتبوو: ئێمە تائێستا سەرکەتوین، دەست کەووت هەیە، ئەم زۆرەی ئەم دواییە هی ئەوەیە ڕژێم ئەیەوێت ئەم جەنازانەی بەجێ نەهێڵێ، ئێمە زیانیشمان نییە، ئەوە کاتژمێریش بووە بە٣ی پاش نیوەڕۆ بۆ وردە وردە پاشەکشە بۆ لای بگاری ناوچەم نەکەین؟

ئەوە بوو دواجار نزیکەی عەسر ئیتر وردە وردە ئاوایمان چۆڵ کرد و بە جۆگەیەکدا بە ئاسانی گەیشتینە لای هێزەکەی رەتڵی دووەم. ڕژێم هەروای کرد هاتنە ئاوایی و جەنازەکانیان کۆکردەوەو پاشەکشەیان کرد، عەسری ئیمرۆ هەردوو رەتڵەکە لەناو ئەم چەم و بێشەلانەدا کۆبووینەتەوە، لە هەڵەبجە و سیروان و خورماڵ و سەیدسادقەوە و لە ئاواییەکانی ترەوە سەدان کەس لەهەڤالانی ڕێکخستن ودۆست وکەسوکاری پێشمەرگە هاتن بۆ لامان و ئەیان پرسی چەند کەستان شەهید بووە؟ ئەمان ووت دوو بریندارمان هەیە، کەس بڕوای نەدەکرد. بریندارەکانیش،یەکێکیان هونەرمەند کاک کاوە حەمە ساڵح کە ئیستا کەم ئەندامە و لەووڵاتی سویدە لەگەڵ فایەق هەڵەبجەیی بوون، ئیتر زیانمان نەبوو. برینی کاوە حەمە ساڵح سەخت بوو[1]، پارچەی شەستیری کۆپتەر پشتی شکاندبوو.

---

[1] _ لەناو شۆڕش و پێشمەرگەدا لەناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا چەندین پێشمەرگەی هونەرمەند هەبوون. ئەمانە جگە لەکاری پێشمەرگانە، ئەرکی هونەریشیان هەبوو وەبەهونەرەکانیان خزمەتی زیاتری پێشمەرگەو گوندنشینانیان ئەکرد، هونەری مۆزیک و گۆرانی لەدێرزەمان و بەردەوام هۆکارێک بووە بۆ مقاوەمەو بەرەنگاری. ئەم پێشمەرگە هونەرمەندانە، بەچڕینی گۆرانی و ووتنی سرووودە حەماسە هێنەرەکان، ژەنینی ئاوازەکانی شمشاڵ وموزیک، خواندنی شانۆگەری و.....تاد، لەشاخ وەرەیان ئەدا بەپێشمەرگە، هونەرمەندانی شاریش بەتایبەت لەدەهەی هەشتاکانی سەدەی ڕابوردودا بەکارو چالاکیە جۆراوجۆرەکانیان، هەرچەندە لەژێر دەستی ڕژێمی بەعسدا بوون، بەڵام ئازایانەو

پێشمەرگە بەیەکدا ئەهاتن و ئەچوون و خۆیان ڕێک ئەخستەوە و خەڵک شاگەشکە و دڵخۆش پیرۆزباییان ئەکردین، ئێمەش فیشەکمان نەماوە. کوێتەرەکانیش بە ئاسمانەوە ئەسووڕێنەوە. لە دوژمنیش هەر ئەو شانزە کوژراوەی سەر لە بەیانی دیاربوو ئەویش لەبەر ئەوە جەنازەکان لەبەردەستدا بوون، کوژراو زیانەکانی تریان ئاشکرا نەبوون. نزیکەی خۆرئاوابوون بە سواری چەندین تراکتۆر بە برینداره‌کانەوە گەڕاینەوە وگەیشتینە ئاوایی ناوگردان، دووکانەکانی ساردی فرۆشتن بەر نەئەکەووتن، خەڵکێکی زۆر وەستابوون بۆ پێشوازی، ئەو شەوە گەڕاینەوە بەرەو شارباژێر.

بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر لە ئاوایی قەویلە پشوومان داو کاکە بەکری حاجی سەفەر گەیشتە لامان، لە لای عەلی لفت[١]ەوە هاتوە، چەند باری قاتر فیشەکی هێناوە، لەم شەڕەدا چەند فەرماندە کەرتێک وەک شەهیدان مەحمودی حاجی فەرەج و مەحمود گەرمیانی.... شەو چووبوونە سەیدسادق، بەڵام دواکەووتنیان بووە هۆی ئەوەی دەمەو بەیانی لەناو گردان تووشی هێزی دوژمن ببن و نەتوانن بگەنەوە لامان، بەرەو دەریاچەکە و ئیمامی زامن ڕۆیشتبوون. هەروەها ڕەتڵی دووەم لەناو گردی شەریف شەو پاشەکشەیان کردبوو بۆ ناوچەی زەڵم و ئێمەیان ئاگادار نەکردبوو، ڕەنگە ئەگەر ئەو فەرماندە کەرتانە لەگەڵ کەرتەکانیان بوونایە و ڕەتڵی دووەم پاشەکشەی

---

نەترسانە ورەیان ئەدا بەگەل، بووبونە هۆکاری ئەوە لاوان دەستە دەستە ڕوو لە چیا بکەن و ببنە پێشمەرگە.

[١] – عەلی لفتە فەرەج لەبنەچەدا خەڵکی خۆرهەڵاتی کوردستان بوو لە ناوچەی گەڵباخی یانگوڵباخی، ئەم منداڵ بووە بنەماڵەکەیان کۆچ ئەکەن و دێن بۆ باشوور، لە ئاوایی دەرەگورگان لە ناوچەی پێنجوێن نیشتەجێ ئەبن، دوای دەست پێکردنی شەڕی عێراق – ئێران مام عەلی هاتە ناوچە ڕزگار کراوەکانی ژێردەستەڵاتی پێشمەرگە، ماوەیەک لەئاوای قەڵاتێ بوو لە شارباژێر، جگە لەوەی خۆی ڕێکخستن و کاری حیزبایەتی ئەکرد، سەرچاوەی بەدەستهێنانی چەکوتەقەمەنی بوو بۆهێزی پێشمەرگە، مام عەلی لەگەڵ هێزی پێشمەرگە مایەوە تا دەست پێکردنی ئەنفالەکان، ناوچەبەناوچە ڕۆیشت لەگەڵ هێزەکاندا، تا دواجار و ساڵی ١٩٨٨ لەسەر چیای ئاسۆس خۆی و بەکری کوری لەگەڵ نزیکەی ٧٠ پێشمەرگە و هاوولاتیدا شەهید بوون بە چەکی کیمیاوی بەدەستی ڕژێمی حیزبی بەعس.

نەکردایە هاوزەمان لەگەڵ ڕەتڵی یەک لە قاجر چۆن کەوتە شەڕەوە، ئەوانیش لە گردی شەریف تووشی شەڕ بوونایە شەڕەکە گەورەتر و دوژمن زیانی زۆرتری بەردەکەووت، ئەوە یەکەم جار بوو لەشارەزووردا دەست لەئاوایی بەر نەدەین و لەبەیانییەوە تا ئێوارە شەڕ بکەین، ئەمە بووە ئەزموونی نوێ بۆ ئێمە.

هەرچەندە پاشەکشەی ئەوان بۆ چەمی زەڵم نزیک تر بوونەوە لە ئێمە بۆ قاجر بوونە پشتیوان لەکاتی کشانەوەکەی ئێوارەدا. لە قاجردا دانیشتوانی دێ سەربە عەشیرەتی هارونین، خەڵکێکی دڵسۆزو کورد پەروەرن، زەحمەتی زۆریان بینی لەم شۆڕشەدا، لەم شەڕەشدا پیاوەکان هانیان ئەداین هیمەت بکەین، بە گشتی خەڵکی ئاوایی زیانیان لێکەوت، پیاوێکی چێوار کە نزیکەی ٣٠ سی بەرخە نێری لە تراکتۆرێک بارکردبوو بەیانی بیبات بۆ شار بیانفرۆشێت ساروخێکی کۆپتەر هەرسی بەرخەکەی کوشت، خاوەنەکەی ساڵی ٢٠١١ سەردانی مەڵبەندی کرد، داوای کرد بۆی قەرەبوو بکەینەوە بەڵام نەمانتوانی بۆی قەرەبوو بکەینەوە.

حاجی حەمەئەمین ڕیش سپی و پیاوی دیاری ناو هارونی، یەکێک بوو لە تێکۆشەرانی ڕیزەکانی یەکێتی، جگە لەوەی ڕژێم چەندجار گرتی و عەزیەتیان دا، لەسەر یەکێتی، لە شەڕی ناوخۆشدا سەرەڕای ئەوەی خزمی کاکە حەمەی حاجی مەحمود بوو برایەکی بەناوی مامە والی سۆشیالیست بوو کاکە حەمە لێیدابوو بە گۆپاڵەکەی دەستی سەری حاجی شکاندبوو. ئەو ڕۆژە هەتا شەڕ تەواو بوو بۆ دەقەیەک نەوەستاوە، هەرئەهات و ئەچوو وەک ئەوە بوو ئەو فەرماندەی شەرەکە بێت ، س لاوە و درووود بۆ گیانی پاکی ئەنێرم. لەم شەڕەدا پێشمەرگە فێری شەڕی ناو دێ بوون کەئەوە بۆ ئێمە ئەزموونێکی نوێ بوو.

# تەقەی خۆشی یان شەرمەزاری ؟

لە دوای کێشە و گیروگرفتەکانی نێو هەرێمی یەک و چوونی کاکە حەمە بۆ ناو سۆشیالیست و دوای چەندین شەڕو کۆ کردنەوەی هێز لە لایەن سۆشیالیست و پارتی لەلایەک و یەکێتی لەلاکەی ترەوە، دوای چەندین شەڕو پێکادان و یەکدی چەک کردن. ئەوە بوو ڕێکەوتنێکی ناوچەیی لەگەڵ کاکە حەمە کراو لەلایەکی تریشەوە ڕێکەوتن لەگەڵ پارتی کرا، پارتی هێزەکانی سنووری سلێمانی کە لەسەر سنوور بوون لە دزڵی و کانی خەیاران و ناوچەی وشکەناو هێنایە شارباژێڕ و بنکە و بارەگای لەچەند شوێنێکدا کردەوە و کەووتنە گەڕان و جەولە کردن.

ئەو هێزانەی هەرێمی یەکیش کە بەشێکی لەگەڵ کاکە حەمە چووبونە لای سۆشیالیست، بەشەکەی تری دووبارە تەشکیلاتی تازەی بۆ کرایەوە، سێ کەس بوونە لیژنەی هەرێم بۆ سەرپەرشتی کردنی کەرتەکان، ئەوانیش شەوکەتی حاجی مشیر، حاکم عومەر عەزیز، حامد حاجی خالد.

فەرماندە کەرتەکان لەو سەردەمەدا، ئەحمەد شاتوانی، مەحمودی حاجی فەرەج، دلێر جاف، جەلال کولکنی، مەحمود گەرمیانی، م. شاهۆ، کاکە شێخ فەیسەڵ مەلا عەلی شەهید بووبوو نیازی سەرپەرشتی کەرتەکەی ئەکرد، لەتیف حەمەی مەلا سابیرو برایم کۆیی و خۆم حەمەی حەمەسەعید بووین. مەڵبەندی یەک بارەگای هاتبووە حاجی مامەند، کاک مەلا بەختیار بەرپرسی مەڵبەند لەوێ سەرپەرشتی سنوورەکانی ئەکرد، ڕۆژێک هەموو مەسئولی کەرتەکانی سنووری سەربە هەرێمەکەیان بانگ کردین بۆ حاجی مامەند، لەوێ کۆبوونەوە دەستی پێکرد، مەلا بەختیار لە دوای ئەوە باسی وەزعی سیاسی و بارودۆخی ناوچەکە و گرنگی و ئەهمیەتی ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ پارتی و لایەنەکان بۆ باسکردین، دواتر بە تورەییەوە، ووتی: چی ڕوودلو شەڕی لابەلا بەرۆکیی. ن. ک ئەگرێ خەتای ئێوەیە لەخوارەوە بەتایبەت

شارەزوور[1]. هەرکەس ئەبینن و تۆشی ئەبن مزەلی جوان و دەمانچەی پێیە ئەدەن بە بن دەستی داو لەسەر چەک کردن و کوشتنی خەڵک لەو سنوورەوە کێشەو گرفتەکان گەورە ئەبن و هەموو کوردستان ئەگرنەوە. باسی ئەوەی کرد هەرکەس لەو جۆرە ڕووداوانەدا بکوژرێ ئێمە لەسەری نایەینە جواب.

ئێمەش بڕێک بەرگریمان لە خۆمان کرد و کۆبوونەوە تەواو بوو، گەڕاینەوە بەرەو قەویلە و لەوێوە بۆ کانی سپیکەی پەرخ، لەدوای کانی سپیکە ئەپەڕینەوە لە جادەی سەیدسادق- عەربەت ئیتر خۆمان ئەکەین بە قوڵایی دەشتی شارەزووردا. قەویلە ئەو ئاوایییە کە ئەکەوێتە سەروی خۆرئاوای دەشتی شارەزوور، سەر بە قەزای سەیدسادقە. لە نێوان دوو چیای بەرزدایە ئاسەواری کەقەڵای سرۆچک ئەکەوێتە بەرامبەری لەسەر چیاکەی لای سەرووی خۆر ئاوای ئاوایییەکەوە.

ئاوایی قەویلە لەبەر ئەوەی ئەکەوێتە سەر ڕێگای شارباژێڕ- شارەزوور و شوێنێکی قایمە زۆربەی وەخت پێشمەرگەی لێبوو. کانی سپیکەش ئەگەر بە ئۆتۆمبیل لە سلێمانییەوە بڕۆیت بۆ سەیدسادق، بەرلەوەی بگەیتە سەراوی سوبحان ئاغا بەلای دەستی چەپدا سەیر بکەیت بە دووری ٨٠٠ هەشت سەد مەتر دێیەک بەرچاو ئەکەوێت ئەوە ئاوایی کانی سپیکەی پەرخە، جگە لەوەی

---

[1] وەک پشتیوانی بۆ ئەم قسەی کاک مەلا بەختیار، من لە تەمەنی پێشمەرگایەتی خۆمدا کە بەرپرسایەتیشم هەبووەو نزیکیش بووم لە رابەرایەتی شۆڕشەکەو بەتایبەت جەنابی مام جەلال، ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆ یەکجاریش، نەبە تەنیا و نەلە کۆبوونەوەدا کەس لەوانە منی هان نەدا بۆ شەڕی ناوخۆ. لە چاوپێکەوتن و سەردانەکانیشمدا بەتەنیا لەگەڵ مام جەلالیان لەکۆبوونەوەو بۆنەکاندا کە چاومان پێکەوتوە، قسە لەباری شەڕی ناوخۆوە کرابێ نەفرەتی لێکردوە، دژی بووە، بە شەڕی نەگریس ناوی هێناوە. دوای ڕاپەڕین هەموومان گوێمان لە کاک مەسعود بارزانیش بوو ووتی: من و مام جەلال بێتاوانین لە شەڕی ناوخۆدا. خەڵک و ئەندامانی هەردولاش تەعلیقی زۆریان بۆ ئەم قسە هەبوو. بەڵام من ئاگادارم و زۆریشم بستوە کە لەسەردەمی خەباتی شاخداو سەبارەت بەشەڕی ناوخۆ، لەناو پارتیدا خوا لێخۆشبوو کاک ئیدریس بارزانی دژ بووەو هەوڵی خۆیشی لەو بارەوە داوە، ئەتوانم شاهیدی ئەوەبدەم هۆکاری دروستبوونی زۆرێک لە ڕووداو کێشەکان سەرەتا لەخوارەوە بوون، دواتر تەشەنەی ئەکردو لەکۆنترۆڵ دەرئەچوون وهەموولایەکی ئەگرتەوە.

بەشەودا وێستگەی کۆبوونەوە و پەڕینەوەی هێزەکان بوو لە شارباژێڕەوە بۆ شارەزوور یان لە شارەزوورەوە بۆ شارباژێڕ، جار جار بەڕۆژیش بە تایبەت بە دوای نیوەڕواندا پێشمەرگەی لێبوو. ئاواییەکە کارەبای هەبوو چەند دوکانێکیش بۆ پێویستیەکانی پێشمەرگە ، بە تایبەت مریشکی بەستوو جگەرە و پێ لاوەی تێدابوو.

کە ئەگەیشتینە ئاوایی قوماشی سەروچاوە ئیتر لەوێوە کەرت و مەفرەزەکان هەر کەس بەرەو سنووری خۆی ئەڕۆیشت، بەڵام ئەم سەفەرە هەموو هێزەکە پێکەوە بووین و ب لاوەمان نەکرد.

پاش نیوەڕۆیەک لەئاواییەکانی عالان، حاسڵ و کانیکەوە بووین، ئەم ئاواییانە سەر بە هۆزی گەلاڵی و سەرۆک هۆزیان مارفی حسەین ئاغایە و پیاوێکی بەڕێزە، ئەندامی یەکێتی نیشتیمانیی کوردستانە. کەرتەکەی ئێمە نیمڕۆ لە کانیکەوە بووین، لە کانی کەوە بۆئاوایی داری قەلان زۆر دوورنییە.

هەواڵیان داینێ چەند جاشێک لە شەڕێک بەدەستی پێشمەرگە کوژران و ئەیان هێنن بۆ سەر قەبرستانی گوندی یەخشی و لەوێ ئەیاندەنە دەست خاک. بۆیە هێزێکی جاشان بۆ حیمایەی ئەم ڕێ و ڕەسمە هاتوون بەرەو ئاواییەکانی داری قەلان و یەخشی، ئێمەش نزیکەی٢٠ بیست پێشمەرگە لەدوولاوە بۆیان ئەچین، کاتێک شەڕو تەقە دەستی پێکرد لە ئاوایی داری قەلان وەدەرمان نان وخۆمان چووینە ئاوایی و لەوێشەوە سەر قەبرانەکەمان دایە بەر گولە، جاشەکان و خەڵک بەرەو سەرجادە ب لاوەیان کرد و لەچەند لاوە جاش ویستیان بەرەو شوێنی ئێمە بێن بەڵام نەیانتوانی.

دنیا تاریکی کرد و ئێمە گەڕاینەوە بۆ کانی کەوە، لە هێزەکەش چەند مەفرەزەیەک دێن بە دەممانەوە. کاتێک لە ئاوایی دەرئەچووین پیاوێک مریشکێکی نیوە کو لاوەی ناومەنجەڵی دەرهێنابوو لەناو چەند نانێکدا پێچابوویەوە، هاتە بەردەمم و گووتی ئەوە بگرە دایکم بە قوربانت بێت بۆ تۆباشە. لەوێوە ئێمە بەرەو عالان و حاسڵ لەگەڵ هێزەکە یەکمان گرتەوە. کاک شەوکەت بڕێک فیشەکی کڕی بوو لای قاچاغ چی، بۆ ئێمە، ئەوانەی ئەو ئێوارە تووشی ئەو تەقە و لێک دانە بووبووین.

بەڵام کاتێک کە دابەشیان ئەکات، دوو کەرتی تر فیشەک وەرئەگرن و ئێمە فیشەکەکان بەشمان ناکات، لەسەر ئەمە لەگەڵ کاک شەوکەت بووە

عاجزیمان. لە دوای عاجز بوونەکە کاک شەوکەت ئەڵێت کۆبنەوە لەوماڵەی ئەوی لێیە لەئاوایی کانی بەردینە. فەرماندەی کەرتەکان هەموو کۆبووینەوە. باس لەوە کرا کە ئەوە کوڕانی قادری حەمەساڵح تاوگۆزی چوونەتە پەنای سۆشیالیست، ئەبێ بیان گرین و شەڕیش دروست نەبێت.

یەکێک ئەپرسێ زەحمەت نەبێت چۆن ئەیانگریت و شەڕیش دروست نەبێت؟. لە دوای ئەم پرسیارە یەکێکی تر ئەڵێت ئەی کاک مەلا بەختیار چەند ڕۆژ پێش ئێستا لە کۆبوونەوەی حاجی مامەند چی بە ئێمە ووت؟ کاک شەوکەت وەڵام ئەداتەوە و ئەڵێت مەلا بەختیار خۆی بە ئێمەی ووت، منیش ئەپرسم کوا ئێمە ئاگامان لەم قسە نەبووە؟. کاک شەوکەت دەڵێ مەلا بە من و ئەم دووبرادەرەی ووت مەبەستی مەحمودی حاجی فەرەج و م شاهۆ بوو، نیازی ئەڵێت دەی مادام هەر بە ئێوەی وتووە ئێمە عیلاقەمان بەسەریانەوە نییە. بارودۆخی ناو کۆبوونەوەکە خراپ بوو، منیش داخی دابەشکردنی فیشەکەکانم لە دڵایە و هاتمە دەرەوە بە نیازیم ووت من ئەڕۆم، کەرتەکەی ئێمەش هەمیشە زۆرترین پێشمەرگەی تێدابوو بێپرس لەکۆبونەوەکەدا دەرچووم وئەو ئێوارە گەشتینە ئاوایی توەقوت و شەو لەوێ ماینەوە .شەو هێزەکەی کەرتەکانی تر لەکانی بەردینە مانەوە و ئێمەش ڕۆژی١٩٨٣/٤/٢٤ لەئاوایی توەقووت کردمانە ئەوبەر دەریاچەی دەربەندیخان بۆئاوایی چۆڵ و ڕاگوێزراوی خوڵامی. لەوێ چەند سەر بەرخمان سەربڕی و ئێوارەکەی کاک ئەکبەر جێگری کەرت و بەهادینی حاجی بەکر ڕابەر سیاسی و مەفرەزەیەک پێشمەرگەم مۆڵەت دان، سەرکەوتنەوە بۆ هاوار و گریانە و بڕیار بوو ئێمە لە خوارەوە بمێنینەوە ئەوانیش بچن و بنکە و بارەگاکانی پێشترمان پاک و تەمیز بکەنەوە ئامادەی بکەن بۆ زستانی ئەمساڵ.

لای عەسر بەلەم و ماتۆڕێکیی ناو ئاو بەرەو کەناری بەری لای خوڵامی هات و چەند پێشمەرگەیەکی بەسەرەوەیە، کاتێک دابەزین کاک حامدی حاجی غالی و نیازی عیزەت ناسرانەوە، کاک حامد کۆمەڵە بوو بۆیە هەمیشە لە ئێمە نزیک تربوو، مونافەسەی مەسئولەیەتەکەشی لەگەڵ شەوکەت دا بوو، حامد لەمەدا لایەنگری ئێمە دەبێت.

دوای دابەزین و کەمێک پشوودان کاک حامد ووتی: نەئەبوو بێنە ئەمبەر و کاک شەوکەت پێی ناخۆش بوو، ئێمە هاتوین بەدواتدا قەرارە

بڕۆین و ئاشت ببنەوە. ئێمە لەگەڵ ئەواندا گەڕاینەوە، لەئاو هاتینە ئەمبەر بۆئاوایی جەرداسنە، هەموو هێزەکە لەوێ بوو. لەگەڵ کاک شەوکەت ئەم لاو ئەو لای یەکترمان ماچ کردو پێکەوە لە ئاوایی بۆ ئێوارە دابەش بووین و شەو لەوێ ماینەوە.

بەیانی ڕۆژی ١٩٨٣/٤/٢٨ هەواڵیان داینێ دوو پێشمەرگە لە هەڵەبجە بەهادین و ماجد گیراون، من بە کاک ئەکبەرم وتبوو لە هەڵەبجە نەمێنێتەوە. بەهادین قەڵەوە و تەمەڵ بوو لەگەڵ ماجد مابوونەوە و گیران. کاک ئەکبەریش گەڕابووەوە بۆ گریانە.

بەیانی دوای نیوەڕۆ هێز کەوتەڕێ بۆ کانی بەردینە ئەو ئاواییەی دوێنێ شەو لێی بووین. من و نیازی پێکەوە ئەڕۆیشتین و بەشێکی هێزەکەش لەپێشمانەوە بوو. کاتێک گەیشتینە ئەو بەرزاییەی ئاوایی کانی بەردینەی لێوە دیارە. بەرایی هێز گەیشتبووە لای ژووروی ئاوایی. لە کەوانەی ئاواییەوە تراکتۆرێک کە عەرەبانەی پێوە نەبوو لە ئاوایی دەرچوو بەرەو ئاوایی بێسەڵمێن. جگە لەشۆفێری تراکتۆرەکە سێ سەرنشینی لەسەر بوو ئەمە دووکەس لەکوڕەکانی قادری حەمە ساڵح و کەسێکی تر بەناوی عەزیزی قادری ئەمین بوون، کەچەکداری حیزبی سۆشیالیستن، هێزەکەی ئێمەیان بینیوە بەرەو ئاوایی تەقووت ڕۆیشتوون لە نزیک بێسەڵمێن لە تراکتۆرەکە دابەزیوون و بەپێ کەوتبونە ڕێ بۆ ئەوەی بچنە ئاوایی تەقووت.

لە جەرداسنە کەرتەکەی لەتیفی حەمەی مەلا سابیر ماوە بەڕێ بکەوێ بەدوای ئێمەدا بێت بۆ کانی بەردینە. لەوکاتەدا ئەیانەوێت بەڕێ بکەون شەوکەت و لەتیف ئەبێت بە دەنگەدەنگیان لەسەر ئەوەپێشمەرگەیەک چەند ڕۆژ پێشتر چەکێکی ڕەشاشی حەفارۆفی لەسوپاوە فڕاندوە سەربازبووە، ئەویش عەبدولڕەحمانی شێخ ئەحمەد نەقشبەندی بوو، داوا ئەکات بگوازرێتەوە لە کەرتەکەی لەتیفەوە بۆ کەرتی فەیسەڵ، بەڵام لەتیف ئەڵێت ڕەشاشەکەی نادەمێ. شەوکەتیش ئەڵێت خۆی هێناویەتی بچێتە هەرکەرتێک ئەتوانێ بیباتە ئەو کەرتە، لێرەدا قسەکەی کاک شەوکەت دروستە.

لەسەر ئەمە لەتیف لەباتی ئەوە بەرەو کانی بەردینە بەدوای ئێمەدا بێت بەرەو تۆەقووت کەوتووە تەڕێ، خۆی و کەرتەکەی بەدوای هێزەکەدا نەهاتووە، دوای ئەوەی ئێمە هەموو گەیشتینە ئاوایی کانی بەردینەو لەلای مزگەوتەکەدا کۆبووینەوە، گوێمان لێ بوو لە لای تۆەقووتەوە چەند دەست ڕێژێک کرا. پاش کەمتر لە نیو کاتژمێر تراکتۆرێک هاتوو لەتیفی حەمەی مەلا سابیر و هیوای مەحمودی سەراجیان بە برینداری هێنا، لەتیف شانی بەرکەووتبوو هیواش قاچی شکابوو، لەئەنجامی بەیەک گەیشتنی سێ چەکداری سەر تراکتۆرەکە کەلەکانی بەردینەوە دەچوون بەرەو تۆەقوت و کەرتەکەی لەتیفیش کەلەجەرداسنەوە بەرەو تۆەقوت هاتوون پێکدا هەڵپژاون.

کاتێک کە زانرا کوڕەکانی قادر کوژراون، چەند کەسێک بەرەو لای شوێنی ڕوو داوەکە ڕۆیشتن، د. نازم کە برین پێچ و خەڵکی دەربەندیخانە منیش هاوکاریم کرد دەستمان بەچارەسەری سەرەتایی بریندارەکان کرد. کاتێکمان زانی لەوێ دووبارە لە شوێنی ڕووداوەکە چەند دەست ڕێژێکی تر کرا، دووبارە پێشمەرگە شڵەژان و هەندێکی تر دووبارە بەرەو تۆەقووت چوون، بەڵام هیچ نەبووبوو، ئەم جارە تەقەی خۆشی بووبوو.

لەتیف خۆی بۆ منی گێڕایەوە کاتێک لێم پرسی چۆن بوو ڕووداوەکە؟ وتی ئێمە لەولاوە ئەهاتین و ئەمانیش سێ کەس لەملاوە هاتن لە قەتارەی پێشمەرگەکانی ئێمە تێپەڕبوون و کە ئەیاندا بەلای جەماعەت دا چاک و چۆنیشیان لەگەڵیەک ئەکرد، من و هیوا دواکەس بووین لە دواوە. کاتێک دوانیان لە من تێپەڕبوون سێیەم گەیشتە لام دوای چاکی و چۆنی وتی ئەمناسی؟ ووتم نا، وتی من تارقم لە خوێندنگا پێکەوە بووین، ئینجا ئەملاو لای یەکترمان ماچ کرد.

دوای دوورکەوتنەوە لەیەک بەچەند مەتر من ئاوڕم داوە بینیم ئەویش لا ئەکاتەوە و لەیەک کەووتبوینە گومان، من چەکەکەم لە شانم داگرت، ئەو دانیشت و ڕووی چەکەکەی تێکردم، منیش دەستم پێش خست و ئیتر ئەمەڕوویدا. ئەوان دووکەس کەکوڕی قادری حەمەسالح بوون بوونە قوربانی و عەزیزی قادری ئەمینیش بۆی دەرچوو بوو، عەزیز ئێستا ماوە پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانییە لەهەڵەبجەدا. شەو بریندارەکان بە تراکتۆر نێردران بۆ ناوچەی قەرەداغ. کاک شەوکەت جارێکی تر کۆیکردینەوە،

نامەیەکی بۆ کاک مەلا بەختیار نووسیوە بۆی خوێندینەوە ئینجا فەرموون فەرماندە کەرتەکان واژۆی بکەن ، دەقی نامەکە وەها بوو کە سۆشیالیست کەمینی داناوە و دوو پێشمەرگەی ئێمە بریندار بوون و ئەوانیش دوانیان کوژراون. دووبارە دەنگە دەنگ دروست بووەوە ، من و نیازی و چەند برادەری تر رامان وا بوو ئەبێ کاک شەوکەت راستی مەسئەلەکە بنووسێ بۆ مەلا بەختیار. هەتا پێشنیارمان بۆ کرد بنووسە لەفرستێکدا بکوژەکانی هەڤالانمان لەناوسۆشیالیست کوشتەوە دوو کەسی ئێمەش بریندارن[1] بەلام لەناو خەڵک و لەناو پێشمەرگەکەش ئەڵێین ئەوان کەمینیان بۆ ئێمە داناوە. چونکە بۆ سەرووی خۆمان راستی رووداوەکە بنووسی باشترە.

شەوکەت توورە بوو، نامەکە چەند کەس واژۆیان کردو واژۆی چەند کەس مابوو پێچایەوە و نێردرا بۆ حاجی مامەند.

بۆرۆژی دواتر کاکە حەمە حاجی مەحمود و هێزەکەی چی پێشمەرگەی متەفەرقە و مەفرەزەی بچوک بچوک لەو دەشتەدا هەبوو بەردەستیان

---

[1] - ماوەیەک بوو عەزیزی حەمەساڵح لای پارتیەوە چوو بوو بۆ لای حکومەت. دواتر بەبەڵێن هاتبووەوە بۆ لای یەکێتیی. درێژەی ئەم بابەتەش لە باسی چەککردنی لەشکری ئیسلامیدا باس ئەکەین، بەلام لای یەکێتی کوژرا، برازاکانی پارتیان بەجێهێشت، چونکە پارتی و یەکێتی رێککەوتبوون و پارتی رێگەی نەدانێ تۆڵەی عەزیز بکەنەوە، لەبەر ئەوەی یەکەم عەزیز تەقەی کردبوو لە حەمە ئەمینی برای حەمە شەمێرانی و برینداری کردبوو. حەمەئەمین بەرپرسی مەفرەزەی تایبەتی جاشان بوو، دواتر هاتبووە دەرەوە بۆ لای پارتی. دووەمیش پارتی ئەو رێکەوتنەی لەگەڵ یەکێتی لەسەر ئەوان تێک نەئەدا، بۆیە چوونە ناو سۆشیالیست.

یەکێتی و سۆشیالیستیش رێککەوتنی ناوچەیان هەبوو، بەلام دواتر کاکە حەمەی حاجی مەحموود وەریگرتن، لەو ماوەدا برایەکی مامۆستا شاهۆ بەناوی کاک حەمەئەمین شەهید کرابوو بەبێ هیچ تاوانێک. هەروەها کاک کەریمی عەبەی خاسەش شەهید کرابوو، کە پێشتر سەرلقی شۆرشی ئەیلول و دۆستی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو، ئەوەندەی من ئاگاداربم کاک کەریم شەهید نەکرایە بریاربوو بێتە دەرەوە بۆ ناو یەکێتیی. بەرای من ئەمەش هۆکاری تری کوشتنی کاک کەریمە، بەدەستی کەسانێکی ترکە جێگەی بروا نییە، خەڵکی تریش ئەمەیان بەدەستی کورەکانی شەهید قادر ئەزانی، ئەم کوشتنانە کوشتن و کێشەی زیاتری لێکەوتەوە لەشوێنی خۆیدا باسی لێ ئەکەین.

کەووتن ، چەکیان کردن و بردنیانە شاخی سوورێن. لەوانە هەڤاڵ جەمیل هەورامی و شەوکەتی حەمەساڵح و چەند پێشمەرگەیەکی تر.
مەلا بەختیار نامەکە ئەگاتە دەستی و سەری سوڕ ئەمێنێ ئێمە ڕێکەوتنمان هەیەچۆن سۆشیالیست کەمین دائەنێ. بۆیە هێزێک ئەنێرێت بۆگرتنی عوسمانی قالە منەوەر و جەبار هەولێری تا بیانگرن و لەگەڵگیراوەکانی ئێمە لای سۆشیالیست بیانگۆڕنەوە وکێشەکە چارەسەر بکات و گەورەتر نەبێت. ئێمە دوای ڕووداوەکە چەند ڕۆژ لەدەشتی شارەوزووردا ماینەوە، ئێوارەیەک لەئاوایی مالوان بووین دابەش بووبووین لە ماڵان. لەناکاو بۆتەقە، دەرچووینە دەرەوەچییە؟ چی ڕووی داوە؟. تەقەی خۆشیە جەزای عەلی کاتب کوژراوە، جەزای عەلی کاتب کێیە؟ نیازی وەرە کاکە بابچین نانەکەمان بخۆین تۆ نازانیت، بەدوای نیازیدا گەڕامەوە لای ئەو ماڵەی لەسەر سفرەی نانخواردنەکە هەستابووین، پرسیم نیازی جەزای عەلی کاتب کێیە؟ نیازی ئەڵێت ئەوە بکوژی شەهید خالیدی حاجی فەرەجە تۆ بیرت نایەت. کۆبووینەوە لە مزگەوت و هەواڵی زیاتر و ناخۆشتر ئەبیستین، حەمەی تەیب و ئاسۆی برای لە سلێمانی تووشی شەڕبوون و خۆیان و چەند کەسی تر بریندارن، پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانیین لەگەڕانەوەدا لە بارەگای جەزای عەلی کاتب ئەبن لەدێیەکی شارباژێڕی تەختدا جەزا پارتیە، ئەویش داوا لە عوسمانی قالە منەوەر ئەکات و ئەڵێت تۆ ئۆتۆمبێلت هەیە با ئەم برادەرانە بنێرینە نەخۆشخانەی حاجی مامەند، عوسمان سۆشیالیستە. عوسمان دەڵێ من ناڕۆم ئەوە ئۆتۆمبێلەکەو خۆت بیانبە، جەزا لێ ئەخوڕێت و ئۆتۆمبێل پڕیەتی لە بریندار و پێشمەرگەی تر. ئەو هێزەی یەکێتی چووە بۆچەک کردنی عوسمان تا لەگەڵ دیلەکانی یەکێتی لایسۆشیالیست بیان گۆڕنەوە. لەدوورەوە تەقە لەئۆتۆمبێلەکە ئەکەن، وائەزانن عوسمانی قالە منەوەرە، جەزا ئەکوژن، پارتی ئاگادار ئەبن لەمە، وائەزانن یەکێتی بەئەنقەست خەزایان کوشتوە، لە بەندەنی گوڕە دێم پیکابێک کە هەڵگری شانزە پێشمەرگەی یەکێتیە بێئاگان لەڕووداوەکان ئەدەنە بەردەسترێژ و ئەیان کوژن بە بێتاوان. وردە وردە شەڕ تەشەنەی سەند و داوا کرا ئێمە سەرکەوینەوە بۆ شارباژێڕ.
ئێوارەیەک هەموو هێزەکە لە سواری و کەوچک تاش چاوەڕێین ئێوارە بێت و لەجادە بپەڕینەوە بەرەو کانی سپیکە و قەویلە بڕۆین. هەمووان دەم و

چاویان گرژ و مۆنە و چەند کەسی ساویلکە شاگەشکەیانە. شەهید نیازی فەرماندەی یەکێک لە کەرتەکان ئەڵێت باشت کرد کاک شەوکەت؟ فەرماندە کەرتێکیتر لەولاوە هەڵ ئەداتێ و ئەڵێت ئەو ڕاوبۆچوونە لاوازو سەیرانەی ئێوە حەمەی حاجی مەحمودی سواری سەرمان کردووە. نیازی ئەڵێت ئا وەرنە ئەملاوە با لەوپێشمەرگانە دوورکەوینەوە. هەموو مەسئولەکان کەمێک لا ئەگرین و کاک شەوکەتیش خوێن زاوەتە دەموچاوی، نیازی بۆمان ئەگێڕێتەوە: ئەڵێت: ( کاتێ خۆی لە تەوێڵە قادربەگی جەعفەرسان، سان ئەحمەدی مەحمود ئاغای کوشتووە، قادربەگی جەعفەر سان بیست ساڵ حکوم دراوە لە ئەبوغرێب زیندان بووە. خەڵکی تەوێڵە ئەچن بۆ سەردانی، ئەپرسێ دەنگوباسی هەورامان، ئەڵێن سەعدی بەگی کوڕت قادرئاغای کوشتوە، ئەویش دەست ئەکات بەگریان، ئەڵێن بۆچی ئەگریت، ئەی نازانی لەسەر ئەوە کوشتی کاتێک سان ئەحمەدت کوشت تۆیان گرت بەدەست پۆلیسەکانەوە بووی قادرئاغا جنێوی پێدابوی؟ قادربەگ ئەڵێت لەبەر ئەوە ئەگریم کە ئەبوو بە دەستی خۆم بیکوژمەوە، نەک سەعدی کوڕم بیکوژێ)، ئەم گێڕانەوەیە، بۆ ئەو فەرماندەیە بوو کە تەقەی خۆشی کردبوو وەفیشەکی نابوو بەمردوەوە.

کەیشتینە شاربازێڕ پارتی بارگەو بنەیان پێچایەوە و وردە وردە بەرەو سنوور هەڵکشان و لە هەندێک جێگاش تەقە و لێکدان ڕوویدا و شەڕی پارتی و یەکێتی لەسەر ئەم نامە و ڕووداوە هەلانە چەند ساڵێکی تر درێژەی کێشا.

# چەککردنی حیزبی عەمەلی ئیسلامی

ماوەیەکی کەم دوای کێشەکەی لیژنەی هەرێم لەسەر عەزیزی حەمەساڵح[1]، لەنێوان کاک شەوکەتی حاجی موشیر و مامۆستا پشکۆ لە لایەکو کاک حامدی حاجی خالید لە لایەکیتر، هەردوولایان داوایان کرد کەرتەکەی هەورامان کەمن فەرماندەی بووم بچینە خوارەوە بۆ شارەزوور، ئەوکاتە بارەگامان لە دۆلی هاوار بوو، داواکەش کاک شەوکەت کردبووی لەگەڵ مامۆستا پشکۆ، بۆ پشتگیری لایکیان لە کێشەکەدا، من بەنووسراو بێلایەنی خۆم و کەرتی هەورامانم لەو کێشەدا دەربڕی بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرهاتینە خوارەوە، لەگەڵ کاک شەوکەت و بەشێک لەهێزەکەی هەرێم، لە ناوچەی گەلاڵی نشین یەکمان گرتەوە، مامۆستا پشکۆو کاک حامد هەریەکەو بەجیا رۆشتبوون بۆ ناوزەنگ مامۆستا عەزیزی بەزیندانی بردبوو لەگەڵ خۆی.

ئاگادار کراین لەلای درۆڵەوە لە ئێرانەوە هێزێک کە نزیکەی٤٠چل چەکدارن بە ناوی حیزبی عەمەلی ئیسلامی هاتوون و لە ناوچەکەدا جەولە ئەکەن، ئێمەش لەو ناوەدا بۆماوەی چەند ڕۆژێک ماینەوە. لەئاواییەکانی جەرداسنە، تەوقووت، بێسەلمێن و کانی بەردینەدا، ئەم هێزە دەرکەوتن و دواتر چوونە ئاوایی قەڵبەزە، ئێمەش بە هێزێکی نزیکەی١٠٠ سەد پێشمەرگەوە پێش نیوەڕۆیەک خۆمان کرد بە ئاوایی قەڵبەزەدا. ئەوان لە مزگەوتەکەدا بوون. هێزەکەی ئێمەش لەناو ئاوایی و لەدەورو بەری مزگەوتەکە ب لاوەیان کرد. خۆشمان بەرپرسەکان چووینە ماڵێک و داوامان کرد. بەرپرسەکانی ئەوانیش بێن تا پێکەوە کۆبونەوە بکەین و بزانین چۆن هاتوون و لە کوێوە هاتوون و ئەیانەوێت چی بکەن؟

ئەم هێزەی عەمەلی ئیسلامی هەموو چەکی مزەلی و یەک لاق و (ئار بی جی) نوێیان پێیەو پۆشتە و پەرداخ، ئێمە ئەوەی لە بیرم بێت لە ماڵەکەدا

---

[1] – هۆکاری دروستبوونی ئەم کێشە دواتر لەبابەتی چەککردنی لەشکری ئیسلامی دا ئەخوێنیتەوە.

کاک شەوکەت، مەحمودی حاجی فەرەج، مامۆستا شاهۆ، لەتیفی حەمەی مەلا مابیر، جەلال کولکنی، مەلا یاسین حەمەی حەسەن موانی.... تاد. ئەوانیش ئەحەی حەمەئەمین حەمە عێراقی و عەبە عەسکەر و خەلیل ناوێک خەڵک خانەقین و چەند بەرپرسی تر کە ئێستا ناویانم لە بیر نییە. هەموو لە هۆدەیەکی ماڵەکەدا دانیشتین، ئێمە هەموومان لە لایەکەوە دانیشتین. پێشمەرگە لە دەوری ماڵەکەدان، ئەوانیشمان هەموو لە لایەکەوە دانا بۆ ئەوەی ئەگەر تەقە بوو ئێمە خۆمان یەکتر نەکوژینەوە.

دەست کرا بە قسەکردن لەلایەن شەوکەتی حاجی موشیرەوە، بڕیار بوو لە نیوەی قسەکاندا ئێمە چەند کەسمان میلیان لێراکێشین و چەند کەسیشمان چەکەکانیان لەبەر دەمدا هەڵگرین. هەروامان کردو بێ ئەوەی هیچ ڕووبدات چەکەکانمان لێ سەندن، تەنیا ئەحەی حەمە عێراقی ویستی پەلامار بدات، دەستی برد بۆ نارنجۆک لەبەردەم پەنجەرەی ماڵەکەدا دانیشتبوو، پێشمەرگەیەک لە دەرەوە لەپەنجەرەکەوە دەستی هێناو یەخەی جلەکەی بەریگرت و کەووت بەپشتدا، یەکێکیش نارنجۆکەکەی لێ کردەوە. ئەوانمان لەناو ژوورەکە دانا و حەرەس بە دیاریانەوە، مەسئولی یەکەمیان بەچەکەکەی خۆیەوە دایە بەر بۆ مزگەوت، بەڵام دەرزی چەکەکەی دەرهێنرابوو. نەوەک لە دوورەوە ئەوانەی دەورو بەری مزگەوتەکە و ناو مزگەوت ببینن بێ چەکە و ڕابکەن بەم لاو و بەو لادا. نەیانزانی ئەم گیراوە وبرادەرەکانی دەست بەسەر کراون، چەکەکەی شانی دەرزی تێدا نییە تا بەردەرگای مزگەوت. هەندێک لە هێزەکەی ئێمەش بێ ئاگابوون، لەناو مزگەوت لەگەڵ هێزەکەی ئەواندا دانیشتبوون. بەر لەوەی لە ماڵەکە بچینە دەرەوە پێمان ووت کەچووینە مزگەوت خۆت داوایان لێ بکە کەس نەجوڵێ هەموو چەکەکانیان دابنێن هەرکەس تەقە بکات ئێمە ئەوانەی گیراون ئەکوژین، واتە مەسئولەکانیان.

ئەویش هەر وایکرد و خۆی لەناو مزگەوت داوای کرد کە کەس نەجووڵێ و چەکەکانیان دابنێن. پێشمەرگە کەووتنە کۆکردنەوەی چەک. هەموو ژمارە کران و لەناو گونییەدا بەستە بەستە دانران و پێچرانەوە، بە حساب تا ئێمە لێکۆڵینەوە بکەین و سەروی خۆمان ئاگادار بکەینەوە. ئەگەر لەسەرەوە فەرمانیان پێ کردین ئەوەچەکەکانیان ئەدەینەوە، کەچی هەر ئەو ڕۆژە ئەوان

ب لاوەەیان  لێکرد و زۆریان داوایان لێکردین ئەگەر ئێمەڕازی بین ئەوان چەکەکانیان ناوێت و مۆڵەتیان بدەین بڕۆنەوە بۆ ئێران. ئێمەش ڕێگریمان لێ نەکردن.

بەڵام لیژنەی هەرێم نامەیەکی دانێ و چەند کەس لە بەرپرسەکانیان بردیان و ڕۆیشتن بۆ ناو زەنگ بۆ لای مولازم عومەر عەبدوڵلا بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری. ئەوان ڕۆیشتن و لەوێش کەرتەکەی ئێمە ئاڕ بی جی یەک و چەند پارچە چەکی ترمان بەرکەووت، لە دەشتی شارەزووردا درێژەمان بەگەشت و جەولەی خۆمان دا و دوای چەند هەفتەیەک سەرکەوتینەوە بۆ ئەودیو چیای شنرویێ بۆبارەگاکانی دۆڵی هاوار.

# چەككردنی لەشكری قورئان

ساڵی ١٩٨٢ لە دوای چەک کردنی حیزبی عەمەلی ئیسلامی، ماوەیەک ـمشتی شارەزوورمان بەجێهێشت و ب لاوەمان کرد، هەر کەرتێک بۆ سنووری چالاکی خۆی، کەرتەکەی ئێمە سەرکەوتینەوە بۆ لای هاوار و بناری هەڵەبجە، لەبەر ئەوە چەکی باشوو فیشەکمان دەست کەوتبوو، لەحەفتەیەکدا سێ چالاکیمان ئەنجامدا بەدژی هێزەکانی ڕژێم لەوچالاکیانەشدا چەندپارچە چەکمان دەست کەوت، لەوانە یەک کلاشینکۆف و یەک ئارپیکە لە چیای شنروی و یەک کلاشینکۆف لەچەمی پالانیا و سێ کلاشینکۆف لە ناو هەڵەبجەدا. پێشمەرگەش زیادی کرد لەڕووی ژمارە و لەڕووی چۆنایەتیشەوە، کەرتی دووی هەورامان لەسنوورەکە و لە ناوهێزی پێشمەرگەشدا ناوبانگی بۆ ئازایەتی و لەخۆبردووی بۆرێک و پێکی و ژیری پێشمەرگەکان دەرکرد، هەمووش گەنج وخوێنەوار بوون، بەداخەوە بەتێپەڕبوونی ڕۆژانی تێکۆشان ئەوانە زۆریان گیانیان بەخشی لەپێناو ئازادی و سەربەرزیدا.

دوای ماوەیەک دووبارە لەگەڵ کەرتەکانی تری هەرێمەکەدا یەکمان گرتەوە لەشارەزوورو و چووینە سەرەوە بۆ شارباژێڕ، ئێمە لەئاوایی ڕەزڵە بارەگامان دانا. لە شارباژێڕ لەئاوایی حاجی مەند و دۆڵەکەی پشتەوەی نزیکەی٣٠٠ سێ سەد چەکداری لەشکری ئیسلامی لێ بوو، هێزێکی کەشیان لە دۆڵی جافایەتی بنەو بارەگایان لێ خستبوو، ئەم هێزە لەمانگی ١٩٨١/٢ لەئێران دامەزران سوپای پاسداران چەکداری کردبوون، ئەم لەشکرە، دەستەی دامەزرینەری حاجی شێخ قادری سۆتکەیی، مەلا حسێن ناوێک وعەباس شاهێن بوون لەناو ئێراندا. شێخ زراری کوڕی شێخ قادر، سمایل ئاغا، خولە ئامە، حاجی مەحمودی گەورەدێ، شێخ جەعفەر سەرکانی و نەوزادی شێخ عەلی و چەندین بەرپرسی تر ئیدارەیان ئەدان و لە ئێرانەوە چەكدارو پڕچەک ئەکران و ئەهاتن بۆئەم دیوو، لەناوچەکەشدا پەیوەندیان

پێوە ئەکردن و ئەمانیش چەکیان بۆ ئەهێنان، کە هەموو چەکەکانیان چەکی پەرەشووتی نوێ و بیکەی سی و قەناس بوون.

ئەوکات ئەمانەو پێشتریش حیزبی عەمەلی ئیسلامی وەک بەشێک لە سوپای ئێران بوون، بەهۆی شەڕی ئێران عێراقەوە، هەرکەس و گروپ وتاقمێک بیانویستایە پارەو چەک لەئێران وەرگرن بۆلێدانی عێراق، ئێران ئەیدانێ وناوێکی لێئەنان و ئەیناردنە ئەم دیو لەوانە لەسنووری ئێمەدا جوندولا، عەمەلی ئیسلامی، لەشکری ئیسلامی. ئەم لەشکرە لەڕێی چیای سوورێن و مەریوان و بەرکێوەوە ئەهاتنە شارباژێڕ و هاتوو چۆیان بەردەوام بوو. لە ماوەیەکی کەمدا زۆر گەشەیان کرد و پەرەیان سەند، بەڵام یەک چالاکیشیان بە دژی ڕژێم نەبوو، چەکدارەکانیان سەربازی هەڵاتوو خەڵکی بێکاری ئاوایییەکان بوون. بەئاگاداری یەکێتی هاتبوونە ناوچەکە، پارتی و یەکێتی و سۆشیالیست هەر کەس لە هەوڵی ئەوەدا بوو خەڵک بنێرێتە ناو ئەمانە. تا وایلێهات ببنە مەترسی بۆیەکێتیی. لەمانگی ١٩٨٢/٦ دا یەکێتی کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆچەک کردنی ئەم لەشکرە لەپەلامارێکی کتوپڕ غافڵگیرانەدا.

دوو ڕۆژ بەر لەچەککردنیان بڕیاربوو هێزەکەی ئێمە بەشێکی بچێت بۆ دۆڵی جافایەتی بۆ هاوکاری ئەو هێزەی تری یەکێتی بۆ سنووری مەڵبەندی دوو بۆچەک کردنی ئەو هێزەی لەشکری ئیسلامی کە لەوێیە، ئێمە لەگەڵ ئەمهێزەدا بووین،دوای دەرچوونمان لە شارباژێڕی بەر کێوەوە بۆ شارباژێڕی تەخت و پەڕینەوەمان لە سیتەک وجادەی ئەزمەڕ -چوارتا دەمەو بەیانییەک گەیشتینە ئاوایی خەمزە، لەوێ ئاگادار کراین ئەبێ بگەڕێینەوە بۆ شارباژێڕ، هەر ئێوارەی ئەو ڕۆژە بێ دواکەوتن گەڕاینەوە و هاتینەوە ئاوایی پارەزان، هێزەکان لەوێ دابەشکران، ئاگاداری ئەو چەکدارانەی یەکێتی ناردبوونییە ناو لەشکرەکە کرا کەئەمشەو لێیان ئەدرێت و ئێوە پێشتر خۆتان لێیان جیا بکەنەوە، وەک حەمەزیاد قولیگیسکانی و برادەرەکانی، نەوشیروان هەڵەبجەیی، عومەر پالانیایی.....تاد، چەند کەسێکی تریش هەن کەمن نایانناسم، یان ئاگادار نیم لەناردن و چوونەکەیان بۆ ناو ئەو لەشکرە، لەوانە باسی سمایل ئاغاو چەند کەسیتر ئەکرێت.

لەشەوی ٢٤-٢٥ /١٩٨٢/٦ لە قۆڵی لای ئێمەوە لەپارەزانەوە سەرکەوتین بۆ سەر چیای نێوان پارەزان و حاجی مامەند کە رووبەرووی کورە کاژاوە. ناوی نهێنی شەرەکە مەلا نووری بوو لەگەڵ رووناکی بەیانیدا ئەو هێزانەی تر لە قۆڵەکانی ترەوە هاتبوون وگەمارۆی ناوچەکەیان دابوو، لەگەڵ چەکدارانی لەشکری ئیسلامیدا تێک رژاین و زۆربەی زۆریان چەک کران، تەقەش دروست بوو هەندێکیش کوژران، لەلای قۆڵەکەی ئێمەوە چەند پێشمەرگەیەکی قارەمان شەهید و چەندی تریش بریندار بوون. شەهیدەکان لەوانە شەهید جەلالی مەلانەجمە و شەهید مامە.حەمەی لای حەمەی حاجی سابیر، جەلالی مەلا نەجمەی خەڵکیی هەڵەبجەو لەبنەماڵەی موبارەک شاین، لەبنەچەدا هەورامی خەڵکی تۆدشەن، لەکوردستانی رۆژهەڵات، جەلال پێشمەرگەیەکی قارەمان و گەنجێکی جوان و تازە پێگەیشتوو بوو ساڵی ١٩٧٤ چووبوونە ئێران، لەوێوە هاتەوە بۆ پێشمەرگایەتی هەروەها کاک حامدی حاجی خالید و ئەمجەدی برای و عەبدولی حاجی حەمە شەریف و چەند پێشمەرگەی تر بریندار‌بوون.لە بیرەوەریەکانی سەنگاویدا دەڵێت، رۆژی ١٩٨٢/٧/٢ چەککراون.

لە نێوان ئەو هێزەی ئێمە و هێزێکی تر لە کورە کاژاوەوە هاتبوونە خوار، حاجی مەحمودی گەورەدێ وەک پیرە هەڵۆ لەگەڵ چەند کەسێک دەرباز بوون بۆپشتی ئاوایی دۆلپەموو. لەکاتی چەک کردنی ئەم هێزە هاوزەمان هێزەکەی لای دۆڵی جافایەتی و سەرگەڵوشیان چەک کران، لەوێ فەرماندەی لێهاتوو دیاری یەکێتی کاکە سەلاحی موهەندس شەهید بوو.

مولازم عومەر عەبدوڵلا سەرپەرشتی ئەم شەرەی ئەکرد نیوەرۆی رۆژی ١٩٨٢/٦/٢٦ زۆربەی هێزەکان لەئاوایی حاجی مامەند کۆبوونەوە و یەکیان گرتەوە، سەدان پارچەچەک دەست کەوت بوو، مولازم عومەر بریاری دابوو سبەینێ دابەشی بکات بەسەر کەرت و هەرێمەکاندا.

لای ئێوارەی ئەو رۆژە ئێمە لەگەڵ پێشمەرگەکانی خۆمان بەسواری پیکابێک گەراینەوە بۆ بارەگاکەی خۆمان بۆ ئاوایی رەزڵە، عەزیزی حەمە ساڵح لەگەڵمان سواربوو، لەدوو ریانی حاجی مامەند پارەزان دابەزی، فەرمووم لێ کرد ئەم ئێوارە میوانی ئێمە بێت لەرەزڵە، ووتی ئەچمە پارەزان بریارە کەرتم بۆبکەنەوە و لەم چەکانە گیراون ملازم عومەر بەیانی ١٥پانزە

پارچە چەکم بداتێ، خواحافیزیمان لەیەک کرد و ئەو بەرەو پارەزان و من بۆ رەزڵە، ووتی پاش چەند رۆژێکیتر سەردانتان ئەکەم منیش وتم وەرە بۆلامان لەخزمەتتداین.

بەرپرسەکانی حیزبی عەمەلی ئیسلامی کەپێشتر چەکمان کردبوون بەنووسراوەوە ناردبوونمانە سەرکردایەتی، گەڕابونەوە شاربازێر و نووسراوێکیان هێنابوو گوایە چەکەکانیان بدرێتەوە، ماوەی چەند رۆژێک لەو دەورووبەرەدا بوون، کەبینیان لەشکری ئیسلامیش چەک کراو کۆتاییان هات. ئەوانیش رۆیشتن و لەناوچەکە نەمان و ون بوون. هەر ئەوئێوارە کەگەیشتینەوە رەزڵە بۆ بەیانییەکەی بینیمان پیکابێک لەلای پارەزانەوە هات تەرمێکی بەسەرەوەیە پرسیارمان کرد کێیە؟ ووتیان: عەزیزی حەمە سالح برای قادری حەمەساڵحە، ئەم شەو لەپارەزان کوژراوە، عەزیز پیاوێکی سەرەڕۆ بوو، پێشتر باسمان کرد کە لەساڵی١٩٧٨ لەشەڕی کانی ژنانی ناوچەی تاوگۆزی گیراو دوای چەندین مانگ لەحاڵەتێکی تەم و مژاویدا لەمانگی١٩٧٨/١١دا رایکرد لەدەست مەفرەزەیەکی شپرزەی دوای تێکشکانمان لەشەڕی پەروونیدا. من لەدڵەوە کوشتنی عەزیزم پێناخۆش بوو. کارێکی هەڵەو دواتر مام جەلالیش پێیناخۆش بوو.

پایزی ساڵی١٩٨٢ عەزیز لەبەرامبەر چیای نوەر لەناوچەی نەوڕۆڵی لەئاوایی دڵف تەقەی کرد لە جەماعەتێکی خۆیان و حەمە ئەمینی برای حەمە شەمێراینی بریندار کرد، عەزەی حەمەی ئەورەحمانیشی کوشت. ماوەیەک قاچاغ بوو، ئەوکات هەر کەس یاخی بوایە وشەی قیادە واحدەیان بۆ بەکار ئەبرد ، عەزیز بوو بوو بە قیادە واحدە، ماوەیەک لەوناوچەدا بوو، لەدوای ئەم تەقەکردنەی، من جارێک لەلای دەریاچەی دەربەندیخانەوە سەرکەوتبووم بۆ نەوڕۆڵی و لە ملەی مزیار رۆژەکەی حەرەسمان دانابوو، خۆمان لەئاوایی رووخاوی هانە سوورە چاوەڕێمان ئەکرد تائێوارە بێت و لە لای پریس و تریفەوە بەرەو لای بامۆک و عەبابەیلێ برۆین، لەوێوە بەرەو لای هاوار سەرکەوینەوە. پاسەوانەکانمان دوو کەس بوون، یەکێکیان هات بۆلام ووتی ئۆتۆمبێلێکی جێب لە هەڵەبجەوە هات، سێ چەکدار لەسەر جادەکە لەنلو باخەکانی پریسی سەروودا ئۆتۆمبێلەکەیان راگرتووە، منیش پێم ووتن کە هات ئێوەش رابگرن، ئەوا ئێمەش ئامادەین، دواتر ئەوان ئۆتۆمبێلەکەیان

مۆڵەت دابوو خۆیان لە جادەکە دوور کەوتبوونەوە و خۆیان کردبوو بەناو باخەکاندا. خۆم چوومە سەرجادە و جێبەکە هات ڕامان گرت، دوای چاکوچۆنی پرسیارمان کرد ئەو سێ چەکدارە کێ بوون؟ ووتیان نەمان ناسیون، ئۆتۆمبێلەکە کەمێک دوورکەوتەوە، ئێمە وامان هەست ئەکرد ئەوانە پێشمەرگەی کەرتەکەی شەهید مەحمودی حاجی فەرەج بووبن. دواتر ئۆتۆمبێلکە وەستاو ژنێک لەگەڵ دوو پیاو لەئۆتۆمبێلکەدا بوون، ژنەکە هاتە خوارەوە و لەگەڵ کادرێکدا کە خەڵکی ناوچەی شەمێران بوو چەند قسەیان کرد و ئەوان ڕۆیشتن بەرەو هانەژاڵە.

کادیرەکە کاک ئاسۆ ڕەحیم بوو هات و پێی ووتم ئەوە خێزانی حەمە شەمێرانی بوو بۆ لای حەمەئەمین ئەچن بریندار بووە، ئەوژنە پێی ووتوم ئەوە عەزیزی حەمە ساڵح بوو لەگەڵ دووچەکداردا لەوسەرجادە. من عەزیزم لا مەبەست نەبوو بۆیە قسەم نەکردو دوای نەکەوتین، ئەشمزانی پەیوەندی بە کاک حامدی حاجی خالیدەوە هەیە، دوای عەسر کەوتینەڕێ بەرەو ناوچەی هاوار. ئەویش لەوناوەدا خۆی ون کرد. لەگریانە بووین بیستمان عەزیزی حەمە ساڵح لەگەڵ دووکەسی تر هاتوون بۆ لای یەکێتی، لەسەر بەڵێنی کاک حامدی حاجی خالید، بەڵام مامۆستا پشکۆ ڕازی نەبووە، گوایا ئەوانە مخابەرات و قاتلی پێشمەرگەن، یوسفی خاتەیان کوشتووە کە لەگەڵ عەزیز بووە، عەزیزیان چەک کردووە، هەڤاڵانی لیژنەی هەرێم لەسەر ئەمە تێک چوون وکاک شەوکەتی حاجی مشیر ئاگاداری منی کرد بێمە خوارەوە، هەروەک پێشتر باسم کردووە، ئێمە هاتینە خوارەوە کەرتی شەهید ئەحمەد گریانەیی کەرتێکی گەورەو زۆرترین پێشمەرگەی هەبوو، هەردولا داوایان ئەکرد لەم کێشەدا لایەنگریان بکەین منش ووتم لەم مەوزوعەدا ئێمە بێلایەنین، پێشتریش نامەم بۆتۆ کاک شەوکەت نووسیوە. کاک شەوکەت پێی ووتین حامد چووە بۆ سەرکردایەتی و مامۆستا پشکۆش ڕۆیشتووە عزیزی بردووە تا بزانین کێشە بە کوێ ئەگات.

کاک حامد کۆمەڵە بوو، مامۆستا پشکۆ بەرپرسی کۆمەڵەیە، شەوکەت بزووتنەوە بوو، پشکۆ لەگەڵ حامد تێکی نەدەدا نەوەک لەگەڵ شەوکەتدا یەکبگرێ، ئەگەر مەوزوعی ئەوە نەبوایە عەزیزیی بەبکوژی پێشمەرگەیەکی خزمی خۆی ئەزانی، ئەویش شەهید حەمەتەوفیقەکە یەکێک لەکادرە ئازاو

کوڕە دڵسۆزەکانی ئەوسەردەمەی یەکێتیی بوو، مامۆستاش ئەوپێداگریەی نەئەکرد، حەقی خۆیشی بوو، شەوکەتیش ئەمەی بە فرسەت ئەزانی بۆ شکاندنی کاک حامد، بۆیە پشتگیری م. پشکۆی کردبوو. دیارە هەردوولا ئەگەنە سەرکردایەتی، حامد و پشکۆ بەجیا، عەزیز دوو ڕۆژ لە سەرکردایەتی یەکێتی لە زینداندا ئەبێت، شەهید تایەری عەلی والی داوا لە مام جەلال ئەکات کە عەزیز خزمیەتی و بە میوانی ئەیباتە لای خۆیان، واتە بۆ لای سۆشیالیست بۆگوڕە شێرو دوایی ئەیهێنێتەوە. دوای ماوەیەک عەزیز هاتە خوارەوە، جەنابی مام جەلال بڕیاری دابوو بکرێتە فەرماندەی کەرت.

دیارە م. پشکۆ و چەند فەرماندەی کەرتێک عاجزبوون، نووسراویان دووبارە بۆ مام جەلال ناردوەتەوە و پێ داگریان کردوە بۆ ئیعدام کردنی عەزیز و لەڕێی خۆشیانەوە ڕێکخستنی هەڵەبجە و ناوچەکەیان ڕاسپارد کە نووسراو بنووسن و ناڕەزایەتی دەربڕن پشتگیری مامۆستا پشکۆو جەماعەتەکەی بکەن لەسەر ئەو مەسەلە، دیارە ڕێکخستن مامۆستا پشکۆ خۆی مەسئول بوو لێی. ئەوە بوو لەژێر ئەم فشارەدا فەرمانی ئیعدام کردنی عەزیز درا. عەزیزیان ئیعدام کرد لە دوای چەک کردنی لەشکری ئیسلامی.

دواتر کوڕەکانی قادری برای عەزیز بۆ تۆڵە سەندنەوەی مامیان لە فرسەتێک ئەگەڕان، ئەو ماوە ئەوان لەلای پارتی بوون، لە ناوچەکەدا بە نهێنی و بەنادیاری دووکەس شەهید کران، ب لاوە بوەوە کە ئەوە ئەوان کوشتوویانن، یەکێکیان پیاوێکی تێکۆشەر و لە شۆڕشی ئەیلول سەرلق و لە شۆڕشی نوێشدا دۆستی ئێمە بوو، ئەویش کەریم عەبدوڵڵا شەمێرانی ناسراو بە کەریمی عەبەی خاسە بوو، دووەم برایەکی م. شاهۆ کە زۆر بێ تاوان و بێ ئاگا بوو لەم ڕووداوانە، دواتر پارتی دەری کردن یان خۆیان وازیان هێنا نازانم، چوونەلای سۆشیالیست و لای کاکە حەمە بوون، ئەوە بوو ئەوانیش لە توەقووت کوژرانەوە.

ئینجا سەیری سیاسەت و ڕووداوەکانی ئەم وڵاتەبکە. حامدی حاجی خالید ئەشکێنرێت لەسادەیی خۆی، شەوکەت هێزەکەی خۆی بەم شێوەیە ڕائەگرێت، پشکۆ حەق و تۆڵە سەندنەوە ئەکاتە ڕێبازی سیاسی خۆی و بە ناوی کۆمەڵەوە شەرعیەتی ئەداتێ. لەناو هێزەکەی یەکێتیدا، نەزان و گێلەکان ئەبنە دوو بەش و هەرکەس لایەنی یەکێ ئەگرێ بێئاگا. عەزیز ئەکوژرێ و

بەڵێن شکێنی مانایەکی نییە. جووتیارێکی بێگوناح و بێئاگا لەم مەسەلانە و تێکۆشەرێکی شۆڕش و کوردایەتی، ئەبنە قوربانی لەڕێی ئەم سیاسەتە چەواشەو هەڵەیەوە.

کەریمی عەبەی خاسە ئەگەر شەهید نەکرایە، لەوماوەدا ئەهاتە دەرەوە، بۆناو یەکێتی، هەرچەندە بەڵێنیشی دابوو بەپارتی، کاک کەریم خۆی بەمنی ووت، ووتی ئەکبەر حەیدەر خەریکە کارئاسانی بکات لەئێران بۆ خێزان و ماڵ و منداڵەکانمان، بەڵام من قەلەقم چونکە بەڵێنیشم بەکاک شەوکەت داوە، مەبەستی شەوکەتی حاجی موشیرە. کەریم ئەگەر بهاتایەتە دەرەوە نزیکەی ٢٠بیست کەسی تری لەگەڵ بوو. کەریم دۆستی خۆشەویستی کاک شەوکەت بوو، جارێک مەفرەزەیەکی کاک شەوکەت مەفرەزەکەی شەهید ئەحمەد حسێنی شەمێرانی چەک کردبوو، ئەحمەد چووە ئیمامی زامن بۆلای کاک کەریم پێی وتبوو منیش کەمین دائەنێم بۆ یەکێتی، کاک کەریم چەکەکانی لەکاک شەوکەت وەرگرتەوە، بۆ ئەحمەد، شەهید وەستاقادر وتبووی چەکەکەم وەرناگرمەوە سەرداریان گۆڕیوە، کاک شەوکەت چەکەکەی شانی خۆی دا بەوەستاقادر، دوای ئەحمەد لەئیمامی زامن لێی سەندبووەوەو ناردیەوە بۆ کاک شەوکەت، ئەحمەدحسێن و مەفرەزەکەی لەناوپارتیدا، زووزوو ئەهاتە خوارەوە پێشمەرگەو فەرماندەیەکی ئازا بوو، ئێمە خۆشمان ئەویست، هەوڵمان نەئەدا بەدوایدا بگەڕێین، چەند جاریش بەیەک گەیشتووین خۆمان لێ هەڵەکردووە.

زیاتر سەیربکەن جێ ماوانی عەزیز و کەسوکارو خزمەکانیان لەلای پارتی پێشمەرگەو ئەندام و لایەنگرن، بۆ تۆڵە کردنەوەی مامیان عەزیز، ئەگەر ئەوان بوو بن ئەچن دۆستێکی ڕاستەقینەی ئێستای یەکێتیی و سەرلقێکی کۆنی پارتی شەهید ئەکەن. کوڕان و جێماوانی کەریم لەگەڵ یەکێتی ئەکەون، ترسی ئەوە هەیە ئەم تۆڵە سەندنەوانە درێژەیان هەبێت[1]،

[1] – بەڵێ ڕووداوەکان درێژەیان کێشاو خەڵکی تر کوژران، لەپەراوێزێکدا لەبابەتی تەقەی خۆشی...دا ڕونکردنەوەیەک لەم بارەوە هەیە. ئەمەش ئەبێتە درێژەی ئەو. لەوێدا ووتومانە کوشتنی کەریم و عەزیز. کوشتن و کێشەی زیاتر بەدوای خۆیدا ئەهێنێ، کە کەریمی عەبەی خاسە بەشێوەیەکی نادیار شەهید ئەکرێت، حەمەسەعیدی برای وخزمەکانی گومانیان لە عەزیزی حەمەسالح وبرازاکانی ئەبێت، پێم وایە لە بنەڕەتدا ماڵی عەزیزی

هەر وەک چۆن لەرابردوودا لەو ناوچەدا ئەمە هەبووە، ترسی ئەوە هەیە ئەم کێشە سەر هەڵباتەوەو دووبارە ئاڵۆزی بکەوێتەوە نێوان پارتی و یەکێتیی نیشتمانی کوردستان لەناوچەکەدا، چونکە شەڕەکانی ناوخۆ لەناوچەکەدا زۆربەیان هۆکارەکانیان لەسەرەتاوە کێشەو دوژمنایەتی کۆمەڵایەتی و عەشیرەیەکان بوون، کەچی ئەوەیە دواتر کوڕان و کەسوکارەکەی کەریم یەکێتیی بەجێ ئەهێڵن و سەنگەر ئەگوازنەوە بۆلای پارتی، جێماوانی عەزیز و کەس و کاری لەگەڵ جێماوانی کەریم و کەس و کاری لە بەرەیەکدا خەبات ئەکەن و کۆتایی بە کێشەکان دێت کە بەڕاستی بەلای منەوە ئەمەیان جێگەی دەست خۆشی و پێزانینە.

---

حەمەسالح کەریم بەبکوژی حەمەسالحی باوکیان ئەزانن. ئەوکاتەی عەزیز تەسلیم بوویەوە رۆژێک لە سلێمانیەوە ئەگەڕێتەوە بۆ هەڵەبجە، ئاگادار ئەکرێت لە سیروان خزمەکانی کەریم بۆت دانیشتوون، ئەویش لە سەیدسادق دائەبەزێ، ئەو شۆفێرەی عەزیزی لە سلێمانیەوە هێناوە ناوی ئەحمەدی وەستا قادرە، کە عەزیز دائەبەزێت شۆفێرەکە ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی بۆ هێنانی سەرنشینی تر بۆ هەڵەبجە، سەرنشینی تر ئەهێنێت، کە ئەگاتە شارۆچکەی سیروان شەمێرانییەکان لەسەر جادە بۆ عەزیز دانیشتون بەتەمان عەزیز لە ئۆتۆمۆبێلەکەی ئەحمەدا بێت دەستی بۆ ڕائەگرن ناوەستێ وائەزانی نەفەرن، ئەوانیش تەقە ئەکەن لە ئۆتۆمبێلەکە سەرنشینەکانی عەبدوڵلای کوێخا محەمەد و پیاوێکی بامۆکی دەبن. لەئەنجامی ئەو تەقەکردنەدا عەبدوڵلای کوێخا محەمەد شەهید ئەبێت و ئەحمەدی شۆفێرو پیاوە بامۆکیەکەش بریندار دەبن. شەمێرانیەکان لەسەر ئەم رووداوە لەگەڵ نەورۆلییەکان کێشەکە چارەسەر ئەکەن، دوای ماوەیەک حەمەسەعیدی برای کەریم لەشاری هەڵەبجە لەنزیک خوێندنگای سەرکەوتن بەنادیاری کوژرا، کێشەکە زیندوو بوەوەو پەرەی سەندەوە، لەسەر حەمەسەعید دوو کەسی نەورۆلی کوژران بەناوەکانی حەمەئەمین حاجی مەحموود و ئەنوەری حاجی مەحموود، لە شەمێرانیەکانیش ئیبراهیم عەبدوڵلا و برایەکی فاروق عەلی حەمە کوژران. لەدوای ڕاپەڕین هەموو کێشە عەشائیریەکان چارەسەرکران لە هەڵەبجەو ناوچەکە، بە کێشەکانی شەمێرانی و نەورۆلیشەوە ئێستا ئەو دوو هۆزە تەباو دۆست و تێکەڵاون.

# ڕێکخستنێکی سەربەخۆ

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە سێ ڕێکخراوی کۆمەڵە، بزووتنەوە، خەتی گشتی پێک هاتبوو، لە ناوچەی هەورامان و هەڵەبجەدا، کۆمەڵە پێشتر تووشی شکست هاتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە دەهەی هەشتاکاندا ڕێکخراوی کۆمەڵە وەک شانەبەندی بۆ ئەندامانی ڕێکخستن زۆرینەو دوای کۆمەڵە خەتی گشتی و ئینجا بزووتنەوە بە پلەی سێ هەم ئەهات.

لەم ناوچەدا کەناومان هێناوە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان جگە لە ئەندامانی ئەم سێ ڕێکخراوە لە ناو جەماوەردا بە هەزاران دۆست و لایەنگری هەبوو، ئەمانە بەش بەش بوون، بەشێک ئامادە نەبوون لەیەکێک لەم سێ ڕێکخراوەدا ئەندام بن، بەڵام دۆست و ئامادەیی گیان بەخت کردن بوون، بەشێک لەوانە دەستی کادری ڕێکخستن و پێشمەرگە پێیان نەگەیشتبوو تا شانە بەندییان لە ئۆرگاندا بۆ بکەن، بەشێک ئەیانووت ئێمە یەکێتین و بەڵام حەزناکەین ناومان لە ناولیست و ئۆرگاندا بنوسرێ.

بۆ کۆکردنەوە و ڕێکخستنەوە و شانەبەندی لە ناو ئەم جەماوەرە دۆست و پشتیوانەی یەکێتیی و بەشێک لەو پێشمەرگانەی وازیان هێنابوو یان ئەو ئەندامانەی لەناو یەکێک لەم سێ ڕێکخراوەدا ئەندام و لایەنگر بووبوون و دابڕابوون، ساڵی ١٩٨١ کاک نەوشیروان مستەفا ڕایسپاردم ڕێکخستنێک لەناو ئەوانەدا دروست بکەین و هەر بەناوی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە بێت و ئەو جۆرە هەڤاڵانەی تێدا ڕێک بخەین، خۆمان سەرپەرشتی بکەین و پەیوەندیمان بە کاک قادری حاجی عەلیەوە هەبێت.

ئەمە بۆ من کارێکی زۆر ئاسان بوو، بەڵام زۆر قورس و جێگەی مەترسی بوو بۆ ئەوانەی لە ناوشارو شارۆچکە و دێهات و ئاواییەکاندا ئەم ئەرکە بگرنە ئەستۆ و بەڕێوەی بەرن، من خۆم لە ناو ڕێکخراوی کۆمەڵەدا بووم، بڕێک توند ڕەویش بووم چونکە باش لە دنیای چەپگەرایی نەگەیشتبووم، بەڵام ئەم ئەرکە بووە سەرەتایەک بۆ کاڵبوونەوەم لەو تۆخیەی کۆمەڵە.

بەڵێ لەگەڵ ئەرکە پێشمەرگانەکەم و جەولە کردنەکانم لە دێهاتەکان و هاتوچۆی شاری هەڵەبجە و شارۆچکەکانی دەورو بەری، دەستم کرد بەپەیوەندی کردن، سەرەتا بە نامە نووسین و ناردنیان بەوانەدا کە هاتوچۆی مەفرەزەکانی پێشمەرگەو پارتیزانەکانیان ئەکرد و ئەگەڕانەوە، کەووتمە پەیوەندی کردن و بناغەدانان وەک سەرەتایەک بۆ ئەم تەشکیلات وڕێکخستنە. بەڵێ بە دڵگەرمی و شەوق و زەوقیشەوە دەستم پێ کرد، چونکە پێشتر ڕێکخستنی کۆمەڵە لە ناو پێشمەرگەدا لە سنوورەکەی ئێمەدا مامۆستا پشکۆ نەجمەدین بەرپرسی بوو، ئێمە کۆمەڵێک پێشمەرگەی یەکێتیی و لە ناو یەکێتیشدا کۆمەڵە بووین بڕێک هەستمان ئەکرد جیاوازیەکمان هەیە لەگەڵ هەندێک لە هاوڕێکانی ترمان، لە ڕووی ڕێکخراوەییەوە، نازانین بۆ لە کۆبوونەوەکانی ڕێکخستنی پێشمەرگەدا جاروبار کۆبوونەوەی ڕێکخستنی کۆمەڵە دەکرێت ئێمە تێدا بەشدارنابین، هەندێک هاوڕێمان بەشدارئەبن نەک هیچ جیاوازیەکمان نییە بەڵکو ئێمە لەوان لەپێشترین، بۆ بوون بەئەندامی کۆمەڵە هەندێک بە کورتترین ماوە پێی ئەگەن، بەڵام دوای ئەوان و چەندین جار داواکاری و تۆران و ئاشت بوونەوە، ماوەیەکی کەمترو زیاتر کۆمەڵێک هەرنابینە ئەندامی کۆمەڵە، هەر لە دەوری لایەنگر و پاڵێوراو داین، جگە لەوەی لە شانەی کۆمەڵەدا نابینە ئەندام، شانەی سەرەکی کۆمەڵەش زیادی کرد و ئەوە لەوێ بۆ بەئەندام بوون لە شانە سەرەکیدا ئێمەی چەوساوەکان هەر پێی ناگەین.

با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، لەو هەڤاڵانەی بۆ یەکەم جار قسەو باسمان دەست پێ کردو ئامادەیی خۆیان دەربڕی و دەست بەکاربوون ئەتوانم ناوی ئەم هەڤاڵانە بهێنم کەمال حسین – کەمال هەورامی پێشتر پێشمەرگەبووەو دەوری کادری حیزبی بینوە و لەو بوارەدا شارەزایە، عەبدولخالق حەسەن، عەبدولخالق فایەق پاوەیی، بەهرۆزی عابد، نوعمان ناجی، مستەفا حەمە سەلیم مستەفا سەر سپی، مامۆستا جەوهەر ستار، ئەسوەد خەرپانەیی... تاد. ئەمانە هەموو لەوکەسانەبوون کەهەریەکە و بەرپرسی هێڵێک و شانەیەک بوون، لێزانترین کەسیان کەمال هەورامی بوو لە ماوەیەکی کەم دا لە ڕووی ژمارەوە بوونە ٣٠٠ سێ سەد کەس یان سێ سەد ئەندام. هەموو مانگانە ڕاپۆرتیان هەبوو وە جگە لە هەواڵ و زانیاری و

چالاکی جۆراو جۆری ئەو سەردەمە ئابوونەوەشیان بە ڕادەیەکی بەرچاو مانگانە کۆئەکردەوە.

لەوکارو چالاکیانە ئەنجامیان ئەدا جگە لە ڕاپۆرت و ئابونەوە، هەواڵ و زانیاری ئامادەکردن و پەروەردەکردن و ناردنە دەرەوەی پێشمەرگەی نوێ، هەروەها بەشداری کاریگەریان هەبوو لە بەشداریو سازدان و جۆش و خرۆشاندنی خەڵک بۆ خۆپیشاندانەکان، وەرگرتنی گولله ئار بی جی، بۆمبی دەستی نارنجۆک و فیشەک لە لای چەکدارەکانی مەفرەزە تایبەتەکانی جاش، مخابەرات و جەیشی شەعبی، پاشان ناردنی بۆ پێشمەرگە، ئینجا ڕێنوێنی و بەشداریان لەکاری پێشمەرگانەدا وەک لێدانی بارەگاو ڕەبییەکانی دەستگا ئەمنی و جاسوسیەکانی ڕژێم لەناوشارو شارۆچکەکانی هەڵەبجە، سیروان، خورماڵ و ئوردوگا زۆرە ملێکانی خورماڵ، سیروان، زەمەقی و عەنەبدا.

هەر وەها دواتر چالاکی بێ وێنەیان ئەنجامدا وەک گرتنی ڕەبیەی پاسەوانی کارەبای هەڵەبجە و تەسلیم کردنی دیلەکان بە پێشمەرگە. وردەکاری ئەم چالاکیە دواتر لەبابەتی ڕۆڵی ڕێکخستن لەرۆژانی تیکۆشاندا دەخوێنیتەوە. بەلام زۆرینەی بەرپرسەکانی ئەم ڕێکخستنە هەڤاڵەکانیان سەر بە کۆمەڵە بوون لەوانە هەڤاڵ کەمال هەورامی خۆی کە وەک کەسی یەکەمی ئەم ئۆرگانە دەرکەوت.

لەساڵی١٩٨٢ کاتێک هەردوو ڕێکخراوی بزووتنەوە و خەتی گشتی یەکیان گرت و یەکێتیی شۆڕش گێڕانیان لێ پێک هات. کاک نەوشیروان نامەیەکی بۆمن نارد، کە تێدا باسی ئەوە ئەکات کۆمەڵە کەرتی ڕێکخستنی لە ناوچەکەدا هەیە لە ئاتی شانە سەرەکیەکەی کۆمەڵە یان ڕێکخستنی کۆمەڵە لە ناو پێشمەرگەدا، و یەکێتیی شۆڕشگێڕان ناوچەی هەیە. لە نامەکەدا کاک نەوشیروان داوا ئەکات ژیرانە بەرپرسەکانی ئەو ڕێکخستنەی لە سنوری هەڵەبجە و هەوراماندا بە ناوی ڕێکخستنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە هەیە، بانگ ئەکەن و کۆبونەوەیان لەگەڵ ئەکەن ئارەزوو مەندانە کێ ئەچێتە لای کۆمەڵە دەورو تەسلیمان لەگەڵ کەرتی ڕێکخستنی کۆمەڵەدا ئەکەن کە ئەوکات هەڵۆی ئەحمەد کوردە بەرپرسی کەرتی ڕێکخستنی هەڵەبجە-شارەزوور بوو، ئەوەی ئەچێتە لای شۆڕشگێڕان دەورو تەسلیمی لەگەڵ هەڤاڵ جەمیل هەورامی ئەکەن کە ئەوکات بەرپرسی ناوچەی شۆڕشگێڕان بوو لە شارەزوور، ئەمە زۆر ئاسانە چونکە وتووێژی یەکێتیی و ڕژێم

دەستی پێکردوە، ئەتوانین بە ڕێک و پێکی هەموو بەرپرسەکان و هەڤاڵەکانیش لە ئاستی ئەندام کۆکەینەوە و قسەیان لەگەڵ بکەین.
بەڵێ من کەوتمە ئاگادار کردنی هەڤاڵان و یەکەم کۆبوونەوەی ئەوانەی کە بەرپرسن لەم ڕێکخستنە لەگوندی جەردا سنە کرا، تەشکیلاتی هەرێمی یەک لە لیژنەی هەرێمەوە گۆڕاوە بۆ تیپ، چونکە دوای ئەوەی هەرێمی یەک کەرت بوو کاکە حەمە چۆتە ناو سۆشیالیست یان ئەکرێ بڵێین سۆشیالیست هاتنە لای کاکە حەمە، هەرێمی یەک ئەو هێزانەی لای یەکێتیی مابوونەوە لیژنەی هەرێمی بۆ دانرابوو وەک پێشتر باسمان کردووە هەڤاڵان، شەوکەتی حاجی مشیر، حامدی حاجی خالید، حاکم عومەر عەزیز بوون، ئەم هێزانەش کرانە دوو تیپ.

تیپی یانزەی هەورامان کاک شەوکەتی حاجی موشیر بەرپرسی بوو، من وەک فەرماندەی کەرتی دووی هەرێمەکە سەربەم تیپە بووین وەک ڕێکخستنی کۆمەڵەش کارمان ئەکرد، کاک شەوکەت سەر بە یەکێتیی شۆڕشگێران بوو بۆیە ئەکرێت بڵێین ناوچەی شۆڕشگێرانی ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی ئەکرد و هاوکاری هەڤاڵ جەمیل هەورامی بوو، بۆ کۆبوونەوەی جەرداسنە کاک شەوکەوت داوای لە من کرد ئەو هەڤاڵانە لە شارەوە هاتوون با بیان بینێ دیارە ئەیویست زۆرترینی ئەو ڕێکخستنە ببات بۆ لای ناوچەی شۆڕشگێران.

هەڤاڵەکان هاتن و کۆبوونەوە کراو بۆمان ڕوون کردنەوە کە بزووتنەوە و خەتی گشتی یەکیان گرتووە شۆڕشگێرانی لێ پێکهاتووە ناوچەیان هەیە سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانیان ئەکات، کۆمەڵەش کەرتی ڕێکخستنی دروست کردووە، نامەکەی کاک نەوشیروانم بۆ خوێندنەوە. بڕیار درا هەڤاڵان بگەڕێنەوە دوای چەند ڕۆژ دواتر کۆبوونەوەیان لەگەڵ ڕێکخستنەکانیان کردبێ و هەرکەس ئەچێت بۆ لای هەر لایەک بە لیست و قایمەی خۆیەوە بێتە گوندی تەپەکوڕە، ئیتر دوای کۆبوونەوەکەی خۆمان کاک شەوکەت چەند هەڤاڵێکی بینی و کاک هەڵۆی ئەحمەد کوردەش چەند کەسێکی بینی، هەردوو لایان هەوڵیان ئەدا لەو ڕێکخستنە سەربەخۆیە زۆرترینی بۆ خۆی ببات. بیرم دێت من خۆم زۆر مەبەستم نەبوو تا هەڤاڵان زۆرتریان بۆ لای کۆمەڵە بێن، کاک کەمال هەورامی لەو کۆبوونەوەی جەرداسنەدا وا قسەی ئەکرد و ئیشی ئەکرد هەمووی بۆ لای کۆمەڵە بهێنێ،

من بە نهێنی پێم ووت بەر لە هاتنتان بۆ تەپە کورە تۆ زووتر وەرە بۆ گوندی شەشک با لەو بارەوە قسە بکەین.

هەڤاڵ کەمال هەورامی هاتە گوندی شەشک و منیش بە نهێنی لەگەڵ دوو پێشمەرگەدا کە ئەوانیش هەڤالان حەمە فەرەج حەمەبابا و رزگار محی الدین بوون ڕۆشتین پێکەوە دانیشتین، هەندێک تاقمی مەخزەن و کەلوپەلی پێشمەرگانەشی بۆ هێنابووین، نییەتی ئەم دانیشتنو کۆبوونەوە بۆ زانینی ئەنجامی کۆبوونەوەکانی ڕێکخستن بوو لە شاردا، تا بزانین چەند کەس دەچنە لای شۆڕشگێران و بەرپرسەکانیان کێن، هەروەها بۆ کۆمەڵەش. هەڤاڵ کەمال ئەو ماوەیە نەشتەرگەری بۆکرابوو، چونکە لەکاتی خۆپیشاندانەکانی ساڵی ١٩٨٢دا گیرابوو، لە ئەنجامی ئەشکەنجە داندا توشی فتقی دەرەکی بووبوو. لەم کۆبوونەوەدا بۆم دەرکەوت هەڤاڵ کەمال هەڵوێستەیەکی کردووە لەڕاکەی پێشتری کە لە کۆبوونەوەی چەرداسنەدا هەیبوو.

دواتر و لەکاتی نووسینی ئەم بیرەوەریانەدا پرسیاری ئەو هەڵوێستە کردنەم لێ پرسی، پێی ووتم: (ڕاستە من تووشی هەڵوێستە کردن بووبووم وەک خۆت ئەوکات درکت پێ کردبوو، من بە ڕواڵەت چەپێکی توند بووم، بەڵام کاتێک ڕۆشتم بۆ ژووری نەشتەر گەری لە ڕێگادا پێنج دینارم کرد بە مەولود تا سەلامەت بم، لەوێدا و دواتر تێگەشتم کە من کەسێکی مارکسی لینینی نیم مارکسیستی بونی خۆم خستە ژێر پرسیار، ئیتر ئەوەبوو بڕیارمدا جارێکی تر چی چاپەمەنی لە بارەی بیری مارکسیستی هەیە دووبارە بخوێنمەوە وام کردو گەشتمە ئەو باوەڕەی وەک فەلسەفە بیری مارکسیزمم پێ پەسەندە، بەڵام وەک میکانیزمی کار لە نێو کۆمەڵگەی کوردەواریدا پێم پەسەند نەبوو) .

چەند ڕۆژ دواتر چووینە گوندی تەپەکورە، لەوێ هەموو هەڤاڵەکان هاتبوون، جگە لە یەک دوو کەس لەوانە یەکێکیان کەمال دیار نەبوو، گەرام بە دوایدا و دۆزیمانەوە لە تەپی سەفا بوو، کاک شەوکەت لەم چەند ڕۆژەدا دەستی پێی گەشتبوو هەولیدا بوو بێتە شۆڕشگێران، بۆیە ئەویش بەڵێنی دابوویە و بوو بە شۆڕشگێران لە سەر ئەمەش بڕێک ساردی کەوتە نێوانمان. لە ئەنجامدا هەڤاڵ کەمال هەورامی و چەند کەسێکیتر لە ناو ڕێکخستنی شۆڕشگێراندا درێژەیان بە ئەرکی خۆیان داو باقی هەڤالانی تریش لەگەڵ کەرتی ڕێکخستنی کۆمەڵەدا بەردەوام بوون.

# هێزی پشتیوان

پایزی ساڵی ١٩٨٢ لە دەشتی شارەزووردا ئەم دێ بۆ ئەو دێ دەگەڕاین، دوای ئەوەی گەشت و کارمان تەواو بوو بەرەو هاوار و گریانە کەوتینەڕێ، شەوی ٢٧-١٩٨٢/٩/٢٨ لەئاوایی خێڵی حەمە لای دۆستەکانی خۆمان نزیکەی ٣٠ سی بەتانیمان کۆکردەوە، چونکە ماوەیەک بوو بنکە و بارەگای گریانەمان چۆڵ کردبوو، ئەبوو سەرلە نوێ ئەو خانۆچکە و کەلاوانەی گریانەڕاست بکەینەوە، بیانکەینەوە بەبارەگا بۆ ئەوەی زستانی ئەمساڵ لەوێ بەسەر بەرین. لەئاوایی خێڵی حەمەوە بەرەو دەرەشیش قەتارەمان بەست و لە زۆر شوێن هاوڕێکەی خۆتت لێ دیار نەئەماکە لەپێشتەوە بوو، شەوێکی ئەوەندە تاریک و نووتەکە بوو، نیوەشەو گەیشتینە سەرکانی و ئاوی سەرکەنی تاوێرە و لە مەترسی دەرچووین، لەوێ لامان دا بۆ پشوودان. دوای پشوویەکی کورت دووبارە کەوتینەوەڕێ.

نزیکەی سەد مەتر لەکانی و ئاوەکە دوورکەوتینەوە ئەوەی لەپێشەوە بوو خۆیدا بە زەوی داو هاواری کرد کێی زەلام کوژرایت؟ دەست هەڵبڕە. ئەویش شراقەی میلی کلاشینکۆفی تاریکە شەوی شەق کرد و خۆتان کێن؟، هەموو شلەژاین و لە بەر ڕێگەدا خۆمان دابەزەویدا، بەڵام شوێنەکە ئەوەنەبوو دوژمن بگاتەئەوێ، بۆیە دوای چەندین جار کێیت و کێن لەیەک ئاشکرا بووین، ئەمە دوو پێشمەرگەی هێزەکەی خۆمانەو کاتێک لەسەرکانی لامان داوە ئەوان پێشتر دەرچوون و نازانن ئێمە وەستاوین بۆ پشودان، دوای ماوەیەک دائەنیشن، ئەوانە هادی برام و حەمەفەرج محەمەد بابا بوون، حەمە فەرەج پیاوێکی قارەمان و گورج وگۆڵ کە بەداخەوە دواتر شەهید بوو، لەسەر ئەمە کە بۆچی ئەوانە ئەزانن ئێمە واین بە دوایانەوە، بەڵام بەو شێوە وەڵام ئەدەنەوە، پێمان ئەڵێن ئەی ئێوە کێن؟ هەر لەو جێگەدا و لەتاریکایی ئەو شەوەدا کۆبووینەوە و بڕیارمان دا ئەم دوو پێشمەرگە سزا بدەین،

سزاکەش ئەوەبوو ۳۰ سی بەتانییەکەمان کردە دوو کۆڵ و بەو هەورازەدا لە سەرکەنەوە بۆ تاوێرەلە کۆڵیان کەن.

ئەوانیش قبوڵیان کرد و کۆڵەکانیان وەرگرت. ڕۆژی دوایی گەیشتینە چەمی هاوارو وردە وردە بۆ ئێوارەکەی گەیشتینەوە بە کۆنە هەوارمان واتە ئاوایی گریانە. لەوێ دەستەیەک چوون بۆ دۆزینەوەو هێنانی ئارد و برنج و ڕۆن، دەستەیەک بۆ دار کۆکردنەوە و دەستەیەکیش بۆپاک کردنەوەی خانە باخ و کێڵە ڕووخاوەکان بە شێوەی کاتی تەنیا بۆ ئەم شەو. ئەو شەوەمان بەڕۆژ گەیاند هیچ هەستمان بە ماندوو بوون نەئەکرد، بەڵام من هەر لە بیری ئەو دەستە پێشمەرگەیەدا بووم کە لە لای گردە درۆزنەوە شەوی پێشوو لێمان جیابوونەوە، ئەویش بە فەرماندەیی فاتح ئێناخی و پێشمەرگانیش زۆرکردە نەبوون فاتح تازە بووبووە فەرماندەی مەفرەزە پەلەی بوو کەچەند چالاکیەک بکات.

من شەوی پێشتر کاتێک خوا حافیزیمان کرد لە فاتح و ئەو چەند پێشمەرگەی لەگەڵیدا بوون، داوام لێ کردبوو وریای خۆیانبن، فاتح پیاوێکی نەترس و هەڵەشە بوو، ترسی ئەوەم بوو لە ناو شاردا ئاشکرا بن و دوژمن بچێتە سەریان. ئەو چالاکیەش کە بەتەمابوون ئەنجامی بدەن بۆی باسکرد بووم، کەئۆتۆمبێلێکی زیلی سەربازی لە ملە هومڵەوە ئێواران دێتە خوارەوە بۆ سەربازگەی هەڵەبجە، ئەمان شەوی یەکەم لە ناوشاردا ئەبن و ئەچنە ئاوایی بامۆک، ڕۆژی دوایی سەر لەئێوارەکەی لەپشتی بامۆک کەمینی بۆئەنێنەوە و لێی ئەدەن.

بەیانی ڕۆژ بووەوە، بۆ ئەکبەر ئێناخیم باس کرد کە فاتح و هەڤاڵەکانی ئەمشەو بێتەوە چالاکیەک ئەنجام ئەدەن و ئەبێ ئێمە لێرەوە بچینە بۆین و لەوێشەوە بچینە ڕێشاو بەپیریانەوە، چونکە لەگەڵ فاتح کات و شوێنمان دیاری کردووە. هەڤاڵانی ترمان ڕاسپارد خەریکی چاک کردن و نۆژەن کردنەوەی بارەگابن، ئێمە دوو ڕۆژمان پێ ئەچێت و ئەگەڕێینەوە.

ئێوارەی ۱۹۸۲/۹/۳۰ کەوتینەڕێ بێئەوەی نان لەگەڵ خۆمان بەرین کە هەرنەشبوو، هەورازی گریانەمان بڕی و لەملەی چاڵانەوە بەدیوی ئاوایی بۆیندا لابەلا بووینەوە، لەو شوێنەدا ڕوو بکەرە باشور، دنیایەکیترت لێوە دەردەکەوێت، تا چاو بڕبکات ڕیزە شاخ و قولەی بەرزو دارستانی چڕو دۆڵ

و شیوی زۆر قووڵ دەردەکەون، کە ئاوی سیروان بەنێو ئەم بەرزایی و شاخە بەرزانەدا ڕەخوڕ بەرەو دەریاچەی دەربەندیخان سەرشێتانە خۆی ئەدا بە دارو بەرد و ئەم بەرو ئەو بەری کەنارەکاندا، تا وردە وردە لە نزیک دەگاگاو شێرۆڵەدا لە بەردەم بالامبۆدا هێمن ئەبێتەوەو ئەگا بەپەنگاوی دەریاچەی دەربەندیخان.

ئەم دەڤەرەی لە تۆوە دیارە لەم شوێنەدا، ئەمبەر و ئەوبەر ئێناخی نشینن، بەشێکیشی ئیمامی نشینە، بۆ نێوەڕۆ لەئاوایی بۆین ماینەوە، بۆین ئاواییەکی کۆکۆی نشینە، بەبێ نان و چا کاتمان بردە سەر تائێوارە، هەندێک لەهەڤالان کونە بەردو بنئەشکەوتان گەڕان هیچمان دەست نەکەوت، بەبرسیەتی ماینەوە و بۆ لای ئێوارە خۆمان کرد بەئاوایی ڕیشاودا کە ئەوکاتە بنکە و بارەگای حیزبی دیموکراتی لێبوو، بە تایبەت هێزی پشتیوان (بەرگری میللی) و خێزانەکانیان لێرە بوون.

لەوێ لە دووماڵدا حەواینەوە، نان و چایمان خوارد و زۆر بەگەرمی پێشووازییان لێکردین. ئێمە بەتەمابووین لە نیوە شەودا ئەوێ بەجێ بهێڵین و بچینە ئەو شوێنەی کە بۆ کاک فاتحم دیاری کردبوو.

بەڵام هەرچەند، چەند کاتژمێرێک لەشەو تێنەپەڕی بوو کەسێک لەپێشمەرگەکانی حیزبی دیموکرات هاتە ئەوماڵەی منی لێ بوو، بانگی کردم وتی کەمێک کارم پێتە، فەرموو، بابچینە ئەولاتر، دوورتر کەوتینەوە لە ماڵەکە. کاکە فاتح لەم سەرەوەیە هەواڵی تۆی پرسی، پێم وتووە لەو ماڵەیە، ووتویەتی پێی بڵێ لێرەین با ئەوان بێنە سەرەوە. زانیم شتێک ڕووی داوە، هەستاین و خواحافیزیمان لە ماڵەکان کردو دوای چەند دەقیقەیەک گەشتینە لای فاتح و سەیرم کرد هەرچوار هەڤاڵەکەی کە هاوسەفەری بوون لەوێ ئامادەن، دڵم خۆشبوو هیچ ڕووی نەداوە. دوای چاکوچۆنیمان، ئەبینم مات و ڕوخساریان تەواونیە، پرسیم چی ڕوویداوە؟ با ئێرە بەجێ بێڵین و بچینە شێخ خامۆش، شێخ خامۆش لەپیران و ڕابەرانی مەسلەکی یارسانە، مەزارەکەی ئەکەوێتە پشتی ئاوایی ڕێشاو لەسەر ڕێگای ئاوایی بۆینەو کانی و ئاوی لێیە.

وردە وردە من و فاتح پێکەوە بە دوای هەڤالانەوە سەر ئەکەوین، بۆم باسکە چیتان کرد؟ وەلا کەمینەکەمان دانا زیلەکە هات و لێمان دا چی تیابوو

کوشتوومانە، کاتێک ویستمان بچینە سەری هات و هاواری ئاشنا بەرگوێم کەوت وابزانم لە خزمانی خۆمانی تێدابوو کوشتوومانن، ئیتر نەچووینە سەریان، یەکسەر بەرەو ئێرە هاتووین، ئەو شەوە لەوێ ماینەوە بەیانی ڕۆژ بووەوە، فاتح ووتی: لە کۆساوا قۆری وپیاڵەم شاردوەتەوە با بچم بیهێنم و نەومنانمان پێیە و هەواڵێکیش بزانم لە سازان چ باسە. ئەوکات و لەو سەردەمەدا سازان ننکە و بارەگای ئەو هێزە عەشایرییە ئێرانیانە بوو کەلە شەڕی عێراق و ئێراندا ڕژێمی عێراق چەکداری کردبوون.



لەئێمەوە نیو کاتژمێر بەپێی پیادە دوور بوون، لە ناو ئەمانەدا بنەماڵەی نامدار کە هەمیرخان بەگی و ئێتاخی بوون، دۆستمان بوون و هاوکاریبیان ئەکردین، لەوانە ڕەزای نامدار و پاشای نامدار و تاهری نامدار و نەجیمی نامدار، ئەمانە شەش برابوون سەردەمی خۆی لەگەڵ تەیموری بەختیار بوون، دواتر لەشۆڕشی ئەیلولدا لەگەڵ باڵی م س بوون، ئەوکاتە قادری برایان شەهید کراوە، دواتر حەمە ساڵحی برایان لەساڵی ١٩٦٨ بریندار بووە و دواتر گیانی سپاردووە.

بەڵێ فاتح لەگەڵ دوو پێشمەرگەدا چووە خوارەوە، من لە سەرەوە بەدووربین چاودێریم ئەکردن، بینیم بەر لەوەی بگەنە ئاوایی ڕێشاو کەسێک بەرەو ژوور هات و لەگەڵ فاتح گەیشتنە یەک و کەوتە قسە و پاش چەند خولەکێک فاتح و دوو پێشمەرگەکە بەپەلە بەرەو ژووربوونەوەو گەڕانەوە بۆلای ئێمە، کەگەیشتن چەند هەنگاویان مابوو چوومە پێشەوە، ها فاتح چی بوو بۆ گەڕایتەوە؟ چوزانم کوڕە! پەنمان داوە، چی بووە؟ لەناوزیلەکەدا خالۆ پاشای نامدار و عەلی حامد و بورهانی مەلاتاهر و عەلی دوریسانمان کوشتووە. ئەودوانەی ترکێن؟ خزمی خۆمانن، چکارەن؟ لەو چەکدارانەی سازان دۆستەکانی جەنابت، بەداخەوە. دەی هەستن بەرەو بڕێن، نیوەڕۆ گەیشتینە بۆین لەسەر کانی و ئاوەکە لاماندا و لەسەر چیمەنتۆی حەوزی

مزگەوت دانیشتین، نانەکەبهێن، کەس قسە ناکات کوا تۆشەبەرەی نانەکە؟ پێشمەرگە لەیەک ئەپرسن کوا؟ نییە، لەبیرمان چووە لەشێخ خامۆش.

هاشم بۆینی وکەیکاوس، ووتیان کاکە حەمە ئارد هەیە، لەکوێ؟ لەکونە بێخوێ، بچن بیهێنن، هێنایان ئاردەکە کۆن بووە و ئەسپێی دروست کردوە. تەشت نییە، لەسەر چیمەنتۆکە ڕۆمان کرد، دەستمان کرد بە بژنینی ئەسپێ، پاک نابنەوە ئەسپێکە زۆر زۆرە، مەنجەڵێکی فافۆنی شکاویان دۆزییەوە، ئەکبەر ئەڵێ بیکەینە مەنجەڵەکەو ئاوی تێکەین ئەسپێکان سەر ئاو ئەکەون.

ئەسپێ سەرنەکەوتوو هەویرمان بە ئەسپێکانەوە شێلا. با هەویرەکە گونک گونک ببژنین. هەرکەس بۆ خۆی خەریکە، لە ناو مەنجەڵە فافۆنەکەدا ڕۆن قرچاوە و هەویرەکەمان لە سەر چیمەنتۆکە داناوە. وەک لوقم پارچەی بچوک ئەبژنین و لەناو ڕۆنی ئەکەین و بەچیلکەیەکی نووکدار دەری دێنینەوە. هاشم ماندوو ئەبێ لە بژنین و تێر نابێ، بۆیە هەروا پارچە پارچە بە ئەسپێکانەوە هەویر ئەبرژێنێ و ئەڵێت کونجی و ئەسپێ جیاوازی چییە؟ خۆی تێر ئەکات. دوای نیوەڕۆ هەورازی تاقەت پڕوکێنی بۆین بۆ ملەی چالانمان بڕی و سەرەو خوار بووینەوە بۆئاوایی گریانە، کەلەسەرەوە سەیری ناو قوولیی دۆڵەکە ئەکەیت ورەت نامێنێ ئاخۆچۆن بگەمە خوارەوە؟.

ئەو شەوە لەگریانە بووین و بەرنامەی ڕۆژانی دواتر و دابەش کردنی ئیش و کارمان تەواو کرد، من ئەمەوێت سەرێک لە ماڵی باوکم و منداڵەکان بدەم، ماوەیەکە بە تەنیا بەجێمان هێشتوون لەئاوایی دەرتفێ و بەتەمان بگوازنەوە بۆ هاوارە کۆن. گەیشتمە هاوارە کۆن باوکم هات و یەکمان بینی، پرسیی ئێوە بە تەمای چین؟ ووتم بنکە و بارەگای ئەم زستانە لەگریانە دائەنێین.

ئەویش ووتی بە تەماین ئەگەر خێزان و ماڵە بەرگریەکانی حیزبی دیموکرات هاتنە هاوارە کۆن، ئێمەش لەگەڵ ئەواندا بگوازینەوە بۆ ئێرە، لەم کاتانەدا ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستانمان کردووەتەوە گوێمان بۆ گرتووە، فەرماندەی تیپ شەوکەت جفرەی هەیە بۆ من، دوای نووسینەوەی و حەلکردنی، ئاوا ئەڵێت خۆت و هەموو پێشمەرگەکان ڕۆژی ١٩٨٢/١٠/٣ لەئاوایی ڕەزڵە ئامادەبن بۆکاری پێویست.

بەڵێ بە باوکم ووت ئەبێ بچینەوە بۆ شارباژێر، داوا ئەکات چەند پێشمەرگەیەک بۆ هاوکاری ئەوان بمێننەوە. زوو گەڕامەوە گریانە و فەرماندە مەفرەزەکانم بانگ کردن و نروسکەکەم پیشان دان، چی بکەین؟ نابێ دوا بکەوین هەر ئەم ئێوارە بەڕێ بکەوین، ووتیان درەنگە سبەی باشە.

ئێوارەی دوایی بەڕێکەوتین و تاریک و لێڵ گەیشتینە دەمی دەشت لەپەنا رەبیەی بەرامبەر ئاوایی دەرەشیش چاوەڕێی تاریک بوون ئەکەین. تاریکی کرد و دەشتی سەبانمان گرتەبەر، بەیانی تیشکی خۆر لەسەر سوورێنەوە دەرکەوت، ئێمەگەیشتبووینە سەرکانی و ئاوەکەی پشتی چواڵەی لای کەوڵۆس.

بۆ نزیک کاتژمێر هەشتی بەیانی لەئاوایی دۆڵە چەووت پێشمەرگەمان دابەش کرد بۆنان و چای خواردن و من و فاتح ئێناخی بووینە پاسەوان، فاتح باسی ئەوەی بۆ ئەکردم، هاتین و دواتر دەنگ و باسی هەڵەبجەشمان نەزانی، لەم قسەکردنەدا بووین بینیم وا کەسێک لە دۆڵە سوورەوە هاتوو بەرەو دۆڵەچەووت ملی ناوە، ووتم فاتح ئەوە کەسێکە لەو ڕێگەی لای دۆڵەسوورەوە بۆ ئێرە دێت، کوا؟ ئەوەتا، دەست ئەبات بۆ دوور بینەکەی ملی و کەمێک ورد ئەبێتەوە، بەخوا ئەوە لە شەوکەتی برام ئەچێت، وەڵا خۆیەتی، شەوکەتی چی؟ بەم بەیانییە چۆن ئەگاتە ئێرە؟ ئەو هەر نزیک تر ئەبێتەوە، بە تەئکید خۆیەتی، بابێت ئەوەندەی نەماوە بگاتە لامان، ئەویش ئێمەی چاو کردووە.

فاتح خۆی ناگرێ و بەپیریەوە ئەچێت، منیش لە سەرەوە سەیریان ئەکەم. کاکە ئەوە لە کوێوە خەیربووە؟ چی بەگوڕەکەی باوا هەمیرخانت ئەی نازانی چیت کردووە؟ منیش چووم و چاکو چۆنیم لەگەڵ کاک شەوکەت کردو دانیشتین و کاک شەوکەت بۆی باس کردین، کە بەڵێ ئەو خزمانە کوژراون و ئەمیان ناردووە دەقیق بزانێ چۆن بووە؟ ئایا ڕێکەوت بووە یان ئەنقەست؟.

منیش بۆ کاک شەوکەتی برای فاتحم روون کردەوە کە چۆن بووەو رام سپارد بچێتە لای مام ڕەزا و بەناوی منەوە سەرەخۆشیان لێبکاو تازە ڕووداوەکە رووی داوە. کاتێک گەڕاینەوە من خۆم ئەو خزمانە ئەبینم و زیاتر بۆیان روون ئەکەمەوە چۆن بووە، کەچی شەوکەت هەر توورەیە لە فاتح،

فاتحیش توورە بوو دەستی کرد بە هەڕەشە کردن، ووتی: گەڕامەوە ئەزانم چی ئەکەم.

من زیاتر شەوکەتم هێمن کردەوە و گەڕایەوە و ئێمەش بۆ نیوەڕۆ سەرکەوتین و گەیشتینە ئاوایی ڕەزڵە. تا گەیشتینە چاڵەخەزێنە دواین ئاوایی ئاوەدان بەرەو سنوری بلەکێ و چەم پاراو وردە وردە لەگەڵ ئەو هێزانەی بەرەو قاسمەڕەش ئەهاتن یەکمان گرتەوە. لە ناو هێزەکاندا واب لاوەە کە ئەچین بۆ پشتیوانی هێزەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات، جارجار پرتەو بۆڵە لە ناو هێزەکاندا هەیە، شەوانە لەمزگەوتەکانی ئەو ئاواییانەی لەسەرە ڕێگەمانن و بەشەودا لێیان ئەمێنینەوە گفتوگۆ لەسەر ئەم بابەتە گەرم ئەبێت، ئێمەش کە لایەنگری ئەوەین ئەبێ ئەم پشتیوانییە بکرێت، تەنیا پاساو ئەوە بوو سەرکردایەتیمان لەژێر مەترسی دایە، هێزەکانی کوردستان هەمیشە بەکاریان هێناوین بۆ دژایەتی کردنی یەکتر، با لە مێژوودا جارێکیش پارچەیەکی کوردستان هاوکار و پشتگیری پارچەیەکیتر بکەین.

لەو بڕوایەشدا بووین ئەوەتا پارتی لەپێش هێزی پاسدارانەوەن لە هێرشەکاندا پێشڕەوی دەکەن بەرەو سەرمەرز، کوردستانی ڕۆژهەڵات و سنوورەکان کۆنترۆڵ ئەکەنەوە، کە ناوچەکە گیرا شەڕەکە ئەبێ لەگەڵ ئێمە دا دەست پێ بکات، مەبەست لەناوچەکە دۆڵەتوو، ئاڵوەتان، کونە مشکێ، ساوێن، مەمکاوێ و داوداوێ و مەزرایە، ئەی بۆچی تا نزیک نەبۆتەوە بەری پێ نەگرین؟ دژەکانیش ئەیانووت کەس بەری هێرشی ئێرانی پێناگیرێ، ئەوەتا هێزەکانی ڕۆژهەڵات هەموو کوردستانیان لە دەست داوە و پێچاویانەتە ئەم سنوورە، هەرکەس شەڕ لەگەڵ ئێراندا بکات دۆڕاوەو ئەنجامی باش نابێت، مەلابەختیار و لایەنگرەکانی ئەوکات زیاتر بە عێراقچی ناو ئەبران دژی ئەم شەڕەبوون، بەڵام تەنیا وەک ڕایەک ئەگینا بەبێ دوو دڵی بەشداری شەڕەکەیان کرد و مێژووش سەلماندی یەکێتیی ئەگەرچی لە مێژووی خەباتی خۆیدا بۆپشتگیری و پشتیوانی براکانی لەپارچەیەکی تری کوردستاندا هەڵوێستی کوردانەی هەبوەو قوربانی داوە. بەڵام باجەکەشیدا.

ئێستا ئەوەتا نەهەڵوێستی سیاسی کوردانە و نە قوربانی دانەکە وەک خۆی خوێندنەوەی بۆ ناکرێ، بەپێچەوانەوە ئەو لایەی لەپێش هێزەکانی سوپای ئێرانەوە پاکسازی کوردستانیان ئەکرد، لەلای لایەنێکی سیاسی

ڕۆژهەڵاتەوە زیاتر ئەو هێزە بە دۆست ئەزانن تا ئەو هێزەی پشتیوانی کردن و باجی سیاسی لەسەردان، ئینجا ئەگەر بارینی بەفری زۆری ئەو ساڵەنەبووایە، وەک جەنابی مام جەلال ناوی نا جەنەڕاڵ بەفر سوڵحی کردین، یەکێتیی شپرزەتر لەوشەڕە ئەهاتەدەر.

بەڵێ ئێمە واتە هێزەکەی تیپی ۱۱ی هەورامان لە دەوروبەری ڕۆژی١٥/ ١٠/ ١٩٨٢ دا گەشتینە ئاوایی مەزرا، لە تەنیشت ئاوایی لەکێڵگەیەکدا کۆبووینەوە و جەنابی مام جەلال ووتارێک پێش کەش ئەکات، زیاتر حەماسی پێشمەرگە و ورەیان بەرز ئەکاتەوە، لای هەندێک قەڵەقی و دوودڵی نامێنێ، لە تەنیشتیەوە د.عەبدولڕەحمان قاسملو و حەمەسوری کۆمەڵە وەستاون، ئەوانیش قسەی خۆیان ئەکەن، لەخواریشەوە بلەی سەعەکەڕ دەستە کەوشەی جووتی جووتیارێکی بەدەستەوە گرتووە و جووتەگاکە لێ ئەخوڕێ و گۆرانی حەسەن زیرەک ئەڵێت، هێرۆخانیش لەم لاوە بە کامێرا ڤیدۆکەی سەرشانی وێنەی ئەگرێ.

دوای تەواو بوونی کۆبونەوەکە هێزەکەی تیپی یانزەش بەڕیز بەناو باخ و ماڵەکانی مەزرادا ئەکەونەڕێ بەرەو مەمکاوێ و داوداوێ، فاتح لەم کاتەدا نوێژی عەسری کردوە و جێماوە، بەفەرنجی لاشانی و چەکەکەی دەستیەوە بەڕاکردن خۆی ئەگەێنێتە کۆتایی قەتارەی پێشمەرگەکان. ئەم دیمەنە وێنە گیراوە ئێستا لەئەرشیفی گەلی کوردستاندا هەیە، دوای چەند ڕۆژێک ئێمە دەگەینە ئاوایی کونەمشکێ، ملازم عومەر عەبدوڵلا لەوێیە و بەهائەدینی حەلیم، بە قسە خۆشەکانی تێبینی هەیە لەسەر ئەم شەڕە.

ئاوایی کونە مشکێ چۆڵە، خانوەکانی بوونەتە بنکە و بارەگای پشتەوەی هێزەکان، لەوێ و لەدوا نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٨٢/١٠/١٧فەرماندەی کەرتەکان و فەرماندەی تیپ بە هاوڕێیەتی ملازم عومەر ئەچینە سەرشاخ بۆ بینینی بەرەی شەڕ تا شەو تیپی ٢٣ سووورداش بگۆڕین. لە ئاوایی بەڕێکەوتین تا نزیک بووینەوە لەبەرزاییەکانی ئەو شوێنەی ئێمە بۆی ئەڕۆین، ئەو پێشمەرگانەی لەوێن، هاتوون بەم دیوداو سەر بەرزایەکانیان چۆڵکردووە. بۆچی لێرەن؟ هەروایە تۆپ باران تەواو بوو ئەچینەوە ناو سەنگەرەکان، ملازم عومەر تووڕە ئەبێ و ئەی حەرەستان لەسەرەوە نییە؟ نەخێر.

خۆمان ئەچینە سەرەوە، ئێمە و هێـزی بەرامـبەر پـێکەوە لەسـەر بەرزایی ناوەڕاسـتدا تێکەڵ ئەبین، شـەڕی دەستە و یەخە دەســـتی پێکـــرد. فەرمانـدەی کەرتێـک بەپەلە ڕائەکـاتە خـوارەوە، هێـزەکە ئەهێنێـتە سـەرەوە بە بەرب لاوەی لەچەنــــــدین لاوە سەنگەر ئەگرن. ئەم چیا چەندین ترۆپکەو بەرزونزمیە لە بەتەنیشت یەکەوەن. بەڕووی کونەمشکێدا زەویەکی داکەوتەو جگە لە بنچکەگەوەن هیچی تری لێ سەوز نابێ، بەڵام بە دیوی ئەودیودا سەخت و دارستانی چڕو پچڕ پچڕە.


لەراستەوە: جەمال ئاغا، نەوشیروان مستەفا، ملازم عومەر، مام جەلال، حەمەی وەستا، ١٩٨١ نێوان زەلی و شێخ...

سەرگورد عەلیار و هێزێک لەدەستی ڕاستی ئێمەدان، هێزەکەی ئێمە ئەگاتە جێ، بەڵام کەرت و مەفرەزەکان تێکە لاوە بوون هەرکەس لە هەر جێگەیەک دایە شەڕی خۆی ئەکات. لەو پەلامارەدا کە نیوکاتژمێری نەبرد بەرگری تەواو کرا، لە ناکاو بەرزایی ناوەڕاست گیرا، هەموو کەوتینە بەر مەترسی، شەوکەتی حاجی مشیر داوا ئەکات ئەبێ بیگرینەوە ئەگینا هێزەکە شپرزە ئەبێت، دەست و برد گرتمانەوە.

فەرماندەی ئەم شوێنە فەرماندە کەرتێکی ئازا بوو، بەڵام لەوکاتەدا ووتبووی خۆ نەوتەکە لێرەنییە، ئەم قسە کاریگەری خراپی کردبووە سەر پێشمەرگەکان و چۆڵیان کردبوو، دواتر هاتنەوە لای ئێمە و پێمان ووتن بۆچۆڵتان کرد، یەکێک لەوانە فەیسەڵی مام کاکل بوو ئەمەی بۆ گێڕاینەوە کە باسمان کرد. لەم شەڕەدا ٥پێنج پێشمەرگەی تیپی ١١ی هەورامان شەهید بوون، لەوانە فاتح مستەفا ئێتاخی فەرماندەی مەفرەزە، فەیسەڵ مەلا عەلی کاکە شێخ فەرماندەی کەرت، عومەر حەمە عەلی چاوجوان فەرماندەی مەفرەزە، سەعدی عەبولە فەرماندەی مەفرەزە. ئەم قارەمانانە پاش نیوەڕۆی ڕۆژی١٩٨٢/١١/١٧ گیانیان بەخت کرد، عیزەدین مەحیەدین نەورۆڵیش لە١٩٨٢/١٠/٩ لە ئالوەتان شەهید بووبوو.

کەیکاوس و هاشم بۆینی و چەندین کەسی تر بە سەختی بریندار بوون. لە تەنیشت ئێمەشەوە سەرگورد عەلیار باڵی بەرکەوتبوو شکابوو. دوای ئەوە هێزی پێشمەرگە لە شوێنەکانیاندا چەقین و سەنگەریان گرت، وردە وردە لە دواوە تەرمی شەهیدەکان و بریندارەکان بە کۆڵ لەلایەن هاوسەنگەرەکانی دەوروبەریانەوە گوازرانەوە بۆ ئاوایی کونەمشکێ.

تۆپ باران و تەق و تۆق لەگەڵ تاریکی کرد کۆتایی هات، بڕێکی زۆر پێشمەرگە بە بیانوی گواستنەوەی شەهید و بریندارەکانەوە چووبوونە خوارەوە، ئەوانەی مابووینەوە دووبارە خۆمان ئامادەکرد نەبادا شەو هێرشەکە دەست پێ بکاتەوە، چونکە هێزەکانی بەرامبەریش لە جێی خۆیان و لە نزیک ئێمەدا مابوونەوە و ئەوانیش خەریکی خۆسازدانەوە بوون.

ئەو شەوە ڕۆژمان کردەوە هیچ ڕووی نەدا تەنیا جاروبار لێرەو لەوێ تۆپەکان لە زەوی ئەتەقینەوە، بۆ بەیانی دەستمان بە دروست کردنی سەنگەر کرد، بۆ نیوەڕۆی ڕۆژی دووەم لەلایەن ئیدارەکانەوە نان و قووتووی ماسیمعەلەبمان بۆ هات و دابەش کرا بەسەر پێشمەرگەدا، بۆ شەوی دووەم وردە وردە ئەوانەی ب لاوەیان کرد بوو یان لەگەڵ شەهید وبریندارەکان ڕۆیشتبوون گەڕانەوە، سەنگەرەکان قایم ترکران، سەر ئەم چیا بە شەودا زۆر سارد بوو، بەڕۆژدا هەندێک ئەخەووتین بەڵام هاتنی گولە تۆپەکان بەپچڕپچڕی نەیان ئەهێشت خەو بچێتە چاومان، لەم جۆرە حاڵەتانەدا زۆر کەس هەن خەوی خۆیان هەرئەکەن، ئەگەر بە دانیشتنیشەوە بێت. شەوی سێیەممان گوزەراند، بەڵام لە نیوەشەوی شەوی سێیەم دا لە بەرزاییەکانی دەستی ڕاستی کونەمشکێ و ئاڵوەتانەوە هێرشێکی گەورەکرایە سەرهێزەکانی ئەو چیا بەرزانە، لەوێ ملازم خولە پێکراو ستوونی پشتی شکا، چیاکەش ئێران گرتی، هێزەکان ئیتر لەبەربرسیەتی و مانەوەی بەردەوام و نەبوونی هێزی یەدەک بۆگۆڕینیان بە هیلاک چوو بوون.

بەیانی ڕۆژی سێیەم ئێمە بۆمان دەرکەوت چەندین بەرزایی لە لاشانی ڕاست و چەپمانەوە گیراوە، بنکە و بارەگای پشتمان چۆڵ کراوە، تازە بەڕۆژ ناتوانین بگەڕێینەوە، ئاگاداریان کردین چۆن ئەتوانن بگەڕێنە دواوە و خۆتان بگەیننە دۆڵەتو.

تازە لە لای ئێمەوە هێزەکانی ئێران وازیان لەپێش ڕەوی هێنا، چونکە ئێمە کەووتبووینە ناوەوەو ئەیانزانی ئەبێ خۆمان بەبێ شەڕ چۆڵی کەین، شەوی چوارەم هەموو هێزەکەمان ئامادەکرد و لەیەک ساتدا هاتینە دواوە و چەند کەسێکمان لەپێشەوە کەووتنەڕێ بەلای خۆرئاوای ئاوایی کونە مشکێدا، ئەو شەوە تابەیانی بەبێ شارەزا ڕێگەمان بڕی، هەندێک دووریش کەتبووینەوە. هاتینەوە بۆ دۆڵەتو خەڵکی ئاوایی و بنکە و بارەگاکانی کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دیموکرات چۆڵیان کردبوو، زۆربەیماڵەکان ئەشیاکانیان بەجێهشتبوو، پێشمەرگە لەچەند ماڵێکدا جێگەیان گرتوو سۆبای ئاگریان سازکرد و نان و چێشت لێنراو بووژاینەوە، ئالەو کاتانەدا ئیتر ماندوبوون و هیلاکی لە بیر ئەچێتەوە، بۆ شەوەکەی هەرلە دۆڵەتوو بووین، پێشمەرگە کۆمەڵ کۆمەڵ لە ماڵان خەریکی کۆکردنەوەی ڕاخەرو بەتانی و دانانی دیوەخان بوون، وەک بڵێی ئا ئەم زستانە لێرە ئەمێنینەوە، لە کاتی نیوەڕۆ دابوو نامەیەکی مام هات و ئەڵێت تیپی ١١ی هەورامان بەگەیشتنی ئەم نامە تەنیا هەر پێشمەرگە و بەتانییەکی پێبێت و وەرن بۆ ساوێن.

ئێمە لە کاتی چوونمان بۆ شەڕگەکان لەوێوە ڕۆیشت بووین کەرت کەرت کەوتینەڕێ. فەرماندە کەرتێ شەهید بووە ئەویش فەیسەڵ مەلا عەلی بوو. فەرماندەیەکی کەم وێنە و قارەمان بوو، نیازی دانرا سەرپەرشتی کەرتەکەی بکات، ئێمە لە دواوە بووین لە نیوەی ڕێگادا، گەشتینە لای شەوکەتی حاجی مشیر فەرماندەی تیپ و مەحمودی حاجی فەرج و مامۆستا شاهۆ. وەستا بوون بە دیار ئێمەوە، هێزەکەش وردە وردە لە ساوێن نزیک ئەبووەوە.

شەوکەت ووتی: ئەگەر مام جەلال پێی ووتین بگەڕێینەوە بۆ سنووری خۆتان ئێمە ئەڵێین ئەگەر لە بەر ئەوە نەبێت ئەو شەهیدانەمان داوە و هێزەکانی بەرەی جوودیش لە شارەزوور تەراتێن ئەکەن حەزمان ئەکرد جارێ هەر لێرە بین. نیازی ووتی کاک شەوکەت پێت وایە مام جەلال ئەمان گەڕێنێتەوە بۆ شارەزوور؟، ووتی: ئەی بۆچی بانگی کردووین؟، نیازی بەپێکەنینەوە ووتی ئێستا ئەتخاتە جێگەیەک نە ئاوی هەبێت نەئاوەدانی. هاتین لە تەختایی لای خۆرئاوای ئاواییەکەوە دەشتایی و زەویەکی داکەوتەیە هەیەو تەپۆلکەیەکی بچووک کەچەند دارگوێژێکی بە قەدەوە سەوز بووە و

کانەبەردی ئاواییشە، مام لەوێیە و دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆش لە تەنیشتیدا وەستاوە.

ئێمە لێی نزیک بووینەوە، بانگی کرد ووتی شەوکەت وەرن بۆ ئێرە، با پێشمەرگەش ئالەوێوە دانیشن، ئێمە فەرماندە کەرتەکان لەگەڵ شەوکەت چووین بۆ لای مام و ماندو نەبوونی لێکردین و سەرە خۆشی لێکردین بۆ شەهیدەکان، چەندین کارتۆن گۆشتی قووتوی سەرەگا لەسەر گردۆلکەکە لە نزیکماندا دانرا بوون، ئینجا لەم کاتەدا تیپی ٥١ی گەرمیان و چەند فەرماندەیەک لە دواوەی شەڕگەکان لە سەرجادەی نێوان خانەو سەردەشت کەمینیان داناوەو هێزێکی تێکەوتبوو شەڕێکی گەورەیان کردبوو، ئەوانیش بەپارتیزانی بە ناو هێزەکانی ئێراندا هاتبوونەوە و گەیشتن، مام بەخێری هێنانەوە و فەرماندەیەک باسی شەڕەکەو چۆنییەتی هاتنەوەیانی بۆمام ئەکرد. لەپڕێکدا مام جەلال ووتی شەوکەت ووتی: بەڵێ مام جەلال، ووتی: ئەو سەلاح چاوشین و داناى ئەحمەد مەجیدە چیوچی پێکراونە شکاون تا دووبارە سەرلەنوێ ڕێکخستنی تەنزیمی هێزەکەیان بۆ ئەکەینەوە ئێوە سەرکەون بۆ شوێنەکەیان، لەگەڵ نیازی سەیری کاک شەوکەتمان کردو پێکەنین، مام حاڵی نەبوو چییە و بۆ پێ ئەکەنین؟!. ووتی ها حەمە چییە؟ ووتم وەڵا هیچ مامە خۆشی سەری جەنابت. ئینجا دوای ئەوە هەر پێشمەرگەیەک و قوتوویەک گۆشتی بە دەستی خۆی داینێ و سەرکەوتین بۆ سەرشاخ، لەوێ ڕەبیەو سەنگەری چۆڵ کراو هەبوون، لەسەر باسکێک کەرتی مەحمود و شاهۆ مانەوە، ئێمەش چووینە پێشتر و سەیری خوارەوەمان کرد بینیمان دێیێک لە شیوێکی زۆر قووڵدا دیار بوو بەردەممان شاخی سەختەو کەس ناتوانێ لەوێوە سەرکەوێ.

یەکەم حەرەسی کاتژمێر ٧– ٨ دانرا، کوڕێکی بۆینی بوو بە ناوی ڕزگار حسین حەرەسیاتی ئەو تەواو نەبووبوو، ئەوەندە بەفر باری حەرەسەکەمان بانگکردەوە بۆژێر نایلۆنەکە هەتا بەیانی بەفر باری، هەرچەند کاتژمێر جارێک ئەو پێشمەرگانەی کۆمەڵ کۆمەڵ نایلۆنیان دابوو بەسەر خۆیاندا بەجارێک نایلۆنەکەیان بەرزئەکردەوە و بەفەرەکەی لەسەر لائەبراو ئەیاندایەوە بە خۆیاندا. بۆ بەیانی کاتژمێر هەشت بەگوڵەی گرداری دۆشکە بە ئیشارەت ئاگاداریان کردین چووینە خوارەوە بۆ ناو ئاوایی ساوێن.

ساوێنیش چۆڵ کرابوو لە هێزو هەواڵیان دانابوو بۆمان بچینە خوارەوە بۆئاواییەکانی مەمکاوێ و داوداوێ. لە مزگەوتی یەکێک لەم ئاواییانە مام چاوەڕێی ئەکردین تیپی ١١ی هەورامان گەیشتن و چووینە مزگەوتەکە، مام قسەی بۆ کردین و پێی ووتین بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆتان، تازە جەنەڕاڵ بەفر سوڵحی کردین، لەوێ دەست خۆشی لەوانەمان کرد کەئەرک و واجبی خۆمان بێ گلەو بۆڵە جێبەجێ کردووە، سەرزەنشتی ئەوانەشی کرد خۆیان دزیوەتەوە و گلە و بۆڵەیان کردووە، یەک بەیەک هەموو زانیاریەکی هەبوو لە سەرمان.

لە ناو مزگەوت لە قسەکانیدا باسی ئەوەی ئەکرد، ئێمە بۆمان دەرکەوت چەند هێزمان هەیە و توانایان چەندە لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە، ئەم شەڕە تاقی کردنەوەیەکی باش بوو، هەروا یەکێتیی پەڕەیەکی تری پرشنگ داری مێژووی گەلەکەمانی نەخشاند بەوەی هاوکاری شۆڕشگێڕەکانی پارچەیەکیتری کوردستانی کرد، هەمیشە کورد بەکارهێنراون دژی یەکتر، ئەم جارە هاوکاری، پشتیوانی جێی دژایەتی گرتەوە، هەر بەم بۆنەشەوە ناونرا لە هێزەکانی یەکێتیی بە هێزی پشتیوان. پاش تەواوبوونی کۆبوونەوەکە لە مزگەوتەکەدا ئێمە خوا حافیزیمان لە مام کردو کەوتینەڕێ بەرەو شارەزوور.

# دانوسانی ۱۹۸۳-۱۹۸٤ لەگەڵ حکومەت

دوای گەڕانەوەمان لە شەڕی هێزی پشتیوان مانگی۱۲ی ساڵی۱۹۸۲ دا، بەر لەوەی لە مەمکاوێ و داوداوێ دەرچین بیستمان ڕژێم داوای وتووێژی کردووە لەگەڵ یەکێتی نیشتیمانیی کوردستان، لەو ماوەدا ئێمە لە شەڕدابووین، بەهۆی نێوبژیوانی د.عەبدولڕەحمانی قاسملۆ سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردستان ئێران، چەند ئەفسەرێکی عێراق هاتبوونە گوڕەشێر ئەو ئاواییەی سەر سنوور لە نێوان سەردەشت و قەلادزێ بارەگای سەرکردایەتی حیزبی دیموکراتی لێبوو. وتووێژی ساڵی۱۹۸۳-۱۹۸٤ لێرەوە دەستی پێکرد.

عێراق ووتووێژی لەگەڵ یەکێتی دا وەک تاکتیک لەو سەردەمەدا بەلاوە گرنگ بوو، چونکە لەزۆربەی بەرەکانی جەنگدا، ئێران لە هێرش و پێشڕەویدا بوو، عێراق شکستی گەورەی ڕۆژانە لەبەرەکانی جەنگدا بەنەسیب ئەبوو. لەباری ئابووریەوە لاوازو تووشی قەیران هاتبوو، هەر وەها قەرزێکی زۆری نێو دەوڵەتیشی لەسەر بوو.

لەمانگی ٥-۱۹۸۳ دا کەرتی شەهید گریبانەی بارەگامان لە گوندی ڕەزلە بوو لەناو مزگەوتەکەدا، هێزەکانی تری تیپەکانی سەر بەمەڵبەندی یەکی یەکێتیی نیشتمانی لە سنووری شارباژێردا ب لاوە ببووینەوە، ئەرکی ئێمە لە سەرشاخ لە جێگەیەک بەناوی قوڵلەی ئەلاهوئەکبەر بوو.

ئێران لە پەلاماردانددا بوو لە ناوچەی شلێرەوە ئەهات بەرەو بەرزاییەکانی تایلەرو شەخەڵمارێن، هێزەکەی ئیمە لە ڕەزڵەوە پەرینەوە بۆ سنووری گوندەکانی دەرەمیانە و گەلۆسو سەرکان، دوای چەند ڕۆژ عێراق لەشکرێکی گەورەو گرانی پێکهاتوو لەجاشوو سەربازی خستەڕێ لە ناڵپارێزەوە بەرەو ئەوشوێنەی ئێمە لێی دامەزرا بووین، ئێمە کەوتینە نێوان هێزەکانی ئێران و عێراق، سەرلەبەیانییەک شەڕ دەستی پێکرد. لەشکری دوژمن بە پاڵپشتی تۆپخانەو پۆلە کوپتەرەکان ماوەیەک پێشرەوی کرد، لەناکاو لەگەڵ هەڵمەتی توندی پێشمەرگەکانی تیپی ۱۱ی هەورامان ڕووبەڕوو بوونەوە، شەڕ بەردەوام بوو تائێوارە پێشمەرگەیتر لەناوچەکەو

دەورو بەریەوە هاتن بەدەممانەوە، لای عەسرەوە دوژمن شکاو بەرەو ناڵپاریز گەرانەوە.

چەند رۆژ لەوێ ماینەوە، بەڵام لە بەر ئەوە وردە وردە وتوویژی یەکێتیی و حکومەت هەبوو، ئێمەیان ئاگادار کرد بکشێینەوە، کشاینەوە بۆبەری رەزڵەو پارازان، لەم شەڕانەدا دوژمن زیانی زۆربوو لەئێمە چەند پێشمەرگەیەک بریندار بوون، ئێمە چەکی (ئار بی جی) مان لەشەڕەدا بۆ لێدانی کۆپتەرەکان بەکارئەهێنا من گولەیەکم هاویشت چەند مەترێک رۆیشتو کەوتەوە سەر زەوی ئەوەندەی نەمابو بەر کاک ئەکرەم ئەحمەد و چەند پێشمەرگەیەک بکەوێت.

لەم سەرو بەندەدا یەکێتیش وەک حیزبێکی کوردی دژبەرژێم لەوپەڕی بەهێزیدا بوو، لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە، هێزی پێشمەرگە لەگەشە کردنێکی بەرچاودا بوو. لە سنووری پارێزگای هەولێر، سلێمانی، کەرکووک دا دەستی بەسەر زۆربەی ناوچەکاندا گرتبوو، وەک مەڵبەندی رزگارکراو تیایاندا بنکە و بارەگای کردبوەوە، هەروەها کۆنترۆڵی زۆربەی رێگاوبانەکانی کرد بوو، ڕژێم بەڕۆژیش بە قافڵە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ئەیتوانی بڕوات. جگە لەمەش ناوچە رزگار کراوەکان پەناگاو پشتیوانی دەیان هەزار سەرباز و ئەفسەری ڕاکردوی سوپای عێراق بوون. ڕێکخستنی بەهێز و پۆڵاینی هەبوو. بە بانگەوازێک لەڕادیۆوە چی بویستایە ئەیکرد، وەک مانگرتن وخۆپیشاندان. بۆیە ڕژێم وتوویژی لەگەڵ یەکێتیدا بەلاوە گرنگ بوو هەروەک چۆن یەکێتیش لەماوەی ئەو وتوویژەدا کەڵکی لە هەندێک مەسەلە وەرگرت، وەک پشوودانی هێزی پێشمەرگە و ئازادکردنی هەندێک لە زیندانیانی سیاسی و. چارەسەرکردنی بریندارەکانی شەڕ و حەوانەوەی ئەو گوند نشینانەی کە لە ناوچە رزگارکراو نیمچە رزگار کراوەکاندا بوون، هەروەها مانگانە یەک ملیۆن و نیو دینار لەڕژێم وەردەگیرا کە مام پاشەکەوتی کرد بۆڕۆژی تەنگانە و پاشان دوای تێک چونی مفاوەزات زۆر سوودی لێوەرگیرا.

جگە لەمانەش یەکێتی و هێزەکەی لە نزیکەوە زانیاریان لەسەر بەعس و هێزەکەی وەرگرت، کوردستانیان و ڕۆشنبیران و ڕۆژنامە نووسان و ئەوانەی ئاگاداری و زانیاریان لەسەر شۆڕش و یەکێتی نەبوو، لەماوەی ئەم

گفتوگۆدا یەکێتی نیشتیمانیی کوردستانیان ناسی وەک هێزێکی سیاسی و سەربەخۆ. هەرچەندە ئەم وتووێژە لەلایەن بەرەی جودەوە لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی ئەو سەردەمەوە دژایەتی ئەکراو بە شێوەی گاڵتە جاڕی باس ئەکرا. یەکێتیش بەهەلی ئەزانی عێراق تووشی شەڕی ئێران بووە و پێی وابوو لەم کاتەدا ئەتوانرێ لەڕێی گفتوگۆوە بەشێک لە داواکانی گەلی کورد بسەلمێنێ.

هەرچەندە هەندێک ڕێبەر و کادری یەکێتی بڕوایان بەم گفتوگۆیە نەبوو، چونکە ڕژێمی بەعس تا ئەوکاتەش کەڕووخا ئامادە نەبوون لەگفتوگۆکاندا باس لە کەرکووک و خانەقین، شەنگار و ناوچەکانی دابڕێنراو وەک ناوچەی کوردستانی باس بکرێت. وتبوویان ئەمانە وەرنەگرین بۆ کاتێکی تر بەتایبەت خانەقین کە دەروازەی شاری بەغدایەو سەر سنوورە، ئەم بابەتە وەرنەگرین بۆ ئەوکاتەی سیقەکەڕایەوە لەنێوانماندا، ئەکرێ باسی خانەقین و ناوچەکانی تریش بکەین. وردەکاری قسەو گفتووگۆکان زۆرە لای ئەو هەڤاڵانەیە ئەندامی وەفدەکان بوون.

ڕژێم لەکاتی گفتوگۆدا بەجاش و سەرۆک جاش و ئەو کوردانەی بوو بوونە داردەستی، دڵنیای ئەدانێ کە لەسەر حسابی ئەوان لەگەڵ یەکێتی وتووێژ ناکات. وە ئامادەش نەبوون لەکەناڵە ڕەسمیەکانیانەوە دان بەو گفتوگۆیەدا بنێن، هەندێک جار ڕێکخستنی حیزبی بەعس لە کۆبوونەوەکانیدا بە کوردەکانی ئەوت یەکێتی هاتوونەتەوە ڕیزی نیشتمانی. ئەوەندەشی پێکرا لەماوەی گفتوگۆدا هەوڵی کوشتن و لەناو بردنی فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگەی ئەدا لەوانەش ملازم سەید کەریم و مامەڕیشە و تۆفیق حاجی و چەندین کەسی تریان شەهید کرد. لەلایەن هێزی پێشمەرگەشەوە هەوڵ ئەدرا هەرچەندە یەکێتی بڕیاری لێبووردنی بۆ جاشەکان دەرکردبوو تۆڵە لە هەندێک جاش و خەڵکی خیانەتبار بکەنەوە، ئەوبوو لەلای هەڵەبجەدا، بکوژی چەند پێشمەرگەیەکیان کوشتەوە.

ووتووێژ لەمانگی ١٩٨٢/١٠ دەستی پێکردو لە١٩٨٥/١/١٥ یەکێتی بەیانی کۆتایی هاتنی بە وتووێژ ب لاوە کردەوە، شەڕ بەشێوازێکی نوێ و بەتاکتیکێکی نوێوە دەستی پێکردەوە، یەکێتی چەندین گورزی کەمەرشکێنی سرەواندە سوپای عێراق و سەرئەنجامیش عێراق بەپرۆسەی ئەنفال و

کیمیاباران کردن یەکێتی و هێزەکەشی لە کوردستان وەدەرناو هەموو ناوچە ڕزگار کراوەکانیشمان لەدەستدا، شەڕی عێراق و ئێرانیش لەساڵی ١٩٨٨دا کۆتایی هات و ئێمەش گەیشتینە ناوخاکی ئێران بۆ لای لایەنە سیاسیەکانی تری کوردستان کەپێشتر بنکەو بارەگایان لەناو خاکی ئێران و لەسەر سنوورەکان بوو، لەوانە پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی سۆشیالیستی کوردستان.. هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە لەسەر ووتووێژ بابەجێ بهێڵین بۆ لێکۆڵەران و شرۆڤەکاران.

بەڵێ بامن بچمە سەر هەندێک بیرەوەری خۆم لەکاتی وتووێژدا.....لە وتووێژی (ی.ن.ک) و میری ساڵی١٩٨٤ دوای ئەوە ئێمە شارباژێرمان بەجێهێشتوو هاتینە خوارەوە بۆشارەزور، بارەگای کەرتی دووی هەورامان و کەرتی شەهید فەیسەڵ لەئاوایی خێڵی حەمە بوو، نیازی فەرماندەی کەرتی شەهید فەیسەڵ و منیش فەرماندەی کەرتی دووی شەهید ئەحمەد گریانەیی بووم لە ت ١١ هەورامان مەحمودی حاجی فەرەج فەرماندەی تیپەکە بوو بارەگای لەئاوایی باوەکۆچەک بوو.

وەرزی لێدانی شەتڵی تووتن هاتە پێش. پێشمەرگە کرانە سێ وەجبە، هەر ڕۆژێک ١٥ تا ٢٠ پ.م بچین هاوکاری جووتیارێک بکەین. کەرتی ڕێکخستن هیوا سەرچناری بەرپرسی بوو، زۆرتر لەلای ئێمە ئەمایەوە. لەم سەرو بەندەدا مامۆستا مەلا موسی مەلای مزگەوتی دێ بوو، ڕۆژێکی هەینی لە ووتاری خۆیدا وتبووی: (هەرکەس کافرو بێدین ئیشی بۆبکات بەرهەمی ئیشەکەی حەرامە)، بۆیە من دوو پێشمەرگەم دوای نوێژی هەینی نارد بەدوایدا، ووتم ئێستا ئیجرائاتی لەگەڵ ئەکەم. پێشمەرگەکان هاتنەوە ووتیان مامۆستا ووتی بانان بخۆم خۆم دێم. منیش تووڕە بووم شەوکەت حەمەساڵح و جەعفەری حاجی ئەولە داوایان لێکردم قسەی پێ نەڵێم و بەلام گلەیی لێ بکەم. کە لە دوورەوە مەلا موسا دەرکەوت بەرەو بارەگای ئێمە کە لەناو بینایەی خوێندنگاکەدا بووین نزیک بوەوە، زەردەخەنە گرتبووی، من کە بینیم بەو ڕوخۆشیەوە هات و دوا نەکەوت، یەکسەر تووڕەییەکەم نەماو ووتم بە شەوکەت و جەعفەر من حەقم نییە خۆتان قسەی لەگەڵ بکەن.

هاتوو دانیشت و ووتی: فەرموون کەس قسەی نەکرد، منیش ووتم: مامۆستا بۆ وات وتووە؟ ووتی چیم وتووە؟ ووتم: وتووتە ئەوەی کافر ئیشی

بۆ بکات بەرهەمی ئیشەکەی حەرامە لەگەڵ ئێمەت بووە، ووتی ئێوە بۆ؟ووتم: ئێمە شەتڵی تووتن لێ ئەدەین بۆ خەڵکەکە، ووتی؛ بۆ ئێوە کافرن، ووتم ئێ ئەومنییە تۆ وا ئەڵێیت؟ ووتی نانا وانییە، کاکە ئێوەی مارکسی لینینی هەرچییە بڵێن من وا هەست ئەکەم لەگەڵ منتانە، منی مەلاش هەرچی بڵێم ئێوە ئەیبەنە سەر خۆتان، ووتم نەمامۆستا نا تۆی مەلا، ئێمە قسەی مەلامان قبوڵە، بڵێ منی ئیسلامی. ووتی من لەگەڵ ئێوەم نەبووە. نا لەگەڵ ئێمەت بووە، بۆ قسە لەسەر حکومەت ناکەیت ئاواییەکانی ڕووخاند؟ بۆ وەک ئیسلامی قبوڵتان کرد مزگەوتەکان بڕوخێنن؟ بۆ هێرش ناکەیتە سەر پارتی باوکت و مامتیان کوشت؟..... تاد.

ئەویش قسەی خۆی کرد و ووتی منیش گلەییم لە ئێوە هەیە دوو پێشمەرگە محسن سابیرو یەکێکی تر هاتوون لە مزگەوت، تەفسیری نامی ئەوەندە پەڕەیە چوون لاپەڕەی ژمارە ئەوەندەیان کردووەتەوە و پرسیاری لەسەر ئەکەن..... تاد، ئیتر بە بێ دڵیشان کۆتاییمان بەگفتوگۆکەمان هێنا.

لەسەرەتای مانگی ١٩٨٤/٦ دا ڕۆژێک بانگ کراین بۆ کۆبوونەوەی فراوان، لەناو گردان هەموو کۆبووینەوە، کاک نەشیروان مستەفا و چەند کەسی ترهاتن و کاک مەحمود سەنگاویشی لەگەڵ خۆی هێنابوو، لە مزگەوتەکەی ناوگرداندا کۆبوونەوەکەمان کرد، فەرماندە کەرتەکان و سەرتیپ ئامادە بوون. دوای هەندێک ڕوون کردنەوە لەسەر وتوویژو شەڕی عێراق و ئێران، ووتیان مەحمود سەنگاوی فەرماندەی تیپەکەیە و مەحمود حاجی فەرەج دەست لەکار ئەکێشێتەوە. مەحمودی حاجی فەرەج پێی ناخۆش بوو لەکاتی دەورو تەسلیمدا دەستی بەگیرفانیدا کرد و بەکاک نەوشیروانی ووت فەرموو ئەوە مۆری لگاوەکەتان، ئەمە هەموو دەورو تەسلیمەکەیان بوو. ب لاوەمان کرد، دوای ماوەیەک کاک نەوشیروان نامەیەکی بۆ من نووسی، ئەڵێت حەمە مەحمود سەنگاوی من ناردوومە بۆ شارەزوور تۆ پشتیوانی بکە بۆئەوە



سەرکەتوو بێت. نامەکە نهێنی بوو، بەدزییەوە نیشانی نیازیم دا و پێم ووت ئەبێ ئێمە پشتگیری مەحمود بکەین.

لەو ماوەدا کە لەخێڵی حەمە بارەگامان هەبوو چەند جارێک پارتی هاتنە سەرمان و بە هاوان و (ئاڕ بی جی) لە بارەگاکەیان داین. شەوێک هاوان کەوتە ناومان حەمە یوسف نەجمەدین، جەواد هاواری و سەعدون حەمە بریندار بوون. سەعدون برینەکەی کاریگەر بوو پارچەیە دابووی لە جگەری. هەر ئەوشەوە بردمانە هەڵەبجە و بە نهێنی سیروانی عەلی ڕەزای هاواری بەئۆتۆمبێلی فواد هاواری لەسەر بەرپرسیاریەتی خۆی بردیە سلێمانی و عەمەلیاتی بۆ کرا.

هاوینی ئەمساڵ واتە لە کۆتاییی مانگی٦/ ١٩٨٤ دا نوێنەرانی ڕێکخستنی کۆنفرەنسە ناوچەییەکان لەشارەزوورەوە کەوتینەڕێ بۆ دۆڵی مێرگەپان، بۆ بەشداری لە کۆنفرەنسی سێیەمی کۆمەڵە. ئێمە چەند کەسێک پێشتر لەکۆنفرەنسی ناوچەیی ڕێکخستنی کۆمەڵە، کەلە دۆڵ پەموو بەسترا بەهەڵبژاردن بووبووینە ئەندامی کۆنفرەنسی گشتی. کاک ئازاد هەورامی سەرپەرشتی کۆنفرەنسەکەی کرد، لەبەرامبەر ئەوەدا لە هەڵبژاردنەکەدا دژایەتیم کرا، بەڵام هەر دەنگی زۆرم هێنا چەکێکی ناتۆی بەدیاری دامێ.

لەڕۆژی١/٧/١٩٨٤ دا لەسەر کانی سێوی بناری چیای پیرەمەگروون لە مێرگە پان ئامادە بووین، لەڕۆژی ١٩٨٤/٧/٢ کۆنفرەنس بەئامادە بوونی ٢٨٧ نوێنەر دەستی بەکارەکانی کرد، ئیمڕۆ مام جەلال وەک سکرتێری گشتی یەکێتیی، دکتۆر عەبدول ڕەحمانی قاسملو، ئیبراهیمی عەلی زادە و دکتۆر فوئادی مەلا مەعسوم ووتاریان خوێندەوە. لەم کۆنفرەنسەدا کێشەکانی ناو کۆمەڵە گەشتنە لێواری تەقینەوە، کۆمەڵە زۆری نەمابوو ببێتە دووبەش. لەکاتی مناقەشەو گفتوگۆدا ١٢٧ ئەندام کەپری کۆنفرەنسەکەیان جێهێشت.

کۆمەڵێک کادر گرژیەکەیان هێور کردەوە لەوانە: ملازم عومەر، ئازاد هەررامی، قادری حاجی عەلی، دلێری سەید مەجید، من وابزانم خوا ئەم کاک دلێرەی بۆ پینەو پەڕۆ ناوبژیوانی بەردەوامی نێو ئەم ڕابەرایەتیەی یەکێتیی دروست کردبێ. بەڵێ جەماعەت گەڕانەوە ناو کەپرەکەو دواتر سەرۆک تاڵەبانیش بارودۆخەکەی ئاسایتر کردەوە، لەکۆتاییدا سەرکردایەتی کۆمەڵە هەڵبژێردرا، لەمەشدا دووبارە خەریک بوو کێشەکە دروست بێتەوە بەڵام

ئەمجارە کاک نەوشیروان چارەسەری کرد، بە پێشنیاری دووبارە نەکردنەوەی خولی دووەمی هەڵبژاردنەکە، لە سەرەوە بۆخوارەوە دوانزدە کەس بەپێی زۆرینەی دەنگەکان بوون بەسەرکردایەتی کۆمەڵە، ئەوانیش: نەوشیروان، مەلا بەختیار، فەرەیدون عەبدول قادر، ملازم عومەر، ئازاد هەورامی، کۆسرەت رەسول، جەبار فرمان حەمە تۆفیق ڕەحیم، حەسەن کوێستانی، قادری حاجی عەلی، عومەر فەتاح و دکتۆر خەسرەوخاڵ بوون.

کۆنفرانسی کۆمەڵە ،ڕوو پۆشەکان نوێنەرانی ڕێکخستنی لەهێڵی ناو شارەکانن



جارێکی تر سۆشیالیست لەئاوایی دێکۆنی نزیک خورماڵ تەقەیان لەگەڵابەی عوسمانی سۆفی حەمەکەریم کردبوو، شەوکەت حەمەساڵح کادر بوو لەناو گەڵابەکەدا بوو، بۆیە کەگەیشتنە خێڵی حەمە، ئێمەش چووین بەرەو دێکۆن و کەوتینە کەمینیان، کاک ئەکبەر ئێناخی باڵی بریندار بوو قۆڵی شکا ئەوانیش هەڵهاتن بەرەو ئەحمەدئاوا. ئێمە گەڕاینەوە خێڵی حەمە و نزیکەی ٢٠ پێشمەرگەم بەسەرپەرشتی ئەکرەم ئەحمەد نارد چوونە ئاوایی ڕۆستەم بەگ و شەو لەوێ مانەوە. چونکە مەفرەزەکەی سۆشیالیست لەماڵێکدا اختفا بوو بوون لەئاوایی دێکۆن. بۆ بەیانی ئاگاداریان کردین لە ئەحمەدئاوا شەڕە. چووین بەدەم شەڕەکەوە.

ئێمە لەکاتی گفتوگۆی ساڵی١٩٨٤ دا نە ئەبوو لەگەڵ بەرەی جود تەقەو لێکدان بکەین تەنیا مەگەر لە کاتێکدا بێنە سەرمان. ئێمە ڕۆیشتین تەقە تەواو بوو بوو، ئەکرەم ئەحمەد ملی بریندار بوو، دواتر زانیمان هیوای برای نەجدەڕەش بە تەنیا سواری پاسکیل بووە و چۆتە ئاوایی ئەحمەد ئاوا. چەند پارتیەک بینیویانە وایان زانیوە هێز چووە بۆیان، هیواش کە ئەوان ئەبینێ بەپەلە ئەگەڕێتەوە. پارتیەکان ڕائەکەن و سۆشیالیست مەفرەزەیەک لەوێ ئەبێت ئەڵێن ها چییە؟ ئەوانیش ئەڵێن هاتن. مەفرەزەکەی سۆشیالیست

ئەکەونە دوای هیوا لەدوورەوە تەقەی لێ ئەکەن و ئەکرەم ئەچێت بەدەمیەوە لەئاوایی ڕۆستەم بەگ بەرەو ئەحمەد ئاوا. ئیتر ئەم تەقەو لێکدانە لەمەوە دروست بوو، بەلام زوو کۆتایی هات بەوەی ئێمە ئاگاداری هێزەکەی خۆمان کرد بگەڕێنەوە بۆ ئاوایی ڕۆستەم بەگ.

کاکە حەمە لەڕۆژ ژمێری پێشمەرگەدا بە شێوەیەکی تر باسی ئەکات. بەلام ڕاستی مەسەلەکە ئەمەیە. پارتیش لەڕادیۆی خۆی کردیە هۆسە و هەرا، شەڕەکەی گەورە کرد و ناوی چەند پێشمەرگەی (ی. ن. ک) ی خوێندەوە کە کوژراون. بەلام کەس نەکوژرا بوو. ناوی حەمە سەلیم فەتحولای هێنا کە هێشتا لەژیاندایە.

ئێمە بۆ تۆڵەی ئەو هاوان بارانەی بارەگای خێڵی حەمەو دێ کۆن شەوێک بە نهێنی کەرتەکانی خۆمان و چەند کەرتێکی تری شارەزوور لەوانە کەرتی جەلال کوڵکنی و مەحمود گەرمیانیمان برد و چووین گەمارۆی ئەحمەد ئاوامان دا، بەلام مەفرەزەیەک لەوێ بوو لەپشتەوە دەرچوون بۆ سەر شاخەکە. دوای دابەش بوون لە مالان دوو پێشمەرگە هاتن بۆلام کەیەکێکیان ناوی سەعدون حەمە بوو ئەوەی پێشتر بریندار بوو بوو، لەگەڵ بەرزان عیزەت مستەفا. کە دواتر لە کێشەیەکی شەخسیدا بووە قوربانی. پێیان وتم لە مالێک داین دوو پێشمەرگەی حیزبی شیوعی لێیە، پرسیم کێن؟ وتیان برادەری ئێمەن، ئەوانیش شوانە و سالار و وابزانم کەسێکی تریان لەگەڵ بوو. منیش پێم وتن بچنە مالەکە و هەرکەس هات بڵێن ئێمە لێرەین و ئێوە برۆن بۆمالانی تر، ئاگاتان لێیان بێت ئەگەر ویستیان برۆن، وریا بیارەیی کەمینی سەر ڕێی و شکەناوە لەبنی پەلگ، بەناوی منەوە ڕەوانەیان بکەن با برۆن. بەیانی ڕۆژ بووەوە پاسدار بە هاوان هاوان بارانی ئاواییان کرد خەلک چۆلیان کرد. مەفرەزەیەکی پارتی کە هۆشمەن یارئەحمەد بەگ بەرپرسیان بوو، بەتفەنگی قەناس لەسەر ئەشکەوتەکەوە تەقەی کرد و جەلال کوڵکنی و کەسێکی تر بریندار بوون. لەساڵی١٩٨٤دا و لەکاتی وتووێژی یەکێتی و میریدا جارجار لێرە و لەوێ تەقە و لێکدان ئەبوو، بەتایبەت لە شارەزوور و نزیک بەچیای سوورێن و هەورامان.

لەو کاتانەدا پێشمەرگەیەکی سۆشیالیست برای سەردارە ڕیشە بەناوی جەلال سەری بریندار بووبوو، بردمان بۆ نەخۆشخانە لە سلێمانی و

دوای چارەسەر گەڕاندمانەوە بۆ ئەحمەد ئاوا. ڕۆژی هێنانەوەی لە سلێمانییەوە لە سەیدسادق پرسەی عەلی خەلیفە و ئەحمەد شاتوانی بوو لاماندا بۆ بەشداری کردنی پرسەکە، کە لەئاوایی تەپە ڕێزینە سۆشیالیست شەوەکەی تەقەی لێ کردبوون، جەلال زۆر ترسا بەڵام کەس نەی ئەناسی.

دووبارە ڕۆژێکی تر بروسکەمان بۆهات لەناو گردان کۆببینەوە، کاک جەبار فرمان بۆتە مەسئولی مەڵبەندی یەک و دێت کۆبوونەوەمان پێ دەکات. ئەو ڕۆژە تیپی یانزە هەموو ئامادە بووین، پێش نیوەڕۆ بوو لەکاتێکدا ئەوان گەیشتنە ئاوایی بەئۆتۆمبێل، من و نیازی لە دوکانێکدا ساردی و بسکویتمان کڕی بوو بیخۆین. دوا کەوتین لەپێشووازی کردن لەڕیزدا بووەستین، هەرچەندە ساردی و بسکویتەکەمان نەخوارد و دامانە دوو پێشمەرگەو بەپەلە ڕۆیشتین. کاتێک گەیشتینە لایان لەبەردەم ئاوایی ناوگردان و لەبەری بیەڕەشەکەوە، فەرماندە کەرتەکان کۆبوونەوە لەگەڵ کادرەکانی ڕێکخستن، بە شێوەی بازنەیی دانیشتبوون، کاک مەحمود سەنگاوی فەرماندەی تیپ بوو بەخێرهاتنی ئەکردن، کاک بەکری حاجی سەفەریش هاوسەفەری کاک جەبار بوو. ئێمە لەگەڵ نیازی سەلاممان کرد و هەڤالان وەڵامیان داینەوە، بەڵام کاک جەبار فرمان وەڵامی نەدایەوە، دوای قسە کردن، کاک جەبار ڕووی کردە من و ووتی تۆ پیاو کوژەکەی؟ من بێدەنگ بووم !؟، کە وەک بڵێیت لەگەڵ منی نییە، دوای ئەوە جەماعەت هەموو بێدەنگ بوون دووبارە هەڕەشەی کرد. منیش ووتم من کادری کۆمەڵە و یەکێکم لەو فەرماندانەی کە لەناو خەڵکدا خۆشەویستم و ڕێزی خەڵک ئەگرم. ئەگەر بە هاتنی تۆ بووبمە پیاو کوژ ئەوەیان ئارەزووی خۆتە. مەحمود سەنگاوی ڕووی کردە کاک جەبار فرمان و ووتی کاک جەبار کاکە حەمە پێشمەرگەی سەرەتایی شۆڕش و کوڕێکی بە ئیلتیزام و فەرماندەیەکی ئازاو چالاکە..... تاد. لەوەڵامدا ووتی: باشە دوایی، پێشمەرگە زانیان بەم دەنگە دەنگە، دواتر ب لاوەمان کرد، من خوا حافیزیم نەکرد و گەڕامەوە بۆ خێڵی حەمە. ئەمە لەسەر چی؟ حکایەتی پیاو کوشتنەکە ئەمەی خوارەوەیە:

ساڵی١٩٧٧ شێخ عەلی پێنج نامەی نووسی بۆ پێنج کەسی دەوڵەمەندی ئەوکاتەی تەوێڵە، بۆ ئەوەی چەندیان پێ ئەدرێ پارە بدەن و هاوکاری شۆڕش بکەن. ئەو پێنج هاوولاتیانەش ئەمانە بوون: ١- حاجی

مەحمەد فەتحولا، ٢ - مستەفا حاجی قادر ٣- عەبدول عەلیەڕەش ٤- حاجی حوسەین، ٥- ڕافع عەزیز. مام هادی نامەکانی ناردبوو لەڕێگەی حەکیم فەتاح ڕەحمانەوە کە پورزای منەو لەڕێکخستنی کۆمەڵەدا بوو، ئەویش نامەکانی گەیاندبووە دەستی ئەو پێنج هاووڵاتیەی شارۆچکەی تەوێڵە. سێ کەسیان وەڵامی نامەکەیان دابووەوە، واتە پارەتیان ناردبوو، دوو کەسیان نامەکەیان بێ وەڵام بوو، پێم وابێ برادەران گومانی ئەوەیان کردبێ حەکیم پارەکەی ئەو دووانەشی وەرگرتبێ.

بۆیە ئێمە چووینە ناوچەکەو سەردانی حەکیممان کردو پێمان ووت پێویستە وەڵامی ئەودوو نامەش بەبوون و نەبوون بهێنێتەوە. ئەگەر هاوکاری نادەن. نامەکان بهێنەرەوە. کاتمان بۆداناو شوێنمان بۆ دیاری کرد، حەکیم هاتەوە نامەیەکبانی هێنا بووەوە. ووتی نامەکەیترم داوە بە لەتیفی برام بۆ حاجی حوسەینی خەزوری. بەلەتیفدا ئاگادارم کردەوە وەڵامی نامەکەیان ئەوێت، یان ئەگەر وەڵامی نییە نامەکەمان بۆبگێڕێتەوە، ووتویەتی نامەکە نەماوە. دیارە نامەکەی لای حاجی گەیشتوەتە ئەمن، جاچۆن و بەرنامەی کێبووە نازانین. حەکیم دیارنەما بێسەرو شوێن، دواتر ووترا گوایا لەکەرکوک ئیعدام کراوە، تەرمەکەشیان نەدایەوە. ئێمە بڕیارمان دا حاجی حوسەین لەسەر ئەمە بگرین و بیبەینە دەرەوە، ساڵی١٩٧٩ مەفرەزەیەکم بردوو چوومە سەری لەناو شارۆچکەی تەوێڵە، مەرکەزی پۆلیس بەرامبەر ماڵەکەیان بوو، دوای ئەوەی دەرگاکەیان نەکردەوە هاواریان لە مەرکەزی بەرامبەر ماڵەکەیان کردو تەقەو لێکدان دروست بوو. من خۆم فەرماندەی ئەو مەفرەزە بووم و گەڕاینەوە نەمان توانی بیگرین.

دوای هاتنی ئازاد هەورامی ساڵ ی ی ١٩٧٩ بۆ هەورامان، خزمانی ئاوایی دزاوەر کە ئاواییەکی کوردستانی ڕۆژهەڵاتە، هاتبوونە ئاوایی شۆشمێ بۆ لای کاک ئازاد هەورامی داوایان کردبوو حاجی حسێن بهێنن بۆلای و عەفوو بکرێ پرسی بووی کێشەی چییە؟ مام هادی تێی گەیاندبوو. کاک ئازاد پێی وتبوون ئێوە بڕۆنەوە با حەمە بێتەوە بزانم کێشەکە چییە. من لەوکاتەدا بە مەفرەزە چوو بووم بۆ دەوروبەری هەڵەبجە، کەگەڕامەوە کاک ئازاد پێی ووتم من وەڵامم داونەتەوە و ووتوومە حەقمان بەسەریەوە نییە ئێستا مەیهێنن.

حاجی حوسەین دوای ئەوە باری کرد بۆ سلێمانی و دواتر گەڕابووەوە بۆ شاری هەڵەبجە. لەساڵی١٩٨٤دا لە هەڵەبجە کوژرا. ئەوانیش واتە کەس و کاری چوو بوونە سیتەک بۆلای کاک جەبار داوایان لەسەر من تۆمار کرد بوو من ئاگاداری ئەمە نەبووم، بۆیە کاک جەبار فەرمان لەکۆبوونەوەکەی نـا وطرد ا ن دا ووتی: تۆ پیاو کوژەکەی؟!.

ماوەیەک دوای کۆبوونەوەی ناوگردان من بروسکەیەکم بۆهات کە لەگەڵ سێ پێشمەرگە بە ناوەکانی هادی حەمە سەعید، برامە، فەیسەڵ کاکە وەهاب، پوورزامە، ڕزگار مەحیەدین ڕزگاری عەزەقوڵ ئەویش خزمەمە. لە سیتەک ئامادەبم. کەووتمە ڕێ بەپێ و بە تراکتۆر بە دەشتی شارەزووردا و لەداری حسکەوە چووینە سیتەک، ئەو ساتەی گەیشتینە ئاوایی لەبەردەم مزگەوتەکەدا وەستابوم چاوەڕێی ئەو سێ پێشمەرگەم ئەکرد چوو بوون بۆ خواردنی شێلم لە دوکانێکدا، کاک جەبار فرمان وکاک سامان گەرمیانی و کۆمەڵێک پێشمەرگە بەدوایانەوە هاتن و منیش بەرەو لایان ڕۆیشتم.

دوای چاکو چۆنی کاک جەبار ووتی هاهاتی؟ ووتم بەڵێ، ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵیا بوون هاتنە پشتی منەوە تازە زانیم خەیاڵی چییە. کلاشینکۆفێکی سیخۆی قۆنداغ دار لە شانمدا بوو، لەگەڵ کاک جەباردا قسەمان ئەکرد، ئەیپرسی لەکوێوە هاتن و چۆن هاتن، سامان لەشانی کاک جەباردا دیار نەما، کاتێکم زانی لە دواوە دەستێک قۆنداغی چەکەکەی گرتم لام کردەوە ووتی: بمدەرێ، منیش شانم شل کردو ووتم فەرموو. دوای ئەوە لەولاوە سێ پێشمەرگەکە هاتن و بەر لەوەی داوای چەکیان لێ بکەن، خۆم بانگم کردن ووتم چەکەکانتان بدەنە کاک جەبار. ئینجا چاوەڕێی فەرمان ئەکەین ئاگادار کراین ئێوە زیندانین، باشە.

مەحمودی حاجی فەرەجیش گیراوە و لە زیندانی گورگەیەرە، لەگەڵ جاش و جاسوس زیندان کراوە. کاک سامان ووتی کاک جەبار کاکە حەمە بالای ئێمە بێت. لەمزگەوت لای دەستەکەی ئەو ماینەوە. هەندێک پێشمەرگە لەوانە برایم عەزیز، شێخ مقداد جەمالەڕەش، ئەحمەد ڕیشە، بوونە برادەرم و حسابی زیندانیان بۆ ئێمە نەئەکرد و ئێمەش خەیاڵی ڕاکردنمان نەبوو. بۆیە هەروەک پێشمەرگەکان بەڕۆژ لەدەرەوەو بەشەویش لە مزگەوتەکەدا بووین. ڕۆژێک کاک جەبار خۆی کرد بەژووردا و هەڕەشەی لە فەرماندەی

پێشمەرگەکان کرد، ئەگەر ئەم پیاو کوژە رابکات ئێوە لە جێگەیدا ئەبن، منیش خەریکی یاری ناپلیۆن بووم، هەرخۆم تێ نەگەیاند.

دوای سێ ڕۆژ لیژنەیەک دانران بۆ مەحکەمە کردن. سەرۆکی لیژنە کاک فەرەیدون عبدالقادرە، ئەندامانی لیژنە: م.سالح ماواتی و جەمیل هەورامی و پێم وابێ کاک ئاوات عەبدول غەفووریش بوو، ئەمانە هەموو دۆست و منیان زۆر خۆش ئەویست.

سوکە گومانێکم لە کاک جەمیل هەبوو نەوەک من کۆمەڵەو ئەو شۆڕشگێرانە لەسەر مەسئەلەکە بروات، ووتیان ئەم سێ پێشمەرگە حاجی حوسێنیان کوشتووە. منیش ووتم ئەگەر ئەم سێ کەسە کوشتبێتیان ئەوە من کوشتومە. دوای چەند دانیشتن سێ پێشمەرگەکە چەکەکانیان وەرگرتەوە و گەڕانەوە بۆ شارەزوور. ئینجا لێکۆڵینەوە لەگەڵ منداکرا، ئەو شەوە حاجی کوژرا بوو لەو کاتژمێرەدا یەکێک لەو سێ پێشمەرگە حەرەس بوبوو، لە مەقەڕی خێڵی حەمە، پاشان منیش لە بارەگا بووم لەگەڵ کادرەکانی رێکخستن. خزمێکی حاجی حوسێن کە ئەویش کادر و پێشمەرگە بوو بەناوی شەوکەت حەمەسالح لەلامان بووبوو ئەو شەوە. لە ئەنجامدا نەسەلمێنرا کە ئەو پێشمەرگانە ئەو پیاوەیان کوشتبێ. بۆیە من ئاگادار کرام کەیەک مانگ سڕ کراوم ئەبێ بچمە سووورداش بۆ لای جەنابی مام جەلال، شەهید مەحمودیش بەهەمان سزا سزادراوە، لەگەڵ مەحمود چووینە ئەوێ و سەرەتا کاک ملازم عومەرمان بینی و دواتر جەنابی مام جەلال، پێیان ووتین لێرە و لەمەرگە و ئاوەژێ لەکوێ ئارەزووتانە لەم سێ جێگەدا بۆ خۆتان بمێننەوە ئێمەش ماوەیەک ماینەوە زۆر زیاتر لەوەی بڕیاری لێ درابوو هیچکەس بۆی نەئەپرسین. بۆیە من بێتاقەت بووم و ڕۆژێک لەسورداش بۆ خۆم بڕیارم دا بگەڕێمەوە شارەزوور، بچمەوە بۆ هاوارە کۆن و گرییانە تا بزانم سەرئەنجامی وتووێژی یەکێتی و حکومەت چی ئەبێت. مەحمود زۆر هەوڵیدا ئەوەنەکەم بەگوێم نەکرد.

ڕۆژێک سەیارەیەک لە سورداشەوە هەندێک ئازوقەو خواردەمەنی بارکرد بوو، ئەو پێشمەرگەم ئەناسی ئەیبرد بۆ سیتەک. بە پێشمەرگەکەم ووت منیش لەگەڵتان دێم، ووتی باشە من خواحافیزیم لە مەحمود کرد و بەپێ بەرەو سەرجادە هاتم، دوای پێنج دەقیقە ئوتومبێلەکە گەیشتە لام و

سوار بووم. تا نزیک سیتەک، لەوێ دابەزیم و نورەدینی سەیدقادری باخچە و قادری حەپسە حازر بوون و سواری ئۆتۆمبێلیان کردم تا ئاوایی چوارتاقی پشتی عەربەت. لەوێ دابەزیم و بەپێ لەڕێی زێڕینجۆ و موانەوە گەیشتمە ناوگردان. شەوی دواتر گەیشتمەوە بۆ ئاوایی خێڵی حەمە، لای نیازی و کەرتەکەی خۆم. کاک ئەکبەر ئێناخی جێگر کەرت بوو نیيەتی خۆمم بۆ باس کرد، دە پێشمەرگەم لەگەڵ خۆم برد و ئەوانی ترم لای کاک ئەکبەر جێهێشتن، ئەوانەی چەکی (ئاڕ بی جی) و ئارپیکەیان لابوو دامان بەو پێشمەرگانەی مانەوە کەوتینە ڕێ و چووین بارەگاکانی پێشترمان لە هاوارە کۆن ئاوەدان کردەوە، ئینجا نامەیەکم بۆ م.س و مەڵبەند نووسی، لەونامەدا وتوومە من بە ناهەق سزادراوم ئەوماوەشی بۆ سزادان دیاری کراوە بەڕێم کردووە، دوای ئەوە لێتان نەپرسیومەتەوە، واهاتوومەتەوە بۆ هەورامان دانیشتووم ئەگەر بێنە سەرم هەڵوێستم ئەبێ.. تاد..

ورده ورده وتووێژ بەرەو کۆتایی ئەچوو. تەقە و لێکدان دەستی پێکردەوە، نیازیش بەچەند پێشمەرگەیەکەوە هاتەوە بۆ هاوارە کۆن، تاک و تەرا پێشمەرگە ئەهاتنە سەرەوە، بۆیە ئێمە لە کۆبوونەوەیەکدا پێمان ڕاگەیاندن دانیشتوین ئیش ناکەین. ئەبێ ئەوانەی پێشمەرگایەتی ئەکەن بچنەوە بۆ لای کەرت و تیپەکەی خۆیان و لێرە نەبن. پێم وابوو یەکێتی لەسەر هاتنی ئەم پێشمەرگانە هێز ئەنێرێتەوە سەرم. هەرواش بوو یەکێتی ویستی هێزێک بنێرێتە سەرمان بەڵام ئەوانە برادەرمان بوون نەهاتن و ناوچەکەش قایم بوو. حیزبی دیموکرات ئاگادار کرا ئەوانە یەکێتی نین و ئەتوانن لەو ناوچە دەریان کەن و بەناوی یەکێتیەوە مەیاننناسن. حیزبیش مەسئول و بەرپرسەکانیان برادەرمان بوون و کاک کاوەی بارامی، نەبی قادری و سەید ڕەزا ئاگاداریان کردین کە شتێکی وا هەیەو داوامان لێکراوە ئەوکاتەی دێنە سەرتان ئێمە هاوکاریان بکەین. حیزب هەوڵیاندا وتیان یەکەم پێمان خۆشە کێشەکەتان چارەسەر بکرێت و بگەڕێنەوە لەوبارەوە ئێمە چیمان پێبکرێ ئامادەی هاوکاریتانین، دووەمیش بۆهاوکاری کردنی ئەو

هێزەی بێتە سەرتان ئێمە شتی وا ناکەین وبەکاک د. قاسملوشمان بەڕاشکاوی ووتوە.

دوای ئەمە ئێمە بەنووسراوێک دووبارە داوامان لەیەکێتی کرد کە بۆ خۆمان دانیشتووین، کۆبوونەوەمان لەگەڵ پێشمەرگەکان کردووە هەرکەس بۆ خۆی ئازادە کێ ئەگەڕێتەوە بۆلای تیپ و مەڵبەند ئێمە چەکی ئەدەینێ، لەم ماوەدا ئەو چەکو چۆڵەی لامانە لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی هاتوونەتە سەرەوە ئەیانێرینەوە. پێشمەرگەکان نەگەڕانەوە و نزیکەی بیست وپێنج کەس بوون، چەکی زیادەشمان لابوو، چەکەکانم لێوەرگرتن بەشی حەرەسیاتی خۆمان و بارەگایەک چەکمان گل دایەوە و ئەوانی تر کە نزیکەی پانزە چەک بوون، لەڕێی حیزبی دیموکراتەوە بەئۆتۆمبێل کاکەحەمەی وەلەدبەگی بردنییەوە بۆ ئاوەکەڵە بۆ مەڵبەندی ۱.

یەکێتی ئەمەی پێ خۆش بوو، ئیتر هیچ هەوڵێکی ناردنی هێز و لێدانمان نەما، ئێمەش ئەو ماوە بۆ خۆمان مەفرەزەمان ئەچووە هەڵەبجەو شارەزوور بۆ هێنانی ئازووقەو خواردەمەنی، چەند چالاکیەکیشمان کرد خەفیفە و جاشمان چەک ئەکرد.

کاتێک ئاش چەککران هەندێکیان هاتنە هاوارە کۆن، بەلام ئێمە ڕێگەمان نەدانێ و گەڕانەوە، چەند کەسێکیان تەسلیم بوونەوەو چەند کەسێکیشیان چوون بۆ ئێران. ئەوانە کاتێک چووبونە دزلی و مەریوان لەگەڵ پارتی قسەیان کردبوو باسی ئێمەیان کردبوو ووتبوویان ئەوانە لەیەکێتی زیور بوون لەگەڵ هێزێکدا لەچۆمی هاوار و گریانەن، مەبەستیان لە من و شەهید نیازی بووە.

بۆیە پارتی لەڕێگەی کاک سەرباز هەورامیەوە نامەیەکی بۆ نیازی نووسی بوو، نیازی لەشۆڕشی ئەیلولدا برادەری سەربازو پێکەوە قوتابی بوون، داوای ئەوەی کردبوو بچینە لای ئەوان. کاک نەسرەدین علید هەورامیش لە حیزبی شیوعی نامەیەکی بۆ من نووسی بوو کە ئاگامان لە خۆمان بێت ئەمە جوملەیەکی نوسراوەکەیەتی: (ئەوانەی دوژمنی ئێوەن

جانەوەرن نەچنەوە بۆ لایان ئەگینا ئەتانکوژن)، ئەگەر بێنە لای ئێمە لەخزمەتتان داین. واتێگەشتبوو ئێمە سەر بەئالاین. وەلامی کاک سەرباز درایەوە نوسیمان ئێمە ئاواییەکانی هاوار و هاوارە کۆن و گریانەو بۆین لەدەستمان دایەو لە ناو ولاتداین. ئێوە بێنە لای ئێمە ئەوکاتە قسەیەک ئەکەین، چونکە ئێوەلە ئێرانن جا نازانم نامەکە گەیشتەوە دەستی سەرباز یان نا، چونکە دوای ئەوە ئیتر پەیوەندی نامەگۆڕینەوە نەما.

لە شۆڕشەکانی کوردا هەندێک دیاردە هەن جێگەی سەرسوڕمانن، بۆ نمونە وەک خۆبەدەستەوەدانەوە بە دوژمن و شەڕکردنەوە لەگەڵ ئەو کەسەی کە هاوسەنگەرت بووە، یان کەووتنە پێشی دوژمن بۆ سەر هاوبیرو باوەڕ و هاوسەنگەرەکانی دوێنێ، یان سەنگەر گواستنەوە بۆ چەندین جار، لەناو ئێمەدا بە ئەم بەرو ئەو بەرکردن ناو ئەبرێت، ڕەنگە یەک جار ئاسایی بێت چونکە مرۆڤ ئەکرێ بیربکاتەوە و لەسەر ڕێبازێک خۆی بەهەڵە بزانێ و ڕێباز و بیروباوەڕی تر هەڵبژێرێت، یان کێشەیەکی هەبێت و لە ناو حیزبەکەی خۆیدا ڕێگەی نەبێتەوە، بەلام چەندین جار و بۆناو چەندین حیزب ئاسایی نییە و جێگەی سەرسوڕمانیشە. یان لەمانەش گرنگ ترو جێگەی سەرسوڕمان تر خیانەت کردن لە خاک و ئاو و گەل و ولات بۆ داگیرکەران و دوژمنانی نەتەوەو خاک. زیاتر لەناو کوردەواریدا بە جاشایەتی ناو نراوە. کە من نازانم ئەو ووشە لەچییەوە هاتووە بۆ ئەو کوردەی لە کوردستاندا خیانەت ئەکات و ضةك بـۆ دوذمـن ئـةكـاتـة شـان ثـێـى ئـةوتـري ێةت (جـاش) ..

سالی١٩٨٤ ئێمە لەگەڵ ڕژێم لە وتووێژ داین، هەڤالانی پارتیش لە دزلی و سەرسنوور لە ملەخورد و کەرەجالن. ڕۆژێک پێشمەرگەیەکی پارتی کەپێشتر پێشمەرگە بووە لای خۆمان، چۆتە ئەوێ و سەنگەری گۆڕیوە، هەم سەنگەری گۆڕی و هاتەوە بۆلامان وابزانم جێگەیەکی تریشی کرد. بەرزان کوڕی غەیدان هاواری و برازای شەهید کەمال هاواریە، کەمال لە شۆڕشی ئەیلولدا ناوبانگی هەبوو، فەرماندەی لق و پێشمەرگەیەکی دلێر و چاونەترس

خوو ڕەوشت بەرز بوو، لە نزیک عەربەت لە شەڕێکی قارەمانانەدا گیانی فیدای گەل و نیشتیمان کرد. ئەم پێشمەرگە کلاشینکۆفێکی هێنا بوو، هەڤاڵانی پارتی١٥٠٠ هەزار و پێنج سەد دیناریان لە بابی سەند.

براکانی شەهید کەمال هاواری کە دۆستی ئێمە و لایەنگری پارتیش بوون، هاتنە ئاوایی خێڵی حەمەو وتیان ئەو پارە ئێمە قەرزمان کردووە چی بکەین؟ منیش بە ئاگاداری کەرتی ڕێکخستن کە ئەوکات بارەگای لای ئێمە بوو، لەگەڵ هەڤاڵانی نیازی عیزەت و شەوکەت حەمە ساڵح و جەعفەری حاجی ئەولە لەگەڵیان دانیشتین و من پێم ووتن کلاشینکۆف بە١٥٠-٢٠٠ دینارە. ئێوە بڕۆنە لای کاک نادر، داوای١٢٠٠ هەزار و دووسەد دیناری لێ بکەنەوە چەکەکەش ٣٠٠ سێ سەد دینار جەریمەی بێت. ڕۆیشتن و هاتنەوە ووتیان وتوویانە ئێمە ئەو ئیجرائاتە نەکەین هەموو پێشمەرگەکانمان ئەڕۆن لەبەر ئەوە ئەبێ ئجرائات بکەین، ئەوە بڕیاری لقیشە. دووبارە پێم ووتن ئێمە چەکەکەتان ئەدەینێ بیبەنەوە بۆیان و پارەکە بهێننەوە، ووتیان باپێشتر بڕۆین ئەگەر بەمەڕازی بوون، ئەوە تۆچەکەکەمان بەرەوە مەمنون ئەبین. ووتم باشە و ئەوان ڕۆیشتن. هاتنەوە ووتیان دەریان کردوین و وتوویانە پارەکە خەرج کراوە.

باشە ئێمە دەبێ چیبکەین؟. من دووبارە لەگەڵ برادەرەکانم دانیشتمەوە و پێم ووتن کەس ناتوانێ١٥٠٠ هەزار و پێنج سەد دینار بدات. لەبەر ئەوە من چەندین کەس لە کەسوکاری پێشمەرگەی پارتی بانگ ئەکەم و داوایان لێ ئەکەم کە ئەبێ بە هەموویانەوە ئەو پارە زیادە کەزیادە لەحەقی کلاشینکۆفەکە بدەنەوە بەماڵی غەیدان هاواری. ئیتر ئەمە بۆتە ڕێ و ڕەسم، کەس و کارمان هەم لەلایەن ڕژێمەوە ئەگیرێ و هەم ئێمە هی پارتی و پارتی هی ئێمەو هەروەها لایەنە ناکۆکەکانی سەر ساحەی سیاسی کوردستان بەهەمان شێوە. زۆرجار ئەم ڕێو ڕەسمە نەشیاو قێزەونەمان ئەنجام ئەدا.

ئەوانەی بانگ کران، کەسوکاری حەمەی ڕەمەزان، عوسمانی حاجی ئەولکەریمی بەشارەت، فازل بەشارەتی، حەمەی وەسمان بەگی بەڵخە باوکی دیاری، وشیار یارئەحمەد بەگی ئەفراسیاب بەگ و حاجی کەرەمی سەرگەتی باوکی حەمە....... تاد.

لە کۆبوونەوەیەکدا لەناو مەکتەبەکە کۆنەکەی ئاوایی خێڵی حەمەدا بۆم شیکردنەوە لەبەرچی بانگ کراون، لازمە ئەو پارە ئەوان بیگێڕنەوە بۆ مام غەیدان هاواری. زۆر قسە کراو ڕای جیاواز جیاواز هەبوو، کۆبوونەوەکەمان دواخست بۆپاش نیوەڕۆ، لەوێ هەستاین لە دوای نانی نیوەڕۆ چووینە مزگەوتەکە. بەر لەوەی بچینە مزگەوت، من وشیاری یارئەحمەد بەگم بانگ کردو پێم ووت تۆ بڕۆ مەیەرە مزگەوت. من جگە لەوەی وشیار و خێزانەکەی لەڕێکخستن و سەر بەیەکێتی بوون هۆشمەند و بەختیار و مامە یارەشم خۆش ئەویست و دۆستم بوون، بۆئەو مەسەلە قەد پارەشم لێوەر نەئەگرت.

پێشتریش جارێکی تر هۆشیارمان لە سازان بانگ کردبوو داوای پارەی چەکێکمان لێ ئەکرد لەسەر تەیموور بەگی خالۆی. ئێستا باش لە بیرم نییە تەیمور بەگ بۆ؟ ئەگینا هۆشمەند پێش چوونە دەرەوە لەڕێکخستنی کۆمەڵە و لەگەڵ یەکێتیدا ئیشی ئەکرد. بەڵام خەتای ئێمە بوو لەسەر هیچ و خۆڕایی عاجزمان کردن. کەچووینە ناو مزگەوتەکە هێشتا دانەنیشتبوین، حاجی کەرەم ووتی بارمان قورستر بوو، کەس وەڵامی نەدایەوە بڵێت بۆ؟، ئینجا ووتی: یەکێکمان فت. من تێگەیشتم مەبەستی وشیارە. ئینجا کۆبوونەوە کۆتایی هات و لیستمان کرد کە هەرکەس بەڵێنی چەندی دابوو. حاجی کەرەم ووتی من نایدەم، ووتم مام حاجی وشیار هی خۆیداوە و ڕۆیشت، ووتی: ئەزانم گیانی مامەی.

جەماعەت هەموو ئیزن دران، حاجی ووتی من ناڕۆم و پارەش نادەم. منیش ووتم باشە تۆ زیندانی. ناردمەوە بۆ بارەگاکەمان و خۆم ڕۆیشتم بۆلای وشیار و نیازی. وربا بیارەیی ووتی باحاجی لامان بێ ئەمە قسەی زۆر خۆش و پیاوێکی دانایە. شەو بانگم کردە لای خۆم، ووتم حاجی ئەوە چۆنە وتووتە خۆزگە دەمانچەیەک هەبێت تەرسەقول بتەقێنێ، هەرکەس کە قسەیەکی نامەعقوول ئەکات تەقو بۆ ناو دەمی؟ ووتی: حەمە گیان ئەوە ئێستا قەتارکێشی ئەوێت فیشەکدان. حاجی بوو بە دۆست و ناسیاوم، پارەکەشم لێ نەسەند دواتر زۆریش ڕێزم لێ ئەگرت، حەمەش دواتر هاتە لای یەکێتی و بوو بە پێشمەرگە و ئێستا پێشمەرگەی خانەنشینەو کەم ئەندام و کەسێکی دڵسۆزە. حاجی زۆر زیرەک و دانا بوو.

جارێک عومەرە کەڕی بیارەیی لەسەر ملەی هەسوون لە کاتی گرانییەکەدا کەمین ئەگرێ بۆ ڕووت کردنەوەی خەڵک، حاجی کە لە ئێران گەڕابوەوە دەنگی ئەداو ئەڵێ چیت پێیە داینێ، ئەویش ئەڵێ مەمکوژە وەرە ١٢٠ سەد و بیست دینارم پێیە نیوەی بۆ من و نیوەی بۆ تۆ. حاجی زۆرتری پێ بووە، عومەر ئەڵێت هەمووی لەسەر ئەوبەردە دانێ و بڕۆ، حاجی کەرەم ١٢٠ سەدوبیست دیناری بە جیا لەگیرفاندا ئەبێ و دایئەنێ و ئەڵێت خواحافیز. دوای چەند ساڵ عومەر لە بیارە ئیسلامیەکانی هێزی دووی سۆران ئەچن بۆگرتنی و هەڵدێ بۆ هانەگەرملە کەدێکی ئێرانە و لەپشت بیارەوەیە. شەو لە ملەی پشتی ئاوایی بێرواسەوە دا ئەگەڕێ و دێتەوە بۆ ئاوایی هانەی دن. ئەچێتە پشت دەرگای ماڵی حاجی کەرەم. تەقە لە دەرگا ئەدات حاجی ئەڵێت کێیە؟ عومەر بە هێواشی ئەڵێ حاجی خۆمانین دەرگاکە بکەرەوە. حاجی چرایەکی فانۆس بە دەستی ڕاستیەوە ئەبێت و بەدەستی چەپی دەرگاکە ئەکاتەوە، عومەر لە دەرگا سەر ئەباتە ژوور، حاجی چراکە نزیکی دەم و چاوی عومەر ئەکاتەوە و پێی ئەڵێت فەرموو (میەو عشیرین) سەدو بیست وەرە ژوورەوە .



حاجی کەرەم پیاوێکی عاقڵ و وریا و قسەزان بوو لە هەوراماندا مەشهوورە، ئەگەر قسە مانادار و جوملە بەنرخەکانی بنووسرێتەوە بۆ خۆی کتێبێکە..

# بگرین بەلام دەنگ بەرز مەکەنەوە

لەدوای ئەوە چەکەکانمان ناردەوە بۆقەرەداغ، مەڵبەندی یەک داوایی کردبوو لەجێگەیەک لەگەڵ نوێنەرانی ئەوان دانیشین و پێک بێینەوە، بڕیارماندا بچینە شارەزوور لەگەڵ فەریدون حەمەساڵح و حەمەسەعید سێ تەلانی وچەند کەسی تردا دانیشتن بکەین، ئەوان نوێنەری مەڵبەندی یەک و لە قەرەداغەوە دێن، لە ڕۆژی ١٩٨٥\٥\١٧ دا ئێمەش لەهاوارە کۆنەوە دەرچووین، من و نیازی لەگەڵ پێنج پێشمەرگە، ئەو شەوە گەیشتینە ئاوایی کشەدەری، لەوێ مام عەبدولخالق و حاکم شاهۆی خانەقینیمان بینی شڵەژاو و بەتەنیاش بوون، پرسیمان چی ڕوویداوە؟ ووتیان تەقە بووە لە تەپە سەرەقووڵە ووتمان ئێمەش گوێمان لێبووە. ئەوان ووتیان مەفرەزەمان ناردووە بزانین چییە ئێستە دێنەوە. زۆرباشە ئێمەش ئەچین بە پیریانەوە، مەفرەزەکە هاتنەوە تەرمی د. مەحمود ئەحمەد بەگ، ڕۆستەم بەگی قلیجە و مامۆستا برهان سەعید خەڵکی زەڵم بوو لەگەڵ خۆیان هێنا. شەوێکی زۆرناخۆش بوو، ئەحمەد قەدەفەری مەسئولی هێزەکانی سۆشیالیست بوو بردمە لاوە لێم پرسی ئەمە چۆن بووە؟ ووتی کەوتوونەتە کەمینی جاش، ئەحمەد بەمنی ووت ئێوە چی ئەکەن و بۆ کوێ ئەچن؟ ووتم ئێمە ئەچینە لای دۆلاش قەرارە بەیانی لەگەڵ برادەران دانیشتن بکەین، ووتی ئێمەش ئەبێ سەرکەوینەوە بۆسوورێن. ووتم باشە ئێمە تەرمی شەهیدەکان ئەبەین بۆ گردی شەریف.

بە تراکتۆرێکی ئاوایی کە شۆفێرەکەی ئەحمەد درێژ بوو، تەرمی سێ شەهیدەکە بارکراو ئێمەش لەگەڵ پێشمەرگەکان سوار بووین و بردنمان بۆگردی شەریف چونکە لەوێ گۆڕستانی لێیە. درەنگانێکی ئەم شەو چووینە گردی شەریف، لەوێ موختاری ئاوایی و مەلاکەمان هەستاندو پێمان ووتن ئەم پێشمەرگانە شەهید بوون و بالەم مزگەوتەبن سبەینێ بە خاکیان بسپێرن. ووتیان باشە، ئێمە ڕۆیشتین. لە نزیک ئاوایی لە ناووتوودرک و پەڵە چنارێکدا خۆمان شاردەوە، بەر لەوەی ڕووناک بکات، تراکتۆرەکە بە

تەرمەکانەوە هاتەوە نزیک ئێمە، گوێمان لێ بوو دایان گرتن و گەڕانەوە. ناچار ئێمەش چووینە لای تەرمەکان و بووینە پاسەوانیان. شەبەقی بەیانی چەند کەسێک خەڵکی ئاوایی هاتن، ووتیان بۆیە شەو هێناومانن با لێرەبن تا خۆروبان گەرم بێت نەوەک حکومەت بەیانی هێرش بکات. سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٩٨٥\٥\١٨ کاتژمێر شەش لەیلاخان خێزانی د. مەحمود کەژنێکی زۆر ئازاو نەترسە لەگەڵ چەند ژنێکی‌تر گەشتنە لامان، دەستیان کرد بەگریان و هات و هاوارو قژ ڕنینەوە، منیش پێم ووتن دادەگیان بگرین، بەڵام دەنگ بەرزمەکەنەوە، تاخۆروبان گەرم ئەبێت.

ورده ورده خۆروبان گەرم بوو، مەفرەزەیەکی یەکێتیی لەوبرادەرانەی کە قەرار بوو ئێمە بیان بینین هاتن، ئەحمەد قەدەفەری و هێزەکەشی دیارە هەر لەو ناوە خۆیان پەنادابوو سەرنەکەوتونەتەوە بۆسورێن و هاتنەوە. ئەو ناوە قەرەباڵغ بوو تەرمەکان برانە ناودێ، ئیتر ئێمە ئەبوو بچین لە دۆلاش لەگەڵ برادەران دانیشین. هێزێکی لای سۆشیالیست لە گردی شەریف قەرەباڵق بووە بۆنان خواردن چوونەتە دۆلاش. ئێمەش کەچووینە دۆلاش فەرەیدون حەمەساڵح و لەتیفی حەمەی مەلاسابیر و چەند کەسیتر لەوێ بوون و بینیمانن و هەندێک قسەشمان کرد، داوایان کرد بچینە بیەڕەشکە لەوێ قسە بکەین، لەتیف بەئامازەی برۆ ووتی مەیەن، ئێمەش بە باشمان نەزانی بچینە ئەوێ، لەگەڵ هێزەکەی سۆشیالیست، گەڕاینەوەو، ووتمان بۆجارێکی تر دائەنیشین.

ئێمە لەگەڵ سۆشیالیست ئەو ئێوارە گەڕاینەوە بەرەو تەپەتۆڵەکە، مام عەبدولخالق، شەوی پێشوو خێزانی هاتبوو کەل و پەل و خواردنی بۆ هێنا بوو لەشارەوە لەکشەدەری دابنابوو، مەفرەزەکەی ئێمەو خۆیشی چووین بۆ خواردنەکە تاسەمان شکاند. بۆیە ئێوارە لە تەپەتۆڵەکە کە هێزەکەی سۆشیالیست دابەش بوون بۆ نان خواردن، ویستمان خواحافیزی لەئەحمەد بکەین و بپەڕینەوە بۆ تەپی سەفا. ووتمان ئێمە نانمان خواردوەو ئەڕۆین. مام عەبدولخالق ووتی: مەڕۆن منیش نانم خواردووە لەم ماڵە چایی ئەخۆین، بابرادەران نان بخۆن دوایی پێکەوە تا تەپی سەفا ئەچین و لەوێ جیا ئەبینەوە. چونکە ئەوان بەرەو ئەحمەد ئاوا ئەچوون و ئێمەش بۆ هاوارە کۆن ئەگەڕاینەوە، بۆیە بەقسەی مام عەبدلخاق هەورامیمان کردو ماینەوە.

شەو قەدەفەری هات و ووتی با بڕۆین، چووینە لای مزگەوت هێزەکەی سۆشیالیست کۆبوونەوە، بەڵام چەند پێشمەرگەیەک مابوون کە هاتنە لای مزگەوت ئەحمەد لێیان تووڕە بوو، ئەیووت بۆچی دواکەوتون؟ لەم کاتەدا لە سەرجادەکە قیرەکەی هەڵەبجە پردی زەڵم، لەئاستی هەردوو ئاوایی تەپی سەفاو تەپەتۆڵەکە بووبەتەقە. ئەحمەد ووتی ئەوە من کەمینم ناردووە بۆ سەرجادەی قیر. پێشمەرگە شڵەژان، مەفرەزەکەی ئێمە و ئەحمەدو چەند کەسی تر بەرەو سەرجادە ڕۆیشتین. لەو سەرەوە مەحمود گردی شەریفی بە بریندارى هات. لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی کەمینەکە بووبوو، ووتمان چییە؟ ووتی نازانم کەوتینە کەمین و من بریندارم.

بەوریاییەوە چووینە سەر قیرەکە بینیمان دوو کەسیان کەوتوون و گیانیان سپاردووە، یەکێکیان ناوی مام کەریم بوو خەڵکی تاوگۆزی و ئەویتر ناوی برایم بوو، مەیتەکانمان وەرگرت و بردنمانە ئەوبەری جادەی بەری تەپی سەفا، عەلی بچکۆل بەرپرسی ئەو مەفرەزە بوو کەوتبونە کەمین، خۆی کردبویە ئەو بەری جادە و تەقەشی کردبوو، لاقی تۆفەشەلی شکاندبوو، تۆفە بەرپەسی مەفرەزەی تایبەت بوو، جاشەکان تۆفەیان بەبریندارى بەرەو گردی گۆ بردبوو. شەهیدەکان چەکەکانیان لە لایاندا بوون، پێشمەرگەیەکی ئێمە ناوی بەهمەن عەبدولکەریم بوو دووچەکی شەهیدەکانی کرد بووە شان بەرەو تەپی سەفا، کاک نوری حاجی عەلی وکۆمەڵێک پیاوی تەپەتۆڵەکەیی مەحمود گردی شەریفیان هێنا بەرەو تەپی سەفا، لەوێ ئەم دوو تەرمەی تریان دابە پیاوەکانی تەپەتۆڵەکەیی بیان بەنەوە بۆ تەپەتۆڵەکەو لەوێوە بۆگردی شەریف، مەحمودیشیان لەوان وەرگرتوو خۆمان بردمان.

گەشتینە تەپی سەفا، دەنگیان داین، ئێمە لە دواوە بووین و گوێمان لێ بوو مەفرەزەی پێشڕەو وەڵامی دایەوە خۆمانین سۆشیالیست، کاکە حەمەی حەمە سەعیدیشمان لەگەڵە. وابزانم کاک جەلال کوڵکنی و دەستەیەک پێشمەرگە بوون، ئێمە کە بەقەرەباڵقی چووینە ناوێ ئەوانمان نەبینی، بەڵام ئەمزانی برادەران پێیان ناخۆش بووە وایان زانیووە بووینەتە سۆشیالیست. بەڵام دواتر زانییان نەخێر بەڕێکەوت پێکەوە بووین. لەوێ خواحافیزیمان لەکاک ئەحمەد و کاک نووری و هەڤاڵانیان کرد، دوورکەوتمەوە بینیم بەهمەن دووچەکی پێیە. پرسیم ئەوەچەکی کێییە پێت؟ ووتی: دوانی

کوژراوەکانم هەڵگرت یەکێکیان دامە هەڤاڵەکانی خۆیان و ئەمەشم پێیە بۆ خۆم، دیارە بەهمەن تازە هاتبوویە لامان هەر ئەوەندەی لێ ئەزانی، ووتم بوەستن کاک سەردار شەوکەت یەکێک بوو لەو پێشمەرگانەی مەفرەزەکەی لای ئێمە بوو، کوڕێکی ژیرو عاقڵە، بە سەردار دا چەکەکەمان ناردەوە بۆ هەڤاڵ ئەحمەد قەدەفەری، پێم ووت بڵێ ئەو پێشمەرگە نەیزانیوە ئێوە ڕۆشتوون و لەئێمە جیا بوونەتەوە، ئەوەچەکی یەکێک لە شەهیدەکانە.

# بنکەی شنروێ

لە دوای وەڵام دانەوەی نامەکەی پارتی لەلایەن کاک سەرباز نادر عەلیەوە نێردرا بوو بۆ نیازی. کەوتمە بیری ئەوە چالاکیەکی گەورە چۆن بکەین، هەرچەندە ماوەیەک بوو چەند چالاکیەکمان کردبوو، بەڵام لەفرسەتێک نەگەڕام چالاکی و شەڕێکی گەورە بکەین بەدژی هێزەکانی ڕژێم، شەڕێکی وابێت دەنگ بداتەوە، ئینجا دوای ئەوە لەگەڵ یەکێتیی بکەومە گفتوگۆ، ئەمە لەبیری خۆمدایە و بەکەسم نەوتووە. ئەم بیرکردنەوەم بۆ نیازیش ئاشکرا نەکرد، نیازی لەم کاتەدا ژنی هێنابوو، ماڵی لەهاوارە کۆن بوو، منیش وردەوردە ئەو چەند مەفرەزە کەهەبوون خستمنە جووڵان و چالاکی، ٢٥بیست و پێنج پێشمەرگە بوون کردمنە سێ مەفرەزە.

لەکۆتاییی مانگی١٩٨٥/١١دا مەفرەزەیەکم بردوو چووم بۆ ناوشاری هەڵەبجە، بۆ ئەنجام دانی چالاکیەک، یەکەم شەو لەماڵێکدا بووین خاوەن ماڵ ناوی مەحیەدین حەمەیوسف بوو تەنیا خۆی و هاوسەرەکەی پێکەوە ئەژیان منالیان نەبوو، کە لەشاردا ئەمامەوە زۆتر ئەچووینە ئەوێ خێزانیمان ئەنارده ماڵی باوکی یان ماڵەخزمی. ئەمشەو مەحیەدین مرواری خانی بردبوو بۆ ماڵی خاڵۆ عیزەت باوکی شەهید نیازی، کەهاتەوە بۆلای ئێمە، ووتی: قازی کاک عیزەت وتوویەتی نامەیەک هاتووە بۆ کاکە حەمە.

پرسیم نەتووت نامەی چی؟ ووتی نەوەڵا، ناردمەوە بۆلای قازی ووتم بڕۆ بیهێنە بۆ ئێرە، قازی هات بۆلام، قازی کوڕێکی وردوو ووریا بوو، دوای قسەوباس و هەواڵ و زانیاری ناوشار، ووتی نامەکەت پێگەشت ووتم نا نامەی چی، لەڕێی شارەوە نامەیەک هاتبوو، کەسێک هێنابووی بۆماڵەوە تەنیا دایکم لەوێ بووە پێی ووتووە، ئەم نامە بنێرن بۆ حەمەی حەمەسەعید، لێیی پرسیوە تۆکێیت ناوی خۆی نەداوە، دوێنێ دایکم نامەکەی بە کاکە حەمەی ولەدبەگیدا ناردوە بۆ هاوارەکۆن.

باشە، ئەم نامەش برێک بیرمی جەنجاڵ کرد، شەوی دواتر دوای نانی ئێوارە ناردم بەهمەن عەبدلکەریم[1] هاتوو بەسواری جێبەکەی بردینییە گەڕەکی

[1] - بەهمەن کوڕی عەبدلکەریم پاڵانەیی بوو، ناسراو بوو بە بەهمەنی بەگ کوڕێکی تاقانە بوو زۆر بەجەرگ و سەرەڕۆش بوو، لەناوشاردا ئیشی بۆ ئەکردین، ساڵی ۱۹۸٥ ماوەیەک هاتەدەرەوە بوو بە پێشمەرگە، دوای ناردمەوە. بەهمەن ساڵی ۱۹۸۹ دەستەیەکی چەکداری دروستکردبوو بەنهێنی، لەڕێی حیزبی دیموکراتەوە بە کاک عەبدلکەریمی جەلالیداو لە ڕێگای قاسمەڕەشەوە پەیوەندی کرد بەمنەوەو نامەیەکیشی بۆ ناردبووم، لەوکاتەدا بارودۆخەکە زۆر خراب بوو، بۆیە من وەڵامم دایەوە ئەگەر خۆی مەترسی لەسەرە ئەوە بابێتە دەرەوە، ئێوە هاوکاری بکەن تابگاتە ئاوایی سونێ لەبنار چیای مەمەندە. ئەگەرنا ئەو تەنیا دایکێکی پیری هەیە با لەوێ بێت و دایکی بەخێو بکات باشترە، لەنامەکەیدا باسی ئەندامانی مەفرەزەکەی کردبوو، کە ئامادەن بۆ هەرئەرکێک کە شۆڕش بۆیان دیاری بکات، لەوانە حەمەی غەفور (حەمەی سەمون)، ڕێبوار محەمەد و مقداد ناوێک. من لەوانە حەمەی سەمونم ئەناسی، حەمە ساڵی ۱۹۷۷ پێشمەرگە بوو لەڕووداوەکەی حاجی مەمەندا لەنێوان کاک وەهاب و کاک عادلی سەید قادردا ڕوویدابوو بریندار بوو تەسلیم بویەوە. لەو ساڵە بەدواوە چەندین جار گیراوەو هاتوەتەوە بۆ پێشمەرگایەتی و تەسلیم بوەتەوە، دواجار لەڕۆژی ۱۹۸۷/٥/۱۳ لەڕاپەڕینی هەڵەبجەدا بەبریندای لەبەردەم دائیرەی ئەمندا گیراو حوکم درا بە لەسێدارەدان، بەڵام لەلێبوردنی گشتی ۱۹۸۸/۸/۸دا ئازاد کرایەوە. من ئەمزانی ئەمانە سەرەڕۆن، بۆیە بەکاک عەبدلکەریم دا ئاگادارم کردنەوە بۆخۆیان دانیشن کێشە دروست نەکەن، تاکاتی خۆی دێتە پێشەوە.

من گەڕامەوە بۆ سنووری کرماشان و پاوە. دوای چەند مانگێک دووبارە لەڕێگای برادەرانی حیزبی دیموکراتەوە، ئاگاداری پەیوەندیەکانی یەکێتیان کردبوو لە ئاوزمنگ و قاسمەڕەشدا گوایا مەفرەزەیەک پێشمەرگەی یەکێتیی لەناو شاری سلێمانیدان ئەیانەوێ بێنەوە بۆسەر سنوورو پەیوەندیان بە منەوە حەمەی حەمەسەعید هەیەو من ئەیانناسم لەڕێگای بێسیمەوە لە قاسمەڕەشەوە بۆ شاری پاوە ئاگاداریان کردم بچمەوە بۆ ئاوزمنگ کە چوومەوە دووبارە برادەرانی حیزبم بینیەوە کاکە حەمەی وڵەدبەگی و کاک عەبدلکەریم. ئەمجار ووتیان ئەمانە پێشمەرگەی ئێوەن لەناو شاری سلێمانین لەڕێگای خزمەکانیانەوە داوا ئەکەن دیموکرات دەریان کات بۆسەر سنوور، ئێمەش ناتوانین و موخابەرات بەگومانن لێمان بەتایبەت لەسلێمانیدا چەند کەسێک لەهێزەکانیان ئەم ملوە کوژراون، بەڵام ئەگەر لەڕێگای مەکتەبی سیاسی یەکێتییەوە بەفەرمی پێمان بڵێن، ئەوە تەکبیریان ئەکەین. بریار درا من بمێنمەوە لەشێنێ وسونێ برادەرانی دیموکرات یەکێک لە خزمەکانی ئەو جەماعەتە بهێنن بۆلای ئێمە، تابزانین ئەوانە کێن و ڕاستە پێشمەرگەن. دوای چەندین هاتوچۆ بۆمان دەرکەوت بەهمەنەو ئەو چەند کەسەی تر، کە جاری پێشوو

مامۆستایان، ڕۆژەکەی دوومالی جەیشی شەعبیان دەستنیشان کردبوو بۆمان، لەنزیک ماڵەکاندا لەتاریکایەکدا دابەزین، بەهمەنیش چەکی پێبوو هات لەگەڵمان بەدەستووبرد هەردوو جەیشی شەعبیەکەمان چەک کردوو سواری ئۆتۆمبێلەکە بووینەوەو ئەوناوەمان بەجێهێشت. لەماڵێکیاندا خەریک بوو خەلیل ڕێشاوی بەجێبهێڵین ڕۆشتبووە ژێر زەمینی ماڵەکە بۆمەخزەن و فیشەک گەڕابوو.

---

بەهمەن ناوەکان ناردوون، لەڕاستیدا ئەمانە پێشمەرگە بووبوون زووترو تەسلیم بووبوونەوە، بەڵام لەدوای ئەنفال وکیمیابارانی کوردستان من ئاگاداری ئیشوکاریان نەبووم.

دوای یەک هەفتە ئەوکەسەی بڕیار بوو بێت بۆلامان نەهات، بەڵام نامەیەکیان بەبێ ناونیشان بەبێ ئەوەی ناوی کەسی لەسەر بیێت ناردوە بۆ من، نامەکە نەماوە بەڵام ئەوەی بیرم بێت ئەمە ناوەرۆکەکەی بوو، (مانگێک لەمەوبەر لە خوێندنگایەکی گەڕەکی بەختیاری شاری سلێمانیدا کوڕێکی موستەشار حەسەنی مەحمود بەگ دیار نەما دوای چەند ڕۆژێک دۆزرایەوە لەماڵێکی چۆڵدا لەگەڕەکی سەرچنار، دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت ئەو مەفرەزە فڕاندویانە بۆ پارە گوایا بەهمەن پارەی لای حەسەن بەگ بووە. هەروەها عەریفێکی عەرەب کوژراوە و چەکەکەی براوە لەنزیک بەنزینخانەی عەقاری یان ڕزگاری. ئەویش خراوەتە ئەستۆی ئەوان، حکومەت لەناوشاردا بەدوایاندا ئەگەڕا چەند شوێنێکیان پشکنی. لە ڕۆژی ١٩٨٩/١٠/٣١ لە کۆمەڵگەی باریکەدا حکومەت چووە سەر ماڵێک شەڕ دروست بوو، لەشەڕەکەدا حەمەی سەمونچی هەڵەبجەیی کوژراو حاجی مەحمودی ئەمن، کەخەڵکی بناوەسووتە بوو بریندار بوو لاقێکی قرتا، چەند ئەمنێکیش کوژراون بەهمەن و ڕێبواریش بێسەرو شوێن بوون). دوای خوێندنەوەی نامەکە منیش سوپاسی هەڤاڵانی دیموکراتم کرد سەبارەت بەو هاتووچۆ و ماندوو بونەیان، ئێمە جارێکی تر گەڕاینەوە بۆسنووری پاوە. دواتر زانیمان خاوەن ماڵەکە لەکۆمەڵگای باریکە حکومەت چۆتە سەری و ئەمان لە ماڵەکەدابوون و شەڕ دروست بووە، خاوەن ماڵ ناوی ساڵح حەمەڕەشید حەمەشەریف و خەڵکی ئاوایی خراپەی شارەزوورە، خێزانەکەی ناوی کەژاڵ ئەحمەد محەمەد مستەفا بووە، بریندار بووە. ساڵح و خێزانەکەی پێنج ساڵ حوکم دران. منداڵێکی تەمەن یەک ساڵیان بەناو ڕێبین شەهید بووە، دوای چەند ڕۆژێک دوای ڕووداوەکەی باریکە دووبارە بەهمەن لەناو شاری سلێمانی لەماڵی هاوڵاتیەکی کوردی ڕۆژهەڵات دا ئەبێت و هێز ئەچێتە سەری، شەڕئەکاو دوای ئەوە فیشەکی پێ نامێنێ بەدیلی گیراوە. لەڕۆژی ١٩٩٠/٨/٢٧دا لەسێدارە دراوە لەگەڵ ڕێبوار محەمەد بەگدا.

هەر ئەوشەوە شارمان بەجێهێشتوو گەڕاینەوە بۆسەر شاخ بەیانی لەگەڵ دەرکەوتنی گزنگی دەم کەل خۆمان کردەوە بەمەقەڕدا لەهاوارەکۆن. بۆ نیوەڕۆکەی سۆراخی نامەکەم کرد لەماڵی خۆشمان و لەوبرادەرانەش لەمەقەڕدا بوون ووتیان کەس نامەی نەهێناوە. بۆ ئێوارەکەی مام برایمی باینگانی باوکی کاک حەمەنەزیفی قادری لەئاوای دەرەتفێ وە هاتەوە بۆ هاوارە کۆن، لایدایە لامان و دوای چاکوچۆنی دەستیکرد بەگیرفانی داو ووتی ئەو نامە بۆتۆ نێردراوە، لێم وەرگرتوو ئەوڕۆیشت، منیش پەلەم بوو بۆ خوێندنەوەی نامەکە دوورکەوتمەوە، نامەکەم هەڵ پچڕاند دەست و خەتی جەنابی مام جەلالە بۆ دڵنیابوون سەیری ئیمزاو ناوەکەیم کرد، خۆیەتی دڵسۆزتان مام جەلال، تەزوویەک سەرتاپا تەزاندمی، نامەکەم چەندین جارخوێندەوە، لەنامەکەدا دوای هەواڵپرسین و هەواڵی برادەران، داوا ئەکات خۆم بگەیێنمە لای بۆ ئاوایی یاخسەمەر، کات عەسر بوو نامەکەم پێگەیشت، شەوەکەی دووجاری تر خوێندمەوە. چوومە لای نیازی نامەکەم دایەدەستی، ئەویش دوجار خوێنیەوەو دایەوە دەستم، ڕۆژی دواتر من بڕیارم دا بێ ئەوەی کەس پێم بزانێ خۆم بگەیێنمە لای مام جەلال لەیاخسەمەر. لە کۆتایی مانگی ١٢/ ١٩٨٥ دوای ئەوەی لەگەڵ باوکم وبراکانمدا قسەوباسمان لەسەر دەست پێکردنەوەی ئیشوکاری حیزبی و پێشمەرگانە کردو نامەکەی مام جەلالم بۆ خوێندنەوە، بەرنامەو نییەتی دڵی خۆم بۆ باس کردن، ووتیان باشە پێمان چاکە. مەهدی ووتی چۆن و لەکوێوە بەرلەوەی مەڵبەندو کادرەکانی کۆمەڵە بزانن بگەیێنە مام جەلال؟ ووتم ئەوە خۆم تەکبیری ئەکەم. دووبارە لەگەڵ نیازی قسەمان کردوو دوا بڕیارمان ئەوە بوو من لەڕێگای شارەوە بەنهێنی بچمە لای مام جەلال و نیازیش لای پێشمەرگەکان بمێنێتەوە، لەگەڵ دوو پێشمەرگە شەوێک لە هەوارەکۆن دەرچووم، لەچیای شنرۆیوە خۆمان گەیاندە ناوشاری هەڵەبجە و لەوێ بەئۆتۆمبێلی بارزانی شێخ مەحمودی کاکە شێخ چوومە سلێمانی. عەسر بوو لەناوشاری هەڵەبجە دەرچووین دوو پێشمەرگەکەشم مۆڵەت داو پێم ووتن چەند مانەوە بمێننەوەو دوایی بڕۆنەوە، لە بازگەی زەمەقی هاوڕێیەکی سەردەمی خوێندکاریم سەربازبوو لەوێ وەستابوو پێم وابێ بینیمی، ئەویش شەوکەت جەعفەر خەلیفە خەڵکی پالانیا بوو.

ئۆتۆمبێلکە نەوەستا، ڕۆشتین تا چووینە یەکەم بازگەی سەیدسادق، لەگەڵ نزیک بوونەوەمان لە بازگەکە دوو گولە تۆپ کە لە ئێرانەوە ئەیانهاوێشت لە نزیک بازگەکەدا کەوتن، عەسکەرێک لە خانۆچکەکەوە سەری دەرهێنا و ووتی بڕۆن مەوەستن. خەریک بوو تاریک بکات لە بازگەی عەربەت ڕێگەیان نەئەدا بڕۆین، ئەیانووت ئەمرە بە شەو ئۆتۆمبێلی مقاتل نابێت هاتوچۆ بکات. بەرزان زۆر ئینکاری کرد و ئەیووت من خۆم مەسئولم ئیشم هەیە ئەبێ بڕۆم. لەوێ دەرچووین لە نزیک چایخانەی حاجی سەمین لە نزیک مەعەسکەرێک لە سەرجادەکە دوو سەرباز بەچەکەوە ئێمەیان ڕاگرت، ووتیان سوارمان کەن، من ووتم با سوارنەبن، بەرزان ووتی بۆ بازگەی سلێمانی باشە باسوواریان کەین.

گەیشتینە بازگەی سلێمانی ووتیان بوەستن، سەربازێک هات و پرسیار و جواب لەگەڵ بەرزان دەستی پێکرد و کاتێک ووتی بڕۆن، سەیری دواوەیی ئۆتۆمبێلکەی کرد و دووبارە ووتی بوەستن. چووە دواوە دەرگاکەی کردەوە و کەوتە قسە کردن لەگەڵ سەربازەکان، دووبارە هاتە پێشەوە و بەبارزانی ووت جارێک بوەستە، ئەو ڕۆیشت و سەربازێکی تری لەگەڵ خۆی هێنا، ئەویش پرسیاری زۆری لێکردن، ئەو سەربازانەی لەگەڵ ئێمە سووار بووبون ئەیان ووت ئەچینە قلیاسان فەوجەکەمان لەوێیە، دواجار مۆڵەتیان داین و ووتیان بڕۆن، هەر لەوێ دوور کەوتینەوە سەربازەکان زۆر ترسابوون، یەکێکیان ئەیووت خواگەورەیە. کە بەرزان قسەی لەگەڵ کردن بۆمان دەرکەوت لەشەری پێنجوێن هەڵهاتوون و بێ مۆڵەت ئەیانەوێت بچنە ناوشاری سلێمانی. هەر لەوێ من بەرزانم وەستاند و هەردوو سەربازەکەم دابەزاند وخۆمان چووینە ناوشار. ئێمە سوارمان کردبوون کە بەهۆی ئەوانەوە سەلامەت بین، بەڵام خەریک بوو بەهۆی ئەوانەوە ئاشکرا ببین.

لە سلێمانی چووینە ماڵی حامد بەگی حەمە تاهیر بەگ دابەزین، چونکە زەکیەخانی خێزانی ناسراوم بوو. کەچووینە ئەوێ بینیم کچێکی حەمە سەعیدی جەلالی خەڵکی نەوسوود بە ناوی تەلیعە لەگەڵ کچێکی ئەکبەری ڕەوایی لەوێبوون. هەردووکیان منیان ئەناسی و لەوێ ویستم بڕۆم زەکیە خان نەیهێشت ووتی هیچ نییە دانیشە. ئەبو ئەمشەو جەماعەتی حیزبی دیموکرات ببینم، بەرزانم نارد بۆ بارەگاکەیان لەگەڕەکی ئاشتی، لەوێ هەواڵی

ئەسکەندری شمشێری پرسی بوو ووتبویان میوانی هەیە چوون لەئوتێل کانین، هاتەوە بۆلای من و پێکەوە چووین بۆکانی هەواڵمان پرسین، خزمەت گوزارەکە سەیری دیوارەکەی کرد کە سندوقی کلیلی پێوە بوو، ووتی لە دەرەوەن کاتژمێر ٩نۆ دێنەوە. بەرزان ووتی بابچینە خوارەوە، چووین جێگەی خواردنەوە بوو، من بە جۆرێک دانیشتم پشتم کردبووە خەڵکەکە و سەیری دەرەوەم ئەکرد، لە جامخانەکەوە ئەو بەری جادە سەنگەر بەندی بوو بەگونییە خۆڵ سەربازگەبوو. لەناکاو سەیری دواوەوەم کرد بینیم حەمەتۆفیق محەمەد کەپیاوی بەعس و خەڵکی هەورامان بوو، من ئەوم ناسی ئەو منی نەئەناسی، بەبەرزانم ووت ئەوە فلانە کەسەو پیاوی ئەمنە. دوای ماویەک بەرزان ووتی ئەوە کابرا ڕۆیشت، دوایی من هەستام بچمە دەست شۆری. کەسێکی تری خەڵکی تەوێڵەم بینی خۆم لێ هەڵەکرد، ئەویش ناوی وەیسی حەمەخان بوو ئەگەر منیشی ببینیایە نەی ئەناسیم و بشیناسیمایە لەو بڕوایە دانەبوو من بگەمە شوێنی وا وەیسی پیاوێکی باشبوو بشیناسیمایە ئاسایی بوو.

کاتژمێر ٩ نۆ چووینە سەرەوە، برادەرانی حیزب لەوێبون و بینیمانن. لەوانە حەمە نەزیفی قادری، کاوەی بارامی، حەکیمی ڕەزایی و ئەسکەندەر شمشێری. حەکیم مەست بوو، سەرەتا وا حاڵی بوو بوو کە من تەسلیم بومەتەوە. بەڵام کاک کاوە ئەیزانی بەنهێنی هاتووم ئەمەوێت ڕەوانەم بکەن بۆ کارێزە. حەکیم کەزانی مەسئەلەکە چۆنە ترسا و ووتی بازوو بڕوات بۆ مەقەڕ. شەو من چوومە بارەگای ئەوان و بەرزان ڕۆیشت بۆ ماڵی زەکیەخان، پێم ووت لەوێ بڵێ ڕۆیشت لەناو شار دەرچوو.

بەیانی زوو بەئۆتۆمبێلێکی جێب شۆفێرەکەی کورێکی تورک بوو وابزانم خەڵکی ناوچەی نەغەدە بوو بە داخەوە دوای ڕاپەڕین لە ناوشاری سلێمانی بە دەستی چەند کەسێک شەهید کرا، بڕیار بوو لە سێدارە بدرێن، بەڵام حیزب خۆی لێیان خۆش بوو. شۆفێرەکە ناوی ئەحمەد ئاغا بوو بردمیە کارێزە و ئیتر لە بازگەی پێشمەرگە منی دابەزاند و خۆی گەڕایەوە. منیش چوومە ئاوایی گەڕەدێ ماڵی مام هادی لێبوو، ئەو شەوە لای ئەو مامەوە. بەیانی پێکەوە چوونە یاخسەمەر بۆ لای جەنابی مام جەلال. لەبازگەکە دانیشتین تا ئاگاداری مامیان کرد، ووتیان بابێن، نزیک بووینەوە لە

بارەگاکەی، بینیم وا بەڕوو خۆشیەوە هات بەدەممانەوە دەستی کردە ملم و ئەم لاو ئەو لای ماچ کردم و بردینییە ماڵەکەی خۆی. هێرۆخان لەوێ بوو، فەرمووی جگەرەی لێکریدن من سوپاسم کرد جگەرە ناکێشم، پرسیاری لێکردین قاوە ئەخۆنەوە یان چایی؟ من ووتم قاوە ئەخۆمەوە مام هادی چایی خوارد، ئەوە یەکەمجار بوو قاوەش ببینم پێم نەئەخورایەوە لەڕووشم نەئەهات بیدەمە دواوە، پێم وابوو هێرۆخان لەبیری نەبووە شەکر دابنێت، نەمئەزانی قاوە بەبێ شەکر ئەخورێتەوە، دوای پشوویەکی کورت هەواڵی ناوچەکە و نیازی و پێشمەرگەکانی پرسی، منیش وەڵامم دایەوەو بۆم باس کرد کێشەکە سەرەتا چۆن دروست بووە، داوای لێ بووردنم لێ کرد کە لای سورداش پرسم پێ نەکردووە و گەڕاومەتەوە بۆ ناوچەکە و شارەزوور، پێی ووتم ئەوە ڕابوردو خەبات و تێکۆشان بەردەوامە.

لێی پرسیم ئەوماوە چیتان کردووە؟ منیش بۆم باس کرد کە هەر لەئاوایی هاوارە کۆن و گریانە و بۆیندا بووین و دۆست و خزمان ئێمەیان ژیاندوەو هاوکاریان کردووین بەپێدانی ئازووقە و خۆشمان هاوینی ئەو ساڵە بنێشتمان کردووە و یەک دینارمان لەکەس داوا نەکردووە و لەکەس نەسەندوە هەندێک چالاکیشمان کردووە بە دژی ڕژێم و دەست کەووتمان هەبووە لەچەک و چۆڵەدا.

لایەنە سیاسیەکان بە تایبەت پارتی و سۆشیالیست و حیزبی شیوعی پەیوەندییان پێوە کردوین بەم جۆرە. یەکەم: کاکەحەمەی حاجی مەحمود خەڵکی ناردووە بۆ لامان ووتوویەتی پێم خۆش نییە دانیشتوون، حەزئەکەم بگەڕێنەوە بۆ لای یەکێتیی و ئەگەر پێتان خۆشە من لەگەڵ مام جەلال قسە ئەکەم. ئەگەر ناشگەڕێنەوە ئەوە خۆیان تووشی هەڵە نەکەن و من ئامادەم چیان پێویستە هاوکاریان ئەکەم، تا ئەو کاتەی کەپێویستیان بە من هەیە، ئێمەش سوپاسمان کردووە و وەڵاممان داوەتەوە کە دڵنیا بێت ئێمە خۆمان تووشی هەڵە ناکەین.

دووەم: حیزبی شیوعی نەسرەدین هەورامی ئەم نامەی ناردووە نامەکەم دایە دەستی، دواتر پەشیمان بووم بۆ نامەکەی نەسرەدین لەبەر ئەو جوملەی کەپێشتر نووسیوومە، گێڕانەوە و پیشاندانی نامەکەی و بینینی لەلایەن جەنابی مام جەلال دوایی بوو بە هۆی ئەوەی کاک نەسرەدین کە

وازی لەحیزبی شیوعی هێنا، ئەیویست بێتە ناو ی ن ک بەلام لە بەر ئەو خالە نەبووە یەکێتیی و چووە ناو پارتی، لە دوای راپەڕین بە هۆی تەقینەوەی مین لەلای ئاوایی بەلەسۆ لەو دیو چیای بەمۆ شەهید بوو، نەسرەدین عابد هەورامی بەرپرس بوو لە ناو حیزبی شیوعی پیاوێکی قارەمان و بەهیمەت بوو، کەسایەتیەکی دیاری کۆمەلایەتی و سیاسی بوو لە ناوچەکەدا.

سێیەم: پارتی لەڕێی ناردنی نامەیەکەوە کەپێشتر باسی ناوەرۆکەکەیم کردووە.

مام جەلال ووتی: هیچ نییە هەموو کێشەکان چارەسەر ئەکەین. دوای تەواو بوونی گفتوگۆکەمان بەکاک بەختیاری سالح رەفعەتی ووت جێگە بۆ حەمە دیاری بکەن تائەو چەند رۆژەی لێرەیە، دوای چەند رۆژێک کەک شێخ محەمەد شاکەلی و مام عەبدلخالق هەورامی لەئێرانەوە بەنوێنەرایەتی سۆشیالیست و کاکە حەمەی حاجی مەحمود هاتن بۆلای مام جەلال، مام عەبدلخالق زۆری پێخۆش بوو منی لای مام بینی، ئەوکاتە کاک مەلابەختیار گیرابوو لەزینداندا بوو، مام عەبدولخالق هەوالی مەلای پرسی لەمام جەلال، ئەویش بەعەبدولخالق هەورامی ووت پێت خۆشە سەردانی مەلابەختیار بکەیت، هەورامی لەوەلامدا ووتی ئەگەرشتێکی دلخۆشکەرت لەدلایە بۆی برۆم سەردانیشی بکەم و پێیشی بلێم ئەوە ئەڕۆم، ئەگەر هەر سەردانی ئاساییێت نەوەلا نارۆم. مام ووتی نا ئێستا هەرسەردانی ئاسایی. ئیتر مام عەبدولخالق سەردانەکەی نەکرد.

## با نامەمان نەدڕێنێ و سەردانمان نەکات

ڕۆژێک مام عەبدلخالق لێیپرسیم ئەوماوە لێرە بوویت سەردانی کاک نەوشیروانت کردووە ووتم نەوەڵا، ووتی دەی ئیمڕۆ من و شاکەلی میوانی ئەوین تۆش وەرە بابڕۆین، ووتم باشە بەسەر چاو. چووین هەستم کرد کاک نەوشیروان ساردە لەگەڵ من، لەدڵا ووتم ئەزانێ ماوەیەکە هاتووم و لەلای مامم، نەهاتووم بۆلای ئەم ڕەنگە ئەوە بێت، شاکەلی ومام عەبدلخالقیش هەستیان پێکرد، مام عەبدلخالق ووتی زۆر حەزمان کرد کاکە حەمەمان بینی لای جەنابی مام جەلال حەزیکرد سەردانی جەنابیشت بکات وارێککەوت پێکەوە هاتین، یەکسەر کاک نەوشیروان ووتی: سەردانمان نەکاو نامەمان نەدڕێنێ و فڕێبدات. منیش ووتم کاک نەوشیروان نامەی چی؟ ووتی من نامەم بۆ ناردوویت نامەکە گەیشتوەتە دەستت دوای خوێندنەوەی دڕاندوتەو فڕێت داوە. کاک نەوشیروان کەس نامەی تۆی بۆ نەهێناوم تابیدڕم، ئەوەڕاستنییە، کاک شێخ محەمەد سەیرێکی منی کردو بەچاو ووتی لەسەری مەڕۆ، من بێدەنگ بووم و مام عەبدلخالق ووتی ئێمە ئێستا بۆسەردان هاتووین ئەمە وەرگرن بۆ کاتێکی تر. درەنگ ڕۆیشتبوین خواردنیش نەمابوو، بانگی خەفەرەکەی کرد ووتی هیچ نەماوە، کاک نەوشیروان ووتی هەنگوین و ڕۆنیان بۆ بهێنە، نانمان خواردو من لەدڵی خۆمدا ووتم ڕەنگە قسەی تایبەتیان هەبێت، بۆیە مۆڵەتم لێوەرگرتن و ماڵئاواییم کرد، گەڕامەوە بۆ یاخسەمەر.

بەڕاستی من نامەی کاک نەوشیروانم بۆ نەهاتبوو تابیدڕم، دیارە کاک نەوشیروان لەڕێگەی برادەرەکانی خۆیەوە کۆمەڵە کەمن گلەییم لێیان هەبوو نامەکەی ناردوە، ئەوانیش حەزیان نەئەکرد من دست بەکار ببمەوە، بۆیە جگەلەوەی نامەکەشیان شاردوەتەوەو نەگەیاندوە بەمن، ئەو بێویژدانییەشیان کردووە وتوویانە نامەکەی دڕاندوەو فڕێداوەو جنێویشی پێداوی.

لەڕۆژی١٩٨٦/١/١٩ لەیاخسەمەر خۆم پیشانی مام جەلال داو بانگی کردم، دوای چاکوچۆنی لێیپرسیم تا کەی ئەمێنیتەوە؟ ووتم جەنابت ئەزانی، ووتی: چەند ڕۆژێکی تر لێرە بە، ووتم بەسەر چاو، ئەم چەند ڕۆژە ئەچمە لای مام هادی، بڕۆ دوای سێ ڕۆژی تر بۆ نیوەڕۆکەی وەرە بۆ ماڵی شێخ دارا بۆ مالومە. خواحافیزیمان کرد و چوومەوە بۆ گەڕەدێ.

دوای سێ رۆژ چوومە مالومە بۆ ماڵی شێخ دارا لەوێ مام میوان بوو بۆنانی نیوەڕۆ، دوای نانخواردن پێی ووتم تیپی١١ و تیپی١٥ لێکدراونەتەوە بچۆرەوە وردە وردە تیپی١١ی هەورامان دروست بکەنەوە، نامەیەکی بۆ کاک شەوکەت حاجی مشیر بۆ نووسیم و یارمەتی دامێ بۆ پێشمەرگەکان و پرسی چیتر؟ ووتم نیازی ژنی هێناوە، یارمەتی تایبەتی بۆ ئەویش دامێ. مام ڕۆستەم لای بوو. مام ڕۆستەم پرسی نەبی قادری لە هەورامان ئەناسی؟ ووتم بەڵێ نەبی قادری ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دیموکرات و مەسئولی کۆمیتەی شارستانی هەورامان بوو. مام ڕۆستەم ووتی کاتی خۆی بریندار بووم لە ئێران ئەو هاوکاری کردوم نامەیەکی بۆ ئەنووسم بیدەرێ، ووتم باشە. مام ڕۆستەم قەڵەم و کاغەزی گرت بەدەستەوە، چەند وشەی ئەنووسی و ئەیکوژاندەوە، دواجار ووتی: وەڵا نازانم چی بنووسم. مام جەلال ووتی: کەویستت نامەبنووسی بۆهەرکەس مەتڵەبەکەت چی بوو هەر چەندە کورتیش بێت بینووسەو کۆتایی پێ بهێنە.

من لەوکاتەوە ئەو ئامۆژگاریەم گرتووەتە گوێ، ئەو ڕۆژە ئیتر خوا حافیزیم لە مام و لەکاک داراو جەماعەت کرد، کاک شێخ دارای حەفید پیاوێکی بەڕێزەو نەجیبە. ڕۆژی دوایی لەگەڵ مام هادی هاتینە ئاوایی گاپێڵۆن و لەوێ لەگەڵ تراکتۆرێک کەباری قاچاخی پێ بوو کەووتمەڕێ و بۆ ئێوارەکەی هاتمە ئاوایی پوشینی شارباژێر. جل وبەرگی شاریانەم لەبەردا بوو کەس هەستی نەئەکرد من پێشمەرگەم. کاتێک لەلای تەگەران تراکتۆرەکە هاتەسەر جادەی قیر بکاتە ئەو بەر بۆ ئاوایی کانی سارد مەفرەزەی جاش لە سەرجادەکە بوون ، هاتن تراکتۆرەکەیان ڕاگرت و داوای پارەیان ئەکرد، من دەمانچەشم پێ بوو. کابرا معامەلەی لەگەڵ ئەکردن ئەوەی ئەوان داوایان ئەکرد، ئەم نەیئەدا، بۆیە من پێم ووت کاکە بیاندەرێ من ئەتدەمەوە. جاشەکەپرسی باری تۆیە منیش ساتێک وەستام و ووتم بەڵێ. کابرا شانزە

بیناری داو ڕۆیشتین. لەئاوایی پوشێن من مامەوەو تراکتۆرەکە چوو بۆ کانی پانکە. لەئاوایی پوشێن چوومە ماڵێک خاوەن ماڵ ناوی کاک حەمە سەعید بوو ، شەو مامەوە. کاک حەمەسەعید بەیانی چوو بۆ عەربەت، نامەیەکم دایە بردی بۆ بەیان عیزەت کەئێستا لەهۆڵەندایە. بەیان برادەرم بوو داوام کردبوو بێت و ئۆتۆمبێل بهێنێ بۆئەوەی پێی بچمە ئەوبەر بۆلای دزکەرە.

دوای نیوەڕۆ کاک حەمەسەعید هاتەوەو بەیان و بارزانی برای و ئەنوەری حاجی ئەبوبەکر تەویلەیش لەگەڵیا هاتبوون، ئۆتۆمبێلێکی جێبیان هێنا بووسایقەکەی بەکری ناوبوو، دوای عەسر من سوار بووم لەگەڵیان بەرەو عەربەت. بەدۆڵێکدا بەرەو چەناخ چیان شۆڕ بووینەوە، لەناوەڕاستی دۆڵەکەدا ووتیان تۆ لێرە دابەزە بڕۆ بۆ ئەودیو، ئەودیو ئەم شانە ئەوە ئاوایی خرابەیە لەولاوە ئێمە دێینەوە بەدواتدا و شەو ئەچینە عەربەت و بەیانی ئەتکەینە ئەوبەرەوە. کاتێک لەڕێگەیەکی تولەڕێ و لاپێدا گەیشتمە نزیک سەر شانەکە مەفرەزەیکی جاش لە خوارتر ئۆتۆمبێلەکەیان ڕاگرت و چەند فیشەکێکیان تەقاند بەسەر مندا. بەخێرایی لەسەر یاڵەکەوە خۆم ئاودیو کردو چووم گەیشتمە ئاوایی، لەسەرووی ئاواییەوە چوومە ماڵێکی گەورەوە. حەوشەیەکی گەورەو ڕانەمەڕی تێدابوو، کەیبانووی خاوەن ماڵ خەریکی دۆشینی مەڕبوو. کوڕەکەیان لەلای مزگەوت هاتەوە. دوای چاکیو چۆنی ووتی تۆ کاکە حەمەی حەمە سەعیدی؟ ووتم نا. ووتی: کاکە من پێشمەرگە بووم لای ئەحمەد شاتوانی بەناونیشانی ئەوەی لە بیە ڕەشکە پێشمەرگەکانی لای تۆ تەقەیان لەهەلی کۆپتەرەکە کرد و لەلای کەلۆران کەوتە خوارەوە لەنزیک سەیدسادق.

ووتم بەڵێ ئەوم ، ئینجا حکایەتی ئەوەم بۆ کرد کە لەوسەر یاڵە فیشەکیان پێوە ناوە و ئەو ئۆتۆمبێلەی لێی دابەزیوم گرتویانە. ئەویش ووتی لێرە دانیشە بامن بچمەوە لای مزگەوت، کوڕەکە ڕۆیشت و هاتەوە، ووتی جاشەکان هاتنە ئاوایی ووتیان کەسێک لەدەستیان دەر چووە هاتووە بۆ ئێرە، ئەوانە جاشی حەمەخانی حاجی دارا بون لەوسەر جادە پارە لەقاچاخ چییەکان وەرئەگرن. خەڵکی ئاوایی ووتوویانە کەسمان نەدیوەو ئەوانیش ڕۆیشتوون. شەولەوێ مامەوە، زۆر قەلەق بووم. بەیانی کاتژمێر نۆی بەیانی ئەنوەری حاجی ئەبوبەکری زاوایان هاتنەوە بەدوامداو منیان برد بۆعەربەت.

ووتیان ئێوارە جاشەکان ووتوویانە ئەو کابرا لەگەڵ ئێوە بووە دابەزیوە کێ بوو؟ ئێمەش ووتوومان لەڕێگادا سوار بوو لەوسەرەوە دابەزی وابزانین سەربازی هەڵهاتوو بوو، ئەوان هاتن بۆ ئاوایی، بۆیە ئێمە ئێوارە نەمانتوانی بێینەوە بەدواتدا.

ماڵی بەیان دووکانی هەمبەرگریان هەبوو لەعەربەت. زۆرم حەزلێبوو زۆریان هێنایەوە بۆماڵ ، دوای خۆشۆردن و کراس گۆڕین و نانخواردن ، چوو بوون بۆلای ئەرشەدی محەمەد بەگی پالانیا فەرماندەی سریەی جاش خفیفە بوو، لەسەرپردی قەرەگۆل. پێیان ووتبوو برادەرێک فیرارە لەم پردەوە ئەیبەین بۆ قەرەگۆل. ئەویش ووتبووی خۆم دێم بە سەیارەکەی خۆم ئەیبەم، هاتوو لەژوورێکی تردا دایاننا و هاتن بەمنیان ووت فلانەکەسە خۆی هاتووە چی ئەڵێیت؟ ووتم: بابێت ئاساییە، منی بینی ئەم لاو ئەولای ماچ کردم و ووتی بۆ نەتان وتووە کاکە حەمەیە دۆستی خۆمە. ئۆتۆمبێلی بەرازیلی ڕەنگ سووری پێ بوو لەگەڵ ئەنوەرو بەیان سوار بووین و لەسەر پردەکە چووینە ئەوبەر. حەرەس جەمالی برزوبەگ پالانەیی بوو، هەرئاگای لێ نەبوو ئێمە تێپەڕمان کردو لە ناو ئاوایی قەرەگۆلەوە تاپشتی ئاوایی نەمەڵیان بردم. لەپشتی دزکەرەوە چوومە سەرجادەی دزکەرە-ئاوەکەڵە. لەوێ ئۆتۆمبێلکەی کاک شەوکەتی حاجی مشیر لەگەڵ سایقێک و دوو پێشمەرگە کەعوسمانی سۆفی حەمە کەریمیان لەگەڵ بوو وەستا بوون بۆ بەنزین وەرگرتن. لەگەڵیان سووار بووم بۆئاوایی بەلەکەجار بۆ مەڵبەند.

کەچووینە ئەوێ کاک شەوکەت زۆری پێ خۆش بوو نامەکەی جەنابی مام جەلالم دایەو ڕێک کەوتین کەمن بچمەوە بۆ هاوارو لەوێ بەناوی بنکەی شنروێ وە وردەوردە تیپی یانزەی هەورامان دروست بکەینەوە. دوای تەشکیلاتی هەرێم و لقەکان یەکێتیی تەشکیلاتی گۆڕیبوو، مەڵبەندو تیپەکانی دروست کرد بوو تیپی ١١ی هەورامان ئەویەکە سەربازیە بوو لەسنوری هەڵەبجە، هەورامان و شارەزوور یەکەم سەرتیپی شەهید شەوکەتی حاجی مشیر بوو، دواتر مەحمودی حاجی فەرج و مەحمود سەنگاوی تاساڵی ١٩٨٤ ئەو تیپەیان بەڕێوە برد دوای ئەوەی من ماوەیەک دانیشتم لەهاوارە کۆن تیپی ١١ی هەورامان لەگەڵ١٥ی شارەزوور تێکەڵ

کرانەوەو ناونران تیپی ١٥ی هەورامان، فەریدون حەمەساڵح پێنجوێنی سەرتیپی بوو.

لەساڵی ١٩٨٥ بەدواوە ئێمە بەڵێنماندا لەسەربڕیاری جەنابی مام جەلال و مەڵبەندی یەک، دووبارە تیپی١١ی هەورامان دروست بکەینەوە سەرەتا بنکەیەک دروست بکەین بەناوی بنکەی شنروێ، کردمان کەپێک هاتبوو لەوپێشمەرگانەی کەلای ئێمە بوون لەگەڵ ئەوانەی کە لەتیپی شارەزوور مەیلیان هەیە لەگەڵ ئێمە ئیش بکەن.

بنکەکە دروست کراو سنوورەکەی هەمان سنوری تیپی ١١ی هەورامانی پێشتر بوو ، نیازی ڕۆیشتە مەڵبەندو بوو بەلێپرسراوی کۆمەلایەتی لەناوچەی قەرەداغ ، منیش بووم بەفەرماندەی بنکەکە ، سەرەتا بەژمارەیەکی کەمەوە، دەستمان کرد بەچالاکی کردن لەسنوورەکەدا و وردە وردە تیپەکەمان دروست کردەوەو بووەوە بە بەهێزترین تیپ، هەم لەڕووی چۆنایەتی و هەم چەندایەتی پێشمەرگەوە لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٦وە بنکە و بارەگامان دانا لە ناو هاوارە کۆن، گریانە و بۆیندا دەستمان کردەوە بەچالاکی لەسنوورەکەدا. سەرەتا پێکهاتەی بنکەکە بەم شێوە بوو.



لەگەڵ کۆمەڵێک پێشمەرگەی قارەمان کەنزیکەی ٣٠ سی کەس بوون، بەشێک لەو تێکۆشەرانە شەهید بوون، لەوانە: شەهیدان ئیبراهیم بۆینی، کەیکاوس کۆکۆیی، نەوشیروان تەپەکورەیی، حەمەنەزیف خەرپانەیی، ئەنوەر حاجی عوسمان، مەهدی حەمەسەعید، کۆسار حەمەسەعید، غەفار فایق،......



لەو ماوەیەدا کە تەشکیلاتی بنکە کرا، مەفرەزەکان وەک پێشبڕکێ کەووتنە چالاکی کردن، کەیکاوس کۆکۆیی بارەگای کردەوە لەبۆین و ئیبراهیم ڕەشید کەرەم وەیس و هاشم بۆینی لەگریانە و مەهدییە بچکۆل لەهاوارە کۆن لەگەڵ بارەگای بنکەدا. لەگەڵ بەشێک بەناوی کۆمەڵایەتی بۆ بەرێکردن و ڕاپەڕاندنی ئیشوکاری خەڵک لەسنوورەکەدا.

یەکێتیی نیشتمانی لەشاخ بۆ بەرێکردنی ئیشوکاری ئەوگوند نشینانەی کە لە ژێردەستی پێشمەرگەدا بوون ئەنجومەنی ئاوایی دامەزراند بوو، یان ئەو هاوڵاتیانەی هەتا لەژێر دەستەڵاتی شۆڕشدا نەبوونوو لەشارو شارۆچکەکاندا سکا لاوە داوایان ئەهاتە لای پێشمەرگە یان ئەگەر لەئاواییەکاندا کێشەیەک بە ئەنجومەنی ئاوایی چارەسەر نەکرایە کۆمەڵایەتی وەک ئۆرگانێک لەتەشکیلاتی پێشمەرگەدا کێشەوگرفتەکانی چارەسەرئەکرد.

ئەنجومەنی ئاوایی جگە لەئیشووکاری ئاسایی ئاواییەکە ئیشی پێشمەرگەشی ئەکرد وەک دامەزراندنی پێشمەرگە بەسەرماڵاندا بۆ نانخواردن، ئامادەکردن و دیاری کردنی خانوو بۆ خەووتن، دانانی سەرە بۆ تراکتۆر یان وڵاخ، یان ئامادەکردنی شارەزا بۆبردنی پێشمەرگە لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکیتر بەتایبەت لەو شوێنانەدا کە شارەزا نەبوونایە. گوندەکان زۆر ماندوو بوون لەگەڵمان جگە لەئەرکی شۆڕش لەسەرشانیان بوو،بەردەوام لەبەردەم هەڕەشەو مەترسی ڕژێمی بەعس وسەدام دابون، بەدرێژایی مێژووی شۆرش گوندنشینان بۆ چەندین جار ئاواییەکانیان

سووتاوە، مەزراو باخ و بێستانیان بڕاوە وئاگریان تێبەردراوە، چەندین جار ئاوارەو دەربەدەر بوون و دووبارە نیشتەجێ بوونەتەوە. مەحمودبەگی بەڵخە لەتێکۆشەرە دێرینەکان بوو، پیاوێکی قسەخۆش بوو لەمبارەوە لە ساڵی ٢٠٠٦دا سوێندی ئەخوارد ئەیووت لەساڵی ١٩٦٢وە تائێستا من لە لۆقە نەنیشتومەتەوە.

جەماوەری سنوورەکە و دۆستان و ئەندامانی ی.ن.ک هاوکاری باشیان کردین لەڕێنوێنی کردن و پێدانی زانیاری و ژمارەیەک گەنج بوونە پێشمەرگە. لەتیپی ١٥ی شارەزووریشەوە کۆمەڵێک فەرماندەو پێشمەرگە کەپێشتر لەتیپی ١١ی هەورامان و لای خۆمان بووبوون خۆیان گواستەوە و هاتنەوە بۆ بنکەی شنروێ، لەوانە ئەکرەم ئەحمەد و تەحسین بیارەیی، ڕێگەی هاتوچۆی ئێمە بۆ دەشتی شارەزوور لەهاوارە کۆنەوە بەهەموو چۆمێکدا بۆناو هاوار و لەوێشەوە بۆ تاوێرە و بەتەنیشتی دەرەشیشدا بۆئاوایی تەپەکورە، رەبییە و مۆڵگەی عەسکەری عێراق و جاشی لێ بوو، بۆیە ئەبوو بەشەودا ئەو سنوورە ببڕیت، ئەتوانرا لەنێوان هاوار و تاوێرەیان تاوێرە و ئاوایی دەرەشیشدا بەڕۆژ بمێنیتەوە، بەڵام چۆڵەوانی و ناوچەی محەرەمە بوو، لەتەنیشت ئاوایی دەرەشیشەوە دووبارە رەبییە و سەربازگەی عەنەب هەبوو بۆیە ئەبوو لەوێشەوە بەشەو تێپەڕیت تا بگەیتە ئاوایی تەپەکورە.

تەپەکورەش یەکەم دێ بوو لەبناری شارەزووردا پێی ئەگەشتی کە لەهەڵەبجە و هەورامانەوە شۆڕبیتەوە بۆدەشت، لەدوای ڕاگوێزانی ئاواییەکانی سنوور ساڵی ١٩٧٩ مابووەوە. ڕێگای دووەم لەدوای تێپەڕبوون لە کەلاوەکانی ئاوایی هاوار و ئەو رەبییە و سەربازگەی دوژمن کە لەهاواردا چێ کرابون، بەدووری یەک کیلۆمەتر بەدەربەندێکی سەخت و قووڵ و هەورازدا بەناوی دەربەندی ئەشکەهۆڵ ئەهاتیتە سەر ملەی ئەشکە هۆڵ و لەوێوە شۆڕ ئەبویتەوە بۆناو ئاوایی عەبابەیلێ یان جەلیلە یان بامۆک، لەوێشەوە بۆ ناوشار ئەم ڕێگا ئەبوو هەموو بەشەودا تەی کەی.

لەدوای چەندین جار هاتووچۆ لەم ڕێگایانەوە، ڕژێم رەبییەی سەربازی هێنایە سەر چۆمی هاوار لەناو قەبرستانەکەی هاواردا لەجێگەیەکدا بەناوی میر ئەسکەندەر چێی کرد، ئیتر ئێمە نەمان ئەتوانی لەم ڕێگایانەوە هاتوچۆ بکەین. ڕێگای ترمان هەبوو، بەڵام زۆر سەخت و هەوراز و دوور

بوو، ئەویش لەهاوارە کۆنەوە سەر ئەکەوێتە سەر چیای شنروێ، لەبەردەم ڕەبیەکانی چادرگە بەفری میریەوە ئەهاتینە سەر کانی و ئاوی وەزگێل، لەوێوە ئەهاتینە سەر ڕێگای دەربەندی ئەشکەهۆڵ ئەمەش دوور و درێژ و ئەبوو هەمووی بە تاریکایی شەو ببڕیت.

مەحمودی حەمە تاهیر بەگ کادری کۆمیتە شارستانی حیزبی دیموکرات، لەئاوایی چۆڵکراوی دەرەتفێ کەدیموکرات ئاوەدانی کردبوەوە دائەنیشت، دواتر لەئێراندا گیراو لەسێدارە درا، گوایا ناوبراو ئاگاداری مخابەراتی عێراقی کردووە کەهات و چۆی ئێمە لەم ڕێگەوەیە واتەڕێگای یەکەم، بۆیە عێراقیش ڕەبیەی لەسەر ڕێگاکە داناوە. تا لەم کاتەشدا موجاهیدینی خەلک سەربازگەیان لەهاوار دانا بوو، لەگەڵ حیزبی دیموکرات نێوانیان باش نەبوو، هەتا حیزب نەیدەهێشت ئەو قاتر چیانەی کە دۆستیانن باری مجاهیدین لەهاوارەوە بۆ شۆشمێ و نەوسوودیان شێنێ و قەلاگا بگوازنەوە.

ڕۆژێک چوومە ئاوایی دەرەتفێ بۆلای کۆمیتەی شارستانی هەورامانی حیزبی دیموکرات، لەلای نەبی قادری و سەید ڕەزای پاوەیی گلەیم لێکردن وتمەحمود بەگ خەبەری داوە بە مخابەرات ڕێگەی ئێمەیان گرتووە، ئەوانیش وتیان ئێوە چەندین ساڵە لەم سنوورە هاتوچۆ ئەکەن هیچ کارێک لەدەست هەڤاڵانی ئێمە رووی نەداوە ئەو هەواڵە مجاهیدین کەیاندوویەتی، منیش پێم وتن ئەگەر ئەوان بن لەم سنوورە دەریان ئەکەین.

بنکە لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٥وە بەردەوام لە کار و چالاکیدا بوو تا کۆتایی ١٩٨٧، لە کار و چالاکیەوە هاوشانی تیپیکانی تری یەکێتیی بوو، لە ڕوی ژمارەی پێشمەرگەشەوە بوبووینە نزیکەی ١٢٠ پێشمەرگە، دوای ئەوەی لە ١٩٨٧/٥/١٣دا ڕاپەڕینی خەلکی هەڵەبجە ڕوویدا جەماوەرێکی زۆر ڕوی لە ئوردوگاکانی ئێران کرد، ژمارەیەکی زۆر لاوی خوێن گەرمی تازە پێگەیشتوش پەیوەندییان پێوە کردین و بوونە پێشمەرگە. دوای ئەوە لە مانگی ٧ی ١٩٨٧دا هەڤاڵان قادر کۆکۆیی و جەمیلی مەلا مستەفا و نزیکەی ٢٥ کەسی تر لە ئێران گەڕانەوە و هاتنەوە بنکەی شنروێ بۆ هاوارەکۆن.

لەمانگی٦/ ١٩٨٧دا لەهەورامانەوە چوومە قەرەداغ بۆ مەڵبەند، دوای کۆبوونەوەیەک بڕیار درا بنکەی شنروی بکرێتەوە بەتیپ، کەگەڕامەوە کاک

شێخ جەعفەر بەرپرسی عەسکەری مەڵبەند و عەلی شێخ حەمەساڵحش هاتن بۆ هەورامان بۆ تەشکیلاتەکە، تەشکیلاتی بنکە گۆڕا بۆ تیپی ١١ی هەورامان. لە کۆتاییی مانگی ٨ی ١٩٨٧دا بە بۆنەی دووبارە تەشکیل کردنەوەی تیپی ١١ی چالاکییەکی سەرکەوتوانە ئەنجام درا کە گرتنی دوو ڕەبییەی سەر چیای پشتی گوندی کۆساوا بوو لە نزیک دەشتی سازان بەسەرپەرشتی کاک قادر کۆکۆیی، لەم چالاکیەدا چەندین دیل و چەک و چۆڵە دەسکەوت بوو.

لە ڕۆژی ١٩٨٧/١٠/٢٠دا بەشێکی هێزەکە لە هەورامانەوە کەوتە ڕێ بەرەو قەرەداغ کە نزیکەی ٦٠ پێشمەرگە بوون بە فەرماندەیی قادر کۆکۆیی چونکە لەوسەرو بەندە دا زۆربەی هێزەکانی قەرەداغ و گەرمیان چوو بوون بۆ شەڕەکانی دۆڵی جافایەتی و سەرکردایەتی، ئەم هێزەی تیپی ١١ی هەورامان لەگەڵ تیپی ١٧ی زمناکۆ کە جەمیل هەورامی فەرماندەی بوو لە شەڕی کانی سارد و چەمەرگەدا هێزی ڕژێمیان شکاندو بەریان بەو هێرشە گەورەیە گرت کە لە دەربەندی خانەوە دەستی پێکردبوو بەرەو قەرەداغ. مەهدی حەمەسەعید مەهدیە بچکۆل فەرماندەی کەرتی ٢ی تیپی ١١ی هەورامان لە کتێبی پیاوێک لە لووتکەی مەردایەتی لە لاپەڕە ٢٢-٢٣دا دەقی چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی لە بارەی ئەو شەڕەوە ب لاوە کراوەتەوە

# بەدیل گرتنی سێ ئەفسەر

لە مانگی ١/ ١٩٨٥دا پاش نیوەڕۆیەک پێشمەرگەیەک بە ناوی سەردار شەوکەت بە بێ چەک بۆ کات بەسەر بردن لە بارەگاکەی هاوارەکۆن بەرەو هاوار دوور کەوتبوەوە تا گەیشتبووە نزیک هاوار هاوار سەربازگەی عێراقی لێبوو، لەوێ لەجێگەیەکدا بەناوی (هەواسوەشڵە) سەر ئەکەوێتە سەر سەخت و بەرزییەک بۆ لێکردنەوەی گیای بەرەزا، بەرەزا گیایەکی سروشتی و لە ناو سەخت و بەرددا سەوز دەبێت وەک دەرمان بۆ بەردی گورچیلە بەکار دێت، کاتێک سەیری خوارەوە دەکات ئەبینێ سێ ئەفسەر و سەربازێکی عێراقی لە بن بەردەکەدا لە خوارەوە بانگی ئەکەن، پێی ئەڵێن ڕێگای ڕەبییەکانی بەننەن لە کوێوە ئەڕوات؟ ئەویش دێتە خوارەوە چاک و چۆنیان لەگەڵدا ئەکات و ئەڵێت هەر ئەم ڕێگایەیە کە لێیەوە هاتوون، سەردار ئەیەوێت بەهەڵە بیانهێنێت بۆ هاوارە کۆن، چونکە ئەزانێ سەربازەکان لەدووریانی هاوارەکۆن درەتفێ بۆبەننەن بەهەڵە لەخوارەوە هاتوون. لێی ئەپرسن تۆ چکارەیت؟ ئەویش ئەڵێت من سەربە ئۆپۆزسیۆنی ئێرانیم، داوای لێ ئەکەن کە پێشیان بکەوێت سەرداریش هێنابوونی بەرەو هاوارەکۆن.

عەسری ئەوڕۆژە کاتێکمان زانی خەڵکی ئاوایی بانگی ئێمە ئەکەن ئەڵێن ئەوە عەسکەر بەرەو ئێرە دێن، ئێمەش خۆمان کۆکردەوەو لە دوولاوە بەرەو لایان ڕۆیشتین، ئەوانیش زیاتر نزیک بوونەوە، بۆمان دەرکەوت و زانیمان ئەوە سەردارە پێشیان کەوتووە، لەگەڵ زیاتر نزیک بوونەوەمان سەردار ئێمەی تێگەیاند کە بە فێڵ هێناونی، ئەوانیش لەوکاتەدا بە سەرداریان وتوە ئەو چەکدارانە کێن؟ پێی وتوون ئەوە پێشمەرگەی حیزبی دیموکراتن، کاتێک بەیەک گەیشتین ئەوان دانیشتبوون بۆ پشوودان ئێمەش لەگەڵ سەردار وتووێژ ئەکەین، ئەوان کەوتنە گومان و ئێمەش میلی چەکمان لێ ڕاکێشان. سێ دەمانچە و کلاشینکۆفێک و هەندێک فایل و نووسراویان پێبوو لێمان سەندن، ئنجا تێمان گەیاندن کە ئێمە پێشمەرگەی (ی.ن.ک) هەر ئەو ئێوارە بردنمان بۆ بارەگای گرییانە، لە ڕێگەدا یەکێک لە ئەفسەرەکان

دەمانچەکەی بەمن بوو وەوتی: ئاگاداربە فیشەک لە پێشەوەیە، کاتێک فیشەکەکەم دەرکرد پێم ووت: بۆچی فیشەکت لەپێشەوەیە؟ ووتی: وەڵا لە ورچ ترساوم.

دوای لێکۆڵینەوە بۆمان دەرکەوت ئەمانە لیژنەن ئەگەڕێن بەسەر سەربازگە و رەبییەکانی ئەو سنوورەدا سەبارەت بەخۆ پاراستن لە چەکی کیمیاوی دەرس ئەڵێنەوە بەو سەربازانەی کە لە بەرەکانی پێشەوەی جەنگی عێراق و ئێراندان. لە هاوار بوون ویستویانە بچنە سەر شاخی بەندەنی پەروونی بەڵام بە هەڵە لە ڕێگەی سەرکی لایانداوە و توشی سەردار بوون، ئەویش بەم دەردەی بردن، سێ ئەفسەرەکە خەڵکی موسڵ و یەکێکیان دکتۆر و یەکێکیشیان کوردی شەبەک بوو، دواتر پێی ووتین کاتێک ئێوە گەیشتنە لامان لەگەڵ سەردار بە هەورامی قسەتان کرد من زانیم و تێگەیشتم کە تازە تووشی چی هاتین، ماوەیەک لامان مانەوە قسەی زۆرمان بۆ کردن لەسەر درندەیی سوپای عێراق و سیاسەتی هەڵەی بەعسیەکان، بە حیسابی خۆیان ئەوانیش لە ئێمە زیاتر ناڕازین لە ڕژێم بەڵام دەستەڵاتیان نییە.

# چەککردنی موجاهیدین

لەبەهاری ساڵی ١٩٨٦ دا ئێوارەیەک حەمە هاواری و شەهید نیازی لەهاوارە کۆن نەبوون و چووبون بۆ ئاوایی دەرەتفێ بۆلای دۆست و ناسراویان لەحیزبی دیموکرات، منیش مەفرەزەیەکم لەگەڵ خۆم بردو سەر لەئێوارە دەرچووین و نزیکەی کاتژمێر چواری دەمەو بەیان خۆمان گەیاندە ئەو ئەشکەوتەی نزیک ئاوایی تاوێرە. لەبارەگاکەدا مەهدی مایەوە، ووتم: هەرکەس هەواڵی ئێمەی پرسی بڵێ چوون بۆ ئاوایی بۆین.

ئەشکەوتەکە زۆر نزمەو ئەکەوێتە تەختایی کەنار ڕێگای تاوێرە-هاوار لەدەستە ڕاستەوە بەدووری ٥٠٠م، شارەزا نەبێت کەس بەو ئەشکەوتە نازانێ چونکە وا هەڵکەوتووە، زاری ئەشکەوتەکە نزم و ڕووی کردۆتە چیای دۆڵەڕەش. سەر لەبەیانی هەوا ڕووناکی کردەوە و هەموو ڕاکشا بووین بخەوین، پێم ووتن یەک کەس حەرەس بێت و ئەویش هەر لەژوورەوە لەئەشکەوتەکەدا دانیشێ، نزیکەی کاتژمێر ٨/٣٠ هەشت وسی خولەکی سەرلەبەیانی حەرەسەکە خەبەری کردمەوە، پرسیم چییە؟ بەدەنگێکی هێواش و بەپەنجەی ئاماژەی کرد بۆچیای بەرامبەر ئەشکەوتەکەو ووتی ئەها ئەوە دوو چەکدارە خەریکی سەنگەر بەستنن ڕووبەڕووی ئێمە.

دوای ورد بوونەوە بینم ڕاستە، پێشمەرگەکانم بەخەبەرکردنەوە ووتم خۆتان ببەستن و ئامادەبن، بامن بچمە دەرەوە سەیری تەختایی پشتی ئەشکەوتەکە بکەم بزانم دەنگو باس چییە. من چەکەکەم بەدەستەوە گرتوو دامە پشتی خۆم و هاتمە دەرەوە. بینیم وا چوارکەس لەبنارەکەوە واتە لای دوو چەکدارەکەوە بەرەو تەختایی پشتی ئەشکەوتەکەو بۆسەر جادەکە دێن. لێیان ورد بوومەوە یەکێکیان چەکدارو سێ بێچەکن، یەکێکیان کۆڵێکی داوە بەکۆڵدا، ئەمە بەهارێکی درەنگە گژوگیا هاتووە.

کەمێک نزیک بوونەوە زانیان من چەکم پێیە یەکێک لەبێ چەکەکان هەڵگەڕایەوە و چەکەکەی لەدەست چەکدارەکە وەرگرت، دیارە ئەوە منی

ناسیوە، لەدڵی خۆمدا بەتەمام کەمێکی ترهاتنە پێش دەنگیان بدەم تا چەکەکە دابنێن، کەنزیکتر بوونەوە سەیر ئەکەم وریای حاجی فەرەجی زەڕەیە، چەکەکەی لەچەکدارەکە سەندوەو کردیە شانی خۆی، وردە وردە نزیک بوونەوە، منیش بە گاڵتەوە ووتم وریا یان تفەنگەکەی بەرەوە یان تاقمەکەشی لێوەرگرە.

وریا بە پێکەنینەوە ووتی: ئەوە تۆی چی ئەکەی لێرە؟ دوای چاکوچۆنی پێم ووت ئێوە بۆگەشتوونەتە ئێرە؟ وریا ووتی: جەماعەتی ڕێگاو بانین، ڕێگای عەسکەری لەشنروێوە ئەبەینەوە بۆلای بەنەنی بەڵخە، ئەمە ئەندازیارە، خزمی کاک عومەر فەتاحە. ئەوی تریش ڕەحیم بوو کەناسراوە بە ڕەحیمی ماڵی شێخ کەمالی عەبابەیلێ، ئەوی تریش جاش بوو لەگەڵ ئەو دوانەی لەوبەرەوە خەریکی بەستنی سەنگەرن، پاسەوانی ئەندازیارەکەو وریان. ئەندازیارەکە ناوی محەمەد عەبدوڵلابوو. کاک حەمەی ئەندازیار ئێستە دۆستێن و ئەندازیاری ڕێگای جووت سایدی هەڵەبجە بۆ سەراوە، دوای ٢٦ساڵ یەکمان بینییەوە.



دوای کەمێک قسە کردن وریا ووتی ئەو کەلوپەلە بۆ ئێوەو بائێمە بگەڕێنەوە، منیش پێم ووت مەگەڕێنەوە، من ئەچم ئێستا لەم باخانەدا خۆمان ون ئەکەین ئێوە ئیشی خۆتان بکەن. ووتی نەخێر ئەڕۆین، لەو دوکەسەی سەرەوە ئەترسم دوایی تووشی کێشەمان ئەکەن. کەلو پەلەکەی دانا کە نان و تەماتە و مریشک و هەندێ شتی تر بوو، زوو ئەوان گەڕانەوە چاوم لێبوو گەشتنە *لای دوو کەسەکە و ئەوانیشیان برد و لەچاو ون بوون. منیش کوڵەکەم برد بۆ* ئەشکەوتەکە و جەماعەتم بردو لەوێ نەماین و دوور کەوتینەوە بۆ جێگەیەکی تر.

ئێمە بۆ ئەوە هاتوین بەتەماین بۆسە دابنێن بۆ موجاهیدین کە لە هاوارەوە هاتوچۆ بۆ هەڵەبجە ئەکەن چەکیان بکەین، کاتژمێر ١١ی

سەرلەبەیانی ئۆتۆمبێلێکی میک زەمینی سپی لەهەڵەبجەوە هات بەرەو هاوار، خەلیل ڕێشاوی یەکێک لەپێشمەرگەکان بوو ووتی زووە بابڕوات بۆ هاوارو لەوسەرەوە ئەگەڕێتەوە ڕێگەی لێ ئەگرین چونکە ئێستا زووە، ئەگەر ببێت بەتەقە ڕەببییەکان نزیکن شپرزمان ئەکەن، ئەگەر دوای نیوەڕۆ بێت تەقەش دروست بێت کات تێپەڕیوە باشترە بۆ ئێمە، وامان کرد و نانمان خوارد و خۆمان ئامادەکرد.

بۆلای عەسر گەڕانەوە، خەلیل لەبەردەم جادەکەدا و هاشم لەپشتی جادە و من و سەلاح عەزیز لەسەر جادە، والی حەمە ڕەشید و حەمە نەزیف کەریم خەرپانەیی لە دوورەوە پاسەوانی ئێمە دەکەن. لەبەردەم کەلی هەیشووردا لەو شوێنەدا کە شۆڕ ئەبێتەوە بەڕووی ئاوایی تاوێرەدا کەمینمان گرت، کاتێک گەشتنە لامان، لەناکاو من و سەلاح بەردەم ئۆتۆمبێلەکەمان گرت، خەلیل و هاشم دایان لە میلی کلاشینکۆف و ووتیان چەکەکانتان دابنێن، ئەوانیش بەشڵەژاوی لەدوای ئۆتۆمبێلەکەوە شەش کەس خۆیان فڕێ دایە خوارەوە.

هەر شەش چەکدارەکە زۆر گورج و گۆڵ و خۆیان شەتەک داوە بەتاقم و فیشەکی زۆرو رومانە و جیهازی بچوکی دەستی و.... ووتیان ئێوە کێن؟ چەکەکانتان دانێن، ئێمە ئەمان ویست تەقە نەبێت و چەکیان کەین ونەشیان کوژین، ئەوانەی پێشی ئۆتۆمبێلەکەش کەشۆفێرەکەو بەرپرسەکەیان بوو دابەزین، ئێمە پاشە و پاش لێیان دوور کەوتینەوە، هەموویان کاراتە باز بوون، شێوەی هاتنە خوارەوە و ب لاوە بوونەوەیان چاو تروکانێک بوو.

تازە تووش بووین ناتوانین چەکیان کەین، پێمان ووتن سواربن و بڕۆن، ئەوان ووتیان ئێوە بڕۆن و ئەم سەرڕێگا چۆڵکەن، ووتمان ئێمە بۆ کوێ بڕۆین، ئێوە سواربن بڕۆن، ووتیان ئێوە کێن؟ ئێمەش خۆمان هەڵەکردو ووتمان ئێوە کێن؟ وەرەقەیان دەرهێناو مۆری موجاهیدینی لەسەر بوو ووتیان ئێمە موجاهیدینین، ووتمان ئێمەش پارتین، ووتیان ئێمە لەگەڵ پارتی کێشەمان نییە و چەند جنێوێکیان بەفارسی بە مام جەلال دا.

دوای مشتومڕێکی تر ئەوان سوار بوون بڕۆن، منیش بەعەیبەم ئەزانی بڕۆن و چەکیان نەکەین ئەمزانی دەنگوباس ب لاوە ئەبێتەوە ئێمە نەمان توانیوە چەکیان کەین، بۆیە بەمەسئولەکەیانم ووت ئەمەوێت بەنهێنی

قسەت لەگەڵ بکەم، ووتی فەرموو، ووتم دابەزە کەلەئۆتۆمبێلەکە هاتەخوار قۆڵم کرد بەقۆڵیدا و لەئۆتۆمبێلەکە دوور کەوتینەوە پرسیم تۆ ناوت چییە؟ ووتی من عەلی تەبرێزیم، کوڕێکی بالآبەرز و کوڵە باڵێکی لەبەردا بوو کلاشینکۆفێکی مزەلی سینی پێ بوو، وابزانم لەخۆیەوە ئەو ناوەیدا ناوی حەلی نەبوو. ئەو چەکەکەی لەشانیدا بوو، منیش تفەنگەکەم بەدەستی ڕاستەوە گرتووە، فیشەک لەپێشەو ئەمن ترازاوە، بەدەستی چەپ قۆڵم کردوە بەقۆڵیدا، لەناکاو لوولەی چەکەکەی خۆم خستە سەر نباگوێی و ووتم: پێیان بڵێ یەک یەک بێچەک دابەزن، لەوکاتەدا خەلیل و هاشم وەک دوو پڵنگ لەپشتی ئۆتۆمبێلەکەوە بەجووتە دایان لەمیلی چەکەکانیان و ووتیان هەر بجووڵێنەوە ئەتان کوژین. کابرای لای منیش هاواری ئەکرد ئاغا نەزەن ئاغا نەزەن.

هاواری کردو پێی ووتن بێچەک دابەزن، چەکەکانیان یەک یەک هەڵدایە خوارەوە، خەلیل دەستی لەکاردایە و هاشم چەکەکان فڕێ ئەداتە بەرجادە، هەرشەشییان چەک کرد، ئەمیش شانی شل کرد و مزەلیەکەی لە شانیدا کەوت، هاشم هات و ئەویشی هەڵدایە لای ئەوانی ترو منیش کابرام بەردا. سەلاح عەزیز دەمانچەی بەرپشتێنی شۆفێرەکەی دەر هێنا، ئینجا والی هات و چەکەکانی کۆکردەوەو دووری خستنەوە، یەکێکیان خەریکی دەستکاری کردنی نارنجۆک بوو ئەویشیان لێ سەند، سەرجەم حەوت کلاشینکۆف و یەک دەمانچە و یەک دووربین و چەندین نارنجۆک و دوو جیهازی بچووکمان لێ سەندن، تاقمەکانمان لێ نەکردنەوە، قورس بوون بۆمان نەئەبران، زوو بەهەڕەشەو گوڕەشە سواری ئۆتۆمبێلکەمان کردنەوەو ووتمان خێراکەن بڕۆن ئەگەرنا ئەتانکوژین، ئەوانیش ئینکارییان ئەکرد و ئەیان ووت ناڕۆین ئەبێ چەکەکانمان بدەنەوە. خەلیل دەست ڕێژی گوللەی بەسەردا کردن و شۆفێرەکە پێی لێ داگرت و لەچاو ون بوون، ئەگەر بەو جۆرە نەبوایە بۆمان چەک نەئەکران، ئێمەش چەند سەد مەترێک لە جادە دوورکەوتینەوە و بەهەورازێکدا سەر ئەکەوتین، ئۆتۆمبێلێک لەهەڵەبجەوە هات خۆمان پەنادا تالێمان تێپەڕی، بینیمان شێخ ئەنوەری شێخ فەرەجی عەبابەیلێیە، جەماعەتی حیزبی دیموکراتی پێیە. بەرەو هاوار ڕۆیشت، ئێمەش هەستاین و هەورازتر بووینەوە، کاتێک نزیکی دەم کەل بووینەوە کاتێکمان

زانی ڕەوە بەرازێک دەرچوون بەرەو ئێمە دێن، لەدواوە تەقە ئەکرێت لێیان، گوللەکان لەناو جەنگەڵەکەدا ویزو هوڕیانە بەم لاو بەو لاماندا، لەوێدا نازانم چۆن بەرێکەوت بەرنەکەوتین.

ئەوە جاشی ڕەبیەکانی ئەشکەهۆڵ بوون ئەو ڕەوە بەرازەیان دەرکردووە و تەقەیان کردووە بەدوایاندا، لەوێ خۆمان حەشاردا تا تاریکی کردو گەڕاینەوە بۆ هاوارە کۆن. شەو لەنزیک هاوارە کۆن چەکو چۆڵەکەمان شاردەوەو خۆمان کرد بەماڵدا و لێی خەوتین.

بەیانی ڕۆژ هەڵهات بەدەنگە دەنگی چەند ولاخدارێک بەخەبەر هاتین، من گوێم رادێرا ئەزانم بۆ خەڵکی تریان باس ئەکرد، ئەیان ووت چووینە هاوار عەسکەری عێراق و موجاهید خەریک بووە بمان کوژن، چونکە دوێنێ موجاهیدەکانیان چەک کردووە. بۆ ڕۆژی دوایی نوێنەری حیزبی دیموکرات هاتن بۆ لامان ووتیان ئێوەچەکتان کردوون؟ عێراق هەڕەشە لەئێمە ئەکات داوای چەکەکانمان لێ ئەکەن، ئێمەش پێمان ووتن ئێمە ئاگامان لێ نییە و ڕۆشتنەوە، دوای چەند ڕۆژێکی تر دایکی شەهید فەیسەڵ مەلا عەلی هات کە موجاهیدین نارد بوویان، لای ئەویش ووتمان ئێمە نین ئاگامان لێی نییە.

دواجار موجاهیدین نامەیەکیان ناردووە بۆمن و لەنامەکەدا دوای هەڕەشە و گوڕەشەیەکی زۆر نووسیبویان (مزدور خمینی ان اسلحها برای ما چیزی نیستند ولی بدانید ماحکومت ایندەی ایران هستیم) واتە: بەکرێگیراوی خومەینی ئەوچەکانە بۆ ئێمە هیچ نین، بەڵام ئەوە بزانە ئێمە حکومەتی ئاییندەی ئێرانین. پاش ماوەیەک موجاهدەکان بنکەکەیان لەهاوار چۆڵکردو چوونە سازان، لەوێش یەک هەفتە مانەوە گولە هاوەنێکی ئێران هات و خەیمەیەکیانی کردە ئامانج و چەند کەسیان کوژران، لەوێش نەمان و ڕۆیشتن و سنوورەکەیان چۆڵکرد.

## مخابەراتی عێراق ئێمەی ناردووە

لەمانگی ٦ی ١٩٨٦دا سەر لەبەیانییەک لەسەر کانی و ئاوەکەی ئاوایی قەڵای هاوارەکۆن کاتێک لەبندارگوێزەکاندا لەشیرینی خەوێکی خۆشدا بووم، پێشمەرگەیەک بەخەبەری هێنامەوە، پرسیم ها چییە؟ ووتی ئەم پیاوە لە ئاوایی ڕێشاوەوە هاتووە ئیشی بەتۆ هەیە، ئەڵێت ئیشەکەشم پەلەیە بۆیە بەخەبەرم هێنایتەوە. کام پیاو کوا؟ ئەوەتا لەسەر بەردە نوێژەکەی[1] سەرکانی دانیشتوە. دوای هەستان و خۆکۆکردنەوە، ووتم برۆ بانگی بکە بابێت، س لاوە بەخێر بێیت، دوای چاک و چۆنی و بەخێر هێنان ووتم فەرمووو؟ ووتی حەزئەکەم کەمێک بچینە ئەولاوە، بەڵێ باشە، کەمێک لەمەنزڵەکە دوورکەوتینەوە، بەرلەوەی شتێک بڵێ سەیرم ئەکاو کەئەیەوێ شتێک بڵێت قسەکە ئەخواتەوە، ئینجا بەڕاست و چەپی خۆیدا سەیرێکی ئەملاو ئەولا ئەکاو ئەڵێت، من فلانە کەسم لەئاوایی ڕێشاوەوە ئەم بەیانییە هاتووم بچم بۆ ئاوایی دەرەتفێ، تاریک و ڕوون لە وێرانەی ئاوایی بۆیندا چەند چەکدارێکم بینیوون لە دووژمن ئەچون بۆیە زۆر بەپەلە هاتم. گەیشتمە ئێرە هەواڵی تۆم پرسی لەنیگابانەکە (پاسەوانەکە) ووتی لێرەیە، زۆر هەوڵیدا ووتی ئیشەکەت چییە؟ ووتومە ئەبێ خۆی ببینم. باشە بەخێر هاتی.

بەڵێ منیش لێم پرسی چەند کەس بوون؟ ووتی من حەوت کەسم بینین، پرسیم چۆن ئەزانیت دووژمنن ڕەنگە پێشمەرگە بوبن؟ نا زۆر پۆشتەو پەرداخ بوون هەم لە چەک و چۆڵە و هەم لە جل و بەرگ دا پێشمەرگە نەبوون، باشە بەخێر هاتیت.

ئەو ڕۆیشت و من خۆم کۆ کردەوە، مەهدی کەیکاوس لەگەڵ هێزە سەرەکیەکەماندا چوونەتە خوارەوە بۆ شارەزوور. لەبنکەکانی گریانەو هاوارەکۆندا تەنیا بەشی پاسەوانی پێشمەرگە ماونەتەوە. خۆم و دوو

---

[1] - بەردە نوێژ ئەوبەردەیە، کە لەسەرو تەنیشتی هەموو چاوگێکی کانیاو کارێزەکان، یان لە قەراغ ئەستێل و حەوزەکاندا دانراوە، بەتایبەت لەناوچەی هەوراماندا. بەردەکە ڕوو بە قیبلە دائەنرێت و نوێژکەر نوێژی لەسەر ئەخوێنێ.

پێشمەرگەی تر بەناوەکانی شەهید نەوشیروان عەبدول محەمەدو والی حەمەڕەشید مەتارە ئاوەکانمان پڕ کردو کەوتینە ڕێ بەرەو بۆین، هەواڵیشم نارد بۆ ئاوایی گرییانە بۆ شەهید ئیبراهیم بۆینی سێ پێشمەرگەم بۆ بنێرن با چەکی ئاڕ بی جی لەگەڵ خۆیاندا بهێنن لەسەرکانی چالان چاوەڕێیان ئەکەم، چالان- ئەو ڕووبەرە گەورەو فراوانەی دارستانی نێوان ئاوایی گریانە و ئاوایی بۆینە. دوای بڕینی ڕێگای قەلای هاوارەکۆن بۆ چالان بەناو دارستان و جەنگەڵی چڕی دار قەزوانەکاندا لە دووڕیانی بۆین- گرییانە، پشوومان دا و حەواینەوە، بینیم وا لەگرییانەوە هاشم بۆینی و ئیبراهیم بۆینی و ئازاد عەبدوللا هاتن، هەورازی تاقەت پڕووکێنی گریانە-چالانیان خستۆتە پشت سەر و هەموو لەشیان عارەقەی لێ ئەچۆڕی. پێکەوە بووینە مەفرەزەیەکی شەش کەسی، لە کۆنە خەرمانێکدا[1]، کۆبوونەوەیەکی کورتم پێکردن و ووتم بۆ ئەو مەبەستە ئەچین بۆ ئاوای بۆین، لە کاتی قسە کردنەکەم دا بۆیان، سەیری پێشمەرگەکانم ئەکرد، لە ڕەوە پڵنگێکی عەودالی ڕاوە نێچیر ئەچون، قارەمان و گورج و گۆڵ وریا و هوشیار چاونەترس و ماندوو نەناس.

بینیم بەبیستنی ئەو هەواڵە ڕووخساریان نەشئاوی بوو. من لەژیانی پێشمەرگایەتدا، کاتێک کۆبوونەوەم کردووە بۆ ئەوەی بە پێشمەرگەکان بڵێم، ئەو شەڕە یان ئەو چالاکیە ئەکەین، بۆ یەکجاریش نەمدیوە لەسیمای ئەوانەدا کەقسەکانیان بۆ ئەکەم نیشانەی پێناخۆش بوون دەرکەوێ، هەمیشە پێشمەرگە بەوهەواڵە دڵخۆش بوون، چەندین جاریش بینیومە مەفرەزەکانی پێشمەرگە بەرپرسەکەی خۆیان هانداوە بۆ ئەوەی چالاکی بکەن یان مۆڵەتیان بدات خۆیان چالاکی بکەن. چالاکی- لەپارتیزانیدا زیاتر مەبەست لەشەڕ کردن و لێدانی دوژمنە.

بەڵی دوای کۆبوونەو کەمێک پشوودان سەرکەوتن و گەیشتینە سەر شاخ و لەئاوڕێژگەدا دانیشتین، من سەرم ڕاکێشا بەڕووی ئەودیوودا ئاوایی

---

[1] - خەرمان ئەو شوێنەیە بەتایبەت لەناوچە شاخاوییەکاندا بەئەندازەی ڕووبەرێکی ٧٠مەتری بە شێوەی بازنەی تەخت ئەکرێ، لەسەر یان لە نزیک ئەو پارچە زەویانەدا کە بە گاجووت کێڵراو داچێنراون، کراون بەدانەوێڵەی وەک گەنم، جۆ، نیسک، نۆک و گلێنە. لەدوای دروێنەکردن ئەو بەرهەمانە لەو خەرمانەدا کۆدەکرێنەوەو گێرە ئەکرێن و دواتر بەشێوەی شەنکردن و بەبادان دانەوێڵەکە لە پوشوو پەڵاشەکە جیا ئەکرێتەوە.

بۆین و چەم و دۆڵ و لاپاڵ و نزاری پڕ لە لێرەواری هەرچوارلای دەشتی سازانمان لێوە دەرکەوت. زۆر بە نهێنی و بە وریای و لەسەرخۆ ناوچەکەمان خستە ژێر چاودێری. نزیکەی نیوەڕۆ پاسەوانێکمان چاو کرد لەپەنا بەردێکدا لەوبەر ئاواییەوە، زانیمان ئێشک گری ئەوانە و ئەوانیش لەو دەور و بەرەدا خۆیان حەشار داوە، چاوەری ئەکەن ڕۆژ درەنگ بکاو بێنەوە بۆ سەرکانی ناو کەلاوەکانی ئاوایی، ماوەیەک بەدیاریەوەماینەوە، جێگەی ئێمە زۆر بەرزەو ئەوان وان لەخوارەوە. بینیمان وا وردە وردە بە پەنا هەژگەلانەکاندا یەک یەک بەربوونەوە بۆ سەر کانی. لە دیدی ئێمەدا نەمان و کەوتنە پەنا.

مەفرەزەکەی ئێمە بووینە دوو بەش، ئادەی هاشم تۆ لەگەڵ نەوشیروان و والیدا بەناو قەدی ئەم شاخەدا لابەلا زوو خۆتان بگەیێننە سەر ڕێگای ڕێشاو-بۆین ئەوسەریان لێبگرن، من و ئیبراهیم و ئازادیش بەربووینەوە بۆناو ئاوایی، ئەوەندەمان نەماوە بگەینە سەر کانی بە پەنا و پەسوێدا پسکە پسک سەرمان بردە دیاری کانییەکەی ناو کەلاوەکانی ئاوایی تا دەنگیان بدەین داوا بکەین چەکەکانیان دابنێن.

بێئاگا لەوەی ئەوان زووتر ئێمەیان چاو کردووە، خەریکە لە ئاوایی دەرچن بەرەو ئاوایی ڕێشاو. دەنگمان دان، کێن نەڕۆن؟ چەکەکانتان فڕێدەن با نەکوژرێن، زوو پەرشو ب لاوە بوون بەملاو ئەولای ڕێگەکەداو سەنگەریان لێگرتین، تەقە دەستی پێکرد، ئێمە ئەم سێ کەسەی بەرەو ئاوایی چووین پەلەمان کردووە و سێ هاوڕێکەمان ڕێگەیان دوورترە نەگەیشتوونەتە شوێنی مەبەست. جگەلەوەش ڕەمەنی سەخت و درێژ لەوشوێنەدا وەک دیوارێکی بەرز درزێکی تێدانییە تالەو ئاستەدا بێنە خوارەوە بۆسەر ڕێگاکە، ئەمەشبووە هۆی ئەوە سێ کەسییان لەدەستمان دەرباز بین و خۆیان گەیاندە ڕەبییەکانی پشتی هەڵەبجە. دوای تەقە و لێکدان و بگرە و بەری مەدەیەک سێ کەسیان دیل کرا و یەکێکیان کوژرا.

دیلەکان ئەمانە بوون، ١- مەنوچەر کوڕی عێلبەگی فەرماندەکەیان بوو،٢- شێرکۆ ٣- جەمال، کوژراوەکەش خەڵکی ئاوایی بۆیسان سووری لای عەربەت بوو. لەدوای لێکۆڵینەوە و پرسیار و وەڵام وتیان ئێمە حەوت کەس بووین جاش وچەکداری سەر بە مەفرەزەی تایبەتین و بەرپرسەکەمان ناوی

موحسین حەمەی زۆرابە لە سەیدسادق مخابەراتی عێراق ئێمەی ناردوە بچین لە ئێران چالاکی بکەین.
دەست کەوت چوار پارچە چەکی کلاشینکۆف و برێک فیشەک ومەخزەن بوو.
تەرمی کوژراوەکەمان دابەکوڵی دیلەکانداو هێنایانەوە بۆنزیک ئاوایی چەند جووتیارێک لە ناوچەکەدا خەریکی بنێشت کردن بوون، بانگم کردن و پێم ووتن ئەمکوژراوە لە قەبرستانی ئاوایی دفن بکەن، ئێوە لەم ناوەدان ئەگەر کەسوکاری هات بەدوایدا قەبرەکەیان پیشان بدەن، خۆشمان بە دیل و دەستکەوتەوە گەڕاینەوە بۆ بنکەی گریانە.

دوای چەند ڕۆژێک دیلەکانم بەمەفرەزەیەکدا نارد بۆقەرەداغ بۆمەڵبەندی یەک، تاکەسوکاریان بڕوات لەوێ ببێتە کەفیلیان بۆئەوەی کەبەرەڵا کران جارێکی تر چەک بۆ دوژمن وەرنەگرنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا شۆڕش لەبەرامبەر ئازاد کردنی هەر جاشێکدا برێک پارەی ئەسەند.

سەرەک جاش و بەکرێ گیراوانی ڕژێم لەپەنا جاشایەتیشدا دزیان ئەکردو خەڵکیان ڕووت ئەکردەوە بۆخۆیان، ڕژێمیش لەبەر ئەوە ئەم جۆرە کەسانە ڕووهەڵماڵراو ئەڵقە لەگوێیان بوون بەریان دابوونە گیانی خەڵک، لەسەر ئەم جاشە گیراوانە موحسنی حەمەی زۆراب باوکی چەند پێشمەرگەیەکی گرتبوو و بردبوە ناو تەویلەکانی خۆیان و پارەیان لێ سەندبوون، لەوانە، عەبدلخالق حەسەن مامی شەهید نیازی، دووکوڕی پێشمەرگە بوون بەناوەکانی فەهمی و وریا.

# ویستمان بیکوژین بەڵام دڵمان نەهات

هاوینی ساڵی ١٩٨٦ دوای ئەوەی یەکێتیی خەریکی ڕێکەوتن و کردنەوەی بارەگای پەیوەندیەکان و ناردنی هەندێک بریندار بوو بۆ ئێران. شەهید ئازاد هەورامی چوو بووە کرماشان، بەڵام ئەم هات و چۆکردنە زۆر ئاشکرا نەبوو. بنکەی شنروێ بارەگای سەرەکی لە هاوارە کۆن بوو، دەستەیەک پێشمەرگە کەپێک هاتبوون لە شەهید کەیکاوس، شەهید مەهدی، حەمە بچکول، سەلاح عەزیز نادر، شەهید نەوشیروان و حەمەی کوێخا ئەحمەد، شەوێک چووبوونە سەر ڕەبیەیەکی جاش خەفیفە کە ئەکەوێتە سەر لووتکەی ئەشکەهۆڵ لە دەستەچەپی ڕێگای تاوێرە _عەبابەیلێ. مەجیدی فەتاح بەگی زەردەهاڵ بەپرسی ئەو ڕەبایە بوو.

کاتێک بە ئاڕ بی جی لێی ئەدەن، چەند پێشمەرگەیەک هێرش ئەکەن بۆ ناو ڕەبیەکە، جاشەکان نارنجۆکێکی دەستی ئەخەنە ناو دەستەی هێرشەکە. سەلاح بە سەختی بریندار ئەبێت و لەجێی خۆیدا ئەکەوێت، ڕاست لە بەردەرگای ڕەبیەکەدا، هاوڕێکانی دوای گرتنی ڕەبیەکە دەریان کردبوو، ماوەیەک بەڕاکێشان و ماوەیەک بە کۆڵ هێنابوویان و گەیشتبوونە ملەی هەیشوور، لەوێ ڕۆژیان لێبوبووەوە، ماوەی دەرچوونیان نەمابوو، ژیرانە سەلاحیان هێنابووە چەمی دواوان لەنزیک ڕەبیەکانی ناو ئاوایی هاوار، لە جێگەیەک شاردبویانەوە و ئاگاداری منیان کرد. شەوی دوایی لەگەڵ مەفرەزەیەک چووم بە هانایانەوە و برین پێچێکی حیزبی دیموکراتی ئێرانم لەگەڵ خۆم برد بە ناوی د. مستەفای نجاری [1]. کەچووین بینیمان سەروچاوی ئاوساوە و باڵێکی شکاوە و چاوێکی ساچمەی بەرکەوتووە. خوێنی زۆری لێڕۆشتووە و بێهۆشە ئەوەی پێویست بوو د. مستەفا بۆی ئەنجام داو پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ دارەمەیتمان بۆ دروست کرد و بەگەڵای داربەڕوو جێگەمان بۆ دروست کرد و لەڕێگەی ئەشکەهۆڵەوە بردمانەوە

---

[1] - نجار ناوی ئاواییەکی ناوچەی هەورامان و نشینگەی شێخ قادرە لە ڕۆژهەلات.

سەرچیای شنروێ و لەوێوە داگەڕاینەوە بۆ هاوارە کۆن، کاتژمێر ٣سێی سەر لەبەیانی گەیشتینە هاوارە کۆن. هەوڵم دا کەس لە هیچ شوێنێک باسی ئەم ڕووداوە نەکات و هەتا پێشمەرگەکانی تریش کە لە بنکە و بارەگاکان مابوونەوە نەزانن. لە باخێکدا بە ناوی باخی عەول کەریمی حەیاتێ جێگەمان بۆچاک کردو چەند پێشمەرگەم بە دیاریەوە دانا. کاتژمێر ١٠ ی بەیانی خۆم چووم بۆ سەردانی بینیم زوو زوو دەستی ئەبات بۆ لای چاوی و پەنجەی ئەکات بەژێر ئەو لەفافەدا کە سەرو چاوی پێ بەستراوە توانای قسەکردنی نەبوو، دووبارە بەلۆکەو دیتۆڵ خۆم برینەکانم بۆپاک کردەوە، لەوێ زانیمان شەویلگەی خوارەوەشی لەگەڵ چوار ددانیدا شکاوە. ددانە شکاو پوش و پەلاشی ناودەمیمان پاک کردەوە، چونکە لە کاتی دەرکرنیدا ماوەیەک ڕایان کێشا بوو.

کاتێک سەیری چاوە بریندارەکەیم کرد دیم کە کرمی بچوک بچوک بە کۆمەڵ لە برینی چاویدا لە نزیک لووتیدا سەر دەرئەهێنن، ماوەیەک بەموکێش ئەوانەی سەریان دەرئەهێنا خەریک بووین بۆ لابردنیان، بەڵام لە خوارەوە خۆیان بەر نەئەدا و ئەپچڕان. مەهدی پێی ووتم با ئیسپرتۆ (ئەلکول)ی تێکەین دێنە دەرەوە، تێمان کرد. ئەمە ئەو شەوەی بریندار بووە سەر لە بەیانییەکەی مێش تێی داوە و گەرایی کردووەتە برینەکانی و ڕۆژی دوایی بوون بە کرمی ورد ورد. چەند ڕۆژێک دکتۆر مستەفا ئەهات و تەداوی ئەکرد. دکتۆر ووتی من ناتوانم هەموو ڕۆژێک لە لای حیزبەوە بێم بۆ لای ئێوە خەریکە خەڵکیش ئەزانن کەمن هاتووچۆی ئێوە دەکەم بریندارتان هەیە.

لە بەر ئەمە بردمانە ئاوایی دەرەتفێ و لە جێگەیەک بە ناوی بگار جێگەمان لە ناو شەخەلێکدا بۆ دروست کرد و ئیتر لەوێ نزیک بوو، ڕۆژانە دکتۆر ئەیبینی شکاوی دەستی و شەویلگەی و چاوەکەی پێویستی بە عەملیات هەبوو. بۆیە د. مستەفا پێی ووتم ئەمە ئەبێ تەکبیری بکەن چونکە بەم چارەسەرانە چاک نابێتەوەو پێویستی بەعەمەلیاتە.

لەم کاتەشدا کۆمیتەی شارستانی هەورامانی حیزبی دیموکرات هەرچەندە لە ناوخاکی عێراقیشدا بوو بەڵام لە بەرئەوە نزیکی بنکە و بارەگای ئەوان بوو، ئاگاداریان کردین ئەو بریندارە بگوازنەوە بۆ جێگەیەکی تر عێراق زانیویەتی ئاگاداری ئێمەی کردووە کە برینداری مخەڕبین لاتانن.

منیش وەلامم دانەوە باشە چارەسەری ئەکەین. بیرمان کردەوە لەوەی کە بیکوژین، بەلام دلمان نەئەهات، بۆیە لەڕیگەی جیهازەوە ئاگاداری مەکتەبی سیاسیم کرد کەحالەتیکی ئاوامان هەیە چی لێ بکەین؟ وەلامیان دامەوە: خۆتان سەربەستن کە چی لێئەکەن، پرسیارم لە سەلاح خۆی کرد: بتنێرم تەسلیمی عێراقت بکەنەوە، هەر ئەوەندە توانای قسەکردنی هەبوو بە ئەماژەی برۆ ووتی نەء، بۆیە بڕیارم دا کە بیبەینە نزیکترین خالی سنوور کەپاسداری لێوە نزیک بێت، نامەیەک بنووسین و بیخەینە گیرفانی و بەجێی بهێلین بە شەوداو وابێت کەڕۆژ بووەوە بیبینن و بیبەن.بۆ ئەم مەبەستە لەگەل بەرپرسی یەکەمیان قسەم کرد.



شەوێک مەفرەزەیەکی خۆمان و لەگەل مەفرەزیەکی حیزبی دیموکراتدا بردمانە شارۆچکەی نەوسوود. نەوسوود ئەو کات گەڕەکی ملە سەروا بە دەست سوپای پاسداران و ناو شارۆچکەکەش لەملە سەروا بەم لاوە بە دەست دیموکراتەوە بوو. شەو کە گەیشتینە ناو نەوسوود لە مالی میرزا حەمەسالح پشوومان داو نانمان خوارد، سەلاح یشمان لەهەیوانەکەیاندا دانابوو.

نەوسوود دیمەنێکی ترسناک و سەنگەری پێشەوەی حیزب و نێوان هەردوو سوپای عێراق و ئێرانیش بوو، شەو تاریک و تاکە تاکە مالەکان مابوون و هەندێک رووخابوون بەهۆی تۆپ بارانی بەردەوامی هێزەکانی ئێرانەوە. تاکوتەرا چرای فانۆس شۆلەیان لەپەنجەرەو دەرگاکانەوە دیاربوو، بەهەر کووچە و کۆلێکدا گوزەرت کردایە کەمین هەبوو دەنگیان ئەدایت.

میرزا حەمە سالح پیاوێکی تەمەن نزیک بە٩٥ سال بوو، پرسیاری ئەکرد لە عەبدولکەریمی کوڕی، ئەمانە کێن؟ وەلامی دایەوە ئێمەی ناساند، پرسیاری ئەکردەوە بۆچی هاتوون بۆ کوێ ئەچن؟ ووتیان میوانن مەپرسە. ئەویش وازی هێنا لەپرسیارکردن.

لەدەورانی عەشائیریدا کاتێک شەڕی هەورامانی لهۆن و تەخت ڕوویئەدا، چەند ئاواییەکی هەورامانی لهۆن لەلایەن تەختەوە دەستیان بەسەردا ئەگیرێ ئەوانیس ئەم ئاواییانە بوون: سەرگەت، هانەدن، گوڵپ، بیارە، هانەگەرمڵە، کەیمنە و بێرواس.

جەعفەر سان (سوڵتان) خەریکی کۆکردنەوەی هێز و تەداروکات ئەبێ بۆگرتنەوەی ئەو ئاواییانە. چەند ڕۆژ هەر کۆبوونەوە ئەکەن و کۆبوونەوەکان بێ ئەنجام ئەبن، دێن و دەچن بە ناویەکدا. دیارە شپرزە بوون، ئەفراسیاو بەگ داوا ئەکات لە سوڵتان ئەڵێت من ئامادەم بیگرمەوە بەلام مەرجم هەیە. سوڵتان ئەڵێت مەرجەکانت چین؟ ئەویش ئەڵێت: یەکەم: کە ناوچەکەم گرتەوە، واتە ئەو دێیانەی ناومان هێنان خۆم حوکمڕانیان بکەم. دووەم: لە ناو لەشکری عەشایری دا خۆم ١٠٠ سەد تفەنگچی هەڵبژێرم. سوڵتان ڕازی ئەبێت و سەنەد ئەنووسن و ئەفراسیاو بەگ لیستی ناوەکان ئەدات بە سوڵتان ناوی یەکەم میرزا حەمەسالح و دووەم ناو نەسروڵا بەگی عەزیز بەگ و سێیەم ناو حەمەوەیسی نەسروڵا کە بەنەسەخانمی هانەگەرمڵەیی ناسراوە .. تاد. سەد تفەنگچییەکە تەواو دیاری ئەکات. ئەم پیاوانە زیرەک و وریاو چەتون بوون لەوسەردەمەدا، ئەگێڕنەوە حەمەوەیسی نەسروڵا شەوێک لەهانە گەرمڵەوە دێت لەئاوایی سەرگەت تەقە ئەکات لەنەیارانی ئەفراسیاب بەگ و هەرئەوشەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئاوایی هانەگەرمڵە، بەیانی لەسەر حەوزی مزگەوت پیاوێک بەناوی سالحی ئەولە ئەیبینێ و ئەپرسێ حەمەوەیس قوری پێلاوەکانت هی ئەم سنوورەی خۆمان نیە؟

جارێکیتر هێرش ئەکەنە سەر مەخفەری پۆلیسی(ئەمنیەی) شا لەهانەگەرمڵە ئەمنیەکان چەک ئەکەن و مەخفەرەکە تالان ئەکەن، حەمەوەیس دەوری ئەبێت لەو هێرشەدا، ئەمنیەکان فارس ئەبن بەرەلایان دەکەن و دەڵێن بڕۆن، کاتێک ئەڕۆن حەمەوەیس جگەرە تەقدیمی ئەمنیەیەک ئەکات، ئەویش ئەپرسێ تۆناوت چییە؟ ئەڵێت بۆ ئەپرسی ناوی منت بۆ چییە؟ ئەمنیەکە ئەڵێت مادام پیاوێکی بەڕێزی حەزئەکەم ناوت بزانم بۆوەخت دنیا هەر ئەمڕۆ نییە. حەمەوەیس گومان لەپیاوێکی ئاوایی ئەکات کەلەژێرەوە پەیوەندی بەحکومەتەوە هەبێت، ناوی ئەو پیاوە ئەدات، ئەڵێت من فلانەکەسم. دوای

ماوەیەک حکومەت دێتەوە ناوچەکە ئەگرێتەوە، ئەو پیاوەی حەمەوەیس ناوی ناوە ئەگرن و ئەیبەن لەقەسری قاجار زیندانی ئەکەن. ئەم حکایەتانە زۆرن شوێن باسی ئێمە نین لەم کتێبەدا، وەریان ئەگرین بۆ شوێنی خۆی.

لە دوای بانگی بەیانی سێ پێشمەرگەی حیزبی دیمکرات و سێ پێشمەرگەی خۆمان ئامادە بوون سەلاح ببەن و برۆن بۆ نزیک ملە سەروا بۆ پەنا سەنگەرەکانی پێشەوەی سوپای پاسداران. من پێشمەرگەیەکی تری خۆمانم حازرکرد و ئامۆژگاریم کرد لەگەڵ سەلاح دابێت، لە باتی ئەوەنامە بنووسین و لەگیرفانی سەلاح دابنێین باشتر وابوو ئەم هاورێیەی لەگەڵدا بێت، چونکە سەلاح ناتوانێ بانگ بکات یان کەئاشکرابوو تێیان بگەیێنێ تەقەی لێ نەکەن. پێشمەرگەکەی هاورێی پەرۆیەکی سپیمان بۆ پەیدا کرد، پێمان ووت لەوجێگە کە بۆتان دیاری ئەکەن دانیشن تارۆژ ئەبێتەوە، کە رۆژ بووەوە چاویان کردن پەرۆ سپیەکە بەرزکەرەوەو رایوەشێنە، کەدێن بۆ لاتان پێیان بلێ ئێمە پێشمەرگەی اتحاد میهنی واتە یەکێتیی نیشتمانین و ئەم هەڤاڵەمان بریندارە و هێناومانە بۆچارەسەر. جا ئەگەر تۆیان نەبرد ئەوا بگەرێرەوە ئەگەر تۆشیان برد برۆ لەگەڵیان. ئەو پێشمەرگانەی حیزب هاوکاریان کردین دەستەیەک بوون، لەوانە محەمەدی وەڵەدبەگی، عیزەت کۆمەدەرەیی، عەبدولکەریم جەلالی و حەمەئەمین کەریمان. ئەو پێشمەرگەی خۆشمان کە لەگەڵ سەلاح ناردمان، شەهیدی نەمر نەوشیروان عەبدول محەمەد تەپەکورەیی بوو.

ئەم شەو من تا بەیانی نەخەوتم، بەری بەیان ئاسۆ رووناکی کرد، لەم بەر لە سەربانێکی ماڵێکەوە بە دووربین سەیری ئەو شوێنەم ئەکرد کە سەلاح و نەوشیروانی لێ دانیشتبوون، هەر دووسەد مەتر لەپاسگای مەرکەزیەوە دووربوو، ئەو قەلا یان ئەو پاسگا بەپاسگای مەرکەزی ناسراوە. کەناوچەکە زیاتر رووناک بووەوە بینیم نەوشیروان پەرۆ سپیەکە رائەوەشێنێ نزیکەی کاتژمێر شەشی سەر لە بەیانی دەنگە دەنگ و شڵەژان لە دەوربەری پاسکاکەدا رووی دا و چەند کەسێک بەرەو لای پێشمەرگەکان هاتن، لە دەستە چەپ و راستیشەوە ئەو چەند کەسە پاسەوانیان دوور و نزیک لەگەڵدا هاتنە پێشەوە. پاش چەند دەقیقەیەک بردنیان بۆپاسگا ئێمەش تاماوەیەک چاوەرێمان کرد تابزانین نەوشیروان ناگەرێتەوە، دڵنیا بووین

کەناگەڕێتەوە،ماڵئاواییمان لەجەماعەتی دیموکرات کردو گەڕاینەوە بۆ هاوارەکۆن. دوای هەفتەیەک لە خوارەوەو سەرئاوی سیروانەوە نەوشیروان پەڕیبوەوە و هاتەوە بۆگریانە و هاوارە کۆن نامەیەکی بەرپرسی بەرەی شەڕی عیراق و ئێرانی ناوچەکەی هێنابوو بۆمن.

بەر لەخوێندنەوەی نامەکە نەوشیروان ووتی هەر ئەو ڕۆژە لەگەڵ سەلاح ڕۆیشتین منیان لەو جیاکردەوە، زیندانیان کردم. پاش ئەوە مووتەرجیمیان هێنا، من قسەی خۆم کرد بەوشێوە کە ئێوە ڕێنێونی و ئامۆژگاریتان کردم. دووبارە کرامەوە زیندان تا ئیمڕۆ هاتن و ئەم نامەیان دامێ و هێنامیانە سەرئاوی سیروان و کەسێکیان نارد لەگەڵمدا تا لە مەیدانی مین دەری کردم پیاوێکی ئێناخی بوو بەناوی ڕەزاقوڵی، دوای ئەوە لە ئاو پەڕاندمیەوە ئەو گەڕایەوە بۆ ئێران.

ڕەزا قوڵی کۆنە پێشمەرگەیەکی حیزبی دیموکرات بووتەسلیم بووبووەوە شارەزایی ناوچەکە بوو. من نامەکەم خوێندەوە. بە ناوی بەرپرسی مەیدانی جەنگی حەق عەلەیهی باتڵ نووسراوە بۆ حەمەی حەمەسەعید، لە نامەکەدا داوا ئەکەن کە ئێمە دوای سێ ڕۆژی تر لەگەڕانەوەی نەوشیروان بچینە سەر ئاوی سیروان لەوێ لەگەڵ ئەوکەسانەی ئەوان ئەیانێرنە ئەوێ قسە و گفتوگۆ بکەین و پەیوەندی دروست بکەین و هاوکاریمان بکەن، ئێمە نەڕۆیشتین، تازە نەوشیروان گەیشتوەتەوە لامان و سەلاحیش ویستوومانە خۆمان بیکوژین ئێستە لای ئەوانەو چاکی ئەکەنەوە، تەواو ڕزگار بووە لە مردن خەیاڵمان بۆی ئاسوودەیە.

پاش ماوەیەک من بەڕێکەوتووم بۆ ئیشێک بچمە لای جەنابی مام جەلال بۆئاوایی یاخسەمەر لەڕێگا لە نێوان ئاوایی قزلەرو دۆڵی مێرگەپان ڕۆژی ٨ / ١٠ / ١٩٨٦ ئەدەین بەلای ئەو هێزانەی کە چەکو چۆڵە و تەداروکاتی ئەو هێزانەیان پێیە ئەچنە خوارەوە بۆ دەوربەری کەرکوک بۆ لێدانی بیرە نەوتەکان بە هاوبەشی لەگەڵ سوپای پاسداران کە سەر بەر قەرارگای ڕەمەزانن، لە نێوان قزلەرو مێرگەپاندا دام بە لای کۆمەڵێک پێشمەرگەدا کە ٤٠-٥٠ کەس بوون لە ناویاندا پێشمەرگەیەکم بینی ئەوە ئەناسم، چەند هەنگاوێکی تر لێم نزیک بوویەوە و سەیرم ئەکات ئەمویست لێی تێ پەڕبیم لەڕیزەکە وەستاو لایدا بۆ لای من و باوەشی پێداکردم. ها

سەلاح گیان ئەمە تۆی یەکترمان گوشی وچەند دەقیقەیەک بەسەرهاتی خۆی بۆگێڕامەوە، باشە ئێستە برۆ با دوانەکەوی بچۆرە قەرەداغ کە من گەڕامەوە لەگەڵ خۆم ئەتبەمەوە بۆ هەورامان. ووتی باشە، لەگەڵ هەڤاڵەکانیدا ڕۆیشت و منیش کەووتمەوە ڕێ، دواتر کەگەڕامەوە سەلاح بۆی باس کردم و ووتی: هەر ئەو ڕۆژە لە نەوسوودەوە بەئۆتۆمبێل بردینیانە ئیدارەی ئتلاعات بۆ کرماشان، نەوشیروانیان لە من جیاکردەوە، منیشیان بردە نەخۆشخانە و لەوێ تێگەیشتم کە بە دکتۆرەکانیان ووت ئەمە دژی ئینقلابە و نابێ کەس سەردانی بکات و قسەی لەگەڵ بکات، هەروەها نابێ ئەمیش لەگەڵ کەس پەیوەندی بگرێ.

ووتی دوای ئەوە بردمیان بۆژووری تیشک هێنامیانەوەو قۆڵە شکاوەکەیان گرتمە کەچ تا ١٥ ڕۆژ، دکتۆرێکی کاکەیی چارەسەری ئەکردم بەناوی مەردان پور لەژێر چاودێریدا بووم، ڕۆژێک چەندین بریندا‌ری خۆمانیان هێنا بۆ ئەو نەخۆشخانەیە، منیش خۆم پێ ناساندن لەوانە غەریب عەسکەری و ڕزگار ناوێک کە قۆڵی پەڕی بوو، ئیتر من وەزعم باش بوو، بۆیان دەرکەوت کە من ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی نیم. ڕۆژێک کاک ئازاد هەورامی سەردانی نەخۆشخانەکەی کرد و خۆشم بەو ناساند، لەدوای ٢٨ڕۆژ لە نەخۆشخانە باش بوو بووم، مەردان پور پێی ووتم ئەوە کارتی جانبازانم بۆ دروست کردویت، ئیتیحادی میهنی لێرە لە تاق بوستان بارەگا و دەفتەری هەیە برۆ بیان دۆزەرەوە و برۆرەوە بۆ لایان.

سەلاح ئەڵێت هاتمە دەرەوە بە ناشارەزایی کوڕێکی ئێناخیم بینی کاتی خۆی لە هاوارە کۆن بوو، ئەویش ووتی لێرە دەفتەرتان هەیە، بەڵام نەناونیشان و نەهیچ زانیاریەکم هەبوو کە لە کوێن، لەناکاو پێشمەرگەیەکی بریندارم بینی ناوی بێستون ، چوومە لای و دوای چاک و چۆنی پرسیاری دەفتەری خۆمانم کرد یەکسەر بردمیە لای کاک ئازاد هەورامی، ئیتر مامەوە و دوای ماوەیەک لەگەڵ چەند کەسی تر ناردمیانەوە سەردەشت و لەوێوە هاتوومەتەوە.

# تفەنگێکی قەناسی دووربین دار

لەماوەی هەشت سالی شەڕی نێوان هەردوو دەولەتی عێراق وئێراندا، نارازیانی ئۆپۆزسیۆنەکانی چەکداری هەردوو وولات هەریەکەو لای وولاتی بەرامبەر پەیوەندیان دروست کردبوو کۆمەک و هاوکاریان وەردەگرت و بەرامبەر بەدوژمنی خۆیان بەکاریان ئەهێنا. هاوکاریەکانیشیان وەک وەرگرتنی چەک و تەقەمەنی و پارەو بەشداری شەڕو ئالوگۆڕی زانیاری بووە.

ئەوانەی نەیاری عێراق بوون، حیزب و گروپ و تاقم و کەسایەتی سیاسی و سەربازی بوون لەهەردوو نەتەوەی سەرەکی عەرەب و کورد، عەرەبەکان زیاتر مەزهەبی شیعی بوون کەمتر حیزبی عیلمانی نەیاری دەولەتی عێراق هەبوون، لەعیلمانییەکان دیارترینیان حیزبی شیوعی عێراق بوو پەیوەندیشیان لەگەل ئێران لەڕێگای حیزبەکانی ترەوە و سنووردارێش بوو. پەیوەندی وهاوکاری کردنەکانیش جیاوازیان هەبوو بەپێی بەرنامەو بیروباوەڕی سیاسی حیزبەکان.

حیزب و لایەنە نەیارە کوردەکانی دەولەتی عێراقیش چەندین حیزبی نەتەوەیی عیلمانی و چەپ و دیمۆکرات و ئیسلامی بوون. لەوانە پارتی پێش شەڕو بەدرێژایی ماوەی شەڕەکەش پەیوەندیان هەبوو و بەردەوامیش بوون لەگەل حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێران، ئێمە، یەکێتیی سەرەتاو پێشتر پەیوەندیمان هەبوو بەلام بەهۆی پشتیوانی کوردەکانی ڕۆژ هەلاتەوە لەسالی ١٩٧٩وە ئەو پەیوەندیە گرژی تێکەوت و دواتر بەیەکجاری تێک چووین تاسالی ١٩٨٦. دواتر لەسەر ئەوە یەکێتیی شەڕی لەگەل عێراق ڕاگرت و وتووێژی دەست پێکرد، ئێرانیش پشتیوانی بەرەی جودی کرد بەدژی یەکێتیی، پەیوەندیەکانمان لەگەل ئێران، چەند جارێک ئالوگۆڕی بەسەردا هاتوە.. سۆشیالیت و پارتی گەل و لەم دواییەشدا بزووتنەوەی ئیسلامی لەو لایەنە کوردە نەیارانەی عێراق بوون پەیوەندیان لەگەل ئێران هەبوو..

جیاوازی هەبوو لە نێوان داواکاریەکانی ئەو دوو دەولەتە لەئۆپۆزسیۆن لەبەرامبەر هاوکاریەکانیان. بۆنمونە ئێران یەکێک لەداواکانی

لەئۆپۆزسیۆنی کوردی عێراق ئەوە بوو، ئەیووت ئەبێ هێزی سەربازی سەربەقەرارگای رەمەزان ببەن بەشداریان بکەن لەچالاکیە سەربازیەکاندا، یان بیانبەن بۆ شناسایی و کۆکردنەوەی زانیاری سەربازی لەسەر هێزە چەکدارەکانی عێراق. لەوکاتانەشدا چەندین جار چەند کەسێکی لایەنەکان بۆ پارە وەرگرتن خیانەتیان لەحیزبەکەی خۆشیان و لەلایەنە یارمەتی دەرەکەشیان کرد بەتاکو بەکۆ پاسداریان ئەفرۆشت بەعێراق.

ئۆپۆزسیۆنە ئێرانییەکان دیارترینیان موجاهیدینی خەڵق بوو، لەکوردەکانیشدا حیزبی دیموکرات وکۆمەڵە سەرەکیترین هێز بوون، ئەمانە عێراق لەبەرامبەر هاوکاری کردنیان زیاتر داوای زانیاری سەربازی لێ ئەکردن یان بردنی دەیدەبان رەسەدی تۆبخانەکان یان ئاسانکاری و رێگری نەکردن لەوکەسانی ئەچنە ناو ئێرانەوە بۆ ئەنجام دانی تەقینەوەکان.

چەندین هۆزو تیرەو گروپ وتاقمیش هەبوون بەتایبەت لە ناوچەکانی مەریوان، هەورامان، جوانرۆ، سەلاس وسەرپێڵدا چەکیان لەعێراق وەرگرتبوو راستەو خۆ لەلایەن موخابەراتی عێراقەوە ئاراستەو سەرپەرشتی ئەکران، ئەمانەش ئیشیان تەقاندنەوەی بۆمب بوو لەناو شارەکانی ئێراندا، یان شەڕی پارتیزانی یان گرتن و فرۆشتنی پاسداری ئێرانی بوو بە عێراق، ئەمانە چەندین جار کەئەچوونە ناو ئێران و نەیان ئەتوانی ئەوکارانەی بۆیان دیاری کراوە بیکەن، شوان و جوتیاری هەژاریان ئەگرت سەریان ئەبڕین و سەرەکانیان ئەهێنایەوە بۆ عێراق بۆ مخابەرات ئەیان ووت سەری پاسدارە، کاتێک عێراق ئەمەی بۆ ئاشکرا بوو سەری بێکارت و بێ بەڵگەی وەرنەئەگرت.

ئەو یەکە سەربازیەی ئێران کەلەرێگایەوە هاوکاری ئۆپۆزسیۆنی عیراقی ئەکرد قەرارگای رەمەزان بوو، بەرپرس و ئەندام و فەرماندەکانی یەکەکانی سەر بەم قەرارگایە هاتوچۆ و بەشداری شەڕەکانی هاوبەشیان ئەکرد لەناو خاکی عێراق دا بەپارتیزانی.

لەسێ ساڵی کۆتایی شەڕی عێراق و ئێران دا، لەسنوورەکانی ئێران لەگەڵ کوردستاندا بەتایبەت ئەوناوچانەی لەسەر سنوورو ناوەوەی کوردستانیش، کەهێزەکانی یەکێتیی، پارتی و سۆشیالیستی لێبوو جاروبار فەرماندە ئێرانییەکانیش هاتووچۆی ئەو شوێنانەیان ئەکرد، بەتایبەت دوای

ئەوە یەکێتیی کۆتایی هێنا بەوتووێژی خۆی لەگەڵ عێراق و لەگەڵ ئێران ڕێککەوتنی کرد. لەبەر ئەوە ئەوکات هێزەکانی یەکێتیی لەسەر سنوورەکان دوور بوون، لەناوچەکانی دۆڵی جافایەتی و دەوروپشتی سلێمانی و ناوچەکانی هەولێرو کەرکوک و قەرەداغ و گەرمیان دا بوون، بۆ ڕێکەوتنەکەو هەماهەنگی و بەرنامەی شەڕە هاوبەشەکان. نوێنەرەکانی ئێران هاتوچۆی ئەم شوێنانەیان ئەکرد کەهێزەکانی یەکێتیی لێبوو، بەتایبەت یاخسەمەرو بەرگەڵو سەرگەڵو لەجافایەتی جەنابی مام جەلال و سەرکردایەتی و مەڵبەندی دووی لێبوو، بالیسان و خۆشناوەتی لە هەولێر مەڵبەندی سێی لێبوو، قۆپی قەرەداغ لە سلێمانی وگەرمیان بارەگای مەڵبەندی یەکی لێبوو. نوێنەرانی ئێمەش لەسەرەتاوە لەڕێگەی سۆشیالیستەوە هاتوچۆی ئێرانمان ئەکرد تائەوکاتەی ڕێگەی تایبەتمان لەناوچەکانی ئالانی سەردەشت و هەورامانەوە لەگەڵ ئێراندا کردەوە.

ئەو ئێرانیانەی هاتوو چۆیان ئەکرد بۆ لای یەکێتیی نیشتیمانیی هەموو کاربەدەستی گەورەو خاوەن بڕیارو فەرماندەکانی پلەبالابوون. لەبەر ئەوە ڕێگای شارەزوور نزیکترین ڕێگای نێوان سنووری نێودەوڵەتی کرماشان و سنە لەودیو و سلێمانی و گەرمیان و هەولێرو کەرکوک لەم دیوبوو، زۆرتر لەم ڕێگاوە هاتوو چۆیان ئەکرد، بەحوکمی ئەوەش کە هێزی یەکێتیی لەشارەزوورو هەڵەبجەو هەوراماندا لەدوای تێکچوونی ووتوێژیساڵی ١٩٨٤-١٩٨٥وە لەناوچەکەدا سەرەتا بنکەی شنروێ و دواتریش بوو بەتیپی ١١ی هەورامان، لەسەر سنوورو لەدۆڵی هاواردا بنکەو بارەگامان هەبوو. بۆیە هێنان و گەیاندن و بردنەوەی زۆربەی ئەو هەیئەت و نوێنەرانە لەڕێگەی ئێمەوە بوو، ئەویش لەسەر داواو بڕیاری جەنابی مام جەلال. گێڕانەوەی داستانی گەیاندنی وەفدێک:

لەکۆتاییی هاوینی ساڵی ١٩٨٧دا، بروسکەیەکم بۆ هاتووە لەجیهازی جەنابی مام جەلالەوە، دەقی بروسکەکە ئەوەبوو، من بڕۆمە شارەزوور بۆ لای کاکە حەمەی حاجی مەحمود، ئامانەتیەکی لایە لێی وەرگرم و ئامانەتەکە بگەیێنمە مام لەیاخسەمەر. بەگەیشتنی بروسکەکە لەهاوارەوە لەگەڵ مەفرەزەیەکدا ڕۆیشتمە خوارەوە بۆدەشتی شارەزوور، سەر لەبەیانییەک لە وێرانەی ئاوایی قاجردا چاوم کەوت بەکاکە حەمە، بۆنانی نیوەڕۆ پێکەوە

لەگەڵ چەند میوانێکی ئێرانی لەلای کاکە حەمە میوان بووین، من میوانەکانم ئەناسی و زانیم ئەمانە ئامانەتیەکەن، دوای نانخواردنی نیوەڕۆ هەر لەوشوێنەدا کۆبونەوەیەکمان کرد، کاکە حەمە ووتی ئەم برادەرانە میوانی جەنابی مام جەلالن ئاگاداری کردووم تەسلیمی دەستی تۆیان کەم، منیش دەستخۆشی و سوپاسم کرد، یەکەم بۆ میوانداریەکەی و دوەم بۆ ئەو ئەرکەی کێشاویەتی لەمەریوان و سەرسنوورەوە خۆی هاتووە لەگەڵ ئەم میوانانەی مام جەلالدا. پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ خواحافیزیمان لەکاکە حەمەو برادەرەکانی کردوو لەئاوایی قاجرەوە لەگەڵ میوانەکان بەڕێ کەوتین بۆ قەرەداغ. میوانەکان ئەم سێ کەسە بوون: محەمەد تهرانی مقەدەم، فەرماندەی تیپی کۆماندۆی٧٥ ی زەفەر. حورمەت حجەتولا فارغی. عەباس حسێن ناسراو بەگوڵزارە سوور.

ئەو ڕۆژە دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە نزیک شارۆچکەی زەڕایەن، شەو لەجادەی سلێمانی – دەربەندیخان چووینە ئەوبەرو ڕۆژی دوای گەیشتینە بارەگای مەڵبەندی یەک لەقۆپی قەرەداغ. لەوێ داوام کرد شارەزایەکم بدەنێ تا لەسنووری تیپی ٥٧ی سەگرمە بمان پەڕێننەوە بۆبناری پیرە مەگرون، کاک قادری حاجی عەلی پێی ووتم پەلە مەکەن ئێمە خۆمان ئەپەڕینەوە بۆئەوبەرو پێکەوە ئەڕۆین.

دوایی دوو ڕۆژ کاک قادرو کاک عومەر فەتاح و هێزێک کەوتنە ڕێگاو ئێمەشیان لەگەڵ خۆیان بردوو بەسنووری سەگرمەدا گوزەرمان کردو کاک هیوا بارۆیی ڕەوانەی کردین تا لەجادەی سلێمانی-تاسڵوجە لەئاست کەنەکەوە پەڕینەوە، لێرەدا بەرلەوەی بچینە سەر جادە قیرەکە مەفرەزە چوبوو بۆ ئەوەی جادەکە تاقی بکەنەوە، ئێمەش هەموو دانیشتبووین و چاوەڕێی ئەوەمان ئەکرد یەکێک لەمەفرەزەکە بگەڕێتەوەو پێمان بڵێت وەرن، لەوساتی چاوەڕوانییەدا من ومقەدەم تارانی لەپەنای یەکەوە دانشتبووین ڕووناکی بلاجکتۆرەکانی باروت خانەو سەربازگەی سەلام و دەواجنەکانی ئەوناوە لەگەڵ لامپو چراخانی سلێمانی و تاسڵوجە شەوارەی کردبوو بەتارانی، هاتە پەناگوێمەوەو بەهێواشی ووتی (یک تفنگ قناس دوربین دار در

دزلی گزاشتم برات)[1] منیش پێم ووت سوپاست ئەکەم دەس خۆش، ئینجا دووبارە پرسی (ما حالا بەکدام ترف میریم) منیش بەئاماژە بۆلای چیایی پیرەمەگرون وەلامم دایەوە. لەوکاتەدا یەکێک هاتوو ووتی وەرن، هەستاین و ڕۆشتین بەر لەوەی ڕۆژمان لێبێتەوە گەیشتینە ئاوای پیسکەنی، لەوێ کاک عومەر فەتاح من و وەفدەکەی لەگەڵ خۆی بردو چووینە ماڵی دۆستێکی، پیاوێکی بەڕێزو خزمەتی زۆری کردین. ئەو ڕۆژەش تائێوارە ڕێگامان بڕی و ئێوارە گەیشتینە ئاوای زێوێی پیرە مەگروون و چووینە مزگەوت لەوێ بۆ دابەش بوون بەسەر ماڵان دا، ئەو کەسەی دابەشی ئەکردین هاتە لای منەوە پرسی تۆ کاک حەمەی؟ ووتم بەڵێ، ووتی تۆو هاوڕێکانت لەماڵی کاک ئەحمەد کوردەن[2]، منیش ووتم باشە بەسەر چاو بڕێک بەدیارمانەوە وەستا، برادەرەکانم دەستبان کرد بەدەست نوێژ شتن و نوێژ کردن، کابرا تەحەمولی نەما ووتی وەرە باماڵەکەت پیشان بدەم دوای خۆتان بڕۆن، چووم لەگەڵیا ماڵەکەی پیشان دام و ئەو ڕۆیشت، منیش دوای چاکوچۆنی لەگەڵ کاک ئەحمەد خۆم پێناساند، پرسی کوان برادەرەکانت؟ دیاربوو ئاگادار کرابوو میوانەکانی کێن، ووتم من هاتم ماڵەکەتان بزانم ئەوان لەمزگەوتن ئێستا ئەچم بەدوایاندا، کوڕێکی خستە تەکم و گەڕامەوە بۆ مزگەوت.

بەمیوانەکانم ووت هەستن ئەچین بۆ نانخواردن، ووتیان ئەکرێ چەند کاتژمێرێکی تر بڕۆین؟ منیش ووتم خاوەن ماڵەکە چاوەڕێمان ئەکا، بۆچی

---

[1]- واتە لە دزلی تفەنگێکی قەناسی دووربین لەسەرم بۆ داناوی، ئەوکات تفەنگی قەناس لای ئێمە برەوی هەبوو، مەبەستی مقەدەم تارانی لەم قسە ئاشکرایە، ئینجا دووبارە ئەپرسی: ئێمە ئێستا بەرەو کام لا ئەڕۆین؟ ناحەقی نەبوو کەسێک کە شارەزا نەبێت و بۆ یەکەمجار بکەوێتە شوێنی واوە لەهەرچوارلاوە شەوقی لامپی کارەبا بداتە چاوی هەر ئەترسێ.

[2] – ئەحمەد عەبدوللا کوردە پیاوێکی بالابەرزی پێکەوتەی گەنم ڕەنگ بوو، کڵاو مشکی ئەبەست و سمێڵێکی سەرنج ڕاکێشی هەبوو، لەشۆڕشی ئەیلولدا پێشمەرگەبووەو دواپلەی فەرماندەی بەتالیۆن بووە، دۆست و خۆشەویستی جەنابی مام جەلال بوو، لە شۆڕشی نوێدا چوار کوڕی پێشمەرگە بوون، بەناوەکانی هەڵۆ، بەرزان، جەزا، نەبەز. ئەو لە تیرەی میراڵەیی سەربەعەشیرەتی سمایل عوزێریە، لەسەر کوڕەکانی لەشاردا ژیانی نامێنێ و ساڵی ١٩٨٥ بە ماڵ ومناڵەوە هاتنە دەرەوە، لەئاوایی زێوێی پیرە مەگرون نیشتەجی بوون.

ئێستا ئێشتان چییە لێرە، لەنێوان خۆیاندا چەند قسەیەکیان کردو ووتیان باشە بابڕۆین، هەستم کرد کێشەیەکیان هەیە. چووینەوە بۆماڵی کاک ئەحمەد، ڕێزی زۆری گرتین و نانمان خوارد، شەویش هەرلەوێ جێگەمان بۆچاک کرابوو بۆ خەوتن، تارانی پێی ووتم ئێمە ئەمانەوێ بچینەوە بۆ مزگەوت کاتی خەوتن دێینەوە، منیش ووتم باشە، ئەوان ڕۆیشتن و زۆریان پێچوو نەهاتنەوە، چوومەوە بۆمزگەوت ئەبینم دانیشتوون و ئەگرین منیان بینی هەستان، چوومە پێشەوە لەتارانیم پرسی چی ڕوویداوە؟ وەڵامێکی لەژێر لێوەوە دامەوە نەمزانی چیووت، دەم و چاویان شۆردو چووینەوە بۆ خەوتن. کاک ئەحمەد پرسی چیان ئەکرد بۆ نەهاتبوونەوە؟ ووتم نازانم کێشەیەکیان هەیە، کەچوومەوە بۆ مزگەوت ئەبینم ئەگرین پرسیومە بۆ ئەگرین وەڵامیان دامەوە تێنەگەشتم، پێم وابێت بیری ماڵومناڵیان بکەن. کاک ئەحمەد ووتی نا، مانگی محەڕەمە.

بەیانی ڕۆژی دوای ئاوای زێوێمان بەجێهێشت، دوای بڕینی ڕێگایەکی هەوراز لەبەرامبەر ئاواییەکەدا لەلاشانی چیایەکەوە ئاودیوی دۆڵی دۆڵەڕووت بوین و ئەو ڕۆژە تائێوارە بەڕێوە بووین قزلەرو مێرگەپان و شەدەڵەمان خستە پشت سەرو گەشتینە سەر ئەو شاخەی سەرگەڵوت لێوە دیارە، لەوێ بەدەستی ڕاستدا بەئۆتۆمبێل چووینە هەڵەدن و لەوێشەوە بۆ بارەگای مام جەلال لەئاوایی یاخسەمەر، مام پێشوازی گەرمی کردین و دوای پشودان و نانخواردن من مۆڵەتم لەمام وەرگرت چوومە بەرگەڵوو بۆ سەردانی چەند برادەرێک.

لەوکاتەدا کاک دارای تەوفیق ئاغا کە ئەفسەرێکی پلەباڵای ناو ئەرتەشی عێراق بوو ڕیزی سوپای بەجێهێشت بوو، هاتبووە دەرە بووبووە پێشمەرگە، لیستی ناوی ئەوکەسانەی کەلەدەروە بوون و پەیوەندیان بەڕژێمەوە هەبوو دابوە مام جەلال. ئەوکاتە قەرارگای ڕەمەزان بارەگایەکیان لەبلکانی ناوچەی قەرەداغ دا هەبوو، ئەم بارەگا چەند پاسدارێکی لێبوو، لەلای بارەگاکەی حیزبی سۆشیالیستدا بوو، سۆشیالیست پاسەوانی ئەکردن، لەناو لیستەکەی دارا دا ناوی پێشمەرگەیەکی سۆشیالیشت بەناوی سەردار ڕەباتی هەبوو، گوایا ئەم سەردارە پەیوەندی بەڕژێمەوە کردووەو بەتەمایە

ئەو پاسدارانەی لەقەرەداغن تەسلیم بەحکومەتی عێراق بکاتەوە، ئەوە بوو ئاگاداری کاکە حەمەی حاجی مەحمود کراو ئەوانیش سەرداریان کوشت.

کاکە حەمە لەم بارەوە ماران گاز بوو، پێشتر چەند فەرماندەیەک لەناو هێزەکەیدا لەوانە ئەحەی ئایش چەند پاسدارێکی کوشت و تەسلیم بەرژێم بوەوە، حەمەقەلی عەبابەیلێی تەسلیم بوەوەو چەند پاسدارێکیشی لەگەڵ خۆی بردوو تەسلیمی عێراقی کردنەوە. من ئەبوو بگەڕێمەوە بۆ هەورامان، وەفدەکەی ئێران لەوێ ئەمانەوە، دوای چەند ڕۆژێک پشودان ومانەوە سەردانی مام جەلالم کردەوەو پێم ووت ئەگەر ئەمرێکت بەمن نەبێ ئەمەوێت بگەڕامەوە بۆ هەورامان، ووتی هیچت پێویست نییە ووتم نەوەڵا هەر سەلامەتی جەنابت، ووتی ئەی ئەو پێشمەرگانەی هاوڕێتن؟ ووتم ئەوانیش داوای سەرکەوتنت ئەکەن، ئەو ڕۆژە مام کەیفی لێ ئەباری بەشەوق و زەوقەوە ڕەوانەی کردین و میوانەکان لای ئەو لەیاخسەمەر مانەوە. لەبابەتەکانی دواتردا لەبارەی هاتوو چۆی ئەوجۆرە وەفدانەوە زیاتر ئەخوێنیتەوە.

# ئەمیر و ئەخزەر

هاوینی ساڵی ١٩٨٦ بروسکەیەکم بۆ هاتبوو لە جیهازی سکرتێری کشتیەوە ئەڵێت: لەگەڵ مەفرەزەیەکدا خۆت بگەیەنە مەڵبەندی یەک بۆ لای شەوکەت، ئەو کات بارەگای مەڵبەند لەئاوایی بەلەکەجاڕی بەرامبەر بەئاوایی سێوسێنانی دۆڵی قەرەداغدا بوو، هەڤاڵ شەوکەتی حاجی مشیر لێپرسراوی مەڵبەند و هەڤاڵان جەمیل هەورامی، مامۆستا ساڵح ماواتی، ئاوات عەبدولغەفور، شێرکۆ جدی، حاکم برایم و چەندین کەسی تر بەرپرس، ئیشوکاری بەشەکانی مەڵبەندیان لە ئەستۆدا بوو. د. فایەق محەمەد گوڵپیش بەرپرسی نەخۆشخانە و ئەندامی مەڵبەند بوو.

هاوڕێی ئازیزیشم شەهید نیازی عیزەت بەرپرسی کۆمەڵایەتی قەرەداغ بوو، کاکە جەعفەری حاجی ئەولەش ڕابەر سیاسی تیپی خەنجەرە بوو کە کاکە سەرحەدی خەلیفەیونس سەرتیپی بوو لەئاوایی سۆڵە جێگیربوون.

پاش نیوەڕۆیەکی دەرەنگی هاوینی ساڵی ١٩٨٦ لەئاوایی هاوارە کۆنەوە لەگەڵ هەڤاڵان ئەکرەم ئەحمەد و مەهدی برام و کەیکاوس بۆینی بەڕێکەوتین، پاش تاریک بوونی هەوا هەورازی تاقەت پروکێنی هاوارە کۆن شنرویمان بڕی و لە شەوێکی نووتەکەدا گەیشتینە سەرکانی و ئاوی وەزگێڵ، لە کاتێکدا ئارەق لە هەموو لایەکی جەستەمانەوە دا ئەچۆڕی، دەممان نایە ئەوکانییە سازگارەو لە دەوری کانی ساتێک پشوومان داو دوای پشوویەکی کورت بە هێواشی ووتم: کەیکاوس بڕۆ. بەڕێکەوتین نیوە شەو گەیشتینە ناوشاری هەڵەبجە، دوایی بەڕێکەوتین و هەروەک هەموو جارەکانی تر دەشتی شارەزوورمان تەی کرد و تادەمە و بەیانی بەڕێوە بووین، بەر لەوەی دنیا ڕووناک بێتەوە لە ئاوی دەریاچەی دەربەندیخان پەڕینەوە بۆئاوایی بێسەڵمێن، کە نزیکەی ٤٠ – ٥٠ ماڵەو کەوتووەتە ناو شیوێک، ئەم ئاواییە سەر بە تیرەی هارونین لە عێلی جاف. ماڵەکانی کەووتونەتە ئەم بەرو ئەوبەری دۆڵەکەوە بە شێوەیەکی نارێک و پێک لەسەر زەویەکی بە درێژی

نزیکەی ١٠٠٠ مەتر خانوەکان بە شاشوشەوێڵی بە دیواری گڵ و دارو قەڕەم سەرگیراون، هەرماڵە و چەند گەلەخانێکی هەیە.

ئاوایی بێسەڵمێن ئاواییەکی خزمەت کارو هەمیشە پێشمەرگەی لێ نەبڕاوە بە ئاشکراو بە نهێنی. چەندین جار ئەم ئاواییە بەهۆی هێرش کردنی سوپا و جاشی ڕژێمی عێراقەوە وێران کراوە و سووتاوە و دواتر دروست کراوەتەوە. ساڵی ١٩٧٩ فەرماندەی قارەمان هەڤاڵ ڕۆستەمی زێبا کە کاتێک لەگەڵ هەڤاڵێکی تر بە ناوی عیزەت تەپی سەفایی لە ماڵێکدا بوون، ڕژێم بەڕۆژ هێرشی کردە سەر ئاوایی و ئەو دووقارەمانە شەڕی مان و نەمانیان کرد تا هەردووکیان شەهید بوون و ماڵەکەیان ڕووخاند و سووتاند بە سەریاندا.

پەڕینەوەی ئێمە لە ئاوی دەریاچەکە بە بەلەمێکی شەق و شڕ بوو کە شەو بێ ئاگاداری خاوەنی خۆی خۆمان لە نزیک ئاوایی ئیمامی زامن سواری بووین بە سەوڵ لێدان بردمانە بەری بێسەڵمێن و لەوێ بە جێمان هێشت. ئەو ڕۆژە بۆ عەسرەکەی گەیشتینە ئاوایی باندەق، لەوێ دوو تراکتۆر پڕ لەپێشمەرگە لە ئاواییەکەوە هاتنە سەرجادە و ئێمەش گەیشتینە لایان. دوای چاک و چۆنی تێگەیشتین کەهەڤاڵانی پارتین و ئەیانەوێت بچنە ناوچەی قەرەداغ، بەرپرسەکانیان هەڤاڵان هۆشمەند یارئەحمەد بەگ کە ئێستا بەرپرسی کۆمەڵایەتی یەکێتیە لە هەورامان و هەڤاڵ محەمەد سعید ناسراو بە حەمەی هەمینە بوون.

چەند پێشمەرگەیەکی شارەزای یەکێتی ڕێنوێنیان ئەکردن، بەرپرسی پێشمەرگەکانی یەکێتیی هەڤاڵ ئەحمەد سۆیلەمیشی بوو. لەوێ ووتیان ئێوە بۆ قەرەداغ ئەپەڕنەوە ئەمانیش لەگەڵ خۆتان بەرن، ئێمە بۆچی بێین و دواتر ئەبێ بگەڕێینەوە ووتم زۆرباشە ئێمەش حەزمان ئەکرد بۆ ئەوەی ماوەیەک بە سواری تراکتۆر بڕۆین، تا نزیک ئاوایی قلیجە تراکتۆرەکانمان برد. لەوێ دابەزین و شەو داهات و ڕیزمان بەست بە جادە و جادە بۆ سەر جادەی سەرەکی سلێمانی دەربەندی خان، کاتێک بەرایی هێز گەیشتنە سەرجادەی قیر، کەسێک بە دەنگێکی ناساز و لە ناکاو میلی کلاشینکۆفی لێراکێشاین ووتی: کێن کوژران کەس نەجووڵێت.

ئێمەش خۆمان دابەزەویدا و وەڵاممان دایەوە تۆ کێیت؟ کەیکاوس و مەهدی لایان لێگرت، دەرکەوت ئەحمەد شەماڵە، لە قەرەداغەوە هاتووە بۆ بەری ناوچەی گەڵاڵی نشینی ئالان و حاسڵ ئەڕوات و بە تەنیاشە. ئەو ئەزانێ بەم ئێوارە لە دەشتەوە پێشمەرگە بەرەو سەرجادە ئەڕوات، ئەمە دوژمن نین بۆیە بە تەنیا و بە دەنگە ناسازەکەی هەموومانی ترساند. زووتر شەهید غەفور دەرەشیشی پێی ئەووت ناشیرینی وەک تۆ نابێت ناوی ئەحمەد شەماڵ بێت حەقە ناووت فەیزە بێت.

بەڵێ دوای یەک ئاشکرا بوون بینیمان هێزەکەی بە دوامانەوە هەموو پەرتەوازە بووە، هەندێکی مەسافەیەکی زۆر گەڕاونەتەوە دواوە، لەوێ بە هۆی فیکە و بانگ کردنەوە کۆمان کردنەوە و چووینە ئەو بەرو بەپەنای ئاوایی سۆفی وەن و چەم و ژاڵەدا نزیکەی کاتژمێر سێی دوای نیوەشەو گەیشتینە ئاوایی زەلەڕەش و لەوێ ماینەوە. هەندیک پێشمەرگە چوونە مزگەوت و هەندێک کەووتنە لێدانی دەرگای ماڵە ڕەش و ڕووت و ڕەجاڵەکانی ئاوایی، بۆچایی و نانخواردن.

من لەگەڵ هەڤاڵ هۆشمەن چووینە ماڵێک تەنیا پیرە ژنێکی ڕەش هەڵگەڕاو دەست قلێشاوی لێ بوو، پێم ووت پوری گیان تۆ دانیشە خۆم چایی دەم ئەکەم، ووتی: نارۆڵە ئێوە دانیشن من نان و چایتان بۆ ئامادە ئەکەم ها سەبرتان هەبێت. دوای دەم کردنی چایی و لە تەیکەیەکدا مووچە یەک نانی ڕەقی دانا و ووتی فەرموون. ئێمە دەستمان کرد بە نان و چایی خواردن زۆر بەلەزەت بوو، ئەویش پرسی لە کوێوە هاتوون؟ ووتمان لە شارەزوورەوە، پرسی ئەری ڕاستە سەرسوورەکان ئەهێننە خوارەوە؟

منیش وەڵامم دایەوە بەڵێ وردە وردە دەستم کرد بە باسی ڕێکەوتن و برایەتی و تەبایی و هەمووڕمان کوردین و پێشمەرگەین و دوژمنمان زاڵمە و سەرسەختە، میمکە ووتی: نا بەخوا باش ناکەن پەشیمان ئەبنەوە، هۆشمەندیش وردە وردە نانەڕەق ئەکرتێنی و لەژێر چاوەوە سەیری پیرەژنەکە ئەکات، منیش ئاماژەم کرد بۆ هۆشمەند بەپەنجەی دەست بۆ سەرلێوم پێم ووت قسە نەکەیت، ووتی باشە.

دوایی هاتینەوە بۆ مزگەوت، هۆشمەند بە کاکە حەمەی ووت وەرە بۆلای ئێمە، لە سوچێکی مزگەوتەکەوە جێگەمان لێ داخست. سێ قوڵی

دانیشتین و هۆشمەند حکایەتی پیرەژنەکەی بۆگێڕایەوە و ووتی بەڕای من هەر لێرەوە بگەڕێینەوە باشترە. کاکە حەمە ووتی بۆ؟ هۆشمەند ووتی ئەمەڕای پیرەژنیان بێت ئای قوڕ بە سەرمان.

بۆ بەیانی ئێمە خوا حافیزیمان لێکردن و ووتم ئێمە ئەچینە مەڵبەند و ئیتر لێرەوە ناوچەی ئازاد کراوە تا ئەگەنە لای هەڤاڵەکانتان لە جافەران. ئێوارەی ئەو ڕۆژە کە هەموو ڕێگاکەمان بەپێ بڕی گەیشتینە سێوسێنان لە ماڵی شەهید نیازی ماینەوە بۆ بەیانی چوومە بارەگای مەڵبەند.

لەگەڵ کاک شەوکەت دانیشتین و بۆی باس کردم کە لە دوای کۆتایی هاتنی و ووتووێژ لەگەڵ ڕژێم ئەمانەوێت لەگەڵ ئێران ڕێک بکەوین و ڕێکیش کەووتووین. دوو کەس لەسنوری سەر دەشتەوە هاتوونەتە ئەم دیو ناوچەکە گەڕاون و زۆربەی هێزەکانی یەکیەتیان دیووە و ئەزانن کەیەکێتیی چەندە بە هێزە و چەندە سنوری ئازاد کراوی لە قوو لاوەیی خاکی عێراقدا لە دەست دایە.

ئێستا ئەیانەوێت لەگەڵ تۆ بێن و بیان بەیتەوە بۆ هەورامان و لەوێوە بچنەوە ناوخاکی ئێران بۆ ئەوەی لەوێوە ڕێگەیەکی هاتوو چۆ بکەنەوە. منیش ووتم چۆن چۆنی بچینە ناوخاکی ئێران؟ ئەو سنوورە مەیدانی شەڕی عێراق و ئێران و هەموو مەیدانی مینە و کەس ناتوانێ هاتووچۆ بکات، دوای ئەم ووتوێژەی ئێمە، کاک شەوکەت دوو کەسەکەی بانگ کرد و منی پێناساندن و ئەوانیش دوو کوڕی گەنج بوون یەکێکیان بە ناوی ئەخزەر و ئەوی تریان بە ئەمیری عەرەب خۆیان ناساند، هەردوو زمانی عەرەبیان بە باشی ئەزانی.

نەخشەیان لە بەردەم خۆیاندا دانا و ئەو ڕێگای تا ئەگەیتە ئاوایی هاوار لە سەر نەخشەکە بۆم دیاری کردن، بۆپەڕینەوە لە ئاوی سیروان و بڕینی مەیدانی مین و گەشتنیان بۆ یەکەم خاڵی پێشەوەی ئێران کە ڕەبیەی کونەکەڵ بوو لە نێوان ئاواییەکانی زی و بەلە بزاندا، ووتیان ئەوە بهێڵە بۆ ئێمە.

بەڵێ بڕیار درا زۆر بەنهێنی و هەتا بەشێک لەهەڤالانی بەرپرس و ستافی مەڵبەند نەزانن و بەشێوەیەکی نهێنی خۆمان بگەێنینەوە سنوری هەورامان. دوای گەیشتنمان منیش لەگەڵیان بچمە ئێران و لەوێوە بچمە لای بەرپرسی تیپی ٧٥ ی زەفەر لە مەریوان ئەوان کارئاسانی و کاری سەرەتایی

بکەن بۆ کردنەوەی ڕێگای هاتوچۆ لە ئێرانەوە لەسنوری شاری پاوە و ناوچەکەوە بۆ هەڵەبجە و شارەزوور و قەرەداغ.

پاش نیوەڕۆیەک لە بەلەکەجاڕەوە کەوتینەڕێ، مەسافەیەک ئۆتۆمبێل تا نزیک ئاوایی مچە کوێرە هاتین لەوێوە سەرکەوتین و بۆ عەسرێکی درەنگ گەیشتینە کانی بەکر، کە ئەنوارێت بە سەر دەشتی شارەزوور دا و شارۆچکەی عەربەت و سەیدسادق و سلێمانیشی لێوە دیارە. ئێمە خۆمان بوارد و لەئاوایی سۆڵە لە سەرکانی بەکر دووبارە نەخشەکەیان ب لاوەکردەوە و ئینجا بەدووربین سەیری ئەو ڕێگایان ئەکرد کە شەو لەپێشمانە، لە ناکاو ئۆتۆمبیلێکی جێب لە دیوی سۆڵەوە هات و گەیشتەلامان، ناسراوبوو شۆفێرەکە ناوی کامیل مەحمود خەڵکی تەوێڵە و هاتوچۆی سنوورەکەی ئەکرد، زۆرتر خێزان و کەس و کاری پێشمەرگەی ئەهێنا و ئەبرد.

لە لای ئێمەدا وەستا و ووتمان زۆرباشە تا ئاوایی زەلەڕەش سوارمان بکە. جەماعەت خۆیان پێچایەوە و سواربووین. لە کانییەکە کەمێک دوورکەوتینەوە کامیل بە منی ووت ئەمانە کێن؟ ووتم ئەمە عەسکەری هەڵهاتوون، ووتی: خۆعەرەبن؟ ووتم بەڵێ.

کامیل پرسیاری کرد خەڵکی کوێن؟ ئەمیر ووتی بەغدا. پرسی: بەغدا کوێ؟ ووتی: ئەعزەمیە، کامیل ووتی ئەم قسەکردنە هی ئەعزەمیە نییە. من تووڕە بووم لە کامیل و ووتم وازیان لێ بێنە. زانیم کامیل ئەزانێت ئەمانە شتێکن، کە گەشتینە لای ئاوایی زەلەڕەش ووتم ئێمە لێرەدا دابەزێنە، دابەزین و پرسیم بەیانی دێیتەوە؟ ووتی: بۆ؟ ووتم ؛ سێ جووت پێ لاوە و دوو مریشکمان بۆ بهێنە. ووتی باشە، ووتم پارەت بدەمێ؟ ووتی نا با بەیانی کە هاتمەوە. من بۆیە ئەمەم بە کامیل ووت وابزانێت ئەمشەو لە زەلەڕەش ئەبین و نەزانێ بەرەو لای هەورامان ئەڕۆین. ئەو دەرچوو بەرەو سەرجادە و لەچاو وون بوو، ئێمەش کەوتینەڕێ بۆ نزیک ئاوایی چەم و ژاڵە.

شەو لە جادە لە نزیک ئاوایی میرە دێ پەڕینەوە و لە بەردەم قلیجەوە بێ ئەوەی لە هیچ ئاواییەک لابدەین دەمەو بەیانی گەیشتینە کانی و نەیجەلانی بەرامبەر قۆرتاس لە کەنار دەریاچەکەدا خۆمان شاردەوە تا ئێوارە. ماڵێکی خەڵکی ئاوایی کانی بەردینە لەو نزیکانەدا زەراعەتیان کردبوو

خێزانی ماڵەکە ناوی دادە پەروین بوو، ژنێکی بەخزمەت بوو، نانی نیوەڕۆی بۆچاک کردبووین و لای ئەوان نانمان خوارد، دوای عەسر کە خۆر زەردەی دایە چیاکانی شنروێ و سوورێن، پەڕینەوە بۆ بەری گورگەچیاو ئەو شەوە تا بەیانی رێگەمان بڕی و لە نێوان ئاوایی بیاوێڵە و دەواجنەکانی دەرەشیشەوە سەرکەوتین، کاتێک گەیشتینە سەرجادەکە ئەمیر و ئەخزەر ئەیانووت لێرە نوێژ ئەکەین، پێم ووتن ئەم لاو ئەولامان سەربازگە و ڕەبیەیە، بە زۆر دامنەبەر و ڕۆژهەڵات لە ناو باخەکانی سەرکەنی تاوێرە خۆمان شاردەوە تا ئێوارە، ئینجا کەوتینەوەڕێ لە ملەی هەیشور داگەڕاین و بەرەو هاوار لە سەرکانی و ئاوی هەیشور بارەگایەکی حیزبی دیموکراتی لێ بوو لامان دا، ئەم بارەگا هی نەقڵ کردنی ئازووقە و خواردەمەنی بوو لە هەڵەبجە وە بۆ بنکە و بارەگاکانی حیزب لە دەرەتفێ و نەوسوود و ناوچەکە، بەرپرسی بارەگاکە کەسێک بوو خەڵکی شارۆچکەی نۆدشەبوو بە ناوی ئەحمەد فەرەنجی. ئەحمەد چایی بۆ دەم کردین و مریشکی سوورکردەوە و تێرمان خوارد و بەپەنا سەربازگە و ڕەبیەکانی ناوهاواردا خۆمان گەیاندەئاوایی هاوارە کۆن.

هاوارە کۆن یەکێکە لەو سێ ئاواییە کاکەیی نشینەی سنوری فەرمانداری هەڵەبجە و ناوچەی هەورامان، ئەکەوێتە سەرچۆمی گریانە و تەوێڵە، ئەم چۆمە لە بەرزایەکانی تەوێڵە و بەڵخەوە سەرچاوە ئەگرێ و لە نزیک ئاوایی گریانە ئەڕژێتە ناو سیروان، لەئاوایی دزاوەری کوردستانی ڕۆژهەڵات لقێکی سەرچاوە ئەگرێ و لە ناو شارۆچکەی تەوێڵە دا لەگەڵ لقێکی تری کە لە ئاوێسەرەوە سەرچاوە ئەگرێ یەک ئەگرنەوە بەرەو خوار تا نزیک ئاوایی هاوار نزیکەی ١٠ چۆمی تری بچوک بچوک بە بەهاراندا ئەڕژێنە سەری، لە نزیک ئاوایی هاوار لە جێگەیەک بە ناوی سۆڵە چۆمێکی تر کە بەهاوین و بەهاردا ئاوی لێ نابڕێ لەئاوایی بەڵخە و شوان گێڵەوە سەرچاوە ئەگرن یەک ئەگرنەوە، بەرەو خوارتر دەرەی دواوانی هاوار و چۆمی شنروێ کە لە ناو ئاوایی هاوار یەک ئەگرنەوە لە دووری ٧٠٠ حەوت سەد مەتر لە خوار ئاوایی هاوارەوە ئەوانیش دێنەوە سەر چۆمی تەوێڵە وگریانە. بەڵام ئەم دوولقە زیاتر بە بەهاردا ئاویان لە سەرەو بە هاوین زۆر کەم و هەندێک ساڵیش وشک ئەبن، ئەم چۆمە بە بەردەم ئاوایی هاوارە کۆندا

ئەڕوات و ئاوایی گریانە بەجێ ئەهێڵێ و لە خوارو گریانەوە بەدووری دوو هەزار مەتر ئەڕژێتە ناو ڕووباری سیروانەوە.

هەموو باخ و باخاتی ئاواییەکانی دزاوەر – تەوێڵە – سۆسەکان – بەڵخە – پالانیا – دۆلبیان – جاور – هاوار – هاوارە کۆن و گریانە بنەوانی جۆگەکانیان لە سەر ئەم چەمە و لقەکانییەوە ئاو وەرئەگیرێ و ئاودێری باخ و مەزراکانیان ئەکرێ. هاوارە کۆن جگە لەچەندین جۆگە کە لەم چۆمەوە وەرئەگرێ دووکانی بە ناوبانگیان هەیە، یەکەم کانی هاوارە کۆن دووەم میری سوور، کە جێگەیەکی پیرۆزی ئەهلی هەق و ڕێبازی یاریە. ئاوایی هاوارە کۆن بەر لەڕاگواستنی لەسالی ١٩٧٩دا ١٠دە مال بوون. خەڵکەی هاوارە کۆن خەریکی باخ داری و ئاژەل داری بوون. جگە لەمەش جەنگەل و دارستانێکی زۆری دارقەزوانیان هەیە کە بنێشتی لێ بەرهەم ئەهێنن. هاوارە کۆن قەلایەکی کۆنی سەردەمی خۆی بووە، وە لە سەر ڕێگای هاوار هاوارە کۆن نزرگەی ئەحمەدی هاواری هەیە.

ئەد مۆندز لە کتێبی کورد و تورک و عەرەب دا لەگەشتێکی لە هەڵەبجەوە بۆ سازان و کۆساوا و بۆین و هاوارە کۆن و هاوارو تەوێڵە. باسی هاوارە کۆن ئەکات، لەڕوویی مێژووییەوە دێێکی کۆنە. ئەگەر لە ناو ئاوایی کۆنی هاوارە کۆن و سەرقە لاوەە بەرەو باشوری ڕۆژهەلات سەیربکەین زنجیرەیەک ماو گابەردی بەرز و هەزار بە هەزار لەگەل لووتکەی قەنارەکە و چالە خرە و دۆلی دەرەبەند زەوار دیمەنی زۆر ترسناک و سەخت و بەرز ئەبینی. بەرەو خوار بە سەر ڕێڕەوی چۆمدا سەیربکەیت دۆلێکی قوول ئەم بەرو ئەو بەر دارستان و جەنگەلی چڕی داربەڕوو دارقەزوانە. ئەو بەری ئاوی سیروان ناوچەکانی زی و هێرتاو مایگەزەن و کەژی شەولان و وشکەناوت لێوە دیارە کە هەموو بە جەنگەلی چڕی سەر سەوز داپۆشراوە سەر بەکوردستانی ڕۆژهەلاتە.

ئێمە لە کاتی سەرەتای شۆڕش و شەڕی پارتیزانیدا زۆرجار لەم ئاواییە و لە ناو باخ و چۆم و سەر کانیاوی ناو جەنگەڵستانەکانیدا پشوومان ئەدا و خۆمان حەشارئەدا. سەرەتای سالی ١٩٨٠بەرلەوەی بنکە و بارەگا لەئەشکەوتەکانی کەنار ڕووباری سیروان و وێرانەی ئاوایی گریانەوە بگوازینەوە بۆ ناو هاوارە کۆن، بۆ ماوەی یەک مانگ مالی ئێمە باوکم و

دایکم و منداڵەکان توانای گەڕان و جەولە کردنیان نەبوو، لەکونێکدا گوزەراندیان، ئەو کونە لەدەستەڕاستی ناو دەربەندی دەربەند زەباردا بەبەرزایی شاخەکەوەیە، مرۆڤ تانەچێتە بەردەمی نەلەخوارەوە و نەلەهیچ لایەکەوە دیار نییە، ئەوان لەوێدا ئەژیان، ئێمە ناوچەکەمان بەجێ هێشتبوو.

لە ماوەی ئەو مانگەدا بەڕۆژ لە ناو کونەکەدا بوون و هەموو شەوێک دوای تاریک بوون بە کۆڵ منداڵەکانیان هێناوەتە خوارەوە بۆ سەرئاوەکە، دەم و چاویان شۆردون و پێویستی سەرئاویان جێبەجێ کردەوە و مەتارەیان پڕ لە ئاو کردووە و کاتژمێر نزیکەی ١٢ی نیوە شەو چوونەتەوە ناو کونەکە تا سەر لە ئێواری ڕۆژی دوایی. ئەو ماوەیە تەنیا چاییان لێناوە بە ئاگر، ئیتر ئەگەرنانیان بووبێ بەچاییەوە خواردوویانە. باقی خواردنی تر وەک نیسک، نۆک، برنج، گەنم کردوویانەتە ناوئاو، دوای خوسانەوە و نەرم بوونی خواردوویانە چونکە ئەو ماوە ناوچەکە چۆڵەوانی و ناوچەی قەدەغە کراو(محرمە) بوو، ڕژێم لە دیوی عێراق و هەم لە دیوی ئێران هەرکەسی ببینیایە بە کۆپتەر ئەچوونە سەری. دوای ئەوماوە ئێمە گەراینەوە ناوچەکەو منالەکانیش لەکونەکەدا هاتنە دەرەوە.



[illegible]

شەڕی عێراق و ئێران گەرم بوو ماڵەکەمان بەئاشکرا کەپرو ساباتیان لەناوباخەکانی هاوارەکۆندا دروست کرد، کەرتەکانی سنوری هەڵەبجە و دواتر تیپی یانزە١١ی هەورامان بنکە و بارەگامان بردە سەرکانی میری سوور و ئاوایی هاوارەکۆن ئاوەداز بووەوە، وردەوردە هەموو خەڵکی ئاوایی لە هەڵەبجەوە بۆی گەڕانەوە و ماڵی سەربازی هەڵاتو(فیراری) پێشمەرگە، هاتنە سنوورەکە و وایلێهات نزیکەی ٧٠ هەفتا ماڵی لێ بوو هەتا کیمیاباران کردنی هەڵەبجە و دواتر ساڵی ١٩٨٨ لە کاتی وەستانی شەڕی عێراق و ئێران و پاشەکشەی هێزەکانی ئێران و دەرپەڕاندنی هێزی پێشمەرگە، هاوارە کۆن ناوەند و بنکەو بارەگای پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانی و وتیپی١١ی هەورامان بوو.

مالی ئێمە پێشترو لەکۆتایی سالی ١٩٧٨ دا لەپەروونی و شۆشمێ بوون، سالی١٩٧٩ ماوەیەک لە قەلاگا و ماوەیەکی تر لە جێگەیەک بە ناوی مەنگە کوێر لە دیوی کوردستانی ڕۆژهەلات لەسەر سنوور بوون. ماویەکی تر لە تەنگەی دەربەند زەوار و بگاری دەرتفێ و لە کولێن دەشت و دواجار لەهاوارە کۆن گیرسانەوە. لەم دیوو و لەو دیووی سەر سنوور سالی ١٩٧٨ بۆ١٩٨٨ ژیانیان گوزەراند. ئەو ڕۆژەی کە ئەمیر ئەخزەرم لە قەرەداغەوە هێنا و شەو گەیشتینە هاوارە کۆن بردنمە مالی خۆمان، مالمان لە سەرکانی لای قەلای هاوارەکۆندا بوو. کەگەیشتینە پێشەوە شەو بوو، ماندو و هیلاک بووین، بۆ ئەوەی پێشمەرگەو خەلکیش نەیانبینێ نەچووینە بارەگا، مالی خۆمان لە کەپرەکەدا بوون، لەوێ لێی خەوتین بۆ نیوەڕۆ هەستاین بۆ نانخواردن، ئەدیبەی خوشکم نانی ئەکرد، هەمیشە ئامادە بوو بۆ نان کردن. ئەبینم ئەمیر و ئەخزەر لەجێگەکانیاند نەماون، هەستابوون و چووبونە دەرەوەی باخ و کەپرەکە بەدووربین سەیری ناوچەکەو دەورو بەریان ئەکرد، ئەو شەوە لەوێ مابنەوە، بەیانی ڕۆژی دواتر لە هاوارە کۆنەوە لەگەل چەند پێشمەرگەیەکی تری خەلکی ئاوایی گریانە ڕۆیشتینە سەر ئاوی سیروان لەم بەر ئاو مەیدانی مینی حیزبی دیموکرات بوو لەو بەر ئاویش مەیدانی مینی ئێران بوو. ئەبوو خۆمان دەرنەخەین بۆ ئەوەی لە کونەکەلی سەر جادەی دوو ئاو –سەرپێل کەپایەگای پێشەوەی سوپای پاسدارانی لێبوو، تەقەمان لێ نەکەن. بە شوێنێکی چەپەک و نادیار لە کونەکەلەوە چووینە سەر ئاوی سیروان. ئەخزەر خۆی ڕووت کردەوە تەنیا پانتۆلێکی کورت و کراسێکی لە بەردابوو بە مەلە چووە ئەو بەر لەوێوە سەرکەوێ و ئاگاداری جەماعەتی سوپا بکات و ئینجا بێتەوە بە دوای ئەمیر و من و پێشمەرگەیەکی تردا کە خەلیل ڕێشاوی بوو. ئەم دوانەمان ئەچوین بۆ ئێران لەگەلیان.

ئەخزەر بە ناو مەیدانی میندا سەرکەوت و هەورازێکی بڕی نزیکەی ٥٠٠ پێنج سەد مەترە لە ئاوەکەوە بۆ سەرجادەکە و ئێمەش بە دووربین لە خوارەوە تەماشا ئەکەین. چونکە ئەوەیەکەم جاربوو خەلک بەڕۆژ لەوێوە بە ناو مەیدانی میندا بچێت بۆ ناو ڕەبیەی سوپای پاسداران. هەر ڕۆیشت و دەنگ نەبوو، چاومان لێبوو چووە ناو ڕەبیەکە، پاش کەمێک چەندین ئۆتۆمبێلی عەسکەری لە لای دوئاوەوە هاتنە ڕەبیەکە. ئینجا نزیکەی ١٠

دەکەس هاتنە خوارەوە شەشیان لێبوون بە حیمایەی چواریان و چوارەکە نزیک بوونەوە بۆ سەر ئاوەکەو هاتنە بەرامبەر ئێمە، لەوێش دووکەسی تر وەستان و دوانیان هاتنە گوێ ڕووبارەکە.

من و ئەمیریش بەمەلە چووینە ئەوبەر، کەل و پەل و تفەنگ و تاقمەکانمان لەگەڵ خەلیل بەگوریس لەم بەرەوە ڕاکێشانە ئەوبەر. لەو بەرەوە چاک و چۆنیمان لەگەڵ دوو کەسەکە کردو من بانگم کردەوە بۆ ئەم بەر، ووتم بە جەماعەت بڕۆن خوا حافیزتان.

ئەوانەی لەلاماندا بوون ووتیان ئەوانە بۆ کوێ ئەچن؟ ووتم ئێمەیان ڕەوانە کردووە و ئەگەڕێنەوە، ووتیان نابێ ئەبێ بێنە ئەم بەر، زۆری خایاند تا تێمان گەیاندن، دوای ئەوە ئەوانەی سەرەوە کەپاسەوانی ئەمان بوون ئەوانیش میلی چەکیان لێخوڕی و ووتیان ئەوانەی ئەوبەر بۆگەڕانەوە؟ دووبارە بانگمان کردن بوەستن و جارێک مەڕۆن و ئەمیرەکە چووە سەرەوە قسەی لەگەڵ کردن. ئێمەش کەوتینەڕێ و برادەرەکانمان هەر لەم بەر ئاو مابوونەوە، ئەوانیش هاشم بۆینی و ئەسکەندەر گریانەیی و چەند پێشمەرگەیەکی تربوون. لەوێ بەرپرسی ئەم پایەگا کورد و خەڵکی ئاوایی خانەگای لای پاوە بوو بەناوی حەمەنەزیف، من قسەم لەگەڵ کرد و تێگەیشـــتن، ئەسکـــــەندەرو پێشمەرگەکان گەڕانەوە ئێمەش بەهەورازەکەدا بەناو میندا بەرەو کونەکەڵ ڕۆشتین. کەچووینە سەرەوە ئەمانە وا تێگەیشتوون ئێمە پێشمەرگەی حیزبی دیموکرات یان مجاهیدینی خەڵقین هاتوین تەسلیم بین، کاتێک من ئەمویست



قسەیان بۆ بکەم دوو پاسدارەکەی هاوڕێمان ئەمیر و ئەخزەر ئەیانووت ئێوە قسە مەکەن و وەڵامیان مەدەنەوە. دەرکەوت کاتێک ئەخزەر هاتووەتە ناو ڕەبیەکە خەریکی نانخواردن بوون پاسەوانیان نەبووە نەیانزانیوە تا چۆتە ناویان. ئەوە بووە کێشە بۆیان، ئەو سەیارانەی لە دووئاوەوە هاتبوون ئێمە سووار بووین و لەگەڵیان ڕۆیشتین. ئەو دووربینەی کەپێمان بوو خەریک

بوو لە بیرمان بچێت لای پاسدارەکان کە داوامان کرد بیدەن، ئەیانووت بۆ ئێمە، ووتمان نایدەین هی خۆمانە. حەمە نەزیف بە زمانی هەورامی بە منی ووت ئەم دووربینەم بدەرێ ئەگەر لەپاوەدا مایتەوە پاداشتت ئەدەمەوە. لە هیروێ لامان داو دیارە لەوێ شوێنی فەرماندەیی و قەرارگای ئەو سنوورە بوو یان ئەو جەبهەبوو. یەکێک دواتر بوو بەبرادەرمان و ناوی حەمەنەعیم بوو خەڵکی پاوە و فەرماندەی گروهان بوو، پرسی لە من ئێوە دیموکراتن ووتم نا ووتی ئەی چین و.... ئەمیرەکە بانگی کرد ووتی بۆتان نییە پرسیار بکەن. ئێمە لە جێگەیەکدا دانیشتین و ئەوانیش لەگەڵ کەسێکی فارسدا کەمێک دوورکەوتنەوە و چەند قسەیەکیان کرد.ئینجا ئۆتۆمبێلێکی تایبەت هات و ئێمە سواربووین بۆ کرماشان. ئێوارە درەنگ بوو لە کرماشان لە جێگەیەکدا دابەزین سەربازگە و هێزێکی زۆری لێبوو کاتی نوێژ کردن بوو، هەموو دەستیان کرد بە نوێژ کردن لەحەوشەیەکی زۆر گەورەدا، من و خەلیل لە کەنارێکەوە وەستاین تانوێژ تەواوبوو. نانیان داینێ و شەو لەوێ خەووتین. بۆ بەیانی ئەمیر وئەخزەر هاتن و خواحافیزیان لە ئێمە کردو ووتیان ئەوە نووسراومان بۆ کردوون و ئۆتۆمبێل ئامادەیە ئێوە ئەچن بۆ مەریوان تۆ لەگەڵ کەسێک دا کەناوی محەمەد مقدەم تهرانی یە قسە و گفتوگۆ ئەکەن بۆ کردنەوەی ئەو رێگەیە کە دوێنێ لێیەوە هاتین.

بەیانی زوو ئێمە لەگەڵ خەلیل بە ئۆتۆمبێلێکی سەربازی شۆفێرەکەی ناوی ڕەزا بوو بەرێکەوتین، ڕەزا ریشێکی کورتی هەبوو تەمەنی نزیکەی ٤٥ بۆ٥٠ ساڵ بوو. زۆر بە خێرایی لێی ئەخوڕی، هەرچەند ئەمووت بۆ لەسەر خۆ ناڕۆیت؟ ئەیووت دوورە. چووینە ناو مەریوان دوو کاتژمێر ڕۆژی مابوو. لە مەریوان لە جێگەیەکدا کۆمەڵێک بینای زۆربوون کە پێشتر واتە پێش چەند ڕۆژێک تەیارەی عێراق لێیدا بوون زۆریان ڕووخا بوون.

لەوێ ووتیان مقەدەم تارانی لە دزڵیە، گەڕاینەوە بۆ دزڵی لە لای ئاوایی بیەکەرە بەدەستی ڕاستدا لاماندا و کەمێک ڕۆیشتین، ڕەزا وەستا ووتم چییە؟ ووتی: بابگەڕێینەوە بۆ مەریوان بەیانی بێینەوە. ووتم بۆ؟ ووتی دەرنگە منیش شارەزابووم، ووتم: ١٥ خولەکمان ماوە با بڕۆین، ووتی (اینجا جنگل زیاد است سەتا بچەدارم) بەپەنجەی دەست ئاماژەی بۆ ملی کرد ووتی زد ئینقلاب سەرم ئەبڕن. منیش ووتم لە سەرمن بڕۆ هەموویان ئەناسین

بشمان گرن من دەبمە کەفیل تۆ ناتگرن، بەترسەوە پێی لێدا گرت و لە سێڕای حیزبو لاوەە (بیەکەڕە) بەرەو دزلێ بە دەربەندێکی سەخت و دڵگیر دا چووینە ناو دزڵی....

لەوێ پرسیارمان لە خەڵک کرد بارەگای تیپی ٧٥ی زەفەر کامەیە؟ خەڵک پیشانیان داین، لێرە لەدزڵی برادەرانی پارتی ئێمەیان بینی و منیان ناسی، چووینە دۆڵ و تەختایەکەی پشتی ئاوایی دزڵی، لەوێ مقدەم تارانی و چەندین بەرپرسی تری پاسدارانی لێ بوو لەوانە سادقی، گەنجی، هیمەت، گوڵزارە سوور. دوای چاکوچۆنی و پشوویەکی کورت، نامەکەم دایە دەست محمد مقەدەمی تارانی، دوای خوێندنەوەی ووتی ئەمشەو و لێرە میوانی ئێمەن و بەیانی قسە ئەکەین، ئیتر ووتوێژ لەسەر زاڵمی بەعس و وێران کردنی ئاواییەکان و شەڕەکانی هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی و سوپای عێراق دەستی پێکرد.

لەناکاو حەرەسەکەیان هاتەژوور قسەیەکی کرد لەگەڵ گەنجی و ئەویش بە مقدەمی ووت ئاغای حاجی مەحمود هاتووە، ووتیان بە من زەحمەت نەبێ برۆنە پشتی ئەو پەردە لە ناو سوولەیەکی درێژدا بووین تارانی چوو بە دەمیەوە و کاکە حەمەی حاجی مەحمود خۆی کرد بەژووردا. (سوولە:ژێر زەمینی درێژو زۆر قووڵە بۆ خۆپاراستن لەلێدانی قەسفی تۆپو تەیارە)، دوای دانیشتن و بەخێرهاتنی ووتی کوا میوانەکەتان ووتیان میوان کێیە؟ میوانمان نییە، ووتی با کاک حەمەی حمە سەعید هاتوە لێرەیە، هاتن بۆ لای من ووتیان ڕازیت کاکە حەمە بتبینێ. ووتم ئەی بۆ نا، هاتمە دەرەوە لەگەڵ کاکە حەمە باوەشمان بەیەکدا کرد و ئەملاو ئەولای یەکمان ماچ کرد و دانیشتین، کاکە حەمە ووتی بچین بۆ ماڵی خۆمان، ئەوان ووتیان نابێ و میوانی ئێمەیە، کاکە حەمە ووتی ئێوەش وەرن. تارانی و گوڵزارە سوور گەنجی و چەند کەسی تری ئەوان و ئێمەش لەگەڵ کاکە حەمە هاتینە ناو ئاوایی دزڵی بۆ ماڵی کاکەحەمە میوانێکی باشی کردین.

چەند کەسێک هاتن ووتیان ئەوە برادەرانی پارتی هەندێک هات و چۆی نائاساییان لەم دەورو بەرەدا هەیە، تارانی گەنجی نارد بۆ لایان لێی پرسیبون ئەوەچییە؟ ئەوانیش وتبوویان ئەوە مەسئولی جەلالیەکانە لەماڵی کاکە حەمە، ئەویش وەڵامی دانەوە ئەوە میوانی ئێمەن.

شەو کاتێک ووتیان بابڕۆینەوە کاکە حەمە ئەوانی ناردەوە، نەیهێشت ئێمە بڕۆین، لە ماڵی ئەوان، بەیانی چووینەوە بۆ لای مقدەم، گفتوگۆمان کرد لەسەر چۆنیەتی کردنەوەی ڕێگاکەی سەر سنوور ووتی خۆم دێم بۆ پاوە ئەچینە شوێنەکەو لەوێ بڕیاری لێئەدەین، لەڕێگای سنەوە ئێمەی ڕەوانەی لای پاوە کردەوەو ئێوارە گەیشتینەجێ شەو لەوێ ماینەوە ئۆتۆمبێلێک و دووکەسمان لەگەڵدابوو. بۆ بەیانی مقدەم خۆی لەڕێگای دالانییەوە هات بۆ پاوە دوای کۆبونەوەیەک لەگەڵ ئیدارەکانی ئەوشارە بەرپرسی ئەو جەبهە و چەندکەسی تری هێناو هاتینەوە بۆ کونەکەڵ، لەوێ بڕیار درا ئێمە لە هەمان ڕێگاوە هاتوچۆ بکەین، کەلێیەوە چووینەتە ناو ئێران، ئەویش ڕێگای پایەگای کونەکەڵە بۆ سەرئاوی سیروان و پەڕینەوە بۆ کولێن دەشت.

دەستەیەکی پەیوەندی لە قەرارگای ڕەمەزان لە هێرتا بارەگا بکەنەوە. هەرکات ئێمە بمانەوێ بچینە ناو ئێرانەوە پایەگای کونەکەڵ ئاگاداری ئەوان بکات و بێن بە دەممانەوە. لەبەری لای ئێرانەوە هەموو ئەلغامەکان ئەوان لایانبەن کە ئەکەونە سەر ڕێگاکە و لای کولێن دەشتیش قسە لەگەڵ حیزبی دیموکرات بکەین ئەوانیش ڕێگاکەمان لەم بەرەوە بۆپاک بکەنەوە. بەڵێنیش بدەن لەوڕێگەوە مەفرەزەیان دزەنەکات بۆناو ئێران، ئەیانوت دەبێ ئێوە ئەو مەسئولیەتە وەرگرن و زەمانەت بدەن. ڕێگای سەر ئاوی سیروان بۆ کونەکەڵ شاخێکی سەخت و هەورازەو پێشتر قەد ڕێگا نەبووەو تازە خۆمان ئەیکەین بەڕێگە..

بەڵێ ئێمە گەڕاینەوە و چووینە لای حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و بۆمان باس کردن ئەم ڕێگایە ئێمە هاتوچۆی پێدا ئەکەین لەبەری لای کولێن دەشتەوە ئەو ئەلغام و تەڵانەی ئێوە داتانناوە هەڵیگرنەوە و پارێزگاری و ئەمنییەتی ئەو سنوورەش بۆ ئێمە بپارێزن. واتە مەفرەزەکانی حیزب لەو ڕێگاوە کە ئەڵغامەکانی لێ هەڵگیراوەتەوە هات و چۆنەکەن و نەچنە ناو ئێرانەوە، تا ئێرانییەکان بیانوویان نەدرێتە دەست و کێشەو گرفت بۆ ئێمە دروست بکەن. حیزبی دیموکرات بەڵێنیان داینێ، بەڵام من هەمیشە لە دڵەڕاوکێدا بووم نەوەک لەو ڕێگایە کەڵک وەرگرن و بچنە سەرپایگای کونەکەڵ.

دوای ئەو سەفەرە بۆ جاری دووەم ئێمە ویستمان بچینە ئەو بەرەوە بۆ ئەوەی چەند بریندارێک بگەیەنینە ئێران، لە ئاوەکە پەڕینەوە، لە ناکاو کەوتینە ناو مەیدانی مینەوە، کەسەکان بریتی بووین لە من و ئەسکەندەرو نوری گریانەیی و حەکیمی مەلاسالح، کاتێکمان زانی ئەسکەندەر کە لەپێشەوە بوو دەنگی هەڵبڕی ئەمە هەموو ئەلغامە، خۆمان وردە وردە ڕێگەمان کردەوە، شارەزای ئەڵغام هەڵگرتنەوە بووین، هەموو کەپسولەکانمان لێکردنەوە، لەملاو لەولاوە دامانئنان، لەبەر خۆمانەوە دەمانگوت ئەمەکاری حیزبی دیموکراتە. دوای ئەوەی ڕێگەکەمان پاککردەوە و گەشتینە سەرجادەی زی و هێرتا، پیاوێکی بەسیج لەوێ بوو پێی گووتین چۆن هاتنە سەرەوە؟ وتمان بۆ؟ ووتی هەر ئەو کاتە و جاری پێشوو دوای گەڕانەوەی خۆتان هاوڕێکانتان ئەو ناوەیان ئەلغام ڕێژ کردەوە، مەبەستی پاسدارەکانی قەرارگا بوو، ئێمە پێشتر گومانمان وابوو کە برادەرانی دیموکرات ئەو ئەلغامانەیان چاندووە، بەڵام وا دەرنەچوو. هەر پاسدارەکانی قەرارگای ڕەمەزان خۆیان ئەو کارەیان کردبوو.

کە سەرکەوتینە سەرەوە جەماعەتی قەرارگا هاتن بەدەمانەوە، پرسیاری ئەوەیان کرد چۆن توانیتان بێنە ئەمبەرو و سەرکەوون؟ منیش ووتم: تۆڕی ئەلغامەکان کەئێوە داتان نابوەوە هەموومان هەڵگرتنەوەو هاتینە لاتان. بەڵام بە داخەوە کابرای بەسیج سەری بەفەتەرادا چوو، دەبوو ئێمە نەمانگوتایە کە ئەو شتی وەهای پێگوتوین. بەهەر حاڵ ئێمە حیکمەتی کارکردن و هۆشیاری خۆمان بۆ ئەوان دەرخست و توانیمان هەموو پلانەکان بپسێنین و لە سەر بەرنامەی خۆمان سەرکەوتن بە دەست بێنین. ئیتر بە شێوەیەکی فەرمی حەکیم مەلا ساڵحمان لەوێ لەپایەگای هێرتا بەجێ هێشت وەک بەرپرسی پەیوەندیەکان و خۆمان گەڕاینەوە بۆگریانە وهاوارە کۆن.

# پاییزی ۱۹۸٦ لە گوندی یاخسەمەر

لەدوای تەشکیل کردنی بنکەی شنرۆێ ودەست کردن بە کار و چالاکی مانگی٩ / ۱۹۸٦ لە هاوارە کۆن لەگەڵ دوو پێشمەرگە بەناوەکانی نەسیم هادی عەزیز و ئازاد عەنەبی بەرێکەوتین بۆ شارەزوور. هادی عەزیز باوکی نەسیم لەگەڵ مەهدی عەزیزی برایدا دوو کەسایەتی تێکۆشەری سەردەمی دوای شۆڕشی ١٤ تەمموزی١٩٥٨ بوون و خەڵکی شارۆچکەی تەوێڵەن، هەردووکیان تا ئەوکاتەی کۆچی دواییان کردووە بۆیەک ساتیش لە خەبات و تێکۆشان لایان نەداوە. مەهدی عەزیز پیاوێکی زیرەک و خوێندەوارو هەوڵی زۆری داوە بۆپێگەیشتن و پێشکەوتنی خەڵک لەو سەردەمەدا لە هەورامان. لە سەرەتای شۆڕشی چەکداری ساڵی١٩٦١ و پێش هەڵگیرسانی شۆڕشیش لەڕیزی کوردایەتی دا جێگەی دیار و بەرچاو بووە لە خزمەت کردن و کوردایەتیدا.

دوای تێپەڕبوون بەئاواییەکانی دەشتی سەر سەوزو خورەمی شارەزووردا، زۆری مەسافەکە بەناو چۆڵەوانی و تەختایی دەشت و کەندەڵان و جۆگەو جۆگەلەیی باریک باریک و هەندێک جار بەناو پوش و پەڵاش و جار جایش بەناو توودڕک و قەڕام و لەهەندێک شوێنیش بەناو بۆیسان و کشتوکاڵی جووتیارەکاندا، دیمەنێکی دڵفرێن و قەد لەیاد نەکراوی لە مێشکمدا تۆمار کردووە، گەیشتینە نزیک زەڕایەن و شەو لە شەقامی سەرەکی دەربەندیخان _سلێمانی پەڕینەوەو بۆ دەمەو بەیانییەکی دوای دەرکەوتنی ئاسۆی دەم کەلان گەیشتینە ئاوایی کانی هەنجیری بنار چیای سۆڵە. لێرەوە ناوچەکە ئاوەدان و جێگەی حەوانەوەی پارتی زانەکانی هەرێمی ٥ پێنجی پێشتر و تیپی٥٥ی قەرەداغی ئێستایە.

پاش پشوودانێک بۆ ماوەی چەند رۆژ، لەگەڵ مەفرەزەیەکی ئەو سنوورەدا کە بەرپرسیان نوری حاجی عەلی (نوری زەڕنگەر) بوو بەبناردا بەئاواییەکانی ئاوەکەڵە بۆ زرگوێز لەوێشەوە بۆ لای هەزار مێرد و جەیشانە بەرامبەر بەشاری سلێمانیدا نیوە بەسواری تراکتۆرو نیوە بەپێ ئەو

سنوورەشمان تەی کردو بۆ عەسرێکی درەنگ کە جارجار لێرەو لەوێ لەنێوان ئاواییەکانیان لەسەر کانیاو بن داراندا ئەگەیشتینە ئەو مەفرەزە و پێشمەرگانەی کەهەندێکیان مۆڵەت درابوون و هەندێکیتر خۆیان ئامادە ئەکرد شەو دابێت و بچنە ناو شاری سلێمانی بۆ لێدانی دوژمن، دەمەو ئێوارە برماندایە ئاوایی تەپەرەشی نزیک بەکرەجۆ کەلەگەڵ بردانی ئێمە بۆ ناو ئاوایی و گەیشتنی ڕانەمەڕو گاگەل، باعەباعی بەرخ و قوڕەی مانگا وگوێلک ئەتووت ڕۆژی حەشرە.

لەوێ دوای ئەوەی هەرکەسەو لە دەستەڕاست و دەستەچەپی ڕێزگرتووی خۆمانەوە بەپەلە بەرەو دەرگای ماڵان ئەچووین، سەلام ئاتوخوا پورێ گیان دوو نانم بەرێ. ئەی بەچاوان فەرموون.

هەربەدەم برینی ڕێگاو بەجێ هێشتنی ئاوایی تەپەرەشەوە هەموو نانمان وەرگرت و بەپەنای بەکرەجۆدا ڕۆیشتین کاتێک گەیشتینە نزیک ڕێگای سەرەکی سلێمانی-کەرکوک چەند پێشمەرگەیەک بەپسکەپسک و سرتە سرت هاتن و چوون، نۆپێش و بۆدوا یەکێکیان گەڕایەوە بۆ لای ئێمەو ووتی یالا، زووکەن بپەڕنەوە، ئێمەش لەجادەی قیر بەخێرایی چووینە ئەوبەرو دوای برینی ماوەیەک بەدەستەڕاستی سەرچناردا بۆ دۆڵەڕووت، بەدرێژایی ئەو سەوە بەڕێوە بووین دەمەو بەیانی زوو گەیشتینە نزیک ئاوایی قزلەر و ئاوایی هەنارانمان خستە دواوە. لەم سەفەرەدا مەفرەزەیەکی ناوچەی شۆڕشگێڕانیش هاوڕێمان بوون، حەمە فەرەج محەمەد بابا کە پێشتر لە هەورامان پێشمەرگەو لای خۆمان بوو، بەڵام دواتر گوازرابوەوە بۆ لای قەرەداغ هاوسەفەرمان بوو. حەمە فەرەج حەمە بابا خەڵکی شارۆچکەی تەوێڵەیە و پیاوێکی قارەمان لە شۆڕشی ئەیلولیشدا پێشمەرگە بوو بوو. حەمە فەرەج بە لێوەشاوەیی و ئازایەتی خۆی هەرزوو پلەکانی پێشمەرگایەتی بڕی و دواجار فەرماندی فەوج بوو کە بەداخەوە لەساڵی ١٩٨٦ شەهید بوو.

دوای گەیشتنمان بۆسەرگەڵوو دەوروبەری. ئێمەچووینە یاخسەمەر بۆ لای جەنابی مام جەلال. بارەگای مام جەلال لەسەر کانی و ئاوی پشتی دێدا کەوتبوە بنار کێوەکە ڕیزێک خانوو کە لە خانووەکانی پێشتر و ناو زەنگ ، بەرچاوتر و پاک و تەمیزتر و گەورەتر بوون دروست کرابوون.

ئەوکات چەند رەبیەیەک بۆپاسەوانی لەم بارەگا دانرا بوون، لەلای دەستەڕاست لەسەر گردۆلکەیەک مەفرەزەیەکی چەند کەسی ڕێکوپێک و پاکوتەمیز هەموو پێشمەرگەی عاقڵ و هەڵسوکەوتیان جیاواز لەپێشمەرگەیتر، لەوانە عومەرو ئەنوەری مارف و پەرۆش و ئاوات و چەند کەسی تر بوون، ئەو دوو پێشمەرگەی لەگەڵ من بوون. لای ئەوان بوون و منیش تا ئەو ماوەیەی کە نزیکەی ١٠ڕۆژی خایاند لای ماڵ و بارەگای مام بووم و جارجاریش ئەچووم بۆ لای ئاوات و برادەرەکانیان. ئەوکاتە بەختیار و وشیار کاکەیی برای ئیش و کاری مام جەلالیان لە ئەستۆ بوو لەو بارەگایەدا.

کوڕێکی خەڵکی ناوچەی بارزانیش لەوێ میوان بوو بەناوی عەبدول زوهێر پیان ئەووت سەیدا. گوێزێکی گەورە لە بەردەم بارەگای مام جەلالدا بوو، گوێزی زۆری پێوە بوو، گوێز پێگەیشتبوو، هەرمام ئەچووە خوارەوە ئێمە دارێکی کورت هەبوو نیومەتر ئەمان گرتە لقوپۆی گوێزەکە بە جارێک نزیکەی ٢٠تا٣٠ دانە گوێز ئەهاتە خوارەوە. هەرجارێک مام ئەهاتە سەرەوە ئەو ڕۆژە کەس سەیری گوێزەکەیشی نەئەکرد، سەیدا ئەیووت ئەم ڕۆگوێز نینە. مامۆستا مەلا عەلی بیارە و مامۆستا مەلا مەحمودی ئازادی و دوو مامۆستای تر ئەو چەند ڕۆژە میوانی مام بوون و زۆرباش میوان دارییان ئەکردن و خزمەت ئەکران، ئەو ڕۆژەی کەڕۆیشتن خواحافیزیان کرد مام جەلال دەمانچەی پیشکەش کردن، دوای هاتن بۆلای ئێمە هەر لە تەنیشت ئەو میوانخانەی کەچەند ڕۆژ بوو لەوێ بوون بۆ خواحافیزی. باسی چاکەو پیاوەتی و قسەی خۆشی مام جەلالیان کرد ووتیان پێی وتوین ئێوە مامۆستای ئایینی خەڵکی فێری ئەلف بێ ئەکەن، من ئەلف ها ئەوان چوارکەس بوون و دەمانچەیان وەرگرتبوو، بۆیەیەکێک لەوانەی دەمانچەی بەرنەکەوتبوو بەوانی تری ئەووت مام جەلال ئەو دەمانچەتان بە دۆشکە لێ ئەسەنێتەوە، نازانم مەبەستی چی بوو. هەر ئەم هەفتە هێزی پێشمەرگە لەگەڵ چەندین پاسدار کەخەدەمەی تۆپ و کاتیۆشا بوون چووبوونە خوارەوە بۆ لێدانی چاڵە نەوتەکانی کەرکوک. ئێمەیش لەرێ توشیان هاتین ئەوە بوو پێشتر باسم کردووە سەلاحی عەزە سمێڵەمان لە لای میرگەپان بینییەوە لەگەڵ ئەو هێزەدا ئەچووە خوارەوە بۆ قەرەداغ.

کەسێک لەلای دەستەچەپی میوانخانەو چێشتخانەکە شوێنێکی هەبوو جیهازێکی ڕاکاڵی دانابوو بەناو ساڵحی کەدواتر من لە شاری پاوەی پارێزگای کرماشان بینیمەوەو ماوەیەک بەرپرسی ئیدارەی ئیتلاعاتی شاری پاوە بوو. سەر لە بەیانییەک زوو کەڕۆژی ١٩٨٦/١٠/١٠ بوو مام خۆی هەستابوو هەمووومانی لە خەو هەڵساندو ووتی بچنە ژێر زەمین و کونە تەیارەکان، دیارە شەوەکەی هێزی پێشمەرگە لەگەڵ سوپای پاسداران تۆپ باران و کاتیۆشا بارانی چاڵە نەوتەکانی کەرکوک و دەور و بەریان کردبوو.

مام پێش بینی ئەوەی ئەکرد کە هێزی ئاسمانی عێراق بێتوو بدات لە بنکەو بارەگاکانی. مام ئێمەی بە زۆر ئەناردەژێر زەمینەکان و خۆی لە دەرەو، منیش تاقەتم نەئەگرت لەژێر زەویدا زوو زوو ئەهاتمە دەرەوە مام لێمان توورە دەبوو. جا من حەز ئەکەم ئەگەر تەیارەکەیش بمکوژێ چاوم لێی بێت نەک تەیارە قەسف بکات و من لەژێر زەویدابم چاوم لێی نەبێ. کاتژمێر بووە نزیکی ١٠ی سەرلە بەیانی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی وڵاتی ئێران دوای لێدانی مارشی جەنگی ب لاوەیان کردەوە کە سوپای پاسداران لەناو قوڵایی خاکی عێراقدا ئۆپراسیۆنی جەنگیان ئەنجام داوە بەناوی فەتحی یەک. هەر کە مام جەلال گوێی لەمە بوو بە کۆپاڵەکەیەوە چووە سەر ئاغای ساڵحی و ویستی لێی بدات، ئەو کەسانەی لە دەورووبەری مام دا بوون گرتیان و نەیان هێشت، بەلام وابزانم هەریەک دوو گۆپاڵی پێدا کێشا. بۆیە بۆپاش نیوەڕ ڕاگەیاندەکانی ئێران دەقی هەواڵەکەیان گۆڕیو بەم شێوە ب لاوەیان کردەوە. ڕزمندەگان اسلام و پێشمەرگان اتحاد میهنی کوردستان............ بە هاوبەشی عەمەلیات فتحی یەکیان ئەنجامداوە.

پاش چەند ڕۆژێک لەم لێدانەی کەرکوک ئیش و کاری منیش لای مام تەواو بوو لەرێگەی سەفرەو زەرونەوە پەڕینەوە بۆ بەری ئالان و لەوێوە چوومە سەردەشت لەوێ پەیوەندیەکان وەرەقەی هاتوچۆیان بۆکردین و ئەو شەوە چووینە سەقز. بەیانی ڕۆژی دواتر لەرێی سەقزەوە بەرێکەوتین بۆچنارەی مەریوان چووینە ئاوایی دزلی. مام نامەیەکی دابوومێ بۆمحەمەد موقەدەم تارانی بەرپرسی تیپی ٧٥ زەفەر. شەو لە ماڵی خاڵە زۆراب لەدزلی ماینەوە. بەیانی سەردانی موقەدەم تارانیمان کرد، س لاوەیی مام جەلالمان پێ گەیاند، ماوەیێک پێکەوە ووتوو وێژمان کرد سەبارەت بە بارەگای

پەیوەندیەکان لە هێرتاو بریار درا پێکەوە سەردانی هێرتا بکەین، لە ناوچەی مەریوانەوە چووینە پاوە بۆ پاش نیوەڕۆیێکی درەنگ گەیشتینە هێرتا. کانی و ئاویی سازگار و چنارە شۆخوو شەنگەکەی سەری دیمەنێکی سەرنج ڕاکێشی بەخشیوە بە ئاوایی وێرانەکراەکەی هێرتا. ئاوایی هێرتای ئێناخی نشین بەهۆی شەڕی عێراق و ئێرانەوە چۆڵ کراوە. بەرلەوەی نان بخۆین تارانی منی بانگ کردو لەجەماعەت دوور کەوتینەوە، دەستیکرد بە ژێر چاکەتەکەیدا و دەمانچەیێکی چواردە خۆری دەرهێناو دەستی ڕادا بۆ من وتی: فەرموو ئەمە دیاری منە بۆ تۆ، لێم وەرنەگرت ووتم سوپاس من دەمانچەم هەیە، زۆر ئینکاری کرد کە وەریگرم هەروەرم نەگرت. دڵگران بوو ووتی بۆ؟ ووتم با پرس بکەم بۆ جارێکی تر، ووتی پرس بە کێ ئەکەی؟ ووتم بە مام جەلال، ووتی دەی باشە ئێستا ئەچین نان ئەخۆین تا پرس بەمام جەلال نەکەی نابێت نان بخۆیت. ووتم نا ئەوە شتێکی ترە، گەڕاینەوە لای جەماعەت، نەسیم هاتە لامەوە ووتی: چاکت کرد ئەو دەمانچەت وەرنەگرت، بەرلەوەی دوور کەونەوە من ویستم پێت بڵێم دەمانچەت ئەداتێ وەرینەگری، بەڵام مەجال نەبوو، ووتم تۆ چۆن زانیت دەمانچەم ئەداتێ؟ ووتی: ئەو دەمانچەی لە گەنجی هاوڕێی وەرگرت تۆ ئاگات لێنەبوو، من زانیم لەوی وەرگرتوو یەکسەر تۆی بانگکرد.

## سەفەری ئێران و بردنەوەی ڕەحیمی و زولقەدر

لەهاوینی ساڵی١٩٨٧ مەڵبەندی یەک هەڤاڵ شەوکەتی حاجی موشیر لێپرسراوی بوو گۆڕا بە هەڤاڵ جەبار فرمان، بارەگای مەڵبەند لەئاوایی بەلەکەجاڕی ناوچەی قەرەداغدا بوو. منیش لەهاوارە کۆن لە بارەگای بنکەدا بووم. ڕۆژێک بێسیمچی (عەدەدجهاز) پەیامێکی جەنابی مام جەلالی بۆ هێنام، نووسراوە بەگەیشتنی ئەم بروسەکە، خۆت و مەفرەزەیەکی جێگە متمانە بڕۆ بۆلای شەوکەت بۆ مەڵبەند.

بەڵێ ئێوارەیەک وردە وردە لە هاوارە کۆنەوە بەڕێکەوتم و کاتێک هەوا تاریکی کرد لەبن ڕەبیەکانی ئەشکەمۆڵ و عەزیز ئەتروشیەوە دابەزیمە خوارەوە بەرەو ئاوایی عەبەبایلێ، دوای ئەوەی گەیشتینە دەشت بەرەو ئیمامی زامن بەتەنیشت هەڵەبجەدا ڕۆیشتین و گڵۆپەکانی شار ئەیدا لەچاومان و بەشەوارە کەوتبووین، لە هەندێک شوێندا تووشی پەرژینی باخ و بێستان ئەبووین، ماوەیەک دوای ئەخستین و ئێمەش ئەبوو دوانەکەوین و بەر لەوەی ڕۆژمان لێ بێتەوە لە دەریاچەکەی دەربەندیخان بکەینە ئەوبەر. ئەوەشەوە تا بەیانی ڕۆژهەڵات بەڕێوەبووین، ڕۆژەکەی لەسنوری ئاواییەکانی بەری ئالان و حاسڵ پشوومان داو نزیک بووینەوە لە سەرجادەی گشتی سلێمانی- دەربەندیخان.

هەوا تاریکی کرد و پەڕینەوە بۆلای ئاواییەکانی کولەبی و چەموژاڵە ئەو شەوەش تا کاتژمێر دوانزەی شەو ڕێگەمان بڕی و لەئاوایی بەردەکەڕ لێی خەوتین تا ڕۆژبوەوە، دووبارە درێژەمان دایەوە بەپیادە ڕەوی، عەسری ئەو ڕۆژە گەیشتمە بەلەکە جاڕ. سەردانی ماڵی کاک شەوکەتم کرد و لەوێ دووکەسی لێ بوو، کاک شەوکەت منی بەوان ناساند، ئەمانە پلەدارو بەرپرسی، سوپای پاسدارانی ئێران بوون[١]، سوپاو بەرپرسەکانی ئێران لە

---

[١] - دوو بەرپرسەکەی سوپای ئێران، یەکێکیان ناوی ڕەحیمی بوو، پیاوێکی باڵا مامناوەندی ڕەشتاڵەی کورجوکۆڵ. بەتەواوەتی نەمزانی ئەو کات بەرپرسایەتی چی بووە؟

دوای رێکەوتنی ئێمە لەگەڵ ئێران و کۆتایی هاتنی ووتووێژی یەکێتیی و رژێمی عێراق لەساڵی ١٩٨٥ دا ئەم جۆرە سەردان و بەسەرکردنەوانەیان ئەکرد، بۆ تێگەیشتن و وەرگرتنی زانیاری لەسەر هێزو توانایی یەکێتی. چونکە پێشتر و لە شەڕی ناوخۆ و لەکاتی وتووێژەکەدا لایەنەکانی بەرەی (جود) ئێرانیان واتێگەیاند بوو کەیەکێتي هێزێکی بچووکەو هەتا وایان گەیاندبوو کەژێر بەژێر پەیوەندییان لەگەڵ عێراق هەیە، بۆیە بە ئاسانی ئەتوانن لە قوڵایی خاکی عێراقدا بن.

ئەمانەش کە سەردانیان ئەکرد سەرسام بوون بە تواناو هێزی یەکێتیی و کەسایەتی جەنابی مام جەلال، چونکە تاکە هێز بوو سکرتێر و سەرکردایەتی و فەرماندەکانی لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان و لە ناوچەرگەی رژێمدا بن و خەبات بکەن و ئەو دەست وەشاندن و شەڕە گەورە و بچووکانە رۆژانە ئەنجام بدەن. ئەیانووت، پێیان وتووین یەکێتیی هەموو مزگەوتەکانی داخستووە. ئەوشەوە لەوێ بووین زۆر قسەو باسمان پێکەوە کرد لە سەر وەزعی ناوچەی هەڵەبجە و شارەزوور و دەربەندیخان و دەریاچەی دەربەند. لەسەر نەخشەی جەنگی ئەو رێگا لەقەرەداخەوە بۆ سەرسنووررو سەر ئاوی سیروان کەئەبوو پێیدا برۆین بۆم دیاری کردن.

چوونی من بۆ ئەوێ، بۆ ئەوەبوو ئەوانە لەرێگای هەڵەبجەوە بگەیێنمەوە خاکی ئێران. شەو تا دەرنگ نەخەوتین، ئەوان زۆر وەسفی یەکێتیی و ئازایەتی هێزی پێشمەرگە وەک هێزێکی شۆرشگێرو بێوێنەیان لە شۆرشەکانی جیهاندا وەسف ئەکرد، هەروەها زۆر سەرسام بوون بەو تەشکیلات و ئیلتیزام و لەخۆبردوی و نیزامەی کە لە ناو ئەم هێزەدا هەبوو، ئەوان بینیبوویان، هەروەها رابەرایەتی کردنی جێگەی سەرنجی ئەوان بوو. باسیان ئەکردئەیانوت ئێمە تا نەهاتین و بەچاوی خۆمان نەمانبینی قەد بە بیرماندا نەهاتووە یەکێتي نیشتمانی کوردستان خاوەنی ئەم هێزو تواناو ئەو

---

پێم وابێ بەرپرسی پەیوەندییەکانی قەرارگای رەمەزان بوو، ئێستا رەئیسی دەفتەری مەجلسی شورای ئیسلامی ئێرانە واتە بەرپرسی مەکتەبی سەرۆکی پەرلەمانی ئێران. کەسی دووەم ناوی محەمەد باقری زولقەدر بوو، ئەم پیاوە ئەوکات فەرماندەی سوپای پێنج رەمەزان بوو، ئێستا یەکێک لەجێگرەکانی سەرۆکی قوەی قەزایی ئێرانە.

هەموو ناوچە ڕزگار کراوانە بێت. پشتیوانی و پێگەی جەماوەری یەکێتی لە ناو شارە گەورەکان و لە ناو دێنشینانداو کاری ڕێکخراوەیی بەشێوەی نهێنی و ئاشکرا لە شارەکان و ئاواییەکانی ژێر دەستی ڕژێم و هەم لە ناوچە ڕزگار کراوەکاندا ئەوانی زۆر دڵخۆش کردبوو، وە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر باسیان ئەکرد. بەتایبەت ناوچەکانی گەرمیان.

ڕۆژی دوایی کە بڕیاربوو کاک شەوکەتیش لەگەڵیان بێت و سەردانی ئێران بکات بۆچارەسەری نەخۆشی، پێکەوە لە بەلەکەجاڕ دەرچووین بەئۆتۆمبێل هاتین تا ئاوایی دووکان، لەوێ لەماڵی ئاوات قارەمانی کە ئەوکات سەرتیپی ٥٥ ی قەرداغ بوو لامان داو نانمان خوارد و پشووماندا. کاک ئاوات برایەکی لەشەڕی عێراق - ئێراندا دیار نەمابوو، بێسەرو شوێن بوو، حەزی ئەکرد سەردانی ئێران بکات بە تایبەت کاتێک ئاغای ڕەحیمی و زولقەدر بەڵێنیان پێدا پێیان ووت ئەگەر بێیت بۆ ئێران هاوکاری ئەکەن بۆ دۆزینەوەی براکەی. ئەویش دوای ئەوە بروسکەی بۆ مام جەلال کرد و مۆڵەتی لە جەبار فرمان وەرگرت، هات و پێکەوە کەوتینەڕێ. جگە لەو پێشمەرگانەی لەگەڵ من بوون مەفرەزەیەکیشمان لە قەرەداغەوە هێنا بۆ ئەوەی ئەو شەوە تاسەر دەریاچەی دەربەند لە شارەزوور لەگەڵماندا بێن.

ئەو مەفرەزەش حەمەتۆفیق گەلاڵی و ئەحمەد سۆیلەمیشی و چەند پێشمەرگەیەک بوون. بڕیاربوو لەسنوری قەڵبەزەو کانی بەردینە بمێنینەوە. بەلام جگە لەوەی کاک شەوکەت خۆی پیاوێکی وریابوو گوێی بە هیلاک بوونیش نەئەدا، پێم ووت هەرچۆن بووە ئەمشەو تابەیانی ڕێگە بکەین و لەم سنوورە دەرچین.

بڕیار درا نەوەستین، هەتا نزیکەی کاتژمێر دوانزەی شەو ڕێگەمان بڕی، هەندێکیش بە سواری تراکتۆر تاگەیشتینە سەر دەریاچەی دەربەندیخان لە ئاست شارۆچکەی سیروان‌دا. لەوێ مەفرەزەکەی قەرەداغمان گەڕانەدەوەو پێمان ووتن ئێوە لە مەولا پێویست ناکات بێن و بڕۆن، خواحافیزیمان لێکردن، ئەوانیش زۆریان پێخۆش بوو، یەکەم لەبەرئەوە ئەچنەوە سنوری ئاواییەکانی خۆیان و دووەم لەڕێگە بڕین ڕزگار ئەبن. لەگوێی ئاوەکەدا بەلەمێکی بێ ماتۆڕمان دۆزیەوە بە دووجار چووینە ئەوبەر، بەری هەڵەبجە، بەلەمەکەمان بەجێهێشت و کەوتینەوە ڕێگا بڕین بەپیادەڕەوی.

دوای نیوەشەوێکی درەنگ بەرەو ئاوای بەشارەت و لە جادەی گشتی هەڵەبجە-پردی زەڵم پەڕینەوە. کاک شەوکەت خوییەکی هەبوو، هەمیشە لە شارەزووردا لەگەڵ هێزی زۆر یان مەفرەزەکەی خۆیشی نەئەخەوت، شەو خۆی و یەک دوو پێشمەرگە ئەڕۆیشت خۆی ون ئەکردو سبەینێ دوای نیوەڕۆ یان سەر لەئێوارە ئەهاتەوە، چەندین جار وایکردووە لەگەڵ مندا. ئەوەش بۆ ئەوەبوو هێزی زۆر لەوانەبوو تووشی شەڕ ببێت بەڵام دوو سێ کەس کەمتر تووش ئەبوون. ئەو هەمیشە خۆی لائەدا لەو شەڕانەی کەخۆی بەرنامەی بۆدانەنێ و بەڕێکەوت تووش ببێت.

جارێـک هـاوینی سـاڵی ١٩٨١لە هەورامـانەوە پـێکەوە دابەزیـن بـۆ شارەزوور، کاتێک گەیشتینە پشتی ئاوایی تەپەکورە پێی ووتم، حەمە من سەردانی ماڵی باوکم لە تەپی سەفائەکەم، ئێوە لەم ئاواییانە پشووبدەن و نان بخۆن و لەچەمی شەشکدا بمێننەوە، من بەیانی دێمەوە بۆ لاتان. خۆی و مستەفای حەمەی شـەمە ڕۆیشـتن، مەفـرەزەکەی خـۆی تـایەرە بچـکـول بەپرسیان بـوو لای مـن بەجێهێشـتن و ئـێمەش پـێکەوە بـووینە نـزیکەی ٢٠ بیست پێشـمەرگە، ئەوشـەوە دوای ئەوە کـاک شـەوکەت لێمـان جیـابووەوەو ڕۆیشت، ئێمە چووین بەرەو ئاوایی تەپەکورە، دووکەسمان لەپێشەوە نارد بۆ تاقیکردنەوەی ئاوایی، ئەو دووکەسە شەهید لەتیف سـاڵح عەنەبی و نەبەزە سووری عەبابەیلێی بوون، خۆیشم لەگەڵ باقی هێزەکەدا هاتینە سەر جادەو وردە وردە لە سـەرجادەکە لەڕوی هەڵەبـجەوە ئەچـووە نـاو ئـاوایی نزیـک ئەبوومەوە، لە ناکاو دەست ڕێژی کلاشینکۆف کرا لە لەتیف نەبەزو ئەمانیش وەڵامیـان دایەوە، ئـێمە پێمـان هەڵگرت بەرەو شـوێنی تەقەکـان، بینـیم نەبەز بەڕاکردن گەڕایەوە، پرسیم ئەو تەقەچی بوو؟ بە شڵەژاوی ووتی تەقەیان لێ کردین و نازانم چی بوو، پرسیم ئەی لەتیف کوا؟ ووتی وابزانم شەهید بوو. دوای ماوەیەکی تر ڕێگە برین بەرەو شوێنی تەقەکان لەتیف لەسەرخۆی هات و کاتێک گەیشتە لامان پرسیم چی بوو کاک لەتیف؟ بەلەسەر خۆیی ووتـی نازانم، کۆمەڵێک چەکدار بوون لەو ماڵانەی ئەمسەر ئێمەیان بینی تەقەیـان لێکردیون و ڕایان کرد منیش دوو دەستڕێژم لێ کردن.

دوایی دەرکەوت برادەرانی پارتی بوون عوسمانی حاجی عبدالکریم خەڵکی بەشارەت بریندار بوبوو، دواتر ئێمە ڕۆیشتین و سبەینێ پاش نیوەڕۆ کاک شەوکەتمان بینییەوە. بەڵی بابێینەوە سەر باسەکەی خۆمان.

شەو گەیشتینە بەشارەتی خواروو، کاک شەوکەت منی بردە لاوەو ووتی ئەمانە با لەگەڵ خۆت بن بچنە بەشارەت لەوێ خۆتان بشارنەوە (ئیختیفا)بکەن، من سەرێک ئەدەم لە تەپی سەفا و سبەینێ دێمەوە بۆ لای ئێوە، خۆی و کەسێکی تر ڕۆیشتن. منیش لەگەڵ ئاوات قارەمانی و ڕەحیمی و زولقەدر و مام هادیشمان لەگەڵ بوو دەمەو بەیانی زوو گەیشتینە ئاوایی بەشارەتی سەرو. ئاوایی بەشارەتی سەروو خزمانی نەورۆڵین و خاڵوانی کاک حامدی حاجی خالید ماڵیان لێرەیە. ئەمانە زۆر جێگەی متمانە و خەڵکی دڵسۆز بوون. دوو ماڵمان دیاری کرد هەر لەو ماڵانەی کە جێگەی سیقەو متمانە بوون لەنزیک یەکدا داینەوە، من و هەردوو میوانەکەو کاک ئاوات و مام هادیشمان ئەو سەفەرە هێنابووەوە پێکەوە بووین لە ماڵێکدا پێشمەرگەکانیش لە ماڵێکی تردا.

بەیانی خاوەن ماڵ چوو بۆ هەڵەبجەو لای نیوەڕۆ گەڕایەوە، ووتی هێز سەرجادە گشتیەکەی گرتووە بەرەو ئیمامی زامنیش هێز ئەڕۆیشت و حکومەت هجومی کردوە بۆ لای بەری عالان و حاسڵو ئەوبەری دەریاچەکە. من یەکسەر زانیم هەواڵی ئێمە دراوە بەحکومەت، مام هادی کەم تەحەمول بوو ئەیووت دێنە سەرمان با لەم ئاواییە دەرچین، ووتم مام هادی بەم ڕۆژە بۆ کوێ بڕۆین؟ ئاوایی بێشکترین جێگەیە، ڕەحیمی پرسی چییە؟ چی شدە؟ ووتم هیچ نییە، بۆئەوەی نەترسن، دوای عەسرێکی درەنگ پێموت حکومەت هجومی کردووە بۆ ئەو ناوچەی ئەوبەر کە شەو لێیەوە هاتین. ووتی خاوەن ماڵ لەهەڵەبجەوە هاتەوە پێکەوە قسەتان کرد، زانیم شتێک ڕوویداوە بەتایبەت بەدەموچاوی مام هادی دا، بەڵام سیمای تۆدا زانیم هەرچی هەیە گرنگ نییە.

نانی ئێوارەمان خواردو کاک شەوکەتیش هاتەوە بۆ لامان، مەگەر هەرخۆی و خوا زانیبێتی لە کوێ بووە، چوونکە هەرجارێک کە ئەڕۆییشت ئەیووت تۆ بڕۆ لەگەڵ ئەم هێزە بۆ فلان شوێن منیش ئەچم بۆ فلانە جێگا لەڕاستیدا نەئەچووە ئەو شوێنەی کە بە ئێمەی ئەووت.

بەڵێ بۆ شەوی دووەم دەستمان کردەوە بەپیادە ڕەوی و تاریکی کرد گەشتینە بنارو بەچەمی دەرشیش و سەرکەند و تاوێرەدا سەرکەوتین، کاتژمێر یەکی شەو گەیشتینە ئاوایی هاوار، هاوار ڕەبیە و عەسکەری سوپای عێراقی لێیە، چەند ماڵێکی حیزبی دیموکرات و بارەگایەکی پەیوەندیەکانی حیزبی دیموکراتیشی لێیە. ئەو ماڵانەی کە ئێرانی بوون لە هاواربوون خەڵکی بەلەبزان و ئاوایی شۆشمێ بوون. ماڵی ئەبوبەکر شۆشمێی عەزیمە خانی خێزانی کچی حاجی ئیبراهیم بوو زۆر خزمەتی ئێمەی کردووە، هەم ئەوکات کە سەرەتاو سەردەمی ئینقلاب بوو ئێمە ئەچووینە ئاواییەکانی ئێران ئەوان ماڵیان لە شوشمێی سەرو بوو هەم دوای ئەوەش کە ئاوارە بوبوون و ماڵیان لە سەر ڕێگای هاوار - هاورەکۆن و هاوار دەرەتفێ بوو، بەردەوام ماڵەکەی میوانی لێ نەئەبڕا.

ئەمشەو لانادەمە لای ئەوان بۆ پشوودان و نانخواردن نەوەک کێشەیان لای حیزب بۆ دروست ببێت، بۆیە بوومەوە بەمیوانی بارەگای حیزبی دیموکرات، ئەحەمەد فەرەنجی پێشمەرگەی حیزبی دیموکراتی ئێرانە و مریشکی بەڕوبەهەنار سوور کردەوە بۆمان، بێ خەیاڵ نەئەپرسێ ئەمانە کێن، نەهیچ قسەیە ئەکات جگە لەدڵسۆزی و میوانداری، بەڵام ڕەحیمی و زولقەدر پرسیان ئەمە کوێیە؟ ئەمانە کێن؟ وتم ئەمە بارەگای حیزبی دیموکراتە. بەگاڵتە و پێکەنینەوە زدی ئینقلاب. پێشتر ئەمیرو ئەخزەرم هێنابووە ئێرە. دوای دەمکردنی چایی و دانانی نانی هەورامی ناسک ئێمەش بەوهیلاکیە نان وچایمان خواردو زوو ڕۆیشتین بۆ ئەوەی ڕووناک نەکات لەبەردەم ڕەبیەکانی دوژمنەوە تێپەڕببین.

لەگەڵ ڕوورناکی بەیانیدا گەیشتینە هاوارە کۆن و چووینە ماڵی باوکم لەسەرکانی قەڵای هاوارەکۆن. میوانەکانم نەبردنە ناوبارەگای پێشمەرگە، لەوێ پرسیان ئەم خانەوادە کێن ووتم ماڵی باوکمەو پێشمەرگەن، ئیتر لەوێ پێم ووتن تەواو لە مەترسی ڕزگار بووین و بۆ خۆتان بخەون و حەقی ئەم دووشەوە بکەنەوە. ئەو ڕۆژەو شەوەکەی پشوومان داو ئەوان پەلەیان بوو، ئینجا بەرەو گریانە و سەرئاوی سیروان کەوتینەڕێ، مەفرەزەیەک پێشمەرگەمان لەگەڵ خۆمان تائاوایی شێخان برد، لەوێ بارەگای سوپای پاسدارانی لێیە، مەفرەزەکە گەڕانەوەو منیش لەگەڵیان ڕۆیشتم بۆ ئێران.

پێکەوەچووینە کرماشان، شەو لە ئوتێل جێگەیان بۆ ئامادەکردین، دوای چەند ڕۆژێک ئۆتۆمبێلێک و شۆفێرێکیان خستە ئیختیارمان، ئۆتۆمبێلەکە سایەقەکەی کوڕێکی گەنج بوو بە ناوی ئەکبەری بەخشی، ئێمەی برد بۆ تاران لەوێ لە ئوتێل هویزە دوو ژووریان بۆگرتین نزیکەی ١٠ دە ڕۆژ



ماینەوە و سەردانی نەخۆشخانەمان کردو پشکنینی تەواویان بۆ کردین. من یانزە ساڵ بوو لەچیا بووم و ئەوە یەکەمجار بوو بچمە شارو نەخۆشخانەو لای دوکتۆر.

لەوێ ئاغای ڕەحیمی هاتەوە سەردانی کردین و ووتی بۆ ناچن سەرێک لەشماڵ بدەن؟ ووتمان ئەچین و پێشمان خۆشە، سەفەرێکی سێ ڕۆژەمان بۆ ئەوێ کرد. لەساری کاک شەوکەت لەو ئوتێلەی شەو مابووینەوە دەمانچەکەی بەجێ هێشتبوو لەچالوس گەڕاینەوە، کاتێک گەشتینە بەر دەم ئوتێلەکە من چوومە سەرەوە بینیم خانمێک ژوورەکە پاک ئەکاتەوە، من دەستم برد بۆژێر سەرینێک دەمانچەکەم دەرهێناو هاتمە دواوە، پاش گەڕانەوەمان لەشماڵ هاتینەوە بۆ تاران، ئێوارەیەک دووبارە ڕەحیمی هاتەوە بۆلامان و ووتی سبەینێ ئێوارە میوانین لەدەفتەری ئاغای ڕەفسنجانی، ئێوارەی ڕۆژی دوایی چووینە جێگەیەک بەناوی شهرکی شهید کلادوز لەوێ لە ڤێلایەکدا ئاغای ڕەحیمی و چەند کەسی تر چاوە ڕێمان بوون، نانمان خواردو دوای نانخواردن، هەندێک گفتوگۆمان کرد دەربارەی کوردەکانی ڕۆژهەڵات، ئێمە ئەمان ووت هەرئەبێ ڕۆژێک بێت ئەم کێشە چارەسەر بکەن، بۆ زووترو لەم کاتەدا کە لەگەڵ عێراق شەڕتان هەیە ئەم کێشە چارەسەر ناکەن بۆ خۆتان باشترە، یەکێکیان ووتی لەئیسلامدا سنوور نییە و ئێرانیش تەنیا قەومی کوردی لێنییە، بلوج و عەرەب و تورک و فارسیش هەیە، من درێژەم دایەو هەر ئەو برادەرە لەوەلاما ووتی ئێمە لە سەرەتادا ترسمان لەوە هەبوو شێخ عیزەدینی حسێنی ڕابەرایەتی کورد بکات بەناوی سوننەوە ئەگەر وایبکردایە عەرەب و بلوج و

سوننەی قەومەکانی تر دوای ئەکەوتن، ئەوکات کێشەی گەورە بۆ ئێمە دروست ئەبوو، دیارە ئێمە هەڵە بووین شێخ عیزەدین دوای کۆمۆنیستەکان کەوت تاکچەکانی..........کرا، کاک ئاوات قارەمانی ووتی حەمە واز بێنە ئەمە شوێنی ئەوە نییە. کاتێک هەستاین قاڵیەکی تابلۆیان داینێ بەدیاری کاک شەوکەت بردی بۆ خۆی. دواتر گەڕاینەوە کرماشان بینیمان شار زۆربەی شوێنە گشتیەکانی ڕووخاوە عێراق بە تەیارە بۆمبارانی کردبوو، چونکە ئەو هەفتەیە ئێران هێرشی گەورەی کرد بەناوی کەربەلای پێنجەوە ڕۆژهەلاتی بەسرەی داگیر کردبوو بە هەزاران دیل و کوژراو لەعێراقیەکان هەبوو. لەکرماشان شەوێک کاک حەمەڕەشیدی سان ئەحمەدی بەڵخەیی میوانداری کردین. لەوێ کاک شەوکەت و ئارامی کوڕی مانەوە.

من و کاک ئاوات گەڕاینەوە، شەوێک لەپاوەماینەوە من لەپاوە قەد هەست بە بێتاقەتی ناکەم لە هەموو شوێنێکم پێ خۆشترە، چونکە خەڵکی پاوە زۆر خەڵکێکی باش و خزم دۆست و ڕێز لەپێشمەرگەی یەکێتیی ئەگرن و هاوڕێیەتی و دۆستایەتیان پاکە.

دوای ئەوەی لەسنوور پەڕینەوە بەرەو گریانە ئەهاتین لە نێوان گریانە و سەر ئاوی سیرواندا لەگەڵ کاک ئاوات پرسیاری وەزع و دەنگ باسمان ئەپرسی لەو مەفرەزەی کە هاتبوون بە دەممانەوە. مەفرەزەکە پێشمەرگەکانی دەستەکەی منن. پێشمەرگەیەک ووتی کاکە حەمە لەپشتی ئاوایی سازان و ڕێشاو لەم ڕۆژنەدا کەمینمان داناوەو دووجاش خەفیفەمان گرتووە، ووتم لە کوێن؟ ووتیان زیندانن لە بارەگاکەی گریانە دامان ناون، پرسیم خەڵکی کوێن؟ ووتیان ناوچەی قەرەداغ. لەبەر خۆیەوە کاک ئاوات ووتی لە قەرەداغ کێبن. لەم سنوورەدا جاشبن؟ قەرەداغ خەفیفەی کەمەو بە تایبەت ئاواییەکەی ئێمە کاکە حەمە ئاوایی قارەمان جاشی هەر نییە.

بەڵێ لەگەڵ کاک ئاوات گەیشتینە گریانەو چووینە بارەگای ئەوێ، بەتانی و کومباریان لەسەربان بۆ ڕاخستین و دانیشتین، چەند پێشمەرگەیەک دەستیان کرد بەچایی دەم کردن. ووتم بەخەلیل ڕێشاوی ئەوجاشانەی گرتووتانن ئابانگیان کەن بزانین کاک ئاوات نایانناسێ خەڵکی کوێن؟ پێشمەرگەیەک چوو هێنانی، سەلام و عەلێکیان کرد و ئێمەش وەلاممان دانەوەو ووتم ئادانیشن، دانیشتن، کاک ئاواتیش سەیریان ئەکات، پرسیم

خەڵکی کوێن ووتیان قەرەداغ ووتم قەرەداغ چ ئاواییەک؟ ووتیان قارەمانی، یەکسەر کاک ئاوات ووتی سەگبابینە لە قارەمانی کوڕی کێن؟ ناونیشانی خۆیان دا، کاک ئاوات ناسینییەوە. ووتم باشە کاک ئاوات ئەوە ئازادیان ئەکەین لە بەرخاتری تۆو ئەگەر خۆشت ئەیانبەیتەوە ئەوە لەگەڵ خۆت بیان بەرەوە.

دوای چاخواردنەوەو پشویەکی کورت هەستاینو هاتینە هاوارەکۆن یەک دوو ڕۆژ لە هاوارە کۆن پشوومان دا، بەکاک ئاواتم ووت باڵەڕێی جاشەکانەوە بەئۆتۆمبێل بتنێرمەوە بۆ قەرەداغ، ووتی نەوەڵا ناوێرم هەربەپێ ئەڕۆمەوە، با مەفرەزەیەک بمباتەوە ووتم ناخۆم ئەتبەمەوە، کاک ئاوات پیاوێکی بەڕێزەو خۆشم ئەوێت پێکەوە ڕۆیشتین، کەگەیشتینەوە قەرەداغ چووینەوە ماڵی کاک ئاوات، ڕۆژێش لەوێ ماینەوە کاک قادری حاجی عەلی هاتبوو بووبووە بەپرسی مەڵبەندی یەک، چووین بۆ لای بۆ قۆپی و بەخێرهاتن و پیرۆزبایمان لێکرد و شەو نەیهێشت بڕۆین لای خۆی میوانداری کردین و لەسەر ئیش و کاری ناوچەکە پێکەوە قسەو باسمان کرد و دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ هەورامان.

# ڕۆڵی ڕێکخستن لە ڕۆژانی تێکۆشاندا

یەکێتیی نیشتمانی کوردستان هەر لەسەرەتای دەست بەکاربوون و چالاکیەوە لەکوردستانی باشوور بایەخی تەواوی بەئەندام و ئەڵقەکانی ڕێکخستن داوە، ئەگەر لەناو شارەکاندا بوو بێت یا لەدێ و شارۆچکەکاندا. سنوری قەزای هەڵەبجەش لەو بارەوە هاوشانی شارو شارۆچکەکانی تری کوردستان لەپلەی شیاوی خۆیدا جێگەی دەبێتەوە،

کۆمەڵە کە لەساڵی ۱۹۷۰ دا دروست بووە وەک ڕێکخراوێکی چەپی نەتەوە دۆست، لەساڵی ۱۹۷۱ دا شێخ عەلی کەشکۆڵ تێدا دەبێتە ئەندام و یەکەمین کەس کە ڕێکی دەخات شەهید وەستا ئەنوەری برای بووە، کۆمەڵە لێرەوە ئیتر وردە وردە گەشە و نەشەی کردووە تا ڕۆژانی دوای شۆڕشی ئەیلول. ئەو دەمە هێدی هێدی ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵە تا دێت لەزیاد بووندا ئەبن، دوای بڕیاردان لەدروستکردنەوەی شۆڕش کۆمەڵە بۆگۆشەیەک دەگەڕێ کە یەکەمین مەفرەزەی چەکدار ڕەوانەی چیا بکات، ئەو گۆشەیەش هەڵەبجەیە. دیارە هەر لەوکاتەدا شەهید برایم عەزۆو کاک قادر خەباتیش مەفرەزەیان لەچیایە.

شێخ عەلی و هاوڕێکانی بەر لەدەرچوونیان لەناوچین و توێژەکانی خەڵکدا لە شار و لە لادێ خەڵکیان ئامادە کردووە، ئەوانەش وەک ئەندام و لایەنگر بۆ ئەوەی شۆڕشی شاخ و شار پێکەوە پەیوەست بکەن. لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین جگە لەهەڵەبجە، لەخورماڵ و شارۆچکەی سیروان و هەورامان بەتایبەت تەوێڵەو بەدەگمەن ئاوایی هەبووە لە شارەزوورو ناوچەکەدا ئەندامی کۆمەڵە ویەکێتیی تیا نەبووبێ. ئەم پڕۆگرامەش لەسەر ڕێبازی ماوسیتۆنگ بوو، کەوای دیاریکرد بوو شۆڕش لەچیادا بەبێ هاوکاری و هاودەنگی جەماوەری ناوشارو ئاواییەکان بەئاقاری گەشەکردنی مێژوودا ناچێ و سەرکەوتن مەحاڵە دەبێت، کۆمەڵە لەسەرەتادا ناوی کۆمەڵەی مارکسی-لینینی کوردستان بیری ماو بوو. بۆ ئەو دەمەی دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و مەیدان چۆڵ کردنەکەی شرش، ئەم بیرو ڕایە

خێرابەخێرا لەهەناوی زۆرینەی تێکۆشەرانی نێرومێی کوردستاندا جێگای گرت.

لەسنوری ئێمەدا وەستا ئەنوەر و حاجی چاوشین هاورێ لەگەڵ ئیبراهیم حەسەندا ڕوو پۆش ناوبەناو دەچوونە چیا و کۆبوونەوەیان بەپێشمەرگە دەکرد، وەستا ئەنوەر برای شێخ عەلی کەشکۆڵ پاش ئاشکرا بوونی گیراو لەژێر ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر سەختدا لەڕۆژی ١٩٧٧/٦/٣٠ دا گیانی بەخت کردو شەهید کرا. حاجی چاوشین لەگواستنەوەی چەکدا لەشارباژێرەوە بۆ قەرەداغ بەتراکتۆر لەگەڵ شەهید سیروان تاڵەبانی وحەسەن خاوێ و هەڤاڵەکانیدا لەنزیک یاسین تەپە لەسەر چۆمی تانجەرۆ کەوتنە بۆسەی جاشان ژیانیان گوازرایەوە بۆ هەواری نەمران، ئیبراهیم حەسەن کەسەر بەرێکخراوی ڕەنجبەرانی هاوپەیمانی کۆمەڵە بوو لەزاڵگەی زەمەقی گیرا لەلایەن ئەفسەرێکەوە بەناوی نەقیب مەیسەر، بەداخەوە ئەڵێن لەبەردەم ڕژێمدا خۆی نەگرتوەو ئەوەی لەرێکخستنەکەیاندا بوو ئیعترافی لەسەر کردون و گیراون، گوایا بەو مەرجە لەمردن ڕزگاری بوو، دوای بەربونەکەی، دیارە پەشیمان و هەستی بەو هەڵە گەورەیە کردووە بۆیە وولاتی جێهێشتوو چووە ئێران و ماوەیێک لە پاوە و سنەدا مایەوە، دواتر لە تاراندا لە مەڵبەندی ڕۆشنبیری سەدر کاری وەرگێرانی ئەکرد، دواجار خۆی گەیاندە هەندەران.

لەسەرەتاوە تا ساڵی ١٩٧٧ ڕێکخستنی کۆمەڵە لەناوچەکەدا چالاک و تۆکمەو بوێرانە کاریان ئەکرد، بەڵام دوای ئەمەو دوای ئاشکرا کردنی کادرە دیارەکان وگرتنیان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە، لەشەوی١٢-١٣ /١٩٧٧/١١ دا ئەنوەر حەمەئەمین ئەنوەری موهەندس لەگەڵ حەمەی حەمەفەرەج تەپی سەفایی لەموسل لەسێدارە دران و ئەم هەڤالانەش حوکم دران جەعفەری حاجی ئەولە، جەمالی ئەلی محەمەد، عەلی دەڵەمەڕی، سەرداری حەمەڕەشید، ئەدهەم مەلا عەلی، عوسمان عەبدوللا ڕیشسور، کاوە شەریف، بەختیار ئەنوەر میرزا، شەریف کەشکۆڵ، ئەکرەم غەریب حەمەسالح، عەزیز ڕەشە عەزیز، نوری عەول قادر. چەندین هەڤاڵیش لە دوای ماوەیەکی زۆر مانەوە لە زیندان دواتر ئازاد کران، لەوانە: سەلاح حەمەغەریب، ئایار مەلا حەسەن، عومەری حەمەسالح، حەمەی حەمەسالح، سەلاحی حەمە چاوەش، موحسن

مەلا حەمە ئەمین، ئەحمەدی حاجی چایچی، مەحمودی فەتە لیرە، محەمەد عەبدرەحیم ئاسۆ، مەلارەئوف مەلا حەسەن و شێخ بەهادین شێخ عەبدرەحمان. لێرەوە دەچینە سەر بەسەرکردنەوەیەکی رۆڵی رێکخستن لەسنوری قەزای هەڵەبجەو دەوروبەری لەم خاڵانەدا قسەیان لەسەر دەکەین:

یەکەم/ رێکخستن ئەرکی گەیاندنی هەواڵ و زانیاری و راپۆرتی گرتە ئەستۆ لەگەڵ دیاریکردنی کەسانی خۆفرۆش، بۆ مەفرەزەکانی پێشمەرگە، تا لەهەر هەلێکدا کەرێک بکەوت پێشمەرگە بیانکوژن، لەلایەکی تریشەوە بۆ تۆو بڕکردنی کەسانی دۆڕاو بەرژێم و بۆ ترساندنی خەڵکانی تر کەئەو دەمە خۆیان لەباوەشی رژێمدا گرتبوویەوە.

دووەم/ ب لاوە کردنەوەی هەواڵ و چالاکیەکانی پێشمەرگەو گەورە کردنیان لەناو جەماوەردا، بۆنمونە ١٠ دە پێشمەرگە ئەچونە ئاواییەک ئەووترا ئەمشەو ١٠٠ پێشمەرگە لە فلان ئاوایی بوون، رێکخستن دەوری راگەیاندنی ئەبینی.

سێهەم/ کۆکردنەوەی ئابوونەوەی ئەندامان و گەیاندنی بەدەستی پێشمەرگە بۆ گەلێ پێداویستی ئەوسەردەمەو چارەسەر کردنی کەم و کورتیەکان.

چوارەم/ بۆ رێنوێنی کردنی پێشمەرگە بۆ رۆشتنیان لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی.

پێنجەم/ قسەکردن لەگەڵ کەسانی نەرمدا بۆپاشگەز بوونەوەیان لەوەی دەستیان تێکەڵی رژێم کردووە.

شەشەم/ شەوانە نامەی هەرەشەی مەرگیان دەخستە حەوشەی خۆفرۆشانەوە بۆ ئەوەی لەو رێگە چەوتە لابدەن و پەشیمان ببنەوە.

حەوتەم/ بەشداریکردن لەراپەرینەکاندا بەدروشمی شۆڕشگێڕانەیان دوژمن و کلکەکانیان سەغڵەت دەکرد و وای لێهاتبوو بەعس لە شۆڕشگێڕانی شار زیاتر سڵی دەکرد و ئەترسا تا پێشمەرگەکانی چیا.

هەشتەم/ ماڵ ئامادەکردن بۆ هێزەکانی پێشمەرگە لەشار یان لەو ئاواییانەی نزیک شار بۆ ئەوەی بمێننەوە بۆ پشوودان،

گەلێ جاریش وارێک دەکەوت لە ناو ئەو ماڵانەدا بەرنامە دادەنرا بۆشەوانی داهاتوو تا دوای پشودان لەمۆڵگەیەکی رژێم بدرێت، بەم تەقە کردنەش هەم دڵی جەماوەریان خۆش دەکرد هەمیش دوژمن ترسی لێ

ئەنیشت، من خۆم زۆر لەشاردا ئەمامەوە، یەکێک لەومالانە زیاتر لەهەموو ماڵە دۆست و ماڵە ڕێخستنەکان منیش و مەفرەزەکانی تر کردبوومانە پەناگە، ماڵی شاژنێک بوو هاوسەرەکەی عەلی عەبدولقادر جۆلا ساڵی ١٩٧٨ لەناو ئاوی دەریاچەی دەربەندی خان لەنزیک ئاوایی لاوەران دوای ئەوە مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی پەڕاندبووەوە بە بەلەم وماتۆڕ، لەگەڕانەوەدا هەلی کۆپتەر لێیداو شەهیدیان کرد، ئەم شاژنە بێوەژنە دڵسۆزە کورد پەروەرە خاوەنی سێ کوڕە بەناوەکانی نەوزاد، حەسەن و حسێن. یەکێتیی نیشتمانی کوردستان قەرزداری ئەم ژنەو منداڵەکانییەتی ئەویش باجی ئایشێی عەزیز ڕۆستەمە .

لەهەڵەبجەدا ژنان هاوشانی پیاوان و لەخزمەت کردنی پێشمەرگەو شۆڕشدا لەسەرەتای شۆڕشەوە ساڵی١٩٧٧ تا١٩٨٨ هیچ لە پیاوەکان کەمتر نەبوون، ئەم چەند ژنە وەک نمونە: نەزیرە هاواری، لەیلا هاواری، مینا شەشکی، قەتە بۆبنی دایکی هاشم، نەجیبە عەبابەیلێی دایکی نەبەز، مەلیعە کەریم خان لەتوەقوت.....تاد.

نۆهەم/ ب لاوەکردنەوەی بەیاننامەی سەر دیوار ئەرکێکی دیکەی گرنگ بوو ڕێکخستن لەئەستۆی گرتبوو، تەنانەت گەلێ جار لەبەیاننامەکان دەخرایە ژێر دەرگای ماڵانی دیکە و ماڵانی هەندێک خۆ فرۆشیش کەدەستی پێ بگەشتایە.

دەهەم/ کتێبی چەپکێ لەوتەکانی ماو کتێبێکی قەبەی ناو باخەڵ بوو ئەندامان دەیان خوێندەوە و سوودیان لەگوتە شۆڕش گێڕیەکانی ماو وەردەگرت و لەناو ڕیزەکانی ڕێکخستندا دەستاو دەستی دەکرد.

یازدەهەم/ ئەگەر دەستەیەک یا کەرتێک پێشمەرگە لەشوێنێکی گونجاوی دووره شاردا بوونایە، ئەوا لەلایەن ڕێکخستنەوە هەم زانیاری و هەم خۆراکی باشیان بەدەست دەگەیاندن، ئەگەر بشیان ویستایە شەو بێنە شارەوە ئەوا ڕێکخستن ڕێنوێنی دەکردن.

دوازدەهەم/ لەسەرەتای شۆڕشدا تا چەند ساڵێکیش دوای ئەوە کەسێ بیویستایە بێتە دەرەوە دەبوو لەلایەن ڕێکخستنەوە نامەی پشتگیری بهێنایە، ئەوسا بەدڵنیاییەوە وەردەگیرا.

سێزدەهەم/ ڕێکخستن بە بڕیار دزەی کردە ناو ڕیزی جاش و ئیستخباراتە کوردەکان و ئەوانیش لەڕێگەی خۆیانەوە ئابوونەوە، فیشەک، ڕوومانە، گوللە

ئار بی جی و زانیارییان دەگەیاندە دەستی ڕێکخستن و لەڕێکخستنیشەوە بۆ دەستی پێشمەرگە.

چوارەدەهەم/ گەلێ جار قەمسەڵە، پێ لاوە، کراس و فانیلە و جلوبەرگ و خواردەمەنی ئامادە دەکرا لەو ماڵانەی کە ڕێکخستنی چەپەکی شار بوون دادەنران لەکاتی سەردانەکانی پێشمەرگەدا پێمان دەدرا.

پازدەهەم/ ڕێکخستنی هەڵەبجە لەدوای شا لاوەی گرتنەکەوە تا ساڵی ۱۹۷۹ کەمێک پرش و ب لاوەی پێوە دیار بوو، دوای ئەوە تەشکیلاتی ڕێکخستن بوو بەسێ کەرت کەرتی شەهید فاتیح، شەهید دکتۆر ڕەزا، شەهید وەستا ئەنوەر ئەو دەمە دێهاتەکانی سنوور ڕاگوازرا پێشمەرگە بەزەحمەت هاتوو چۆی ناوەوەمان پێ دەکرا و لەگەڵ ئەوەشدا هاوکاری هێزی پێشمەرگەی کوردستانی ڕۆژهەڵاتمان ئەکرد، ئەوماوە لەئاوایی شۆشمێ سەر بە شارۆچکەی نەوسوود و دەوروبەری بارەگامان دامەزراندبوو، بۆ تۆکمە کردنەوەی ڕێکخستن بەرپرسی هەر سێ کەرتەکەی ناو شار بانگ کرانە ئاوایی شۆشمێ، تا لە ڕێکخراوی شەهید وەستا ئەنوەردا یەکبگرنەوە، کەرتی شەهید وەستا ئەنوەر ناوەکەی گۆڕا بەکەرتی شەهید هیوا. بەرپرسی هەر سێ کەرتەکەی ناو شار پێکهاتبوون لە هەڤاڵان حەکیمی مەلا ساڵح، ئەحمەد کولکنی و فەیسەڵ ئەحمەد تۆفیق، کاک عومەر غەریب کە خەڵکی سلێمانی بوو، بە دەست نیشان کردنی شەهید جەمال تاهیر بووبە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان ڕێکخراوی شەهید وەستا ئەنوەر و کۆمیتەی یەکی سلێمانی، بەم شێوە کارو چالاکیەکانیان فراوانتر بوون، گەلێ سوودو قازانجی شۆڕشگێڕانەی لێکەوتەوە و ڕێکخستن لە پرش و ب لاوەییەوە بوو بە کۆبەندی.

ماوەیەک بەسەر ئەم بارودۆخەدا گوزەرا، ئەوەبوو لەسەر پێشنیاری کاک نەوشیروان مستەفا ڕێکخستنێکی سەربەخۆش دامەزرا بەسەرپەرشتی من و بەرپرسایەتیەکەی درایە دەست کەمال هەورامی تائەوکاتەی بزووتنەوەو خەتی گشتی یەکیان گرتوو شۆڕشگێڕانی لێنینیک هات، ئەمە تایبەت بوو بەسنووری تیپی ۱۱ی هەورامان.

شانزەهەم/ هەندێ جار ڕێکخستن بەهاوکاری هێزی پێشمەرگە چالاکییان دەنواند، یەکێک لەو چالاکیانە گرتنی مونەزەمەکەی زەمەقی بوو بە

سەرپەرشتی کاک حامدی حاجی غالی کە مامۆستا کەریمی شێخ عەلی تێدا بریندار بوو، بەڵام مونەزەمەکە چی تێدا بوو هەموی کوژران و گیران.

دووەمیان گرتنی بنکەیەکی پاسەوانی ئیدارەی کارەبی هەڵەبجە بوو لەسەرووی شارەوە ئەم چالاکیە هەڤالانی شۆڕشگێران ئەنجامیاندا بەناوی کەرتی شەهید کاکە شێخ کە مامۆستا کەمال هەورامی سەرپەرشتی دەکرد و ئەندامانی بریتی بوون لە سەعدوون حەمە سالح نامدار، نەجیم حسێن، رەفعەت ئێناخی، حەسەن حاجی مەحمود، فاتیح سۆسەکانی، بەهمەن ئەفراسیاو ناسراو بە بەهمەنەپیشە. دەسکەوتەکانی ئەم چالاکیە برتی بوو لەگرتنی چوار سەرباز، دەست کەوت چوار کلاشینکۆفی مزەلی، سێ دەمانچەی شانزە خۆربوو. ئەو دەمە کەئەو چالاکیە کرا، چوار دیلەکەیان لەماڵی کەریمە دۆم حەشار دابوو، ، تا من مەفرەزەم بەسەرپەرشتی ئەکبەرئێناخی نارده ناو شار و ڕادەستی هێزی پێشمەرگەیان کردن [1]. دواتر لەسەرئەمە خاوەن ماڵەکە لەسێدارە. درا ئەوکاتە من فەرماندەی کەرتی دووی تیپی١١ی هەورامان بووم، کاک شەوکەتی حاجی موشیر فەرماندەی تیپ بوو.

چالاکییەکی دیکە کەبەلامانەوە زۆر گرنگ بوو، دانانی بەرنامە بوو بۆ کوشتنی سەرەک جاشێکی لەلایەن ڕێکخستنەوە، ئەوەبوو کەلەدوای ڕاگواستنەکانی ئاواییەکانی سەر سنوور، رەشەی ساڵحە کەدژی شۆڕش خراپ دەستی دابوویە پارەی لە خەڵکی بارکراو دەسەند و شەوانە

---

[1]- ساڵی ١٩٨٢ دوژمن لە دەشتی شارەزووردا بە دوو پێشمەرگەی زانی، هێزی جاش و سوپا چووە سەریان. یەکێکیان نامیقی مام ساڵحی ناوگردانی بوو دەستی لێکردنەوەو شەهید کرا، هەڤاڵەکەی دی ئەحمەد مستەفا بوو، کە خۆی ڕادەستی دوژمن کرد و گیرا. ڕژێم داوای کرد چوار سەربازەکەی، کەرێکخستن دیلی کردبوون ئەگۆڕنەوە بەو پێشمەرگەی گیراوە، کە خەڵکی گوندی گردی شەریفی شارەزوور بوو، ئاڵوگۆڕەکە کرا کاکە حەمەی حاجی مەحمودی پونگلە لە نێواندا بوو، بەڵام دیارە بەداخەوە دوژمن ئەم پێشمەرگەیان لەزیندان کڕیبوو، یان ئەوترا هەر پێشتر پەیوەندی هەبووە. بۆ من ئەمە ڕوون نەبوەوە، بەماوەیەکی کەم دوای گۆڕینەوەکەی پێشمەرگەکە لەگەڵ چوار سەبازەکە، پێشمەرگەکەش هەڵهات و خۆی تەسلیمی رژێم کردەوە و بوو بەفەرماندەی سریەی جاشان.

لەنادیەکەی هەڵەبجە قوماری پێ دەکرد، مەفرەزەیەک پێشمەرگە لەشاردا بوون، ڕێکخستن ئاگاداری کردن کەشەو لەکاتی گەڕانەوەی ڕەشەی ساڵحەدا بۆ مۆڵگاکەی بۆسەی بۆ دابنێن، ڕێکخستن بەلایتی قەڵەمی یەکتریان ئاگادار دەکرد تا لەگەڵ گەشتندا بەشوێنی دیاریکراو تەقەی لێبکەن، بەڵێ بەرنامەکە سەری گرت، بەڵام بەداخەوە ڕەشە دەرنەچوو، بەڵکو مەفرەزەکی چەکداری ئێرانی بوون، حەمەی حەمە تایەر بەگ بەرپرسیان بوو خراپیان بەسەر هات، حەمەو حامدی برایشی لەدۆستە دڵسۆزەکانی شۆڕش و مام جەلال بوون و هاوکاری تەواوی یەکێتیان دەکرد. جارێکیتر بە هەڵە هەر لەناو شاری هەڵەبجەدا پێشمەرگە بۆسەیان بۆ ئەم سەرەک چاشە دانا، بەداخەوە ئەوجارەش دوو هاولاتی بەجێبێکەوە تێکەوتوو کوژران یەکێکیان ناوی حەمە سەعید حەمەلاو بوو ئەندامی شۆڕشگێڕان و زۆریش چالاک بوو ئەوی دیش ناوی حەمە سەعید حەمە موئمین بوو.

زۆرجاریش بۆ کوشتن یان تۆقاندنی هەندێ پیاو خراپ ڕێکخستن هاوکاری مەفرەزەکانی پێشمەرگەی دەکرد و بەوەش پێشمەرگە ئامانجەکانیان دەپێکا چونکەچاو ساغیان هەبوو.

حەڤدەهەم/ ئەرکێکی دیکەی گرنگی ڕێکخستن کەوتبووە سەر شانی چەند سەیدەلانییەک لەکاتی پێویستدا دەرمان و کەلوپەلی پزیشکی باشیان دەگەیاندە دەرەوە بۆ چارەسەرو پێشمەرگە سوودیان لێ وەردەگرت. لەوانە دەتوانین ناوی ئەم بەرێزانە بهێنین: موحسین سەیید قادر، حەمە ئاوات، قادری حاجی حەمە شەریف، مەحمود ئەحەمەد گەڵە، فەرەیدون عەبدوڵلا چۆپی، کاوە عەبدوڵلا، کەمالی ئەلەکە و غەریبی دانساز. هەندێک جاریش وا ڕێکەوتووە پێشمەرگەی بریندار لەشاردا شاراونەتەوە، لەڕێگەی ئەو هەڤاڵانەوە چارەسەر کراون.

هەژدەهەم/ ڕێکخستن هەمیشە لەبزاوتندا بوو، زۆر جەسورانە دژی هەر هەنگاوێکی دوژمن خۆیان ڕێکدەخست و ڕاپەڕینیان بەرپا دەکرد، کەبەمەش زۆر جار لێیان دەگیرا و ئازار و ئەشکەنجە دەدران، بەڵام پاش ئەوەی کەخۆیان ڕادەگرت و دانیان بەهیچدا نەدەنا دوای ماوەیەک ئازاد دەکران و خێرا تێهەڵ دەچوونەوە. لەساڵی ١٩٧٩ بەم لاوە تا ڕاپەڕینە گەورەکەی ساڵی ١٩٨٧ هەڵەبجە و دەورو بەری ناودار بوو بە ناوچەی ڕاپەڕین، جموجوڵی

فراوانی تێدا بوو بەبێ ئەوەی سڵ لەدوژمنی درندە بکەنەوە، بۆیە ئێستە بەقەوارەی خۆی ژمارەی زیندانیانی سیاسی زۆری هەیە و زۆرینەیشیان تائێستا شوێن لێدانی جەلادەکانی دوژمن بە جەستەیانەوە دیارە.
لەگەڵ گەشەکردنی رێکخستندا چالاکی لە هەڵەبجەوە پەل و پۆی هاویشت بۆ خورماڵ، تەوێلە، سەیدسادق و سیروان، شارەزوور. بریا ئەو دەزگایەی بەناوی رێکخستنە دێرینەکانەوە دامەزراوە بەوردی بچوایەتە بنج و بناوانی کاروبارەکانی رێکخستن و هەموو کار و چالاکیەکانی تۆمار بکردایە تاوەکو گۆشەی ئەرشیفێ لەمێژووی تێکۆشانی گەلەکەماندا خانەی خۆی پڕکردایەتەوە.
نۆزدەهەم/ لەسەر بڕیاری سەرکردایەتی رێکخستنی شار رێگا درابوو هەرئەندامێکی رێکخستن ئەتوانێ، لە رێگەی خزمایەتی، دراوسێیەتی، ناسیاویی و هاوعەشیرەتیەوە پەیوەندی بکات بە کەسانی سەربە رژێمەوە، ئەم کارەیش سەری گرتوو و گەلێ کەسیان راکێشا بەلای شۆڕشدا، لەوانە جاشەکانی رژێم کەبە ئابوونەوەو فیشەک و رووماڵەو مەخزەن و زانیاری پێویست هاوکاری شۆڕشیان ئەکرد. ئەوەی من ئاگادار بم تا ئەو رادەی لە ناو مەفرەزە تایبەتەکەی رەشەی ساڵحەدا چەند کەسێک وەک ئەحمەد حەمە کەریم ئەحمەد پەتڵە و کەماڵی جەلالە شەل و سەعەی قالە پۆلیس هاوکاری باشی شۆڕشیان ئەکرد، هەر لەسەر ئەوە رژێم ئەحمەد پەتڵەی گرتوو لە کەرکوک گولە بارانیان کرد.

## نەوشیروان مستەفا
## لە هەورامانەوە بۆ قەرەداغ

لە مانگی تەمموزی ١٩٨٧ لە کاتێکدا لەسنووری هەڵەبجە و هەورامان و شارەزووردا وەزع زۆر ئاڵۆز و کێشەو گرفت لەو پەڕی لووتکەی خۆیدا بوو. چونکە ڕژێم لەم چەند مانگەی پێشوودا هەموو ئاواییەکانی دەشتی شارەزووری لە خورماڵەوە بۆ عەربەت و زەڕایەن لەوێوە بۆ هەڵەبجە ڕاگواستبوو، لە سەر ئەم ڕاگواستنە لەڕۆژانی ١٢ و١٣ / ٥ / ١٩٨٧ دا ڕاپەڕینی جەماوەری و هەڵگەڕانەوەی چەکدارە کوردەکان لە شارۆچکەکانی هەڵەبجە، خورماڵ، سیروان و سەیدسادق ڕووی دابوو.

یەکێتی تیپی ١١ی هەورامانی سەر لەنوێ ڕێکخستبوەوە و سەدان کەس هاتبوونە ناوچەکەوە و پەیوەندییان کردبوو، بە هەزارانیش چووبوونە ئێران بە ماڵ و خێزانەوە، رژێم بەرنامەی خۆی هەبوو بۆسنوورەکەو بۆ ئەو شارۆچکانە. بۆ بە تەواوەتی ویران کردنیان لەم بارەوە دواتر بابەتێک بە ناونیشانی ڕاپەڕینی خەڵکی هەڵەبجە لە ١٣ /٥ / ١٩٨٧ ئەخوێنیتەوە. بابێینەوە سەر باسەکەی خۆمان.

ئەو سەردەمە یەکێتی جهازێکی لەشاری سەقز جێگیر کردبوو، بەجیهازەکەی کە لە شاری سەقز بوو بروسکەیەکم بۆ هاتبوو ئەمە دەقی بروسکەکەیە. (لە / شەوکەتی حاجی مشیرەوە بۆ/ کاک حەمەی حەمە سەعید. دوای س لاوە بەگەیشتنی ئەم برووسکە خۆت و مەفەرەزەیەکی ٢٠ بیست کەسی لەپێشمەرگەی ئازاو لێوەشاوە بگەرە سەرکانی و ئاوی قەڵاخانی ئەو کەسەی کە لە مەدحەت مالوانی ئەچێت لەوێ چاوەڕێت ئەکات). قەڵاخانی کانی و ئاوێکە ئەکەوێتە بناری چیای هەورامان لە دیوی ئێران لەڕاستی هانەنەوەی پشتی ئاوایی سەرگەتی سەر بەشارۆچکەی بیارە.

هەر ئەو ڕۆژە بیست پێشمەرگەم ئامادەکرد و ئاگاداری پەیوەندیەکانم کرد بۆ سبەینێ لە ئاوایی شێخان بەڵگەی هاتوچۆ و ئۆتۆمبێلمان بۆ ئامادە بکەن، بەیانی ڕۆژی دوایی لە هاوارە کۆنەوە هاتینە گریانە و نزیک کاتژمێر

١١ی نیوەڕۆ بەرەو شێخان ڕۆشتین، لە پردیوەر لە لێواری ڕێگەکەدا ئەڵغامێکی ڤالمێرا دەرکەوتبوو، پێشمەرگە لێی تێپەڕبوون، من و هەڤالان شەهید کەیکاوس و ئەکرەم ئەحەمەد و چەند کەسی تر لە دواوە بووین، قاترێک کە هەندێک کەلوپەلمان لێ بارکردبوو لەپێشمانەوە ئەڕۆیشت، ووتم ئێوە برۆن با مز ئەم (مینە) ئەلغامە هەڵگرمەوە و فرێی دەمە بەردەم ڕێگا، چونکە خەتەرە نەوەک بە خەڵکدا بتەقێتەوە، کەیکاوس و ئەکرەم و تەحسین بیارەیی نەڕۆیشتن بە دیارمەوە وەستان و منیش شارەزا بووم لە مین هەڵگرتنەوە، دەرمهێنا و سەرقاپی مینەکە کە دەرزیەکەی تێدایە کردەوەو لامبرد، مینەکەم سەرەو خوار کردەوە بۆئەوەی ئەو کەپسولانەی تێدایە بکەونە خوارەوە. ئەوجۆرە ئەڵغامە زۆر مەترسیدارە و ناوی ڤالمێرایە، کەپسوولەکان نەکەوتن، بۆیە هەڵم دا لە دووری ١٠ مەتر لە بەردەم ڕێگاکە کەوتە سەر زەوی و یەکسەر گرووو چرە دووکەڵی ڕەش و سپی ئێمەی کرد بەژێرەوە، دوای یەک سات کە هەموو خۆمان دا بوو بە زەویدا، پرسیم کەستان بریندارنەبووە؟ ووتیان نازانین. چرە دووکەڵو تەپ و تۆز ڕەویەوە بینیم ئەکرەم شەرواڵەکەی بووە بەدزداشە لە دەرلەنگەی ڕاستەوە بۆ ناو نەفەک و بۆ دەرلەنگەی چەپی هەڵتەقی بووەوە. لەوێ بەبەن لەچەند لاوە شەرواڵەکەی بەسترا بە لاقیەوە. کەچووینە شێخان پێشمەرگەیەک کە قاترەوانەکەمان بوو، ئەبوو بگەڕێتەوە پانتۆڵەکەیمان لێسەند بۆ ئەکرەم و پانتۆڵە دڕاوەکەمان دا بەو، بە هەمان شێوە بەستی و گەڕایەوە.

دوای وەرگرتنی بەڵگەو ئامادە بوونی ئۆتۆمبێل لەڕێگای نۆدشەوە بۆ لای هەجیج و لەوێوە بۆ سلێن و بلبەرو هەورامانی تەخت ڕۆیشتین، لەئاوایی کەمالا کەپێشی ئەووترێت ڕوەو وەرێ کەبابخانەیەکی بەناوبانگ و خۆشی لێیە. لاماندا نانی نیوەڕۆمان خواردکە نزیکەی کاتژمێر چواری سەر لە ئێوارە بوو. لەوێ چەکداری کوردی پاسدار لێبوو، کاتێکم زانی دەنگە دەنگ دروست بوو بینم هوشیار بیاوێڵەییە، ئێستا هەردوو لاقی لە دەست داوە لەمین هەڵگرتنەوەدا، هوشیار لەگەڵ پاسدارێک تێگیراون، هوشیارم بانگ کردو بە کابرام ووت چییە کاکە؟ ووتی ئەم برادەرە پێم ئەڵێت تۆ جاشی، منیش بۆ ئەوەی کابرا واز بهێنێ، ووتم داوای لێبووردن ئەکەین، ووتی لێبووردنی چی ئەم کابرا پێم ئەڵێت ئێوە جاشن من وتومە نا پێشمەرگەی موسڵمانم کەچی

شۆخیم پێئەکا. منیش ووتم قەیدی نییە ئەوە نازانیٚ، هەرچۆن بوو کابرا ڕۆیشت لەکۆڵمان بوەوە، لای عەسرێکی دەرنگ گەیشتینە قەلاخانی.

من مەدحەت مالوانیم نەدیوە ئاخۆسیمای چۆنە؟ بۆیە لەڕێگا لە نزیک ئاوایی شێخان ئەکرەمم بانگ کردە لاوە ووتم تۆ مەدحەت مالوانی باوکی حەمەو فەتاح ئەناسی ووتی بەڵیٚ؟ ووتم شێوەو ڕوخساری لە کیٚ ئەچێت؟ ووتی وەلا لە کاک نەوشیروان ئەچێت. من حاڵی بووم، ئەکرەم پرسی بۆ؟ ووتم هەروا ئەپرسم.

قەلاخانی تیمێک پاسداری سەربە قەرارگای ڕەمەزانی لێبوو، لە لای دەستە ڕاستی کانییەکەوە لەبناری کێوەکەدا چەند خەیمەیەک هەڵدراوە، پاسدارو پاسداری قاترەوان بەڕاستو چەپدا دێن و دەچن، ئەم کانی و ئاوە ئەنواڕیٚ بەسەر حەوش و بارانی یان مارانیدا، هەردوو ئاوایی هەورامی نشینی دەمەیەو دەرەکیەی لێوە دیارن، کانییەکە خۆی لە زەوییەکی هەردەی داکەوتە دایە لە نێوان حەوشومارانی و چیای هەسوون دا، هەسوون لووتکەیەکی چیای هەورامانە. دوای ئەوە کەگەیشتینە پێشەوە بینیم کاک شەوکەتی حاجی موشیر هات بەدەممانەوە، پێشمەرگەکانی نارد بۆچەند خەیمەیەک لەویٚ پشووبدەن و منی برد بۆ خەیمەیەکی کەنارتر، بینیم کاک نەوشیروان مستەفا لەویٚ دانیشتووە، دوای چاکی و چۆنی بەخێر هێنانەوە، وردە وردە کەوتینە گفتوگۆ.

کاک نەوشیروان لەمانگی ١٢/ ١٩٨٦چوو بووە تاران و لەوێوە بۆ ئەوروپا، گەشتێکی هەم سیاسی و هەم بۆچارەسەری نەخۆشی کردبوو، (بڕوانە کتێبی خولانەوە لە ناوبازنەدا ل ١١٩، ل ١٢٨) دیارە لەوکاتەدا لەفەرەنسا کۆنگرەی پارتی سوشیالیستی فەرەنسی بووە، کاک نەوشیروانیش بەشداری کردووە، لەویٚ لەگەڵ نووسەرێکی لۆمۆند چاوپێکەووتنی کردبوو لەسەر ڕەوشی کوردستان و شەڕی عێراق و ئێران و تێک چونەوەی ووتوێژی یەکێتیی و بەعس، لەم چاوپێکەووتنەدا وتبووی پاشەڕۆژی عێراق چەند ئەگەرێکی هەیە، یەک لەوانە دابەش بوونی بە سیٚ دەوڵەتی کورد، شیعە و سونەیە.

لە سەر ئەمە سووریا و تورکیا و ئێران گلەییان لە مام جەلال و یەکێتیی کردبوو، داوای ڕوون کردنەوەیان کردووە، ئێرانییەکان لەسەر ئەمە تووڕە

بوون و هەرچەندە ویزای گەڕانەوەیان دابوو، بەڵام بەشێوە نهێنییەک گەڕابوەوە ڕاست لە تارانەوە بۆ سەقز و لەوێوە بۆ کانی قەڵاخانی.

پرسی ئێوە ماندوون ئیمڕۆ بەڕێوە بوون، ووتم بە ئۆتۆمبێل هاتووین زۆر ماندوو نین. ئەو شەوە لەوێ ماینەوە، بەیانی بەڕێکەوتین بۆ ئەم دیوو تا نزیکی نیوەڕۆ  گەیشتینە هانەنەوە، لەوێ چاوەڕێمان کرد تا دەمەو ئێوارە وردە وردە هاتینە خوارەوە بۆ نزیکی ئاوایی هانەی دن، لەوێ کاک شەوکەت خواحافیزی کردو گەڕایەوە بۆ دیوی ئێران. کاتێک هەوا تاریکی کرد کاک نەوشیروانمان سواری قاترێک کردو کەوتینە ڕێ.

پێشمەرگەبەکی تیپی سوورێن بە ناوی وەستا زاهیر و دووکەسی تر وەک شارەزا بەتولە ڕێگایەکی باریکدا کە ئەملاو ئەولای مەیدانی مین و ڕێگاکە بۆ هاتوچۆی پێشمەرگە پاکیان کردبویەوە کەوتینە ڕێ. من دواتر بارەگام لە هانەنەوە و هانە تۆتمە دانا لەوێوە تەقەمەنیمان ڕەوانەی قەرەداغ ئەکرد لەگەڵ گواستنەوە و پەڕاندنەوەی بڕێک چەک و تەقەمەنی ئۆپۆزیسیۆن (معارەزەی) عێراقی، پێم وابێ هی عادل عەبدول مەهدی و هادی عامری و ئەوان بوو، هەموو جارێک ڕێگاکەمان پاک ئەکردەوە بەڵام زووزوو تیمەکانی هەندەسەی سوپای عێراق ڕێگاکانی مین ڕێژ ئەکردەوە.

بەڵێ ئەمشەو بە ترس و دڵەڕاوکێوە لە تەنیشت قەبرستانی باوا ناوسەوە هاتینە بەردەم گوڵپ و لەوێوە بەرەو خوار بووینەوە بە دۆڵێکی پڕلە خڕەبەرد و بەردی گەورە گەورەدا  هاتین و لە جادەی گشتی بیارە-خورماڵ لە نزیک ئاوایی خارگێلان کەوتینە تەختایی دەشت. باوا ناوس یەکێکە لەپیرانی ڕێبازی یارسان کە بەبابا نائوس یان باواناوس ناو ئەبرێ، زیارەتگا یان مەزارەکەی کەوتووەتە بەردەم ئاوایی هانەی دن و تەنیشت ئاوایی سەرگەت.

لەم جێگەدا زۆرجار کەمین دائەنرا لەسەر ڕێگاکە بۆ لێدانی ئەو مەفرەزانەی پێشمەرگە کە لێرەوە هاتوچۆ ئەکەن، هەر لەم شوێنەدا مەفرەزەیەکی بزووتنەوەی ئیسلامی کەوتنە بۆسەی جاشەکانی ئیستخبارات کەمەفرەزەی تایبەت بوو، ئامر مەفرەزەکەیان ناوی تۆفەشەل بوو، کوڕێکی لێهاتووی شێخ جافری سەرگەتی بەناویی بەختیار و کوڕێکی مامۆستا شێخ سدیق بە ناویی باباشێخ  لەم بۆسەدا بوونە قوربانی، هەر ئەم مەفرەزەی

تۆفەی کوڵە بکوژی چەندین پێشمەرگەی تر بوو لەوانە فەرماندە کەرت د. مەحمودی ئەحمەد بەگ لە تیپی ١٥ ی شارەزووری یەکێتیی و ڕۆستەم بەگ و بورهانی سەعە زەڵمی پێشمەرگەی حیزبی سۆشیالیست لە شەوی١٧ لەسەر١٨ی ١٩٨٥/٥دا لە ئاوایی تەپەسەرە قووڵە.

هەروەها لەسەرجادەی گشتی هەڵەبجە پردی زەڵم لە ئاست تەپەتوڵەکە و تەپی سەفادا شەوی١٨ لەسەر١٩ / ٥/ ١٩٨٥ دا بۆسەی بۆ ئێمە و جەماعەتێکی حیزبی سۆشیالیست دانابوو دەستەیەک کەووتنە بۆسەکەوە، کەپێنج پێشمەرگەی سۆشیالیست و پێشیرەوی هێزەکەبوون کاتێک گەشتنە سەرجادەکە مەفرەزەکەی تۆفە دەست ڕێژیان کرد لە دەستەی پێشرەو دوو کەسیان شەهیدبوون لەوانە مام کەریم تاوگۆزی و ئیبراهیم ناوێک، مەحمود گردی شەریفی برینداربوو. یەک پێشمەرگەیان بە سەلامەتی لەو دەست ڕێژە ڕزگاری بوو ئەویش عەلی بچکۆل تەپەڕێزینەیی بوو، لەم بۆسەدا تۆفە شەل لاقی شکاو بەلاقشکاوی خۆی گەیاندەوە ڕەبیەکەی گردی گۆ.[١]

ئەو شەوە دوای پەڕینەوە لە جادەی بیارە- خورماڵ وەستا زاهیر و برادەرەکانیم ئیجازەدان گەڕانەوە، لەنزیک داری بەرمەڕان هاوانێک لەو ڕەبیانەی دەورو بەرەوە گوللەیەکی بۆ هاویشتین و لە نزیکماندا تەقیەوە بەڵام زیانی نەبوو، تەنیا ئەو وڵاخەی کاک نەوشیروانی لە سەر سواربوو بوو سڵەمەییەوە و سوارەکەی کەوتە خوارەوە، ئێمەش چەند کەس بەپەلە چووین بەدەمیەوە چونکە نەشتەرگەری فەقەراتی کردبوو، بەڵام سەلامەت بوو.

---

١- هەندێکجار لێبوردنی گشتی ئەبێتە هۆی پێشلکردنی مافی خەڵک و بریندارکردنی هەست و دڵی هەزاران تێکۆشەر و کەسووکاری شەهیدان، یان ئەبێتە بنەمای ناعەدالەتێکی یەکجار گەورەو گرانی کۆمەڵایەتی، هەتا ئەبێتە پێشلکردنی یاسای وەرگرتنەوەی مافی خاوەن مافەکان. لێبوردنە گشتیەکەی ڕاپەڕینی بەهاری١٩٩١ بووە هۆی ڕزگاربوونی سەدان خائین و تاوانباری وەک تۆفە شەل. هەرچەندە تۆفە شەل لەو لێبوردنەش کەڵکی وەرنەگرتوو هەڵهات بۆ بەغداد، درێژەی بە خیانەتی خۆیدا تا ساڵی ٢٠٠٣. سەرباری ئەوەی قاتلی حەوت پێشمەرگەیە بەئاشکرا، ئێستا لە کوردستانی ئازاددا خانەنشینە لەسەر لیستی لایەنێکی سیاسی لە سەیدسادق نیشتە جێیە لەوانەشە مووچەکەی لە هی شەهیدەکان زیاتر بێت!

دەشتمان تەی کرد و نیوەشەو گەیشتینە ئاوایی خێڵی حەمەی چۆڵ کراو وێرانە. لەسەر حەوز و ئاوی مزگەوت لاماندا، بەڵام سەگ و پشیلەی ئاوایی لە برساندا لێمان کۆبوونەوە. ئێمەش نان و گۆشتی قوتووی معلب مان پێ بوو، پێشمەرگە سووکە نانێکمان خوارد، کاک نەوشیروان ووتی من ناخۆم مەعیدەم نەخۆشە، هەر جگەرەی ئەخوارد لە بەر ئەوە لەڕێگە نەیتوانیبوو جگەرە بکێشێ لەو نێو کاتژمێر پشوودانەدا جگەرەی نەکوژاندەوە

هەرهەمان شەو لە خێڵی حەمە دەرچووین بە ناو ئاواییە چۆڵو وێران کراوەکانی هەردووشەشک و هەردوو تەپی سەفاکاندا تێپەڕبووین و لە جادەی گشتی هەڵەبجە-زەڵم پەڕینەوە، وێرانەی ئاوایی تەپە تۆڵەکەشمان خستە دواوەو دەمەوبەیانی لەناوچەم و توودرک و قەرەمێکی چڕدا لەنزیک کەلاوەکانی ئاوایی قاجردا ماینەوە.

ئەم رێگای باسم کردو ئەم شەو بڕیومانە چۆڵەوانی و پڕ مەترسی و کەشێکی زۆر سامناک و وەحشەتناکی هەبوو، چونکە شەوێکی نووتەکەو هەر جۆرە ئیشارەتێک وەک جگەرە یان هەر بریسکەیەک هەر دەنگێک نیشانەی ئەوەیە لەو شوێنەدا پێشمەرگەی لێیە، چونکە هاوولاتی مەدەنی لەم وولاتەدانییە، کەس نییە هەواڵی ڕێگاو زانیاری لێ وەرگرین جاران خەڵکی ئاواییەکان ڕێنیشاندەرو ڕێنوێنی کەرمان بوون.

لەو شوێنەدا کە ماینەوە، پێشمەرگە هەموو هیلاک لەسەر زەوی کەوتن و لێی ڕاکشان، مێشولەش تێمان وروژان، نازانم چۆن چەند پێشمەرگەیەک خەو ئەیبردنەوە. من و هوشیار بیاوێڵەیی دانیشتبووین، پرسیم ئەرێ هوشیار ئەوە پێرێ لەچایخانەکەی کەمالا بۆچی ئەو کابرات توورە کردبوو؟ تۆچیت پێ ووتبوو؟. ووتی پرسیومە تۆ جاشی؟ ووتویەتی نە من پێشمەرگەی موسڵمانم. پێم وتووە ناجاشی، ووتی: جاش چییە؟ خۆ عێراق نییە جاشی هەبێت. منیش لێم پرسی تۆ کوردنیت؟ ووتی بەڵێ کوردم، ووتم ئەی چەکی حکومەتت پێ نییە؟ ئەویش بەڵێ، ئێ منیش ووتم هەرکەس کوردبێ وجلی کوردی لەبەردا بێت چەکی حکومەتی ئەو وڵاتەی پێبێ کەپارچەیەکی کوردستانی لەسەرە ئەوە جاشە. کاک نەوشیروان لەپەنامانەوە دەستی کرد بەپێکەنین و ووتی ئافەرم ڕاست ئەکا.

بۆ نیوەڕۆ هەستاین وردە وردە کەوتینەڕێ بەرەو دۆلاس و ناوگردان، هەرئەم هۆشیارەو پێشمەرگەیەکی تری تەپەکوڕەیی بەناوی عومەری ناوخاس بەدەم ڕێوە نزیک بوونەوە لە من ووتیان ئەرێ کاکە حەمە ئەم کابرایە کێیە تۆ ئەمەندە ڕێزی لێ ئەگری؟ ووتم ئەوە میوانەو ئەیبەین بۆ جێگەیەک، ووتیان ئەی خۆی بۆ ناڕوا بەخوا تووشی بەلایەکمان ئەکات.

من پێشتر بە ئەکرەم و کەیکاوسم ووتبوو، چونکە ئەوان خۆیان کاک نەوشیروانیان ئەناسی، وتبووم ئەبێ ئاگاتان لێ بێت ئەم پێشمەرگانە نەیناسن، چونکە لەوانەیە یەکێکیان بەرگەی ئەم وەزعە نەگرێ و خۆی لێمان بدزێتەوە یان بڕوا تەسلیم بێتەوە، ئەوکاتە تووشی کارەسات ئەبین، ئەگەر یەکێکیشتان دەرچێت دوایی هەر ئەڵێن دەستی ئەوکەسەبووە کاک نەوشیروانیان داوە بەکوشتن.

نزیکی کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ من خۆم لەپێشەوە بووم لەگەڵ دوو پێشمەرگە چووینە سەر جۆگەکەی دۆلاش، لەوێ دارێک وەک پرد لەسەر ئاوەکە دانراوە، ئەو بەری جۆگە و دارەکە حەوزو سەرئاوی ئاوایی دۆلاشە.

دەرەختەکانی توو و بی و چنار لە وێدا ئەوەندە چڕن کەس لەدورەوە ئەویتر نابینێ تا نەگەن بەیەک، کەپێم خستە سەر دارەکە بینیم کۆمەڵێک چەکدار لەسەر حەوزو سێبەری بندارەکاندا دانیشتوون، ئەوانم بینی یەکسەر گەڕامە دواوەو بەئاماژە بە دوو پێشمەرگەکەی دواوەی خۆمم ووت بگەڕێنەوە. کاک نەوشیروان ووتی هاچییە؟ ووتم چەکداری لێیە، یەکسەر یەکێک بەدەنگی بەرز ووتی کاکە حەمە مەگەڕێرەوە، لام کردەوە بینیم کاکە حەمەی حاجی مەحمودە بەرەولامان هات، پرسی ئەوە کاک نەوشیروانە؟ ووتم بەڵێ، دوای چاک و چۆنی لەگەڵ ئێمە، لەگەڵ کاک نەوشیروان یەکیان لەئامێز گرت، ووتی فەرموون، ئێمەین، کاکە حەمە تۆ بۆگەڕایتەوە من تۆم ناسی وام زانی منت چاوکردووە؟

ووتم نەوەڵا ئێمە لە خۆرەکەوە هاتینە ناو دارەکان تۆم نەبینی بەلام قەرەباڵەقیەکەم بینی. جا مرۆڤ کاتێک لەبەر هەتاوەوە بڕوات بۆ ناو جەنگەڵ و سێبەر تاماوەیەک چاوی بەباشی نابینێت. لەوێ کاکە حەمە ووتی ئەزانم برسیتانە، ووتمان وەڵا ئێمە نانمان خواردوە، بەلام کاک نەوشیروان نەخۆشە و هیچی نەخواردوە. لەوێ ڕۆژی نیوەڕۆ کاکە حەمە دوو پێشمەرگەی بانگ

کردو بردنییە لاوە بەچرپە قسەی لەگەڵ کردن، چاوم لێبوو ئەو دوو پێشمەرگە چەکەکانیان داناو ڕۆیشتن. ئەم زانی کاکە حەمە ئەوانەی بۆ شار ناردوە، زۆر قەلەق بووم ئاخۆ ئەم دووانە خەبەرمانمان لێ نادەن؟ چونکە لەو شوێنەدا لای باشوورو ڕۆژهەلات دەریاچەکەیەو لای باکورو خۆرئاواش جادەی قیرەو شارۆچکەی سەیدسادقە، ئەم شوێنەی ئێمەی لێین ئەکەوێتە نزیکەی پێنج کیلۆ مەتری سەیدسادق.

بەلام دڵم بەوە خۆش بوو دیارە سیقە پێکراوی کاکە حەمە خۆی بوون. ئەگینا نەی ئەناردن، بەر لەعەسر هاتنەوە نان و کەبابێکی زۆریان هێناو نانمان خوارد، دوای نانخواردن کەوتینە ڕێ. کاکە حەمە ووتی خەڵکتان لەگەڵ بنێرم؟ ووتمان پێویست ناکات زۆرین. کاک نەوشیروان بەکاکە حەمەی گووت من حەز ئەکەم کەمتربین بە حەمەم ووتوە هەندێک لەم پێشمەرگانەش ئیزن بدات.

خواحافیزیمان کرد و لای ئەوان دوورکەوتینەوە ووتی حەمە تەنیا خۆت و سێ کەس ئەبێ بڕۆین؟ ئەوانی تربنێرەوە با بگەڕێنەوە، هەرچەند ووتم کاک نەوشیروان ڕێگا زۆری ماوەو ئەوا تووشی شتێک بووین، ووتی نابێت ئەم قەرەبالغیەم پێ باش نییە، بۆیە تەنیا من و ئەکرەم و تەحسین بیارەیی و ڕزگاری حاجی عەلی لەگەڵیا ماینەوە، کەیکاوسم ناردەوە لەگەڵ باقی هێزەکەداو پێموت بکەونەڕێ ئاگات لێ بێت پێشمەرگە خۆیان نەدزنەوە لێت لە ناو هەڵەبجەدا، لەقەراغ شاردا یەک دوو کەسی جێ متمانە بنێرە لەگەڕەکێکی کەنارەوە نان و کەلوپەلەتان بۆکۆبکەنەوە و خۆت لای ئەمانی تربە تائەوان دێنەوە، بکەونەڕێ بەرەو بناری شنرێ وسەرکەونەوە بۆبارەگای تیپ، خەمی ئێمەتان نەبێت، ئەمشەو بۆدەمەو بەیانی ئەگەینە قەرەداغ.

دیارە مەفرەزەیەکی کاکە حەمەش دوورو نزیک بەدوای ئێمەدا هاتن، ئەوانیش بۆ قەرەداغ ئەچوون، تا دەمەو ئێوارە ڕێگەمان بری گەیشتینە ئاوایی مالوان ئەو ئاواییە ماڵێکی حەیوانداری لێمابوو، تراکتۆریان هەبوو. بەلام لەمالوان توشی مەفرەزەیەکی تر بووین. من نەم ئەناسین، کاکە نەوشیروان خۆی ئەیناسین چاکی و چۆنی لەگەڵ کردن و ئەوانیش زۆر بەگەرموو گوڕی

ووتیان بۆ کوێ؟ بائێمەش لەگەڵتابێین کاک نەوشیروان، ووتی پێویست ناکا. ئەمانەش بەرەو لای زەڕایەن ئەچوون.

ئەوان چاوەڕێن خۆر بنیشێ و ئەم تراکتۆرە نزیکیان بکاتەوە، ئێمەش بەتەمابین تراکتۆرەکە لەگەڵ خۆمان بەرین. بۆیە پێکەوە هەر دوولا سوار بووین، پرسیم کاک نەوشیروان ئەمانە کێن؟، ناوی هێنان من لەبیرم نییە کێبوون، بەلام کاک نەوشیروان ووتی حەمە ئاگاداربە ئەمانە ئاشبوون لای ئێمە چەک کراون هاتوونەتە لای سۆشیالیست، خەڵکی ناوچەی شارباژێرن. پێکەوە هاتینە ئاوایی شێخ حسەین، ئێمە لەبەردەم زەڕایەندا لەتراکتۆرەکە دابەزین و دنیا وردە وردە تاریکی کرد، ئەو ماوەی لە مالوان وەستاین تا ئێوارە بێت و بەتراکتۆرەکە برۆین، بەیەکێک لەپێشمەرگەکاندا قاترەکەم نارد ووتم سواربەو برۆ بۆ لای ئاوای شێخ حسەین، لەوێ بوەستە تا ئێمە دێین. ئاوایی شێخ حسەین چۆڵە و تەنیا کەلاوەکانی لەدوورەوە دیارن قاترەوان لە ئاوایی شێخ عەزیز لە خواتری ئاوی شێخ حسەین وەستا بوو، لەوێ ئێمە ووتمان لێرە دائەبەزین، تراکتۆرەکە ئەوانی ماوەیەکی تربرد، هەوا بەتەواوەتی تاریکی کردو ئێمەش خۆمان لەوان ونکردو بەرەو دزکەرە کەوتینەڕێ.

لەبەردەم زەڕایەندا گلۆپەکان شەوارەیان پێکرد بووین و ڕێگەمان بە هەڵە بەرەو ناو زەڕایەن گرتوەتەبەر. لەناکاو چەند دەسرێژ گوللە کرا بەسەرماندا، گوللەکان ئاگراوی بوون بەسەر ئێمەو بە تەنیشتماندا ویز و هوڕیان بوو، لەوێ بە دەستەڕاستدا کەمێک وەک نیوە بازنە لامان دایەوە و لە جادەی گشتی سلێمانی - دەربەندیخان پەڕینەوە و بەلای دەستی چەپی ئاوایی دزکەرەدا خۆمان گەیاندە بەردەم ئاوایی کانی هەنجیر، پێشمەرگەکان و منیش ئیتر خەریک بوو لەپێ بکەوین، بۆیە لەکەنەڵانێکدا ئاوی بەهار لموچەوی لێ فەرش کردبوو، دوور لەپوشوو پەڵاش خۆماندا بە ئەرزدا داو لێی کەوتین و مێشوولە وەک پورەی هەنگ لەوێش لێمان ئاڵان، خراپیان پێکردین، بەلام ئێمە برزسکمان لێبڕابوو گوێ بەمێشوولە نادەین، پاش دوو کاتژمێر پشوودان هەوا ڕووناکی کرد و کەوتینەوە ڕێگا چووینە ئاوایی کانی هەنجیر لەوێش نەوەستاین چووینە ئاوایی کۆرە، لەوێ کاک عومەر فەتاح لەگەڵ کاک شێخ جەعفەری شێخ مستەفا کە ئەوکات بەرپرسی عەسکەری

مەڵبەندی یەک بوو چاوەڕێیان ئەکردین، دیارە بەجیهاز لەسەر سنوورەوە ئاگادار کرابوون کەلەو کاتەدا ئێمە ئەگەینە ئەو شوێنە، قاترەکەمان لەکۆرە بەجێهێشت بۆ پێشمەرگەکانی تیپی ١٥ شارەزوور. بەڵێ لەبارەگای تیپی ١٥ی شارەزوور دوای پشوویەکی کورت سواری چەند ئۆتۆمبێلێک بووین، بەچیای پشتی کورەدا بەرێگەیەکی زۆر خراپدا کە بۆ تراکتۆر دروست کرابوو چووینە سەرشاخ، بەلای ئاوایی فەقیرەدا شۆڕبووینەوە بۆ ئاوایی شێخ مستەفا.

لەوێ ئەو ڕۆژە حەواینەوە، شێخ دلێرو شێخ جەعفەری برای میوانداری و پێشوازیەکی گەرمیان کردین، ئەمانە خاوەن دیواخان و خاوەن سفرەونانن خۆشیان پێشمەرگەن. ڕۆژی دوەمیش هەر لەوێبووین، ئەوەندە خواردنی خۆشیان داینێ حەزمان ئەکرد هەر لەوێبین، بەڵام ئێمە ئەرکمان ئەوبووە، ئەبێ بگەڕینەوە بەرەو هەورامان، مۆڵەتمان وەرگرتوو کاتێک حواحافیزیمان کرد، کاک نەوشیروان دەستی بەگیرفانیدا کرد و بڕێک تمەنی ئێرانی پێبوو دایە دەستم، ووتی ئەوەبگرە کەگەیشتنەوە هەورامان ئەمە بدە بەحەیوانێک با ئەو پێشمەرگە پشکێک گۆشت بخوات، مەبەستی هوشیار بیاوێلەیی بوو.

ئەو ڕۆژە لە ئاوایی گەڕاینەوە، شەوەکەی دووبارە لە جادەی گشتی دەربەندیخان سلێمانی لە نزیک چەم و ژاڵە پەڕینەوە و تا دەمە و بەیانی ڕێگەمان بڕی و سەر لە بەیانی گەیشتینە کانی ئاوەکەی پیر مەحمود لە بێسەلمێن بەرامبەر بە قۆرتاس، خاوەنی ئەم کانی و ئاوە ناوی حاجی ئەوڵایە پیاوێکی بەڕێزە، وچەند جاری تر لێرەدا خۆم شاردوەتەوە تا عەسر، چونکە هەرکەس لەو ناوەدا دەرکەوتایە کوێتەر زوو ئەهاتە سەری، دەریاچەکە ناوچەی قەدەغەکراوە محەڕەمە، ئەو ڕۆژە تا ئێوارە لە دڵەڕاوەکە دا بووین چۆن لە دەریاچەکەدا بپەڕینەوە؟. کاتژمێرێکی مابوو بۆ خۆر ئاوابوون، خۆم هاتمەکوێی ئاوەکە ئا خۆ لەم بەر یان لەوبەر بەلەمێک چاوناکەم؟ ئەگەر لەو بەریشدا بوایە خۆم بەمەلە ئەپەڕیمەوە و بەلەمەکەم ئەهێنا بۆپەڕاندنەوەی جەماعەت بۆ بەری هەڵەبجە. بە بێ هیوایی بەگوێ ئاوەکەدا بەرەو پردی کۆنی توەقووت ملم نا، پووشوو پەلاشو دڕکوداڵ لەهەندێک جێگەدا تائاستی بالاپیاو هاتووە، تینوومەو تۆزی پووشو پەلاشەکە گەروی گرتووم، ماوەیەکی

تر ڕۆیشتم هیچم دەست نەکەوت، بەدووربین بڕێک وەرد بوومەوە لەلێوارەکانی ئەوبەر بەری ئاوایی سووتاو وێران کراوی ئیمامی زامن. هیچ دیار نییە، بەبێ ئەمەلی و خەمباریەوە گەڕامەوە، گەیشتمە جێگەیەک لەناکاو لە دووری ئاوەکەوە لە ناو پوش و دڕکو داڵدا کەووتم بەسەر کەلەکێکی چکۆلەدا. کە بەچەند تەختە و دار لەسەر دوو چوپی گەورەی تراکتۆر دروست کرابوو، چوومە نزیکیەوە سەیرم کرد هەوای ناوچووپەکان تەواوەو زۆریش ڕێک و پێک بەپەت و شریتی نایلۆن تەختەکان بەستراون و نێوان تەختەکان بە قامیش تەنراوە، ئای لەوکاتەدا چەندە دڵخۆش بووم. جێگەکەیم دیاری کردوو گەڕامەوە بۆ لای جەماعەت، زۆر دڵم خۆشبووم لە دوورەوە وتیان چییە؟ وتم هەستن خۆتان کۆکەنەوە کەڵەکم دۆزییەوە، چووین گەیشتینە لای چووپەکان، ئەکرەم وتی ئەتەوێ بەمەوە بمانخەیتە ناو ئەم بەحرە؟ وتم بۆ؟ وتی وەڵا من سوار نابم تۆخۆت مەلە ئەزانی و ئێمە ئەخنکێین، دووبارە بڕێ پشکنیمان کەموکورتی نەبوو، بەقسەی خۆش دڵنیام کردن بەمەرجێک جووڵە جووڵ نەکەن و نەترسن بەسەلامەتی ئەتانبەمە ئەوبەرەوە، بەڵام جارێ زووە دانیشن تاخۆر ئاوا بێت.

خۆرئاوا بوو کەڵەکەکەمان هەڵمان گرت و خستمانە ناو ئاو، هەر چوارمان چوەوینە سەری، پێم وتن بەڕێک و پێکی دانیشن هێواش هێواش بە سەوڵ لێدان هاتین و لەدەراوی ئیمامی زامندا گەیشتینە وشکایی و دابەزین، نەماندوو بووین و نەبرسیەتی نەما وەک ئەوە بوو ئێستا لە دایک بین. بە دەشتی نێوان سیروان و بناری بێژاواو پریسی خواروودا بە لای ئاواییە چۆڵەکانی گورکەچیاو بە کراوادا نزیکەی نیوەشەو خۆمان گەیاندە عەبابەیلێ و لەوێ چووینە ماڵی دادە نەجیبەی دایکی نەبەزو نەورۆز، خۆمان شاردەوە تا شەوی دوایی، چەندین جاریتر لەم ماڵەدا حەواوینەتەوە، بەڕاستی دادە نەجیبە نەجیب وبەخزمەت بوو.

ئەم ئێوارە زوو نانمان خواردو دادە نەجیبە کولێشی بۆ پێچاوینەوە، نان و شەکرو چاو پەتاتەی کو لاوە ئامادە کرا، مەتارەکانیشمان پڕکرد لەئاو، جەماعەت پەلەیانەو ئەیانەوێت بەڕووناکی لەماڵەکە دەرچین منیش ئەڵێم ئەی نابێت بوەستین تاتاریک بکا؟ ئەم دراوسێ ماڵانەی دادە نەجیبە نابێ بمانبینن کاتێک لێرە بچینە دەرەوە، هەرچەندە خەڵکی ئاوایی هەمویان خەڵکی باشوو

دۆستی خۆمانن. تاریکی کردوو بێدەنگ دەرچووینە ناو کۆڵان، نانەکەمان کەمەو ئادەی ئەکرەک لەماڵی حاجی کەریم برێک نانیتر بهێنن، لەئاوای دەرچووین، کەوتینە سەرەتای ئەوهەورازەی کەهەر بەچاو تەماشاکردنی لەخوارەوە بۆسەرەوە هەناسە برکە ئەتگرێ.

نیوەشەوێکی درەنگ دوای برینی ڕێگایەکی هەورازو و دواتر سەرەوخواروو ماوەیکی تریش لابەلا بەنێوان پایەگاو ڕەبیەکانی دوژمندا، لەسەرکانی و ئاوەکەی وەزگێڵ گیرساینەوە، ئێرە ئەو شوێنەیە دورکەوتووینەتەوە لەمەترسی، لێرە بۆ بارەگاو مەقەڕەکانمان لەهاوارەکۆن یەک کاتژمێر ڕێگای لابەلاو سەرەوخوارکەیە. دوای دەموچاو شۆردن و پشوویەکی باش ئادەی تۆشەبەرەکان بکەنەوە، ئەوەی ماڵی حاجی کەریم نزیکەی کیلۆیەک کەرەو ڕۆنی خۆماڵی تیایە، ئەمە بەچاوە خۆشە ئێستا ناتوانین چالێنێین، هەموو ڕازین یەکی نانێک بخۆین بەئاوی وەزگێڵەوە، خواردمان، چەندە بەلەزەتە دوای ماندوو بوون و برسێتی نان و ئاو.

دنیا ڕووناکی کردووە ئێمەش گەیشتووین و لەپشت کەپرو ماڵەکانی چەمی هاوارەکۆنەوە دانیشتووین، سەیری ناو ئاوایی و کەپرو هەوارەکانی ناوباخەکان ئەکەین. خەڵک وردەوردە تاکو تەرا، یەکێ بزن لەکەلا (پەچە) دەرئەکا، یەکێ قاترجل ئەکاو چەند کێبانوش بۆسەرکانی و ئاوهێنان دینو دەچن، ئەدەن بەلای یەکدا پێکەوە ماوەیەک ئەوەستن و قسەوباس ئەکەن بەوبەیانییە زووە ئاخۆ باسی چی دەکەن.

پێشمەرگەکان بائێمە بچینەوە بۆ مەقەڕ، مەڕۆن بابچین ئێستا دایکم چایی لێناوە کەرەو ڕۆنەکە پێکەوە بخۆین، نائەڕۆین، دەبیبەن لەگەڵ خۆتان، ناتۆبیبە بۆمناڵەکانی کاک ئازادو[1] خۆتان. باشە خواتان لەگەڵ. ئەوان دابەزین و پەڕینەوە بۆ بارەگای تیپ، منیش هاتمە ناوکەپرو ساباتەکەی ماڵی خۆمان کۆڵەکەم داناو دایکم هەستاوە، بەخێربێیتەوە، سەرچاوم کوان ڕەفیقەکانت چوونەوە بۆمەقەڕ، هەرئەوەندەو لەجێگەکەی دایکما خەوتم خەوێکی خۆش.

[1] – ئازاد کوڕی حاجی عومەری عەنەبیە، هاتبوو ببووە پێشمەرگە، لەگەڵ خۆیدا خێزانەکەشی غەزال خانمو سێ منداڵی بەناوەکانی هەردی وهاوژین دێرین هێنابوو، باوکم لەلای کەپرەکەی خۆیدا ئەم هاوینە کەپری بۆ ئەوانیش کردبوو.

## گواستنەوەی چەک
## لە ئێرانەوە بۆ قەرەداغ

لە مانگی ١٩٨٧/٢ لە بنکەی شنرویێ و سنوورەکەدا سەرگەرمی ئیش و کاری پێشمەرگانەو حیزبی خۆمان بووین. پێشمەرگە لە رووی ژمارەوە زیاتر بووبوون، شەڕی عێراق و ئێرانیش گەرمەی بوو. عێراق بەرنامەی هێرش کردنە سەر ناوچە ڕزگار کراوەکان و جێبەجێ کردنی پرۆسەی ئەنفالی هەبوو، چونکە لە دوای وتوویژ سالّی ١٩٨٤-١٩٨٥ کاتێک کە وتوویژ لەگەڵ ڕژێم بێ ئەنجام بوو، یەکێتی بڕیاریدا، شەڕ دەست پێبکاتەوەو جۆری شەڕەکەش بگۆڕێ، وەلەگەڵ ئێرانیش ڕێک بکەوێت و چی پێکرا بەرامبەر بەبەعس دریغی نەکات.

عێراقیش بە هەمان شێوە بڕیاری دابوو چی پێ بکرێت بەرامبەر بەیەکێتي و خەڵکی کوردستان دریغی نەکات، هەردوولا بەڵێنی خۆمان بردەسەر، ئێمە بەڕێکەوتن لەگەڵ ئێران و هێنانی پاسدار و وەرگرتنی چەک و تەقەمەنی، جگە لەو هێرش و پەلامارانەی هێزی پێشمەرگە ئەیانکردە سەر سوپاو جاش و باشترین گورزیان ئەسرەواندە سوپاو هێزە چەکدارەکان لەو دەمەدا. جارجار لێرەو لەوێش لەگەڵ هێزەکانی سوپای پاسداران کە ئامادە کرابوون بۆ لێدانی عێراق بەشێوەی پارتیزانی و بەرەیی لە ناو قووڵایی خاکی عێراقدا، لەیەکەیەکدا فەرماندەیی ئەکران بە ناوی قەرارگای ڕەمەزان پێکەوە بەشداریمان ئەکرد، تا دواتر کار گەیشتە لێدانی چاڵە نەوتەکانی کەرکوک و پێکەوە هێرشمانکردە سەر چیای ئەزمڕ ودەشتی شارەزوورو هەڵەبجە.

ئەوانیش واتە ڕژێمی بەعس و سەدام و دارو دەستەکەی، لەوانە عەلی حەسەن مەجید سەرپەرشتیاری پرۆسەی ئەنفال و کیماوی باران، بە درندانەترین شێوە دەیان هەزار مرۆڤی کوردی بێسەرو شوێن کرد، بە بەکارهێنانی چەکی کیمیای و خوڵقاندنی کارەساتی ئەنفال لە گەرمیان و خۆشناوەتی و قەرەداغ و دۆڵی جافایەتی و شاری هەڵەبجە و دەشتی شارەزورو بادینان و کۆیەو سەرجەم ناوچەکانیتری کوردستان دا. لەگەڵ

وێران کردن و ڕوخاندنی هەموو ئەو ئاوایی و شارو شارۆچکانەی پێشمەرگەی لێبوو یان پێشمەرگە دەستی ئەگەیشتێ.
یەکێتیی بە تەماوو چەک لە ئێران وەرگرێت و فریای گوندنشینەکانی بخات بەتایبەت لەناوچەکانی کەرکوک و گەرمیان، بۆ ئەوەی چەکداریان بکات تا بەرەنگاری سوپا و هێزە چەکدارەکانی عێراق ببنەوە.

ئەم دیوئەودیو کردنی ڕێگاکان لەسەرسنوورەکانی عێراق ئێران سەخت و دژواربوون بە درێژایی سنوور هەر لە خانەقینەوە تا قەندیل هاتوچۆ ئاسان نەبوو، بە تایبەت بۆگواستنەوەی چەک و تەقەمەنی بە وڵاخ و بەبار، کەمێک لەڕێی سەفرەو زەروونەوە بۆ دۆڵی جافایەتی و سەرکردایەتی بۆ سەرگەڵو بەرگەڵو بە بچڕبچڕ و بەکەم و کورتی هاتووچۆ هەبوو. گەیاندنی چەک و تەقەمەنی بۆ سنوری کەرکوک و گەرمیان و قەرەداغ لەوێوە ئاسان نەبوو.

لە کۆتاییی پاییزی ١٩٨٧دا مام جەلال داوای کردبوو سەردانی بکەم لە یاخسەمەر، دوای ئەوە لە هاوارە کۆنەوە بۆ قەرەداغ و لەوێوە بۆ دۆڵی جافایەتی هەروەک جاران و دێبەدێ لە سنووری مەڵبەندی یەکەوە بۆ سنووری مەڵبەندی دوو تاگەیشتمە لای مام جەلال، پاش حەوانەوە پشوودان، وەڵامی پرسیارەکانی مام جەلالم دایەوەو بە وردی باسی سنوورەکەو کاروباری پێشمەرگانەو حیزبی و گەشەکردن و فراوان بوونی بنکەی شنروێ و زیاد بوونی هێزی پێشمەرگە و پەیوەندییەکانمان لەگەڵ حیزبی دیموکرات و هاتووچۆ لەناوچەکەوە بۆ ئێران و ڕێگاوبانەکان و بارودۆخەکەم بە گشتی بۆ باسکرد، دوای ئەم وتووێژە پێی ووتم: زۆر باشە بەخێر هاتیت ئەبێت ماوەیەک لێرە لای من بیت ئیشم پێتە. ووتم بەسەر چاو، لەوێ لەیاخسەمەر مامەوە

دوای ئەوەی من لە هاوارەکۆنەوە کەوتوومەتە ڕێ بەرەو یاخسەمەر کاک جەبار فەرمان لەگەڵ تیپی ١٥ی شارەزوور و دەستەکەی خۆی بە دوو وەجبە دێنە هاوارەکۆن، ئەوانەی کە لەپێش کاک جەبارەوە گەیشتونەتە هاوارەکۆن بنکە و بارەگایان لەوێ داناوە، دواتر کە کاک جەبار خۆی ئەگاتە سنووری بنکەی شنروێ لە هاوارەکۆن ئەمێنێتەوە و ئەنێرێت بە دوای حەکیمی مەلا سالح دا، کاک حەکیم ڕابەرسیاسی بنکەکەو بەرپرسی

پەیوەندیەکانیش بوو لەگەڵ ئێرانیەکان، لە نووسینێکی خۆیدا لەوبارەوە ئەنوسێت و ئەڵێت :

((بنکەی شنرۆێ لە سنوری هەورامان هەڵەبجە دامەزرا بە مەبەستی ئەوە گەشەو نەشە بکات و دواتر لەسەر ئەو هەیکەلە تیپی یانزەی هەورامان تەشکیل بکرێتەوە، لێپرسراویەتی ئەم بنکەو تەشکیلاتەکەی سپێردرا بە حەمەی حەمە سەعید، منیش (حەکیم) بەرابەر سیاسیی دیاری کرام. هێندەی پێنەچوو من ئەرکی پەیوەندی نێوان یەکێتی و قەرارگای ڕەمزانیشم پێ سپێردرا، ئەمە لەسەر بریاری لێپرسراوی مەڵبەندی یەکی ئەوکات بوو. بنکە کە لە گەشەکردن و چالاکی نواندندا بوو، لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە پێشمەرگەی باشی هەبوو، لە چالاکی و ئەرکی پێشمەرگانەدا و لە تەشکیلات و هەیکەلی کەرت و مەفرەزەکانەوە جیاوازی نەبوو لەگەڵ تیپەکانی تردا، زەمینە ساز بوو بۆ کردنەوەی تیپی یانزەی هەورامان، هەر مابوو بە بڕیارێک ناوی بنکەکە بگۆڕدرێت بۆ تیپی یانزەی هەورامان، بارەگامان لەگوندەکانی بۆیین و گرییانەو هاوارەکۆندا هەبوو، لە ڕووی جوگرافیەوە ناوچەیەکی تارادەیێک فراوانی ئازاد کراومان هەبوو.

ڕۆژێک بە کارێک کەنەمان دەزانی بۆ چی بوو بە بروسکە کاکە حەمەی حەمە سەعید بە بانگهێشتی بەڕێز مام جەلال چوو بۆ سەرکردایەتی، دوای چوونەکەی ئەو بە ماوەیەکی کەم کۆمەڵێک پێشمەرگە لە قەرەداغەوە بەسەرپەرشتی سۆرانی ڕێکخستن، هاتنە هاوارە کۆن و سنوری بنکەی شنرۆێ ئەو بەرپرسانەی لەگەڵ ئەم هێزەدا هاتبوون بریتین بوون لە هەڤاڵان جەلال کولکنی، فەلاح حەمە بۆر، سەریاس هاواری، تایەرە بچکۆل، عزیز کولکنی و ژمارەیێک پێشمەرگە.

من ڕۆژێک لە بارەگای گوندی گریانە بووم پێشمەرگەیەک هاتو ئاگاداری کردم کە هەڤاڵ جەبار فرمان هاتووەتە هاوارە کۆن و داوات دەکات، منیش چووم بۆ لای کاتێک کە گەیشتمە ئەوێ بینیم هەڤاڵ کەمال دشەیی ئەندامی کۆمیتەی شارستانی هەورامانی حیزبی دیموکرات لەوێ لەگەڵ کاک جەبار دانیشتووە، ژن و منداڵەکەی کاک جەباری لەشارەوە گەیاندبووە هاوارەکۆن. من کە چوومە ژوورەوە تاڵی و سوێریم لە سیمای کاک جەباردا خوێندەوە، کەمال دشەیی لەبەرم هەستا و یەکترمان راموسی و

ئینجا ڕووی کردە کاک جەبارو ووتی کاکە ئێوە زۆر بەختەوەرن کە کادرێکی وەک ئەمەتان هەیە چەند خزمەتی یەکێتیی دەکات ئەوەندەش هی حیزبی دیموکرات دەکات، کاک جەبار سەیری کردم و بەم قسەیە برێک سیمای ڕوون بوویەوە، دوای تاوێ سوپاسی کاک کەمالی کرد ئەویش ماڵ ئاوای کردو ڕۆشت بەدەم کاریەوە.

ئینجا ڕووی کردە من و ووتی: ئەم بنکەی شنروێ چییە؟ بنکە یەعنی چی؟ووتم بنکە بە بڕیاری بەڕێز مام جەلال و بە ئاگادرای مەڵبەند کراوەتەوە، بۆ ئەوەی ببێت بناغە بۆ تەشکیل کردنەوەی تیپی ١١ی هەورامان و پارێزگاری لە ناوچەکە دەکات و کارو چالاکی بەردەوامەو جاروباریش مەفرەزەی لێ ئەڕوات بۆ شاری هەڵەبجەو شارەزوورو دەوروبەری بۆ چالاکی نواندن وێستگەیەکیشە بۆ هاتووچۆی یەکێتیی لەناوچەکانی تر ەوە بۆ ئێران.

ووتی ئاخر لە هەیکەلی عەسکەری یەکێتیدا شتێک بەناوی بنکەوە نییە. ووتم بۆ ئەوە دامەزراوە گەشە بکات و ببێتەوە بە تیپی یانزەی هەورامان. ئەی حەمەی حەمە سەعید لە کوێیە؟ ووتم بروسکەی بۆ هاتووە چووە بۆلای بەڕێز مام جەلال. لەم قسەو باسانەدا بووین چەند فیشەکێک تەقی. کاک جەبار بانگی کرد لەپاسەوانەکانی ئەو تەقە چییە؟ من ووتم کاک جەبار ئێمە تەقە و ڕاومان قەدەغە کردووە ئەم هەڤاڵانەی کە هاتوون هەم تەقە ئەکەن و هەم ڕاویشیان ئازاد کردووە. لەپڕ شەهید سەریاس هاوارییان بانگرد بۆلای، لێی تووڕە بوو کردیە دەرەوە و بەزمانی هەڕەشە پێی ووت هەمووتان دەبێ ئەمشەو لەم سنوورەدا دەرچن و بچن و بەڕێی خۆتانەوە. ئینجا کاک جەبار نامەیەکی بەڕێز مام جەلالی پیشاندام کە کراوەتە بەرپرسی هێنانی ئەو چەک و تەقەمەنییەی کە لەلایەن ئێرانەوە دیاری کراوە بدرێت بە یەکێتی و بیگوازێتەوە بۆ قەرەداغ.

پێکەوە بووین تا ئێوارە، ئینجا کاک جەبار لەگەڵ منداڵەکانی بەسواری وڵاخ گەیاندنمانە گوێ ئاوی سیروان و لەوێ بە کەڵەس چوونە ئەوبەرەوە بۆ ئێران، من بەرێگادا بە پرسیارەکانی کاک جەباردا سەبارەت بە بنکەو ئیش و کارو چالاکی و پەیوەندیەکان هەندێک شتم لا ڕوون بوویەوە و هەندێک سەرنجیشم لا دروست بوو.

دوای ماوەیەک  کاک جەبار گەڕایەوە بۆ قەرەداغ و ئەرکی گواستنەوەی چەک و تەقەمەنییەکە، لەلایەن بەڕێز مام جەلالەوە سپێردرا بە هەڤال حەمەی حەمە سعید و بنکەی شنروێ، ئێمەش سەرکەوتووانە ئەرکەکەمان ئەنجام دا و هەموومان گواستەوە لە ئێرانەوە بۆ سنووری بنکەی شنروێ و لەوێشەوە بە هاوکاری تیپەکانی تری یەکێتیی بۆ قەرەداغ)).

بەڵێ دوای ماوەیەک ڕۆژێ هەڤال مام جەلال بانگی کردمە ماڵی خۆیان وپرسیاری کرد حەمە ئایا ئەتوانی ئەو چەک و تەقەمەنییەی کە هەمانە لە ئێران بۆمان بگوازیتەوە بۆ دیوی عێراق وسنووری بنکەی شنروێ؟ لەوێوە بە هاوکاری تیپەکانی ١٥ ی شارەزوور و٥٥ی قەرەداغ و ٥١ی گەرمیان و ٥٣ی شیروانە بگاتە قەرەداغ؟ پرسیم چەکەکان چەندە جۆری چیە؟ ووتی کلاشینکۆفەو لەگەڵ مەخزەن و توربەو کەلوپەلی تری سەربازی حسابیان کردوە بە٢٥٠ دووسەدو پەنجا باری ولاخ (قاتر) ئەگوازرێتەوە بە٣سێ هەنگاو، ووتم بەڵێ ئەتوانم، ووتی بۆم باس بکەچۆن چۆنی؟ بەوردی بۆم باس کرد کە چی ئەکەم و چۆن چۆنی ئەیگوازمەوە.

بەمام جەلالم ووت ڕێگای هات و چۆمان بۆ ئێران لەوسنوورە دا بەسەر ئاوی سیرواندایەو بەسیم ئەمبەرو ئەوبەر ئەکەین، ئێستا وەرزی زستانە و ئاو زۆرە و ڕێگاکەش هی پیادەڕەوە هی ولاخ نییە. بۆیە ئەبێ ڕێگای شێخان بۆئاوایی گریانە بە لێوار ڕووبارەکەدا بکەینەوە هەرچەندە ئێستا کەکەم هاتووچۆی پێدا ئەکرێ، ئەو کات ڕووباری سیروانمان لە کۆڵ ئەبێتەوە. ئاوایی شێخان سوپای پاسدارانی تێدایە و لەم بەرئاوە بە جێگەیەکدا کەپێی ئەووترێ پردیوەر دێینەوە سەر ئەم ڕێگایەی هەزار پەز و کولێن دەشت و گریانە. بەڵام ئەمە ڕاوێژی ئەوێت لەگەڵ حیزبی دیموکراتی ئێراندا ئەوان چاودێری ڕێگاکە دەکەن و کردنەوەی و لابردنی ئەلغام و تەڵەکان بێئاگاداری و ڕەزامەندی ئەوان نابێت، کەئەمە تەواو بوو بەشەوداو بەنهێنی چەک و تەقەمەنییەکە بەولاخ ئەگوازینەوە بۆچەند ئەشکەووتێکی سەخت و نادیار کە هەر خۆمان پێی ئەزانین، ئینجا وردە وردە تیپەکان بە هێزی ٥٠-٧٠ کەس و هەرجارە و ئەتوانن ٢٠ – ٣٠ باری ولاخ بە قافڵە کاروان کاروان بهێننە شارەزوور و لەوێوە بۆ قەرەداغی بەرن.

ووتی زۆر باشە ئەبێ لێرەوە بچیت بۆ ئێران و ئەم ئیشەم بۆجێ بەجێ بکەی، چونکە کاک جەبارو تیپی ١٥ چوونەتە ناوچەی ئێوە لەهەورامان و پێیان نەکراوە ئیشەکە بکەن، لەدڵا پێم خۆش بوو ئەوان پێیان نەکراوە، ووتم زۆرباشە دڵنیابە بەسەرکەوتویی ئیشەکە جێبەجێ دەکەین. زۆری پێخۆش بوو، چەند ڕۆژێکی تر لای مام مامەوەو نامەی بۆ نووسیم بۆ کاک عەلی کەمال بەرپرسی پەیوەندیەکان بوو لەشاری سەردەشت، کەلەوێوە واتە لەسەر دەشتەوە ڕەوانەی لای کرماشانم بکات. نامەیەکیشی دامێ بۆ ئاغای مەسجدی لە کرماشان. لە نامەکەدا پێی ئەڵێت حەمەی حەمەسەعیدم ناردە لاتان ئەو چەک و چۆڵەی یەکێتیی تەسلیم بکەن، دوای نووسینی نامەکان، ووتم مام جەلال خۆت ئەزانی ساردییەک لە نێوان من و کاک جەباردا هەیە، هەرچەندە کاک جەبار فرمان برای گەورەو ڕێزی تایبەتی لای من هەیە و من دڵم زۆرسافە و پێم وابێ چەند کەسێک وێنەی منیان لای ئەو پیاوە ناشیرین کردووە، لە بەر بەرژەوەندی شەخسی خۆیان.

چونکە ململانێ و منافەسەی منیان پێ ناکرێ، ئەوەتا لەڕێی ئەو پیاوەوە کێشە و گرفت بۆ من دروست ئەکەن. ووتی هیچ نییە تۆبڕۆ ئیشی خۆت بکە، ووتم باشە بەڵام نامەیەک بۆ کاک جەبار بنووسە کە هاوکاریم بکات یان هەر بۆ ئەوە ئاگادار بێت، کە ئەو ئەرکە بە من سپێردراوە.. نامەیەکی دامێ بۆ کاک ڕەفعەتی مەلا ئەو لە علاقاتی کرماشان بوو.

بەڵێ لەو ماوەدا کە من لەلای مام جەلال بووم لە یاخسەمەر بێئاگا بووم، لەوەی تیپی ١٥ی شارەزوور و کاک جەبار چوونەتە هەورامان و سنووری بنکەی شنروێ. من ئیشم لای مام تەواو بوو ئامادەی ڕۆیشتن بووم پێی ووتم سبەینێ مەفرەزەی تایبەت لەگەڵ چەند کەسێکی تر ڕەوانەتان ئەکەن بۆ لای شاناخسێ. من چاوەڕوان بووم، بەیانی ڕۆژی دواتر شێخ عبدالکریمی شەدەڵە هات و دارای حاجی ئیبراهیمی چەرمەگاو دارای توفیق ئاغایش هاتن. مام جەلال کۆبوونەوەی خۆی لەگەڵ کردن و منیشی پێناساندن، مەفرەزەیەکی تیپی ٣٧ شاربازێری بە فەرماندەیی کوڕێک بەناوی ئاسۆ ئامادە کرد بوو، ئاسۆ دواتر شەهید بوو. لەیاخسەمەر دەرچووین بۆ ئاوایی مالومە و چۆخماخ و لەوێوە بۆ قەیوان و لە دۆڵێکەوە شۆڕ بووینەوە بۆ ئاوایی مارەڕەش.

لە مارەڕەش بەرۆژ ماینەوەو لە چەند ماڵێکدا خۆمان قایم کرد. دیارە دارای حاجی ئیبراهیم فەرماندەی فەوجی سووک بووە، پەیوەندی هەبووەو ماوەیەکە هاتووە پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کردووە، دارا پیاوێکی ڕووخۆش و ڕۆح سووک بوو. خەڵکی ئەم ئاواییە، سەربە خزمانی شێخانی کارێزەن، لەڕابووردودا و لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا ئەم دووبنەماڵە واتە شێخانی کارێزەو چەرمەگاییەکان کێشەیان لە نێوان دا دروست بووە و لە نێوانیاندا چەند کەس کوژراون.

دارای تۆفیق ئاغاش کوڕێکی نەرم ونیان و شاریە، بەرپرسی دەزگایی هەواڵگری بووە لە ناوسوپای عێراقدا، ئەویش پەیوەندی کردووە و هاتووەتە دەرەوە. دیارە نییەتی سەردانیان بۆ ئێران بۆ بینینی بەرپرسانی ئێران و پێدانی زانیاریە لە سەر هێزە چەکدارەکانی عێراق.

ئەو ڕۆژە لە مارەڕەش ماینەوە، ئێوارەکەی دەرچووین و چووینە ئاوایی هەباس چەقەڵ لەوێ لە جادەی گشتی ماوات چوارتا شەو پەڕینەوە و چووینە ئاوایی وەڕاس. ئاوایی وەڕاس قەرەباڵغ و کارەبای هەبوو لەوێ نانمان خوارد و چووینە سەر ئاوی ڕوبارەکەی نزیک ئاوایی، ئاو زۆر هاتبوو توانای پەڕینەوە نەبوو. بۆیە بە سواری ئەسپ و ماین هەمووومانیان پەڕاندەوە و بە هەورازێکدا بە نێوان ڕەبیە و سەربازگەی سوپای عێراق دا سەرکەوتین و بۆ دەمەو بەیانی گەیشتینە ئاوایی کوڕەداوێ.

لەوێ پشوومان داو پاش نیوەڕۆ لەگەڵ کاروانی قاچاغ چییەکاندا کەوتینەڕێ و دوای بڕینی ڕێگایەکی دوورو درێژو هەوراز، نیوە شەوێکی زۆر سارد گەیشتینە ناو قەدی چیای گمۆ. لێرە ئەوانەی سواری قاتر و ئەسپ بووبون بە هۆی سەرماوە دابەزین. لە ناکاو لەگەڵ ڕەشەباو زریان (دەمە_ کرێوە) ڕووبەڕوو بووینەوە، من تا ئەو شەوە نەمبینی بوو خەڵک ڕەق بێتەوە، کاتێک ئەیانووت فڵان جەماعەت یان فلانەکەس لە ناو بەفردا ڕەق بۆتەوە، لە دڵی خۆمدا ئەمووت چۆن؟ بۆچی خەڵک ئەوەستێ تاڕەق ئەبێتەوە؟.

ئەو شەوە قیامەتم بینی، وڵاخەکانی لەپێش مانەوەبوون ڕوویان وەرئەگێڕاو سەریان ئەکرد بەژێر سکی خۆیاندا و ئەوەستان یان هەوڵیان ئەدا بگەڕێنەوە، قاترەوانەکان هەوڵیان ئەدا لێخوڕن وڵاخەکان بڕۆن نەئەڕۆیشتن. من و

هەردوو دارا وشێخ عبدالكريم دەستمان بەیەکەوە گرت و سەهۆڵ لە کونەلووتمان دا ئەیبەست ئەتویست لایبەیت برژانگی چاو سەروخوار ئەنووسا بەیەکەوەو ئەیبەست، لەو شەوە تاریکە نووتەکەدا هیچمان نەئەبینی.

پاڵتوو جلەکانی بەرمان بوبووە شەختە، وەک تەختەی لێ هاتبوو. شتێکی وای نەمابوو دانیشین و ڕەق بینەوە من بەرەوخوار لەڕێگاکە لامدا، هەرچەندە ڕشەباکە ئەوەندە بەفری هێنا لەماوەیەکی زۆر کورتدا نەڕێگا و نەدارو بەرد دیار نەما، شێخ عەبدولکەریم داراو ئەوانی تر هاواریان کرد لامەدە و مەڕۆ، ووتم وەرن، ئەترسام لێیان ون بم و ئەوان ڕزگاربن، بۆیە ووتم با ئەوانیش بێن و پێکەوە ڕزگار یان پێکەوە بمرین، کەمێک بەرەو خوار بووینەوە دیاربوو ژێر بەفرەکە تەپکە گەوەن کوێستان بوو ئەوەی کەتیرەی لێ دەردەهێنرێ . هەر چەند مەترێک ڕۆیشتم و ئەوانیش هاتن بە دوامدا، بینیمان دنیا ڕوناک و مانگە شەوە و ڕزگارمان بوو بەڵام نازانین بۆ کوێ بچین؟ ئەم قیامەتە تەنیا لە نزیکەی ٤٠-٥٠ مەتردا بوو. وردە وردە درێژەمان بەڕێگەکردن داو بەرەو خوار بووینەوە، ئاراس هاتبوو لە دواوە بوو هات و پێشمان کەوتەوە تاچووینە خوارەوە بۆ ناو ئاوایی شاناخسی ئیتر نازانم وڵاخ دارو کاروانەکە چیلێهات. لەشاناخسێ بارەگاو ماڵی پێشمەرگی لێبوو جلەکانیان وشک کردینەوەو گەرمەمان بووەوە، تابەیانی خزمەتیان کردین.

بەیانی ڕۆژ بووەوە زانیمان کوڕێکی خەڵکی سلێمانی کەسەربازی هەڵاتوو بوو هاتووەتەوە بۆئاوایی کوڕەداوێ لەوێ خوشکێکی هاتووە بۆلای و هێناویەتی لەگەڵ خۆی بیبات بۆ شاری بانە لەوێ پێکەوە بژین. ئێوارە لەگەڵ ئێمە هاتن، بەڵام بەداخەوە ڕەق بووبوونەوە و شەو لە دوای ئێمەوە هەردووکیان مردبوون.

پاش نیوەڕۆ لە ئاوی چۆمان پەڕینەوەو چووینە سەردەشت، ڕوومان لە بارەگای پەیوەندیەکانی یەکێتیی و ئێران کرد. نووسراوەکەی کاک عەلی کەمالم تەسلیم بەخۆی کرد، لەوێ من لەهەردوو دارا و شێخ عەبدولکەریم جیا بوومەوەو چووم بۆ کرماشان و سەردانی کاک ڕەفعەتی مەلام کرد، کاک ڕەفعەت بەرپرسی پەیوەندیەکانی یەکێتی بوو لەوێ، نووسراوەکانی مام جەلالم پێدا.

ئەوەی خۆی خوێندەوە و پێکەوە چووین بۆ لای ئاغای ئیرەجی مەسجدی و نامەکەی ئەویشمان تەسلیم کرد. بڕیار درا ڕۆژی دوایی دانیشین. ئێمە گەڕاینەوە بۆ بارەگای علاقات لەوێ من دانیشتبووم، کاک ڕەفعەت ووتی کاک جەبار هاتووە لەو دیووە، ئەیزانی ئێمە نێوانمان ساردە. ووتی با من قسەی لەگەڵ بکەم، ووتم بەڵێ باشە. ئاگام لێ بوو کاک ڕەفعەت بۆی باس کرد، ووتی حەمەی حەمەسەعید مام جەلال ناردوویەتی و بەڵێنی بە مام جەلال داوە چەک و تەقەمەنییەکە بگەێنێتە جێگای خۆی، کاک جەبار لە ناخا پێی خۆش بوو چونکە ئەوەندە هاتوچۆی شێخان و دزڵی و دزۆڵە و سەر ئاوی سیروانی کردبوو، حەزی ئەکرد نەجاتی بێت لەو کێشەیە، چونکە ئەم ئەرکە ئاسان نەبوو. ماوەی مانگێک بوو هەرلەم سەرو ئەو سەردابوو بوو.

بەڵێ ڕۆژی دوایی لەگەڵ کاک ڕەفعەت چووینەوە بۆ لای ئیرەجی مەسجدی[1] ، ووتی۱۵۰۰ هەزارو پێنج سەد پارچە چەکە لەگەڵ هەشت تفەنگی قەناس و شەش هەزار مەخزەن و.... تاد.

پرسی تۆ ئەتەوێ لەکوێ تەسلمیت کەین؟ ووتم لەسەر سنوور ووتی دزڵی، شێخان یان دزۆڵە؟ ووتم لەشێخان (پردیوەر). لەوێ لیست و هەندێک وەرەقەو فۆرمیان هێناو ئیمزامان کردو ووتی ئێمە سبەینێ هەموو ئەبەینە شێخان تۆ بۆگواستنەوەی چیت پێویستە؟ ووتم ۲۰ قاتر دوو جهازی کۆڵەپشت. ووتی قاتر تەسلیم بە جەبار فرمان کراون و لە شێخانن ئەبێ لەوانە کەڵک وەرگری، دوو دەستگا بێسیمی کۆڵەپشتیش بە سەر چاو.

من خوا حافیزیم کرد لە حاجی ئیرەجی مەسجدی و لەگەڵ کاک ڕەفعەت هاتمەوە بۆ علاقات، کاک جەبار فرمان هات و دوای چاکوچۆنی ووتی چیتان کرد کاک ڕەفعەت وەڵامی دایەوە. لەمنی پرسی لە دوای شێخان ئەم چەکو تەقەمەنییە ئەبەیت بۆ کوێ؟ ووتم جارێ نازانم ووتی چۆن نازانی؟ ووتم لە شێخان( شێخان ئاوایییەکی ڕۆژهەڵاتە لەسەر سنوور ئەوکات سەنگەری پێشەوەی سوپای پاسداران بوو) ئەمێنێتەوە تا بزانین چی لێ ئەکەین و لە کوێ دایئەنێین. ووتی باشە ئیتر زۆر لە سەری نەڕۆیشت، من

[1] حاجی ئیرەجی مەسجدی ئیستا سەفری ئێرانە لە بەغدا.

ئۆتۆمبێلێکم گرت و ڕۆژی دوایی وێنەی دووەمی لیست و فۆرمەکانم هێناو هاتمە شاری پاوەو لەوێوە بۆ شێخان. بینیم چوار زیلی عەسکەری لەوێن چەک و کەلوپەلەکان دائەگرن، کلاشینکۆفەکان هەموو لەناو سندوق دان لەباتی ١٥٠٠ کلاشینکۆف بەهەڵە ٢٠٠٠ دانەیان هێنابوو، ٦٠٠٠ شەش هەزار شانەی کلاشینکۆف بوو ئەوانیش لەناو سندوقدا، ٣٠٠٠سێ هەزار تورەکە عەسکەریە (بەروانکە) جێگە شانەی کلاشینکۆف لە ناو شلیفی گەورە گەورە دان، لەوێ بارەگای سوپای پاوەی لێیە لە ئەمبارو قاعەکانی سوڵتان ئیسحاق دا هەڵ چنراون. سەیرم ئەکرد ئەترسام ئاخۆ چۆن چۆنی ئەم هەموو چەک و تەقەمەنییە ئەگوازرێتەوە؟ لەوێ قەرارگای ڕەمەزان پاسەوانی بۆ دانابوو تا ئەوکات خۆمان وەری ئەگرین و پاسەوانی خۆمانی بۆ دائەنێین.

من هاتمەوە بۆ هاوارە کۆن و گریانە، نێوان شێخان و گریانە بەپیادە ڕەوی کاتژمێرێک ڕێگایە. سەیر ئەکەم بارودۆخی ناوەچەکە وەک جاران نییە، ئەو هەڤالانەی تیپی ١٥ کە هاتون و لەوێ بوون بەشێکیان لێرە ماونەتەوە، ئەوانیش و کاک جەباریش بەرخوردیان لەگەڵ ئەو هەڤالانەی بنکەی شنروێدا سارد و هەڤالانە نەبووە. لەگەڵ کەیکاوس و مەهدی و ئیبراهیم بۆینی و هاشم و حەکیمی مەلا ساڵحدا کەوتمە گفتوگۆ تێگەیشتم کە ناڕەحەت و دەم بەگلەیین باسی هەندێک شتی عەقڵ نەبڕ ئەکەن، من دڵم دانەوە و ووتم گوێ مەدەنێ، ئێمە جگە لە ئەرکی پاراستنی سنوورەکە ئەرکێکیتر هاتووەتە سەر شانمان ئەبێت ئێوە هیممەت بکەن و بەدڵسۆزانە و سەرکەوتوانە جێبەجێی بکەین، ئینجا پێم ووتن (ئەرکە نوێکە گواستنەوەی چەکەکانە بۆ قەرەداغ) خۆتان ئامادەبکەن١٠دە پێشمەرگەی باوەڕپێکراو حازربکەن کەهەر ئەوان بزانن و لەچەند ڕۆژی داهاتوودا شەوانە دەست ئەکەین بەگواستنەوەی چەک و چۆڵەکە. بیرم لەوەکردەوە لەگەڵ حیزبی دیموکرات دا قسەبکەم و چەکەکان لەناوخاکی عێراقدا لەئەمبارەکانی ئەوان دا دابنێم تائەوکاتەی ئەیگوازینەوە بۆ قەرەداغ.

لەوێوە چوومە لای حیزبی دیموکرات، بارەگای هێزی شاهۆ لەخاکی عێراق و دراوسێی بنکەی شنروێ بوون، زۆر بەنهێنی لەگەڵ نەبی قادری و کاوەی بارامیدا، لەسەر کردنەوەی ڕێگاکەی شێخان پردێوەر بۆ هەزارپەز قسەوباسمان کرد و ئامادەی هاوکاریان دەربڕی، دواتر داوام کرد زۆر

بەنهێنی نزیکەی ١٠٠٠ هەزار پارچە لەچەکەکان لەئەمبارەکانی ئەواندا دابنێم تا وردەوردە ڕەوانەی ئەکەم. بۆ ئەمەش ووتیان بەسەرچاو. بەڵام هێنانی چەک بۆ ئەمبارەکانی ئێمە ئەبێت هەموو بە شەو بێت و چەند کەسی دیاری کراو و باوەڕ پێکراوی خۆت زیاتر کەسی تر نەزانێت، ووتم بەسەر چاو واثەکەم، زۆر دڵم خۆش بوو گەڕامەوە بۆ هاوارە کۆن و مەفرەزەیەکم ئامادەکرد بۆ ئەوەی بچینە شێخان و پاسەوانی چەک و تەقەمەنییەکەیان تەسلیم بکەین.

مەفرەزەم لەگەڵ خۆم برد و چووینە شێخان، ئاوایی شێخان تازە چۆڵ کرابوو گەوڕ و گەلە خانەکانیان ٤٠ چل قاتری قەرارگای ڕەمەزانی لێبوو، بەڵام زۆریان تۆڕو تولەن تا ئێستا بار نەکرا بوون و هەندێکیان شێت و گرتن و هێمن کردنەوە و بارکردنیان دژواربوو، بۆیە بۆ گرتن و هێمنکردنەوە و جلکردنی ١٥ قاتر چەند پێشمەرگەیەک و چەند کەسێک لە خەڵکی هاوارەکۆن و گریانە کە جێگەی متمانە بوون وەک هێزی پشتیوان هاوکاریان ئەکردین و ولاغداری باشیش بوون کەڵکم لێوەرگرتن، هەربۆیە توانیمان تەنیا لە١٥ڕۆژدا هەموو چەک و تەقەمەنییەکە بێ کێشە و گرفت بگوازینەوە تەنیا نزیکەی ١٠-١٥ کەسیش ئەیانزانی کەچیمان کردووە، واتە کەل و پەلەکان هاتونەتە هاوارە کۆن، بۆ لای حیزبیش تەنیا شەش پێشمەرگە ئەیزانی براوەتە لای ئەمبارەکانی ئەوان لەئاوایی دەرەتفێ. بۆیە ئەو هەزار پارچە چەکە کلاشینکۆفەم بردە لای حیزبی دیموکرات نەوەک عێراق هێرش بکات بۆ دەست بەسەراگرتنی، بێگومان بووم کە عێراق ئەم زانیاریەی پێئەگات، هێرش کردنە سەر ناوچەکە ئاسان بوو، چونکە ئێمە لەو دۆڵەدا دابڕاو بووین لە هەمو هێزەکانی تری یەکێتیی، بەرزاییەکانی ئەمبەر و ئەوبەریشمان هێزی عێراقی لەسەر بوو.

نزیکەی ١٠ دە بار مەخزەن و توورەکە عەسکەری و قایشی تفەنگ مابوو، ڕۆژێک پاش نیوەڕۆ چووینەوە شێخان و ئەویش بارکراو کەیکاوس و مەهدی لە شێخان ئێوارە بەر لە تاریک بوون هێنایان و دەرچوون بەرەو گریانە، منیش بەڵگە و فۆرمەکانی کەلام بوو ئەبوو بیبەمەوە بۆ کرماشان لەبن دەستم دایە و زۆر مورتاح و دڵخۆش بووم بەوەی کە هەمووی گوازرایەوە و تا ئێرە سەرکەوتووین.

له شێخان له نزیک بارەگای پاسدارەکاندا کەمەزارگەی سوڵتانی ساقه ئیسحاق وەستا بووم تا ئۆتۆمبێلێک دێته شێخان و لەگەڵیدا سواربم بۆ پاوە، بینیم ئۆتۆمبێلێکی جێپی لاندلۆڤەری خاکی درێژی سەربەتاڵ هات و گەیشتنه لام، کەمێک لەمن ڕەد بوو وەستا و جەماعەت دابەزین، کاک جەبارفرمان لەگەڵ هەڤاڵان کاک فەلاحی حەمه بۆرو کاک سیروانی عەلی ڕەزا و نزیکەی ده پێشمەرگەشی لەگەڵدا بوو. هەر دابەزین ب لاوەبوونەوە، من بەب لاوه بونەوەکەیاندا زانیم که شتێک هەیه. کاک جەبار ووتی: خەیرە؟ ووتم ئەگەڕێمەوە بۆ کرماشان. ووتی چیت کرد و چەکەکانت له کوێ داناوە؟ ووتم لێره نەماوە. ووتی ئەزانم لێره نەماوە، بردووتەته کوێ؟ منیش ووتم هەر جێگه زۆرە. ووتی باشه قاترەکان و دوو جهازت لایه مادام تەواو بووه ئەوانه هەر ئێسته بهێنەوە. ووتم کاک جەبار من ئەبێ بڕۆمه کرماشان و ئەم لیستانه ئیمزا بکەم و تەسلیمیان بکەمەوە، که هاتمەوە بەسەرچاو. ووتی نابگەڕێرەوە بۆ ئەودیو. ووتم کاک جەبار من بەجەنابی مام جەلالم وتبوو که نامه بۆ جەنابت بنێرێت هاوکاریم بکەیت، هەتا ئەگەر هاوکاریشم نەکەیت کێشەم بۆ دروست نەکەیت، ئێمه ئیشەکەمان لەسەرەتادایه قاترەکان و دوو جیهازەکه تائەوکاتەی کەلوپەلەکه ئەگاته قەرەداغ ئەبێ لای من بن وازم لێ بهێنه بائیشەکەی خۆم بکەم. ووتی نابێ، ووتم لەو٤٠ چل قاترەی جەنابت١٥ قاترم بردووە، ئەو دوو جیهازەش ئیمزام کردووە کاتێک شتەکان گەیشتنه جێی خۆیان بیگێڕمەوە، من قاتر و جیهازم بۆچییە؟ قیراندی نابێ؟ هەر ئێستا ئەبێ بڕۆیت ئەو شتانه بهێنیتەوە؟!. ووتم تۆ نەتتوانی ئیشەکه بکەیت بۆ پێت ناخۆشه من ئیشەکەم کردووە؟ من بەڵێنم به مام جەلال داوه پێشتر وات ئەزانی ئەم ئەرکەم پێ جێبەجێ ناکرێ، ئێستا که تێگەیشتی، بەڵێ ئەتوانم کارەکه ئەنجام بدەم هاتوویت بیانووم پێ ئەگریت قرەقڕی چیته؟ یەکسەر هاواری کرد فەلاح، سیروان، پێشمەرگە، ئادەی ئەو سەگبابه باڵ ببەستن.

سیروانی عەلی ڕەزاو فەلاح ووتیان کاک جەبار ئەمه خاکی ئێرانەو ئەوه پاسدارن و عەیبه و واز بهێنه، ووتی: نا عومرتان نەمێنێ ئێوه ترسنۆکن. فەلاح و سیروان تەریق ئەبوونەوە لەهاتوو هاواری کاک جەبار بەبێ هۆکار، ئەیانزانی شەرم پێئەفرۆشێت، بەڕاستی هەڵوێستێکی جوانیان هەبوو بەگوێیان نەکردو لەجێگەی خۆیان نەجولان. منیش کاغەز و فایلەکان

لەبن دەستم دایە، خۆی بەرەو رووم هات، عوسمان گەچینەیی و حەمەبیکەیسی و چەند کەسی تریش ناچار بەدوایدا هاتن، بەڵام فەلاح و سیروان هەر لەولاوە وەستاون. کاک جەبار چەند مەتری مابوو بگاتە لام جنێوەکەی دووبارە کردەوە ووتی سواری ئەو ئۆتۆمبێلەبە. من بەتەنهاو بێچەکم لەناو ئێران داین، ئەوان هەموو چەکیان پێیە، هەر وەستا بووم و نەمئەزانی چی بکەم؟ حەمە و عوسمان هاتن ویستیان باڵم بگرن و بمبەن بۆ لای ئۆتۆمبێلکە منیش فایلوکاغەزەکانی بندەستم فڕێ داو پەلاماری یەخەی کاک جەبارم دا وگرتم و چەند جنێوی دابوو دووئەوەندە جنێوم پێ دایەوە هەرچەندیان کرد بەرم نەدا.

پێشمەرگەکان هەموو هاتن بەقۆندخە تفەنگ تێمان بەر بوون، چەند قوناخە تفەنگیان لەمندا ئەوەندەش لە کاک جەبار، چونکە من ئەوم بەر نەئەدا لەدڵا ئەمووت بەریدەم ئەمکوژن. هەموومان گرمۆڵە بووین و کاک جەبار پێی خلیسکا و کەوت لە دواوە حەمەبیکەیسی بە قنگی مزەلی کێشای بەپشتی سەرماو منیش کەووتم و سەرم تەقی و خوێن فوارەی کرد، ئیتر نازانم چۆن بیگێرمەوە، کورد واتەنی بەدڵی خۆیان کووتامیان دوای چەند ساتێک بەرچاوم رەش بوو. پاسدارەکان هیچ هەڵوێستێکیان نەبوو، ئەگینا ئەیان توانی نەهێڵن ئەم پیاوە بە ئاشکرا ئەم شەڕە بەمن بفرۆشێت. منیان باڵبەست و خستمیانە دوای جێبەکەو کاک جەبار فرمان خۆی لێدەخوڕی بەرەو پاوە. من ئەمویست شتێک بکەم کە لە بازگەی دووئاو پێم بزانن، بەڵام ئەوانەی کە لە دوای جێبەکەدا سواربوو بوون هەموویان لاقیان لەسەر سەر و پشت و شان و ملی من دانابوو. لە بازگەی دووئاو بەپێ چەند پێ لەقەیەکم کێشا بە جێبەکەدا پاسدار منیان بینی و شڵەژان، ووتیان ها ئەوە چییە؟ کاک جەبار ووتی ئەوە چەکداری ئێمەیە جاسوس بووە، بەتەما بووە هەڵبێت بڕوا بۆ لای بەعس گرتومانەتەوە. ئەوانیش وتیان (زیند باشید دستتان درد نکند) واتە هەربژین ودەستتان خۆش.

دوای ئەوە تاریکی کرد گەیشتینە پاوە، بردمیانە بارەگای علاقات، دیارە برادەران پێیان ناخۆشبوو لۆمەی کاک جەباریان کرد و خۆیشی پەشیمان بوو، داوای کرد من لەنامەیەکدا بنووسم هەڵەبووم و ئیمزای بکەم و بڵێم کە خەتای من بووە ئینجا بڕۆم، من ئەوەم نەکرد، چەند کەس شەو هاتن

و تەکلیفیان کرد ئەو کارەبکەم نەمکرد. شەو بروسکەیەکم نووسی و دام بە برادەرانی عیلاقات بیدەنە مام جەلال. ووتیان باشە. بەلام دیارە دواتر زانیم کە نەیاندا بوو.

کاک جەبار شەوخۆی هات و ووتی تۆ خۆت بەچی ئەزانیت حساب بۆ من ناکەیت؟ خۆت بە گوندە ئەزانیت؟ ووتم حکایەتی بەرخ و گورگەکەیە. لەوێ لەسەر داوای برادەرانی علاقات و برادەرانی تر کە لەوێ بوون، دووبارە داوایان کرد من بنوسم خەتای من بووە تا کێشەکە کۆتایی بێت. بەلام هەر نەم نووسی، ئینجا ئەو وازی هێنا و منیان برد بۆنەخۆش خانە تەداوی سەرمیان کرد، من نەچوومەوە بۆ کرماشان، شتەکانم لە علاقات بەجێهێشت و گەرامەوە بۆگریانە.

بەنووسراوێک چۆنییەتی چوونە پێشەوەی ئیشەکەو شەڕ فرۆشتنەکەی کاک جەبار فەرمانم نووسی بۆ مام جەلال و لەرێگای مامۆستا ساڵح ماواتیەوە ناردم. پێشمەرگە و خەلکەکە لەسنوورەکە هەموو زانییان بەم کێشەیە. کاک جەبار دوای چەند رۆژێک هاتبوە شێخان بۆئەوە بگەرێتەوە بۆ قەرەداغ، مەهدی و کەیکاوس و خەلیل رێشاوی....تاد زانیبویان کاک جەبار ئەگەرێتەوە بۆ قەرەراغ لە نێوان هاوارە کۆن و گریانەدا لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک کەمینیان بۆ دانابوو، من بێ ئاگا بووم تا کاک ئەکبەر ئێناخی هات بۆ لام و ووتی شتێکی وا هەیە، کە ئەمەم زانی چووم بۆ لایان و لێیان توورە بووم و بانگم کردنەوە. کاک ئەکبەر ئێمەی خۆش ئەویست، ئەبوو کاک جەباریش رەوانەبکاتەوە، بۆیە داوای کرد ووتی لەچالانەوە ئەیانبەمەوە نایانهێنمە هاوارەکۆن، منیش بەلێنم دا بەکاک ئەکبەر لەکوێوە ئەیانبەیت ئاساییە.

ئەوە بوو کاک جەبار لەگەرانەوەیدا، کاک ئەکبەر ئێناخی لەسەر شاخ و لە شنروێ و چالانەوە بردیەوە بۆ قەرەداغ و نەهاتە هاوارە کۆن، منیش لە بەرخاتری مام جەلال زۆر لەسەر مەسەلەکە نەرۆیشتم و ئەمزانی ئەگەر ئیشەکە بەسەرکەوتویی تەواو ببێت لەوە گرنگترە ئێمە لە هەولی تۆلەکردنەوەدا بین، هەر لەم ماوەدا لە پردیوەر لوغمێک تەقی بوو بە پێشمەرگەیەکدا بە ناوی نەوزاد وەهاب مەحمود کە لە دەستەکەی کاک جەبار

بوو قاچێکی پەڕاندبوو، بە کاک جەباریان ووتبوو پێشمەرگەکانی بنکەی شنروێ دایان ناوە بۆتۆ.

لەساڵی ٢٠٠٦ دا کاتێک کاک جەبار نەخۆش بوو ڕۆژێک سەردانم کرد، بینیم کاک عومەری سەید عەلی و چەند کەسێکیتر لەلای کاک جەباردا دانیشتوون، دوای چاکوچۆنی یەکێک ووتی کاک جەبار ئەوە حەمەی حەمە سەعیدە هاتووە بۆ لات، ئەویش ووتی حەمە ووتم بەڵێ کاک جەبار، ووتی: خۆزگە ئەڵغامەکەی بۆت دانابووم ئەوکاتە بیکوشتمایە ، من خۆم بێدەنگ و هەڵە کرد، تێگەیشتم چی ئەڵێت، وامزانی جەماعەت تێنەگەیشتوون، ماوەیەک لای دانیشتین و دواتر کە هاتینە دەرەوە کاک عومەری سەید عەلی دەستی گرتم و لێی پرسیم: حەمە ئەوە کاک جەبار چی ووت؟ منیش ووتم کاک عومەر ئەوە قسەی ١٩ نۆزدە ساڵ لەمەوبەرە، حکایەتەکەی دورو درێژە، ووتی وەرە لای من سوارەبە لەگەڵ خۆی سواری کردم و بەکورتی بابەتەکەم بۆ گێڕایەوە.

ئیتر مەرحەلەی دووەمی گواستنەوەی چەک لە هاوارە کۆنەوە بۆ شارەزوور و قەرەداغ دەستی پێکرد، هەرجارەو فەرماندەیەک ئەهات و وەجبەیەکی ئەبرد بۆ مەڵبەندی یەک لە قەرەداغ، تاڕۆژێک کاک جەبار خۆی داوای کرد کە دێت بۆ هاوارە کۆن بۆلامان و ئاشت ئەبینەوە و وەجبەیەک چەکیش ئەباتەوە. ئێمەش کۆبووینەوە، ئەوانەی لەوکۆبوونەوەدا قسەیان هەبوو ئەمانە بوون: شەهید ئیبراهیم بۆینی، شەهید کەیکاوس، شەهید مەهدی، حەکیمی مەلاسالح، خەلیل ڕیشاوی هاشم بۆینی و ئەکرەم ئەحمەد. دواجار هەمویان ووتیان تۆخۆت چی ئەڵێیت؟ منیش ووتم باوکمان ئەزانێت و ئەو ڕازیبێت ئێمە قسەیەکمان نییە، باوکم ووتی: ئەگەر پرس بەمن ئەکەن بابێت، ئێمەش ڕازی بووین و کاک جەبار هات و کەگەیشتە هاوارە کۆن، بەر لەوەی بێت بۆ بارەگای بنکە چووە ماڵی باوکم ئێمەش چووینە ئەوێ، لەوێ ئاشت بووینەوە، لەو ڕۆژە بە دواوە نێوانمان زۆر خۆش و کاک جەباریش زۆر منی خۆش ئەویست، منیش زۆر ڕێزم لێ ئەگرت، جەبار فەرمان فەرماندە وسیاسیەکی ناودارو کوردێکی هەڵکەوتوی کەم وێنەو دوژمن تۆقێنەربوو، بەڕای من ئەو بۆشاییە لە ڕێبەرایەتیدا بەنەمانی ئەو دروست

بوو، تائێستا پرنەبۆتەوەو لەداهاتوشدا بەزەحمەت پیاوی وا جەربەزەو ڕاشکاو دیسپلیندار دروست ببێتەوە.

خۆی وتی حەمە تۆیان لای من کردبوو بەپیاو کوژو دڕندە و بێ ئیلتزام، بەڵام بۆم دەرکەوت ئەوانەی دژایەتی تۆیان ئەکرد خۆیان بوودەڵە و هیچ لەباردا نەبوبوون. ئیتر من نەم زانی مەبەستی کێیە و نەمویست بە دوای ئەو مەسئەلەدا بڕۆم. هەر ئەو سەفەرە دوو جار کاک جەبار کەوتەڕێ و لە نیوەی ڕێگای هاوار هەوارەکۆندا هەواڵیان ئەدایێ جاش کەمینی داناوە ئیتر ئەگەڕایەوە، چونکە هەموو ڕێگاکە ئاشکراو یەک ڕێگاش هەیەو بە جاش وخەفیفە لەچەندلاوە ئەگیرا. کاک جەبار ئێوارەیەک گەڕایەوە، بارە تفەنگ ئەوەندە بارکرابوو داگیرا بووەوە هیلاک بوبووین، لەسەربانی بارەگاکەی هاورەکۆن لەسەر تاییەک بارە تفەنگ دانیشتبوو قسەی بۆئەکردین، وتی حەمە ڕۆژێک ئەبێت کوردستان ڕزگار ئەبێت، ئەوانەی خیانەتیان کردووە لەم وڵاتە ئەبێ بە سزای خۆیان بگەن، کارتێکیش لە نفوس دروست ئەکرێت بۆ ئەو خائینانە تا منداڵەکانیشیان بۆیان نەبێت لە خوێندنگای کوردیشدا بخوێنن، ڕۆژانی دواتر کەوتەوە ڕێ و کاروانێک چەک و تەقەمەنی گەیاندە قەرەداغ.
بەڵێ دوای چەند ساڵ من زانیم کاتێک کە کاک جەبار ڕاسپێردراوە بۆ هێنانی ئەو چەکەو گواستنەوەی، چەند کەسێک وایان تێگەیاندوە ئەگەر حەمەی حەمە سەعید و بنکەی شنروێ کە لە ناوچەی هەورامانن لەوێ بن تۆ ناتوانیت سەرکەوتوو بیت لەو پرۆسەیەدا چونکە......تاد. کاک جەباریش داوا لە مام جەلال ئەکات من بانگ بکات بۆ یاخسەمەر بۆ لای خۆی و گلم بداتەوە تا ئەوان ئیشەکە بکەن، هەروەها داوای لێ ئەکەن دوای ئەوەی کە من بانگ کرام و ڕۆیشتم ئەوان بێنە ناوچەکە، حەکیمی مەلا ساڵح کەسێکی تری لە جێگە دابنێن و بەرپرسەکانی تری بنکەش ئەوەی ئەوان ئەیانەوێت جێبەجێیان نەکرد لە ناوچەکە دووریان بخەنەوە. بەڵام کاک جەبار دیارە کە ئەگاتە ناوچەکە و سنووری بنکە ئەبینێت ئەو بارودۆخە سیاسی و سەربازی و کۆمەڵایەتیەی ئەوان لە پێش چاویان وێنا کردووە وا نییە.

ئەبینێت کۆمەڵێک فەرماندە کەرت و فەرماندە مەفرەزەی قارەمان و کەم وێنەی وەک شەهید ئیبراهیم بۆینی، شەهید مەهدی، شەهید کەیکاوس، شەهید نەوشیروان، هاشم بۆینی، سەلاح عەزیز، ئەکرەم ئەحمەد، تەحسین

بیارەیی و خەلیل ڕیشاوی..... تاد لەوێن. کە قسەش لەگەڵ حەکیمی مەلاساڵحدا ئەکات بۆی دەر ئەکەوێت کادیرێکی تێگەیشتوو و بە ئەدەب و لەسەر خۆیە، پرسیار لە خەڵکی ناوچەکە و حیزبی دیموکراتیش ئەکات لە سەر بارودۆخی ناوچەکە، ئەوکات دیمەنی شانۆیەکی تری دێتە پێش چاو.

ئەوەیە کاک جەبار نزیکەی ٣٠ ڕۆژ لە ناوچەکە و هاتوچۆی بەسنووری ئێراندا ئەبێت و ئەگاتە ئەو بڕوایە کە ناتوانێت ئەو چەکوچۆڵە بگوازێتەوە و بیگەیێنێتە شوێنی مەبەست. بۆیە مام جەلال ئاگادار ئەکات لەم کات و ساتەدا ئەو ئیشە ناکرێت، مامیش من لە پەنا دەستی دام بانگم ئەکات، حەمە ئەتوانی ئەو ئیشە بکەیت؟ بە جۆرێک پێم ئەڵێت کە من وابزانم تایبەت بۆ ئەوەی بانگ کردووم یەک مانگە لای خۆی گلی داوەمەتەوە، منیش ئەڵێم بەڵێ... بەو شێوەیەی کە پێشتر لەم بابەتەدا باسم کردووە.

ئێمە هەموو ئەوانەی لە بنکەی شنرویدا بووین، خەڵکی سادە ودڵپاک بووین، حەزمان لە هەندێ فرووفێڵ و ساختەو ململانێی ناڕەوا نەبوو، بەڵام بەداخەوە زۆرێک لەو برادەرانەی کاک جەبار باوەڕی پێیان هەبوو ساخ دەرنەچوون، ئەو ڕاستیانەش دوایی دەرکەوتن.

# بارودۆخی
## سنوورە دابڕاوەکە-١٩٨٧

لەدوای ئەوە زۆربەی ئەوچەک و تەقەمەنیانەی لەئێرانم وەرگرتبوو گواستبوومنەوە لە هەورامانەوە بۆ مەڵبەندی یەک کە بارەگاکەی لە قوپی قەرەداغدا بوو، پێشتر و لەبابەتی گواستنەوەی چەک لە ئێرانەوە بۆ قەرەداغ باسم کردووە کەچۆن ئەو چەکانەم وەرگرتوە، چۆن لە ئێرانەوە گواستوومەتەوە بۆ ناو خاکی عێراق وسنووری بنکەی شنروێ و بەشێکیم لە هاوارە کۆن داناوەو بەشێکی زۆریشی لە دەرەتفێ لە ئەمبارەکانی هێزی شاهۆی حیزبی دیموکراتدا، تا لەوێشەوە گوازراونەتەوە بۆ قەرەداغ.

بەشێکی زۆر کەمی کە نزیکەی ١٠٠ پارچە چەک مابوەوە، وەک پێشتر باسم کردووە گواستنەوەی ئەم چەکو تەقەمەنییە لە سنووری بنکەی شنروێوە بۆ سنووری مەڵبەندی یەک لەلایەن تیپەکانی ١٥ی شارەزوور و٥٥ ی قەرەداغ و ٥١ ی گەرمیان و ٥٣ ی شیروانەوە بوو، ئەویش کاروان کاروان بەباری قاتر گەل، بەشێوەیەکی سەخت و دژوار لەڕێگەیەکی دوورو درێژو هەوراز نشێو ناخۆشەوە.

سنوورەکەی ئێمە دابڕابوو لە هەموو هێزەکانی پێشمەرگەو ناوچە ڕزگارکراوەکانی تری کوردستان، بەشێوەیەک ئەگەر هێزێک لە قەرەداغەوە یان لەشارباژێڕەوە هەرچەندە شارباژێر لەمساڵدا چۆڵ کرابوو لە هێزی پێشمەرگە بەهۆی پەرەسەندنی شەڕی عێراق و ئێرانەوە، بیویستایە بێتە سنووری هەورامان، ئەبوو بەشەو جادەی سەرەکی سلێمانی دەربەندی خان ببڕێت و بێتە پانتایی دەشتی شارەزوور، لەدەشتی شارەزووردا ئەبوو بەڕۆژدا ووریابن و بەتایبەت پێش نیوەڕوان خۆحەشار بدەن، کاتێک کە زۆر جار دەمەوبەیان ئەو هێزە ئەگەیشتە ناو جەنگەڵ و بێشەڵانەکانی سەر چەمی زەڵم لەسنووری ئاواییەکانی قاجرو تەپەتوڵەکە، ئەمەش ئەگەر شەوەکەی تا دەمەو بەیان بەڕێگەوە بوونایە.

بۆشەوی دووەم ئەبوو ڕێگای گشتی هەڵەبجە سەیدسادق ببڕن و بێنە شارەزووری بەری هەڵەبجە، ئەمشەویش دووبارە ئەبوو بەڕێگەوەبن تادەمەو بەیان ئینجا ئەگەیشتنە داوێنی چیای شنروێ بەڕووی هاوارە کۆندا، ئەمە بۆ هێزێک کەبیویستایە زووتر بگات، ئەگینا بەشێوەی ئاسایی مەفرەزەو هێزەکان بە سێ شەو دوو ڕۆژ ئینجا ئەگەیشتن.

ئەم ناوچە دابراوە ڕزگار کراوە ئەکەوێتە سەر سنووری عێراق-ئێران لە ڕۆژ هەلاتی چیای شنروێ لەپارێزگای هەڵەبجە، جەماوەری گوندەکانی ئەم چەموو دۆلە ساڵی ١٩٧٩ داگیراون بۆ کۆمەڵگا زۆرە ملێکانی عەنەب، سیروان، زەمەقی. بەهۆی ئەوەی لەسەرەتای دروست بونەوەی شۆڕشی نوێدا مەفرەزەکانی پێشمەرگە لەساڵی ١٩٧٦وە لەئاوایییەکانی ئەم سنوورەدا بوون و کاریان ئەکرد، پێشمەرگەی ئازاو لەخۆبردو چاونەترس و دەست و دەم و داوێن پاک بوون و پرچەک بەبیری نوێ ڕۆشنبیر بوون، جەماوەرەکە زۆربەی زۆری ببونە دۆست ولایەنگری یەکێتیی نیشتمانی کوردستان. هەروەها پێشمەرگەکانی سەرەتا لەم سنوورەدا لەساڵی ١٩٧٦ تاساڵی١٩٨٢ کەسەر بە هەرێمی یەک بوون، سەرەتا سێ مەفرەزەو دواتر لەسێ کەرت پێک هاتبوون، دواتر لەساڵی١٩٨٢ بەدواوە تا ساڵی ١٩٩٠ تەشکیلاتەکەیان بووە تیپی ١١ی هەورامان، بەلام لە سەرەتای ساڵی١٩٨٥ تا مانگی ٦/ ١٩٨٧ بەهۆی چەند کێشەیەکەوە تەشکیلاتی تیپەکە هەڵوەشایەوە و لەجێگەی دا بنکەی شنروی دامەزرا، پێشمەرگەکانی ئەم تەشکیلات و ناوچە بەدرێژای ئەو مێژووە زۆریان خەڵکی هەورامان و ئاوایییەکانی ئەم سنوورە دابڕاوە و ناو شاری هەڵەبجەو هەورامان و ناوچەی نەورۆلی و کۆکۆی و ئێناخی و ئاوایییەکانی دەوروبەری هەلەبجە بوون، دواجار لەساڵی ١٩٨٧دا ئاوایییەکانی ئەم ناوچە دابڕاوە ئەمانە بوون: هاوار، هاوارە کۆن، درەتفێ، گریانە، بۆیین و ڕێشاو.

لەساڵی ١٩٨٠ بەدواوە بەشێک لەخەڵکی ئەم ئاوایيانە گەڕابوونەوە و باخ و مەزراکانیان ئاوەدان کردبووەوە، ئێمەش بنکەو بارەگامان لێدانابوون، سەرباز گەلێکی زۆری هەڵهاتووی شەڕی عێراق و ئێرانیش هاتبوونە ئەم سنوورە. بەرزایییەکانی باکوری ڕۆژ هەلاتی ناوچەکە لەگەڵ بەرزایییەکانی باکوری ڕۆژهاوای سوپای عێراقی لەسەر بوو، بەرزایییەکانی لای ڕۆژهەلات

هێزەکانی حیزبی دیموکراتی لەسەر بوو، باشووری ڕۆژهەڵات وئەوبەر زێی سیروان هێزەکانی سوپای پاسدارانی ئێرانی لەسەر بوو. چەندین ڕێگای قاچاخ لە چەندین لاوە ئەهاتنە ناوچەکە، عێراق و ئێران هەریەکەو بۆخۆی مەفرەزەکانی شناسای و هەواڵگری و دانانەوەی ئەڵغامیان ئەناردە ناوسنوورەکە بەنهێنی، سەرەڕای ئەمانە هەموو، بەشێک لە خێزان وبنەماڵەکانی حیزبی دیموکرات لەم ناوچەکەدا بوون، ئێمەش دوای ئەوەی لەگەڵ ئێران ڕێککەوتبوین ڕێگەیەکی هاتوو چۆمان، بۆهاتووچۆکانمان لەقەرەداغ و هەڵەبجەو شارەزوورەوە بۆناو ئێران کردبوەوە، بۆگواستنەوەی بریندارو نەخۆشەکانی پیشمەرگەو خەڵک بۆ ڕەوانەکردن وهێنان و بردنی وەفدەکانی هەردوو لاوە تیمە تایبەتەکان، بۆ هێنانی ئازووقەو چەکوتەقەمەنی و پێویستیەکانی لۆجستیکی و دەرمان. بۆ هاتووچۆی مەفرەزەکانی ئۆپۆزسیۆنی عەرەبی و دەربازکردنی ئەندام و کەسوکاریان لەشارەکانی بەغداو خوارووی عێراقەوە بۆ ناو ئێران.

بۆیە ئیدارەدان و پاراستنی ئەم سنوورە زۆر سەخت و دژوار بوو من و هاوڕێکانم بەرپرسیار بووین لێی. جاروبار عێراق پەلاماری ئەدایَن، بەردەوام ناوچەکە مەیدانی کەوتنە خوارەوەی گوللە تۆپ و هاوەنەکانی هەردوو ولاتی بە شەڕهاتوو بوو. بالێرەدا حکایەتی هێنان و ڕەوانە کردنی کەسێک لەبەغداوە بۆ شاری پاوەی ئێران بگێڕمەووە:

لە ڕۆژێکی مانگی دووی ١٩٨٧ سەرقاڵی ئیشوکار بووم لەهاوارەکۆن، پەیامێکم بۆ هاتبوو لەمام جەلالەوە، ناوەرۆکی پەیامەکە ئەوە بوو، ناونیشانی کەسێکت بۆ دێت ئەوکەسە لە بەغدایە، ئەمەوێت لەڕێگەی خۆتەوە بەسەلامەتی بیگەیێنیتە ئێران. دوای چەند ڕۆژێک هەڤاڵ سەردار شەوکەت هەورامی کەئێستا لە ولاتی ئەڵمانیا ئەژیت، لەمەکتەبی پەیوەندیەکانەوە لە شاری پاوە وێنەیەکی ئەو کەسەو ژمارە تەلەفۆنێکی بەغدای بۆ هێنام، پێی ووتم ئەمە وێنەو ژمارە تەلەفۆنی ئەوکەسەیە کەجەنابی مام جەلال بروسکەی بۆ کردویت برای یەکێک لەسەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقە پێم وابێت لەئەورووپایە داوای لەمام کردووە کە لەڕێگەی یەکێتییەوە ئەم براییەی بۆ بگەیێننە ئێران.

دوای دوو ڕۆژ لەگەڵ مەفرەزەیەک چوومە ناوشاری هەڵەبجە، کاتژمێر یەکی شەو گەیشتین هەڤاڵان هاشم بۆینی وکەیکاوس کۆکۆی بەرەو گەڕەکی سەرا ڕۆیشتن لەوێ بمێننەوە، من و هەڤاڵ ئەکرەم ئەحمەدیش چووین بەرەوگەڕەکی مامۆستایان و خۆمان گەیاندە ماڵی دۆستێکی جێگە متمانەو لەوێ ماینەوە دوای پشوودان و نانخواردن لەگەڵ خاوەن ماڵ دەستم کرد بەقسەکردن، ئەویش بەهمەن حەمەڕەشید سۆسەکانی بوو، وتم بۆیە خۆم هاتووم بۆ ناوشار بەتایبەت بۆلای تۆ هاتووم، بۆ ئەنجامدانی کارێک کەبەتۆ ئەکرێت، ئەویش هێنانی کەسێکە لەبەغداوە بۆ ئێرە، ووتی بەسەر چاو کێیەو چۆن بیدۆزمەوە؟ منیش دەستم کرد بەگیرفانمداو وێنەو ژمارە تەلەفۆنەکەم دەرهێناو دامە دەستی، کاتێک سەیری وێنەکەی کرد بانگی حەیات خانی خێزانی کرد، ووتی کلیلی ئەوتاکەم بۆ بهێنە، چووە دیوەکەی ترو کاتێک هاتەوە بینیم وێنەکەی من داومەتێ بەراورد ئەکات لەگەڵ وێنەیەکی تر پرسی ئەم کابرا هەر ئەوکابرانییە؟ منیش کاتێک سەیرم کرد وتم با هەرئەوە، جێگەی سەرسوڕمان بوو، پرسیم ئەم وێنە چۆن لای تۆیە؟ ووتی ماوەیەکە ئەم ڕەسمەو هەمان ژمارە تەلەفۆنم لایە، قەیسەری برام هێناویەتی، هاتوو چۆی سەر سنووری لای دزلی ئەکات، لەوێ کاکە حەمەی هەمینە بەرپرسی ناوچەی هەڵەبجەی پارتی پێی وتووە کاک مەسعود داوای کردووە بەڵکو هەرچۆن بووە ئەم پیاوە لەبەغداوە بهێنن بۆ ئێران، ئەوانیش داویانە بەقەیسەرو ئەویش هێناویەتی بۆ لای من، منیش جوابم کردوون ووتومە ناتوانم.

ووتم ڕاست ئەکەن، منیش جەنابی مام جەلال داوای لێکردووم بەدەستێکی ئەمیندا ئەم پیاوە بگاتە ئێران، لەتۆ ئەمینتر شکنابەین ئەبێ بچیت بیهێنیت، ووتی بەسەر چاو. دبارە هەر ئەو کەسە داوای لەمام جەلال کردووە بۆ هێنانی براکەی هەمان داواشی لەکاک مەسعود کردووە.

ئێمە لە دوای ئەنجامدانی هەندێک چاوپێکەوتن وئیشوکاری حیزبیو ڕێخستن گەڕاینەوە، دوای سێ ڕۆژ شەوێک قەیسەری برای بەهمەن هات بۆ هاوارەکۆن و کابرای هێنابوو، کوڕێکی گەنجی باڵابەرزو سپی ڕەنگ بوو، من نامەیەکی دەستخۆشی و سوپاسم بۆ بەهمەن نووسی و قەیسەرم ناردەوە، میوانەکەمان چەند ڕۆژێک مایەوەو هیلاکی دەرچوو، ڕۆژێک ئاگادارم کرد

خۆی ئامادە بکات تا ڕەوانەی ئێرانی بکەین، کاک حەکیمی مەلاساڵح هات وتی ئەم پیاوە ئەڵێت ناچم بۆ ئێران، پرسیم بۆ؟ ووتی ئەڵێت خواحافیزیم لەماڵەوە نەکردووەو تەسفیەی کاروبارمم نەکردووە، خۆم لەگەڵ کاک حەکیم چووم بۆلای، پێم ووت تۆ چانست هەبوە بەسەلامەتی گەیشتوویتە لای ئێمە چۆن جارێکی ترخۆت ئەخەیتەوە بەردەم مەترسی و ڕێگەی هاتوونەهات، زۆرمان ووت نەیبیست، بۆیە دووبارە بە هاوولاتیەکی کوردی ڕۆژهەلات دا بەناوی ڕەئوف ئێناخی قەیسەرم ئاگادار کردەوە بێت بۆ هاوارەکۆن وسەردانم بکات، هەرهەمان شەو قەیسەر هاتەوە، بەنهێنی و بێئەوەی کەس بزانێ ناردمەوە بۆ ناوشار بۆ لای بەهمەن تەنیا هەڤاڵ حەکیمی مەلا ساڵح ئەیزانی.

کەئەگاتەوە ناوشار قەیسەر ئەیباتە ماڵی باوکی، خۆی ئەچێت بەهمەن بەگ ئاگادار ئەکات، بۆ ڕۆژی دوایی ئەیدەنە دەست شۆفێرێکی خەتی هەڵەبجە- بەغدا، بەناوی وشیار یار ئەحمەد بەگ، بەهمەن بەجێی نامێڵێ تالەترمینال دەرئەچێت، ژنێک بەناوی تووبا خان خوشکی ئاوەڵ زاوایەکی بەهمەن کەناوی ئەمینە نەفەری ئۆتۆمبێلەکەیە. دوای نیوکاتژمێر لە دەرچوونیان لەشار، بەهمەن ئەبینێ ئۆتۆمبێلەکە والەبەردەم ئیدارەی ئەمنی هەڵەبجەدا وەستاوە، بەبینینی ئەودیمەنە ناوەستێ تا بزانێت چی ڕویداوە، هەڵدێت بۆ ئاوایی عەبابەیلێ و لەوێ خۆی حەشار ئەدات.
لەئاوای عەبابەیلێ مام ئەمین محەمەدعەلی و حاجی کەریمی برای لەوکەسانە بوون کە زۆر ماندوو بوون لەگەڵمان و ئەرکی پێشمەرگەو مەفرەزەکانیان لەسەر بوو، جێگەی متمانەو ماڵەکانیشیان وێستگەو شوێن گواستنەوەی تەداروکات و کەلوپەلی پێشمەرگە بوون لەنێوان شارو شاخ دا.

کاتژمێر یەکی نیوەشەو بوو لەناو بارەگای خۆمدا خەوتبووم، لەئاوایی هاورەکۆن، پاسەوانێک بەخەبەری هێنام خۆمکۆکردەوەو ووتم هاچییە؟ ووتی پیاوێک هاتووە داوای تۆ ئەکات ئەڵێ ئیشی زەروورم پێیەتی، وردە وردە بارانیش دەبارێت، شەهید کەیکاوس لەپەنام دا خەوتبوو، ئەویش هەستا، پێکەوە چووینە سەرەوە، ئەبینم پیاوێک وەستاوە کێشەکەی سەری کردووەتە چەتفە، ڕەشۆی قاترێک بەدەستیەوەیە، لێی چوومە پێش بەهێواشی

س لاوە مام ئەمین تۆی بەخێر بێیت، گوێیشی گرانە، کاکە حەمەم ئەوێت، خۆمم مام ئەمین، دەستی گرتم و بردمیە لاوە، ووتم کەرە خێر بێت.
ووتی بەهمەن بەگ ڕای کردووە لەعەواوەیلێیە، منی ناردووە بۆلات، ووتی ئەبێ هەر ئەم شەوو برۆی پێی بڵێیت کابرای عەرەب گیراوە. چۆن کەی لەکوێ کێ گرتوویەتی؟ نازانم هەر ئەوەندەی ووت. ئەی خۆی بۆنەهات کەڕای کردووە؟ نازانم، منیش خەموو دڵەڕاوکە دایگرتم. مام ئەمین ووتی من ئەبێ بگەڕێمەوە، ئەی پشوو نادەی؟ نەوەڵا. دوای ساتێک بیرکردنەوە، ووتم بە کەیکاوس باخۆم برۆم، لەگەڵ دوو پێشمەرگەی زرنگ و چەلەنگ دا، کەوتینە ڕێ مام ئەمین ووتی سواری قاترەکەبە، ووتم ناخۆت ماندوویت سواربە، سوار نەبوو، من پەڕیمە کوڵی ولاخەکە و بەچیای شنرۆێدا هەڵگەڕاین هاتینە سەر شاخ، کزەیەکی ساردی هەبوو لەقاترەکە دابەزیم، کەوتینە لابەلای کانی وەزگێڵ و دوای بڕینی خۆرەتاوی سپی تل و ئەمبەرو ئەوبەری ئەشکەهۆڵ بەیەنا ڕەبیەکانی ملەی ئەشکەهۆڵدا، سەرەوخوار بووینەوە بۆ ئاوایی عەبابەیلێ، لە هاوارەکۆن دەرچووم تاگەیشتن بە شوێنی مەبەست، مێشکی من بۆیەک ساتیش لە شەلالی بیرو خەیالات غافڵ نەبووە، چی بێت؟ چۆن بووبێت؟چی وەلامی مام جەلال بدەمەوە؟ چۆن بڕوامان پێبکات؟ من بۆ عەقڵم لەسەردا نەبوو ڕازی بووم ئەم کابرا بگەڕێتەوە..........تا دوایی.

کاتێک سەرەوخووار بەرەو ئاوایی ئەهاتینە خوارەوە ڕووناکی لامپەکان و چراو چراخانی هەڵەبجە شەوارەی پێکردبووین، جارجاریش برکەبرکە تەموتواڵی بەری شەوقەکەی لێ ئەگرتین، نەم ئەزانی چکاتە، نەشم ئەپرسی لە هاوڕێکانم، کەگەیشتینە کەوانی ئاوایی بێدەنگ بۆماوەیەک کورکەمان کردووە تا بزانین چباسە، نەوەک بێئاگا بکەوینە داوی جاشگەل، مام ئەمینیشم لە پێشەوە ناردە ناو ئاوایی، کاتێک هەستاین بۆ ئەوەی برۆین بۆ ناو ئاوایی، ئاوڕێکم دایەوە بۆ سەر شاخ و ملەی ئەشکەوڵ، بینیم بەری بەیانەو ڕووناکە ئاسۆ.

خۆمان کرد بە ئاواییدا، لەماڵێکدا ماینەوە ئەم ماڵە پێشتر باسم کردووە، پەناگەی هەمیشەیمان بوو، خاوەن ماڵ دادە نەجیبە دایکی نەبەزە سوورو نەورۆز، نەجیبە خان بەڕاستی نەجیب بوو، لەدواجاردا رژێمی بەعس

تۆلەی لەم ژنە تێکۆشەرە کردەوە، ئەوەبوو لەمانگی ١٩٨٨/٨دا کاتێک ئێران لەهەڵەبجەو ناوچەکەدا پاشەکشەی کرد، نەجیبە شێخ عەزیزو ئاسۆ شێخ حسێن و شێخ ئەورەحمان و توفیق ناوێک، لە ئاوایی عەبابیلێ مانەوەو نەهاتنە ئێران، کاتێک سوپایی عێراق هاتەوە ناوچەکە ئەمانەی گرتوو بردنییە تۆپزاوا لەسنوری هەولێر، دوای شەش مانگ زیندان و ئازارو ئەشکەنجە ئازاد کران.

هاورێکانم خۆیان ڕانەگرت تا نان و چایی بخۆن، لێی خەوتن، من نەمتوانی بخەوم ئۆقرەم لێبڕابوو بۆ بینینی بەهمەن و تێگەیشتن لە ڕووداوەکە، دوای نان و چا خواردن ناردم مام ئەمین بەهمەن بدۆزێتەوەو بیهێنێ، هات ووتی ڕۆشتوەتەوە بۆ ناو شار، یەکێکم نارد بۆ ناوشار تابیهێنێتەوە، لەدلیشدا ووتم بەڵکو وانەبێت و ئەم پیاوە عەرەبە نەگیرابێت، نزیک بەنیوەڕۆ بوو بەهمەن هات بەدەم وچاویدا زانیم نەخێر کابرا نەگیراوە، دوای چاکی و چۆنی ووتم ئادەی بۆم باس بکە چیبووە، بەئاماژە بۆ پێشمەرگەکان کە خەوتبوون ووتی ئەمانە کێن، ووتم خەوتون قسەبکە. ووتی:

کابرا هاتەوە بردم و لەگەڵ وشیاری یار ئەحمەد بەگدا ناردمەوە بۆ بەغدا کرێ سەیارەکەشم بۆ دا، دوای نیوکاتژمێر لەبازاردا بووم کاتێکم زانی ئوتۆمبێلەکە گەڕایەوەو چوو لە بەردەم دائیرەی ئەمندا وەستا ئیتر من نەوەستام و هاتم بۆ عەبابەیلێ ئەوەبوو مام ئەمینم نارد بۆلای تۆ، دوای ئەوە ناردم بەدوای ئەمینی ئاوەڵ زاوامدا هات بۆ لام پێم ووت بڕۆ تەلەفۆن بکە بۆتووبای خوشکت بۆ بەغدا بزانە گەیشتووە، ووتی بۆ چیبووە؟ مەسئەلەکەم بۆ باس کرد. چوو هاتەوە ووتی تووبا لەماڵەوە بووە لەبەغدا، لێم پرسیوە بۆ سەیارەکەتان دوای نیوکاتژمێر لەدەرچوون گەڕاوەتەوە بۆ بەردەم ئەمنی هەڵەبجە؟ ووتویەتی لەبازگەی دەرەوەی شار کارمەندێکی ئەمن نەفەر بووە گەڕاینەوە بۆ جانتاکەی. من سەرەڕای ئەو هەموو ماندوو بوون وخەفەتە دەستم کرد بە پێکەنین ومێشکم ساف بوو.

تا ئێوارە پێکەوە بووین و شەو گەڕامەوە بۆ هاوارەکۆن، بەیانییەکەی بێسیم چیەکەمان هاتوو بروسکەی مام جەلالی دامێ، لەم بروسکەدا مام توورەیەو ئەپرسێ کابرا کێ هێناویەتی و چیلێهاتووە بۆ کوێیان بردوە؟ دیارە کەلە بەغدا دەرچووە براکەیان ئاگادار کردووە لە ئەورووپا، دوای چەند ڕۆژ

کە نەگەیشتووە ترساون و مامیان ئاگادار کردووە ووتویانە رەنگە تەسلیمی بەعسیان کردبێت.

منیش بە بروسکەیەکی درێژ مامم ئاگادار کرد ئەوپیاوە گەیشتووەتە لای ئێمەو خۆی گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا. مام جەلال دووبارە داوا ئەکات بنێرەوە بە دوایدا، جارێکیتر بەهەمەنمان ناردەوە بە دوایدا، ئەمجارە ئۆتۆمبێلی حاجی غازی محەمەد فەتاحی لە هەڵەبجەوە بەتایبەت بردبوو بۆ بەغداو جارێکیتر کابرای هێنایەوە، حاجی غازی یەکێک بوو لەوکەسانەی جێگەی دڵنیایی بوو، کە گەیشتە هاوارەکۆن خۆم بردمە سەر سنوور لەئاوایی شێخان کە گوندێکی کوردستانی ڕۆژهەلاتەو بارەگای ئێمەو سوپای پاسدارانیشی لێبوو تەسلیمی دەستی شەهید نیازیم کرد ئەوکات بەرپرسی پەیوەندیەکان بوو لە شاری پاوە.

١ – لەهەڵەبجەدا چەندین شۆفێر هەبوون لە خەباتی ناوشاردا زۆر لەخۆبوردو بوون، من زۆرتر ئیشەکانم بەوانە ئەسپارد، لەوانە گواستنەوەی پێشمەرگە لەشوێنێکەوە بۆشوێنێکی تر بەناو دەستەڵاتی حکومەتدا بەسەیارەی خۆیان و بێبەرامبەر، لیرەدا ناوی چەند کەسیان ئەهێنم، کەبێگومان شۆفێری تری وەک ئەمانە هەبووە، بەلەخۆ بردوویی ئیشیان کردووە لەگەڵ هەڤالانی تردا، بەلام من زیاتر ئەمانە ئەناسم کە ناوم هێناون، بۆیە داوای لێبوردن لەوانەیتر ئەکەم، کە ناویان لێرەدا نەهاتووە.

ئەوانەش ئەنوەر شێخ فەرەج عەبابەیلێی، سەید عومەر عەبابەیلێی، خاڵە زەینە، غەفوور زەمەقی برای شەهید غەفار، فایەق حەمەئەمین شەمێرانی، حەسەنی بەدری، هوشیاری یارئەحمەد بەگ، مەریوانی عەلی شەممە، کامیل مەحموود و مەحیەدین حەیوسف تەوێڵەیی.

## ئامادەکارییەکانی ڕژێمی عێراق
## بۆ ئەنجام دانی پرۆسەی ئەنفال

هێزەکانی ی.ن.ک لە دوای وتووێژەکانی ساڵی ۱۹۸٤وە دەستیان دەگەیشتە هەموو ئەو ناوچەو جێگایانەی کوردستان، کە لەژێر کۆنترۆڵی حکومەتی عێراقدا بوون، شەوانە هێزەکانی پێشمەرگە چالاکیان تێدا ئەنجام دەدا. نەک هەر ئەوە بەڵکو مەڵبەندەکان و تیپەکانی هێزی پێشمەرگە ناوچەیەکی زۆریان ڕزگارکردبوو، بە دەیان بنکەو بارەگای گەورەیان لەسنوورە ئازادو ڕزگارکراوەکاندا کردبوەوە، لەوێوە پەلیان هاویشتبوو بۆ ناوچە دورە دەستەکانیش، سەرکردایەتی یەکێتیش لە دوای جێهێشتنی ناوچەکانی ناوزەنگ و قاسمەڕەش هاتبوونە قوڵایی خاکی کوردستان، لە ناوچەکانی سەرگەڵوو بەرگەڵوو بارەگای مەکتەبی سیاسی و دام و دەزگاکانی تری وەک: ڕاگەیاندن و ئیدارەو مەکتەبی عەسکەری و ڕێکخستنیان لەوێ دانابوو.

بارەگای سکرتێری گشتی مام جەلالیش لە ئاوایی یاخسەمەر بوو، هەموو گوندەکانی ناوچەکەو بەرزاییەکانی نێوان شاری سلێمانی و شارۆچکەی دوکان و ناوچەی ماوەت بەدەست هێزی پێشمەرگەی کوردستان و یەکێتییەوە بوون. هەر لەو سەروبەندەدا هێزی پێشمەرگە چەندین گورزی گەورەی سراوەندبووە سوپای دڕندەی عێراق و دامودەزگاکانی حزبی بەعس. لەلایەکی ترەوە نەتەوە یەککرتووەکان لە هەولدا بوو بۆ وەستانی جەنگی عێراق ـ ئێران. عێراقیش لەلایەک لەگەڵ ئێران بە درێژایی سنوری هەردو وڵات سوپاکەی سەرگەرمی شەڕبوو، لە زۆر لاشەوە هێزەکانی پیادەی عێراق تێک شکابوون، لەلایەکی تریشەوە لە ناوخۆی وڵات و لە ناوچەکانی کوردستاندا هێزی پێشمەرگە سەرگەرمی چالاکی زۆرو جۆراو جۆربوون، ئەمەش وایکردبوو سەدام و سەرکردایەتییەکەی هەنگاوێکی نوێتر بدۆزنەوە بۆ ڕووبەڕوونەوەی هێزەکانی یەکێتیی و لایەنە سیاسییەکانی تر کە ئەو سەردەمە بە پەراگەندەیی لە ناوچەکەدا لەپەنا هێزەکانی یەکێتییدا

بوون، حسابێکی تایبەتیشیان بۆ ئەو هێزەی ئۆپۆزسیۆنی عەرەبی عێراقی دەکرد، کە بنکەو بارەگاکانیان لە نێوان سنوری گەرمیان و ناوچەکانی قەرەداغدا لە گوندی دەربەند دەرەوار دەوروبەریدا بوون.

لەلایەکی تریشەوە یەکێتیی پەیوەندی و هەماهەنگی زیاتری لەگەڵ ئێراندا دەست پێکردبوو، لە چالاکییەکی هاوبەشدا لەگەڵ هێزەکانی قەرارگای ڕەمەزان هێرشیان کردبووە سەر چاڵە نەوتەکانی کەرکوکو دەوروبەری، بۆیە ڕژێم هەوڵی دەدا هێزەکانی یەکێتیی و لایەنە سیاسییەکانی تر لەناوچە ئازاد کراوەکانی کوردستان دەربپەڕێنێت.

ئەوەبوو حکومەت لە سەرەتای ئازاری١٩٨٧دا لە بەرەکانی جەنگی عێراق ـ ئێراندا، کەوتە حاڵەتی بەرگریی و هەوڵیدا هێزی زیاتر، کە پێکهاتبوو لە چەندین فیرقەو فەیلەق ئامادە بکات بۆ هێرشێکی گەورەو گران بۆ سەر هێزەکانی یەکێتیی و ناوچە ڕزگارکراوەکان، بەمەبەستی دەستپێکردنی پرۆسەکانی ئەنفال.

لە هەنگاوی یەکەمیشدا هێرشەکە بۆ سەر سەرکردایەتی یەکێتیی بێت، چونکە حسابی ئەوەیان کردبوو بنکەو بارەگاکانی لایەنە سیاسییەکانی تری کوردستان و ئۆپۆزسیۆنی عەرەبی عێراقی هەموو لە پەنای (ی.ن.ک) و هێزەکانییەوە توانیویانە لە ناوجەرگەی خاکی کوردستاندا بنکەو بارەگایان هەبێت، ئەوەش ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرەو هەموو لایەنەکانیش خۆیان ئەوەیان دەزانی.

بۆ ئەم مەبەستەش لە کۆبونەوەیەکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی بەعسدا لە ناوەڕاستی مانگی ئازاری١٩٨٧دا بڕیاریدا: عەلی حەسەن مەجید وەک بەرپرسی نوسینگەی باکووری حزبی بەعس دابنێ، ئەویش بەڵێنیدا لە ماوەیەکی کەمدا جوڵانەوەی ڕزگاریخوای کوردستان کۆتایی پێ بهێنێت.
دەسەڵاتی پێدرا بەپێی ئەم دەقە:

بەناوی خوای بەخشندە

بەناوی گەل

ژمارەی بڕیار: ١٦٠ لە ٢٩ی / ٣ / ١٩٨٧

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش

بەپشت بەستن بە ئەحکامی برگە أ لە مادەی ٤٢ وە برگەی أ لە مادەی ٤٣ی دەستوور بەجێ بەجێ کردنی تەواوی ئەوەی لەکۆبوونەوەی هاوبەشی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و سەرۆکایەتی هەرێمایەتی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی دا لە ١٩٨٧/٣/١٨دا بڕیاردرا:

یەکەم / هەڤاڵ عەلی حەسەن مەجید نوێنەرایەتی سەرۆکایەتی هەرێمایەتی حزبو ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بکات، بۆ جێ بەجێ کردنی سیاسەتەکانیان لە گشت ناوچەکانی باکووردا لەنێویشیاندا ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان بەمەبەستی پاراستنی ئاسایشو دەستەبەرکردنی ئارامی و جێ بەجێ کردنی قانوونی ئۆتۆنۆمی لە ناوچەکەدا.

دووەم / هەڤاڵ ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی بۆ ئەنجامدانی ئەم بڕیارە، سەرپەرشتی دەسەڵاتی بڕیاردانی پەیوەندیدار بە هەموو دەزگا مەدەنیی و سەربازی و ئاسایشییەکانی دەولەت دەکات بەتایبەت ئەو دەسەڵاتانەی پەیوەندییان بە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و لیژنەی کاروباری باکوورەوە هەیە.

سێیەم / هەموو ئەو لایەنانەی خوارەوە لە گشت ناوچەکانی باکوور بە هەڤاڵ ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتییەوە دەبەسترێنەوە، بە هەموو ئەو بڕیارو ڕۆتینیانەوە پەیوەست دەبن، کە دەبێ جێ بەجێ بکرێن بەپێی ئەم بڕیارە:

ئەنجومەنی جێ بەجێ کردنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان.

لە دەزگاکانی پارێزگاکان و سەرۆکی یەکە کارگێڕییەکانی سەر بە وەزارەتی حوکمی مەحەلی.

دەزگاکانی هەوالگری و هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆو هەوالگری سەربازی.

سەرکردایەتی سوپای میللی.

چوارەم/ سەرکردایەتی سەربازی ناوچەکە پەیوەست دەبن بە فەرمانەکانی هەڤاڵ ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی بە هەموو ئەو بابەتانەی پەیوەندیان بە خالی یەکەمی ئەم بڕیارەوە هەیە.

پێنجەم/ کار بەم بڕیارە دەکرێت لە ڕۆژی دەرچوونییەوە تا ئاگادارکردنەوەیەکی تر، ئەو بڕیارە یاساییانەی ناکۆک دەبن لەگەڵ ئەحکامی ئەم بڕیارەدا کاری پێناکرێت.

سەدام حسێن
سەرۆکی
ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش
ئیمزا:

بەڵێ عەلی حەسەن مەجید لە دوای ئەم بڕیارە وەک کەسێکی غەڕاو دڕندە، کەوتە جوڵەو بڕیاردان و جێ بەجێ کردنی ئەو ئەرکەی کەپێی سپێدرابوو، بەشێوەیەکی دلسۆزانە بۆ سەرۆکەکەی و بەشێوەیەکی دڕندانەو بێ بەزەیی بەرامبەر بەگەلی کورد، سەرەتاو زۆرتر کاری لەسەر کۆکردنەوەو بارکردن و وێران کردن و ڕاگواستنی گوندەکانی کوردستان و خەڵکەکەی کرد، بەڵام لەم سیاسەتەیدا سەرکەوتوو نەبوو، ئیشەکەی تەواونەکرد بۆیە لە ڕۆژی ١٩٨٧/٦/٢داعەلی حەسەن مەجید بڕیارێکی تری سەبارەت بەگوندەکانی کوردستان دەرکرد.

<u>دەقی بڕیارەکە</u>

ژمارە ٤٠٠٨/٢٨ بەروار ١٩٨٧/٦/٢

سەرکردایەتی نوسینگەی باکوور
لە / سەرکردایەتی نوسینگەی سکرتاریەتی ڕێکخستنی باکوورەوە
بۆ / قیادەی فەیلەقی یەک، قیادەی فەیلەقی دوو، قیادەی فەیلەقی پێنج.
بابەت مامەلەکردن لەگەڵ ئاوایی قەدەغەکراو لەباری ئەمنییەوە لەبەرئەوەی ماوەی ڕەسمی بۆ کۆکردنەوەی ئەو گوندانە لە بەرواری ٢١ی حوزەیرانی ١٩٨٧وە کۆتایهاتووە، بڕیارماندا لە ڕۆژی ٦/٢٢/ ١٩٨٧وە دەستبەکاربین بەم شێوەیەی خوارەوە:
هەموو گوندەکان لەمەودوا بە ناوچەی قەدەغە کراو دادەنرێن لە ڕووی ئەمنییەوە، کە هەتا ئێستا شوێنی بەکرێگیراوی ئێرانو تێکدەرانی خائینزادەو نمونەکانیانن، کە خیانەت کارانی عێراقن.

بەتەواوی قەدەغەیە خەڵکو ئاژەڵیان تێدا بمێنێ، ئەم ناوچانە بە ناوچەی قەدەغەکراو دادەنرێنو تەقەکردن تیایاندا ئازادە بێ مەرجو بێ ڕێنمایی مەگەر ڕێنمایی تر دەرچێت لەوبارەیەوە لەلایەن بارەگاکەمانەوە.
هاتووچۆ لەوێوە بۆ ئێرەو لێرەوە بۆ ئەوێ یان کشتوکاڵ و تۆو کردن و پیشەسازی و ئاژەڵ داری قەدەغەن و لەسەر دەزگا پەیوەندیدارەکان پێویستە بەدواداچوونی جدیان لەبارەییەوە هەبێت و هەریەکە بەپێی تایبەت مەندی خۆی.
سەرۆکایەتی فەیلەقەکان لیدانی تایبەت ئامادەبکەن، ناوبەناو بە تۆپو فرۆکەو سەمتی و کوپتەر لە هەموو کاتدا شەو ڕۆژ بخەنەکار بۆ کوشتنی گەورەترین ژمارە لەو کەسانەی، کە لە شوێنە قەدەغە کراوەکاندانو ئاگادارمان بکەنەوە.
دەستبەسەرداگرتنی هەموو ئەو کەسانەی، کە دەستگیردەکرێن لە گوندەکانی ئەو ناوچانەدا، دواتر لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانەوە لێکۆلینەوەیان لەگەڵ بکرێتو حوکمی لە سێدارەدانیان بە سەردا جێ بەجێ دەکرێت، ئەوانەی، کە تەمەنیان لە نێوان ١٥-٧٠ساڵدایە، دوای سوودوەرگرتنی ئەو زانیاریانەی پێیەتی ئاگادارمان بکەنەوە.
دەزگا پەیوەندیدارەکان هەڵدەستن بە لێکۆلینەوە، کە لەگەڵ ئەوانەی خۆیان ڕادەست دەکەن، لە دەزگا حکومی و حیزبیەکاندا بۆ ماوەیەک ئەوپەڕی ٣-١٠ ڕۆژ بێت، دەبێت لەو حالەتانەدا ئاگاداربکرێینەوە، ئەگەر پێویستی کرد ماوەی زیاتر بێت، دەبێت لەو حالەتەدا بە تەلەفۆن یان بە برووسکە ڕەزامەندیمان وەربگرێت لە ڕێگای هەڤاڵ تاهیر ئەلعانییەوە.
هەموو ئەو کەلوپەلانەی کەوا فەوجەکانی خەفیفەو جەنگاوەرەکانیان دەستیان دەکەوێت بۆ خۆیان دەبێت، جگە لە چەکە قورسەکانو چەکی ئەسنادو چەکی مامناوەندی، چەکە سوکەکان بۆ خۆیان دەبێت، ژمارەکانیان تۆمار بکەنو ئێمەی لێ ئاگاداربکەنەوە، پێویستە لەسەر فەرماندەی جەحفەلەکان چاکبن بۆ ئاگادارکردنەوەی هەموو مستەشارەکانو فەرماندەی سریەو مەفرەزەکانیان، هەروەها بە وردی ئێمە ئاگادار بکەنەوە لە چالاکی فەوجە خەفیفەکان.
الدیفاع الوطنی سەرۆکایەتی مجلس تشریعی و . سەرۆکایەتی مجلس تنفیزی . دەزگای زانیاری . سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپا . پارێزگاکان . سەرۆکایەتی لیژنە ئەمنییەکان نەینەوا، تەئمیم، دیالە، سەلاحەدین، سلێمانی، هەولێر، دهۆک ڕاگری لقەکانی ئەو پارێزگایانە . بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری گشتی و سەربازی . بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی گشتی . بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی ناوچەی حوکمی زاتی بەڕێوەبەری ئەمنی پارێزگاکان موسل، کەرکوک، دیالە،

سەلاحدین، سلێمانی، هەولێر، دهۆک . تکایە بۆ تێروانینو جێ بەجێ کردن، هەرکەسەو بەپێی تایبەتمەندی خۆی . ئاگادارمان بکەنەوە.
ئیمزا:

عەلی حەسەن مەجید
ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی
سەرکردایەتی نوسینگەی ڕێکخستنی باکوور ٢ / ٦ / ١٩٨٧

لەگەڵ ئەم بڕیارو فەرمانانەشدا بڕیاری ئابلوقەی ئابووری بۆ سەر ناوچە ڕزگارکراوەکانو ئەو گوندانەی مابوونەوە دەرکرد تا کاریگەری زیاتری بۆ سەر هێزی پێشمەرگەو ئەو خەڵکە هەبێت، کە لە ناوچە ڕزگارکراوەکاندان.

لەوانە چاودێری کردنو زاڵبوون بەسەر شارۆچکەو ئۆردووگا زۆرەملێکاندا، کەمکردنەوەی ئەو وەکیلەکانی خۆراک لە قەزاو ناحیەکانداو بەرتەسک کردنەوەی پێدانی بەشە خۆراک بە هاوڵاتیان، لە ڕێگەی خاڵەکانی پشکنینەوە چاودێری دەرمانو سوتەمەنی قەدەغەکراو بکرێت، چاودێریکردنی گواستنەوەی خۆراکی وەکیلەکان تا گەیشتنی بۆ جێگەی خۆی، نەوەک لە ڕێگا لێی لابدرێت.

لەوکاتەدا ئێمە لە سنوری ناوچە ڕزگارکراوەکانی گوندەکانی سەر ئاوی سیروانو بەری هەورامان بووین، کەلەم کتێبەدا بە ناوچە دابڕاوەکە پێشتر ناوم هێناوە، ئەم ئابلۆقەیە هیچ کاریگەری لە سەرمان نەبوو، نە بۆ پێشمەرگەو نە بۆ سەر خەڵک، چونکە لە ئێرانەوە ئازوقەو پێداویستیمان بۆ دەهاتوو لە ڕێگەی حزبی دیموکراتەوە لە هەڵەبجەوە بە چنگمان دەخست. مەبەستم تیپی ١١ی هەورامان و هاوڵاتیانی نیشتەجێی گوندەکانی: ڕێشاو، بۆین، گریانە، هاوارە کۆن، هاوارو دەرەتفێ یە، کە لەژێر دەستەڵاتی هێزی پێشمەرگەدابوون و ئاوەدانکرابوونەوە، بەشێکی زۆریش لە خێزانو کەسوکاری پێشمەرگەکانی تیپی ١٥ی شارەزووریش هاتبوونە ئەم گوندانە.ئەمە بەڵگەنامەیەکە لەوبارەوە کە بالیۆزخانەی ئەمریکا لە ئوردن داویەتی بە واشنتۆن.

**دەقی بەڵگە نامەکە**

**لە باڵیۆزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە العمان**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە واشینتۆن دی سی، ٨٤٠٥**

**بابەت: دەقی گفتوگۆکانی عەلی حەسەن مەجید لەگەڵ کاربەدەستانی باڵای بەعس لە ١٩٨٨ دەربارەی کیمیابارانکردنو سەرکوتکردنی خەڵکی باکوور**

**نیسانی ١٩٩٢**

**بۆ زانیاری:**

USIA WASHDC
SECDEF WASHDC
DIA WASHDC
CIA WASHDC
JCS WASHDC
FBIS RESTON VI
USCIMCCENT MACDILL AFB FL

**لیژنەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوەیەکگرتووەکان لە جنێف لیژنەی وڵاتانی ئەندامی کۆنفرانسی ئیسلامی کۆنسولخانەی ئەمریکا لەئەدەنە.**

**کورتە: ئەمە ڕاپۆرتێکی کورتە لەبارەی ناوەڕۆکی ٣ کاسێتی دەنگ، کە لە ١٩٨٨ تۆمارکراوە ئەم کاسێتانە بەڵگەیەکی زۆر ڕوونە، کە نیشانی دەدات ڕژێمی عێراق ئەو هێزانەی خۆی سزاداوە، کە سەرپێچیان لە شەڕکردن لەگەڵ تێکدەرەکان کردووە، گوندنشینەکانی لە پێداویستییە سەرەکییەکانی ژیان بێ بەشکردووە، بۆئەوەی ناچاریان بکات کۆچ بکەن بۆ شارەکانو ئەو دانیشتووە غەیرە عەرەبانەی ڕاگواستوەتەوە، کە وەک هەڕەشەی ئەمنی سەیری کردوونو فەرمانیداوە، کە کوردەکان گۆشەگیر بکرێنو بۆ ماوەی ١٥ ڕۆژ کیمیاباران بکرێن بۆئەوەی ئاگربەست ڕابگەیەننو لەگەڵ عێراق وتووێژ بکەن.**

ئەم کاسێتانە بەشێوەیەکی ڕوون ئەو سەرکوتکاریانە نیشان دەدات، کە عەلی حەسەن مەجیدی، وەزیری بەرگری ئێستای عێراق تا ئەمڕۆ ئەنجامیداوەو لەوانەیە لە بواری هەوڵە گشتی و دیپلۆماتیکیەکانماندا سوودی هەبێت.

ئەو کاربەدەستەی کە ئەم کاسێتانەی خستووەتە بەردەستی ئێمە سێ دانە کاسێتی یەک کات ژمێری لەکاتی سەردانەکەی بۆ باکووری عێراق لە ١٦-١٨ی ئازار لەگەڵ هێزەکانی شا لاوەی دابین کردنی ئاسایش دەست خستووە ١٤١.

لەسەر کاسێتەکان ئەم ڕستەیە بە عەرەبی نووسراوە:

گفتوگۆکانی عەلی حەسەن مەجید لەگەڵ ئەندامانی حزب/ ١٩٨٨، عەلی حەسەن مەجید پێشتر وەزیری ناوخۆ بووەو ئێستا وەزیری بەرگری سەدام حوسێنەو ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشە.

عەلی حەسەن مەجید لە ١٩٨٨ بەرپرسی فەرمی بەرنامەی ڕاگواستنی زۆرە ملێو سەرکووتی کوردەکان بەدەستی ڕژێمی عێراق بوو. ئێمە زۆر دەنگی تۆمارکراوی ئێستای عەلی حەسەن مەجید مان لەبەردەستدا نییە بۆئەوەی لەگەڵ دەنگی ناو کاسێتەکەدا بەراووردی بکەین. عەلی حەسەن مەجید لەنێو کاسێتەکاندا بە ناوی خۆی بانگ ناکرێت، بەڵکو لە سەرەتادا بە ئەبو حەسەن بانگ دەکرێت.

ناوەرۆکی کاسێتەکان نیشانی دەدات، کە بەرواری تۆمارکردنی کاسێتەکان دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری کۆتای پێهاتنی جەنگی عێراق - ئێران.

ئێمە نازانین ئەم کاسێتانە ئەسلن یاخود کۆپی کراو، هەروەها نازانین پێشتر کاسێتەکان ب لاوەکراونەتەوە یاخود نا. عەلی حەسەن مەجید پێشتر لە کاسێتێکدا ووتبووی بە بۆلدۆزەرو شۆفل دەیانکەم بە ژێر خاکەوە.

ئەم وتە بەناوبانگەی عەلی حەسەن مەجید لەناو ئەم سێ کاسێتەی بەردەستماندا نییە. دەنگی نێو دوو لە کاسێتەکان ڕوونەو بە باشتر دەبیسترێت، بەڵام کاسێتی سێیەم ڕوون نییە، بەڵام ئەگەر لە ڕووی هونەرییەوە دەستکاری بکرێت چاک دەبێتەوە.

کاسێتی یەکەم: دیوێکی ٣٢ خولەکەو دیوەکەی دیکەی ١٨ خولەکە.

بابەتە سەرەکیەکانی ئەم کاسێتە بریتین لە سزادانی تێکدەران و هێزەکانی بەرگری نیشتیمانی، کە فەرمانەکانیان جێ بەجێ نەکردووەبە ناچارکردنی کوردەکان بە کۆچ کردن بۆ شارەکان لە ڕێگای بێبەشکرنی ناوچە گوندنشینەکان لە پێداویستییە سەرەکییەکانی ژیان، وادیارە ئەو کەسانەی، کە لە دانیشتنەکەدا ئامادەبوون بریتین لە: عەلی حەسەن مەجید، پاریزگاری هەولێر، دهۆک و کاربەدەستانی دیکەی عێراق لە پارێزگاکانی باکووری عێراق.

لە کاسێتەکەدا دەربارەی ئەم تەوەرانە قسەوباس کراوە: لەسیدارەدانی کاربەدەستە محەلیەکان، کە فەرمانەکانیان جێ بەجێ نەکردووە، دژایەتی کردنی پێدانی وێستگەکانی فرۆشتنی بەنزین بە کەرتی تایبەت تا ئەو کاتەی کە بارودۆخی نائاسایی لە باکوور کۆتایی پێدێت و فەرمانی ٦ یەکەی هێزی بەرگری نیشتیمانی پێکدێت، لەبەرئەوەی کەوتوونەتە ژێر کاریگەری پروپاگەندەی دەروونی تێکدەران. سزاکەیان بریتییە لە بڕینی ٢٥%ی مووچەی کادرەکان و زیندانیکردنی خێرای ئەو فەرماندانەی، کە لەگەڵ فەرمانی لەناوبردنی تێکدەران هاوڕانین.

لە کاسێتەکەدا عەلی حەسەن مەجید بە ئاماژەکردن بە لێدوانی پێشووی بۆ کۆمیتەی نەوت، دەڵێت:" دەرکردنی خەڵک لە ناوچە گوندنشینەکان بۆ ناوچە شارنشیەنەکان لەباکوور سوودی دەبێت من هیچ شتێک نادەم بەدانیشتوانی گوندەکان بۆئەوەی ناچاربن کۆچ بکەن بۆشارەکان. بۆ دەبێت هەموو هەفتەیەک ٤ دەبە نەوت بدەم بە گوندنشینەکان، تەنیا دەبەیەکیان دەدەمێ، ئاردیان نادەمێ، شەکریان نادەمێ، نەوتیان نادەمێ، کارەبایان نادەمێ، یان ئاویان نادەمێ، بابێن بۆلام بۆئەوەی دەنگم ببیستن و بیخەمە ناو مێشکیانەوە ئیدولۆژی کەلتورو هۆشیاری چۆناوچۆنە.

کاسێتی دووەم: فەرماندەیەکی دیکە قسە دەکات، دیوی یەکەمی کاسێتەکە ٣٠ خولەکە، عەلی حەسەن مەجید وادیارە بەرپرسیارێتی ئیدارەی باکووری حزبی بەعسی داوە بە کەسێک بە ناوی ئەبو عەلی.

سەرەتا هەڤال عەلی حەسەن دەڵێت:" ئەبوعەلی یەکێ لە ئەندامە کۆنەکانی ڕێبەرانی حزبی بەعس و ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشە، ئێستا، کە سەقامگیری گەڕاوەتەوە بۆ ناوچەکە، ئەبوعەلی باشترین کەسە

بۆئەوەی کاروباری باکوور بەرێوە ببات". هەڤال عەلی حەسەن ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە ئامۆژگاری دەکات، کە پشتیوانی لە ئەبوعەلی بکەنو ئاماژە بەوە دەکات، کە لەوانەیە هێشتا زەبری شمشێر پێویست بێت.

عەلی حەسەن مەجید دەڵێت:" خۆی وەک راوێژکارو بەشێوەی فەخری هاوکاری ئەبو عەلی دەکات". هەروەک باس لە گرتنەبەری ئەو رێگاو شێوازانە دەکات، کە بۆ وەداوخستنی تێکدەران و سزادانیان داویەتی بە فەرماندەکانی سوپاو ئاماژە بەوە دەکات، کە هەندێ لە فەرماندەکانی سوپا هەست دەکەن ناتوانن ئەو رێنماییانە جێ بەجێ بکەن و خۆیان لەجێ بەجێ کردنی ئەو رێنماییانە دزیوەتەوە.

عەلی حەسەن مەحید ئاماژە بەوە دەکات، کە خۆی فەرمانی لەسێدارەدانی ٣٥کەسی دەرکردووە، کە ئەندامی بزوتنەوەی ئیسلامی بوون، دەڵێت لە ئەنجامی رێنماییەکانی ئەودا خراپە کاریەکە تا ٤ی ئەیلول بە تەواوی کۆتایی پێهاتووە، بەڵام بەهەرحال خراپەکارییەکانی دیکە واتا خراپەکاری بیروباوەرە سیاسییەکانی نەیاران کۆتایی پێ نەهاتووە.

عەلی حەسەن مەجید دەڵێت:" ئێستا ئەرکی حزبی بەعس ئەوەیە، کە لە رێگای دامەزراندن و پرکردنەوەی بۆشایی سیاسی کۆتایی بە خراپەکاری رووناکبیران بێنێت. قسەیەکی ناروون لەناو کاسێتەکەدا هەیە، کەوادیارە عەلی حەسەن مەجید رەخنە لە یاسای پێشووی ئۆتۆنۆمی کوردەکان دەگرێت، چونکە مافی زۆریداوە بە کورد.

عەلی حەسەن مەجید دەڵێت:" زۆر سەری لەو لێبوردنە سورماوە، کە بۆ تێکدەران دەرکراوەو ئاماژە بەوە دەکات، کە متمانەی بە هیچ کام لە کاربەدەستە کوردەکانی حکومەتی عێراق نییە جگە لە پارێزگاری هەولێرو سلێمانی نەبێت.

دیوی دووەمی کاسێتی دووەم ٢٧ خولەکە، لەبارەی راگواستنی زۆرە ملێی خەڵک بۆ بەرەنگاربوونەوەی تاقمچێتیە، عەلی حەسەن مەجید دەڵێت:" من توونددو تیژ یان مرۆڤ کوژنیم، بانگەشەی ئەوەش دەکات، کە عەرەب و ئێزیدییەکان لە ٥١% دانیشتوانی کەرکووک پێکدێنن.

عەلی حەسەن مەجید هەروەها مافی ژیان و کارکردن لە کەرکووک بۆ کوردەکان قەدەغە دەکات و دەڵێت:" هەندێک لە کوردەکانم زیندانی کردووە".

هەروەها دەڵێت:" تورکمانەکان وەلایان بۆ تورک هەیە نەک عێراق و هەموو دەرفەتێک بەکاردەهێنن بۆئەوەی وەفاداری خۆیان بۆ تورکیا نیشان بدەن".

عەلی حەسەن مەجید دەڵێت: ئەوانەی کەڵک لە عەشیرەتچێتی و تاقمچێتی وەردەگرن مەترسیدارن"، جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە نابێت ئێمە سوونئە دژی شیعە بخەینە ناو جموجۆڵی سیاسی، چونکە خۆمان پارچە پارچە دەکەین و دەیدۆڕێنین".

عەلی حەسەن مەجید دەڵێت:" بڕیارمانداوە، کە نابێت لە ناوچەکانی مەندەلی و خانەقین و ئەو ناوچانەی کەوتونەتە نێوان ناوچە کوردنشینەکان و عەرەبنشینەکان ڕێژەی عەرەب ٤٠% کەمتر بێت".

عەلی حەسەن مەجید دەڵێت:" دەبێت پشتێنێکی ئاسایش بە دەوری ناوەندەکانی نیشتەجێبوونی خەڵک دروست بکەین و ئەو کەسانەی کە لە شوێنەکانی دیکەوە دێن بۆ ئێرە ئاسانکاری مادیان بۆ بکەین و هاوکارییان بکەین. ئەگەر من هەموو پێداویستییەکانی ژیانیان بۆ دابین بکەم، ئەوان لە ڕێگا لابدەن ئێمە دەتوانین سزایان بدەین، هەروەک ئایینی ئیسلام دەڵێت: ناتوانین تەرمەکانیان پارچە پارچە بکەین".

کاسێتی سێیەم دەربارەی کەڵک وەرگرتنی سیاسی لە ئایین، کیمیابارانکردنی کوردەکان و دانانی پارازیت تەشویش لەسەر ڕادیۆی نەیاران، دیوی یەکەمی کاسێتەکە ٣٢ خولەکەو دیوی دیکەی ٣٢ خولەکە، دەنگێکی نەناسراو دەڵێت: هەڤاڵ ئەبو حەسەن هەندێک کەس هەوڵ دەدەن ئایین بۆ مەرامی سیاسی خۆیان دژی حزبی بەعس بەکاربهێنن، لقەکانی سەرکردایەتی شۆڕش دەبێت بەرنامەیەک دابڕێژن، چونکە توێژینەوەکان نیشانیداوە، کە دەمارگری ئایینی لەنێو حزبدا هەیە، کە دەبێت چارەسەر بکرێت.

ئێمە دەبێت سەرچاوەی پشتیوانی خەڵک لەوانە وشک بکەین، بەڵام ئەگەر ئێستا دژی ئەوان دەست بەکاربین بەشێک لە خەڵک پشتیوانیان لێ دەکەن و ئێمە دەیدۆڕێنین.

عەلی حەسەن مەجیدو ئەو کەسەی یەکەمجار قسەی کردووە باسی ئەو کەسانە دەکەن، کە لەساڵی ١٩٧٧ وەک عەرەب ناویان تۆمارکراوە، بەڵام ئێستا دەیانەوێت ناویان وەک کورد تۆماربکرێت، ئەبو حەسەن:" دەڵێت

یەزیدییەکان و مەسیحیەکان عەرەبن ئێمە یاسامان هەیە، لەوانەیە کەسێک بلێت من کوردم عەرەب نیم، بەلام ئێمە پێی دەلێین: تۆ بژاپۆنشینی".

عەلی حەسەن مەجید باسی داواکاریەکی جەلال تالەبانی ڕێبەری ی.ن.ک دەکات، کەوتوویەتی ئێمە ی.ن.ک بەرپرسانی بەعس لە بەرامبەر هاوکاری کردنمان لەگەڵ ئێران بە بەرپرسیار دەزانین و ئەگەر ئاگربەست ڕانەگەیەنرێت یان وتووێژ نەکرێت درێژە بە هاوکاری کردن لەگەڵ ئێران دەدەین.

عەلی حەسەن مەجید دەلێت:" بە تالەبانی یان ئەو کەسەی، کە پەیامەکەی بۆ بردووە وتوومە، کە ئێوە دەزانن وەلامی ئێمە چییە، هیچ ئاگربەستێک لەئارادا نابێت، هیچ وتووێژێک لەئارادا نابێت، بەرنامەی ڕاگواستنی کوردیش لە گوندەکانیان ڕاناوەستێنرێت. من بە فەرماندەکانی هێزی بەرگری نیشتیمانییم ووت: کە بە تالەبانیم وتووە کیمیا بارانتان دەکەم، دەبێت چۆلی بکەن تەنانەت ئەگەر شەڕیش کۆتایی پێ بێت و ئێران لە ناوچە داگیرکراوەکان پاشەکشە بکات، ڕاگواستنی خەلک ڕاناوەستێنرێت".

ئێمە سەرەتا بەرنامەی ڕاگواستن بە تەواوی جێ بەجێ دەکەین، شالاوە سەربازیەکانمان درێژە پێ دەدەین و پاشان گۆشەگیریان دەکەین، نەک ڕۆژێک یاخود دوو ڕۆژ، بەلکو بۆماوەی ١٥ ڕۆژ بە چەکی کیمیایی لێیان دەدەم.

پاشان من ئەو کەسانە قبول دەکەم، کە چەک دادەنێن و ڕادەست دەبن، لە درێژەدا کەسێکی نەناسراو دەلێت:" دەنگی ڕادیۆی سوریاو تورکیا دەبیسترێت، ئەبو حەسەن فەرمان دەدات پەیامێک بنێرن بۆ وەزیری زانیاری، وادیارە دەزگایەکی تایبەت لە تەلەعفەر ١٤٣ هەیە، ئێوە دەتوانن بەو دەزگایە پارازیت بخەنەسەر ڕادیۆکانی دیکە، سروشتی خەلک وایە گوێ لە ڕادیۆی ولاتانی دیکە بگرن کاتێک، کە باسەکە گەیشتە سەر چۆنییەتی ڕاگواستنی کوردەکان کاسێتەکە تەواو بوو.

هاریسۆن

عەلی حەسەن مەجید بەرپرسی نوسینگەی باکووری حزبی بەعس لە وتارێکیدا بۆ دۆستان و دلسۆزانی حزبی بەعس لە کۆتایی سالی ١٩٨٧دا ئاگاداری کردنەوە، کە کەس لە گوندەکانی کوردستان ڕزگاری نابێت تەنانەت

مستەشارو جاشەکانیش ئەگەر گوندەکانیان چۆل نەکەن. عەلی حەسەن مەجید لەو پەیوەندیەیدا دەڵێت:" من ناتوانم گوندەکانتان هەروا بهێڵمەوە، بە چەکی کیمیایی هێرشیان دەکەمە سەرو بەم جۆرە خۆتان و خێزانەکانتان دەکوژرێن. ئێوە دەبێ دەستبەجێ چۆڵی بکەن. ناتوانم پێتان بڵێم چ ڕۆژێک بڕیار دەدەم بە چەکی کیمیایی هێرش دەکەم. هەر هەموویان بە چەکی کیمیایی دەکوژم بابزانم کێ قسە دەکات؟ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی؟ لە کۆمەلگای نێودەولەتیش بم، لەوانەش بم، کە گوێیان لێ دەگرن.
ئەمە نیازو مەبەستی منە، هەر لە ڕاگواستنی گوندنشینەکان بووینەوە بەپێی پلانێکی سەربازی لە هەموو شوێنێک پەلاماریان دەدەین. من بە تەنیا ڕۆژێکو دوو ڕۆژ بە چەکی کیمیایی لێیان نادەم، بەلکو بۆماوەی ١٥ ڕۆژ بە بەردەوامی کیمیابارانیان دەکەم، پاشان دەبینن هەرچی ئۆتۆمبێلی دنیا هەیە بەشی گواستنەوەیان ناکات".
عەلی حسەن مەجید لە کۆبوونەوەیەکی دیکەدا لەگەڵ ئەندامانی نووسینگەی باکوورو پارێزگاکانی هەرێمی ئۆتۆنۆمی کوردستان لە١٥ی نیسانی ١٩٨٨دا دەڵێت: هاوینی ساڵی داهاتوو نابێ هیچ گوندێک جگە لە کۆمەلگاکانی نیشتەجێکردن بمێننەوە. دەبێت ئەو خەڵکە بخەیتە ناو ناوەندەکانی نیشتەجێ کردن و چاویشمان لێیان بێت. ئیتر نایەلین لە گوندەکاندا بژین و تێکدەران سەردانیان بکەن.
بۆ گەنم؟ گەنمی ئەوانم ناوێت، ئێمە ٢٠ بیست ساڵە گەنم لە دەرەوە دەهێنین با ٥ پێنج ساڵی دیکەشی لەسەر بێت. ئەو ناوچە بەرفراوانە قەدەغە دەکەمو ناهێڵم کەس تێدا بمێنێتەوە چی دەبێت ئەگەر ئێمە تەواوی ئەو ناوچانە لە قەرەداغەوە بۆ کفری و دیالەو دەربەندیخان و سلێمانی قەدەغە بکەین، تا ئێستا چیمان لەم ناوچانە دەستکەوتووە؟ وای لێهاتووە ئێستا کەس ناتوانێت بێ ئۆتۆمبێلی زرێپۆش لە کەرکووکەوە بچێت بۆ هەولێر.
هەمووی ئەم ناوچەیە لە کۆیە بۆ کەرکووک چۆل دەکەین. ناهێڵم یەک کەس تێدا بمێنێتەوە، ڕێگاوبانە سەرەکیەکە نەبێت، ناهێڵم تا ٥ پێنج ساڵی دیکە مرۆڤ پێی تێبخات، ئەگەر بەم شێوەیە کارنەکەین چالاکی تێکدەران تا ملیۆنێک ساڵی دیکەش کۆتای پێنایەت، پشت بەخوا بەم زووانە هەموویان لەناودەبەین و لە هاویندا هیچیان لێ نامێنێتەوە".

عەلی کیمیایی لە دانیشتنێکی دیکەیاندا لەگەڵ ئەندامانی سەرکردایەتی بەعس لە سەروبەندی کۆتایی هاتنی جەنگی عێراق ـ ئێران دەڵێت:" من بە جەلال تاڵەبانیم وتووە، کە کیمیابارانتان دەکەم، دەبێت چۆلی بکەن، تەنانەت ئەگەر شەڕیش کۆتایی پێ بهێنرێت ئێران لە ناوچە داگیرکراوەکان پاشەکشە بکات، ڕاگواستنی خەڵک ڕاناوەستێنرێت، ئێمە سەرەتا بەرنامەی ڕاگواستن بە تەواوی جێ بەجێ دەکەین، شالاوە سەربازیەکانمان درێژە پێدەدەین و پاشان گۆشەگیریان دەکەینو نەبۆ ڕۆژێکو نەبۆ دوو ڕۆژ، بەلکو بۆ ماوەی ١٥ ڕۆژ بە چەکی کیمیایی هێرشیان دەکەینەسەر ناوی کیمیایی نابەم، چونکە زانیاری نهێنییە، بەڵام دەڵێم بە چەکی کوشندەی نوێ دەتان بێژم، سوێند دەخۆمو دڵنیام، کە دەیان بەزێنم بە هەڤاڵە پسپۆڕەکانم وتووە، کە چەند دەستەیەکی تایبەتم لە ئەوروپا پێویستە بۆ کوشتنی ئەو تێکدەرانە بە پشتیوانی خوا ئەمەش دەکەم".

عەلی حەسەن مەجید لە کۆبوونەوەیەکی دیکەدا لەگەڵ ئەندامانی حزبی بەعس لە ١ی ئابی ١٩٨٨دا دەڵێت:" لە موسل دەرمان کردن بێ هیچ قەرەبووکردنەوەیەک خانوەکانمان تەخت کردنو وتمان بڕۆن، بەڵام ئەوانەی ئێستا جەنگاوەرن سەرەتا پێیان دەڵێین دەبێ لە ناوەندەکاندا نیشتەجێبن، بێ ئەوەی هیچ قسەو مشتو مڕێکیان لەگەڵ بکەین بەلێننامەکەیان پێ واژۆ دەکەم. پاشان لە هەرشوێنێکی دیکەدا بیان بینم سەریان پان دەکەمەوە، ئەم سەگانە هەردەبێ سەریان پان بکەیتەوە  بە چەکدارە کوردەکانی جاشو خەفیفە دەڵێت.

دەتانەوێت دانیشتوانی عەرەب بەم خەڵکە خوێڕی و هیچو پووچە زیاد بکەن؟ پێویستە ناوچەکەتان واتا موسل بکەینە عەرەب، بەڵام عەرەبی ڕەسەن نەک یەزیدی، کە ئیمڕۆ دەڵێن کوردین و بەیانی دەڵێن عەرەبین، یەزیدی بە کەڵکی چی دێن؟ بێگومان هیچ؟"

# ڕاپەڕینی خەڵکی هەڵەبجە

## ١٩٨٧/٥/١٣

ساڵی١٩٨٧ گەرمەی جەنگی عێراق ـ ئێران بوو، بارەگای سەرەکی مەڵبەندی یەکی یەکێتیی لە ئاوایی بەلەکجاڕی ناوچەی قەرەداغ بوو، ئەم مەڵبەندەش سەرپەرشتی تیپەکانی٣٧ی شارباژێڕ، ٣١ی سلێمانی، ٣٣ی سورێن، ٣٥ی کوڕەکاژاو، ٥٥ی قەرەداغ،٥٧ی سەگرمە، ١٧ی زمناکۆ، ٥٩ی حەمرین، ٥١ی گەرمیان، ٥٣ی شێروانە، تیپی تایبەتی مەڵبەندو تیپی ١٥ی شارەزوور، ١١ی هەورامانی دەکرد، هەر لەم سەروبەندەدا هاتووچۆ بۆ ناو ئێران و بردنی بریندار بۆ چارەسەرو هێنانی چەکو تەقەمەنی و بۆ کاروبارەکانی تر لە قەرداغەوە بۆ ئێران لێرەوە بوو واتە لە هاوارە کۆنەوە، کە باراگای تیپی ١١ی هەورامانی لێ بوو.

لەڕۆژی ١٩٨٧/٥/١٣ دا خەڵکی شاری هەڵەبجە دژ بە دامودەزگاکانی ڕژێمی بەعس لەو شارە ڕاپەڕین، هۆکاری ئەم ڕاپەڕینەش بەرپەرچدانەوەی بڕیاری ڕاگواستنی گوندەکانی دەشتی شارەزوور بوو، ڕژێم لە جێگەو ڕێگەی باوباپیرانیان دەری کردبوون بەبێ ئەوەی شوێنیان بۆ دابین بکات، ئەوەش بەپێی بڕیارێک، کە ڕۆژی ١٩٨٧/٤/٢٠ دەسەڵاتی وێرانکردنی کوردستان بە یەکجاری درابوو بە عەلی حەسەن مەجید. دامودەزگا سەربازییەکانی رژێم لە ڕۆژی ١٩٨٧/٥/١٠ ئاگاداری ٥٢ پەنجاو دوو ئاواییان لە شارەزوور کردووە، کە گوندەکانیان چۆل بکەن.

بنکەی تیپی ١١ی هەورامان لە سنوری بەری قەرەداغەوە بۆ دەشتی شارەزوورو هەڵەبجەو هەورامان تا سەر سنوور، تاکە بنکەی هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی بوو لایەنەکانی تریش لەو سنوورەدا بوونیان نەبوو.

ڕۆژی ١٩٨٧/٥/١٢ لەگەڵ کاک شەوکەتی حاجی موشیردا بە کارێک چووبووینە کرماشان، لە دەفتەری پەیوەندییەکان بووین لە ڕێگەی بێ سیمەوە ئاگادارکراین، بارودۆخی هەڵەبجە ئاڵۆزە، هەر ئەو ڕۆژە گەڕاینەوە بۆ ئاوایی هاوارە کۆن وئێوارەکەی هێزمان ئامادەکرد سەرلەبەیانی ڕۆژی

١٢|٥|١٩٨٧ بەرەو هاوارو تاوێرە بەڕێکەوتین، خەڵکمان نارد بۆ ناو شار، بۆ وەرگرتنی هەواڵ و زانیاری، لە ڕێگەی بێ سیمەوە پەیوەندیشمان گرت لەگەڵ مەڵبەندی یەک، زانیمان هەڤاڵ جەبار فەرمان بە هێزێکەوە لە قەرەداغەوە بەرەو هەڵەبجە بەڕێکەوتووە.

لەناو شاردا ڕۆژی ٥/١٢ خەڵک ڕاپەڕین و بەشێکی شاری هەڵەبجەو سەیدسادق، لەگەڵ هەردوو شارۆچکەی خورماڵ و سیروان دەستیان بەسەردا گیرا، ڕژێم کۆنترۆلی لەدەستدا چەکدارەکانی ڕژێم بەشێکیان هەڵگەڕانەوەو چوونە پاڵ خەڵک. هاوکات لەگەڵ ڕاپەڕینی ٥/١٣ لە هەڵەبجە ڕەواندزو شەقڵاوەش بۆ پشتیوانی لە خەڵکی هەڵەبجە ڕاپەڕین، بەڵام زوو ڕاپەڕینەکەی ئەو ناوچانە خامۆش کرا.

ئێمە نیوەڕۆی١٢|٥/١٩٨٧ پەلاماری ئاوایی هاوارماندا، کە سێ بنکەی جاشی سوکی لێ بوو، بەبێ تەقە خۆیان بەدەستەوەدا، پاشنیوەڕۆ بەڕێکەوتین بەرەو هەڵەبجەو هاوارمان بەجێهێشت، دوای گەیشتنمان بۆ ئاوایی تاوێرە لەوێ ماینەوە پەیوەندیمان کرد بە هەڤاڵانی ڕێکخستنی شارەوە، زانیمان کاک جەبار فەرمان گەیشتبووە ئاوایی قاجرو ڕۆژی دواتر هاتبووە ئاوایی تەپەکورە، بەڵام ڕای وابوو ئێمە نەچینە ناو شار، چونکە چوونی ئێمە بۆ نێو شار بیانوو دەداتە دەست ڕژێم تا بەوپەڕی توندوتیژیەوە ڕاپەڕینەکە سەرکوت بکات. لە نامەیەکیشیدا بۆ من داوای کردبوو ٥٠ پەنجا چەکی کلاشینکۆف بنێرم بۆ ڕێکخستنەکانی ناو شار، من چەکەکانم ئامادە کردو لەئاوایی هاوار دامنابوون، بەڵام ئەو کەسەی کە دەبوو ئەو چەکانە ببات نەیتوانی ئەرکەکەی ئەنجام بدات، شەو بەسەردا هاتوو لەتاوێرە ماینەوە.

بەیانی١٤|٥ ئاگادارکراین ڕژێم ڕاپەڕینەکەی دامرکاندووەتەوە، هەر ئەو شەوەو ڕۆژی دواتریش خەڵکێکی زۆر ڕوویکردە سنوورەکانی ئێران و ناوچە ڕزگارکراوەکان، ڕژێمیش جگە لەوەی لەکاتی ڕاپەڕینەکەدا دەیان کەسی کوشتبوو، شەوەکەشی لە نەخۆشخانەی هەڵەبجە بریندارەکان و ئەوانەی بەدیاریانەوە بوون گرتبوون و لە ئاوایی بامۆک زیندەبەچاڵی کردبوون، چەند کەسێک لەوانە لەنەخۆشخانە دەرچوون ڕزگاریان بوو.

لەنێوان پردی زەڵم و خورماڵیشدا کۆمەڵێک هاولاتی ناوچەی هەورامانیان گرتن و بردن لە نزیک ئۆردوگای شانەدەری نزیک بە سەیدسادق ئەوانیشی لەگۆڕی بەکۆمەڵدا زیندە بەچاڵ کرد، کە نزیکەی ٢٥کەس بوون، لە سەیدسادقیش چەندین کەسیان کوشت.

ڕۆژی دواتر حکومەت گەڕەکی کانی عاشقانی لە هەڵەبجەدا تەقاندەوەو چەندین کەسی گرتو بێسەرو شوێنی کردن. لە سەیدسادقیش هەردوو گەڕەکی حەسارو چەقانی رووخاند. بەهەزاران کەسیش شارو شارۆچکەکانیان جێهێشتوو چوونە ئێران و بوون بە پەنابەر، خەڵکێکی زۆر لە کەسوکاری پێشمەرگەو ڕێکخستن ڕوویان لەبنکەو بارەگاکانی تیپی١١ی هەورامان کردو دەیان کەسیش لە هاولاتی و ڕێکخستنەکانی یەکێتیی بوون بە پێشمەرگەو نەچوونە ناو ئێران، دەیان کەسیتر دواتر لە ئوردوگاکانی ئێرانەوە گەڕانەوە لامان و بوون بەپێشمەرگە، لەوانە هەڤاڵان جەمیلی مەلا مستەفا، قادر کۆکۆیی، عەبدولڕحمانی میرزا حەسەن.

مام جەلال لە بروسکەیەکدا بەخێرهاتنی کردن و داواشی لە من کرد بڕۆم بۆ دەفتەری پەیوەندیەکان لەئێران بۆپێشوازیان بیان هێنینەوەو لە تیپی ١١ی هەوراماندا ڕێکیان بخەینەوە. ئێمەش برووسکەکەیمان جێ بەجێ کرد. هەروەها سەدان چەکداری ڕژێم پەیوەندیان بە هێزەکانی یەکێتیی و پارتی و سۆشیالیستەوە کردو بوون بە پێشمەرگە، لەوانە: فەرماندەی دوو فەوجی سوکحەمە مۆریاسی و نەبەرد جاف لەگەڵ دەیان چەکداری تردا.

لەم ماوەدا ئەو بنکەو بارەگایانەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە گوندەکانی هاوارو دەرەتفێ بوون، هاوکاریی و یارمەتی زۆریان کردین وەک یارمەتی سیاسی و هاوکاری پێشمەرگانە، چ وەک ڕزگارکردن و پەنادانی خەڵک لە دەستی ڕژێم.

دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەی ناو شاری هەڵەبجە، ئەو ٥٠ پەنجا پارچە چەکە کلاشینکۆفەی کەبۆ ڕێکخستن دانرابوو لەگەڵ ٢٠ بیست پارچە کلاشینکۆفی تر کە ڕۆژی١٩٨٧/٥/١٣ لەهاوار پێشمەرگەکانمان گرتبوویان، کرانە ٧٠ حەفتا پارچە چەک و شەوی١٤ لەسەر١٥ ی/٥ بردمانە خوارەوە بۆ شارەزوور تالەوێوە ڕەوانەی قەرەداغ بکرێت، هەمان شەو لەئاوایی چۆڵکراوی تەپەکوڕەدا تەسلیمی هەڤاڵان کاک شەوکەتی حاجی موشیرو کاک

فەلاحی حەمەبۆرمان کردو خۆمان گەڕاینەوە بەرەو هاوار، زۆر هیلاکو ماندوو بووین بۆیە لەناو باخەکانی سەرکەنی تاوێرەداماینەوەو لێی خەوتین. بەیانی زوو پاسەوانەکەمان بەشلەژاوی بەخەبەری هێنام، پرسیم ماچییە؟ ووتی ئەوەتا لەسەر بەرزاییەکانی لای سەروومانەوە بەکۆپتەر هێزە دائەبەزێنن حکومەت چۆتەوە ناو هاوار، ڕێگەکەشیان لیگرتووین.

ووتم هەستن زوو بەدەستوبرد هەموو هەستاین و خۆمان کۆکردەوە، ١٠ دە پێشمەرگەم لەگەڵدا بوو لەگەڵ چەند سەربازێکی هەڵهاتوو، پێشمەرگەکان نەترس و ئازاو قارەمان هەڵبژاردە لەوانە شەهیدان، کەیکاوس کۆکۆیی، برایم بۆینی، نەوشیروان تەپەکورەیی و مەهدی وسەریاس هاواری. ئەوانەشیان ماون مەڤالان هاشم بۆینی،ئەکرەم ئەحمەد، خەلیل ڕێشاوی..... زووکەوتینە ڕێ تا بەرلە دوژمن بگەینە ناو هاوار، لەشوێنەکەی ئێمەوە بۆ ئاوایی تاوێرەو ملەی هەیشوور دوو کیلۆمەتر



سەرەوژوورو هەورازە، لەملەوە بۆناو هاوار سەرەو خوارو ئەویش نزیکەی کیلۆ نیوێک ئەبێت، بە کاتژمێرێک کەمتر ئەگەین ئەگەر تا ناو ئاوایی تووشی شەڕ نەبین. لەناو باخەکانی سەرکەن هاتینە دەر، کەوتینە سەر جادە سەرەو ژوور بووینەوە، سەیارەیەکی جێب لەتاوێرەوە بەرەو خوار هاتوو ئەڕوات بۆ هەڵەبجە، گەیشتە لامان شۆفێرەکەی یونس خەڵکی ئاوایی عەبابەیلێ بوو مامۆستا دلێری مەحمود ڕەزایشی لەگەڵدا بوو، دلێر ڕێکخستنی خۆمان بوو یونسیش کوڕێکی باش و دۆستمان بوو، ڕامگرتن بینیم زۆر بەپەلەن و ئەترسن، ووتم لەهاوارەوە هاتوون دەنگوباس چییە؟ ووتیان جاشو عەسکەر لەهەموو لایەکەوە دێنە خوارەوە بەرەو هاوار مەڕۆن دەرناچن، منیش ووتم بگەڕێرەوە کەمێک نزیکمان بخەرەوە، دەستیان بەهاوارو داد کرد، شۆفێرەکە

ووتی لە هاوار دەرچووم تائێرە لەمبەرو لەوبەرەوە تەقەم لێ ئەکەن، بەزۆر گەڕاندمەوە هەموو سوار بووین نەئەڕۆیشت ووتم سویچەکەم بەرێ تا تاوێرە ئەیبەم و لەوێ بۆت بەجێ ئەهێڵم، ووتی تائەوێ خۆم ئەتبەم ماوەیەک ڕۆشتینو لەتاوێرەش دەرچووین، نزیک ملەی هەیشوور بووینەوە لەبەرزاییەکانەوە تەقەیان لێکردین، دابەزین و ئەوانم گەڕاندەوە، تەقەکردنەکە دوور بوو گوللە ئەگاتوو ناگات، پێشمەرگەکان چەند دەشترێژیان بەرەو بەرزاییەکان کرد، سەربازەکانم ئەبینی خۆیان دەدا بەزەویا.

سەرەو خوار بووینەوە بەرەو هاوار بەشیوەکەدا، جاروبار تووشی دوورە تەقە ئەبووین، تاگەیشتینە ناو ئاوایی، لەوێ زانیمان بەرلەوەی هێزی حکومەت بێتە ناو هاوار چوە نێوان هاوارو هاوارەکۆنی گرتوە، ئێمە تازە لەهاواردا ماینەوەو سەنگەرمان گرت شەڕ دەستی پێکرد، شەڕی گرتنەوەی ئاوایی هاوار لەلایەن ڕژێمەوە لە ڕۆژی ١٩٨٧/٧/١٥، شەڕێکی گەورەو خوێناوی بوو، ئێمە نزیکەی ١٠ پێشمەرگەبووین لەگەڵ چەند سەربازی هەڵهاتوو، دەورمان گیرابوو، بە سەدان جاش و خۆفرۆش لەگەڵ چەندین فەوجی سەرباز، بە تۆپبارانی بەردەوام و دابێژانی ناوچەکە لەلایەن پۆلە فرۆکەکانەوە، ئەو داستانە بەخوێنی شەهید نەوشیران عەبدولمحەمەد تەپەکورەیی و برینداربوونی چوار پێشمەرگەو بریندار بوونی چەندین هاوولاتی کۆتایی هات[1]. ئەو بارەگایەی حزبی دیموکرات لەناو ئاوایی هاواردا

---

[1] – ئەمڕۆ ئێمە نزیکەی ١٠پێشمەرگە بووین و لە ئاوایی هاوار گەمارۆ درابووین، بەتەمابووین یان دڵخۆش بووین بەوەی ئەمان ووت ئێستا هێز فریامان ئەکەوێ، چونکە بە دووری دوو کیلۆمەتر لە خوارترەوە ئاوایی هاوارەکۆن هەبوو، کە جگە لەوەی نزیکەی ٧٠پێشمەرگەی خۆمانی لێبوو، تیپی ٣٧ شارباژێریش گەیشتبوون ولەوێ بوون، بەڵام مەجالیان نەبوو بەهانامانەوە بێن. ئەو هاولاتیانەی ئەمڕۆ لای ئێمە بریندار بوون ئەمانە بوون سەردار بەلخەیی، مەحمود محەمەد نادر زمناکۆیی دواتر بوو بەپێشمەرگەو ساڵی١٩٩١ شەهد بوو، فاتیح محەمەد نادر زمناکۆیی دواتر بوو بە پێشمەرگەو ئێستا کەم ئەندامی سەنگەرە. ئەمەجگە لە چەندین هاولاتی تر هەر هەمان ڕۆژ بریندار بوون. ئەمڕۆ باوکم بەپێشمەرگەیەکدا کۆڵێک فیشەک لە هاوارەکۆنەوە نارد بۆمان. ئەو پێشمەرگە هاتبوو، بەڵام لەرێ کۆڵەکەی فرێدابوو وە گەڕابوویەوەو ووتبووی بۆم بردن.

بەشداریەکی کاریگەریان کرد لە شەڕەکەدا، ئەتوانم ناوی شەمسەدین تینی بهێنم، کە شان بەشانی هەڤالانی ئێمە بۆ ماوەی ١٠ کاتژمێر شەڕیان کرد لە دژی هێزەکەی عێراق، ئێمە تەقەمەنیمان نەمابوو، ئەوان تەقەمەنییان خستە بەردەستمان. تیپی ٣٧ی شارباژێڕو بەشێکی هێزەکانی خۆمان لە هاوارە کۆن بوون نەیان دەتوانی بێن بە هانامانەوە، چونکە تەنیا ڕێگەیەکی سەختو لاپێ هەبوو دوژمن بە سەر ئەو ڕێگەشدا زاڵ بوو.

کەشەو داهات تەقە وەستا، سوپاو جاش ئەوانەیان لەچەند لایەکەوە نزیک بووبونەوە پاشەکشەیان کردوو چونەوە بۆ سەر بەرزاییەکان، لەم شەڕەدا چەندین سەربازو پلەداری ڕژێم کوژران لەوانە فەرماندەی فەوجی تێدا بوو، ئێمەش تەرمی شەهید نەوشیروانمان هێنایە خوارەوە، بریندارەکانمان کۆکردنەوە، ڕێگای هاوار هاوارە کۆن کرایەوە، مامۆستا جەماڵ و بەکرفەتاح و چەند فەرماندە کەرت و نزیکەی ٣٠ سی پێشمەرگەی ئەوان و خۆمان هاتن بەدەمانەوە، پرسیان چی بکەین لێرە لە هاوار بمێنینەوە یان بگەڕێینەوە بۆهاوارە کۆن، ووتم بەیانی حکومەت هێرش ئەکاتەوەو هاوار هەر ئەگرێتەوە باشترە بچین لەهاوارە کۆن دامەزرێین. مامۆستا جەماڵ و هەڤاڵەکانیان تەرمی شەهیدو بریندارەکانیان بۆ هەڵگرتین و هاوارمان بەجێهێشت. بەیانی بۆ نیوەڕۆکەی دووبارە کۆپتەرەکانی حکومەت هاتنەوە بۆسەر ئاسمانی ناوچەکەو دوای دابێژانی هاوارو دەوروبەری بە ڕۆکێت و تۆپ باران هێزەکانیان لای عەسری ڕۆژی ١٦|٥| هاتنەوە شوێنەکانی خۆیان. تیپی ٣٧ ی شارباژێر لە لای بانەوە بەناو ئێراندا بۆ پاوەو لەوێوە بۆ هاوارەکۆن هاتبوون بۆ پشتیوانی ئێمەو خەڵکی ڕاپەڕیوی شاری هەڵەبجە، کە ڕاپەڕینەکە دامرکایەوە هێزەکانی هەموولایەک

---

مەفرەزەیەکیش خۆیان ئامادە کردبوو وە پێیان ووتبوو وەرە لە کوێوە چوویت پێشمان کەوە با ئێمە بگەینە لای حەمە. ئەویش کەمێک ملەجەڕێ کردبوو، بەلام بە زۆر برێک هێنابوویان تاگەیشتبوونە گوللەهاوێژی سەربازەکانی سوپای عێراق تەماشایان کردبوو لەوێ کوڵەفیشەکەکەی فڕیداوە.

هەریەکەو گەرانەوە بۆ شوێنی خۆیان، تیپی ۳۷ نەگەڕانەوە بەناو ئێراندا، لەهاوارەکۆنەوە بۆ شارەزوورو لەوێشەوە بۆ قەرەداغ ڕۆیشتن

دواتر نامەیەکی ڕێکخستن، کە بۆ ئێمە هاتبوو لەلایەن هەڤاڵ ئەحمەد عەلی ئەحمەد کولکنی کە ئەوکات بەرپرسی هەموو ڕێکخستنەکانی یەکێتیی سنوری هەڵەبجە بوو، سەبارەت بە ۱۹۸۷/٥/۱۳ لەو نامەدا دەوری بەرچاوی ڕێکخستنەکانی یەکێتیی باس دەکات، کە چۆن هەر لە کاتی ڕاگواستنی گوندەکانەوە گرژی لە ناوچەکەدا دروست بووە، ئەوان خۆیان بۆ ئامادە کردووە بۆ خۆپیشاندان و ڕووبەڕووبونەوە. لەلایەن ڕێکخستنەکانی سلێمانییەوە دروشمیان بۆ هاتووە بۆ وتنەوەی لەنێو خەڵکە ڕاپەڕیوەکەدا.

لەنامەکەدا باسی ئەوە دەکات بەیاننامەیان دەرکردووەو ب لاوەیان کردۆتەوە، هەروەها شەوی ۱۲ لەسەر۱۳ / ۱۹۸۷/٥ لە لایەن یەکێتیی و حیزبی شیوعییەوە لە بلند گۆکانی مزگەوتی گەورە جامعەوە بانگەواز کراوە بۆ بەیانی خەڵک ڕاپەڕن، ناوی ئەو هەڤاڵانەی کە سەرمەشق بوون بۆ خۆپیشاندانەکە لە ڕێخستنەکانی یەکێتیدا دیاریکردووە.

ڕژێم زۆر بە دڕندانە ئەم ڕاپەڕینەی دامرکاندەوەو ژمارەیەکی زۆریش قوربانی لێکەوتەوە، هاوکات گەڕەکی کانی عاشقانیشی بە تەواوی بە دینامیتو بلدۆزەرو شۆفلەوە لەگەڵ زەویدا یەکسان کرد.

دروستکردن و دامەزراندنی بزووتنەوەی ئیسلامی، زادەی ئەم ڕاپەڕینە بوو لەناو وڵاتی ئێراندا، ئەو زانا ئایینیانەی، کە لە هەڵەبجە هەڵهاتبوون دروستیان کرد، بەتایبەتی هەردوو مامۆستاو کەسایەتیە ناسراوەکان: خوا لێخۆش بووان مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیزو مامۆستامەلا عەلی عەبدولعەزیز.

## بەڵگەنامەکان لەبارەی ١٩٨٧/٥/١٣

لە نوسراوێکی بەڕێوبەرایەتی ئەمنی هەڵەبجە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی سلێمانی بە ژمارە ٣١٢٤ لە ڕۆژی ١٩٨٧/٥/١٤دا، ئاماژە بە بڕیاری ژمارە ٢٨٥٨ دەکات، کە عەلی حەسەن مەجید فەرمانی کوشتنی بریندارەکانی داوە، کەژمارەیان لەونوسراوەدا ١٧ کەسە، هەندێکیان ژنو مندالن. چەند کەسێکیشیان هەرچەندە ناویان لە لیستەکەدا هەیە بەڵام بەرلەوەی مەفرەزەی ئەمن بچێت بۆبردنیان بۆ کوشتن دەربازبوون و ئێستا لەژیاندا ماون وەک: فریشتە حەمەئەمین، جەمیلە ڕەشید، چنوور مەحمود قادر، زلیخا جەمال عەبدولقادر....تاد.ئەمانە لە نوسراو فەرمانەکەی حکومەت و عەلی حەسەن مەجید دا بۆ کوشتن ناویان هەیە. دیارە دەرکردنی فەرمانەکەش پەلەپەل و لەسەر ڕاپۆرتی چەند خۆفرۆشێک بووە، چونکە چنوورخان دەڵێت ڕاستە من لە خۆپیشاندانەکەدا دەورم هەبووە، بەڵام نە بریندار بووم و نە لەناو نەخۆشخانەکەشدا بووم.

# ئاماری قوربانیانی مەدەنی
# لە١٩٨٧/٥/١٣ی هەڵەبجەو دەوروبەری

| ز | ناوی سیانی | ز | ناوی سیانی |
|---|---|---|---|
| ١ | مەریوان حەمە ڕەشید | ٢٥ | محەمەد عەزیز بارام |
| ٢ | سدیق مستەفا معروف | ٢٦ | میدیا عوسمان عەلی |
| ٣ | حەمەشەریف حەمەعەلی | ٢٧ | جەمال حەمید فەرەج |
| ٤ | حمزە سلێمان عوسمان | ٢٨ | فریشتە حەمەئەمین _ ماوە |
| ٥ | فاتمە سەعیدحەمەکەریم | ٢٩ | حەسیبە عەبدوڵلا قادر |
| ٦ | هیاس لتیف ڕەحیم | ٣٠ | حەیدەر مەحمود ئەحمەد |
| ٧ | حەسەن ئەسعەد مەحمود | ٣١ | زلێخاجەمال عەبدولقادر_ ماوە |
| ٨ | عومەر عەبدوڵلا قادر | ٣٢ | میدیا جەمال عەبدولقادر |
| ٩ | محەمەد مەحمود | ٣٣ | بەهمەن عەبدوڵلا جعفر |
| ١٠ | عبدالرحیم حەمەڕەشید ئەمین | ٣٤ | ئیبراهیم ئەحمەد عەبدولقادر |
| ١١ | عەبدوڵلا حەمەڕەشید ئەمین | ٣٥ | فەرەج عەبدوڵلا عەلی |
| ١٢ | سلیمان عەلی عەبدوڵلا | ٣٦ | زوبێدە عەبدولڕەحمان مستەفا |
| ١٣ | عوسمان عەلی کەریم | ٣٧ | منیجە عەبدولقادر |
| ١٤ | حەمەکەریم سالح مەحمود | ٣٨ | مستەفا عەبدولقادر |
| ١٥ | ئەحمەد شێخ محەمەد | ٣٩ | فاتمە حەمە ئەمین عەبدولقادر |
| ١٦ | عوسمان عەلی ئەحمەد | ٤٠ | عبدالصمد محەمەد مەحمود |
| ١٧ | عەبدولقادر ئەحمەد قادر | ٤١ | یاسین محەمەدئەمین حەمەکەریم |
| ١٨ | سەرکەوت عەبدوڵلا جافر | ٤٢ | سەرکەوت محەمەد حەمە لاوە |
| ١٩ | فهیمە عەبدوڵلا | ٤٣ | نوری محەمەد حسێن |
| ٢٠ | جەلال فەتاح قادر | ٤٤ | نادر حەمەصالح مەجید |
| ٢١ | عیرفان فەتاح مستەفا | ٤٥ | عبدلله قادر مەولود |
| ٢٢ | کەژال فەتاح مستەفا | ٤٦ | جەمال حەمید فەرەج |
| ٢٣ | عەلی عەبدوڵلا فەتاح | ٤٧ | حەپسە مەیکە عەلی عەزیز |
| ٢٤ | ئیسماعیل عەبدوڵلا قادر | ٤٨ | سەرکەوت عەبدوڵلا جعفر |
| ٤٩ | هادی حەمید فەرەج | ٧٢ | مەجید سۆفی کەریم |
| ٥٠ | عومەر حاجی ئەحمەد | ٧٣ | حەسەن سەعید |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٥١ | پیرۆزە خێزانی مەحمود | ٧٤ | فازیل محی الدین |
| ٥٢ | فەرحان ئەحمەد مارف | ٧٥ | حاجی سالح |
| ٥٣ | تەیب سلیم حەمە رەشید | ٧٦ | زینەدین سالح |
| ٥٤ | عبدلله ئەحمەد عەلی | ٧٧ | ئەحمەد ئیسماعیل |
| ٥٥ | فەرەج عبدلله عەلی | ٧٨ | جەمال عەلی رەزا |
| ٥٦ | ئەحمەد عەلی ئەمین | ٧٩ | عوسمان شەمسەدین ئیبراهیم |
| ٥٧ | حیدر محەمەد ئەحمەد | ٨٠ | ئاراس محەمەد خوەرشە |
| ٥٨ | جەمال حامد سالح | ٨١ | ئازاد حسێن مەحمود |
| ٥٩ | سەلام حەمەئەمین عەلی | ٨٢ | حاجی عەبدوللا |
| ٦٠ | حەمەخان ئەحمەد شەریف | ٨٣ | سامان شمس الدین ئیبراهیم |
| ٦١ | منصور حەمەعزت | ٨٤ | حەمەنەجیب حەمەخان |
| ٦٢ | عومەر شمس الدین ئیبراهیم | ٨٥ | وینس رحیم عەبدوللا |
| ٦٣ | عەبدوللا مەحمود عەزیز | ٨٦ | رحمان قادر محەمەد |
| ٦٤ | حەمەکەریم حەمەشەریف | ٨٧ | صالح محەمەد فتح الله نصرلله |
| ٦٥ | عومەر عەبدولرەحمان عەبدوللا | ٨٨ | سەرکەوت محەمەد حەمە لاوە |
| ٦٦ | عەلی عەبدولرەحمان عەبدوللا | ٨٩ | یاسین محەمەد ئەمین |
| ٦٧ | مەحمود کەریم فتاح | ٩٠ | ئەحمەد لەتیف |
| ٦٨ | محەمەد صالح فتاح | ٩١ | زەینەب حامد محەمەد |
| ٦٩ | لەتیف ئەحمەد رەشید | ٩٢ | د. جەمال خەلکی سلێمانی |
| ٧٠ | سابیر رۆستەم | ٩٣ | چنورمەحمود قادر_ماوە |
| ٧١ | حەمە رەشید علی عەزیز | ٩٤ | جەمیلە رەشید_ماوە |

**تێبینی:** هەوڵی زۆرماندا ئەم ئامارە تەواوو رێکو پێک بێت، بەڵام نەمان توانی، بۆیە لەوبارەوە داوای لێبوردن لە کەسوکاری قوربانیانی کەیسی راپەرینی ١٩٨٧/٥/١٣و کیمیابارانی هەڵەبجە لە ١٩٨٨/٣/١٦ دەکەین. وەزارەتی شەهیدان و دەزگا پەیوەندیدارەکانی تایبەت بەم دۆسییانە تا ئێستا نەیان توانیوە ئامارێکی راست و دروستیان لەبەردەستدا بێت تا سوودی لێوەربگیرێت.

## بۆ ئەم سەردەمە پێویستە

لەپایزی ١٩٨٧ دا لەهاوارە کۆن بووین، کاک قادر کۆکۆی بۆتە فەرماندەی تیپی ١١ی هەورامان زۆر پەلەی بوو چالاکیەک بکات، پێکەوە چەند کۆبوونەوەیەکمان کرد لەسەر شوێن و کات وجۆری چالاکیەکە، چەند پێشنیارێکی ئەکرد من بەگرانم ئەزانی وەبەڕاستیش پێشنیارەکانی خۆخستنە بەر مەترسی بوو، لەم شۆڕشەدا زۆر کوڕی ئازام بینیوە، ئەم پیاوە لەوتەمەنەدا لەو کوڕە ئازاو نەترسانە بوو. ئەیوت نابێت تۆیشم لەگەڵدا بێت ئەبێ چالاکیەک بکەم دەنگ بداتەوە، ئەمووت بۆ منت لەگەڵدا نەبێت، ئەیووت ئەگەر تۆمان لەگەڵدا بێت چالاکیەکە بەناوی تۆوە ب لاوە ئەبێتەوە من ئەمەوێت خۆم ئەو چالاکیە بکەم، رێک کەوتین لەسەر پەلامار دانی سێ رەبیەی پشتی کۆساوا لەنزیک گوندی سازان، ئەم رەبیانە سەنگەری پێشەوەی سوپای عێراق بوون لەبەرامبەر سوپای پاسدارانی ئێران لە بەرزاییەکانی مەرەخێڵ و چیای گوزیل، ئاوی رووباری سیروان لەنێوان ئەم دووسەنگەرە دژبەیەکەدا گوزەر ئەکات. هەرچەندە نەئەبوو ئێمە بچینە سەر هێزەکانی عێراق لەوشوێنانەدا کەحیزبی دیموکراتی ئێران نزیکی بێت لێیانەوە، حیزب لەگوندی رێشاو بوون نزیک بوون لەم رەبیانەوە، ئەمە رێکەوتنی نێوان هەردوولامان بوو. بەڵام لەبەر ئەوە کاک قادر پەلەی بوو، لەوکاتەشدا شوێنی لەوە مسۆگەرتر نەبوو لەسەر ئەمە ساغ بووینەوە.

لەسەر کات و ژمارەی پێشمەرگە وتووێژمان کرد، نزیکەی هەفتا پێشمەرگە دیاری کران، بەرپرسەکانیان هەڤاڵان ئەکبەر ئێناخی، مەهدی بچکۆل، رەفعەت ئێناخی، ئەکرەم ئەحمەد، کەیکاوس کۆکۆی هاشم بۆینی، مامەیارەی ئێناخی مەهدیە ریشە، حەکیمی مەلاساڵح وعومەری کوێخا وچەند کەسی تر کەناوەکانیان نایەنەوە یادم، داوای بوردن دەکەم لەو فەرماندەیەی گەر بەشداری ئەم چالاکیە بووەو ناوەکەیم لەیاد نەبووە. هێزەکەمان لەهاوارە کۆن و گریانەوە گوستەوە بۆ ئاوای بۆین، سەر لەئێوارەیەک کاک قادریش رۆیشت بەدوایاندا من لەهاوارەکۆن مامەوە، هەر ئەوشەوە پەلاماری

ڕەبیەکانیان دابوو. قارەمانانە هەرسێ شوێنەکیان گرتبوو، دەستکەوتیان چەند پارچە چەکو بڕێک تەقەمەنی بوو، سێ جەیشی شەعبی کوژرابوون و سێیش بە دیل گیرابوون پێشمەرگەش سەلامەت بوون.

دوای ماوەیەک دیلەکان بەمەفرەزەیەک هەڤاڵ حەکیمی مەلاسالح بردنی بۆ مەڵبەندی یەک، منیش لەگەڵ هێزێک لەدیوی ئێرانەوە چوومە بناری چیای هەسوون بۆسەر کانی قەڵەخانی، بۆگواستنەوەی هەندێک چەک و تەقەمەنی بۆ قەرەداغ. لەم کاتەداو بەر لەوەی بچمە ئەوبەر، هەڤاڵ جەمالی عەلی محەمەد هات بۆلام ووتی کاکە وریای خۆت بە، ووتم بۆ چی بووە من هەر وریای خۆمم، ووتی شتێکت پێ ئەڵێم، بەلام مەیکە بە هۆسەو هەر بۆ زانیاری خۆت، ووتم باشە بەسەر چاو، وتی کۆمەڵێک لەم ناوەن خەریکی تەقریر نووسین دروست کردنی تۆمەتی خراپن لەسەر تۆ، منیش پێکەنیم و ووتم ئەزانم هیچ نییە، ووتی چی ئەزانی؟ ووتم مام وریا هاواری عارەق ئەخواو لەم لاوە لەولا قسە لەسەر برادەرەکانمان ئەکات، دوای ئەوە بەری ئەدا پەشیمان ئەبێتەوە، ئەوە ئەڵێیت؟ ووتی نا، ووتم ئەی چی؟ ووتی تۆ وەعدم بەرێ باسی من نەکەی پیلانت لەسەرە بۆت باس ئەکەم، منیش بەپێکەنینەوە کاک جەمال خۆ من سەدام نیم پیلانی چیم لەسەرە؟ ئێ منیش ووتم بەگۆڕی گریبانەی باست ناکەم لای کەس و هیچیش ناڵێم، جا تائێستا کەئەم بابەتە ئەنووسمەوە ئەم قسەی کاک جەماڵم باس نەکردووە لای کەس.

ووتی من ئەزانم تۆ پێشمەرگەو کادرێکی دڵسۆزوو چەندە ماندوویت، چەند کەسێک بەناوی ڕێکخستنەوە تائێستا چەند تەقریریان بۆ مەڵبەند بۆ لای کاک عومەر فەتاح لەسەر نووسیویت، من برادەریانم شت لەمن ناشارنەوە پێشم وتوون: یەکەم ئەوشتانەی ئێوە دوورن لەڕاستیەوە دووەم دژایەتی کردنی حەمەی حەمەسەعید ئاسنی سارد کوتانە، پێشم وتون ئێوە لە قەرەداغەوە راتان کردووە هاتوون بۆ ئێرە لەگەڵ ماڵومناڵدا بێخەم پاڵتان لێداوەتەوە، لەخۆتانی تێک مەدەن. ووتم کاک جەمال کێن ئەوانە؟ ووتی نازانی؟ ووتم نە بەسەری مام جەلال. بشزانم هیچ ناڵێم چونکە هیچ شک نابەم من ئیشی خۆم ئەکەم هەرکەس هەرچی ئەڵێت بابڵێت. ووتی سۆرانی گەرمیان سەردەستەیانە، کەمێک بێدەنگ بووم، ووتی چییە بۆبێدەنگ بووی؟

ووتم وەڵا سۆرانم بەکادرێکی تێگەیشتوو بەویژدان زانیوە خۆشیشم ئەوێت نەم زانیوە ئاوایە.

دوای گەیشتنمان بۆ بنار چیای هەسوون لەنزیک حەوشی مارانی لەسەر کانی و ئاوی قەڵەخانی بنکەیەکی سوپای پاسدارانی سەربە یەکەی قەرارگای ڕەمەزان چێکرابوو، لەوێ پشوومان دا، ڕۆژی دواتر ڕێک کەوتین هێزەکەی ئێمە بارەگا بهێنێتە ئەم دیو بۆبنار چیای هەورامان لەهانە نەوە بنکە دابنێین، تیپی ۳۳ ی سورێن تازە تەشکیل کرابوو هەڤاڵ کاک کەماڵ شاکر فەرماندەی بوو، ئەوان لەدیوی ئێرانەوە لەکانی قەڵەخانییەوە چەکو تەقەمەنییەکان بەباری ووڵاخ بهێننە دیوی عێراق و لەهانەنەوە ئێمە لێیان وەرگرین، کانی قەڵەخانی ئەکەوێتە نێوان شاری هەورامانی تەخت و شارەدێی دزلی لەناوچەی مەریوان، کانی هانەنەوەش ئەکەوێتە پشتی ئاوایی سەرگەت لەنێوان شارۆچکەی بیارەو خورماڵدا.

ئێمەش لەهانەنەوەوە بەشەودا چەک و تەقەمەنییەکەمان ئەگواستەوە بۆ بێشەلانەکانی ئاواییەکانی قاجرو تەپەسەرەقوڵە لەدەشتی شارەزوور، لەوێشەوە تیپی ۱۵ ی پانزەی شارەزوور ئەیگواستەوە بۆ قەرەداغ.

هەرچەندە ئەم ئەرکە قورس و جێگەی مەترسی بوو بەڵام ئەوەندەی لە ئەستۆی ئێمە بوو بە ئاسانی جێبەجێمان کرد، بەم شێوە: لە قەڵە خانی پێویستی بارەگاو نزیکەی ۲۰ بیست قاترمان وەرگرت، قاترەگەل بارکران وکەوتینە ڕێ، کام ڕێگا؟ ڕێگایەکی سەرەوژوور بۆسەرلوتکەی چیا لەودیو سەیری سەرلوتکەی چیاکە ئەکەیت وائەزانی نووساوە بە ئاسمانەوە کە ئەگەیتە سەر قوڵلەی چیاکەو بەدیوی عێراقدا سەیری خوارەوە ئەکەیت ترس وسام ئەتگرێ، ئەمە ڕێگاش نەبووە پێشتر، لەشەڕی عێراق ئێران دا هاتووچۆی پاسدارو قاچاخچی کردویانە بەڕێگا، ئێمە جارێکی تر لەم ڕێگانادەینەوە، چونکە تیپی۳۳ سورێن بارەکانمان لە قەڵەخانییەوە بۆ ئەهێننە هانەنەوە، ئێمە لەهانەنەوەوە بۆ شارەزووری ئەگوازینەوە، بەڵێ کاروانەکە کەوتنە ڕێ، سەرەوژوورو پێچاوپێچ بۆسەرلوتکەی چیای هەسوون، هەر قاترو بارێک پێشمەرگەیەک لێی بەرپرسە بیگەێنێتە جێ، کاتێک خۆم گەیشتمە سەرخاڵی لووتکەی چیاکە ئەوشوێنەی کە لەخوارەوە وادەزانی بەئاسمانەوە نووساوە، ئێرە واتە ئەم قوڵلە جیاکەرەوەی خاڵی سنووریشە، چەند گام

بەپێڵلە بەڕووی عێراق دا هاتمە خوار لەوێوە سەیری پانتایی دەشتی شارەزوورو دەورووبەری ئەکەیت شارەزوور وەک مەنی دەریایەک ئەنوێنێ، بەرزاییەکانی دەوروبەریشی لەچیای شنرۆێوە بەرەو باشور لووتکەکانی بالانبۆ و نوەر لەم بەرو بێژەل و شەمێران و زمناکۆ لەوبەرو بەرەولای باشوری ڕۆژ ئاوا، لەوبەرتر بەرزاییەکانی قەرەداغ و ئەمبەرو ئەوبەری سلێمانی سەریان لە(ئوفوق) ئاسۆدا لەگەڵ ئاسمان لێکی داوە. باخە گوێزەکانی هانە نەوەو هانە تووتمەو شەڵوان درێش لەبەر دەمتا وەک چەند تاکە درەختێک ئەنوێنن.

لەنیوەی ڕێگا سەرەوخوارەکەدا گەشتم بەپێشمەرگەیەک جگە لەقاترەکەی خۆی بەبارەوە قاترێکی تری بێباری پێبوو، پرسیم ئەوقاترە بۆباری لەسەر پشتنییە کواوبارەکەی؟ پێم وابوو کابرا دووقاتری هێناوە یەکێک بەبارەوە و ئەویتر بێبار بۆ سواری خۆی، کەچی لەوەڵامدا ووتی ئەوە هی ئەو بەرازەیە خۆی بارەکەی بەکۆڵ بردو قاترەکەی بەخالی کردە ملی من. مەبەستی لە هاشم



هانە ئوشان پایزی ١٩٨٧ لەراستەوە حەمدییە چکۆل، تۆفیق
ڕیشە سەلاح ... جەمەعەلی ئازاد عەبدلا شەپۆل پانۆکی وەفالانی تر

بۆینی بوو، هاشم عەبدل ڕەحمان بۆینی کەئێستا کەم ئەندامەو لەهەڵەبجەدا ئەژی پێشمەرگەیەکی قارەمان لەگەڵ ئەوەشدا پاڵەوان بوو. دەرکەوت ئەوەندە بارەکەی کەوتوەو باری کردووەتەوە، ڕاست کردنەوەو بەرودوا پێکردن وەڕسی کردووە، لەبەرئەوە بارەکەی لەقاترەکە کردووەتەوە و خۆی بەکۆڵ بردبویە خوارەوە.

دوانیوەڕۆیەکی درەنگی ئەورۆژە پاشرەوی کاروانەکە گەیشتینە سەرکانی وئاوەکە هانەنەوە لەبن دارگوێزەکاندا ب لاوەیان کردو بارو بارخانە داگیران، لەگەڵ چەند هەڤاڵێکدا هاتینە خوارتر بۆدیاری کردنی شوێن بارەگا، جێگەیەکی باشمان دیاری کرد، کانی وئاوێک بوو بەناوی هانە

تووتمە، هانەتوتمان لەنێوان ئاوایی هانەی دن وهانە نەوەدایە، شوێنێکی زۆر خۆش بوو لەسەر ئەستێڵی ئاوەکە لەبن سایەی دارگوێزەکاندا هەروەک لەوێنەکەدا دیارە لیرە چەند ڕۆژ حەواینەوە، ئینجا ناردم بۆ هەڵەبجە بەدوای دووکەسدا کەشارەزای بار بارکردن وولاخدارو قاچاخچی بوون، هاتن بۆلامان پێم وتن ئەبێ هاوکاریمان بکەن بۆ جیبەجێ کردنی ئەرکێک، ئێوە دۆست و دڵسۆزن هاوکاریمان بکەن چیش داوا بکەن بەسەر چاو، وتیان ئامادەین. بۆم باس کردن هەر دووشەو جارێک دە قاتر بار ئەکەین، ئەبنە دوودەستە دەستەیەکیان کاک ئەکبەر ئێناخی سەرپەرشتی ئەکات دە پێشمەرگەی لەگەڵە دەستەی دووەم کەیکاوس کۆکۆی سەرپەرشتی ئەکات ئەویش دە پێشمەرگەی لەگەڵە، کاک ئەکرەمیش لای من ئەبێتو جارجاریش ئەکبەروکەیکاوس ئەگۆڕێت، ئێوە هەریەکەو لەگەڵ دەستەیەکیان ئەبن لێرەوە تا ئەچنە جێگەی مەبەست، بۆ سەرپەرشتی کردنی قاترگەل وبارەکانی سەر پشتیان، وتیان زۆرباشە هەر کاروانێک کە ئەگەینە جێ پێشمەرگەکان لەوسەرەوە پێویستیان بەئێمە نییە خۆیان بگەڕێنەوە چوار قاتر بۆ ئێمە بەجێ بهێڵن ئێمە ئەیانبەینە هەڵەبجەو شەوی دواتر سێ بار قاچاخ ئەهێنین بۆ خۆمان و بارێک ئازوقەش بۆ ئێوە ئەهێنین ئازووقەکەش لەسەر خۆمان. ئێمەش ڕازی بووین ودەستمان پێکرد بەم شێوە:

لەهانەنەوە بەر لەتاریک بوون بارەکان بار ئەکران، وردەوردە ئەهاتنە خوارەوە، لەنزیک بارەگاکەمان لەسەر هانە تووتمە ئەوەستان تاتاریکی ئەکرد، ئینجا بەپەنا ئاواییە چۆڵو وێران کراوەکانی هانە دن، سەرگەت، گوڵپ داو لەنێوان ڕەبیەکانی سوپای عیراق و بەتوولە ڕێیەکی باریک و پاککراوە لەمین ئەهاتنە خوارەوە جادەی گشتی خورماڵ بیارەیان ئەبڕیو ئەکەوتنە پانتای دەشت، لەوێشەوە بەناو ئاواییە چۆلکراوەکانی گومەلار، شەشک و تەپی سەفاکاندا ئەچوون و جادەی سەرەکی هەڵەبجە –سەیدسادقیان ئەبڕی و ئەگەیشتنە ناو بێشەلانەکانی چەمی زەڵم لەنێوان ئاواییەکانی تەپەتۆڵەکەو قاجردا لەنزیک تەپەسەرە قوڵەو کشەیەری دا تەسلیمی هەڤالانی تیپی پانزە ئەکرا، یان ئەیان شاردنەوە، دواتر بەناونیشان ئەهاتن ئەیانبرد بۆ قەرەداغ.

ماوەی یەک مانگ بەم شێوە خەریک بووین، نزیکەی هەشت کاروانمان گوللەی کاتیۆشاو گوللەهاوەنی جۆراو جۆر گواستنەوە، لەکۆتاییدا

حەوت بار کەلەوپەلو چەک و تەقەمەنی مەجلسی ئەعلا مابوو لەو حەوت بارە بارێکی دەمانچەو گوللە دەمانچە بوو، چەند کەسێکی خۆیان لەگەڵ کاروانەکەدا بوون، ئەمە ئەبوو بەسەلامەت بگاتە قەرەداغ لەوێوە خۆیان ئەیانبردە دەربەند دەرەوار هادی عامری خۆی لەوێ بوو بنکەو بارەگایان هەبوو، بۆیە هەڤالانی خۆمان لەگەڵ قوەتێک گەیاندنیانە جێ، بەداخەوە ئەوەندەی نەبرد شا لاوەی ئەنفالەکان گەیشتە ئەوناوچە، دوای شەڕێکی قورسی هێزی پێشمەرگە لەگەڵ سوپای دڕندەو بێشوماری سەربازو جاش لەهەموو قۆڵەکانەوە هێزی پێشمەرگە پاشەکشەی کرد، فەرماندەکانی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان ئاگاداری هادی عامری و مەجلسیان کرد بۆ ئەوەی ئەوانیش پاشەکشە بکەن و ناوچەکە بەجێ بهێڵن، بەلام وەلامیان ئەوەبوو ئەبێ فەرمانیان بۆ بێت، بەبێ فەرمان ناتوانن پاشەکشە بکەن، ئەوە بوو تووشی شەڕێکی سەخت و خوێناوی بوون و نزیکەی ٦٠ شەست کەسیان شەهید بوون.

لەو کاتەدا کەسەر گەرمی ئەم ئەرکە بووین کاک حەکیمی مەلا سالح لە قەرەداغەوە لەگەڵ مەفرەزەیەکدا گەرابوونەوە، لەشارەزوورەوە نەچووبونەوە بۆ هاوارەکۆن سەر کەوتنە سەرەوە بۆ بناری هەورامان بۆ لای من، ئەم مەفرەزە سێ سەربازە دیلەکەیان برد بوو بۆ مەڵبەند ئەوانەی لە هەڵمەتەکەی کاک قادر کۆکۆی و هەڤالانی پێشمەرگەدا لەنزیک سازان دیل کرابوون. حەکیم لەگەڵ هەڤالانی خۆمان کەلەشارەزوور بەیەک گەیشتبوون سەر لەبەیانییەک گەیشتنە هانە تووتمە، پاش حەوانەوەو نانخواردن، حەکیم بردمیە لاوە دوای گێرانەوەی چۆنییەتی سەفەرەکەیان باسی ئەوەی کرد کەهەڤالانی مەڵبەند زۆر ڕازین لەتۆ هەردوولایان هەم کۆمەڵەو هەم شۆڕشگێران بەلام، ئێ بەلام چی، ووتی کاک عومەر فەتاحم بینی باسی ئەوەی کرد ووتی زۆر تەقریر لەسەر حەمە دێت بۆمان، بەدوادا چوونمان کردووە شتەکان شەخسین حەزئەکەم تۆ کە ڕابەر سیاسی و هەم کۆمەڵەشی وە لەگەڵ ئەویت، بۆم باسبکەیت حەمەی حەمەسەعید چۆنەو ئەو برادەرانە چیان لێ ئەوێت؟ ووتی منیش وتومە کاک عومەر بەڕاستی هیچی وانییە ئەوبرادەرانە غەدری لێ ئەکەن ئەیانەوێت پێش مەرگەو کادرەکانی لێ هەڵگێڕنەوە بەلام کەس بەگوێیان ناکات، کاکە حەمەی حەمەسەعید،

پێشمەرگەی سەرەتای شۆڕشە، تەمەنی ١٥ پانزە ساڵ بووە چۆتە دەرەوە، دواتر لەساڵی ١٩٧٩ دایک و باوکو خوشک و براکانی هاتوونتە دەرەوە هەمویان پێشمەرگەن، کۆمەڵەن چالاک و دڵسۆزن لەو سنورەدا ئەوەی بەو ئەکرێ بەکەسی تر ناکرێ، ئەوبرادەرانە گێچەڵی پێ ئەکەن و ئەویش حیسابیان بۆ ناکات. ئەمە تا ئێرە من نازانم ئەو برادەرانە مەبەست لە کێیە، پرسیم کاک حەکیم برادەران کێن؟ ووتی کاک عومەر کادیرو بەرپرسێکی لەسەرەخۆ وتێگەیشتوە بەڕاستی بەویژدانیشە، نامەیەکی بۆ نووسیون پیشانت ئەدەم بیخوێنەرەوە بەڵام باهەر خۆت بزانی و لای کەس باسی مەکە. دیارە نامەکەی کاک عومەر نهێنییە، حەکیم هەڵیپچڕاندوە و خوێندویەتیەوە. منیش نامەکەم خوێندەوە، باسی وەزع و هەندێک ڕێنمای و وەڵامی چەند خاڵێکە، لەجێگەیەکدا ئەڵێت: واز لەو کوڕە بهێنن بۆ ئەم سەردەمە پێویستە. منیش نامەکەم دایەوە دەست کاک حەکیم و بەگاڵتەوە پرسیم ئەی ئەو کاتە کەیە ئیتر من پێویست نابم؟ ئەویش ووتی گوێ مەدەرێ، ئەو دەستیکرد بە پێچانەوەی نامەکە تاوەک خۆی لێبکاتەوە و نەزانن هەڵپچڕاوە، منیش قسەکانی کاک جەماڵی ئەلی محەمەد جەماڵی کەبابچیم هاتەوە یاد.

ئەوماوە کەلەو ناوچە بووم ناردم مامۆستا جەوهەر ستار لەهەڵەبجەوە هات بۆلام چەند ڕۆژێک مایەوە جەوهەر هاوڕێی منالی و قوتابخانەم بووە، مامۆستا شاهۆی مام ڕەئیس و خاڵۆ زۆرابیشم لە دزلێو دیوی ئێرانەوە هاتبوون و ئەوماوە هەر لام مانەوە، جارجار برادەرانی پارتیش لەلای کەرەچاڵو وشکەناوەوە ئەهاتن بۆسەردانمان، دوای تەواو بوونی ئیشوکارەکانمان بارەگاکەمان بەهەموو کەلوپەلەکانییەوە بەجێهێشت بۆ هەڤاڵانی تیپی ٣٣ سورێن و خۆمان گەڕاینەوە بۆ ئەمبەر واتە بەری چیای شنروێ.

لە گەڕانەوەدا ئەبینە میوانی سوپای ڕزگاری، سوپای ڕزگاری کێیە؟ موریدو مەنسوبانی ڕێبازی نەقشبەنی کە خوالێخۆش بوو شێخ عوسمانی بیارە یان دوورۆ رابەرایەتی ئەکرد، وە لەسەردەمی محەمەد ڕەزا شای ئێراندا لە جێگەیەک بەناوی مەحمود ئاوا نزیک بە ئاوایی دوورۆ لەسەوڵ ئاوای سەر بەناوچەی مەریوان ئەژیا، لەدوای ڕووخانی ڕژێمی شا و هاتنە سەرکاری ئیمام خومەینی، کۆچی کردو گەڕایەوە بۆ عێراق سەرەتا لەبیارە

جێگیر بوو، لەشەڕی عێراق ئێراندا کوڕەکانی بۆ موریدو مەنسووب و شوێن کەوتوانی تەشکیلاتێکی چەکداریان دروست کرد بەناوی سوپای ڕزگاری، بەدژی ئێرانی تازە.

گاگەل و ئاژەڵ و بنەرانو ڕەوە ئەسپ مایین گەلی ماڵی شێخ لەئاوایی خارگێلانی ناوچەی هەوراماندا بوون، دەیان خێزان وبنەماڵە خەریکی بەخێوکردنیان بوون، ئاوایی خارگێلان کەوتوەتە سەر ڕێگای هاتنەخوارەوەی پێشمەرگە لەچیاو چەموو دۆڵەکانی هەورامانەوە بۆ دەشتی شارەزوورو ناوچەکانی تری وەک شارباژێرو قەرەداغ، خارگێلان لەئاواییە چۆڵ کراو قەدەغە کراوەکان بوو. ئاوەدان کردنەوەی لەلایەن سوپای ڕزگاریەوە بۆ ئێمە بووبووە وێستگەیەکی حەوانەوەو پشوودان، جاجاریش پێشمەرگە لەم سەرو لەوسەرەوە چەند سەر بەرخێکمان ئەبرد بۆ خواردن، هەربەخزمەت کردنەکە رازی نەئەبووین.

بابێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، ئێوارە دوای تاریک بوونی هەوا لەهانە تووتمەوە کەوتینە ڕێ، پێشتر لەلێڵەی بەرلەتاریک بووندا چەند پێشمەرگەیەکی بەدەستوو بردم ناردبووە دارو قەبرستانەکەی باواناوس، ئەوجێگە شوێن بۆسەی دوژمنە ئێمەش ئەبێ بەوێدا گوزەر بکەین، بەبێدەنگی قەتارەمان بەستوە بەدوای هەڤاڵی پێشڕەو شارەزادا تا بگەینە لای هەڤاڵانی پێش قەرەوڵ.

گەیشتینە باواناوس شێرە کوڕانی ورياو گورج وگۆڵ چاوەڕێمانن، لەوێ دووبارە دەستەیەکی سێ٣ کەسی شارەزا بەتوولە ڕێگای نێوان مینە چێنراوەکان فیشەکیان لێخوڕیوەو پەنجە لەسەر ماشەی چەکەکانیان پێشمان کەوتوون تا لەهەر جێگەیەکدا بۆسەی دوژمن ووتی: قف ئەمان بەدەست ڕێژی گوللە وەڵامیان بدەنەوە، لەباوا ناوسەوە سەرەو خوار بەپەنا ئاواییە چۆڵ کراوەکانی سەرگەت وگوڵپ دا و ئینجا پەڕینەوە لەجادەی خورماڵ بیارەو تەیکردنی دەشت تا بگەین بە ئاوایی خارگێلان. شەوێکی نوتەکەو چاوبەکلە، شارەزاکە چۆن ئەڕوا ئەوهێزەی دوای کەوتوە بەهەمان شێوە، مەسافەیەک ڕاستو هەندێک جار پێچاوپێچ لەچەن جێگەیەکدا سەرکەوتن و داگەران بەناو ئاودڕو کەنەڵانەکاندا جارجاریش ئەمبەرو ئەوبەر کردنی جۆگەلەو پەڕینەوە لەدەرەو شیوەکاندا. ئەگەر لەڕوناکی دابێت وکەسێک لەدوورەوە تەماشای ئەو دیمەنە بکات شێوەی ڕۆیشتنی مارێک ئەبینێ.

بەر لەنیوەی شەو گەیشتینە ئاوایی خارگێلان[1]، خۆمان کرد بەناو کەپرو کەلاوەکاندا ئەو خەڵکەی لەوێیە ئەشڵەژێن، کێن مەیەنە پێشەوە؟ خۆمانین یەکێتیی، چۆن بزانیین کێتان لەگەڵە ناسراو؟ تیپی ۱۱هەورامانین. کوا کاک حەمەی حەمەسەعیتان لەگەڵە؟ بەڵێ، دەی باشە فەرموون من حاجی حەمەلاوی چەشمییەریم. لەوێ دابەش ئەبین ومیوانداریەکی دۆستانەمان ئەکەن، دۆی سارد نانی هەورامی و کەرەو چای شیرین.

دوای پشوودان و نان خواردن ئەکەوینە ڕێ بەرەو هەڵەبجە، دەشتی سەبانمان بڕی و چەند کاتژمێر شەوی مابوو لەنزیک ئاوایی دەرەشیش ئێمە مەفرەزەیەک جیا بوینەوە، هەڤالان ئەکبەر ئێناخی و کەیکاوس لەگەڵ هێزەکەدا سەرکەوتنەوە بەرەو هاوار، مەفرەزەکەی ئێمەش من لەگەڵ ئەکرەم ئەحمەد و تەحسین بیارەیی و ڕزگاری حاجی عەلی، لەگەڵ ئەو دوو کەسە هاووڵاتیەدا کە ناردبووم بەدوایاندا بێن هاوکاریمان بکەن بەنهێنی ئەوانیش حاجی محەمەدی، حاجی عوسمان و قەیسەری حاجی حەمەڕەشید بوون، پێکەوە چووین بۆ ناوشارو چەند ڕۆژێک ماینەوە، لەناوشار هەڤالانی ڕێکخستنمان بینی لەوانە ئەحمەد کوڵکنی و حەمەی حاجی حەمەشەریف ومستەفا حەمەسەلیم...... دوای وتوویژ لەسەر چەند ئیشوکارێکی حیزبی، ئەوان دلگران بوون گلەییان هەبوو سەبارەت بەڕاپەڕینی ڕۆژی ۱۹۸۷/٥/۱۳ کە هێزی پێشمەرگە وەک پێویست نەچووین بەدەمیانەوە، گلەییەکانیان ڕاست و لەجێگەی خۆیدا بوو. کاتێک سەرکەوتمەوە بۆ هاوارەکۆن، هەڤاڵ نیازی لەپاوەوە هاتبووەوە لەبەرپرسایەتی پەیوەندیەکان لایان دابوو کاک ئاسۆی شێخ نوریان لەشوێنی دانابوو، هاتە لام و گلەی هەبوو، منیش دڵم دایەوە ووتم لێرەبە پێکەوە ئیش ئەکەین.

---

[1] - خارگێلان ئەکەوێتە نێوان هەڵەبجە و بیارە. لە خورماڵەوە بچیت بۆ بیارەوە لەدەستە ڕاستەوە لقێک لە جادەی سەرەکی جیا ئەبێتەوە بەناو خارگێلانو ئەچێتە هەڵەبجە. لەمانگی ۱۹۸۳/۷ مەفرەزەیەکی پارتی لەسەر ئەو ڕێگا سەرەکییە لوغمێکی تانکیان چاندبوو، کەڕێگای مەدەنی بوو، لەڕۆژی ۱۹۸۳/۳/۲۱دا لەژێر ئۆتۆمبیلێکی جێبدا تەقییەوە بووە هۆی کوشتنی چەندین هاوڵاتی مەدەنی خەڵکی تەوێڵە، لەوانە شۆفێری ئۆتۆمبێلەکە بەناوی عەتا فایق، فایق عەزیز و چوار کوڕو دوو کچی، نەزمت عارف ڕەسوڵو برینداربوونی عەبدولعەزیز عەلی.

# گەشتێک و
# چەند جارێک ڕزگاربوون لەمەرگ

لە کۆتایی کانوونی دووەمی ١٩٨٨دا کاتێک شەهید نیازی هەورامی بەرپرسی پەیوەندییەکانی یەکێتیی و ئێران بوو، ئاسۆی شێخ نوری چووبووە شوێنەکەی و نیازی گەڕابووەوە بۆ ئاوایی هاوارە کۆن. هێندەی نەبرد لە ڕێگەی بێ سیمەوە بە برووسکە لەلایەن کاک نەوشیروان مستەفاوە ئاگادارکراین پێکەوە بچینە بەرگەڵوو. سەر لەئێوارەیەک من و شەهید نیازی و دوو پێشمەرگە بە ناوەکانی: ئەکرەم ئەحمەدو خەلیل حاجی مەحمود لە هاوارە کۆن دەرچووین بەرەو هەڵەبجە، ئەکرەم فەرماندەی کەرت بوو، خەلیلیش جێگری فەرماندەی کەرت بوو، هێشتا دنیا تاریک نەببوو بە پەنای سەربازگەکەی هاواردا تێپەڕمان کردو گەیشتینە ئەو چەند ماڵانەی، کە خەڵکی شۆشمێو بەلەبزان بوون، لەوێ لە پەنای حزبی دیموکراتدا نیشتەجێ ببوون، سەربازگەکە بەرپرسەکەی فاتیح قادر عەباس بوو، پەیوەندیمان هەبوو، پێشتریش دوو چەکی کلاشینکۆفم بە دیاری بۆ ناردبوو، لەبەرئەوەی ڕێگەیان لە هاتووچۆی خەڵک نەدەگرتو یارمەتی خەڵکیشیان دەدا، بەتایبەت سەربازە هەڵهاتووەکانی شەڕی عێراقو ئێران، پاش پشوویەکی کورت لە هاوار لەماڵی ئەبوبەکر شۆشمێیی عەزیمەخانی خێزانی دەست و برد چایی بۆ دەم کردین تا نان و کەرەیشمان نەخوارد مۆڵەتی دەرچوونی نەداین.

دوای نان و چا خواردن کەوتینە ڕێ هەروەک جاران سەرەو ژوور دەربەنو دۆڵی ئەشکە مۆڵمان بڕی، گەیشتینە سەر ملە ئەمجارەش وەک سەدان جاریتر چراو چراخانی شاری شاعیران و شاری بەرخۆدانمان لێ دەرکەوتەوە، چەندە سەرەوژوور هەڵزنیوی ئەبێ ئەوەندەش سەرەو خوار داگەڕێیت تابگەیتە سەرەتای دەشتی شارەزوورو ئاوایی عەبابەیلێ بخەیتە پشت سەرو یەکەم گامی دەشت بەرەو ناو شار بهاوی، بەڵێ هەموو لەشمان عارەقەی لێ دەچۆڕێ و سیپاڵەکانی بەرمان خووساوەو بەرەو ناوشار ملمان ناوە، لەبەر ڕووناکی لامپ و بلاجکتۆرەکان بەردەمی خۆمان نابینین، بۆیە ماوەماوە دائەنیشین و بێدەنگ ورد ئەبینەوە، دوای شناسایی دڵنیا بوون

لەمەسافەیەک دووبارە ئەکەوینەوە ڕێگا بەوجۆرە تا دەستمان گیر بوو لە سەرەتای ماڵەکانی گەڕەکی مامۆستایان، نزیک کاتژمێر۲ی شەوە کشوماتی باڵی بەسەر شاردا کێشاوە لەتاریکایی پەناماڵێکدا کورکەمان کردووە، لەدورەوە و لەدەورو بەری سەربازگەی شاردا حەپەحەپی سەگەل و جارو باریش شریقەی دەسترێژێک گوللە، کشوماتی و بێدەنگیەکەی شار شەق ئەکا، کۆلان بەکۆلان وکوچەبەکوچە، تا خۆمان گەیاندە ماڵی مامە ڕەشەی نەجەقولی بەگ، دراوسێی لای ڕاستیان عوسمانی سەعەی جەواهیرو عەتاو خانی خێزانی، دراوسێی لای چەپیان مامۆستاحسێن وتەلیعەخانی خێزانی جێگەی دڵنیایی و باوەڕ بوون، هیچ ترسمان نەبوو لێیان، بەسەر بانی ماڵی مامۆستا حسێندا ئەچوینە سەربانی ماڵی حاجی حەمەڕەشید.

دوای پشوودان و نان خواردن چووینە ئەو ژوورە تایبەتە کە لێی ئەخەوین و ئەمێنینەوە، داوامان لە بەرزانی کوڕی کرد بەیانی بە ئۆتۆمبێل من ونیازی بباتە نزیک دزکەرەو زەڕایەن، تالەوێوە بچینە قەرەداغ، چونکە شارەزوور چۆڵ کرابوو، کە نالی سۆلەمیش سەراو پانتایی دەشتی شارەزووری کرد بووە دوو بەش، ناوچەکە چۆلو ڕێگای هاتووچۆ لە هەورامانەوە بۆ قەرەداغ دژوار بوو، بەرزان ووتی: چەند ڕۆژێک پێش ئێستا نەوزاد نەورۆلیم بردووە بۆ قەرەداغ راپۆرتیان لێداوم چاودێری ئەکرێم ناتوانم بەسەیارەکەی خۆم بتانبەم.

ڕاستی دەکرد هەرلەو ماوەیەدا عوسمانی حاجی مەحمود لە چارەسەری برینداریيەکەی لە ئێران گەڕابووەوە، هاتووچۆ لەهەورامانەوە بۆ قەرەداغ زۆر سەخت بوو، بۆیە عوسمانمان بەنهێنی لەهاوارە کۆنەوە ناردبووە ناو شاری هەڵەبجەو لەوێوە بەرزان بە ئۆتۆمبێل ڕەوانەی قەرەداغی کردبووەوە، لەم ساڵەدا بریندارو کەمئەندام زۆر بوون و هەموویانم بەئۆتۆمبێل و لەجادەوە دەنارد بۆ ناو شار بۆ بینینی کەسوکاریان، لەو سەریشەوە هەر بەئۆتۆمبێل دەیانهێنەوەو دەماننناردنەوە بۆ ئێران، چونکە بڕیار بوو لە ئێرانەوە بنێردرێنە ئەوروپا.

ڕێکەوتین لەسەر ئەوەی بەیانی بچێت مەحمود عەبدوللا کەلێپرسراوی هۆبەی کشتوکالی زەڕایەن ئاگاداربکات جێگەمان بۆ دابین بکاتو کەسێک ئامادە بکات، کە گەیشتینە زەڕایەن بە ئۆتۆمبێل بمانباتە ئاوایی

دزکەرە. لە هەڵەبجەش بۆ نیوەڕۆ حەسەنی مەحمود بەگ کە مستەشار بوو میوانداری بکات، ئێمەش داوای لێ بکەین بە سەیارەکەی ئەو، بەرزان بمانباتە نزیک ئاوایی دزکەرە، وامان کرد ئێمە حەسەن بەگمان بینی و داواکەمان ئاراستە کرد، ئەویش ووتی: بەسەرچاو دەچمە سلێمانی و ئۆتۆمبێلەکە دەنێرمەوە بۆتان، نەوەستا بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ ڕۆیشت دوای ئەوە بارزانیش چوو بۆ زەڕایەن بۆ لای مەحمود و هاتەوە بۆ لامان بۆ هەڵەبجە، ووتی مەحمود ماڵیش و سەیارەشتان بۆ ئامادە ئەکات و خۆیشی دێت بۆ ئێرە، حەسەن بەگ سەیارەکەی نەناردەوە بەرزان چەند بەتەلەفۆن هەوڵیدا بیدۆزێتەوە نەبوو، پاش نیوەڕۆ مەحمود عەبدوڵلا هات، محێدین نەورۆڵیش بەرێکەوت هاتە ماڵی بەرزان، ناوبراو سەیارەیەکی سۆپەری مۆدێل ۸۲ی پێ بوو، بەرزان ئەویشی هێنا بۆ قاتی سەرەوەو بۆ ئەو ژوورەی ئێمەی لێ بوو، ووتی: ئەمە برادەرمەو سەیارەی پێیەو خۆم بە سەیارەکەی ئەم دەتانبەم. بە دەمو چاوماندا محێدین زانی پێمان ناخۆشە بێ پرس هێناویەتیە ژوورەکەو ئێمەی بینیوە، محێدین ووتی: مەترسن عەبدولکەریم تریفەیی و ئاوات فەتاح تریفەیی لە ماڵی خۆمان ئێختیفان. ڕاستی دەکرد ئێمە دەمانزانی ئەوانیش لە شارن، لای عەسری ئەو ڕۆژە خەلیل و ئەکرەممان لەماڵەکەدا بەجێ هێشت بڕیار بوو شەو خۆیان بگەڕێنەوە بۆ هاوارەکۆن. من و نیازیش سەرکەوتین لە سەیارەکەداو بەرزان بردینییە زەڕایەن، لە ماڵی کاک عەبدولی حاجی حەمەلی دایبەزاندین و ئەو گەڕایەوە.

پاش کەمێک پشوودان، مەحمود عەبدوڵلا ڕۆیشت سەیارەیەکی هێنا، شۆفێرەکەی ئامر سریە بوو لای فەوجی سالح خەیات سالە خەیات. ئێمە نەمان دەناسی و نەمان دەزانی کێیەو چ کارەیە. مەحمود خۆی لەپێشەوەی ئۆتۆمبێلەکەدا سەرکەوت ئێمەش بەدوو دەمانچەوە، کەدەمانچەکانمان شاردبووەوە سەرکەوتین هەرکە کەوتەڕێ شۆفێرەکە دەستی بە پرسیار کردن کرد، ئێمە هیچ قسەمان نەدەکردو بێدەنگ دانیشتبووین، لەناو ماڵەکانی زەڕایەن لەسەر ڕێگاکە بەرەو ڕێگەی دزکەرە دەگەڕاینەوە چەکدارێک دەستی ڕاگرت لەشۆفێرەکەمان، من و نیازی هەردووکمان لەیەک کاتدا وتمان مەوەستە. کابرا وەستاو ووتی: بۆ؟ ئەوە برادەرمە، فەرموو سەرکەوە بەتفەنگێکی RBK ئار بی کەی و ۱۰ـ ۱۲ مەخزەنەوە خزاندیە پاڵ ئێمە،

شۆفێرەکە، کەوتە گومانەوە لێمان لەگەڵ چەکدارەکەش کەوتە قسەو ووتی: ها بۆکوێ؟ ئەویش وەلامی دایەوە حەمەخان ئەیەوێت ئاوەکەلەو کورەی بۆ بگرین ئەمشەو، بەتەعەلیقەوە قسەی دەکرد، کاکی شۆفێریش ووتی: دوێنێ شەو نەتبینی ئێمە لەکوێ وە ئاڕ بی جیمان دەنا بە بارەگاکەی جەلال کولکنێیەوە قەد ئێوە ناتوانن بچنە ئەوێ.

ئێمەش بێدەنگ گوێمان گرتووە بۆ وتووێژی ئەم دوانە، گەیشتینە لای سێ ڕێگای دزکەرە ڕێگاکەیان بە شۆفل بڕی بوو، بۆیە بەرەو ئۆردوگای نەسر ڕۆیشتین لەلای ماڵەکانی حەمەخانی حاجی دارا دا نزیکەی ٤٠٠ بۆ ٥٠٠ چەکدار کۆببوونەوە کابرای جاش لەوی دابەزی چوو بۆلای ئەو جاشگەلەکە، ئێمە ڕۆیشتین ولەخوارترەوە لاماندایەوە بۆناو کۆمەڵگەی نەرسر ئەوکۆمەڵگە دروست ئەکرا عالەم خەریکی کاربوون ئەتووت ڕۆژی حەشرە، لەوکاتەدا بەناوجادەو کوچەکانی ئەوکۆمەڵگەدا ئەڕۆیشتین شۆفێرەکە ڕێگەی هەڵە کرد سەیارەیەکی بەرازیلی شین لە پێشیەوە بوو ئەیویست پرسیاری لێبکات، لەیەککاتدا هەردووکمان ووتمان مەوەستە، چونکە حەمە تۆفیق گەلالی و ئەحمەد سویلەمێشی لەناو سەیارەکەدا بوون، ئەم دوانە پێشمەرگەبوون برادەرمان بوون تەسلیم ببوونەوە، شۆفێرەکە سەیری کردینو ووتی: بۆ ئەو دووانە ئەناسن؟ وتمان نەخێر، ئیتر لەسەری نەڕۆیشت.

گەیشتینە سەرگردەکەی بەرامبەر ئاوایی دزکەرە پشتی ئاوایی نەمەل، لەوێ زانیمان ئەمە فەرماندەی سریەیەو ئەم سێ ڕەبایە هی ئەون. لەوێ لەگەڵ مەحمود تا لای تەلبەندی ئاخر سەربازگە هاتنو ئێمەیان ڕەوانەکرد، کابرا ووتی: زوو بڕۆن ئێستا جاشەکانی حەمەخان دێن بەرەو ئاوەکەلەو کورە، باتووشی گێچەل نەبن، کە دوورکەوتینەوە دوو سێ فیشەکیان نا بە بەرپێمانەوە لامان کردەوە دەبینین مەحمود بە تفەنگەکەی کابرا دەمانترسێنێ.

ئێمە ڕۆیشتین و پێمان هەلگرت، تاریکی کرد گەیشتینە ئاوایی ئاوەکەلەو لەوێ بارەگای یەکێتیی لێ بوو، کاک نەسرەدین عەبدول لاوە چەند پێشمەرگەیەکی پارتیشی لێ بوو، ڕێمان کەوتە لای ئەوان وتمان خۆتان کۆکەنەوە جاش هاتن، وتیان: ئەوە ئێوە لەکوێوەو چۆن بەتەنیاو بەو شێوە هاتوونو بۆ کوێ ئەچن؟ وتمان کاتی گفتوگۆکردن نییە باکەمین بڕۆن بۆ بەردەم ئاوایی واهاتن، پێشمەرگە چوون بۆسەیان دانا .

ئێمەخەریکی قسەوباس بووین جاش گەیشتو کەوتنە کەمینی پێشمەرگە، تەقە دەستیپێکردو جاشەکان کشانەوە بۆ دواوە. ئەو شەوە لەوێ ماینەوە بەیانی چووینە قۆپی بۆ بارەگای مەڵبەندی یەک بۆ لای کاک قادری حاجی عەلی و کاک عومەر فەتاح، پێکهاتەی مەڵبەندی یەک ئەو کات بەم شێوەیە بوو:

. قادری حاجی عەلی: بەرپرسی مەڵبەند. عومەر فەتاح: لێپرسراوی ڕێکخستنی کۆمەلە - عەلی شێخ حەمەساڵح: لێپرسرای ڕێکخستنی شۆڕشگێڕان - حاکم برایم: دادگاو بەشی یاسایی لەگەڵ حاکم محەمەد. د. فایەق محەمەد گولپی بەشی تەندروستی. بەشی سەربازی: شێخ جەعفەرو چەند هەڤاڵێکیتر.

نەوزاد نەورۆلیش لەوێ لای کاک عومەر بوو، بانگ کرابوو بۆ لێکۆلینەوە لەسەر تەقەکردنەکەی ئاوایی باوە کۆچەک و شەهید کردنی عەبدولی میرزا حەسەن. ئێمە داوامان کرد لە کاک قادر مەفرەزەیەکمان لەگەڵ بنێرێت تا لە ڕێگای سلێمانی تاسلوجە بپەڕینەوە، ووتی: باشە هێزێکمان بۆ ئەوێ ئەروات پێکەوە بڕۆن، بەڵام لەوێوە ڕێگە نییە لەلای چەمچەماڵەوە بڕۆن.

دوای چەند ڕۆژێک لەگەڵ ٤٠- ٥٠ پێشمەرگەدا کەوتینەڕێ، لە جەعفەرانەوە چووینە بارەگای تیپی ٥٧ی سەرگرمەو لەوێوە بۆ ئاوایی دێلێژە، بە لێوار ئاوی باسەڕەدا چووینە خوارەوە بۆ ئاوایی بەرەکە، ئەوەی بیرم بێت کاک سالار ڕابەر سیاسی تیپی ٥٧ی سەرگرمە بەرپرسی ئەو هێزە بوو لەگەڵ ئەودا ڕۆیشتین، سالار پیاوێکی ئازاو لەسەرخۆ بوو هەر بە سالاری ڕابەر سیاسی ناسراوە.

گەیشتینە ئاوایی خاڵدان، کەرتی ئەردەڵان لەو دەوروبەرەبوون ڕەوانەیان کردین شەو لە ڕێگای سەرەکی تەکیە - چەمچەماڵ پەڕینەوەو چووینە کوچکە نەخشینە، بەیانییەکەی ڕومان کردە گوندەکانی تیژەو تلیان، ئەم گوندانە ئەرکیان زۆر لەسەر بوو، خزمەتی زۆری پێشمەرگەیان دەکرد. دواتر بە پەنای گۆپتەپەو عەسکەردا بەرەو چۆمی سورقاوشان ڕۆیشتین لەوێوە سەرکەوتینە سەر چیاکەو بەلای کانی هەنجیردا عەسرێکی درەنگ لە ڕێگای سلێمانی - دوکان لەلای ئاوایی کانی خانەوە پەڕینەوە. هێزەکە

چاوەڕێی تاریکبوونی دەکرد تا لە ڕێگاکە بدەن، بەڵام کە زانیان ئێمەو چەند کەسێکی تر پەڕینەوە، ئەو ڕەبایەی پاسەوانی ڕێگابوو زۆر نزیک بوون جاشی سوکی لێبوو، بانگیان کرد زوو بڕۆن، بە ڕووناکی پەڕینەوەو بەرەو سورداش ڕۆیشتین.

دوای ئێمە هێزەکەی تر، کە ساڵار ومەحمودی مامە عەزەو چەند فەرماندە کەرتو کادیرێک بوون تووشی تەقە بوون لەسەر ڕێگاکە، چۆنییەتی دروست بوونی تەقەکەش ئەوەبوو لەوکاتەدا ئامر لیوایەک ویستبووی بڕوات لەسلێمانییەوە بۆدوکان تووشیان بوو، لێیان دانو چەند سەربازێک کوژرانو دوو سەیارەی سەربازی تازەشیان لێگلدانەوە، پێشمەرگە سەرکەوتن و هێنایانن بۆ سەرگەڵو، لەنێو یەکێک لەسەیارەکاندا گولل ئارپی جی لەدەست پێشمەرگەیەک دەرچووبوو پێشمەرگەیەکی تری شەهید کردبوو.

ئێمەعەسرێک گەیشتینە بارەگای کاک نەوشیروان مستەفا لە سەرگەڵوو، مام جەلال لەدەرەوەی وڵات بوو. کاک نەوشیروان دوای چاکی و چۆنی ووتی: هاتن؟ وتمان بەڵێ، ووتی: باشە دوای کەمێک پرسی دەنگو باسی ئەو سنوورە چییە؟ وتمان باشە، چەند پرسیارێکی تری کردو ئێمەش وەڵاممان دایەوە، ووتی: بڕۆن ئەمشەو جێگەی خۆتان بکەنەوە لەجێگەیەک، بەیانی لە مەکتەبی سیاسی بانگتان ئەکەین ئیشمان پێتانە، وتمان باشە.

هەر بەدەم پیاسەوە لە سەربانی بارەگاکەی خۆیەوە پرسی: نالە هەورامی چی دەکات؟ ئێمەش وتمان چی دەکات لەو شاخەی پشتی ئەحمەدئاوایە، لای ئەو دەرچووینو بەرەو بارەگای ڕاگەیاندن ڕۆیشتین، کە ئەوکات کاک ئەرسەلان بایز بەرپرسی ڕاگەیاندن بوو، هاوڕێی نزیکی منیش بوو.

لە بەردەم گەلیەکەدا چاومان بە جەبار فەرمان و ملازم عومەر کەوت، عەدنان شاسوارو کۆمەڵێک پێشمەرگەی تر دوای چاکی و چۆنی وتیان: هاتن، کاک نەوشیروانتان بینی؟ وتمان: بەڵێ، کاک جەبار فەرمان ووتی: ئێوە بچنە بارەگاکەی من، ئێمە ئەچینە لای کاک نەوشیروان و دواتر من دێمەوە بۆلاتان، ئەم ئێوارەش میوانی منن.

ئەوان ڕۆیشتن و ئێمەش بۆبەردەم بارەگاو مەقەڕی کاک جەبار فەرمان ڕۆیشتین. نیازی ووتی: ئێستا ئەزانم بۆچی منیان بانگ کردووە،

ووتم بۆ؟ ووتی: لەپاوە کاتێک بەرپرسی پەیوەندییەکان بووم، شەوێک عەلی شامارو عەدنان شاسوارمیوانم بوون، منو عەلی شامار تادرەنگانێک نەخەوتین و قسەمان دەکرد، ئەویش خۆی کردووە بەخەوتوو گوێی لە قسەکانمان بووە، وتم بۆ باسی چیتان کردووە؟ قسەی خراپ یان باش؟ ووتی: بۆ عەلی شامار لەهەر شوێنێک بێت قسەی باش ئەکرێ؟

ووتم ئەی عەدنان بۆ؟ ووتی: ئەوە لەبەشی زانیاری ئیش دەکات، وتم زانیاری چییە؟ ووتی: تەشکیلاتێکی نهێنییە، دیارە من تا ئەو کات نەمدەزانی یەکێتیی دەزگای وای هەیە، بەیانی چووینە مەکتەبی سیاسی و کاک نەوشیروان قسەی لەگەڵ کردینو ووتی: شەوکەتی حاجی موشیر لەدیوی ئێرانەوە دێتە هەورامان.

فەرەیدون عەبدولقادریش لە گفتوگۆدایە لەگەڵ ئێرانییەکان بۆئەوەی لە لای ئێوەوە بەرەیەکی شەڕی هاوبەش بکەینەوە، چونکە ڕژێم بە نیازی پەلاماردانی ئێرەیە ئەوە دەستی پێکردووە، لەقسەکانیدا ڕووبەڕووی من ووتی: حەمە تۆ بەرپرسیت ئەبێت نەخشەکە سەرکەوتوو بێت، ئەبێ بەجدی هاوکاری فەرەیدون و شەوکەت بکەیت، سەرکەوتنی ئەوبەرەیە یان شکانی بەهەرلایەکدابێ کاریگەری باش یاخراپی بۆ سەر شۆڕش و کێشە ڕەواکەمان دەبێ.

دیارە کاک نەوشیروان بە دەموچاوی گرژو برێک بەتوڕەییەوە قسەی دەکرد، وادەرئەکەوت کەسێک پێی وتبێ حەمەی حەمە سەعید ئامادەنییە هاوکاریمان بکات، یان تووڕەی بارودۆخەکە بوو نازانم، قسەوباس تەواو بوو ئێمە ئامادەیمان پیشانداو لەوێ دەرچووین، بڕیارماندا ئەوشەوەش لای کاک ئەرسەلان بایز بمێنینەوەو بەیانی زوو بکەوینەڕێ و بگەڕێینەوە بۆ هەورامان.

شەو تادرەنگ دانیشتین کاک ئەرسەلان سەرقاڵی ئیش و کار ڕادیۆو ڕاگەیاندن بوو، بەیانی زوو لەخەو هەستاین، نانو چایان ئامادەکردبوو، من هەستم کرد سەرسنگم گیراوەو ناتوانم هیچ بخۆم، نیازی بەهەمان شێوە، وتیان چییە؟ بۆ نانو چایی ناخۆن، وتم: شەو جەماعەت جگەرەی زۆریان کێشاوە سنگمان گیراوە، شەویش گوللە تۆپی زۆر کەوتنە ئەو دەوروبەرە، لەپڕ بووە هاتوو هاوار یەکێک هاتوو ووتی: بەگوللە تۆپی کیمیایی لێمان دراوەو خەڵکێکی زۆر بریندارن و لەنەخۆشخانەکەن.

لە بەرگەڵو نەخۆشخانەیەکی باشو رێکپێک هەبوو، کە د.هەڵۆ بەڕێوەبەری بوو، رۆژانە بریندارێکی زۆری چارەسەر دەکردن ئەوەبوو بریندارانی چەکی کیمیاویشی بۆ زیادبوو. دواتر زانیمان نەخێر جگەرەکێشانی هەڤالان نییە، ئێمە خەوتووین هەموو بارەگاکانی تر بەخەبەر بوون و زانیویانە تۆپبارانی کیمیایی کراوە ئیتر هەستاین وخواحافیزیمان لە کاک ئەرسەلان و برادەرەکانی کرد..

لەگەڵ نیازی لەبەرگەڵووەوە بۆ سەرگەڵوو بۆ سەر دابان بەڕێکەوتین، ئەوناوە بەدرێژایی رێگاو ئەمبەرو ئەوبەری دۆلەکە بۆنی سیرو قەوزەی ناو ئاوو لیتەی بنی گۆم دەهات، خەڵک ترسابوون و بەم لاوە بەولادا هەڵدەهاتن. ئەورۆژە تائێوارە رێکامان بڕی هەتاگەیشتینە قزلەر، لەقزلەرەوە بە رێگەیەکی چەپەک و لاپێی سەختدا ئاودیوی ئاوایی زێوێی پیرەمەگرون بووین.

شەو درەنگ گەیشتینە ئاوایی، خەڵک لەوێ سەریان لێ شێوابوو بەئێمەیان گووت: ناتوانن بپەڕنەوە بۆ بەری حاجی ئاواو و چەرمەگا، چونکە بەدرێژایی رێگای تاسلوجە - دوکان سوپاو هێزی سەربازی لەسەر رێگاکەن و بنەو بارەگایان خستووە، بەدرێژایی ئەو رێگا سەرەکیە بۆشایی لێ نەماوە تابپەڕنەوە. لەوکاتەشدا هەندێک پێشمەرگە پەیدا بوون، بوونە هاوسەفەری ئێمە، لای عەسر وردەوردە شۆڕبوینەوە بە لای ئێلان قوزدا بەدووربین سەیری سەررێگاکەمان کرد زانیمان ڕاستە هێزی زۆر لەوناوەدا ب لاوەبونەتەوە.

ئەوپێشمەرگانەی لەگەڵمان کەوتبوون گەڕانەوە، ووتیان دەرناچین و رێگانییە، ئێمە وەستاین تادنیا تاریکی کرد، پاشان کەوتینەڕێ، نزیکی رێگا سەرەکیەکەی دوکان - سلێمانی بوینەوە زانیمان کەس بە کەس نییەو سوپا وەک کەمین لەسەر رێگادا نین، بەڵام لە نزیکمان و لەم لاوە لەولاوە هێز پرشو بلاوە، بە دەنگە دەنگو قاڵە قالیشیاندا وادەرنەدەکەوت کەمینی تایبەتی سەررێگایان هەبێت، بۆیە ئێمە لەکەلێنێکەوە لەرێگا پەڕینەوە تابەیانی بەرێگاوەبووین، شەو دووبارە رێگای گشتی سلێمانی - کەرکوکمان لە نزیک گوندێک بەناوی بیبیجەک بڕی، کۆمەلگاکەمان لەبازیان تێپەڕاندو کەوتینە بناری ئەو شاخەی بەرامبەر.

ڕۆژ دەرکەوتو تراکتۆرێک پەیدابوو، ئێمە لەپێ کەوتبووین، سەرکەوتین تا ئاوایی گوڕباز، لەوێ لە ماڵی مەولود گوڕبازی لاماندا، دوای پشودان و نانخواردنی نیوەڕۆ، ئەویش بۆ لای ئێوارە تراکتۆری بۆ ئامادەکردین و بردینی تا ئاوایی جەعفەران.

ڕۆژی دواتر گەیشتینە قۆپی بۆ لای مەڵبەند، بەرلەوەی بچینە مەڵبەند لە گوندێک هونەرمەند حەمەجەزای گوانیبێژ، کە پێشمەرگەو پیاوێکی زۆر بەرێز بوو، شەو گلی داینەوە نەیهێشت بڕۆین میوانداری کردین، ماڵی لەوێ بوو ماندووی چەند ڕۆژی ڕابردوومان لەبیرچوەوە، ئەوەندە خزمەتی کردین و خواردنی خۆشی داینێ، ڕۆژی دواتر چووینە بارەگای مەڵبەند.

لەمەڵبەند کاک عومەر فتاح ووتی: نەوزاد نەورۆڵیش لەگەڵ خۆتان بەرنەوە، دیارە لێکۆڵینەوەکەی تەواو ببوو، ووتیان دەرکەوتوە ئەو تەقەیەی کە لەعەبدولڕەحمانی میرزا حەسەن کراوە لەلایەن نەوزادو هەڤاڵەکانی تریەوە بە ئەنقەست نەبووە.

لەدوای ڕاپەڕینی١٩٨٧/٥/١٣و گۆڕینی ناوی بنکەی شنروێ بۆتیپی١١ی هەورامان، کاک حامدو کاک شەوکەتیش بنکەیەکیان کردەوە بەناوی بنکەی باڵانبۆ. پاشماوەیەک ناوی ئەوبنکەش گۆڕا بۆ ناوی تیپی باڵانبۆ[1]، هەروەها ووتی: هێزێک ئامادەکراوە ئەوانیش لەگەڵ خۆتان بەرن،

---

[1]- تیپی باڵانبۆ سنووری ئیشوکارو بنکەو بارەگای بۆ دیاریکرا. شوێنی بارەگاکەی دەوەرە بوو. دەوەرە ئەکەوێتە پشت چیای باڵانبۆ، کانیاو باخێکی سەفادارە می کۆکۆییەکانە، ئەکەوێتە باشوری خۆرهەلاتی شاری هەڵەبجە، سنووری کارکردنەکەش ناوچەی نەورۆلی و شەمێران و تاوگۆزی ئەگرتەوە. بۆ فەرماندەی ئەم تیپە عەبدولڕەحمان کوڕی میرزا حەسەن دانرا، ئەم پیاوە سادەوساکارو دڵپاکە زوڵمیان لێکرد، پێشمەرگایەتی کەم و بێ ئەزموون بوو. میرزا حەسەنی باوکی پیاوێک بەڕێزو بە قابیلیەت بوو ڕیش سپی و براگەورەی نەورۆلییەکان بووە. لەشۆڕشی ئەیلولدا لای مام جەلال فەرماندەی لق بوو. عەبدولڕەحمان خۆی لە ڕاپەڕینەکەی ١٣/ ١٩٨٧/٥دا لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکدا هاتبووە دەرەوە. نەوزاد نەورۆلی کرا بەفەرماندەی یەکێک لە کەرتەکانی تیپی باڵانبۆ و جێگری تیپەکەش. ماوەیەک کاریان کرد نەوزاد خۆی بەشیاوتر لە عەبدولڕەحمان ئەزانی بۆیە منافەسەیان هەبوو. لەو ماوەدا کۆمەڵێک چالاکیان ئەنجامدا، دیارترینیان گرتنی ڕەبیەیەک بوو لەسەر چیای نوەر لەناوچەی نەورۆلی، دەستکەوتیان لەو چالاکییەدا چەکێکی دژەهەوایی چوار لولە بوو. شەوی ٢٣ لەسەر١٩٨٧/١١/٢٤ بە مەفرەزە چووبوون

دێن بۆ هاوکاریتان، وتمان باشەو ڕۆژی دواتر لەگەڵ هێزەکەدا بەرەو شارەزوور بەڕێکەوتین.

شەو هاتینە سەر ئاوی تانجەرۆ، ئەو چەند ڕۆژە، کەکۆتای مانگی ١٩٨٧/٢ بوو ئەوەندە باران بەلێزمە باری بوو، سێ لاوە لافاوی تانجەرۆ بگاری نەهێشتبوو بۆ پەڕینەوە، هەرچەندە سەرەو خوارو سەرەو ژوورمان کرد بوارنەبوو، لەجێگەیەکدا پێشمەرگەیەک ووتی: من ئەڕۆم ئەگەر ڕۆیشتمە ئەوبەر ئەوەبێن بەدوامدا، ئەگەریش لافاو بردمی ئەوە بڕۆن شوێنی تر بدۆزنەوە. پێشمەرگەکە ڕۆیشت، وردەوردە بەرەو خواربووەوە، ئاو تالای گەردنی هاتبوو، تەنیا سەری بەدەرەوە بوو، ئێمەش سەیرمان دەکرد، هەرچەندە شەوێکی تاریک بوو، بەڵام لەئاودا بەئاسانی بەشەودا شت ئەبینرێ. لەچاو ونبوو، وتیان: تازە ئاو بردی، کەچی لەوبەرەوە بانگی کرد پەڕیمەوە، ئێمەش بە کۆمەل دەستمان بەیەکەوە گرتو خۆماندابەدەم ئاوەکەوە، من مەلەوانی باشبووم، بەلام لەوێدا مەلەوانی کەلکی نەبوو.

بەسەلامەت هێزەکە پەڕیەوە بەری موانی حەسەن موان گوندێکی سەربە قەزای سەیدسادقە، لەوێوە بەناو قوڕو وەردا بەشێوەیەکی زۆر دژوار گەیشتینە سەرکە نالی ئاوی سۆیلەمێش، ئەم کەناڵە پڕکرابوو لە ئاو، لە نێوان هەر ٥٠٠ مەترێکیشدا ڕەبیەیەکی سەربازو جاش پاسەوانیان دەکرد. بۆیە منو فەلاحی حەمەبۆرو فازیل شێرەمەڕی و لەتیفی حەمەی مەلا سابیر

---

بۆ هەڵەبجە عەبدول لەئاوایی باوە کۆچەک بە تەنیا مابووەوە، نەوزادو مەفرەزەکە هاتنە ناو شار لەگەڕانەوەدا لە باوەکۆچەک تەقە لە عەبدول کراو شەهیدیان کرد. نەوزاد ئەیوت ئەو خۆی نەهاتوە بۆ ناوشار دوایی کە ئێمە گەڕاوینەتەوە لەشوێنی خۆیدا نەبووە لەجێگەیەکی تردا نەفەرێکمان بینیووە تێمان خوڕیووە ڕایکردووە تەقەمان لێکردوە چوینەتە سەری عەبدول بووە. دواتر و هەر لەسەر ئەم کێشە نەوزاد چووە ناو پارتی و لەوێ شەهید بوو. من نەمزانی ئەوکارە ئەنقەست بوو یان ڕێکەوت، بەلام بۆ مێژوو تۆ فەرماندەکەت بەجێئەهێڵی نابێ کەسێکی لەلا دابنێیت؟ دوایی کە ئەگەڕێیتەوە هەرلە هەمان شوێن کەسێک ئەبینی کە تێی ئەخوڕی با ڕاش بکا چۆن تەقەی لێ ئەکەی؟ لێکۆڵینەوەکەو لێپرسینەوەکەی مەڵبەند لە نەوزاد لاواز بوو. دواتر من زانیم گوایا عەبدول بە حەمە سیاسی ووتووە: زانیاریم بۆ هاتوە نەوزاد چۆتە ناوشار لەگەڵ مولازم خالید دانیشتوە. حەمەسیاسی ئەمە ئەگێڕێتەوە بۆ نەوزاد، کە نەئەبوو ئەوکارە بکات. مولازم خالید بەرپرسی ئیدارەی ئەمنی هەڵەبجە بوو. هەر چۆن بوو، دواجار میرزا حەسەن دڵفراوانی و گەورەیی خۆی سەلماندو نەوزادی بەخشی.

زۆر بەبێدەنگی و لەسەرخۆیی لە کەنالەکە نزیکبووینەوە، فازیل شیرەمەڕی فەرماندەیەکی گورجو گۆلو ئازاو چاونەترس بوو.

کەشفی کەنالەکەمان کردو لەناکاو چرایەکی ڕەبیەی نزیکمان سەر کەناڵەکەی ڕووناک کردەوە، ئێمەش هەموو لەسەر قوڕەکە درێژبووین، چراکە نەماو ئێمەش بەسنگە خشکە گەڕاینەوە بۆ لای هێزەکە، کە کەمێک لەدواتر چاوەڕێیان دەکرد. لەوێ گفتوگۆ بەچرپە چرپ دەستی پێکرد، هەڤالان وتیان: ناتوانین بپەڕینەوە پێیان زانیوین، ئەی چار چییە؟یانبابگەڕێینەوە بۆ قەرەداغ یان لێرە دورکەبکەوینەوە تەکبیرێکی تر بکەین.

نەگەیشتینە ئەنجام ئەوان گەڕانەوەو منو نیازی و نەوزاد نەورۆلی و پێشمەرگەیەک بەناوی وینس، کەخزمی نەوزاد بوو ئێستا لەژیاندا ماوە نەگەڕاینەوە، وتمان ئێمە ناگەڕێینەوەو هەوڵ ئەدەین لەم کەناڵە دەرچین، من پەلەی ئەوەم بوو کاک شەوکەتو کاک فەرەیدون چاوەڕێمانن و ئەرکەکەی سەرشانمان گرنگە، هەروەها بیریشم لەوە دەکردەوە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ قەرەداغ لەوانەیە پێمان بڵێن بەئەنقەست خۆیان دوائەخەن، لەتاریکی ئەو شەوەداو لە قەراغی ئەو کاناڵەدا قسەکانی کاک نەوشیروانیشم هێنایەوەخەیالی خۆم.

وردە وردە بەسکە خشە هەر چوارمان هاتینە سەر لێواری کاناڵەکە، من شالەکەی پشتم کردەوەو پێچام بەدەستمەوەو بەوانم گووت: لە سەرەوە وردەوردە شلیکەن تابگەمەناو تەختی کاناڵەکە، لەناکاو بەریان دامەوەو بینیم تا ئەژنۆ ئاوی تیایەو هیچ مەترسی نییە، لەخوارەوە هاوکاریم کردن، وینس هاتە خوارەوە بۆ لای من، بەهەردووکمانەوە نیازیشمان داگرتە خوارەوە، ئەنجا نەوزادیش هاتەخوارلەناو ئاوەکەدا بە بێدەنگی گوێمان ڕاگرت، کاتێکمان زانی لەسەربازگەی لای ڕاست دەنگە دەنگ پەیدابوو، بەچراو لایت دەوروبەری خۆیان سەیر دەکرد، لەوکاتەدا من پڕی کۆلە پشتێک ڕۆژنامەو گۆڤارو نوسراوی کۆمەلەم پێ بوو،کاک عومەر فەتاح ناردبووی بۆ کاک حەکیمی مەلا سالح، حەکیم کادری سیاسی و ئەندامی کۆمەلەبوو، بەدرێژایی ئەو هەموو ڕێگا ناخۆش و دژوارە ئەوانە هەربەکۆلمەوە بوون، بەلام لەوێدا کۆڵە پشتەکەم لەناو ئاوەکەدا داناو پێیەکم لەسەر دانا تابەتەواوی تەڕو نوقم بوو.

ئیتر برێک بارم سوک بوو، لەوێ دەرچووین دەمەو بەیانی هاتینە سەر ئاوی چەقان لە نزیک ئاوایی کەڵتەکەو کەلوڕان. نەمانتوانی لێی بدەین، لەوێ ماینەوە تا ڕۆژ بێتەوە لەسەرئەوقوڕە هەڵ لەرزیوین تەبەری ئاسۆ ڕووناک بوەوە، ئەوکات بەرەو خواربووینەوە بەرەو لای دەریاچەکە، گەیشتینە جێگەیەک ئاوی چەمی چەقان ببووە سێ بەش، لەوێ لێماندا و پەڕینەوە تا ئاوایی قاجر نەوەستاین، نیوەڕۆ لەناو چۆمو بێشەی گوێ ئاوی ڕیشێن لە نزیک ئاوایی قاجر ماینەوە، برسیەتی زۆری بۆ هێناین، چونکە تا ئەم بەیانییەش وردەوردەو بە دەم ڕێگاوە ئەو نانەڕەقەی، کە لە گیرفانماندا مابوو ئەمان کرتاند.

خۆخستنە بەر مەترسی و ڕزگاربوون لەمەرگ لێرەوە دەست پێ دەکات، لە قاجر لای عەسر لەئاوی ڕیشێن بەنارەحەت پەڕینەوە بەڕێکەوتین بۆ سەر چەمی زەڵم لەئاست ئاوایی تەپە تۆڵەکە، کەبەبگار یان بواری تەپەتۆڵەکە ناسراوە، کاتێک ئاوەکەمان لێوە دەرکەوت ئەو داربیە گەورانەی گوێ ئاوەکە تاکو تەرا پەلوپۆیان لەناو قوڕاودا ئەبینرا، برسیەتی و ترس دایگرتین، چی بکەین؟ نازانین، نەوزاد ووتی: بگەڕێینەوەو ئەمشەو بچینە ناو سەیدسادق، ئەی دوای ئەوە نازانم، بەلکو ئەم ئاوە کەم بکاتو لافاوەکە بنیشێتەوە، بەگوێمان نەکرد وردەوردەو بەبێ بەرنامە نزیک بووینەوە لەسەر ڕێگای گشتی سەیدسادق - هەڵەبجە، لەناو کەلاوەکانی ئاوایی تەپەڕێزینەدا دانیشتین، لای ئێوارەیەو ئۆتۆمبێل هاتووچۆیان نییە، لەلای دەستە ڕاستمانەوە سەربازگەکەی گردی گۆیەو کۆمەلێک کەس لەسەر گردەکە سەیری دەشتەکە دەکەن، خالێکی پشکنین لەسەر پردەکەی زەڵمەو پاسەوانێک دیارە. بە وینسمان گووت: بۆ چەکەکەت دانانێتو بچیتە سەر ئەو پردە بلێیت من سەربازی فیرارمو ئەڕۆمەوە بۆ هەڵەبجە، ئەگەرزانیشت چەکداری خەفیفەو هی خالیدی خولەسور یان حەسەنی مەحمود بەگن ئەوانە دوو فەرماندە فەوج بوون هاوکاریان دەکردین ئەوە بلێ چەند هاوڕێیەکی ترم هەیە باشەو بێن لێرەوە بپەڕنەوە، ئەنجا وەرەوە بۆلامان، وینس ڕۆیشتو ئێمەش لەدورەوە هەرسەیری دەکەین تابزانین چی ڕوودەدات، لەناکاو لە چاو ونبوو، دوای ماوەیەک گەڕایەوە ووتی: وەڵا ناڕۆم، وتمان بۆ؟ ووتی: ئەمگرن.

ئێمە کەسمان شارەزای مەیدانی مینو ئەوبەرەی لای شیرەمەڕو بانیشار نەبووین ئەگینا بە ئاسانی دەمانتوانی بچینە وشکەناوو خۆرنەوازان بۆ لای هەڤالانی پارتی بەبێ ئەوەی ئاوبێتە ڕێگەمان. دوای کەمێک ڕاوێژکردن، من هەستامو بەرەو لای ڕێگا قیرەکە ملم ناو لەوکاتەشدا بارانێکی بەلێزمە دەباری، نیازی ووتی: ئەوە بۆکوێ؟ وتم: ئەڕۆمە سەرڕێگاکەو هەرسەیارەیەک هات ڕایئەگرمو سواری ئەبینو بەبێ وەستان ئەدەین لەخالی پشکنینەکە، نەوزاد هات بەدوامداو ئێمە گەیشتینە سەر ڕێگاکە، لەلای گولەخانەوە سەیارەیەکی بەڕازیلی بەخێراییەکی زۆرەوە هاتوو نزیکبووەوە، لەناکاو لەگەڵ نەوزاد خۆمان خستە بەردەمی و بەجۆرێک وەستا ئەوەندەی نەمابوو لەڕێگاکە دەرچێتو وەرگەڕێ، لەپڕ چوار چەکدار لەسەیارەکە دابەزین هاواریان کرد لە شەڕی سورداش هەلهاتووین نەمانکوژن.

شۆفێری سەیارەکەش ڕایکرد بۆ لای نەوزادو دەستی لەملی کرد، فەرماندەی سریە بوو خزمی نەوزاد بوو، گووتیان: چی دەکەن لێرە؟ چیتان ئەوێت؟ گووتمان: بەم سەیارە بمانبەنە ئەوبەری پردەکەو لەچ شوێنێکدا ماوە هەبوو دادەبەزین و ئەڕۆین. هەموومان ڕێگەمان نەبوو سواربین شۆفێرەکە زۆر شلەژا، ووتی: ئەوە سەیتەریە وتمان خۆمان سەیارەکە ئەبەین و ناوەستین ئەوەندەی تر ترسا.

لەم قسەوباسەدا بووین، ڕەبیەکانی دەوروبەریش سەیری ئەم دیمەنەیان دەکرد، بینیمان بەدوای ئەوانیشدا واسەیارەیەکی گەلابەش لەسەیدسادقەوە هات بەرەو هەڵەبجە ئەڕوات ئەویشمان ڕاگرت و بەپەلە چەکدارەکانمان نارده ناو گەلابەکەو سەرکەوتن، گووتمان بە شۆفێری گەلابەکە بەدوای ئێمەدا وەرە پێش نەکەوی، ووتی: زۆر باشە، شۆفێرکەی ئێمە ووتی: خۆم سەیارەکە لێ دەخورم، وتمان باشە، هاتین و دامان لە بازگەکە، لەسەر پردەکە پەڕینەوە بەرەو هەڵەبجە، پاسەوانی سەیتەرەکەش لەبەر باران وەستابوو سەیری کردین و دەستی ڕانەگرت. لە پردی زەڵم تا بازگەی هەڵەبجە ئەوەندە هێزی سەربازی بنەو بارگەی خستبوو ماوەمان نەبوو دابەزین تا گەیشتینە بازگەی قەراغ شاری هەڵەبجە، بازگەکە قەرەباڵەغ بوو، ژمارەیەکی زۆر سەیارەیان ڕاگرتبوو، کە بەرەو ناو شار دەچوون. ئێمەش سەیری یەکمان دەکردو بێدەنگ دەستمان لەسەر ماشەی کلاشینکۆفو

دەمانچەکانمان دانابوو، شەهید نیازی دەمانچەی پێ بوو من لەقەرەداغ چەکێکم هێنابوو دەمانچەشم پێ بوو، نەوزادو وینس دوو کلاشینکۆفیان پێ بوو، ئێمە شەشەم سەیارەبووین پێنج سەیارە لەپێشەوە وەستابوون، سەربازەکە قسەی لەگەڵ یەکەم سەیارەکردو دوای ئەوە چووە دواوەو بە دەست ئاماژەی کرد: بڕۆن بڕۆن بەبێ ئەوەی بمانوەستێنێ لەوێش دەرچووین.

لەوێ بەدواوە کەمێک هاتینەوە سەرخۆمان، بە نەوزادمان گووت: ئەم کوڕە کێیە؟ نەیهێشت نەوزاد وەڵام بداتەوە، ووتی: کاکە حەمە ئەی تۆ من ناناسی، ووتی: من لەتیفم کوڕی ئەحمەدی حەمەمینی پریس، وتم: ئێ زۆر باشە دیارە شانس هاتووەتە ڕێگامان، خوا تۆی نارد لەو بێ هیواییە ڕزگارت کردین.

گەلابەکە لێمان وونبوو، لەتیف ووتی: مەترسن ئەوانەی لەگەڵ ئەودا سواربوون خزمی خۆمن و جێگەی سیقەن، نەوزاد ووتی چی بکەین؟ وتمان با بمانباتە ماڵی قەیسەری مام ڕەشە، خۆمان ماڵەکە شارەزابووین، چووینە بەردەم ماڵی قەیسەر، قەرەباڵق بوو، بوار نەبوو دابەزین وتمان بڕۆ، بەلای دوکانێکی لاکۆلاندا تێپەڕ بووین عەزیز سەعیدعەزیز دەرنەفیزمان بینی بانگمان کرد عەزیز عەزیز، لای کردەوە ئێمەی نەناسی ڕایکرد بە کۆلانێکدا، چونکە سەربازی هەڵهاتوو بوو.

هەرلەو نزیکانەدا چووینە ماڵی دایکی شەهید وریا بیارەیی، لەوێ ئێمە دابەزینو نەوزاد ووتی: من و وینس لەگەڵ لەتیف ئەڕۆین و دواتر خۆمان دێینەوە بۆ هاوارە کۆن، ئەوان ڕۆیشتن و دنیا تاریکی کرد، خوشک و براکانی شەهید وریا سەریان سوڕ ئەما بۆچی و چۆن ئێمە بەم شێوە و لەمکاتەدا بەو سەیارە هاتووینەتە بەردەم ماڵەکەیان، پشوومانداو نانی ئێوارەمان خوارد، وشیاری برای شەهید وریامان نارد بۆ ماڵی قەیسەر، پێم گووت: بڵێ بە قەیسەر ئێمە لێرەین، شەو دوای کاتژمێر ١٢ بێت بەدواماندا، وشیار ڕۆیشت و هاتەوە ئەوەندەی نەبرد تەقە درا لە دەرگای ماڵیان، ئێمەش و ئەوانیش وامانزانی قەیسەرە بەدوای ئێمەدا هاتووە، هۆشمەندی کوڕیان چووبوو بۆکردنەوەی دەرگاکە، بەشڵەژاوی گەڕایە دواوەو ووتی: چەکدارن ئەڵێن، کەمینین چایمان بۆ دەمکەن دێین بۆ چایی خواردن، بەڵام لەسەر دەرگاکەوە قسەم لەگەڵ کردون دەرگاکەم نەکردوەتەوە.

ئەندامانی خێزانەکە ترسان و شلەژان حەقی خۆشیان بوو، شلێرخان کچە گەورەی ماڵ لەسەرخۆ بە ئێمەی گووت: هەستن لەم پلانەوە بچنە سەربان بزانین چی دەبێت، شلێر هیچ نەترساو خۆیشی لەگەڵ ئێمە هات بۆ سەربان لەسەربان لە هەموولاوە گولپ دیاربوو دەتروانی بەسەر هەموو شاردا، لەپەنا هەورەبانەکەوە خۆمان مەڵاسدا، فەرقی هەبوو لەگەڵ ناوماڵەکەدا، من کەمێک ترسم هەبوو، بەڵام ڕۆیشتمە سەربان ئەو ترسەشم نەماو بارودۆخەکەم بەلاوە ئاسایی بوو، دوای ماوەیەک شلێر ووتی: دانیشن و مەجوڵێن با من بڕۆمە خوارەوە، ئەو دابەزی پاش ماوەیەک لە خوارووی کۆڵانەکەوە چەند دەست ڕێژێکی گوللەکران بەرەو لای ئێمە چاومان لێ بوو گوللەی ئاگراوی دەیاندا بەمبەرو بەوبەری دیواری ئەو ماڵانەی، کە دراوسێی ماڵەکەی ئێمە بوون.

پاش کەمێک دنیا ئارام بووەوە لە پشتی دەرگاکەوە بە دەنگی بەرز یەکێک ووتی: دادە کوبرا دەرگاکە بکەرەوە قەیسەرم، ئێمە هەر لەسەربان مابووینەوە، قەیسەر هاتوو هاتە سەرەوە بۆ لامان، ووتی: هەستن ئەوە چییە بۆ ترساون بابڕۆین. ئێمەش ڕووداوەکەمان بۆ گێڕایەوە، ووتی: من زووتر هاتم ئەم ناوە چەکداری لێ بوو جەماعەتەکەی تۆفە شەل بوون، ڕۆیشتمەوە ماڵو چەکم هێناو لە خوارەوە دوو دەستڕێژم کرد ئەوان ڕۆیشتن و منیش هاتووم بەدواتاندا.

من لە ژیانی پێشمەرگایەتی و لەناو شۆڕشدا زۆر کوڕی ئازاو بەجەرگم دیوە، بەڵام بە جەرگی وەک قەیسەرم زۆرکەم دیوە، بەداخەوە لە دوای ڕاپەرین کەوتە بۆسەی پاسدارانی ئێران و شەهیدیان کرد.

چووین لە ماڵی قەیسەر چەندکاتژمێرێک ماینەوەو قەیسەر ڕۆیشت شێخ ئەنوەری شێخ فەرەجی عەبابەیلێی هێنا بەسەیارە بردینی تا سەرچیای پشتی ئاوایی عەبابەیلێ، شێخ ئەنوەریش لە شۆڕشی ئەیلولدا پێشمەرگەو لە شۆڕشی نوێشدا وەک کەسێکی ڕێکخستن زۆر هاوکاری دەکردین. ڕۆژی دواتر لە کاتژمێر ٨ی بەیانیدا گەیشتینە ئاوایی هاوارە کۆن، ئاگاداریان کردین: کاک شەوکەتی حاجی موشیرو حامدی حاجی خالید لە ئاوایی گریانە چاوەڕێمان دەکەن.

## بڕیاری
## ژمارە (٥٩٨) ی نەتەوە یەکگرتووەکان

ساڵی١٩٨٨ کۆتا ساڵی جەنگی عێراق ـ ئێران بوو، دەوڵەتی عێراق لە زۆربەی ئەو ناوچانەی خاکی ئێران کە پێشترو لە ماوەی جەنگدا داگیری کردبوو، تووشی شکست ببوو پاشەکشەی لێ ئەکرد، بەتایبەت هێزی پیادەی عێراق بەتەواوەتی تێکشکابوو.

لەتۆڵەی ئەو شکستەدا عێراق کەوتبووە بۆردومانکردنی شوێنی نیشتەجێبونی هاوڵاتیانی مەدەنی، بەتایبەتی شارە گەورەکانی ئێران، بۆ یەکەمجار لە مانگی ئەیلولی ١٩٨٧دا تارانی پایتەخت کەوتە بەرهێرشی مووشەکەکانی عێراق، لەبارەی ئەو موشەکبارانەوە رۆژنامەی الثورەی زمان حاڵی حزبی بەعس نوسیبووی: (موشەکباران دەبێ دەسەڵاتدارانی تاران والێبکات، کە بیروبۆچوونی خۆیان بگۆڕن و دەست درێژیەکانیان بۆ سەر عێراق و خەڵکی عەرەب بوەستێنن).

هەر لەو ساڵانەشدا واتە١٩٨٧و سەرەتای ساڵی١٩٨٨، هێزەکانی ی.ن.ک کارو چالاکییەکانیان لە دژی ڕژێمی بەعس گەیاندبووە ئاستێک، کە عێراقی ناچار کردبوو بەشێکی زۆری سوپاکەی بهێنێتەوە ناوچەکانی کوردستان، زیانێکی زۆری گیانی و سەربازیشی بەرکەوتبوو. هەڕەشەی تۆڵەسەندنەوەی دەکرد لەکورد، ئامادەکاری هێرشی گەورەی بۆ سەر کوردستان دەست پێکردبوو، لەوکاتەدا نەوشیروان مستەفا لەبری تاڵەبانی کە لە دەرەوەی کوردستان بوو، لە سەرگەڵو بەرگەڵوەوە سەرپەرشتی هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی دەکرد.

مام جەلال سەرگەرمی ئاگادارکردنەوەی جیهان بوو لەپەلامارە درندانەکانی ڕژێمی بەعس، وەک ڕووخاندن و وێرانکردنی گوندەکانی کوردستان و ئەنفالکردنی خەڵکەکەی و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی هاوڵاتیانی مەدەنی لەلایەن ڕژێمی بەعس و سوپاکەیەوە. لەم کتێبەدا سەیری بەڵگەنامەکان لەم بارەوە بکە.

لەو هەلومەرجەدا ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بڕیاری ژمارە ٥٩٨ ئاگربەستی ڕاگەیاند، بەڵام ئێران گلەیی هەبوو لەوەی کە ئەو بڕیارە لایەنگری لە عێراق کردووە، چونکە لە ناوەڕۆکی ئەم بڕیارە ١٠ مادەییەدا داوا لە هەردولا کرا بوو، کە کۆتایی بە شەڕ بهێنن و بڕیاری ئاگربەست قبوڵ بکەن.

ئێران داوای ئەوەی دەکرد، کە دەبێ لەپێشدا لایەنی دەستدرێژکار دیاری بکرێت، تادواتر بەندەکانی ڕێکەوتننامەکە قبول بکرێت. هاشمی ڕەفسنجانی ووتی: ئێمە دژی مەرجەکانی ڕێکەوتنەکە نینو بەگشتی نامەکەمان لاپەسەندە، بەڵام مەرجی کۆتایی هێنان بەم شەڕە لە هەنگاوی یەکەمدا ناساندنی دەست درێژکارو هەڵگیرسێنەری شەڕەکەیە.

لەوکاتەدا دەنگۆی ئەوەهەبوو، ئێران بە هاوکاری لایەنە کوردستانییەکانی باشوور سەرگەرمی ئامادەکارین بۆ هێرشێک لە ناوچەی سەردەشت و ئالانەوە بۆ سەر قەڵادزێ دواتر بەرەو ڕانییەو تا کۆنترۆلکردنی چیای هەیبەت سولتان و گرتنی بەنداوی دوکان. ئامانجیش لەو کارە وەک باس دەکرا ئەوە بوو، کە هێرشەکەی فەیلەقی یەکی سوپای عێراق بۆ سەر هێزەکانی یەکێتیی لە ناوچەکانی: بنگرد، مەرگە، قەسرەتو دوکانەوە بۆ دۆلی جافایەتی و لە ناوچەکانی ترەوە بۆ سەر بنکەو بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتیی هەڵ بوەشێتەوە.

هەر لەگەڵ ئەوەشدا باسی ئەوە دەکرا ئەگەر ئەونەخشەیە سەری گرتوو سەرکەوتنی بەدەستهێنا ئەوە لە بەرەی هەڵەبجەشەوە هێرش بکرێت بۆ سەر هەڵەبجە و دەست بەسەر بەنداوی دەربەندیخاندا بگیرێت و لەقەرەداغ و گلەزەردەوە هێزەکان لەگەڵ دوکان و چیای پشتی کلکەسماق و هەیبەت سولتاندا لێکبدرێتەوە، ئەمە ئەگەر سەری گرتوو سەرکەوتین مەرکەزی پارێزگای سلێمانی وچەندین قەزاو ناحییەی دەستی بەسەردا ئەگیریت، ئەم قسەو باسانە لەلایەن سەرکردە سیاسی و سەربازییەکانی ئەو کاتەی بەرەی کوردستانییەوە دەکرا.

هەرچی لایەنی ئێرانیش بوو باسی لە هێرشێک دەکرد بیکات لە ماواتەوە بۆ ڕزگارکردنی ئەو بەرزاییانەی کە دەکەونە نێوان هێزەکەی یەکێتیی و ئێران لە ناوچەی ماوات، بەڵام بەبیانوی ئەوەی بەربەستە

سروشتییەکان و کەشوهەوا بۆتە ڕێگر لە بەردەم ئەو هێرشەدا، بۆیە جێ بەجێ کردنی نەخشەکەیان گۆڕی بۆ گرتنی هەڵەبجە، ئەمە ڕاستییەکەی شتێکی دیکە بوو، لێرەدا جێ بەجێ نەکردنی بەڵێنەکانی ئێران بۆ نەخشەکەی ماوات و هاوکاری یەکێتیی، ڕازێکی ترو داستانێکی تری لای یەکێتیی هەیە، ئێران زۆر حەزی ئەکرد ئەم نەخشە جێبەجێ بێت و سەرگەوتووبن، چونکە بەتیرێک دوو نیشانەی ئەشکاند، نیشانەی دووەم گرتن یان دەرکردنی ڕێبەرایەتی کۆمەڵەو حیزبی دیموکرات بوو، ئەمانە دوو حیزبی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی بوون. لەم کاتەشدا سەرکردایەتیەکانی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی، کۆمەلە لە دۆلی جافایەتی لە ئاوایی چۆقماقو دەوروبەری و ڕێبەرایەتی حزبی دیموکراتیش لە گەورە دێ و دەورەبەریدا بوون.

بۆیە هۆکاری سەرەکی گۆڕینی نەخشەی ئەم هێرشە لەلایەن ئێرانەوە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کەدەولەتی عێراق لەبەرەی ماواتەوە بە هێزێکی زۆرەوە بەرگری دەکرد، لەبەرئەوەش بوو ئێران نەیتوانی پێشڕەوی بکات، هۆکاری ئەم بەرگرییە بەهێزەش ئەوەبوو کەعێراق دەیزانی ئەگەر ئێران لێرەوە سەرکەوتن بەدەستبهێنێت، ئەوە لەگەڵ ئەو ناوچە ڕزگار کراوانەی، کەلەژێر دەستی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستاندا بوون، لێک دەدرێنەوە و مەترسییەکی گەورە بۆسەر بەنداوی دوکان و شاری سلێمانی و بڕینی ڕێگای هەولێر - سلێمانی دروست دەبێت، هەربۆیە لەگەڵ شکانی ئەم هێرشەی ئێران لەسنووری ماواتدا، ئێرانییەکان بڕیاریاندا لە هەڵەبجەوە هێرش بکەن. لەشوێنی خۆیشیدا ئەوهۆکارە باس دەکەین بۆچی ئێران لەم ماوەدا زۆر پەرۆشی گرتنی ناوچەیەکی ستراتیژی عێراق بوو.

لەم سەروبەندەدا ئایەتوڵلا ڕەفسنجانی لەنوێژی هەینیدا ڕایگەیاند و ووتی: (میللەتی ئێران وەڵامی دەستدرێژییە هەواییەکانی عێراق بۆسەر شارو شارۆچکەکان و خەڵکی مەدەنی، لە بەرەکانی شەڕدا دەداتەوە).

لەوکاتەدا بۆ جێ بەجێ کردن و دانانی ڕێوشوێنی هێرشی سەر هەڵەبجە، یەکێتیی لەڕێگەی فەرەیدون عەبدولقادرو د.فوئاد مەعسوم و شەوکەتی حاجی موشیرەوە دەستیکرد بە گفتوگۆ کردن لەگەڵ قەرارگای ڕەمەزان، هەروەها لەلایەن پارتی و سۆشیالیستەوە بەهەمان شێوە بۆ

ئەنجامدانی نەخشەی گرتنی شاری هەڵەبجەو ناوچەکە بەگشتی، وتوویژەکان دەستیان پێکرد.

پرسیاری ئەوە دەکرێت، ئێران بۆهێرشی کردە سەرهەڵەبجە[1]؟ ئەی بۆچی لایەنە کوردستانییەکان ئەو کارەیان کرد؟ واتە بۆ بە هاوکاری ئێران هێرشیان کردە سەر هەڵەبجە؟ لەوەڵامدا دەڵێین: ڕژێم بەرنامەی جینۆسایدی گەلەکەمانی جێ بەجێ دەکرد گوندەکانی وێران کردبوو، نەخشەی ڕاگواستنی هەڵەبجەو شارو شارۆچکەکانی بەدەستەوە بوو، ئەنفال دەستی پێکردبوو، لەدوای شکستی گفتوگۆکانی یەکێتیی و عێراق، لە ١٩٨٥/١/١٥دا عێراق هەڕەشەی توندی کردبوو، یەکێتیش لە وەڵامدا گووتبووی: چیتان لەدەست دێت بیکەن، ئێمەش دریغی ناکەین، ئەوان ئەنفال و کیمیابارانیان دەست پێکردو ئێمەش لەگەڵ سوپای ئێراندا هێرشمان کردە سەر هێزەکانی ئەوان، سەرەتاو بۆ یەکەم جار لە سنوری کەرکوک بۆ سەر چاڵە نەوتەکان بەناوی فەتحی یەک، دواتر لەئەزمڕو لەهەڵەبجەدا.

لەوکاتەدا تەنیا یەکێتی، بنکەو بارەگای لەنێو قوڵایی کوردستانی باشووردا هەبوو، ئەوانەی سلێمانی و کەرکوک لەگەڵ ئەوانەی گەرمیان گەمارۆ درابوون، لایەنە سیاسیەکانی تریش بە زۆری بنکەو بارەگاکانیان لەسەر سنوور بوو، تەنیا هێزێکی بچوک بچوکی کەم نەبێت لەم دواییەدا لە ناوچەی قەرەداغ، ئەویش سەر بە پارتی و سۆشیالیست و شیوعی و دەعوە بوو لەگەڵ بەشێک لەهێزەکانی یەکێتیی، کە بۆ پارێزگاری ناوچەکە مابوونەوە. هێزە سەرەکییەکانی یەکێتیی هەموو چووبوونە دۆڵی جافایەتی و دەوروبەری سەرکردایەتی لەوێ لە شەڕێکی قورسدا بوون لەگەڵ هێزە چەکدارەکانی عێراق.

بۆ شکاندن و لەناوبردن و دەرکردنی ئەو هێزانەش کە لە ناوچەکانی قەرەداغ وگەرمیاندا مابوونەوە ڕژێمی بەعس لە چەندین لاوە هێرشی بەرب

---

[1] – وەڵامی ئەم پرسیارە، کە بۆ چی ئێران هێرشی کردە سەر هەڵەبجە؟ ئەمەیە لەوکاتەدا نەتەوە یەککرتوەکان بەنهێنی خەریکی گفتووگۆ بوون لەگەڵ هەردوولادا بۆ ڕاگەیاندنی ئاگر بەست، ئەوەیە هەمیشە بەر لەهەر ئاگربەستێک لایەنەکانی بەشەڕ هاتوو هەوڵ ئەدەن ناوچەی زیاتر بخەنە ژێردەستی خۆیانەوە. بۆئەوەی لایەنی بەرامبەر باشتر بێتە پێشەوە بۆ ڕێکەوتن.

لاوەی دەست پێکردبوو، دوای بەرگرییەکی سەخت و مەرگبار ناوچەکانی ڕزگارکراوی ژێر دەستی پێشمەرگە لە گەرمیان و قەرەداغ و جافایەتی سەر بەسلێمانی، سنوورەکانی ڕزگار کراوی کەرکوک و هەولێر هەموو گیران و شارۆچکە و گوندەکان وێران کران، خەڵک و پێشمەرگە، ئەوانەی ڕزگاریان بوو گەیشتنەوە قەندیل بەشێکی زۆریش شەهیدو ئەنفال کران.

ئامادەکارییەکان بۆ هێرشکردنە سەر هەڵەبجە لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٠دا تەواو بوبوو، دواجار لە شەوی ١٢و١٣ /٣/ ١٩٨٨دا شەڕ بۆ سەر دەوروبەری هەڵەبجە دەستی پێکردو لەڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٧دا کۆتایی هاتوو ناوچەکە کۆنترۆل کرا، لەڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦دا ڕژێمی بەعس تاوانی کۆکوژی دژی هاوڵاتیانی سڤیلی هەڵەبجە، سیروان، خورماڵ، هەورامان و شارەزووری ئەنجامدا بە چەکی کیمیایی قەدەغەکراوی نێودەوڵەتی هێرشی کردە سەریان کارەساتێکی تۆقێنەری لە سەدەی بیستەمدا خوڵقاند، کە بوو بەهۆی زیانێکی گەورەی ماددی و مرۆیی. ئەنجامەکانی تێکچوونی شیرازەی خێزانی، زۆر منداڵ بێ سەرپەرشت و زۆر دایکو باوک بێ منداڵ، زۆر خوشکو برا بێکەس. بریندارێکی زۆر، کە بەردەوام بە دەم ئازارەوە دەتلێنەوە، وێرانبوونی شارو شارۆچکەکان، وشک بوونی مەزراو دارو درەخت، پیسبوونی ژینگەی سنوورەکەو لەناوچونی گیان لەبەران ، بە هەزاران کەس لە یەک کاتدا کوژران، هەزارانی دیکەش بریندار بوون و دەیان هەزار کەسیش ئاوارەی ئێران بوون.

# ئامادەکارییەکان
# بۆ هێرشکردنە سەر هەڵەبجە

لەگەڵ کاک شەوکەت پێکەوە دانیشتین، بەرلەوەی ئەو باسی ئامادەکارییەکان و کۆبوونەوەکانی لەگەڵ ئێرانییەکان و لەگەڵ لایەنەکانی بەرەی کوردستانی بکات، من باسی ڕۆیشتنەکەمانم بۆ لای کاک نەوشیروان بۆبەرگەڵو کرد، باسی ئەو هێزەشم بۆ کرد کە لە قەرەداغەوە دەبوو لەگەڵ ئێمەدا بێنە ئێرە(هەورامان) بۆ بەشداری کردن لەگرتنی هەڵەبجەدا، نەهاتن و لەڕێگەدا گەڕانەوە، من نەمدەزانی ئەو هێزە دوای ئەوە کەلەسەر کاناڵەکەی سۆیلەمیش گەڕانەوەو نەیانتوانی لەگەڵ ئێمەدا بێن بۆ هەورامان، یەک ڕۆژ لەئاوایی چۆلکراوی موانی حەسەندا خۆیان حەشارداوەو شەوی دواتر هاتوون و لەبناری سورێنەوە سەرکەوتون بۆ سەر سنوور و گەیشتونەتە دزلی، لەوێوە لەپشتەوە بەناو ئێراندا بەڕێوەن بۆ لای ئێمە دێن بۆ هاوارە کۆن، ئەوەی بەبیرم دێت فەلاحی حەمەبۆرو لەتیفی حەمەی مەلاسابیر بەرپرسی ئەو هێزە بوون.

کاک شەوکەت هەروەک لەکتێبەکەی خۆیدا بە ناوی کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە نوسیویەتی پێی ووتم: من بە تۆپزی نێردراوم بۆ فەرماندەیی کردنی ئەم شەڕە، باسی کۆبونەوەکانی کاک فەرەیدون و کاک دکتۆر فوئاد مەعسوم و خۆی لەگەڵ ئێرانییەکان و کۆبونەوەکانی بەرەی کوردستانی و پاشان بەرەی کوردستانی و ئێرانییەکان و ژمارەو جۆری ئەو هێزەی لە بەردەستماندایە بۆ من کرد، دواتر داوای لە من کرد سەرنج و تێبینییەکانی خۆمی پێ بڵێم و زانیاری تازە چی هەیە لەسەر ناوچەکەو هەڵەبجە بیدەمێ.

منیش پێم گووت: سەرەتا باوەڕم ناکەم ئێرانییەکان بەجدی ئەم هێرشە بکەن، ئەو سوربوو لەسەر ئەوە بەجدی دێنە پێشەوەو هاتووشن، دیارە ئەو لەکۆبوونەوەکان و ئامادەکردنی هێزەکان و ئەوتێکە لاوەیەی چەند حەفتەی ڕابردوو لەگەڵیاندا بوبوو، زانیاری زیاترو باوەڕی زۆرتر بوو بەوەی، کەبەڕاستی هێرشەکە دەکەنە سەر هەڵەبجە.

من پێم وابوو ئێرانییەکان لەشوێنی ترەوە هێرش دەکەن بۆسەر عێراق، ئەم ئامادەکاریە لەسنووری هەڵەبجەدا بۆ خەلەتاندنی سوپایی عێراقە، هەروەها من لەو باوەڕەدابووم ئەم هێزەی یەکێتیی، کەکۆکراوەتەوە کەمەو موتەفەریقەیە، هێزە شەڕکەرو سەرەکیەکەی یەکێتیی لەوکاتەدا سەرگەرمی شەڕی حکومەت بوو بۆسەر سەرکردایەتی لەدۆلی جافایەتی.

هەروەها لەو بڕوایەدا بووم کێشەی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی، یەکێکە لەکێشە سەرەکییەکان و دەبێ بەرلە هێرشەکە چارەسەر بکرێت، بەتایبەت حزبی دیموکرات جگە لەو هێزەی هەیبوو لە ناوچەکە، نزیکەی ٦٠٠-٧٠٠ پێشمەرگەی تری خۆی لە ناوچەکانی دیکەوە هێنابوو بۆ ئەم سنوورە.

پێشتر ئێمە زانیارمان کۆکردبوەوە لەسەر هێزەکانی دوژمن هەموو لایەنەکانی شەڕەکەش خەریکی کۆکردنەوەی زانیارین لەسەریەک، بەڵام زوو زوو ئاڵوگۆڕیان بەسەردا ئەهات. بۆیە ئەو زانیاریە نوێیانە کەلای من بوون لەسەر هێزەکانی سوپای عێراق ئاگادارم کردەوە لێیان، چونکە من ڕۆژی پێشتر لەسەر پردی زەڵمەوە تاناو شاری هەڵەبجە بەناو هێزەکاندا هاتبووم وەشەوەکەشی لەناو شاردا بووبووم برادەرانی ڕێکخستنی شارم دیبوو.

لەو ماوەدا من چووبومە سەرکردایەتی، کاک حامدی حاجی خالید هەوڵی دابوو زیاتر زانیاری کۆبکاتەوە، بۆیە چەند مەفرەزەیەکی سەربەتیپی ١١ی هەورامانی ناردبووە خوارەوە بۆ هەموو سنوورەکە، یەکێک لەو مەفرەزانە چەند ئەندامێکی قەرارگای ڕەمەزانیان لەگەڵ بوبوو، ئەوکات لەبری ووشەی پاسدار ووشەی خزمانمان بەکار ئەهێنا، لەبەر ئەوە ئەو مەفرەزانە تووشی چەند شتێکی سەرنج ڕاکێش ئەبن، لێرەدا بەکورتی ئەیهێنمەوە یاد، مەفرەزەی یەکەم حەمەدی حەمەسەعیدو ئەکرەم ئەحمەدو تەحسین بیارەیی بوبوون، چوارکەس لە خزمانیشیان لەگەڵدا بووە.

ئەم مەفرەزە بۆ شناسایی و وێنەگری و فلیم بەرداری سەربازگەو ڕەبیەکانی دوژمن بەکەمجار ئەچنە سنووری ئاوای عەنەب، ئەکەوێتە دەستە ڕاستی شاری هەڵەبجە، ڕۆژەکەی لەناو باخەکانی ئاوای دەرەشیشدا ئەمێننەوە ئیختیفا ئەکەن واتە خۆ ئەشارنەوە، چاوەڕێ دەبن دەمەو ئێوارە ئیشەکەیان بکەن، لەکاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆدا کاتێک ئەزانن چەند فیشەکێک ئەتەقێ، گوللەکان لەنزیکیاندا ئەکەون ئەمانیش وا دەزانن دوژمن

پێی زانیون بۆیە خۆکۆ ئەکەنەوەو خۆئامادە ئەکەن. مەهدی لائەگرێ، گوێی لەدەنگە دەنگ ئەبێت، ئەبینی سەیارەیەکی جیپ لەسەر ئەو جادەی کەنزیکیانە وەستاوەو سێ کەس دابەزیون نیشانەیان داناوە نیشانە شکێنێ دەکەن، نیشانەکەش رووبەرووی ئەمانە. مەهدی بەهاوڕێکانی ئەڵێت بێنە ئەملاوە گوللەی وێڵی نیشانە شکێنێ ئەمانکوژێت، پاسدارەکان ئەترسن ئەپرسن چیە؟ ئەڵێن هیچ نییە چەند چەکدارێکن ئێستا ئەڕۆن، کەچی چەکدارەکان دێنە خوارەوە بۆناو باخەکان ڕاست بۆ ئەو شوێنەی پێشمەرگەکانی لێیە، ئەمانیش بێدەنگ خۆیان ئامادە ئەکەن تانزیک ئەبنەوە لێیان، ئەمبەروو ئەووبەری جۆگەی ئاوە، لەناکاو پێشمەرگەکان میل ڕائەکێشن و یەکێکیان دەڵێت نەجوڵێن چەکەکانتان دابنێن، لەترسانا ئەکەونە جۆگەی ئاوەکەوەو چەکەکانیان فڕێ ئەدەن.

ئەرکەکەی بۆی چوون ڕێک ناکەوێت ئەگەڕێنەوەو ئەمانە لەگەڵ خۆیان ئەهێنن، سێ کەسەکە دووانیان چەکداری جاشی سووک ئەبن بەناوەکانی جەلال محەمەد فەرەج و شالیار سەباح، کەسی سێیەم شۆفێری جیپەکە بووە بەناوی عیزەتی رەعنا کە ئەندامی ڕێکخستنی شۆڕش گێڕان بوو، عیزەت هەوڵ ئەدات پێشمەرگەکان ئەم دووکەسە نەبەن و لەبەر خاتری ئەو بەریان بدەن، کەلەهەوڵەکەیدا سەرکەوتوو نابێت تووڕە ئەبێت و ئەڵێت بەمەهدی لەم سنوورە نەقڵت ئەکەم ئەگەر ئەمانە بەریت و بەریان نەدەیت، مەهدی سەری سوڕ ئەمێنێ ئەم کابرا ئاوا قسە ئەکات ئەیەوێت لێی بدات، ئەکرەم ئەیباتە لاوە ئەڵێت ئەمە ڕێکخستنی شۆڕش گێڕانە بەپەرمین و نازەوە ئەوقسە ئەکات، مەهدیش وازی لێ ئەهێنی و ئەیان هێنن و شوێنەکە بەجێ ئەهێڵن.

بۆجاری دووەم دوای چەند ڕۆژ لەم ڕووداوە، هەمان مەفرەزە دەچنە سنووری بیارە، پێشتر نەجمەدینی مەلامحەمەدی زەڕایەنی بەنهێنی هاتووە بۆ هاوارەکۆن، بڕیار بووە فەرماندەی سرییەیەک لەفەوجی شێخ برایم هاوکاریان بکات بۆ وێنەگرتن و وەرگرتنی زانیاری لەسەرشوێن و ژمارەی بنکەو مۆڵگەکانی سوپای عێراق لە نێوان بیارەو ئاوای بەڵخە لەناوچەی هەوراماندا ، ئەو کەسە کە فەرماندەی سرییەی جاشان بووە، ناوی جەبار بووە، رەبیەکەی لەنزیک بیارەدا بووە، کات دیاری دەکەن مەفرەزەی

پێشمەرگەکان بچنە ناو خانەباخێک لەناو باخەکانی بیارەدا کەخانەباخی وەستا تەوفیق بووە، نەجمەدینیش لەڕەبیەکەی جەباردا چاوەڕێیان بکات، تاکەسێک لەلای پێشمەرگەکانەوە بچێتە لای بۆناو ڕەبییەکە. پێشمەرگەکان بەر لەوەی لەهاوارە کۆنەوە بکەونەڕێ، پێشمەرگەیەک بەناوی کازم فەتاح تەوێڵەیی ئەنێرن بۆ ناوشار لەڕێگای ڕێکخستنی هەڵەبجەوە ئاگاداری فاروق حەمەسالح و سابیر فەتاح بیارەی ئەکەن لەو ڕۆژەدا کەدیاری کراوە بێن بۆ ئەو خانەباخەی پێشمەرگەکان ئەچن لێی ئەمێننەوە، بۆئەوەی خواردنیان بۆببەن و ببنە پردی پەیوەندی نێوان پێشمەرگەکان و نەجمەدین و ئەوکەسەی بەرپرسی ڕەبیەکەیە.

پێشمەرگەکان لەکاتی دیاری کراودا ئەگەنەجێ، لەناو خانەباخەکەدا ئەخەون و پاسەوان دائەنێن، ڕۆژ ئەبێتەوە چاوەڕێی سابیرو فاروق ئەکەن، ئەبینن ئەوە دووکەس لەو باخانەدا هاتنەخوارەوە بەرێکەوت ئەچنە لای پێشمەرگەکان ئەوانیش فاروق و سابیر نین بەڵکو دووکەسی ترن بەناوەکانی ڕۆستەم نادرو ڕزگار سادق، ئەمانە بەرێکەوت هاتوون وئاگایان لەهیچ نییە، بەڵام ئەمانیش دۆستی دڵسۆزی یەکێتیی و پێشمەرگەن، ڕزگاریش ئامۆزای تەحسینە کە یەکێکە لە پێشمەرگەکان، ماوەیەک لایان ئەمیننەوە، سابیرو فاروق دیار نابن، بۆیە ڕزگار ئەنێرن بۆ ڕەبییەکە، ئەڵێن برۆ بۆ ئەو ڕەبیەو بڵێ من نەجمەدینی مەلامحەمەدم ئەوێت، کەبینیت بیبەرە لاوە پێی بڵێ پێشمەرگەکان هاتوون، منیان ناردوە بتبەم بۆ لایان، پێیان ووتوە نەجمەدین شکڵو ڕوخساری چۆنە نەوەک یەکێکی تر خۆی بکات بەو، ڕزگار ئەگاتە ناو ڕەبیەکەو هەواڵی نەجمەدین ئەپرسێ، ئەڵێن بۆ چیتە؟ ئەڵێت ئیشم پێیەتی، ئەیگرن و ئەیبەن بەرپرسی ڕەبیەکە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ ئەکات، ڕزگار بۆی دەرئەکەوێت ئەمە ئەوکەسە نییە ئەم هاتووە بۆلای، لەکاتی پرسیارو وەڵامدا لەوەلامدا، ئەڵێت من دوکاندارم لەبیارەدا، ئەوان شمەکیان بردووە و پارەیان نەداوە قەرزارن هاتووم بۆ پارەکەم. ئەوانیش ئەڵێن ئەوان ڕۆیشتوون دوو ڕۆژە یەکترمان گوریوە. ڕزگار دێتەوە بۆ لای پێشمەرگەکان و داستانی چوونەکەی بەیان دەکات بۆیان، لەمکاتەدا خرابتر ڕوودەدات.

هەموویان لەناو خانەباخەکەدا دانیشتوون و گوێیان لەرزگار گرتوە حکایەتەکەیان بۆئەگێڕێتەوە، نازانن یەکێک لە پاسدارەکان چۆتە دەرەوە

لەبەردەم خانوەکەدا چۆمی ئاوە لەگوێ ئاوەکەدا نوێژ ئەکات، مەهدی ئەڵێت کێیە لەدەرەوە؟ ئەڵێن کەس، ئەڵێ دەنگەدەنگ دێت، دەردەپەڕێت ئەبینێ چەکدارێک والەوبەر چەمەکەوە بانگی ئەم پاسدارە ئەکات بچێت بۆ لا-پاسدارەکەش ملی ناوە بەرەولای خانوەکەو ووەلامی ئەو چەکدارە ناداتەوە، مەهدی بەهاوڕێکانی ئەڵێت وەرنەدەرە، لەوکاتەدا دوو چەکداری تر لەپشتی خانوەکەوە بەمەهدی ئەڵێن کێیت چەکەکەت دانێ؟ ئەویش ئەڵێت ئێوە کێن وەرنە خوارەوە تانەکوژراون ئەکرەم و تەحسین دێنەدەر پلنگ ئاسا بێشلەژان یەکێکیان بۆ لای مەهدی و ئەویتریان پەلاماری ئەوەی ئەوبەر چەم ئەدا، ئەوە ناوی عەلی بووە چەکەکەی فڕێ ئەدات، ئەمانیش دوانەکەی ئەمبەر چەک ئەکەن، ئەمانە یەکێکیان ناوی فازڵ بوو خەڵکی ئاوایی ڕەزڵەی شارباژێری بەرکێو بوو، ئەویتر ناوی ئەبوبەکر بوو.

ئەمانە پێنج جاش بوون دوانی تریان کەمێک لەمانەوە دوورتر بوون بانگیان ئەکەن وەرن نایەن پێشمەرگەکان ئەیانەوێت تەقەیان لێبکەن، عەلی ناوەکە ئەڵێت تەقەمەکەن من ئەچم ئەیانهێنم بەبێچەک ئەڕوات کەئەگاتە لایان ئەمیش لەگەڵ ئەواندا ڕائەکەن و ئەڕۆن، تەحسین ماوەیەک بەدوایاندا ئەڕوات فریاناکەوێ ئەگەڕێتەوە. سەرئەنجام سێ کلاشینکۆفی پەڕەشووت و کۆمەڵێک فیشەکی باشیان دەست ئەکەوێ، لەوکاتەدا ئەمە ڕووئەدا ڕزگار لە خانوەکەدا دەر ئەچێت و لەلاڕێوە خۆی قوتار ئەکات، پێشمەرگەکانیش بەو نیوەڕۆیەو لەناوەڕاستی ئەو هەموو دوژمنەدا شوێنەکە بەجێ ئەهێڵن و بەناو باخەکاندا بەدیل و دەستکەوتەوە دێنە خوارەوە بەرەو ئاواییەکانی دەرەقەیسەرو خارکێلان تا هەوا تاریک ئەکات ئیتر شەو قەڵای مێردانە.

هەرلەم ڕۆژانەدا مەفرەزەیەکیتر کەهەڤالان کاک جەمیلی مەلامستەفاو عومەری کیخا ئەحمەدو چەن پێشمەرگەیەکی تربوون، دەستەیە پاسدار لەگەڵ خۆیاندا ئەبەن و ئەچنە ناوشار، پاسدارەکان تەسلیمی دەستی حەسەن بامۆکی ئەکەن، لەوێ لای ئەو ئەمێننەوە بەڕۆژدا ئەیانبات بۆ دەورو پشتی سەربازگەی دەلەمەڕ کاری وێنەگری و زانیاری کۆکردنەوە تەواو ئەکەن، مەفرەزەیەکیتر کەهەڤالان مەهدی و ئەکرەم و عوسمانی حاجی فەرەج و چەند پێشمەرگەیەکی تر ئەچن ئەیانهێننەوە، ئەم ئەرکە بەهەموو پێشمەرگەیەک نەئەسپێردرا.

لەگەڵ ئەمەشدا چەندین دەستەی تری شناسای و هەواڵگری و هەندەسی بەشەودا ئەڵغامی بەردەم سەنگەرەکانی پێشەوەی بەرەکانی شەڕگەکانی سنوورەکەو دەورپشتی سەربازگەو ڕەبیەکانی سوپای عێراقیان لابردبوو، چەندین دەستە پاسداریان ئەهێناو شارەزای شوێنەکانیان ئەکردن. هەر بەهەمان شێوەی سەرەوە کەباسکرا بەهاوکاری یەکێتیی چیان کردووە بۆ ئامادەکاری لەوناوچانەدا کەیەکێتیی لێبوو، لەوناوچانەشدا کە سۆشیالیستی لێبوو وەک بناری سورێن، یان پارتی لەبناری ئەحمەد ئاواو زەڵم هەمان ئامادەکاری کرابوو، بزووتنەوەی ئیسلامیش بۆناوشاری هەڵەبجە هاوکاری باشیان کردبوو.

نەخشەی مەیدانی هێرشی ئێران بۆ سەرشاری هەڵەبجەو دەوروبەری



# دابەشبوون و
# شوێنی هێزەکان

لەسەروبەندی شەڕی عێراق ـ ئێراندا ئەو دەمەی کەهەڵەبجەی تیادا کیمیاباران کرا، هێزەکانی عێراق و ئێران، ئۆپۆزسیۆنی عێراقی و ئێرانی لە ناوچەکەدا مەبەست سنوری قەزای هەڵەبجەیە بەم شێوەیەی خوارەوە دابەشبوو بوون، لەباشوورەوە بە سنوری هەردوو وڵاتدا بەرەو باکور.

لەسەردەریاچەی دەربەندیخانەوە سوار بەسەر ئاوی سیرواندا بۆ لای چیای باڵامبۆو شنروێ، لەهەورامان لەپشتی چیای پەروینی بۆلای شۆشمێ و وەزڵی، لەپشتی ئاوێسەر بۆ بەرزاییەکانی تەوێڵە لەوێوە بۆ هەوارە بەرزەو بەرزاییەکانی بیارەو چیای شرام و چیای سورێن، لەناوچەی نەورۆڵی و سەرلوتکەی نوەر، لوتکەی باڵامبۆ بۆ بەرزاییەکانی پشتی چنارو مۆردینو مەگر نزیکەی ٢٠ سەربازگەو بنکەی ڕەبیەی فەوج و سریەو فەسیلی عێراقی لێ بوو، لەدۆڵی سازان چەکدارەکانی عەشایەری ئێران، کە دژی دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی دەجەنگان لەناو سازان و سەرچاوگی سازان و کۆساواو شێخ مۆمندا بنکەو بارەگایان هەبوو.

لەسەرملەی نێوان ئاوایی کوکویی نشینی چنار، ئێناخی نشینی سازان چەند مۆلگەیەکی سەربازی عێراقی لێ بوو، لەملەهوملە، ملەی ڕێشاوو دەڵەمەڕ بۆسەر بەفری میری، دارەڕەش، عەزیز ئەتروشی، کەنگەسپی نێوان بۆینو گریانە چەندین بارەگای سریەو فەسیلی عێراقی لێ بوو. ئەمانە وەک سەنگەری پێشەوەی عێراق بەرامبەر بە ئێران و بەرامبەر بەهێزی پێشمەرگەی یەکێتیی، کەبنکەو بارەگانی تیپی ١١ی هەورامان لە دەوەرە لەبەردەم ئاوایی مۆردین و چناردا بۆسەر ئاوی سیروان، ڕووبەڕووی بەردەم زنجیرە چیاو تەپۆلکەکانی باڵامبۆ، لە هاوارە کۆن و گریانەو بۆین دا ڕووبەڕووی چیای شنروێ و بەفری میری هەبوون.

عێراق لەسەر چیای پەروینی و قەڵاتەی شوانان و پشتی دەرەتفێ بەزنجیرە گردۆلکەو شاخەکاندا بۆ سەر بەرزایی نێوان نەوسوودو تەوێڵەو ئاوایی دزاوەر، نزیکەی ٣٠ سی سەربازگەو بنکەڕەبییەی فەوج و سریەو

فەصیلی هەبوون، لەوێوە لەبەرزاییەکانی پشتی ئاوێسەرو بەرزاییەکانی گۆزیندار تەوەنێ و هەوارە بەرزە، کە دەکەوێتە نێوان گوندەکانی بەلخە لەدیوی عێراق و کێمنەو هانەگەرمەڵە لەدیوی ئێران ٢٥ بیست و پێنج خاڵی سەربازی عێراقی لەسەر بوو، سەرشاخی شرام و زنجیرە بەرزاییەکانی نێوان بیارەو گوندەکانی گولپ و سەرگەت ١٥ پانزە سەربازگەو بنکەی فەوج و سریەو فەسیلی تری لێ بوو. بەرزاییەکانی نێوان ئاواییە چۆڵ کراوەکانی زەڵم و سەرگەت و ئەحمەدئاوا، شەش بنکەو سەربازگەی لەسەر بوو، بەرزاییەکانی ملە قۆندرەی پشتی ئاوایی هانەی قوڵو باخچەی بەرامبەر ئەحمەدئاواو نەیجەکۆڵەی نێوان ئاواییەکانی چۆلکراو وێرانی بانی شارو یالانپێ بۆ پشتی شیرەمەڕو عامورەو گردەکانی سێ تەپانو بەوشو لاشانی نەوێو گردۆلکەو بەرزاییەکانی گولەخانە، نزیکەی١٧ حەڤدە سەربازگەو بنکەی فەوج و سریەو فەسیلی عێراقی لێبوو. ئەمانەی سەرەوە هەموو سەنگەری پێشەوەی بەرەی شەڕی عێراق بوون بەرامبەر بەهێزەکانی ئێران.

بەرامبەر بەم هێزەی عێراق لەدۆڵ و شیوەکانی چیای سورێن هێزی سۆشیالیست. لەخۆرنەوازان، وشکەناو و کەڕەجاڵ هێزی پارتی لێبوو. لە شیو و دەرەو دۆڵ و ئەشکەوتەکانی بەردەم بەرزاییەکانی بالانبۆ بەلێواری ئاوی سیرواندا بۆلای ئاواییەکانی بۆین، گریانە، هاوار، هاوارەکۆن و دەرەتفێ هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانی لێبوو.

لەپشتەوەی ئەمبەرەی پێشەوەی شەڕدا، لەدەوروبەری هەڵەبجەدا، سەربازگەی زەمەقی، سەربازگەی تۆپخانەی دەڵەمەڕو سەربازگەی هەڵەبجە پشتی شار، لەگەڵ سەربازگەی نزیک ئاوایی عەنەب، سەربازگەی خەرپانی، سەربازگەی پالانیا تۆپخانەو سەربازگەی بەلخەو تاڤانی بیارەو سەربازگەی دەلێن لە ئاوای ڕۆستم بەگ، سەربازگەی قەدەفەری لەگەڵ گولەخانە، لەگەڵ دەیان بنکەو رەبییەی پاسەوانی ئەم سەربازگەو تۆپخانەو بارەگاو بنکانەی پشتەوەی ئەم بەرەی جەنگە، لەگەڵ سەدان چەکداری تایبەت مەفرزە خاسەو فەوجی سوک و تاقمی چەکداری جیاواز جیاواز بوونیان هەبوو.

بەرامبەر بە هێزەکانی سوپای پاسدارانی ئێران، هێزەکانی کۆمەڵەی ئێران و سوپای ڕزگاری لە بیارە و هێزەکانی دیموکرات لەهانەگەرمڵە، دەرەتفێ، نەوسوود و بەرزاییەکانی قەلاگا، ئاوەزنێ، پەروێنی و ناوشاری

نەوسوود و گوندەکانی شۆشمێ و شێنەو چەمو دۆلەکانی ئەو گوندانە هێزی حزبی دیموکرات هەبوون. لەچەم و دۆلی سازاندا چەکدارە عەشایەرەکانی: ئێناخی ،ئیمامی، جوانرۆیی و باوەجانی هۆزوتیرەکانی تر، ئەمانیش لەبەردەم هێلی پێشەوەی عێراق ڕووبەڕووی ئێران وەستابوون.

بەرەکانی پێشەوەی ئێران بەرامبەر بەئۆپۆزسیۆنی ئێران و هێزەکانی عێراق. لەم شوێنانەدا جێگیرببوون، سەرچیای بێزەل، دڕۆلە، سەرسورەوان، لەسەر ڕێگای سەرپێل بۆ دووئاو، لەپشتی گوندەکانی: سیمان، بەورۆل، هەنجیرک، مەڕەخێل. هەروەها لە بەرزاییەکانی: گوزێل، لەئاواییەکانی هێرتاو زێ، لە کونەکەل و تراشە، لەشێخان و بەرزاییەکانی ڕۆژهەلاتی نەوسوود، تەشارو وەزلی، هەروەها لە شەمشی، هەرات، نوەیجەڕ، دالانی و ملەخورد.

ئەم هێزانە جگەلەوەی لەکاتی هێرشەکاندا پێک هەلدەپژان، جاروبار لێرەو لەوێ هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی بۆلێدانی سوپای ئێران، ئۆپۆزسیۆنی عێراق بۆ لێدانی هێزەکانی عێراق، بەشێوەی شەڕی پارتیزانی و نامونەزەم، دەچووینە قولایی پشتەوەی هێزەکان بۆلەناکاو غافلگیرکردنی چەند بنکەو سەربازگەیەک یان دانانی بۆسە لەسەر ڕێگاکانی هاتووچۆ یان جاروبار دروستبوونی شەڕی گەورەو زیان لێدان لەدوژمن.

لەم سنوورەدا، کە باسەکەی لەسەرە، لەسەر ڕێگاو دەوروبەری پایگاو سەربازگەکان و سەرکانی و ئاو و ڕێگای لاپالو چەمو دۆلەکان، بەهەزاران مینی دژە مرۆڤ، دژە ئۆتۆمبێل و تانک بەشێوەیەکی بەرب لاوەو نارێکو پێک چێنراون. لەوکاتەشدا لە سنوری قەزای هەلەبجەدا، ئاوەدانی تەنیا لەم شوێنانەدا هەبوو: ناوەندی قەزای هەلەبجە، کۆمەلگاکانی زەمەقەی و عەنەب، کەئەویش لەگەل ناوەندی شارەکە تێکە لاوە ببوون وەک دوو گەڕەکی شارەکەیان لێهاتبوو، هەرسێ ناوەندی ناحیەکانی: خورمال، سیروان و سەیدسادق.

بۆ چاودێری و پارێزگاری لە ئیدارەکانی حکومەت و پاراستنی ڕێگاکانی ئەم چوار شارۆچکەش حکومەت دەیان سەربازگەو بنکەو بارەگای لە ناوچەکەدا دانابوو، تەوێلەو بیارەش بەهۆی نزیکیان لە سنوورو هێلەکانی پێشەوەی شەڕەوە لە ڕابردوودا چۆل و وێران کرابوون و هێزی عێراقیان لێ بوو، ئەم هێزانە لەم شوێنانەدا چەندین سال بوو جێگیر کرابوون، تاکاتی

هێرشی پێشمەرگەو ئێران بۆ سەر هەڵەبجەو دەوروبەری لە شەوی ١٢و١٣ /٣ / ١٩٨٨دا، بەوشێوەیەی، کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا عێراق هێزی لە سنوورەکە هەبوو.

بەڵام لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/٥ بەدواوە تاشەوی هێرشەکە، حکومەتی عێراق هەندێک هێزو کەرەستەی جەنگی زیاتری هێنایە ناوچەکەو هەڵەبجە، هەرلەم کاتەدا کەش و هەوا باراناوی بوو، سەر بەرزاییەکان سەرماو سۆڵەیەو دەشت و پێ دەشتەکانیش قوڕو لیتە، چۆم و جۆگەو کانیاوەکانیش ئاوێکی زۆر بەرچاویان لێ ئەڕواو ئەڕژێتە ناو گۆلاوی دەربەندی خان.

بەرنامەی هێرشی هێزەکانی ئێران بەم شێوە بوو: قەرارگای ڕەمەزان لەگەڵ هێزەکانی یەکێتیی، سەربازگەکانی پاسەوانی تۆپخانەی دەڵەمەڕ بگرن، هێزێکی تری یەکێتیی بەپارتیزانی بچێت بۆ ناوشاری هەڵەبجە، بەشێکی تری هێزی (ی.ن.ک) سەربازگەو بەرزاییەکانی ئەشکەهۆڵ و شنروێ بگرن، هەر ئەم قەرارگا لەگەڵ سۆشیالیست لە پشتەوەی هێزەکانی عێراق و لە سنوری پردی زەڵم و شارۆچکەی سەیدسادق بەپارتیزانی لەگەڵ دەست پێکردنی هێرشەکەدا چەند چالاکیەک ئەنجام بدەن بۆ شڵەژانی هێزەکانی عێراق، قەرارگای قودسیش لەچنارەوە بۆسەر پردی زەڵم، قەرارگای فەتح لەدرۆڵەو سیمانەوە بۆ ناوچەی نەورۆلی و بالامبۆ و چیای تەمورەژنان و سورمەرو چیای شەمێران بڕوات. قەرارگای ئامن ئائمە لە گوزێلەوە بۆ سازان و سەر شاخی مەگرو ملەهۆملەو بەشێکی شنروێ بڕوات.

قۆڵی لای باکووری هەڵەبجە، کە قەرارگای قودس و بەشێک لە قەرارگای ڕەمەزان و هێزەکانی پارتی و سۆشیالیست لێی بەرپرسیار دەبن. هەروەها قۆڵی لای باشوور، کە قەرارگای فەتحە لەلای ناوچەی نەورۆلی و تەمورە ژنان و ملەی دارێ بەرەو شارۆچکەی سیروان بڕۆن، ئەم دوو قۆلە لێکبدەنەوەو هێزەکانی عێراق، کە دەکەونە پشتی پردی زەڵمەوە تا تەوێڵەو شرام و پالانیاو چیای پەروینی بڕبدرێن. بەشێکی قەرارگای ڕەمەزان و تیپی ٧٥ی‌زەفەرو هێزەکانی یەکێتی و بەشێکی قەرارگای ئامن ئائمەش ئەرکیان ئەوەیە بکەونە وێزەی ئەم هێزەگەمارۆ دراوەی عێراق، نەخشەکە بەوشێوەیە بوو. بەڵێ هەموو ئەوکارانەی بۆ هێرشێکی وا ئەکرێت جێ بەجێ کرا، تەنیا

مابوویەوە، قسەکردن لەگەڵ حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی ئێران وسوپای ڕزگاری، ئەویش سپێدرا بە من و کاک حامدحاجی خالید و نیازی عیزەت.

هێزەکەی یەکێتیی کرا بە دوو ڕەتل، دابەشکردن و ژمارەکەی بەم شێوەیەی خوارەوە بوو: ١٢٥ پێشمەرگەی تیپی پانزەی هەورامان، کەئەمانە شارەزا و باشترین هێزی ئەم هێرشە بوون، بەم شێوە دابەش کران: ٥٠ پێشمەرگەیان لەگەڵ ٦٠ پێشمەرگەی تیپی ٥٣ی شێروانە لەگەڵ کاک قادر کۆکۆیی و کاک سەلامی کوێخا عەزیزدا و مەهدیدا دەبنە هێزێک بۆ کاتژمێری سفر بە پارتیزانی دەچنە نزیک سەربازگەی دەڵەمەڕ، بۆ گرتنی سێ بنکەی پاسەوانی سەربازگەو تۆپخانەکەی دەڵەمەڕ.

هێزێکی تیپەکانی باڵەک، کوڕەک، کاروخ لەگەڵ ٣٠ پێشمەرگەی تیپی ١١ی هەورامان و دەستەکەی کاک حامدو من(حەمەی حەمەسەعید) کاک قادر خەبات ڕەتلی یەک دەبین بۆ گرتنی بنکەکانی ڕەبیەکانی سەر بەرزاییەکانی نێوان تاوێرە و شنرویێ.

کاک شەوکەت، هەڤالان ئەکبەر ئێناخی و فەلاحی حەمەبۆرو لەتیفی حەمەی مەلا سابیرو مەجیدی حاجی عەلی و حەمە مۆریاسی ڕەتلی دوو دەبن، کە دەبنە نزیکەی ١٥٠ پێشمەرگەی تێکە لاوە لە تیپەکانی ١١ی هەورامان ٥٥ی قەرەداغ و ٣٥ی کوڕەکاژاو ١٥ی شارەزوورو ٣٧ی شارباژێڕ. ئەمانە بەرەو ڕێشاو و پشتی سازان دەچن و چاوەڕێی گرتنی ناو شاری هەڵەبجە دەبن.

تیپی ٣٣ی سورێن نزیکەی ٥٠ پێشمەرگە لەگەڵ کەماڵ شاکر شەوێک پێشتر ئەیانباتە ناوشارو بە هاوکاری ڕێکخستنەکانی ناو شار لەکاتی هێرشەکەدا پەلاماری هەندێک شوێن ئەدەن. کۆمەلایەتی و ئیدارەش بارەگا سەرەکیەکەیان لە هاوارە کۆن دەبێت مامۆستا سالح ماوەتی بەرپرسی بەڕێوبەری کاری ئیداری هەردوو ڕەتلەکە دەبێت. لەسنوری ئەم هێزانەی ناوم بردن ئێرانییەکان بەرپرس دەبن لەگرتنی سەربازگەی دەڵەمەڕو سەرلوتکەی بەفری میری و چیای بالامبۆ.

- بۆ بڕینی ڕێگای سلێمانی . هەڵەبجەش سۆشیالیست و هێزێکی ئێران دەچنە سەر ڕێگای سەرەکی لە نزیک ئاوایی تەپەڕێزینەو پردی زەڵم.

- پارتیش لەگەڵ ئێراندا بەرزاییەکانی پشتی خورماڵ و ناو شارۆچکەی خورماڵیان بۆ دانرابوو.
- بزوتنەوەش لەگەڵ ئێرانییەکان خۆیاندا دەبن بۆ کاری لۆجستکی، لەشکری بەدریش لەگەڵ سوپای پاسداراندا بۆ سەر سەربازگەی دەڵەمەڕ.

ئەو کەسانەی کە دانرابووین لەگەڵ حزبی دیموکرات و کۆمەلەدا قسەبکەین، چووینە هاوارە کۆن لەگەڵ هەڤال کاوەی بارامی فەرماندەیی هێزی شاهۆو محەمەدی وەلەدبەگی بەرپرسی پەیوەندییەکان و چەند کادیرێکی تریان دانیشتین، سەرەتا باسی بارودۆخەکەمان بۆ کردن، کە عێراق بەرنامەی ئەنفال و چۆلکردنی شارو شارۆچکەکانی هەیەو شەڕێکی گەورەی بەرپاکردووە بۆ سەر سەرکردایەتی یەکێتیی، ئێمەش لەگەڵ ئێران ڕێکەوتووین و بەنیازین هەڵەبجە بگرین بۆیە داوامان وایە ئێوە یەکەم ئەو هێزە زۆرەی هێناوتانە بیاننێرنەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان و ژن و منداڵ و کەلو پەلی زیادە لە سنوورەکە مەهێڵن و خۆتان کۆبکەنەوەو ئامادەبن، بۆئەوەی ئەگەر ناوچەکە گیرا، ئێوە بە ئاسانی بتوانن دەربازبن.

سەرەتا وتیان ئێران هێرش ناکات، عێراق هێزی زۆری لە ناوچەکەدایەو خۆیشی قایمتر کردووە، ئەوان لەوباوەڕەدا نەبوون ئێران بتوانێ ئەو هێرشە بکات، بەڵام گووتیان: کۆبوونەوە دەکەین و وەڵامتان ئەدەینەوە.

پێشتر کاک شەوکەت نامەیەکی نووسی بوو، نامەکەمان بۆ کۆمەلەو گوردانی شوانی کۆمەلە لە بیارە نارد و هەمان قسەو باسمان بۆ سوپای ڕزگاری نوسیبو لە نامەیەکدا بەڵام نامەکەی سوپای ڕزگاری نەنێردرا، داوامان کردبوو لەحیزبی دیموکرات ئەوان خۆیان لەگەڵ ڕزگاریدا قسە بکەن.

ئێمە کەلەلای دیموکرات گەڕاینەوە لەگەڵ برادەرەکانی خۆمان و چەند کەسی ئێرانی و ئەندامانی قەرارگای ڕەمەزانیش دووبارە لەسەر ئەم بابەتە کۆبووینەوە، ئێمە بەبێ پێچ و پەنا وتمان حزبی دیموکرات دۆستمانن و هاوکاری ئێمەیان زۆرکردووە نامانەوێ ئێمە لەم شەڕەدا لەگەڵیان دەرگیربین لەوباوەڕەشدا نین وەڵامی ئەم دانیشتنەمان بدەنەوە، ئێرانییەکان گووتیان: ئێمە لە سنوری شێخان بۆ قەڵاگاو لە نەوسوەوە بۆ تەوێڵە هێرش ناکەین خۆتان بەرنامەکە ئاگادارن عەمەلیاتەکە عەمەلیاتی گرتنی شاری هەڵەبجەیە.

لە لای سوورێنەوە پردی زەلّم دەگرین و لەم لاشەوە بەرەو دەریاچەکە دەڕۆین دیموکرات و کۆمەلە با هەر لە جێگەی خۆیاندابن یان ئەگەر ئەوانە هەرکەسیان ئامادەیە پێشتر بێتە لای ئێوە بەتایبەت ئەوانەی بەرگری و خەلّکی عەشایەرن ئێوە پسولەیان بدەنێ ئێمە دەست ناهێنینە رێگەیان. من بۆ خۆم دەمزانی ئەم جۆرە قسانە دواتر جێ بەجێ نابن[1]، لەوبارەوە کێشەی گەورەمان بۆ دێتە پێش.

هەر لەم کاتەشدا لە رێگەی دۆست و خزم و رێکخستنەکانەوە ئاگاداری بەشێکی خەلّکی هەلّەبجەمان کردبوو، کە ئێران هێرش دەکات و شارەکە ئەگیرێت، بەلام کەس بڕوای نەکرد.

کۆمەلە وەلامیان نەبوو، دووبارە من و کاک شەوکەت و چەند کەسێکی تر چووینەوە بۆ لای دیموکرات بۆ بارەگای سەرەکیان لە ئاوایی دەرەتفێ لەگەلّ مەنسووری فەتاحی و کاوەی بارامی و حەمەی وەلەدبەگی و حەمەی موزەفەری دانیشتین، ئەمجارە بەجدی داوامان کرد هەرچەندە ئەمە قسەی ئێرانییەکانە گوایە لێرەوە پەلامار نادەن یان ئەوەی ئێمە پەنای بدەین ئەوان کاریان بەسەریەوە نییە، یان ئەگەر ئێوە شەڕ نەکەن و رێگرنەبن ئەوان نزیکی سنووری ئێوە ناکەون، بەلام بێن ئەم سنوورە بەجێبهێلن و بڕۆن بائێوەش تووشی زیانی گەورە نەبن و ئێمەش قەلەق و خەجالەت نەبین، خۆ ئەگەر قسەکەی ئێوەبوو ئێران نەهات یان شکا ئەوە ئێوە بگەڕێنەوە جێگەی خۆتان. هیچ بەگوێیان نەکردین، ئێمەش حەزمان دەکرد بڕۆنو ناوچەکە بەجێ بهێلن بۆئەوەی بە ئاسانی کاری خۆمان بکەین.

---

[1] – دواتر نەک هەر نەمانتوانی بەرگری لەو کەسانە بکەین، کە مەدەنی یان بەرگری میللی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی بوون، نەشمان توانی بەرگری لەو پێشمەرگانە بکەین کە هی خۆمان بوون و کوردی خۆرهەلات بوون. لەئێران لەدوای شەڕەکە یان حوکم دران یان لەسێدارە دران، بۆ وێنە چەند پێشمەرگەیەکی تیپی ١١ی هەورامان لەوانە یارئەحمەد ئێناخی، حەمە کێمنەیی، ئەکبەر کەریم ئێناخی، جەوهەر تینی. لەراستیدا ئەم ئیجرائاتە هەر لەم سنوورەداو زیاتر پەیوەندی بە شەڕی هەلّەبجەو داوای خەلکەوە بوو، ئەگینا لەسنوورەکانی تردا کوردی خۆرهەلات پێشمەرگە بوون لەناو یەکێتییداو دواتر ئەوانەیان گەڕانەوە ئێران هیچ ئیجرائات نەکران.

دوای ئەم وتوویژە ئێمە هاتینە خوارەوە بۆ هاوارە کۆن و بروسکەیەک هاتبوو لە مەکتەبی سیاسی خۆمانەوە، کە پەلە بکرێت لە دەستپێکردنی هێرشەکە. چونکە عێراق هێرشەکانی بۆ سەر هێزی پێشمەرگەو سەرکردایەتی و خەڵکی ناوچەکە توندتر کردبوو. بەناوی پرۆسەی ئەنفالی یەکەوە، ئێران لەم ماوەدا خەریکی گواستنەوەی هێز بوو، زۆر بەنهێنی و زیاتر بەشەودا لە جوانرۆ و باینگانو پاوەوە بۆ ناو جەنگەڵ و دارستانەکانی سەرسنوور لە ناوچەکانی دزڵەو مەرەخێڵ و لەشکرگەو هێرتاو زێو بەلەبزان و لەوێشەوە وورده وورده بۆ کەناری رووباری سیروان لەبەری ئێران خۆیەوە، لە قۆلی سنە و مەریوانیشەوە بۆ لای دزلی و دۆڵەناو کانی خەیاران و ملەخورد. لەو شوێنانەوە کەسەر سنوورە هێزی ئێرانی دەبوو هەموویان بە پیادەو چەندین کاتژمێر رێگە ببڕن ئەنجا بگەنە نێو خاکی عێراق.

لە سنوری ئێرانەوە بۆ دەوروپشتی هەڵەبجە رێگاکان بەم شێوەیە بوو:

١ـ لەلای دزڵەوە پەڕینەوە بۆ ناوچەی نەورۆلی و بالامبۆ دەبوو بە بەلەم و قەیاق لەلای ئاوایی دزڵەوە بۆ ئاوایی کەوتە بپەڕێنەوە لەسەر ئاوی سیروان و زوو دەگەیشتنە سەر رێگای ئۆتۆمبێل لەلای کەوتەدا یان لە بناری چیای بالامبۆ لە ئاست ئاوایی تەوەنەوەڵ بەپیادە هەلزنن بەو هەورازە سەختەدا بۆ سەر چیای بالامبۆ.

٢ـ لەسەر رێگای مەرزی سەرپێل بۆ دوو ئاو، لەئاست ئاوایی سیمان دەبوو لەبەری ئێرانەوە بە ٤٠ خولەک بە پیادە رەوی بێنە سەرئاوی سیروانو لەوێ پردیان بەنهێنی دروستکردبوو دوای پەڕینەوە لەپەنگاوی ئاوی دەریاچەی دەربەند بەیەک کاتژمێر پیادەرەوی دەهاتنە گوندەکانی چنارو مۆردین لەوێ دەگەیشتنە سەر رێگای ئۆتۆمبیل، ئەمەش بۆ پەلاماردانی بەرزاییەکانی پشتی مۆردینو چنارو بەشێکی بالامبۆو پشت ئاوایی گردەناوێ بوو.

٣ـ رێگای لانەوان بۆدەشتی سازان، ئەم رێگاش لەبەری ئێرانەوە دەبوو نیو کاتژمێرێک پیادەرەوی بکەن ئەنجا لە سیروان بپەڕنەوە بەرەو سازان و ملەهوملەو هەڵەبجە، لێرەوە لەمبەر ئاوەکەی سیروانەوە جادەی ئۆتۆمبێل نزیک بوو.

٤. ڕێگای هێرتا ـ مەڕمانگان، لێرە بەئاسانی پردی پیادەڕەو لەسەر ئاوی سیروان دەبەسترا، چونکە سەختو تەنگەبەر بوو، بەڵام لە هێرتاوەوە بۆ سەر ئاوەکە یەک کاتژمێر پیادەڕەوی بەرەو خوارو سەختە، لەمبەری عێراقیشەوە بەدوو کاتژمێرو نیو پیادەڕەوی سەرەو ژوورو لابەلا دەهاتنە نزیک ئاوایی ڕێشاو، بەڵام ئەم ڕێگایەیان ڕێگای سەیارەی لەسەر نەبوو، لەم ڕێگاوە زوتر هێزیان هێناو لە ئاوایی بۆینو چەمی گلامۆردو نزیک ئاوایی ڕێشاودا حەشاریاندا، چونکە ناوچەکە سەختو لە هیچ لایەکیشەوە نابینرێت، ئەم هێزە بۆ دەڵەمەڕو بەفری میری ڕۆیشت.

٥. ڕێگای شێخان ـ گریانە، لە دیوی ئێرانەوە ڕێگای ئۆتۆمبێل تا سەر سنوور هەبوو، لەوێشەوە بەیەک کاتژمێر پیادەڕێ دەهاتنە ئاوایی گریانە لەوێشەوە بۆ سەر چیای شنرۆێ لەگەڵ ئەو هێزەی لای ئاوایی بۆین یەکیان ئەگرتەوە.

سەرەتا تا کاتی دەستپێکردنی هێرشەکە ئێرانییەکان تەنیا سێ ڕێگایان لەم پێنج ڕێگایە بەکارهێناو کەڵکیان لێوەرگرت، ئەوانیش بریتی بوون لە.

ا ـ ڕێگای سیمان ـ دەوەرە ـ مۆردین.

ب ـ ڕێگای هێرتا ـ بۆین ـ ڕێشاو.

ج ـ ڕێگای شێخان ـ گریانە ـ شنروێ.

لەم سێ ڕێگایەوە گەورەترین هێز لە ڕێگای هێرتاوەوە بەسەر ئاوی سیرواندا پەڕیەوە بۆ مەڕمانگان لەوێشەوە بۆ ئاوایی بۆین.

٦. ڕێگای سەرەکی نەوسوود ـ تەوێڵە ـ بیارە سەرەتا بەکارنەهێنرا تا ناوچەکە گیرا.

لە سنوری مەریوان، کە سورێن و مەلەخورد خالی سنووریە، سێ ڕێگایان بەکارهێنا، بەم شێوەیە:

١. کەماجەڕو کەلی وەزەرا بۆ سەرگەت.

٢. مەلەخورد بۆ خوڕماڵ.

٣. کانی خەیاران بۆ چنارەو بناری چیای سورێن بە دیوی دەشتی شارەزووردا.

لەگەڵ نزیکبوونەوەی وادەی هێرشەکەدا، ئێران لەمەڕەخێل بۆ دەشتی سازان، لەپشتی سیمان بۆ دەوەرە مۆردین، لەمەلەخورد بۆ وشکەناوی پشتی خوڕماڵ شەوانە بەشێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش ڕێگای سەیارەی دروست

دەکرد، لە شەوی هێرشەکەو ڕۆژانی دوایی هەموو ئەو ڕێگایانەی بەستەوە بە ڕێگاکانی ئۆتۆمبێل لەناو خاکی عێراقەوە.

تا ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٢ ئەو هێزانەی ئێران دیاریکرابوون، شەوی یەکەم پەلامار بدەن لەگەڵ ئەو هێزانەی یەکێتیی لە ناوچەکانی ترەوە هاتبوون، گەیشتبوونە ناو خاکی عێراق، لەلای بۆین و گریانە و دەوەرە، ئامادە کرابوون کەل و پەل و تەقەمەنی و خواردن و ماسکی گازو دەرمان و ئەمپولی دژە کیمیاوی هەمووی دابەش کرابوو.

حاجی عەلی بەرپرسی ناوچەی شۆڕشگێڕانو محەمەدی حەمەئەمین بەرپرسی ڕێکخستنی کۆمەلە لە هاوارە کۆن بەرپرسی وەرگرتنی زانیاری و هەوالی تازەبوون تابیدەن بە بەرپرسی ڕەتلەکان. جگەلەوەی ئێمە لە ڕێگەی ڕێکخستن و ئەوچەکدارانەی ڕژێم، کەپەیوەندیان بە ئێمەوە هەبوو، زانیاریمان کۆکردبووەوە. پێشتریش زۆربەی مەیدانی مینەکان، کەعێراق دایانابوون لەسەر ڕێگای هێرشی ئێران و پێشمەرگەدا، تیمی تایبەتی سوپای پاسداران، بەشێوەی پارتی زانی زۆر بەنهێنی شەوانە لایان بردبوون.

شانبەشانی ئەم ئامادەکارییانە چەندین تیمی ئێرانی وەک وێنەگر، نەخشەبەردار ڕەسەدو هەندێکیش بۆ ئاشنابوون بە ڕێگاکان و ناوچەکە، بەنهێنی پێشتر نێردرابوونە مەیدانی ئەو جەنگەی دەبوو ڕووبدات و گەڕابوونەوە، ئێرانیش لە ڕێگەی ئەو پیاو دۆستانەی خۆیەوە کەسێ جۆربوون لەوانە مەدەنی، سەربازی، ئەوانەی لەناو ئۆپۆزسیۆنی ئێران خۆی و بەتایبەت لەناو چەکدارە عەشایەرەکاندا هەبوون بەردەوام زانیاری کۆ دەکردەوە، زانیارییەکانیش بەشێکیان ڕاست بوون و بەشێکیان درۆ.

بۆهەریەکێک لەو ڕەتلانەی هێزی پێشمەرگە چەند پاسدارێکی هونەری و شارەزا دانرابوون وەک بێ سیم چی، وێنەگر، ڕەسەد، ڕێکخەر تا لەکاتی تێکەڵبوون و بەیەکگەیشتندا لەمەیدانی جەنگەکەدا یەکتر بناسین و تووشی کارەسات نەبین.

ئەوکەسانەی، کەبەرپرسی هێزەکانی ئێران بوون و پێشتر لەکۆڕو کۆبونەوەکاندا لەگەڵ لایەنەکانی بەرەی کوردستانی کۆبوونەوەو وتووێژیان کردبوو ئەمانە بوون: دەهقانی، شەهلایی و سلێمانی. هەریەک لەئاغای شەمخانی و مقدم محەمەدی تهرانی قیادەی مەیدانی بوون، شەمخانی

بارەگای لەلای دووئاوو ئاوایی هێرۆێ لەنێوخاکی ئێران دانابوو، مقدم تەهرانیش لە نێوان شەمخانی و فەرماندەکانی ڕەتلەکانی خۆیان هاتووچۆی بوو لەدرۆلەوە تا دووئاو لە (دەوەرەوە) بناری بالانبۆ، بۆ بۆین و گریانەو هاوارە کۆن، ئەم بەرو ئەوبەری دەکرد.

تانیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٢ ئامادەکارییەکان و دابەشبوونی هێزەکانی هەمولایەک تەواو بوو، ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٢ هێزەکان سوپای ئێران و پێشمەرگە نزیک کرانەوە لە ئامانجەکانی خۆیان، لەمکاتە هەستیارەدا کتوپڕ ئێرانییەکان هەوڵیاندا هێرشەکە دوابخەن، بیانوەکەشیان یەکەم: ئەو فەرماندە سەربازییەی، کە بۆگرتنی چەند بنکەیەکی پاسەوانی سەربازگەو تۆپخانەی دەڵەمەڕ دانرابوو، بەپەلە هەوالی ناردبوو بۆ عەلی شەمخانی، وتبووی عێراق ئیمڕۆ هێزی تازەی هێناوە بۆ سنوری هەڵەبجە، لەکاتێکدا ئەوەڕاست نەبوو.

دووەم: شەمخانی، مقدم تەهرانی ناردبوو بۆئەوەی بزانێت، کە بۆچی شەوکەتی حاجی موشیر بەکراوەیی و بێ بەکارهێنانی جفرە قسەی کردووە لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتیی، ووتوویەتی ئاگاداربن لەچەند کاتژمێری ئاییندەدا دەست بەکار ئەبین، دیارە لە ڕێی جیهازەوە گوێیان لە جیهازەکانی ئێمە گرتووە، بەلام هێرشەکە دوانەکەوت و لەکاتی خۆیدا دستی پیکرد.

# گەڕانەوە بۆ سەرەتاو
# مێژووی بەکارهێنانی چەکی کۆکوژ

لە سەرەتای مێژووی مرۆڤایەتییەوە هەتا ئیمڕۆ زۆرجار لایەنە بەشەڕهاتووەکان کەڵکیان لە بەرکاهێنانی چەکی کیمیایی و ژەهراوی میکرۆبی و کۆکوژ وەرگرتووە بۆ یەکلایی کردنەوەی جەنگەکان لە بەرژەوەندی خۆیان. جۆرەکانی سەرەتایی ئەو چەکانە لە تیروکەوانەوە دەست پێ دەکات، تا دەگات بە پێشکەوتوترینیان، کە چەکی کیمیایی و بایەلۆژی و میکرۆبییە. چەکە کیمیاییەکان کاریگەری ڕاستەوخۆیان هەیە لەسەر مرۆڤ، ئاژەل، ڕووەک...تاد هەبووەو ماددە کیمیاییەکانیش پێکهاتەکەیان یان شێوەکەیان لەشێوەی شلە یان بەستوو بووە. لە شەڕەکاندا لایەنە بەشەڕهاتووەکان لە دژی یەکتر بەکاریانهێناوە بۆ کۆمەلکوژی مرۆڤ و ئاژەڵ و لەناوبردنی مەزراو جەنگەڵ و بێشەکان.

لەسروشتدا ئەم جۆرە ماددەی هاوشێوەی زیانی چەکە کیمیایی و ژەهراوییە، لەناو لەشی هەندێک گیانلەبەری خشۆکی وەک مارەکان و خشۆکەکانی تر و هەورەها دوپشکدا هەیەو بۆ بەرگریکردن لە خۆیان یان لەناوبردنی دوژمنەکانیان بەکاری دەهێنن، بەشێوەی فڕێدان یان پێوەدان. لە سەردەمی کۆندا مادەی ژەهراویی و کیمیایی بەشێوەی دوکەڵیش بەکارهێنراوە، بەتایبەت سەربازانی هێرشبەر بەلێدانی تونێل و پاشان سوتاندنی گۆگرد هەوڵیانداوە سەربازانی دوژمن لەنێو قە لاوە سەنگەرەکانیاندا بکەنە دەرەوە یان بهێننە دەرەوە. هەر لە قۆناغەکانی ڕابردوودا لە قیر و گۆگرد جۆرە دەرمانێک دروستکراوە، کراوەتە سەر ئاوی دەریاکان و ئاگری تێ بەردراوەو سوتاوە لەسەر ئاوەکەوە، ئەم مادە پێی وتراوە ئاگری یۆنانی، ئەم جۆرەیان زیاتر بۆ ڕێگەگرتن لە هاتووچۆی بەلەم و کەشتییەکان بووە. ئەمەو لە سەردەمی کۆندا کەسانێک لە مادەی سروشتی بۆ بێ هۆشی کاتی چرکردنەوەی دەمارەکان کەڵکیان وەرگرتووە. لەم نێوەندەدا هیندییەکان بەر لە دوو هەزار ساڵ پێش زایین کاریان لەسەر ئەوە کردووە. ئامانجی بێهۆش کردنەکەش بۆ ڕاوشکاربوو، نێچیرەکانیان پێ

بێهۆش دەکرد بۆئەوەی بیانگرن. ئەویش بە سوتاندن و دوکەڵی جۆرێک بخوورد بوو لە بەردەم لانەی نێچیرەکەدا یان لەژێر دارێکدا، کە باڵندەی بە سەرەوە بوویێت. شتێکی تر، کە هیندییەکانی لە سەردەمی کۆندا کەڵکیان لێ وەرگرتووە، دۆزینەوەی گیاییەکی سروشتی کیمیایی بووە بە ناوی کیورار. لەو گیایە دەرمانێکیان دروست کردووەو تیرەکانی خۆیان پێ ژەهراوی کردووە. دواتر ئەم تیرانەیان هاویشتووە بۆ نێچیرەکان، نێچیرەکەش بەشێوەی کاتی تووشی ئیفلیجی بووە، تا بە ئاسانی بگیرێت.

لەساڵی ٦٧٣پ.زدا یۆنانییەکان لەکاتی گەمارۆدانی قوستەنتینییە ئەستەنبوڵی ئێستا سەرچاوە ئاوییەکانی ئەم شارەیان ژەهراوی کرد. لەساڵی ٦٠٠پ.زیشدا سۆلۆن ڕەگی داری HELEBORUSE دەکردە ناو ئاو، کە ئەم ڕەگانە خاوەنی مادەیەکی دەرمانی بوون لەنێو جۆگەلەو ڕووبارەکاندا کاتێک سەربازانی دوژمن ئاویان دەخواردەوە تووشی نەخۆشی سکچوون دەبوون.

هەر لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینیدا جەنگاوەرانی دەوڵەتی سپارتا لە یۆنانی کۆن لە شەڕەکانیاندا دژی شارەکانی تر لەوانە ئەسینا، کە بە شەڕەکانی پیلۆپۆنیز بەناوبانگن لەنێوان ساڵانی ٤٣١-٤٠٤پ.ز، کەڵکیان لە جۆرە چەکێکی کیمیایی سەرەتایی وەرگرت. مێژوونووسی یۆنانیش توسەیدید، کە خۆی لە شەڕەکاندا بەشدار بووە، نووسیوویەتی سوپای سپارتا ئاگری لە دەوری شارە گەمارۆدراوەکاندا دەکردەوەو دواتر قیرو کبریتی دەڕژاندە سەر ئاگرەکە، لە ئەنجامی سووتانی ئەم مادانەدا گازێکی کوشندە دروست دەبوو، بەناوی گازی کرین. ئەوەش دەبووە هۆی کوشتنی خەڵک و سەربازەکانی ئەو شارانە. بەو جۆرە لەساڵی ٤٢٩پ.ز گرتنی شاری پلاتیا ئاسان بوو. هەروەها سوپای سپارتا هەر بەو جۆرە شاری دیلیومی لەساڵی ٤٢٤پ.زدا گرت. پێش ئەمەش لەساڵی ٦٠٠پ.زدا فەرمانڕەوای شاری ئەسینا فەرمانیدا ڕەگی گیاییەکی ژەهراوی بە ناوی HELLEBORUS بکەنە ناو چاوگی جۆگەلە بچووکەکانەوە بەمەش سوپای دوژمن کاتێک ئاویان دەخواردەوە تووشی سکچوونێکی بەهێز دەبوون و پەکیان دەکەوت دواتر زۆر بە ئاسانی تێک دەشکێنران.

لەساڵی ٢٠٠پ.زدا لە یەکێک لە شەڕەکانی قەرتاجەکاندا فەرماندەی سوپاکە پاشەکشەی کرد و لە دوای خۆی بڕێکی زۆر شەرابی جێهێشت، کە بە ڕەگی گیایی MANDRAGORA ژەهراوی کرابوو، کاتێک کە سوپای دوژمن هاتن و شەرابەکەیان خواردەوە تووشی نەخۆشی گێژی و بێهۆشی بوون. بەو هۆیەشەوە قەرتاجەکان گەمارۆیاندان و هەموویان کوشتن. هەر وەک لە جەنگی خاچ پەرستاندا لاشەی ئەو کەسانەی، کە بە نەخۆشی تاعوون دەمردن بە مەنجەنیق فڕێیان دەدانە ناو ئەو شارو گوندانەی، کە دەیانویست داگیری بکەن. بەو جۆرە نەخۆشیان ب لاوە دەکردەوەو هەزاران کەسی بێتاوانیان دەکردە قوربانی.

لەساڵی ١٩٠پ.زدا هێزە دەریاییەکانی هانیباڵ لەو ژەهرەی، کە ڕاستەوخۆ لە مارەکان دەریان دەهێنا، بەرامبەر بەدوژمنەکانیان بەکاریان هێنا، لەسەردەمی جەنگی خاچ پەرستەکانیشدا شەڕە بایەلۆژییەکان زیاتر پیسکردن و ژەهراویکردنی سەرچاوەکان و چاڵە ئاوەکان بوون بەهۆی لاشەی مردووەکان و ئاژەڵەکانەوە بوو، کە لەکاتی شەڕەکاندا مردبوون. یان لە شەڕەکاندا سەری ڕم و تیرەکان ژەهراوی دەکران.

لە هەندێک کات بۆ کەڵکوەرگرتن لە بەکاربەری جەنگی میکرۆبی بیدەنگتر لە شوێنی نهێنیدا بەکاردەهات، بۆ نمونە لەساڵی ١٣٦٣ز ئینگلیزەکان ئەو بەتانی و مەلافانەی، کە بە میکرۆبی ئاوڵە ئالودەبوون ئەنارد بۆ بەرپرسانی سورپێست لە باکووری ئەمریکا لە ئۆهایۆ. ئەوەش ئەبووە هۆی مردنی ژمارەیەکی زۆر لە سورپێستەکان. سوپاکەی تەیموری لەنگ لەکاتی گرتنی شاری بەغداد لەکەناری ڕووباری دیجلەدا بۆ لەناوبردنی بەرگریکاران سوودی لەشلەیەکی لینجی حلزون هێلکەی شەیتانۆکە وەرگرت، کە دوای دانانی لەبەر خۆر مادەیەکی ژەهراویان لێ بەرهەم دەهێناو سەری تیرەکانیان پێ ژەهراوی دەکردو بەر هەر کەس بکەوتایە لەپێی دەخست و فەلەج دەبوو.

کاتێکیش تورکەکان لەساڵی ١٤٥٤زدا هێرشیان کردە سەر شاری بەلگرادی پایتەختی یوگسلافیا هێندەی نەمابوو شارەکە داگیر بکەن، زانایەکی کیمیایی لەوێ بوو شلەیەکی کوشندەی دۆزیەوە بۆ ڕێگریکردن لە پێشڕەوی تورکەکان، بەرگریکارانی شار پارچە قوماشیان هەڵدەکێشا لەو مادەو ئاگریان تێبەردەدا، بەو هۆیەشەوە دوکەڵێکی ژەهراوی بە ئاراستەی لەشکری

تورکەکان دەچوو. ئەوانیش ناچاردەبوون پاشەکشە بکەن و شوێنەکە بەجێبهێڵن.

سوورپێستەکانی ئەمریکا و ئوسترالیاش خەڵکێکی سادەو بێ زیان بوون. کریستۆڤەر کۆلۆمبس دۆزەرەوەی کیشوەری ئەمریکا لە نامەیەکیدا بۆ پادشای ئیسپانیا سەبارەت بەو خەڵکانە ئاوای نووسیووە: دراوسێیان لە خۆیان خۆشتر دەوێت، لە قسەکردندا میهرەبانن، ڕووخۆش و دەم بەخەندەن، هەرچەندە خێلەکین، بەڵام هەلسوکەوتیان جوان و بەڕێزە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوروپییەکان بۆ لەناوبردنیان و داگیرکردنی زەوی و زارەکانیان زۆر دڕندانە مامەڵەیان لەگەڵدا کردن. سەرچاوەکانی ئاوی خواردنەوەیان بە لاشەی ڕزیو میکرۆباوی پیسکردن. کاتێکی لە شەڕەکاندا لەگەڵ ئەم سورپێستانە دەدۆڕان، پیلانی گ لاوەو نامرۆڤانەیان بۆ لەناوبردنیان دادەنان، بۆ نمونە جلوبەرگی ئالودە بە میکرۆب، کە پێشتر ئامادەکرا بوو، وەک دیاری دەنارد بۆیان تا نەخۆشی لە نێوانیاندا ب لاوەببێتەوە، بەوشێوەیە سەدان کەسیان لێ دەکوشتن.

سورپێستەکان بەر لە چوونی ئەوروپییەکان بۆ ناوچەکانیان نەخۆشی ئاولەیان نەناسی بوو، بۆیە هیچ جۆرە چارەسەرێکیان بۆ ئەو نەخۆشییە لانەبوو. فەرماندەیەکی سوپای بەریتانیا بە ناویSIRGEFFRYAMHERST لە کارێکی نامرۆڤانەدا هەستا بە ناردنی دیاری بۆیان، کە جلوبەرگی تایبەت بوو بۆ هەموو سەرۆک خێلەکانی سورپێستەکان، ئەم جلانە لە نەخۆشخانەکانی بەریتانیا میکرۆباوی کرابوون یان جل وبەرگی ئەو کەسانە بوون، کە بەهۆی نەخۆشی ئاولەوە مردبوون، بەهۆی ئەم جلوبەرگانەوە ئەم نەخۆشییە لەنێو سورپێستەکاندا ب لاوەکرایەوەو بوو بە هۆی لەناوبردنی ژمارەیەکی زۆر لێیان. بەو جۆرە بەبێ شەڕو خوێن ڕشتن، هەموویان لەناودەچوون و زەوی و زارەکەیان بە ئاسانی دەستی بەسەردا دەگیرا. ژمارەیەکی زۆر لە سورپێستەکان لەو سەردەمەدا بە چەکی کیمیایی و میکرۆبی بەشێوەیەکی مەترسیدار لەناوچوون.

وەک سەرچاوەکان باسی دەکەن کاتێک کیشوەری ئەمریکا دۆزرایەوە، سورپێستەکان نزیکەی پانزە ملیۆن کەس بوون، کە لەوێدا

نیشتەجێ بوون، بەڵام بەهۆی ئەم سیاسەتەی، کە ئەوروپییەکان لە دژیان پەیڕەویانکرد ژمارەیان دابەزی بۆ یەک ملیۆن کەس. هەروەها لە لوبنان، کاتێک کە ئەو وڵاتە لەژێر دەستی عوسمانییەکاندا بوو، ئەمیر فەخرەدین، کە لەلایەن سولتانی عوسمانییەوە وەک فەرمانڕەوای لوبنانی دیاریکرابوو ماوەیەکی زۆر حوکمی کرد و لە دواجاردا نێوانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا تێکچوو، خەباتی چەکداری دژ بە عوسمانییەکان دەستپێکرد. ناوبراو چوو بۆ بەرزاییەکانی لوبنان لە ئەشکەوتێکدا بە ناوی نیما خۆی جەشاردا. لەنێو ئەم ئەشکەوت و دۆڵەدا ئاوێک گوزەری دەکرد، سەرچاوەی ئاوەکە لە دەرەوەی ئەشکەوتەکە بوو، ئەو کاتەی تورکەکان گەمارۆیان دابوو، فەرماندەو سەربازەکانی لەم ئاوەیان دەخواردەوە، سەرچاوەی ئاوەکەیان پیس کردو ژەهراویان کرد، ئەمیر ناچار ناوچەکەی جێهێشت و ڕوویکردە باشووری لوبنان و لە دەوروبەری شاری جنین مایەوە. زۆری نەبرد خۆی بەدەستەوەدا و لەساڵی ١٦٣٣دا نێردرا بۆ ئەستەنبوڵو دواجاریش لەساڵی ١٦٥٣دا لەسێدارەدرا.

تاتارەکانیش لەساڵی ١٦٦٦دا لەکاتی هێرشیان بۆ سەر نیمچە دوورگەی کریمیا-قرم سوودیان لەلاشەی ئەو کەسانە وەرگرت، کە بە نەخۆشی تاعوون مردبوون. لەساڵی ١٧١٠یشدا ڕووسەکان بۆ تێکشکاندنی سوپای سوید لە میکرۆبی تاعوون کەڵکیان وەرگرت.

ناپلیۆن بۆناپرتیش لەساڵی ١٧٩٧دا کاتێک لە شەڕدابوو لە ناوچەکانی باکووری ئیتالیا، هەوڵیدا نەخۆشی تب مرداب لەنێو دوژمنەکانیدا بڵاوبکاتەوە، جگە لەوانەش بە درێژایی مێژوو زۆرجار لە جەنگەکاندا چەکی کیمیایی و میکرۆبی بەکارهاتووە، چ لە وڵاتانی خۆرئاواو چ لە جەنگی سەربەخۆیی ئەمەریکادا، بەتایبەت و زۆرجار ئالودەکردنی سەرچاوەو چاڵە ئاوەکان باو بووە، ئەوەش دەبوو بەهۆی مردنی هەزاران ڕانە مەڕو گاگەڵ و مرۆڤ، ئەوەش لە دەورانی کۆنەوە، تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بوو، بەڵام بەکارهێنانی ئەم چەکە لەسەدەی بیستەمدا هەرچەندە دروستکرابێ، هیچ کات بەکارنەهێنراوە، هەتا جەنگی یەکەمی جیهانی. واتە تا ئەو کات زانیاری تەکنەلۆژی لەبارەی چەکی کیمیایی نەبووە و هیچ

پێشـــکەوتنێکی ئەوتـــۆی بەخـــۆیەوە نەبینیـــووە، تـــا ئەو ڕادەیەی بـــڕوا بە بەکارهێنانی ئەم چەکە نەدەکرا.

کەڵکوەرگرتن لە چەکی کۆکوژ لە شەڕەکاندا تا جەنگی یەکەمی جیهانی ١٩١٤-١٩١٨ زۆر کەم بوو. واتە ناو بە ناو لێرەو لەوێ لەم جۆرە چەکانە بەکارهاتووە. بۆنمونە لە شەڕی ترانسوالدا بەریتانیا، کەڵکی لە گوللە تۆپێک وەرگرت لەکاتی تەقینەوەیدا گازێکی خنکێنەری هەبوو، هەر لەکاتی جەنگەکەدا بەکارهێنانی ئەم چەکە ڕووی لە زیادبوون کرد، بەشێوەیەک بۆ یەکەمجار ئەڵمانەکان لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٤دا لە نوشاپول گوللەی پڕ لە گازی فرمێسک ڕێژیان لە دژی فەرەنسییەکان بەکارهێنا.

هەروەها لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩١٥دا ئەڵمانەکان گوللەتۆپی گەورەتریان لە ناوچەی بوسموف بەکارهێنا، بەڵام بەهۆی ساردی کەش و هەواوە کاریگەری نەبوو، دیسانەوە لە ئازاری ساڵی ١٩١٥دا گازی کلۆریان لە دژی ڕووسەکان لە شەڕی پۆلۆنیادا بەکارهێنا. گازە بەکاربراوەکان لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لە جۆری گازی خنکێنەرو زیانبەخش بوون لەوانە کلۆر و خەردەل، کە لەلایەن سوپای ئەڵمانیاوە بەکارهێنرا. سەربازە فەرەنسییەکانیش یەکەم گرووپی سەربازی بوون لە جیهاندا بەشێوەیەکی کاریگەر ئەو چەکەیان لەلایەن ئەڵمانەکانەوە لە ٢٢ی نیسانی١٩١٥دا لە دژ بەکارهێنرا. ئەوەش بەهۆی دروستبوونی ئەو هەورە ڕەنگاو ڕەنگەوە، کە لەسەر زەوی و لە مەیدانی جەنگدا هەموو سەنگەرو بەرزی و نزمیەکی گرتەوە، سەرەتا سەربازەکان سەریان سوڕمابوو نەیانزانی بوو چییە؟ بەڵام کاتێک زانیان مادەی ژەهراوی کوشندەیە بەخێرایی ئەو ناوچەیان بەجێهێشت. دیاری ئەگەرچی هەردوو لایەنی فەرەنسی و بەریتانییەکان جەختیان لەسەر کاری نامرۆڤانەی ئەم چەکەو بەکارهێنانی کردەوە، بەڵام بەبێ دواکەوتن بەریتانیا دەستیکرد بە بەکارهێنانی ئەو چەکە لە دژی هێزەکانی ئەڵمانیا، لەئەنجامدا هەردوولا بەخێرایی کەوتنە دۆزینەوەی ڕێگای بەرگری و خۆپاراستن لەو چەکە. بەجۆرێک دواتر ئەڵمانەکان کە ئەم چەکەیان بەکارئەهێنا، لەگەڵ سەربازی ماسکدارو خاولی تەڕ بە دەست و مەلافەی تەڕکراو، کە لەخۆیان پێچابوو ڕووبەڕوو ئەبوونەوە، لەم جەنگەدا لە ٢٥%ی سوپای دوژمن لە شەڕکردن لەکارکەوت، بۆیە وردە وردە هەردوو لایەنی

شەڕ دەستیان بە دۆزینەوەی ڕێگا چارەی زیاتر کرد بۆ ئەوەی بتوانن کاریگەری کوشندەیی ئەم چەکە کەم بکەنەوە.

لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٥یشدا ئەڵمانیا گازی فسژنی بەکارهێنا، کە دە بەرامبەر بە گازی کلۆر کوشندەتر و کاریگەری زیاتر بوو. لە سەرەتای ساڵی ١٩١٦دا جارێکی تر ئەڵمانەکان لە وەردەن بە تۆپ و هاوەنی گەورە لە ماوەی شەش ڕۆژدا ٥٠٠٠٠٠ گوللەتۆپ و هاوەنی هاویشت، کە سەدان هەزاریان گوللەی کیمیایی بوون و ئەمەش بووە هۆی خنکاندن و مەرگی دەیان هەزار سەرباز و هاوڵاتی فەرەنسی.

لە ئازاری ساڵی ١٩١٦دا وڵاتانی بەرەی میحوەر، کە بریتی بوون لە دەوڵەتانی عوسمانی، نەمسا و مەجەر، ئەڵمانیا لە شەڕگەی زوم بۆ یەکەمجار گازێکی نوێ تریان بەکارهێنا، کە تا ئەوکاتە ئەوە گەورەترین هێرشی کیمیایی بوو ئەنجام درابێت. خەردەلیش، کە یەکێکە لە گازە زۆر کوشندەکان لە مایسی ساڵی ١٩١٧دا لەلایەن ئەڵمانەکانەوە لە دژی هاوپەیمانەکان بەکارهات. هەر لەو ساڵەشدا لایەنە بەشەڕهاتووەکان نزیکەی ١٢٥٠٠٠ هەزار تەن گاز کیمیایی میکرۆبیان بەکارهێنا.

لەساڵی ١٩١٨شدا ئەڵمانەکان لەم چەکە کەڵکیان وەرگرت و لە جەنگی جیهانی یەکەمدا شەش جار گازەکانی فرمێسک ڕێژ، کلۆر، زایلیل برومید، فسژن، کلرپیکوین، خەردەلیان بەکارهێنا. جگە لە ئەڵمانەکانیش هەریەکە لە مەجەڕ، بەریتانیا، ئیتالیا، ڕوسیا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا چەکی کیمیاییان بەکارهێنا، بەڵام چەکی کیمیایی هیچ لەو وڵاتانە بە ئەندازەی ئەڵمانیا پێشکەوتوو نەبوو. بەپێی زانیارییەکان زیانە گیانییەکانی چەکی کیمیایی لەو جەنگەدا بریتی بووە لە ١٣٠٠٠٠٠ کەس، لەو ڕێژەیە نزیکەی ١٠٠٠٠٠ کەسیان گیانیان لەدەستداوە. بەتەنیا ئەڵمانیا، فەرەنسا، بەریتانیا نزیکەی ٢٠٠٠٠٠دوو سەد هەزار بەرکەوتوویان هەبوو. ڕووسیاش نزیکەی ٤٠٠٠٠٠چووارسەد هەزار بەرکەوتووی هەبوو.

لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەمیش وڵاتانی جیهان هەوڵەکانی خۆیان خستەگەڕ بۆ ڕێگریکردن لە دووبارەبوونەوەی ئەو زیانانەی، کە چەکی کیمیایی لەو جەنگەدا بە دوای خۆیدا هێنابووی. ڕێکەوتنی ساڵی ١٩٢٢ی واشنتۆنو پرۆتۆکۆلی جنێڤی ساڵی ١٩٢٥ لەدیارترینی

هەوڵەکان بوون، بەڵام بەهۆی پەرەسەندنی ململانێکانی نێوان وڵاتان بۆ بەدەستهێنانی ئەو چەکە بەشێوەی فراوانترو پێشکەوتوتر لەلایەک و گوێنەدان بە بڕیارەکانی ئەو ڕێکەوتننامانە لەلایەکی ترەوە جارێکی تر ئەو چەکانە بەکارهێنرانەوە. بۆ نمونە ئیتاڵییەکان لەساڵی ١٩٣٦دا لە ئەسیوبیا ئەم چەکەیان بەکارهێنا.

بەپێی زانیارییە هەواڵگرییەکان لە ٢٥ی مایسی١٩٣٥ەوە تا ٢٥ی ئەیلولی هەمان ساڵ بڕی ١٦٥ تەن گازی خنکێنەر و ٤٥ تەن گازی خەردەل و ٧٤٨٣ تەن بۆمبی کیمیایی لەڕێی کەناڵی سوێسەوە بەرەو ئەفەریقا ڕەوانە کراوە. مۆسۆلۆنیش لە ڕێکەوتی ١٩٣٥/٩/٢دا فەرمانی هێرشی هەمەلایەنەی بۆ سەر ئەسیوبیا دەرکرد، بۆ شکاندنو لەناوبردنی سەربازە ئەسیوبیەکان ئەم چەکە بەکارهات، لەکاتێکدا ئەسیوبیا نەک هیچ جۆرە بەرگرییەکی ئەم چەکەی نەبوو، بەڵکو چارەسەری سادەشیان نەبوو. لەم شەڕەدا ١٥٠٠٠ پانزە هەزار کەس لە دانیشتوانی ئەسیوبی بوونە قوربانی ئەم چەکە کۆکوژە.

ناوەڕۆکی پرۆتۆکۆلی ١٩٢٥ی جنێف و پێشنیازی وڵاتی ئەرجەنتین لە ڕۆژی ٤ی تەمموزی١٩٣٦ نەیانتوانی ڕێ لەئیتالیا بگرن، کە ئەو چەکە بەکارنەهێنێ، بەڵکو ڕێگەشی لە بەردەم ژاپۆندا کردەوە بۆ بەکارهێنانی چەکی کۆکوژ بەشێوەیەکی فراوانتر دژ بە چین. چەکەکەش لە شەڕی بانکێت لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٧دا ڕوویداو ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی چین بوونە قوربانی. لە ١٧ی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٨شدا ژاپۆنییەکان ٨٣٥ نارنجۆکی گازی سوریان لە هێرش بۆ سەر قەڵای Guangzhou لە چیندا بەکارهێنا. هەروەها لە شەڕەکانی شەنگەهایی و سینکۆدا ژاپۆن گازی بەکارهێنا. لە شەڕەکانی ناوخۆیی ئیسپانیاشدا، کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٦دا ڕوویداو سێ ساڵ بەردەوام بوو، ڕووسەکان پشتگیرییان لە کۆماریخوازەکانی ئیسپانیا کرد لە دژی میلیکەراکان بە سەرۆکایەتی فرانکۆ، بە فەرمانی جۆزیف ستالینی سەرۆکی یەکێتی سۆڤیەت لە دوو ناوچەی ئیسپانیادا بۆمبی کیمیاویی خەردەلیان بەکارهێنا، بەوهۆیەشەوە ژمارەیەکی زۆر خەڵکی مەدەنی لە گوندەکان و شارەکاندا کوژران.

لە جەنگی جیهانی دووەمیشدا هەرچەندە لایەنەکانی بەشەڕهاتوو پڕچەک بوون بەچەکی کیمیایی، بەڵام کەسیان بەکاریان نەهێنا لەترسی

لایەنەکانی بەرامبەر، بەڵام ئەمریکا و بەریتانیا لەنەوتی خاو مادەیەکی سوتێنەرو مەترسیداریان دروستکرد، کە لەنێو ناپالێمدا بۆ سوتاندنی شارەکان و ئاگربەردانە سەر سەربازەکانی دوژمن بەکاریان ئەهێنا. هەر بەهۆی ئەم بۆمبانەوە بۆمبارانی شاری هامبۆرگی ئەڵمانیا کرا لەلایەن فرۆکەکانی هاوپەیمانانەوە لە ساڵی ١٩٤٢دا. بەو هۆیەشەوە نزیکەی ٢٠٠٠٠٠دووسەد هەزار کەس خەڵکی مەدەنی بوونە قوربانی. لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەمیشدا سۆڤیەت و ئەمریکا بایەخ و گرنگی ئەم چەکەیان بۆ دەرکەوت، بۆیە کە دەستیان گەیشتە خاکی ئەڵمانیا، چەندین کارگەی دروستکردنی ئەو چەکەیان گواستەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان. لەگەڵ ئەوەشدا مەترسیدارترین بەکارهێنانی ئەو چەکەش لە کۆتایی جەنگەکەدا لەلایەن ئەمریکاوە بەکارهات بۆ لێدانی هەردوو شاری هێرۆشیما و ناکازاکی ژاپۆن، کە ئەویش چەکی ناوەکی بوو، بەمەبەستی ناچارکردنی ژاپۆنییەکان بۆ خۆبەدەستەوەدان، بەوهۆیەشەوە ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیانی ئەم دوو شارە کۆمەلکوژکران، کە ژمارەیان سەدو پەنجاودوو هەزارو سی و چوار ١٥٢٠٣٤ کەس بوو.

دوای جەنگی دووەمی جیهانی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بوو بە شتێکی ئاسایی، بۆ نمونە لەساڵی ١٩٥٠دا بەریتانییەکان ئەم چەکەیان لە دژی شۆڕشگێڕانی مالیزیا بەکارهێنا. هەروەک ئەمریکییەکانیش لە جەنگی ڤێتنامدا نزیکەی ٤١ جار ئەم چەکەیان لە دژی شۆڕشگێڕانی ئەو وڵاتە بەکارهێنا، کە زیانی بە دارستان و گژوگیا و دوو ملیۆن هاوڵاتی ڤێتنامی گەیاند.

دەبێت بڵێین ئەمریکا لەساڵەکانی ١٩٦٢- ١٩٧١ بەشێوەیەکی سیستماتیک دەستیکرد بە بەرنامەیەک بۆ وەراندنی گەڵای دارستانەکانی لە رووبەرێکی فراوانی ڤێتنامی باشووردا. ئەویش بە وەشاندنی دەرمانی ژەهراوی بەسەر کشتوکاڵ و دارستانو بێستانەکانی ئەو وڵاتەدا، کە جێگەی خۆحەشاردانی شۆڕشگێڕانی ویت کینگ wet- keng بوو. بەوەش ژیانی گیانلەبەرو رووەکیشی لەناوبرد.

بۆ یەکەمجار لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٦٧دا ئاشکرابوو، کە ئەمریکا لە بنکەکانی خۆیدا لە ڤێتنام دەمارە گازی GB ئەنبار کردووە. پاشان لە ئابی ساڵی ١٩٧٠دا رۆژنامەنووسێکی ئەمریکی لە ڤێتنامەوە ب لاوەیکردەوە، کە

ئەمەریکا لە جەنگدا دژی هێزەکانی ڤێتنام لە باکووری کامبوج گازی VX بەکارهێناوە.

لە شەڕەکانی یەمەنیشدا لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٣-١٩٦٧دا هێزەکانی میسر لەو چەکە کیمیایانە کەڵکیان وەرگرت، کە لە ڕووسیا وەریانگرتبوو، هەروەک هێزەکانی ئەندەنوسیا لە دژی هەوادارانی سەربەخۆیی تەیموری ڕۆژهەڵات لەساڵی ١٩٨٤دا سوودیان لە چەکی کیمیایی وەرگرت. هێزەکانی نیکاراگواش لە کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا ئەو چەکانەیان بە ناوی بارانی زەرد لە دژی هێزە چەکدارەکانی کەنترا بەکارهێنا. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش لەساڵی ١٩٧٧شدا لە دژی وڵاتی کوباو ساڵی ١٩٨٩ لە دژی وڵاتی پەناما بەکاری هێنا، کە چەکی میکرۆبی بوون زیاتر. هەروەها بەریتانیا ساڵی ١٩٨٢ لە جەنگی فۆکلاند لەدژی ئەرجەنتین. لەساڵەکانی ١٩٨٤ - ١٩٨٥شدا هێزەکانی ڤێتنام لە ماوەی دوو ساڵدا گوللەتۆپی کیمیایی لە جۆری ٢فسژنو هایدرۆجینو سیانیدیان بەهۆی ساروخی ڕۆکێت ٢٫٧٥ ئینجی و ساروخی ١٠٧ میلیمەتری بەکارهێنا، کە لە ڕێگەی کۆپتەرەوە ئاستە دەکران. هەروەها لە شوباتی ساڵی ١٩٨٥دا هێزەکانی تایلەند لەگوللە تۆپی ژەهراوی دژی هێزەکانی کامبوج کەڵکیان وەرگرت. لە ئەفغانستانیش هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەت لە سەرەتای مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٥دا بەهۆی فڕۆکەی میکی ٢١ کیمیاییان لە دژی موجاهیدانی ئەفغانی بەکارهێنا. دواجار بەپێی هەواڵێکی هەواڵنێری یونیتا هێزەکانی ئەنگۆلایی کوبایی و ڕووسی لە مانگی ئەیلول و تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٥دا بە بۆمبی ناپاڵم و ژەهراوی بەهۆی فڕۆکەی AN ٢٦ و میگی ٢٣ هێرشیان کردووەتە سەر سەنگەرەکانی یۆنانی.

مەترسیدارترین و دڕندانەترین کەڵک وەرگرتن لەم چەکانە لە مێژووی هاوچەرخدا لەلایەن عێراقەوە بوو لە شەڕی عێراق - ئێران و شەڕی عێراق بە دژی گەلی کورد، دڕندانەترین شێوەی بەکارهێنانی ئەم چەکەش لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦دا بوو کاتێک ڕژێمی بەعس بە چەکی کیمیایی هێرشی کردە سەر شاری هەڵەبجە، لە ئەنجامی ئەو هێرشەشدا هەزاران کەس شەهید بوون و هەزارانی دیکەش بریندار بوون، پاشماوەی خەڵکەکەشی ئاوارەی وڵاتی ئێران بوون.

بەر لە کۆمەڵکوژییەکەی شاری هەڵەبجەش کۆمەڵکوژییەکەی شاری دەرسیمی باکووری کوردستان، بە چەکی کۆکوژی بوو، کە نزیکەی ٨٠ساڵ بەر لە ئێستا ڕوویدا. پیاوێکی تەمەن ١٠٨ ساڵە، کە خەڵکی شاری ترابزۆنی نزیک دەریای ڕەشە، ئەو کات سەرباز بووە بە ناوی فایەق باشکان نووسیوویەتی تەمەنم ٣٠ساڵ بوو خزمەتی سەربازیم دەکرد لە دەرسیم ناپاکی بەرامبەر کوردەکان کرا. ئەوانەی دەمانگرتن ڕادەستی جەندرمە دەکران. ئەوانیش دەیانبردن لە دارستانەکاندا دەیانکوشتن و تەرمەکانیان دەسوتاندن. لە درێژەی گێڕانەوەکانیدا ووتوویەتی ڕۆژێک مەتارە ئاوەکەم خاڵی بوو یاریدەدەرەکەم راسپارد بچێت ئاو بێنێت لە جۆگەی خاچک دوای ماوەیەک گەڕاوەیەوەو ئاوەکەی نەهێنا، پرسیم بۆ؟ ووتی: تەرمەکانیان فڕێداوەتە ناو جۆگە ئاوەکە بۆئەوەی هەرکەس ئاوی لێ خواردەوە تووشی نەخۆشی ببێت. ئەوەش بەو مانایەی ئاوەکە ژەهراوی بووە.

# جۆرەکانی
# گازی کیمیایی و ژەهراوی

ئەو گازە کیمیاوی و ژەهراویانەی، کە بۆمب و گوللە تۆپ و مووشەکەکانیان لێ پڕ دەکرێت تا ئێستا حەوت جۆریان لێ زانراوە:

یەکەم: گازە جولێنەرەکان، لەوانە: فرمێسک ڕێژو پژمەهێنەر، ئەمانە زۆرتر لەناو نارنجۆکی دەستی و گوللە هاوەنە سوکەکاندا بەکاردێن، ئەوانەی لەووڵاتاندا ئێستە بەدژی خۆپیشاندەران بەکار ئەهێنرێن، وەک فرمێسک ڕێژو پژمەهێنەر جۆری کیمیاوی وژەهراوی نین.

دووەم: گـــازە نەوتییەکـــان: ئەمـــانەش ئەو گـــازانەن لە بەرهەمە نەوتییەکان دروست دەکرێن و دەبنەهۆی سوتانی پێست یان تلۆقە لەسەر پێست دروست دەکەن، کە لەوانەشە ببنە هۆی لەکە یان پەڵەی سەرەتانی.

گازەکانی خەردەل، کە بەناوبانگە بە گازی مەرگ یان بارانی زەرد، هێما زانستییەکەی VXە، لەو گـــازانەیە، کە لە جلـــو بەرگـــو هەتـــا بەنـــاو کەرەستە پلاستیکیەکاندا گوزەر دەکاتو دەچێتە نـــاو پێســـت، حکـــومەتی عێرا ق ڕێژەیەکـــــی زۆری ئەم گـــــازەی لە دژی گەلـــــی کـــــوردو ئێرانییەکـــان لە جەنگـــی عێراق ـ ئێران و شەڕی پێشمەرگەو حکومەتی عێراق دا بەکارهێناوە لەدەهەی هەشتاکاندا.



سێیەم: گاز خنکێنەرەکان، ئەم گازانە لەگەڵ هەوادا دەچنە ناو سییەکانەوەو زیانیان پێ دەگەیەنێ، بەتێپەڕبوونی کات سیکلدانۆچکەکانی دەخنکێنێ و دەبێتە هۆی بریندار بوونیان و مردن.

چوارەم: گازی ئەعساب دەمارەگاز: ئەمانە پێکدێن لە تێکەڵەی چەند گازێک، کە خراپترینیان گازی تابوونە، ئەمەش لەڕێی هەواوە دەچێتە ناو سییەکان، هەروەها لەڕێ کونە وردەکانی پێستەوە دەچێتە ناو پێست، ئەم گازە بەرگری لێ ناکرێت، چونکە لە هەموو شوێنێکەوە دەچێتە ناو لەش.

هەرکەسێک ئەم گازە هەلمژێت لەوانەیە کوێر یان فەلەج یان تەنگەنەفەس ببێت، ئەم گازە زۆرتر کوشندەیەو دەبێتە هۆی مردن، لەبەرئەوەی ئەم گازە ڕەنگ و بۆنی نییەو بە ئاشکرا نابینرێت کاتێک کەسی تووشبوو پێی دەزانێت، کە کاری تێکردووە.

پێنجەم: گازەکانی شەلەل: ئەم گازانە مرۆڤ ناکوژن، بەڵام توانای لەش ناهێلن لەوانەشە بۆماوەیەکی کەم مرۆڤ بێهۆش بکەن، بۆئەوەی بە ئاسانی دیل بکرێت، تا لەکاتی خۆیدا دیل بەدیلی پێ بکرێت یان دوژمن والێبکات خۆی تەسلیم بکات.

شەشەم: گازەکانی خوێن: ئەم گازانە هێزی خوێن بۆ وەرگرتنی ئۆکسجین کەمدەکەنەوە، بەتێپەڕبوونی کات خوێن پیس دەکاتو دەبێت بە هۆی ژەهراوی بوونی گشتی لەناولەشدا.

حەوتەم: گازەکانی ناپالم، مادەی ناپالم دەکرێتە ناو هەندێک گوللەی تۆپ یان ناو بۆمبەکانەوە لەسەر لەشی گیان لەبەر یان هەرشتێکی زیندوو سوتاویەکی قوڵ دروست دەکات، پارچەی ئەم بۆمبانە دەنوسێن بەلەشەوەو بە ئاگراوی ئەمێننەوە تا دەچنە ناو لەش، زیاتر لەلای ئێمە ئەم مادەی بەئاگری فسفۆر ناسراوە، ساڵی١٩٧٤ لە شۆڕشی ئەیلولدا، لە چەند شەڕێکدا ئەم جۆرە بۆمبە بەدژی پێشمەرگە بەکار هێنراوە ئێستا چەندین بریندارى ئەومادە فسفۆرە هەن لەوانە خاڵە نەبەز و برایەکی کاک مستەفا چاوڕەش. پێشتر ئێمە وامان دەزانی ناپاڵم ناوی بۆمبەکەیە، دیارە بۆمبەکە بە ناوی مادەکەی ناویەوە ناونراوە.

## هێرش بەرەمزی یارەسولەڵا
## بۆ سەر هەڵەبجە دەستی پێکرد

ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٢ جارێکی تر هێزەکەی ڕەتڵی یەک، کە حامدی حاجی خالید فەرماندەو من و قادر خەبات یاریدەدەری بووین، هەروەها نیازی هەورامی و عەلی قەندیلی و چەندین فەرماندەی تری کەرت و مەفرەزەو کادری سیاسی و ئیداریمان لەگەڵ بوولەگەڵ هێزەکەی لای قادر کۆکۆیی، لەهاوارە کۆن هێزەکەمان چێک کردەوە. هەرئیمڕۆ جارێکی تر



ئاگاداری حزبی دیموکراتمان کردەوە، کەئێمە دەست پێ دەکەین و ئێوە تەکبیری خۆتان بکەن، ئیمڕۆ دووبارە بەرپرسە ئێرانییەکان هاتنەوەو بەمنیان ووت؛ هەرچۆن بووە بەڵکو دیموکرات قەناعەت پێبکەن ناوچەکە چۆڵ بکەن و بڕۆن، لەبەر ئەوە حەزیان ئەکرد بڕۆن هێرشەکە ئاسانتر بکرێت بۆیان، ئەیانزانی ئەگەر حیزبی دیموکرات شەڕبکەن شەڕی سەرسەختانە ئەکەن.

ئێوارەی ١٩٨٨/٣/١٢ لەگەڵ تاریکبوونی هەوادا بەرێکەوتین بەرەو سەر، بۆسەرکانی و ئاوی وەزگێل و قەمان و بەرزایی سپی تل و سەر بەرزاییەکانی ئەشکەهۆڵ و قوللەی عەزیز ئەتروشی، ئەم قولله ئەکەوێتە پشتی ئاوایی عەبابەیلێ و دەڵەمەڕ لەبەرئەوە عەزیز ئەتروشی لەوێ شەهید بووە بەو ناوەوە ناونراوە.

ئەو هەورازەی لەهاوارە کۆنەوە بۆ وەزگێل تاقەت پڕوکێنو برزکبڕە، ڕیزی پێشمەرگەی قەتارە بەستوویی کۆل بەکۆل هەندێک جار لابەلاو ڕێک هەندێک جار پێچاو پێچ، بەناو تاریکو ڕوونی سەر لەئێوارە، بەناو ئەو جەنگەڵانەی

داربەڕوو دارەبەنەکاندا دیمەنێکی سەرنج ڕاکێشی هەبوو، کاتژمێر ١٢ی شەو گەیشتینە جێ کاک قادر کۆکۆیش سەربەم ڕەتڵەیە بەڵام لەگەڵ هێزێک ئەچێتە نزیک ڕەبیەکانی پاسەوانی سەربازگەو تۆبخانەی دەڵەمەڕ، ئێمە هێزەکەمان دابەش کردو هەر تیمێک جێگەی خۆی بۆ دیاریکرا، منو نیازی هەورامی و قادرخەبات پێکەوە لەناوەڕاستی هێزەکاندا بووین، چاوەڕێی تەقاندنی یەکەم فیشەک بووین، لەسورێنەوە بەکەوانەیی بۆ سەرچیای باڵامبۆو ملەی دارێ ئاخۆ لەکوێوە چەخماخەی یەکەم گوللەی ئەم هێرشە گەورەو بەرب لاوەە چەخماخە دەدا؟ قادر خەبات کاتێک سەیری لای باشووری کرد واتە بەفری میری، پرسی ئەوە کوێ یە؟ وتم: شنروێ یەو سەربازگەی لەسەرە، سەیری لای ڕۆژهەڵاتی کرد کەئەکاتە بەرزاییەکانی پاڵانیاو پشتی دۆلە هەنجیر ووتی: ئەی ئەوێ؟ وتم: هێزی عێراقی لێیە، بایداوە بۆ لای باکوور وتم: ئەوەش بەرزاییەکانی تاوێرەو بەڵخەن هێزو سوپای عێراقی لەسەرە، بەردەمیشمان ئەو ڕەبیانەبوو، کەکەوتبوونە لای خۆرئاوا ئامانجی هێرشەکەی ئێمە بوون.

دیارە بەشەودا لەجێگەیەکدا سەیری بەرزاییەکانی دەوروبەرت ئەکەیت زۆر نزیک دیارن، بەڵام لەڕاستیدا ئەو شوێنانە بۆ لای ئێمە نزیک ترینیان جگەلەبەری لای خۆرئاوای خۆمان لەهیچ لایەکیانەوە گوللەی تفەنگی قەناس بهاوێ ناگاتە لای ئێمە، کە قسەکەم تەواوکرد، قادر خەبات، کە قارەمانێکی بێوێنەبوو، یەکسەر جنێوێکی بە حامد[١]ی حاجی خالی دا، بۆجێگەیەک، کەهەلی بژاردووە، منیش پێم گووت: کاک قادر ئەوە بەشەودا وادیارە خۆت ئەزانی ئەگەرنا بەڕۆژ زۆر دورە لەم قسەوباسەدا بووین کاتژمێر ببووە یەک و نیوی شەو، واتە شەوی ١٢لەسەر١٣/٣/ ١٩٨٨ هێرش بە ڕەمزی یارسول الله دەستی پێکرد، لەناکاو چاومان لەچەخماخەو پاشان گویمان لەتەقە لەسەر قوللەی چادرگەی بەفری میری واتە سەرلوتکەی شنروێ لەلایەن سوپای پاسدارانەوە بوودەستی پێکرد، ئەحمەد ئەو پاسدارە بێسیم چییە بوو لەگەڵ ئێمەدا، بێسیمەکان کرابونەوەو لەهەموو لایەکەوە پەیوەندی هەبوو، هێزەکەی قادر کۆکۆیی بەلای ئێمەدا چووبووە خوارەوە

---

[١] – کاک حامید هێزەکانی دابەشکردبوو.

بۆپشتی عەبابەیلێ و دەڵەمەڕ لای ئەوانیشەوە تەقە دامەزرا فەرماندەکانی ئەم هێزە، قادر کۆکۆیی فەرماندەی ئازاو چاونەترس بوون، لەوانە مەهدی حەمەسەعید، سەلام کوێخا عەزیز و خولەی سەلە نەبەز، چەندین کەسی تر، بەدوای یەکدا تەقە لەبالآمبۆ دەستپێکردو دوای بالآمبۆ لەبەری لای خورماڵ و دەوروبەری و ناوشاری هەلەبجەوە سەرتاسەری سنوورەکە بلێسەی سەند، ئێران لەچەند لاوە، لەدزلی و کانی خەیاران و لەلای لەشکرگەی مەڕەخێلەوە،لەدوو ئاوی نێوان پاوەو نەوسوودەوە ناوچەکەی خستە ژێر ئاگری تۆپخانەوە. پاش ماوەیەک عێراق لەبەری سەیدسادق و ئەوبەری دەریاچەکەوە کەوتە تۆپبارانی بەرامبەر.

کاتێک ڕۆژبووەوە لەلای ئێمەوە بەرزاییەکانی شنروێ و دارەڕەش و عەزیز ئەتروشی و ئەشکەهۆڵ گیرابوون، هێزەکانی عێراق بەرگریان نەکردو زوو خۆبەدەستەوەدان. بەشێکی بالآمبۆ لەلایەن دکتۆر ساڵحی یەوەگیرابوو، کەئەوکات خوێندکاری دکتۆراو بەرپرسی هێزێکی بەسیج بوو. لەڕاستیدا من هەرگیز لەوبڕوایەدا نەبووم هێزێکی وانەشارەزا بتوانێ شوێنی وادورە دەست و هەڵەت و پرلە مەیدانی مین ببڕێ وبەئاسانی بگرن.

سەربازگەی دەڵەمەڕ لەگەڵ چەند بنکەیەکی پاسەوانی سەربازگەکە ئەو شەوە نەگیران، بەیانی ڕۆژی ٣/١٣ هێزەکەی کاک قادرکۆکۆیی وچووبوەوە بۆلای ڕەتڵی دوو لەلای ملەی ڕێشاوو سازان گەیشتنەوە بەوان.

دوای کۆکردنەوەی ئەو سەربازە هەڵ هاتووانەی، کەشەو لەڕەبیەکانەوە هاتبوونە خوارەوە بۆناو شیو چەمو دۆڵی شنروێ و وەزگێڵ و قەمان، ئەفسەرێکی لەشو لار لاوەازیان هێنا بۆ لای من وتیان ئەمە فەرماندەی سەر لوتکەی شنروێ یە لەبەفری میری، ئەمە لەکاتێکدایە من ئاگادر کراوم لەگەڵ بەشێک لە هێزەکەدا بگەڕێمەوە بۆ هاوارە کۆن. ئەفسەرەکەم لەگەڵ خۆمدا هێناو لەڕێ هەندێک سەربازی ترمان بینی، کەیەکێکیان بریندار بوو دەستی ڕاستی لەمەچەکیدا پەڕیبوو پێشمەرگەیەک ویستی بیکوژێت نەمهێشت، وردەوردە نزیکی هاوارە کۆن بووینەوە بەئەفسەرەکەم گووت: تۆ هەموو جارێک بەچەکی دژە هەوایی و هاوانی ٨١ ملم ئەم چەمو دۆڵەو ئەم بنکەو بارەگایانەی ئێمەت دائەبێژا، ووتی: کاکە منی چی سێ ڕۆژ پێشتر ئێمەیان لەڕۆژهەڵاتی بەسرەوە هێناوە بۆ ئێرە

دووشەوی یەکەم ئاگاداریان کردووین ئێران هێرش دەکات نەخەوتووین، بەڵام ئەمشەو خەوتبووین لەناکاو ئێوە هاتنە سەرمان شەڕمان نەکردووەو رامان کردووەتە خوارەوە.

بەگەیشتنی ئێمە بۆهاوارە کۆن دیمەنێکی زۆر ناخۆش و شانۆیەکی جەنجاڵو دڵگرانکەرمان هاتە بەر چاو، ئێران لەقۆڵی لای شێخان و قەڵاگاوە هێرشی کردبوو بۆسەر دیموکرات، بەڵام هێزەکانی دیموکرات رێگەیان لێگرتبوون و شەڕێکی خوێناوی و سەخت روویدابوو. خەڵک بەچوار تەرەفدا ئەهاتن و ئەڕۆیشتن کۆمەڵێک بەرەوخوارو هەندێک بەرەو ژوور واتە لەلایەکەوە بەرەو گریانە بۆسەرسنوورو لەلاکەی ترەوە بۆ هاوارو بەرەو هەڵەبجە، هەندێک لەدەرەتفێ لای حزبی دیموکراتەوە دەهاتنە خوارەوە بۆ هاوارە کۆن و هەندێک سەرئەکەوتنەوە بۆ لای دەرەتفێ. ئەومالانەی کەپێشتر لەوێ نیشتەجێ بوون هەم عێراقی و هەم ئێرانی، هەموو بەیەکدا دەهاتنو دەچوون، چەند پاسداریش هاتبوونە ناویان، بەرایی سەربازی دیل و هەلهاتوو برینداریش گەیشتبووە ناو ئاوایی وناو ئەو چەمو باخە چڕانەی هاوارە کۆن.

خەڵکێکی زۆریش دەوری منیان داوەو لێم ئەپرسن چی بکەین؟ بۆکوێ بچین؟ منیش ئەمگووت نازانم، لەمکاتەدا دووبارە ناردمانە لای حزب یەکێک بنێرنە خوارەوە، کادرێک ئەندامی کۆمیتە شارستان بوو بەناوی حەمەی مزەفەری خەڵکی ئاوایی نۆدشە هات بۆلامان، پێم گووت: برۆ بەبرادەرەکانت بڵێ ئەوە شنروێ و بالامبۆ گیراون، شەڕکردنی ئەوان لەنزاری قەڵاگاو ئاوەزنێ کەڵکی نییە، خەڵک مەدەن بەکوشت، هەتابوار ماوە برۆن و ناوچەکە چۆڵ بکەن، ووتی باشەو بەپەلە گەڕایەوە، خەڵکێکی زۆر لەعەشایەرە ئێرانییەکانی سەر بە دیموکرات، پەرۆشی ئەوە بوون رزگاریان بکەین یان لەگەڵ خۆمان بیان هێڵینەوە منیش دەمزانی ئێران ئەوەمان لێ قبول ناکات. پێشتر ئەمەم بەکاک شەوکەتو کاک حامد وتبوو، هەرواش دەرچوو، چونکە لەسەر رەزامەندی ئێران خۆی مامەیارەی ئێناخی ساڵێک بەر لەو رۆژە هاتبووە لای ئێمە، کەچی دواتر لەسێدارەیاندا.

دواتر رۆیشتمەلای بێسیمەکە تابزانم بۆچی داوای منیان کردووە، کاک شەوکەت پێی راگەیاندم، هەندێک لەو بەرنامەی هەبووە تێکچووە

لەبەرئەوە دەڵەمەڕ نەگیراوەو نازانین بارودۆخەکە چی بەسەر دێت، بۆیە پێویستە لەوڕەتڵەی لای ئێوەیە هێزێک ئامادەبکەی و هەڤاڵ سەلامی کیخا عەزیزیش لەگەڵ بەشێک لەهێزەکەی کاک قادر ئەگەڕێنینەوە بۆلای ئێوە کاک قادرلای ئێمە دەبێت، دەبێ ئەمشەو پەلاماری بارەگای لیوای پالانیاو بەرزاییەکانی سورەهەلالەو پشتی پالانیاو پشتی دەرەتفێ بدەن.

هەر دوا بەدوای قسەکانی من حەمەی مزەفەری گەڕابووەوە بۆ دەرەتفێ و لەبارەگای هێز قسەکانی منی بەئاشکراو بێ پێچ و پەنا بۆ برادەرەکانی گێڕابووەوە، بۆیە چەند کەسێک پەلاماری ئەدەن و ئەلێن ئێران شکاوە شنروێ و بالامبۆ نەگیراوە تۆپیاوی ئێرانی و پروپاگەندە ب لاوەئەکەیتەوە بۆئەوەی پێشمەرگە وورە بەربدەن و بەری هێرشەکە چۆڵ بکەن، لێیان دابوو سەری حەمەیان شکاندبوو.

ئێران چەند هێرشێکیان کردبوو شکابوون، لەمکاتەدا ئاغای ئێرانی دووبارە هاتەوەو ووتی بەلکو هەول بدەیت دیموکرات قایل بکەیت لێرە بڕۆن، منیش وتم هەولماندواە بزانین چی دەبێت. پاش نیوەڕۆ هێزەکەی دیموکرات کەوتە پاشەکشە بەرەو لای تاوێرەو قەلاڕێزین وچەمو دۆلی ئاوایی دەرەشیش.

بۆ لای عەسر کاک سەلام، هێزێکی ٣٠-٤٠ پێشمەرگەی لەگەڵدابوو گەیشتە لامان. سەلام پیاوێکی قارەمان بوو لەم شەڕەدا فەلاحی برای کەپێشمەرگەیەکی قارەمان بوو لەگەڵمان بوو بەداخەوە دواتر لەکاتی ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩٩١ فەلاح و سەلاح و چەندین خزمی تری کاک سەلام لە خانەقین شەهیدبوون، ئەو شەوە لە هاوارە کۆن ماینەوە، ئێمەش نزیکەی ٥٠ پێشمەرگەمان لەڕەتڵی دوو هێنایە خوارەوەو لەخواریشەوە نزیکەی ٢٠ کەسی متەفەریقەمان لێ کۆبونەوە هێزەکەمان بووبە نزیکەی ١١٠ کەس.

لەمکاتەدا حەمەئەمینی کەریمان، خەلکی ئاوایی نەروی و ستاری سەعیدی جەلالی خەلکی نەوسوودو حسێن جوانڕۆیی، کە سێ کادیری حیزبی دیموکرات بوون هاتن و وتیان دەرەتفێ چۆلەو کەسی لێ نەماوە ئێمە دواکەوتوین هاتووین بۆ لای تۆ چی بکەین؟ وتم وەرنو تێکەلی ئەم هێزە ببن.

سەرکەوتین بۆ ئاوایی دەرەتفێ، کەنزیکەی ٢٠٠ ماڵی ئێرانی و خێزانی پێشمەرگەی دیموکرتی لێ نیشتەجێ ببوو، لەگەڵ بنکەو بارەگای

هێزی شاهۆو هێزەکانی تری دیموکرات، هەموو چۆڵ کرابوون و هیچ کەسێکی لێ نەمابوو، ئێرانییەکانیش دوای ئەوە لە شەڕی ڕۆژی پێشتر شکابوون لەقەلاَگا بەملاوە بەرەو دەرەتفێ نەهاتن و لەقۆڵەوە کشانەوە.

ئەم شوێنەی ئێمەی بۆی دەچووین بەرەی پێشەوەی شەڕی عێراق و ئێرانە، ١٠ مەتر زەوی شک نابەی، کە مینی تێدا نەچێنرابێت، تەنیا باریکە ڕێگەیەک هەبوو، ئەویش بۆ هاتووچۆی هەندێک سەرباز بووە جاروبار بۆ ئاوبردن یا لێرەوە کەسێک پێیدا چووبێتە لای ئەوان.

ئەمەم بۆ سەلاَم باس کردو پێم گووت: بەشەو ناتوانین بچینە سەریان، ووتی: ئەی چی بکەین؟ وتم ئەی بۆ ئەم پێشمەرگانەی حزبی دیموکرات لەگەڵ خۆم نەبەمو نەڕۆمەسەرەوە بۆ شناسای بەڵکو فەرماندەی ئەم سوپای عێراقیش ببینم و بڵێم ئێمە دیموکراتین و جێماوین شەو لێرەوە پاشەکشە دەکەین، ووتی: خۆت ئەزانی. وتم: تۆلێرە لەگەڵ ئەم هێزە بمێنەوە خۆتان زۆر دەرمەخەن و دەریشکەون وائەزانن هێزەکەی دیموکراتە، قسەم لەگەڵ پێشمەرگەکانی دیموکرات کردو حەمەئەمین کوڕێکی ئازاو برادەریشم بوو ووتی: باستارو حسێن لێرە بن لای کاک سەلاَم من ئامادەم بێم بابڕۆین.

بە ڕێگەکەی نێوان مەیدانی مینەکاندا سەرکەوتین بۆسەر شاخ، ئاوایی دەرەتفێ دەکەوێتە خوارەوەی ئەم زنجیرە چیای سەرەوە بەلای خۆرئاواداو خاکی عێراقە، بە لای ڕۆژهەلاَتیشدا خاکی ئێرانە، لەدەرەتفێ سەرئەکەویت بەدیوی لای باکوردا شۆڕدەبیتەوە تا ئەگەیتە ئاوایی پالاَنیا. لە ڕێگە بە هێواشی بەدەم قسەکردنەوە چووینە سەرەوە بەکەریمیانم گووت: بە عەرەبی قسەناکەین و داوای تەرجومان دەکەین من عەرەبیش نازانم، هەرچیان پرسیار کرد تۆ هیچ قسەمەکەو وەلاَمیش مەدەرەوە، ووتی باشە.

من ماندوو بووم شەوی پێشووش نەخەوتبووم هەردووکمان جانتای ماسکی گازو کۆلەپشتو چەکو تاقم بەکۆڵمنانەوەیە. گەیشتینە لای یەکەم سەنگەرو تەلبەندەکە، دووسەرباز کەلە دوورەوە ئێمەیان چاوکردووە هاتنە بەردەمان، سەربازەکان سەلاَم وعەلێکیان کرد، وەلاَممان دانەوە، ووتیان فەرموون، وتمان ئامرمان دەوێت، تەلەکەیان لاداو یەکێکیان بەدیوی پالاَنیادا پێشمان کەوتو شۆڕبوینەوە بۆ جێگەیەک بەناوی خۆرەتاو نزار یان قەلاَتەی شوانان،فەرماندەکەیان لەوی بوو.

لەلای ئاوایی دەرەتفێ وە بەپیادە ۲۰ دەقیقە ڕێگایە تاسەنگەری پێشەوەی سوپای عێراق، لەوێشەوە ۱۵ خولەک چووین و گەیشتینە بارەگای فەوج، بەحسابی ئێمە ئەمە فەوجە، بەلام بارەگای سریە بوو، پالانیاش لیوا لێ نەماوە بارەگای لواکە ئامر فەوجی لێیە. ئەفسەرێک هات بەدەمانەوە بەخێرهاتنی کردین و ڕەنگ و ڕووی پەڕی بوو چاییان بۆ هێناین و بەدەم چاخواردنەوەوە پرسیاری کرد چیتان ئەوێت؟ دەنگو باستان چی یە؟ وتمان دەنگو باسی ئێوە چی یە؟ ووتی: زۆر باشە، ئێرانییەکان دەستیان گەیشتبووە هەندێک سەنگەری پێشەوە لەشنروێ، بەلام لێمان وەرگرتنەوە، منیش پێم گووت: ئەی ئێمە ئاگادارین شنروێ بەدەست ئێرانییەکانەوەیە ئەو هەر حاشای دەکرد دیارە نەیدەزانی هێزەکەی دیموکرات ناوچەکەی چۆل کردووە، ووتی: ئەم پێش نیوەڕۆ بەتۆپ شێخان و تەشارماندوو ئاوایی ئێرانن قەسف کردووە باش بوو چاوتان لێ بوو؟ وتمان بەلێ، ووتی: بابچینە سەرەوە سەیری شوێنەکان بکەین.

من پێم ووت هێزەکانی ئێمە ڕۆیشتوون و ئێمە سەد کەس ماوین ئەمانەوێت ئەمشەو ئێمەش بڕۆین، شەوبێن و لێرەوە پاشەکشە بکەین، ووتی: چۆن ئێوە ئەوهێزە قارەمانەتان هەیە، من بە دووربین سەرلەبەیانی دوێنێ چاوم لەمەعرەکەکەتان بوو بۆچی چۆلی دەکەن؟ منیش پێم ووت شنروێ و بالامبۆگیراوەو هیچ چارەنییە جگەلەپاشەکشە، چونکە ئێمەش و ئێوەش تازە کەوتوینەتە پشتی بەرەی شەڕەوە، دوای ئەوە سەیری دیوی ئێران و ئەو شوێنەی ئەوان تۆپبارانیان کردبوو کردمان، ووتی: بابچینەوە بۆ بارەگا هاتینەوە جێگەکەی خۆی، تەلەفونێکی سەحرای لابوو هەندێک لێیداو کەس وەلامی نەدایەوە، دووبارە پرسی ئێوە چۆن پاشەکشەتان کردووە؟ ووتم لەهەلەبجەوە فەرماندەی گشتی ئێوە ئاگاداری کردوین بچینە هەلەبجە. دووبارە چەند جار تەلەفۆنەکەی لێداو کەس وەلامی نەدایەوە.

من وتم بائێمە بچین هێزەکە چاوەڕێمان دەکات جەماعەتەکەت ئاگاداربکە، کەشەو لێرەوە لای ئێوەوە پاشەکشە دەکەین، پێشم گووت: کەهاتین تەقەمان لێ نەکەن، بانهێنییەک لە نێواندا بێت ووتی: تۆ ناوت چییە؟ وتم عەلی، ووتی: هەر بلێ عەلیم، وتم باشە ئەڕۆین ئەو سەربازەی ئێمەی بردبووە لای ئەو لەوێ نەمابوو، سەربازێکی تری لەگەل ناردین سەرەو

ژوور بووینەوە ١٠٠ مەتر دوور نەکەوتبووینەوە لەدواوە بانگیان کردین بگەڕێینەوە ئامر داواتان دەکات حەمەئەمین بەهێواشی ووتی: تووش بووین، وتم: مەترسە بشمان گرن بۆ کوێمان دەبەن ئەم شەو خورماڵ و پردی زەڵم ئەگیرێت من نەمزانی بوو گیراون.

گەڕاینەوە ئامر بەتووڕەییەوە ووتی: هەرکەس بە شەو بێت بەرەو ئێمە لێی ئەدەین نەیەن، وتم باشە ئەی بۆ ئێستا نەیەین لێرەوە بڕۆین، سەربازێکی خەڵکی ولاخ لوی دۆڵی جافایەتی بەناوی ئەنوەر وەرگێڕمان بوو.

ووتی: زۆر باشە ئێستا وەرن بڕۆن، وتم: زۆر باشە یەک کاتژمێر مۆڵەتمان بدەنێ هێزەکە ئەهێنینو ئەڕۆین، ووتی: بڕۆن، گەڕاینەوە سەرەو ژوور ٣٠سی دەقیقەی نەبرد هاتمەوە لای کاک سەلام حکایەتەکەم بۆفەرماندەو پێشمەرگەکان گێڕایەوەو ووتیشم ڕەبیەو سەنگەرەکانیان چۆڵو سەربازی کەم لێیە، هێزەکەمان خستەڕێو ڕێگاو ڕێگا دەستمان گەیشتە یەکەم سەنگەر، من و کاک سەلام و چەند کەسێکی تر لەپێشەوە ڕۆیشتین بەمام هەلمەتمان گووت: تۆ دواکەوە لەگەڵ ١٠ کەس گەیشتنە یەکەم سەنگەر بوەستن، ئێمە گەیشتینە بارەگای سریە داوای چەکیان لێ دەکەین پێشمەرگەش ئەوسەنگەرو ڕەبیانەی ئێرە تالای ئامر پەلامار ئەدەن، سەنگەرەکان کەخالی بەرچاون ئەکەوتن. لەشێوەی جۆگەی ئاودا لە نێوان ڕەبیەکاندا دروست کرابوون، بەلام کەبوو بەتەقە لەهەموو سەنگەرەکانەوە سەرباز دەهاتنە دەرەوە. ئێمە گەیشتینە بارەگای سریەو ئامر لەوێ نەمابوو، پێشمەرگەیەک لەگەڵ هێزەکەی کاک سەلام ناوی سالح بووناسراو بەسالە گژە، لەناکاو تەقەی کرد.

سالح خەڵکی ئاوایی کوێرەکی بناری بەمۆ بوو، بەدوای سالح دا هەندێک پێشمەرگە چەند دەست ڕێژێکیان کردە ناو سەنگەرەکانی دەوروبەرمان بینیمان نزیکەی ٤٠-٥٠ سەرباز لەملاو لەولاوە لەکونەکانەوە دێنە دەرەوەو هاوار دەکەن مەمان کوژن تەسلیم ئەبین، کەسیان تەقەی نەکردو ئەو بەرزاییەی نێوان پالانیاو ئاوایی دەرەتفێ هەمووی هاتە خوارەوە بۆ لای بارەگای سریە، پێشمەرگەکانیش دەستیان بەچەککردنیان کرد.

هەوالی ئەفسەرەکەم پرسی سەربازێک ووتی: ئێستا ڕۆیشتوەتە خوارەوە بۆ بارەگای فەوج، ئێمەش تفەنگمان خستە سەرشانو بەرەو پالانیا

سەرەو خوار بوینەوە سەیرمان کرد لەلای شۆشمێ و تەویلەوە لەدوو لاوە بەسەدان سەرباز ملیان ناوەو بە پیادە لەلایەکەوە بەرەو بیارەو بەڵخە ئەڕۆن لەلایەکی ترەوە بەرەو پاڵانیا دێن ئەمانە لە بەرەکانی پێشەوە پاشەکشەیان کردوو.

بەرلەوەی تاریک بکات گەیشتینە سەر ئاوایی پاڵانیا قەتارەی سەرباز ئەوەندە زۆربوو لەشوێنەکانی ترەوە بەرەو پاڵانیا دەهاتن، بە پێشمەرگەمان دەگووت: تەقەیان لێ بکەن بانەیەن، ئەم حەشاماتە چی لێ بکەین.

دوو مەفرەزە چوونە خوار بۆ بارەگای فەوج بۆ ناو ئاوایی پاڵانیا، ئێمەش بەدوای ئەواندا چووینە ناوبارەگای فەوج، بارەگا لەبن دارگوێزەکانی بەردەم ئاوایدا بوو، شوێنێکی تەخت باخو دارگوێزی گەورەو بەرزی زۆری لێ بوو، ئەفسەرو سەربازو برینداری چەند ڕۆژی پێشتر لەوێ کەوتبوون تازە کەس داوای چەک لە کەس ناکات ئەتووت هەموو یەک هێزین هەمووی بە دوای نانو ئاودا دەگەڕا ئازوقەو خواردنی لێ نەبوو بەڵام بەتانی وکەلوپەلو چەکو چۆڵێکی بێشومار لەو ناوەدا کەوتبوو.

کاک سەلام پرسی چی بکەین؟ وتم لێرەوە نزیکە بەچەمدا بەرەو هاوار دەگەڕێینەوە، ئەمە شەوی ١٥لەسەر١٦/٣/ ١٩٨٨ تە، دیارە ئەم هێزانە بەدرێژایی نزیکەی ٤٠ چل کیلۆمەتر لە بەرەی پێشەوەی شەڕی عێراقو ئێران لە دەرەتفێ وە تا تەویلەو ئاوێسەرو لای بیارە، ئێران لە دیووی لای خۆیەوە جولەی نەکردووەو ئەم هێزەی عێراقیش ئاگاداربوون، کە پردی زەڵم و هەڵەبجە گیراوە خۆیان هاتوونەتە خوارەوەو ملیان ناوە بەرەو دواوە تا ئاخۆ لەکوێو کێ بەریان پێ ئەگرێ.

لەبارەگای فەوجەکە چەند چرایەکی فانۆسی پڕلەنەوتمان داگیرساندو چەند پێشمەرگەیەکی شارەزایی ڕێگای پاڵانیا ـ جاور هاوارمان چرا دار کرد، وەک سەلاح سۆسەکانی ئازادی حاجی عومەر، عەبدوڵلای برای ئازاد سەباحی مەحمود بەگو غەفاری فایەق. ١٠٠تا١٥٠ ئەفسەرو سەربازیشمان بەچەکی شانی خۆیانەوەو هەندێکیش چەند پارچە چەکێکی R.B.Gو هاوانی ٦٠ملیمان زیادە دابەکۆڵیانداو هەر نزیکەی ٢٠ پێشمەرگەو ٢٠ سەرباز تێکەڵ بەدوای چرا بەدەستێک دا بەرەو هاوار کەوتینە ڕێ لەبەر ئەوە لەپاڵانیا نەمانوێرا بمێنینەوە، چونکە پەیوەندیمان لەگەڵ هێزەکانی خۆمان برابوو،

کەسێکی ئێرانیشمان لە پاسدارەکانی پەیوەندی و بێسیم چی لەگەڵدا نەبوو، ترساین ئەم شەو ئێران ناوچەکە تۆپباران بکات یان لە نەوسوودەوە هێرش بکات.

کاتژمێر ٨ی شەو گەیشتینە کەلاوەکانی ئاوایی جاور، کەگوندێکی چەپەکو جێگایەکی باش بوو بۆ پشودان، ئەمشەو هەموو سەربازو ئەفسەرەکانمان وەک ڕانەمەڕ لەدۆلەکەدا داناو خۆمان بەچواردەوریاندا ئاگرمان کردەوەو بەوانیشمان گووت: ئاگربکەنەوە تابەیانی. ئەفسەرەکەی، کە فێڵم لێ کردبوو هەر شەو لە جاور لە پال ئاگرێکی گەورەدا بەپێوە وەستابووم هاتوو ووتی: ئەوە تۆ نەبوویت عەسر هاتی بۆ لام؟ وتم بەڵێ من بووم، ئیتر ئەویش حکایەتەکەی ئەگێڕایەوە بۆ ئەفسەرەکانی تر، دەیگووت کاکە عەلی ئەو تاکتیکەی بەکارهێناوە، چونکە من کاتێک لەگەڵ کەریمیان چوو بووم بۆ لای، پرسی ناوت چییە؟ وتم ناوم عەلییە، حەمەئەمین کەریمیان ئێستا لە وولاتی سویدە.

سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦ لەجاورەوە بەرەو هاوار کەوتینە ڕێو ملمان نا، ئێمە نەماندەزانی تیپی نەبی ئەکرەم لە نزیک هاوار سەر ڕێگەکەیان لێگرتووین، ئەوانە شەو لەسەر بەرزایی سەرخوشێنەوە کە ئەکەوێتە نێوان هاوارو بەلخە چاویان لەئاگرەکانی ئێمەبووە، چاودێری ناوچەکەیان کردووە بەیانی خەبەریانداوە بە هەموو لایەک هێزێکی تێکە لاوە لەسەربازی نیزامی و چەکداری بومی پێشمەرگە بەرەو هاوار دێن.

لەجاور بۆ هاوار نیو کاتژمێر ڕێگەیە، کاک سەلام و چەند پێشمەرگەیەک پێشکەوتن و زووتر گەیشتبوونە ناو ئاوایی هاوار، ئێمەش بەدوای ئەواندا کەگەیشتینە قەراغ ئاوایی لەلاشانێکەوە دەرئەکەوی و ئاوایت لێوە دیارە، سەیرم کرد پاسدارێکی باریکەلەی ڕیشداری ڕەشتالە لەسەر ڕێگەکەمان وەستاوەو دوونارنجۆکی بە دەستەوەیە، ئەلقەکانی ڕاست کردووەتەوە، بانگی کرد: بوەستن، مەجولێن، ئێوە کێن؟ منیش وتم پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستانین ئەمانەش دیلی عێراقین، قسە لەو قسە لە ئێمە هیچ بەگوێیدا نەچوو، ئەم هەموو عالەمەی وەستاندوە، من ڕۆیشتمە پێشو کارتی پێشمەرگەو وەرەقەی مۆرکراوی تیپی ١١ی هەورامانم پیشاندا، کەچی ئامادە نەبوو سەیری بکات. لەوکاتەدا کاک سەلام

گەڕایەوەووتی: ئەوە چییە؟ وتم: ئەم ئاغا ڕێگای لێگرتووین و هیچ بەگوێیدا ناچێت.

سەلام ووتی: دەی وەرن ناهێلی چی ئەکات، ووتی: چی ئەکەم؟ یەکێک لە نارنجۆکەکانی دەستی برد بۆ لای دەمی و بە دان ئەلقەی ڕاکێشاو بیخاتە ناومان، کاک سەلامو دوو کەسی تر باوەشیان پێداکردو گرتیان نارنجۆکەکانیان لێ سەند. ئێمە ئاگاداری ئەوە نەبووین، کە ئەم کەسە هێزێکی لەگەڵدایەو لەسەرەوە بەرەو خواردێن، فریانەکەوتوون ئەم بەم دوو نارنجۆکەوە ڕای کردووە ئێمە ئەخلەتێنێ تائەوان بێن.

ئەوان نزیک ببوونەوە، ئەم لێرەوە هاواری لێکردن ئەوانیش خۆیاندا بە زەویدا داو میلی چەکیان لێ ڕاکێشاین، ئێمە نەمان دەویست بیان کوژین، بە قسەکردن و بانگکردن یەکێکی تریان هاتوو من پێم وت، کە ئێمە کێین و لە کوێ بووین و فەرماندەی عەمەلیات کێیەو چەند ناوێکی بەرپرسەکانی ئێرانم هێناو ووتی: ڕاستە فەرموون. کەوتینەڕێ کابرای خاوەن نارنجۆک بانگی دەکرد بۆ سەرەوە دەیووت جەماڵی بیا سەیری ئی خرس گەلەکە. هاتینە سەرکانییە درێژی هاوار، پێشمەرگەو سەرباز ب لاوەبوونەوە لەوێ کارتۆنە بسکیتو نانە ڕەقە هەلرژابوو دەستیان کرد بە خواردن. دوای پشوویەکی کورت بینیمان لە سەیارەیەکدا کاک حامدو موقەدەم محەمەدی تارانی و ئاغای ڕەسولی لە تاوێرەوە بەرەو هاوار هاتنو دابەزین، گەیشتنە لامانو وتیان ئەمە چییە؟ ئێمەش چیرۆکی چۆنییەتی گرتنی ناوچەکەو گەڕانەوەمان بۆ ئێرە بۆ باس کردن، وتیان: ئێوە بچن پشوو بدەن، وتم: ئەی ئەم دیلانە؟ وتیان با برۆن بەرەو شێخان کەسێک بخەنە پێشیان ڕەوانەیان بکات بابڕۆن، کاک حامد ووتی: چەند کوردیان تیایە لای خۆتان گلی بدەنەوە.

بەمەبەستی پشوودان بەرەو ئاوایی هاوارە کۆن بەڕێ کەوتین، کە گەیشتینە پێشەوە فڕۆکەکانی ڕژێم بە بۆمبی کیمیایی بۆردومانی نێوان گریانەو هاوارە کۆنیان دەکرد، ئاڕاستەی هەواش بەرەو هاوارە کۆن بوو، ستاری سەعید جەلالی و حەمەئەمینی کەریمیان و هاوڕێکانیان شەو نەمان بردبوون بۆ سەر پالانیا ناردبوونمەوە بۆ هاوارە کۆن، کە گەیشتمەوە یەکسەر هاتن بۆ لامان لەوێ ستار فریامان کەوت ئێمەی بردە ناو ژوورێکەوەو خێرا بەتانییەکی تەڕ کردو کردی بە پەردە بۆ ژوورەکە هەتا

بۆنو بوخاری کیمیاویەکە نەما. هەندێک خەڵکی ئێرانی لێ بوو وتیان چی بکەین؟ پێمان وتن: کێ دەچێتەوە بۆ ئێران ئەوە لەرێی گریانەو شێخانەوە برۆن بەتایبەت ژنو منداڵ، کێش دەچێت بۆ لای هێزەکەی دیموکرت با بێت لەگەڵ کەریمیان و هاورێکانی دا بروات بۆلای ئەوان لە تاوێرەو دەرەشیشن.

ئەو شەوە ئەوەندە خەڵک هاتوو کێشەیان هەبوو من هیچ پشووم نەدا، کەمێک خەوتینو بەیانی ڕۆژی ٣/١٧ هەستاین بەرەو هەڵەبجە برۆین، بینیمان خەڵکی هەڵەبجە لە ڕێگای هاوار بۆ هاوارە کۆنو لە ڕێگای هاوار بۆ دەرەتفێ وەک مێرووله بەڕێوەن، هەمووی بە هاتوو هاوارو نالەو گریانەوە هەندێکیان کوێر ببوونو دەستیان گرتبوون، هەندێکی تر برینداربوون و بە کۆلی خەڵکی ترەوە بوون، ئیدی زانیمان هەڵەبجە کیمیاباران کراوە. بە هەرحاڵێک بوو بە لارێداو بە لای ئەو خەڵکەدا خۆمان گەیاندە هاوارو لەوێ هەندێک پێشمەرگەی تیپی ١١ی هەورامان، کە لە ڕەتلەکەی کاک شەوکەت بوون هاتنو بریندارو کوێر ببوون لەوانە: ئەکرەم ئەحمەد لێمان پرسی چی ڕوویداوە؟ ووتی: هەڵەبجە گیرا، بەڵام دواتر ڕژێم کیمیابارانی کرد. وتمان، برۆن بەرەو ئێران، ئێمەش هاتینە تاوێرە لە هاوار بۆ تاوێرەش بە هەزاران ژنو منداڵ و پیرو گەنجو پێشمەرگەو چەکداری تریش بەڕێگەوەبوون، هەندێکیشیان لەملاو لەولای ڕێگاکەدا لایان دابوو پەکیان کەوتبوو.

زۆر خەڵک بریندااری کیمیایی و زۆریش بریندااری پارچەو پەلاش بوون، بۆ ئێوارە گەیشتینە ئاوایی عەبابەیلێ، تەشکیلات تێکچووبوو ڕەتڵ و تیپ و کەرت و مەفرەزە هیچی بەسەر هیچەوە نەمابوو، هەرکەس بۆ خۆی، مەبەستم هێزەکەی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستانە، لایەنەکانی دیکەش بەهەمان شێوە، شەهیدو برینداریان هەبوو. زۆر بریندااریش بەبێ کەس ملی ناوە تا لەناو شار دووربکەوێتەوە، هەندێکیش کەسوکاری خۆی دۆزیبووەوەو بەرەو لوتکەی چیاکانو دۆڵەکانی دەوروبەر ڕۆیشتبوون.

ئیدی لەوکاتەدا زانیمان پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٥/ ١٩٨٨/٣ هەڵەبجە گیراوە، هێزی پێشمەرگە ڕەتڵی یەک و بەشێکی ڕەتڵی دوو چووبوونە ناو شار، پاسداریش لە بەرزاییەکان و هێزێکی زۆریش لە هەولی کۆنترۆلکردنی ڕێگای زەڵم سیروانو کەناری دەریاچەکەدا بوون، هێزەکەی ئێران خۆیان لە قەرەی ناو شار نەدابوو، بەڵام تاکو تەراو مەفرەزەی جیاجیا لە ڕۆژی

١٩٨٨/٣/١٦دا ڕۆیشتبوونە ناو شار، پێشمەرگەش لەناو شاردا بووە، بەرپرسانی پێشمەرگەو ڕێکخستنەکانی ناو شارو خەڵک لە کۆبوونەوەو تەکبیری ئەوەدابوون چی بکەن.

هێزەکانی ئێرانیش لە پێشڕەویدان بۆ قایمکردنی هێڵی پێشەوەی بەرەکە، لە گولەخانەوە بۆ پردی زەڵمو کەناری دەریاچەی دەربەندیخان و چیای تەمورەژنان، ئالەمکاتەداو لە کاتژمێر ١١:٤٥ خولەکی ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦ دا، بە باراندنی گازی مەرگ لەلایەن هێزی هەوایی عێراقەوە هەموو شت تێکو پێک دەدات.

# وێنەگر و ڕۆژنامەوان هاتنە مەیدانی جەنگەکە

دەبێ دان بەوەدابنێین ئەگەر ئێرانییەکان ڕێگەیان بە کەنالەکانی میدیای ناوخۆی ئێران و ڕۆژنامەنووسان و وێنەگرانی وڵاتانی خۆرئاوا نەدایە کارەساتی کیمیابارانکردنی هەڵەبجەش وەک پرۆسەی ئەنفال و بێسەروشوێن کردنی هەشت هەزار بارزانی و هەموو تاوانەکانی پێشوتری عێراق بە بێدەنگی و شاراوەیی تێدەپەڕی. بەڵام ئەمجارەیان ١٩٨٨/٣/١٦ بەهۆی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە بووە مایەی گرنگی پێدانی زۆرێک لە کەنالەکانی میدیا لە جیهاندا.

سەرەتای ب لاوەبوونەوەی هەواڵەکە لە میدیاکانی ئێرانەوە دەستپێکرد، دیارە ب لاوەبوونەوەی ئەو دیمەنە ترسناکو مەرگبارانە لەلایەن کۆمەڵێک وێنەگرەوە بووە، کە گیانی خۆیـــان خستبووە مـــەترســـــی و خزمـــــەتێـکی گەورەیـــان بـــە کێشەی نەتەوایەتی و کێشەی ڕەوای گەلەکەمان گەلی کورد کرد، بە بەڵگەو دێکیۆمێنت سەلماندیان کەوا ڕژێمی بەعس و سەدام حسێن چەکی کۆکوژیان هەیەو لە دژی گەلی کورد بەکارهێناوە.



ناو شاری هەڵەبجە

ئەو کەسانە واتە وێنە گرەکان زۆرن، من وەک کوردێک وپێشمەرگەیەک وەک کەسێکی خەڵکی هەڵەبجە ڕێزو خۆشەویستیم هەیە بۆ ئەوانەیان، کە لە

ژیاندا ماونو س لاوە درود بۆ ڕۆحی شادی ئەوانەشیان، کە ماڵئاویان لە ژیان کردووە دەنێرم.

ڕۆژنامەنووس ئیبراهیم هەورامانی، کە یەکێکە لەو کەسانەی زۆر ماندونەناسانەو بە بەردەوامی هەوڵی کۆکردنەوەو بەدەستهێنانی زانیاری نوێ لەسەر کەیسی کیمیابارانی هەڵەبجە دەدات، لە یەکێک لە بەرهەمەکانیدا بە ناوی لە هەڵەبجە بووین ئاماژەی بە ناوی ژمارەیەک لەو ڕۆژنامەنووسانە کردووە، کە لە نزیکەوەو بە چاوی خۆیان ڕووداوەکانیان بینیوەو تۆمارکردووە، لەوانە:

١. ئەحمەدی ناتقی، خەڵکی تاران، کە لە ماوەی هەشت ساڵی جەنگی عێراق - ئێراندا وەک ڕۆژنامەنووس و وێنەگر لە بەرەکانی جەنگدا کاری کردووە.



٢. ڕەمەزان ئۆزتورک، خەڵکی باکووری کوردستان، ئەم ڕۆژنامە نووسە بەناوبانگە ساڵی ١٩٨٧ لە ڕێگای بەغداوە دێتە عێراق، دواتر سەردانی شاری سلێمانی دەکات لە نزیک تاسلوجە لە ئۆتۆمبێل دادەبەزێ و بەدزیەوە ڕوو لە چیای پیرەمەگرون دەکات، لەوکاتەدا هێزی پێشمەرگەی کوردستان چەند بیانییەکی لە نزیک کارگەی چیمەنتۆی تاسلوجە گرتووەو لە بەرگەڵوو زیندانی ئەبن، لەوانە کەسێکیان تورک دەبێ بە ناوی عەلی.

ڕەمەزان لە نزیک قزلەر سەرئەکەوێ بۆ سەر چیاو لەوێ دەستەیەک پێشمەرگە دەیگرن و لێی حالی نابن، بۆیە بە بەندکراوی دەیبەن بۆ زیندان، پێشتر ڕۆژنامەیەکی تورکی ب لاوەی کردبۆوە لە عێراقدا ئەو ڕۆژنامەنووسەیان بە ناوی عەلییەوە بێسەرو شوێن بووە، هەروەها دوای ماوەیەکیش هەر بەهەمان شێوە زانیاری سەبارەت بە دیارنەمانی ڕەمەزان ئۆزتورک لە ڕۆژنامەکانی وڵاتی تورکیادا ب لاوەدەبێتەوە.

ڕەمەزان ئۆزتورک لە زینداندا دەڵێت: من ڕۆژنامەنووسم و هاتووم سەردانی مام حەلال بکەم، مام جەلال ئاگادار دەبێت و داوای دەکات دەچێتە یاخسەمەر بۆ لای مام جەلال، دیدارێکی ڕۆژنامەوانی لەگەڵدا ئەنجام دەدات، داوا دەکات لە مام جەلال، کە عەلی ئازاد بکات مام جەلالیش داواکەی قبول دەکات، بۆیە ڕۆژێک دوای ئەم دیدارە لە ڕۆژنامەی سەباحی تورکیدا ب لاوەدەبێتەوە بە مانشێتی گەورە دەنوسێ ڕەمەزان نەک هەر وون نەبووە عەلیشی دۆزیوەتەوە.



دواتر ڕەمەزان ناتوانێ لە عێراقەوە بگەڕێتەوە، لەگەڵ عەلی لە ڕێگەی عەلاقاتی یەکێتیی لە شاری سەردەشتی ئێرانەوە بەڵگەی هاتووچۆیان بۆ دەکرێت و بە دزی و بە ناوی پێشمەرگەوە دەچنە شاری ورمێ لەوێ ئێران پێیان دەزانێ و ئەوانیش دەچنە کونسولگەری تورکیا لەناو شاردا دواتر دەگەنەوە تورکیا. پێویستە بلێین، وێنەی عومەری خاوەر ڕەمەزان تورک گرتوویەتی.

٣- سەعیدی جانبزرگ وێنەگری سوپای پاسداران، لەگوندی عەنەب بریندواربووە بەچەکی کیمیاوی،دواتر لەساڵی ٢٠٠٢کۆچی دوایی کردووە.

٤- عەباس عەبدولڕزاق ناسراو بە عەباسی ڤیدیۆ، خەڵکی خانەقینو پێشمەرگەی دێرینی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان، وێنەگرو ڕۆژنامەنووسی سەردەمی شاخ لەگەڵ پێشمەرگەدا بووە.

٥- یوسی ڤۆتیلا ئەم وێنەگرو ڕۆژنامەنووسە خەڵکی ولاتی فنلەندایە، ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٨ گەیشتووەتە شاری هەڵەبجە.

٦- سەعیدی سادقی، خەڵکی تەورێز.

٧- ستێڤان یەرتین خەڵکی ولاتی سوید، ڕۆژی ١٩٨٨/٣/٢٢ گەیشتووەتە ناو شاری هەڵەبجە.

٨- عەلی ئەسغەر فەرەیدونی، خەڵکی تاران.

٩- کیس سخاب مان خەڵکی ولاتی هۆلەندایە.

١٠. ئەباسەلت بەیات خەڵکی ساوەی نزیک تارانە، ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٨ لەنێو شاری هەڵەبجەدا بووە.

١١. مەجیدی کەریمان، خەڵکی تاران، لە ڕۆژنامەی جمهوری ئیسلامیدا کاریکردووە لە ١٩٨٨/٣/١٨ لە هەڵەبجەدا بووە.

١٢. ئیحسان ڕەجەبی، خەڵکی تاران.

١٣. ئەرستۆ کلاشن، خەڵکی ولاتی نەرویج، لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/٢٢ گەیشتووەتە ناو شاری هەڵەبجە، ئەم پیاوە لە دیدارێکدا گووتوویەتی: لەساڵی ١٩٨٨دا هەڵەبجە گەرمترین دۆزەخی سەر زەوی بووە.

١٤. یوسفی گرامی، خەڵکی شاری ئەسفەهان، ڕۆژی ١٩٨٨/٣/٢٠ گەیشتووەتە ناو شاری هەڵەبجە.

١٥. ساسانی موئیدی خەڵکی تاران.

١٦. مەهدی جەمشیدی خەڵکی تاران.

١٧. جاسمی غەزبان پور خەڵکی خوڕەم شەهر.

١٨. مەحمودی بەدرفەڕ، خەڵکی تاران.

١٩. مەهدی فەلاحەت پور.

٢٠. مەحمودی مەعریفەتی.

٢١. سەیفولای تاهیری.

٢٢. هیدایەت اللەی بەهبودی نووسەر.

٢٣. غولامرەزای شەهید محەمەدپور.

٢٤. ئەحمەدی بەنەکشایی.

٢٥. کاوە گولستانی.لەساڵی ٢٠٠٣دا لەناوچەی کفری کوژرا.

٢٦. یەدولایی چراغی.

٢٧. پەرویزی پەژوهەندە.

٢٨. عززەت باوەکۆچەکی، یەکێک بووە لە پێشمەرگەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی، کە کامێرای پێ بووە.

# کۆبوونەوەیەک دوای کیمیاوی باران

ئەم کۆبوونەوەیە دوای چەند ڕۆژێک لە کیمیابارانەکە لە ئاوایی عەبابەیلێ بەسترا، لە کۆبوونەوەکەدا باس لەوەکرا هێزەکان پرشوب لاوە بوونەتەوە، هەندێک پێشمەرگە، کە خەڵکی سنوورەکەنین گەڕاونەتەوە بۆ ناو ئێران و لەگەڵ خەڵکدا ڕۆیشتوون، هەندێک سەرکەوتونەتەوە بۆ بنکەو بارەگاکانی پێشتر، کە تیپی ١١ی هەورامانی لێ بووە.

هەروەک لە شەڕەکەدا چەندین پێشمەرگە شەهیدو بریندار ببوون، بەشێکی زۆریش بریندارى کیمیاوی بوون، حاجی عەلی جانجانی و حەمەی برایی و حەمەحانی ژن برایی لە عەنەب لەناو سەیارەکەدا، کە کۆمەڵێک بەڵگەو دێکیۆمێنتی ئەمن و دەزگا جاسووسیەکانی ڕژێمیان پێ بوو ویستبوویان دەریبکەن، بەڵام گازەکە خنکاندبوونی، حاجی عەلی پیاوێکی بەڕێزو بەرپرسی لیژنەی ناوچەی شۆڕشگێڕان بوو.

ئەم کۆبوونەوەیە کە بۆ ڕێکخستنەوەی هێزەکەو کۆکردنەوەی کرا، تیایدا بڕیاردرا کە: کاک شەوکەت لە عەبابەیلێ بارەگا دابنێ، قادر کۆکۆیی بڕواتە باوەکۆچەک، منو مامۆستا ساڵح ماوەتی بچینە تاوێرە، ئەرکی کۆکردنەوەی ئەو پێشمەرگانەش لە ناوچەکەدا ب لاوە بوونەوە بگرینە ئەستۆ، بڕیار بوو بەیانییەکەی بگەڕێینەوە بۆتاوێرە، بەڵام عەسری ئەوڕۆژە دوای کۆبونەوەکە لەگەڵ شەهید نیازی هەورامی ویستمان بچینە خوارەوە سەیری هەڵەبجە بکەین، چونکە تا ئەو ئێوارە ئێمە نەچووبووینە ناو شار، لە ڕێگای عەبابەیلێ وە بۆ لای عەنەب تا نزیک ئاوایی جەلیلە ڕۆیشتین، دیمەنی قەتلوعامی ژن و منداڵ و ئەو هەموو لاشەمان بینی لەسەر ڕێگاو لەملاولەولای ڕێگاو سەرکانی و ئاوەکان کەوتبوون، دیمەنەکە هێندە تراژیدی جەرگ بڕ بوو نەڕۆشتین لەلای کانی قلیجی نێوان عەنەبو جەلیلە گەڕاینەوەو هاتینەوە بۆ ئاوایی عەبابەیلێ، بەیانی زوو کەوتینەڕێ بەرەو ئاوایی تاوێرە، کە گەیشتینەئەوێ خەڵکێکی زۆر چاوەڕوانیان دەکرد، تابزانن چی بکەن و چی تر ڕوودەدات، لێرەش تاکو تەرا بریندار هەبوون و بە سەیارەکانی سوپاو سەیارەی مەدەنی ئێرانی، کە لەئێرانەوە بارو بارخانەی پێ

دەگواستنەوە بۆ ناوچەکەو بەخالی دەگەڕانەوە بۆ ئێران، خەڵکو بریندارەکانیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد. پاش نیوەڕۆی ئیمڕۆ تەرمی شەهیدەکان حاجی عەلی و براو هاوڕێکانی و چەندین کەسی تری هاوولاتی عەنەبمان بەخاک سپاردن.

چەند ڕۆژێک ماینەوە بارەگاکەمان دانا سەباح بەگی دەرەشیشی، کە پیاوێکی بەڕێزو عەشایەری ناوچەکەو براگەورەی دەرەشیشیەکان بوو لەوی مابوەوە چەند ڕۆژ لای من بوو، هەروەها حەیدەری سەید محەمەدی بەلەبزانیش، کە هەموو ژنو منداڵەکەی گیانیان لەدەست دابوو خۆی بە تەنیا مابووەوە تەندروستی خراپ بوو ئەویش لەوێ مایەوە. دوای دەستکردن بە ئیشوکار برێکی باش لە هێزەکەی یەکێتیمان کۆکردەوە. لێرە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ کچێکی منداڵی بێخاوەنی چوار ساڵانم لابوو، ئەم منداڵە لەگەڵ خەڵکێکی زۆر لە دەوری ئاگرێکدا بوون خەڵکەکە ووردەووردە دەڕۆیشتنو لە دواوە خەڵکی تر دەهاتە لای ئاگرەکە، چەند دەستە خەڵک ئەهاتن و ئەڕۆیشتن هەر جارێک چۆڵ دەبوو ئەو منالە بە تەنیا دەمایەوە. سەرنجی ڕاکێشامو ڕۆیشتم هێنام ئەو خەڵکەی لەو دەوروبەرەدا بوو ئاگادارم کردن کەس خاوەنی نەبوو، بۆیە دامە دەست پێشمەرگەیەک بەناوی عەبدوڵلای حاجی عومەر عەنەبی، کە پێشمەرگەبوو لای خۆمان، منداڵەکە تا سێ ڕۆژ مایەوە، بسکیتی ڕەقو نانەڕەقەم دەخوساندو تێرم دەکرد، دواتر دامانە دەست خێزانێکی خەڵکی ئاوایی جەلیلەو وتمان بەڵکو خاوەنی بۆ پەیدا بێت، ئەوان لەگەڵ منداڵەکانی خۆیاندا بردیان بۆ ئێران، ئیتر نازانم دواتر چی بەسەرهاتوو هی کێ بوو، ماڵەکەش ماڵی کاک عەبدوڵلای برای مامە ڕەشەی[1] جەلیلەی بوو.

---

[1] – حەمەڕەشید جەلیلەیی پیاوێکی کوردپەروەرو تێکۆشەر بوو، ئەندامی ڕێکخستنی یەکێتی شۆڕشگێران بوو. زۆرێش چالاک بوو، ساڵی ١٩٨٧ کاتێک هێزەکانی یەکێتی بەتەمابوون پەلاماری فەوجێکی سووک بدەن لەناوچەی زرگوێزو دەوروبەری، کە فەوجی خالید ئەحمەد بوو، ناوچەی شۆڕشگێران حەمەڕەشیدیان بانگ کردبوو بۆ ئاوایی ئاوەکەڵە، لەوێوە ناردبوویان بۆ لای فەوجەکە، سریەیەکیان هەبوو پەیوەندی هەبوو بۆئەوەی ئاگاداری ئەو سریەو فەرماندەکەی بکات، شەو پێشمەرگە هێرشیان کردە سەریان ئەمان تەقەیان نەکرد وخۆیان بەدەستەوەدا. مامەڕەشە درەنگ گەیشتە شوێنەکە و شەو لەڕەبیەکەدا مایەوە، ئاگاداری فەرماندە سریەکەی کرد و ووتبووی: لەم شەوانەدا پێشمەرگە ئەگەر هاتنە سەرتان تەقە نەکەن و تەسلیمیان ببن. مامە ڕەشە نەیزانیبوو هەر

لە تاوێرە دووبارە عەبدولحسێن، کەکەم ئەندام و پێشمەرگەی حزبی دیموکرات بوو بینییەوە هاتە لامو ووتی: چی بکەم؟ چەند ڕۆژ پێشتر لەهاوار بینیبووم، لە هاوارو تاوێرە کەس لێی نەپرسی بوو پێم گووت نازانم چیت لێ بکەم؟ ووتی: لەگەڵ یەکێک لەم لۆریانەدا سوارم بکە دەگەڕێمەوە بۆ ئێران، شەوێک دامە دەست شۆفێری لۆرییەکی خەڵکی سەحنەی لای بێستوون، پێم گووت: دەتوانی ئەم کورە لەگەڵ خۆت بەریتەوە بۆ پاوە؟ ووتی: بەسەرچاو، سواربوو ١٠ دینارمدا بە کابرای شۆفێر، بەڵام وەری نەگرت. دواتر زانیمان عەبدولحسێن لە میراوای لای پاوە گیراوەو براوە بۆ زیندانی کرماشان.

ئەو ماوەیەی لە تاوێرە بووم داوایان لێ کردم چەند شەوێک لەگەڵ نیازیدا بچینە هاوارە کۆن، بۆ خوێندنەوەو جیاکردنەوەی ئەو بەڵگەنامانەی، کە لەناو دەزگا ئەمنییەکانی هەڵەبجەو سیروان و خورماڵدا کەوتبوونە دەست یەکێتیی. ئێمەش پێکەوە چوار شەو بەردەوام و بەنهێنی زۆربەیانمان خوێندەوەو جیامانکردنەوە، کە نزیکەی ٣٠ کیلۆگرام دەبوون.

ئەوەی جێگەی سەرنج بوو لەم بەڵگەنامانەدا، زانیاری دروست سەبارەت بە شوێن و جوڵەو ژمارەی پێشمەرگەو بەرپرسەکان و هاتووچۆیان و کاروچالاکیان هەبوو، هەمیشە زانیارییەکان دوای وادەی خۆیان درابوون بەو دەزگا ئەمنیانە، بەشێکی تریشیان هەلسەنگاندنو لێکۆلینەوە بوو سەبارەت بە عەشیرەتەکانی ناوچەکەو کەسایەتییە دیارەکان. بەشێکیشیان فایلو ڕاپۆرتەکانی کاروچالاکی ئەو کەسانە بوون، کە خۆیان پێشمەرگە بوون، یان خزمەکانیان بەناوی ئەوانەوە زانیاریان دابووە دەزگا ئەمنییەکان.

بە پێویستم نەزانی لەناو ئەم کتێبەدا ناوی ئەو کەسانە ب لاوەبکەمەوە ئەمە نهێنییەکەو تائێستاش لام پارێزراوە، هەر ئەو کاتە سەرجەم بەڵگەنامەکان تەسلیم بەکاک ئاسۆی شێخ نوری بەرپرسی پەیوەندییەکانی یەکێتیی لە شاری پاوە کران، لەوێشەوە بران بۆ شاری سەرقز.

---

ئەوشەوە هێرشەکە نەکرێت، بەڵێ هێرش کرایە سەریان و مامەڕەشەی جەلیلەیی لە ڕەبیەکەدا شەهید کرا، ناوی بەخائین تۆمار کراوە، کە لەڕاستیداو بۆ مێژوو حەمەڕەشید جەلیلەیی ئەمە داستانی شەهید بوونەکەیەتی، نەجاش بووەو نەخائین.

# بارودۆخی هەڵەبجە دوای کیمیاباران

لەوکاتەدا گەیشتینە تاوێرە وتیان وەزعی هاوار کەمیک ئاڵۆزە، بۆیە بڕیار درا من سەرێک لەهاوار بدەم و بگەڕێمەوە، کەچوومە ئەوێ چەند کەسێکی سەربە کۆمەڵەو دیموکرات لەوناوە لەناو خەڵکدا خۆیان پەنا دابوو، پاسداریش ئەهاتن و ئەڕۆیشتن. لەهاوار خانوچکەیەکی چەپەک هەبوو بەناوی خانوەکەی عارفە شەل، عارفە شەل سەربەحزبی دیموکرات و خەڵکی ئاوایی تەشاری لای نەوسوود بوو. لە هاوار لەسەر کانییە درێژبووم کەسێکی کەمئەندامیان، هێنا بۆلام لاقێکی نەبوو ووتی: من پێشمەرگەی دیموکراتم جێماوم، چی بکەم پێم گووت: بڕۆ بۆناو ئەوخانوە دانیشە تابزانین بارودۆخەکە چۆن دەبێت. هەر دوای ئەو، دووکەسی سەربەکۆمەڵەش هاتن و هەمان قسەیان کرد، وتم: بچنە خانوەکەی عارف تابزانین چی دەکەین، چوونو لەناکاو هاتنەوە گووتیان: دیموکراتی لێیە، ئێمە ناچینە ئەو خانووە، مەبەستیان لە کەمئەندامە کەبوو، کە ناوی عەبدول حسێنە،پێشتر باسم کردووە، منیش لەم بارودۆخەدا، کەهەرگیز کەس ناتوانێ وێنای بکا، زۆر دلگرانبووم لەو دوو پێشمەرگەی کۆمەلە، لەسەرئەم هەلوێستەیان لەم کاتەدا، کەزانیان قسەکەیانم پێناخۆشەو خۆشیان هەستیان کرد هەڵەبوون، وون بوون و دیارنەمان، ئەو دوو کەسەش بەختیار ئەمیرخان، کەبەلهۆنی ناسراوە لەگەڵ تەهای کەیخەسرەوی بوون ئێستا هەردووکیان لەووڵاتی سوئێد ئەژین. دەرکەوت خۆیان خستوەتە بەر ئەو مەترسیەو لەگەڵ ئەو هێزەدا، کەقادر خەبات بەرپرسی بوو، دەرچوون و گەیشتونەتەوە ناوچەی قەندیل.

بەڵێ پاش یەک هەفتە، بارودۆخەکە هێوربوویەوەو هێزی پێشەوەی ئێران و سوپای پاسداران لەسەر لوتکەی شاخی نوەر نزیک لێواری ڕووباری سیروان بۆ پشتی نێوان هەردوو ئاوایی میری سوورو عامورە لە چیای سورێن بە درێژایی دەیان کیلۆمەتر جێگربوون، هێزەکەی حزبی دیموکرات ئەوانەی لە دەرەتفێ و سنوری نەوسوود تا هاوار جێگیربوون پێکهاتبوون لە: هێزەکانی شاهۆ وبێستوون و زاگرۆس، ڕۆژی ١٣٦٦/١٢/٢٢ واتە

١٩٨٨/٣/١٣ تووشی شەڕ بوون لە نزاری قەڵاگاو ئاوەزنێ لە ئەنجامدا سێ پێشمەرگەیان شەھید بوو، ئەوانیش عزەتی ئەحمەدی، سەعدی شەبرەندو مەحمود گەلێنی بوون، ھێزی شاھۆو زاگرۆس ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٥ ناوچەکەیان چۆڵکردو ھاتنە نزیک عەنەب و دەرەشیش، بەشێکی تری ھێزەکانی دیموکرات لەوانە بەیانیش لە ھانەگەرمەڵە بوون ئاگاداریان کردبوون گەیشتنەوە لایان و ھەموو یەکیان گرتەوە ئەوکەسەی فەرماندەی لای ھانەگەرمڵە بوو لەگەڵ ھێزی بەیاندا ناوی جەعفەر بوو، لەگەڵ جەماعەتی کۆمەڵەش قسە دەکات پێیان دەڵێت:" ھێزی شاھۆو زاگرۆس لە دەرەشیش و سەرکەنی تاوێرەن ھێزی بەیانیش دەبەین بۆ ئەوێ ئێوەش وەرن باپێکەوە بین بەڵام بەقسەیان ناکەن، کاوەی بارامی دەڵێت:" ئەو کەسەی ناردمان بەدوای ھێزی بەیاندا پێمان گووت داوا لە کۆمەڵەو ڕزگاریش بکات بێن پێکەوە دەردەچین، بەڵام وەڵامیان نەدابوونەوە".

بەقسەی کاوەی بارامی حزبی دیموکرات ڕۆژی ١٣٦٦/١٢/٢٨ ھەتاوی ھەرسێ ھێزەکەیان لەگەڵ ئەو خەڵکانەی لەگەڵیان بوون نزیکەی ٨٥٠ کەس بوون، ئەکەونە ڕێ لە سەرکەنی تاوێرەوە بە دەشتی سەباندا بۆ لای خورماڵ و بۆ پشتی ئاوایی شیرەمەڕو لە نێوان عامورەو شاخی سورێنەوە تێپەڕ دەبنو ڕزگار ئەبن بەبێ زیان. نزیکەی ١٠ کەسی تریان چەند ڕۆژ دوای ئەم ھێزە، کە لە ناوچەکە جێمابوون ئەوانیش لە ھەمان ڕێگاوە ڕزگاربوون.

دەربازکردنی ئەم ھێزە بە ھاوکاری ھێزەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی و حزبی سۆشیالیست دیموکرات بوو، کە ھەڤاڵان محەمەد حەمەئەمینی تەپی سەفایی و ھەڤاڵ عومەر کولکنی، کە ھەردووکیان دواتر شەھیدبوون لەگەڵ چەند پێشمەرگەی سۆشیالیست، کە حاجی عەبدوڵلا سیامێوەو چەند کەسی تر بوون ئەو ھێزەیان لە بەرواری ١٣٦٦/١٢/٢٨ھەتاوی - ١٩٨٨/٣/١٩ز ڕەوانەکردو دەربازبوون. جێی خۆیەتی کە بڵێم کاک فەلاحی حەمەبۆر ناوی منی لە کتێبی ڕووماڵخەزای ھەڵەبجەدا ھێناوە، بەڵام من لەگەڵیان نەبووم. لە دوای کیمیابارانی ھەڵەبجەوە ھەتا ئێستا سەدان نوسین و لێکۆڵینەوە، کتێب، گۆڤار، نامیلکە، بابەتو کۆڕو کۆبوونەوەو مێزگرد لەسەر کارەساتە نوسراونو ب لاوەکراونەتەوە، لەم دوایەشدا چەندین نامەی ماستەرو دکتۆرا نووسراون،

کەمیان لەم کەیسەدا ئاماژەیان بۆ کۆمەڵەو دیموکرات کردووە یان هەر نەیان کردووە، بۆیە ئەوە کەموکورتی ئەوکەیسەیە.

هەرچی سەبارەت بە هێزەکەی کۆمەڵەی ئێرانە، کە گوردانی شوان بوون، لەو شەڕو دەرگیرییەی کەنار دەریاچەی دەربەندیخاندا لە نزیک ئاوایی دوانزە ئیمام و کانی شێخو ئیمامی زامن دا هەموویان تیاچوون، کە ژمارەیان نزیکەی ٧٩ کەس بووە.

بەهادینی حاجی بەکر کە خەڵکی هەڵەبجەیەو ئەو کات پێشمەرگەی کۆمەلە بووە ئێستا لە ئەوروپایە، بەم شێوە باس لە لەناوچوونی هێزەکەی کۆمەلە دەکات: لە پایزی١٩٨٧ کۆمەلەی ئێران بەشێک لە هێزی سەربازی خۆی لە هەورامان لە سنوری شارۆچکەی بیارە جێگیرکرد، ئەودەم بیارە لەژێر دەستی سوپای عێراق دابوو، ئەم هێزە ناوە ناوە ئالوگۆڕی پێ دەکرا. سەرەتا گوردانی ئارێز، دواتر شاهۆو پەلێکی گوردانی سەردەشت دوای ئەوانیش لە بەرهاری ١٩٨٨دا گوردانی شوانی لێ جێگیر کرا، ناوبراو درێژە بەقسەکانی دەداتو دەڵێ لە رۆژی ١٩٨٨/٣/١٣دا، کە ئێران و بەرەی کوردستانی هێرشیان کردە سەر ناوچەکەو بەرزاییەکانی دەوروبەری هەڵەبجە، کۆمەلە ئاگاداری رێبەرایەتی کرد، کە ئەوکات شوکروڵای خێرئابادی فەرماندەی گوردانەکە بوو. دوای ئەوەی لە ماوەیەکی زۆر کورتدا سوپای عێراق شکاو ناوچەکە گیرا، ئەم گوردانە لە بیارەوە بۆ دەوروبەری شارۆچکەی سیروان پاشەکشەی کرد. کۆمەلە، محەمەدی سەیاریان بەقەیاغەوە بە هانای ئەم هێزەوە نارد بۆ سەر دەریاچەی دەربەندیخان لە نزیک ئاوایی بێسەلمێن، بڕیار بووە من واتە بەهادین هەڵەبجەیی بە چاوساغی لەگەڵیان بم، بەڵام من لە رانییە بووم فریانەکەوتم بۆیە عەدنان هەورامی لەگەڵ ئەو دەستە دەچنە کەناری دەریاچەکە بەدەم ئەو هێزەوە. واباس دەکرێت کەدەچنە ناوئاوەکە لە قەیاقەکەیان دەدرێت و هەموو دەکوژرێن، دواتردەردەکەوێت بەرپرسی ئەم دەستە محەمەدی سەیار لای ئێرانییەکان دیلە،پاشان ئازاد ئەکرێ و ئێستا لەئەوروپایە، ئەمە ئەگەر وابێت دیارە سەیار پەیوەندی هەبووە بەئێرانییەکانەوە.

سەرەنجام لە گوردانی شوان ٥٦ کەس شەهیدو ١٢ کەسیشیان دیل ئەکرێن، دووکەسیشیان بەناوەکانی: نەسرین ڕەمەزان عەلی و جەلالی بەرخودار ڕزگاریان دەبێت.

دیارە بەهادین زانیارییەکانی لەسەر ژمارەی قوربانیانو دیلو ڕزگابووەکان ناتەواوە، چونکە کۆمەلە ٧٠ کەسیان دەبنە قوربانی، ٨ دیلو ٢ کەسیشیان ڕزگار دەبن، حەمەی سەیاریش ڕاستە بەشێوەکی تەمومژاوی گیراوە دواتر ئازاد کراوە.

دواتر ئەو ڕێکەوتن و بڕیارانەی پێشترو بەر لە گرتنی هەڵەبجە لە نێوان چەند کەسێکی سەر بە قەرارگای ڕەمەزان لەگەڵ لایەنەکاندا کرابوون، هیچی جێ بەجێ نەبوو لەوانە تەسلیم کردنی هەڵەبجە بەئۆپۆزسیۆنی عێراقی و هێنانەوەی ئەو هێزانەی یەکێتی و لایەنەکانی بەرەی کوردستانی، کەلە ناوچەکانی تری کوردستانەوە بەهۆی شالاوەکانی ئەنفالەوە چووبوونە نێو خاکی ئێرانەوە یان ئازادکردنی ئەوکەسانەی، کەچوونەتە ناو ئێران لە ڕێگەی یەکێتیی نیشتیمانییەوە.

خەڵکی هەڵەبجەو ناوچەکە بەو ژەهربارانەی، کە عێراق باراندی بەسەریاندا بە هەزاران کەسیان گیانیان لەدەست داو سەدان کەسیش بریندار بوون، بریندارەکان هەندێکیان بە هەلیکۆپتەرەکانی ئێران لەمەیدانی شەڕەکەوە بۆناو ئێران گوازرانەوە، هەندێکیان لە گەڵ خەڵکەکەی تر بەپیادە لە ڕێگاکانی: ئەورۆلی بۆ دزۆلە. سازان بۆ مەرەخێڵ. هاوار بۆ شێخان. تەوێلە بۆ نەسوود، ئەحمەدئاوا بۆ دزلی ڕۆیشتن و ناوچەکەیان چۆڵ کرد، تاکو تەرا خەڵک لەشاردا مابوونەوە سوپا خۆی ئەوانیشی ڕەوانەی ئێران کرد بەڵام لە ئاوایییەکانی بناردا لەگەڵ پێشمەرگە هەندیک خێزان مابوونەوە.

هەندێک لە بریندارەکان نێردران بۆ وڵاتانی خۆرئاوا بەمەبەستی چارەسەرکردن. بەشێکی زۆر کەم خەڵکی هەڵەبجە لە ڕێگای پردی زەڵمەوە بۆ سەیدسادق و سلێمانی دەرچوون، ئەویش هەر لە ڕۆژی یەکەمی دەستپێکردنی شەڕەکەوە بوو.

ئەوترێت کە گوایا ڕۆژی یەکەم خەڵک ویستوویەتی دەرچێت بۆ ئێران، بەڵام پێشمەرگە ڕێگەیان نەداوە.

من ئاگادارنیم پێشمەرگە ڕێگەیان لەدەرچوونی خەڵک گرتبێت، ئێوارەی ١٥لەسەر١٦ی /١٩٨٨/٣ ئەکرێت هێزەکانی ئێران یەکەم ڕۆژ ڕێگای سەرسنوور بۆ ناو خاکی ئێرانیان گرتبێت نەک بەگشتی، ئەگەر واش بووبێ بۆئەوەبووە ڕێگری بکرێت لە ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی لەگەڵ خەڵکەکەدا نەچنە ناوخاکی ئێران، خۆئەگەر ئەمەنییەتی ئێرانییەکان بووبێ دواتر ئەگەر کیمیابارانەکە نەبوایە هەر ڕێگاکانیان نەدەکردەوە.

کاک شەوکەت سەبارەت بەڕێگرتن لەدەرچوونی خەڵک لەکتێبیکارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجەدا دەڵێت: "لەکاتژمێر ١:٣٠ی شەوی ١٥ و١٦/ ٣ هەوالمان بۆهات لەپشتی سەربازگەی دەڵەمەڕی پشتی هەڵەبجە، کە هێزێکی سوپای ٩ی بەدری سەر بەئەنجوومەنی بالای شۆڕشی ئیسلامی عێراق لێ بوو، لەگەڵ هێزەکانی سوپای پاسدارانی ئێران لەم شەڕەدا بەشداربوون ڕێگایان لەخەڵک گرتووە، کەبەرەو ڕێشاوو بۆین بەڕێوەبوون ئەوەش لەبەر نەشارەزایی یان ئەوان لەسەر بارودۆخەکەیان نەدەزانی شار بەتەواوی گیراوە....تاد"، هەروەها درێژەی دەداتێ و دەڵێت: "دواتر ئاگادارمان کردنو خۆمان چووینە لایان"، بەلام لە کۆتایی نوسینەکەیدا دەڵێت: "ئەم هەواڵە ب لاوەببوەوە بەشارداو خەڵک دل ساردبوونەوە لەوەی لەشار دەرچن".

دوای چۆڵبوونی ناوچەکە لە خەڵکو ئاسایی بوونەوەی بارودۆخەکە وردە وردە ئەو پێشمەرگەو بەرپرسانەی ناوچەکەیان بەجێهێشتبوو گەڕانەوە. چەند جارێکیش پێشمەرگەو سوپا لەناوشاردا بەیەکدا هەلپژان و تەقەو لێدانیشی لێ کەوتەوە، لەسەر تەقەو لێدانی سوپای پاسداران و پێشمەرگە، کەیکاوس حەمەڕەشید، کە یەکێک بوو لەفەرماندەی کەرتەکانی تیپی ١١ی هەورامان ماوەیەک قاچاخ بوو تاکێشەکە چارەسەر کرا. چەندین جار پێشمەرگەیان چەک دەکردو زیندان دەکرد تاوای لێهات پێشمەرگە بنکەو بارەگایان بردە باوەکۆچەک و عەبابەیلێ و هاوار، بەرلەوەی پێشمەرگە لەناو شار بکشێنەوە ئێرانییەکان داوایان کرد دەستەیەک پێشمەرگە ببنە پاسەوانی بانقی هەڵەبجە بۆیە لە تیپی ٣٧ مەجیدی حاجی عەلی و هێزێک دیاری کران بۆ ئەو مەبەستە. شەوێک عێراق زۆر تۆپبارانی ناوشاری دەکرد، من لەعەبابەیلێ بووم پێشمەرگەکان هاتنەوەو وتیان ناتوانین

لەناوشاردابمێنینەوە، چەند ڕۆژ پێش ئەمە یەکێتیی لەڕێگەی لیژنەیەکەوە ویستی ئەوبانقە بکاتەوە، بەڵام نەیان توانی بیکەنەوە، لیژنەکەش ئەوانەی لە بیرم مابن مامۆستا ساڵح ماوەتی و حامدی حاجی خالید و مەجیدی حاجی عەلی لەتیپی ٣٧ی شارباژێر بوون.

هەرلەو هەفتەیەدا بوو، ڕۆژێک ئێمە لە خانووەکانی شێخ کەمالی عەبابەیلێ دابووین ئۆتۆمبیلێکی پیکاب لاندگلۆزەر هات، کەهی پاسدارەکانی قەرارگای ڕەمەزان بوو، وتیان ئەمشەو بانقەکەیان بڕیوە.

کاک شەوکەت و چەند کەس لەگەڵیان ڕۆیشتن و دواتر هاتنەوە، ئێمە پرسیمان چیلێهاتووە؟ کاک شەوکەت وتی: بانقەکە تەقیوەتەوە، بەڵام دیارە پێشتر بەکلیل کراوەتەوە ئەوپارەو زێڕەی تیایدا بووە براوە، دواتر تەقێندراوەتەوە، چونکە تەنیا پارەی وردەی ئاسن ب لاوەبۆتەوەو هیچ ئاسەوارێکی زێڕو پارەی کاغەزیش دیار نییە.

بەبۆچوونی من بەڕێوەبەری بانقی هەڵەبجە، کە ئێستا ماوەو لەسلێمانییە بڕێک لەونهێنیانە ئەزانێ، چونکە تاماوەیەک لە ناوچەکە مابووەوە، ئینجا کلیلی قاسەکەش لای چەند کەس دەبێت، ئەوئەزانێ ئەوکلیلانە لای کێ بوون بەر لەگرتنی هەڵەبجە یاخود کلیلی تەسلیمی کێ کردووەتەوە.

بەرپرسی بانقەکە، کە ناوی قادری سۆفی سەعیدە، وتویەتی: ٥پێنج کاتژمێر بەر لەگرتنی هەڵەبجە بەرپرسی ئیستغبارات کلیلەکانی لێوەرگرتووە، ئەگەر وابێت گومانی ئەوەهەیە ئەوان واتە عێراق چی تیابووبێت بردبێتیان و قفلیان کردبێتەوە.

دوای چەند هەفتە ئێران لە ئاوایی خەرپانی ناوچەی هەورامان بارەگای پەیوەندییەکانی خۆی کردەوەو داواشی لەلایەنە سیاسیەکانی کوردستان کرد نوێنەر دیاری بکەن بۆ هەماهەنگی مەیدانی، مۆڵەتیدا بە خەڵکەکەی هەڵەبجەش لە ئۆردەگاکانەوە بەنۆبەت بێنەوە بۆ هەڵەبجەو ئۆتۆمبیلی بارهەڵگریشی دەدانێ، تا کەلوپەلەکانیان ببەنە ئێران.

لەم کاتانەدا یەکێتیی هەڤاڵ جەبار فەرمانی ناردە ناوچەکە لەگەڵ لیژنەیەک بۆدوو ئەرک، یەکەم سەرپەرشتی هێزەکانی یەکێتیی لە ناوچەکەو دووەم بۆ لێکۆلینەوە لەوکەسانەی، کەدەوترا دەستیان بۆماڵی خەڵک

درێژکردووە. لە ئاوایی جەلیلە کاک جەبار چەند کەسێکی بانگ کردو چەند ڕۆژیش گلیدانەوە و دوای لێکۆڵینەوە سزادران، پارتیش بەهەمان شێوە لیژنەیەکی لێپرسینەوە پێکهێناو لێکۆلینەوەیان لەگەڵ چەند کەس کرد کەپێم باشنییە ناوەکانیان بهێنم، هەندێکیان سزا دران، لە دوای دانانی بارەگای پەیوەندییەکانی ئێران لەخەرپانی داوا لەلایەنەکان کرا نوێنەر بناسێن بۆئەوەی ڕۆژانە لەو شوێنەدا کۆبنەوە بۆ ئیشوکار یان بۆ چارەسەر کردنی ئەوکێشانەی دروست ئەبن، من وەک نوێنەری یەکێتیی دەست بەکاربووم.

ئەم ئەرکە زۆر قورس بوو، پێشمەرگەو هەندێ لە فەرماندەکانیان وا دەجولانەوە، کە ئەوە بەشەڕو بە پشتیوانی بەرەی کوردستانی ناوچەکە ڕزگارکراوە، ئێرانییەکانیش حسابی ئەوەیان دەکرد ئەوە سنوورێکی جەنگییەو مەیدانی شەڕی دوو دەولەتەو نابێ هێزەکانی پێشمەرگە یان کورد هاتووچۆ و بوونیان لەو شوێنانەدا هەبێت، چونکە ئەوان لەباری ئەمن و ئاسایشی مەیدانی جەنگەوە لێمان دڵنیانین. لەگەڵ مامۆستا ساڵح ماوەتیشدا ڕۆژانەو زۆرجار پێکەوە دەبووین و ئەویش بەشداری کۆبوونەوەکانی دەکرد.

یەکێتیی ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستانی هێناو لەسەر چیای شنروێ لەبەفری میری دایمەزراندەوە، بارەگای کاک جەبار فەرمان هاتە ئاوایی جەلیلەو دواتر چووە ئاوایی دەرەتفێ لەسەر سنوور، گوندەکانی: سازان، ڕێشاو، بۆین، هاوارە کۆن، دەرەتفێ، گریانەو هاوار ئەو شوێنانەبوو، کەبارەگای پێشمەرگەو خێزانەکانیان لێی جێگربوونەوە. ڕێگای هاتووچۆ لەسازانەوە بۆ مەڕەخێڵ و لەگریانەوە بۆ شێخان ڕێگای هاتووچۆی هاتنو ڕۆیشتنی پێشمەرگەو ئەو خەڵکە بوو، کەلەو گوندانەدابوون ئەویش بەوەرەقەو بەڵگەی هاتووچۆ تردود.

هەندێک فەوجی گوردان یان گرووی وێژە تایبەت، کە کورد بوون و پاسداری سوپای ئێران بوون، کەوتنە هاتووچۆو چاودێری خەڵکەکە، ئەگەڕان بەدوای ئەو کوردانەی ئێراندا، کەلە ناوچەکەدا بوون ئەوانیش وردە وردە ئەگەڕانەوەو خۆیان تەسلیم دەکردەوە. هەر لەم سەروبەندەشدا چەند کێشەیەک سەریان هەلدا، لەوانە:

یەکەم: مەحمود بەگ مەخولە دشەیی مەسئولی پاسدار کوردی ڕۆژ هەلات،هات بۆ ئاوایی هاوارو چوبوە مالّی پیاوێکی کاکەیی، تاپڕێکی بردبوو، مەهدی حەمەسەعید لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگەدا ڕێیان پێ گرتبو تاپڕەکەیان لێوەرگرتەبوەوەو خۆشیان چەک کرد بوو، مەحمود بەگیش خۆی بەشت ئەزانی وئەم چەککردنەی بەقورس ئەزانی وئەیووت من شکاوم، خۆی بەخاوەن حەق دەزانی و هەر لەسەر کێشەکە دەڕۆیشت.

دووەم: ئێرانییەکان بە دوای کەسێکدا دەگەڕان بەناوی جەوهەر تینی، ئەویش لای کەبکاوس کۆکۆیی ببووە پێشمەرگە، ئێران داوایان دەکرد لە ئێمە.

سێیەم: مامەیارەی ئێناخی، کەبەرپرسی کۆمەلێک چەکداری عەشایری ناوچەکەبوو، پێشتر لەگەڵ موخابەراتی عێراقدا بووبوو، لەساڵی ١٩٨٦دا خۆی و نزیکەی ٢٠خێزان و ٣٠ چەکدار هاتبووە ناو ڕیزەکانی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان لە تیپی ١١ هەورامان ببووبە پێشمەرگە.

ئێمە پێشتر لەگەڵ کاک شەوکەتی حاجی موشیر بەئامادەبوونی نیازی هەورامی بەرپرسی پەیوەندییەکانی ئێران لە کۆبوونەوەیەکدا لە مالّی نیازی لەگەڵ محەمەد مقدم تارانی و ڕەحیمی دا بەر لە هێرشکردنە سەر هەڵەبجە، قسەمان کردبوو، کە مامەیارە لای ئێمەیە ئەگەر ئەوان ڕەزامەندنین، ئەوە ئێمە لای خۆمان جوابی دەکەین، چونکە کوشتنی دکتۆرو کارمەندانی نەخۆشخانەی پاوەی خرابووە ئەستۆ لە شەڕی ١٩٧٩/٨/١٩دا، ئەوان وەلامیان بۆ ئێمە ئەوەبوو: جاشێک کەمترو مبارێزێک زیاتر.

چوارەم: کێشەی گرتنی نزیکەی ١٠ ژنی حزبی دیموکرات بوو، کەنەیانتوانی بوو لەگەڵ ٨٥٠ کەسەدا بڕۆن خۆشیان تەسلیمی ئێران نەکردبوو بۆماوەی نزیکەی یەک مانگ لای ئێمە پەنادرابوون، بەڵام دواتر بەهۆی پێشمەرگەیەکی دیموکرات بەناوی ئەنوەر دەرەبەیانی ئەویش جێ مابوو، لەناوچەکەدا بەبێ سیمێکی دەستی و چەکو تاقمەوە هەر هاتووچۆی بوو چەند جار ئەمان نارد بۆ بنکەی پێشمەرگە، هەر دەهاتەوە بۆ ئەوشوێنانەی ژنەکانی لێ بوو، جارجاریش لەگەڵ جەماعەت لەزەڕایەن پەیوەندی ئەگرت بەبێ سیمەکەی، ژنەکانیشی ئاشکراکردو و ئێمەش ناچار خۆمان بەقەرارگای ڕەمەزانمان گووت: چەند ژنو منداڵێک جێماون لای ئێمەن ئەمانەمان بۆ ڕەوانە بکەن

بۆسەردەشتو قاسمەڕەش لەبەرامبەردا حزبی دیموکرتیش بڕیارە ژن و مندالی هەڤالانی ئێمە، کە لەعێراقدا خۆیان شاردوەتەوە بهێنە سەر سنوور ڕەوانەی ئێرانیان بکەن، بەلێنیاندا ئەمە بکەن، ووتیشیان زانیومانە ئەو ژنانە لاتان ولەژێر چاودێریشدا بوون.

ئەو پێشمەرگەی، کە بەهۆی هاتووچۆکردنییەوە ئەمانیشی ئاشکرا کرد خۆی داوای کردبوو دەچێتە ئەحمەدئاوا بۆ لای کاکە حەمەی حاجی مەحمود، ڕۆیشتو دواتر بێسەرو شوێن بوو. ژنەکانیش هەرمانەوەو قەرارگاش هەر ئیمڕۆو بەیانی پێ دەکردین تاماوەیەکی زۆر، دواتر ئاگاداریان کردین لیستی ناوەکانیان بدەینێ تا بەناوی خێزانی هەلەبجەو پێشمەرگەی یەکێتیەوە بیان نێرنەوە بۆناوچەی سەردەشت.

ئێمەش لیستی ناوەکانمان دانێ بەلگەی هاتووچۆیان بۆکردن دوو پێشمەرگەی تیپی ١١ی هەورامانیشمان ئامادەکرد لەگەلیان بڕۆن تا سەردەشت، پاش نیوەڕۆیەک سەیارەیەکی ئوتوبوس هات لە ئاوایی بیاوێلە سەری خستنو و ڕۆیشتن.

ئێوارەی هەمان ڕۆژ یەکێک لە پێشمەرگەکان، کە عەبدوللای حاجی عومەر عەنەبی بوو هاتەوە بۆ هەلەبجە، ووتی: ڕۆیشتین لە نزیک دووئاو دووکەس سەرکەوتنو سواربوون لە پاسەکەداو لەبەر دەرگای فەرمانداری پاوە ڕایان گرتینو ئەوانیان دابەزاندو بەئێمەیان گووت: بڕۆن ئەمانە میوانی ئێمەن خۆمان دەیانبەینە شوێنی مەبەست'، دواتر برانە شاری ورمێ و ٥ مانگ گل درانەوە لەزینداندا پاشان ئازاد کران، پێم وابێت کەسێک بەناوی جەمیلی بابائی هاوکاری بەردانەکەیان بوو. ئەمەش لیستی ناوی ئەوژنانەیە.
١ـ شیرین جەلالی. ٢ـ قەدری ڕەئووفی. ٣ـ گە لاوەێژ جەلالی. ٤ـ نەسرین بهرامی. ٥ـ عاسماخان خێزانی بزرومی میتران. ٦ـ ئاوین کوهگەرد. ٧ـ ئێران خورشیدی. ٨ـ مەحسومەی شاهروا. ٩ـ شعلەی قادری.

یەکەم ڕۆژی دەستبەکاربوونمان و کۆبوونەوەی لایەنە سیاسیەکان لەخەرپانی، دوای هاتنە دەرەوە لەکۆبوونەوەکەدا، بینیم کەسێک لەبن دیوارێکدا دانیشتوەو چاوەڕێ دەکات، ڕۆیشتمە لای و وتم تۆ ئەو کەسە نیت، کە ماوەیەک لەمەوپێش لەپردی زەلم ئێمەت ڕزگارکردو بەسەیارەکەت هاتین بۆ هەلەبجە، ووتی: بەلێ لەتیفم لەتیفی ئەحمەدی حەمەئەمین، وتم

فەرموو ووتی: ئەگەر ئەتوانی بمنێرەوە بۆ قاسمەڕەش، بچمەوە بۆ عێراق منیش هەرلەوێ گەڕامەوە بۆ لای ئێرانییەکان و بەلگەی هاتووچۆم بۆ وەرگرتو کەوتە ڕێ بەرەو سەردەشت.

مامەیارەئەحمەدی ئێناخی کەوتمان بووبەکێشە بۆمان، پیاوێکی سادەوساکار بوو هەرچۆن بتویستایە دەتتوانی بۆهەر کارێک ڕازی بکەیت، سەردەمێک قاچاخ بووە لەڕژێمی شایی ئێران، پەیوەندی بەتەیموریەکانەوە کردووە. دواتر بوو بووە پێشمەرگە لەشۆڕشی ئەیلول لە دوای سالی ١٩٧٠ تەحویلی ئێران کرابووەوە ماوەیەک زیندان بوو بوو. لەکاتی سەرهەلدانی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا چەکی کلاشینکۆفی شاراوەی دەرئەهێنێ و بەدزی شاو دارو دەستەکەی بەکاری ئەهێنێ، دواتر ئەچێتە ناو حیزبی دیموکرات پاشان ئەوانیش بەجێ ئەهێلێ و دەبێتە چەکداری عێراق، سالی١٩٨٦ یش هاتەدەرەوە، مامەیارە تامانگی ١٩٨٨/٦ لەگەل پێشمەرگەمایەوە لەبارەگای سەروەزنی سازان مالو مندالیشی گەڕابوونەوە ئێران. ڕۆژێک هێزێکی سوپا ئەچنە سەری و بۆیان ناگیرێ و لەدەستیان قوتار دەبێت دوای ئەوە دێنە لای فەرماندەی هێزەکانی یەکێتی داوای ئەوەدەکەن مامەیارەیان تەسلیم بکات.

کاک شەوکەتی حاجی موشیر لە ئاوایی عەبابەیلێ بارەگای هەبوو ناردی بەدوامدا بۆ کارێکی پێویست سەردانی بکەم، ڕۆیشتم بینیم ئێرانییەکان لەوێن، دوای حاکوچۆنی ووتی: ئەم برادەرانە هاتوون داوای مامەیارە ئەحمەد دەکەن تەسلیمیان بکەین، ئەوکەسەی کە بەرپرس بوو شۆرەتی ئێرانی بوو، دەرکەوت خۆیان بەرلەوەی بێنەلای کاک شەوکەت، بەهێزەوە چوونەتە سەر مامەیارە بۆیان نەگیراوە. منیش پێم ووتن: ئێوە خۆتان بۆتان نەگیراوە ئێستا چۆن دێتە ئێرە، ئێوە بڕۆن بائێمە بیدۆزینەوە دواتر وەلامتان ئەدەینەوە. ئەوان ئەیان گووت: بێتە پاوەو دواتر بگەڕێتەوە، ئێمە ئەمانەوێت ئەو کێشەی هەیەتی حەلی بکەین، چونکە شاکی داواچی هەیەو ئێمەش خەلک فشاری بۆ هێناوین.

ئەوان ڕۆیشتن ئێمە کاک ئەکبەر ئێناخی، کەیەکێک لەفەرماندەکانی یەکێتی و خۆیشی لە خزمانی ئێناخیە ڕامان سپارد مامەیارە بەنهێنی ڕەوانە بکاو بچێتە سەرئاوی دەریاچەی دەرەبەندیخان و لە نزیک ئاوایی خولامی

بەڕێتەوە بۆ جەرداسنە چوپ کەرەستەی مەلەوانی بۆتەرخان ئەکەین خۆی تەسلیمی عێراق بکاتەوە.

کاک ئەکبەر چووبوو دۆزیبویەوەو ئەمەی پێ ووتبوو، بەڵام مامەیارە ڕازی نەبوو، وتبووی" دێمو ئەچم بۆ ئێران ئێوە ئاگاداری جەنابی مام جەلال بکەن ئەوان ناتوانن بمگرن". بۆیە دواتر لەسەر سیقەو بەڵێن کاک شەوکەت بردی و چوو بۆ پاوە پاوە شارۆچکەیەکی ڕۆژهەلاتە سەر بەپارێزگای کرماشانە لەوێ گلیاندایەوەو کاک شەوکەتیان ئێزن دابوو، دواتر مامەیارە لەسێدارەدرا.

دوای گرتنی هەڵەبجەو کیمیاباران کردنەکەی، یەکێتیی نیشتیمانی نەک هەر هێزی ناوچەکانی تری نەهێنایەوە بۆ هەڵەبجە ئەو هێزانەش، کەهی سنوورەکە نەبوون بۆ بەشداری شەڕەکە هاتبوون گەڕانەوە. یەکەم هێز، کەئامادەبوو بۆ گەڕانەوە هێزەکەی قەندیل بوو لەگەڵ کاک قادر خەبات دا.

لایەنە سیاسیەکانی بەرەی کوردستانی هیچ جۆرە لێپرسینەوەیەکیان لەگەڵ ئەو کەسانەدا نەکرد، کەکورد بوون و بەکرێ گیراوی ڕژێم بوون، کەوتبوونە پشتی بەرەی شەڕەکەوە، بگرە چەندین کەسشیان لەوانە پەناداو لەدەست ئێران ڕزگاریان کردن، لەمەیدانەکەدا چەند کەسێکیش بەبێ مەحکەمە کوژران، لەوانە دڵە گولپی، فایەق هانە گەرمڵەی، ئەنوەر دەرەشیشی.......تاد.

ئێران لەو جۆرە کەسانە سەدان کەسی گرتو لەزیندانی خزاندن لەناو ئێران، دواتر بەهۆی لایەنەکان و پارتیبازیەوە زۆریان ئازادکران و چەندین کەسیشیان لەسێدارە دران. ئەوکوردانەی ئێران، کەلە ناوچەکەدا بوون وەک پەنابەر یان ئەندامی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی گەڕابوونەوە ئێران ئەوانیش گیران، چەندین کەسیان ئازاد کرا لەبەرئەوە ژێربەژێر پەیوەندیان بە ئێرانەوە هەبوبوو، زۆریشیان حوکم دران و چەندین کەسیشیان لەسێدارە درا، دەیان کەسیش لە بینای خوێندنگاکانی شاری پاوەدا دەست بەسەر بوون بەهۆی بۆمبارانی فڕۆکەکانی عێراقەوە لە دوای هێرشەکەی هەڵەبجە بوونە قوربانی و گیانیان لەدەست دا.

گرتنی هەڵەبجەو کارەساتی کیمیاباران ئەنجامەکەی کوژرانی دەیان کەس بەرلەگرتنی شارەکەو لەکاتو ساتی شەڕەکەداو دواتر کوژرانی هەزاران

کەسو برینداربوونی سەدان کەسی ترو بێسەرو شوێنبوونی دەیان کەسو ئاوارەبوونی دەیان هەزارکەسی ترو لەناوچوونی هەموو سەروەت و سامانی خەڵکەکە بوو بەگشتی، پاش چوار مانگ دوای ئەم کارەساتە کەم وێنە لەجەنگی عێراق و ئێراندا هەردوو وڵات ڕێککەوتنو پەیمانی ئاشتیان مۆرکرد. بۆیە هەرتەنیا خەڵکی هەڵەبجە بوو بەقوربانی.

ئەوانەشیان مانەوە تائێستاش لەباروذۆخێکی دەروونی خراپدا ئەژین،بەتایبەت ئەوانەی کەسوکاریان ونبوون نەلەمەیدانی شەڕەکەدا تەرمەکانیان دۆزرانەوە نەلەناو وولاتی ئێراندا ئاسەوارێکیان هەبوو، بۆ وێنە چەند کوڕێکی ماڵی ڕەشە عەزیز، بنەماڵەیەکی دیارو کورد پەروەری شارەکە بوون، پورێکی خۆم بەناوی ئامینە عەزیز لەگەڵ ئاریانی کوڕیدا کەتەمەنی دوانزە ساڵان بوو،........ هەتا دوایی.

هەڵەبجە شارێکی دێرینو جێگەی شارستانییەت و بازرگانی و کشتوکاڵ بووە،ڕژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق لە دوای ۱۹۲۰وە هەریەکەو بە نۆرەی خۆی ڕقو قینی خۆی بەرامبەر بەکورد لەهەڵەبجەدا هەلڕشتووە، کەدواترینیان ڕژێمی بەعسی سەدام بوو، عەرەبە شۆڤێنی و بەعسیەکانیش لەساڵانی ۱۹٦۱- ۱۹۷٤- ۱۹۸۷- ۱۹۸۸دا ڕقو کینەی خۆیان بەرامبەر بە کورد لەهەڵەبجەدا خالی کوردۆتەوە دواترین ڕقی شۆڤێنییەکان بەرامبەر بەکورد کیمیبارانی هەڵەبجەو ئەنفال بوو لە ۱۹۸۸/۳/۱٦ دا.

بەرلەگرتنی هەڵەبجە، لەلایەن ئێرانەوە، عێراق بەشێک لەخانوەکانی شارەکەی لەڕێگەی بەکارهێنانی تیێن تیەوە لەگەڵ خاکدا لە۱۹۸۷/٥/۱٤دا تەخت کرد، دواتر لەکاتی پاشەکشەکەیدا ئێران بەشێکی زۆر لەبینای دەولەتی و پردو بینا خزمەتگوزارییەکانی تەقاندەوە، دوای گەڕانەوەی عێراقیش بۆ ناوچەکە لە هاوینی ۱۹۸۸دا ئەوەشی مابووەوە عێراق دەستی کرد بەتەقاندنەوەو ڕووخانو وێرانکردنی، بەڵام ڕاپەڕینی بەهاری ۱۹۹۱ نەیهێشت بەتەواوەتی هەموو شارە چۆڵەکە بتەقێننەوەو تەخت بکەن. بۆیە بەر لەڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان هەڵەبجەببووە ناوچەیەکی قەدەغەکراوی چۆلکراو لەزیندەوەرو ژینگەیەکی ئالودەکراو بە بە چەندین جۆر لە گازی کیمیاویی.

# قوربانیانی ١٦/٣/١٩٨٨
# لە هەڵەبجە

بێگومان تائەمڕۆش یەکێک لەو کەموکورتیانەی لەم کەیسەدا هەیە نەبوونی ئامارێکی ڕاستو ڕوونی شەهیدانی کیمیابارانەکەیە، نەبوونی ئاماری ڕاستو دروست کێشەو گرفتی لاوەکیشی هەیە، هەم بۆکەیسەکەو هەم بۆ دەزگاکانی پەیوەندیدار بەم کەیسە، ئینجا بۆ جێماوانی قوربانییەکانیش.

دیارە ژمارەی ٥٠٠٠ هەزار سەرەتاو لەگەرمەی شەڕەکەدا لەلایەن یەکێک لە فەرماندە سەربازییەکانی یەکێتیی وە بەجیهاز درا بە مەکتەبی سیاسی یەکێتیی، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوکەسانەی لەدەرەوەی ناوچەکە بوون پرسیاریان دەکرد لەبارودۆخی ناوچەکەو ژمارەی کوژراوان هەرکەسو لایەنێک بەئارەزووی خۆی وەڵامی دەدایەوە، ژمارەی جیاوازو زیادکراوو ناڕاست ئەدرا. لەماوەی دوو ڕۆژدا ئەم ژمارەی پێنج هەزارە کەوتە ناو ڕاگەیاندنەکانی ناوچەکەو جیهانەوە.



تائێستا ژمارەی ڕاستو دروستی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە نازانرێ، بەئامارێکی کۆمەڵەی قوربانیان نزیکەی ٣٠٠٠ شەهید هەیە، لەڕابردوودا هیچ کەسو لایەک لەبەر ڕەوشی سیاسی حەزمان نەکردووە بە تەواوەتی ئەم ژمارە بزانرێ، بەڵام دوای ٢٦ ساڵ لە کارەساتەکە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە ئەم ژمارە ساغ بکرێتەوە، دیارە پێشتر بۆ زیاتر تاوانبارکردنی سەدام و ڕژێمەکەی حەزمان دەکرد ژمارەکە زیاترو

گەورەتر بکەین. بەلام سەدام و ڕژێمەکەی و تاوانبارانی کیمیابارانی هەڵەبجە بوون بەبەشێک لەمێژوو، کەم کەسیان ماوە بەسزای خۆی نەگەیشتبێ.

ئەو ئامارەش، کەئێستا هەیەو حکومەتی هەرێمی کوردستان بەرپرسە بەرامبەر بە قەرەبوو خزمەت کردنیان، چەندین کەسی تێدایە بە چەندین ساڵ بەر لەساڵی ١٩٨٨و دوای ئەو ساڵەش بەنەخۆشی و هۆکاری تر گیانیان لەدەستداوەو کراونەتە شەهیدی کیمیابارانی هەڵەبجەو لەناو ئەم لیستەدا دانراون، چەندین کەسیش لە ناوچەکە، کە بریندارى چەکی کیمیای بوون و دواتر گیانیان لەدەستداوە نەخراونەتە ناو ئەم لیستەوە. لەگەڵ ئەمەشدا چەندین هەڤاڵی سەر بەڕێکخستنەکانی ئێمە کەئێشی باشیان کردبوو بۆمان لەناو هێزەکانی عێراق دا بەلام بەداخەوە لەشەڕەکەدا شەهید بوون لەوانە باوکی یەکێک لەفەرماندەکانی پێشمەرگە بەناوی حەمەڕەشید عیسا[1] لەگەڵ گروپێکدا.

---

[1] - کەیکاوس حەمەڕەشید سەرەتا پێشمەرگە بوو لە مەفرەزەی شەهید فاتح ئێناخیدا. ئەو مەفرەزە ساڵی ١٩٨٢ چالاکییەکیان کرد لەسەر ڕێگای سازان-بامۆک لەپشتی هەڵەبجەدا، سێ چەکداری دۆستی خۆمان کە لەناو ئەوهێزانەدا بوون بە دژی ئێران شەڕیان ئەکرد بەناوەکانی پاشا نامدار ئێناخی، عەلی حامید ئێناخی، بورهان مەلاتاهیر کوژران. ئەم ڕووداوە لەبابەتی هێزی پشتیواندا ئاماژەم پێکردووە.

خزمەکانی بورهان چاوەڕێیان نەکرد تا چۆنییەتی ڕوودانی ڕووداوەکە ڕوون بێتەوە، چونەسەر باوکی کەیکاوسوتەقەیان لەماڵەکەی کرد، من ئەو کێشەم بەناردنی نامەیەک بۆ کاکە ڕەزای نامدار چارەسەر کرد. دواتر لەساڵی ١٩٨٧دا دوو ڕۆژ لەدوای چالاکی گرتنی ڕەبیەکانی کۆساوا لەنزیک سازان شەهید قادر کۆکۆیی لەئاوایی بۆین نامەیەک ئەنوسێ بۆ حیزبی دیموکرات و ئەیداتە دەست حەمەڕەشید و ئەڵێت: کەگەڕایتەوە بۆ هەڵەبجە لە ئاوایی ڕێشاو بیدەرە دەست دیموکرات، لەسەر ئەم نامەش ناوبراو کێشەیەکی تری بۆ دروستبوو. من نازانم ناوەڕۆکی نامەکە چی بووە؟ دوای ئەو کێشە حەمەڕەشید باوکی کەیکاوس نامەیەکی بۆمن نووسیبوو لەونامەدا داوای کردبوو، کە لەسەر ئێمە ژیانی نەماوە چی بکەین؟ ئەگەر ئەتوانن بمانژیێنن ١٠تا١٢ ماڵ دێینە دەرەوە، منیش وەلامم داوەتەوە هەرچۆن بووە ئەم ماوە بگوزەرێنن، ئێمە ناتوانین لەشاخ ژیانتان دابین بکەین، بۆیە بڕیارياندا سێ کەسیان لە فەوجی عەلی کۆکۆیی چەکدار بکەن. ئەو سێ کەسەش ئەمانە بوون حەبیب ساڵح عیسا، ئەنوەر سەعید وەلی، زاهیر محەمەد ڕەمەزان. بەر لەهێرشی گرتنی هەڵەبجەش ئاگاداری کەیکاوسمان کرد ئەو مەفرەزەی خزمەکانی ئەوی تیایایە لەسەر گردی گۆن پاسەوانی پردی زەڵم ئەکەن با لە ڕۆژی هێرشەکەدا پردەکە

ئەوەی تائێستا دیارە لە کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجەدا بەناوی سیانی نزیکەی ٣٠٠٠ سێ هەزار هاوڵاتی و پێشمەرگە بوونەتە قوربانی، ئەمە جگەلە قوربانیانی سوپاکانی عێراق و ئێران. یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان ٨ کادرو پێشمەرگەی شەهید بووە، پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق ٤ پێشمەرگەی شەهید بووە، حزبی سۆشیالیست ٦ پێشمەرگەی شەهید بووە، کۆمەڵەی ئێران نزیکەی ٧٦ پێشمەرگەو حزبی دیموکراتی ئێرانیش ٥ پێشمەرگەیان شەهید بووە.

لەسەرچاوەکاندا جیاوازی دیارو بەرچاو هەیە لەسەر ژمارەی قوربانیان و برینداران و دیل و بێ سەروشوێن کراوەکان، بۆنمونە: لەکتێبی اطلس جنگ، فشردە نبردهای زمینی لەلاپەڕە ٩٩دا کوژراو برینداری عێراقی بە ١٨٠٠٠هەژدە هەزار کەسو دیلی بە ٥٤٤٠ پێنج هەزارو چوارسەدو چل کەس دیاریکردووە، هەروەها لەکتێبی جغرافیای –عملیات ماندگار – دفاع مقدسدا لەلاپەڕە ٤٤٠دا ئاوای دیاریکردووەو نوسیوە علاوە براسارت بیش از ٦٠٠٠ شش هزار نفر از نیروهای دشمن...تاد، هەرلە هەمان لاپەڕەشدا نوسیویەتی: دراین تهاجم برق اسا علاوە برهلاکت هزاران نفر از قوای دشمن، ٤٠٠٠ چهار هزار نفر از نیروهای عراق، ازجملە چندە افسر بلند پایە بەاسارت سپاهیان اسلام در امدند.

لە دوای ڕاپەڕینەوە تائێستا کۆمەڵەیەکی مەدەنی N.G.O هەیە لە کەسوکاری ئەو شەهیدانە پێکهاتووە، بەناوی کۆمەڵەی کیمیابارانی هەڵەبجە کە ئەوانە ڕۆڵ و ئەرکی گرنگیان بینیوە لە خزمەتکردنی کەیسی کیمیاباران و کەسوکارو بە جێماوانی ئەم کارەساتەدا، ئەو خزمەت و هاوکاری قەرەبوەی وەک موچەو زەوی و خانوو، بۆ شەهیدانی کیمیاباران کراوە لەهەڵەبجە، لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە بۆشەهیدانی سەنگەر نەکراوە، دیارە زۆری

---

تەسلیم بە پێشمەرگە بکەن، بۆئەم مەبەستە، کەیکاوس ئاگاداری باوکی دەکات و ئەویش خۆی ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٣ ئەچێتە گردی گۆ، لەوکاتەدا تۆپباران ئەبێت بەڕێکەوت گوللە تۆپێک کاک حەمەڕەشید و هەرسێ کەسەکەی تری کردە قوربانی ئەو کێشانەی باسمان کرد.

بەهۆی فشاری ئەو کۆمەڵەوە بووە، هەرچەندە کۆمەڵەکە کەمو کورتیشیان هەیە، کەمو کورتییەکانیش هۆکاری تایبەتی خۆیان هەبوەو هەیە.

بەر لەلێدانی عێراق و ڕووخانی ڕژێمەکەی سەدام لەسەر چەکی کۆکوژو بەکارهێنانی دژی هاولاتیانی خۆی و بەتایبەت گەلی کورد، کە نیازی جینۆسایدکردنی نەتەوەی کوردی هەبوو، لەسەر ئەولاساری و جەنگانەی دژی دراوسێکانی و لەسەر ئەو مەترسیەی لە ناوچەکەو ڕۆژهەڵاتدا هێنابوویە ئاراوە، ئەمریکیەکان و هاوپەیمانانیان هەر لەوە دەچوو قەلەق بن لەلێدانی، ئەوەبوو لێدان و ڕووخانی ماوەیەکی زۆر دواکەوت.

لەساڵی ٢٠٠٣دا مەکتەبی سیاسی یەکێتیی داوایان لەمن کرد لەو کۆمەڵەو لە کەسوکاری شەهیدانی هەڵەبجە گرووپێک بنێرین بۆ لای ئەمریکییەکان تا لەبارەی لێدانی عێراقەوە بۆچوونیان وەرگرن و قسەیان لەگەڵ بکەن، ئێمەش ئەو گرووپەمان ئامادەکردو ناردمانن بەرلە لێدانی عێراق ئەمریکیەکانیان بینی.

لیستی ناوی قوربانیانی پێشمەرگە لەجەنگی گرتنی هەڵەبجەدا.

<u>یەکێتیی نیشتمانی کوردستان</u>

عەلی حەمەئەمین حاجی عەلی

محەمەد ئەمین محمد

مەحمود حەمەئەمین

حەمەجان محمد ئەمین

ئەحمەد فتاح عبدالمحمد ئاوات تریفەیی

د.ئەحمەد ڕەشید کۆکۆیی

یارئەحمەد حەسەن مامەیارەی ئێناخی

محەمەد کریم حەلیلەیی

<u>سۆسیالیست:</u>

تۆفیق پارەزانی

ئەرسەلان ولەسمتی

جەلال مێشەڕۆیی

حاجی عەبدوللای سیامێوە

عوسمان حاجی مەحمود

بەکرحاجی محەمەد دێکۆنی

<u>پارتی:</u>

صالح عریف حەسەن

سالح قادر ساڵحی مامە قالە

ئیسماعیلی مەلا محمد گلێجالی

ئەحمەد ڕەش بەشارەتی

<u>دیموکرات:</u>

عیزەت ئەحمەدی

مەحمود گەلێنی

ئەنوەر دەرەبەیانی

سەعدی شەب ڕەند

<u>کۆمەلە:</u>

مام یوسفی  نەوسوودی

عەلی نازری

محەمەد عەلی زادە

جەمال ئەسکەندەریان

نادر سولەیمانی

جەمال عەلی زادە

ئارەزوو دۆستکانی

فەرهاد وەکیلی

فەرزاد محەمەدی

شەهرولا خیرئابادی

ئەشرەف قەدرجو جەلال ڕەزبەندە

عەبدوللا شەریفی

شاپور محەمەدی شاهۆ

جەمیل ئەحمەدی

بەدیع سمایلی

جەمال ڕازایی محەمەد

باوەرێس

ڕەزا فاتحی
عەبدول حسێن محەمەد
جەمشید خەزبوزی
خالید واحیدی
فەرهاد مەجیدی صەباحەسوور
جەواد باوەڕێز
نامیق کەریمی
حەمەعەلی وەزیری
زەمانەی قادری
عەزیزە عەزومی
تۆفیق قادری‌ماملاتۆفیق
عەلی مورادی
حەیدەر گەوێلی
فەتح الله کەریمی
غولام حەق بەیان
ڕەزوان ئەحمەد زادە
عەلی محەمەدی
هومایۆن نازری
مەنسور پاک سرشت
کەمال ئەلیاسی
لوتفولا شەریعەتی
ماشەللا مهرپناه
کەماڵی سەید مورادی
تاهیر هەورامی
تاهیر زەبیحی
کەیومەرس مجاهر
ئەرسەلان سعادەت مەتند
ڕەزا خالیدیان
ناصر هادی

فەرهاد گەوێلی
ئەمین لوتفی
عەلی حسەسین محەمەدی
ڕەحەمەت کولا قوچی
ئیبراهیم ئەحمەدی
عەلی حەبیبی
ڕەحەمەت تیر ئەندازی
صابر مەلکی
حسێن ئەحمەدی
ڕەحەمەت ئیسماعیلی
مەحمود سەمەدی
نادر سەبا
سەلاح بەشارەتی
سدیق گەوەنتۆ
مەنصور ئاقایی
مەحمود سەجادی
عەدنان هەورامی
سەوسەن فەریقی
سوهرا پزیشک هەمەدانی
قوباد سادقی
حسێن نادری
حەسەن بابا خانی
شاروخ بەنی بە شەر
لوتفولا محەمەدی
زوبەیر ئەحمەدی
<u>دیلەکانی کۆمەلە لەوشەڕەدا ئەمانە بوون:</u>
عەتیە گەزان
قادر زەندی
محەمەد ئەمین موهاجێر

ئەرخەوان

زیبا ڕەشیدی

فەرهاد باوەڕێز

شەهلا کۆلا قوچی

حەمەی سەیار ـ ئازاد کراوەو ئێستا لە ئەوروپا دەژی.

دەربازبووەکان دووکەس بوون بەناوەکانی:

جەلال کاکی.

نەسرین ڕەمەزان عەلی.

## کێ کیمیابارانی هەڵەبجەی کرد ؟

یەکەم ڕۆژی کیمیابارانەکە تەنیا خەڵکی هەڵەبجەو دەوروبەری دەیانزانی ناوچەکە کیمیاباران و کۆمەلکوژ کراوە، گازە بەکارهێنراوەکانیش چەندین جۆر بوون بەپێی سەرچاوە تەندروستی و زانستیەکان لەوانە: سیانید، خەردەل، تابوون، فرمێسک ڕێژ.

لەپاش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦دا تاران زانی گاز بەکارهاتووە، ئەویش بەهۆی ئەو پەیامانەی، کە لەمەیدانەکانی جەنگەوە پێی گەیشت، سەرکردایەتی بەرەی کوردستانیش بەهۆی ئەو پەیامانەی بەبرووسکە لەمەیدانەکەوە پێیان ئەگەیشت ئاگاداربوون، لەئەوروپاش مام جەلال ئاگادارکرا، بەڵام بەر لەمانەو بەر لەئێمەش، کەلەمەیدانەکەدا بووین، چەند کەسێکی تر دەیانزانی هەڵەبجە کیمیاباران کراوە، زانیشیان جۆری گازەکەکان کامەیەو وەچەند تەن بەکارهاتووە. ئەو کەسانەش سەدام حسێن و عەلی حەسەن مەجیدو داروودەستەکەیان بوون، چونکە بەبڕیاری ئەوان و بەفەرمانی ئەوان ئەم گازە ڕژا بەسەر شاری هەڵەبجەو دەشتی شارەزووردا.

لەدنیای دەرەوەدا میدیاکانی یوگسلافیا سەرەتا ئەم هەواڵەیان بەشێوەیەکی کورت ب لاوەکردەوە، دواتر مام جەلال کەوتە ئاگادارکردنەوەو تێگەیاندنی دەوڵەتان و دۆستانی کورد، توانایەکی زۆرو لەڕادەبەدەری لەپێناو ئاشکراکردن و ڕیسواکردنی تاوانەکە سەرف کرد. یەکەمجار ئەوانەی لایەنگری عێراق بوون دەیانگووت: ئێران گازەکەی ڕژاندوە بەسەر خەڵکی هەڵەبجەدا.

هاوکات لەگەڵ هەولەکانی سەرۆک تالەبانی و سەرکردایەتی سیاسی کورد، ئێرانیش بێ دواکەوتن بۆ چارەسەرکردنی بریندارەکانی چەکی کیمیایی داوای هاوکاری کۆمەلگای نێودەولەتی کردو ڕایگەیاند: "ئێران ئەو برە دەرمانەو توانای چارەسەرکردنی ئەو هەموو بریندارەی نییە". لەپاڵ ئەوانەشدا وێنەو گرتە ڤیدیۆییەکانی هەڵەبجە ووردە ووردە ب لاوە بوونەوەو جیهانیان هەژاند، بەشێوەیەک پشتیوانانی عێراقیش لەنێویاندا ئەمریکاو سۆڤیەت

نەیانتوانی پەردەپۆشی تاوانەکە بکەن. لەوکاتەدا ئەمریکا بەناچاری لەڕێگای دیپلۆماتەکانییەوە عێراقی ئاگادارکردەوە لە تێڕوانینی ئەمریکا لەسەر ئەو تاوانە.

زۆرکەس و لایەنیش بە ئاگاو بێئاگا هەر دەیانگووت: کۆماری ئیسلامی ئێران هەڵەبجەی کیمیاباران کردووە، لەوانە دۆستانی کوردو کوردانیش خۆیان. سیاسەت مەدارێکی گەورەو دانای وەک د. عەبدوڕەحمانی قاسملو لەکوردانی ڕۆژ هەڵات کیمیابارانی هەڵەبجەی خستە ئەستۆی ئێران، بەڵام زوو پەشیمان بوەوەو دواتر دەرکەوت ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی حیزبەکەی تووشی ئەو هەڵەیەی کردووە، هەروەها زۆربەی وڵاتانی عەرەبیش ئێرانیان تاوانبار کرد.

کوشتن و قەتلوعامی هەزاران کەسیش لەچەند کاتژمێرێکدا لەلایەن



[illegible]

عێراقەوە بەو گازە کوشندەو قەدەغەکـــراوە تـــاوانێکی نەشـاراوە بـوو، زۆر کەسـو لایەنــی هێنــایە ســەر خەت بەدۆســــتەکانی عێـــراق خۆشیەوە لەنێویاندا ئەمریکا.

هــاتنی ڕۆژنــامەنووس و وێنەگـران لە جیهـانەوە بـۆ ئێـران و لەوێشــەوە بـۆ هەڵەبــجەو دەشــتی شــارەزوور، بەدوای خۆیــدا زنجیرەیەک هەواڵو زانیاری لـەسەر تاوانەکە لە میدیا جیهانییەکـانەوە هێنا لەوانە ڕۆژنامەی نیۆرک تایمز نوسـیبووی: هۆکـاری مەرگی ئەوانە، هەمـوو بەهۆی یەک فرۆکەی جەنگیەوە بـووە، کەبەبێ دوودڵی ئەتـوانرێ بوترێت عێراقی بووە. بەڵام یەک فرۆکە نەبووە چەندین فرۆکە بوون.

پێشتر لەچاو پێکەوتنێکدا بۆ نامەیەکی ماستەر لەسەر جینۆسایدی هەڵەبجە، وتوومە: یەکێک لەهۆکارەکانی هێرشی ئێران بۆسەر هەڵەبجە، کەلای ئەوان بە وەلفەجری ١٠ بەناوبانگە بۆزیاتر هاتنە پێشەوەی عێراق بوو بۆئاشتی، چونکە نوێنەری ئەوکاتەی ئێران لەڕێکخراوی نەتەوەکاندا ووتی: ئەگەر ڕێکخراوی نەتەوەکان لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و ئەنجامدانی

ئەوتاوانە لەهەڵەبجەدا لێکۆڵینەوە نەکات ئێران پابەند نابێت بەو هەوڵە نوێیەی گفتوگۆی ئاشتیەوە، کەبڕیارە دەست پێ بکات. لەبەرئەوەی بڕیاربوو لە سەرەتای مانگی ئازاری ١٩٨٨دا سکرتێری ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بەجیا لەگەڵ نوێنەرانی هەردوو وولات عێراق و ئێراندا دانیشتن بکات.

عێراقیش تاماوەیەک بێدەنگی هەلبژارد تائەوکاتەی، کەوتەبێژی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان ڕایگەیاند: شاندێک دەنێرین بۆ تاران تالێکۆڵینەوە لەسەر کیمیابارانی هەڵەبجە ئەنجام بدات.

عێراقیەکان لە دوای ئەم بڕیارە ئارامیان لێبڕاو کەوتنە لێدوان و بەدرۆخستنەوە، بەڵام هیچ کەس ولایەنێک باوەڕی پێ نەدەکردن. لەکۆبوونەوەیەکی مجلس قیادەی ثورەدا بەڕابەرایەتی سەدام حسێن، کەتایبەت بوو بەقسەکردن لەسەر بەکارهێنانی گازی کیمیایی، حاشایان کردو وتیان: عێراق هەر ئەوچەکەی هەبە، کەبۆ بەرگری لەخۆی لەپێناو ئاشتیەکی عادڵانە بەکاری ئەهێنێ. هەرلەوبارەوە ڕۆژنامەی البعث نووسیبووی: لە ئاستی نێودەولەتیدا هەول دەدرێت پێگەی عێراق لەکەدار بکرێت.

تاریق عەزیز لە نامەیەکدا بۆ ئەمینداری گشتی، ناردنی تیمی پسپۆڕی لێکۆڵینەوە بۆ ئێران لەسەر ڕاستی و دروستی بەرکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن عێراقەوە، بە لایەنگیرکردنی ئێرانی ناوبرد. هەر لەوبارەوە لەتیف نەسیف جاسم وەزیر لە عێراق بە پێرێز دیکویلاری گووت:" سکرتێری گشتی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ئەنجامدانی ئەرکەکانیدا بێتوانایەو جێگەی متمانە نییە". دیکویلار لە وەلامی نامەدا بە وەزیری دەرەوەی عێراقی گووت:" کاتی ئەوە هاتووە لەبارەی جەنگی ئێران ـ عێراقەوە باسێکی گشتی و ئاشکرا ئەنجامبدرێت". لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا عێراق بە درۆکەوتەوەو لێکۆڵینەوەکان دەریان خست عێراق گازەکەی بەکارهێناوە.

ساینس مانیتوری ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی نووسیبووی:" تاوانبارکردنو هەولەکانی عێراق، سەبارەت بەبەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن ئێرانەوە، بەفراوانی لایەنگیرکردنی نێودەولەتی لە عێراق کاڵ کردووەتەوەو شانسی دانانی گەمارۆی چەکو تەقەمەنی لەسەر ئێران لەلایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کەمکردووەتەوە".

سەرەتا عێراق خۆیان بێدەنگ کردبوو لەهەرلێدوانێک، لەبارەی تاوانەکەوە، هەتا نەشیان گووت ئێران ئەو تاوانەی ئەنجامداوە، بەڵام کاتێک زانیان چیان کردووە بەپەلە کەوتنەحاشاکردن و تاوانبارکردنی ئێران، چونکە ئەگەر ئێرانیش بووبێ چۆن عێراق لەئاست ڕووداوێکی واگەورە هەتا بۆتاوانبارکردنی بەرامبەریش هیچ ناڵێن. لەکاتی شەڕەکەدا لە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦دا بەشی عەرەبی ڕادیۆی مۆنتی کارلۆ لەزاری ئێرانییەکانەوە باسی شەڕێکیان کرد لەدەوروبەری خورماڵ ڕوویداوە. ڕۆژی دوایی عێراقییەکان نکۆلیان لەو شەڕو پێکدادانە لەو ناوچەدا کردو بە پروپاگەندەیان لەقەڵەمدا. دواتر دانیان بەپاشەکشەی هێزەکانیاندا نا لەو سنوورەدا، بەڵام هیچ ئاماژەو باسێکیان لەهێرشی کیمیایی نەکرد، نەلەلایەن ئێران و نەلەلایەن خۆشیانەوە.

یەکەم ناوهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن عێراقەوە لە ١٩٨٨/٣/٢٣دا هات، کاتێک عەبدولئەمیر ئەنباری ڕایگەیاند: ووتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا گووتویەتی: ئێران بە تۆپی کیمیایی چەند شوێنێکی خاکی عێراقی تۆپباران کردووە. لە ڕۆژی ٣/٢٥دا لە ڕادیۆی ئوردنەوە چاوپێکەوتن لەگەڵ تاریق عەزیز کراو ووتی: لەدەستدانی هەڵەبجە جێی داخە، هەرچەندە ئەم ناوچە نە ستراتیجییەو نە هەڕەشەیەکی سەربازییە، ئێرانییەکان هەرهاتوو هاواریانە لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و جەنگی شارەکان، ئەمەش پاساوی درێژەپێ دانی جەنگە" لەم سەروبەندەدا، کە عێراق لە هەڵەبجەدا شکا، سەرکردایەتی یەکێتیی گرتوو هاتوو هاواری سەرکەوتنی دەستپێکرد. لەڕاستیدا ئەم شەڕەی یەکێتیی ورژێمی عێراق بابەت و داستان و لاپەڕەیەکی تری مێژووی پرشانازی گەلەکەمانە، کەئێرە جێگەی گێڕانەوەو وردەکارییەکانی نییە.

دوای کەوتنی سەرکردایەتی و دۆڵی جافایەتی، سوپای عێراق بەبێ وەستان دەستی بە قۆناغەکانی ئەنفالی دوو و سێ کرد، چونکە ژمارەیەکی زۆر هێزو بنکەو بارەگای یەکێتیی نیشتیمانی و بەشێک لەهێزی لایەنەکانی تر لە ناوچەی ڕزگارکراوەکانی قەرەداغ و گەرمیان بوون. هێزەکانی ئێرانیش لە دوای گرتنی هەڵەبجەوە لە ڕۆژهەڵاتی سلێمانییەوە گەیشتبوونە سەر دەریاچەی دەربەندیخان، هێزەکانی یەکێتیش لە بەری قەرەداغەوە

باڵادەستبوون بەسەر لای ڕاستی ڕێگای سلێمانی - دەربەندیخاندا، بەوهۆیەشەوە هەڕەشەیەکی جددیان لەسەر ڕێگای سلێمانی - دیالە - بەغدا دروست کردبوو.

لەڕووی نەخشەو بەرنامەی جەنگی سەربازییەوە ئەوەی لەسەر نەخشە تەماشای هەلکەوتەی جوگرافی پارێزگای سلێمانی بکات، دەزانێ ئەگەر ئێران بەرنامەی هێرشێکی تری دوای هێرشی هەڵەبجەی هەبوایە، ئەو سەرکەوتنەی عێراق لەسەر یەکێتی و سەرکردایەتیەکەی بەدەستی هێنابوو، ئەوا دای دەناو شاری سلێمانی، کە ناوەندی پارێزگاکەیە لەگەڵ چەندین شارو شارۆچکەی تریشی لەدەست دەدا، ئەوکات عێراق ناچار دەبوو لە ناوچەی دوکانو جافایەتی پاشەکشە بکاتەوە، چونکە هەڵەبجە تا بازیان دەبوو بە یەک بەرە هێزی پێشمەرگەو هێزەکانی ئێران لەیەکیان دەدایەوە.

یوست هێلتەرمان باس لەوە دەکات لە هێرشێکی عێراقدا بۆ سەر شاخی گلەزەردە لە ٣٠ی ئازاردا بە چەکی کیمیایی سەربازەکانی خۆی برینداربوون. چەند ڕۆژ دوای ئەم هێرشە تاریق عەزیز، ئێرانی تاوانبار کرد بەوەی لە ٣٠- ٣١/مارتدا لەکەرتی هەڵەبجە چەکی کیمیایی بەکارهێناوە بەوهۆیەشەوە هەشتاو هەشت سەربازی عێراق بریندار بوون، لەهەڵەبجە لەو ڕۆژانەدا شەڕ نەبووە، عێراق بەهەلە سەربازەکانی خۆیانی لەقەرەداغ نەک هەڵەبجە بریندارکردووە.

هەروەها یۆست دەڵێت: کاتێک د.مانوێل کارمۆن پزیشکی پسپۆڕی نەتەوەیەکگرتووەکان چاوی بەو ژمارە بریندارە کەوت، لەنەخۆشخانەیەکی بەغدادا گەیشتە ئەو بڕوایەی، کە ئەمانە بەگازی خەردەل بریندار بوون، بە سەربازەکان وترابوو، کە بلێن لەسەر چیاکانی نزیک بەهەڵەبجە لە ٣٠- ٣١ی مارتدا بەرکەوتوین، کەڕێک لەگەڵ لێدانی کیمیاییەکەی سەرشاخی زەردەدا یەکدەگرێتەوە. ئەڵبەتە د.دۆمینکوز، ئەم زانیارییانەی لانەبووە تابزانێت ئەو سەربازانە چۆن بریندار بوون.

ئەو سەربازانەی عێراق لەشەڕی ئەنفال و لە چیای زەردەی قەرەداغدا کاتێک تۆپخانەو فڕۆکەکانی عێراق بۆردومانی سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگەیان کردبوو، لەوکاتەدا بەهۆی ئاراستەی پێچەوانەی باوە سەربازەکانی عێراق خۆی بەرکەوتبوون، ئەمەش ڕاستی ڕووداوەکەیە.

عێراق بەهۆی بەڵگەو نامە نهێنییەکانییەوە، لەزۆر جێگە باسی ئەرکی تایبەت یان لێدانی تایبەت دەکات، ئەم وشەی تایبەتە سەلماوە، کەمەبەست لێی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بووە. یان لێدوانی ئەو ئەفسەرو فرۆکەوانانەی، کەدیلبوون یان ئەو کەسانەی دواتر لە سەدامو سوپاکەی هەڵگەڕابوونەوەو چوونە ڕیزی ئۆپۆزسیۆنی عێراق، ئەوەیان سەلماندووە عێراق کیمیابارانەکەی ئەنجام داوە. بۆنمونە سەیری کتێبەکەی یۆست هێلتەرمان بکە لەلاپەڕەکانی ٢٣٤-٢٤١ ئەمەش چەند نمونەیەک:

١- بروسکەیەکی ١٦ی ئازاری ١٩٨٨ی پۆلیسی نهێنی لەسەر بارودۆخی هەڵەبجەباس لەسەر زیادکردنی هێزو دلڕەقی سەربازی دەکات.

٢- چەند ڕۆژ دواتر یاداشتێکی هەواڵگری سەربازی باس لەوەدەکات، کە لەئەنجامی بۆردومانکردنی هەڵەبجەو خورماڵدا لەلایەن فرۆکەو تۆپخانەی خۆمانەوە دووهەزار کەس لەهێزەکانی دوژمنی فارسو بەکرێگیراوانی یەکێتیی نیشتیمانی کوژراون.

٣- بروسکەیەکی هەواڵگری سەربازی چەند هەفتەیەک دوای شەڕەکە باس لەوە دەکات شریتی ڤیدیۆی کیمیابارانەکە بەنهێنی لەناو دوکانەکانی سلێمانیدا ئەفرۆشرێت.

وەفیق سامەڕای سەرۆکی پێشووی دەزگای هەواڵگری سەربازی عێراق لە ١٩٩٧دا لە چاوپێکەوتنێکیدا لەوبارەوە وشەی تایبەتی بەوە لێکدایەوە، کەمەبەست لەکیمیاویی بووە. بەهەمان شێوە ڕاپۆرتی پسپۆڕانی نەتەوەیەککگرتووەکانیش لەساڵی ١٩٨٦دا قسەی فرۆکەوانێکی عێراقی گواستەوە، کە گیرابوو، کاتێک باسی لێدانی کیمیایی بەفرۆکە وەک ئەرکی تایبەت ناوی هێناوە کردووە. جگە لەمانەش لەو هەژدە تەن بەڵگەنامەدا، کەنزیکەی پێنج ملیۆن لاپەڕەیەو ئێستا لە ئەمریکایە،لە ماوەی هەشت ساڵی جەنگەکەیدا لەگەڵ ئێران، عێراق هیچ ئاماژەیەکی بەوە نەداوە، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئێران چەکی کیمیایی لە دژ بەکارهێنابێت.

هشام صباح الفخری فەرماندەی عەمەلیاتی باکووری بەسرە لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ١٩٨٤دا لەگەڵ ڕۆژنامەنووسان دەڵێت: عێراق مافی خۆیەتی چەکی کیمیایی بەکاربهێنێ.

ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٢٩ / جونی / ١٩٨٤دا. داوای لەسەرۆک کۆمارەکانی عێراقو ئێران کرد بەلێنی خۆیان رابگەیەنن بۆبەکارنەهێنانی چەکی کیمیایی لە شەرەکەدا، عێراق وەلامی نەدایەوە، بۆیە سکرتێری نەتەوەیەکگرتووەکانیش لە وتەیەکیدا لەئەنجومەنی ئاسایش، رایگەیاند: نەیتوانیوە بەلێنی عێراق بۆ بەکارنەهێنانی چەکی کیمیایی دژی ئێران وەرگرێت.

رۆژنامەی الحریەی ئۆرگانی جبهەالدیموقراتیەی فەلەستین چاپی لەندەن ئاشکرای کرد، سەدام لەچاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ وەزیرانی دەرەوەی عەرەب لە بەغداد پێی وتوون بەشێوەیەکی کەم جوزئی چەکی کیمیاویمان بەکارهێناوە.

وەزیری دەرەوەی عێراق لەکۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیدا لە شاری بۆن لەوەلامی پرسیارێکدا ووتی:" دەولەت لەچەکە کیمیاییەکان کەلکی وەرگرتوەو وەریش ئەگرێ".تاریق عەزیز لەساڵی ١٩٨٨دا لەوەلامی ئەو ولاتە ئەوروپیانەدا، کەرەخنەیان لەعێراق گرتبوو سەبارەت بەبەکارهێنانی چەکی کیمیایی، ووتی:" ولاتانی ئەوروپا خۆیان چەکی کۆکوژ دەدەن بەولاتانی جیهانی سێیەم، بەلام لەکاتی بەکارهێنانیدا فرمێسکی تیمساحی بۆ قوربانییەکانی ئەرێژن.

واشنتۆن پۆست لەساڵی ١٩٨٣دا لە زمانی هاگی قسەکەری وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاوە نوسیبووی: ئەو تۆمەتانەی ئێران دەیداتە پاڵ عێراق گوایە لە شەڕدا عێراق لەگازی ژەهراوی کەلکی وەرگرتوە تا رادەیەک راستە. لەساڵی ١٩٨٤دا ئەمریکا لەکۆنفرانسی داماڵینی چەک دا عێراقی تاوانبار کرد بەوەی، کەچەکی کیمیایی لە شەڕدا دژی ئێران بەکارهێناوە، نوێنەرەکەی ئەمریکا لە کۆنفرانسەکەی جنێفدا ووتی:" بەداخەوە دەبێت بلێم بەلگە هەیەو لەبەردەستدان، کە دەیسەلمێنن عێراق چەکی کۆکوژو کیمیایی بەکارهێناوە".

هەروەها هەندێک راپۆرتو نوسراو لەرۆژانی ٢٤- ٢٥- ٣/٢٧باس لەوە دەکەن ئێران ماسکی گازو ئەمپول و کەل و پەلی دژە کیمیاوی داوە بەکوردەکان لەگەل ٢٠ بیست ئەمبولانس، باس لەکوشتنی ١٥٠٠ کوژراوی مەدەنی و ١٥ پێشمەرگەی بەناو تێکدەر لەهەلەبجەدا بەو هێرشی کیمیابارانە دەکەن.

باس لەوەدەکەن کوردەکان هەڕەشەی خۆپیشاندان دەکەن لەدژی ڕژێم لەسەر کیمیابارانی هەڵەبجە.

- لەنوسراوێکی تری نهێنی ڕۆژی ١٩٨٩/٣/١٥ لە ڕۆژێک پێش یەکەمساڵیادی کیمیابارانەکەدا گوایە لەسلێمانی خۆپیشاندان ئەکرێ.

- نوسراوی کەسێکی کوردی سەربەڕژێم مەفرەزە خاصە لە ڕۆژی ١٩٨٩/٣/١٦، واتە ڕۆژی یەکەم ساڵیادی کیمیاباران بۆ پۆلیسی نهێنی ئەنێرێتو دەڵێن ئەگەری خۆپیشاندان هەیە، بەڕێوەبەریش دەڵێت: ئەگەر هەولی خۆپیشاندان بدەن ئەوە سزای خیانەتکارانیان پێ ڕەوایە.

- چاوپێکەوتنەکانی فرۆکەوان مێجەر ئەحمەد شاکر لە ١٧ی ئازار لەهەڵەبجە کەوتەخوارەوە، یاسر ئەلگەیلانی فرۆکەوان دوای جەنگ وڵاتی بەجێهێشت.

- چاوپێکەوتنەکەی مانگی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٠ی جەنەڕاڵ جودت النقیب ئەفسەری پلە بەرزی ژووری ئۆپەراسیۆنی سەربازی. هەروەها جەنەڕاڵ نزار الخزرجي، کەسالانی ١٩٨٧- ١٩٩٠ سەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراق بووە.

- لیوارۆکن نەبیل خەلیل سەعید لەچاوپێکەوتنی ساڵی ٢٠٠٤دا.

ئەمانەو دەیان بەلگەو دیکیۆمێنت و شاهیدی عەینی و چاوپێکەوتنی تر دەیسەلمێنن، کەعێراق کیمیابارانی هەڵەبجەو ناوچەکانی تری کوردستانی کردووە لەدژی پێشمەرگەو خەڵی مەدەنی، وەلە شەڕی عێراق - ئێراندا لەدژی سوپاو هاوڵاتیانی ئێران گازەکوشندەکانی بەکارهێناوە.

ڕاست کردنەوە:

لەڕۆژێکی مانگی مایسی ساڵی ٢٠٠٢ دا لەهەڵەبجەو لەناو بارەگاکەمدا، کە لە ناو کۆمەلگای عەنەب دا بوو لە گەڕەکی شارەوانی ئاگادارکرامەوە کە میوانم هەیە، لەوکاتەشدا ئێمە سەر گەرمی کێشەی ئەنسار ئیسلام بووین لە ناوچەکەدا. دوای گەیشتنی میوانەکە بۆم دەرکەوت، کە کەسێکی بیانییەو ناوی یوست هێلتەرمانە، پێکەوە دانیشتین وەک ڕۆژنامەنووس خۆی ناساند، جگەلەم سەفەرە چەند جارێکیتر هاتە هەڵەبجەو ئێواران دەگەڕایەوە بۆ سلێمانی، جارێک پێکەوە سەردانی چیای شنرۆیمان کرد بۆ بینینی بنکەو بارەگاکانی ئەنسارئیسلام لەسەر بەرزایی و ناو چەم و دۆلەکانی ناوچەی هەوراماندا.

لەچاوپێکەوتنێکدا، کەپرسیاری لەسەر هێرشەکەی ئێران و گرتنی هەڵەبجەو رۆڵی لایەنە کوردستانییەکان لە گرتنی هەڵەبجەو کیمژاپۆنی ئەو شارە لەلایەن عێراقەوە لێکردووم، بەپێویستم زانی چەند هەڵەیەکی ئەو چاوپێکەوتنە راست بکەمەوە. لەلاپەرە ١ی بەرایی لەدێری ١٥ پانزەدا نوسراوە، لە نیوە شەوی ١٢یان١٣ی مارتدا ڕاستیەکەی ١٢لەسەر١٣ی مارتە لەلاپەرە ١٤٧، لەدێری ١٤ـ ١٥ نوسراوە ی.ن.ک بەمەبەست جفرەی پەیوەندی بێتەلی بەکار دەهێنا ڕاستیەکەی ی.ن.ک بەمەبەست جفرەی پەیوەندییەکانی بێتەلی بەکارنەهێنا.

لەلاپەرە ١٥٦داو لە پێش دێری کۆتاییدا نوسراوە: لە ١٤ی مارتدا هێزەکەی حەمەی حەمەسەعید. ڕاستیەکەی: لەشەوی ١٤ی مارت دا هێزەکەی حەمەسەعید

لەلاپەرە ١٥٧دا لەدێری ٢١ نوسراوە: لەکاک شەوکەتەوە فەرمانم پێدرا پێشڕەوی بکەم بۆ هەڵەبجە

ڕاستیەکەی:لە کاک شەوکەتەوە فەرمانم پێدرا لەپشتی هەڵەبجەوە بگەڕێمەوە بۆ گرتنی سەربازگەی پالانیا.

لەلاپەرە ١٦٠دا لە دێری ١٦دانوسراوە: ئێمە ئامۆژگاری خەڵکی هەڵەبجەمان کرد چۆڵی نەکەن.

ڕاستیەکەی: فەرماندەکانی هێزەکە ئامۆژگاری خەڵکی هەڵەبجەیان کردووە چۆڵی نەکەن.

لەلاپەرە ١٦٢دا لەدێری ١٥ـ ١٦دا نووسراوە. لەوانە تۆپبارانێکی کیمیایی بۆسەر هاوارە کۆن.

ڕاستیەکەی: لەوانە بۆمبارانێکی کیمیایی بۆ سەر هاوارە کۆن.

# بەشداری بەرەی کوردستانی لەگرتنی هەڵەبجەدا

لەو هێرشـــەدا کە هێزەکـــانی ئێـــران کردیـــانە ســـەر هەڵەبـــجەو دەوروبەری، دوای ئەوە کەکۆنترۆڵیان کرد، سەدام حسێن و عەلی حەسەن مەجید بڕیاری کیمیاباران کردنیانداو ئەو بڕیارەش لەڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦دا لەلایەن هێزی ئاسمانی سوپای عێراقەوە جێ بەجێ کرا. هێزەکانی بەرەی کوردستانی هاوکاری وبەشداربییەکەیان لەگەڵ هێزەکانی ئێراندا بۆگرتنی هەڵەبجەو دەوورو بەری بەشدارییەکی ڕەمزی بوو.

چونکە ئێمە وەک هێزەکەی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان لە شەوی ١٢لەسەر٣/١٣ /١٩٨٨دا تا لوتکەی بالامبۆو لوتکەی چادرگە بەفری میری لەسەر شنروێ نەگیرا، هیچ پەلاماریکمان نەدا، لە دوای گرتنی ئەو دوو شوێنە، ئینجا لەلایەن هێزەکانی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستانەوە چەن پەلامارێک درا، دواتریش بۆچوونە ناوشاری هەڵەبجەو گرتنی بەرزاییەکانی پەرونی و پالانیا لەلایەن هێزەکەی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستانەوە دلنیا ببووین، کەقەرارگای قودسو قەرارگای فەتح لەبالی ڕاستو چەپی نەخشەی هێرشەکەدا، قەرارگای قودس زاڵبووە بەسەر ڕێگای سەیدسادق - پردی زەڵم داو قەرارگای فەتح زالە بەسەر دەربەنی تەنگی سەید محەمەدو شاخی تەمورەژەنان دا، هەردوو باڵەکە لەهەولی پێشرەویدابوون بۆئەوەی لە نزیک شارۆچکەی سیروان ئەم دوو قەرارگا لێک بدەنەوە، هەروەها قەرارگای ئامن الامەش بەتەواوی چیاکانی شنرویێ بالامبۆی کۆنترۆل کردبوو.

ســەبارەت بەسۆشیالیســت، بەپێــی قســەکانی عەلــی بچکۆلــو چەنــد کەسێکی تریـان هەرلەنـاو گوندەکانی دۆلاش و قاجردا بوون تاپردی زەڵـم گیــراوە، دواتــر ـەگونـدەکانی تەپەتـۆلەکەو تەپــی ســەفادا گەڕاونەتەوە بــۆ ئەحمەدئاوا.

هێزی بەشداربووی پارتیش بەپێی قسەی هۆشمەند یارەحمەدو چەند کەسێکی دیکەیان شەوی یەکەم بێئاگابوون و دواتریش هێزێکی، کەمیان

هاتەخوارەوە هەرلەدەوروبەری گوندەکانی خێلی حەمەو تەپەکوڕەدا بوون تا ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦.

بزووتنەوەی ئیسلامیش پێشتر ڕۆلیان باس کراوە، کە خەریکی چەند کارێکی ئیداری و چاوساغی و لۆجستیکی بوون، هێزەکانی حزبی شوعیش بەرلەهێرشەکە سنوورەکەیان جێهێشتبوو چووبوونە ناوچەی قەرەداغ، کاتێک شارەکەو ناوچەکەش کۆنترۆلکرا هەر بە تەنیا هێزەکانی ئێران خۆیان لە بەرەی پێشەوەی شەڕ بوونو خەتی پێشەوەیان لەمیری سورەوە بۆ تەمورەژنانی ناوچەی تاوەگۆزی داناو قایم کرد.

دوای ئەوە وردەوردە کەوتنە دەرکردن و دوورخستنەوەی هێزی پێشمەرگە، تەنیا خۆیان مانەوە لە هێلی پێشەوەو ناوشارو شارۆچکەکاندا، ڕێگایاندا هێزەکانی بەرەی کوردستانی لەسازان و عەبابەیلێ و ئەحمەدئاوا بمێنێتەوە لەگەڵ ئەو شوێنانەی پێشتر بنکەو بارەگای حیزبەکانی لێ بووە، واتە بەر لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٢، ئەو شوێنانەش بریتی بوون لە: گریانە، بۆین، هاوار، گەڕەجال، وشکەناوو چیای سورێن.

نوێنەری حزبەکانیش بۆیان هەبوو ڕۆژانە بچنە ئاوایی خەرپانی بۆ ئیشوکارو کۆبوونەوە لەگەڵ نوێنەری قەرارگای ڕەمەزان. هەندێک جاریش بەبیانووی جۆراوجۆر، ڕێگەیان لە پێشمەرگەو مەفرەزەکانی پێشمەرگە دەگرت نەک هەرنەیانهێشت ئەو هێزانەی، کەبڕیاربوو لە ناوچەکانی تری کوردستانەوە بەهۆی شا لاوەکانی ئەنفالەوە هاتوونەتەسەر سنوورەکان بێنەوە بۆهەڵەبجەو دەوروبەری، ئەوهێزەش، کەبەشداری گرتنی هەڵەبجەی کردبوو، هی ناوچەکانی تربوو گەڕانەوە بۆسنوری سەردەشت و بانەو قەندیل و مەڵبەندی سێ، هێزەکەی ئێمەش، کەزۆرترین پێشمەرگەی بەرەی کوردستانی بووین لە سنوورەکەدا بەشێکی زۆری چووبووە بەرەی مەڵبەندی سێ بۆ لای هێزەکانی هەولێرو ئەو هێزەی، کە لە گەرمیان و قەرداغ و ناوچەکانی تری کەرکەوکو کۆیەوە بەرەو سنوور دەهاتن، بە هۆی شالاوەکانی ئەنفال و شەڕی بەردەوام ڕۆژانە لێیان شەهیدو بریندار دەبوو، ئەوەشی دەردەچوو بەرەو لای مەڵبەندی سێ، کە لە ناوچەکانی خۆشناوەتی و بالەکایەتی و قەندیل بوون دەڕۆیشتن.

هێزەکانی پارتیش زۆربەیان لەلای پیرانشارو شنۆوە کۆببوونەوەو بەرەو سێ سنوورو خواکورک بەڕێوەبوون، لەوێوە بەرەیەکی شەڕیان کردەوە لەگەڵ ئەو هێزانەی عێراق، کە کەوتبوونە دوای ئەو هێزانەی لە سنوورەکەدا لە ئەنفال ڕزگاریان ببوو.

هۆشمەند یارئەحمەد بەگ، یەکێک بووە لە بەرپرسەکانی هێزەکەی پارتی، کە بڕیار بووە لەم جەنگەدا واتە هێرش کردنە سەر هەڵەبجەو ناوچەکە بەشداری بکەن، ئەو ووتی:" ئێمە نزیکەی ٥٠ پێشمەرگە بووین چەند ڕۆژێک پێش هێرشەکە لەدزلیەوە بردینیانە ئاوایی شێخان و لە نزیک لای نەوسوود پێیان وتین: ئێوە لەگەڵ یەکێتیی لەم قۆلەوە بەشدار دەبن، بەڵام دوای دوو ڕۆژ ئێمەیان گەڕاندەوە بۆ دزلی و ئەو ڕۆژەی لەملەخوردەوە هاتین بۆ گەرەجال ١٣٠ پێشمەرگەبووین، دەروێش ئاغاو حەمید ئەفەندی بەرپرسی ئەم هێزە بوون.

دوای وەرگرتنی کەلوپەلی دژە کیمیایی شەوی ١٢لەسەر١٣ /٣/ ١٩٨٨ لە کەرەجال ماینەوە، نزیکەی کاتژمێر ٧ی سەرلەبەیانی بینیمان چەند سەربازی دیل بەرەو لای ئێمە دێن، ووتیان ڕەبیەکانی بەرزاییەکانی ناوچەکەو شارۆچکەی خورماڵ گیراوە ئەوکاتە ئێمە زانیمان ئێران هێرشی کردووە.

ئێمەش بەپەلە کەوتینە خۆمان هێزێکی ٦٠ پێشمەرگەو ٢٠ پاسدار پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٣ هاتینە خوارەوە بۆ خێڵی حەمەو تەپەکورە، بڕیاربوو بچین سەربازگەی زەمەقی بگرین، شەوی دووەمی شەڕەکە، کەوتینەڕێ تا نزیکی سەربازگەکە بووینەوە ڕۆژمان لێبوویەوە، بەڵام دووبارە گەڕاینەوە بۆ خێڵی حەمەو نەچووینە سەر سەربازگەکە.

ڕۆژی ٣/١٤ /١٩٨٨هەر لە خێڵی حەمەو تەپەکورە بووین، لێرە هەندێک کتێبو موجەلەو نوسراومان بینی فڕێ درابوو پاسدارەکان هەلیانگرتەوەو دوای ڕێچکەی نوسراوو کتێبەکان کەوتن بەرەو خوار دەستیان بەخوێندنەوەیان دەکرد، وتیان ئەمە هی کۆمەنیستەکانە کۆمەڵەی ئێران، بەوەدا زانیان کۆمەڵە لە بیارەوە هاتوونو بەرەو شارۆچکەی سیروان ڕۆیشتوون.

سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٥ کۆمەڵێک سەربازو ئەفسەر بە پەرشوب لاوەی و سەرلێشواوی، کە لەلای هەڵەبجەو عەنەبەوە هاتبوون، ئەو دەشتەیان گرتبووەبەرو بەرەو پردی زەڵم هەڵئەهاتن. پێشمەرگە ڕێگەیان پێ گرتنو هەندێکیان چەک کردنو هەندێکیشیان هاتنە دەستو تەقەیان لە هێزەکەی ئێمە کرد، دیاری حسێنو فازیل بەشارەتی و چەند کەسێکی دیکە برینداربوون، دوو پێشمەرگەش شەهید بوون، هەرئەو ڕۆژە پاسدار دوو پێشمەرگەی تریان لای گۆمەلار شەهید کرد".

دیاری حسێن عوسمان، کە ئەویش یەکێک بووە لە بەرپرسەکانی پارتی، دەڵێت:" ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦ لە بەشارەتو تەپەکورە بووین، ئێمە برینداربووینو دوو پێشمەرگەشمان لە نزیک بەشارەت شەهیدبوون بەناوەکانی: ئیسماعیلی مەلامحەمەدی گلێجالی و ئەحمەدە ڕەشی بەشارەتی، هەرهەمان ڕۆژ سالحی مامە قالەو سالحی عەریف حەسەنی زەردەهالی لە نزیک گۆمەلار بە دەستی پاسدارەکانی ئێران شەهیدبوون".

من زۆر هەولمدا بۆ ئامادەکردنی ئەم بابەتە قسە لەگەڵ چەند بەرپرسێکی لایەنەکان و بەشداربوانی ئەم شەڕە بکەم، بەڵام بەداخەوە زۆریان بەروارەکان و ڕۆژەکان بەدروستی نازانن و لە بیریان نییە، ئەو چەند بەرپرس و فەرماندانەی لایەنەکانی بەشداربووی شەڕەکەش قسەم لەگەڵ کردوون ئەوەتا جیاوازی هەیە لەنێوان گێڕانەوەکانیان دا. بۆیە پەنام بردە بەر ئەو بابەتو نوسراوانەی ئەوکەسانەی لەسەر کارەساتی هەڵەبجەیان نوسیوە، بەتایبەتی ئێرانییەکان، بەڵام لەوێش مێژوو ڕۆژو ژمارەی دیل و کوژراوەکانیش جیاوازی تێدایە بۆنمونە کاک شەوکەتی حاجی موشیر، کەبەرپرسی هێزەکانی یەکێتیی بووە ساتی دەستپێکردنی هێرشەکەی بەکاتژمێر ٣٠:١ی شەوی ١٤لەسەر١٥/ ٣ / ١٩٨٨ دیاریکردووە، لەکتێبی کارەساتی کیمیاباران هەڵەبجەدا، کە ئەوەش هەڵەی کردووە.

ئێرانییەکان لە کتێبی جغرافیای عەملیاتدا دەنووسن: ١٣٦٦/١٢/٢٣ واتە لە شەوی ١٢لەسەر١٩٨٨/٣/١٣دا هێرش دەستپێکردووە، هەرلەوێدا دەنووسێت ٤٨ کاتژمێر هێرشەکە وەستاوە تا جادەی ملەخورد بداتەوە لەجادەی پێلانێ و مانەقوڵ، ئەگەر٤٨ کاتژمێر نێوان هەنگاوی یەکەمو دووەم بووبێ ئەوە هێرشەکە دەبێ شەوی ١٢لەسەر١٩٨٨/٣/١٣ دەستپێکردبێت، چونکە ٢٣+٢١ =

٤٤ – ٣٠ =١٤، بەڵام ئەگەر مانگ ٣١ ڕۆژ بوو بێت ئەوە ئەو کات ٢٣+٢١ = ٤٤ – ٣١ = ١٣، بەڵام ڕاستییەکەی هەنگاوی یەکەم شەوی ١٢لەسەر١٣/ ٣/ ١٩٨٨ دەستپێیکرد[1].

هەر لە هەمان کتێبدا لەلاپەڕە٤٤٠دا یەکەمجار دەڵێت: بەدیلگرتنی ٦٠٠٠ نەفەر، لە کۆتایی هەمان لاپەڕەدا دەڵێت: ٤٠٠٠ دیل، کە هەندێکیان ئەفسەری پلەبەرز بوون، بەڵام تەنیا ژمارەکانی نوسیوە بە نووسین نەینوسیوە، بۆیە دوورنییە هەڵەی لە ژمارەکەدا کردبێ.

هۆشمەند دەڵێت:" ئێمە لەخێڵی حەمە بووین دەبابەو سەیارەو سەربازی زۆرمان بینی لەلای شیرەمەڕو بەری بێلانبێ وە بەرەو خورماڵ دەهاتن بۆیە گومانمان وابوو هی عێراقیبێ خۆمان کۆکردەوەو، بەڵام ئەو پاسدارەی خاوەنی جیهازبوو پێی ووتین هی خۆمانن، ئەنجا ئێمە زانیمان لەماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا ڕێگاکەیان لێکداوەتەوە هەروەها ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦، کە بۆمبارانی هەڵەبجەکرا، حەمید ئەفەندی لەکەرەجالەوە بەجیهاز ئاگاداری کردین هەوالی ناوشار بزانیو ئاگاداری بکەین ئێمەش چووینە ناوشارۆچکەی سیروان لەوێ زانیمان کیمیایی ڕژاندوە بەسەر شارو دەوروبەریدا".

عێراقییەکان لە گرتنی هەڵەبجەو ناوچەکەدا خۆیان زۆر کەمتەرخەم بوون، چونکە دەزگا هەوالگری و سەربازییەکان لە ناوچەکەدا ئاگاداری سەرو خۆیانکردبوویەوە، کە ئێران نیازی هێرشکردنە سەر شاری هەڵەبجەی هەیە، بە بەرچاویانەوە ڕێگای گوزێڵ بۆ لانەوان، کە ئاوایییەکی ئێرانە لە

---

[1] –ئەم هاوکێشە ژمارەییە بەم جۆرەیە ؛ ئیسلام، یان مێژووی کۆچی یان شمسی مانگی ٦٢١/٢/٢١ واتە شەش سەدوبیست ویەک ساڵ و دوو مانگ وبیست و یەک ڕۆژ دوای ساڵنامەی زایینی مەسیح هاتووە. ئەگەر مێژووییەکی زایینیت لەبەردەستدا بوو ویستت بیکەیت بە کۆچی یان خۆری مانگی، ئەوا دەبێت ئەم مێژووەی سەرەوەی لێ دەربکەیت. ئەگەر مێژووییەکی شمسی مانگیشت هەبوو ویستت بیکەیتە زایینی ئەوا هەمان مێژووی سەرەوەی لەگەڵ کۆ ئەکەیتەوە. بۆ وێنە ئەتەوێ بزانی مێژووی میلادی ٢٠١٤/٢/٢٠ ئەکاتە چەندی خۆری مانگی، ئەو کاتە ٦٢١/٢/٢١ لێدەرکە ئەکاتە ١٣٩٢/٩/٩٩، ئەوکات ٩٩ڕۆژەکە ئەکاتە سێ مانگ و نۆ ڕۆژ، سێ مانگەکە ئەخەیتە سەر نۆ مانگەکە ئەکاتە ١٢ دوانزە مانگ، واتە ئەبێتە ١٣٩٢/١٢/٩.

کەناری ڕووباری سیروان دا لە بەرامبەر دەشتی سازاندا کاری لەسەر دەکرا، بەهەمان شێوە ڕێگای ملەخورد ـ وشکەناو لە پشتی خورماڵ بە ئاشکراو بە بەرچاوی هێزەکانی عێراقەوە کاری تیادا دەکرا.

بۆ سەیرکردنی ئەم ڕێگایە چەند ڕۆژ بەر لە هێرشەکە لیژنەیەکی هەوالگری سەربازی عێراق سەردانی شارۆچکەی خورماڵ یان کردبوو، لە نزیک ڕێگای خورماڵ بۆ ئاوایی ڕۆستم بەگ لە دەستی چەپی ڕێگاکەدا بەرەو ئاوایی دێکۆن بە دووربین سەیری ئەو بیلدۆزەرو شۆفلانەیان کردووە، کە سەرگەرمی سازکردنی ڕێگاکە بوون بۆ نێو خاکی عێراق.

یەکێک لە ئەفسەرەکان بانگ دەکاتە سێ پیاوی دانیشتووی ئۆردووگاکە، کە ئەوانیش لەو دەشتەدا سەیری ڕێگاکە دەکەن، پیاوەکان دەچنە لایان، یەکێکیان حاجی کەرەمی خەڵکی ئاواییهانەی دن دەبێت، ئەفسەرەکە دەڵێت: کامتان سەربازیتان کردووە، حاجی کەرەم دەڵێت من سەربازیم کردووە، پێی دەڵێت: ئا بەم دووربینە سەیری ئەو ڕێگا بکە ئێران دەیهێنێ بۆ پشتی خورماڵ، حاجی درێژ بۆی ئەکەوێو هەردوو ئانیشکی ئەخاتە سەر زەوی و بە دووربینەکە سەیری دەکات، ئەفسەرەکە دەڵێت ئەها ئەوە زۆر باشتر لێی ئەزانێ حاجی لە سەیرکردنەکە دەبێتەوە، ئەفسەرەکە دەپرسێ حاجی بە چەند ساڵی تر ئێران دەتوانێ ئەو ڕێگا بداتەوە لەو ڕێگای ئێمە؟ حاجی دەڵێت: سێ ڕۆژی تر.

فەرماندەی لیوای ٤٣ی عێراقیش، کەلەم شەڕەدا دیل کرا لە وتەکانیدا لای ئێرانییەکان باسی ئەوەدەکات، کەچۆن کەمتەرخەم بوون، ئەو دەڵێت:" یەک مانگ بوو دروستکردنی ڕێگا لەبەر چاومان بوو، بەڵام بەجدی نەمان گرت تامن لە ڕۆژی دووەمی هێرشەکەدا پەیوەندیم لەگەڵ فەرماندەی فەیلەقی یەکدا گرت، وتم ئەمە هێرشە سەرەکیەکەی ئێرانە،بەڵام ئەویەکەمجار دانی پێدانەنا، بەڵام ڕۆژی سێ هەم پشتگیری لە ڕاکەی من کرد".

ئەحمەد قەدەفەری یەکێک بووە لە بەرپرسەکانی سۆشیالیست لەو سەردەمەدا سەبارەت بەو هێرشەو بەشداری کردنیان، دەڵێت:" من بریندار بووم لە ملەخورد لەگەڵ ئەوکەسانەی ڕەسەدبوون بۆ تۆپبارانی ناوچەکە مابوومەوە کاکەحەمەی حاجی مەحمودو هێزێکی پێشمەرگە، کە ژمارەیان نزیکەی ١٠٠ پێشمەرگە دەبوو لەگەڵ نزیکەی ٤٠ پاسدار شەوی

١٢لەسەر١٩٨٨/١٣ چوونە خوارەوە بۆئەوەی هێرشەکە دەستپێکرد پردی زەڵم ببڕن، ئەم هێزە ڕۆژی ٣/١٣ لە گوندەکانی دۆڵاشو قاجردا مابوونەوە شەوەکەی لەناو سەیدسادق تەقەیان لە چەند سەیارەیەکی سەربازی عێراق کردبوو، هێزێکی تری سۆشیالیست لەگەڵ نوری حەمەعەلی و ڕەمەزان دێ کۆنیدا هەرهەمان شەو چووبوونە خوارەوەو لە گوندەکانی شەشکو تەپی سەفادا مابوونەوە. کاتێک ئێران لەگەڵ دەستپێکردنی هێرشەکەدا تۆپبارانی دەشتی شارەزووری دەکرد چەند پێشمەرگەیەکی لە هێزەکەی کاکەحەمەی بریندار کرد لەوانە عەتا سەراوی و مەحمود گردی شەریفی و برایم قاجری".

قەدەفەری لەسەری دەڕواتو دەڵێت:" پردی زەڵم لەلایەن قەرارگای ڕەمەزان و هێزەکانی پێشمەرگەوە نەگیرا تا ڕۆژی١٩٨٨/٣/١٥ هێزی سەربازی ئێران سەر بە ئەرتەش لە ڕێگای ملەخوردەوە گەیشتە ئاوایی شیرەمەڕو دەبابەو مودەڕەعەشیان پێ بوو پردەکەیان بڕی".

هەرلەبارەی هێزەکەی سۆشیالیستەوە عەلی ئەحمەد سەلیم، عەلی بچکۆل یەکێک لە فەرماندەکانی ئەو هێزە بووە، لەگەڵ کاکەحەمەدا، دەڵێت:" شەوێک پێش هێرشەکە نزیکەی ٥٠ پێشمەرگەو ٢٠ پاسدار چووینە خوارەوە، هەرئەو شەوە هێرشمان کردە سەر ئۆتۆمبێلێکی سەربازی لەناو سەیدسادقدا، ڕۆژی هێرشەکە ئێمە لە دۆڵاشو قاجرو گردی شەریف بووین، چەند پێشمەرگەیەکمان بە تۆپی ئێران برینداربوون". ئەو دەڵێت:" ئێمە لە ڕۆژی ٣/١٣ دا لە قاجربووین بەیانییەکەی پردی زەڵمیان تەقاندەوەو هێزێکی زۆری ئێران لە ڕێگای ملەخوردەوە هاتە شیرەمەڕ بە دەبابەو سەیارەی زۆرەوە".

هەروەها دەڵێت( ئەو ڕۆژەی پردەکەیان تەقاندەوە هێزێکی زۆری جاش و جەیشی عێراق لە ڕێگای تەپەتۆڵەکەوە هاتن بەرەو سەیدسادق برۆن، لەناو قاجردا ئێمە خۆمان لێکردن بە فەوجێکی جاشی عێراق، کەس بەکەس نەبوو، ئەفسەرێکی پلە بەرزیان لەگەڵدابوو وتمان فەرماندەی فەوجەکەمان تۆی دەوێت دورمان خستەوەو دەمانچەو، کەلوپەلەکەیمان لێ کردەوە ئینجا تەقو تۆق دروستبوو، چەند سەربازێک کوژران و پاسدارێکی ئێرانیش کوژرا، برایەکی پاسدارە کوژراوەکە بە ناوی گەنجی ١٠ سەربازی عێراقی لە تۆڵەی براکەی کوشتەوە بەرپرسی پاسداران لەم هێزەدا گولزارە

سوورو گەنجی بوون". عەلی دەڵێت:" جاشو سەربازێکی زۆرمان ئازادکردنو نزیکەی ١٥٠ کەسیشمان $\frac{5}{16}$بە دیلی لەگەڵ خۆمان هێناو شەوی ١٣لەسەر١٤/١٩٨٨ لە تەپەتۆڵەکەوە گەڕاینەوە بۆ ئەحمەدئاوا. عەلی ئەوەشی گووت: کە ئەوەندە هێزە هەڵهاتووەکەی عێراق زۆربووە لە تەپەتۆڵەکەوە هاتوون بەرەو سەیدسادق بڕۆن ئێمە لەناویاندا ونبووین و زۆرکەس پرسیاری لێ دەکردین ڕێگای سەیدسادق کامەیە ئێمە ئاماژەمان بۆ هەڵەبجە دەکرد ئەیان گووت نا ئەوە هەڵەبجەیە لەوێوە هاتووین).

عەلی هەر لەمبارەوە دەڵێت:( زۆرکەس لە جاش و خەڵک و سەربازی عێراقیمان ڕێگری نەکردووەو ڕۆیشتوون، دەڵێت: هەرئەو ڕۆژە ئێوارەکەی عەبدولڕەحمان تریفەیی و کۆمەڵێکی زۆر چەکدارمان بەرداو چەکەکانیشمان دانەوەو وتمان بڕۆن، عەلی ئەڵێت پێیان وتین خالید ئەحمەد خالیدە کەچەڵفەرماندەی فەوجی سوک لەگەڵمان بووە لە گۆماوی بکاری تەپەتۆڵەکەدا خنکاوە، لە کۆتایی قسەکانیدا ووتی: ملازم خالد، کەئەفسەرێکی ڕژێم بووە لە هەڵەبجەدا، عەلی سالح ناوێک، لە شارۆچکەی سیروانەوە بەرەو سەیدسادق دەریکردووە).

# پاشەکشەی یەکێتی
# لە دۆڵی جافایەتی

لەناوەڕاستی مانگی شوباتی ١٩٨٨دا هێزێکی گەورەو بێشوماری عێراق لە سوپاو جاش، بەپاڵپشتی سەدان تانک و زرێپۆش و سەدان تۆپی قورس و سوک و کاتیۆشاو فڕۆکەی جەنگی سیخۆو کۆپتەری سەمتیەوە هێرشی کردە سەر ناوچەی سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستانی لە دۆڵی جافایەتی، یەکێتیش هێزێکی لە هەموو سنوورەکانەوە کۆکردبووەوەو لە سنوورەکەدا ڕووبەڕووی هێرشەکانی سوپای عێراق دایمەزراندبوو، هێزەکانی عێراق پێکهاتبوو لە: فەیلەقی ٥ پێنج و ١ یەک و ٢٠بیست لیوای دیکەی لە فیلەقەکانی تری سوپای عێراق.

دەرەنجام شەڕێکی گەورەو گران و نا بەرامبەر، کە چەکی کیمیایشی تیادا بەکارهێنرا لە نێوان هەردوولادا ڕوویدا، سەرپەرشتی شەڕەکە لەلایەن سەدام حسێن خۆی و عەلی حەسەن مەجیدو عەدنان خەیرو لاوە سولتان هاشمەوە بوو، نزیکەی یەک مانگ شەڕ لە نێوان هێزی پێشمەرگەو سوپای بەعس دا بەردەوامبوو، بەڵام دواجارو دوای چەند ڕۆژێک لە دوای کیمیابارانی هەڵەبجە بڕیاردرا هێزی پێشمەرگە پاشەکشەبکات.

پێشتر کە بڕیاربوو هێرش بکرێتە سەر هەڵەبجە،بۆچوونەکان وابوون کەعێراق هێز لەم بەرەوە بەرەی دۆڵی جافەتی وسەر سەرکردایەتی یەکێتیی پاشەکشە پێ دەکاتو بەرەو هەڵەبجەی دەنێریت، بۆیە بەگرتنی هەڵەبجە بۆماوەیەکی کاتی ورەی هێزەکان و خەڵکی ناوچەکە بەرز بووەوە، بەڵام بەکیمیابارانکردنی هەڵەبجەو، کەم نەکردنەوەو پاشەکشەپێ نەکردنی هێز لەم بەرەوە بۆ لای هەڵەبجە، ورەی خەڵکی ناوچەکانی دۆڵی جافایەتی و قەرەداغ و هێزی پێشمەرگەو سەرجەم ناوچەکە ڕزگارکراوەکانی تری ژێردەستی پێشمەرگە لاوەاز وشپرزە بوون، لە شەڕی یەک مانگەی بەناوبانگ بەشەڕی

سەرکردایەتی، نزیکەی ٨٠ پێشمەرگەو کادرو فەرماندەی قارەمانی یەکێتیی، لەوانە مامەڕەزای فەرماندەی تیپی ٦٣ی جوتیاران بوونە قوربانی.

سوپای عێراق نزیکەی ٨٠٠٠کوژراو برینداری هەبوو، کە نزیکەی ٥٠٠ کەسیان ئەفسەری پلەداری جۆراوجۆربوون، لەگەڵ تێکشکاندنی چەندین چەکی جۆراو جۆرو مودەڕەعەو ناقیلەو سەیارەو لێدانی چەند فڕۆکەو کۆپتەرێک لەگەڵ بەدیلگیرانی سەدان ئەفسەرو سەرباز.

بەڵام بەلای منەوە پێشبینییەکی دروست و ڕێک، کە لەو سەردەمەداو لەکاتێکی ئاوادا زۆر گرنگو جێی سەرنج بوو تائێستاش هەیە، ئەم پێشبینییەی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستانە، کە ئەمە دەقەکەیەتی و برگەی کۆتای بوو لە ڕوونکردنەوەکەدا لە ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستاندا ب لاوەکرایەوە:" بەم بۆنەیەوە ئاگاداری جەماوەری میللەتەکەمان دەکەین ئەگەرچی دوژمن بەنرخێکی گران سەرکەوتنێکی بچووکی بۆگرتنی ناوچەیەکی جوگرافی تەسک بەدەستهێنا، بەڵام دلنیاتان دەکەین، کەئەم شەڕە خالی وەچەرخانێک دەبێت لە جەنگی ٢٧ ساڵەی گەلی کوردو سوپای عێراقدا، بە قازانجی گەلەکەمان و سەرەتای پاک کردنەوەی یەکجاری خاکی کوردستان دەبێ لە هێزی چەپەلی داگیرکەری بەعس، کەڕۆژی لە گۆڕنانی نزیک بۆتەوە".

من بۆخۆم ئەو ڕۆژەی گوێم لەم بۆچوون و پێش بینییەبوو لەگەڵ هاوڕێم شەهید نیازی هەورامیدا سەیرێکی یەکترمان کرد، من ئەمەم تەنیا بە ڕاگەیاندن ئەزانی، بەڵام بەتێپەڕبوونی کاتێکی کەم ئەم بۆچوونو پێش بینییەی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان هاتە دی و ڕاستو دروست دەرچوو.

لە دوای کارەساتەکەی هەڵەبجە یەکێتیی بەشێوازێکی بەرنامە بۆ داڕێژراو ناوچەکانی دۆلی جافایەتی و بنکەو بارەگاکانی سەرکردایەتی چۆل کردو بەجێهێشت، هێزەکانی ڕژێم بەریان بەرەڵابوو، بەتایبەت جاشو خۆفرۆشان، بۆتاڵان و کۆکردنەوەی پروپیتال و شرەخۆری لە بنکەو بارەگاو گوندەکاندا، ببووە فڕکان فڕکان و سەر بەکولانە کردنی قەلو مریشکو بردنی مەڕو بزنی گوندنشینانی هەژار. ڕۆژی دواتریش واتە لە١٩٨٨/٣/١٩

وەک تۆلەکردنەوەیەکی هەڵەبجەو سەرکەوتنی سوپای عێراق بەسەر هێزی پێشمەرگەدا، سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکان بەیانێکی لە ڕادیۆو تەلەفزیۆندا ب لاوەکردەوە لەگەڵ ئەمەشدا هەمان ڕۆژ بروسکەی سولتان

هاشم ئەحمەد فەرماندەی ئۆپەراسیۆنی ئەنفال پیرۆزبایی بۆسەدام حسێن نارد.
ڕاگەیەنراوەکەی ڕژێم پاشەکشەی یەکێتی و دزینی قەل و مریشک و بە تالانبردنی پرۆپیتالی مالان و گەلەو گۆتالی گوندنشینانی هەژاریان کردە دەسکەوت بۆ عێراق سەرکەوتنی گەورە، بەوبۆنەوە ئاهەنگ و هاتوو هاوار دەستی پێکرد.

دەقی بەیانی فەرماندەی گشتی هێزەچەکدارەکان
لەگەڵ دەقی بروسکەکەی سولتان هاشم بەم بۆنەوە.

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان
وەک هەر دەستدرێژکارێکی چاوچنۆک هێزەکانی خومەینی زایۆنیست بەپشتیوانی هەندێک لەوانەی خیانەتیان لە نیشتیمانو خەڵکی ناوچەی باکووری عێراق کرد، ئەوانەی کەواگەلی کوردی بەئەمەک لە ڕیزەکانی خۆیانیان وەدەرناون ئەوکەسانەی، کەخزمەتی ئابرووبەرانەیان بەبێگانە کردووە یەک لەو کارە پرشەرمەزارییە یان هاوکاریکردنی هێزەکانی داگیرکەربوو بۆئەوەی بێنە گوندەکانی ناوچە سنوورییەکانی لای هەڵەبجەوە لە پارێزگای سلێمانیدا.
وەک گوزارشتێک لە خواستو ئارەزووی گەلی عێراقی مەزن هێزە چەکداری قارەمانەکانمان بەهاوکاری نیشتیمانپەروەرانی بەشەرەفی گەلی کوردمانو لە وەلامی ناپاکی ئەم تاقمە سەر لێشێواوەدا، هێزەکانی بەدری قارەمان، فەعقاعی قارەمان، موعتەسەمی قارەمانو ئەو هێزانەی بەشدارییانکردووە، لە هێزە چەکدارەکانمانو فەوجەکانی بەرگری نیشتیمانی پرۆسەی ئەنفالیان ئەنجامدا بەسەرپەرشتی فەریق ڕوکن سولتان هاشم، کەبەشێوەیەکی کاتی ئەم ئەرکەی پێسپێدرا، سەرەڕای ئەرکو کارەکانیتری هێزەکانمان هێرشیان کردە سەر بنکەو بارەگاکانی یاخیبوان، کەوا جەلال تاڵەبانی خیانەتکارو بەکرێگیراوی ڕژێمی ئێرانو دوژمنی عەرەبو کورد ڕابەرایەتیاندەکات لە ناوچەکانی سەرگەڵوو بەرگەڵوو زێوەداو هەروەها لە ناوچە شاخاوییە سەختەکانی سلێمانیدا.

لەکاتژمێر ١٣:٠٠ی ئیمڕۆداو لە پاش نەبەردییەکی ئازایانەو تۆڵەسێن لەگەڵ خیانەتکاراندا بارەگای یاخیبوون داگیرکرا، فەرماندەی ئەو هێزەی پاسی بارەگای یاخیبوانی دەکرد لەگەڵ ژمارەیەک خیانەتکارو کەسانی سەرلێشواودا دەستگیرکران. بەپشتیوانی خواو خواستی پیاوە دلگەرمەکانی عێراق بەعەرەبو کوردەوە ئەمانە ژمارەیەکی زۆریان لێکوژراو ئەوانیتریش بەشەرمەزاری هەڵاتن.

ئەمەیە بوێری و دلسۆزی بێوێنە ئەمەیە ئەو ململانێیەی تەواوی جیهان لێی سەرسامە ململانێی گەلی سەدام حوسێنی سەرکردە بەعەرەبو کوردەوە لەپێناو خزمەتی نیشتیمانییدا خۆشەویستی و دلسۆزیان بەخشیە سەرکردەی مەزنیان، کەهێمای سەرکەوتنو ناونیشانی شکۆمەندییانە، گەلی ئێمە تەواوی ئەو خیانەتکارانەی لە ڕیزەکانی خۆی توورداوە، ئەوانەی کەوا بەنرخێکی هەرزان خۆیان بەدوژمنی بێگانەی چاوچنۆک فرۆشتووە.

سوپاس بۆخودا بۆ ئەو سەرکەوتنەی....ڕووڕەشی و شەرمەزاریش بۆ سەرشۆڕان.

ئیمزا
فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان
١٩ ی مارتی ١٩٨٨

دەقی بروسکەی سولتان هاشم.

بۆ سەرۆکی فەرماندە مهیبی ڕوکن سەدام حسێن خوا بیپارێزێ.

لە: لیوا ڕوکن سولتان هاشم ئەحمەد فەرماندەی ئۆپەراسیۆنی ئەنفال.

مژدەی سەرکەوتنییەکە بەشداربووەکانی ئۆپەراسیۆنی ئەنفال بەسەر پاشماوەی زۆرداری بەکرێگیراوانی ئێرانتان دەدەمێ، کەبە پشتوپەنای خوا بارەگاکانی تێکدەران لە ناوچەکانی سەرگەڵوو،بەرگەڵوو، زێوە، مەولان، قۆمرغان، کانیتوو، هەلەدن، چا لاوەا، یاخیان، چۆخماخ، یاخسەمەر، قزلەرو ناوچەکانو بەرزاییەکانی دەوروبەری لەلایەن پیاوە ئازاکانتان لە ڕۆلەکانی قادسییەو یەکە سەربازییەکانو خۆنەویستان لە ڕۆلەکانی گەلی کوردمان لە فەوجەکانی بەرگری نیشتیمانی، کەبڕیاریاندابوو ئەو هەرچی و پەرچییانەی دەستیان لەگەڵ بێگانەکاندا تێکەڵکردبوو بۆ پیسکردنی خاکی نیشتیمان ڕیشەکێش بکەن ژمارەیەکیان لێکوژراو ئەوانیتریشیان ڕاونراون بۆ لای گەورەکانیانو دەستبەسەر دەزگای ئێزگەی بەکرێگیراوانو ژمارەیەک لە چەکو تەقەمەنی و کەلو پەلو ئۆتۆمبێلدا گیرا.

گەورەم سەرۆکی فەرماندە خوابتپارێزێ.

سەربازە پاڵەوانەکانتان لە پیاوانی پیادە، زرێپۆش، تۆپخانەو فڕۆکەوانی سەربازی و ئەندازیاری و بەشەکانیتری فەرماندەی هێزەکانی بەرگری نیشتیمانییەکەمو فەرماندەی هێزەکانی بەدرو فەرماندەیی هێزەکانی قەعقاعو فەرماندەیی هێزەکانی موعتەسەم بەهاوکاری و پشتیوانی تەواوی فەرماندەیی فەیلەقی یەکی پاڵەوانو فەرماندەیی فەیلەقی پێنجی پاڵەوانو بەڕێنمایی ڕاستەوخۆی جێگری فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانو سەرۆک ئەرکانی سوپاو ئەندامانی فەرماندەیی گشتی هێزە چەکدارەکانو بەشداریکردنی ڕێکخستنی حزبی فەرعی ڕەشیدی سەربازی.

خوا هەموو لایەک بۆ خزمەتکردنی عێراقی خۆشەویستمان بەسەرۆکایەتی بێهاوتای ئێوە سەرکەوتوو بکات. بەڵێنتان دەدەینێ بەردەوامبین لە هەلکوتانە سەر ئەو تاقمە سەرلێشێواوە تا دەگەڕێنەوە لای دەنگی هەق.

لیوا ڕوکن سولتان هاشم ئەحمەد

فەرماندەی ئۆپەراسیۆنی ئەنفال ١٩/ ئازاری / ١٩٨٨

# لێدانەکانی چەکی کیمیایی لەلایەن عێراقەوە

یەکەم: بەکارهێنانی چەکە کیمیایی دژی گەلی کوردو پێشمەرگە لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا، بەم شێوەی خووارەوە لەلایەن حکومەتی عێراقەوە.

لە کۆتایی مانگی ١٩٨٨/٢دا، لە سەر گەڵوو، بەرگەڵوو، بە تۆپ باران کردن.

١٥تا١٩٨٧/٤/١٧ سەرگەڵوو، هەلەدن، کانی توو، بەرگەڵوو، ئاوەژێ، سێرەوان، نولچەکە چنارێ، یاخسمەرو چا لاوەای بوردومان کرد.

لە١٩٨٨/٤/١٨ ناوچەی قەرەداغ و ئاواییەکانی گۆپتەپەو عەسکەری بوردومان کرد.

١٩٨٧/٤/١٦ بالیسان و شێخ وەسانان، کانی بەرد، زینی بەلالوک، چیای دەرشیری، ساوسێوەکانی بوردومان کرد.

لە ١٩٨٧ زێوە، ئامێدی، سەرسیر، سینیا، نێروە، چیایی ڕەشک، گوهەرزکا، خراب، بەرچێ، کانێ، دێرێ، دەرگەنێ، سگیری، سەرگەلی لەبادینان بوردومان کرد.

١٩٨٨/٣/١٦ شاری هەڵەبجە و شارۆچکەکانی خورماڵ و سیروان وئاواییەکانی ناوچەکەی بوردومان کرد هەزاران شەهیدو بریندااری لێکەوتەوە.

١٩٨٨/٨/٢٥ لەبادینان، بەرواری باڵا، بازێ و گەلێ بازێ، ئامێدی بانکا، نێرەو ڕێکان، هێت ویت، شیڤێ، کانیا پینگ، گارە،زێوێ گەلێ کتوکێو ناوچەی مزووری بەرۆژی ڕوبێ شین، باڵا، باسکا، ئاڤۆکی، بیمناش، ئاکرێ، پریسە، جزگیر، سوارو سپیندار، هیران و نازەنین، خەتێو وەرتێ، برجینێ، زیناڤا، دبانکێ بوردومان کران.

١٩٨٨/٨/٢ سیرێ زەروا، خواکورک، ئارێ، بێمزرتە بۆردومان کران.

١٩٨٧ سێوسێنان، دوکان بەلەکجار، وەلیان، جافەران بوردومان کران و لە ڕۆژی
١٩٨٨/٣/٢٣ کیمیابارانکردنی ئاوایی شناخسێ، کوشتنی ٢٥ کەس و برینداربوونی ٤٠٠ کەسی لێکەوتەوە.
١٩٨٨/٥/١٧ دۆلی مەلەکانی بوردومان کرد، لەئاواییەکانی بلێ خوارو سەروو، کەندۆر، سماقولی وگۆرە شێر. ٨١ شەهیدو ٣٠٠ بریندار ی لێکەوتەوە.
لە ٣/٣٠ /١٩٨٨دا لە ناوچەی قەرەداغ و سەرچیای زەردە.
دووەم: بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی سوپای پاسداران و خەڵکی کوردستانی ئێران
بۆمبارانی کیمیایی خورەم شەهر لە ٢٠ی کانونی یەکەمی ١٩٨١.
بۆمبارانی کیمیایی ئابادان بەتۆپخانە لە ٢٢ی کانونی یەکەمی ١٩٨٢.
دووجار لێداز و بۆمبارانی پیران شار بەفڕۆکە لە ڕۆژی ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٣دا
بۆمبارانی شاری مەریوان بەگوللە تۆپی کیمیایی لە ٢٥ی تشرینی یەکەم ١٩٨٣دا.
بۆمبارانی کیمیایی هۆری الهویزە بەفڕۆکە لە ٢٧ی شوباتی١٩٨٤دا، کەبووە هۆی مردنو برینداربوونی ١١٠٠ کەس.
بۆمبارانی هەوایی کیمیایی سەربازگەی حەمید لە ٢٨ی نیسانی ١٩٨٥دا ١٠٠٠ کوژراو برینداری لێکەوتەوە.
بۆمبارانی ڕێگای فاو- بەسرە لە ١٣ی شوباتی ١٩٨٦دا ٨٥٠٠ کوژراوو برینداری لێکەوتەوە.
٨_ بۆمبارانی هەوایی کیمیایی شاری مهران لە ٢٥ی شوباتی ١٩٨٦دا ٧٥٠ کوژراوو برینداری لێکەوتەوە.
٩بۆمبارانی هەوایی کیمیایی خورەم شەهر لە ٢٥ ئەیلولی ١٩٨٦دا ١١٦٠ کوژراو برینداری لێکەوتەوە.
١٠_بۆمبارانی هەوایی کیمیایی شاری سۆمار لە ٧ کانونی دووەمی١٩٨٧دا ٢٠٠ کوژراو بریندار لێکەوتەوە.
١١ _ بۆمبارانی هەوایی کیمیایی ڕێگای خورەم شەهر ٣٠٠ کوژراو بریندار لە ١٠ی کانونی دووەم ١٩٨٧.

١٢بۆمبارانی هەوایی کیمیایی ناوچە مەدەنییەکانی سەردەشت لە چوار ناوچەداله ٢٥کانوونی دووەمی١٩٨٧دا، ٨٠٢٥ کوژراو برینداری لێکەوتەوە.

١٣_بۆمبارانی ئاوایی قەلاجی لە ناوچەی مەریوان لە ٢٢ی مارسی ١٩٨٨دا، کە نزیکەی٤٥٠ کوژراو برینداری لێکەوتەوە، کەهەموو هاولاتی مەدەنی بوون.

١٤_ بوردمانی کیمیاوی شنۆو رەبەتو ڕاژان لەسالی ١٩٨٨.

١٥ - بوردومانی کیمیاوی سەردەشت لەسالی ١٩٨٨.

## سەرچاوەکانی
## چەکی کیمیایی عێراق

سەرچاوەی دابینکردنی کەرەستەی چەکی کیمیایی عێراق بەگشتی دوو ولات بوون، ئەوانیش ولاتانی بەریتانیاو ئەلمانیا بوون، جگە لەمانەش بەلگەو دیکیۆمێنتی زۆر هەن لەسەر ناردنی کەرەستەی چەکە کیمیاییەکان بۆ عێراق لەلایەن ولاتانی: ڕووسیا، ئەمریکا، چین، یۆگسلافیا، بەلجیکا، ئیتالیا، ئیسپانیا، هۆلەندا، ئەفریقای باشوور، شیلی.

کنت تیمرمن لێکۆلەرو نوسەری ئەمریکایی لە کتێبەکەیدا بەناوی سەودای مەرگ، کە لەسالی ١٩٩١ ب لاوەبۆتەوە بابەتێکی گرنگی ئاشکرای کردووە کە:

کارخانەی ئەلمانیا کۆلمب شەش هێلی دروستکردنی چەکی کیمیایی جیاجیای بەناوەکانی: ئەحمەد، محەمەد، عیسی، عانی، مەدای و قاچی لە سامەڕا دروستکردووە، یەکەمیان لەسالی ١٩٨٣وە دەستی بەکارکردووەو دوا کارخانەشیان لەسالی ١٩٨٦ تەواوبووە، کە گازەکانی: خەردەل، ئەسیدپروسیک، سارین، تابوونی تێدا دروست دەکراو دەیانکردە ناو گوللە هاوەن، ساروخ، گوللە تۆپەکانەوە. بێگومان ئەمە کارخانەیەکی گەورەی دروستکردنی چەکی کیمیایی بووە لە جیهاندا.

ئەو ولاتو کۆمپانیاو کەسایەتیانەشی هاوکاری عێراق بوون بۆ دروستکردنی چەکی کمیایی یان پێدانی کەرەستەی خاوی ئەم گازانە یان گازە ئامادەکراوەکە بۆ جێکردنەوەی لەناو گوللەتۆپو ساروخو ناپالەکاندا، سەرەڕای سکا لاوە سەدان بەلگەو چاوپێکەوتنی قوربانیانو ئاشکرابوونی ئەو هەموو بەلگەنامەو دۆکیۆمێنتانەی دوای ڕووخانی ڕژێمی عێراق، وەک پێویست دابینکەرانی ئەم چەکە هیچ جۆرە لێپرسینەوەیان لەگەڵ دا نەکراوە. تەنیا فرانس ڤان ئانرات، کە لە ڕۆژی ٢٠٠٥/١٢/٢٣دا لە دادگای لاهای بەپێی مادەکانی ٤٨و ٥٧ بە ١٥ سال زیندانی حکومدرا. بەکارهێنەرانی چەکەکە دژی گەلی کورد بەتایبەت لە پرۆسەی ئەنفالو هەڵەبجەدا، هەروەها بەکارهێنانی لە دژی سوپای ئێران و هاولاتیانی مەدەنی ئێرانی لە ماوەی سالانی جەنگی عێراق ـ ئێراندا، تا ئێستا تەنیا چەند کەسێکیان سزادراون، کە ئەوانیش بریتین لە سەدام حسێن و عەلی حەسەن مەجیدی ئامۆزای.

# چەند بەڵگەنامەیەک
# لەسەر بەکارهێنانی چەکی کۆکوژ

بەپێی ئەم بەڵگە نامانەدا دەرئەکەوێ کە ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی هەر لەسەرەتاوە ئاگادار بوون لەوەی کە عێراق چەکی کۆکوژی هەبووە، وەئاگاداریش بوون لەوەی کە چەندجارو لە چکاتێکدا بەدژی کوردو ئێرانییەکان بەکاری هێناوە، هەروەها بەوردی ئاگاداری پرۆسەی ئەنفال و وێران کردن وسووتاندنی کوردستان بوون. بەڵام لەبەر بەرژەوەندی خۆیان لەعێراق و ناوچەکەدا چاویان لەئاست ئەوهەموو تاوانانەدا کوێر بووە.

<u>یەکەم:</u> لە باڵیۆزخانەی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لە رۆما بۆ وەزارەتی دەرەوە ١٢٨١.

بابەت:بەرنامەی ڕاگواستنی خەڵک لەلایەن دەولەتی عێراق حوزەیرانی ١٩٨٨.

بۆ زانیاری: US INS WASHDC

ئاماژە بە:

أ ـ تیلیگرامی ٢٠٠٤٧٤١ ی وەزارەتی دەرەوە بۆ باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە رۆما.

بـ تیلیگرامی ١٣٤٠٦ی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە رۆماوە بۆ وەزارەتی دەرەوە.

١ـ سوپاستان دەکەین، کە وەڵامی گونجاوتان بە داواکارییەکەی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە رۆما دایەوە، بۆئەوەی لەبارەی بەرنامەی ڕاگواستنی خەڵک لەلایەن حکومەتی عێراقەوە پەیامتان بۆ بنێرین.

٢ـلە وەڵامی پەرەگرافی ٢ی تیلیگرامی ٢٠٠٤٧٤١ ی وەزارەتی دەرەوە، باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە رۆما داوا دەکات حساب بۆ زانیارییەکانی ناوە رەشکراوەکەوە لە پەیوەندی لەگەڵ بەرنامەی ڕاگواستنی خەڵک لەلایەن دەولەتی عێراقەوە بکرێت، چونکە زانیارییەکانی دەربارەی دەستگیرکردنی سەرەڕۆیانەو ئەشکەنجەدانی خەڵک بەتەواوی باوەڕ پێکراوەوە لەگەڵ ڕاپۆرتی سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکانی دیکە یەکدەگرێتەوە.

زانیاریەکان نیشانی دەدات، کە سەرجەم شارۆچکەکانی کوردستان لە سەروبەندی شا لاوەی کۆنترۆلکردنی پێشمەرگە کوردەکاندا لەلایەن هێزەکانی دەولەتەوە خاپوورکراون، بەگوێرەی زانیارییەکان، کوردەکان بەکۆمەل ڕاگواسراونەتەوەو ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەولەتی بانگەشەی ئەوەی کردووە، کەژمارەیەکی زۆر لە خەلکی مەدەنی لەوانە: خوێندکاران پاش دەستگیرکرانی هەڕەمەکیانە لەسێدارە دراون یان بێ سەروشوێن کراون. ناوە ڕەش کراوەکە، کەسەربازبووە لە سوپای عێراقدا فەرمانی پێدراوە تەقە لە خۆپیشاندەران لە هەولێر بکات، بەلام فەرمانەکەی جێ بەجێ نەکردووە. دەولەتی عێراق هیچ چەشنە نەیارێکی سیاسی قەبول ناکات و بەئەشکەنجەو کوشتن وەلامی چالاکی سیاسی نەیارانی حکومەت دەداتەوە.

لە پەیوەندی لەگەڵ بڕگەی ١٠١ الف ٤٢ دا، بالیۆزخانەی ئەمریکا لە ڕۆما لەگەڵ ئەوەدایە، کەعێراق لەناو لیستی ولاتانی کێشەدار لە NEA نوسینگەی کاروباری ولاتانی ڕۆژهەلاتی نزیکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکادا بمێنێتەوە.

راب

<u>دووەم:</u> لە وەزارەتی دەرەوە واشینتۆن

بۆ سەرجەم ناوەندە دیپلۆماتییەکانی ئەمریکا لە ڕۆژهەلاتی نزیکو باشووری ئاسیا.

بالیۆزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروتو کابولو کونسولخانەی ویلایەتەیە کگرتووەکانی ئەمریکا لە ئالیکسەنددێریا، کەراچی و لاهور.

بابەت: ناوەڕۆکی دیدار لەگەڵ جەلال تالەبانی لە وەزارەتی دەرەوە حوزەیرانی ١٩٨٨.

بۆ زانیاری: سەرجەم ناوەندە دیپلۆماتییەکانی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەورووپاو کونسولخانەی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەدەنە، ئیستانبولو ئیزمیر.

CINCPAC HONOLULU HI

UNCENTCOM MCDILL AFB FL

ئێمە وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەمان ڕێنوێنی کردبوو، کە ئەگەر لە کۆنفرانسە ڕۆژنامەوانییەکەدا لە ١٤ی حوزەیران پرسیاری لێکرا بەم شێوەیە وەڵامبداتەوە:

پرسیار:ئایا کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە لەگەڵ ڕێبەری یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان، جەلال تاڵەبانی دیداریان کردووە؟ ناوەڕۆکی ئەو گفتوگۆیانە چی بووە؟

وەڵام / بەڕێز تاڵەبانی لەکاتی سەردانەکەی بۆ ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا داوای کردبوو چاوی بکەوێت بە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە، بەڕێز تاڵەبانی لە ١٩٨٨/٦/٩ لەگەڵ بەرپرسی بەشی کاروباری وڵاتانی باکووری کەنداو لە ئیدارەی ڕۆژهەڵاتی نزیکو باشووری ئاسیاو هەروەها هەندێ لە کاربەدەستانی پەیوەندیدار بە مەسەلەی ئاوارەکانو مەسەلەی مافی مرۆڤ دیداری کرد.

بەڕێز تاڵەبانی بیروبۆچوونەکانی خۆی لەبارەی دوایین ڕووداوەکانی پەیوەندیدار بە ناوچە کوردنشینەکانی عێراق دەربڕی لەوانە: شەڕەکانی مانگی ئازاری دەوروبەری هەڵەبجە، کە تێدا چەکی کیمیایی دژی دانیشتوانی مەدەنی بەکارهێنراوە.

کاربەدەستانی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا سیاسەتە ئاشکراکانی ئێمەیان سەبارەت بەناوچە بۆ بەڕێز تاڵەبانی دووپاتکردەوە، لەوانە مەسەلەکانی پەیوەندیدار بەمافی مرۆڤو ئەوەی، کە ئێمە کەڵک وەرگرتنی نایاسای لە چەکی کیمیایی شەرمەزار دەکەین. لەبارەی هەڵوێستی ئێمە سەبارەت بە کوردەکان، سیاسەتی ویلایەتەیەکگرتووەکان ئەوەیە، کە کوردەکان دەبێ بەشێوەی ئاشتیخوازانە بگەن بە مافەکانیان لە چوارچێوەی وڵاتانی ئێستای ناوچەکەدا، ویلایەتەیەکگرتووەکان دەست لە کاروباری ناوخۆیی ئەو لاتانە وەرنادات.

ویلایەتەیەکگرتووەکان لەو باوەڕەدایە، کە دەبێت سەرجەم خەڵکی عێراقو ئێران لەوانە کوردەکان لە کۆتایی پێهاتنی جەنگی ئێران - عێراق بەگوێرەی بڕیارنامەی ٥٩٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان سوود وەربگرن، ئێمە درێژە بە هەوڵەکانمان دەدەین بۆئەوەی مەرجەکانی ئەو بڕیارنامەیە جێ بەجێ بکرێت.

پرسیار: گرنگی ئامادەبوونی ئیمرۆی بەڕێز تاڵەبانی لە بەشی OPEN FORUMی وەزارەتی دەرەوە لەچیدایە؟

OPEN FORUM وەزارەتی دەرەوە بەرنامەیەکی سەربەخۆیە بۆئەوەی کاربەدەستانی ئاژانسەکانی کاروباری دەرەوەی ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا لەگەڵ بیروبۆچوونە جۆراوجۆرەکان، کە گەلێکیان نایەکانگیرین ئاشنابن هەموو ئەو شتانە، کە لە OPEN FORUMدا باس دەکرێت تۆمار ناکرێن مەسەلەی هەلبژاردنی ئەو کەسانە، کە تێدا بەشداردەبنو بیروبۆچوونەکانی وەزارەتی دەرەوە یا حکومەتی ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا نییەو ئامادەبوونی بەڕێز تاڵەبانی یان هەرکەسێکی دیکە لە OPEN FORUM بە واتای پشتیوانیکردنی وەزارەتی دەرەوە لە تاڵەبانی نییە.

شۆلتز

سێیەم: لە بالیۆزخانەی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ستۆکهۆلم بۆ:

وەزارەتی دەرەوە، واشنتۆن دی سی ٢٤١٠

بابەت: دواین زانیارییەکانی جەلال تاڵەبانی ڕێبەری کورد لەبارەی شالاوەکانی عێراق دژی کوردەکان.

تشرینییەکەمی ١٩٨٨

بۆزانیاری:

بالیۆزخانەی ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا لە ئەنقەرە، بەغداد، کۆپینهاگن، هلیسینکی، ڕەیکجاویک

UNCLAS STOCKHOLM

١- جەلال تاڵەبانی ڕێبەری یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان لە میانەی گەشتەکەی بۆهەندێ لە وڵاتانی خۆرئاوایی سەردانی سویدی کردووە، تاڵەبانی بە ڕاگەیاندنە گشتیەکانی سویدی گووتووە، کە ٥ پێنج هەزار ئاوایی کوردنشین لە کوردستانی عێراق خاپوور کراوە. هەروەها بەهەوالنێرەکانی گووتوە: لە دوای ئاگربەستی ئێرانو عێراق، دەولەتی عێراق دەستی ئاوەڵا بووە بۆئەوەی سەرجەم هێزە چەکدارەکانی دژی باکووری وڵات تەیار بکات، کە کوردەکان ناوچەی ئازادکراوی گەورەیان تێدا پێکهێناوە. تانکەکانی عێراق لە مانگی ئابی ئەمساڵدا هەولیانداوە هێرش بکەنە سەر ئەم ناوچانە، بەڵام کاتێک، کەهێرشەکەیان لە ئەنجامی خۆڕاگری پێشمەرگەدا شکستی هێناوە

فرۆکەکانی عێراق بەچەکی کیمیایی ناوچەکەیان بۆمباران کردووە بە گووتەی تاڵەبانی دوایین هێرشی کیمیایی ڕۆژی ٥ی تشرینییەکەم لە نزیک شارۆچکەی دوز لە نێوان بەغدادو کەرکوک ڕوویداوە.

٢. تاڵەبانی هەروەها بەڕاگەیاندنەکانی گووتوە: کاتێک ٢٠٠ هەزار کورد بەرەو سنوری تورکیا ئاوارەبوون، گەلێک لە ڕێکخراوە فریا گوزارییە نێونەتەوەییەکان کاردانەوەیان نیشانداوەو هەولیانداوە یارمەتی بنێرن بۆ ئاوارەکان، بەڵام دەولەتی تورکیا نەیهێشتوە ڕێکخراوە فریاگوزارییەکان سەردانی ئۆردووگاکانی ئاوارەکان بکەن. تاڵەبانی ووتوویەتی تورکیا دووڕووی هەیە، لەلایەکەوە دەیەوێت لە ڕێگای قبولکردنی ئاوارە کوردەکان خۆی وەک خێرخواز بەوڵاتانی خۆرئاوایی نیشانبدات، لەلایەکی دیکەوە گووتوویەتی: هیچ شوێنەوارێکی بۆمبی کیمیایی بە لاشەی قوربانیانی ئاوارەکانەوە نەبینیوە، کەوابوو تورکیا بەم شێوەیە یارمەتی ڕژێمی عێراق دەدات.

تاڵەبانی بانگەشەی ئەوەی کردووە، کە بەردەوام زانیارییەکانی لە ڕێگای پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانی لەگەڵ بەرەی کوردستانی لە ئێرانەوە نوێ دەکاتەوەو ڕاگەیاندنەکانی سویدی ئاگادارکردووتەوە، کە ئێران لە ١٥ی تشرینییەکەمدا ڕایگەیاندووە، کە ئەگەر ئاوارە کوردەکانی تورکیا بڕۆن بۆ ئێران، دەولەتی ئێران پێشوازییان لێ دەکات.

٣. تاڵەبانی بە ڕاگەیاندنە گشتییەکانی گووتوە، کە کوردەکان بە بەراورد ١٩٧٥ دۆستی زۆر باشتریان هەیە، یەکێکیش لەو دۆستە نوێیانە وویلایەتەیەککگرتووەکانی ئەمریکایە، کە زیاتر لە وڵاتانی دیکە، کەڵک وەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی شەرمەزارکردووە.

تاڵەبانی بەتایبەت ئاماژەی بە ڕاپۆرتێکی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا لەبارەی ئاوارە کوردەکان لە تورکیاوە کردووە، کە تیایدا بێ هیچ گومانێک ڕوونی کردووەتەوە، کە ئاوارەکان بوونەتە قوربانی چەکی کیمیایی عێراق.

نیوێل

<u>چوارەم</u>: ناوەرۆکی دیداری جەلال تاڵەبانی لەگەڵ کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە لە کۆنفرانسی چاپەمەنی وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە، بەڕێز ڕێدمان ١٤٥.

١٥ی حوزەیرانی ١٩٨٨.

پرسیار: هەفتەی رابردوو چاوپێکەوتنێک هەبوو لە نێوان رێبەری کورد، جەلال تالەبانی و کاربەدەستێکی وەزارەتی دەرەوە ئایا ئێمە دەتوانین بلێین وەزارەتی دەرەوە یان دەولەتی ئەمریکا ناوبژیوانی بۆ چارەسەربوونی ناکۆکیەکانی نێوان کوردەکانو دەولەتی عێراق، یا چ هۆکارێکی دیکە لە پشتی ئەم دیدارەدایە؟

رێدمان/ چاوپێکەوتنەکە لەگەڵ بەرێز تاڵەبانی لەسەر داوای خۆی بوو. تاڵەبانی لەکاتی سەردانەکەی بۆ ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا داوای کردبوو چاوی بکەوێت بەکاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە، لە ٩ی حوزەیران لەگەڵ بەرپرسی بەشی کاروباری کەنداوی باکوور لە ئیدارەی رۆژهەڵاتی نزیکو باشووری ئاسیا دیداری ئەنجامدا.

تاڵەبانی هەروەها لەگەڵ هەندێک لە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە باسی کێشەی ئاوارەکانو کێشەی مافی مرۆڤی کرد.

لەپەیوەندی لەگەڵ کێشەی کوردا، کەجەنابت ئاماژەت پێکرد سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەیە، کەکوردەکان دەبێ هەوڵ بدەن لە چوارچێوەی ولاتانی ناوچەکەدا بەشێوەی ئاشتی خوازانە ئامانجەکانیان بەدی بێنن.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەست وەرناداتە کاروباری نێوخۆی ئەم ولاتانە.

پرسیار / ئایا ئێوە چاوپێکەوتن لەگەڵ تاڵەبانی بەدەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی عێراق نازانن؟

رێدمان: نەخێر.

پێنجەم: شەرمەزارکردنی کەڵکوەرگرتنی عێراق لە چەکی کیمیایی دژی پێشمەرگە کوردەکان.

بەیاننامەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ٨ی ئەیلولی ١٩٨٨.

لە ئەنجامی هەلسەنگاندنی ئێمە لە بارودۆخەکە، بۆ ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا دەرکەوتووە، کە عێراق لە شالاوە سەربازییەکانی دژی پێشمەرگە کوردەکان کەڵکی لە چەکی کیمیایی وەرگرتووە. ئێمە نازانین عێراق تا چ رادەیەک چەکی کیمیایی بەکارهێناوە. بەلام هەرچەشنە کەڵکوەرگرتنێک لەم

چەکانە کاریکی پاساو هەڵنەگرو دزێوە. ئێمە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی کوردەکان شەرمەزار دەکەین، هەروەها بەردەوام عێراقمان شەرمەزار کردووە. بەهۆی کەڵکوەرگرتن لە چەکە کیمیاییەکان دژی ئێران لە شەڕی نێوان ئەو دوو وڵاتەدا ئێمە نیگەرانی قولی خۆمان بەنیسبەت ڕەفتاری دەوڵەتی عێراق دەردەبڕین.

حکومەتی عێراق باش ئاگاداری هەڵوێستی ئێمەیە. هەڵوێستی ئێمە ئەوەیە، کە سوودوەرگرتن لە چەکە کیمیاییەکان بە تەواوی پاساو هەڵنەگرەو قبول نەکراوە. وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەمیانەی دیدارەکەیدا لەگەڵ بەڕێز سەعدون حەمادی وەزیری کاروباری دەوڵەتی عێراقبە ڕوونی باسی ئەم مەسەلەیەی کردووە.

<u>شەشەم</u>: یەکەم لێدوانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەربارەی کیمیابارانی هەڵەبجە

وەزارەتی دەرەوە ١٦/ ئاداری ١٩٩٨

جەیسمس ڕۆبین وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە:

لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨ سوپای عێراق بەچەکی کیمیای هێرشی کردە سەر هەڵەبجە، کە شارۆچکەیەکی کوردنیشینە لە باکووری عێراقو لە ئەنجامدا ٥٠٠٠ پێنج هەزار کەسی مەدەنی کوژرانو زیاتر لە ١٠٠٠٠ دە هەزار کەسیش برینداربوون.

ڕژێمی عێراق تەنیا لەکاتی شالاوەکەی دژی هاوڵاتیانی سیڤیلی کوردی عێراق، کەکۆمەلکوژی هەڵەبجە یەکێک لەوانەبوو، چەکی کیمیای بەکارنەهێنا، بەلکو نزیکەی ٢٠٠٠٠ بیست هەزار سەربازی ئێران لەساڵی ١٩٨٣ تا ١٩٨٨ لەکاتی شەڕی نێوان عێراق ـ ئێراندا لە ئەنجامی هێرشی کیمیاییەکانی عێراق کوژرانو ڕژێمی عێراق نەیگووتووە لە کیمیابارانی هەڵەبجە پەشیمانە، لەڕاستیدا ڕژێمی عێراق داکۆکی لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەکاتی شەڕەکەی لەگەڵ ئێران کردووە،هەروەها بانگەشەی ئەوەی کردووە، کەهەموو نەتەوەیەک مافی ئەوەی هەیە خۆی لە بەرامبەر داگیرکاریدا بپارێزێت. ئەمە لەکاتێکدایە، کە پرۆتۆکۆلی ساڵی ١٩٢٥ی جنێف، کە عێراقیش واژۆی کردووە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی قەدەغە کردووە. ئێستا دوای تێپەڕبوونی ١٠ساڵ بەسەر کیمیابارانی هەڵەبجەدا هێشتا خەڵکی هەڵەبجە

بەدەست شوێنەوارەکانی هێرشە کوشندەکەی ١٦ی ئازارەوە دەناڵێنن لەوانە زۆربوونی ڕێژەی توشبوون بە نەخۆشی ژێرپەنجە،لەدایکبوونی منداڵی ناتەواو، لەبارچوونی منداڵ. ئیمڕۆ بەتایبەتی لایەنگرانی ویلایەتەیەککگرتووەکانی ئەمریکا لەگەڵ خەڵکی هەڵەبجەدان، ئێمە بەیادی خۆمانو کۆمەڵگای نێو نەتەوەی دەهێنینەوە، کە نەتەوەیەککگرتووەکان نابێت بهێڵێ عێراق دەست بە بەرنامەی چەکە کۆکوژەکانی بکاتەوە.
تەنیا ڕێگا بۆئەوەی لەوە دڵنیابین، کەڕژێمی سەدام حسێن جارێکی دیکە ناتوانێت چەکی کۆکوژی هەبێت یان دژی خەڵکی عێراقو یان خەڵکەکانی دیکە بەکاری بێنێت، ئەوەیە کە ئەبێ پشکێنەرانی چەک، سەر بە نەتەوە یەککگرتووەکان خێرا بێ شەرت و مەرج بێ سنوور دانان سەردانی هەموو شوێنەکانی عێراق بکەن.

<u>حەوتەم:</u> وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاساڵیادی کۆمەلکوژی هەڵەبجە ١٦ی ئازاری ٢٠٠٠.

جەیمس ڕوبین، وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە: بەبۆنەی جەژنی قوربان پیرۆزبایی لە سەرجەم موسلمانانی جیهان دەکەین هەروەها لەم ڕۆژەدا دوازدەیەمین ساڵیادی هێرشی کیمیایی سەدام حسێن بۆسەر هەڵەبجە، کە شارێکی کوردنشینە لە باکووری عێراق بەرز ڕادەگرین بەهۆی ئەوەی ئەمساڵ جەژنی قوربان هاوکاتە لەگەڵ ساڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجەدا، گەلێ لە موسولمانان لە هەرێمی کوردنشینی عێراق جەژنی قوربان بەڕێوە نابەن بەهۆی ئەوەی لە ١٦ی ئازاری ١٩٨٨دا هێزی ئاسمانی عێراق هەڵەبجەی بەگازی موستاردو گازە کوشندەکانی دیکە بۆمباران کرد لە ئەنجامدا نزیکەی ٥٠٠٠ خەڵکی مەدەنی کوژرانو ١٠٠٠٠ کەسی دیکەش بریندداربوون، ١٢ ساڵ دوای ئەو کۆمەل کوژیە خەڵکی هەڵەبجە هێشتا بەدەست نەخۆشیە گەلێکی جدی وەک: شێرپەنجەو ناتەواو بەدنیا هاتنی منداڵ ئازار دەکێشن، قوربانیانی هەڵەبجە شایەنی دادپەروەری و پشتیوانی کۆمەڵگای نێونەتەوەیین کیمیابارانی هەڵەبجە، کەتاوانێکبوو دژی مرۆڤایەتی نیشانەی مێژووی دوورودرێژی ڕەفتارە تاوانبارەکانی ڕژێمی سەدام حسێنە.

ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لە مێژە داوا دەکات دادگایەکی نێونەتەوەیی پێک بێت بۆ لێکۆلینەوە لە سکالاکانو ئەگەر بکرێت سزادانی سەدام حسێن و داروودستەکەی بەبۆنەی ئەو تاوانانەی، کە ئەنجامیانداوەو تا ئیمڕۆ لە باشوورو ناوەڕاستی وڵات بەردەوامە. ئێمە پشتیوانی لە هەوڵە نێودەولەتییەکان دەکەین بۆ کۆکردنەوەی بەلگە لەسەر ئەو تاوانانەی، کە عێراق دژ بە مرۆڤایەتی ئەنجامیداوەو دەبێ بەو بۆنەیەوە سزا بدرێت لێپرسینەوەو دادگایی کردنی سەدام حسێن بەهۆی پێشێلکردنی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ زۆر دواکەوتووە، ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لە مێژووی خۆیدا پشتیوانی لە لێپرسینەوەو سزادانی ئەو کەسانە کردووە، کە جینۆسایدو تاوانەکانی دیکەیان دژ بە مرۆڤایەتی ئەنجامداوە، ئێمە بەهەمان شێوە پشتیوانی لە لێپرسینەوەی ئەو کەسانە دەکەین، کە لە بەرامبەر کیمیابارانی هەڵەبجە بەرپرسیارن.

ئێمە چاومان لەو ڕۆژەیە، کە ئەو کەسانەی فەرمانی کیمیابارانکردنی هەڵەبجەیان داوە لە دادگایەکی نێودەولەتیدا لە عێراقێکی ئازادو دیموکرات یان هەروڵاتێکی دیکەدا سزا بدرێ، تاوانەکانی عێراق دژی مرۆڤایەتی وەک کیمیابارانکردنی هەڵەبجە هیچ سنوورێک ناناسێتو ئەم تاوانە لەبیر ناچێت. کیمیابارانی هەڵەبجە بەدەستی سەدام حسێن تەنیا ڕووداوێک نەبوو، بەلکو بەشێک بوو لە شا لاوەیکی چڕوپڕ دژی هاولاتیانی کوردی مەدەنی عێراق، کە سەدام حسێن فەرمانی دەرکردبوو عەلی حەسەن، کە ناسراوە بە عەلی کیمیایی بەڕێوەی دەبرد بەگوێرەی هەڵ سەنگاندنی چاودێرە نێونەتەوەییەکان هێزەکانی عێراق ٥٠ هەزار تا ١٠٠ هەزار کەسیان لە شالاوەکانی ئەنفالدا لەساڵی ١٩٨٨دا کوشتووە. هەروەها ڕژێمی عێراق لەکاتی جەنگی ئێرانو عێراقدا، لانی کەم٥٠٠٠ ئێرانی بەچەکی کیمیایی کوشتووە. بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بەپێی ڕێکەوتننامەیەکی نێودەولەتی ساڵی ١٩٢٥، کە عێراق خۆشی واژۆی کردووە قەدەغە کراوە.

# هەڵەبجە و پاول

کۆلن پاول وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە مانگی ئەیلولی٢٠٠٣دا، لە پەراویزی سەردانی هێزەکانی ئەمریکادا لە عێراق سەردانی هەڵەبجەشی کرد، لەو سەردانەدا ژمارەیەک لە کەسایەتی وەک پۆل بریمەری حاکمی سیاسی عێراقو زۆرێک لە سەرکردەکانی عێراقو هەرێمی کوردستانیش هاورێییەتییان دەکرد لەوانە: مام جەلال تاڵەبانی، کاک مەسعود بارزانی، دکتۆر بەرهەم سالح....تاد لەسەر مەزاری



شەهیدانی هەڵەبجە پاول وتارێکی پێشکەش کرد سەبارەت بە داگیرکردنی عێراقو ڕووخاندنی ڕژێمەکەی سەدام حسێن، وەزیری دەرەوە لە قسەکانیدا ووتی:" ئەم شارۆچکە بچوکە کشتوکالیە، کە لە شاخەڕەش و ڕووتەکانی باکووری عێراقدا هەلکەوتووە، سەدام حسێن بەهۆی کیمیاباران کردنییەوە ٥٠٠٠ پێنج هەزار کەسی کردە قوربانی، ئەوەش بەلگەو نیشانەی ئەوەیە، کە سەدام حسێن چەکی کۆکوژی هەبووەو ئەمەش ڕاستی ئەو بڕیارە دەردەخات، کە ئەمریکا بۆ ڕاگەیاندنی شەڕ دژی عێراق داویەتی. لەسەر قسەکانی پاول لە هەڵەبجەدا لە ئەنجومەنی نوێنەراندا کونگرێسمەن دیلاهوت ڕەخنەی لە وتەکانی پاول گرتو بەسەرۆکی ئەنجومەنی گووت:" لێدوانەکانی وەزیری دەرەوە لە هەڵەبجەدا خەڵەتاندنی خەلکە".

ئەمەش دەقی وتەکانی دیلاهوت:

ئەنجوومەنی نوێنەران لێدوانەکانی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە هەڵەبجە فریودانی خەڵکە، ١٦ی ئەیلولی ٢٠٠٣

کونگرێسمەن دیلاهوت:" جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن نازانم ١شەممەی ڕابردوو چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانییەکەی جێگری سەرۆک کۆمارتان

بینی؟جێگری سەرۆک کۆمار ئەو لێدوانەی سەرۆک ئەرکانی سوپای ئەمریکا ژەنەراڵ شینسکی دووپاتکردەوە که پێویستیان بەچەند سەد هەزار سەرباز هەیە بۆ سەقامگیرکردنی عێراق.

ئەم دواییانە شتێکم بینی، کەبە بۆچوونی من کردەوەیەکی فریودەرانەیە، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کۆلن پاول هەفتەی ڕابردوو سەردانی هەڵەبجەی کرد، کەتێدا ٥٠٠٠ هەزار کوردی عێراق بەهۆی کیمیابارانی سەدام حسێنەوە گیانیان لەدەستدا، وەزیری دەرەوە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە:" ئەم شارۆچکە کشتوکالیە بچووکە لە شاخە ڕەشو ڕووتەکانی باکووری عێراقدا هەڵکەوتووە. بەڵگەو نیشانەی ئەوەیە، کە دەوڵەتی سەدام حسێن چەکی کۆمەڵکوژی هەبووەو ئەمەش ڕاستبوونی بڕیارەکەی ئەمریکا بۆ ڕاگەیاندنی شەر دژی عێراق دەردەخات".

کیمیابارانی هەڵەبجە، کە لەساڵی ١٩٨٨ ڕوویداو هەروا بەسەرچوو دەبوو کاتی خۆی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی وەڵامی ئەوەی بدایەتەوەو دادگایەکی بۆ لێپرسینەوە لە تاوانەکانی سەدام حسێن پێک بهێنایە، هەروەها بڕیاری دەستگیرکردنی سەدامی دەرکردبایەو دواتر دادگایی بکردایە. لەساڵی ١٩٨٨دا ڕیگان سەرۆک کۆماری ئەمریکابوو پاشان سەرۆک کۆماری ئەمریکا بووش بوو، کەباوکی سەرۆک کۆماری ئێستای ئەمریکایە وەزیری دەرەوەی ئێستای ئەمریکا ئەوکاتە ڕاوێژکاری ئاسایشی نیشتیمانی ڕیگان بوو من زۆر لەو قسەیەی سەرۆک کۆمار توورەم، چونکە گەلێک لە کاربەدەستانی ئێستای ئەمریکا هەرئەوکەسانەن، کەکاتی خۆی لە سەدام حسێن نزیکبوونەوە بۆئەوەی سەدام لە شەڕەکەیدا بەسەر ئێراندا زاڵبێت، دۆناڵد ڕامسفێلد وەزیری بەرگری ئێستای ئەمریکا ساڵی ١٩٨٢ وەک نوێنەری تایبەتی ئەمریکا سەردانی عێراقی کردو تەوقەی لەگەڵ سەدام حسێن کرد،دواتریش ئەمریکا ناوی عێراقی لە لیستی وڵاتانی پشتیوانی تیرۆریزم دەرهێنا ئەوەش دەرفەتێکی گەورەی بۆ ڕژێمی عێراق ڕەخساند تا لەساڵی ١٩٨٤ پەیوەندییە دیپلۆماتیەکانی ئەمریکاو عێراق بەتەواوەتی دەستپێکرد.

هەروەها لەساڵی ١٩٨٦دابالیۆزخانەی ئەمریکا لە بەغداد کرایەوە خەڵکی ئەمریکا دەبێت ئەو ڕاستیە، کە بزانێت لە ١٩٨٨دا ئەو تاوانە قێزەونو دزێوە دژی کوردەکانی عێراق لە شاری هەڵەبجە ئەنجامدرا، ئێستا پاش ١٥

ساڵ جەنابی وەزیری دەرەوە دەڵێت: کیمیابارانی هەڵەبجە هۆکارێک بوو بۆ دروستبوونی بڕیاری دەستێوەردانی ئەمریکا لە عێراق"، بەڵام چیرۆکەکە لێرەدا کۆتایی پێ نایەت، چونکەئەوە جۆرج بۆشی باوکی بۆشی سەرۆک کۆماری ئێستا بوو، کەشکستی بە هەوڵەکانی کۆنگرێس هێنا کاتێک ویستیان ئابلوقە بەسەر عێراقدا بسەپێنن لە بەرامبەر ئەوتاوانەی، کە دژی خەڵکەکەی خۆی ئەنجامیدابوو.

خاڵێکی گرنگ هەیە، کەخەڵکی ئەمریکا دەبێت بیزانن بەگوێرەی لێکۆڵینەوەیەک نوسینگەی لێکۆڵینەوەی کۆنگرێس، کە لیژنەیەکی بێلایەنە. پاش ئەوەی راپۆرتەکان ب لاوەبوویەوە، کەعێراق چەکی کیمیایی دژی کوردەکان بەکارهێناوە لە ٩ی ئەیلولی ١٩٨٨دا ئەنجوومەنی پیرانپرۆژە یاسایەکی تێپەڕاند بۆئەوەی ئابلوقەی ئابووری بەسەر عێراقدا بسەپێنێتو ناردنی تەکنەلۆجیای سەربازی بۆ عێراقبوەستێنرێت.

لە ٢٧ی ئەیلولی ١٩٨٨دا ئەنجومەنی نوێنەران ئەو پرۆژە یاسایەی بە ٣٨٨ دەنگی ئەرێنی لەبەرامبەر ١٦ دەنگی نەرێنی پەسەند کرد، بەڵام ئەنجوومەنی پیران پرۆژە یاساکەی قبول نەکرد،پرۆژە یاساکە ناردنی کۆمەڵێک تەقەمەنی بۆ عێراق قەدەغە دەکردو داوای لە سەرۆک کۆمار دەکرد هەناردەکردن و هاوردەکردنی کاڵا بۆ عێراق سنووردار بکات کۆتایش بەبەخشینی قەرزی کریدیت بەعێراق بهێنێ، دژی بەخشینی یارمەتی ئابووری نێودەوڵەتی بەعێراق رابوەستێت ئەگەر عێراق کۆتایی بەبەکارهێنانی چەکی کیمیایی نەهێنێت، هەروەها قایل نەبێت،کە پشکێنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان سەردانی ئەو وڵاتە بکەن، بەهەمان شێوە لە تەمووزی ١٩٩٠ داو بە ماوەیەکی کەم بەر لە دەستپێکردنی شەڕی یەکەمی کەنداو ئیدارەی بووش هەواڵەکانی کۆنگرێسی پووچەڵکردەوەو شکستی بە هەوڵەکانی ئەنجوومەنی نوێنەرانو پیران هێنا بۆ ئەوەی بەخشینی کریدیتی فرۆشتنی کاڵای قەرزی کردیت بەعێراق و بیمەکردنی کۆمپانیا عێراقیەکان لەلایەن دامودەزگا نێودەوڵەتیەکان سنووردار بکرێت.

بەڵام ئیدارەی بۆش هەموو ئەو هەوڵانەی پووچەڵکردەوە ئێمە دەمانزانی کەعێراق چەکی کیمیایی بەکاردەهێنێت ساڵی ١٩٩٠ ئەوەمان دەزانی، بەڵام چیمان کرد؟

ئیدارەی ئەمریکا شکستی بەهەولەکانی کۆنگریس هێنا، کەوابوو سەردانەکەی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ هەڵەبجەو گووتنی ئەوەی، کەکیمیابارانی هەڵەبجە یەکێک بووە لە هۆکارەکانی دەستێوەردانی سەربازی ئەمریکا لە عێراق بۆ فریودانی خەڵکە.

دیلاهوت و چەندین بەرپرسی تری ئەمریکا رەخنەیان لە سیاسەتی ئەمریکا گرتووە، کە لە سەردەمی ریگانو بۆشی باوکدا، لەوانەش هاری رید، دەڵێن هەر ئەو کات دەزانراسەدام چی بەسەر هەڵەبجەو کوردو عێراقدا هێناوە، بەڵام ئەندازیارانی هاوپەیمانی ئەمریکاو عێراق لە دوای ١٥ساڵ ئێستا کارەساتی هەڵەبجە دەکەنە هۆکاری لێدانو رووخانی عێراق. ئەوەش بەهۆی پاراستنی بەرژەوەندییە ئابورییەکانی ئەمریکاو ساخکردنەوەی کا لاوە شمەکو چەکوتەقەمەنی ئەمریکا بووە لە عێراقدا. لەوانە دۆنالد رامسفێلد نوێنەری تایبەتی ئەمریکا بووە، کە سەردانی سەدامی کردووە لە دوای کارەساتی هەڵەبجە. دیک چینی وکۆلن پاولو چەندین کەسی تر، کە ئەوکاتەش پۆستی بەرپرسیارێتی گرنگیان لە ئیدارەی ئەمریکادا هەبووە. جگەلەوەش بە پێی بەڵگەنامەکانی خۆیان ئاگاداری هەموو جموجولەکانی عێراق بوونو پشتگیری تەواویان لە عێراق کردووە لە جەنگەکەیدا لە دژی ئێرانو کورد. هەروەها چی کراوە بە گەلی کورد لە هەشتاکانی سەدەی رابردووا ئەمریکا ئاگاداربووە، ئەو وەک زلهێزێکی جیهان بە دوای بەرەوەندییەکانی خۆیەوە بووە.

<u>هەشتەم:</u> بۆچی کیمیابارانی هەڵەبجە وەک هۆکارێک بۆ رووخانی رژێمی سەدام بەکاردێنن؟

ئەنجوومەنی نوێنەران ١٧ی ئازاری ٢٠٠٤

کۆنگریسمەن هاری رەید:"جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەن داوا دەکەم لە چوارچێوەی بریارنامەی ٥٦١ی ئەنجومەنی نوێنەراندا ٥٥٧ی دەربارەی ئازادی خەڵکی عێراقو خزمەتی درەوشاوەی هێزە چەکدارەکانی ئەمریکاو هێزەهاوپەیمانییەکان بخرێتە بەر باس ئەمە دەقی بریارنامەکەیە:

بریارنامەی ٥٥٧ ئەنجوومەنی نوێنەران بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی، کە سەدام حسێنو رژێمەکەی تاوانی دژی مرۆڤایەتیان ئەنجامداوەو بەشێوەیەکی چرووپر مافی هاولاتیانی عێراقو ولاتانی دیکەیان پێ شێلکردووە.

به لەبەرچاوگرتنی ئەوەی، کەڕژێمی تیرۆرستی سەدام حسێن هاوڵاتیانی عێراقی کوشتووەو ئەشکەنجەی داونو دەستدرێژی کردۆتە سەریانو دەستو پێی بڕیوون.
به لەبەرچاوگرتنی ئەوەی، کە ڕژێمی سەدام لە ١٦ی ئازاری ١٩٨٨ چەکی کۆمەلکوژی دژی هاوڵاتیانی کورد بەکار هێناوەو نزیکەی ٥٠٠٠ کەسی کوشتووە.
به لەبەرچاوگرتنی ئەوەی، کە لە ئەیلولی ١٩٨٨ ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا بەتێکرای دەنگ پرۆژە یاسای S٢٧٦٣ ی پەسەند کرد بۆ سەپاندنی ئابلوقەی ئابووری بەسەر ڕژێمی سەدام حسێندا بەهۆی ئەوەی چەکی کیمیایی دژی هاوڵاتیانی کوردی خۆی بەکارهێنابوو، بەڵام ئەو پرۆژە یاسایە شکستی هێنا بەهۆی ئەوەی ئیدارەی ڕیگان دژی ڕاوەستاو هەڕەشەی ئەوەی کرد، کەڤیتۆی دەکات.
به لەبەرچاوگرتنی ئەوەی، کە ٢٧٠ گۆڕی بەکۆمەل لە عێراق دۆزراونەتەوە، کەئیسکو پروسکی ٤٠٠٠٠٠ هەزار قوربانی دەستی ڕژێمی سەدامی تێدابووە.
به لەبەرچاوگرتنی ئەوەی، کە ڕژێمی سەدام حسێن بەترساندنو تۆقاندنی خەڵک بەردەوام لە بەرچاوی بنەماڵەکانیان دەستدرێژی کردۆتە سەریان. به لەبەرچاوگرتنی ئەوەی، کە ڕژێمی سەدام حسێن عەرەبە زۆنگاونشینەکانی سزاداوە لە ڕێگای وشک کردنی زۆنگاوەکانیان، کە لە ئەنجامدا سەدان هەزار کەس ئاوارەبوونو کارەساتێکی ژینگەیی ڕوویدا.
به لەبەر چاوگرتنی ئەوەی، کە یاسای ١٩٩٨ی ئازادی عێراق یاسای گشتی ٣٣٨.١٠٥، کەبە ٣٦٠ دەنگی ئەرێنی و ٣٨دەنگی نەرێنی لەلایەن ئەنجوومەنی نوێنەرانەوە پەسەند کرا ڕایگەیاند، کەویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێت پشتیوانی لە هەولەکان بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام حسێن بکات.

به لەبەرچاوگرتنی ئەوەی، کە ڕژێمی عێراق ١٦ بڕیارنامەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکانی جێ بەجێ نەکرد، لە ٨ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢ ئەنجوومەنی ئاسایش بە تێکرای دەنگ بڕیارنامەی ١٤٤١ی پەسەندکردو تیایدا ڕایگەیاند، کەعێراق سەرپێچی لە جێ بەجێ کردنی ئەرکو بەرپرسیارێتییەکانی بەگوێرەی بڕیارنامەکانی ئەنجوومەنی

ئاسایش لەوانە بڕیارنامەی ٦٨٧ی ساڵی ١٩٩١ ی کردووە وە تائێستاش دەیکاتو بەتایبەت لەگەڵ پشکنەرانی نەتەوەیەکگرتووەکان هاوکاری نەکردووە.

بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەوانە لە ٢٠٠٢/١٠/١٠ ئەنجوومەنی نوێنەران ڕێگەیدا بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی دژی عێراق، لە ٢٠٠٣/٣/١٩ ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا ئۆپەراسیۆنی سەربازی دژی عێراق ئەنجامدا.

# کۆبوونەوەکەی

# دەربەن دزڵی دوای پاشەکشێ

دوای جێگربوونی هێزەکانی ئێران لە سنوورەکەدا، ئیدی وردە وردە هێزە سیاسییەکان و هێزی پێشمەرگە هەم خۆیان کشانە دواوەو هەم سوپای ئێران کەوتە ڕێگریکردن و قەدەغەکردنی هاتووچۆو مانەوەی هێزەکانی پێشمەرگە بەتایبەت لەناوهەڵەبجەو سیروان و خورماڵدا. ئەو هێزانەی یەکێتیی، کە خەڵکی سنوورەکە نەبوونو لە ناوچەکانی ترەوە هێنرابوون، بەرەو سەردەشتو قەندیل گەڕانەوە، بەشێکی هێزی تیپی ١١ی هەورامانو تیپی ١٥ی شارەزووریش لەسەر داوای قادری حاجی عەلی نێردران بۆ سنوری مەڵبەندی ٣و ناوچەی بالەک، کاک نەوشیروان مستەفاو چەند کەسێکی تر لەوانە: هەڤاڵان جەبار فەرمان، فەرەیدون عەبدولقادر، ئەرسەلان بایزو دلێر سەید مەجید هاتنە سنوورەکە واتە سنووری هەڵەبجە بۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخەکە، ئەو هێزەی لە سنوورەکەدا مایەوە بنکەو بارەگای خۆیان بردەوە بۆ: سازان، باوەکۆچەک، عەبابەیلی، جەلیلە، بیاوێلە، هاوار، هەوارەکۆنو سەرکەنی تاوێرە. لە شاری پاوەش، کە سەر بە پارێزگای کرماشانە عەمبارێکی گەورە کرایەوە، بۆ ئەو کەلوپەلانەی لەلایەن سوپاو خەڵکی ترەوە بێ بەڵگەو بێ ئاگاداری بردبویانە ناو خاکی ئێران لەوێ لێیان وەردەگیرایەوەو دادەنرا تا دواتر هەرکەس بەڵگە یان ناونیشانی پێ بوو ماڵی خۆیان وەردەگرتەوە.

ئەوەی من ئاگاداربووم لە گەرمەی شەڕو کیمیابارانداا پێشمەرگە دەستی بۆ هیچ شتێکی کەس نەبردووە، ئەگەر چەکێک یان ڕادیۆیەک یان چرایەک یان هەرشتێکی لەو بابەتانەشی گرتبێ بەدەستەوە، بەبینینی دیمەنی کیمیابارانەکەو تێکشکانی هەموو شتێک بەیەکدا لەیەککاتدا، ئەوە ئەوشتەشیی فرێی داوەتەوە، خەڵک خۆی ببوە مل، جانتاو قیناع و چەکەکەی خۆشی بۆ دەرنەدەچوو، زۆر کەمو تاکو تەرا ئەگەر بوبێ لەوکاتەدا ئەوەندە بێ ویژدانو شۆڕاوە بوبێ لە پیاوەتی دەستی بۆشتی خەڵک بردبێت.

رادیۆی دەنگی گەلی کوردستان لەسەر لوتکەی بەفری میری لە چیایی شنروێ دامەزرابوو بارەگایەکی سەرکردایەتی لەسەر کانی قەمانو کانی وەزگێل لەپشت چیایی شنروێ بەڕوی هاواردا دانرا، کاک نەوشیروان مستەفاو هەڤاڵەکانی دەستیان کرد بە ڕێکخستنەوەی هێزەکان و هەندێک لێپرسینەوە لەو دەنگۆیانەی، کە بە ناڕەوا درانە پاڵ، پێشمەرگە، بەڵام بینیان وەزع و بارودۆخی ناوچەکە بە جۆرێکی ترەو ئێرانیش بە شێوەیەکی تر هەڵسوکەوت لەگەڵ لایەنە سیاسییەکان دەکات ئەوەندەی نەبرد گەڕانەوە بۆ لای قاسمە ڕەشو ناوزەنگ وئێمەیان بەجێهێشت، ڕۆژانە نوێنەری لایەنەکان سەردانی خەرپانیان دەکرد زۆرتر بۆ ڕێکخستنی کاروانی ئەو بار هەڵگرانەی، کە لە ئێرانەوە لە ئۆردووگاکانەوە بە نۆبەت خەڵک دەهاتن بۆ بردنی، کەلوپەلو ئەشیای ناوماڵەکانیان، بەڵام لەکاتی بردنی ئەشیایی ماڵان لەلایەن خاوەنەکانیانەوە، بەمۆڵەتی حکومەتی ئێران و سوپا، ئەگەر کەسێک، کەلو پەلی دراوسێکەی خۆی بردبێت، کە ئەو دراوسێیە لە ئێران نەبوبێت یان هەموویان شەهید بوبن.

ئێمە لە سنوری قەزای هەڵەبجەدا تا ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٥ماینەوە. هێزەکانی ترێ یەکێتیی لە ناوچەکانی دیکە سەرگەرمی بەرگری و شەڕی مانو نەماندا بوون، شالاوەکانی ئەنفالو کیمیابارانی ناوچەکانی ترو هێرشەکانی سوپای عێراق بۆ سەری.ن.ک، هێزەکانی یەکێتیی پارچە پارچەو لەیەک دابڕاو کرد، بەشێکی لە سنوورەکانی خوارەوە لە کەرکوکو گەرمیانو قەرەداغدا بوو، بەشێکی تری لە هەڵەبجەو بەشێکی تریش لە سنوری هەولێردا بوو.

ئەو هێزانەی یەکێتیی لەگەڵ سوپای پاسداراندا هێرشیان کرد بۆ سەر سنوری هەڵەبجەو ناوچەکەیان ئازاد کرد، لەگەڵ ئەو هێزانەی لەدۆلی جافایەتی بوون بەپێی پلانێک لە ١٩٨٨/٣/١٩دا پاشەکشەیان کردبوو بۆ ناو خاکی ئێران، بەشێکی زۆری ئەم هێزانە لە سنوری قەندیلەوە گەڕابوونەوە بۆ سنوورەکانی هەولێرو کەرکوکو گەرمیان و قەرەداغ بۆهاوکاری وپشتگیری ئەو هێزانەی لە مانگی ئازاری١٩٨٨دا لە چەندین لاوە هێرش کرابووە سەریان، کە پێشتر لە ناوچەکەدا بوون.

ئەم شەڕە بەردەوام بوو تا مانگی ١٩٨٨/٩ لە چیای قەندیل کۆتایی هات، زۆربەی زۆری ئەم هێزە دەرچوونو گەیشتنە سەر سنوور لەگەڵ چەندین فەرماندەو بەرپرس لەوانەی سنوری مەڵبەندی ١ی سلێمانی ئەوسەردەمە.

لەوانە هەڤالان: کاک عومەر فتاح، شێخ جەعفەر، قادری حاجی عەلی، جەمیل هەورامی، مەحمود سەنگاوی،شێخ عەلی حەمەساڵح و کوردۆ قاسم لەگەڵ سەدان پێشمەرگەو کادرو فەرمانەدەی تر بە داوای لێبوردنەوە ناوی هەموویانم لە یاد نەبوو.

بەشێکی کەمی تری ئەم هێزەش لەگەڵ چەند فەرماندەیەکی تر بە دەستەی بچووک بچووکەوە، کە دەستەکان پێکهاتبوون لە دەیان پێشمەرگەی قارەمان لە خوارەوەو لە ناو مەیدانەکەدا مانەوە دواتر بوونە پارتیزانەکان، کە ئەمانە جێی شانازی یەکێتی و گەلەکەمانن، لەوانە: شەهید مەحمودی مامەعەزە، شەهید حەمەڕەش، شەهید مەلا ئەحمەد، شەهید سەیدجەوهەر، عوسمانی حاجی مەحمود، عەدنانی حەمەی مینە، کەریم کەڕی مەجید بەگەچاوڕەش،نازم کەرکوکی و دەیان قارەمانی تر داوای لێبوردن لەوانیش دەکەم.

ئەنفالی حەوت لە ١٩٨٨/٨/٢٧ دەستپێکردو لە ڕۆژانی ١٩٨٨/٩/١٨دا لە چیای قەندیل کۆتایی هات، سەرکردایەتی بەرگری کردن لە چیای قەندیل لەلایەن شەهیدی سەرکردە ئازاد هەورامییەوە[1] دەکرا زیانی زۆر لە دوژمن

---

[1] - ئازاد هەورامی کوڕی مەجید بەگ کوڕی غەفار بەگ کوڕی جەعفەرسانی سانی هەورامانی لهۆنە. کاتێک حکومەتی ڕەزاشای ئێران لەساڵی ١٩٣١ هێرشی کردە سەر هەورامانی لهۆن دوای بەرگریکردنێکی قارەمانانە بۆ ماوەی یەک ساڵ، لەساڵی ١٩٤١ناوچەکەی کۆنترۆڵکرد، چونکە هێزەکان نابەرامبەر بوون دەوڵەت بەهێزو سان بێچەکوچۆڵە، سان و داورودەستەکەی کۆچیان کرد بۆ عێراق برانە ڕومادی مافی پەنابەریەتیان درابە، دوای چەند ساڵ هێنراونەتەوە کەرکوک. مەجید بەگ لەوێ مایەوە ئازاد لە کەرکوک و لە ڕۆژی ١٩٥٤/١٢/٣١ لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایکبوو وە لەوی گەورە بوو. جەعفەرسان ساڵی ١٩٤١ کۆچی دوایی کرد و لەشاری هەڵەبجە، لەگۆڕستانی ئاوایی عەبابەیلێ دا بەخاک سپێردراوە.

درا، چەندین پێشمەرگە شەهیدو کاک ئازادیش بە سەختی بریندار بوو لە ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٣١دا گیانی سپارد بە کوردو کوردستانەکەی.

ئەو هێزانەی سنوری مەڵبەندی ١ی سلێمانی، کە مابوونەوە لە قەندیلەوە بۆ سنوری مەریوان و دزلی گوازرابونەوە، هێزەکانی سنوری هەڵەبجەش لەگەڵ هێزەکانی ئێراندا بۆ سنوری فەرمانداری پاوەو جوانڕۆ پاشەکشەمان کرد، هەڵەبجەو ناوچەکەمان چۆل کرد، لە ڕێگەی سازان بۆ مەرەخێل، هاوار بۆ شێخان، زۆر خێزانیش لەگەڵ ئەم هێزەدا مابوونەوە لە ناوچەکەدا هەتا پاشەکشەکەی ئێران لە مانگی ١٩٨٨/٨، دابەشبوون بەسەر ئۆردووگاکانی سەریاس، ڕەوانسەر، تازاواو جوانڕۆدا.

ئێمەش واتە پێشمەرگە، ماوەیەک لە پاوەو دەوروبەریدا بووین، ئەوانەی سەڵت بوون لەناو شاری پاوە خانوومان بەکرێ گرتوو بارەگای تیپی ١١ی هەورامانمان دانایەوە.



ترسمان هەبوو عێراقو ئێران مامەڵەمان لەسەر بکەن، لەوکاتەدا پیاوێکی خەڵکی پاوە بەناوی خاڵەڕۆستەمی بارامی سەردانی کردین وهاتە بارەگەکەمان لە من وشەهید نیازی پرسی بۆماتو عاجزن؟وتمان لەم ڕێککەوتنەی عێراق و ئێران، پێی وتین مەترسن هەرکات ئیسرائیلو عەرەب ڕێکەوتن، دەوڵەتی سەدامو ئێران ڕێکدەکەون، هیچ نییە ئێستا هەر شەڕەکەیان وەستاندووە.

لێرەدا نابێت کوردی عێراق و یەکێتیی چاکەو پیاوەتی خەڵکی ئێران نادیدە بگرن، چونکە هەمیشە پشتو پەنامان بوون، لە ڕۆژانی بەرەنگاربوونەوەدا، لە ڕاپەڕینی ١٩٨٧/٥/١٣دا، لە کیمیاباراندا بەتایبەت لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦دا، لەکاتی پرۆسەکانی ئەنفالو کوڕەودا. خەڵکی کوردستانی عێراقو هەموو لایەنە سیاسییەکان قەرزاری چاکەو پیاوەتی هاوکاری کوردانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی برامانین.

سەرباری هەموو ئەو بارودۆخە سەخت و ناخۆشە، چەندین مەفرەزەی یەکێتیی لە سنوری گەرمیانو قەرەداغدا بە پارتیزانی مانەوە، چەند مەفرەزەیەکی تریش لەو هێزانە لە قەندیل هاتبوونە سنوری مەریوان لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٨٨دا لە سنوری شارەزوورەوە گەڕانەوە بۆ قەرەداغ لە مانگی شوباتی ١٩٨٩ مام جەلال لە دەرەوە گەڕایەوە ئێران و لەوێوە چووەوە بۆ قاسمەڕەش، لەوێوە دەستیکرد بەکۆبوونەوە کردن لەگەڵ هێزەکاندا، ئینجا هاتە سەردەشت لەوێوە بۆ بانەوبلەکێ و دواتر هاتە مەریوان کەوتە کۆڕو کۆبوونەوە کردن لەگەڵ مەڵبەندەکان و ئۆرگانە جیاجیاکانی یەکێتیی و هێزی پێشمەرگەو کادرو فەرماندەکانیان. لەڕۆژی ١٩٨٩/٩/٢٠ گەیشتە دەربەنی دزلی و لە کۆبونەوەیەکی فراواندا لەگەڵ هێزەکەو جەماوەردا ووتی:" عێراق و ئێران ڕێکەوتوون، ئێمە لە رووی سەربازییەوە شکاوین، بەڵام هەلومەرجی تازە بۆ خەبات لە ناوچەکەو جیهان هاتوتە پێش، دەبێ کورد قۆناغێکی نوێ دەستپێبکات، دەبێ شەڕ بە شێوە کلاسیکیەکەی بەلاوە بنێین، تەنیا بایەخ بە خەباتی چەکداری نەدەین، خەباتی سیاسی و دیپلۆماسی دەست پێبکەین، خەباتی ڕێکخستنی نهێنی و دەوری گرنگی لە هاندان و جۆشو خرۆشاندنی خەڵکدا بۆ کۆکردنەوەو ئامادەکردنیان بۆ بەگژداچوونەوەی داگیرکەران، دەبێت گرنگی بدەین بە پەروەردەکردنی پێشمەرگە. پێشمەرگە بکەین بە ٣ بەش یان ٣ جۆر تەشکیلات، یەکەم هێزی تایبەت بۆ سەڵتو گەنجەکان، دووەم بەتالیۆنو تیپەکان لەسەر سنوورەکان لە بارەگاو لەواجبدابن، سێیەم هێزی پشتیوان و پشتگیری لە ئۆردوگاکان و ئەو شارو شارۆچکانەی ئێران، کەڵێی نیشتەجێن بۆ پێشمەرگە بەتەمەنو دێرینەکان، لە کۆتایی قسەکاندا ووتی: حکومەتی عێراق کێشەی قەرزی هەیە، سەرەتای خەباتە عێراق بەبێ شەڕ ناژی دوورنییە پەلاماری یەکێ لە دراوسێکانی تری نەدات، دڵنیابن ئەوەندە نابات یان ئەم حکومەتە ئەفرێنین یان ئەمان .... تاد.

دواتر لە ڕۆژی ١٩٩٠/٦/٩ کاک نەوشیروان مستەفا هاتە سنوورەکە بۆ تەشکیلاتی هێزەکان، لە ڕۆژی ١٩٩٠/٦/١٠ لە ئاوایی ولەژێری لێوار گۆلی زرێباردا لە مەریوان، لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی هێزەکانی سنوری مەڵبەندی یەکدا، قسەی کردو بە درێژی باسی هەلومەرجی سیاسی و ڕێکەوتنی عێراق

و ئێرانی کرد، لەکۆتای قسەکانیدا ووتی:" سالّی١٩٧٥ تووشی شکست بووین دێهاتی کوردستان مابوو، ڕێکخستنی کۆمەڵەو یەکێتیی ئامادەبوو. ئەمجارە وانییە، ڕەنگە نەتوانین لەناو ئێراندا بە ئاوارەیی ئەم خەڵکە بەخێو بکەین، بۆیە کێ دەچێتەوە بۆ عێراق با بڕوات ئەوە لێبوردن هەیە، کێش لە ئێران دادەنیشێ بادانیشێ و کێش دەچێتە دەرەوە خۆی سەرپشکە"، لە دوای ئەم قسانە لەناو هێزەکەدا دەنگە دەنگ و گلەیی دەستی پێکرد. پێشتریش کاک عومەر فەتاح و کاک فەرەیدون عەبدولقادر هاتنە ئەم سنوورە کاک عومەریش هەر ئەم بۆچوونەی کاک نەوشیروانی لە مالّی مامۆستا جوامێردا لەناو برادەراندا باس کردبوو، بەلاّم لەگەڵ مامۆستا عەلی گەرمیانی بووبوە گفتوگۆیان بەتایبەت لەسەر ئەو بۆچوونە هەندێک هەڤاڵ هەیانبوو کەپێشمەرگەو خەڵک تەسلیم ببنەوەو بڕۆنەوە بۆعێراق.

ئێمە پێشمەرگەکانی تیپی ١١ی هەورامان لە پاوەوە هاتبووین بۆ مەریوان بۆبەشداری کردن لەم کۆبوونەوەی لەگەڵ کاک نەوشیرواندا، لە گەڕانەوەماندا کاک نەوشیروانیشمان لەگەڵ خۆمان برد بۆ پاوە، لە هەورامانی تەخت و ئاوایی هەجیج و شارۆچکەی نۆدشەوە ڕۆیشتینەوە، عەسرێکی درەنگ گەشتینە شارۆچکەی نۆدشەولەوێ دەرچووین پاسدار گرتینیانو ئێمەیان گێڕایەوە بۆ نۆدشە، بەبێ ئەوەی هیچ مخالەفەیەکمان کردبێت تەنیا ئەیان گووت: بۆ لێرەوە هاتوون؟ ئەم پیاوە نەوشیروان کێیە؟ دوای ماوەیەک ئازادیان کردینو شەو گەیشتینە پاوە.

لەناو کوردەکانی ڕۆژهەلاتدا لەو ناوچەیەی ئێمەی لێ بووین، جموجولێکی ئیسلامی سیاسی هەبوو جارجار هانی خەڵکیان دەدا بۆئەوەی کێشەمان بۆ دروست بکەن، ئەیان وت سەدام حسێن پیاوێکی باشەو سونی مەزهەبە ئەمانە دژایەتی دەکەن، مامۆستا مەلا قادری قادری ئیمام جومعەو پێش نوێژی کەری هەینی شاری پاوە حاکم شەرع و پیاوێکی بەڕێزو دەست ڕۆیشتوو بوو، لای دەوڵەتی ئێران و بەرپرسەکانی ناوچەکە بەقسەی دەکرا، دۆست و ناسیاوی ئێمەش بوو لەبنەچەدا خەڵکی تەوێڵەیە. بۆیە ئەگەر کێشەو گرفتێکمان هەبوایە بۆی چارەسەر دەکردین.

# بەرەو ڕاپەڕین

یەکێتیی نیشتمانی لەساڵی ١٩٧٦بۆ١٩٧٩ خاوەن هێزێکی پێشمەرگەی ڕێک وپێکو گیان فیداکەر بوو لەسەر چیا، کە بەشێوەی شەڕی پارتی زانی خەباتیان ئەکردو چالاکیان ئەنجام ئەدا بەدژی سوپای داگیرکەری عێراق، لەشارو شارۆچکەو ئاوایییەکانیشدا خاوەنی تەشکیلات و ڕێکخستنێکی نهێنی و پۆلاین بوو، خەبات و تێکۆشان و تەلاشی ئەم دوو باڵە بەجۆرێک پڕلەقوربانی دان و خویناوی بوو، دۆستانی کوردی سەرسام و دوژمنانی زەندەق بردبوو. درووشمی پارتیزانەکانی شاخ نەسرەتن تاسەرکەوتنبوو، دروشمی تەشکیلاتی نهێنی و قارەمانانی نێو زیندانەکان کەم ژیان وکەڵ ژیان بوو.

لەساڵی ١٩٧٩بەدواوە تاساڵی١٩٨٨ شێوەی خەباتی ئەم هێزە گۆڕا بۆقۆناغێکیتر، قۆناخی پەلاماردانی هێزەکانی دوژمن و ڕزگارکردنی ناوچەی ئازاد کراو و دانانی بنکەو بارەگای ئاشکرا لەوناوچانەدا بوو، ئەمەش بەهۆی هاتنە پێشەوەی ئەو بارودۆخەوە بوو کەشەڕی ئێران عێراق دروستی کرد بوو.

لەدوای ئەم دووقۆناغەوە قۆناغی تێک شکان و پاشەکشە دێتە پێشەوە ئەویش بەهۆی وەستانی شەڕو ئاگربەست لەنێوان هەردوو وڵات و دواتر ڕێککەوتنیان، ئەوەبوو عێراق دەستی خاڵی بوو لەوشەڕەو سوپا زلوزەبەلاح و پڕچەک کراوەکەی لەلایەن ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی تریەوە، لەبەرەکانی شەڕی لەگەڵ ئێراندا هێنایە سەر کوردستان و شەڕی ئەنفال وکیمیاباران و قڕکردنی گەلی کوردی دەست پێکرد، سەرئەنجام دوای بەرەنگار بوونەوەو قوربانییەکی زۆر بۆ ماوەی زیاتر لەساڵێک، دەیان هەزار مرۆڤی کورد کوژران و بێسەروشوێن کران، دەیان هەزارکەس ئاوارەو دەربەدەر بوون، هەزاران گوندو شارو شارۆچکە لەگەڵ خاکدا تەخت کران، سەدان هەزار دۆنم ڕەزو باخ و مەزرا سووتێنران، بەسەدان هەزار سەر مەڕو ماڵات و ئاژەڵ وگەلەو گۆتاڵ بەتاڵان بران.

بەنمونە لەسنووری پارێزگای سلێمانیدا، شارەکانی ناوەندی فەرمانداریەکانی قەلادزە، چوارتا، پێنجوێن، هەلەبجە، دوکان، لەگەل هەموو شارۆچکەکانی ناوەندەکانی ناحیەکانی سەر بەم قایمقامیەتانە، لەگەل هەموو ئاوایی و شارەدێکانی سەربەم ناوەندانە، بەجۆرێک وێران و خاپوور کران، لەدوای ١٩٨٨/٨/٨ەوە تا ١٩٩١/٣/٧ نەمرۆڤێک نەگیان لەبەرێکی مالی تێیاندا ژیاوە.

بۆیە هێزەکانی ئێمەش ئەوەی کەمابوو لەدوای ئەم شەڕەوە بەشێکی زۆری ئاوارەی وولاتی ئێران بووین و چووینە پشت و سەر سنوورەکان، بەم شێوەیە: هێزەکانی هەولێروکەرکوک لەسەر سنوور لەنێوان قەلادزەو سەردەشت دا لەگەل سەرکردایەتی و ئۆرگانەکانی تری حیزبیدا زۆریان هەرلەناو خاکی کوردستانی باشوردا مانەوەو لەئاواییەکانی بێدەلان، سونێ، شێنێ، زەلێ و ناوزەنگ دا جێگیر بوون. بەشێکیشیان لەسەر سنوور لە نۆکان، تووژەلەو قاسمەڕەشدا بنکەو بارەگایان چێکردەوە.

هێزەکانی سنووری سلێمانی وبەشێک لەکەرکوکو گەرمیان لەسەر سنوور لەنێوان شارۆچکەی چوارتاو شاری بانەی ڕۆژهەلات دا لەچەم ودۆل و ئاواییەکانی بلەکێ و چەمپاراودا گیرسانەوە.

بەشێک لە هێزەکانی گەرمیانو شارەزوورو سلێمانی کەوتنە سنووری شاری مەریوان و لەسەر سنوور لەنزیک شارەدێی دزلی لەجێگەیەک بەناوی دۆلەناو بنکەو بارەگایان کردەوە.

هێزەکانی هەلەبجەو هەورامان و بەشێک لەخانەقین وگەرمیان و بناری بەمۆ کەوتینە لای شاری پاوەو جوانڕۆ. لەم سنوورانەوە خۆمان ڕێکخستەوەو تەشکیلات نوێ کرایەوەو ئامادەکاریەکان بۆڕاپەڕین دەستی پێکرد. لەگەل هاتنەپێشەوەی ئەم بارودۆخەشدا، چەندین بەرپرس و فەرماندەی قارەمانی یەکێتیی لەگەل چەندین مەفرەزە پێشمەرگەی بەجەرگدا بەپارتی زانی لەسنووری گەرمیان و قەرەداخ دا مانەوە تاڕاپەڕین، ئەمانە لەمێژووی خەباتی گەلی کورددا سەردەمێکی بێوێنەو پڕلەشانازی و نوێیان دروست کردو هێنایە ئاراوە.

ئێمە ڕانەهاتبووین بەژیان و گوزەرانی ئاوارەیی لەوولاتێکیتردا، ڕاهاتبوین لەسەر ژیانی ئازادو سەربەرز لەسەر چیاو کەس بالادەستمان نەبووە، بۆیە ئەوماوەمان لەوولاتی ئێراندا برێک بەسەختی گوزەراند.

هەرچەندە ئێران وکۆماری ئیسلامی بەبەراورد لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێی کورد یان دۆستانی کورد لەباشوور، لەکاتی ناخۆشیەکان و تەنگانەماندا لەهەموو ئەوانە زیاتر پشتیوان و کۆمەک و هاوکاری کردووین، هی هەموو حیزب ولایەنە سیاسیەکان بەبێ جیاوازی.

من لەو ئاوارەیەشدا بێکار نەبووم، دانیشم وەک هاوولاتیەکی مەدەنی، سەرەتای پاشەکشەو تا دامەزرانەوەو جێگیر بوون وەک بەرپرسی هێزەکانی کەوتبوونە سنووری هەورامان لەشاری پاوەو دەوروبەری کارم ئەکرد لەگەڵ هاورێکانم بۆ ورە بەرزکردنەوەیان، بۆ کۆکردنەوەو جێگیرکردنیان بەتایبەت ئەوانەی سەڵت و گەنج بوون چونکە خۆشم سەڵت بووم. پێم ئەوتن ئەم قۆناخەو ئەم پاشەکشەو شکانە کاتیە، هەرلەوماوەدا حکومەتی عێراق لێبووردنی گشتی دەرکرد، بەلێشاو خەلکو لەگەلیشیاندا پێشمەرگە تەسلیم ئەبوونەوە، لەنزیک شاری پاوەدا وێستگەیەکی گواستنەوەی ئەو خەلکە هەبوو بۆسەر مەرزی شۆشمێ، من ڕۆژانە ئەچومە ئەوێ قسەم لەگەڵ خەلکو ئەوکەسانەدا ئەکرد کەئەگەڕانەوە بۆ عێراق، خەلکی زۆرم پەشیمان ئەکردەوە، بەتایبەت پێشمەرگە، هەندێکیش ڕووبەڕووم ئەبوونەوە ئەیانووت ماڵتان وێران کردین لێرەش لێناگەڕێن وازمان لێبهێنە حەمەی حەمەسەعید بابڕۆینەوە بەعس بمانکوژێ لەئاوارەیی باشترە.

دواتر کرام بەبەرپرسی پەیوەندیەکانی یەکێتیی نیشتمانی و ئێران لەشاری مەریوان ئەوماوەش لەوێ بەردەوام خەریکی ئیشووکار بووم تا دروست کردنی تەشکیلاتی نوێ و زیاتر ئامادەکردن و ڕێکخستنەوەی پێشمەرگە لەبەتالیۆن و تیپەکاندا، دووبارە گەڕامەوە بۆپاوەو خەریکی ئەو ئەرکە بووم. دوای ئامادە کردن و ڕێکخستنەوەی تیپی ١١ی هەورامان، ئەوە بوو دواجار لەگەڵ چەند هاورێیەکمدا بەر لەڕاپەڕین بەپارتی زانی گەڕاینەوە بۆکوردستانی باشوورو لەقۆپی قەرەداغ جێگیر بووین ولەوێوە دەستمان بەکارکردن کرد بۆ سازدانی خەلک و ڕاپەڕین.

# کۆنفرانسی ناوچەیی
# ۱۹۹۰/۱۲/۱ لە شاری پاوە

دوای کۆبوونەوەکەی مام جەلال لەدەربەن دزلی و بڕیاری تەشکیلاتی نوێی بۆ هێزی پێشمەرگە لە ۱۹۸۹/۹/۲۰، بۆ دروست کردنی بەتالیۆنەکان لەناو ئێراندا ودوای بڕیاردان لەسەر یەکگرتنەوەی کۆمەڵەو شۆڕش گێڕان[1]، تیپی ۱۱ی هەورامان و بەشێک لەتیپەکانی ۵۳ی شێروانە و۵۱ی گەرمیان کرانە بەتالیۆنێک، بەتالیۆنەکە پێکهاتبوو لەسێ تیپ وچەند ئۆرگان وبەشیتر، بارەگای بەتالیۆن هاتە شاری پاوە بۆلای بارەگای ۱۱ی هەورامان، ئەوفەرماندەو پێشمەرگانەی لێرەدا ناویان هاتووە سەر بەم بەتالیۆنەن، ئامادە کراون و ڕێکخراون بۆ خەباتی ئەوسەردەم و بارودۆخەی لەدوای ئەنفال وکیمیاوی ڕێککەوتنی دوای شەڕی ۸ هەشت ساڵەیی نێوان عێراق و ئێران هاتوەتە ئاراوە، دواتر هەر ئەم هێزە ئامادە کراو سازدرا بۆبەشداری ڕاپەڕینی بەهاری۱۹۹۱، بەرلە ڕاپەڕین چەندین فەرماندە لەم بەتالیۆنەو لەبەتالیۆنەکانی تری یەکێتیی بەشێوەی پارتی زانی هاتینە خوارەوە بۆ ناوچەکانی سلێمانی و دەوروبەری بۆ خۆئامادەکردن و زەمینەسازی لەناو خەڵکدا بۆ ڕاپەڕینەکە.

[1] - ماوەیەک بوو قسە و باس و گفتوگۆ دەکرا لەسەر یەکگرتنەوەی کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان، لەناو هەردوولادا زۆرینە ڕازی بوون، ناڕازی چەند کەسێکی کەم بوون، ئەوانیش لەناو کۆمەڵەدا بوون، دواجار ئەم بابەتە لەکۆبوونەوەی فراوانی قاسمەڕەش لەناوەندی کۆمەڵە ڕۆژی ۱۹۹۰/۱۰/۳۰دا بڕیاری لێدراو تەواو بوو.

# پێکهاتەی تەشکیلاتی بەتالیۆنەکە بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

تەشکیلاتی بەتالیۆن:

| | |
|---|---|
| دەستەی بەتالیۆن | ٣ کەس |
| لێپرسراوی بارەگای بەتالیۆن | ١ کەس |
| بەڕێوەبەریتی | ٥ کەس ١ ل. ب، ٢ نانەوا، ٢ ئاشپەز |
| پشتیوانی | ٢ کەس |
| زانیاری | ٣ کەس |
| بێسیم | ٢ کەس |
| پزیشکی | ٢ کەس |
| دارایی | ١ کەس |
| کیمیاوی | ١ کەس |
| هەندەسە | ٢ کەس |
| شۆفێر | ١ کەس |

..........................................

تەشکیلەی تیپ:

| | |
|---|---|
| - هەر تیپێک | ٣ کەرتە |
| - هەر کەرتێک | ٢ مەفرەزەیە |
| - هەر مەفرەزەیەک | ٧ پ. م |

کەواتە:

| | | |
|---|---|---|
| -هەر کەرتێک بە ف. ک و ج. ک دەبێتە: | | ١٦ پ. م |
| -هەر تیپێک بە ف. ت١ و ف. ت٢ دەبێتە: | | ٥٠ پ. م |
| -مەفرەزەکانی بارەگای بەتالیۆن کە ١١ بەشن دەکەنە | | ٢٣ پ. م |
| -سەرجەمی بەتالیۆن ئەکاتە: ٢٣+٣×٥٠ | = | ١٧٣ کەس |

-چەک دابەشکردن بەسەر تیپەکاندا بەم شێوە بوو:

هەر تیپێک ٣٢ کلا ێشینکۆف + ٦ ئارپیجی + ٦ رەشاشی دەدرێتی ێ.

..........................................

پێشمەرگەکانی بەتالیۆنی یەک

بارەگای بەتالیۆن:

| | |
|---|---|
| مەحمود حەمەئەمین عەلی/ م. سەنگاوی | فەرماندەی بەتالیۆن |
| عەلی عەبدوللا کاکە ئەحمەد/ م. عەلی | جێگری ف. بەتالیۆن |
| سەلاح محەممەد فەرەج/ سەلاح کوێخا | رابەر سیاسی |
| مەنسوور ئەنوەر بەگ | لێپرسراوی بارەگای بەتالیۆن |
| جوامێر رەشید ئەمین | لێپرسراوی دارایی |
| نوری حسێن مەحمود | بي ئ سیم |
| رەحیم قادر مستەفا | بي ئسیم |
| ئیبراهیم مەدحەت جومعە | پشتیوانی |
| یوسف عەزیز عەلی | پشتیوانی |
| بەرزان محەممەد فەرەج | زانیاری |
| حەمە یوسف نەجمدین رەشید | زانیاری |
| حسێن حەسەن محەممەد | زانیاری |
| رۆستەم محەممەد نادر | کیمیاوی |
| حەقی محەممەد ئەحمەد | هەندەسە |
| مەجید محەممەد مەولود | هەندەسە |
| قاسم محەممەد وەهاب | پزیشکی |
| فارس محەممەد عەبدوللا | پزیشکی |
| خالید ئەحمەد ئەمین | ئیدارە |
| حسێن یوسف ئەحمەد | شۆفێر |
| شوکر ئەحمەد محەممەد | ئاشپەز |
| سەعید سالح کەریم | ئاشپەز |
| جەلال جەبار عەباس | نانەوا |
| حەسەن شەریف فەرهاد | نانەوا |

.................................................

* پێشمەرگەکانی تیپی ۱۱ هەورامان

| | |
|---|---|
| حەمەی حەمە سەعید عەلی | فەرماندەی یەکەمی تیپ. ت۱ |
| ئەکبەر سان ئەحمەد | ف. ت۲ |
| عەبدولکەریم عەبدولرەحمان محەممەد | ف. ک۱ فەرماندە کەرتی یەکەم |

| | | |
|---|---|---|
| نەبەز حسێن محەممەد | ف. ک١ | |
| ئەکرەم ئەحمەد قادر | ف. ک١ | |
| کەیکاوس حەمە رەشید عیسا | ف. ک١ | |
| خەلیل مەحمود کەریم | ف. ک٢ | فەرماندە کەرتی دووەم |
| رەفعەت جەعفەر محەممەد | ف. ک٢ | |
| مەهدی سەعید عەلی | ف. ک٢ | |
| ئەنوەر عوسمان عەلی | ف. ک | |
| خالید سالح عەبدوللا | ف. ک | |
| کەریم محەممەد کاکەخان | ج. ف. ک | |
| بێستوون محەممەد قادر | ف.م | فەرماندەی مەفرەزە |
| عوسمان فەرەج نادر | ف.م | |
| ئیسماعیل ئەمین قادر | ف.م | |
| عەبدوللا عومەر حەمەئەمین | ف.م | |
| سەباح مەحمود حەمەئەمین | ف.م | |
| تەحسین مەجید عیزەت | ف.م | |
| ئەسکەندەر فەرەج محەممەد | پێشمەرگە | پ. م |
| ئامانج محسن قادر | | |
| بەکر شەریف محەممەد | | |
| هادی عەبدوللا عەزیز | | |
| ئقبال سەعید عەلی | | |
| هادی سەعید عەلی | | |
| وریا عەبدولخالق حەسەن | | |
| حەسەن عەبدولرەحمان عەبدوللا | | |
| سابیر رەشید عەزیز | | |
| کامل عەبدولرەحمان عەزیز | | |
| مەحمود عەبدولرەحمان ئەحمەد | | |
| سەردار شەوکەت حەمەحسێن | | |

فەلاح ئەفراسیاب عەلی
فایەق محەممەد نادر
ساحیب جەعفەر محەممەد
فەهمی عەبدولخالق حەسەن
فاروق مەحمود کەریم
شاهۆ عەلی عەزیز
غەفار فایەق حەمەساڵح
نوەر محەممەد عەبدولمحەممەد
جەزا عەبدولڕەحمان عەزیز
غەریب کەریم ڕەزا
عوسمان عومەر عەبدوللا
محەممەد کەریم ڕەزا
سەلام فەتاح عەبدولمحەممەد
عەباس عەبدولمحەممەد میرئەحمەد
عومەر عوسمان عەلی
کەمال حسێن ئەحمەد
ئیحسان حسێن یونس
سەلاح عەزیز نادر
عەبدولڕەحمان کەریم محەممەد
فەتاح مەحمود نادر
سەلاح حەسەن ڕەشید
ئیبراهیم عەلی حسێن
عەلادین عومەر عەبدوللا
مەحمود فەتاح عەبدولمحەممەد
عوسمان فەتاح عەبدولمحەممەد
نەبەز جەمال عەبدولڕەحمان
ئەسکەندەر حەمەئەمین ڕەحمان
کەریم یارئەحمەد

ئیبراهیم عومەر حەمەئەمین

عومەر ئەحمەد محەممەد

ئەحمەد عەبدولرەحمان ئەحمەد

هەڵمەت ئەحمەد مەولود

حیکمەت عوسمان عەلی

محەممەد فەتاح عەبدولمحەممەد

سەلاح حسێن حەمەحسێن

نەجم عەبدوللا عەزیز

حەمەعەلی رەشید قادر

ئازاد عومەر حەمەئەمین

..............................................................................

پێشمەرگەکانی تیپی١٢

| | |
|---|---|
| مەحمود عەزیز مەحمود مەحمودی مامە عەزە | فەرماندەی. ت١ |
| سەلام رەسول ێ قادر سەلام شوشە | ف. ت٢ |
| سدیق عەلی تۆفیق | فەرماندەی یەکەمی کەرت. ف.ک١ |
| عەلی محەممەدئەمین مەجید | ف. ک ١ |
| ئەحمەد وەلی مەحمود | ف. ک١ |
| محەممەد نوری ئیسماعیل | ف. ک١ |
| عادل عەبدولقادر رەحیم | فەرماندە کەرتی دووەم. ک٢ |
| مەحمود عەلی رەحمان | ف. ک٢ |
| حسێن حامید عەبدولقادر | ف. ک |
| وریا ئیبراهیم محەممەد | ف. ک |
| جەلال حەمید عەزیز | ف. ک |
| محەممەد سلێمان میرئەحمەد | ف. ک |
| حەسیب ستار حسێن | ف. م فەرماندەی مەفرەزە |
| محەممەد وەلی مەحمود | ف. م |
| شەهاب ئەحمەد حەسەن | ف. م |
| سەباح مەولود عەباس | ف. م |
| ئەحمەد وەهاب حسێن | ف. م |

| | |
|---|---|
| محەممەد ساڵح عەبدولکەریم | ف. م |
| حەسەن حسێن عەلی | ف. م |
| فایەق عەزیز شەهاب | ف. م |
| ڕەزا عەزیز عەبدوڵلا | پ. م پێشمەرگە |

محسن خالید قادر
جەمال عەبدولڕەحمان محەممەد
نەورۆز عەبدولڕەحمان محەممەد
مەحمود محەممەد مەعروف
سیروان ئەحمەد عەلی
ڕەحمان فەتاح محەممەد
حەمەخان سلێمان میرئەحمەد
بەختیار سەعید حەسەن
ڕەمەزان ستار عەلی
حەسەن کەریم مەجید
بەرزان عەلی یوسف
حەسیب لەتیف ئەحمەد
ئەمیر وەهاب حسێن
حەسەن جیهاد ئەمین
کامەران مەجید کەریم
کەریم عەسکەر یارموراد
نەریمان عەزیز مەحمود
کەمال سەعید حەمید
مەجید محەممەد عەلی
ڕێبوار ئەحمەد محەممەد
ئاکۆ محەممەد قادر
عەزیز مەحمود حسێن
نەوزاد ئەحمەد محەممەد
ساڵح مەحمود ئەحمەد
عومەر محەممەدساڵح عەبدولقادر

حسێن عەلی ئەحمەد
عەبدوڵلا عەلی کەریم
سەلاح عەبدولقادر محەممەد
یەحیا رەشید فەرەج
کامەران حامید عەبدولقادر
سەباح حامید عەبدولقادر

.........................................................

پێشمەرگەکانی تیپی١٤

| | |
|---|---|
| سەلام عەزیز محەممەدسەلامی کێخا عەزیز | فەرماندەی یەکەمی تیپ |
| ئەحمەد حەمەسالح محەممەد | ف. ت٢ |
| سدیق مەجید محەممەد | فەرماندەکەرتی یەکەم |
| فایەق عەزیز مەحمود | ف. ک١ |
| ئیسماعیل عەبدوڵلا حەمەخان | ف. ک١ |
| نەوزاد حەمەسالح حەمەئەمین | فەرماندە کەرتی دووەم |
| محەممەد عەبدولرەحمان محەممەد | ف. ک٢ |
| سەعید حەسەن محەممەد | ف. ک٢ |
| تۆفیق رەشید مەحمود | فەرماندەی مەفرەزە |
| رەمەزان محەممەد عەلی | ف. م |
| عەبدول عەبدوڵلا حەسەن | ف. م |
| فازیل ئەحمەد خدر | ف. م |
| شەریف سدیق حەمەجان | ف. م |
| عەبدوڵلا غەفار محەممەد | ف. م |
| ئازاد محەممەد سەعید | پ. م واتەپێشمەرگە |
| شەمال ێ عەبدولرەحمان محەممەد | |
| ئەکرەم سالح عەزیز | |
| عەلی محەممەدسالح عەبدولقادر | |
| داود مەجید محەممەد | |
| حەمید حەمەرەشید حەسەن | |

فارس حەمەڕەشید حەسەن
عەبدوڵلا عەلی رەشید
هادی ئەحمەد مەحمود
کامەران عەلی ئەحمەد
سالح قادر رەحیم
حەسەن ئەحمەد مەحمود
عەتا ئەحمەد مەحمود
سەلاح عەزیز محەممەد
شێرزاد عیزەدین میرزا
ئەمحەد مستەفا مەحمود
محەممەد مەجید عەبدولقادر
عەبدوڵلا سەعید رەشید
حەسەن عەبدوڵلا محەممەد
عەدنان قادر عەلی
سەعید محەممەد کەریم
لەتیف مەجید عەبدولقادر
رەحمان حەمید خورشید
محەممەد قادر مستەفا
سەلاح عەبدوڵلا محەممەد
جەبار عەلی قازی
کەریم رەحمان سەلمان
بورهان کەریم عەلی
محەممەد رەحیم قادر
حسێن محەممەد قاسم
حسێن محەممەد سالح
کەمال عەبدولڕەحمان محەممەد
هەژار عەبدوڵلا ئیبراهیم
هاوار عەبدوڵلا ئیبراهیم

**یەدەکەکانی سنوری بەتالیۆنی یەک:**

یەحیا حەبیب محەممەد ف. کەرت
مەنسوور رەئوف حەسەن
بگموراد شاموراد
ئیدریس حەمەرەشید عەلی
بەرزان حەمەئەمین مستەفا
جەمال عەلی محەممەد
هادی حەمەیوسف محەممەد
حەسەن محەممەد عینایەت
حەمەسەلیم فەتحولا
حەمەرەشید فەرەج نادر
محسن قادر محەممەد
محەممەد ئەبوبەکر قادر
مزەفەر فاتیح فەفار
نیازی عیزەت حەسەن
سەرکەوت سابیر عەلی
عەلی عەبدولرەحمان محەممەد
عەلی عەبدولکەریم محەممەد
عەزیز کەریم رەزا
عومەر ناوخاس قادر
فەتاح محەممەد میرئەحمەد
سالح محەممەد عەبدولقادر
سەلاح تاهیر حەمەئەمین
تەحسین حەسەن محەممەد
رەفیق لایەق مستەفا
عەلی محەممەد فەرەج
مەحمود حسێن مەحمود
عاسی ئادەم کەریم

محسن عەلی خان
عەلی یار ئەحمەد
سەلاح جومعە شوکر
وەلی مەحمود رەمەزان
سەلاح حامید عەبدولقادر
حسێن محەممەد شاوەیس
مخەممەد حسێن محەممەد
ئەحمەد عەزیز موحمود
محەممەد حەسەن حسێن
ئەحمەد عومەر قادر
حیشمەت محەممەد فەتاح
نامیق رەشید فەرەج
ئەحمەد مستەفا ئەحمەد
موختار سەردار مستەفا

.....................................................................

بەرپرس و پێشمەرگە ئیجازە دراوەکان لەسنووری بەتالیۆندا:
قادر مەحمود نادر  قادر کۆکۆیی
جەلال ئە       مین کاکە
رەئوف فەتاح محەممەد
محەممەد ئەحمەد سەنگەری
زەینەلعابدین مەحمود
ستار سالح قادر
نەجم وەلی مەحمود
تالیب عەلی حسێن
محەممەد فایەق عەزیز
مەحمود کەریم ئەحمەد
فەلاح زۆراب عەزیز
حەمەئەمین شەریف کەیانی
محەممەد فەرەج شاسوار

جاسم محەممەد ئەکبەر

.......................................................................................

بریندارەکان: کەم ئەندامەکان

هاشم عەبدولڕەحمان مستەفا

عومەر مەجید کەریم

سالح عەزیز مەحمود

وەلی عەبدولڕەحمان فەرەج

.......................................................................................

پێشمەرگە ریش سپییەکان:

حاجی محەممەد ئەمین محەممەد

حسێن ئەحمەد بەهرام

محەممەد عەلی ئەحمەد

مەحمود نادر مەحمود.

حەمەسەعید عەلی مەولود

عەبدولخالق حەسەن حەمەحسێن

عیزەت حەسەن حەمەحسێن

محەممەد سالح کەریم

عەلی عەبدولقادر عەزیز

فایەق محەممەد حەسەن

مەجید عەبدولقادر عەزیز

.......................................................................................

لەمانگی ١٠/١٩٩٠دا ڕێکخستنەکان لەئۆردوگاکان و پێشمەرگە نوێنەرەکانیان بە هەڵبژاردن دیاری کران بۆبەستنی کۆنفرانسی ناوچەیی بۆدیاری کردن وهەڵبژاردنی نوێنەرانی کۆنگرە، بابەتی سەرەکی کۆنفرانس و کۆنگرەش یەکگرتنەوەی کۆمەڵەو شۆڕش گێڕان وقسەکردن بوو لەسەر خۆئامادە کردن و خۆسازدان بۆ ئەو شێوە خەباتەی دوای ڕێککەوتنی عێراق و ئێران و کۆتاییی هێنان بەجەنگی هەشت ساڵەیان، هەروەها بۆ ئامادە کردن و پەروەردەکردنی هێزێک بوو بۆ ئەگەرەکانی دوای جەنگی دووەمی کەنداو، قسەکردن بوو لەسەر شێوەی تەشکیلاتی نوێی ڕێکخستن.

کۆنفرانسی ئەم بەتالیۆنە لەشاری پاوەی سەربەپاریزگای کرماشان گیرا بەئامادە بوونی کاک کۆسرەت وکۆمیتەی سەرپەرشتی کۆنفرانسەکە، لەکاتی دەنگداندا بەکاندیدەکان، ئەندامانی کۆنفرانس ئەوانەمان سەربەتیپی ۱۱ هەورامان بوون دەنگمان داوو بەکاندیدەکانی تیپەکانی ٥١ و٥٣ بەلام ئەوانەی ئەو دووتیپە دەنگیان تەنیا بەوانەی خۆیان و یەک کەسی ئێمە دابوو، ئەمەش لەکاتی فەرزکردنی دەنگەکاندا دەرکەوت، ئەمە لیستی ناوی ئەو هەڤالانەیە کەلە هەڵبژاردنەکەدا دەنگیان هێنا بۆ نوێنەرایەتی کۆنگرەی یەکی یەکێتیی نیشتمانی کەلەدوای راپەرین لەسلێمانی و هەولێر ئەوکۆنگرە بەسترا.

لیستی نوێنەرەکانی گەرمیان و شارەزوور بۆ کۆنگرە: ١- مەحمودسەنگاوی ١٩٦ دەنگ، ٢- مامۆستا عەلی ١٨٣ دەنگ، ٣- مامۆستا جوامێر ١٨٧دەنگ، ٤- عوسمانی حاجی مەحمود ١٣٢ دەنگ، ٥- سەلاحی کویخا ١٠١دەنگ، ٦- ئەکبەر سان١٠٠دەنگ، ٧- مەحمود کەریم ٩٣دەنگ، ٨- حەسەن جیهاد ٩٠دەنگ، ٩- حەمەی حەمەسەعید ٨٧ دەنگ، ١٠- ئاسۆی شێخ نوری ٧٩ دەنگ، ١١- دڵشاد ٧٩ دەنگ، ١٢- کەمال هەورامی ٧٥ دەنگ، ١٣- شێرزاد باوەنوری ٧١دەنگ، ١٤- هاوڕێ مەجید ٧٠ دەنگ، ١٥- مەلاسەعید ٦٧دەنگ، ١٦- نیازی عیزەت ٦٤ دەنگ.

.لەم کۆنفرانسەدا حەمەی فەتاح تریفەی یەکێک بوو لەئەندامانی کۆنفرانس نامەیەکی خوێندەوە سەرەتا گلەیی بوو لەبەرپرسەکان و ئەو باروو دۆخەی بەسەرماندا هاتووە، دواتر ئامۆژگاری بوو بۆ هەڤالان تا لەگەڵ یەکتردا واز لە دژایەتیکردن و ململانێ بێنن و تەباو برابن. لەم هەڵبژاردنەی نوێنەرەکانی کۆنگرەدا ئێمە دەنگمان دابوو بەنوێنەرانی تیپەکانی ٥١ و ٥٣ ئەوان دەنگیان نەدابوو بەئێمە لە ١١ی هەورامان.

هەروەها ئەم هەڤالانەی خوارەوە بۆئیش و کاری رێکخستنی ئوردوگاکان و نوێنەرانیان بۆ کۆنگرە هەڵبژێردران، ١- غەزالی مەحمود ٤٢ دەنگ، ٢- مەلاسالحی هەڵەبجەیی ٤١ دەنگ، ٣- وەهبی پاشا نامدار ٣٤ دەنگ، ٤- عوسمانی عەلی عارف ٣١ دەنگ.

# داگیرکردنی کوەیت

لە دوای خۆ ڕێکخستنەوە و تەشکیلاتی نوێ و خۆ ئامادە کردن بۆ هەر ئەگەرێک، سازوئامادە بوین. عێراق لە ١٩٩٠/٨/٢ دا پەلاماری وڵاتی کوەیتی داو گرتی. ئەمریکاو هاوپەیمانان داوای کشانەوەی عێراقیان کرد لە کوەیت دا، عێراقیش لاری کردو لەبەرامبەردا هەڕەشەی ئەکرد، هاوپەیمانان دەستیان کرد بە لەشکەرکێشی بۆ کەنداو و ناوچەکە.

لەم نێوانەدا چەندین کۆبونەوەو وتوویژ لە نێوان لایەنە پەیوەندی دارەکاندا دەستی پێکرد، تا عێراق بەبێ شەڕ پاشەکشە بکاو وڵاتی کوەیت بەجێ بهێڵێت. وتوویژەکان بێ ئەنجام بوون، بۆیە هاوپەیمانان لە١٩٩١/١/١٧ دا یەکەم گورزی سەربازی هەواییان سراواندە عێراق.

لەم سەروبەندەدا بەرەی کوردستانی زیاتر کارا بوو، کەوتنە کۆڕو کۆبوونەوەو بڕیاردان، بۆ خۆ ئامادەکردن و پەلاماردان لە کاتی پێویستدا، یەکێک لە بڕیارەکان ئامادەکردنی مەفرەزەکانی هاوبەشی پارتیزانی بوون، بەتایبەت مەفرەزەی هاوبەش لە نێوان پارتی و یەکیەتیدا، سەبارەت بە دیاریکردن و چۆنییەتی ناردنی مەفرەزەکان بۆ ناو کوردستان و پەیوەندیکردن بەخەلک و چەکدارە کوردەکانی سەر بەڕژێمەوە، لەناوچە جیاکاکاندا چەندین کۆبوونەوەی هاوبەشکرا بۆ وێنە: لە نێوان مەڵبەندی یەکی یەکێتیی و لقی چواری پارتیدا لە سنووری مەریوان.

یەکیەتی جگە لەم مەفرەزە نوێیانە کەبڕیار بوو بیاننێرێتە خوارەوە، لە خوارەوە مەفرەزەی تری هەبوون و هەر لەوێدا مابوونەوە، سنوورەکانیان بە جێ نەهێشت بوو، بۆیە بۆ ئێمە چوونە خوارەوەو پەیوەندیکردن بەو مەفرەزانەوە ئاسانتر بوو. دیارە لەم کات و سەردەمەدا سەرزەویی سنووری پارێزگای سلێمانی زۆربەی زۆری خاکەکەی چۆڵەوانی و قەدەغە کراو بوو، بۆیە ئاسان نەبوو ئەو مەفرەزانە بمێنەوەو بژین، مانەوە و گوزەرانکردن لە سەر زەویی سووتاو و قەدەغەکراودا هیمەت و خۆڕاگری ئەویست. مێژووی

خەباتی مەفرەزە پارتیزانەکانی یەکیەتی نیشتیمانیی کوردستان لە ٨/٨/ ١٩٨٨ بۆ ١٩٩١/٣/٥ مێژوویێکی بێوێنە بووە لە مێژووی خەباتی گەلاندا.

عێراق لە ماوەی دوو ڕۆژدا تەواو سەرزەویی کوەیتی داگیر و کۆنترۆڵ کرد لە ١٩٩٠/٨/٢ دەستی پێکردو لە ١٩٩٠/٨/٤ دا کۆتایی هات، لەدوای داگیر کردنەکە، سەرەتا عێراق کوەیتی وەکوو وڵاتێکی کۆماری بە ناویی کۆماری کوەیتەوە ڕاگەیاند بە سەرۆکایەتی عەقیدێک بەناویی عەلا حسین خەلال. لەڕۆژی ١٩٩٠/٨/٩ دا ئەو حکومەتەی هەڵوەشندەوەو کوەیتی لکاند بەعێراقەوە کوەیت بوو بەنۆزدەهەمین پارێزگای عێراق، کوەیت بۆ ماوەی حەوت مانگ بە داگیرکراویی مایەوە، لە ڕۆژی ١٩٩١/٩/٢٦ دا هاوپەیمانان کە ٣٢ وڵاتی لەخۆ گرتبوو عێراقیان لەکوەیت وەدەرنا و ڕزگاریان کرد، لێدانەکانی هێزە هواییەکانی هاوپەیمانان بۆ سەر هێزەکانی عێراق لە ١٩٩١/١/١٧ وە تا ١٩٩١/٢/٢٨ خایاند، کە ئەکاتە نزیکەی ٤٣ ڕۆژ، لەو چل و سێ ڕۆژەدا ١٠٩٨٧٦ لێدانیان (غارەیان) ئەنجامدا، لەم لێدانانەدا ٦٠٦٢٤ تۆن بۆمبایان بەکار هێنا.

هێزەکانی عێراق کە لە کوەیت شکان و هەڵهاتن چەند شوێنێکیشیان لە باشووری عێراق بەجێهێشت. بۆیە بەشێک لەناوچەکانی شیعە نشین ڕاپەڕینیان کرد بەدژی ڕژێمی عێراق.

لە کوردستانیشدا خەڵکی هەرچوار پارێزگاکانی سلێمانی و هەولێر و دهۆک و کەرکووک بەهەماهەنگی هێزی پێشمەرگەی کوردستان ڕاپەڕین و بەشێکی زۆری خاکی کوردستانی باشووریان ڕزگار کرد. بەڵام بەهۆی بارودۆخی سیاسی ئەوسەردەمەو ئەوبیرو بۆچوونەی ئەو سەردەمەی ئەمریکا سەبارەت بە عێراق و ناوچەکە زیاتر لە سەر عێراق نەهاتن و وازیان لێهێنا مەبەستیان تەنیا دەرکردنی بوو لە کوەیتدا، عێراقیش کە ئەمە تێگەیشت زوو جووڵانەوەکەی باشووری سەرکووتکردو لە باکووریش دەستی بە سەر ناوەندی پارێزگای کەرکوکدا گرتەوە.

ئەوە بوو بۆ پارێزگاری لە کوردەکان هاوپەیمانان ناوچەیێکیان بە ناونیشانی ناوچەی ئارام و دژەفڕین بۆ ئێمە دروست کرد کە سەرووی هێڵی ٣٦ ئەگرتەوە.

# مەفرەزەکانی پارتیزانی

لە دوای کۆبوونەوەکان بۆ دیاریکردن و ناردنەخوارەوەی مەفرەزە هاوبەشەکان لە مانگی ۱۹۹۱/۱۲ دا من لە پاوەوە گەیشتمە سنووری دزلی و مەریوان بۆ لای بتالیۆنی سنووری شارەزوورو مەڵبەندی یەک، دوومانگ بەرلەم بەرواره مەفرەزەیەکی تیپی ١٥ی شارەزوور دابەزیبوون بۆ سنووری شارباژێرو لەلایەن ڕژێمەوە گیرابوون[1]. لە نێوان هەردوو بەتالیۆنی گەرمیان و شارەزووردا وا بڕیار درا تیپی یانزەی هەورامان هێزەکەی لەپاوەوە بگوێزرێتەوە بۆ کانی خەیاران و دۆڵەناو بۆلای هێزەکانی بتالیۆنی شارەزوور، ئەمەیش لەبەر ئەوە بوو بتالیۆنی گەرمیان لەکاتی هاتنەخوارەوەو ڕاپەڕیندا لە پاوەوە دەبێت بڕۆنە سنووری لای تازاوای سەلاسی باوەجانی و لە وێوە سنوور ببڕن و بگەنە ناوچەکانی دەربەندیخان، باوەنوور، کەلار و کفری. بەتالیۆنی شارەزووریش لەلای دزلی و مەریوانەوە لەچیای

---

[1] لەڕۆژی۱۹۸۹/۱۱/۲دا مەفرەزەکەی تیپی ١٥ی شارەزوور کە پێک هاتبوو لە هەڤاڵان حەمەسیاسی، سەرکەوت قاجری، فەخرەدین عەبدوڵا، کەماله خرە، مەلابەکرو دوکتۆر مەحمود دابەزینە خوارەوە بۆسنووری شارەزوورو دوای ماوەیەکی کەم هەموویان گیران. لەم بارەوە سەرکەوت قاجری ووتی : کاک جەبار فرمان بانگی کردینە ماڵی هەڤاڵ جەمیل هەورامی لەکانی دینار لەئێران، ئەرکی بۆ دیاری کردین ، ئەویش دابەزین و گەشتێک بوو بۆ شارەزوورو شارباژێر بۆکۆکردنەوەی هەواڵ و زانیاری. دوای دوو ڕۆژ مانەوەمان لەشارەزوورو چوار ڕۆژ لە دۆڵی گلال، بووین بە دوو بەش، مەلابەکرو کەماله خرە ئەچن بۆهەڵەبجەی تازە، لەوێ ئەچنەماڵی مەلابەکر، دوای دوو ڕۆژ باوکی ئەچێت بۆلای کاربەدەستانی ڕژێم و ئەڵێت کوڕەکەم و کەسێکی تر هاتوون تەسلیم ببنەوە، ئەوان لەوێ تەسلیم بوونەوە. ئێمەش چوار کەسەکەی تر چوین بەرەو شارباژێر ڕۆژی ۱۹۸۹/۱۱/۱۲لە وێڵەدەر بووین و شەوەکەی چەکەکانمان شاردەوەو بەبێچەک ڕۆیشتین بۆ ناوشاری سلێمانی، هەرکە گەیشتینە لای قرگە گیراین، دواتر ووتمان هاتوین تەسلیم ببینەوە بەڵام بڕوایان پێنەکردین و لە۱۹۹۰/٦/٤دا حوکم دراین، لەزیندان دا بووین تا ڕۆژی ۱۹۹٥/۸/٥.

سووریێنەوە دابەزنە سنووری شارەزوور و شارەکانی هەڵەبجەو سەیدسادق و هەڵەبجەی نوێ و کۆمەڵگاکانی ئەسروو باریکە لەگەڵ زەڕاین و عەربەت.

لەم کاتەدا هێزەکانی تیپی یانزەی هەورامان پێویست ئەکات لەم میحوەرەوە بێنە خوارەوە بۆیە لە مانگی ١٩٩١/١ دا گوازرانەوە بۆ لای دۆڵەناو، بەشێکی کەمیان لە پاوەو لای بەتالیۆنی گەرمیان مانەوە، من خۆم کە فەرماندەی تیپەکە بووم لەگەڵ ئەم هێزەدا هاتبوومە سنووری مەریوان بڕیاریش درا خۆم دابەزم بۆ خوارەوە بەپارتیزانی، هێزەکە لەگەڵ هەڤاڵ ئەکبەر ئێناخی و فەرماندە کەرتەکاندا لەدۆڵەناو ئەمێنێنەوە تائەوکاتەی هێزەکان دائەبەزن.

ئەم هێزە هەڤالان جەمیل هەرامی و حامدی حاجی غالی و چەندین فەرماندە تیپ و کەرت و هەڤالانی مەڵبەندیش کە هەڤاڵ شێخ عەلی حەمە سالح و کادرەکانی مەڵبەندی یەکی سلێمانی بوون لەوێ لەسنووری مەریوان لەدزلی و دۆڵەناو و کانی خەیاران چاوڕێی بارووددۆخەکە ئەبن تاکاتی هاتنە خوارەوە دێتە پێش. هەڤاڵ فەرەیدون عەبدولقادر و شێخ جەعفەرو چەندین هەڤاڵیتر سەرپەرشتی هەردوو میحوەرەکە ئەکەن.

میحوەری لای جوانڕۆ بەروە سنووری گەرمیان، میحوەری مەریوان بەرەو شارەزوور، نوێنەرانی هێزەکانی میحوەری شارەزوور بۆ پێکهێنانی مەفرەزەی پارتیزانی نوێ و چوونە خوارەوەیان بۆ لای مەفرەزەکانیتر، ئەم هەڤالانە بۆ ئەومەبەستە پێکەوە بووینە مەفرەزەیێک:

١ - فەلاحی حەمە بۆر جێگری بەتالیۆنی شارەزوور.

٢ - خۆم (حەمەی حەمە سەعید) فەرماندەی تیپی ١١هەورامان.

٣-سەردار ناوتاقی

٤-مەلا ئەحمەدی دزکەرە

٥-شێخ حەمە زیاد

٦-خەلیل سەرکانی

ئەم چوار هەڤاڵەیش هەریەکەو لێپرسراوێتی هێزێکیان لە ئەستۆدایە لە سنووری ئەم میحوەرەدا میحوەری شارەزوور. ئەم مەفرەزە لە ١٩٩١/١/١٠ دا دواکۆبوونەوەی خۆمان کرد لەگەڵ فەرەیدوون عەبدولقادر لە کانی دینار لە نزیک مەریواندا. دوای ئەم کۆبوونەوە کەوتینە ڕێ لەسنووری کانی

خەیاران بەرەو چیای سوورێن و لەوێوە بۆ دەشتی شارەزوور و مەبەست گەیشتن بەچیای قەرەداخە، بەڵام ئێرانییەکان ئێمەیان گێڕایەوە، ئەیانووت ئەبێت ئەم مەفرەزە پارتیزانە پاسدارێک واتە ئەندامێکی قەرارگای ڕەمەزان لەگەڵ خۆتاندا ببەن، ئێمەیش ئامادە نەبووین بۆ بردنی ئەو پاسدارە بۆیە ئەوجارە گەڕاینەوە.

دواتر هەوڵماندا لە سنووری جوانڕۆ بۆ چیای بەمۆ بە دزی ئەوانەوە سنوور ببڕیز و بڕۆین بەڵام نەمانتوانی، جارێکی تر گەڕاینەوە بۆ سنووری مەریوان و هەوڵماندا لە سنووری مەریوان بۆ ناوچەی شلێر لە خاڵی ساوجیەوە بۆ کوخلان دەرباز ببین لەویش سەرکەوتوو نەبووین جارێکی تر گەڕاینەوە بۆ لای دزلی و کانی خەیاران. دواجار هەڤاڵ فەرەیدون ووتی چار نییە لەگەڵ خۆتان یەکێکیان ببەن، ئێمە بیانوومان ئەوە بوو، لە ڕێ پەکی ئەکەوێ و جێی ئەمێنێت، ئێمە خۆمان ئەدەینە دەست ڕێگەی هات و نەهات، ئەگەر بچینە ناوخەڵک بزانن پاسدارمان لەگەڵە ئەترسن وئامادە نین بمانشارنەوە. کەڵکی نەبوو لەبەر ئەوە زیاتر دوا نەکەوین بڕیارمان دا لەگەڵ خۆمان کەسێکیان ببەین، لە ڕۆژی ١٩٩١/١/٢١ دا کەسێکیان هێناو پێیان ناساندین بە ناویی ئەحمەد کوڕێکی باش گورجوگۆڵ و بەهیمەت بوو، لە ڕۆژی ١٩٩١/١/٢٣ دا لە چیای سوورێن دوای بڕینی بەفرێکی زۆر هاتینە ئەم دیوو گەیشتینە بارەگای کەرتێکی تیپی پانزەی شارەزوور، ئەم بارەگا چەند پێشمەرگەیێکی لێبوو بەرپرسەکەیان شەهید سەریاس هاواری بوو، ئەمە تاکە بنکەی هێزەکانی بەتالیۆنی شارەزوورو ئەم مێحوەرە بوو لەخاکی کوردستانی باشووردا، کەئەکەوتە پشت ئاوایی بانیشار، لەم بنکەدا جیهازێکی ڕاکاڵ دانرا بوو بۆ گەیاندنی ئەو هەواڵ و زانیاریانەی کە لەو کەسانە وەر ئەگیرا ڕێیان ئەکەوتە بناری سوورێن و ئەو ناوچەیە ئەوانەش زۆرتر قاچاخچی بوون. کارپێکەری جیهازەکەش بورهانی ئەحمەدبەگی خورماڵی بوو.

لێرەدا بە پێویستی ئەزانم بڵێم ئەو کوبوونەوانەی لە نێوان ئێمەو هەڤاڵانی پارتیدا کرا بوون بۆ ئامادە کردنی مەفرەزەی پارتیزانی هاوبەش، بەڵێنیان دابوو کەهەرکات کەوتینە ڕێ ئەوانیش لە فەرماندەکانی خۆیان چەند کەسێکیان ئامادە کردووە پێکەوە ئەکەوینەڕێ، ڕێکایەکی نەبراوە. هەتا ئەو

ڕۆژەی لە کانی دینار ماڵئاوایمان لە هەڤالان کاک فەرەیدون و شێخ عەلی کرد پێمان ووتن هەڤاڵەکانی پارتی لە کوێن؟ ووتیان لە کانی خەیاران و دوڵە ناو چاوەڕێتان ئەکەن، فەرەیدون داوای لێکردین کە ئاگامان لێیان بێت و هاوکاری تەواویان بکەین. بەڵام کە هاتینە شوێنی ناوبراو لە ڕێگای هەڤالان کاک حامدو کاک جەمیل هەورامیەوە هەڤالانی پارتی ئاگادار کران ئەوە مەفرەزەکەی یەکێتیی ئامادەیە و چاوەڕێ هەڤالانی ئێوە ئەکەن، بابەیانی لە شوێنی دیاری کراو ئامادەبن، کەچی بە گاڵتەجاڕییەوە وتبوویان مەفرەی چی؟؟!!!.

سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٩٩١/١/٢٥ بارەگای پشتی بانی شارمان بەجێ هێشت و کەوتینە ڕێ بەرەو ئاوایی چنارەی بناری سوورێن ئەمە سەرەتای ئەو سەفەرەیە کە دەکەوینەڕێ بەنییەتی گەیشتن بەچیای قەرەداغ و دۆزینەوەی بارەگای مەفرەزەی پارتیزانی هەڤاڵ ڕەئیس لەقۆپی حەمەی هەواس تا لە وێوە دەست بکەین بە ئیش وکاری خۆمان، کە پەیوەندیکردنە بە جەماوەرو چەکدارە کوردەکانی ڕژێمەوە بۆ ئامادەکاری و سازدانیان بۆ ڕۆژی ڕاپەڕین.

هاوکات لەگەڵ کاری مەفرەزە پارتیزانەکاندا لە ناوخۆ و لە شاری و شارۆچکەو کۆمەڵگا زۆرە ملێکاندا، سەرکردایەتی یەکیەتی و مەڵبەند و بەتالیۆن و تیپەکانی پێشمەرگە و ئۆرگانەکانی تر کە لەناو ئێران و لەسەر سنوورەکان و بە تایبەت لە ناوچەکانی شێنێ وناوزەنگ و قاسمەڕەش وتۆژەڵە لە نێوان شاری سەردەشتی کوردستانی ڕۆژهەڵات و شاری قەڵادزەی کوردستانی باشووردا، وە لە ناوچەکانی بانە وبلەکێ لە سنووری مەریوانیش لە دزڵی و کانی خەیاران وە لە ناوچەکانی پاوە و جوانڕۆ و سەلاسی باوەجانی دا جێگیر بوون هەموو لایان کەوتبوونە پەیوەندیکردن بە جەماوەرو هێزە چەکدارەکانی ڕژێم و ڕێکخستنەکانی ناو شارەکانەوە، هەرکەس و لە کاناڵی خۆیەوە ئەمە جگە لە ڕێگای ڕاگەیاندنەوە بە تایبەت ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان کە دەوری یەکجار گرنگی هەبوو لە جۆشدان وخرۆشاندنی کۆمەلانی خەڵکی کوردستنادا بۆ ڕاپەڕین.

ئەم پەیوەندی کردنانەش زۆرتر لەڕێگەی ئەو قاچاخچیانەوە بوو کە عێراق خۆی لە سەر سنوورەکاندا چەند بازارێکی بۆ کردبوونەوە بۆ هێنانی

خۆراک لە ئێرانەوە چونکە عێراق ئابلۆقەی ئابووری لەسەر بوو گرانی ب لاوە بووەوە لە ناو کۆمەلانی خەلکدا.

بۆ سنووری میحوەری شارەزوور و سلێمانی و هەتا گەرمیانیش ئەو بازارەی کە لە گوخلان لە سەر سنوور لە ناوچەی شلێر کەلکی لێوەرئەگیرا بۆ پەیوەندیکردن و ئاگادارکردنی خەلک بۆ راپەرین، هەڤالان نامەو نووسراوەکانی خۆیان لەگەل دەقی ئەو نووسراوەی مەکتەبی سیاسی ئەناردە خوارەوە، نووسراوەکەی مەکتەبی سیاسی یەکیەتی زیاتر بۆ مستەشارو بەرپرسەکانی فەوج و مەفرەزەو ئۆرگانەکانی حیزبی بەعس بوون، کە تیایدا یەکەم دلنیایان ئەکات لە هەموو تاوانێک بەخشراون دووەم داوایان لێئەکات هاوکاری خەلکبن لە کاتی راپەریندا.

نامەو راسپاردەو نووسراوەکانی هەڤالانیش خۆیان بۆ ئاگادار کردنی شانەکانی رێکخستن و پێشمەرگە دابراوەکان و سەرۆک هۆزەکان و بنەمالە تێکۆشەرو ناسراو دیارەکان بوو. لەم رێگەوە رێگای مەریوان گوخلان بۆناوشاری سلێمانی و شارۆچکەو کۆمەلگاکان، هێلێکی چالاک هەبوو کە هەڤال عوسمان سوفی حەمە کەریم هەورامی بەرپرسی بوو، سەرئەنجام خۆی و بەشێک لە هاوکارەکانیشی گیران و لە بەندیخانە بوون تا رۆژی راپەرین کە لە ١٩٩١/٣/٧ دا لە ئەمنە سوورەکە خەلک و پێشمەرگە رزگاریان کردن.[1]

---

[1]- گوخلان بازارێکی گواستنەوەی کەلوپەلی خۆراکی بوو لە ئێرانەوە بۆ عێراق، قاچاخچیەیکانی دیوی ئێران بەشێکیان ئێرانی و بەشێکیشیان عێراقی ئاوارەی ئێران بوون. ئەو قاچاخچیانەشی، کە لە عێراقەوە ئەهاتن بۆ گوخلان زۆربەی زۆریان عێراقی و دانیشتووی شارەکانی سلێمانی و دەوروو‌بەری بوون، بەشکی کەمیشیان ئێرانی بوون، کە پەنابەر بوون لە عێراقدا و کاریان بۆ موخابرات دەزگای هەوالگری عێراق ئەکرد. ئەو قاچاخچیانەی دیوی عێراق لە سلێمانییەوە تا پێنجوێن لەوێشەوە بۆ شلێرو تا گەیشتی بەخالی سنووری گوخلان دەبوو بەناو سوپاو هێزە چەکدارەکانی عێراقدا هاتووچۆیان ئەکرد، بێگوومان هەموویان بە بێ جیاوازی ئەوانە کە دۆست و هەتا ئەندامانی رێکخستنی لایەنەکانی کوردستانیش بوون لە ژێر چاودێری و راستەوخۆ لەلایەن داموودەزگاکانی هەوالگری و موخابراتەوە سەرپەرشتی ئەکران. لەم کاتەدا و پێشتریش جاروبار لێرەو لەوێ قاچاخچی یان هەندێک کەس بەناویی کەس وکاری پێشمەرگەوە هاتووچۆیان دەکرد بۆ سەر سنوورەکان و بۆ لای پێشمەرگە ئەوانەش هەر لە لایان رژێمەوە ئەنێردران بە

بەڵێ بابێینەوە سەر باسی سەفەرەکەمان، دوای ئەوەی بەرزاییەکانی بەبەفر داپۆشراوی چیای سورێنمان بەجێهێشت وبەدامێنی خاڵخاڵ بووی سورێندا هاتینەخوارەوە گەشتینە نزیک کەلاوەکانی ئاوایی چنارە، باشەوەم لەبیر نەچێ کاتێک لەبارەگا بچکولەکەی سورێن بووین ئەو بەیانییەی کەهەستاین یەکێک لەهەڤالان جیهازەکەی خۆی کردەوە، بەرێکەوت کەسێک هاتە سەرخەت ووتی من شێخ کەریمی باخم، پێمان ووت ئەمانەوێت لەگەڵ سامان رەئیس قسەبکەین. لەوەڵامدا ووتی لێرە نییە لەگەڵ ئاواتی شێخ جەناب و مامۆستا جەلال چوون بۆشوێنێکیتر، دواتر زانیمان بۆناوشاری سلێمانی چووبوون

---

مەرجی ئەوەی هەواڵ و زانیاری بۆ بەرن. هەڤالانی سنووری میحوەری شارەزوور لە رێگەی ئەم قاچاخچیانەوە بە تایبەت ئەوانەی بازاری گۆخلان راسپاردەو نووسراو نامەکانیان ئەنارد بۆ خوارەوە، بە تایبەت لە رێگەی هێلەکەی عوسمان هەورامییەوە. سەرەتا سەردار حەمە ساڵح هەورامی لەسەر گواستنەوەی ٤٨ نامەو نووسراوە لە گۆخلانەوە بۆ سلێمانی و تەسلیم کردنیان بە عوسمان گیرا. عوسمان بەشیک لە نامە و نوسراوەکان دابەشکردبوو بەسەر پیاوەکانی رژێم و هەندێک لە سەرۆک هۆزو و ئەوکەسانەی کە بۆیان چوو بوو. خۆی گەڕابووەوە بۆ گۆخلان لە گەڕانەوەدا لە دەشتی شارەزوور خۆی و ئەوکەسانەیشی لەگەڵیدان بوو گیرابوون. ئاشکرا بوونەکەشی بەم شیوە بووە: شەوێک نوسراوێکی بردبوو بۆ سەرۆک فەوجێک لە ناو شاری سلێمانیدا بە ناوی ناسح موحەمەد، دوای تەسلیمکردنی نوسراوەکە و قسەکردن لەگەڵیدا، داوای ئۆتۆمۆبێلەکەشی لێکردبوو، ئەویش پێدابوو. ئەمەو نوسراوێکیشی هەر هەمان شەو بردبوو بۆسەرۆک فەوجێکی تر بە ناوی سەباح هاواری. سەباح و ناسیح پێشتر منافەسە و ململانێیان بووە کامیان زیاتر خزمەتی ئەنفالچیەکان بکەن، سەباح دوای ئەوەی نامەکەی لێوەرگرتبوو بەڵێنیشی دابوو لەکاتی راپەڕیندا هاوکاری بکات، عوسمان ماڵئاوایی کردبوو هاتبووە دەرەوە و سەباحیش بە دوایدا هاتبوو، کە ئۆتۆمبێلەکەی ناسحی بینیبوو، بۆ بەیانییەکەی نوسراوەکەو ژمارە و جۆری ئۆتۆمبیلەکەی بردبوو بۆ دائیرەی ئەمن و ووتبووی: ئەمشەو ئەم نووسراوە بەم ئۆتۆمبیلەدا لەلایەن کەسێکی نەناسەوە دراوە بە پاسەوانی بەردەرگاکەم. دەزگای هەواڵگرییش ئۆتۆمبیلەکەیان دۆزیبووەوەو ناسیحیان گرتبوو بەهۆی ئەوشەوە عوسمان ئاشکرا بوو، کە عوسمانیشیان گرت لەگەڵیدا بەهەمەن حەمە رەشید و بەهجەت حاجی عەلی و سیروان حاجی عارفیشیان گرتبوو. بەوەش هەموویان لە بەندیخانە مانەوە تا رۆژی راپەڕین.

ئێمەش تێمان گەیاند کەبەرەو لای ئێوە دێین ئەگەر هیچ ڕووداوێک نەبوو سێ ڕۆژی تر ئەگەینە لاتان.

هەواتاریکی کردووە لەسەرەخۆ بەهێواشی ڕیزمان بەستوەو بەدوای هەڤاڵ خەلیلدا، لەجێگەیەکدا ئێمە دانیشتین خەلیل بەتەنها دابەزیە خوارەتر، بۆئەوەی بەڕۆشنایی چاودێر ڕێگای نێوان ڕەبیەکان بکات، خەلیل خۆی پەناداوەو ئێمەش چاودێری دەکەین، بۆئەوەی تاریکی کرد بزانین لەکوێدایە، لەوکاتەدا ڕمە (ڕەوە) پەزەکێویەک دەرکەوتن نزیک دەبونەوە لەخەلیل. لێڵەی کرد بەرەو سەرکانی ئاوایی چنارە وردە وردە بەڕێوەین، گوێشمان سوکوشل کردووە، دنیا کشوماتە جارجار پێش قەرەوڵ کورکەیەک ئەکاو ئێمەش هەریەکەو لەجێگەی خۆماندا ئەوەستین. گەیشتینە سەر ئاوی کانیاوەکە، لەدەوری خوڕەی ئاوەکە کۆبوینەوە، مەتارەکانمان دەرهێناو ورد ئەبینەوە ئەم خوڕە لەکوێوە دێت، پلوسکی ئاوەکە دیارنییە، دیارە چەندین ساڵ چۆڵەوانی و بێ ڕێبواری، دارو درەختی لەقوپۆشکاو تولەڕێیی باریک باریکی ئاژەڵ وگیان لەبەرە کێویەکان، دیمەنێکی نوێی بەخشیوە بەکانییەکەو وایکردووە ئاوەکە وونە، بەلادانی دارو بەردوو پووشوپەلاش پلووسکەکەمان دۆزیەوە کەمێک بەدیاریەوە وەستاین تاپاک ببێتەوە، ئینجا یەک یەک مەتارەکانمان پڕکرد.

هەریەکەو جگە لەکلاشینکۆفێک و تاقمی ٧-٨ حەوت تا هەشت مەخزەنی پڕلە فیشەک و چەند دانە نارنجۆک و دووربین و مەتارەی ئاو و بێسیمی دەستی و کیسەخەو، کۆڵەپشتێکی ١٠-١٢ دە تا دوانزە کیلۆیمان پێبوو، ئەم کۆڵەپشتە پڕبوو لەکەلوپەل و پێداویستی کەسێکی پارتیزان لەوانە نان خورما شەکروچا لایتی ڕۆشنکەرەوە ڕادیۆ پاتری جلوبەرگ و پێ لاوە گۆرەوی هەتابەکرەو دەرزی.

دوای پشویەکی کورت بەدەستەچەپی کانییەکەدا کەوتینە ڕێ بەتوولەڕێیەکی باریکدا بۆلاشانی نێوان ئاواییەکانی کانی ئاسکان و نەوێ، لەسەر ئەم ڕێگا مەیدانی مین هەیە، بەترسو دڵەڕاوکەوە ئەبێ بەناو مەیدانی مینەکاندا گوزەر بکەین، مەسافەیەکمان لەلای کانیکەوە تاسەر لاشانەکە تەیکردو لەوێوە سەرەو خوار بووینەوە ج ڕووینەدا، بەحسابی ئێمە تەواو مەترسی مین نەما. ئەوانەی پێشەوە وەستان ئەوانەی دواوە هاتن لەوێش

گردبووینەوە خەلیل ئەڵێت وەرنە پێشەوە، سەرئەبەینە نزیکی یەکەوە ئەڵێت لەمەو خوار تائەگەینە دەشت بەسەر بەردا وەرن، لێرەشەوە ماوەیەک بەسەر بەردو دوواتر تاقەتمان نامێنێ ئەکەوینەڕێ چی ئەبێ بابێ تاگەیشتینە تەختای دەشت، لێرە چەند ساتێک پشوو ئەدەین جلوبەرگمان خووساوە ئەوەندە عارەقەمان کردووە، سەرماو کزەبایەک هەڵیکردووە ناهێڵێ پشووەکەمان چەند دەقیقەیەک درێژە بکێشێ بەناچاری کەوتینەوە ڕێ بەبەر دەم ئاوایییە وێرانکراوەکانی نەوێ، بەردەبەل، وڵەسمت و توتاقاچ دا بەرەو سەرجادەی پێنجوێن سەیدسادق.

دوای چەند کاتژمێر لەبڕینی کێڵگەکان و شێلانی قوڕ لەشەقامە سەرەکیەکە سەیدساق پێنجوێن پەڕینەوەو بەرەو چەمی چەقان و ئاوایی وێرانکراوی پەری هێرۆ ڕۆشتین، ئەمە ناوچەی عێلی غەوارەنشینە، لەچەم پەڕینەوەو مەترسی کەوتن بەسەر سەربازگەو ڕەبیەو کەمیندا نەما، من لێرەوە هەنگاوەکانم بەرەبەرە کورت ئەهێنن، ماندوم ماندویەکی تەواو بۆیە کەوتمە بیانوو گرتن، بەهەڤاڵەکانم ووت ئێوە بڕۆن وردەوردە دێم بەدواتاندا، قبوڵیان نەکردو بەدیارمەوە وەستان، کەمێکیتر ڕۆشتین و گەشتینە سەرەتای دۆڵی گلاڵ خۆم دا بەزەویدا، خەلیل و فەلاح وتیان ئێمە پێش ئەکەوین بۆ ئەو ئەشکەوتەی کەبڕیارە لێی بمێنینەوە، ئێوە وردەوردە وەرن، ئەوان ڕۆیشتن سەردار ناوتاقی و حەمەزیاد هەریەکەو شتێکیان بۆ وەرگرتم مەلائەحمەدو ئەحمەدی پاسداریش[1] بەپێوە وەستاون و ئەڵێن کاکە هەستە بابڕۆین واڕۆژمان لێبوەوە منیش ناوچەکە شارەزام و ئەزانم ڕۆژیش بێتەوە ناوچەکە چۆڵەوانییەو جێگەی مەترسی نییە.

پشویەکی دە خولەکیمان داو کەوتینە ڕێ بەرەو کەلاوەکانی ئاوایی ئەشکەوتان، لەمبەرو ئەوبەری ئەم دۆڵەدا چەندین ئەشکەوت هەن، هەربۆیە ئاواییەکەش لەم دۆڵەدا ناونراوە ئەشکەوتان، گەیشتینە جێگەیەک کەسێک

---

[1]- ئەحمەد ئەو پاسدارەیە، کە تا لەگەڵ خۆمان نەمان هێنا ئێران مۆڵەتی نەدا لە مەرز دەرباز ببین، وا ئەمشەو لەدۆڵی گلاڵ بەپێوە وەستاوە بەدیار منەوە، بەبێ ئەوەی هەست بەماندووبوون بکات، من لە مەریوان ئەمووت ئەم پاسدارە بێت لەگەڵمان من ناڕۆم، یەکێک لەبیانوەکانم ئەوە بوو ئەمووت لەڕێگە برناداو جێ ئەمێنێ.

ووتی لێرەوە وەرە کاکە حەمە، دەنگەکە ناسراو نییە، حەمەزیاد ئەڵێت تۆکێیت کاکە؟ وەڵام ئەداتەوە کاک فەلاح و خەلیل منیان ناردوە بەدەمتانەوە. باشە ئەچین و ئەگەینە لای دوای چاکو چۆنی ئەیناسینەوە عومەرە عومەری مەجە هەجیجی خەڵکی ئاوایی رۆستەم بەگ، پێکەوە چووینە سەرەوە بۆناو ئەشکەوتەکە ئەبینین هەڤاڵەکانی خۆمان دانیشتوون بەدیار کوتەی پشکۆوەو چایی ئەخۆنەوەو جگە عومەریش دووکەسی تر لەوێن. دوای حەوانەوە زانیمان هەڤالان کاتێک ئەگەنە دەمی ئەشکەوتەکە ئەبینن پشکۆی ئاگر ئەدرەوشێتەوە لەقولای ئەشکەوتەکەداو لێی ئەچنە پێشەوە ئەبینن سێ کەس لەلای ئاگرەکەدا خەوتوون، لێیان وردئەبنەوە ئەزانن بێچەکن، خەبەریان ئەکەنەوە زۆر ئەترسن هاوار ئەکەن مەمانکوژن لێقەوماوین.

ئەمانە ئێستا دانیشتووی کۆمەڵگاکانی نەسرو باریکەن، لەوێوە بەکۆڵ کەلوپەلی کارەبایی ئەهێنن و شەوێک لێرە ئەمێننەوەو شەوی دواتر ئەپەڕنەوەو ئەچنە سەرسنوور بۆ لای جۆمەرەسی، لەئێرانەوە قاچاخچی دێن بۆلایان و کەرەستەو کەلووپەلی خواردەمەنی وەک برنج وئاردیان بۆ ئەهێنن و دوای ئاڵوگۆڕ کردنی کالاکانیان ئەگەڕێنەوە بەهەمان ڕێگەدا، هەرهاتن و گەڕانەوەیەک سێ تا چوار شەو ڕۆژیان پێئەچێت.

دوای قسەکردن و هەواڵ پرسین و وەرگرتنی چەند زانیاریەک کەبۆ ئێمە پێویست و گرنگ بوو، ئیتر ڕۆژ بوەوە، ئێمە خەوتین و ئەوان بوونە پاسەوانمان، تانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە واتە ڕۆژی ١٩٩١/١/٢٦، نیوەڕۆ هەستاین، چوار ڕۆژ لەوەوبەر من لەکانی دینار لەکەبابخانەکەی عەبەپاوەییدا دوانزە کەبابم جوان پێچابوو بەنانی هەورامیەوە، ئەو نیوەڕۆیە لەکۆڵە پشتەکەمدا دەرمهێناو پێکەوە نانمان خوارد، دوای ئەوە هەندێک نامەو نوسراومان دانێ بۆ هەندێک کەس لەوانەی کەلەبەرنامەی کارمان دابوون، ئێمە هەستاین ماڵئاوایمان لەوان کردو بەرەو دەراوی ئاوایی کۆترمەڕ بەڕێکەوتین.

لەنزیک کۆترمەڕ بەدەستی چەپدا هەڵمانکرد بەدۆڵێکدا، دوای ماوەیەک گەیشتینە ئەشکەوتی زینانە، لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا دانیشتین و دوای حەوانەوە بڕیارماندا ئەمشەویش شەوی٢٦لەسەر١٩٩١/١/٢٧ لەم ئەشکەوتەدا بمێنینەوە، ئیشمان دابەش کرد، دوو کەس ئەشکەوتەکە پاک بکەنەوەو سێ کەسیشمان بچین بۆ دارکۆکردنەوە بۆئاگری شەو ئاغا ئەحمەدی پاسداریش

پاسەوان بێت تائێمە ئیشەکانمان ئەکەین، ئاگرمان گردەوە چاییمان دەمکرد، دوای نان و چا خواردن پاسەوانیمان دانا بەنۆبەت تابەیانی، ئیتر هەرکەسەو ئازادە ئەخەوێت یان نا، ئەمشەو سەرەڕای ئەوە هەرپاسەوانەو لەسەرە پاسەوانی خۆیدا نەیهێشتوە ئاگرەکەمان خامۆش بێت کەچی بەیانی ڕۆژ بوەوە لەخەو هەستاین هەرکەسەو لەبەر خۆیەوە گلەیی لەسەرمای ئەمشەو ئەکات.

ئیمڕۆ ١٩٩١/١/٢٧ پاش نیوەڕۆ ئەشکەوتی زینانەمان بەجێهێشتوو وردەوردەو بەبێدەنگی سەرکەوتین بۆناو کەلاوەکانی ئاوایی مۆریاس، هەڤاڵی پێش قەرەوڵ کورکەی کردو بەئاماژە ووتی دانیشن، ئێمەش بەئاماژە پرسیمان چییەوچی ڕوویدا؟ گوێمان ڕادێرا بەهێواشی سەدای گۆرانی مامۆستا حەسەن زیرەکە، بەلای دەستی چەپدا سەرمان کێشا بۆسەر کەلاوەیەک ئەبینین دووکوڕی گەنجن، سەربازی هەڵاتوون و ناوکەلاوەکەیان پاک کردووەتەوە لێی ڕاکشاون، ئێمەیان بینی زۆرترسان، خەلیل و حەمەزیاد ئەیانناسنەوە، یەکێکیان پێشتر پێشمەرگە بووە لای شەهید کاکەبرا بەرزنجی ناوی عەتایە ماوەیەکیش لای ئەوان دانیشتین و هەندێک قسەمان کردو خەلیل وحەمەزیاد چەند نامەو ڕاسپاردەیەکیان دانێ بیگەیێنن بۆ لای هەندێ دۆست ناسراویان.

بە ڕووناکی هاتینە پشتی شێرەبەرە دەشتی گرێزە و بناری قەرەداغمان لێوە دەرکەوت تا چاو بڕ بکات ئەو دەشتە سەربازگە و سوپای لێیە، بەدووربین خەریکی دۆزینەوەی ڕێگایەکین تاشەو لەنێوان سەربازگەکانەوە جادەی سەرەکی سەید سادق -عەربەت ببڕین وبەرەو سەرچۆمی تانجەڕۆ بڕۆین.

ئەو هەڤاڵانەی شارەزا بوون ووتیان لێرەوە زەحمەتە بۆیە ڕێگامان گۆڕی و تاریکی کرد داگەراین بەدۆڵ ولاشانێکدا بەرەو دۆڵی چەناخچیان، تاریکی باڵی کێشاوە بەسەر ئەم مەملەکەتە سامناک و وەحشەتناکەدا. دوای ماوەیەک ڕێگا بڕین لامپ و بلاجکتۆر دەرکەوتن ئەو ناوەیان ڕۆشن کردوەتەوە هەر ئەڕۆین و پێیان ناگەین گەیشتینە جێگەیەک خەلیل ووتی نزیک بووینەوە لە بازگەکە بۆیە بەلای ڕاستدا بامان داوە و لە شان و باڵێکەوە کەوتینە کەوانەی لامپ و چراخانەکە، دوای بڕینی چەند سەد

مەترێک و نزیک بوونەوە لە ڕێگای سەرەکی چەند سەیارەکی سەربازی بەرەو عەربەت تێپەڕیان کرد و ئێمەش لە پەنا جادەکەدا خۆمان شاردەوە، دوای دەرچوونی ئەوان هەستاین و پەڕینەوە بۆ بەردەم جادەو بەرەو ئاوایی زێڕنجۆ و سەرچۆمی تانجەڕۆ ڕۆیشتین، لێرەوە مەلائەحمدی دزکەرە شارەزاو پێش قەرەوڵە، دوای پەڕینەوە لە چۆمی تانجەڕۆ.

ملمان ناوە بەرەو ڕێگای سەرەکی نێوان سلێمانی و دەربەندیخان دوای نیوەشەو لەژێر پردێکەوە چوینە پشتی جادە لەقەراخ چۆمێکی بچوکەوە کە پردەکەی لەسەر بوو کەوتین بەسەر خەیمەی مەفرەزەیەک جاشی خەفیفەدا کە دیارە پاسەوانی ڕێگاکەبوون، ئەوانەی لە ناو ئەو چادرەدا بوون خەوتبوون ئێمە خۆمان لێلاداو دورکەوتینەوە دواتر لەڕۆژهەڵاتی ئاوایی دزکەرەوە سەرەو ژوور بوینەوە لەوێوە بامان داوە بەرەولای ئاواییەکانی خەرجانەو جۆلانە، ویستمان بچینە ئاوەکەڵە بەڵام کە گەیشتینە بەردەم ئاوایی بەری ئاسۆ ڕووناکی کرد بینیمان ئاوەکەڵەوە دەوروبەری هێزی دوژمنی لێیە بۆیە بە پەلەو بە خێرایی خۆمان دزیەوە بەرەو دەربەند فەقەرە.

گەیشتینە دەربەندەکەو دنیا ڕووناکی کردەوە، لەوێوە کەمێک هەورازتر هەڵکشاین و ماینەوە تا نزیک بە نیوەڕۆ لەوبن گابەردانەدا پشومان دا دواتر سەرکەوتین بۆ سەرشاخ ئاو دیوو بوین بە دیوی دۆڵی دوکان و دووکەرۆدا لە جێگەیەک لە ناو داربەڕاوە بە تەمەن و لق و پۆشکاوەکاندا لێی کەوتین، لە ئاستی ئێمەدا کونێک بووە هەورەکەو تیشکی خۆرەتاوێکی ساردو سڕ لێمان ئەدات، هەموو ڕاکشاوین ئەو پاسدارەی لەگەڵمان بوو دەفتەرو قەڵەمەکەی دەرهێناوەو ناوی دێهاتە ڕووخاوەکاوەکان و ئەو دەشت و دۆڵ و دەرانەی ئەوێت کەبەناویا هاتوین لەسورێنەوە تا ئەم شوێنە منیش خەریکم بۆی بەیان ئەکەم، لەوکاتەدا گوێمان لە دەنگێک بوو، وا لە خوارەوە کەسێکی چەکدار خۆی لە پەنا قەدی داربەڕوویەکدا پەناداوە ئەڵێت ئێوە کێن؟ جەماعەت هەموو ڕاست بوینەوە، توکێت؟ من پێشمەرگەم، ئێمەش پێشمەرگەین، من حەمەی تەلەم (شاهۆ) ئێوە کێن؟ ئێمەش خۆمان پێناساند، هات و یەکترمان لەئامێز گرت، شاهۆ قەدو قیافەیەکی لەڕوو لاواز لەناو جلوبەرکێکی چلکندا، باشە تۆ بە تەنیا ئێمە شەش کەس چۆن دەنگت داین؟

ئاغا لە پشتانەوە دووکەسم داناوە، ئەوانیش هاتن هادی برای و هادی دەرەدۆینی بوون.

تا لای عەسر پێکەوە بووین ئەوان بەرەو ئوردگایی نەسر ملی ڕێگەیان گرت و ئێمەش بەرەو قۆپی قەرەداغ، باران بارین دەستی پێکردو تا گەیشتینە ئاوایی مەسۆیی لای سێوسێنان بە هیلاک چوین، شەو لە کەلاوەکانی مەسۆیدا گەیشتین بەو دوو پێشمەرگەیەکە لە لایەن مەفرەزەکەی ڕەئیسەوە نێردرابوون بە دەمانەوە لە تاریکی شەوو لە ژێر ڕەهێڵەی باران دا بە ناونیشان لەڕێی بێسیمەوە یەکترمان دۆزیەوە، داوامان کرد ماندووین و لەم ناوە بمێنینەوە، وتیان ناتوانین، کەوتینە ڕێ بەرەو دەربەندی قۆپی حەمەی هەواس. ئەم دوو پێشمەرگە یەکێکیان ناوی عەدالەتە خەڵکی ئاوایی سێوسێنان و ئەویتریان ناوی حەمەیە خەڵکی دەربەندیخانە.

نیوەڕۆی ڕۆژی ٢٩/ ١/ ١٩٩١گەیشتینە ئەو بارەگا چکۆلەو پەنهانەی مەفرەزەکی ڕەئیس، شوێنی بارەگاکەیان ئەکەوێتە پشتی قۆپیەکەی حەمەی هەواس لە دۆڵەکەی دەستی ڕاستدا. بارەگاکە بەشێوەیەک چێکراوە تا نەچیتە ناوی نازانی ئەوە شوێنی ژیانی مرۆڤە.

خانووچکەیەکی دوومەتر بە سێ مەترە، لەبن گابەرێک دا دروست کراوە لەناو دار بەرڕووەکاندایە، دەورو پشتی هۆدەکەو سەربان و تەنیشتەکانی بە هەژگ و پرچ و دار داپۆشراوە کە بەنایشیدا بڕۆیت وا ئەزانی ئەمە تەپەیەک هەژگوو پرچ و پەلاشە، ئەم هەڤالانە ژیانێکی سەخت و گوزەرانێکی نالەباریان لەم شوێنەدا بەڕێ کردووە، شەکرو چایی و خۆراکی وەک نوک و فاسۆلیا و دۆشاوی تەماتە و ئاردیان لە چەند جێگەیەکی تردا بە چەند کیلۆمەتر دورتر لە خۆیان لە ژێر گڵدا شاردووەتەوە هەرجارە و بەشی پێویستی خۆیان دەرئەهێنن، تەنیا ڕەئیسیش بەم شتانە ئەزانێت.

چەند ڕۆژ پشووی باشمان دا هیلاکیمان دەرچوو، ئەوان باسی ژیان و گوزەرانی ئەو شێوە پارتیزانیە بۆ ئێمە ئەکەن و کابرای پاسداریش هەر خەریکی یاداشت نووسین و نووسینەوەی قسە وباسەکانی ئەوانە. ماوەیەک لەم شوێنەدا ماینەوە، بڕیار درا ئاغا ئەحمەد کابرای پاسدار بنێردرێت بۆلای پارتیزانەکانی گەرمیان و لەوێوە لە ناوچەی شەرواڵ دڕەو ئەوبەری سیروانەوە بگەڕێتەوە بۆ ئێران، ئێوارەیەک فەلاحی حەمەبۆرو عەدالەت

بردیان و ڕۆیشتن خواحافیزی لە ئێمە کرد، کەوتنە ڕێ بەرەو دیوبی چرچە قە لاوە بۆلای بنکەکەی شەهید حەمە ڕەش.

دوای گەڕانەی ئەوهەڤاڵانە بۆ لای ئێمە خەلیل سەرکانی مەلا ئەحمەد و کاک سەردار ناوتاقی و حمەزیاد چوونە خوارەوە بۆ گەیاندنی نامەکان و پەیوەندی کردن بە جەماوەر و چەکدارەکانی ڕژێمەوە لە سنورەکەدا ئێمەش لە بنکەدا لای ڕەئیس ماینەوەو خواردنمان لە گزی دایە.

ئێوارەیەک عەدالەت ووتی ئەم چیای پشتمان بەڕووی بەلەکەجاڕدا حەیوانی کێوی لێیە، ووتم بمبەرە شوێنەکەیان تا حەیوانێکتان بۆ بکوژم، فەلاح و ئەنوەر دەرەویانیش وتیان ئێمەش دێین لەگەڵتان، دەمە عەسربوو وردە وردە بارانیش ئەبارێت سەرکەوتین، هاتینە سەرشاخ دۆڵی قەرەداغ و سنورەکەمان لێوە دەرکەوت عەدالەت خەریک بوو شوێنی کەڵەکێویەکانم پیشان بدات خۆم چواردانەم چاوکرد، بەئامازە پێم ووتن دانیشن بێدەنگ خۆم چاوم کردون، ئەوان دانیشتن و منیش بەسەختەکەدا داگەڕام و بەپارێز نزیک بوومەوە لێیان، پێیان زانیم سڵەمینەوە دانەیەکی حەوت ساڵم لێخستن، تا ئەوان هاتنە خوار سەرم بڕی و بەدیاریەوە دانیشتم، زۆر گەورە بوو نزیکەی چل کیلۆ گۆشتی هەبوو جەماعەت هەڵیان گرتوو هاتینەوە بۆ خانووچکەکە، بەو لە تاریک بوونی هەوا کەوڵمان کردوو کردمان بە داربەڕوویەک دا، ئاگرێکی گەورەو پشکۆیەکی زۆر کەوتووە، هەرکەس بۆ خۆی گۆشت لێی ئەکاتەوەو ئەبرژێنێ، دوو ڕۆژ ئینجا لایەکی تەواو بوو، بەشی شەهید حەمەڕەشیشمان نارد بۆ ئەدیوو.

# چەپۆکانی دێوانە چەم

هەر لەم ڕۆژانەدا ئاواتی شێخ جەناب و مامۆستا جەلالی شێخ کەریم لە شاری سلێمانیەوە گەڕانەوە بۆ لامان ئەوانیش بڕێک خواردن و شفتەیان هێنابوو. چەند ڕۆژێک پێکەوە بووین لە قوپی ئێمە ڕۆژێک ئەوانمان بەجێهشت و هاتینە خوارەوە بۆ نزیک ئاوەدانی، من و فەلاحی حمە بۆر، عەدالەت هات ڕەوانەی کردین تا دەربەند فەقەرە، لەم هاتنە خوارەوەدا بە هیلاک چووین، لە قوپی بەوحسابە کەئێمە بەرەو ئاوەدانی ئەڕۆین، هیچ خواردنمان نەهێنا لەگەڵ خۆمان ئەوەی هەبوو بەجێمان هێشت بۆ ئەو هەڤاڵانەی لەوێ مانەوە. سەر لە بەیانی نزیک کاتژمێر هەشت لە گەلیەکەی قوپی حەمەی هەواس هاتینە خوارەوە، دوای ئەوە لەچۆمەکە پەڕینەوە گەیشتینە ناو وێرانەی ئاوایی سێوسێنان لەسەر کانیەکە پشومان دا کەمێک برسی بووین، عەدالەت ماوەیەک گەڕا بەو دەووروبەرەدا، ئاسەواری سەربازگەیەک لە تەنیشت کەلاوەکاندا بوو، عەدالەت قوتویەکی کەبسی دۆزیبوەوە تەبسی باینجان بوو، ماوەکەی بەسەر چووە بوو، هەڵی پچڕاند و خواردی بەشی من و فەلاحی دا نەمانوێرا بیخۆین خۆی هەمووی خوارد.

فەلاح دەستی کرد بە کوزەڵە خواردن پێم ووت خراپە بە برسیەتی بیخۆی، دوای ئەوە کەوتینە ڕێوەڵەگەڕاین بەهەورازی پشتی ئاوایدا بۆ سەر شاخ و لەوێوە بۆ ئاوایی قەلا قەیمەز.

کە گەیشتینە سەرشاخ هەوایەکی ساردی هەبوو شەو باران باریبوو برسیەتی زۆری بۆ هێناین کاتێک چۆمی دێوانەمان لێوە دەرکەوت بینیمان ئاوی چۆمەکە هەستاوەو سێ لاوەی سوربووەو بەڕاستی دێوانە چەمەو چەپۆکانییەتی بەمبەرو بەوبەردا، کە گەیشتینە لێواری چۆمەکە ئەبینین سەرپۆپی درەختەکانی ژاڵەو بی لەم بەرو لەوبەری ئاوەکەوە لەناو قوڕاودا بەحاڵ دیارەن، بۆمان دەرکەوت ناتوانین بپەڕینەوە، کەمێک سەرەو خوارو سەرەو ژوورمان بە لێواری ڕووبارەکەدا کرد، بێکەڵک بوو ترس و وەحشەتناکی دایگرتین، چونکە بەو برسیەتیە نەمان ئەتوانی بگەڕێینەوە بۆ

قۆپی، فەلاح و عەدالەت لە جێگەیەکدا دانیشتن من هەورازتر بوومەوە بۆ بەرامبەر ئاوایی شێخ مستەفا تا هەورازتر ئەڕۆیشتم بەری ڕووبارەکە تەسک ئەبووە، بەبێ هیوایی گەڕامەوە گەیشتمەوە لای هەڤالان فەلاح بە ئاماژەی سەروچاو ووتی چیە؟ منیش هەروەک ئەو بەئاماژەی بادانی ملو سەر وەلامم دایەوە بگارنیە.

هەرسێکمان بەرەو خواربوینەوە بەرەو بەردەم ئاوای چالگە، درەنگمان پێبووە کات خەریکە بەرەو عەسر ئەڕوا لە جێگەیەکدا عەدالەت ڕاوەستاو ئێمەش گەیشتینە لای ووتی ئاها ئەوە پانتاییە ئەگەر لەوێدا بواری پەڕینەوەمان نەبێ دڵنیابن ئیتر بوارنیە.

عەدالەت کوڕێکی لاوی تازە پێگەیشتوی بالابەرزی بەخۆوەیە، کەمێکی تر ڕۆیشتین و گەیشتینە ئاست پانتاییەکە دابەزینە خوارەوە بۆ ڕۆخی ئاوەکە، بەبێ پێ لاوە پانتۆڵ داکەندن، عەدالەت چووە ناو ئاوەکە هەر لە یەکەم هەنگاوەوە ئاو تابەر پشتێنگەی ناو قەد هات تەواو بێهیوا بووین، برۆ کاک فەلاح چارنیە یان ئەمانبا یان ئەچینە ئەوبەر، ئەگەر ئەوە نەکەین لەم چۆڵەوانیەدا و بەم برسیەتیە چی ئەکەین؟

عەدالەت کەمێکی تر برۆ بەرەو ناوەڕاست ڕۆیشت و لەجێگەیەکدا ئاو هاتە نزیک ناو شانی فەلاح هاوار ئەکات بگەڕێوە، منیش وتم مەنە نایبات عەدالەت گەیشتە لێواری ئەو بەرو من و فەلاحیش لە ناوەڕاست ئاوەکەداین، عەدالەت چەکو چۆڵەی خۆی داناو هاتەوە ناو ئاوەکە، وەرن وەرن مەترسن هیچ نیە، ئێمە لەسەرخۆ هەنکاو ئەگوازینەوە عەدالەت دەستی درێژ ئەکاو منیش دەستی ئەگرم و فەلاحیش بەدوامدا هاتینە ئەمبەرەوە، من لە دلا حەیوانێکم کردبوو بەمەولود کە ڕزگاربین و ئاونەمان بات لە لێوار ئاوەکەدا وەستاین عەدالەت خۆی کۆکردەوە، هەڵەلەرزین و وردە وردە کەوتینە ڕێ کەلە ڕووبارەکە دورکەوتینەوە لە بەردەم ئەو جادەدا کە لەتلەزەیتەوە ئەچێتە سۆلە، بینیمان جوتێک کورەوی فرێ دراون لەبندار بەڕوویەکی پیرە ساڵدا، دیارە ئەوە کەسێک بەم ناوەدا هەیە، کەمێکی تر ئەچینە پێشەوە سێ قوتوی خاڵی کراوی مەعلەبی ماسی کەوتبوون، ڕەنگە ئەمە هەڤالان سەردار ناو تاقی وەمەلائەحمەد و ئەوان بووبن گەڕابنەوە بۆ لای ئێمە و ئەم ئاوە ڕێگەی

نەدابن، ئەگینا کێزاتی ئەوە ئەکات، بێتە ئەم ناوچە چوونکە سەر زەوی قەدەوغەکراوە محرەمە.

عەدالەت دانیشتوو لە پاڵ قتوەکاندا بە چیلکە خەریکە ئەو گۆشت ماسیەی نوساوە بەبنی قتوەکاندا دەریێەکاو ئەیخاتە سەر زمانی، منیش چەمامەوەو قوتوپەکی خاڵیانم وەرگرت ئەوەی من پارچەیەک گۆشت نوساوە بە لێواری ژێر ئەو بەشەی سەری قتوەکەوە کە هەڵنەپچڕاوە، بەپەنجە دەرم هێنا و خواردم، فەلاحیش سەیرمان ئەکا.

تاریکی کردو باران دایکردەوە هەور ئەگرمێنێ و شەوقی بروسکەو چەخماخە شەوارەمان پێئەکا. زۆر بەناڕەحەت هەورازەکەی لەپێشمانە بڕیمان و سەرکەوتینە سەر شاخی فەقیرە، لەنیوقەدی هەورازەکەدا پشوویەکماندا لەبن داربەڕوویەکدا دانیشتبووین بەڕووی وەریوی پایز لەبنیدا مابوونەوە، من باخەڵی پاڵتۆکەمم پڕکرد لە بەڕوو.

نیوەشەوێکی درەنگ گەیشتینە دەربەندی پشتی ئاوایی دەربەند فەقەرەو لە دەستی ڕاستی دەربەندەکەوە بنزەردێک هەیە نزیک بووینەوە لێی، بەفەلاح وعەدالەتم ووت بۆنی ئاگردێت ووتیان ئاگری چی، کەمێکیتر هاتینە خوارەوە، ڕووناکیەک دەرکەوەت بینیمان ئاگرێک کراوەتەوە کۆمەڵێک بە دەوریدا دانیشتوون، نزیکتر بووینەوە ئەوان بە ئێمە نازانن بە دیاریانەوە وەستاوین زانیمان سەربازی هەڵهاتوو قاچاغن هەموویان ئەناسین خەڵکی ئاوایی بۆینن خزمی شەهید کەیکاوسن، س لاوەمان لێکردن شڵەژان دانیشن مەترسن خۆمانین. لایان دانیشتین و ئاگرەکەمان گەورەتر کرد و خۆمان وشک کردەوە، ئەوانیش بەناسین و بینینی ئێمە گەشانەوە، چاییان لێناوە چاییان داینێ نەئەوان باسی نانخواردن ئەکەن و نە ئێمەش هیچ ئەڵێین.

دووکەسیان خزمی نزیکی کەیکاوس بوون بەناوەکانی سەباح جافر ڕەمەزان و لەتیف مەجید عەزیز بانگم کردنە لاوە ووتم دوای ئێشم پێتانە، ووتیان بەسەر چاو، پێم ووتن بەیانی قسە ئەکەین، ئەی شتێکتان پێ نیە بیخۆین؟. بڕێک سەمونی ڕەش و ڕەقیان داینێ بەچاوە خواردمان لەعێراقدا گرانیە ژیان و گوزەرانی خەڵک خراپە بەبوخچە و تۆشەبەرەکەی ئەمانیشدا دیارە، دواتر لەتیف و سەباح هاتنە لامانەوە بە ئاماژە پێم ووتن قسەمەکەن، بەیانی ڕۆژ بوەوەو لەگەڵ فەلاح بردمانە لاوە، هەواڵی هەندێک دۆست و

ناسراومان لێ پرسین و لە کوێن و چی ئەکەن، ئەوەندەی ئەیانزانی وەڵامیان داینەوە،

لەگەڵ ڕووناک کردنەوەی بەیانی ئێمە خواحافیزیمان لەوان کرد بە سەباح و لەتیف مان ووت بەیانی بۆ لای نیوەڕۆ هەر لەم دەوربەرەین با هەڤاڵەکانتان نەزانن، چووینە ئەو بەری دەربەندەکە و لە ناو قەدی شاخەکەدا لەبن دەوەنەکاندا دانیشتین لەگەڵ فەلاح چەند نامەیەکمان نووسی و لەگەڵ نامەکاندا چەند نوسراوێکی مەکتەبی سیاسیمان نارد بۆ چەند فەرماندە فەوج و سریەی چەکدارانی خەفیفە، دوانیوەڕۆ چووینەوە بنزەردەکە و چەند کەسێک لە سەربازەکان ڕۆیشتبوون و سەباح و لەتیف مابونەوە لەگەڵ چەند کەسی تردا، بانگمان کردن و پێمان ووتن ئەم نامەو نووسراوانەمان بۆ بەرن و بیان دەن بەناسیح ڕەشید برای شەهید کەیکاوس، ئەوانیش ئامادەییان دەربڕی و ناردمانن و ڕۆیشتن، لە نامەکەی ناسح دا نووسیبومان ئەم نوسراوانە بدەرە دەست ئەو کەسانەی کە ناویان نووسراوە لە سەریان.

لە نوسراوێک دا بۆ کاک نورەدینی سەید قادری باخچە نووسیبوومان ئێمە هاتووینەتە خوارەوە تا دوو ڕۆژی تر لە لە نزیک ئاوای شەمە و وێلەکەین، لەڕاستیدا ئێمە لە جێگەیەکدا بووین چاومان لەو ناوچە بوو ئەگینا لەو جێگەدا نەبوین لە نامەکەدا ئاماژەمان پێکرد بوو، ئەوەش لەبەر ئەوە نەوەک ئەم نوسراوە دەست حکومەت بکەوێت بۆ دوو ڕۆژ دواتر کاک نورەدینی سەید قادر ئازادی برای ناردبوو بۆ لامان و کەڵ و پەل و خواردنی زۆری بۆناردبووین، لەکاتی خواردنی ناندا باسی چەند ڕۆژی پێشترە و قتووە ماسیە خاڵیەکانی سەرچۆمی دێوانەمان کرد، ئازاد ووتی من و دوو برادەری تر بووین هاتبووین بۆ ڕاو لەوێدا نانمان خواردبوو.

دووبارە لەگەڵ ئازاد قسەمان کردو چەند نوسراوی ترمان نارد بۆ چەند کەسی تر، لەناو ئەو نوسراوانەدا داوامان لەو دۆستانە ئەکرد خۆیان ئامادەکەن بۆ ڕاپەڕین و ئێمەش نزیکین و هەماهەنگی زیاتر ئەکەین، تا پێیان ئەکرێ لەگەڵ خەڵک بەتایبەت بەرپرسی جاش و فەوج و مەفرەزە چەکدارەکانی ڕژێم دا ئەوانەی دڵنیان لێیان قسە بکەن.

گەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان بنبەردەکەی دەربەند فەقەرەو لە ڕۆژێکی باراناویدا بەدووبین سەیری ئەو دەشتەمان ئەکرد، کەسێک دەرکەوت

بەکۆڵیکەوە هەر چاودێریمان کرد تاگەیشتە کەلاوەکانی ئاوایی دەربەند فەقەرە، عەدالەت چووە خوارەوە بۆ لای زانیمان هەرکەس هەیە بۆ لای ئێمە هاتووە، عەدالەت گەیشتە لای و پێکەوە هاتنە سەرەوە، دوای چاک و چۆنی لەگەڵیا خۆی ناساند ووتی من ناوم ماجد عەبدرەحمانە برازای سەرحەدی خەلیفە یونسم. خواردن و کەلوپەلی بۆ هێنابووین هەڤاڵەکانی ترمان سەردار ناو تاقی و مەلا ئەحمەد لەخوارەوە بوون، ئەوان ناردبوویان تا بزانن ئێمە هاتووینەتە خوارەوە یان نا، بێسیمەکەمان پیلی نەمابوو تا پەیوەندی بکەین، نامەیەکمان بۆ ناردن، ئەوانیش هاتنە سەرەوە هەموویەکمان گرتەوە، ئەوانیش ئیشی باشیان کردبوو، خەڵکی زۆریان بینی بوو ئیتر بەبێترس بنکەیەکمان لەو دەربەندەدا داناو خەڵک هاتووچۆی ئەکردین و پەیوەندیەکانمان زیاترو زۆرتر کرد لەگەڵ ناوشاری سلێمانی و شارۆچکەی عەربەت و هەڵەبجەی تازەو زەرایەن و کۆمەڵگاکانی نەسر و باریکەدا. ئەتوانم بڵێم سەرەتاو سەرمەشقی پەیوەندیەکان و کارئاسانی بۆ سەرکەوتنەکانمان لەتیف و سەباح بوون.

لە رۆژی ٢٠ / ٢ / ١٩٩١دا دووکەس لە ئوردوگایی باریکەوە هاتبوون بۆ ئەو شاخە، ئێمە لە دوورەوە چاومان کردن، بەرێکەوت هاتن بۆ ئەو شوێنەی ئێمەی لێبوو، برادەرەکانم خەوتبوون، من پاسەوان بووم، بە دووربین تەماشام ئەکردن قەفەزی کەویان بەدەستەوە بوو، من خۆم حەشاردا نەوەک لە دورەوە بمبینن و بگەرێنەوە، کە گەیشتنە بەردەمان بانگم کردن وەرن بۆ ئێرە، هەڵوێستەیەکیان کردو وەستان، هەستامە سەرپێ و دووبارە ووتم خۆمانین وەرن، هاتنە پێشەوە چاک و چۆنیان کرد و دانیشتن جەماعەتم بە خەبەر نەکردەوە، لێم پرسین خەڵکی کوێن؟ ووتیان شاربازێر، پرسییم خەیربووە ووتیان بێتاقەتی و بۆ رۆژ بەسەربردن هاتووین، ووتم دیارە راوە کەو ئەکەن؟ ووتیان نەوەڵا، پرسیم ئەی ئەوەنیە کەو و داوتان پێیە، پرسیم لەشاربازێر خەڵکی کوێن ووتیان رەزلە، ووردبوومەوە لە سەرو سیمای یەکێکیان و پرسیم دادە خاوەری خێزانی کاک مستەفا چیتە؟ بە سەرسورمانەوە ووتی خوشکمە، پرسیم ئەی خۆت ناوت چیە؟ ووتی ناوم محەمەد عەبدوڵلا حمەخان ناسراوم بەحەمەی عەبە کۆماسی، ئیتر وردە وردە من پرسیارم ئەکرد و ئەوانیش وەڵامیان ئەدایەوە، برادەرکانیشمان

یەکەیەکە لەخەو هەستان دواجار ووتیان ئەگەر ئیشتان بەئێمە نیە با بڕۆینەوە ووتمان بڕۆن خواتان لەگەڵ، تۆشەبەرەکەیان دانا و ووتیان ئەو نانە بۆ ئێوە، ووتمان بۆ خۆتان بیبەن ئێمە نانمان زۆرە، نەیان برد جێیان هێشت ـ نانێکی رەش بێزۆخ و تام، خەڵک ئەیانووت ئاردەکەی ناوکە خورمایە ئەیهاڕن. لەم ماوەدا هەڤاڵەکانی ترمان هاتنەوە بۆ لامان سەردار ناوتاقی، مەلائەحمەدی دزکەرە، حەمەزیادو خەلیل سەرکانی، چونکە لەم ماوەدا هەواڵ و دەنگوباس وا بڵابوەوە ڕژێم مەرجەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانان قبوڵ ئەکات و لە کوێت ئەکشێتەوە، ئێمە لەم هەواڵە زۆر نیگەران بووین هەتا بارودۆخ وایلێهات تەکبیری چۆنیەتی گەڕانەوەمان بۆ ئێران بکەین، سەرچاوەی هەواڵ وزانیاریمان تەنیا ڕادیۆی جیهانی BBC بوو ئەویش بەشی فارسیەکەی.

# دواجار
# گەیشتین بە ئاوەدانی

بەڵام دوای ئەم هەواڵ و زانیاریانە، دووبارە باردۆخەکە گۆڕاو ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی پەلاماری عێراقیاندا چەند ڕۆژ دوای پەلامار دانەکەی عێراق ئێمە دابەشبوین بە سێ بەش و چووینە خوارەوە هەڤاڵان فەلاح و خەلیل بۆ باریکە و عەربەت، من و حەمەزیادو مەلا ئەحمەد و سەردار ناوتاقی بۆ نەسر و زەڕایەن و هەڵەبجەی تازە بە جیاجیا چووینە خوارەوە،مەلا ئەحمەد و سەردار ناوتاقی زیاتر لە ماڵی خزمەکانی خۆیان دا بوون لە زەڕایەن و نەسردا،خەلیل و فەلاحیش بە هەمان شێوە لای دۆست و ناسراوەکانی خۆیان بوون لە باریکە.

من و حەمەزیادیش لە کۆمەڵگەی نەسر لە ماڵی هاوڕێ عەزیزی کوڕی حاجی فەرج بووین کەخەڵکی ئاوایی گەڵوزن لەبناری چیای تالیەر، لەوێوە شەوانە سەردانی کۆمەڵگای باریکە و زەڕایەنیشمان ئەکرد و لە ماڵی کەس نەئەماینەوە دووبارە ئەگەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان بۆماڵی هاوڕێ عەزیز.

ئێمە بەهۆی شێخ محەمەد چەوتانیەوە ماڵی هاوڕێ عەزیزمان دۆزیبوەوە چونکە بەر لەوەی بێینە خوارەوە شێخ محەمەد هات و چۆی بناری ئەوەکەڵە و دەربەند فەقەرەی ئەکرد بۆ لامان لەگەڵ نەعمانی برای، شێخە پیاوێکی زۆر بەهیمەت و ئازابوو، دەوری باشی هەبوو لەڕێکخستن و ئامادە کردنی خەڵک بۆ ڕاپەڕین، بە داخەوە لە دوای ڕاپەڕین شێخ محەمەد بەهۆی کێشەی کۆمەلایەتیەوە لەگەڵ خزمەکانی خۆی کوژرا.

شەوێک لەگەڵ شێخە لەنەسرەوە چووین بۆ باریکە تەنیا پردێک لە قەرەگۆل هەیە لە سەر ئاوی تانجەڕۆ بازگەی لەسەر بوو، بۆیە ئەبوو لەسەرروی پردەکەوە لە ئاوی تانجەڕۆ بپەڕینەوە ئاوەکەش زۆرساردو ئەو شەوەش باران بوو، هەرچۆن بوو خۆمان گەیاندە ناو کۆمەڵگای باریکە سەرەتا سەردانی ماڵی حەمەڕەشید باریکەیمان کرد، لەوێ ێ لەگەڵ مەحمودی حاجی سالح و جەلالی حاجی کاکەلی و چەند کەسی تر

کۆبوینەوە، ئەمشەو مەلا ئەحمەدی دزکەرەش هاتووە بۆئەم ماڵە، مەحمود زۆر ئەترسا لەنیوەی کۆبوونەوەکەدا بەجێی هێشتین من باش مەحمودم نەئەناسی پرسیم ئەوهاوڕێیەتان چیلێهات؟ مامەڕەشە ووتی بۆ ئەترسی خەبەرمان لێبدات؟ مەترسە ئەگەر ئەو دەساڵی تریش بمرێ ئەوە لەترسی ئەمشەودا مردووە، بەڕێنوێنی کاک حەمەڕەشید سەردانی چەند ماڵێکی ترمان کرد ئێستا لە بیرم نیە، ئەوانە ماڵی کێ بوون.

چەند کاتژمێر شەوی مابوو گەڕاینەوە و دووبارە دامانەوە لە ئاوی تانجەرۆ چوینەوە بۆ نەسر، لەوی سەردانی ماڵی حەمەی مارفی[1] نەمەڵیمان کردو مەلا ئەحمەد لەئێمە جیابوەوە ئێمە گەڕاینەوە بۆ ماڵی هاوڕێ ێ عەزیز.

ئەم چەند ڕۆژە چەندین نامەمان نووسی و پەیوەندیمان بە چەندین کەسەوە کرد لە سلێمانی و هەڵەبجەی تازە، هاوڕی عەزیز و حەمەچەوتانی هەر لە هات و چۆدا بوون. لەھۆڵەکەی ماڵی هاوڕێ عەزیزدا ژێرەکەی ژێر زەمین بوو دەرگای جانتایی هەبوو دائەخراو قاڵی لەسەر ڕاخرابوو، ڕۆژێک نزیک بە نیوەڕۆ دانیشتوانی ناوماڵ شلەژان و هاتن ژوورەکەی ئێمەیان کردووە، پرسیمان چی ڕوویداوە؟ ووتیان مەفرەزەی جەیش شەعبی ئەگەڕێ

---

[1]- حەمەی مارفی نەمەڵی پیاوێکی لێهاتوو نەترس و دڵسۆزو خاوەن سفرەو نان بوو، ماڵی لە کۆمەڵگەی نەسردا بوو، ئاواییەکەی خۆیشیان پێشتر وبەر لە ئەنفال هەر لە سنووری ئەم کۆمەڵگەیەدا بووە. لەبەر ئەوەی لە عێراقدا گرانی هەبوو خۆراک و خواردەمەنی بە ئاسانی بەدەست نەئەهات، بۆ ئێمەی پارتیزانەکان لە مەریوانەوە کاک حامیدی حاجی غالی بە عوسمان هەورامیدا لە ڕێگای گوخلانەوە تەداروکی ئەکردین. ئارد و ڕۆن و شەکر و چایی ئەنارد بۆمان لە گوخلانەوە عوسمان بە ئۆتۆمبێلی عەبدوڵای حاجی عەلیە سووردا ئەیناردە کۆمەڵگەی نەسر بۆ ماڵی حەمەی مارف. ماڵی کاکە حەمە لە کەوانەی کۆمەڵگاکەوە بوو، مەفرەزەکەی هەڤاڵ سامان ڕەئیس گوێ درێژیان هەبوو هەرجارەو دوو پێشمەرگە ئەچوونە خوارەوە بە باری گوێ درێژەکەو بە کۆڵ ئازووقەکەیان لە ماڵی کاکە حەمەوە ئەهێنا بۆ قوپی حەمەی هەواس لە قەرەداغ، دواتر کە نزیک بووینەوە و هاتین بۆ بناری دەربەند فەقەرە ئازووقەکەیان ئەهێنا بۆ ئەوێ بۆمان.

ماڵان ئەپشکنن بە دوای سەربازە هەڵهاتووەکاندا ئەگەڕێن، قاڵیان هەڵ دایەوە دەرگای ژێر زەویەکەیان بەرزکردەوە وتیان بچنە ئەوێوە، من کە سەیری خوارەوەم کرد تاریک و هەواکێشی نەبوو ووتم وەڵا ناچینە ئەوی ئ جا ئەگەر هاتن بۆ ماڵی ئێوە شەڕئەکەین تا بکوژرێن، ئەوە باشترە لەوەی لەو ژێر زەویەدا بخنکێین. ئێوە بچنە دەرەوە دەرگاکەتان داخەن وا ئەزانن کەس لە ماڵەوە نیە، وتیان کابرایەکی مەسئول بلۆکیان لەگەڵە زۆر خراپە دەرگاکە ئەشکێنی ئ ئەیانهێنێتە ژوورەوە، لەم قسەو باسەدا بووین ووتیان ڕۆیشتن بەرەو ئێرە نەهاتن.

دوای کە بارودۆخەکە ئاسایی بوەوە، من زۆر نیگەرانبووم کە چۆن بوینە ئەرک و ناڕەحەتی و مەترسی بۆ سەر ئەم ماڵومناڵە لە دلا ئەمووت ئەمشەو ئەگوازینەوە بۆ جێگەیەکی تر.

لە هاوڕێ عەزیزم پرسی مەسئولی بلۆک چیە؟ ووتی دەوری مختار ئەبینێ و خۆیشی جاشی شەعبیە، ئەم مەسئول بلۆکەی ئێمە مامۆستایەکی هەورامیە، ووتم هەورامی؟ ووتی بەڵی، ووتم ناوی چیە؟ ووتی ناوی مامۆستا مەجیدە؟ ووتم پیاوێکی باڵا مام ناوەندی ڕەشتاڵەیە؟ بەڵی وەڵا خۆیەتی. ئەوە خەڵکی تەوێڵە و ناسراوە کاتی خۆی لە هەڵەبجە دا ڕێکخستن بووە، ئێستا نامەیەکی بۆ ئەنووسم هاوڕێ بۆی بەرە، بۆ خاتری خوا چی ئەنووسی؟ تۆ خەمت نەبێ ئەوە پیاوێکی باشە نامەکەی بدەری ئ و لەگەڵتا دێت بیهێنە بۆ ئێرە. چۆن بەخوا ڕەنگە ئەوە نەبێت تۆ باسی ئەکەی. نا ناونیشانەکە خۆیەتی، بەڵام سەرم سوڕ ئەمێنێ ئەو چۆن بۆتە جەیشی شەعبی و پیاو خراپی ئەکات، چونکە ئەو مامۆستایەو دۆستی ئێمەش بووە، من پرسیم ناوی مەجید حسێن وەیسیە خەڵکی تەوێڵەیە؟ هاوڕێ عەزیز ووتی بامن بڕۆم بپرسم خەڵکی کوێیە؟ ووتم باشە، ڕۆژی دواتر هاوڕێ عەزیز چووە دەرەوە نیوەڕۆ هاتەوە، پارچە کاغەزێکی دایە دەستم لەسەری نوسیبوو مامۆستاکە ناوی سیانی مەجید ئەحمەد نەسرولایەو خەڵکی ئاوایی گوڵپە. حەمە زیاد سەیرێکی کردم و ووتی خەریک بوو ئاشکرامان کەیت بەس نەبوو هاوڕێ عەزیز نامەکەی نەبرد.

ئێوارە لەماڵی هاوڕێ عەزیز گوێمان بۆ ڕادیۆی گەلی کوردستان گرتبوو، ئەم ڕادیۆیە دەوری باشی هەبوو، کۆمەلانی خەڵکی کوردستان

رادیۆی گەلی کوردستان جۆشی دان و خرۆشاندنی و دواجار ڕژاندنییە سەرشەقامەکان و، لەهەموو لایەکەوە پەلاماری دام و دەزگاکانی حیزبی بەعسیان دا، ئەم ئێوارە بەرنامەکانی ڕادیۆ ئەوەبوون ئامادەبن زەماوەند نزیکە.

ئەم شەو چووینەوە بۆ کۆمەڵگای باریکە لەگەڵ شێخ محەمەد سەرەتا چووینە جێگەیەک جەند کەسێکمان بینی لەوێ هەستاین و دەرچووین کوڕێکی گەنج لەگەڵمان هات لەگەڵ شێخ محەمەد پێشمان کەوت بۆ ماڵی سالاری مام نەسە سەرەتا چووینە جێگەیەک پاسەوانی لێبوو فەرمویان کردین دیارە ئاگادار بوون ئەچینە ئەوێ دیوەخان چەند پیاوێکی لێبوو، دانیشتن و چاییان هێنا و کەسێک لەوێ دانیشتبوو دیارە دەم سپی و خزمی نزیکی کاک سالارە ناوی خالید عەبدوڵلا شەریفە پرسی لەحەمە زیاد ئەم برادەرەمان کێیە ووتی ئەمە کاک حەمەی حەمە سەعیدە زیاتر ڕیزی نواندو ووتی دەی فەرموون، منیش لیی نزیک بوومەوە ووتم ئەمانەویت کاک سالار ببینین سەرەتا ووتی لێرە نییە، چیتان هەیە ئەگەر بەئێمە ئەکرێت بەسەر چاو، ئێمەش داوای بەشداری ئەوانمان کرد لەڕاپەڕیندا، ووتمان ئامادەبن و دەورتان هەبێت، لەم کاتەدا من قسەم ئەکرد لەگەڵ ئەو پیاوەدا، دانیشتوانی ناو ماڵەکە هاتوچۆو چووتە چوتێکیان هەبوو، من بەجۆرێکی تر تێگەیشتم، بەئاماژە حەمەزیاد و شێخ محەمەدم تێگەیاند کە وریابن. کابرا ورد و عاقڵ بوو، ووتی هیچ نییە ئێستا سالار دێت بۆلامان، دیارە سالار هەر لەوماڵەو لە هۆدەیەکی تردا بووە، لێرەدا کوڕە گەنجەکەم ناسی عەلی حاجی صالح برازای حاجی ڕۆستەمە دوای چا خواردنێک، کاک سالار هات و ئێمەش هەستاین چاک و چۆنی و ئەم لاو ئەولای یەکترمان ماچکرد، سالار مستەشارەو فەرماندەی فەجی ١٦٦ بوو.

لەگەڵ ئەویشدا قسەکانمان دووبارە کردەوە، سالار جگەرەی ڕۆزمەنی تەقدیم کردین من بێ ئەوەی جگەرە کێشبم لەدەستیم گرت، لەسەر ژێر جگەرەکەی بەردەستم دا دامنا، دووبارە جگەرەیەکی تری داگیرساندو ووتی فەرموو، ووتم ئەوەتا پێت داوم دەست خۆش. پرسی ووتی من چی بکەم؟ ووتمان تۆ هێزەکەت دابەش بکەو ڕۆژی ڕاپەڕین پەلاماری دەزگا ئەمنییەکان بدەن و حەرەس و پاسەوان بۆئیدارە مەدەنییەکان دابنێن خەڵک

تالانیان نەکەن و نەیان سووتێنن، ووتی هێزەکەم لێرە نییە، منیش ووتم ئەی لەکوێیە؟ ووتی لەدوکان واجبمان هەیە. دەی باشە هێزەکە بهێنەرەوە بۆ ئێرە، چۆن ئەبێ ناتوانم ئەوە حکومەتە چۆن شوێنەکە لەخۆمەوە چۆڵ ئەکەم و بەسەر سلێمانیدا ئەیهێنمەوە نابێ نا شتی وا ناکرێ، ئەی لێرە چەکی زیادەت نییە بیدەرە خەڵکەکەی خۆتان و هێزەکەشت لەدووکان ئاگادار بکە شەڕ نەکەن و شوێنەکانیان تەسلیم بکەن، ووتی ئەوەیان بەسەر چاو، خەریکبوو تەکبیری شوین بکەن وایانزانی لای ئەوان ئەمێننەوە ووتمان ئیشمان هەیە ئەڕۆین سوپاس لێرە نابین.

لەوکاتەدا کەسێک هاتە تەنیشت منەوەو ووتی ئەرێ قادر قادرتان لەگەڵ نییە، ووتم نەخێر چ شتێکت هەیە من لەباتی کاک قادر، چوونکە هەمووومان لەبەرەی کوردستانین، ووتی من ڕێکخستنی پارتیم ناوم ئیسماعیل عەبدوللا سەلیمە حەز ئەکەم بزانم بەرنامە چییە و چی بکەین، ووتم ئاگات لەکاک سالار بێت و ورەی بخەنە بەر نەترسێ تازە حکومەت توانا و دەسەلاتی نەماوە لەچەند ڕۆژی داهاتوودا هەموو شاروشارۆچکەکان کۆنترۆڵ ئەکرێن با وەک شێخ سمایلی دەورتان هەبێت لەم ڕاپەڕینەدا،ووتی بەسەر چاو.

ئێمە هەستاین و خواحافیزیمان کرد و لەماڵەکە دوور کەوتینەوە، کوڕە گەنجەکە لەگەڵمان هات تاچووینە کۆلانێکی تر ووتی من ئامادەم هاوکاریتان بکەم ئۆتۆمبێلیشم هەیە ووتم ناوت چییە ووتی عەلی خەڵکی گرێزەم تەماشەم کرد عەلی حاجی ساڵحە لەماڵەکەشدا بینیبوومان ووتمان زۆر باشە، زۆر هەوڵی دا ووتی وەرن بابچینە ماڵی خۆمان لەوێ بمێنەوە ووتمان نائەڕۆین تۆ برۆ خوات لەگەڵ.

کەمێک دوورکەوتەوە حەمەزیاد ووتی بۆ بەئۆتۆمبیلەکەی نەڕۆینەوە بۆ نەسر بابانگی بکەین بزانین ئەتوانێت بمانبات؟

بانگمان کردەوە کەنزیک بوەوە ووتی فەرمون، ووتمان ئەتوانی بەسەیارەکەت بمانبەیت بۆ ئەوبەر بۆلای قەرەگۆل؟ ووتی ئەی چۆن وەرن بابتانبەم، لەگەڵیا ڕۆشتین من بەتەمابووم لانکرۆزی هەبێ کەچووینە لای ماڵیان بینیم ترەیلی فلات بەرد هەڵگری هەیە ئیشی پێکرد و ووتی سەرکەون، هەرسێکمان لەپێشەوە سوار بووین. ووتیان بۆ بەم ئۆتۆمبێلەوە نەچین

بۆمالی شێخ جەمال، ڕۆیشتین نزیک بووینەوە لەماڵەکە عەلی حاجی ساڵحمان لەدوورەوە دانا بەئۆتۆمبیلەکەوە ووتمان ئەگەر هەر ڕووداوێک ڕوویدا تۆ برۆ بەجێمان بهێڵە. چووین بۆ ماڵی کاک جەمالی شێخ نەسرە پیاوێکی بەڕێز و نەترس بوو دوای دانیشتن و چایی خواردن، دەستمان کرد بەقسەکردن ووتمان ئەمانەوێت شێخ برایمی برات ببینین، ووتیان لێرە نییە، بەڵام ئەوەندە خەڵکمان لێرەیە چی ئەرک بکەوێتە سەر ئێمە جێبەجێی بکەین ووتمان ڕاپەڕینەکە نزیکە و هەر ڕوویدا ئێوە پەلاماری دام دەزگاکانی حکومەت بدەن و چەکی زیادەش هەبوو بیدەنە دەست کروکاڵ و دەرودراوسێ پێشمەرگەش زوو دێنەلاتان بۆ ڕێنوێنی و هاوکاریتان دەمانزانی کاک فەلاح و خەلیل لەوناوەن. لەوێش هەستاین و ماڵئاواییمان کردن، عەلی هەر بەدیارمانەوە وەستاوە سواری فلاتەکە بووینەوە، هاتە سەرجادەی گشتی سلیمانی دەربەندی خان دامان لەبازگەی سەر پردەکە پاسەوانێکی لێ بوو سەلامی کردو نەوەستاین کردمانە ئەوبەر لەنزیک کۆمەڵگای نەسر دابەزین و عەلیمان گێڕایەوە بەپێ کەوتینە ڕێ، چووین بۆ گەڕەکێک کەخەڵکی لای مەمەند ئاوای شارباژێر بوون حەمەزیاد ووتی بەحەمە چەوتانی بمانبات بۆ ماڵی عومەری مەلا کۆمەڵێک خزمیان چەکدارن و کروکاڵی زۆریان هەیە باقسەیان لەگەڵ بکەین.

باران ئەبارێت بەرەو گەڕەکی ئەو بنەماڵە ڕۆیشتین، چووینە کۆلانێکەوە لەچەند لاوە میلی تفەنگیان ڕاکێشا کێن کوڕان دەست بەرز بکەنەوە؟ حەمە چەوتانی خۆی پەنادا و ئەویش میلی تفەنگی لێ ڕاکێشانەوە، حەمەمەزیاد ووتی خۆمانین ڕێبوارین، کەسێک بانگی کرد حەمەزیاد ئەوە تۆی؟ ووتی بەڵێ ئەی تۆ سدیقی، ووتی نا حاجی مەحمودم، لێک نزیک بوینەوە لەگەڵ حەمەزیاد چاک و چۆنیان کرد و من و حەمە چەوتانی لەولاوە وەستاوین، حاجی مەحموود چەکدارەکانی ب لاوەە پێکرد و ووتی هەرکەس بڕواتەوە ماڵەوە قەرەباڵخی مەکەن. لەو نزیکانە دەرگای ماڵێکیان کردەوە چووینە ژوورەوە دەستمان کرد بەقسەکرن بۆیان و پێمان وتن ئێمە هاتووین بۆلاتان پێتان بڵێین ئەوە ڕاپەڕین ئەبێت بەشداری بکەن و هاوکاریمان بکەن کەچی خەریک بوو بمانکوژن.

وتیان دوێنێ شەو دزیمان لێ کراوە، ئەمشەوە خۆمان داگرتووە نەوەک دزەکان بێنەوە، ماڵتان ئاوابێت ئەمە ئێوە لەکوێوە پەیدا بوون، منیش ووتم حاجی ڕەنگە لەخەویشتا نەبوبێ حەمەزیاد ئەگاتە ئێرە چۆن یەکسەر بانگت کرد حەمەزیاد، ووتی دەنگیم ناسی. ئەوانیش فەرمویان لێکردین و ووتیان باجێگەتان بۆ چاک بکەین بمێننەوە ووتمان نا ئەڕۆین بەڵام بڕێک نان و شەکر و چایمان بدەنێ ئەمە لەبەر ئەوە وابزانن بۆ دەشت ئەچین، شتەکانیان ئامادە کردو کوڵیان بۆ پێچاینەوە و هەڵمان گرت و خواحافیزیمان لێ کردن بەرەو ماڵی هاوڕێ عەزیز گەڕاینەوە شەو درەنگی کردبوو هاوڕێ هەر خۆی بەخەبەر بوو بێدەنگ دەرگای کردەوە و چووینە ژوورەوە کوڵەکەمان کردەوە نان و شەکر و چا و خورمایان دابوینێ.

بەیانی کەڕۆژ بوەوە، هەستاین ڕادیۆمان کردەوە بەدەنگی زوڵاڵ دەی نەڕاند:

ئێرە دەنگی گەلی کوردستانە..........

زەماوەند......زەماوەند.

ڕاپەڕینە......

زەماوەندی رزگاری و سەرفرازیە وا ڕانییە دەرزازەی ڕاپەڕینی خستە سەر پشت......

دەسا ئێوەش دەرگاکان بکەنەوە و هەڵمەت بەرن........... تا دوای.

ڕۆژی ١٩٩١/٦/٥ بەنهێنی و نیوە ئاشکرا خەڵک ئەهات و سەردانی ئەکردین لەگەڵ هەڤالانی ترمان پەیوەندیمان کرد و ڕۆژی ٧/ ٣/ بەئاشکرا ئێمە لەنەسر هاتینە دەرەوە، خەڵکێکی زۆرمان لێ کۆ بووە، پەلاماری مەرکەزی پۆلیس و دائیرەی ئەمن درا لەوێ شاهۆ حەمەی تەلەو هادی برایم لەناو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا بینییەوە، چەند کارمەندێکی ئەمن ئاسایش کوژرابوون من هەوڵم ئەدا خەڵک نەکوژرێ چەند کەسێک لەژوورەوە خۆیان قایم کردبوو خەڵک لەدەرەوە تەقەیان لەبیناکە ئەکرد، منیش بانگم ئەکرد تەقە مەکەن چونکە لەبەرامبەردا بەرگری نەبوو کەس تەقەی نەئەکرد، لەپڕ یەکێک دەستی گرتم و ووتی وەرە دواوە ئەتکوژن، لە هۆسەو هەراکە دووری

خستمەوە، ئەویش شەهید ئەحمەد سویلەمێشی بوو، حەمە زیادمان دۆزیەوە دوورکەوتینەوە، لەولاوە بەپێ خەڵکێکی زۆر هاتن بەرەو لامان گەیشتین بەیەک کاک سەردار ناوتاقی و مەلا ئەحمەدی دزکەرە بوون لەگەڵ حەمەخانی حاجی داراو نوری ئالانی و نزیکەی ٢٠٠ چەکدار بوو ئەوانیش چوون بەرەو مەرکەز و دائیرەی ئاسایشەکەی نەسر ئێمەش بڕیارمان دا بچینە زەڕایەن و هەڵبجەی تازە هەر لەوێدا عومەری قالە گوڵباخ، حەمە تۆفیق گلالی حەمە قاشتی گەیشتنە لامانو وتیان چی ئەکەن وتمان وەرن ئەچین بۆ زەڕایەن حەمە تۆفیق ووتی ئەوە ماڵی کاک مارف ئاغایە حەز ئەکەم سەردانی بکەن، ووتمان زۆرباشە هەر بەسەر پێوە چاک و چۆنیمان لەگەڵ کاک مارف کرد ئەبینم کاک مارف زۆری پێناخۆشە چووین بۆلای ئەترسێ منیش دڵم دایەوە و ووتم تەواو هیچ نیە، ووتی ناچارێ نەئەبوو بێنە ئێرە، منیش هەواڵی کاک ئازادم پرسی کاک مارف ووتی لێرە نیە، دوایی هاتینە دەرەوە ئەحمەد ووتی لەوێ بووە لەدەرگای پشتەوە ڕۆیشتۆتە دەرەوە، ووتم بۆ؟ ووتی جارێ دڵنیانین بارودۆخەکە بەکوێ دەگات. نەوەستاین و بەرەو سەرجادە، لەسەر جادەی گشتی زەڕایەن قەرەگوڵ کاک عەلی حاجی صالح بەخۆی و فلاتەکەیەوە گەیشتەوە لامان سواربووین بەرەو زەڕایەن، گەیشتینە نزیک زەڕایەن کاروانێکی سەربازی لەدوو دارە و میرەدێ وە هات بەرەو نەسر بڕوات، ئێمە ئەوانمان بینی لامان دایە کەناری ڕێگاکەوە.

هەندێکیان لێمان تێپەڕ بوون و سەیارەیەکی جێب لەلاماندا وەستا پلەدارێک دابەزی ووتی بۆکوێ؟ ووتمان لەنەسر تەقەیەو ئێمە ڕامان کردووە ووتی تەقەکە کێیەو کێ ئەیکات؟ ووتمان پێشمەرگەیە خەڵک ئیدارەکانی حکومەتیان گرتووە.

سواری جێبەکەی بوویەوەو ڕۆیشتن و لەئێمە تێپەربوون زۆر دور نەکەوتنەوە لایان دایە کەناری جادەکەوە، ئێمەش گەیشتینە سەرەتای ماڵەکانی کۆمەڵگای زەڕایەن کەس بەدەرەوە نییە دنیا چۆڵەو ئەڵێی ئەم وڵاتە تەنیا ئێمەی لێین، ئۆتۆمبێلێکی زیلی سەربازی لەقافڵەکە دەرچوو بەرەو لای ئێمە گەڕایەوە، ووتم کاک ئەحمەد بزانە بۆچی گەڕایەوە، ئەحمەد سۆیلەمێشی ئۆتۆمبێلەکەی ڕاگرت و پرسیاری کرد بۆ کوێ؟ وتیان ئامر تەقەمەنی

پێویستە ئەچین بۆی ئەهێنین، ووتم ئەحمەد بلێ مەڕۆن بوەستن، کەمێک ڕامان گرت دوای ووتمان بڕۆن بەڵام نەگەڕێنەوە، سەربازەکان وتیان باشە ڕۆیشتن بەرەو میرەدێ.

لەم کاتەدا ئێمە چووینە ناوماڵەکانی زەڕایەن لەچەند دەرگاماندا پرسیارمان کرد ماڵی حەمەکەریمی حاجی ساڵح کامەیە ماڵێکیان پیشاندایین چووین پیاوێکی لێبوو، ووتی من رەئوفی برای حەمە کەریم فەرموون، ووتمان بۆنایەنە دەرەوە پەلاماری ئەو دام و دەستگایەی حکومەت بدەین لەهەموو شوێنەکان هێزەکانی حکومەت چەککراون، ووتی ئێمە کەسمان نییە و حەمەکەریم لێرە نییە لەدەربەندیخانە، بەجێمان هێشت و خۆمان روومانکردە ئەمنی زەڕایەن، نزیک بوینەوە لەبیناکەو چەند فیشەکێک تەقی و لەنزیک ئێمەدا ئەیاندا لەزەوی برادەرەکانم خۆیان کرد بەکۆلانێکدا منیش خۆم دایە پەنا دیواری بیریک، لەپەنا دیوارەکەدا ئەمویست بزانم ئەو تەقە لەکوێوە ئەکرێ، کابرایەک لەدەرگایەکی بەرامبەرمەوە سەری هێنایە دەر ووتی تەقە نەکەی کاکە دێم بۆلات منیش ووتم وەرە، کەنزیک بوویەوە لێم برێک تێم راماو ووتی کاکەحەمەی حەمەسەعیدیت؟ ووتم بەڵێ تۆ کێیت، ووتی من فاروقی بلەی عەزەی بارامم [1].

ووتی ئەوە دوو برای منن حەرەسی دائیرەی ئەمنن بابانگیان بکەم تەقەنەکەن ووتم باشە برۆ ئەو ڕۆیشت و منیش بانگی حەمەزیادم کرد وەرە بۆ ئێرە لەگەڵ سۆیلەمێشی هاتن و فاروق هاتەوە دوو کوڕی لەگەڵ خۆی

---

[1] - فاروق خەلکی بناری چیای بەمۆیە ئەو ئامر سریەی جاش بووە لە لای ساڵەی خەیات، پێشتر و لەساڵی ۱۹۸۷دا بە ئۆتۆمبێلی خۆی من و شەهید نیازی لە زەڕایەنەوە بردوە بۆ بەردەم ئاوایی ئاوەکەڵە. لەبابەتی سەفەرێک وچەندجار ڕزگاربوون لەمەرگدا باسمکردوە. لەوسەفەرەدا ئێمەی نەناسیبوو کێین و چکارەین؟ مەحمود عەبدوللا هێنا بووی ئێمەی گواستەوە، بەڵام دواتر قسەی بۆ مەهدیە ڕیشە کردبوو، ووتبووی: دوو کەسم بەم ناونیشانە گواستوەتەوە بەناوی سەربازی هەڵهاتوەوە، بەڵام لە پێشمەرگە ئەچوون، مەهدیش پرسیبووی کێ هێناونی؟ فاروقیش وتبووی: مەحمود عەبدوللا هەورامی، مەهدیش لەچەکمەجی ئۆتۆمبێلەکەیدا وێنەیەکی خۆی ومن و نیازی پیشاندابوو وە ووتبووی ئەمانە بوون؟ مەهدێش ووتبووی: ئەوە نیازی و حەمەی حەمەسەعیدن، ئەمرۆ فاروق بەوەدا منی ناسییەوە.

هێنا بوو ووتی ئەوە حەسەن و برایمی برامن نەیانزانیوە تەقەیان کردووە، ئەوانیش ووتیان ئێمە لەسەربان حەرەس بووین و ئەمنەکان لەخوارەوە لەترسی ئەوان تەقەمان کرد ئێستا کەهاتینە خوارەوە چۆڵ بووە و کەسی لێ نەماوە، پرسیم ئەی چیان لێهات ووتیان نازانین بۆکوێ چوون.

ووتم باشە وەرن لەگەڵ برادەرەکانمان هەردووکمان بردن و فاروقیش هات و چووینە ناو حەوشەی بیناکەوە دوو ئوتومبێلی لاندکرۆزی لێ بوو من خەریکی نامە نوسین بووم بۆ حەسەن و برایم کەهەر خۆیان پاسەوانی بیناکەبن تا پێشمەرگە بێت و تەسلیمی کەن، وردە وردە خەڵکیش هاتن و لێمان کۆبونەوە، من نامەکەم تەواو نەکردبوو لەپەنجەرەکانی بیناکەوە گڕی ئاگر کلپەی کردوو ڕامان کردە دەرەوە و نەمانزانی چۆن و کێ بووە بەنزینی ڕژاندبووە بیناکەوە و ئاگریدا، بەجێمان هێشت و هاتینە بەری جادە کەرتی جەیشی شەعبی لێ بوو بەبێ پاسەوان سەرەتا بەخەڵکمان ئەوت وەرن تالانی نەکەن کەس نەیئەوێرا دواتر وایلێهات خەڵک خەریک بوو تفەنگەکەی شانی خۆشم بەرن.

فاروق ووتی بابڕۆینەماڵەوە، گەڕاینەوە بۆلای ماڵی ئەوان گەیشتینە پێشەوە، زمناکۆی کاک کەریمی عەبەی خاسەی شەمێرانی هات و سەیارەی هێنابوو ووتی ئێمە هاتوین بەدواتدا بچینە خوارەوە بۆ هەڵەبجە، جەماعەت هەموو کۆبونەتەوە لەوێن چاوەڕێی تۆ ئەکەن مەبەستی چەندین ئامر فەوجی جاش و ئامرمەفرەزە خاسە بوو. چووینە هەڵەبجەی تازە لەبینای خوێندنگایەکدا خەڵکەکە کۆبونەوە ئێمەش چووین بۆ لایان.

لەم کاتەدا قافڵە سەربازیەکە ئەیویست بەرەو نەسر بڕوات گەڕاوەتەوە لایان داوەتەوە ماڵی بایزی حاجی عەزیز ئەویش مستەشارە من خەریکی قسەکردنم بۆ بەرپرسەکان، کەئەوا حکومەت لەهەموو لایەکەوە خەڵک پەلاماری داوەو دام و دەستگاکانیان چەک کردون شاری سلیمانی و ڕانییە گیراون هێزی پێشمەرگە بەڕێوەیە، بەرەی کوردستانی دروست بووە هەرکەس شارەزووی هەیە ئەچێتە لای هەرحزبێک سەربەخۆ و شارەزوو مەندانەیە لاپەڕەی تازە کراوەتەوە و کەس بۆی نییە تۆڵە لەکەس بکاتەوە......
لەم قسانەدا بوین خەڵکەکە شڵەژان پرسیم چییە؟ ئەو سەدان چەکدارەی لەدەرەوەی بیناکە بوون ملیان ناوە بۆ ژوورەوە دێن ئەڵێن جەیش هات چی

بکەین تەقە بکەین یاننا ؟ ئەوە لەزەڕایەن تەقەدەستی پێکرد. دوای بۆمان دەرکەوت ئەو قافڵە سەربازیە کەچونەتە ماڵی بایز برسیان بووە نانیان پێ داون و کۆمەڵێک سەرباز خەریکی نانخواردن بوون، مەهدی مەحمو، تەیمەز مەهدیە ریشە چەکێکی بیکەیسی لێ فڕاندوون تەقەیان بەدوای ئەودا کردووە.

کۆبوونەوەکەمان لەگەڵ ئەوان تەواو بوو لەوکاتەدا حەمەخانی حاجی دارا هات ووتی من ئیشم بەجەنابت هەیە ووتم فەرموو، ووتی مەلا ئەحمەدو لەتیفی حاجی عەولقادر خزمن تەسلیمی ئەوان بووم، بەڵام من لەتۆ دڵنیام پیاوێکی خاوەنی قسەی خۆتی هاتووم بۆلات، من پارتیم پەیوەندیم بە پارتیەوە هەیە ئێستا چیم لێ ئەکەن و چیم بۆ دائەنێن من ئامادەم و ئەیکەم، تائەوکاتەی پارتی دێتە خوارەوە کەئەوان هاتن ئەچمە لایان تۆ گلەیی نەکەیت ئەمە بەدەنگی بەرزو بەدیار خەڵکەوە ئەوقسانەی کرد منیش ووتم ئێمە راستە یەکێتین بەڵام نوێنەری بەرەی کوردستانین، بەرەی کوردستانی نوسراویان بۆ ناردویت لاپەڕەی سپی کراوەتەوە بۆ هەموو کەس هەرکارە بووە و هەرچی کردووە.

ئەوڕۆیشت و وتیان حەمەی حەسەن و تۆفە شەل نەهاتوون و ئەترسن تۆفە رای کردووە[1]، بەڵام حەمەی حەسەن لەماڵەیەوە ووتویەتی کاکە حەمە بێت لێرە قسەمان بۆ بکات، ئێمەش لەگەڵ زمناکۆ و حەمەکەریم چووین بۆلایان دیتمان ئەوبش خەڵکێکی چەکداری زۆری لەخۆی کۆ کردوەتەوە لەسەر جادە و کۆڵانەکان وەستاون، قسەمان بۆ کردوون و لەگەڵ خۆمان هێنامانن بۆلای ئەوانیتر خەریک بوو خۆر ئاوا بێت کاک حامیدی حاجی خالدیش زوو زوو پەیوەندی ئەکات نزیکتانین هەرچی لەمنە

---

[1] - تۆفە شەل رایکردبوو چووبووە بارەگای ئەو لیوا سەربازییەی، کە بارەگاکەی لە کانیکەوەی گلاڵی نشینی نزیک هەڵەبجەی تازە بوو. لەوکاتەدا من سەرقاڵ بووم نوری ئالانی هات بۆلام چەند پێشنیاری هەبوو یەکێک لەوانە چەککردنی سەربازگە. منیش ووتم: پەلە مەکەن لەچەککردنی عەسکەر، دواتر زانیم نوری و ئەحمەد سۆیلەمیشی چوونەتە سەر لیواکە، ئەبینن لەوێ تۆفە شەلو چەندین جاش وخۆفرۆش، کە لەدەست ئێمە لە زەڕایەن و هەڵەبجەی تازە هەڵهاتبوون کۆبونەتەوەو پەنایان بۆلای ئەو لیوایە هێناوە. تۆفە شەل لەوێش پەلاماری چەکی لێدابوون.

لەبەری تانجەرۆیە لەدەوروبەری موانەکانن، چەند کەسی ناسراومان بەتراکتۆرەوە ناردووە بۆ سەرچەم هاتنەوە و ووتیان چۆڵە و کەسی لێ نییە، ئێمە نازانین کاک فەلاح و خەلیل خەریکی دابینکردنی ئۆتۆمبێلین بۆیان و چوون بەدەمیانەوە بەرەو کانی پانکە و سەیدسادق، بەر لەتاریک بوونی هەوا ئێمەو سەرۆک مەفرەزە و فەوجەکان و چەکدار و خەڵکێکی زۆر لەنزیک ماڵی کاک حەمەسەعیدی حەمەی سان ئەحمەد چاوەڕێی گەیشتنی هێزی پێشمەرگە ئەکەین، لەوکاتەدا خوشکەزایەکی شەهید تۆفیقی حاجی لەگەڵ کوڕێکی تەوێڵەی بەناوی ئیدریس هاتنە پەنامەوە ووتیان چی ئەکەی ئەمانە خەیاڵیان خراپە، چەند کەسێک باسی ئەوە ئەکەن ئەڵێن ئەمانە هەر ئەم دوو کەسەن مەبەستیان من و حەمەزیاد بووە، بابیان گرین حکومەت چۆن ئەڕوخێ دوای دێتەوە هەموومان ئیعدام ئەکەن، منیش ووتم چۆن کێ وائەڵێت؟ ووتیان خۆتان بدزنەوە ئێمە ماڵمان بۆ ئامادە کردوون، منیش ووتم نا چۆن شتی وائەبێت. لەم چوتەچوتەدا بووین حەمەکەریم لەخۆیەوە میلی کلاشینکۆفی ڕاکێشاو بەدەنگی بەرز ووتی من تازە تەسلیم بووم پەشیمان نابمەوە سەدامیش بێتەوە من لەگەڵیان ئەچمە شاخ، خەڵکەکە شڵەژان و چەند کەس ووتیان چییە کاکە چییە؟ حەمەکەریم ووتی ئەمانە ئەڵێن پێشمەرگە نایەت و حکومەت بەیانی هەمووومان ئەگرێ هەر ئەم دوو کەسەن بابیان کوژین، کاک حەمەسەعید، حەمە کەریمی بردەلاوەو ووتی کێ وادەڵێت. کەس نەبوو دیارە حەمە کەریم لەخۆیەوە بۆ خۆبردنە پێشەوە ئەم باسەی دروست کردبوو.

خەڵکیش لەپەسا دێن ئەوا فلان خوێندنگایان سوتان فلان دائیرەیان تالان کرد، گورەپانێک لەتەنیشتمان بوو بەدەیان تراکتۆری دائیرەی کشتوکاڵی لێ دانرابوو هەرکەس سواری تراکتۆرێک ئەبوو ئەیبرد، عالەم خەریکی شرەخۆری و پەلاماردانی ئیدارە و بردنی کەل و پەلی ناوبیناکان بوون، کۆمەڵێک دەستیان بەچەک کردنی سەرباز و پەلاماری سەربازگە و بارەگاکانیان ئەدا ئێمەش لەماڵی کاک سەعید نانی ئێوارەمان خواردوو بەرایی هێزی پێشمەرگەش گەیشتە لامان. سەرەتا هەڤاڵەکانی خۆم لەتیپی ١١گەیشتن وبەیەک شاد بووینەوە، وردە وردە ڕاپەڕین هەموو شارو شارۆچکەکانی کوردستانی گرتەوەو ڕزگار کران بەکەرکوکیشەوە .

# پاشکۆ

لە دەستپێکی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان بەوەدا، کە لە خوێندنەوەی بیرەوەری هەڤاڵەکانمدا بەوە گەیشتم کە بەشێکیان ڕەخنە هەڵدەگرن، بۆیە بەپێویستی دەزانین لە پاشکۆی ئەم بەرهەمەدا زۆر بەکورتی ئاوڕێکیان لێ بدەینەوە:

یەکەم: سەبارەت بە (ڕۆژمێری پێشمەرگەیەک)، کە لەنووسینی کاکە حەمەی حاجی مەحمودە، کارەکەی بەو شێوە وردەکاری و ئاماژەکردن بە ورد و درشتی ڕووداوەکان، لەگەڵ ڕۆژ و مانگ و ساڵدا، جێگەی ستایش و دەست خۆشییە بەتایبەت دەستخۆشی بۆ ئەو هەموو نامە و نووسراو و بەڵگەنامانە، کە لە هەموو بەرگەکانی کتێبەکەدا ئاماژەی پێداون. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێک کەم و کورتی و هەڵەی تێدایە، ئەوەی من بۆ خۆم ئاگادارم لەو بەشانەی کتێبەکەدا هەیە کە ڕەنگە لێرەدا و لەم پاشکۆیەدا جێگەی ئەوە نەبێت من ئاماژەیان پێ بکەم، یان ڕەخنەیان لێ بگرم یان سەرنجی خۆمیان لەسەر بنوسم. ئەمەشم لەگەڵ کاکە حەمەدا باس کردووە، کاتی خۆیشی لە ڕۆژنامەی هەواڵدا تێبینی خۆم لەسەر نوسیوون و لەگەڵ ئەوەشدا دەستخۆشی لێ ئەکەم و جي ێطةی نـرخـانـدنـة.

دووەم: سەبارەت بە کەشکۆلی کۆلم لە نووسینی شێخ عەلی کەشکۆل دوای خوێندنەوەی بە تایبەت ئەو بەشانەی، کە من زانیاریم لە سەریان هەیە و لەنزیکەوە پێکەوە بووین، چەند هەڵەیەکم بە دی کردووە، کە هەڵەکان زەق و دیارن، بەڵام لەبەر ئەوە چەند هەڵەیەکی کەمن ئیشارەتیان پێ ئەکەم وەک ئەوەی لەبابەتی شۆڕشی نوێدا، لەلاپەڕە ۸۲دا سەرەتا باسی شکستی ساڵی ۱۹۷۵ و دەرچوونی خەڵکی بۆ ئێران کردووە. باسی لە دوای جاڕدانی شکستەکەو گەڕانەوەی هەندێک لە کۆمەڵانی خەڵک کردووە بۆ عێراق. ئەمەو باسی ڕاگواستنی ئەوانی کردووە بۆ باشووری عێراق، بەڵام لەپڕ ئەمانەی لەگەڵ گەڕانەوەو ئەنفالکردنی ئەوانەدا لەساڵی ۱۹۸۸-۱۹۸۹دا گەڕاونەتەوەو

